

کوێزە شینکە (یوسفجوق)

٢

یەشار کەمال

# ئاغاکانی ئافچاساز

وەرگێڕانی
رەسوڵ سۆڵتانی

# ئاغاکانی ئاقچاساز

## بەرگی دووەم

**ڕۆمان**

**یەشار کەمال**

**و: ڕەسووڵ سوڵتانی**

MUKIRYANI
ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION

هەولێر ٢٠١٣

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **ئاغاکانی ئاقچاساز ٢ (ڕۆمان)**
- نووسینی: یەشار کەمال
- وەرگێڕانی بۆ فارسی: ڕەئیس نیا
- وەرگێڕانی بۆ کوردی: ڕەسووڵ سوڵتانی
- نەخشەسازی ناوەوە: وەرگێڕ
- بەرگ: هۆگر سدیق
- نرخ: ١٢٠٠٠ دینار
- چاپی یەکەم: خانەی موکریانی ٢٠١٣
- تیراژ: ١٠٠٠
- چاپخانە: موکریانی (هەولێر)
- لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٢٥٥٥)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە

زنجیرەی کتێب (٧٤٥)



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ٥٢

"ئەو بنیادەمە باشانە، لێی سواری ئەو ئەسپە جوانانە بوون و
سەری خۆیان هەڵگرت و ڕۆیشتن"

بارانێکی بڵێی و نەڵێی زەردباو کە هەڵدەڕژایە سەر بریقەبریقێکی بێ سنوور، شلکەگیا و نەمامەکانی لوول دەدا و تێکیەوە دەپێچان و بە دەوری پۆلە دەوەنێکی پڕ لە گوڵەتوتڕکدا دەخولاوە. ئەسپێکی کوێت، ئارەقاوی کە لاق و لەتەری هەتا ئەژنۆی لە قوڕ چەقیبوون، لەگەڵ هەر قەمچییەك کە بە ویڕەویڕ وەکەفەڵە گنج تێکەوتوو و گرژەکەی دەکەوت، بەتاو بە دەوری پۆلە توتڕکەکەدا دەخولایەوە و جاربەجار بازنەی خولانەوەکانی گەورەتر و بەرینتر دەکردەوە. لمبۆزی وا هێنابووە پێشەوە گوێچکەی کەوتبوونە سەر یاڵ و ملی و سەر و ملی ببوونە یەك. ئەسپەکە سێ جاران بە سەر پۆلە توتڕکەکەدا بازی دا. سێ جار دەستەکانی لە قوڕەکە هەڵچەقین و هەستایەوە و سەری بەرز کردەوە و کونەلووتی لێك ڕەوینەوە و سێ جاران حیلاندی و حیلە و پڕمەکەی لە ڕەوەزەکانی ئاناوەرزادا دەنگی دایەوە.

لێزمەی بارانەکە هەر دەتگوت نوورێکە و بەسەر ڕووناکاییەکەدا دەپڕژێ. با پڕیشکەی بارانەکەی دەبرد و تۆزێك لەولاترەوە دەیپڕیشکاند. باڵندە خووساوەکانی بەربارانەکە سەریان نابووە بن باڵەکانیان و لەسەر لك و پۆی دارەکان هەڵکورمابوون.

لافاوی وەنەوشەیی پەپوولەکان بە نێو بارانەکەدا تێپەڕی و لەولاترەوە، لە دەم ئاوەکە تووشی ڕەشەبایەك هات و لە سەر دەوەنی پێنج پەڕەکە، لێك بڵاو بوون و تاوێك دواتر یەکیان گرتەوە و بوونەوە هێشوو و ئاخرییەکەشی بڵاو بۆوە و ڕەنگە وەنەوشەییەکە (مۆرەکە) لە تیشکە زەردە تۆخەکەدا توایەوە و وردە وردە کاڵ بۆوە و لە چاوان ون بوو. دەوەنە پێنج پەڕەکە یەکسە وەنەوشەیی داگەڕا. ئەسپە کوێتەکە هەروا کە هەتا ئەژنۆی لە قوڕ دەچەقی، لە غاردانێ نەدەکەوت.

گەردەلوولێکی باریك و سپی، وەك داهێزرابێ لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات ڕێگەی دەبڕی. گەواڵە هەورێکی سپی لە پاناوکی ئاسمانەکە خزی و سێبەرە تارەکەی بە تەختایی دەشتەکەدا دەڕۆیی. لەگ لەگە مل درێژەکان بەبێ ئەوەی باڵ ببزێون، پۆل پۆل بە ئاسمانە گەرمەکەدا تێدەپەڕین و سێبەرەکانیان گەواڵ گەواڵ دەکەوتە سەر خاکە تاوەسووتەکە.

ئەوجار بایەك لە دوور دوورەوە هەڵی کرد. هەورێکی سوور هەستا و بە ئاسمانێ وەربوو و هەر لە بەیانییەوە تا شەوێ چڕ بۆوە و کەڵەکە بوو و لێك بڵاو بۆوە و سێبەرەکەی بەسەر هەموو دەشت و دار و شینکە و ئاو و گژ و گیا و بەرد و ڕەوەزەکان کشا و سووری داگێڕان.

لە دوور دوورەکانەوە کۆشکێك دەسووتا. دەشتەکە لەو خوارەوە خۆی هەڵدەخست. نەرمە دووکەڵێك وەك پەردەیەکی تەنك دەشتەکەی داپۆشی. دەنگی چەند تەقەیەك دڕی بە بێدەنگییەکە دا. منداڵ و ژن و کچ و کوڕەلاو و پیرەپیاو و پیرەژن لە کۆشکەکە دەردەپەڕین. هەرکەس لە کۆشکەکە دەهاتە دەرێ، دەدرایە بە ڕەهێڵەی فیشەك و بە قەدی گردەکەدا خلۆر دەبۆوە. کۆمەڵە پیاوێك کە چاکەتی درێژی سپییان لەبەردا بوو و مێزەریان لەسەر بوو، وەك ئاڵقەیەك دەوری گردەکەیان دابوو و بە فیلینتا بریقەدارەکانیان پەیتا پەیتا تەقەیان لە کۆشکە گڕگرتووەکە دەکرد. ئەو بڵێسە ئاگرانەی هێندەی منارەیەك لە کۆشکەکەوە هەڵدەستان، تا بەیانی دانەمرکانەوە. لەسەر گردەکەش، لەجێی کۆشك، کۆگایەکی ڕەش بەجێ ما. بۆنی خوری و گۆشتی برژاو هەموو وڵاتی داگرتبوو. ئەسپی نیوەسووتاو وەك بکڕووزێنەوە دەیانحیلاند، حیلەی دڵتەزێن. لە هەموو لایەکەوە دەنگی ناڵین و شین و شەپۆڕ دەهات.

"ئەوەی نووزە و ناڵەی دێ، خەنجەرێکی لێ بدەن. دەنگەکان ببڕێننەوە. ئەسپە سووتاوەکانیش بکوژن."

جا ڕەمۆ گوتی:"ڕای کرد. خەیانەتکار، ترسنۆك، شێت..." ئیتر بەدوایدا ئەسپەکەی تاو دا. ئەسپەکەی پێشەوە وەك بای شەماڵ دەفڕی. بە گوندێکدا کە خانووەکانی لە قوڕ دروست کرابوون، تێپەڕین. ڕەمۆ جار بە جار لە سوارەکەی پێشەوە نزیکتر دەبۆوە. کە گەیشتنە شارۆچکەکە، هەر هێندەی سەری ئەسپەکە لێك دوور بوون. ڕەمۆ ئاخێکی هەڵکێشا و لە دڵی خۆیدا گوتی:"کوڕە خۆ ئەوە ژنە. خوێنی ژن شووم و بێ فەڕە. داوێنمان دەگرێ. ژن، کە ناسیتەوە و زانیت ژنە، ئیتر ناتوانی بیکوژی." لە وارسکەی خۆیەوە، ئەو قسەیەی دەکرد. ئەو بیرکردنەوەیە وەك خۆرکەیەك لە وارسکەیدا بوو:"ئەو ژنانەی لە ئاگرێ ڕایان دەکرد، هەر بەپێی وارسکەی خۆی دابوونییە بەر تیر و خەنجەران. بۆ ئەوەیان نەیدەتوانی بڵێ:"ئەوانەی وەبەر خەنجەرم

دان، دیتمن و ناسیمن. ئەوجار لە نێوەڕاستی شاریش خۆ نەدەکرا. لەگەڵ هەموو ئەوانەدا، شان بە شانی یەکتری گەیشتنە شارەکە. رەمۆ خۆی گەیاندە پێشی و رێگەی لە سوارەکە گرت. چاوی منداڵێك کە بە باوەشی ژنەکەوە بوو، لە ترسان لە ژێڵلا هاتبوون. سێ ساڵان دیار بوو. مۆرە و کووژەکەی نەزر و قوربانی لەسەر شانەکانی هەڵدەبەزینەوە. مۆر، زەرد، سپی... رەمۆ خەنجەری هەڵکێشا و پێنج پەنجەری لە منداڵەکە دا... و ئەسپەکەی لینگ دا...

"هیچ کەس، هیچ کەس، هیچ کەس بۆ تۆویش لەو رەچەڵەکە زیندوو دەرناچێ..."

ژنە، کە منداڵەکەی توند لەباوەش گرتبوو، لە ئەسپەکە بەربۆوە. هەموو گیانی خەڵتانی خوێن بوو. شین و گریانەکەی لە ناخی دڵیەوە دەگەیشتە پەڕپەڕۆچکەی ئاسمانێ. منداڵەکەی لە نێوەڕاستی گۆڕەپانەکە لەسەر عەرزەکە درێژ کرد. خوێنی منداڵەکەی لە دەموچاوی هەڵدەسوی و روومەتی بە نینۆکان دادەڕنی. شین و شەپۆڕەکەی وردە وردە دامرکایەوە و سەردوولکەیەك لە ناخی گیانییەوە هەستا. مەیدانەکە ئەوەندەی یەك و دوو پڕ بوو لە خەڵك. کەس پشووی دەرنەدەهات. لە نێوەندی مەیدانەکەوە دەنگێکی خەمناك و کپ وەك لە قووڵاویی زەوییەوە بێتە دەرێ، هەڵدەستا.

گەردەلوول و هەورەتریشقە گەلێ جاران کردیانە بریسکەبریسك و ئاخرییەکەی دامرکانەوە. پیاوێکی باریکەڵەی پشت کۆماوەی بەسالاچووی ریش چەرموو بە عابایەکی سپییەوە لە نێو تەپوتۆزەکە هاتە دەرێ. شمشێرێکی درێژ و خواری بە قەدییەوە بوو، نووکی لە عەرزی دەکشا. مشتووی شمشێرەکەی لەبەر تاوەکە دەبریسکایەوە. دەتگوت شۆلاوگەی زێڕینی تیرێژەکە چاوی ئازار دەدات. داوێنی کراسی پیرە پشت کۆماوەکە خۆڵ و خاکەکەی دەماڵی. توورەکەی هەوریشمینی سووری بەدەستەوە بوو. ردێن و جلوبەرگ و شمشێرەکەی و توورەکە و دەست و دەموچاوی هەموو خۆلاوی بوو و هەر ددان و چاوی دیار بوون و دەبریسکانەوە.

بە کەلێنی دەرگای کۆشکەکەدا خۆی خزاندە ژوورێ و هات رێك لە چەقی حەوشەکەدا راوەستا. سەری بەحاڵ هەڵبڕی و چاوی لە کۆشکەکە بڕی و هەرای کرد:"

"سوڵتان، سوڵتان، سوڵتان.... وەرە، وەرە، وەرە دەرێ. وەرە دەرێ... هەر من مامەوە. هەر من مامەوە. هەر من و تۆ ماوینەوە.... سوڵتان، سوڵتان، ئەمیر سوڵتان، مەترسە، بۆ گیانێکی سووك، خۆ لە قوژبنی ماڵێ مەپەستێوە."

لە پێشدا بە زاری چەرکەزییانە گوتی ئەو جار بە زمانی کوردی و دوایی بە سریانی و عەرەبی و هەرمەنی و لازی و دوای ئەوە بە هێندێ زمانی دیکەی کەس لێی تێنەدەگەیشت لەوانەیە ئارامی یان ئاسووری یان لەوانەشە بە عیبرانی.

کە تاو گەیشتە چەقی ئاسمانێ، چوار مەشقی لەسەر عەرزە سوورەوەبووەکە دانیشت و دەستی کرد بە گێڕانەوەی پاڵەوانیەتییەکی کۆن. حەماسەیەکی سەردەمی گیلگەمێش. باسی خودایانی دەرکرد. بە دەنگێکی پیر و پڕ لە زایەڵە. باسی خوێن و خاکی خوێناوی و ئاسمان و ئەقڵ و ئاو و گوڵ و زیندوو و مردوو و گەوهەر و ئەسپ و جەنگ و ئاشتیی دەکرد. دەنگی، دەنگە زایەڵەدارەکەی سینگی لە خاکەکە دەخشکاند و دەشتەکەی دەبڕی.

دەمەدەمی ئێوارە دیسان هەستا و هەرای کردەوە:

"دەروێش بەگ، دەروێش بەگ، بە منی بسپێرە. بینێرە لای خۆم... کۆشکەکەی تۆش بە مەرەدی کۆشکەکەی من دەچێ. دەروێش بەگ، دەروێش بەگ، دەروێش بەگ، ئەمن بەو پیرییەی خۆمەوە لە چوکووراواوە بە پێیان هاتووم. بیسپێرە بە من، بیسپێرە. خۆ ئەگەر بە منی نەسپێری، یاخوا کۆشکەکەی تۆش وەك کۆشکەکەی من وێران بێ. ببێتە تەپۆڵکێك رەژوو. کوندەبوو تێیدا بخوێنێ. کۆشکەکەی من هەزار ساڵە بوو... کۆشکەکەی تۆش یاخوا بە مەردی کۆشکەکەی من بچێ."

ئەژنۆی لەسەر عەرزی دادا. دەستە درێژەکان وەك باڵ لێك کردنەوە و لەملاولای خۆی دا و کڕووزایەوە. ردێنەکەی خووسا. لە جێی خۆی هەستا و بەرەو دەرگاکە چوو. دەرگاکە لەخۆوە کرایەوە. پیرە، شمشێری لە کالانێ دەرکێشابوو و وەك تۆفانێکی حەز و تاسە هرووژمی برد بەرەو پلیکانەکان. پشتی قیت ببۆوە و تیزەبزەیەکیش کەلێنی خستبووە ریشەکەیەوە. پێی نایە یەکەم ژوورەوە. لەوێ هاتە دەرێ و چووە یەکی دیکە و یەکی دی و یەکی دی... پێی دەنایە هەر ژوورێك، هیواکەی کاڵتر دەبۆوە و کاڵتر دەبۆوە و پشتی کۆمتر دەبۆوە... کە دەرگاکەی کردەوە، لە سەر جێی خۆش حەپەسا. شیرەکە بە دەستییەوە هەڵکشا و بەو پەڕی تووڕەیی و رەقەوە داهاتەوە، لە نیوەی رێیە بەهەواوە دەستی وشك بوو و شمشێرەکەی هەروا مات و بریقەدار بە هەواوە ماوە.

رەنگی بە روخسارییەوە نەبوو. ردێنە رەشەکەی، قژە رەشەکەی، برۆی و سمێڵ و رەشێنەی چاوی ژاکابوون. لە مردوو بێ گیانتر دەیانڕوانی، گنجاوی و بێ گیان و دەرپەڕیو، بەبێ هیچ جووڵەیەك. دوای ئەوە شەپۆلێکی خۆڵ و لم هات و داپۆشی. شمشێرەکە چەند ساتێك هەروا بێ جووڵە مایەوە.

کابرا پیرە داهاتوە. خۆی راپسکاند و گەڕایەوە. لاقەکانی تێك دەئالاّن. لە حالێکدا ئەژنۆکانی دەلەرزین و دەنووشتانەوە، لە پلیکانەکان هاتە خوارێ و هەرچۆنێك بوو، خۆی گەیاندە نێوەڕاستی حەوشەکە و لەوێ لەجێی خۆی چەقی. هەتاو بەسەری دەکشا و وشکی دەکرد.

ئاخرییەکەی دەستی جوولاّ و شمشێرەکە دەرپەڕی و لەوبەری دیوارەکە وەعەرزی کەوت. دیسان دانیشتەوە و گۆرانییە پڕ لە حەماسەتەکەی، بەرەو ئەو رۆژە چڕی کە لە دوور دوورەوە هەلّدەهات. بەدەم گۆرانیگوتنەکەیەوە تا پێش دەرگاکە چوو. راوەستا. ئاوڕێکی لە کۆشکەکە داوە. توورەکەکەی دانا و دەستی بەرەو ئاسمان هەلّبڕی و کەوتە پاڕانەوە. دەستی بە ردێنیدا هێنا. تالّ تالّی ردێنی وەك پووش و پەلاّش لە بن دەستەکەیدا قرچەقرچ دەشکانەوە و پەرش و بلاّو دەبوون.

هەنگاوێکی نا. توورەکەکەی کردەوە. زێڕەکە لەبەر تاوەکە دەرەوشایەوە. بە دەستە رەقەلّەکانی زێڕەکانی بەسەر عەرزەکە وەرکرد. زێڕەکان لەبەر رووناکییەکەدا درەوشانەوە و لە درەوشانەوە کەوتن. درەوشانەوە و کپ بوونەوە. پیرە پیاوە ئاخرییەکەی توورەکە سوورەکە توورِ هەلّدا. توورەکەکەی بە پنچکە درِوویەکەوە گیرسایەوە و کەوتە جۆلانە. پیرە پیاوە هەر گۆرانیی دەگوت.

بارانێکی زەرد باو دەباری. بارانێکی ئالّۆز و پەرش و بلاّو کە زەردییەکەی هەر دەهات و رەنگی نارنجیی دەگرت و چیی نارنجییش دەبۆوە، خەستتر دەبوو و وەك دیوارێك هەلّدەستا.

لە نێو بارانە نارنجییەکەوە هاتە دەرێ. لە حەوشەکە راوەستا. گریان و نووزانەوەیەکی تێکەلاّوی خرمە و گرمەی باران هەر چوار دەور و تەنیشتی گرت. لەسەر ئەسپەکەی گرمۆلّە ببوو و سەری شۆڕ ببۆوە... لە رکێفەکەیەوە دلّۆ دلّۆپ خوێن دەتکایە سەر عەرزەکە.

سێ مامز بە رەوەزەکانی ئاناوەرزا هەلّگەڕان. هە سێ کیان وێکڕا لە گابەردەکانەوە خۆیان فڕێ دا. مارێکی زەنگولّەدار پەپکەی خواردبوو...

دلّۆپە و چۆڕەی خوێن عەرزەکەی کون دەکرد.

بارانە نارنجییەکە وردە وردە رەش داگەڕا. دەنگی زەنگولّە عارەبانە لێرە و لەوێ لە دەشتەکەدا دەبیستران. پیاوەکان بە ئەسپە سپییەکانەوە لە قرچەقرچی گەرماکەدا بە دەوری کۆشکەکەدا دەخولانەوە. سوارەکان لە نەکاو جلّەوی ئەسپیان کێشا و ئەسپەکان لە غاردانێ کەوتن و تفەنگ تەقەیان لێ هەستا. هەموو ولاّت، کۆشکەکە، حەوشە، دارەکان و رەوەزەکان لە دووکەلّدا ون بوون. بارانە نارنجییەکە بە لێزمە، بێدەنگ و وەك دیوارێك دەهاتە خوار.

لەسەر ملی ئەسپەکە خزی و کەوتە خوارێ. چاوەکانی درشت و رەش و وەك ئاگر داییسان. ردێنە رەشەکەی لەبەر تیریێژی تاوەکە کەسك دەچووەوە. کاکۆلّە لە ئارەقە شەلاّلّەکەی لەسەر

نێوچاوانی پەخش و پەرێشان ببوو. دەسبەجێ دەرپەڕین و کابرا بریندارەکەی سەر قوڕەکەیان هەڵگرتەوە و بردیانە سەرێ. ئەسپەکەی هەر لەوێ بەجێ ما. کەفەڵی خوێناوی بوو. سێ رۆژ و سێ شەوان لە جێی خۆی نەبزووت.

کۆشکەکە راتڵەکا و شووشە و پەنجەرەی دیوەخانەکە خرمەیان کرد.

ژنەکان، لەچکی سپی بەسەرەوە، لە چیاکان و لە گوندە نزیکەکانەوە، بە سواری و پیادە بە تەراکتۆر و ترۆمبێل و جیپ، دەهاتن و تەپوتۆزیان هەڵدەستان. هەر دەگەیشتنە حەوشەکە، یەك بەخۆیان لە بانگیان دەدا و شین و گابۆڕیان دەنایەوە و راست دەچوونە سەر ئەو مەیتەی لەسەر دۆشەگێك بە بان کۆنەبەڕەیەکی گەورەوە درێژ کرابوو و دەستیان دەکرد بە لاواندنەوە و سەردولکە پێدا هەڵگوتن. شینگێڕییە دڵتەزێنەکانیان وێکڕا و بە راوەشاندنی لەچکە سپییەکانیان دەست پێ دەکرد و دەنگی شینگێڕەکان دوور دوور دەڕۆیشت و شینی دوور و درێژ لە رەوەزەکانی ئاناوەرزادا دەگۆڕدرا، ماندوو، کپ.

برایم لە بن سەرچەفەیەکی سپی یەك تەختە درێژ ببوو. هەر دەتگوت خەوی لێ کەوتووە. خەونێکی ئارام و بێ جووڵە و ترپە. هەر دوو دەستیان خستبووە سەر سینگی. دەموچاوەکەی بلێی و نەلێی زەرد هەڵگەڕابوو و درێژ دەچۆوە. شتی جیا لە مەرگ و ترسناکتر لە مەرگ لەسەر روخساری ئەو تازە لاوە نیشتبوو. روخسارێك کە ژنە سەردولکەبێژەکان لە جارێك پتر نەیاندەتوانی سەیری بکەن.... شتێکی وەك زەردەخەنە، زەردەیەکی کە دێ بپشکوێ، شتێکی وەك ترس و تۆقین، سەرووتر لە زراوچوویی. چاوەکانی زەق زەق، ریپۆق کردوو و دەرپەڕیو، لێڵ و لە ژێڵڵاهاتوو. نە باب و دایکی برایم و نە هیچ کەسێکی دیکەش توانیبووی چاوە تۆقیو و بەمۆڵەق وەستاوەکانی لێك بنێ. چەند جارێك بۆیان لێك نابوو، بەڵام چاوی مردووەکە دیسان زەق زەق کرابوونەوە. ئاخرییەکەی هەمووان ترسابوون و ئیتر وازیان لێ هێنابوو.

دەنکی درشتی بارانە شلەتێن و زەردەکە وەك دەنکە تەسبیح، دەنك دەنك و تلێپەتلێپ دەکەوتە حەوشەکە و کونی قووڵ قووڵی دەختستە لم و خۆڵەکەوە. دەنکە زەردەکان بە هەزاران داو و تای زەردیان لە ئاسمانەوە بۆ زەوی رۆهێشتبوو.

لە حەوشەکەی دیکەدا، تۆزێك لەولای تەراکتۆرە زەرد و سوور و شینەکانەوە، قەرەقیزخاتوونیش لە بن سەرچەفێکی سپیدا خەوتبوو. دەستەکانی وەك دەستی منداڵێکی بچووك، دەموچاوی وەك دەموچاوی منداڵێکی مردوو تێك نابوو و رەش داگەڕابوو و لە دەموچاوە گنج و لۆچاوییەکەیدا لێو و چاو و برۆی تێك نابوون. ئەو دەموچاوە کە هیچ لە

دەموچاو نەدەچوو، نوقمی سام و ترسی بەختەوەرییەك بوو. پۆلە ژنێكیش بەسەر ئەوەوە دانیشتبوون و هێدی هێدی لە جێی خۆیانەوە دەیانلاواندەوە و دەنووزانەوە. لاواندنەوەیەك بە حاستەم دەبیسرا.

سێ شەهێن بەسەر كۆشكەكەوە باڵیان لێك كردبۆوە و بەبێ جووڵە بە میچی ئاسمانەكەوە نووسابوون.

مستەفا بەگ لە جێو بانەكەیدا كەوتبوو و گوێی دابووە ئەو سەردولكە و لاواندنەوانەی بە حاستەم دەگەیشتنە ژوورەكەی.

بارانە زەردەكە تلێپەتلێپ دەكەوتە سەر خاكەكە. دەروێش بەگ قیت و رەپ، هات. دڕی دا بە حەشیمەتی ژنەكان و گەیشتە سەر مەیتەكە. بەسپایی داهاتەوە و دەستێكی بە كاكۆڵی كوڕەكەیدا هێنا. دوو دڵۆپە فرمێسك خزینە سەر روومەتەكانی. بێ ئەوەی تێی رامێنێ هەستا. گەڕایەوە. لە حاڵێكدا لەوێ دوور دەكەوتەوە، گوتی:"مردووەكە هەڵگرن."

لە حەوشەكە چووە دەرێ. ئەسپەكەی لەبەر دەرگا بوو. خۆی خستە سەر پشتی و بەرەو دەشتەكە تاوی دا.

"سوڵتان ئاغا، ئەمیر سوڵتان، ئەمیر سوڵتان، ئەو بە ئێمە بسپێرە دەروێش بەگ..."

كفنەكانیان لە ملدا و شمشێری لە كالان دەركشێراویان بە دەستەوە هاتن و لە نێوەڕاستی حەوشەكە كۆزیلكەیان بەست. بەرەبەری بەیانی بوو. رۆژێكی نوێ لە دایك دەبوو. كفن بە ملەوە و شمشێری هەڵكێشراو بەسەر شانەوە لە ناخی بوولێڵەكەوە هاتنە دەرێ. هەتا تاو هەڵات شمشێرەكانیان لە عەرزەكە كوتا و بەرەو خۆرەتاو ئەژنۆیان دادا و دەستیان بۆ پاڕانەوە هەڵبڕی:

"ئەمیر سوڵتان، ئەمیر سوڵتان."

هەر دەتگوت شەرم دەكەن بیڵێن، یان ناوێرن ناوی بێنن. لێوەكانیان نەدەجووڵا. لە نێوان خۆیاندا ئاگرێكیان كردەوە. ئاگرەكە هێندەی كۆشكەكە هەستا و دڕی بە تاریكییەكە دا. دڵۆپە درشتەكانی بارانە نارنجییەكە دەڕژایە سەر شەو و ئاگرەكە و چزەی هەڵدەستاند. گۆشتی وشكەوەبووی ئاسكەكەیان لەسەر پشكۆی ئاگرەكە دانا. گۆشتەكە بە پۆلووەكانەوە نووسا. تەندووری زگیان نێڵەی دەهات. گۆشتە وشكەوەبووەكانیان لە چاوترووكانێكدا لە سەر پشكۆكان راماڵی و خواردیان.

ئەو دووعایەی بەردەوام دووبارە دەبۆوە، هەر گوتیان و گوتیانەوە. بە دەنگێك كە هەڵدەستا و دادەمركایەوە، هەتا بەری بەیانی هەر پاڕانەوە. كە بەیان ئەنگوت، دەمیان

داخست و شمشێرەکانیان لە عەرزی کوتا. سێ جار، بە مەودایەکی درێژ، خاکەکەیان ماچ کرد. بارانە زەردەکە پەردەیەك بوو لە نێوان ئەوان و کۆشکەکەدا.

بەیانیی سێهەم ڕۆژ پەلاماری دەرگای کۆشکەکەیان دا و دەسبەجێ دەرگاکەیان کردەوە. کفن بە ملەوە و شمشێری هەڵکێشراوی ئاگرین بە دەستەوە کۆشکەکەیان سەنگ و سووژن دا و سەریان بە هەموو کەلێن و کولێنێکدا کرد. کۆشکەکە چۆڵەکوژی تێدا نەبوو. تەنانەت مێشوولە و زەردەواڵەیەکیشی تێدا نەبوو.

لە پلیکانەکانەوە بە خێرایی هاتنە خوارێ. بەرەو خۆری دەمی زەردەپەڕ ئەژنۆیان دادا. ئەفسانەیەکیان وێکڕا و بێ پسانەوە چڕی. شمشێرەکانیان کە لە عەرزەکە هەڵدەگرت، تاریکییەکە خەست دەبۆوە. بە دەشتەکە وەربوون. بۆنی گۆشتی وشکەوەبوو و برژاو و ناسکی ئاسکەکە حەوشەکەی داگرتبوو.

دەروێش بەگ خۆی هاویشتە سەر پشتی ئەسپەکە. پەڵە هەورێکی پەمەیی کە تیشکی خۆرەکەی دەم ئاسۆ قەراغ و لێوارەکانی روون کردبۆوە، شەپۆلی دەدا. چیای دوڵدوڵ نوقمی تیشکێکی پەمەیی بوو. گەواڵە هەورێك بەسەر لووتکەکەیەوە دەفڕی. شەوی بەر بناری چیاکە و سەر سینگی دەشتەکە خەستتر دیار بوو. تاوێکی دیکە رووناکایی لووتکەکان لە داوێن و بنارەوە دەخزی بەرەو دەشتەکە.

دنیا چۆڵ ببوو. هەوا و گیا و باڵندە و مێشەنگوین بێدەنگ بوو،. گەڵای دارێك نەدەبزووت. هەموو شتێك بەتاڵ ببۆوە. دەروێش بەگ بۆ ساتێك هەستی بە هیچ شتێك نەدەکرد. نە خراپ و نە چاك. نە تاڵ و نەشیرین. دەمارەکانی خوێنیان تێدا نەمابوو. لوولەی بۆش و بەتاڵ. دڵە بەتاڵەکەی لە خۆڕا ترپەی دەهات. وەك شتێکی لەبیر چووبێتەوە. دەچووە هەر جێیەك و هەر شتێکی دەکرد، ڕەهۆڵی بەتاڵی لەبیرکراوەکان، لە مێشکی نەدەسڕدرایەوە. بن دارەکان، هۆدەکاین کۆشکەکە، کۆنە گۆڕستانەکەی ئاناوەرزا، ئاوەکان، دار و بەرد و کاژێری دارەکان و نێو دەوەنەکان و هێلانەی تەیرەکانیش دەگەڕا و ئەوەی لێی دەگەڕا نەیدەدۆزییەوە و ناچار سواری ئەسپەکەی دەبوو و خۆی بە دەست شنەی بایەکەوە دەسپارد.

لە پڕێکا سەری ئەسپەکەی وەرگێڕایەوە و رووی کردە کۆشکی ئاق یۆللی. تیشکەکزەکەی چراکە لە تاریك و روونی بەیانییدا لە دوورەوە ترووسکەی دەهات. ماوەیەکی زۆر هەر نەیتوانی چاو لەو پەنجەرەیە هەڵگرێ کە تیشکەکە لەوێوە دەهاتە دەرێ. لە بن دارچنارەکەوە راوەستابوو. هەتا شنە بای بەیانی هەڵی کرد هەر لەوێ چاوەڕوان ما. کە بەیان ئەنگوت،

سەری ئەسپەکەی بەرەو لای کۆشکەکەی خۆی وەرسووڕاندەوە... لە پلیکانەکان چۆوە سەریّ و خۆی خستە نێو جێوبانەکەیەوە. چەند مانگ و رۆژان بوو خەوی لیّ نەدەکەوت. بۆشایی ناخی و رەهۆڵی لەبیرکراوەکانی هەر دەهات و گەورەتر دەبۆوە.

دەمەدەمی ئێواریّ کە وەخەبەر هات، شیوەکەی لە ماست و سوێسکەی سوورەوەکراو و پلاو و تەرە پیاز بۆ دانرابوو، بەپەلە خواردی. دەست و زاری بە ئاو و سابوون شوشت. ژنەکەی، بە نیگەرانییەوە لە دوورەوە سەیری مێردەکەی خۆی دەکرد.

دەروێش بەگ بە بیّ ئۆقرەییەوە ئەمسەرئەوسەری دیوەخانەکەی کرد. کە خۆر ئاوا بوو، بە پەلە لە پلیکانەکان هاتە خواریّ. ئەسپەکەی زینکراو ئامادە بوو. لێی سوار بوو و لینگی دا. هات، بە دڵێکەوە کە لە سینەیدا حەجمینی نەبوو، لە بن چنارەکە، لە جێیەکەی دوێنێی راوەستا. کۆشکەکە لە تاریکیدا نوقم ببوو. راوەستا. تاوێك دواتر چرایەکە هەڵکرا و تیشکە کزەکە دیسان لە پەنجەرەکەوە خزییە دەرەوە. هەموو گیانی لە خۆشییەك کە نەیدەزانی چییە کەوتە لەرزین.

هەتا بەیانی تەنانەت بۆ چاوتروکانێکیش چییە چاوی لە تیشکەکە هەڵنەگرت. بیری کردەوە و بیری کردەوە. لە بارەی مستەفا بەگ و وەزع و باری دەروونی و رابردووی... باشە ئەوەی لەبارەیەوە بیستبووی راست بوون؟

سێهەم شەو لە بن چنارەکە خۆی پیّ نەگیرا. شتێك ئەوی بەرەو کۆشکەکە، بەرەو تیشکە لەرزۆکەکەی پشت پەنجەرەکە راکێش دەکرد. چەند هەنگاوێکی بەرەو پێشەوە هەڵگرت. ئەمجارەیان لە بن سپیدارەکەی دەم جۆگە پڕ ئاوەکە راوەستا. لە ئەسپەکەی دابەزی و جلوبەرگەکانی داکەند و خۆی بە ئاوەکە دادا و لە حاڵێکدا جار نە جارێك سەیری ئەو تیشکەی دەکرد کە پتەپتی بوو، لە پەنایەکەوە بەرەو ئەویّ مەلەی کرد. دوایش جلوبەرگەکانی لەبەر کردنەوە و لێی سوار بۆوە و بەرەو کۆشکەکە غاری دا. وەك بای شەماڵ بە دەوری کۆشکەکەدا خولایەوە و خولایەوە. لە بن پەنجەرەیەکەوە کە تیشکی لێوە دەهات، راوەستا. دیسان ئەسپەکەی لێنگ دایەوە و راوەستا و وای کردەوە.

دوندی چیاکەی دوڵدوڵ کە رووناکی کردبۆوە و تاریکییەکە لە خوارەوە خەستتر دەبۆوە، دەروێش بەگ بە ناقایلی و ناچاری سەری ئەسپەکەی بەرەو لای کۆشکەکەی خۆی وەرسووڕاندەوە.

بای باکووری ڕۆژهەڵات هەڵی کردبوو و هەموو شتێکی تێکەوە دەپێچا و تێکی هەڵدەشێلان و دەیپێچانەوە و رای دەدان.

لە پێشدا تەراکتۆرەکان ڕۆیشتبوون. حەمە عەلی ئیتر لە ئەدەنەوە نەدەهات. کۆمەڵێك لە شۆفێر تەراکتۆرەکانی کە کلاوی گەڕگەڕیی حەسیریان لەسەر نابوو، لەگەڵ پیاوێکی وەکازبەدەست، راسپارد. شۆفێرەکان تەراکتۆرەکانیان وەکار خست. وەکارکەوتنی ئەو هەمووە تەراکتۆرە پێکەوە، مستەفا بەگی لەخەوێ راپەڕاند. سەری هەڵێنا و لە پەنجەرەوە روانیی:"تەراکتۆرە شینەکە لە پێشەوە و تەراکتۆرە سوور و کەسك و نارنجییەکەش بەدوایدا خەریك بوون لە حەوشە دەچوونە دەرێ. تەراکتۆرەکان هەورێکیان لە تەپوتۆز بەدوای خۆیاندا بەرز کردبۆوە و بەرەو رووبارەکەی جەیهان بەڕێوە بوون. مستەفا بەگ قیت بۆوە و پاڵی بە میلەی قەرەوێڵەکەوە دا و هەتا تەراکتۆرەکانی لە چاو ون نەبوون و تەپوتۆزەکەیان نەنیشتەوە، چاوی لەدوو هەڵنەگرتن.

دواتر خەرمانکوتەکان و مەکینەی دروێنە و گاسن و ئەسپ و گا و مانگاکان رۆیشتن و حەوشەکە چۆڵ بوو.

ئەوجار ژنەکەی و منداڵەکانی دیکەی و نۆکەرەکانی یەك بە دوای یەکدا ماڵەکەیان بەجێ هێشت. هەر ئەو و نەنە سەنەم لە کۆشکەکەدا مانەوە و نەنە سەنەمیش هەر دەیگوت:

"ئەمن بەگی خۆم بەجێ ناهێڵم. ئەمن بەجێی ناهێڵم."

حەمە عەلی لە ماوەی مانگێکدا شەش جاران بەشەو هاتە لای بابی و گوتی: "بابە هەستە با بڕۆین. لە ئەدەنە نهۆمی باڵەخانەیەکم بەکرێ گرتووە کە ئاوی گەرم و حەمامی هەیە. لەبری ئەوەی لێرە ئەو جانەوەرە وەحشییە بتکا بە قوربانی گوللەیەك... بابە، بابە، بابە وەرە بڕۆین..."

دەست و دەموچاوی ماچ باران کرد، بەڵام مستەفا بەگ زار هەڵنەپچڕی. حەمە عەلی هەرچیی دەیکرد، ئەو متەقی لێوە نەدەهات و نەشدەجوولا.

حەمە عەلی هەموو جارێك دەیگوت:"ئیتر هەرچی بەسەرت بێ لە ئەستۆی خۆتە و من تاوانبار نیم" ئەوەی دەگوت و بە تووڕەیی و بێزارییەوە بەجێی دەهێشت.

"وەحشیینە، دڕندەیینە.."

ژنەکەی هات، براکانی، خزم و کەس هاتن و هیچ کام نەیانتوانی قسەیەك لە زاری مستەفا بەگ دەرکێشن. بە رەنگ و روویەکی بزڕکاو و زەرد و سڕ و بێ گیانەوە لەسەر قەرەوێڵەکەی راکشابوو و متەقی لێوە نەدەهات.

حەمە عەلی دەیگوت:"دێ. کە بیستییەوە لێرە رۆیشتووین، دێ و دەیکا بە قوربانی گوللەیەك. ئەو خوێنمژە. ئەو وەحشییە..."

حەمە عەلی هەرکەسێکی پێی وابوو بابی جامینی ئەوی دەوێ و قسەی ناشکێنێ، ناردییە لای، بەڵام ئەوانیش مستەفا بەگیان پێ نەرم نەکرا.

حەمە عەلی دوای ئەوەی هیوای بە راگواستنی بابی نەما، کۆمەڵێك قەباڵە و نامەی دەهێنا و دەستی ئەویشی لە بن لێفەکەوە دێنایە دەرێ و بنەوە پێ مۆر دەکرد.

مستەفا بەگ دوای هەر مۆرێکی دەیکرد، لە بن برۆکانییەوە سەیرێکی کوڕەکەی دەکرد و بە تیشکێکی نیوەگیان لە چاوەکانیدا، زەردەیەکی وەك مردووانی دێنایە سەر لێوی. هەر ئەوەندە و بڕایەوە.

رۆژێکیان حەمە عەلی دەستەکاغەزێکی دیکەی هێنا و بابی دەستی کرد بە ئیمزاکردنی یەك بە یەکیان. ئیمزای کرد و کردی و لەنەکاو بە تووڕەییەوە خۆی راوەشاند و سەری هەڵێنا و دەنگێکی تێکەڵاو بە هاوار و نەڕاندن لە قوڕگی هێنادەرێ کە هەموو گیانی حەمەعەلیی خستە لەرزین:"ئیتر ئەوەیان نابێ. ئەمن ئەوانە نافرۆشم. نە ئەو کۆشکە و نە ئەو گردە و نە گۆڕستانەکش. کۆشکەکەی شارۆچکە و باغچەی پڕتەقاڵەکەش نافرۆشم."

ئیتر کاغەزەکانی بە تووڕەییەوە تووڕ بەرەو دیوارەکە و دیسان گرماندییەوە:"قرۆشێکیش چییە لە پارەی حیسابی بانکییەکەم ناتدەمێ. تێگەیشتی؟"

حەمەعەلی کەوتە پاڕانەوە:"ئەمن پێویستیم بە پارەیە بابە، خەریکم کارخانەیەك دادەمەزرێنم، نووسینگەی بریکاری دەکەمەوە، بانگ دادەنێم... ئەگەر لێرە بمێنمەوە، ئەو وەحشییە لە تۆڵەی کوڕەکەی دەمکوژێتەوە... بابە، بابە، بە کوشتنم مەدە، یارمەتیم بدە بابە..."

حەمە عەلی چەند مانگێکی دیکەش ئەوانە سەری لە مەزراکە دەدایەوە. بەڵام مستەفا بەگ لەبزی دە لەبزی نەگەڕا و تەنانەت سەیری دەموچاویشی نەکرد.

ئەسپە کوێتەی دەروێش بەگ سەقەت بوو. ئەو بیرەوەرییە فریای کەوت. ئەوەی لەبیری چووبوو، لەوانەیە هەر ئەوە بووبێ. لەوانەیە مەرگێك بووبێ. مەرگی ئەسپێك کە خۆشی

دەویست. زۆری بەزەیی پێیدا هاتەوە. ئەوجار ئەسپێکی دیکەشی مرد. هەموو ئەو ئەسپانەی لە گەلەخانەکەیدا هەیبوون، لە پانزە رۆژدا هەموویان مردن. ئەسپی گوندەکانی دەوروبەریش مردن. ئەو ساڵە ساڵی مەرگ و نەمانی بێوێنەی ئەسپەکانی چوکووراوا بوو. وەچە و تۆرەمەی ئەسپ لە زۆر گوندان بڕایەوە.

بە دەروێش بەگیان گوت:"بەیتەر هات."

دەروێش بەگیش گوتی:"با بێ."

ئەو بەردەوام ئەوەندەی خەمی مەرگی مرۆڤەکانی دەخوارد، ئەوەندەش هیی ئەسپەکان.

بەیتەرە گەنجە سمێل قەیتانی و قژ درێژەکە، گوتی:"بەداخم بەگ."

" سوپاست دەکەم جەنابی بەیتەرە. ئەوە چ پەتایەکە؟"

"لاڕەشەی ئەسپ. دەبێ هەموو کەلاکەکان دەرمانیان لێ بدرێت، بۆ ئەوەی میکرۆبی نەخۆشی و پەتا بمرێ."

هەموو هەڵۆ و باشوو و باز و سیسارکە و قەل و داڵ و شەهێنەکانی ئاناوەرزا و چیای حەمیتە و چیای گاوران و بەین بۆغاکان و ئالاداغەکان و چیای دولْدولْ بەرەو بۆنی کەلاکەکانی چوکووراوا داگەڕابوون و ئاسمانەکەی چوکووراوایان رەش داگیرابوو. باڵندە باڵ بڵاوەکان بە ئاسمانە بەرینەکەی چوکووراوا وەرببوون، پۆل پۆل بە ئاسمانەکەدا دەفڕین و ئەوجار لەپڕ و وەك شێتان دەنیشتنەوە و ئیتر نەیاندەتوانی باڵەکانیان لێك بکەنەوە و بفڕنەوە. دوای ئەوەی سێ چوار پل گۆشتە دەرمان لێدراوەکەیان دەپچڕی، باڵەکانیان بێهێز دەبوون و بەلادا دەهاتن و بەقاووقیژەوە وێك دەهاتن و ئاخرییەکەی بەبێ جووڵە لەسەر خاکەکە بەلادا دەکەوتن.

لەو پاناوکانەدا کە هێندەی زەوی و زارەکان دەبوون، لاشەی هەڵۆ لە تەنیشت کەلاکی ئەسپەکان وەعەرزی کەوتن. ئەوجار کەلاکی گورگ و چەقەڵ و رێوی لە تەنیشتیانەوە بینرا و لە ئاسمانەکەی چوکووراوادا هەڵۆیەك، بایەقۆشێك، شەهێنێك و... نەما... گورگێك، رێوییەك... شەهێن و باشووەکان و بازەکان و... هەڵۆکانیش لەگەڵ ئەسپەکان رۆیشتن. گورگ و رێوی و کەمتیار و چەقەڵەکانیش...

دەروێش بەگ گوتی:"هەڵۆکانیش، ئەو بنیادەمە باشانە، بەسواری ئەو ئەسپە جوانانە... هەڵۆکانیش، هەڵۆکانیش... لە تاریکاییەکی گەورەدا، لە نێو مەرگەساتێکی بێ بڕانەوە داین مستەفا ... دەبێ چ بکەین؟ دەبێ چ بکرێ؟"

رزین و بۆگەنبوون و دامرکانەوە و تەواوبوون و هەموو شتەکانی هەست پێ دەکرد. رەهۆڵە بەتاڵەکەی نێو ناخی دەروێش بەگ لەگەڵ تێپەڕینی رۆژەکان بەرینتر و گەورەتر دەبۆوە.

هەڵۆکان لە زۆر زووەوە پۆل پۆل لە رەوەزەکانی حەمیتە و قەڵاکەی ئاناوەرزا و تۆرووسدا هێلانەیان دەکرد. ئاسمان مەیدانی هەڵۆکان بوو. باڵە لێك بڵاوکردووە رەش و سوورەکانیان ئاسمان مسییەکەی دادەپۆشی. چەقەڵ و رێوییە کلك سوورەکان و گورگە گورج و گۆڵەکان و مێگەلی ئاسکە سڵ و خۆشبەزەکان و کەو و سوێسکە و... چوکووراوا ئیتر چکووراواکەی جاری جاران نییە. چوکووراوایان کاول کرد... دوور نییە ئەو رۆژە بێ کە جگە لە خاکێکی وشك و رەش و ئاسمانێکی چۆڵ وبەتاڵ ئەو چکووراوایە چیی لێ بمێنێتەوە. نە سەوزە و شینکەیەك و نە گوڵ و دەوەنێك و نە کچۆڵەیەك و نە تەیرێك و نە دەعبایەکی کێوی.

بە هەڵڵا و هەنگەمەیەك لە خەوێ راپەڕی و رای کردە بەر پەنجەرەکە. کۆمەڵێك جووتیار لە هەورێکی تەپوتۆزدا لە ئاناوەرزاوە دەهاتن. حەشیمەتەکە وەك لافاوی کوللە دیوارەکانی بڕی و حەوشەکەی پڕ کرد و لە جموجۆڵ کەوت و بێ دەنگ بوو. چەند ساتێك لە بێدەنگیدا تێپەڕی ئەوجار هەمووان وێکڕا و یەکدەنگ هەرایان کرد:"

"ئەمیر سوڵتان، ئەمیر سوڵتان، ئەمیر سوڵتان!"

جلوبەرگی خوێناوی و عابای کۆبەگیراو و کراس و مێزەر بەدەستەوە و هەر هەمووشی سپی و خوێناوی.

جەماوەرەکە پاڵیان بە دەرگاکەوە نا. پیاوێك بە شمشێرەوە لە پێش هەموانەوە خۆی هەڵدەسووڕاند. شمشێرە رووتەکەی لە گەرووی خۆ رۆدەکرد و کە دەری دەهێنایەوە، بڵێسەی گڕی لە زاری دەردەپەڕی. ئەو پیاوەی خۆی هەڵدەسووڕاند، رووت و قووت بوو.

ترسێکی گەورە دەروێش بەگی داگرتبوو. لە نەکاو تەقە لە تفەنگانەوە هات و تیربارەکان دەسرێژیان کرد. شەش فڕۆکەجێت وێکڕا بەسەر کۆشکەکەدا تێپەڕین و دەرگا و دیوار و پەنجەرەیان هێنایە لەرزین و لەو دەمەدا حەشیمەتەکە خۆی بەعەرزییەوە مەڵاس دا. گەمەی جێتەکان هەتا نیوەڕۆ و ئەو کاتەی یەکێکیان خۆی بە رەوەزەکانی ئاناوەرزا دادا، هەر بەردەوام بوو. کە جێتەکە بەربۆوە، حەشیمەتەکە لە نەکاو بزر بوو. کەسیش نەیزانی چوونە کوێ و چییان لێ هات. جێتەکە لە نێو بڵێسە و گرمەگرمی جارجاری تەقینەوەکاندا لە نێو رەوەزەکانی ئاناوەرزا دەسووتا.

سێ ئەسپ لە ئۆرفەوە، هاتن. هەرسێکیان کوێت بوون. هەر سێکیان نێوچاوانیان بەش (خاڵی سپی) و پەڵەیەکی سپییشیان بە لاقی راستیانەوە بوو. کلك و یاڵیان لە رەنگی شەبەق دەچوو. دەروێش بەگ تاوێك نەیناسینەوە.

ئەمرۆ ترسێکی نامۆ بەربینگی پێ گرتبوو و دڵی زۆر خراپ لێی دەدا. حەپەساو و سەری لێ تێك چووبوو. چاوەڕێی رۆژئاوابوونێ بوو، کەچی نەشیدەزانی دوای رۆژئاوابوونێ چ دەکا.

خۆر کە ئاوا بوو، سواری ئەسپەکەی بوو و هەروا لەسەر خوانی زین مایەوە. نوقمی خەیاڵێکی لێڵ و ئاڵۆز و بێ سنوور بوو.

ئاوەکە شڵەقابوو. چاوە دەرپەڕیوەکانی جەماوەرەکە لە بن ئاوەکەدا بەمۆڵەق وەستابوون و دەتگوت شەپۆل دەدەن. خاکەکە هەڵدەستا و هەڵدەستا و دەنیشتەوە. خاك پشووی دەکێشا. هەناسەی قووڵ. کوللە لە خوارەوە دەهاتن، شەپۆل شەپۆل، رەش رەش، بەری هەتاویان دەگرت. هەر جارێکی هەڵدەستان و دەنیشتنەوە، گژ و گیا و شینکە ئاسەواری لێ نەدەما و لە کێڵگە پان و بەرینەکان، هەر خاکێکی رەش و وشك و رووتەن دەمایەوە.

بای باکووری رۆژهەڵات هەوری کوللەکانی دەشێواند و بڵاوی دەکردن. بایەکە شێتانە هەڵی کردبوو و دارەکانی دەشکاندنەوە و کۆخەکانی کاول دەکرد و گژ و گیا بەرزەکانی لە رەگەوە هەڵدەکەند.

نیوەشەوێ، تۆفانەکە نیشتەوە و دامرکایەوە و وڵات هێمن بۆوە. دەروێش بەگ لە برسان دڵی خاو ببۆوەو لەبوورەوە دەهات. رای کردە چێشتخانەکەیان و نان و پەنیرێکی هاویشتە بەر دڵی. لە پلیکانەکانەوە رای کردە خوارێ و خۆی فڕێدایە سەر ئەسپەکەی و جڵەوی بۆ شل کرد. هەستی دەکرد هەموو شتێك تەواو بووە و لەو دنیا گەورەیەدا بەتەنێ ماوەتەوە. تا رادەیەك دەیزانی مستەفا بەگ چ دەچێژێ، بەڵام ترس لە ناخیدا هێلانەی کردبوو. بۆ ساتێك نەترسا و لەبیرکردنی ترسەکە بەلایەوە بۆشاییەکی تاقەتبڕ بوو کە خۆی لەبەر رانەدەگرت.

هاتە بن چنارەکە. لەوێ، شەوێ لە دەم رووبارەکە گوێی لە زەمزەمەی ئاوەکە هەڵخستبوو. لە سەر پشتی ئەسپەکەی دانیشتبوو و بیری لە تەقەی فیشەکێك دەکردەوە کە لە شوێنێکەوە دەهات. لەگەڵ ئەوەدا کە ئەم رووداوە روون و بەڵگەنەویست بوو، دیسان بڕوای نەدەکرد و لە هەمان کاتدا بە دڵێکی پڕ لە خورپەوە، چاوەڕوان دەبوو. ئاخرییەکەی بێ هیوا دەبوو و دەشڵەژا و بەردەبۆوە تەرکی تاریکی بۆشاییەکەوە. ئەسپەکەی بەرەو کۆشکی مستەفا بەگ تاو دەدا و چاوەڕوانی تەقەی تفەنگ لە پەنجەرەوە و نوقمی ترس و دڵەڕاوکێی ئەو چاوەڕوانییە، شێتانە

بەدەوری کۆشکەکەدا دەخولایەوە و کە ئاخ و ئۆفی لێ دەبڕا و پشووی لەبەردا نەدەما دەگەڕایەوە کۆشکەکەی خۆی. لە جێوبانەکەیدا دەکەوت و چەند سەعاتان چاوەڕێی ئەوە دەبوو خەو بێتە چاوی و لە جێوبانەکەیدا هەر جینگڵی دەدا و تەنیشتاوتەنیشتی دەکرد.

"سوڵتان ئاغا، سوڵتان ئاغا، ئەمیر سوڵتان."

ردێنەکەی لوول و بریقەدار بوو. پەژارەی بێ سنووری تێ شکان و دامای لە چاوەکانیدا... کەڵەگەت بوو و دەتگوت ئەسپی عەرەبییە. کە بە ڕێگەشدا دەڕۆیشت، رەوت و تەقڵەی ئەسپی عەرەبیت وەبیر دەهاتەوە.

دەروێش بەگ لە نەکاو هەموو گیانی پڕ بوو لە شادی و بەختەوەری. ژنەکەی زۆر لەمێژ بوو ئاوای نەدیتبوو. حەزێکی پڕ لە شەهوەت بۆ ژنەکەی لە گیانی گەڕا و بۆ یەکەم جار بەبێ ئەوەی عەشق و کەفوکوڵ و خۆشییەکەی بنیشێتەوە، تا بەیانی لە تەنیشت ژنەکەی خەوت. دەستی بەسەری منداڵەکانیدا هێنا و لەگەڵ هەمووواندا بەگەرمی تاسەبارانە جووڵاوە. ئەوەندە کەیف خۆش بوو، ئەگەر دانی بەخۆیدا نەگرتبا، هەڵدەستا دەکەوتە چەقڵە سەما و هەڵپەڕین. ژنەکەی لێی شارەزا بوو. کە تازە زەماوەندیان کردبوو، هەر بەو جۆش و خرۆشەوە و بە عەشق و کەفوکوڵ و شەهوەتە بێ سنوورەوە دەچووە پێشێ و چەندی پتر جووت دەبوو لەبری بەتاڵبوونەوە پڕتر دەبووەوە و پڕ کەفوکوڵتر دەبوو و هەر دووکیان لەو پەڕی تاسەباری و هەژاوی و شەهوەتدا لەیەکتریدا دەتوانەوە و تێکەڵاوی یەکتری دەبوون.

بە کەیفخۆشییەوە سواری ئەسپەکەی دەبوو و رکێفکوت بەرەو کۆشکەکەی ئاق یۆللی وەك با دەفڕی. یەك پشوو بەخۆی دەگوت:"باشە ئەوە تا کەی نابڕێتەوە؟ کە گەیشتە حەوشەی کۆشکەکەی مستەفا بەگ، دابەزی و ئەسپەکەی لە سینگێك بەستەوە و دەمانچەکەی هەڵکێشا و بە پلیکانەکاندا لەسەر خۆ سەرکەوت. لەو کاتەدا نەنە سەنەم دیتی و زمانی شکا و دەست و پێی تێکەڵ هاتن. کە دەروێش بەگ گەیشتە دیوەخانێ، نەنە سەنەم زمانی پژا:

"مەیکوژە بەگ. ئەو داماوە بەجێ و بان کەوتووە، نە دەم لە هیچ دەدا و نە هیچ دەخواتەوە. لە جێوبانەکەی خۆشی نایەتە دەرێ. بەتاقی تەنێ بەجێیان هێشتووە. هەمووان وازیان لێ هێناوە و رۆیشتوون. یاخوا لەسەرت گەڕێم بەگ. نەچی لێی بدەی."

دەروێش بەگ بە دیوەخانەکەدا رۆیشت و لە حاڵێکدا بۆن و بەرامەی گەرم و خەستی رەیحانەکەی هەڵدەمیشت، بە تەنیشت رەیحانە و مێخەکەکەدا تێپەڕی و لە ژوورکەی مستەفا بەگ نزیك بۆوە. پەنجەی لەسەر پەلەپیتکەەی و بەترس و پارێزەوە دەرگاکەی کردەوە. مستەفا بەگ لە

سەر قەرەوێڵەکەی دەتگوت خەوی لێ کەوتووە. لەوانەشە پێش وەژوورکەوتنەکەی دەروێش بەگ چاوی لێك نەنابێ و هەر لەگەڵ چاوی بەو کەوتبێ لێکی نابێتن. دەروێش بەگ وای زانی.

لێفەیەکی شینی گوڵداری بەسەرخۆی دادابوو. دەستەکانی زەرد و بێ گیان لە دەرێ بوون و کەوتبوونە سەر لێفەکەوە.

دەستی دەروێش لەرزین. دەمانچەکەی دەستی، ڕێك بەرەو تەختی نێوچاوانی مستەفا بەگ ڕاگرتبوو. نێوانی هەردوو برۆکانی.

دەموچاوە ڕەنگ پەڕیوەکەی مستەفا بەگ کە ئەوەندە بزڕکابوو کەسك دەچۆوە، درێژ ببۆوە. گنجی قووڵ قووڵ کەوتبوونە سەر تەوێڵی و برۆ و مژۆڵەکانی داچۆڕابوون. لە سەر مێزێکی چێوی، سندووقێکی سەدەف نیشان کە جێ جێ مۆرکە خواردبووی و سەدەفەکان هێشتاش فڕینی چەند باڵندەیەکیان دەردەخست، بەدی دەکرا. چەند وێنەیەکی کاڵ بۆوە لە چوارچێوەی شڕ و شەوێق و لەگرێژەنەچووی مۆرکەلێدراودا بەدیوارەکەوە هەڵواسراابوون. هەموو وێنەکان ترسێك لە نیگایاندا ئاوسابوو. برۆیان تێك نابوو و هەر دەتگوت هەموو پیاوەتییەکەی خۆیانیان لە گۆشەی سمێڵە چەخماغییەکانیاندا کۆ کردووەتەوە.

بەڕەیەکەی تورکمانیی چڵکن و شڕ و دڕاویان لە ژوورەکەدا ڕاخستبوو. پۆل پۆل سووتووی جگەرە لە سەر بەڕەکە کەوتبوو. تەپڵەکە چێودانەکەی کە لە تایەی ترۆمبێل دەچوو و پڕ بوو لە قونچکە جگەرە، لەسەر مێزەکە دیار بوو. سەر مێزەکەش پڕ بوو لە قونچکە جگەرە. نینۆکی پەنجە درێژەکانی کە دووکەڵی جگەرە زەردی هەڵگێڕابوون، سپی سپی، وەك گەچی سپییان لێ هاتبوو.

دەروێش بەگ بیری کردەوە کە تەنیا نینۆکی مردووان ئاوا درێژ دەبنەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی بنیادەم لە پێشدا نینۆکی و دواتر دەستەکانی دەمرن. ئەو کابرایە مردووە. دەستی سەر دەمانچەکەی شۆڕ بوونەوە. ئەژنۆی نوشتانەوە. خۆی بەسەر پێیانەوە پێ ڕانەگیرا. لەو کورسییە دارگوێزەی نیوەی نێوەڕاستەکەی نەمابوو، چووە پێشێ و لەسەر دانیشت. نەیدەتوانی چاو لە مستەفا بەگ هەڵگرێ.

هەتا نیوەڕۆ بەبێ ئەوەی چاوی بترووکێنێ، سەیری مستەفا بەگی کرد و لە گنجەکانی دەموچاوی ورد بۆوە. مستەفا بەگ بەحاستەم هەناسەی دەکێشا و دەستی جار نەجارێك بەرەو لای دەمانچەکەی دەچوو و تۆپەکەی پڕ و بەتاڵ دەکردەوە. هەر جارێکی تۆپەکەی پڕ دەبوو لە فیشەك، دەروێش لەجێی خۆی دەردەپەڕی و سێرەی لە تەختی ئەو نێوچاوانە دەگرت کە

تەنانەت بۆ جارێکیش چاوی نەترووکاندبوو. ئەوجار تۆپەی دەمانچەکەی دەدی کە بەخێراییەوە دەخولایەوە و فیشەکەکانی دەڕژانەوە سەر لێفەکەی.

دەستەکانی مردووەکە لە کاتی پڕ و بەتاڵکردنەوەی دەمانچەکەدا گیانیان وەبەر دەهاتەوە و هەر دەکەوتنەوە سەر لێفەکە گیانیان لەبەردا نەدەما. نەنە سەنەم جار نەجارێ لە کەلێنی دەرگاوە سەرێکی دەکێشایە ژوورێ. دەروێش بەگ دەمانچە بەدەستەوە و دەست لەسەر پەلەپیتکە و ئەژنۆی پێکەوە نووساندبوون و بە کونجکۆڵییەوە چاوی لە مستەفا بەگ بڕیبوو و بەزەییشی پێیدا دەهاتەوە.

لە سێ پەنجەرەی ژوورەکەوە لافاوی هەتاو دەهاتە ژوورێ. هەتاوەکە دەمێك بوو کەوتبووە سەر جێوبانەکەی مستەفا بەگ. مستەفا بەگ ئارەقەی شین و مۆری دەرکردبوو. دڵۆپەی ئارەقەی سەر نێوچاوان و دەست و لامل و نێو تاڵە درێژ و ژاکاوەکانی ردێنەکەی بریقەیان دەدایەوە.

دەروێش بەگ لەپڕ لە جێی خۆی هەستا و بۆ دوایین جار سەیرێکی مردووە ئارەق کردووەکەی کرد و گەڕایەوە و لە ژوورەکە وەدەر کەوت و وەك سەرخۆشان کەوتە رێ و لە حاڵێکدا ئەژنۆی دەنووشتانەوە، لە پلیکانەکانەوە چووە خوارێ.

ئەسپەکەی کێشایە تەنیشت بەردەسوارەکە و بەزەحمەت لێی سوار بوو. سەری کاس بوو. نە گوێی لە هیچ دەبوو و نە هەستی بە هیچ دەکرد.

وەك تەندوور داییسا.

ئەسپەکەی ئەوی بردە بن دارەچنارەکەوە لەوێ چەقی. بەبێ ئەوەی خۆی ویستبێتی، لە ئەسپەکەی دابەزی و بە چەکمەوە وەنێو ئاوەکە کەوت. چەند شڵپ ئاوی بە دەموچاوی داکرد و بەبێ ئەوەی وشکی بکاتەوە بە زەحمەت سوار بۆوە. ئەمجار بە ویستی خۆی سەری ئەسپەکەی بەرەو کۆشکەکەی مستەفا بەگ وەرسووڕاندەوە. دەمانچەکەی بە دەستی راستییەوە بوو و پەنجەی لەسەر پەلەپیتکە.

بارانە زەردەکە نەرم نەرم دایکرد، بە لێزمە و بێ دەنگ، هەر دەتگوت ناشبارێ. زەرد زەرد و وەك پەردەی تیشك کە هەر دەهات و خەستتر دەبۆوە و نارنجی دەچۆوە و تارتر دەبوو و قورس قورس لەسەر دەشتەکە دەنیشت.

"ئەو بنیادەمە باشانە، لێی سواری ئەو ئەسپە جوانانە بوون و
سەری خۆیان هەڵگرت و رۆیشتن. هەڵۆکانیش، هەڵۆکانیش..."

هەتا مێشکی ئیسقانەکانی تەڕ ببوو. لە تاریکایی شەوەکەدا و لە نێوەڕاستی حەوشەکەی مستەفا بەگ وەك خەدەنگ قیت چەقیبوو... لە حاڵێکدا گۆرانی و سەردولکە کۆن و لەمێژینەکان لە گوێیدا دەزرینگانەوە... دەمانچە بە دەست و قامك بە پەلەپیتکەوە.

"ئەو بنیادەمە باشانە... هەڵۆکانیش..."

## ٥٣

هەرای کرد:"ئەسپەکەی بنگێون."

دەموچاوی درێژ ببۆوە و چاوەکانی بەقوولڵدا چوبوون و شەویلگەی دەرپەڕیبوون.

پێنج تفەنگ لە پێنج شوێنەوە تەقەیان کرد و پێنج فیشەك ئەسپە کوێتەکەیان پێکا.

دەموچاوی درێژ ببۆوە و لە حاڵێکدا سەیری ئاوێنەکەی دەکرد گوتی:"دەست راگرن."

لە ئاوێنەکەدا دەموچاوی دەدی و بەزەیی بە خۆی و زراوچوویی و تەنیایی و وەگیانهاتوویەکەی و تەواوبوونەکەی دادەهات. ئاوێنەکەی فڕێ دایە سەر عەرزەکە و بە هەنگاوی بەرز بەرەو ئەسپەکە، ــ کە لەسەر عەرزەکە لینگەفرتەی بوو ــ رۆیشت. بارانەکە دایکرد و پەردەیەکی رەشی خستە نێوان ئەو و ئەسپەکەوە. لە دوورەوە هەورەتریشقەیەك گرماندی و برووسکەیەکی دا. تاریکاییەکە بەهەموو خەستی و قورسایی خۆیەوە بەسەر هەموو وڵاتدا هات. لە تاریکاییەکەدا هەتا قورڕقورڕۆچکەی چووە نێو زەلکاوێکەوە. زەلکاوەکە قووتی دەدا. کاتێ کە ئیتر ئاو و قوڕەکە هەڵیاندەلووشی، بارانە بەخوڕەمەکە خۆشی کردەوە و تاریکاییەکە نەما و تاوێکی خۆش کەوت. هەر چۆنێك بوو خۆی لە زۆنگاوەکە کێشایە دەرەوە. ئەسپە کوێتە هێشتا گیانی دەدا. بەرەو لای غاری دا. لەولاترەوە، ئەویتر، ئەژنۆی لەسەر عەرزی دادابوو و دەتگوت نوێژێ دەکا، نێوچاوانی لە عەرزەکە هەڵدەسوی و سەری هەڵدێنایەوە و دیسان تەوێڵی لەسەر عەرزەکە دادەنایەوە. چوو و لە ژوور سەری راوەستا. ئەوی دیکە یەك پشوو نێوچاوانی لەگەڵ خاکەکە ئاشنا دەکرد و سەری هەڵدێنایەوە. جاری ئاخری کە سەری هەڵێنایەوە، لەنەکاو ئەوی دی. هەر دیتی، بەرەو ئاقچاساز تێی قووچاند. ئەویتر هەروا لەتەنیشت ئەو ئەسپە بەجێ ما کە گیانی دەدا. تاوێك دواتر وەخۆ هاتەوە و سەری لەدووی نا. بەڵام ئەویتر رۆیشتبوو.

لەو نێوەدا سوارەکان گەیشتنێ و ئەو پیاوەیان گەمارۆ دا کە رای دەکرد و کەمەندیان بۆ هاویشت. کەمەندەکانیان پەیتا پەیتا دەکەوتە ئەستۆی و هەر کەمەندێکی دەکەوتە ئەستۆی و دەکێشرا، دەمارەکانی نێوچاوانی هێندەی قامکێك هەڵدەستان و چاوە گۆمە خوێنەکانی لە ژێڵڵا دەهاتن.

سوارەکان کابرای مل لە نێو کەمەندگیراویان بەسەر عەرزەکەدا بەملاولادا دەکێشا. هەر لینگەی چەکمەکانی کەوتبوونە لایەك. چاکەتەکەی دڕابوو و تیتۆڵ تیتۆڵ بوو و لەبەری داکەنرا. زمانی دەرکێشا. کەمەندەکانیان کە شل دەکردەوە، نەیدەتوانی بەسەر پێیانەوە راوەستێ. لەسەر عەرزەکە کەوتبوو و هانکەهانکی بوو.

بەردەکان لە قەدی شاخەکەوە خلۆر بوونەوە. گابەردە گەورەکان بە گرمەگرمی سامناکی تێك شکان بەرەو لایان خلۆر بوونەوە. سوارەکان پیاوەکەیان بەجێ هێشت و رایان کرد ودوور کەوتنەوە و بەردەکان بە دەوروپشتی کابرای لەپێ کەوتوودا خلۆر دەبوونەوە. بە راکردن بە نێو بەردە خلۆربۆوەکاندا، خۆی گەیاندێ و لەکۆڵی کرد و بە غاردان لە مەرگ نەجاتی دا. لە پەناگەکە، هەروا کە تفی قووت دەداوە، گوتی:"ناهێڵم بمری. ئەگەر ویستبایەم تا ئێستا سەد جارم کوشتبووی. ئەتۆ نابێ بمری، تۆ دەبێ زەجر و ئازار بچێژی. برسیتە؟ تینووتە؟ بریندار بووی؟..."

سفرەیەك راخرا، سوێسکەی برژاو، پلاو، مسات، هەنگوین، دەڵەمە... گوتی:"دەبخۆ. بخۆ و گیانێکت وەبەر بێتەوە کارم پێتە."

کابرا لەسەر سفرەکە دانیشت. خواردی. پەنجەکانی لستنەوە. خواردی و پنچکی لەسەر سفرەکە نەهێشت.

"جا ئەوجار وەرە."

رستەیەکی لە ملی خست. دەستەکانی لە پشتەوە شەتەك دا. ئەو لە پێشەوە و ئەویتر لە پشتەوە هاتنەوە کۆشك. کابرای بە شەقان خستە ژێرەزەمینە تاریکەکەی کۆشکەوە و دەرگاکەی لەسەر گاڵە دا. ئەو چاڵە رەشە کە وادیار بوو بچووکترین درزی تێدا نییە هەوای لێ بچتە دەرێ و پێیدا بێتە ژوورێ، لە مێژبوو بۆ ئەو ئامادە کرابوو. بۆگەن و هەڕنەهووتەکەی لووتی دەخوراند.

"لەو چاڵە رەشەدا دەڕزێی. ئێرە گۆڕەکەت دەبێ. دەی با بزانین چەند رۆژان خۆ رادەگری."

کابرا وەك کەلاکێك لە سێ گۆشەی چاڵەرەشەکەدا کەوت. بەیانیی دووەمین رۆژ هات و بە دەنگێکی کە ئاوازێکی شادیی تێدابوو پرسیی:"چۆن ی ی ی؟ ماوی؟ خواردنەکەت باشە؟"

خواردنەکەی گۆشتی بۆگەن و شیری ترشاو بوو. کەلاکە مەڕێکی باکردوو و کرمێ و کووپەیەك شیری ترشاوی لێ بوو.

دەنگێك نەهات.

"مردووی کافر؟ نامری، ئەتۆ نامری، نابێ بمری."

حەوتووەك دواتر نووزانەوەیەك هات. دەرگاکەی کردەوە. کە دەرگاکە کرایەوە، سەری لەگێژەوە هات، گێژ بوو. ئەگەر دەستی بە دیوارەکەوە نەگرتبا، بۆگەنەکە، لەکاری دەخست. خۆی بە تاریکییەکەدا کرد و کابرای کەوتووی گرت و بە راکێش راکێش بردییە بن سێبەری دارچنارەکە. بای کردبوو و دوو ئەوەندەی بنیادەمێکی ئاسایی لێ هاتبۆوە. جلوبەرگەکەی تیتۆڵ تیتۆڵ ببوو. دەسبەجێ رووتی کردەوە و چەند سەتڵێك ئاوی بەسەردا کرد.

مردووەکە وردە وردە وەخۆ هاتەوە. دیسان چاوی هەڵێنایەوە.

"ئەی لەوە باشتر؟ چ لەوە باشتر، کافر... لەوە باشتر هەر نابێ... ئەشکەنجەی بێ هەوا... باشترین جۆری ئەشکەنجە..."

دەستەکانی چەند جاران بە ئاو و سابوون شوشت. کابرا بەحاستەم هەناسەی دەکێشا... تاریکاییەکە هەستا. تاریکاییەکەی پڕ کرد لە ناڵین و کڕووزانەوە. تاریکاییەکە خۆی رانەگرت. لە ناخی تاریکییەکەوە زرینگەزرینگی زنجیر دەهات...

کە رووناك بۆوە، کافرەی دیت بەپێوە راوەستابوو. زنجیری دڕکاویی ئەستوور ئەستووری لە ئەستۆی و دەست و نێوقەد و قولاپەی پێیدا بوو. وەك شێتان ئامبازی بوو، ئاڵقەکەی گەردەنی گرت و کێشایە نێو چاڵێکی پڕ لە وردەشووشەوە. بەسەریدا نەڕاندی:"بڕۆ."

کافرە هەنگاوی نەنا. ئەویش نەڕاندی:"کەواتە بگرە."

پاڵی پێوە نا بۆ نێو چاڵە پڕ لە وردە شووشەکە. کافرە لەگەڵ هەر تەکانێکیدا بە نێو وردەشووشەکاندا پتر رۆدەچوو و خوێن لە هەموو زامەکانی گیانییەوە فیچقەی دەکرد. جار بە جار پتر چووە خوارێ و هەر سەری لەدەرێ مایەوەمە، سەرە خوێناوییەکە. خوێنی سەر وردە شووشەکان کەفی کرد. تیریێژێکی بەهێز هەستا و سەری وردەشووشەکان هەر هەمووی لە لافاوێکی تیشکی چاوکوێرکەردا نوقم بوو.

متەقی لێوە نەدەهات. هەر دەستی درێژ دەکرد. قوڕەکە، کە گەیشتبووە بن چەناگەی، پتر قووتی دەدا. چەناگە و لێو و لووتی و هەموو سەری چووە خوارێ و هەر دەستی لەدەرەوە مایەوە. دەستی گرت و کێشایەوە دەرێ.

شاد بوو. شاگەشکە ببوو.

"کافر."

دەمانچەکەی بەنێوچاوانییەوە نا. پەنجەی لەسەر پەلەپیتکە بوو. ئاسنەکە سارد بوو. ئارەقەی کرد. ئارەقە بە گیانە رووتەکەیدا جۆگەلەی بەست. وشك بۆوە. وشك و برینگ. زەرد هەڵگەڕا، زەرد زەرد. ئەوجار سەوز داگەڕا. لە سەوزییەوە بۆ زەردی و لە زەردییەوە مۆر هەڵگەڕا. رۆژێکیان هەتا تەنگەی نوێژی شێوان لوولەی دەمانچەکەی بەنێوچاوانییەوە راوەستا. ئاخرییەکە لەپێ کەوت و بەلادا هات.

گڵۆپی گەورەی پێنج سەد ڤۆڵتی داگیرسان. دە، پانزە، بیست، سەد دانە گڵۆپی پێنج سەدڤۆڵتی.

"برۆ، برۆ ژووریٚ... گەرمە؟ برۆ، دەبرژێی، برۆ ژووریٚ..."

چاوەکانی بەشەوارە کەوتن، کوێر بوو. دەستی لە بە بەر چاوییەوە گرت. بە دەوری خۆیدا خولایەوە و خولایەوە و چەندی پتر دەخولایەوە، خێراتر دەخولایەوە. سەری لەنێو دەستەکانیدا بەملاولادا دەهات. کەوت. لە هێلانەی نوورەکەوە بۆنی گۆشتی سووتاو دەهات. نوورەکان، دیوارەکان، گڵۆپ و بۆنە تیژەکان هەر هەموو تێکەڵاو ببوون و دووکەڵاوی...

رووناکی لەبەر یەکی هەڵدەدڕیٚ... کانییەك قوڵتەقوڵت هەڵدەقوڵیٚ...

"بخۆوە کافر، پێویستیم پێتە."

پاسارییەك بەفڕکە لە لکێکەوە دەفڕێتە سەر ئەویتر. ئەو چۆلەکەیەی لە سەر لێواری بەری چەپی پەنجەرەیەك هەڵنیشتووە دەبیٚ میٚ بێت، کە ئاوا بە کەفوکوڵەوە دەجیکێنیٚ.

دەمانچەکەی پڕ و بەتاڵ دەبێتەوە.

رووتی بکەنەوە، رووتی کەنەوە.... رووتی کەنەوە منداڵەکان. چەند ڤۆڵتە؟ خۆ نایکوژیٚ؟... لە گونەکانی ببەستن، لەوێی ببەستن. کلیلەکە لیٚ بدەن با بلەرزیٚ. دیسان بۆنی گۆشتی سووتاو... هەڵدەبەزیٚ... گیانی گڕ گڕ داییسیٚ. با بلەرزیٚ. کارەباکەی لە گۆشتەکانی، لە زمانی و لە چاوەکانی بدەن. با بلەرزیٚ؟ وەك سەگ با بلەرزیٚ.

ئاسمان ساو و سامالٚ بۆوە. روون و بیٚ پەڵە. چوکووراوا پڕ پڕ لە گوڵ.

لێرە و لەویٚ قاسپەی سوێسکە دیٚ. حاسڵات هەڵدەگیرێنەوە و دروێنە دەکریٚ. دەشتەکە پڕە لە تەراکتۆر و کامیۆن و گیادروو(دەڕاسە) و خەرمانکوت و لاوێر و بۆنی بەنزین و گازاییل.

کرێکار بە ملی درێژبۆوە و شەلاڵی ئارەقە بە داوێنە پڕ وردکەبەردەکەوە، دەستەوانە لە دەست خەریکی دەسکەنەن. کارخانەیەك لە ئەدەنە بە سەدان کرێکاری ڕۆناوییەوە، لە نێو بڵێسەکاندا کار دەکا. هەوای کارخانەکە وەك بەرد سوورەوە بووە و پیاو دەخنکێنێ. بۆنی بەنزین لە قوڵکە و شیو و دۆڵەکان نیشتووە.

"وەرە با بزانم م م م م، براله وەەرە ەەەە کافر... چاوەڕێت بووم."

کافرە جارێکی دیکە تێ کەوتووە. هیچ چاوەڕوانی ئەوە نەبوو.

نەڕاندی:"رووت بەوە."

دەسبەجێ رووت بۆوە.

تەنەکەیەك بەنزینی هەڵگرت و گوتی:"وەرە ئێرە. لێرە دانیشە. ئەلێرە. زوو بە."

هەر کافرە دانیشت، بەنزینەکەی بەسەردا کرد و شقارتەکەی لێدا و کافرە لە نێو بڵێسەی گڕدا ون بوو. کافر دەستی کرد بە راکردن. وا دەڕۆیشت فیشەك نەیدەگەیشتێ. بە گڕەگڕ و هاوار و نەڕاندن رای کرد هەتا خۆی گەیاندە زۆنگاوەکە و خۆی تێ خست. زۆنگاوەکە هەتا بناری ئاناوەرزا بوو بە بڵێسە. ئاو و قوڕ و لیتاوی زۆنگاوەکە وەك بەنزین ئاگری گرت. لە قووڵایی زۆنگاوەکە هاوای "کۆمەگ، کۆمەگ" هەستا. قووڵایی ئاوەکە دەسووتا. کافرە وەك رەژوو داییسا و دادەمرد. نەڕاندنەکەشی بای کردبوو و بڵێسەیەکی لێ هەڵدەستا.

ئاوەکە دەسووتا. ئاوەکە یەکپارچە ببوە گڕ. ئاوەکە بای کردبوو. ئاگرەکە بای کردبوو. هەموو شتێك ئاوسابوو و بۆش ببوو. ئەوەندە سووك ببو بایەك دەیتوانی هەموو شتێك لەگەڵ خۆی رادا. هەستێك لەگۆڕێ نەبوو... هیچ شتێك نەبوو... ئاوەکە ببووە گڕ... ئەو چاوە گڕاوییانەی لەو بڵێسانەدا دەدرەوشانەوە....

کەوتبووە بن ئاوەکە و زاری وەك ماسییەکی سەر وشکانی دەکرایەوە و دەبەسترایەوە.

لەپڕ هاتەوە سەر ئاوەکە. هاتەوە وشکایی و دیسان گڕی تێبەربوو. بەگڕەکەوە و بەهەموو تین و توانایەوە بەرەو ئاوەکە رای کرد. لە پشت خۆیەوە کێڵگە و پووش و پەڵاشەکانی ئاگر دا. ئاوەکەش ئاوری لێ هەڵدەستا. خۆی لەوێ لادا و خۆی بەنێو خۆڵ و خاکەکەدا کرد و خۆی گەوزاند و تلایەوە.

جەستە سووتاوەکەی بای کرد.

"راوەستە."

حەمە عەلی! حەمە عەلی بە نێو لمەکەدا دەڕۆیشت. کە ئاوڕی دەدایەوە کافرەکە بوو و کە رووی وەردەگێڕایەوە دەبۆوە بە حەمە عەلی.

پێی لە رکێفاندا گیر ببوو و سەری لە سەر عەرزەکە دەکشا و ئەسپەکە وەك شێتان لە بەیانییەوە تا شەوێ بە نێو دەەوەن و رەوەز و خەرەند و دڕووەڵانەکاندا رای کرد. رووت و قووت، تەنیا گۆرەوییە سەوزە پیاوانەکەی و لینگە کەوشێکی ڤێرنیی لە لاقی چەپیدا مابوو کە لە رکێفەکە گیر ببوو. دەموچاوی شەڵاڵی خوێن و قوڕ ببوو و هیچ کوێی نەدەبینرا.

تەراکتۆرەکە بەرەو پێش دەچێ. پەڵەیەك خوێن و قوڕ، دەموچاوی حەمە عەلی. تۆپ "تایە" گەورەکانی تەراکتۆرەکە بەسەریدا دەڕۆوات. سەری حەمە عەلی دەپلیشێتەوە.

"بڕۆ حەمە عەلی، بڕۆۆۆ."

لەسەر کورسییە گوێزە شەق و لەقە مۆرکە خواردووەکە، کە نیوەی نەخش و نیگارە هەڵکۆڵراوەکەی پشتەوەشی سواوە و نەماوە، لە تەنیشت رەیحانەکەوە، پاڵی بە ئەستوونەکەوە داوە و چاوەڕوانە.

ئێستا لە سایەی سەری، ئێستا لە سایەی سەری... "با" ردێنە سپییەکەی رادەژێنێ و رانە رووت و لەرزۆکەکانی، دەخولێتەوە و دەخولێتەوە... لە قوڕ و چلپاوەکەدا نوقم بووە. رۆدەچێ و بەقوڕێدا دەچێتە خوارێ و لەسەر ئاوەکەوە هەر کۆمەڵێك جەغزی پەیتاپەیتا بەدوای یەکدا دروست دەبن...

"وەرە کافر."

دەستی گرت و کێشای و لە نێوشانییەوە هەڵیکەند.؟ دەستی کافرەکەی هەتا شەوێ بە دەستییەوە بوو. ئەوەندە تووڕەبوو تاقەتی نەما و بەلادا هات و کەوت.... دەستە خوێناوییەکە لە تەنیشتی بەربۆوە. هێشتا خوێن لەبەر دەستەکە دەڕۆیی.

## ٥٤

جارچییەکەیان هێنایە حەوشەی بەندیخانە و لە خوار گابەردەکە فڕێیان دا. کابرای وردیلەی سەر و گوێ خوێناوی و قوڕاوی کە دەستیان لێ بەردابوو، گرمۆڵە ببوو و بێ جووڵە کەوتبوو.

هەرچوار دەوری زیندانەکە ژووری بەندییەکان بوو. دەرگای ژوورەکان کرابوونەوە و بۆنی هەڕنەهووت و بۆخاوك و شێداری و ئارەقە و کەڕوو تێکەڵ دەبوونەوە و لێیانەوە دەهاتنە دەرێ. بۆنێکی قورس لە دەرگا و پەنجەرەکانەوە دەڕژایە حەوشە و لەوێ دەنیشت.

دوای تاوێك بارانەکە دایکرد. بەندییەکان لەبەر دەرگاکان کۆ بوونەوە. بێدەنگ و حەپەساو سەیری کابرا وردیلە و گرمۆڵەبووەکەی تەنیشت بەردە بنەوشەکەی چەقی حەوشەکەیان دەکرد. تارمایی جارچییەکە لە تەنیشت بەردەکە لە خەمباریی تەیرێکی مردوو دەچوو.

پۆلە تەیرێك لە لای راستەوە، لەگەڵ شەپۆلی بۆرانەکە هاتن و بەخێراییەوە لووری زەوی بوون و گورج و گۆڵ لە سەر سەری جارچییەوە هەستانەوە. هەر دەتگوت پۆلە تیرێکن و لە کەوانێ دەرچوون. هەوا کە لەبەر بارانەکە رەش و تاریك داگەڕابوو، لەگەڵ خۆشکردنەوەی بارانەکە، رووناکی کردەوە. بن بەردەکە، هەر ئەو شوێنەی جارچییەکە لێی کەوتبوو، پڕ بوو لە ئاو و گۆمیلکە لێرەو لەوێ وەك ئاوێنە بریقەیان دایەوە.

وسوو خۆی بە بارانەکە دا کرد. داهاتەوە و دەیستی جارچییەکەی گرتە نێو دەستەکانییەوە. دەستی جارچییەکە گەرم بوو. وسوو رووی کردە بەندییەکان و گۆڕاندی:

"وەرن کاکە، وەرنە ئێرە کاکە."

ئیتر هەموو بەندییەکان وێکڕا و بەیەك دەنگ لە دەرگاکانەوە رژانە حەوشەوە و دەوری گابەردەکەیان گرت. وسوو گوتی:

"زیندووە کاکە، نەمردووە."

حەسەن جنۆکە داهاتەوە و سەرە سپییەکەی هێنایە خوارەوە و بە سینگی کابرای گرمۆڵەوەبووی نووساند. ئەژنۆی لەسەر قوڕەکە، ماوەیەك هەروا مایەوە و ئاخریی سەری هەڵێنا و یەك بەی یەك سەیری بەندییەکانی کرد کە پێکەوە قسەیان دەکرد. هەموو بێدەنگ بوون. حەسەن جنۆکە گوتی:"نەمردووە. دڵی وەك ماتۆڕ کار دەکات."

زنجیرەکانی قورس بوون. لە ئەستۆ و دەستەکانیدا...

"باشە بۆچی ئەو داماوەیان وەك رۆستەمی زاڵ لە کۆت و زنجیر کردووە؟"

دەنگێك لە نێو خەڵکەکەوە هەستا:"جاڕچی ئەو زنجیرانە دەپسێنێ. لەتوکوتیان دەکات."

دەنگێکی دیکەش هات:"کۆت و زنجیر، خشڵێ بەندکراون."

دەنگێکی دیکە:"شەرم و شوورەیی نییە شێر لە کۆت و بەنددا بێت."

هەموو وێکڕا پێکەنین.

وسوو باوەشی بە جاڕچییەکەدا کرد و بردییە ژوورەکەی ئەوسەرەوە.

حەسەن جنۆکە گوتی:"تازە ناژیێ. هیوام پێی نەماوە بژیێ. قۆرت بۆغا بێ و نەبێ جەندەرمەی لێ تین داوە، بۆیە ئاوا لە پەل و پۆیان خستووە."

جاڕچی سێ جاران چاوی هەڵێنا و لێکی نانەوە.

زیندانی دڵیان خۆش بوو و دە پانزە کەسێك وێکڕا گوتیان:"نامرێ..."

جاڕچی کەوتە وڕێنەکردن:"ئەمن کوشتم..."

سەرە خوێناوییەکەی رادەژاند و دەیگوت:"

"مستەفام، براکەمم کوشت. بۆۆ ۆۆچی؟ بۆ ۆ ۆ ... بۆۆ ۆ ۆ ۆ یە کە ی ... ناڵێم بۆ.... ئەمن کوشتم. تەرمەکەی لەسەر سندانەکە... تەرمەکەی... تەرمەکەی لە نێو کوورەکەیدا... لە نێو پشکۆکان... تەرمەکەی لە نێو ئاشەکە...."

وسوو:"فەرهولوو چایەکە لێ بنێ."

"هەی راوەستاو بێ فەرهولوو. بە پیر و بە پێغەمبەران پیاوێکی دیکەت لە گوێن نییە لەو چوکووراوایەدا، فەرهو، فەرهولوو."

چاویان بە دەمی جاڕچییەکەوە کرد. جاڕچییەکە سێ جاری دیکە چاوەکانی کردنەوە و لێکی نانەوە.

کە سێهەم کووپی خواردەوە، سەری بە زەحمەت هەڵێنا و لە چوارەمین کووپدا بزەیەکی بزرکاوی لە لێوەکانی نیشت. ئەوجار چاوی هەڵێنا و نیگایەکی سەرسووڕماوانەی لە

دەوروپشتی خۆی کرد. دەتگوت بە نیگا دەپرسێ ئەمن لە کوێم؟ چیم لێ هاتووە؟ چ بەڵایەکیان بەسەرم هێناوە؟ چاوی لەگەڵ هەر نیگایەکدا زەقتر دەبۆوە و سەرسووڕمانەکەی پتر. ئەوجار چاوەکانی گەڕان گەڕان تا لەسەر پیرەپیاوێکی ریش چەرموو کە لە گۆشەیەکەوە راوەستابوو، گیرسانەوە. چەند ساتێك بەبێدەنگی تێپەڕی و لە نەکاو هاواری کرد:"ئەمن کوشتم. کوشتم."

ئەوجار بە هەموو تین و هێزی خۆی دەرپەڕی و خۆی بە عەرزەکەدا دا و بە کڕووزانەوە و لالانەوەوە گوتی:"ئەمن کوشتم، کوشتم...."

ئیتر تا زاری لەگۆ نەچوو و دەنگی نەبڕا، هەر گوتی و راواندی.

شەوەکە زرەزری زنجیری لێوە دەهات و لەگەڵ خرم و هۆڕی بارانەکە تێکەڵاو دەبوو. ئاسمان لە دوور دوور و لە پشت چیا دوورەکانەوە دەینەڕاند و چیاکانی دەلەرزاند. لاقەکانی جارچییان لە خوێاوك گرت. سەر و گیانیان بۆ خاوێن کردەوە و مەڵحەمیان لەسەر شووخاڵ و برینە زاردایچڕیوەکەی کووڕایی پشتی دانا و خواردنیان دایە. وەك کەسێکی چل رۆژان برسێتیی کێشابێ، خواردنەکەی کردە دوو قەپووچکە و بە دەست و پێ و کووڕاییەکەی پشتی و بەهەموو گیانی...

جارچی مانگێکی رەبەق چەقوچۆی گرت و لە تەندووری تادا هەڵچۆقی و پتر تێك شکا. کەس بیری لەوە نەکردەوە کۆت و زنجیرەکەی لە ئەستۆ و دەستی بکاتەوە و پێشانی دوکتۆری بدات. جارچی لەبەر ئەوەی خوێن دەمیزت، بەندییەکان چەند جاران چوونە لای وەردییان (زیندانەوان)ـەکە ، بەڵام بێ سوود بوو. ئیتر لە ئێسك و پرووسك بەولاوە شتێکی وای لێ نەمابۆوەو دەموچاوی رۆژ بە رۆژ درێژتر و بچووکتر و باریکتر دەبۆوە و چاوەکانی پتر بە قووڵدا دەچوون. ددانە سپییەکانیشی هەر دەهاتن و درێژتر دەبوونەوە. لێوەکانی تەنك بوونەوە و رەش هەڵگەڕان و رەشێکی کاڵەوەبوو، مردوو و مەیلەو سپی.

ژنی جارچییەکە سێ جاران هاتە سەردانی، بەڵام نەیانهێشت چاوی پێی بکەوێ. خواردن و میوە و جگەرە و هێندێ پارەی بۆ هێنابوو و گوتی:"رۆژانی دووشەممە دێمە سەردانی."

ئیتر رۆیشت.

جارچی دەشەلی و دەستی راستەی هیچی پێ نەدەگیرا.

لە بن بەرداشی ئاشەکەوە هەڵدەقوڵی. پشکۆ و پۆلووی لە ئاوە بەقوڵتەقوڵتەکە دەکرد.

"ئەمن کوشتم. دەیکوژمەوە. دیسانیش، جارێکی دیکەش، هەزار جاری دیکەش دەیکوژمەوە. چاك دەبمەوە. چاك چاك."

هەر جارێکی باران دەباری، جارچی خۆی بە حەوشەی زیندانێدا دەکرد. زنجیرە قورسەکان لە دەست و مەچەکیدا... و کۆت لە ملیدا.

رای دەکرد و وەك شێتان هەڵدەبەزی و چەقڵە سەمای دەکرد، هەر دەتگوت بە دەوری ئاگرێکدا دەخولێتەوە. بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە و ئەوەندە دەخولایەوە کە نیوەگیان و نیوەزیندوو و شەلاڵی ئارەقە لە بن بەردەکە دەکەوت و وەزمان دەهات:"ئەمن کوشتم، ئەمن کوشتم. ئەمن..."

ئەوەندەی دەگوت و دەیگوتەوە هەتا لە زمان دەکەوت.

شەوێ چاو چاوی نەدەدی. لە ئاوەکە پەڕییەوە. ئاوە بەخوڕەکە بەسەر سەریدا تێدەپەڕی. دەیزانی ئەوەی بەدواوەیەتی کێیە، دەیزانی کێن. ئەوەیانی دەناسی کە زۆری لێ دوور نەبوو. هەر ئەوەی خەنجەرێکی چەرکەزییانەی بە دەستەوە بوو...

جارچییەکە گوتی:"لە ئاوەکە پەڕیمەوە. کوڕە براڵە وسوو چیی نەمابوو بخنکێم. خوێنی لە دەمی خەنجەرەکەی دەچۆڕا. لەوانەیە واش نەبووبێ. لەوانەشە ترس دایگرتبێتم...

سێ کەس سەریان لە دوو نابووم، دەمتوانی بۆ کوێ رابکەم؟ خۆم بە بن کۆرەگەی ئاشەکەدا کرد، تەنیشت بەرداشەکە. لەوێش دۆزییانمەوە. ئاوەکە وەك شێتان کەفی دەچڕاند و بەرداشەکە دەخولایەوە. لەوێ رام کرد. ئەو دەمانچەیەی دەروێش بەگ پێی دابووم، هەڵمکێشا و حەوت فیشەکم پێوە نان. هەرسێکیان گەوزین و ئەمن دەرچووم."

وسوو گوتی:

"ئەی دوایی؟ دوایی چیی لێ هاتەوە؟ بڵێ لووو."

"ئاسنگەرەکە برای من بوو."

"دەزانم لو."

"ئەوان دەیانویست من بکوژن. حەوت فیشەکم پێوە نان و هەر سێکیان گەوزین."

"دەزانم لو."

دوای ئەوە یەك پشوو باران دای کرد. هەموو وڵات وەسەرئاو کەوت. لافاو زۆر خانووی دەم چۆمەکەی برد."

"دەزانم لوو."

"ئەمن کوشتم. ئاسنگەرەکە من کوشتم، من، من، من..."

ددانە سپییەکانی وسوو بریسکانەوە. ئیتر قسەی نەکرد و قاقای کێشا. پێکەنی و قاقای کێشا.

جارچی تفێکی رۆکرد و بەخێرایی لێی دوور کەوتەوە.

تەپوتۆزێکی سوور، گەرم، ئاگرین و خنکێنەر، هەموو ولاتی داگرت. سەر ئاوەکە مەیی. کا و کۆت و ئاومالَك لەبەر رووناکایی تاوەکە وردە وردە بەسەر ئاوە مەیوەکەدا رۆیشتن.

زرەزری زنجیرەکە زیندانی پڕ کرد و هەمووان گوتیان:"دیسان جارچییەکە شێت بوو."

بەرۆکی حەسەن جنۆکەی گرت و لە بن گوێی راکێشا:

"مەبزوو. لە جێی خۆت مەبزوو حەسەن جنۆکە. بڕوانە حەسەن جنۆکە، ئەمن ئاسنگەرەکەم کوشت."

حەسەن جنۆکە متەقی لێوە نەهات.

"ئاسنگەرەکە من کوشتم."

حەسەن جنۆکە هەر بێدەنگ بوو.

"پێت دەلێم ئەمن ئاسنگەرەکەم کوشت. من..."

جارچی ئەو رۆژە هەتا عەسرێ لە زیندان تووشی هەر کەس بوو، وای پێ گوت:

"بڕوانە برالە، ئاسنگەرەکە من کوشتم. ئاسنگەرەکە برای من بوو. عالەم و ئادەم دەزانن. بۆچی کوشتم؟ ئیتر بەکەس نالێم بۆ."

"تۆ، تۆ، یانی ئەتۆ براکەتت کوشت؟"

"من کوشتم."

حەسەن جنۆکە گوتی:"لە سێدارەت دەدەن. ئەمن باش لە قانوون دەزانم. قانوون لە دارت دەدا."

جارچییەکەش گوتی:"بەلێ بە پەتەوەم دەکەن. بۆخۆم باش دەزانم بە پەتەوەم دەکەن. دەی با بمکوژن. ئەمن کوشتم."

دووکانی ئاسنگەرییەکە دەسووتا. چنارەکەشیان سووتاند. چنارەکە هەتا بەیانی لە نێوەڕاستی شارۆچکەکە سووتا و رووت و قووت و رەش و سووتاو و وشك مایەوە و توێکلَی پێوە نەما، بەلام هەر وا سەر بەرز راوەستا.

"خۆزگە نەتکوشتبا."

"کوشتم."

ئیتر زنجیرەکانی خستە زرەزر. زنجیرەکانی ژەنگیان هێنابوو. جارچییەکە لە بن دیوارەکەوە، لە بن سێبەری دارهەنجیرەکە دانیشت و دەستی کرد بە خاوێنکردنەوەی ژەنگی ئاڵقەی زنجیرەکە. هەموو بەیانیان کە دەرگای ژوورەکانیان دەکرایەوە، زنجیرەکانی ئاڵقە ئاڵقە، بەو داوودەرمان و کەرەستانەی داوای کردبوو بۆی بێنن تیف تیفە و مشتومالْ دەدا و ژەنگی لێ دەگرت... ئاڵقەکانیش رۆژ بە رۆژ بریقەدارتر دەبوونەوە. بەلاّم حوکمدراوەکان کەیفیان بەو کارەی ئەو نەدەهات و زۆر زۆر لەو کارەی دلّمەند بوون. رۆژێکیان وسوو پێشی پێ گرت و بە تەوسەوە گوتی:"درۆزن، درۆزن، باشە ئەتۆش ئینسانی لوو."

ئیدی ددانەکانی لەسەر یەك داگرت و قسەکەی خۆی خواردەوە.

بەدوای ئەودا حوکمدراوەکانی دیکەش هاتن. دەهاتنە ژوور سەری و تەوس و پلاریان پێدادەدا."درۆزن."

ئیدی وەشوێن کاری خۆیان دەکەوتنەوە. جارچی گوێی پێیان نەدەبزووت و هەروا وەك هیچ شتێك نەقەومابێ، خەریکی مشتومالّی ئاڵقەی زنجیرەکەی دەبۆوە.

رۆژێکیان بەیانی بوو بە گۆپالْ باران. جارچی بەبێ ئەوەی گوێ بداتە بارانەکە، لە ژوورەکەی وەدەر کەوت و لە بن سەیوانەکە بەردەرگاوە هەروا خەریکی مشتومالّی زنجیرەکانی بۆوە. هەموو بەندییەکان لە بەر دەرگای ژوورەکان سەیریان دەکرد. ئەگەر راستیت دەوێ، ئەو ئاڵقانەی جارچییەکە سپیی کردبوونەوە، چاویان بە شەوارە دەخست. لە نەکاو حەسەن جنۆکە خۆی هاویشتە پێشێ و لەسەرخۆ و بە بەزەیەکەوە گوتی:"بڕوانە جارچی گیان، ئەتۆ درۆزنی. ئاسنگەرەکە تۆ نەتکوشتووە. قۆرت بۆغا کوشتوویەتی. هەمووان ئەوەیان لێ سوورە."

رووداوێکی چاوەڕواننەکراو قەوما. جارچی سەرەڕای ئەو هەمووە زنجیرە قورسەی بە دەست و ئەستۆیەوە بوون، وەك تیر دەرچوو و قورقوڕۆچکەی حەسەن جنۆکەی گرت و لە عەرزی دا. خۆ ئەگەر بەندییەکان زوو نەجوولاّبانەوە و حەسەن جنۆکەیان لە چنگی نەهێنابایەتە دەرێ، هەر خنکاندبووی. پەنجەکانی وەك مەنگەنە قوڕگی حەسەنیان رێك دەگوشی و حەسەن لە بنەوە هەر جیق و فیقی مەرگی بوو.

دوای ئەو رووداوە ئیتر کەس نەیدەوێرا بە جارچییەکە بڵێ ئەتۆ ئاسنگەرەکەت نەکوشتووە. ئەویش بە کەسی نەدەگوت"ئەمن ئاسنگەرەکەم کوشتووە."هەر لە بەیانییەوە هەتا ئێوارێ لە بن داری هەنجیرەکە دادەنیشت و دەستی لە زنجیرەکان وەردەدا، مشتومالّی دەدان و لە

سەیرکردنی ئەو وێنەیە تێر نەدەبوو، کە لە زنجیرەکەدا سەری درێژ دەبۆوە و چاوە وردیلەکانی لە ئاڵقەی مشتومالکراو و بریقەداریدا دەینواندەوە. سەری هەر هێندەی سەری مێشەنگوینێك دیار بوو. یەك پشوو خودا خودای بوو کە زنجیرەکانی لە دەست و پێ و ئەستۆی نەکەنەوە.

گەردنی مێشەنگوینەکانیش درێژ دەبێتەوە. پشتەکولکنەکەی، گرژگرژ بە بریقەیەکی هەنگوینی و رەش و سوور و بنەوشەیی.... و بن زگی هەنگونینیی ئاڵقە ئاڵقەیان، باڵی روونی خەت خەتیان، کونکون و ناسك و لەرزۆك و وزەوز و چاوەکانیان دەرپەڕیو...

جارچی دوای پانزە رۆژ بۆسەدانانەوە، مێشێکی گوڵینگەداری گرت. هەموو رۆژێ توێکڵە شووتییەکانی لە بن دیوارەکە دادەنا و خۆی مات دەکردن و هەر ئەوەندەی مێشەنگوینێکیان لەسەر دەنیشت، وەك کەوانێکی کێشراو خۆی بۆ داویشت. کە ئامبازی دەبوو، وای دەزانی دەنگی زرەی زنجیرەکەی لە بازاڕێ دەبیسرێ و ئەو خەیاڵە تەواو لەخۆبایی دەکرد و شیرنیایی ئەو هەستە تاڵاوی فڕینی مێشەکەی لا شیرین دەکردەوە... ئاخرییەکەی مێشەکەی گرت. بن زگی سێ ئاڵقەی زۆر بریقەداری تۆخی لێ بوو کە لە تاریکاییەکەدا و لە نێوان وردەمووەکانیدا بریقەیان دەهات. ئاڵقەیەکی سووری بچووکی دیکەش بەرەو خوار زگی کێشرابوو. باڵەکانی پان و شین بوون و قەراغەکانیان زەردێکی مەیلەوسوور. وردەمووەکانی پشتیشی زەردێکی تار بوون. چاوەکانی لەو کاتەوە کە لەداو کەوتبوو، هەر دەهات و گەورەتر دەبوونەوە و بڵێسەی زێڕینیان لێ دەردەپەڕین.

جارچی مێشەکەی لە ئاڵقە بریقەدارەکە بردە پێش، بەڵام وێنەی مێشەکەی وەك وێنەی دەموچاوەکەی خۆی نەدیت. هەر لە بەیانییەوە هەوڵی دا، بەڵام نەیتوانی وێنەی مێشەکە لەسەر ئاڵقە بریقەدارە ئاوێنەییەکان ببینێ. هەر دەموچاوی خۆی دەدی. چاوە دەرپەڕیوەکانی، چاوە سەرسووڕماو و حەپەساوەکانی، شەرم و ترسەکەی...

مێشە گوڵینگەدارەکەی بەڕەڵڵا کرد. مێشەکە رۆیشت و لەسەر چڵە گوڵێکی کێوی، کە لەسەر بەردێکی بنەوش شین ببۆوە، هەڵنیشت. جارچی، کە نەیتوانی وێنەی مێشەکە لەسەر ئاڵقەکانی زنجیرەکە ببینێ، چاوی لێ هەڵنەگرت. لەسەر بەردەکە دانیشت و لە نزیکەوە لە مێشەکە ورد بۆوە. مێشەنگوینەکە لە پێشدا بێجووڵە هەڵنیشت و باڵەکانی لێك کردبوونەوە. جارێ لووری عەرزی دەبوو و هەڵدەستایەوە و دیسان راست دەبۆوە. لە پڕ باڵەکانی جووڵاند و کەوتە وزەوز بەڵام زۆر زوو هێور بۆوە. دوای چەند جاران وزەوزکردن و هێوربوونەوە بۆ

ماوەیەکی زۆر وزەوزی کرد. ئاخرییەکەی وزەوزەکەی بڕایەوە. مێشەنگوینەکە دەستی بە سەر و چاو و پشتی خۆیدا دەهێنا و تیماری دەکرد و بە هەزار و یەك ڕەنگ دەبریسکایەوە...

جاڕچییەکە کە نوقمی سەیرکردنی ببوو، ئاوڕێکی دایەوە و سەیرێکی دواوەی خۆی کرد. زیندانییەکان سەرسووڕماوانە و بە ئێرەییەکی بێوێنەوە، وەك بڵێی سەیری بوونەوەرێکی سەیر و سەمەرە بکەن، لێیان دەڕوانی. ئاوڕی دایەوە بەڵام مێشەکەی نەدی و لە حاڵێکدا ترپەی دڵی بە خۆشییەوە لێدانێکی نوێی دەست پێ کردبوو، بەخۆی گوت، هەڵفڕیوە و ڕۆیشتووە. هەر بەو شادییەوە ڕێك خەرکی ئاڵقەکان بۆوە و لەگەڵ گوتنەوەی گۆرانییەکدا لە بن لێوانەوە، خەریکی مشتوماڵکردنەوە و بریقەدارکردنەوەی بۆوە.

سەعدوڵڵا دوای ئەوەی نوشتایەوە و خۆی قیت کردەوە و تفی زار قووت دایەوە، گوتی:

"گەورەم، ئەو کووڕە شێت و شوورە لەو زیندانەدا پیاو بەکوشت دەدا. تکایە زنجیرەکانی لێ بکەنەوە."

"باشە زنجیری ئەو چ کێشەیەکی بۆ خەڵکی هەیە؟ پاڕاوەتەوە بۆ ئەوەی ئەو زنجیرانە پێوە بێ. سەیر دڵی بەو زنجیرانەوەیە."

سەعدوڵلا لە حاڵێکدا سەیری ئاسمان و ئەستوندەکانی سەربانە قوڕەکانی دەکرد و دەستەکانی خستبووە سەر زگی، گوتی:"ئەگەر زنجیرەکانی نەکەنەوە، لەو بەندیخانەیەدا خوێن دەڕژێ. دەبێتە ڕاپەڕین و ئاژاوە."

"ئاخر ئەو کاری بەسەر کاری کەسەوە نیە. ئەنگۆ بۆچی چاوتان بەو زنجیرانەی ئەو هەڵنایە؟"

"زیندانییەکان بەزەییان پێیدا دێتەوە."

سەرۆکی زیندانەکە دەرپەڕی:"قسەی قۆڕ. درۆ مەکە."

"چاویان بەو زنجیرانە هەڵنایە."

"بە حەقی خودا و پێغەمبەر."

"بێت و ئەو زنجیرانەی پێوە بمێنێ، دەیکوژن."

"با بیکوژن. ئەمن ناتوانم بەخاتری زنجیرێك دڵی دەروێش بەگ لەخۆم بکەم. جاڕچی پەیغامی بۆ ناردووە و ئەویش تکای لێ کردووم کارم بەسەر زنجیرەکانییەوە نەبێ. ئەتۆش بڕۆ. ئەتۆ پیاوێکی فامیدەی و بە ئاماژەیەك تێدەگەی. بڕۆ و چۆنی بۆخۆت پێت باشە بزانە دەڵێن چی؟ باشە چییان لە گیانی ئەو داماوە دەوێ؟ داوایان لێ بکە لێی گەڕێ خۆ ئەو قوڕبەسەرە نە

پیاوکوژە و نە هیچ تاوانێکی کردووە، کە زیندانییەکەی بکێشێ. ئێستا کە ئەو دڵی بەو زنجیرە خۆشە، بۆ دەبێ لێی وەرگرنەوە؟"

"کەیفی خۆتانە، من ئەوە پێم گوتن."

وای گوت و گەڕایەوە ژوورەکەی زیندان. کە بە بەردەم جاڕچییەکەدا تێدەپەڕی، خۆی پێ ڕانەوەستا و نەیتوانی تەشەرێکی پێدا نەدا.

زیندانییەکان بەردەوام باسی زنجیر و مێش و زەردەواڵەکانی جاڕچییەکەیان دەکرد، بەڵام نەیاندەوێرا توخنی بکەون و نەیاندەویست قەڵسەی لێ بگێڕن و گێچەڵێك بنێنەوە. ئەوان بە دەم هەڵمشتنی بۆنی شێ و هەڕنەهووت و ترشاوەوە، بە تووڕەییەوە وایان دەنواند کە جاڕچییەکە بەهەند ناگرن و خۆیان بە قومار و گەمە و سوعبەت و شەڕ و... دەخافڵاند.

جاڕچییەکەش بە چاوی دەرپەڕیوەوە چەند سەعاتان خەریکی مشتومالی ئالقەکان دەبوو و لە حاڵێکدا بە سەدان زەردەواڵەی باڵ هەڵکەنراو، کە هەر یەکەی لە ڕەنگێك دەبریسکایەوە لە دەوروپشتی کەوتبوون.

## ٥٥

کیسەڵەکەی پێشەوە پیرە کیسەڵێکی مێ بوو. کاسەی پشتی لووس و بریقەدار، هێڵەکانی قەوزەیان گرتبوو و ئەو شوێنانەی ئێسقانەکانی کە دەرکەوتبوون زەرد دەچوونەوە. کیسەڵەکە سەری رەق و زبر ببوو و لە سەر خۆ و بە لارەلار بە نێو گوڵە بنەوشەکاندا بەرەو زۆنگاوەکە دەچوو. تۆزێك دواتر دەگەیشتە نێرگزەجارێك کە هەموو گوڵەکانی پشکوتبوون. لووتی کیسەڵەکە هەر لە ئێستاوە بۆن و بەرامەی نێرگزەکانی کە وەك هەڵم هەڵدەستا، هەڵدەمشت و گیانی لە خۆشییان مێرووڵەی دەکرد و لە حاڵێکدا بۆنی مێینەییەکەی خۆی بەملاولادا بڵاو دەکردەوە، لە قرچەی گەرماکەدا سەری قیت راگرتبوو و چاوەڕێی نێرەکەی بوو. نێرەیەکی گەنج لە نێو دەوەنەکانەوە هاتە دەرێ. بەتەنیا و بەپەلە دەڕۆیشت. دوو کیسەڵ رێك لە لێواری نێرگزەجارەکە گەیشتنە یەك. بۆنیان بە یەکترییەوە نەکرد. ماوەیەك هەر وا نوقمی بۆن و بەرامەی گوڵە نێرگزەکان بەرەورووی یەکتری راوەستان. دەنگی تەقەتەقێکی توند لە نێرگزەجارەکەوە هات. هەموو کیسەڵەکان گوێیان لەو دەنگە بوو. کیسەڵە گەنجەکە پەیتاپەیتا لەوی پێشەوەی دەکوتا. تۆزێك دواتر هەموو نێرگزەجارەکە پڕ بوو لە تەقەتەق. لێرە و لەوێ کیسەڵ لێك جووت دەبوون. کیسەڵە گەنجەکە بە زەحمەت سواری ئەوی دیکە بوو و هەردووکیان لە شەپۆلی چێژێکی گەرمدا توانەوە. ماندوو و کەفوکوڵ دامرکاو، بەتاڵ و بارخستوو، بەدامرکاوییەوە و بە تەقەتەق نێرگزەجارەکەیان بڕی. مارێکی گەورە و سەر رەش لەسەر رێیەکەیان پەپکەی خواردبوو. لە تەقەتەق کەوتن و بەسپایی بەتەنیشتیدا تێپەڕین و کەوتنەوە تەقەتەق.

لەوبەرەوە ماسیگرە پەمەییەکان بە لەنجەو لار دەڕۆیشتن و دەتگوت دەیانەوێ هەڵفڕن و کەچی پاشگەز دەبوونەوە. پۆلە سیخوڕێك بە چقڵی ماش و برینجییەوە کە ئامادەی هاویشتنیان بوون لەوێوە تێدەپەڕین. رێوییە کلك درێژەکان لە گۆشەیەکی چۆڵی لێڕەکە خۆیان مەڵاس دابوو و بە چاوی سووری پتەپت کەریانەوە چاوەڕێی شەو بوون. تەیرە رەنگاوڕەنگەکان

به هەزار و یەك گۆرانی و جیك و فیكەوە بەسەر زۆنگاوەكەدا ئەمبەر و ئەوبەریان دەكرد. لەولاترەوە، لە كەنارەكەوە، لە لای ئاناوەرزاوە، شین و شەپۆڕ بوو. لە پێشیانەوە، لەسەر ئەو خاكە بە پیتەی شینكەی لێ هەستابوو، تەرمی سێزدە منداڵی تاگرتوو درێژ كرابوون. زۆنگاوەكە پڕاوپڕ بوو لە هەڵڵا و قاووقیژو جموجۆڵ. خشۆك و خزوك و فڕندە و جڕوجانەوەر پێك وەربببوون. مارێكی خۆڵەمێشی بۆقێكی شینی هەتا نیوە قووت دابوو. بۆقەكە هێشتا لاقەكانی لە دەرەوە بوون و لە زاری مارەكەدا لینگەفرتەی بوو و ملی لەگەڵ مەرگ دەكرد. كە خۆر ئاوابوو، لوورە لوور دەستی پێ كرد. هەوری تەپۆ و مێشوولە بەسەر زۆنگاوەكەدا كەوتنە فڕین. بنیادەمەكان، دەعبای كێوی، هەر كامە لە ترسان پەنایان بردە بەر پەسیوێك. لە نێوەڕاستی زۆنگاوەكەوە بڵێسە هەستان. تێكەڵاوبوونی قیڕەی بۆق و لوورەی چەقەڵ و وزەوزی مێش، دەنگێكی كێوییانەی سەیر و سەمەرەی دروست كردبوو. زۆنگاوەكە بە حاستەم هەناسەی دەكێشا و لە بن بنەوەڕا دەوروبەر و ڕەوەزەكانی ئاناوەرزای دەلەرزاندەوە. قوڵتەقوڵت دەكوڵی و هەڵدەستا. لە كەناری زۆنگاوەكە شلكە دەوەن جێ جێ خاكە شلەپەتەكەیان قەڵشتبۆوە و قەڵاشتنەوە و هەڵدڕین و هەڵدان هەروا بەردەوام بوو.

ماهیر قاباقچی ئۆغڵی لەوێ لە چەقی سرووشتەكەدا لە نێو تەنیایی و سەرچاوەكەی خێر و بەرەكەتەكەدا ڕاوەستابوو و لەگەڵ هەر هەستانێكی دنیا، دڵی بەتاڵ و بەتاڵتر دەبۆوە... لەولاترەوە سێبەرە درێژ و ئاوساوەكانی ئەو دەزگا زەبەلاحانەی بۆ زنەكێشی و كاناڵ كێشان هێنابوویانن، كەوتبووە سەر ڕەوەزەكانی ئاناوەرزا.

جوتیاری دڵسووتاوی زەوی لە چوار لاوە هرووژم و پەلاماریان هێنابوو... هەركەسە و لەو شوێنەوە كە زەوییەكەی دەچۆوە سەر زۆنگاوەكە، جۆگەیەكی بچووكی لێ دابوو و قووڵاییەكانی پڕ كردبۆوە و خەركی ئەوە بوون دوو قولانج خاك لە چنگی زۆنگاوەكە دەركێشن. تەماحی ئەستاندنی خاك لە زۆنگاوەكە تا و یاوێكی سووتێنەر بوو كە هەمووانی گرتبۆوە و سات بە سات پتر دەبوو. هەر كەسە لە گۆشەیەكەوە هەڵیكوتابووە سەر زۆنگاوەكە. بە سەدان كەناڵ و زنە و جۆگەیان لە قامیشەڵانەكەوە بەرەو بەستێنە وشكەكەی ڕووباری ساورۆن كێشابوو وئاوی زۆنگاوەكەیان بە ڕۆژ و بە شەو بەتاڵ دەكردەوە و بەو جۆرە لە دەوراندەوری زۆنگاوەكە خاكی تازە لە بن زۆنگاوەكە دەهاتە دەرێ و زەوی و زاری وەرزێڕەكانی دەوری زۆنگاوەكە ڕۆژ بە ڕۆژ پان و بەرینتر دەبوونەوە. هەر لە ئێستاوە خەڵكێكی زۆر لە وەرزێڕەكان ببوونە خاوەنی زەوی و زاری پان و بەرین و دامودەزگا.

ماهیر قاباقچی ئۆغلی، لەوێ تۆزێك دوورتر لە كەرەستەكانی خەرەند هەڵكەندن، لە حاڵێكدا كۆمەڵێك دەزگا و كەرەستە و مەكینەی زەبەلاحی وەك دێوەزمەی ئەفسانەیی لێ دیار بوون، لە سەیارەكەی خۆیدا دانیشتبوو و خەیاڵی هەڵیگرتبوو. یەك جێ سەر و مێشك و ددان و نینۆك و لاق و چاو و بە ئاسنەواڵەو لاستیك و مەكینەی ترۆمبێلەكەی خستبووە كار و بیری دەكردەوە و لە رێگەچارەیەكی شێتانە دەگەڕا و دەیدۆزییەوە و دوای ئەوەش وازی لێ دێنان. هەموو پاپۆڕەكانی دەسووتێنران و بەبێ ئەوەی بزانێ ئەوانەی سووتاندوویانن بۆچی ئەو خەیانەتەیان پێ كردووە، لە خەیاڵی خۆیدا لە نێو كەشتییە سووتاوەكانیدا داماوانە پەلاقەژەی دەكرد.

قۆرت بۆغا گەردنی قیت راگرتبوو و سینگی دەرەپەڕاندبوو و وەك ئەفسەرێكی بەشان و شەوكەتی عوسمانییەكان رەپ و قیت راوەستابوو و ورد ورد و گران و سەنگین قسەی دەكرد:"... دەوڵەت دەبێ ئەو زۆنگاوە وشك بكاتەوە. ئەگەر ئەو ئاقچاسازە پێنج ساڵی دیكە ئاوا بمێنێتەوە، ماڵ كاول دەبێ و لە پەڕ و پۆ دەبێ و ئیتر لەو دەشتەدا تووشی چۆلەكەكوژێك نابی."

مامۆستا رۆستەم بەگ هەر ئەوەندەی گوت:"لە پەڕوپۆ..."

ئیتر بێدەنگ بوو. ئەوجار سەری بە هێمنی هەڵێنا و سەیرێكی قۆرت بۆغای كرد:"باسی سەردەمی منداڵیی تۆیان بۆ كردووم. كە بۆت دەگێڕنەوە پیاو مووی لێ دەبێتە نەشتەر. نۆ برات بە نۆبەتێ مردوون و هەر تۆیان بە زیندوویی لێ دەرچووی، جەنابی قۆرت بۆغا، هەر جەنابت..."

رۆستەم بەگ چاوی پڕ ببوون لە ئاو.

حاجی قۆرت بۆغا خۆی خاوكێش كرد و دەستی راستەی بەدەم تەسبێح گێڕانەوە خستە سەر ئەژنۆی و دوای ئەوەی مژێكی لە جگەرەی نێو مۆدنە زێڕینەكەی دا، بە دەنگێكی لەرزۆك كە لە قووڵایی دڵییەوە دەهاتە دەرێ، گوتی:"ئاااااخ، ئاخ، ئاااخ، هەر باسی مەكە مامۆستا، برینم لێ مەكولێنەوە...."

ئەوجار بای نێو گووپی بەتاڵ كرد. پووچاوە و بچووكتر دیار بوو. بێت و ئاگای لەخۆی بوایە، نەیدەهێشت ئاوای لێ بێ.

سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە بە دەنگێكی گڕ گوتی:"ئەو زۆنگاوە كە زیانی بە برامان، بە دۆستی گیانی بە گیانیمان، بە قۆرت بۆغا ئۆغلۆ حاجی بەگ ئاغای ماقووڵ و ماقووڵزادەمان گەیاندووە، بەو زووانە وشك دەكرێ."

ئیتر هەستا و گرماندی:"ئەو زۆنگاوە دەکوژرێ. ئەو زۆنگاوە وەرهەمی بە گەورەمان، حاجی قۆرت بۆغا ئۆغڵی هەڵێناوە. وەرهەم. ئەگەر ئێمە خۆمان بە دۆستی گیانی گیانیی حاجی بەگ ئەفەنی قۆرت بۆغا ئۆغڵی دەزانین، وەرن با ئەو زۆنگاوەی بۆ لە بنە بێنین. وەرن با تەپوتۆزی لە تەختی بنی هەستێنین و بڵێین حاجی قۆرت بۆغا ئۆغڵی چاوی دوژمنت کوێر بێ. دۆستایەتی دەبێ وابێ."

"وایە."

ئالاتەمیر بەبێ ئەوەی بەحاڵ ببزوێ، وەك پەیکەرێك لە جێی خۆی چەقیبوو، قسەکەی ئەسلان سۆوی پەنجەی لە زاری قۆستەوە و گوتی:"هەر ئەوەمان لێ دەوەشێتەوە. ئەرکی ئێمەیە ئەو جانەوەرە بکوژین کە دوژمنایەتیی گەورە و تاجی سەرمان دەکات."

"ئەرکی ئێمەیە."

زالم ئۆغڵی بوو کە لەگەڵ گوتنی ئەو قسەیە هەستا سەر پێ. باڵا بەرزەکەی وەك کەوانێك داهاتبۆوە. بە زستان و هاوین پاڵتۆ یەخە چەرمینەکەی دانەدەکەند.

جافر ئۆز پۆلاد بێدەنگ بوو. قاباقچی ئۆغلێیش هەروا.

ئەگەر زۆنگاوەکە وشك بووبا ، سەرچاوە بەپیتەکەی جافر ئۆز پۆلادیش وشك دەبوو و ئیتر نەیدەتوانی قامیشەکان بە خەڵکی دێهاتەکان بفرۆشێ بۆ کەپر و چارداغ.

ماهیر قاباقچی ئۆغلێیش بێدەنگ بوو. هەتا ئێستا زەوی و زارێکی ئاوا پان و بەرینی لە دەم ئاقچاساز وەدەست نەکەوتبوو و کە بتوانێ لەوێوە هەوڵێکی پتر بدات بۆ دەرکێشانی زەوی لە زۆنگاوەکە.

لە شارۆچکەکەدا بۆ وشککردنەوەی زۆنگاوەکە تۆفانێك هەڵدەگیرسا. سلێمان سامی دیسان هاتبۆوە مەیدان:

"کوشتیان، لە حەوت ساڵانەوە هەتا حەفتا ساڵان، هەموو چوکووراوایان لە حەوت ساڵانەوە هەتا حەفتا ساڵانە کوشت. ئەو مێشوولانە نۆ برای حاجی قۆرت بۆغایان خواردووە. ئەو زۆنگاوە هەموو ساڵێ دوو سێ هەزرا منداڵ و پێنج شەش هەزار بەتەمەن لەو دەشتەدا دەکوژێ. ئەو زۆنگاوە وشك دەکرێ، ئەویش دەسبەجێ و بەبێ راوەستان. مێشوولەی ئێرە هەرکامەیان سیسارکە کەچەڵێکن. مێشوولەی ئێسقاندار، خوێنمژ... دەوڵەت بەو زووانە ئامراز و کەرەستەکانی دەنێرێ. کەناڵێك... هەر ئەوەندە بەسە زنە و خەرەندێکی لێ بدرێ ئیتر زۆنگاوەکە تەواو دەبێ..."

جافر ئۆز پۆلاد و ماهیر قاباقچی ئۆغڵی لە بنەوە چەتیان لە کارەکە دەخست و تەگەرەیان دەخستە بەری، بەڵام بێ سوود بوو. تازە قۆڵیان هەڵماڵیبوو بۆ وشککردنی زۆنگاوەکە. تەلەگراف بەدوای تەلەگرافدا بەرەو ئەنکەرە بەڕێ دەکرا. ئاغاکانیش و لە سەرووویانەوە ئالاتەمیر، خەڵکی گوند و شارۆچکەکەیان هان دەدا و دنەیان دەدان. هەوری مێشوولەکانیش کە تەنانەت بە رۆژی رووناکیش پیاویان کەوڵ دەکرد، یارمەتی دەری ئەو کەش و فەزایە بوون. ئاغاکان ئەنجومەنێکیان پێك هێنا. ئەنجومەنەکەیان بە سەرپەرشتیی سلێمان سامی ناردە ئەدەنە بۆ خزمەتی قایمەقام. سلێمان سامی بە دەستی پڕەوە چوبووە هەنتەشی قایمەقام. دەتگوت پسپۆڕێکی قەڵاچۆکردنی تەپۆیە. دەیزانی تەپۆ و مێشوولە لەو زۆنگاوەدا چۆن دەژین و چۆن زاو و زێ دەکەن و چۆن زۆر دەبن. لەگەڵ ئەوەشدا شووشەیەکی پڕ پڕ لە مێشوولەی زل زل لە گیرفانیدا بوو.

چاکەت و پانتۆڵە نیلییەکەی سلێمان سامی کە بە پێی دوایی مۆدە و پڕ بە بەری دوورابوو، رواڵەتێکی تەواو گران و سەنگینی پێ بەخشیبوو. دەرزیلەیەك لە شێوەی نیشانی زێڕین کە لە بۆینباغە خەت خەتییە مارکە پاریسییەکەی دابوو سەرنجی بەرەو خۆی رادەکێشا. ئەو دەرزیلەیە دەیانگوت هێمای چوکووراوا بوو و سلێمان سامییش وتەبێژەکەی.

بە گران و سەنگینی چووە لای قایمەقام و بەر لەوەی دابنیشێ شووشە پڕ لە مێشوولەکەی لە سەر مێزەکە دانا. قایمەقام بەو و بەوانی دیکەشی کە بەدوایدا وەژوور کەوتن گوت کە لە کوێوە دانیشن. سلێمان سامی کەوتە قسەکردن:"جەنابی قایمەقام کوڕە ئێمە مردین. بە واتایەکی دیکە، ئێمە مردووین. زۆر دەمێکە مردووین. حاجی قۆرت بۆغا کە بەڕێزت باشی دەناسی، یەکێکە لە دەستڕۆیشتووەکانی شار و لە بەرهەمهێنەرە ناودارەکانە. مێشوولە نۆ برای ئەویان کەوڵ کردووە. هەموو دەشتەکە خەریکە لە نۆبەتێدا دەمرێ. منداڵەکان، منداڵی پاك و بێ گەرد کە هێشتا خونچەی نەپشکووتوون، وەك گەڵای خەزەڵوەر هەڵدەوەرن. مردوو ئەوەندە زۆر بوون، فریای کفن و دەفنیان ناکەوین. بەتایبەتی لە وەرزی هاویندا، زیندووەکان بەشی ئەوە ناکەن مردووەکان بنێژن. ئەوە درۆ نییە جەنابی قایمەقام، راستییەکی تاڵە کە دەبێ لێی رانەوەستن و کاری بۆ بکەن..."

کە ئەو قسەی دەکرد، ئەوانی دیکە بە سەر لەقاندن قسەکانیان پشتڕاست دەکردەوە.

"وشككردنی زۆنگاوەکە کارێکی ئەستەم نییە... هەر ئەوەندەی خەرەند و زنەیەکی بە درێژیی دوو سێ کیلۆمەتر لێ بدەن. لە ماوەی چەند مانگێکدا هەڵدەچۆڕێ. چەند شۆفڵ و بێڵ

میکانیکییەکی دەوێ. خودا میللەت و دەوڵەتەکەمان لە بەڵای زەوی و ئاسمانی بەدوور بکا. ئەمن زۆرم لەو مەکینە و ئامرازانە دیتووە."

قایمەقام وەدەنگ هات:"چیت گوت؟"

سلێمان سامی بە توورەییەوە وەڵامی دایەوە:"عەرزم کردی شتی وام زۆر دیتووە. زۆر."

قایمەقام گوتی:"بەڵێ ێ ێ ێ..."

سلێمان سامی بە لەبزێکی زویرانەوە لەسەر قسەکەی رۆیشت:"ئێمە هەموومان تێدادەچین جەنابی قایمەقام. دەستمان بە داوێنت. رزگارمان بکە. ئەوجار، میللەتەکەمان ئەو هەمووە زەوی و زارەشی دەست دەکەوێ. ئەو زۆنگاوە، ئاوا بەکاری چی دێ؟"

قایمەقام لە حاڵێکدا بە نووکی قەڵەمە زەردەکەی دەست سمێڵی دەخوراند گوتی:"بەکاری هیچ نایە."

دەموچاوی زەرد و درێژ و بن چاوەکانی رەش هەڵگەڕابوون و ئاوسابوون. لە پشت مێزە گەورەکەوە بچووك دیار بوو و چاوە سوورە فێڵاوییەکانی لە گلێنەیدا پتەپتیان بوو.

"هەر کامیان جانەوەرێکی دڕندەن و ملوێن ملوێن هرووژم دەبەنە سەر شوێنێك. نەك کەژاوە پێشیان دەگرێ و نە جلوبەرگ. سەیرێکی ئەوانە بکە، جەنابی قایمەقام..."

هەستا و شووشەی پڕ مێشوولەکەی لە بەر دەستی قایمەقام دانا و لەسەری رۆیشت:"هەر درویشەیان دەڵێی خەنجەرە... شمشێری میسری. تێی رۆ دەکەن و جەرگی پیاوی دەکۆڵن، دەیکوژن. خەڵك دەکوژن. هاونیشتیمانییەکانمان دەکوژن..."

کە گەیشتە ئێرە دەنگی لەرزی و وەگریان کەوت. دەگریا و بەدەم گریانەوە دەیگوت:

"ئاااااخ نیشتیمانە بەڵا لێدراوەکە، نیشتیمانە بێ کەسەکە... ئاااخ هاونیشتیمانییە داماو و بێ پشت و پەناکان... رۆژێك لە سەرمای چیاکانی قەفقازدا لە سەرمان رەقمان کردنەوە و رۆژێك لە بن لم و خۆڵەکەی بیابانی عەرەبستانێدا ناشتمانن و رۆژێکیش لە دەشتەکانی روسیادا بەکوشتمان دان و ئەمڕۆش ئەوە دەتانکەینە پێخۆری مێشوولە، های هاونیشتیمانە..."

قایمەقام دڵسۆزانە و دڵدەرەوانە گوتی:"جەنابی سلێمان سامی، برای بەرێزمان..."

سلێمان سامی لەپڕ ژیر بۆوە و ملی بەرەو لای قایمەقام درێژ کردەوە و چاوی تێوەبڕی.

"حکوومەتەکەمان لە دەستی دێ زۆنگاوێکی بچووك هەڵچۆڕێنێ و وشکی بکات."

سلێمان سامی بە دەنگێکی ماندوو و سڵەمیوەوە لالایەوە:"بچووك نییە، بچووك نییە جەنابی قایمەقام."

"ئەگەر گەورەش بێ، دەوڵەتی کۆماری تورکیامان دەتوانێ هەڵیچۆڕێنێ. زۆر خۆشحاڵم کە پیاوی وەك تۆ نیشتیمانپەروەر دەبینم. ئەنگۆی نیشتیمانپەروەر..."

سلێمان سامی لەخۆوە وەنێو قسەکانی کەوت:"کە بیر لە نیشتیمان دەکەمەوە کزەم لە جەرگی دێ. ئەمن تورك پەرستم. تورك پەرستییەکەی ئێمە لەخۆڕایی نییە، ئێمە بوون و نەبوونمان بە تورکانەوە بەستراوەتەوە. لەو دەرو و رۆژگارەدا ئێمەی تورك پەرست زووخاو دەخۆینەوە. هەر کزەمان لە جەرگی دێ و دان بە جەرگیشماندا دەگرین..."

قایمەقام لە حاڵێکدا هەڵدەستایە سەر پێ گوتی:"سوپاست دەکەم. بەو زووانە دێم و سەر لە زۆنگاوە گەورەکەی مەڵبەندەکەتان دەدەم."

سلێمان سامی و ئەوانی دیکەش بە پێی فەرماندارەوە هەستابوون و وێکڕا گوتیان:"پێڵاوت لەسەر سەر و چاومان جەنابی قایمەقام."

سلێمان سامی لەو کاتەدا هاتە پێشەوە و خۆی خستە سەر دەستی قایمەقام. بەڵام قایمەقام ئیزنی نەدا دەستی ماچ بکرێ و هەتا بەردەرگایە بەڕێی کردن.

ماوەیەك بەسەردا هات. هەموو شارەکە چاوەڕێی ئەوە بوون فەرماندار بێ، بەڵام هیچ سۆراغی نەبوو. شار ئۆقرە و سەبری نەمابوو. وەفدێکی دیکەیان ناردە ئەنکەرە بۆ وەزارەتی تەندروستی. ئەمجارەیان سەرپەرشتی وەفدەکە مامۆستا رۆستەم بەگ بوو. سلێمان سامی لە ژووری وەزیری تەندروستیش دەستی کردە گریان. وەزیری تەندروستیش وەك قایمەقامەکەی ئەدەنە بەزەیی بە فرمێسکەکانی سلێمان سامیدا هاتەوە و گوتی:"کۆماری تورکیا وەك ئاوخواردنەوەیەك بەلایەوە ئاسانە زۆنگاوێکی بچووك وشك بکات.

سلێمان سامییش بە لووشمەلووشم و گریانەوە گوتی:"بچووك نییە، بچووك نییە جەنابی وەزیر."

"گەورەکەشی..."

ئەوەی گوت و لەجێی خۆی هەستا و لەسەری رۆیشت:"پشتیوانی و دەستخۆشانەکردن لە نیشتیمانپەروەری وەك ئێوە ئەرکێکی نیشتیمانییە."

ئەوجار بەوپەڕی گران و سەنگینییەوە لە سلێمان سامی چووە پێشێ. ئەوانی دیکەش وێکڕا هەستابوونە سەر پێ. سلێمان دەست لەسەر سینگ هەر دادەهاتەوە و لە حاڵێکدا گەش گەش ببۆوە، دەستی راستەی لە دەستی وەزیر نا. وەزیر بە دەم رێكگوشینی دەستی ئەوەوە، لەسەرخۆ پرسیی:"تۆ ناوت چییە؟"

"سلێمان سامی داغ یاران."

"زۆر باشە... زۆر زۆر باشە."

ئەوجار سەری بردە بن گوێی و بە سرتەوە گوتی:"بۆ خولی داهاتوو... پێویستیمان پێتە."

سلێمان سامی داغ یاران بە روخسارێکی گەش و شادەوە داهاتەوە و دەستی گرت. وەزیر لایهاتووانە و زۆر سروشتی دەستی بۆ شل کرد. سلێمان سامی هەر دوو دەستی ماچ کرد. وەزیری تەندروستی هەتا بەر دەرگای بەڕێ کردن. کە ئەوان لە وەدەر دەکەوتن، دەستی کردبوو بە یادداشت کردن.

مەکینە و دەزگای زەبەلاح هاتنە بەستێنی زۆنگاوەکە. کۆمەڵێك پیاوی شەڵوار شینی چەور کە دیار بوو لووتبەرزانە بەڕێیەدا دەڕۆیشتن، مەکینە و دەزگاکانیان لە تەنیشت یەك ریز کردن. بێڵ میکانیکییەکان زۆر زل بوون. وەرزێرەکان لە گوندە دوور و نزیکەکانەوە هاتبوون و بە ترس و خۆفەوە سەیری ئەو دەزگا و مەکینانەیان دەکردن بۆ ئەوەی بزانن چین. پیاوەکان هەموو رۆژێ دەستیان تێوەردەدان بەڵام مەکینەکان لە جێی خۆیان نەدەبزووتن و زنەیان لێ نەدەدا و خەرەندەیان هەڵنەدەکەند و ئاوی زۆنگاوەکەیان بەتاڵ نەدەکرد. هەموو چاوەڕێی وەکارکەوتنیان بوون، بەڵام ئەوان وەکار نەکەوتن و نەکەوتن و لەوێ لە دەم ئاقچاساز، لە لای رەوەزەکان وەك کۆمەڵێك جڕ و جانەوەری زەبەلاحی نارنجی و وەك ئەوەی لەتێك بن لە ئاناوەرزا، بێجووڵە کەوتن.

کەس نەیزانی ئەو دەزگا و مەکینانە بۆچی هاتوونە ئەوێ و کاریش ناکەن.

ماهیر قاباقچی ئۆغڵی دەستی لەسەر دڵی دانابوو و چاوەڕێ بوو. پێویست بوو بەر لەوەی زۆنگاوەکە هەڵچۆڕێ، پێ بە پێی وشکبوونی زۆنگاوەکە دەست بەسەر پارچەیەکی گەورەدا بگرێ کە لە رۆژهەڵاتەوە یان لە رۆژئاواوە یان لە باکوور یان باشوورەوە دەچۆوە سەر ئاقچاساز... دەبوو هەتا بەڵگە و قەباڵەی وەك پارچە زەوییەك بەدەست نەهێنێ، ئەو زۆنگاوە وشك نەکرێ و ئەو دەزگا و مەکینانە هەتا دەستەبەربوونی ئەو بەڵگە و قەباڵەیە، واتە راگەیاندنی رازیبونی دەروێش بەگ، لە جێی خۆیان نەدەبزووتن. وەك جرۆجانەوە و دەعبا ئەفسانەییەکان، لەبەر تیشکی مانگەشەو لە کەناری دەشتەکە و لە حاڵێکدا سێبەرە قورسەکانیان دەکەوتە سەر گابەردەکان و وێنەیان لە ئاوە زولاڵەکەدا بەسەر یەکدا دەشکایەوە و گەورە دەبووەوە...

ڕۆژێکیان بەیانی، مەکینە و دەزگا زلەکان، لووتی پۆلایینی درێژ و بێڵدار و نارنجییەکانی خۆیان بەرز کردەوە و لە حاڵێکدا زەوی لە بن تۆپ و تایەکانیاندا دەلەرزی، بە هاڕەهاڕ و گرمەگرم ملی ڕێگەیان گرت و ڕۆیشتنەوە. وەرزێرەکانی گوندە دوور و نزیکەکان هاتبوونە سەیریان. ئەوان دەیانویست بزانن ئەوانە چۆن ئیش دەکەن. ئەگینا بڕوایان نەدەکرد ئەو مەکینە و دەزگایانە ئەگەر لەوەش زلتر بوایەن، بتوانن زۆنگاوەکە هەڵچۆڕێنن. ئەوان پێیان وابوو مەحاڵە ئەو ئاوە هەڵچۆڕێت و تەواو بێت. ئەگەر ڕاستیتان دەوێ ئەوانیش کە هاتبوون و زانیبوویان ئەو زۆنگاوە وشك ناکرێتەوە، بەو ڕێگەیەدا کە هاتبوون گەڕابوونەوە.

لەو جەنگەیەدا عەلی ڕەزا درێژە، لەگەڵ برادەرەکانی و بە نرخی گیانی خۆی و منداڵەکانی خەریکی بەرینکردنەوەی چزیلك (دوورگە)ـەکەی نێوەڕاستی زۆنگاوەکە بوون. ئەوان تا ئێستا توانیبوویان ئەوەندە زەوی لە چنگ زۆنگاوەکە دەربێنن کە لەوێ گوندێك بۆخۆیان بنیات بنێن. ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ کلکەیەکی بەپیت لە بن زۆنگاوەکەوە سەری وەدەر دەنا و باوەشی بۆ دەکردنەوە کە دانەوێڵەی لێ بچێنن و ئەویش بۆیان پێ بگەیەنێ. عەلی ڕەزا و هاوڕێکانی بە خوێنی دڵ کێڵگە و زەوی و زاری خۆیان بەدەست هێنابوو و هەر بە خوێنی دڵیش بەدەستیان دێنا. وەرزێرەکانی کەنارەکەش بە هەڵکەندن و لێدانی سەدان و بگرە هەزاران جۆگە و زنە و بەنداو، ئاوەکەیان دەکشاندەوە و پارچە پارچە خاکەکەیان لە چنگ زۆنگاوەکە دەردێنا. تالانەکە دەستی پێ کردبوو. وەرزێرە بێ زەوی و زارە دەست لەگیان شوشتووەکان لە لایەك و ئەو ئاغا و بەگ و جووتیارانەش کە لە کەنارەکە زەوی و زاریان هەبوو، لە لایەکی دیکەوە بە وەك گورگی برسی پەلاماری ئاقچاسازیان دەدا و هەموو ڕۆژێك، هەرکەسە و پارچەیەکی لەو خاکە بڕ دەدا کە وەك زێڕی بێ خەوش وابوو. لە دەوروبەری ئەو خاکە بەپیتە و لە بن ئاوە لەکوڵەکەوە، ململانێیەکی بەجۆش و خرۆش لە ئارادا بوو. هەر کەسە و خۆی گورج و گۆڵ دەکرد بۆ دەرهێنانی چاوی ئەوی دیکە.

تەقەتەقی کیسەڵەکان و قاوقیژ و چەهچەهەی پڕ لە شەهوەتی مەل و باڵندەکانی بەر لە تاوهەڵات دەستی پێ کردبوو. کە تاو کەوت لوورەی چەقەڵ بڕایەوە. دنیا نوقمی جۆش خرۆش و ناز و نووزی لەخەو هەستان و نوقمی خوناو و گەشانەوە و زیندوویەتی بوو. دەنگی جڕوجانەوەری بچووکی پێست ڕەق، کە لە بەر خۆرەتاوەکە بە ملوێن ڕەنگیان لێ دەبۆوە، لە ئاو و خاکەوە دەهاتنە دەرێ و تێکەڵ دەبوون و وەك ڕووبارێکی پان و بەرین دەکەوتە ڕێ. دەستەیەك ماسیگرەی ڕەنگ یاسەمەنی، کە گەواڵە سێبەرێکی خزۆکیان خستبووە سەر عەرزی

و جارێك وێك دەهات و خەست دەبۆوە و جارێ دەكرایەوە و كاڵ دەبۆوە، بەرەو خۆرەتاوەكەی كە لە ئاسۆ سەری وەدەرنا، دایان لە شەقەی باڵ. تاوێك دواتر لەگەڵ بەرزتربوونەوەی خۆرەتاوەكەدا، زۆنگاوەكە كەوتە گرم و هۆڕ و هەموو دەنگەكان تێكەڵ بوون، تا ئەوەی رووناكایی هەتاو وردە وردە داكشا و هەموو دەنگەكانی كپ كرد.

دەرگای ترۆمبێلەكەی داخست و وەك بای شەماڵ بەرەو ئاوە خەست و مەیلە و سەوزەكە پێی پێوەنا. هاڕەهاڕی ترۆمبێلەكان كە وەڕێ كەوتبوون، هەموو دەنگەكانی دەشت و زۆنگاوەكەیان لەخۆیاندا ون كرد. سەیارە و ترۆمبێل و كامیۆنەكان بەكاوە خۆ گەیشتنە رێگە سەرەكییەكە. كە دوور كەوتنەوە، ماهیر قاباقچی ئۆغلو لە پشتەوەڕا سەیری كردن و بزەیەكی پڕ لە رەزامەندیی لەسەر لێوان بوو و لەسەرخۆ گوتی:"بڕۆن، بڕۆن دیسانیش دێنەوە."

ناخی پڕ بوو لە تێشكان و تەماح و ژان و پەژارە. لە حاڵێكدا گڵمتك و كەرسەكەكان لە بن پێیانیدا ورد دەبوون، لە تەنیشت ترۆمبێلەكەیەوە كەوتە پیاسەكردن. چووە پێشتر و لقە قامیشێكی هەڵكەند. وەك بێهۆش و خەوگەڕان، هەر دەتگوت هیچ ئاگای لەخۆی نییە و خەیاڵی بەرەو شوێنێكی دیكە فڕیوە، لە حاڵێكدا نووسەنەكە بە داودەلینگییەوە دەنووسان، لە تەنیشت زۆنگاوەكە كەوتە پیاسەكردن. ئەو كیسەڵە شینانەی لە دەم زۆنگاوەكە نوستبوون، بە شڵپەشڵپ خۆیان بە ئاوەكە دادایەوە. لە نێو بۆنی خەست و قۆرسی زۆنگاوەكە و بۆنی گژ و گیا و قوڕ و لیتەدا، لە حاڵێكدا جار و بارە تۆزە بۆنێكی گوڵە نێرگزەكان بە شەپۆل بەسەریدا دەهات، چووە پێشتر و پەیتا پەیتا لەگەڵ خۆی قسەی دەكرد: ئەوە چیم كرد؟ چیم كرد ئەمن... ئەگەر دوای گەڕانەوەم لە ڤیەننا دامەزرابایەم... بە دەم هەڵمژینی بۆنە گەرمەكەوە، وەك شتێكی لێ بزر بووبێت، بە دوای بۆنێكی لێڵ و نامۆدا دەگەڕا كە لە رەوەزەكانی ئاناوەرزاوە دادەگەڕا و ئەو پێی وابوو بۆنی بەردە. عوسمان رەمزی ئێستا بەڕێوەبەری گشتییە. ئێستا ئەو كامیۆن و شۆرفلڵ و داودەزگایە هەر بە ئەمرێكی ئەو ئێرەیان بەجێ هێشت...

من، من، من... ئەمن چیم بوێ دەیكەم. خوێندەوارم... لە ڤیەننا... چما لەو مەملەكەتەدا چەند كەسی وەك من دەست دەكەوێ؟ ئەگەر ئێستا بووبامە بەڕێوەبەری گشتی، دەروێش بەگ كلكەسووتەی لەبەر دەكردم و خۆی بەسەر پێڵاوەكانم دەكێشا... دەروێش بەگ هات و لەبەر چاوی راوەستا. لەسەر زۆنگاوەكە و بە بەرچێڵەیەوە كە هەر دەهات و گەورەتر دەبۆوە... چما ئەمن دۆڕاوم؟ مەزرایەكی میكانیزە، دوو، ئەوجار؟ ... ئەوەندەی دێنیٰ؟ هێشتا درەنگ نەبووە. پیاوماقووڵی ئەنكەرەم زۆر ناسیوە... عوسمان رەمزییش بوو بە

فەرامەسۆن... نازانم چ پلەیەکی هەیە... ئێرەیی بە عوسمان رەمزی نابەم. هەر ئی ئەوەی نییە. هەمیشەی خودا چارەنووسی لەسەر ئا و نایەکە. بەڵام عوسمان رەمزیش دەتوانێ دەوڵەمەند بێ. بووشە. هەر لە ئێستاوە لە چەند بانکدا پارەی خەواندووە و لە چەند دامەزراوەیەکی بەرهەمهێنەردا بەشی هەیە...." ئەو بۆنە تیژەی لە زۆنگاوەکە هەڵدەستێ، لووتی بنیادەم دەخورێنێ. ئەو بۆنە چییە؟ لێگەڕێ با شۆفێرەکە لەوێ لە ترۆمبێلەکەدا هەر چاوەڕێم بێ. ئێستا بیر لە چی دەکاتەوە؟ چیی دەوێ؟ چیی لە دڵی دایە؟ لە خەیاڵی چی دایە؟ ژیانێکی تەسك و تەنگەبەری هەیە. هەر دەڵێی لە بازنەیەکدا و ئەویش بازنەیەکی بێ مانا و بێ واتادا دەژی. دەخەوێ، هەڵدەستێ، لێ دەخورێ و دیسان دەخەوێتەوە. سبەینێیش هەمان تاس و هەمان حەمام. هەر ئەوەندە. ژیانێکی بەتاڵ و بێ رەنگ و بۆن. تیشکی هیچ هیوایەك دڵی رووناك ناکاتەوە. باشە دەکرێ چ هیوایەکی هەبێت؟ کێ چووزانێ... دەروێش بەگ، دەروێش بەگ... برایەتی.... ئاخخخ گەنجێتی، کێ چووزانێ سبەی چیی بەسەر دێ؟ سێبەرێکی درێژ... سێبەری رەوەزەکان، سێبەری ئاناوەرزا و چیاکانی رووبەڕوو، بەرەو بەری خۆراوا درێژ بوونەوە و جیکەجیك و قاوقیژەکان دەستی پێ کرد.... جۆش و خرۆش....

دەنگێکی چڕ و ناڕوون، دەتگوت شتێکی گەورە دەکەوێتە ئاوەکەوە.... دەنگەکە وردە وردە دەنیشتێتەوە و دیسان دەست پێ دەکاتەوە. قاباقچی ئۆغڵی لە نەکاو وەخۆ هاتەوە و دیسان دوورکەوتنەوەی سەیارە و کامیۆن و شۆفلەکان و زیندووبوونەوەی سەرلەنوێی دەنگەکانی زۆنگاوەکەی لێ روون بۆوە و ئەوەی بە مێشکیدا تێدەپەڕی هاتە سەر زمانی:"ئاااخ، دەروێش بەگ."

سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد. ماسیگرەکان کە تاوێك بەر لە تاوکەوتنێ هەڵفڕیبوون و لەچاوان ون ببوون، لە حاڵێکدا جارێ رەنگاورەنگ دەبوون و جارێ سپی هەڵدەگەڕان، یەك بە یەك بە پەڕ و باڵی لێك کراوە و قاچی نووشتاوەیانەوە لەسەر خۆ لە زۆنگاوەکە نیشتنەوە. خۆ ئەگەر ئەو کارەی دەروێش بەگمان تێکەوە پێچابا، هەموو شتێك دەبڕایەوە. مەزرایەکی میکانیزە کە... کە... عوسمان رەمزی چیی گوت؟ گوتی ... هەر کەس بیەوێ مەزرایەکی میکانیزەی پێشکەوتووی.... وەك مەزرا میکانیزەکانی ئەورووپای هەبێ، چەندی سەرمایەی بوێ دەوڵەت دەیداتێ. چەندی بیەوێ. کام خاکی دنیایە لە هەمووان بەپیت و بەرەکەتترە لە بن زۆنگاوێی دەرکێشە... ئەو کات هەموو شتێکی، ئاغا و کوێخای... و جا دانەوێڵە.... هەزار دۆنم... پرتەقاڵ، لیمۆ و لالەنگی و نارنج... هەموو پێستی چرچ و لۆچ. لە بەهاراندا گوڵباران

دەبن و ناتوانی بچیتە نێو باغی پڕتەقاڵ و لیمۆ. هەر بۆنی گوڵ دەتخا. هەر دارەی هەزاران مێشەنگوینی سەرخۆش و شاد و دەم پڕ لە ئاوازی لەسەر دەنیشێ و...

ماهیر بەگ دڵی پڕ بوو لە خۆشی و بۆن و بەرامەی گوڵەلیمۆ لە لووتیدا و لەرزە و لەرەی باڵی ملیۆنان مێشەنگوین و بریقەی دەماری شین و روون لە چاوەکانیدا بوون.

لە کوشتنی دواوەی سەیارەکەیدا پاڵی دابۆوە و بە دەنگێکی نەرم و خۆمانە و تژی لە شادی و هیوا گوتی:"وەرێ بکەوە. بچۆ ماڵی دەروێش بەگ، بۆ کۆشەکەی ساری ئۆغلی... با بڕۆین. بچین سەرەخۆشییەکی لێ بکەین... وا نییە؟"

ئەوجار بیری لەوە کردەوە باشە دەروێش بەگ کێی مردووە؟ جا چونکە وەبیری نەهاتەوە، لەسەر قسەکەی خۆی رۆیشت:"نا، با نەچین. با بزانم، دەروێش بەگ کێی مردووە؟"

شۆفێرەکەی گوتی:"کەسی نەمردووە."

"سەیرە، سەیرە، ئەوە من چمە؟ دەی باشە وەرێ بکەوە با بچینە ماڵی دەروێش بەگ. وەرێ کەوە، وەرێ کەوە با بچینە کۆشکەکەی ساری ئۆغلی."

## ٥٦

وەلی شەماڵ گوتی:"راوەستە، هەر لێرە راوەستە مەستان تا ئەمن سەرێکی ئەو زۆنگاوە دەدەم و دەگەڕێمەوە. دەورێکی زۆنگاوەکە لێ دەدەم و شوێنێك دەدۆزمەوە کە بکرێ لە بن ئاوەکە بیهێنینە دەرێ. ئەتۆ لێرە بە، ئەمن ئەوە رۆیشتم..."

وەلی شەماڵ غاری دەدا. بە هانکەهانك هاتەوە و راوەستا. دەست و پەنجەی لێك کردبوونەوە و سێبەرەکەی هێندەی بنیادەمێك درێژ و سێبەری دەستەکانی کەوتبووە سەر دیوارەکە و بێ جوولە بەوێوە نووسابوون. شلەژاو، هەر دەتگوت رۆحیان کێشاوە. لە پشت دیوارەکەوە دەنگی شەق و هۆڕی هەزاران مەکۆك دێ. لوورەیەکی کپ و قورس و دوورودرێژ لە دەوری شەقەشەقەکە دەئاڵێ. سێبەرەکەی لەسەر دیوارە سپییە ماتەکە هەڵکشان و داکشانی هەیە و لەگەڵ هەر هەڵکشان و داکشانێك درێژتر دەبێتەوە. را دەکا، رادەوەستێ، دەگەڕێتەوە و لینگە درێژەکانی وەك مقەست و خێرا دەکرێنەوە و وێك دێنەوە. دەستەکانی گەورە و بەجووڵەن و لەگەڵ گەورەبوونەوەی سێبەرەکە، جووڵە و هەوڵەکانیان پتر دەبێ. گەڵای چنارەکە وەریوە. پارکەکەی رووبەروو، ریزی دارکارەباکان و لە بەر هەر دارێك کۆگا کۆگا تیشکی سپی بە شەپۆل. سەگێك زمانی دەرکێشاوە و لە تەنیشت یەکێك لە دارەکان لینگی بەرز دەکاتەوە. دوو کەس کە پاڵتۆی خۆڵەمێشییان لەبەر کردووە، خۆیان پێکەوە نووساندووە. کابرا قژی درێژ و سپی و زوور و دەموچاوێکی درێژووکەیە و دەوروبەری چاوەکانی پڕ لە چرچولۆچ. قژی درێژ و وەك شەبەنگی ژنەکە لایەکی دەموچاوی کابرای داپۆشیوە. گەرما، گەرمایەکی لەرزۆك کابرای داگرتووە. کچۆڵەکە جار نە جارێك سەرێك دەکێشێ و بە سڵەسڵ چاوێك لە دەوروبەری خۆی دەکا... سێبەری سەگەکە و ئەوانەی لەسەر کورسیی پارکەکە دانیشتوون، لەسەر دیواری کارخانەکە تێکەڵ دەبن.... ئەو سێبەرەش وەك نەخشی بەراوەژووی وێنەیەك بەسەر دیوارە سپییەکەوە بەجێ دەمێنێ. بێ جووڵە، بزمارچن، سڕ و بەستوو. دیوارەکەی هەڵکەندووە.

لەرزۆك بە چرکەچرکی سەد هەزار سەعاتەوە.... سێبەرەکە لە نەکاو ون دەبێ... لە نێوان نەرمی و نووشتانەوەکەیدا، شتێکی وەك شەرم و بەزەیی و میهرەبانی و دۆستایەتی و گەرم و گوڕی و هیوا و هاتنەوەسەرخۆ، بزر ببوون. سێبەری سەگەکە پەیتاپەیتا لینگی بەرز دەکردەوە و میزی بە سەر شلّق و هۆڕ و تەفە و رووناکاییەکەدا دەکرد.

سێبەرەکە بەسەر ئاوێکی مەند و راوەستاوەوە کە خۆڵ و خاك و ئاومالّك لەسەری مەیبوو و جار و بار پەڕ و پۆی پەرش و بلاّوی لەسەر دەبریسکانەوە، پان بۆوە. کارخانەکە ماندوو و هیلاك و شەلاّلی ئارەقە بوو. پنجی گەسگەکی سەر لێواری دیوارەکان، شێداری میز و بۆنی میز. ئەسپێکی کز و لاواز بە عارەبانەکەوە کە سەری بەردابۆوە، هەر گەیشتە بن دیوارەکە، راوەستا. لاقەکانی لێك کردنەوە و میزەکەی کرد و دوای ئەوەی چەند جارێکی کەفەڵی لەبەر یەك کێشایەوە و وێکی هێنایەوە، ئاوڕێکی داوە و سەیرێکی میزەکەی کرد و وەڕێ کەوتەوە. لە دواوەی چیی نەمابوو تاو هەڵێ و سێبەرەکە بەسەر وردە شەپۆلی بەخۆڵ و تۆز و کا و کۆت داپۆشراوی ئاوەکەوە شەپۆلی دەدایەوە. شان بە شانی بەرزبوونەوەی خۆر، سێبەرەکە تۆختر دەبوو و پتر بە قووڵایی ئاوەکەدا رۆدەچوو.

رەوەزەکانی ئاناوەرزا لەگەڵ تاوهەلاّتندا رووناك دەبوونەوە و دەدرەوشانەوە. سێبەرەکە زۆر سەیر درێژ دەبێتەوە و چەندی پتر با دەکا، یاڵی ئەسپەکەی بنیشی وەك هەور هەو دەکا و هەڵدەمسێ. ئەسپەکە بە کلك و یاڵی پەخش و پەرێشانەوە لە مانگەشەوەکەدا لەگەڵ بۆنی ئارەقەکەی بەرەو پێشەوە دەخوشێ و چەندی پتر دەچێتە پێشێ، یاڵی بلاّوتر دەبێ و هەڵدەستێ، گوتی:

"راوەستە، راوەستە، وەلی شەماڵ."

سێبەری ئەسپەکە کەوتە سەر رەوەزە ئەو رەوەزە سوورە کالّەی لەبەر مانگەشەوەکە مەیلەورەش دەچۆوە. سێبەری ئەسپە یاڵ پەرێشانەکە بەسەر دیوارەکەدا غار دەدا. وەلی شەماڵ دەخولێتەوە، بە دەوری بەردێکدا. بەردە مەڕمەڕە سپییە خەت خەتی و نەخشدارەکەی کردووەتە قەڵغانی خۆی و دەخولێتەوە. لە سەر دیوارەکە دە ئەوەندە گەورەتر بۆتەوە، یاڵی هەستاوە و دەجووڵێ وەك گای دەم بێن کراوی گێرە بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە.

"وەلی شەماڵ، وەلی شەماڵ، راوەستە."

سێبەرەکە بۆ تاوێك لە ڕەوەزەکاندا ون دەبێ. گابەردەکان وەك لافاو لە ڕەوەزەکانەوە خلۆر دەبنەوە. ئەسپە یاڵ پەخش و پەرێشانەکە لە داوێنی چیاکەوە هەڵدەکشێ و لە بن سمەکانییەوە بەرد دەردەپەڕن.

هەرای کرد:"ڕاوەستە، ڕاوەستە وەلی شەماڵ."

تاو هەڵات.

"فەرموو بەگ."

"تۆ نامەردی. ئەوە ئێستام ناسییەوە."

"دەست ڕاگرە بەگ. دەست ڕاگرە دەروێش بەگ. دەست باگرە، باشە؟ گوێم بدەیە جا دوایی چیت پێ خۆشە بیکە."

گەڵا زەردەکان لەبەر تیشکی هەتاوە ڕەنگ مسییەکە، خەتی سوور سووریان پێدا هاتبوو. دارە چنارەکان گەش و چڕ. گەڵای زەردی ڕەگ سوور، وەکوو بارانێ دەبارێ و پەرش و بڵاو دەبێ.

لەگەڵ ڕاوەستانی هەڵوەرینی گەڵاکاندا، بارانەکە دایکرد. هەورێکی زەرد، زەردێکی زێڕین، چین بە چین و لێڵ و قۆڕاو پڕ لە خاڵی بریقەدار وەك گۆزەی سەروبن هەڵدەڕژا. خرمەی ناڵ و بزمار لەو دیو هەورەکەوە و تێکەڵاوی خرم وهۆڕی بارانەکە.

"ڕاوەستە، ڕاوەستە وەلی شەماڵ."

"وەرە بمکوژە، وەرە بمکوژە، وەرە بمکوژە."

لەسەر عەرزەکە لە پەنای ڕەوەزە مۆرە زبر و پڕ لە گرێیەکە، درێژ بوو. سەگەکە، سەگێکی بۆر کە پشتی زەرد دەچۆوە، سەگێکی مێگەل هێندەی ئەسپێك، لینگی هەڵێناوە و لە تەنیشت بەردەکە بە دەوەنێك هەڵدەمیزێ. دەست و دەموچاوی هەڵمساوە و گردە ڕانە بێ مووەکانیشی هەروا. گەسگەسکەکە سەگەکە وەخوروو دەها و سەگەکە لە تاو خورانی نێوگەڵی خۆی بە گەسگەسکەکە دەخورێنێ.

"ڕاوەستە، ڕاوەستە وەلی شەماڵ."

تەقەی تفەنگەکە لە ڕەوەزەکان گەڕا.

"سەیرکە مەستان."

خاکێکی ڕەش و ورد و نەرمی وەك ساواری لێ دەکەوێتەوە.

"ئەوە دەیبینی مەستان لێرە چەندەمان خاك پێ دەبڕدرێ. چەند دۆنم؟ دەی بڵێ چەند؟ ئاوەکەی قووڵە؟ ئەمن ئێرەم هەڵبژارد. هیی کەس نییە، بێ خاوەنە. کەپرەکە هەر ئا لێرە هەڵدەبەستین و پەرژین و چەپەرەکەشی خۆم دەیچنم. قامیشەکەی خۆم دەیهێنم و سەربانەکەی هەڵاش دەکەم... دیوارەکانیشی هەر خۆم سواغیان دەدەم. ماڵەکەشم هەر لێرە ساز دەکەین. کەپرێکی جوان. بە قامیش. ئەمن قامیشم خۆش دەوێ. بەداخەوە تۆزێك درەنگ وەخۆ هاتینەوە. درەنگ ئەقڵمان کەوتە کار. درەنگ وەخۆ کەوتین. بەڵام دەی باشە، زەرەر لە نیوەشی بگەڕێتەوە هەر باشە. لێرە، لەو ئاقچاسازە خاك و ملکێکی زۆر بڕ دەدەین. خۆ بە ئاوەکەدا بدە. ئەمن دەستت دەگرم. ئەگەر زۆنگاوەکە ویستی قووتت بدا، خۆم دەرت دەکێشمە دەرێ. دەی خێراکە بجووڵێوە، مەترسە، هیچ نییە."

ئاوەکە تا ئەژنۆ دەهات. تەرکی زۆنگاوەکە وەك بنێشت بە پێیانەوە دەنووسا.

گوتی:"باشە، باشە."

"لێرە دەکرێ بحەوێینەوە و نیشتەجێ بین."

"باشە، باشە."

"ئەرێ باشە هەتا ئێستا بۆ ئەقڵمان پێی نەشکابوو؟ هەر کەسە و مشوورێکی لەخۆی دەخوارد و دەحەسایەوە... ئێمەش سەگی پاسەوانی بەگەکان بووین..."

"باشە، باشە.

"باشە، باشە. کوڕە ئەقڵی جاحێڵی هەر وایە ئیدی. کە تفەنگێکت دەدەنێ، خۆت لێ دەبێتە پادشای کێوی قاف."

کە بەرەو چەقی زۆنگاوەکە دەچوو، گەیشتە پۆلە دەوەنە تووترکێکی چڕ. راوەستا و دەستی کردە سێبەری چاوەکانی و سەیرێکی ئاناوەرزا و رەوەزە مۆر و سوورە بریقەدارەکانی کرد و گوتی:"دەی باشە، باشە."

"باشە، باشە باران دەبارێ. خۆڵمان بەسەر. ئەو هەمووە پیاوەمان کوشت بۆچی؟ لە پێناوی هیچ. دەکرێ بڵێی باشترین نیعمەتی خودامان فەوتاندن. گەنجێتی... ئێستا ئەگەر بڵێن ها مێروولەیەك ئەزیەت بکە، بیکوژە، نایکەم، نایکوژم. دەڵێی پاش فەوتاندن و بەفیڕۆدانی گەنجێتی، بنیادەم ئاقڵی دەکرێتەوە.

بنیادەم کە تەمەنێکی رادەبرێ، تازە نرخ و بایەخی مرۆڤ و جڕ و جانەوەر و تەنانەت گژ و گیا و پووش و پەڵاشیشی لێ روون دەبێتەوە."

"دەی باشە، باشە. زۆر باشە."

وەك مریشكێك كە ئاو دەخواتەوە، ئاوا زاری بەرەو ئاسمان كردبۆوە و لەسەری رۆیشت:"بە خودا باشە، زۆریش باشە. كوێر چیی لە خودای دەوێ دوو چاوی ساغ. بڕوانە، یەكەم ساڵ لێرە تەماتە دەچەقێنین، هۆ لەوێش باینجان... ئەها، چیی نەمابوو لەبیرم بچێ، هێندێ بامییەش لێرە... بڕوانە ئێرەوەش دەبێتە كێڵگە بیبەر. پێمەكەنە چاوەكەم، وشكی دەكەینەوە. ئەمن لە سەر سەری خۆم مەرج و گرێو دەكەم كە ئێرە وشك دەكەینەوە. بە پیر و بە پێغەمبەر هەر ئە لێرە كێڵگەیەكی باش بۆخۆمان دەستەبەر دەكەین."

"باشە. باشە. دەیكێڵین. خاكە چەور و بە پیتەكەی دەبریقێتەوە."

"باشە، باشە."

هەر یەكەم جاری بێ هەستی كردبێ هەوا هەیە، زۆر بە چێژ و لەزەتەوە تاسەبارانە و یەك پشوو هەواكەی هەڵمشتە نێو سییەكانییەوە. دەماری ملی هەستا و شل بۆوە و لەسەری رۆیشتەوە:"دەبێتە كێڵگەیەك پڵنگی لێ دەرنەچێ. چڕ و پڕ".

"باشە، باشە. لێی دەرناچێ. جا سوێسكەتان بۆ دەگرن، هەموو رۆژێ نۆ دانە. تەپكەیەكت بۆ ساز دەكەم، سوێسكەی لێ دەرنەچێ. بە نۆ سوێسكە، خواردنێكت بۆ لێ دەنێم، قامكی خۆتی پێوە بخۆی."

سەری رووەو ئاسمان هەڵبڕی و تفی زاری قووت داوە. دیسان قووتی داوە. جارێكی دیكەش و لەسەری رۆیشت:"

"جا هەموو شتێك لە قابڵەمەكە دەكەم. هەر لە تەماتەوە بگرە هەتا باینجانی تازە و كەدو و بامیە و لۆبیا و بیبەری تازە لێكراوە و هەرچیی دڵت بیەوێ. تەماتەی سووری تازە گەیشتوو جا چ تامێكی هەیە. جا كە لە قابڵەمەدا لەگەڵ سوێسكەی قەڵەو دەكوڵێ و بۆن و بەرامەكەی لە دەشتەكەی ئاناوەرزا دەگەڕێ."

"باشە، باشە. زۆر باشە. زۆر زۆریش باش. گەنم و جۆ دادەچێنین. سووچێكیشی دەكەینە جێ خەرمان. خەرمانێكی پڕ نیعمەت و بەرەكەت دەبێ."

"باشە، باش. لۆكەیەكی لێ دەكەوێتەوە سوار بە ئەسپەكەیەوە تێیدا ون بێ."

ئەوەی گوت و لێوەكانی لستەوە.

لەو بەرەوە و لەوپەڕی دەشتەكەوە و لە سەرووی دار تووە چڕ و پڕەكانی نێو دەشتەكەوە، سوارێك بە نێو ئەو تەم و مژەدا كە لە تۆزێكی شینی شیرباو یان هەور دەچوو، دەهات. لە

خالێکی ڕەش دەچوو. ئەو خاڵە لە تەم و مژەکەدا جارێ کاڵ دەبۆوە و بچووکتر دەبۆوە، ون دەبوو و جارێ ڕەش دەچۆوە و لە دوورەوە وەك سێبەرێك دەکشا.

وەلی شەماڵ بانگی هێشت:

"لەوێ وەرە دەرێ، من دەڕۆم."

بەو پرسیارە تەوساوییەوە لە زەینی خۆیدا کە ئاخۆ ئەویش سوارەکەی دیتووە یان نا، بەرەو ئەو پیاوەی لە زۆنگاوەکەدا دەگەڕا، لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:

"ئەمن دەڕۆم و دەورێکی دیکەی زۆنگاوەکە لێ دەدەم، بەشکم جێیەکی باشترم پەیدا کرد. ئەتۆ لێرە چاوەڕێم بە."

مەستان هەرای کرد:

"نا، ئێرە زۆر باشە. ملکی کەسیش نییە... مەڕۆ، مەڕۆ."

وەلی شەماڵ وەك بای سەرسەر فڕی.

مەستان شلپەشلپ و بە هەشتاو و زراوچوو لە زۆنگاوەکەی دا، کە سەیری کرد وەلی شەماڵ نەماوە.

لە دەم زۆنگاوەکە دانیشت و چاوی لە ئاوە ڕەشەکە و لە قوڕەکە بڕی. تۆزێك لەولاترەوە، ژنەکەی لە بن داری قارەجان ئاگرەکەی کردبۆوە و خەریکی چێشت لێنان بوو. بۆنی ساواری بۆ هات. تاوێك دواتریش بۆنی ئیشتیابزوێنی ڕۆنەکە، کە لە تاوەدا دەقرچا، هەتا دوور دوور ڕۆیشت.

کوڕە گەورەکەی کە لە خۆی بەتەمەنتر دیار بوو، گوتی:"بابە خواردن ئامادەیە."

مەستان بە نقەنق و بەقورسی هەستا. کوڕەکەی گوتی:

"ئێرە باشترە. مامە وەلی شەماڵ بۆ کوێ چوو؟"

"چوو جێیەکی لێرە باشتر بدۆزێتەوە."

کوڕەکەی لێبڕاوانە گوتی:"نادۆزێتەوە."

منداڵ لە بن داری قەرەجان، بەرەو کۆڕی لاو و پیران کەوتنە ڕێ.

"خوشکەکەی مامە وەلی شەماڵ بە ڕۆیشتنەکەی زۆر تووڕە بوو."

ڕێك لەو کاتەدا بوو کە ئەو سوارەی بە لینگدان دەهات، چەند هەنگاوێکی مابوو بیانگاتێ، هەوساری ئەسپەکەی کێشا. بەڵام ئەسپەکەی ڕانەوەستا، لایدا و هەتا تەنیشت

دارەکان چوو. سوارەکە لەوێوە سەری ئەسپەکەی وەرسووڕاندەوە و هەروا کە بەرەو لایان دەهاتەوە نەڕاندی:

"ئەو قامیشانەتان لە کوێ بڕیوە؟"

کەفەڵ و سینگ و گەردنی ئەسپەکەی شەڵاڵی ئارەقە بوو.

مەستان:"فەرموو جافر ئاغا، بەخێر بێی. منم، ئەمن مەستانم جافر ئاغا. دەمەوێ بەو قامیشانە کەپرێك بۆ خۆم هەڵبەستم جافر بەگ... لە ئاقچاساز بڕیومن. لەگەڵ وەلی شەماڵ دەمانەوێ لەو قامیشەڵانە بستە زەوییەك بۆ خۆمان بگرینەوە. دەمانەوێ ئیتر بەو سەری پیرییە لە ئاوارەیی و ماڵ بەکۆڵی... منم من، مەستان..."

دەنگە تووڕەکەی جافر ئۆز پۆلاد وەك تۆپ گرمەی هات:"هەر کەسێکی ببە، هەر کەسێکی کەیفی خۆتە، هیچ ئیزنت لە من وەرگرت کە لە قامیشەڵانەکەم قامیشت بڕیوە؟"

مەستان گوتی:"جافر بەگی ڕەسەن و ماقووڵم، لە ئەسپەکەت دابەزە و کووپێك قاوە بخۆوە، پاروو نانێك نۆشی گیانت بکە."

"ئەمن لە سەر سفرەی خەڵکی وەك تۆ دانانیشم."

ئەوەی گوت و ئەسپەکەی بەرەو پەرژینە نیوەچڵەکە لێ خوڕی و تێکی دا.

وەلی شەماڵ کە دیتی سوارەکە هات و لە لای مەستان ڕاوەستا، بەندی جەرگ و دڵی پسا و لە پشت دەوەنی پێنج پەڕێك خۆی مات کرد و لە دوورەوە چاوی بڕییە جموجۆڵی سوارەکە.

مەستان بە دەنگێکی پڕ لە تکا و پاڕانەوەوە گوتی:"تێکی مەدە بەگ."

جافر ئۆز پۆلاد ئەوجار ڕووی ئەسپەکەی لە مەستان کرد و تاوی دایە:

"ئەو قامیشانە تۆ بڕیوتن؟ چما قامیشەڵانی من ملکی بابت بوو؟"

بە قەمچی وەرگەڕایە سەر و گوێلاکی کوڕەکەی مەستان.

مەستان بە تووڕەییەك کە قەت لەخۆیدا شکی نەبردبوو، هەڵبوو:

"دەست ڕاگرە جافر بەگ؟"

بەڵام ئەو گوێی نەدایێ و پەیتا پەیتا بە قەمچی لە سەر و شانی کوڕەکە. کوڕەش بەبێ ئەوەی متەقی لێوە بێ و نێوچاوانی تێك بنێ و خۆی وێك بێنێ، قیت قیت ڕاوەستابوو و قەمچییەکانی نۆشی گیان دەکرد.

"دەست ڕاگرە جافر."

"ئەتۆ بۆت نییە لێرە بار و بنە بخەی و زەوی و زار بگریتەوە. ئێرە ملّکی منە. ئەتۆ پشتت بە کێ قایمە؟"

قەمچییەکان دادەهاتن.

مەستان بە غاردان خۆی گەیاندە بن دارە قەرەجانەکان و تفەنگەکەی لە جەوالێ دەرکێشا و سواری کرد و ئەژنۆی دادا و نەڕاندی:"دەست ڕاگرە جافر، ملت بشکێنە و لێرە بڕۆ."

جافر سەری ئەسپەکەی وەرسووڕاند و ڕووی لە مەستان کرد و لێی نزیك بۆوە. چیی لێی نزیکتر دەبۆوە، لوولەی تفەنگەکەی مەستانیش پتر بەرەوڕووی هەڵدەکشا. جافر بە دەنگێکی پێشخواردووانەوە گوتی:"لە ملّکی من بڕۆ دەرێ. ئەو قامیشەڵانە ملّکی منە و کەس بۆی نییە ئێرە داگیر بکا. وا باشترە لێرە بڕۆن: ئەگینا ئەوی دەیبینن لە چاوی خۆتانە. خوێنتان لە ئەستۆی خۆتان. ئەوە پێم گوتن."

نەڕەی تووڕەییەکەی لە ناخی دڵییەوە بەردا:

"بڕۆ جافر، ئێمە لەگەڵ وەلی شەماڵ لێرە بەعەرزمان داداوە، بڕۆ جافر. تا زیندووین ناتوانی لێرەمان وەدەر بنێی. ئێرەش هیی تۆ نییە، هیی هیچ کەسی دیکەش نییە، ملّکی خودایە، بڕۆ جافر."

جافر سەرێکی لەقاند، لە رکێفی دا و ڕووی کردە ئەو دەوەنە پێنج پەڕەی وەلی شەماڵی لە پشت مات ببوو. وەلی ئەو سوارەی دیت کە بەرەو لای دێ و خۆی بە ئاناوەرزادا کرد.

مانگ هەڵات. سێبەری لینگە درێژەکانی کەوتە سەر ڕەوەزەکان. ڕەنگە مۆرەکەی بەرەو شینێکی شیری و سوورایییەکەی بەرەو تاریکی دەچوو... سێبەرەکە لە حالێکدا وەك مار دەخوشی، دەشکایەوە و ڕوون دەبۆوە. ماوەیەکی زۆر لە بن شینایییە شیرباوەکە و لەسەر ڕەوەزەکان گەمەیەکی سەیری کرد. سوورایییە ماتەکەی شەوێ، تێکەڵاو لەگەڵ دەنگە ناخۆشەکەی کوندەبوو و هانکەهانکی زۆنگاوەکە و لوورەلووری چەقەڵان...

## ٥٧

ماهیر بەگ لە بنەماڵەیەکی هەژار و دەستکورت لە دایك ببوو و هەر بۆیەش بەخۆی دەنازی. هەر جارێکی دەرفەت و هەلێکی بۆ دەڕەخسا، بە زایەڵەی غروورێك لە دەنگیدا، دەیگوت:"ئەمن منداڵی بنەماڵەیەکم کە خێزانەکەیان لەبەر بێ نانی ئەوەندەیان کوولەکە خوارد، مردن."

بەنرخترین بنیادەم ئەو کەسەیە، کە لە کوورەی کوێرەوەری و کێشە و تاڵی و سوێرییەکاندا لەکڵ دەرهاتبێ. خۆڵ بەسەر ئەو کەسانەی کە بە ئێسك و پرووسکی رزیوی باب و باپیرانی خۆیان دەنازن. کوڕە وەرە بۆرە ئاغا و بەرماوەی دەرەبەگانیش خۆیان بە بنیادەم دادەنێن. کوڕە ئەو گەمژە بە ناز و نیعەمت پەروەردەکراوانە پێیان وایە باب و باپیرانیان ئەم دنیایەیان دروست کردووە. تەنەکەی بۆش و بەتاڵ. هەر دەڵێی لە لووتی فیلەوە بەربوونەتەوە.

کوڕە پیاو ئەگەر خۆی لەکڵ هاتبێتە دەرێ، بۆ تاقە رۆژێکیش چییە خۆشی نابینن. ئەوان ناچارن تا دەمرن هەر بە کوێرەوەرییەوە بژیێن و کۆسپ و تەگەرە لە بەر خۆیان لابەرن. چارەیەکی دیکەشیان نییە. یان دەبێ لە جێی خۆیاندا بچەقن، یان ئەگەر دەیانەوێ پێشکەون، نابێ بحەسێنەوە و بسەکنێن. ئەگەر ویستت لەو جێیەی خۆت ژوورتر بڕۆی، دەبێ لە گیان و غرووری خۆت مایە دانێی. هیچ شتێك بە مفتێ و خۆڕایی وەدەست نایە. لەم دنیایەدا هیچ شتێك لە جێگۆڕکێ گرانتر راناوەستێ. ئەگەر قانع بی بەوەی بە هەژاری لە دایك بی و بە دەستکورتییش بمری، پێویستیت بە فیداکاری و لەخۆبوردەیی نییە. بەڵام ئەگەر دەتەوێ، پێ لە بەرەی خۆت پتر راکێشی، گرانت لەسەر دەکەوێ و دەبێ خوێن و گیان و پیاوەتی و غرووتی لەسەر دابنێی.

کە بەرەو نیشتیمان دەگەڕایەوە، دەیتوانی زۆر پلەوپایە و سەرۆکایەتی و بەڕێوەبەریی گشتی و بەرپرسیارەتیی وا وەربگرێت کە پارووی لە رۆنێ بکەوێ. چونکە لەو کاتەدا نەك

ئەوروپا، بەڵکو وڵات و مەملەکەتەکەی خۆشی خوێندەواری زۆر نەبوو*. بەڵام ئەو پشتی کردبووە ناو و ناوبانگ و پلە و پایە و گەڕابۆوە شارۆچکە هەژارەکەی خۆی و ئەوەش بەلایەوە فیداکارییەکی گەورە بوو. خۆی پێی وابوو و هەر واشی دەگوت. خەڵکی شارۆچکەکەش لەوەدا هاوڕای بوون. کاتی گەڕانەوەی بۆ شارۆچکە جلوبەرگی جوان درواوی ڤیەننایی لەبەر و پێڵاوی بۆداپێستیی لەپێدا بوو. جا چونکە یەکەم کەسی شارۆچکەکە بوو کە قۆناغی دواناوەندی و زانکۆی تەواو کردبوو و فەرەنگی دیتبوو و لەوەش گرنگتر لەوێ خوێندبووی، ئەگەرچی دەیانزانی کوڕی کێیە و دایی و بابی کێن، کەس نەبوو رێزی نەگرێ. هەر هەموو بەپانەوە، هەر لە هەژار و دەستکورتی شارۆچکەوە بگرە تا دەوڵەمەندەکەی دەتگوت کێبڕکێیانە بۆ دەستگرتن و یارمەتیدانی.

لە دووەمین مانگی گەڕانەوەیدا لە ئەوروپاوە، رێیان بۆ خۆش کرد لەگەڵ کچەکەی زکریا بەگی، سەرۆکە تۆپەڵە و گووپنەکەی دایرەی تەلەگراف زەماوەند بکات و داوەت و زەماوەندێکی گەورەیان بۆ رێك خست و نەیانهێشت تاقە فلسێك چییە لە گیرفانی ماهیر بەگ خەرج بکرێ. دیارە هەر نەشی بوو خەرجی بکا. ئەو جێی شانازیی شارۆچکەکە بوو و شارۆچکەکەی خۆی پێ باشتر ببوو لەو پلە و پایە و پۆستانەی ئەگەر وەریگرتبان پارووی لە رۆنێ دەکەوت.

ئەوەی هەموو شتێکی بۆ رێکخست، زیرەکیی و بەمشوورییەکەی بوو. لەو کاتەدا ئەو زەوی و زارەی کەوتبوونە دەرەوەی کەوشەنی مڵکی بەگەکانەوە، کەس بە پووشێکی نەدەویستن.

بە دزییەوە ئەو رێگەیانەی تاوتوێ کرد کە دەیتوانی لەوێوە لە عەولخالق ئەفەنی نزیك بێتەوە. لە پێشدا خانوویەکی تەنیشت ماڵەکەی ئەوی بەکرێ گرت. دراوسێیەتی دەرمانی گەلێ دەردان بوو. هەر کاتێ رێی دەکەوتە ئەدەنە و ئەنکەرە، چیی ئەو کەیفی پێ دەهات، بەدیاری بۆی دێنا. عەولخالق خووی بە "ئەفییە"وە کە تۆز و گەردی گژ و گیای بۆنخۆش بوو، گرتبوو و لە ساڵانی تەمەنیدا بە سەدان قوتووی جۆراوجۆری ئەنفیەی کۆ کردبۆوە. ماهیر بەگ قوتووەکی ئەنفیەی لە عاج دروستکراوی پێ دا. دۆستایەتییەکەیان لە ماوەی ساڵێکدا گەیشتە ئەوەی عەولخالق ئەفەنی ماهیر بەگی بە "کوڕم" و ماهیربەگیش ئەوی بە بابە بانگ دەکرد.

---

* من بە داخەوەو تورکی نازانم، بەڵام پێموا نییە لە دەقە ئەسڵییەکەشدا ئاوا بێ و نووسەر لە بەراوردی تورکیا و ئەورووپادا پێی وابێ تورکیا دەبێ ژمارەی خوێندەوارەکانی لە ئەورووپا پتر بن. بە رای من ئەو رستەیە دەبێ بەو شێوەیە بێ:"... لەو کاتەدا نەك وڵاتەکەی بەڵکو ئەورووپاش خوێندەواری زۆر نەبوو..."

لە تەختی بنەوەڕا پتەویان داڕشت.

ڕۆژێکیان خەزێنە ملکەکەی خۆی لە "گۆك نال" هەر بۆ ڕیایی و پتر هاندانی عەولخالق ئەفەنی، خستە مەزایدەوە. بەلام کەس لەو مەزایدەیەدا بەشدار نەبوو. خاکی ئەو ملکە لە خاکە هەرە بە پیتەکانی ئەو دەوروبەرانە بوو. ئەو ملکە دەکرا بنەمای هەموو ئارەزووەکانی ماهیربەگ بێ. ئەوە یەکەم جێ پێی ئەو بوو لە چوکووراوادا. خەون و خولیاکانی لەوێ چەکەرەیان دەکرد و هەلێاندەدا و بەریان دەگرت.

ماهیربەگ لە گوندە کوێستانییەکان لەشکرێك خزم و کەس و لە نێو ئەوانیشدا مامێکی پیری هەبوو. زەوی و زارەکان بە ناوی ئەو مامەی و بە پارەیەکی زۆر کەم، سێسەد لیرە کڕدرا و ماهیر بەگ سالێك دواتر هەر ئەو ملکەی بە قیمەتی سێسەد و دە لیرە لە مامی کڕییەوە. ماهیر بەگ لەسەر ئەو باوەڕە بوو مالی خۆت توند بگرە و کەس بە دز مەگرە. هەر بۆیەش یەکێك لە خزمەکانی خۆی دنە دا کە سکالایەکی لەسەر تۆمار بکا بەو ناوەی ملکێکی ئاوا زۆر و پان و بەرینی بە نرخێکی زۆر کەم کڕیوە. دەی دیارە دادگاش ماهیر بەگی بە بێتاوان ناسی. ئیتر دادگاش مافی ئەو خاوەندارێتییەی بەو دا و جا لەمەودوا ئەو سەودا و مامەلەیە بەهیچ شتێ هەلنەدەوەشایەوە.

ملك و مال و خانووبەرەی ئەو هەرمەنییانەی دوای شەڕی ڕزگاریخوازیی دوور خرابوونەوە، وەك گۆشتی قوربانی دابەش و حەپەلووش کرابوو... ملکە گرانبابیەکان بە دەست ڕفێنەرەکانیانەوە مانەوە. ملکەکەی گۆك نالیش بەو جۆرە کەوتە چنگ ماهیر بەگ. هەر بەو جۆرە بوو.

ملکێکی هەزار دۆنمی لەو کات بەدواوە دەستی بەسەردا گیردرابوو و پان و بەرین و هەراو کرابۆوە و کرابوو بە دووهەزار دۆنم. بەلام ماهیر بەگ دیسانیش دوو قورتم و نیوی هەر مابوو. تەنانەت ئەگەر قەبالە و تاپۆی هەموو چوکووراواشیان بە ناوی کردبایە، تینوێتییەکەی نەدەشکا و چاوی تێر نەدەبوو. ماهیر بە هیچ عەرزێك چاوی تێر نەدەبوو. هەر کەسە و دلی بە شتێك خۆشە. ژن، پارە، کارخانە، ژیانی باشتر... ماهیریش خولیای زەوی و زار بوو. زەوی و زاری لە خۆی خۆشتر دەویست.

زۆنگاوەکە وردە وردە وشك دەبۆوە. ماهیر وای دانابوو ڕووبەری زۆنگاوەکە سەد و بیست هەزار دۆنمێك دەبێ. بەلام زەوییەکەی بەنرختر ببوو و هەر کەسە و لە جێی خۆیەوە چاوی تەماحی تێوە بڕیبوو و ئەوەش دەستڕاگەیشتن بەو زەوی و زارەی دژوارتر و ئەستەمتر دەکرد.

دەستڕۆیشتوویی و پارەی زۆر و دۆستی دەستڕۆیشتبوو و حیزبێکی وەك کێوی قاف لە پشت و ئیحتوبار* و پێگەیەکی تا بڵێی باشی لە بانکدا هەبوو. لەو نێوەدا تەنیا پشتیوانیی دەروێش بەگی کەم بوو. گرێکوێرەیەکی کەوتبووە کارەکەیەوە کە تەنیا بە دەروێش بەگ دەکرایەوە. بەڵام دەروێش بەگ رووی پێ نەدەدا. کەرێتییەکی کردبوو و دڵی دەروێشی ئێشاندبوو.

باشە دەروێش رقی چیی لێ هەڵگرتبوو؟ ئەو خۆ هیچ خراپەیەکی دەرهەق نەکردبوو و قەتیش پێی نەگوتبوو پشتی چاوت برۆیە. بەڵام زۆر بێ تاوانیش نەبوو. هەتا ئێستا، لە جێژنەیەکدا، یان بۆنە و دەرفەتێکی نەقۆستبۆوە و نەچووبووە سەردانی و نێوانی لەگەڵ خۆش نەکردبوو. لە حاڵێکدا دەرگای کۆشکەکەی بەگ بۆ هەمووان لەسەر گازی پشت بووە. هەر کاتێکیش تووشی هاتبێ و هەڵکەوتبێ، ئەوا خۆی گرتبوو و بڵێی و نەڵێی بە سووك سەیری کردبوو و ئەوەشی لێ نەشاردبۆوە. دەی دیارە دەروێش بەگ کە موو لە ماست دەردەکێشێ، ئەو شتانەی لێ ناشاردرێتەوە. جا ئەوجار، هەر لە کۆنیشەوە چاوی تەماحی لە مڵك وماڵەکەی دەروێش بەگیش بڕیبوو. دەتگوت تا ئەو جێیەی پێی کراوە ئەو ویستەی بەنهێنی راگرتبوو، بەڵام وێدەچوو دەروێش بەگ لە رەگی قوونیشی تێگەیشتبێ. دەروێش بەگ هەرکاتێك چاوی پێی دەکەوت، رەنگێکی دێنا و دەبرد. هەستی دەکرد دەروێش بەرگ بە دیتنی ئەو تێك دەچێ و نیگاکانی هیچ خۆمانە نین.

ئێستاش ئەوە گەمەی گەردوون، ئەو گابەردەی خستبووە سەر رێیەکەی. بۆ ئەوەی بتوانێ ئەو زەوییانەی لە زۆنگاوێ هاتوونە دەرێ، بخاتە سەر زەوییەکەی خۆی، پێویستیی بە یارمەتی و پشتیوانیی دەروێش بەگ بوو. ئەو پارە و دۆست و حیزبی پشتیوانی هەبوو و دەستیشی دەڕۆیشت. بەڵام دەروێش بەگ چی؟ بەبێ پشتیوانیی دەروێش بەگ تەنانەت بستە خاکێکی ئەو زۆنگاوەشی پێ نەدەخرایە سەر زەوی و زارەکەی خۆی. ئەگەر دەروێش بەگ پێشی نەگرتبایە، هەرچۆنێك بوایە بەشی خۆی لە چنگی زۆنگاوەکە قوتار دەکرد. بەڵام ئەگەر دەروێش بەگ چاکەیەکی لەگەڵ کردبایە، لادانی هەموو کۆسپ و تەگەرەکان وەك ئاوخواردنەوە وابوون.

ئەگەر پێشتر، تەنانەت دوو ساڵ پێشتر، هەستی کردبایە حەوجێی بە دەروێش بەگ دەبێ، ئێستا وەك مێو نەرمی کردبوو و هەرچۆنێکی بێ، خۆ خستبووە بەر دڵی وی. بەڵام چاوی تەگبیری کوێر ببوو. کەرێتیی کردبوو و لە کەرێتییەکەشی دانەبەزیبوو. تەنانەت جارێکیان لە

---

* ئیحتوبار: اعتبار. ئیعتیبار. ئەوە نەخوێندەوارەکانمان وشەی اعتباریان ئاوا تێك شکاندووە و من پێم وایە کاتێ وشەیەك لە زمانێکدا جێدەکەوێت و تێکدەشکێنرێت مافی ئەوەت هەیە وەك مڵکی خۆت بەو تێکشێنراوییە بەکاری بێنیت.

سەرخۆشیدا لە زمانی دەرپەڕیبوو و گوتبووی:"خاکی وەك ملکەکەی دەروێش بەگ نەك لە چوکووراوا بگرە لە میسریش دەست ناکەوێ. بەڵام ئاخ و مخابن وەها خاکێك بە دەست گەندوگوو و پاشماوەی دەرەبەگایەتییەوە بەفیڕۆ دەچێ. ئەو خاکە دەبێ بکەوێتە دەستی یەکێك کە قەدر و نرخی بزانێ. ئەو خاکە شارێکی پێ تێر دەبێ... ئەو خاکە بەنرخانە ئاخرییەکەی ڕۆژی خۆی دەکەونەوە دەستی خەڵکی بەتوانا و لێهاتوو، کە بتوانن ڕەعەمەلیان بێنن...."

لە شەڕی تۆڵە ئەستاندنەوەی ساری ئۆغلی و ئاغ یۆللییش دا تۆزێك جامینی مستەفا بەگی گرتبوو. چۆن دەیتوانی نەیگرێ؟ ئەو جانەوە وەحشییە، گەنجێکی بەژن و باڵا زراڤ و ڕووناکبیر و جوانچاکی وەك مورتەزا بەگی بە کوردە بۆرەیەك بەکوشت دابوو. پیاوەکانی حوکمەت ئێستاشی لەگەڵدابێ، وەك جاری جاران، وەك سەردەمی پادشایەتی قسەیان لە قسەیدا نەدەکردەوە. هەڵکەندنی ڕەگ و پنجی بیر و باوەڕ و دابونەریتە کۆنەکان لە دڵ و گیانی جەماوەری خەڵك کارێکی سەیر دژوار و ئەستەمە.

لە ساڵی رابردوودا ئەو هەمووە هەوڵ و تەقەلایانەی دابووی بۆ ئەوەی خۆ لە دەروێش بەگ نزیك بکاتەوە ونێوانی لەگەڵ خۆش بکا، هەمووی بەفیڕۆ چووبوون. ئەو تا ئێستا، خۆی بۆ کەس ئەوەندە سووك و بچووك نەکردبۆوە و ئەوەندەش بەکەم نەگیرابوو. غروور و پیاوەتییەکەی پێخوست کرابوو. ماهیر بەگ پیاوێك نەبوو سووك و سانا ئاوا لەخۆی بکا بەڵام چار نەبوو. هەر کەسێ تاوسی بوێ دەبێ ڕەنج و کوێرەوەریی ڕێگەی هیندوستان قەبووڵ بکا*. ئەو خەیاڵە گەورەی ئەوەندە شیرین بوو، هەموو تاڵی و سوێرییانەی بۆ شیرین دەکردەوە. ئەو ئامادەبوو هەموو سووکایەتییەك قەبووڵ بکا بەو مەرجەی بە ئامانج و مەبەستە پیرۆزەکەی بگات. خۆ ئەو شتانەی لە پێناوی هەر شتێکی دیکەدا قەبووڵ کردبایە، پێی سووکایەتی و بێ ڕێزی بوو، بەڵام لە پێناوی زەوی و بەرزراگرتنی نیشتیمان و بەرژەوەندییە بەرزەکانی وڵاتەکەیدا هەمووی بە دڵ و گیان دەکڕین. ملکێکی وای بە نەسیبی وڵاتەکەی دەکرد کە هەر کەس دیتبای، واقی وڕ مابایە. ملکێکی لە ئەمریکا و ئەورووپاش لە وێنەی نەبێ. لە ڕێگەی وەها مەبەست و ئامانجێکی بەرزدا سەری بۆ ئەو هەمووە بەڵایە شۆڕ کردبوو.

لەو یەك ساڵەدا جا چیی لە دەست دەروێش بەگەکان نەچێشتبوو. لەو یەك ساڵەدا ژەهر و ژەقنەمووتیان دەرخوارد دابوو و لە گیان بێزاریان کردبوو. بۆ نزیکبوونەوە و نێوانخۆشکردن لەگەڵی، بۆ خۆخستنە بەردڵی و دۆستایەتییەکی وەك عەولخالق ئەفەنی، چیی لەدەستی هاتبوو

---

* کورد دەڵێ: پیاو ماسی بگرێ قوونی "قولاپەی" تەڕ دەبێ.

کردبووی و هەموو جارێکیش بە سووکایەتی و تەوس و پلاران دەرکرابووە دەرێ. بەڵام دیسانیش هەر تەڕ نەببوو و دەستی هەڵنەگرتبوو.

رۆژێکیان دەروێش بەگ لەگەڵ مودیر ناحیە و شارەوان و بەرپرسانی شارۆچکەکە لە نادییەکەی شار دانیشتبوون. دیسان وەك هەمیشە، دەستی لە سەر دەسکە عاج نیشانەکەی دەمانچەکەی بەر پشتوێنەکەی بوو. ماهیر کە دیتی، دڵی خۆش بوو. دەرفەتێکی دەگمەن هەڵکەوتبوو. دەبوایە چیی هونەری هەیەتی بۆ برادەرگرتن، هەمووی بخاتە گەڕ. زەردەیەك لەسەر لێوان و بە چاوێکی پڕ لە گرشەی شادی، لێی چووە پێشێ.

"سەیرە، سەیرە، ئەمڕۆ کەری کێ لە گاڕانێ هاتووەتەوە کە بەگەکەمان، ئاغا و ئەفەنیی خۆشەویستمان بەسەری کردووینەوە؟ کوڕە بای شەماڵ هاتووە و گوڵی هێناوە. یاخوا بەخێر بێی ئاغا. نادییەکەمانت بە پێ و قەدەمت رازاندەوە. یانی رێی تێچووە جار و بارە ئاغا و سەروەری خۆشەویستمان پێڵاوی بنێتە سەر چاوانمان و گەورەمان بکات و ئەو شانازییە بە نۆکەری خۆی ببەخشێ...."

بە کڕنۆش و خۆ چەماندنەوە خۆی گەیاندە دەروێش بەگ و دەستی بۆ درێژ کرد، بەڵام دەروێش بەگ دەستی نەهێنا. ماهیر بەگ دەستی هەروا مایەوە. چیی کردبایە، باشتر بوو؟ لە بەر چاوی خاوخێزان سووك و چرووك ببوو. وەك منداڵێکی ساویلکە و چەقاوەسوو پڕی دایە دەستی دەروێش بەگ و گوشیی و گوتی:

"خوای نەخواستە هەڵە و خراپەیەکمان بەرامبەر بەگمان نەکردبێ؟ ئەگەر نەچوومەتە زیارەتیان، لەبە ئەوەیە نامەوێ سەر و دڵی بگرم. ئەگینا بەگ خۆشەویست و ئازیزمانە. ئێمە بەگی خۆمانمان خۆش دەوێ و دەیپەرستین. بەگمان سەروەرمانە. تاجی سەرمان و گیان و جگەرمانە. ئەگەر بێت و خوای نەخواستە رۆژێك لە رۆژان بەگمان دڵی لێمان ئێشابێ، ئێمە چیی لەدەستمان بێ دەیکەین بۆ ئەوەی دڵی چاك بکەینەوە. پێشینیان واتەنی: لە بچووکان هەڵە و لە مەزنان لێبوردەیی."

دەروێش بەگ رەنگی هەڵبزڕکا بوو و نێوچاوانی تێك نابوو. لە حاڵێکدا پەڕەی لووتی هەڵدەبەزینەوە و توند توند دەسکی دەمانچەکەی گرتبوو و دەیگوشی، قیت و رەپ دانیشتبوو. خەڵکەکەش بە سەرسووڕمانەوە سەیریان دەکرد.

"منداڵ و سۆمای چاوەکانمان بە قوربانی تۆزی رێگەی بن. ئەو بەڕێزە کە هەتا ئەمڕۆ بە تاقی تەنێ باری قورسی پاراستنی دابونەریتە کۆنەکانی تورکمانی مەزنی لەسەر شان بووە،

ئەگەر ئێمە پیاو بین، وەشوێنی دەکەوین و لێی لانادەین. هەر ئەوەیکە لەو خەباتەدا بەتەنیامان جیٚ هێشتووە، هەقێتی لێمان زویر و تووڕەش بیٚ و هەر چاویش لە چاومان نەکا و تەنانەت تفیشمان لە رووی بکات. ئەمن لە ئینگلیز بەو چاوانەی خۆم بەرینبوونەوە و پەرەگرتنی هەمە لاینەیە ئیمپراتۆریام بینی. رووگەی ئەنگلیکانیش رووگەیەکە وەك تورکمانەکانی ئێمە و بگرە بچووکتریشە. هەر ئەو هۆزە بە پشتبەستن بە دابونەریتەکانی خۆیان ئیمپراتۆریایەکیان.... بەگی ئێمە...."

"وەچەی ساری ئۆغلّییش، تورکمانی چوکووراواش بە دابونەریتەکانییەوە ئیمپراتۆرییەك..."

دەروێش بەگ بە ئاماژەی دەستی راستەی کە لەسەر دەسکی دەمانچەکەی لایبردبوو، لای دا وەك ئەوەی بۆگەنێکی ناخۆشی بۆ هاتبیٚ، لچ و لووتی قرچ کرد و نێوچاوانی تێك نا و بە لۆق هاویشتن و بەپەلە بەرەو لای دەرگاکە چوو و بەبیٚ ئەوەی ئاوڕێك بداتەوە، لەویٚ رۆیشت.

تاوێك هەموو ولّات بێدەنگ بوو. بێدەنگییەکی ئەوتۆ کە گوێت لە بالّی مێش دەبوو. هەر ماهیر بەگ خۆی بێدەنگییەکەی شکاند:"پێی وابوو گالّتەی پیٚ دەکەم."

بە بزەیەکەوە چاوێکی داگرت و لەسەری رۆیشت:"کوا مەبەستم گالّتە و جەفەنگ بوو؟ نە بەخوای. چما حەدم چییە گالّتە بە بەگی هۆزێکی مەزن و بەشکۆ بکەم کە بە باپیرە و رەچەلّەکی عوسمانییەکان ناسراوە. لەگەلّ کیٚ؟ لەگەلّ دەروێش بەگ، لەگەلّ حەزرەتی دەروێش؟ دابونەریتی ئێمە، نەریتی ئۆغۆزەکان و نەریتی ئەسپ... ئەوەی لەناومان دەبات و ئەوەی دەمان فەوتێنیٚ، مەکینەی تووك لێکراو، ئەوە داهێنانی کافرانە."

مودیر ناحیە و شارەوان و خەلّکەکەی دی کە لە دەوری دانیشتبوون، لەبەر دلّی ئەو پێدەکەنین.

"لە حالّێکدا ئەسپەکە لەسەر پێیە، ئەو بیٚ مالّ و حالّ و بیٚ ولّاتانە، ئەو هیچ و پووچانە، حەزیان دەچێتە سەر فڕۆکە جێت، کە ناموسلّمانەکان دروستیان کردووە. ئەو خەیانەتکارانە دەبیٚ سەریان پان بکرێتەوە، هەر هەموویان..."

لە نێو تریقانەوەی قاقاکاندا ماهیر بەگ قسەی تەواو بوون و ئاوا بە تەوس و قسەی فشقیات، غرووره تێك شکاوەکەی خۆی رزگار کرد.

بەڵام دەروێش بەگ وەك بە چاوی خۆی دیتبێتی، ئاوا بە گوێی گەیشتەوە کە پاش ڕۆیشتنەکەی چ قەوماوە. لەو شارۆچکەیەدا شتێك نەبوو بکرێت و ئەو پێی نەزانێتەوە. بەخۆی گوت:"جا ئیی من و تۆ مابێ ماهیری سەگ باب. دەبێ بتڕێنم بە گۆڕی باب و باپیرەتدا...."

ماهیر دوای ئەوەی خۆی بە ئاو و ئاگردا کرد بۆ ئەوەی نێوانی لەگەڵ خۆش بکات، بەڵام بۆی نەچووە سەر. دەروێش بەگ نەرم نەدەبوو.

نەریتی هەرە ناوداری تورکمانەکان کامەیە؟ میوانداریێتی. لە چوکووراوادا کێ لەهەمووان میوانگرترە؟ دەرویش بەگی ساری ئۆغلی. ڕۆژێکیان لێی سوار دەبێ و دەچێتە بەردەرگای دەروێش بەگ و دەڵێ:"میوان خۆشەویستی خودایە. ئەمشەو میوانی تۆ دەبم." چاری ناچارە و دەڵێ:"پێڵاوت لەسەر چاوان." بەو جۆرە لەسەر سفرەکەی دەروێش بەگ دادەنیشێ و هەل و دەرفەتی بۆ هەڵدەکەوێ سەرەداوێك بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی نێوانی لەگەڵ خۆش بکات.

دوانیوەڕۆی ڕۆژێك سواری ئەسپەکەی بوو و رووی کردە کۆشکەکەی دەروێش بەگ. بە ئانقەست بە سواری ماشێنەکەی نەچووبوو. لەوانەبوو دەروێش بەگ بڵێ ئەمن میوانی ماشێن سوار راناگرم. لەوانەش بوو کەیفی بەوانە نەیە کە سواری ترۆمبێل دەبن.

بە دەم ڕێگەوە، زۆر کەیفی بەو دۆزینەوەیەی خۆی دەهات. دەروێش بەگ بە پێی ڕێو ڕەسمێکی تورکمانی ناتوانێ میوان لەماڵەکەی خۆی دەربکات تەنانەت ئەگەر ئەوەی لێی میوان دەبێ کوڕیشی لێ کوشتبێ. چاکی بەسەردا کەوتبوو. ئەو بەڵای نەریتە هەر فریای ئەو نەکەوتووە، بەڵکو تۆزێکیش بەکاری خەڵکی دیکەش دێ. بەکاری ئەو کەسانەی نەریتەکان زیانیان پێ گەیاندوون.

دەمەدەمی ئێوارە، گەیشتە بەر دەرگای کۆشکەکەی دەروێش بەگ. بەو نۆکەرەی جڵەوی ئەسپەکەی بۆ گرتبوو، گوت:"بە بەگ بڵێ، ماهیر قاباقچی ئۆغڵوویە. میوان خۆشەویستی خودایە و هاتووەتە ماڵەکەت و حەز دەکات ئەمشەو لە بن میچی کۆشکەکەی ساری ئۆغڵیی رەسەنزادە رۆژ بکاتەوە."

زایەڵەیەك لە دەنگی دابوو کە دەیگوت:"دەروێش بەگ ئاوات دایك دەگێم..." جا چ گوویەك دەخۆی بیخۆ.

بەگ لە ڕێوە بۆی چوبوو، کە ماهیر بەگ مەبەستی چییە، گوتی:"ماهیر بەگ بەرنە دیوەخانەکەی نهۆمی خوارەوە."

ئەسپەکەیان بردە گەوڕ و خۆیان فەرموو کرد بۆ ژووری میوانان. ژوورەکە بەڕەی کۆنی لێ ڕاخرابوون. هەموو شمەك و کەلوپەلەکانی کۆن و چڵکن بوون.

کرێکاری گەڕۆك و خەڵکی غەوارە و ڕێبواران لەو ژوورەدا میوانداریيان لێ دەکرا. ماهیر بەگ هەر چاوی بە ژوورەکە کەوت، دووقڕانییەکەی کەوت و زانیی دۆڕاندوویەتی. بەڵام دیسان وەسەر خۆی نەهێنا و چاوەڕێ ما. بەشکم بەگ خۆی بێ و بەخێرهاتنێکی بکات. تاریکان بەسەردا هات و چرای ژوورەکە داگیرسان. بەڵام نە دەروێش بەگ سەری لە ژوورەکە نا و نە کەسێکی دی. دیار بوو مزەفەریش لە ماڵێ نییە، ئەگینا تا ئێستا فریای کەوتبوو. زەبرێکی دیکەشی خواردبوو. کردبوویانە نێو ژووری کرێکارە غەریبەکانەوە و حیسابی سەگێکیشیان بۆ نەکردبوو. نەهاتنی خانەخوێ بۆ بەخێرهێنانی، لەگەڵ نەریتی میوانداریێتیی یەکی نەدەگرتەوە. ئەو بنیادەمە کابرایەکی ساختەچی بوو. کابرایەك بوو کەڵکی خراپی لە نەریتەکان وەردەگرت. دەبێ هەموو شتێکی لێ لەقاو بدات.

تۆزێك دواتر نۆکەرێکی شڕ و چڵکن هات و تۆقەی لەگەڵ کرد و گوتی:"بەگ ناردوومی بەخێرهاتنت بکەم. بەگ زۆر ماندووە و خۆی نەیتوانی بێت." و ئیتر گەڕایەوە و ڕۆیشت.

دوای ئەو، لە سینییەکی گەورەدا خواردنیان بۆ هێنا و لە نێوەندی ژوورەکە بۆیان دانا. چەند نۆکەرێکی سەر و گوێلاك ئاڵۆز و چڵکن هاتن و گوتیان:"بەخێر هاتی، فەرموو بخۆ."

ئەوەیان گوت و لەسەر سفرەکە دانیشتن. یانی ئەوانەیشی لەگەڵ بووە. دەستی کە لە داخان دەلەرزین، برد و پاروویەکی هەڵگرت و کشایەوە. نۆکەرەکان وەرگەڕانە خواردنەکە و بە چەند قەپووچکەیەك ماشتیانەوە. هەر دەتگوت ساڵێ جارێك بە هەڵکەوت نیعمەتێکی ئاوایان بۆ هەڵدەکەوێ.

ماهیر بەگ دەتگوت زانیوێتی مزەفەر لە ماڵێ نییە، بەڵام دیسانیش پرسیاری کرد:"مزەفەر بەگ لە سەرێیە؟"

ئەوانەی لەوێندەر بوون بە سەر گوتیان نەخێر و سینیی خواردنەکەیان هەڵگرت و وەدەر کەوتن.

هەموو گیانی دەلەرزی و لە حاڵێکدا هیچ ڕۆچنەی هیوایەکی لە دڵیدا نەبوو کە دەروێش بەگ ئێستا و ئەگەر بۆ ساتێکیش بێ، سەرێکی لێ بدات، لە تەنیشت بوخچە و نوێنەکەی چاوەڕوان مایەوە. بەڵام کە هیوای بە هاتنی نەما، لە ژوورەکەی هاتە دەرێ و بانگی ئەو پیاوە چەکدارەی کرد کە لەبەر دەرگا کێشکی دەکێشا.

"کێشکچی، کێشکچی... ئەسپەکەم بۆ بێنە رۆڵە. ئەمن دەبێ بڕۆم. بەڵام وا باشترە بە بەگ نەڵێی. باشە؟"

جا دراوێکی پەنجا لیرەی لە مستی کێشکچییەکە نا. کێشکچییەکەش کە بە چراپێڵەکەی سەیری دراوەکەی کرد، هەر پێی سەیر بوو. ئەو پارەیە بۆ وی سامانێك بوو. دەسبەجێ رای کردە گەوڕەکە و ئەسپەکەی ماهیر بەگی هێنا و رکێفی بۆ گرت و یارمەتیی دا سوار بێ.

ماهیر بەگ دوای ئەوە ئیتر هیوای بە ئاشتبوونەوە لەگەڵ دەروێش بەگ نەما و مەسەلەکەی راشکاوانە لەگەڵ مزەفەر باس کرد.

"زۆنگاوەکە خەریکە وشك دەبێ براله. گوندی، وەك مار و مێروو رژاونەتە سەر ئەو خاکە و هەر کامەیان خەریکن لە گۆشەیەکەوە دەیخۆن. ئەگەر درەنگ وەخۆ بکەوین، گوندی و بەگ و ئاغاکان ئەو سەد هەزار دۆنم زەوی و زارەمان لە چنگ دەردێنن. ئیزن بدە با بێ پێچ و پەنا قسە بکەین. براله، ئەمن لەبەر چاوە ڕەشەکانی بابت نییە کە دەمەوێ لەگەڵی ئاشت ببمەوە. لە خۆڕاییش نییە ئەو هەمووە تەوس و سووکایەتییەی لێ قەبووڵ دەکەم و سەری لەبەر دادەنوێنم. ئەوە هەمووی لەبەر خاتری ئەو زەوی و زارەیە کە هەر بستێکی خوێنی کوڕێکی شیرین دێنێ. ئێستاش جوان و زەریف گوێ بگرە. براله، مزەفەر بەگ، ئەمن پارەم هەیە، حیزبم هەیە و زۆر شتی دیکەش، بەڵام لە شتێکم کەمە. ئەویش پیاوە. بابی تۆ پیاوی زۆرە و خەڵکی ئەو لایەش قسەی دەسەلمێنن. دیارە ئەگەر بمەوێ خۆ دەتوانم بە پارە هەزار شایەتی بەدرۆ ساز بکەم و خەڵکی دەستڕۆیشتوو رەگەڵ خۆم بخەم. خۆ ئەگەر بتەوێ هەرچی کارمەندی پایەبەرزی حکوومەتە لە شارۆچکەدا دەیکڕم. لە مودیر ناحیەوە بگرە هەتا سەرۆکی دارایی و سەرۆکی پۆلیس و هەر هەموویان بە پارە دەکڕدرێن. ئەمن تەنیا شتێکی لە بابتم دەوێ ئەوەیە چەت لە کارەکانم نەخات و بەردم نەخاتە سەر رێ. ئەگەر ئەو مەیلی لێ نەبێ و رازی نەبێ، ئەو گوندییانەی بۆ دراوێك دێن و شایەتی دەدەن، ئیتر شایەتییەکەیان نادەن. تەنانەت ئەگەر هەزار لیرە، دە هەزار لیرە، سەد هەزار لیرەش بدەم، شایەتییەکەیان نادەن کە زەوی و زاری ئەو زۆنگاوە هیی منە. لە حاڵێکدا کە ئەگەر ئەو لای من بگرێ و بە هەر کامەیان بڵێ، بچۆ لای مودیر ناحیە و سوێندێ بخۆ و بڵێ هەموو کێڵگەی چوکووراوا ئیی ماهیر قاباقچی ئۆغڵییە و هەمووی میراتی بابێتی پێی گەیوە، دەچن و شایەتی دەدەن. هەموویان شایەتی دەدەن. هەر لە پیری بەساڵاچۆوە بگرە هەتا گەنجی حەڤدەساڵان. ئەوان پێیان وایە ئەگەر بۆ بەگی خۆیان درۆ بکەن، نەك گوناح نییە، خێریشی هەیە. پارە لە من، حیزب لە من و رازیکردنی

بەرپرسەکانیش لە من، تەنیا شایەتییەکان لەسەر ئەو بن. تەنانەت شایەتیشم ناوێ. هەر ئەوەندە خۆی تێهەڵنەقوتێنێ...."

بڕوانە براله، هەر ئێستا نزیکەی شانزە هەزار دۆنم خاکی لە زۆنگاو دەرکێشراو حازر و ئامادەیە. خاکێکی شەقڵ نەشکاو، بەپیت و بەرەکەت. خاکێکی وەك زێڕ و ئەڵماس و پلاتین. خاکێك کە یەك و سەد بەرهەم دەدات. حازرم ئاد و پەیمانی لەگەڵ ببەستم کە ئەگەر کارەکەم سەر بگرێ، نیوەی بۆ من و نیوەی بۆ ئەو بێ. یانی هەرچی خاکێك کە لە زۆنگاوەکە بە نەسیبمان دەبێ، پێکەوەی بەش دەکەین. نابێ وەها دەرفەتێك لەکیس بدات. پیاوی ژیر، تا تەندوورەکە گەرمە، نانی خۆی پێوە دەدات. رۆژێك وای لێ دێ، ئەو گوندی و ئاغا و بەگانە وەك گورگی برسی هرووژم دێننە سەر ئەو خاکەی چوکووراوا. هەر بەردەی بناغەی مڵکدارییە گەورەکان و سەروەت و سامانە زۆرەکان، لەو قۆناغە نیوە خەوتوو و نیوە بێدارییانەدا دانراوە. دەبێ ئەو هەلە بە دەرفەت بزانین. بچۆ و بابت رازی بکە. گوتم، ئەگەر راستیت دەوێ ئەمن لەبەر رەچەڵەك و رەسەنزادەبوونەکەی نییە ئەوەندەی مەرایی لەبەر دەکەم. لەبەر بەرژەوەندیی خۆم و داهاتووی خۆمە ئەو هەمووە سووکایەتییەی لێ قەبووڵ دەکەم. دیسانیش لەبەری دادەنوێنم. چار نییە. خەزێنە و گەنج بە بێ رەنج دەستەبەر نابێ. ئەمن هەر لە ئێستاوە داهاتووی ئەو چوکووراوایە وەك رۆژی روون لەبەر چاومە. دیسانیش دەیڵێمەوە، هەموو شتێك لە من، پارە و هەوڵ و راکەراك و هەموو، تەنیا شتێکم لەو دەوێ، ئەویش ئەوەیکە ئەو بێ لایەن بێ و کاری بەسەر هیچەوە نەبێ. هەر ئەوەندە. ئێوەش داهاتووتان هەیە. سەیر کە، چەند بران؟ چوار؟ پێنج؟ شەش؟ وای دانێین، مووم لەسەری زمانی بێ دووانیشتان بەتۆڵە تێدا چوون، دیسان چوارتان دەمێنن. وایە؟ ئەگەر ئەو مڵکەی هەتانە بەسەر چوار کەسیدا دابەش بکەن، یەکی چەندەتان پێ دەبڕدرێ؟ ئیتر هیچ پارچەیەکی ئەو زەوییە بەکار نایە. لە حاڵێکدا ئەگەر بێت و بەگ چەت لەو کارە نەها و پشتی من بگرێ، ئەو هەمووە زەوییە دەست لێنەدراوە چاوەڕوانتانە. پێموایە تۆ ئاوا دەتوانی بابت قایل بکەیت."

ماهیر بەگ هەر قسەی کرد و لێی رست. وای باسی خاکەکە دەکرد مزەفەر لیکاوی بەزاریدا دەهاتە خوارێ. دوای ئەوە، ئەویشی سواری ترۆمبێلەکەی کرد و ئەو عەردانە نیشان دا کە لە زۆنگاوەکە هاتبوونە دەرێ. پێشانی دەدا و دەیگوت:"سەیری بکە بەگی من، ئەوە خاك نییە، بەرەکەت و سەروەت و سامانە. خۆ بۆنی عەترەکەیت بۆ دێ؟ هەر دەڵێی بەرامەی

میسك و گوڵاوە. بنیادەم مەست و سەرخۆش دەکات. هەر حاسڵات و بەروبووی یەك ساڵی بەشی تا مردنی بنەماڵەیەك دەکات."

چاوی قیچ کردبوون و بۆنی بە خاکەکەی نێو لەپی دەستییەوە دەکرد و بە جۆش و خرۆشێکی پترەوە دەیگوت:"تۆ خوا ئەو خاکە حەیف نییە بە مفت و خۆڕایی بکەوێتە دەستی کەسانی دیکەوە؟ ئەویش لەبەر خراپ لێك تێگەیشتن یان زویربوونێك یان چووزانم لەبەر چی، وانییە؟ کوڕە لێ گەڕێ با ئەو خاکە بۆخۆمان بێ و بابت من بکوژێ."

مزەفەر گەنجێکی ژیر بوو. قسەکانی ماهیربەگی بەر دڵ کەوتبوون. زەوییە پان و بەرینەکە لە بەر چاوەکانی وەك کچۆڵەیەك دڵیان دەڕفاند و چاوەکانی بریسکەی حەز و ئارەزوویان لێ دەبۆوە. هەر بە راستی ئەو خاکەی لەو بەر خۆرە خۆی هەڵخستووە، جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ کیژۆڵەیەکی نازداری نووستوو؟ خاکەکە ماهیر قاباقچی ئۆغلیی پتر سەرخۆش دەکرد.

ئەو گەنجانە ژیرن. قسەی بەجێ و رێیان دەچێتە گوێ. قاباقچی ئۆغڵی تێگەیشتبوو کە مزەفەریش وەك خۆی وەختە بۆ ئەو خاکە شێت بێ. دەروێش ناتوانێ بە قسەی ئەو هەست و ئیحساسەی کوڕەکەی نەکات. ئەگەر بیەوێ مل بابدات، ئیتر لەوەودوا ژیانی لێ دەبێتە دۆزەخ. بەڵام ئەویش لە کڵی جەهەننەمی ژیاندا خاراوە.... باشە تۆ دەکرێ بڵێی پیاوێکی ئاوا کە سات بە سات لەگەڵ ترسی مەرگا دەژی و بەردەوام دەستی بە دەمانچەکەیەوەیەتی، زیندووە؟ دەکرێ بڵێی دەژیێ؟ هیچ بنیادەمێك ئەوەندە تاقەتی ئازار و عەزابی دەروونی ناهێنێ و هەرکەسێکی دیکە لە جێی ئەو بوایە، هەتا ئێستا حەوت کفنی دڕاندبوو. رەبی خودا ژیانێکی ئاوا بە نەسیبی گورگی بیابانیش نەکات. لە ئێستاوە خەرمانێکی ئاگر لە دڵی مزەفەردا کڵپە دەستاند و لە تاو ئەو زەوی و زارەی لە ئاقچاساز دەرکەوتبوو، بڵێسەی دەکێشا. جا دەروێش یان ملی بۆ ئەو کارە رادەکێشا یان لەو گڕەدا دەسووتا.

مزەفەر بە جۆش و خرۆشێکی منداڵانەوە چووە لای باوکی و مەسەلەکەی لەگەڵ هێنایە گۆڕێ و لە حاڵێکدا لیکاوی بەزاریدا دەهاتە خوارێ و زوو زوو تفەکەی قووت دەدا، دەستی کرد بە تاریفی ئەو خاك و زەوییەی دەیتبووی. دەی چ دەبوو لەبەر خاتری ئەوان، چاوپۆشیی لە کردەوەکانی قاباقچی ئۆغڵی کردبایە... ئەو خۆ هیچ شتێکی دیکەی لێ نەدەویست. دەی خۆ ئەوە هیچ نەبوو...

دەروێش بەگ لە ژیانی خۆیدا کوڕەکەی ئاوا نەدیبوو، ئاوا شێت و شەیدا و بە چەقوچۆوە لە ئاگری حەز و ئارەزوودا. هەر جارێکی دەگەڕایەوە لای ماهیر، ئەوەندەی دیکە بەجۆش و

خرۆشتر دەبوو. سەیرە، کەوابوو مزەفەریش دەیتوانی ئاوا شێت و شەیدای شتێك بێ. دڵی زۆر بەوە خۆش بوو چونکە ئەو پێی وابوو کوڕەکەی دەستەوستان و خەمسارد بێ.

دەروێش بەگ لەناکاو لەجێی خۆی هەستا، لەسەر خۆ و بەهێمنییەکی لەرادەبەدەرەوە گوتی:"کوڕی خۆم، من ناتوانم چاوم بقووچێنم و دەست لەسەر دەست دانێم و سەیری ئەو کابرایە بکەم  ئاقچاساز هەڵدەلووشێ. خۆ مڵکە چەند ملیۆنییەکەی گۆك نالیش کە دەڵێن هەر بە سێسەد لیرەیەك کڕیوێتی، مڵکی خەڵکە. من هەرگیز ناتوانم شەریکی دزی و گزییەکانی ئەو بم. دەیەوێ نیوەی زەوییە داگیرکراوەکە بدات بە من؟ گووی خوارد. لە ساری ئۆغلی ناوەشێتەوە هاودەستی یەکێکی ئاوا بێت. هەتا ئێستا پارووی حەرام لە گەرووی من نەچووەتە خوارێ. رۆڵە ئەمن ناتوانم باندێکی دزیکردن لەگەڵ ماهیر پێك بێنم بۆ دزین و بردانی زەوی و زاری ئەو میللەتە هەژارە. ئەمن لە هیچ مەسەلەیەکی بچووك یان گەورەدا، ناتوانم هاوکاری ئەو بم. ئەوە قسەی ئەوەڵ و ئاخریمە. بمبوورە کورم، ئەو گووە بە من ناخورێ."

کە لەو قسانە بووەوە، بەپەلە لە پلیکانەکان چووە خوارێ. خۆی خستە سەر ئەسپەکەی و وەك تۆپێکی رەش بە چەقی چوکووراوادا رۆچوو.

## ٥٨

لە پاش ئەوە، حەز و تەماحی زەویخواردنی مزەفەر بەردەوام لەگەڵ ملبادان و کەللەڕەقییەکەی دەروێش بەگدا بەگژ یەکتریدا دەچوونەوە. هەموو ڕۆژێ مزەفەر قاباقچی ئۆغلێی ئاگادار دەکردەوە:"مل نادا. هیوایەك نییە. قایل نابێ. هیچ هیوایەك نییە. ڕۆژ بە ڕۆژ سەرسەختتر دەبێ. ئیتر ماندوو بووم. دەرگاکان بەداخراوی دەبینم. کاری من نییە ئەو بوونەوەرە سامناکە ڕازی بکەم. تۆ دەفەرمووی چ بکەم؟ چار چییە؟"

ماهیر بەگ چەند مانگێك هەر چاوی بەسەر بەربەرەکانێیەکی مزەفەرەوە بوو. کە زانیی ئیتر باشاری دەروێش بەگ ناکات، بیری لە ڕێگەی چارەیەکی دیکە کردەوە. مزەفەر دیسان چیی لەدەستی هات کردی. پێی لەسەر ویست و داخوازییەکانی خۆی داگرتەوە و هاوکات هەوڵی دا دایکی و براکانی دیکەشی بخاتە لای خۆی و بەگژ دەروێش بەگیاندا بکات. ئەگەر ئەوەی توانیبا، ئیتر دەروێش بەگ لە ماڵەکەیدا گەمارۆ دەدرا و ناچار دەبوو دەست لەو سەرسەختی و لاسارییەی هەڵگرێ. خۆ ئەگەر تەنیا جارێك، هەر یەك جار دەروێش بەگ ڕێی بدات بچێتە لای، تەنیا یەك جارێ، ئەگەر جارێك ڕووبەڕوو قسەی لەگەڵ بکات، ئەگەر قسە بکەن، ماهیر کلیکی سندووقەکەی دڵی وی دەدۆزێتەوە، یەك جار، تەنیا جارێك ڕووبەڕوو...

مزەفەر چەندی کردی و کراندی نەیتوانی بابی قایل بەکا بەوەی بێڵێ ماهیر بچێتە لای.

بەڵام ئەویش ماهیر قاباقچی ئۆغلێیان پێ دەگوت. ئەو هەر ئەو کەسە بوو، کە لەو هەژاری و نەبوونی و گرانییەدا ئەو سەروەت و سامانەی وەسەریەك نابوو. دەستی بۆ هەر شتێك بردبایە، بە دەستییەوە دەهات. مەحاڵ بوو ئاوا سووك و سانا دەست لە ئاقچاساز هەڵگرێ. ئاخرییەکەی ڕۆژێك بە هەر فرت و فێڵێك بووە، ئەو نێچیرە دڵبەرەی لە زاری شێرێکی وەك دەروێش دەڕفاند. ئاوا سووك و سانا دەستی لە داخوازییەکەی هەڵنەدەگرت و

ئەو بەزینانە، مەیدانی پێ چۆڵ نەدەکرد. لە پێشدا خۆی هەڵمەتەکەی بردبوو و سەرنەکەوتبوو. ئەوجار کوڕەکەی لێ تیژ کردبوو و ئێستاش باقی ئەندامەکانی بنەماڵەکەی هەر لە ژن و منداڵەوە بگرە ت دەگاتە براکانی هەمووی تێبەردا بوو. خۆی دەیزانی بنەماڵەکەی ناتوانن قەڵاکەی دەروێش بەگ بگرن، بەڵام هەموو رۆژێ کەرپووچ و خشتێکیان لێ دەڕووخاند.

ئەوەندە بەس نەبوو. دەبوو لە لایەکی دیکەشەوە پەلامارەکە دەست پێ بکا. هات و هەر جارەی یەکێکی نارده لای دەروێش بەگ. هەر کامە و نامەیەکی دەدانێ و دەیناردنە کۆشکەکەی ساری ئۆغڵی. لە هەموو ئەو نامانەشیدا دەپاڕایەوە کە تەنیا جارێك، هەر یەك جار ئیزنی بدات بچێتە لای. بەگوێرەی پێویست رێزی نەگرتبوو. بچووك هەڵە دەکەن و مەزنان دەبوورن. لێبوردن نەریتە هەرە گەورەکەی تورکمانەکان بوو.

دەروێش بەگ رێگەی بە راسپاردەکان دەدا بچنە لای. نامەکانی دەخوێندەوە. لە پێشدا بەبێ ئەوەی متەقی لێوە بێ، راسپاردەکانی بەڕێ دەکردەوە. دواتر پەیکەکانی دەر کرد. ئاخرییەکەشی دوای خوێندنەوەی هەر نامەیەك، چاوی دەقووچاند و زاری دەکردەوە و شرت و شۆی نامەهێنەرەکەی دەردێنا. هەموو ئەو دژکردەوانە نیشانەی ئەوە بوون کە دەروێش ئاگای لێیەتی و ئاخرییەکەی نەرم هەر دەبێ. دڵی نەرم دەبێ و لەگەڵی ئاشت دەبێتەوە. ئاسۆی پەیوەندییەکانی چەندی تاریکتر دەبوو، ماهیر بەگ خۆی هەر دەدۆزییەوە و کاروبارەکەی رێك دەخستەوە.

هەرکاتێك سەردانی ئەو خاك و زەوییانەی دەکرد، کە لە زاری زۆنگاوەکەوە دەرکەوتبوون، لە خۆشییان سەری لەگێژەوە دەهات و دڵی تێکەڵ دەهات. خاکەکە بۆنی عەتر و میسکی دەدا. ئەو خاکە بەبێ کێڵان و داچاندنیش بەروبووی دەدا. ئەو خاکە نەرم و رەشە، بەپیت و ئاوس بوو. ئاوس بوو بە ژیانێکی نوێ وبەروبووی تازە. رووەکی ئەو خاکە کە هەزار ساڵ، سەد هەزار ساڵ لە بن ئەو ئاوەدا نووستبوو، دەبێ جۆرێکی دیکە بێ، مسۆگەر هەر جۆرێکی دیکەش دەبێ. گوڵە گەنمەکانی هەر یەکە و قولێك، گەنمەکەی هێندەی باڵای پیاوێك هەڵدەستێ و رەگ دادەکوتێ. ئەسپ لە گەنمەجاڕی دەرناچێ. گەنمەجاڕەکەی، گەنمەجاڕ نییە، دەڵێی قامیشەڵانە. هەر چڵە پەمۆیەکی هێندەی دارێك و هەر قۆزاخەیەکی پڕ بە مستێك، کە لە نێو هەرکامەیاندا لۆکەیەکی سپی وەك هەور دەرکەوتووە. لك و پۆپەکانی سێ هێندەی مێشەکانی دیکە. زۆر لەمێژ ساڵ بوو پوورە هەنگێکی لە رەوەزەکانی چوکووراوادا دیتبوو. پوورە هەنگەکە پڕ پڕ بوو لە هەنگوین و مێشە زەردباوەکان، بە باڵە روونەکانیان و بە وردە موو و

کلك و پشتی مەیلەوسوورییانەوە، لە بوونەوەرێکی سەیر و سەمەرە، لە پەپوولەیەکی سەیر و سەمەرە دەچوون. هەنجیرەکانی شیلەی لێ دەتکێ و هەر دەنکە ترێیەکی دڵۆپێك هەنگوین.

تەماتەی تورت و گۆشتن و سوور وەك خوێن... هەموو رووەکەکانی ئێرە درشت و هەراش و زەبەلاح... میوەی لەبەر شیرینی دەقەڵشن و خاکەکەی حاسڵی لێ هەڵدەقولێ. ئەگەر کچۆڵەیەك، بۆ یەك شەو لەسەر ئەو خاکە نووستبایە، بەیانی بەدووگیانی هەڵدەستا و ئەگەر گەنجێك لەسەری نووستبا، خاکەکە لێی دووگیان دەبوو. خاکەکە بۆنی تۆو و ئاوڵەی دەدا. هەڵدەستا و "زا و زێ"ی لێ هەڵدەقولێ. بەرەکەتی خاك لە گیانلەبەرەکانییەوە دیارە. چڵ و پۆی گژ و گیایەکان لەبن قورسایی جرِوجانەوەرە درشتەکان، کە پشتی هەرکامەیان بە هەزار و یەك رەنگ و نەخش و نیگارەوە دەدرەوشایەوە، دادەێنەوە. باڵەکانیان لە بن پێستە رەق و رەنگاورەنگەکەیانەوە لەکاتی وەخەبەرهاتنیاندا دەکرێتەوە و کۆمەڵێك رەنگ لەبەر سوورایی و زەردی و شینایی و کەسکیی هەتاوەکە و... لە چاو دەدەن و نارنجی و مۆر و رەش بە چوار دەوریاندا دەپژێنن.

ئەو خاکە ئاوسە، شێتانە چیی هەیەتی دەیخستە روو. تەنانەت ئەگەر دەستت رێخشاندبا، پشتی خاکەکە وردە وردە هەڵدەستا و تژی لە ناز و لاواندنەوە، بۆ خۆنواندن و خۆ ئاشکراکردن دەکەوتە جموجۆڵ و جۆش و خرۆش. ماهیر بەگ بە چەند سەعاتان، هەر دەستی بەسەر پشتی ئەو خاکەدا دێنا. ئەو کەفوکوڵ و شەهوەتەی بە دەست لێدانی ئەو خاکە لە گیانیدا هەڵدەستا، لە هیچ شتێکی دیکەیدا نەدیتبوو. ئاخرییەکەی ئەو خاکەی داگیردەکرد و دەیخستە سەر مڵکەکەی خۆی. لەبری غروور و پیاوەتی و لەبری هەمووی سامانەکەی و بە هەر نرخێکی بڵێ، قەیناکا. تەنانەت بە نرخی گیانیشی.

"ئەگەر دەروێش بەگ نەیتە پێشێ، دەیکوژم. بەو دەستانەی خۆم دەیکوژم. هەمووانیش پێیان وادەبێ مستەفای ئاق یۆللی کوشتوویەتی."

کە دەیگوت:"دەیکوژم"، سەهۆڵی چێژێکی نامۆ لە ناخیدا دەتوایەوە. ئەو خاکە کاری چۆن فیداکاریی چۆنی دەوێ. کە لەناخەوە دەهەژا و هەڵدەچوو و هیچ رێگە چارەیەکی شك نەدەبرد، "وەلی" نۆکەرەکەی بانگ دەکرد.

"جوان و زەریف گوێ راگرە بزانە دەڵێم چی، هەمووی بە مێشکت بسپێرە، وەلی."

وەلی دەیگوت:"کورە بەسە. تۆ خودا لەوە پتر مەمنێرەوە لای ئەو نامەردەی دەڵێی لە لووتی فیلەوە بەربووەتەوە. کورە وەك سەگێکیشی بەلایدا نەرۆیشتبێ وایە. هەر نەفرەتی لێ بێ. ئاغا دەست و پێیانت ماچ دەکەم ئەو کارەم پێ مەسپێرە..."

ماهیر بەگ پێی دادەگرتەوە:"ئەمجارەش بچۆ. جارێکی دیکە. بەشکم ئەو کافرە دڵی نەرم بوو. دەنگی تۆ زۆر بەسۆزە. بەشکم کار بکاتە سەر دڵەکەی و ئیزنم بدات بچمە لای. ئەگەر ئەو ئەسپاردەیەت پێ جێبەجێ کرا، پەنجا دۆمت لەو خاکە، کە هەر لوێچێکی خوێنی کوڕێك دێنێ، دەدەمێ."

وەلی خۆی پێ نەدەگیرا، قایل دەبوو و دەکەوتە رێ....

## ٥٩

ئەو سوارەی بە ڕێی دەم زۆنگاوەکەدا دەهات، جاری وابوو لە تەپوتۆزدا ون دەبوو و دەردەکەوتەوە.

دەروێش بەگ ڕووی کردە جەیحوونی کوڕی و بە تەوسەوە گوتی:"قارەمانەکەت دیسان ڕاسپاردەی ناردووەتەوە."

بەگ زۆری کەیف بەو کوڕەی نەدەهات. هیچ هیوایەکی بە نێوچاوانییەوە نەدەدی کە بڵێ سبەینێیەکی گەشی دەبێ. تێی ڕانەدەدیت بتوانێ ئالآی بەرزی ئۆغوز، لە کەشکەڵانی ئاسمانەکاندا بشەکێنێتەوە. بەو حاڵەشەوە ئیزنی دەدا قسە و ڕا و بۆچوونی خۆی ڕاشکاوانە دەربڕێ. هەمووان پێیان سەیر بوو کە جەیحوون چۆن دەتوانێ لە هەنتەشی باوکیدا ئاوا بەجەرگ و ڕووهەڵماڵاو بێ. شتێك لە ناخی جەیحووندا هەبوو کە بەگی نەرم دەکرد.

"پیاوەکانی هەروا شڵەژاو و دڕدۆنگ دێن. کوڕە لە ڕەوتی ئەسپەکانیانەوە بزانە چۆن دەتوانی بیانناسیتەوە. ئەگەر سوارەکە شڵەژاوبێ، ئەسپەکەی خۆی وێك دێنێ و ئەگەر سوار بێ ترس و خۆف بێ، ئەسپەکەش وەك مەل دەفڕێ و ئازایانە دێتە پێشێ. هەر لە هەڵسوکەوت و ڕەوتی ئەسپەکەوە دەکرێ بزانی سوارەکەی دڕدۆنگە، خەمبارە، دڵخۆشە یان نوقمی بیر و خەیاڵ. ئەگەر لە ڕووی هەڵنەیە و تەریق بێتەوە، ئەوا ئەسپەکەش بە شەرمەوە ڕێ دەکات. ئەو سوارە لە شەمەرزارییانە حەز دەکات ببێتە دڵۆپە ئاوێك و بەرعەرزیدا ڕۆبچێ. حەزیشی لێ نییە بێ، بەڵام چ بکا ئەو داماوە. ئەگەرچی زۆر لێرەوە دوورە و ڕێگەکە پڕە لە هات و چۆی ڕێبواران، کە هاتە پێشتر، ئەوە دەیبینی، نێردراوی قابقچی ئۆغڵییە. ڕەوتی ئەسپەکەی درۆ ناکا. هەرگیز درۆ ناکات. چیی لە ناخی سوارەکەدا بێ، ئاشکرای دەکات. ئێستا تۆزێك ڕاوەستە. بەزەییم بەو ڕاسپاردانەیدا دێتەوە. هەمووان دێن و وەك قوڕنوو بە پیاوییەوە دەنووسێن. هەر بە ڕاست ئەو قاباقچی ئۆغڵووە بوونەوەرێکی چۆنە؟ هیچ دەزانێ غروور و

پیاوەتی چییە؟ زۆر بێ غیرەتە. لە ماست بێ رەگ و ریشەترە. ئاخر چۆن دەکرێ پیاوێك ئەوەندە بێ غیرەت و بێ ئابڕوو بێ؟ سەرم لێی سووڕ ماوە. بەڵام باش دەزانم چیی لێ دەکەم. ئەوەندەی سووك و چرووك دەکەم و لە گۆلاوی سووکبووندا دەیتلێنمەوە، تا بزانم بنیادەمێك دەتوانێ چەندە نزم ببێتەوە. کوڕە نزمی و سووکبوونیش وەك زۆر شتی دیکە بێ سنوورە. دەمەوێ ئەو بێ سنوورییە بەو چاوانەی خۆم ببینم. بێچووە بەرازێکی تاقیگەم کەوتووەتە بەردەست. دڵم نایە وا زوو بەری بدەم. ئەوەندەم پێم دەکرێ، ناچاری دەکەم وەك سەگ لەبەر ئەو دەرگایە کلکەسووتە بکا. دەبێ هەزار جار، ملوێنێك جار بێتە بەر ئەو دەرگایە. ئەوە دەیەوێ پووڵ لە پێستی گا بئاخنێ، یان قەباڵەکەی چوکووراوای بەنێو بکرێ. بەڵام ئەوە من نیم کە هەتا زیندووبم بهێڵم ئەو سەیە تەنانەت دۆنمە زەوییەکی ئاقچاسازیشی دەست بکەوێ."

دەروێش بەگ ئەوەندە لەسەرخۆ و گران و سەنگین قسەی دەکرد، جەیحوون سەری سووڕ ما.

"ئەو دەست لەم خاکەی ئاقچاساز کە بستێکی کوڕێکی شیرین دێنێ، هەڵدەگرێ یان وەك حەیوانێك ئەوەندە لەبەر ئەو دەرگایەم کلکە سووتە دەکات و قوونەخشکێ دەکات، نقوستان دەبێ."

جەیحوون بە لەبزێکی تێکەڵاو بە چاوقایمی و سەرسووڕمانەوە گوتی:"ئەی پێت وانییە تۆ لەهەڵەدا بی بابە؟ وا باشتر نییە تۆزێکیش بیر لە داهاتووی ئێمە بکەیتەوە."

جەیحوون کە ئەو قسەیەی دەکرد، هەموو شتێکی لەبەرچاو گرتبوو. ترسی ئەوە هەبوو بابی هەڵبچێت و رقەکەی خۆی بەسەر ئەودا برێژێ. دەروێش بەگ ئیزنی نەدەدا هیچ کەس قسەی لە قسەیدا بکاتەوە.

جەیحوون حەڤدەساڵان و لە مزەفەر منداڵتر بوو. قژی زەرد و گرژ و چاوەکانی کەسك و گەورە و گرێی گەرووی وەك هیی چینییەکان بەرز بوو. لەوانەیە هەر لەبەر ئەوەش بووبێ کە بابی زۆر لەگەڵی نەرم و نیان بوو.

بەڵام دەروێش بەگ نەك هەر هەڵنەچوو بەڵکو بە زەردەیەکەوە و بە لەبزێکی نەرم و نیانەوە گوتی:"پێم وانییە ناهەق بم کوڕم. ئەمن ئەوە نیم کە داهاتووی ئێوە بکەم بە قوربانی حەز و ئارەزووەکانی خۆم. ملکەکەی ساری ئۆغڵی ئەگەر بێت و خۆی پێوە ماندوو بکەی، نەك هەر تۆ و براکانت، بگرە خەڵکی گەورەدێیەکیش تێر دەکات."

جەیحوون لەو نەرم و نیانییەی بابی وەغیرەت کەوت و گوتی:"وای دانێین تێری بکات، بەڵام کوا چاو لە ماڵی دنیا تێر دەبێ؟ ئەگەر زەوی و زارەی ئاقچاساز ئێمە داگیری نەکەین، ماهیر

بەگ نەیکا، ئاغاکانی دیکە حەپەلووشی دەکەن و هیچ شتێك بۆ حوکمەت و ئەو گوندییانە ناهێڵنەوە، کە خۆت بە داشدیار و لایەنگریان دەزانی. ئەمن پێم وایە تۆ ناهەقی. بە قازانجمانە لەو مەسەلەیەدا لەگەڵ ماهیربەگ رێك کەوین."

دەروێش بەگ دیسان بە لەسەرخۆیی و نەرم و نیانییەکی دوور لە چاوەڕوانییەوە جوابی دایەوە:"بڕوانە کوڕم، با راشکاوانە شتێکت پێ بڵێم. ئەمن قاباقچی ئۆغلۆ بە پیاو نازانم و لە شانی منیشدا نییە لەگەڵی رێك کەوم. تەنیا پێم شەرمە بیریش لەوە بکەمەوە کە لەگەڵ یەکێکی وەك ئەو لەسەر یەك زەوی دەژیم و لە دنیایەکدام. چ بگا بەوەی قسەم لەگەڵ قسەی ئەو بکەمە یەك. کە ناچار دەبم سلاوی یەکی ئاوا بستێنمەوە، وەختە لەشەرمان بمرم و بێزم لە خۆم دەبێتەوە. ئێستا تێگەیشتی کوێم دێشێ؟ ئەمن کارم بە کاری ئێوە نییە. ئەنگۆ کەیفی خۆتانە چیی دەکەن بیکەن. تەنانەت بۆتان هەیە لەگەڵیشی رێك بکەون. بەڵام سەبارەت بە خۆت با پێت بڵێم، ئەگەر قەرار وابێ ئەتۆ وەك کاکە مزەفەرت و قاباقچی ئۆغلی بچی، ئاوات دەخوازم بمری و لەو گۆلاوە پیسانەدا نەتبینم.... ئاخ، برایم."

جەیحوونیش لە کولێژە ئەمریکییەکەی تەرسۆس دەرسی دەخوێند. دەروێش بەگ هەموو منداڵەکانی ناردبووە کۆلێژ و پێی وابوو ئەو شتەی ئینگلیزی کردووەتە ئەو ئینگلیزە، پێبەندبوونە بە دابونەریتەکانییەوە. ئەو تورکەی زمانی ئینگلیزی فێر بێ، لە سێبەری ئەو زانستەدا کە لێی فێر دەبێ، تورکبوونەکەی خەستتر دەبێتەوە و پتر سوور دەبێ لەسەر پاراستن و رەچاوکردنی دابونەریتەکانی. دەروێش بەگی داماو بیری لە لایەکەی دیکەی ئەو مەسەلەیە نەکردبۆوە. دیتبووی و دەیدی، بەڵام خۆی لە گێلی دەدا و لاسارانە خۆی لێ گێل دەکرد. ئەو وای خستبووە مێشکی خۆیەوە کە فێربوونی زمانی بیانی، جا بە پلەی یەکەم ئینگلیزی، وا دەکات بنیادەمەکان وەخۆ بێنەوە و فێریان دەکات رێز لە بەها و دابونەریتەکانیان بگرنەوە و وەك بنیادەم رایان دێنێ.

جەیحوون یەکەم جاری بوو ئاوا بە ئاسوودەییەوە لەگەڵ باوکی قسەی دەکرد. ئەو دەرفەتە نابێ لەکیس بدات. چونکە مزەفەر لە ژوورەکەی تەنیشتیانەوە گوێی لە قسەکانیان هەڵخستبوو. دەروێش بەگ ئیزنی بە مزەفەر نەدەدا ئاوا راشکاوانە قسەی لەگەڵ بکات... مزەفەر چەند رۆژێك لەوە پێش پێداگرانە داوای لێ کردبوو قسەی لەگەڵ بکا. ئێستا دەرفەتێك بوو رەخسابوو کە ئەو خۆی هەم پێشانی مزەفەر بدات و هەمیش دایکی و هەم پێشانی باوکی. باوکی پیاوێکی جوامێر بوو. لەو چوکووراوا پان و بەرینەدا کەس لە نەجیمی و گران و

سەنگینی و ڕێز و ئیحتوباردا تۆزی پێی باوکی نەدەشکاند. دەرفەتی وەها چەلەحانێیەك لەگەڵ پیاوێکی ئاوا گران و سەنگین و ماقووڵ بە نەسیبی هەموو کەس نەدەبوو. دەبوایە ئەو هەلە بە دەرفەت بزانێ و بیقۆزێتەوە و تێگەیشتوویی و چاوکراوەیی خۆی پێشان بدات و سەرنجی ئەو بۆ لای خۆی رابکێشێت و وای لێ بکات ڕێزی بگرێ.

"بەڵام بابە، ئاخر، زیندووەکان پێویستیان بە ژیانە. بنیادەم بۆ ئەوەی بژیێ، ناچارە مل بۆ هەندێ کێشە و کوێرەوەری شل بکات و وەك دەڵێن، کاتێ چەرخی گەردوون بەکەیفی تۆ ناسووڕێ، تۆ لەگەڵی بسووڕێ. لە هەر حاڵەتێکدا دەبێ چەندی دەکرێ باش بژییێ. بنیادەم دەبێ بەبێ ئەوەی ئاتاج و حەوجێی بە خەڵکی بێ، کارێك بکات خەڵك چاویان لە دەستی ئەو بێ. حەیا و ئابڕوو و ئەو شتانە... ڕەسەنایەتی و شتی وا... باشن، باشن، بەڵام ئێستا کەس بە پووشێکی ناوێن. ئێستا دەگمەنن ئەوانەی ئاوڕ لەو شتانە بدەنەوە. لە دنیای ئەمڕۆ دا ئابووری بنەمای هەموو شتێکە. دنیای ئەمڕۆ نەك ڕەچەڵەك و نەتەوە و ڕێبەرەکان، بەڵکو ئابووری هەڵیدەسووڕێنێ. ئیتر دنیا نە لەسەر پشتی گا و ماسی ڕاوەستاوە و نە لەسەر بانگەشەی مزگێنیدەران و نە بە ئایەتە ئاسمانییەکان و نە بە دابونەریتەکانی ئۆغۆز، بەڵکو لەسەر شانی ئابووری ڕاوەستاوە. هەموو میللەتانی دنیا دیلی ئابوورین. هێزی جووڵێنەری مێژوو تەنیا ئابوورییە و تەواو. ئەوە قسەی مامۆستاکەی ئینگلیزیمانە. چما ئێمە بنەماڵە هەرە دەستڕۆیشتوو و ڕەسەنەکەی چوکووراوا نیین؟ هەین. وایە؟ شان و شکۆ و ناو و ناوبانگیشمان خۆ هەیە، وا نییە؟ بەڵام ماهیر بەگ، هەر ئێستا دەتوانێ ئەوەی هەمانە و نیمانە بە پارە بیکڕێ. ئەو دەساڵ لەوە پێش چیی هەبوو؟..."

دەروێش بەگ بە زەردەخەنەیەکی تەوساوییەوە قسەی بە جەیحوون بڕی:"بەو هیچ و پووچە مەڵێ بەگ."

دەتگوت دەمی لە قاپە ژەهرێك ناوە و دەریهێناوەتەوە و لچ و لێوی هەروا ژەهریان پێوەماوە...

جەیحوون بە لەبزێکەوە کە دیار بوو بەداخە، گوتی:"جا ئەوە دامنا منیش پێم نەگوت بەگ، بەداخەوە هەموو بە بەگ بانگی دەکەن. کەس بە خالیدە شێت ناڵێ بەگ، ئەوە بەخێر سەردەمانێك گەورەپیاو و ماقووڵزادە بووە، تەنانەت کاکەشی پێ ناڵێن، بەڵام ماهیر نەك هەر بەگ، بەڵکو بە ئەفەنییش بانگی دەکەن. هەر لە بەر ئەوەی خالیدە شێت گیرفانی بەتاڵ بووە بەڵام ماهیر قاباقچی ئۆغلی بەسەریدا باریوە و ڕۆژ بە ڕۆژ دەوڵەمەندتر دەبێ.

ئەو راستییە چەندی تاڵیش بێت، ناکرێ گوێی پێ نەدەی. ئێمە دەبێ خۆمان بەوجۆرە ببینین کە هەین. ئێمە وای دانێ هێشتا لێ نەکەوتووین بەڵام خەریکین دەکەوین. عەرزەکەی بن پێمان دەلەرزێ. ئەوە دامنا حەوت هەشت ساڵی دیکەش ئاوا خۆمان راگرت، بەڵام خۆ ئاخرییەکەی هەر دەکەوین و تێدا دەچین. کە قۆناغی توانەوە هات، داکشان مسۆگەرە و رێی ناگیردرێ..."

ئەوانە هەر هەموو بیر و بۆچوونەکانی مزەفەر بوون کە جەیحوون وشە بە وشەی دەیگوتنەوە. دەروێش بەگیش دەیزانی و لە دڵی خۆیدا پێ دەکەنی و وەڕووی خۆی نەدێنا. دەستی راستەی لەسەر دەمانچەکەی دیار بوو دەلەرزی. ئەویش دەیزانی لەو دنیا کاولبووەدا، پێوەری نرخ و پێگە، تەنیا و تەنیا پارە و ماڵی دنیایە و هیچی دی. ئەوەش رێك ئەو شتە بوو کە ئەو خۆی لەبەر نەدەگرت... بە چاوی خۆی دیتبووی کە خالید، چۆن کاتێك پارە و ماڵی دنیای لەدەست بۆوە و رووتایەوە، لە پەڕوپۆ بوو و هیچی پێوە نەما. تەنانەت ئەوانەی نانخۆریشی بوون و لە ماڵەکەی بە نانی ئەو گەورە ببوون، گاڵتەیان پێ دەکرد و گەپیان پێ دەدا. لە حاڵێکدا ئەگەر سەد ساڵ، پەنجا ساڵ و تەنانەت سی ساڵ لەوە پێش بوایە، ئەو خالیدە تەنانەت ئەگەر فلسێکیشی بە دەستەوە نەبوایە، هەر وەك بەگێك سەیریان دەکرد و وەك بەگێك رێز و حورمەتیان دەگرت.

ئەو هەتیوە زەردەڵە راستی دەکرد. هەمووان راست دەکەن، بەڵام ئەی رەسەنایەتیی بنیادەم چیی لێ دێتەوە؟ لەو دنیا بێ بەقایەدا، رەسەنایەتیی ئەسپ و تاژی و تەنانەت رەگەزی تەماتە و باینجانیش جێی بایەخ و سەرنج بوون، بەڵام کەس رەسەنایەتیی بنیادەمی بە پووشێك نەدەویست، بۆ؟ ئاخۆ بنیادەم لە حەیوان و کەلوپەلەکانیش سووکتر و بێ قیمەتترە؟ بەڵێ، بنیادەم بوونەوەرێکە لە هەموو شتێك سووکتر و بێ نرختر. چما بوونەوەرێکت دەست دەکەوێت لە رەگەزی و جسناتی گەندووگووی وەك ماهیر و مزەفەر و ئەو بنیادەمە تازە پێگەیشتووە بێ غیرەت و بێ رەگانەی تازە پەیدا بوون؟ باشە چۆن دەکرێ ئەسپێکی عارەبی هەر لەبەر ئەوەی زینەکەی خوار بووە، بڵێی لە بارگیرێکی خۆڵەمێشی کەمترە. باشە ئەوە بێ ئینسافی نییە کابرایەکی بێ داك و باب، هەر لەبەر ئەوەی دەوڵەمەندە، بخرێتە سەرووی یەکێکی رەسەنزادە و ماقووڵزادەوە؟ ئەوە بەو مانایەیە، کە ئەگەر زینێکی زێڕکفت لەسەر پشتی بارگینێك دابنێی، یان گوێدرێژێك بە جل و کورتانی جوان بڕازێنیتەوە و بڵێی بە ئەسپێکی رەسەنی عارەبیی ناگۆڕمەوە. ئەوەیە تێکەڵبوونی بایەخەکان. ئەو دنیایەی کە جگ و کووژەکە تێیدا لە دوڕ و

گەوهەر بەنرختر بێ، مەحکوومە بە تێداچوون و فەوتان... نەیدەویست گوێی لەو جۆرە قسانە بێ کە پێیان وایە پارە لە شەرەف و رەچەڵەك و ئابڕوو باشترە. کە گوێشی لێیان دەبوو، شێت دەبوو و کەللەی گەرم دادەهات.

"ئەمن ناهێڵم بنیادەمی ئاوا پێ لە ماڵم بنێ و سڵاوی پیاوی ئاواش ناستێنمەوە و ئەگەر ناچاریش بم سڵاویان لێ بکەم یان وەڵامیان بدەمەوە، خۆم تەریق دەبمەوە. لەو کاتانەدا پێم وایە پیاوەتی و شەرەفی خۆمم بەتاڵان داوە. ئەمن کارم بە پارە و ماڵی دنیاوە نییە. ئەو دنیایەیان کە لەسەر پارە راوەستاوە، سەریان بخوات."

"بەڵام بابە..."

"بابە و قوزەڵقورت."

دەروێش بەگ هەڵچوبوو. بە دەگمەن هەڵدەچوو، بەڵام کە تووڕە دەبوو، ئیتر خۆی پێ نەدەگیرا:"با برسێتی بکێشم، ئاوارە و ماڵ بە کۆڵ بم، با لە خالیدە شێتیشم خراپتر بەسەر بێ و بمرم، با بمرم، بەڵام نەچمە سەر رەنگی ئەوانە. ئەوە نیشانەی دنیاخرابوونە کە خەڵك، ئەو خەڵکە لێقەوماو و نەزانە گرنگی بەو جۆرە سەگانە، بەو درۆزن و بێ شەرەفانە دەدەن. نیشانەی گەندەڵبوونی مرۆڤە، بەرهەمی قۆناغێکی قەیراناوییە. قۆناغێك کە تێدەپەڕێ. کێ چووزانێ ئەو مرۆڤایەتییە پیر ە بەساڵاچووە چیها قەیرانی تێپەڕاندووە؟ ئاخرییەکەی رۆژێك دادێ کە بنیادەمەکان تێبگەن، شان و شکۆ و شەرەف و پیاوەتی لە پارە و ماڵی دنیا باشترە. ئاخۆ بنیادەمەکان بیست ساڵ، پانزە ساڵ لەوە پێشیش ئەوەندە داماو و لێقەوماو بوون؟ تۆ خوا ئەو دەمیش بنیادەم ئاوا دیل و کۆیلەی پاروە نانێك بوون؟ بە پیاوێك دەڵێن پیاو، پیاوێك شیاوی ئەوەیە ناوی هەبێ، کە بتوانێ بە نێو بنیادەمەکاندا بە روویەکی گەشەوە بگەڕێ و لە هەموو دەورە و زەمانەیەکدا خەڵك رێزی بگرن. ئەی ئەو ئاغا و بەگانەی تۆ چی؟ خۆ پیاو کە چاو لە نێوچاوانیان دەکا، هێڵنجی دێتێ و موچڕکەی پێدا دێ. لەوانەشە هەقت بێ کوڕم. لەوانەیە ناهەقیش بێ، لەوانەیە هەقت بێ. بەڵام ئەو پیاوەتی و ئینسانییەتە، ئەو پارە و ماڵی دنیایەم ناوێ. لاچۆ لەبەر چاوم، لا."

جەیحوون ئەمجارەیان بە رێز و حورمەتێکی پترەوە دەستی کردەوە بە قسە:"بەڵام بابە، ئەم دنیایە وای لێ هاتووە ئەگەر پارەت نەبوو، تەنانەت براکەشت بە پیاوت نازانێ و رووت تێ ناکا. چما نایبینی؟ تەنانەت پیاوەکانی خۆشت وەك جاری جاران حەوجێیان بەتۆ نییە. ئەو

سەدەیە بتەوێ و نەتەوێ، سەدەی ئابوورییە، بابە. تەنیا هێزی دەسەڵاتدار لەم سەدەیەدا ئابوورییە، ئابووری. ئەوی دیکەی هەموو تورەهاتە."

دەروێش بەگ بە قەڵافەتە باریك و کەڵەگەتەکەیەوە کە دەتگوت کەوانێکی لەبەریەك کێشراوە، دەرپەڕی و گوڕاندی:"بیبڕەوە، بیبڕەوە ئیتر. ئاگات لە دەمت بێ. ئەوەی تۆ لە ئاوێنەدا دەیبینی، ئەمن لە خشتی گڵدا دەیبینم. ئەمن لە ئێوە باشتر هەموو شتەکان دەبینم و هەتا مێشکی ئێسقانیشم هەستی پێ دەکەم. بەڵام ئەو تورەهاتەم قەبووڵ نییە و هەتا دەشمرم قەبووڵی ناکەم. تا لە داری دنیایە بژییم ملی بۆ راناکێشم، هەتا زیندووم. تێگەیشتی؟ ئەمن ئەوە بە ئەرکی سەر شانم دەزانم. بە هەر نرخێکی لەسەرم بکەوێ، ئەو بێ ئابڕوویەتییە قەبووڵ ناکەم. ئەمن لەو جۆرە کەسانەم کە هەزار کراسی لە یەك رەنگ دەدڕن، نەك لەوانەی کراسێك بە سەد رەنگەوە دەدڕن.... و رۆژێکیش کە زانیم وەك ئەوانم لێ دێ، جا ئەوکات..."

دەمانچەکەی لەسەرخۆ لە بەرپشتوێنی دەرهێنا و بەرزی کردەوە و لوولەکەی بەرەو زاری راگرت و گوتی:"ئاوا پەلەپیتکەی دەترازێنم. ئەتۆ بەخێر و ئەمن بە سلامەت. تێگەیشتی جەیحوون بەگ؟ ئەو بەسەرهاتە ئاوایە کوڕم؟"

سوارەکە، کە لە هەوری تەپوتۆزەکەدا ون دەبوو و دەردەکەوتەوە، بەرەو کۆشکەکە دەهات. هات و هات تا گەیشتە ئاوایی. کە دەروێش بەگ ناسییەوە، بە هەژاوییەوە گوتی:"نەمگوت، ئەوە وەلییە."

جا بەبێ ئەوەی چاو لە سوارەکە هەڵگرێ، بە زەردەیەکی تەوساویی و تاڵەوە، لە حاڵێکدا سەری بۆ دەلەقاند، لەسەر قسەکەی خۆی رۆیشت:"نەمگوت، نەمگوت؟... نەمگوت؟ وەلییە؟ هۆی وەلی هۆو؟ دیسان تۆ؟ داماو، بیبڕەوە. دەست هەڵگرە ئیتر. کوڕە ئەو فلانی فیسار پێکراوە، ئەوەندەت دەنێرێتە ئێرە ئاخرییەکەی سەرت بە فەتەرات دەدا. بە سواری نا، بگرە لەوێوە بەسەرچۆکان بێی و وەك سەگ بحەپێنی و بلوورێنی، دیسانیش بێ فایدەیە. دەروێش بەگ نەك نابێتە داردەستی دەستە گلاوەکانی ئەو، بەڵکو دژیشی رادەوەستێ. ئەویش بەهەموو توانایەوە... ئێستا چارت نییە جگە لەوەی دەستەوداوێنی مستەفا ئاق یۆللی بی و دەروێش بەگ لەناو بەری. بەڵام دەروێش بەگ تەنانەت دوژمنەکەشی پیاوە. تەنانەت بە نرخی کوشتنی دەروێش بەگیش رازی نییە لەگەڵ ئێوە یەك بگرێ. ئەو رەسەنزادەیەکی ماقووڵ و بەشەرەفە."

وەلی نوقمی تەپوتۆز و ئارەقە لە ئەسپەکەی دابەزی. ئەسپەکەی لە حەوشەکەدا لە لقی دارە تووەکە بەستەوە. گەڵای دارەکە لەبەر تۆز و خۆڵ سپی دەچوونەوە. ئەسپە لە دار

بەستراوەکە، دەیهانکاند و سینگ و زگی دەفی دەدا. دەروێش بەگ بەزەیی بە ئەسپەکەیدا اتەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی:"ئەسپی ئەو یەزیدانە ئاوا دەکەونە نرکە و هانکەهانك. هیچ گیانلەبەرێك لەبەر چاوی ئەوان نرخی نییە کە... با بزانین ئەو دنیا چەپەڵە چیی لێ دێتەوە."

بە بێزارییەوە لە هەورەبانەکەوە تفێکی کردەوە. عادەتی نەبوو تف بکاتەوە.

وەلی لەسەر خۆ و بەشەرمەوە و وەك ئەوەی بە زمانی بێ زمانی بڵێ، دەسەڵاتم چییە، دیسانیش بە زۆر ناردوویانمەوە. بلێ و نەڵێی بەترس و سەرسووڕمانەوە و لەسەرخۆ، وەك ئەو بنیادەمانەی قورسایی بەرپرسیارەتییەکی گەورەیان لەسەر شانە، بە هێواشی لە پلیکانەکان وەسەر کەوت و لە هەمبەر دەروێش بەگ سەری بەردایەوە و راوەستا.

دەروێش بەگ بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی لێ بپرسێ، ماوەیەك هەروا لێی راما و ئاخرییەکەی بە دەنگێکی بەرز و پڕ لە سووکایەتییەوە پرسیی:"دەی بڵێ بزانم چیت دەوێ؟"

وەلی بەحاستەم جووڵەیەکی کرد و لە حاڵێکدا لێوەکانی دەلەرزین، بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:"ئاغام سڵاوی گەیاندووی."

دەروێش بەگ بە تووڕەییەوە قسەکەی پێ بڕی:"کام ئاغا؟"

"ماهیر ئاغا..."

بە لەبزێکی پڕ لە تەوس و تەشەرەوە قسەکەی پێ بڕی:"ئێ ێ ێ...؟" و پرسیی:"دەڵێ چی؟"

"گوتی، سڵاومی پێ بگەیەنە و عەرزی بکە..."

"نامەوێ گوێم لە هیچ شتێکی بێ. نە پێویستیم بە سڵاوی هەیە و نە بە رێز و حورمەتەکەشی. پێی بڵێ، هەر دووکیان دەنێرمەوە بۆخۆی. پێشکەشی خۆی بن."

"گوتی با ئەمجارەیان وەڵامێکی باشم بدەنەوە."

"ئاوا؟ ئەی بە چاوان."

"ماهیر دەڵێ..."

"ئەها... ئەها..."

"هەتیوەکەی خەلیل قاباقچی دەڵێ..."

"ئەوە باشتریش..."

"دەڵێ عەرزی گەورەی خۆم بکەم کە..."

بەگ لەبەر خۆیەوە گوتی:"ئەو داماوە وەختە گیانی دەرچێ، گوناحە ئەگەر نەهێڵم قسەکەی بکات."

"ئەو دەڵێ ئێمە هەر لەسەرەتاوە برا بووین."

دەیویست بڵێ:"ئەمن سەگی ئاوا بە برای خۆم دانانێم." بەڵام دڵی نەهات قسەی وەلی ببڕێ.

"ئەمن حازرم سەرم بە قوربانی بەگ بکەم."

"ئەی لەو جوامێرییەی."

هەر جارێکی دەهاتەوە، ئەو قسەیەی دەکردەوە. تەواو لەبەری کردبوو. "باشە ئەو سەگی سەگبابە قسەیەکی دیکە نازانێ بیخاتە سەر زاری ئەو داماوە؟"

".... ئەو وەك هەمیشە، هەر بەگی ئێمە و گەورەی ئێمەیە. ئێمە لە حاندی سەرمان پێوە نییە. بەگایەتییەکەی ئەو رەگ و پنج و رەچەڵەکی هەیە. ئەو رەسەنە. تێمە ئاغایەتییەکەشمان ساختە و بێ بنەمایە. لە رێزگرتنیدا تەخسیر ناکەین. ئەگەر ئەو بنیادەمە، ئێمە لە هەمبەر ئەو هیچ نین، پووش و پەلاشین. ئەو رەچەڵەکی هەیە. ئەسپی عارەبی رەچەڵەکی هەبێ، چۆن دەبێ بنیادەم نەیبێ؟ هەر ئەو بنیادەمەی کە باشترینی مەخلووقەکانە و خودا لە رەنگی خۆی خولقاندوویەتی، چۆن دەکرێ بێ رەگ و رەچەڵەك بێ؟ ماهیر دەڵێ، ئەمن ئەوە دەزانم و بە دەنگی بەرزیش بە هەموو دنیای رادەگەیەنم. هاودەنگ لەگەڵ دەروێش بەگ خەڵکەکەمان، میللەتەکەمان بانگ دەکەم بگەرێنەوە سەر رەچەڵەکی خۆیان. دەڵێ، ئارەزوومە بەو زووانە ئیزنم بدات تەوێڵم لەبەر دەرگای کۆشکەکەی ساری ئۆغڵی بساوم. ئێمە لەوەتەی هەین، پێمان لەوە ناوە و گوتوومانە بەگمان، سەرووەری ئێمەیە و لە حاندی ئەو سەرمان پێوە نییە. ئەگەرچی خۆمان بنەماڵەیەکی هەژار و بچووکین و بابمان بە کوولەکەخواردنێ مرد، باپیرانمان هەر ساری ئۆغڵییان بە بەگی خۆیان زانیوە و لە بن باڵی ئەودا ژیاون و بەختەوەر بوون. چاویان کردووەتەوە و پادشا نا، بەڵکو ساری ئۆغڵییان ناسیوە. لە کۆنەوە نەریتی خۆمانە تەوێڵمان لەبەردەرگای بخشێنین. دەروێش بەگی رەسەنزادە نابێ پێش بەو نەریتەمان بگرێ. ئەوانەی بە من گوتووە کە عەرزی بەرێزتی بکەم. دەیویست نامە بنووسێ، بەڵام تۆ بەبێ ئەوەی نامەکەی بخوێنیتەوە، دەیدەیە نۆکەرەکانت و دەڵێی هانێ قوونتانی پێ خاوێن بکەنەوە. گوتی بچۆ و ئەو دەردە گەورە و بێ دەرمانەمان بە بەگی مەزنمان بڵێ. گوتی زەمەن تێدەپەرێ و ئەگەر درەنگ بەخۆدا بێینەوە، دەسووتێین و تێدا دەچین. گوتی شەرەفی نێوچاوان سوینی بەردەرگاکەیمان پێ

ببەخشێت و ئەو منەتە گەورەیەمان لەسەر بکات. گوتی با بمخاتە بن سێبەری گەورەیی خۆی و لە درەگای نەمرەتێنیێ، کە نۆکەر دەرکردن لە قاپییە، لەگەڵ نەریتی بەگایەتی یەك ناگرێتەوە. بەگە گەورەکان قەت نۆکەرەکانیان بە دەستی بەتاڵ لە ماڵێ دەرناکەن. گوتی ئەمن نە زەویم لەوی دەوێ و نە یارمەتی و نە هیچ شتێك. گوتی هەر ئەوەندەم لێی دەوێ ئیزنم بدات نێوچاوانم لە خۆڵی بەردەرگای ماڵەکەی بخشێنم و هیچی دی."

وەلی دەتگوت هەژاوە و دەست و پێی تێکەڵ دێن و رەنگی بە روخسارەوە نەمابوو، بەڵام لەسەر یەك راسپاردەکەی خۆی باش گەیاندبوو. بەوحاڵەشەوە باش توانیبووی بێ کەموکوورِی هەموو ئەو شتانە بڵێتەوە کە بە مێشکی سپاردبوون. دیسانیش هەندێ شتی لە بن لێوانەوە گوتنەوە کە نەیانزانی دەڵێ چی.

بەگ زانیی زاری وشك بووە و نەیتوانیوە هەرچی لە مێشکیدایە بیڵێ، هەر بۆیە گوتی:

"خەمت نەبێ وەلی. ئەوی دیکەی هەموو دەزانم. تا ئێستا بەلای کەمەوە بیست جارت گوتوونەوە. ئەمجارەیان زۆر باشت گوتنەوە. پێویست نییە هەموو بڵێیەوە. هەر بەبێدەنگی بەرامبەرم راوەستی، چییت لە مێشکی دایە دەیخوێنمەوە. تێگەیشتی؟"

وەلی، سەری لەقاند و متەقی نەکرد. زۆر مەمنوون ببوو. بەگ ئەمجارەیان نێوچاوانی گرژ نەبوو و قسەی هاتەران پاتەرانی نەدەکرد. یانی نەرم ببوو؟ ئاخ وازی لەو لاسارییەی هێنابایە و گوتبای باش. هەر باشەیەکی ئەو، وەلیی لەو گێژاوی هەژاری و داماوییەی رزگار دەکرد. بەبێ ئەوەی سەری هەڵێنێ، چاوەڕوان بوو. وەك ئەوەی گۆرانییەك لەبەرخۆیەوە بڵێتەوە، قسەکانی زۆر بەسۆز و خۆش کردبوو. هەر قسەیەکی کاری لە بەردێ دەکرد، بەڵام خۆ ئەو جانەوەرە کێوییە هەر گوێشی لێ نەبوو.

ماهیربەگ پێی گوتبوو، خەڵکی رەشۆك نابێ سەیری نێو چاوی بەگەکان بکەن، باش نییە. پێیان ناخۆش دەبێ و لەوانەیە تووڕە بن. نەکەی نەکەی کاتی قسەکردنێ چاو لە نێو چاوی بەگەکان بکەی. ئەگەر سەیرێکی چاوی کردبایە، لێی تێدەگەیشت. ئەو چەند خولەك چاوەڕوانییە نیوەعومری کرد. چەند خولەکێك نا، سەد ساڵ.

تاوێك دواتر، دەنگی بەگ رایچڵەکاند:"ئەگەر جارێکی دیکە، بێیەوە ئێرە، پێ بنێیتەوە ئەو کۆشکەی من، قەڵەمی پێت دەشکێنم. بەڵایەکت بەسەر دێنم، با بە دەواری شڕی نەکردبێ. برۆ و ملت بشکێنە. جەحەندەم پڕ کە... گوتم جەحەندەم پڕ بکە..."

پەلاماری دا. وەلی هەر ئەوەی دیت، تێی تەقاند و بەرەو پلیکانەکان رای کرد و هەوساری ئەسپەکەی بە دەستە لەرزۆکەکانی کردەوە و سوار بوو و بە قەمچی لێدان بەرەو دەشتەکە تاوی دا.

بەگ هێشتا بەشوێنیدا دەینەڕاند:"قولاپەت دەشکێنم ها. چاوت دەردێنم. کوڕە وەرە سەیری ئەو نێردراوەی، کەچەڵەی چەتە.... وەلییە کەچەڵ. کوێر لە کوێر دەگەڕێ و ئاویش لە قووڵکە..."

## ٦٠

هەموو دەرگایەکی لەسەر داخرابوون. وەلییش دوای گەڕانەوەی لە کۆشکەکەی ساری ئۆغلّی گوتبووی:" ئەوە دواجاری بیّ. ئەگەر دەتەویّ رسق و رۆزییەکەم ببڕی، بیبڕە ئاغا. ئەمن ئیتر ناتوانم بچمەوە ئەویّ. ئیتر پیّم قەبوولّ ناکریّ ئەوەندەم سووکایەتی پیّ بکا. هەر قسەیەکی وەك خەنجەریّکی ژەهراوی گوللەیەکی چەور وایە*."

ماهیر بەگ، بەو هەمووە خویّندەوارییەوە، ئەو پیاوەی هەموو کۆلاّن و لاکۆلاّنەکانی ڤییەننا گەڕابوو، ئەوەی خراپ لیّك دابۆوە. ئەو دەرویّش بەگە چ جانەوەریّك بوو؟ دەبیّ بەناخیدا رۆبچیت و پیّچ و پەناکانی کەسایەتییەکەی هەلّسەنگیّنی. هەولّی دابوو لە ریّگەی کوڕەکەیەوە بەیدەستی بکات. هەلّە، هەزار جار هەلّە. دەرویّش بەگیّك کە هەر لە کوڕەکەی بیّزار بوو، جا چۆن قسەی لیّ وەردەگرت؟ چوبووە مالّەکەی و ویستبووی بە زنجیری دابونەریت دەست و پیّی شەتەك بدات و کەلّك لە میوانگرییەکەی وەربگریّ. دەرویّش بەگیش دەسبەجیّ لەوسەری گەڕابۆوە و گووی لە دەمی بەستبوو. ئەوجار وەلیی تیّوەردابوو. بەو دەنگە بەسۆزەیەوە... کۆنە چەتە، چەنەوەڕ و زمانچەور، بەلاّم کەچەلّ. ئاخۆ دەرویّش بەگ هیچ حیساب بۆ پیاوی وا دەکا؟ ئەگەر هەزار جاریشی بنیّریتە لای ئەوەی گوتوویەتی هەر ئەوە دەبیّ. هەی خۆلّت بەسەری ماهیر. گیّلی خودای. تۆ میّشکی کەرت خواردووە. ئەو هەمووە خویّندن و ڤییەنناچوونەت یاخوا سەرت بخوا هەی...

جا چی بکەم؟ ئەو بنیادەمە دەبیّ نەرم بیّ. لەو دنیایە کیّشەیەك نییە چارەی نەبیّ. هەر کاریّك ریّیەکی هەیە و ریّی دلّی دەرویّش بەگیش دەبیّ بدۆزریّتەوە. یان خاکەکەی ئاقچاساز یان مەرگ. چەند رۆژان، ماوەی نزیك بە بیست و چەند رۆژیّك هەر دانیشت و بیری کردەوە.

---

*کورد دەلّیّ: قسەکانی ماستیان لەسەر رۆبکەی و لە پیّش سەگی دانیّی نایخوات.

دەروێش بەگ لەبەر چی ملی نەدەدا؟ لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێ، کە خەڵکی هیچ و پووچی دەنارده لای. ئەگەر ئێستا بەگەکانی بنێرێتە لای، چ دەبێ؟ چۆنە خالیدە شێتی بنێرێتە لای؟ خالیدە شێت بەگێکی لێ کەوتوویە و دەروێش بەگ قسەی ناشکێنێ... بە دوای ئەو تەگبیرەدا، وەلیی بە دوای خالیددا نارد و پێی گوت:"دەچیتە لای دەروێش، بۆ ئاشتکردنەوەمان..."

خالید کابرایەکی باریکەڵە و درێژ و زەردەڵەی پشت کۆماوە بوو. کڵاوە لبادییەکەی سەر کوڵمەکانی دادەپۆشی و چاوەکانی خەفەتبار بوون.

"ئەگەر ئاشتمان بکەیتەوە، جووتێك گا و پەنجا دۆنم زەوییت دەدەمێ. پێنسەد لیرەش... هونەری خۆت بنوێنە."

خالید وەك شێتان بەو گفت و بەڵێنانە دڵی خۆش بوو. بەڵام بڕواشی نەکرد.

"جارێ ئێستا، پێشەکی دووسەد و پەنجایم بدەیە. ئەمن هەرچۆنێکی بێ، ئاشتتان دەکەمەوە. دەروێش بۆ دەبێ لەگەڵت ئاشت نەبێتەوە؟ چما ئەتۆ چیت لەو کەمترە؟ ئەتۆ قاباقچی زادەی. خەلیلی ئاغا قاباقچی زادە باش دەناسم. خودا عافووی بکا. هاموشۆی کۆشکەکەی بابمی دەکرد. پیاوێکی دەستڕۆیشتبوو بوو. دەست و دڵاوا و چاکەکار و بەشەرەف و ماقووڵ. زۆر جوامێر بوو. بە دەروێشیش دەڵێم: چما ئەتۆ کێی پێت شوورەییە قسە لەگەڵ کوڕەکەی قاباقچیزادە بکەی؟ ئەگەر بە رەسەنایەتی و رەچەڵەکی خۆت دەنازی، ئەویش وەك تۆ رەچەڵەکی هەیە. ئەگەر پارە دەڵێی، دوو سێ هێندەی تۆی پارە وماڵی دنیا هەیە. ئەگەر بە ژیری و تێگەیشتووی دەڵێی، کابرا چووەتە فەرەنگ و قورئانی خەتم کردووە هیچ، چیی کتێبی فەرەنگیشە هەمووی خوێندووەتەوە و خەتمی کردوون. دەی باشە، ئەی چیت دەوێ؟ ئەگەر دوژمنایەتییەکیش لە نێوانتاندا بێ، ئەویش بەمن ببەخشە کە وەچەی ئالای بەگ ئۆغلم. ئەگەر بە رەچەڵەکی خۆت زۆر دەنازی، نەدەبوو من بێمە کۆشکەکەت. ئەوە کەمایەسییە بۆ من. لە درێژایی مێژوودا هەرگیز هیچ ئالای بەگ ئۆغلوویەك نەچووەتە ماڵی ساری ئۆغلی تکا بکات. جگە لەوەش، ئەم سەردەمە، سەردەمی رەسەنایەتی و رەچەڵەك نییە. سەردەمی ئەقڵ و ژیرییە و ئەگەر بمەوێ کاکڵی قسەکەم بکەم، سەردەمی پارەیە... ئەتۆ ئێستا دووسەد و پەنجا لیرەی خۆمم بدەیە، ئەوە کاری منە. ئەگەر حەز دەکەی، با هەر دەروێش بەگ بێنمە لای تۆ."

ماهیر جزدانی دراوەکەی دەرهێنا و گوتی:"فەرموو. دووسەد و پەنجا لیرەکەی دیکەشت لای منە. پەنجا دۆنم زەوی و جووتێك گای جووتییشت لەبیر نەچێ. کە خەبەری ئاشتبوونەوەکەت هێنا، دەستخۆشانەی دیکەشت دەدەمێ. دەتکەمەوە ئالای بەگ ئۆغلّییەکەی جاری جاران. ئەگەر حەزت لێ بوو، دەتکەمەوە خاوەنی ملّك و مالّ. بەلاّم بێت و ئاوا قسە بکەی، دەترسم نەتوانی دەروێش قایل بکەی."

خالید قاقایەکی کێشا و بە هەژاوییەوە گوتی:"ئەتۆ کارت بەوە نەبێ نا.... من... من... لەبەر من... دەیکا. ئەگەر نەیکا، دیارە ئەو بەگێکی درۆیینە. نە ئۆغوزی خۆش دەوێ و نە منیش و نە جامینی خەلّکی رەسەنزادە و رەچەلّکداریشی. ئەتۆ کارت نەبێ..."

خالیدە شێت لەوانەیە دە سالّێك دەبوو کە دووسەد و پەنجا لیرەی لەسەر یەك نەدیتبوو. خەریك بوو بفڕێ... پەنجا دۆنم زەوییش، جووتە گایەکیش.

خالید ملی کەچ کرد و بە لەبزێکی پڕ لە تکا گوتی:"ماهیر بەگ، وەرە ئەو پەنجا دۆنم زەوییەی دەمدەیەی، ئەویشم بە تەراکتۆرەکەت بۆ بکێلّە. دوو سالّم بۆ بکێلّی بەسمە. دوای ئەوە دەتوانم بەرەی خۆم لە قوڕێ دەرکێشم."

ماهیر بە دەنگێکی هیوادەرانەوە گوتی:"کوڕە ئەتۆ ئەو کارەم بۆ جێبەجێ بکە، پەنجا دۆنم سەهلە، دووسەد دۆنمیشت بۆ دەکێلّم. چما نەمگوت دەتکەمەوە ئالابەگەکەی جاری جاران."

"من وا رۆیشتم."

"ترۆمبێلەکە لە خوارێ چاوەڕێتە."

خالید بەهەلّەداوان لە پلیکانەکان چووە خوارێ. ئەوەندە بەپەلە چووە خوارێ هەلّەنگووت و تەخت کەوت.

"گرنگ نییە، گرنگ نییە. هەلّەنگووتم. دەی باشە، دەچم بۆ کاری خێرێ... ترۆمبێلەکەت هەلّکە کاکی شۆفیر."

تا گەیشتە گوندەکەی ساری ئۆغلّی، هەزار رێ و شوێنی بە مێشکیدا هات. لە ترۆمبێلی دوا مۆدێلدا دانیشتبوو. لاقی راستەی لەسەر لاقی چەپەی دانابوو و بەخۆی دەگوت:"هەی سەگی سەگباب، گوتم ئاخرییەکەی رۆژێك حەوجێت پێم دەبێ و دەستم ماچ دەکەی، نەتان دەسەلاماند. دەمگوت هیچ کەس جگە لە من ناتوانێ پێکتان بێنێتەوە، بڕوات نەدەکرد. هههه. دەلّێی رۆژگار دیسان بە کەیفی دلّی بەگە ئەسپ رەسەنەکان دەخولێتەوە."

دەمەدەمی عەسرێ بوو کە ترۆمبێلەکە لە بەردەرگای کۆشکەکەی ساری ئۆغڵی رایگرت. پرسیاریان لەو پیاوە کرد کە بە پێشوازیانەوە هاتبوو:"بەگ تەشریفی لە ماڵێیە؟"

"بەڵێ، تەشریفی لە ماڵێیە."

لە پلیکانەکان وەسەر کەوت. بەگ کە لە دیوەخانەکەدا دەهات و دەچوو، هەر چاوی بە خالیدە شێت کەوت، تاوێك راوەستا و بە روویەوە پێکەنی. بۆلای چوو و خۆمانە دەستی گوشی و بە روویەکی گەشەوە گوتی:"بەخێر بێی، خێر و بەرەکەتت هێنا گیانەکەم."

خالیدە شێت بەر لەوەی بەگ فەرمووی بکا و بڵێ:"فەرموو دانیشە." خۆی بەسەر پێیانیدا کێشا و دەستی کردە ماچکردنی و تکاکردن:"کوڕەکەتم کوشتووە و خۆم لە ماڵت هاویشتووە بەگ. کوڕەت، هەر پێنج کوڕەکەتم کوشتووە و خۆم لە ماڵت هاویشتووە. یان بمکوژە یان تکاکەم لێ وەرگرە. یان بمکوژە..."

دەروێش بەگ دەسبەجێ دووقڕانییەکەی کەوت و هەڵچوو. دەشیزانی بە چ نرخێك ئەو کارە دەکا و بۆچیی دەکا. بەسەریدا نەڕاندی:"هەستە، هەستە. ئالای بەگ ئۆغڵی نابێ ئەوەندە خۆی سووك بکا. هەستە ملت بشکێنە و وەدەرکەوە. هەستە دەی. هەستە و جەحەندەم پڕ بکە..."

خالیدە شێت دەلالایەوە:"بەگ، بەگم..."

دەروێش بەگ فەرمانی دا:"فڕێی دەنە دەرەوە. کۆی بکەنەوە و بیخەنەوە نێو ترۆمبێلەکەی ئەو سەگبابە..."

دراوێکی پێنسەد لیرەشی لە گیرفانی دەرهێنا و خستییە بەردەمی:

"چما هەموو پاڕانەوە و لالانەوە و نووزانەوە و کلکەسووتەکەت بۆ ئەوە نییە؟ ها."

خالیدە شێت دەنووزایەوە:"زیاتر... لەوە زیاتر... زۆر زیاتر..."

نۆکەرەکان دەست و پێیان گرت و بردیان و خستیانەوە نێو ترۆمبێلەکە و بە شۆفێرەکەشیان گوت:"هەڵی بکە و بڕۆ. بەگ ئاگری لێ دەبارێ. دەی زوو بە خێرا."

ترۆمبێلەکە، کە گەیشتە قەراغ ئاوایی، خالیدە شێت بە شۆفێرەکەی گوت:"رایگرە، دەمەوێ دابەزم."

دابەزی. لە خۆشییان نەیدەزانی چ بکا و بەخۆی دەگوت:"خوایە شوکرت، ئەمڕۆ دەسکەوتێکی باشم بووە."

ماهیر ئەوەی لە شۆفێرەکە بیستەوە و تێگەیشت خالید خراپی بۆ چووە و ئەگەر خۆی بەسەر پێیانیدا نەکێشابایە و ماقوولانە جوولابایەوە، کارەکە جێبەجێ دەبوو. دەبێ بەگێکی دیکە بدۆزێتەوە.

سێ ڕۆژ دواتر بەگەکەی "جیغ جیق"ـی نارد، کە ئەویش دەست لە گونان درێژتر گەڕایەوە. سەرۆکی دارایی شارۆچکەش کە بەخۆی هەڵدەگوت و بەڵگەی دەخستە روو کە بەڵێ رەچەڵەکی دەچێتەوە سەر دانیشەمند ئۆغڵیی ناودار و دەروێش بەگیش بەڵگە و بانگەشەکانی ئەوی قەبووڵ بوون، هەر هیچی بۆ نەچووە سەر. لێرە ژمارەیەکیش زولقەدر ئۆغڵی هەبوون. زولقەدر ئۆغڵییەکانیش ژن و ژنخوازییان لەگەڵ عوسمانییەکان هەبوو. تەنانەت دایکی سوڵتان محەمەدی فاتیحیش کچی بنەماڵەی زولقەدرەکان بوو. حاجی بەگی زولقەدر ئۆغڵییش دەست لە گونان درێژتر لە لای دەروێش بەگەوە گەڕایەوە.

دوای ماوەیەك، نۆرە گەیشتە بەگە گەورەکانی بنەماڵەکانی کووزان ئۆغڵی و رەمەزان ئۆغڵی. فەتحی بەگی کووزان ئۆغڵیی پارێزەریشی نارد. فەتحی بەگ نەوەی ئەحمەد پاشای کووزان ئۆغڵیی ناودار بوو، کە دژی عوسمانییەکان راپەڕیبوو. ئەویش هیچی بۆ نەچووە سەر. کەسێکی بنەماڵەی رەمەزان ئۆغڵییشی دۆزییەوە. رەمەزان ئۆغڵییەکانیش هێشتا رێز و حورمەتێکیان لە نێو خەڵکیدا مابوو و تەواو لێ نەکەوتبوون. لە کن مستەفا کەماڵ پاشاش قسەیان دەڕۆیی. رەمەزان ئۆغڵیی بە دەم و دووش قسەی نەچووە سەر.

رۆژێکیان لە حاڵێکدا ماهیر پەرێشان و شپرز بە بازاڕێدا تێدەپەڕی، چاوی بە رەشیدخان کەوت. رەشیدخان لە سەردەمی شەڕی یەکەمی جیهانیدا لە وانەوە هاتبووە ئێرە. دەیانگوت رەشید هان یەکێك لە بەگە هەرە گەورەکانی وان بووە. ئەو ئێستا لە شارۆچکەکە دووکانێکی گەورەی کووتاڵی هەبوو. دەروێش بەگ پتر لە هەموو کەس جامینی ئەوی دەویست. هەر چاوی پێی دەکەوت، لە دوورەوە لەبەری هەڵدەستا و دەستی دەگرت و لەسەر جێیەکەی خۆی دادەنا. باشە ئەوە بۆ بیری بۆ رەشیدخان نەچووبوو؟ رەشیدخان بەگ بوو. بەگێکی بە رەچەڵەك و بەناوبانگ. هەر چونکە کابرایەکی کەمدووش بوو، لە سی ساڵی رابردوودا لە شارۆچکەدا هەر ئەو ئاوی بە ئاگری هەموو دوژمنایەتییەکاندا کردبوو. ئەو مەسڵەتی دوژمنایەتیی خوێنی و تۆڵەی کۆنەرق و کێشەی نێو حیزبەکانی کردبوو. رەشید خان وەك فریشتەیەکی ئاشتی، لە چوکووراوادا ناوی دەرکردبوو. باشە چۆن، چۆنە لەو دەمەوە هەر رەشیدخانی بە مێشکیشدا نەهاتبوو؟

"ڕەشیدخان."

"فەرموو ماهیر بەگ."

"تکایەکم هەیە."

"چییە؟ ئەها، تێگەیشتم. باشە ئەوە بۆ تا ئێستا نەهاتوویە لای خۆم؟ بەیانی، بەیانی زوو، ترۆمبێلەکەت بنێرە، خۆم دەچمە لای دەروێش ساری ئۆغڵی بەگ. باشە؟"

ئەوەی گوت و زەردەیەکی هاتێ.

ماهیریش بە زەردەیەکەوە گوتی:"باشە."

ڕەشیدخان:" ئیشەڵڵا بەیانی ئەو گرێکوێرەیەت بۆ دەکەمەوە و ئاشتتان دەکەمەوە. بەیانی، سبەی... ترۆمبێل..."

ماهیر بەگ:"بەیانی زوو ترۆمبێل دێتە بەر دەرگاکەت."

ئەوجار منەتبارانە لەسەری ڕۆیشت:"ئەتۆ کابرایەکی زۆر باشی ڕەشیدخان."

ئیتر چاوی کە پڕ ببوون لە ئاو، لەو بڕین. ڕاستە ئەو دنیایە هێشتا پیاوی باش و خێرخوای تێدا ماوە. بەبێ پاڕانەوە و لاڵانەوە، داوای پیاوی قەبووڵ دەکەن.

ڕەشید ئاغا دەستەکانی هێنا سەر ورگی و گوتی:"نەك پیاوی باش. نەك باش. هەر خودا حەزی لە ئاشتی و تەباییە. خودا دوژمنی دوژمنایەتییە. ئەگەر خودا نەیەوێ، ڕەشید ئاغا چ کارەیە؟ یەکەم خودا."

دەروێش بەگ کەڕەی بەیانی گوێی لە دەنگی ترۆمبێل بوو. لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەی کرد.

کوڕە وەرە سەیری ئەو کەرەی، ئەوجار کێی ناردووە؟ ئیتر وەگیان هاتبوو. نەریت بێ نەریت. هەرکەسی ناردبێ، بە شەق لە پلیکانەکانەوە...

گرماندی:"هەر کەس لە ترۆمبێلی ئەو سەیە هاتە دەرێ بیهێننە سەرێ و لە سەر پلیکانەکانەوە بە شەقان فڕێی دەنە خوارێ."

ئەوە زۆر کەرانەیە. ناپیاوەتیە. بەڵام ئیتر وەگیان هاتبوو.

لە نەکاو ئەوەی باوەڕی بەو شتە نەکرد کە بە چاوەکانی دیتبووی. ئەوەی لەو ترۆمبێلە هاتە دەرێ، ڕەشیدئاغا کوردە بوو. خۆ بێت و ئەو داماوەیان بە قەڵافەتە سەد و چل کیلۆییەوە لە پلیکانەکانەوە خلۆر کردبایەوە... دەستی لە ئەستۆی ڕەشید ئاغا کرد و یەکتریان ماچ کرد. گلەیی لە ڕەشید ئاغا کرد، کە بۆچی هەتا ئێستا سەرێکی لە کۆشکی ساری ئۆغڵی

هەڵنەهێناوە؟ هەر بەراستی ماهیر بۆچی ئاوا درەنگ ڕەشیدخانی ئاشتیدەرەوی وا درەنگ ناردبوو؟

هەر بەراستی بەگ بە هاتنەکەی ڕەشید خان زۆر شاد و خۆشحاڵ بوو. قەڵافەتێکی جوامێرانەی هەبوو. هەرکات ڕێی دەکەوتە شاری، سەرێکی لێ هەڵدێنا و کووپێك قاوەی لەگەڵ دەخواردەوە. ڕێزێکی زۆری لەو کابرا دڵپاکە بێ پۆز و ئیفادە و جوامێرە دەگرت و کە دەچووە لای، هەموو چەپەڵی و چەوتییەکانی دنیای لەبیر دەچۆوە.

کە لەسەر مۆبلەکە دادەنیشتن، گوتی:"دەزانم بۆچی هاتووی."

ڕەشید ئاغاش بە داوای لێبوردنەوە گوتی:"ئاشتبوونەوەیە و خودا وای ویستووە."

دەروێش بەگ دەستی لێك دا و خزمەتکارەکە هات.

"قاوە."

چەنەیان گەرمدا هات. بەڵام دەروێش بەگ قسەکانی ئەوی بۆ نەدەچوونەوە سەر یەك. ئێستا زۆر شتی شیرین و هێور و دڵنیاکەرەوە و دڵخۆشکەری لە ڕوخساری دەباری. بەڵام ئاخر ئەو شتانە چ بوون؟ چییان پێوە بوو؟ هەرچی دەیهێنا و دەیبرد، بۆچی ساغ نەدەبۆوە و لەبری ئەوەی بشڵەژێ، دڵخۆشتر دەبوو. لەو ڕوخسارەدا، شتێکی ئاشنا و هێورکەرەوە، بیرەوەرییەکی لەبیرکراوی شیرین شەپۆلی دەدا. بە نیگایەکی کونجکۆڵەوە، لە ڕوخساری ورد دەبۆوە. ئاخرییەکەی ڕووناکاییەك لە چاوەکانی گەڕا و بەسەر زاریدا هات.

"ئەها، دۆزیمەوە. بەگ، ئامۆزات بوو، وایە؟:

"بەڵێ، بەگ ئامۆزای من بوو."

بەگ جوانترین بیرەوەریی ژیانی دەروێش بەگ بوو. هەر کات وەبیری دەهاتەوە، دڵی پڕ دەبوو لە شادی و بەختەوەری. کەوتبووە جۆش و خرۆش.

"یاخوا بەخێر بێی برالە..."

جارێکی دیکەش ڕەشید ئاغای لە ئامێز گرت و ماچی کردەوە. چاوەکانی ڕەشیدئاغا پڕ بوون لە ئاو. لە مێژ بوو کەس ئاوا بە جۆش و خرۆشەوە میوانداریی نەکردبوو. چیی وای نەمابوو ئەو کەڵەپیاوە لە بانگ بدات.

"برای گیانی گیانیم، ئاااااخ... ڕۆژگاری ڕابردوو، ئەو ڕۆژانەی بەگ هاتە ئێرە... ئەتۆش لەگەڵ بەگ بووی وایە؟:

ڕەشید ئاغا لە حاڵێکدا گریان ئەوکی گرتبوو، بە دژوارییەوە گوتی:"بەڵێ."

بێت و ناچار بوایە دوو قسەی دیکە بکات، خۆی پێ نەدەگیرا و لە قوڵپی گریانی دەدا.

"بەگ لە حاڵێکدا دەگریا، بەمنی گوت دەروێش بەگ، ئەستۆمان کەچ و دەستمان شکاوە. گوتی لەو چوکوورەدا جگە لە تۆ بەگێکی دیکەم نەدی. گوتی، بنیادەمەکان بەبێ بەگ و پاشا، وەك مێگەلی بێ شوان بەرەڵڵا و پەرش و بڵاون. ئا ا ااای، بەخێر بێی براله. ئێمە هەر برای تۆین. بەگ بەمنی گوت ئامۆزاتە..."

رەشید ئاغا دیسان بە زەحمەت گوتی:"بەڵێ."

ئەگەر ئەو گریانەی لە ئەوکی گیرابوو و ئەو فرمێسکەی لە چاویدا قەتیس مابوو، رەوییبانەوە....

"بەگ بەمنی گوت، رەچەڵەکی هەموو بەگەکان، جا کورد بن، عەجەم بن، عەرەب یان ئینگلیز، فەرەنسی بن یان رووس، ئەڵمانی بن یان گورجی، چینی بن یان هیندی... دەگاتەوە سێ ئۆغوزەکە. هەرچی عێل و عەشیرەت و گەلی رەسەنی ئەو دنیایەن لە ئاسیای ناوەڕاست نێوکیان بڕدراوە. هەر بۆیە هەموو بەگەکان پێکەوە بران. هەر بۆیەشە ئێمەش برای یەکین. ئەوەم هەزار جاران بە تۆ گوت. باشە بۆچی سەرێك لە ماڵی ئەم برایەت هەڵناهێنی؟ ئێرە ماڵی خۆتە. ئەو دامودەزگا و زەوی و زارە هیی تۆن."

دیسان دەستی لێك دان. لە نەکاو چاوی گەشانەوە و بەدەنگی بەرز گوتی:"خوا راوەستاوت بکا رەشید ئاغا."

بەو نۆکەرانەی هاتبوونە ژوورێ، گوت:"بەرخێك بکوژنەوە یان شەکێکی قەڵەو. برامان گەورەی کردووین. دەی گورج بن."

لە نێو تورکمانانداندا کوشتنەوەی مەڕ بۆ میوانێك، ئیدی ئەوپەڕی رێز و حورمەتە بۆ میوانەکە. رەشید ئاغا بە ناڕەزایەتییەوە گوتی:"بەگ، بەگ."

دەروێش بەگ بە روخسارێکی گەشاوەوە و لە حاڵێکدا دەستی بەسەر شانەکانیدا دێنا گوتی:"هەتا ئێستا پیاوی وەك تۆ بەشان و شکۆ و رەسەن پێی لەو ماڵە نەناوە. جا مەڕێك بۆ تۆ چییە، وشترێکیش...."

هەستا و دەستی گرت و هەڵیستاندە سەر پێ:"بفەرموو، چیی دڵت دیەوێ. لەبەر خاتری ئەتۆی وا بەرز و رەسەن، لەگەڵ ئەو سەگبابە ئاشت دەبمەوە. هەموو دنیای، هەر لە بەرپرسانی ئیدارییەکەیەوە بگرە هەتا بەگ و ئاغاکانی، هەتا نۆکەرەکانی و کوڕەکانی خۆم و براکەم، هەر هەمووی لەسەر کردم، بەڵام ملم نەدا لەگەڵی پێك بێمەوە. ئەوە لەبەر حورمەت و گەورەیی

تۆیە لەگەڵی ئاشت دەبمەوە. ئەگەر تۆ بڵێی دەروێش بڕۆ و لەگەڵ براکوشتەت، لەگەڵ مستەفا ئاق یۆللی ئاشت بەوە، قسەت ناشکێنم و لەگەڵی ئاشت دەبمەوە."

"رەشید ئاغا کە لە بن باری ئەو چاکە و خۆشەویستییەدا خەریك بوو ورد و خاش دەبوو، ویستی بڵێ:"خودا راوەستاوت بکا و تەمەن درێژ بی، بەقوربانت بم بەگ..." بەڵام پێی نەگوترا. بە زۆر پێشی فرمێسکەکانی دەگرت کە لە چاوییەوە هەڵدەقولّی. ئاخرییەکەی بەسەر گۆنایدا لووزەویان بەست. دەسرۆکەکەی دەرهێنا و رووی وەرگێڕا و چاوی سڕینەوە.

بەگ هێشتا هەر قسەی دەکرد، بەڵام رەشید ئاغا ئاگای لە قسەکردنی نەمابوو. کە ژیر بۆوە و گرێیەکەی قورگی رەوییەوە، گوتی:"بەگ، بە قوربانت بم. تورکمانەکەی ئێوە گوتی: رەسەن هەڵە ناکات. رێبوار رێی لێ هەتڵە نابێ. وایە قوربان."

دەروێش لەو جەنگەیەدا بە ئاماژە ئەو نۆکەرەی لە دیوەخانێ چاوەڕوان راوەستابوو، لە شتێك تێگەیاند. تاوێك دواتر ئەو کوردانەی کاریان بۆ دەروێش بەگ دەکرد، هەر لە نیوەکار و نۆکەرەوە ورد و درشت بە ژن و پیاوەوە هاتن.

"بەگ من نیم. بەگ ئەوەیە. بەگێکی بەتەواو مانا. خۆزگە بە خۆتان بەگێکی ئاواتان هەیە."

کوردەکان دەستەونەزەر راوەستابوون. بە ریز لە هەنتەشی بەگەکەیاندا راوەستان و یەك بە یەك دەستیان ماچ کرد و چوونە لاوە.

رەشید ئاغا لە خۆشیان نەیدەزانی چ بکا.

"باشە تەوسۆن بەگیش خزمایەتییەکی لەگەڵتان هەیە؟ هەر ئەوەی لەکاتی کۆڕەوەکەدا هاتبووە ئێرە و من لە ملکەکەی خۆمدا جێیەکم دایێ...."

شمشێرێکی زێڕکراویشی کە بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو، پێشان دا. دەمانچە سەدەف نیشانەکەشی لە بەر پشتوێنەکەی دەرهێنا و بۆ رەشید ئاغای راداشت. رەشید ئاغا دەمانچەکەی لێ وەرنەگرت:"تکا دەکەم بەگ. با دەستی ئێمەمانان وەچەکی تۆ نەکەوێ."

دەروێش بەگ لە حاڵێکدا دەمانچەکەی دەخستەوە بەر پشتوێنەکەی گوتی:

"ئەوانە ئەو بۆی ناردبووم."

"تەوسۆن بەگی خزمان. بابی بابم، کچی باپیرەی ئەوی خواستبوو. ئەو چەکانە زۆر ئەنتیکەن."

دەروێش بەگ بە پێکەنینەوە:"کەوابوو قاباقچی ئەمجارەیان تۆی دۆزییەوە. ئاخرییەکەی مەبەستی خۆی پێکا. باشە چۆنی زانی ئەمن قسەی تۆ ناشکێنم و چیی بفەرمووی سەرم لە رێیە؟ خۆ ئەگەر بفەرمووی بچۆ لەگەڵ ئەو سەیە لە سەر سفرەیەك دانیشە، دادەنیشم و لە قاپێکدا نانی لەگەڵ دەخۆم. ئەگەر داوای سەری منداڵەکەشم بکەی، دەستت ناگێڕمەوە. سەری ببڕە. ئەگەر بفەرمووی بمرە، دەمرم..."

رەشید ئاغا وەك گەنجێکی شەرمەون، بە شەرمەزارییەوە دەستە زلەکانی لە سەر ورگی لێك هەڵپێکابوو، گوتی:"بێ ئەدەبیم کردووە بەگ. هاتم چونکە خودا ئاشتیی پێ خۆشە. خودا رقی لە دوژمنایەتییە."

دەروێش بەگ ئیتر نەیدەبیست. خەیاڵی، بە کەفوکوڵەوە گەڕابۆوە بۆ دواوە. بۆ ئەو رۆژانەی کوردەکان روویان کردبووە چوکووراوا.

کوردەکان پاش جەنگی یەکەمی جیهانی، چوکووراوایان پڕ کردبوو و بە سەدان خێوەتی مەرەزی گەورە و بچووك لەو دەشتەدا هەڵدران و پەتی خێوەتەکان هەموو لێك گرێدرابوونەوە. نۆبەتێ و برسێتی، قڕی لەو کوردانە خستبوو، کە شەڕ دەربەدەر و ئاوارەی کردبوون. هەوای چوکووراوا، بۆ ئەوان هەوا نەبوو، بەڵکو ژەهر بوو. ژەهریان هەڵدەمشت. لە جێی خۆیان هەڵقەندرابوون و هاتبوون. بە مەڕ و ماڵات و پەلەوەر و دار و نەداریانەوە. هەر عێل و هۆز و عەشیرەتێك بەگی خۆی بەسەرەوە بوو. لەو نۆبەتێ و برسێتی و قاتی و قڕییەشدا، بازنەی دابونەریتی خۆیانیان نەدەبەزاند. بەگوێی بەگی خۆیانیان دەکرد و قسەیان لە قسەیاندا نەدەکردەوە.

رۆژێکیان چوبووە سەردانی بەگێکی کورد. بەگە کوردە دیسان هەر لە خێوەتێکی رازاوەی پڕ لە بەڕە و مافووری بێ وێنەدا دانیشتبوو. روخساری زەرد هەڵگەڕابوو و حوکمی چاوانی بڕابوو، بەڵام شان و شکۆیەکی هەبوو. لە بەر دەرگای خێوەتەکەش دوو پیاوی چەکدار بە رانك و چۆغەوە ئێشکیان دەگرت. ئەو دەیزانی بەگ لەو رۆژانەدا نانی شەوێی نییە. لەوانەیە هەر ئێستاش زگی لە برسان قووڕەی بێ. بەڵام ئەو مافوورەی لەسەری دانیشتبوو، لانیکەم بایی سەد سکەی زێڕ بوو. برسێتی شتێکە و لەسەر مافووری سەد سکەیی دانیشتن شتێکی دیکە... کەس لۆمەی بەگە کوردە نەدەکرد کە بۆچی برسییە، بەڵام ئەگەر ئەو لە چادرێکی رووتاوە و هەژارانە و بێ شکۆی خەڵکی ئاساییدا دانیشتبایە، جا با لە وڵاتی غەریبایەتییش بوایە، هەموو بە چاوی سووکەوە سەیریان دەکرد.

نۆکەرە نۆبەتیێگرتووە کوردەکان، بە ڕەچاوکردنی دابونەریتی خۆیان، بردیانە لای بەگەکەیان. کە بەگەکەیان بە لایاندا ڕادەبورد، هەر هەموویان، چ ئەوانەی نزیکتر و چ ئەوانەی کیلۆمەترێك لەولاترەوە بوون، لە حەوت تا حەفتا ساڵانەیان، لەبەری هەڵدەستان و دەستەونەزەر خۆیان بۆ دەچەماندەوە.

دەروێش بەگ، سەری لەو پابەندی و ڕێز و حورمەت و گەورەیی و لەو دابونەریتە سووڕمابوو کە ئاوارەیی و برسێتییش نەیتوانیبوو کەلێنی تێ بخا. بنیادەم و هەرچی ناوی بنیادەمی بەسەرەوەیە، دەبێ ئاوا بێ. هەرچی لەدەستی هاتبوو، دەرهەق بەو بنیادەمە جێگەی ڕێز و حورمەتانە کردبووی. زۆریانی بردبووە ئاواییەکەی و پەنای دابوون. زۆریانی تێر کردبوو بەبێ ئەوەی بەگەکەیان هەر پێ بزانێ. چاکەیەکی لەگەڵ کردبوون، کە براش دەرهەق برا نایکا. بەگە کوردەش دوای گەڕانەوەیان بۆ وڵاتی خۆیان، چاکەی ئەوی قەت لەبیر نەچووبۆوە. هەموو ساڵێ لە وانەوە دیاریی بۆ دەنارده چوکووراوا. ئەسپێکی عارەبیی بۆ ناردبوو کە لە هەموو بیابانی عارەبستاندا هاوتایەکی دیکەی نەبوو. ئەو ئەسپە زیرەکە، تەنیا ئەوەندە بوو وەك بنیادەم قسەی نەدەکرد. ناو و ناوبانگەکەی زۆری نەبرد هەموو چوکووراوای گرتەوە و تاریفی جوانی و خۆشبەزییەکەی کەوتە سەر زار و زمانان. شمشێرێکی سەدەفنیشانی گرانباییشی بۆ ناردبوو کە دەیانگوت، شمشێرەکەی سەلاحەدین ئەیوبیی باپیرەی بووە. لە سەر دەمی شمشێرەکە نووسراوەیەکی سەلاحەدین ئەیووبیی پێوە بوو.

ئەو بەگە، تەوسۆن بەگ بوو. یەکێکی ردێن سپیی کەڵەگەت بوو. روخساری جۆرێك بوو وەبیر هەڵۆی دەخستییەوە. گنجەکانی دەموچاوە تاوبردووەکەی قووڵ و چاوە درشتە ڕەشەکانیشی وەك شەوی بێ بن قووڵ بوون. لووتی هەڵۆیی بوو. لەسەرخۆ و کاریگەر قسەی دەکرد و وەك هەموو بەگە ڕەسەنەکان، کەیفی بە چەنەوەڕی نەدەهات و تا پێویست نەبوایە، متەقی لێوە نەدەهات و لە خۆڕایی قسەی نەدەکرد و زمانی نەدەگەڕا. دەنگیشی بێ خەوش بوو. سامناکترین کارەسات قەومابایە یان خۆشترین شت هاتبایەتە پێشێ، دەنگی بەرز و نەویتر نەدەبوو.... لەسەرخۆ، زاڵ و ماقووڵ و گران وسەنگین...

دوژمنەکەی تەوسۆن بەگیش هاتبووە چوکووراوا. ئەویش لە گوندێکی ئەو نزیکانە بار و بنەی بە عەرزیدا دابوو. دوژمنایەتییەکەیان سەد ساڵ دەبوو. بەردەوام پیاویان لێك کوژتبوو و هۆبە و هەواری یەکتریان تالان کردبوو. ئەو بەگە ناوی عامر بەگ بوو. عامر بەگ لە وڵاتی غەریبایەتی کەوتبووە فکری ئاشتبوونەوە لەگەڵ تەوسۆن بەگ.ماڵیان کاول ببوون و ئەو

هەمووە بەڵایەیان لێ باریبوو. بەو حاڵەوە، دوژمنایەتی و شەڕ لە عەریبایەتی زۆر عەیب دەبوو. شەڕ و دوژمنایەتی شتێك نەبوو تا هەتایە بەردەوام بێ. برایەتی جوان و پەسندە و دۆستایەتی بەکەڵك و بەسوودە. لە وڵاتی غەریبایەتی، کەس کەسی نەدەناسی. تەنیا کەسێکی تەوسۆن بەگی دەناسی و دەیزانی باب و باپیرانی کێن، هەر عامر بەگ بوو. تەوسۆن بەگیش دەیزانی بنە و بنەچەکی عامر بەگ کێن.

بەڵام تەوسۆن بەگ ئەو قسانەی بەگوێدا نەدەچوون. دەبوو بەگێکی رەسەن نێوبژیوانییان بکات بۆ ئاشتکردنەوەیان. تەوسۆن بەگ خۆی نەیدەتوانی دابونەریتەکان پێخوست بکات و بیانشکێنێ. دەروێش بەگ مەسەلەکەی بیستەوە و قۆڵی هەڵماڵی و کەوتە نێوانیانەوە. تکای کرد و رووی لێ نان و باسی چاکە و سوودەکانی ئاشتی و دۆستایەتیی کرد. تەوسۆن بەگیش ئاخرییەکەی دڵی نەرم بوو و رازی بوو.

دەروێش بەگ ئەو ئاشتبوونەوەیەی هەر لەبیر بوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت، تورکمانەکانیش دیارە وەها نەریتێکیان هەیە. نەریتێکی کۆن کە هەر لە کۆن کۆنەوە، لەو کاتەوە کە ئاڵای ئۆغوز لە سەرانسەری ئۆوکووراوا و عەرەبستان و خۆراسان و کەنارەکانی دانوب دەشەکایەوە، هەبووە. ئەو کاتەی عوسمانیی نامەرد رەسەنایەتیی خۆی نەدۆڕاندبوو و پشتی ئۆغووزی نەشکاندبوو. ئەو نەریتە تەنانەت تۆزێك بەر لە شۆڕشی کووزان ئۆغڵییش دەبێ هەبووبێ. ئۆغووزەکانیش... ئۆغوزەکانیش ئاوا ئاشت بوونەتەوە... عامربەگیشی لەبیر بوو، کە هاتبوو بۆ ئاشبوونەوە. قەڵافەتە کفن پۆشراوەکەی عامربەگ، کە شمشێرێکی لە کالان دەرکێشراوی بەدەستەوە بوو، لەبەر چاوی لانەدەچوو.

تورکمانەکانیش، ئۆغوزەکانیش، عوسمانییەکانیش بەر لە تێشکانیان، لەگەڵ ئەو نەریتەدا بوونە و بەوجۆرە ئاشت بوونەتەوە. دەروێش بەگ دوای رێوڕەسمی ئاشتبوونەوەکە، دەستەکانی تەوسۆن بەگی گرتبوو و گوتبووی:"کە دەڵێن پیاو، کە دەڵێن هۆز و عەشیرەت، بە ئێوە دەڵێن. ئێمە تێدا چووین. ئێمە حاشامان لە باب و باپیرانی خۆمان کرد. دنیامان گرت و ئیمپراتۆرییەکی جیهانیمان دامەزراند، بەڵام چ فایدە. ئۆغوزمان لەبیر کرد. لە کیسمان دا. دابونەریتمان لەکیس چوو. تێداچووین. لە هۆز و عەشیرەت و نەتەوەبوون بێبەش بووین. ئێوەن کە ئۆغوزتان زیندوو راگرتووە. هەر بژین و راوەستاو بن برالە."

تەوسۆن بەگ لە خۆشیان گریابوو. دەستی لە ئەستۆی دەروێش بەگ کردبوو و سەری خستبووە سەر شانی و گریابوو. دەروێش بەگیش سەری لەو حاڵەتەی ئەو بەگە مەزن و ماقووڵ

و هەڵۆئاسایەی کور سوورِ مابوو. کەوابوو دڵێکی ناسکی وەك دڵی منداڵ، لە سینگی ئەو بنیادەمە رەوەزئاسایەدا لێی دەدا. گریانی مندالآنەی پیاوێك کە ئەگەر بەتیر لێت دابایە، نەیدەگوت وەی، دەروێش بەگیشی گریاندبوو.

تەوسۆن بەگ گوتبووی:

"ئاخ بەگ، ئاخ بەگ، ئێمەش تێدادەچین. ئێمەش."

پێکەوە و وەك ژنان بۆ ئۆغوزی لەدەستچوو و دابونەریتە لەبیرکراوەکان گریابوون. دەروێش بەگ دوای ئەو شین و گریانە، بەڵێنی بەخۆی و تەوسۆن بەگ دابوو ئەوەندەی لە تاقەت و توانای دایە، ئاڵاکەی ئۆغوز هەر بە شەکاوەیی راگرێ و دابونەریتەکانیان بکاتە تاجی سەری خۆی و رێ و شوێنە لەبیرکراوەکانیان ببووژێنێتەوە. ئەگەر پێویستیش بێ، گیان و ماڵیشی لەسەر دابنێ.

"باب و باپیرەکانمان، ئاوا، رێك بەو جۆرە ئاشت بوونەتەوە. رێك ئاوا..."

رێك نەیدەزانی، بەڵام شکی بۆی دەچوو کە ئاوا بووبێ. تۆزێك لە درۆیەکەی خۆی تەریق ببۆوە، بەڵام نەشدەکرا جۆرێکی دیکە بووبێ. لە هەموو جێیەك، هەموو هۆز و عەشیرەتەکان، هەموو بەگەکان، ئاوا دەبوونە خاوەن شەرەف و شکۆ و بە پێی ئەو جۆرە رێ و شوێنە رەسەن و جوانانە ئاشت بوونەتەوە. دەروێش بەگ بیری لەو رۆژە جوانانە، لە ئۆغوز و لە تەوسۆن بەگە ماقووڵەکە و لە عامربەگی کفن پۆشیو دەکردەوە.

رەشید ئاغای لەبیر نەمابوو. لە نەکاو وەخۆ هاتەوە و گوتی:

"بەڵێ رەشید ئاغا. من ناتوانم قسەی تۆ بشکێنم و بە دەستی بەتاڵ بتنێرمەوە. گەڕاندنەوەی تۆ بە نامرادی، بۆ من لە مەرگ ناخۆشترە. ئیتر چارم نییە و دەبێ لەگەڵی ئاشت ببمەوە. بەڵێ ئاشت دەبمەوە. ئەویش وەك چۆن بەگەکانی سێ ئۆغوز و هەموو بەگەکانی دنیا ئاشت دەبوونەوە ئاوا. دەی باشە برای شیرینم گوێ بدەرێ، چیت پێ دەڵێم لێم وەرگرە رەشید ئاغای ماقووڵزادەم..."

بریسکەبریسکی بزۆزانە و شادییەکی لەبنەوەبڕانە لە چاوەکانییەوە هەستان. عامر بەگ، کوردەی کفن پۆش، لە رۆژی ئاشتبوونەوەکەدا، هاتبۆوە پێش چاوی. لە بیری ئەو ماهیری دێنایە بەر چاوی خۆی و لە خۆشییان شێت دەبوو. بەڵام ئاخۆ ماهیر قەبووڵی دەکا؟ ئەو قسەیە چییە؟ ئەرێ وەڵڵا قەبووڵی دەکا و ئەولاتریش، قوڕاوخۆرەوەش دەبێ.

"ئەژدادی ئێمە، ئەژدادی من و تۆ چۆن ئاشت دەبوونەوە؟ ئەوان بە شان و شکۆ و ناوبانگەوە ئاشت دەبوونەوە. ئەمن ئەگەر بمەوێ لەگەڵ یەکێك ئاشت ببمەوە، رێك وەك ئەوان و بە پێی رێوشوێنی ئەوان ئاشت دەبمەوە. ناتوانم شان و شکۆ و ناوبانگی بەگەکانی سێ ئۆغوز و ئالآی بەرزی ئەوان فڕێ بدەم، رەشید ئاغا. ئەمن تا زیندووم و پیاوی رەسەنی وەك ئێوەم هەبێ، هەرگیز، هەرگیز ئالآی سێ ئۆغوزەکە ناکەوێتە عەرزی. تا من و تۆ زیندووین و ماوین، ئالآی ئەو سێ ئۆغوزە هەر شەکاوە دەبێ. جوان و زەریف گوێم بدەیە. کاتی ئەوەی هاتووە ئالآی سێ ئۆغوزەکە لە چەقی شارۆچکەکەدا و بە هەموو دنیا پێشان بدرێتەوە. "

بە لەپی دەستی چەند جارێك لە پشتی دا و دەستی پێ کردەوە:

"ئەوە ئەو دەرفەتەیە وا چاوەڕوانی بووین. باش بوو هاتی. هەر تۆم دیت، یادی سێ ئۆغوزەکە لە دڵمدا زیندوو بووەوە. بۆ رێزگرتن لە دابونەریتی ئۆغوزەکان لەگەڵ ئەو سەگبابە ئاشت دەبمەوە. ئەگەر پێی خۆش بێ بەپێی نەریت ئاشت بێتەوە، ئەو زەوییەشی کە دەیەوێ بیدا بە من، دەیدەمەوە بە خۆی. ئەگەر پێی خۆش بوو. هەموو چوکووراوا با بخاتە سەر مڵکەکەی خۆی. ئەمن قسەیەکم نییە و کارم پێی نییە. تەنانەت نیوەی مڵکەکەی خۆشمی دەدەمێ. هەر ئەوەندە بەسە ئالآی سێ ئۆغوزەکە لە چوکووراوادا بشەکێتەوە. ئەوەندە بەسە... ئەشید ئاغا، هەر ئەوەندە بەسە برای شیرینم. برای خۆم. رەشید ئاغای ئازیز، ئەتۆ برای منی و لە براش لێم نزیکتر و خۆشەویستتری. بەگێکی رەسەنی، بە رەچەڵەکی، خوێن پاکی. خوێنت وەك گەوهەر وایە. خوێنی ئاوا پڕ دوڕ و گەوهەر لە دەماری کێ دایە؟ تۆ، تۆ... یانی سێ ئۆعوزی مەزنی ئالآ بەرز... شوێنێکی پێی بنیادەمە خوێن پاکەکانی وێکەوێ، خێر و بەرەکەتی لێ دەبارێ. کە تۆ پێت لە ماڵم نا، ئالآی دە سەدەیی ئۆغوز لە ئاسماندا شەکایەوە."

رەشید ئاغا سەری سوور مابوو. بیری دەکردەوە و مێشکی خۆی دەگوشی و قسەکانی دەروێش بەگی هیچ بۆ نەدەچووەوە سەر یەك. ئەو مەسەلەی ئۆغوزە هەندێ شتی تێدا بوو، بەڵام باشە ئەو شتانە چ بوون؟ تەنیا شتێکی لێ تێگەیشتبوو، ئەویش ئەوەیکە بەگێك لەبەر خاتری ئەو لەگەڵ کابرایەکی سووك و بێ قیمەتدا ئاشت دەبۆوە. تەواو لە هاتنەکەی خۆی پەشیمان بۆوە. بەگێکی گەورە، سەیەکی وەك قاباقچی ئۆغلۆوی بانگ دەکردە لای خۆی، ئەویش لەبەر خاتری ئەو. چۆنە بڵێ، بەگ وازی لێ بێنە، لەبەر خاتری من لەگەڵی ئاشت مەبەوە. بەڵام دوایی پاشگەز بۆوە: چونکە ئاشتبوونەوە، لەگەڵ هەر کەسێك بێ، کاری خێرە و خوداش ئاشتکەرەوەکانی خۆش دەوێ.

لەو مەسەلەی ئۆغوزەدا هەندێ شت جێی گومان و دڕدۆنگی بوون. ئەو ئاشتبوونەوەیە بە دابونەریتی ئۆغوزەکان بەگی شێت کردبوو. ئەو وشەی ئۆغوزەی پێشتریش بیستبوو، بەڵام کەنگێ و لە کوێ؟ وەبیری نەدەهاتەوە. هەموو مێشك و زەینی خۆی سەنگ و سووژن دا بۆ ئەو وشەیە و بۆی ساغ نەدەبۆوە. لە قسەکانی دەروێش بەگدا وا دیار بوو ئۆغوز دەبێ شتێکی ئەنتیکەی ئالا بەدەست و سامناك بێ، کە تەنیا لە کوێستانەکان و بەرزاییەکاندا دەست دەکەوێ. خۆ نەشدەکرا لەوبارەیەوە لە بەگ بپرسێ. بەگ وای باسی ئۆغوز دەکرد، دەتگوت ئەو باش باش دەیناسێ و دەزانێ چییە. جا چونکە زۆری بیر لێ کردەوە و هیچی بۆ نەچۆوە سەر یەك، ئارەقی رەش و شینی دەرکرد.

"ئارەقەت کرد رەشید ئاغا. دیارە باسی باوکە ئۆغوزمان، هەستی نەجیمانەتی تەواو ورووژاندووە و خوێنە پاکەکەتی وەجۆش هێناوە. ئەو بێ قیمەتانە نە دەزانن ئۆغوز چییە و نە دەزانن پیاوەتی چییە."

ئەوجار شتێکی بۆ دەچۆوە سەر یەك. بیری کردەوە، کە دەڵێ باوکە ئۆغوزمان، کە واتە ئۆغوز دەبێ باپیرەی بووبێ. بە هەژاوییەوە، ئەو هەناسەیەی لە سییەکانیدا قەتیس مابوو، دایە دەرێ و بە دەنگێکی کزەڵۆکەوە گوتی:"

"ئەوان ئۆغوز ناناسن. هیچ ناناسن."

"جا ئێستا جوان وەزەریف گوێت بکەوە و ببیە رەشید ئاغا. ئەو سەگە کارێکی باشی کرد ئەوجارەیان تۆی نارد. ئەگینا تا رۆژی بازاڕەکەی قیامەتێ، لەگەڵی ئاشت نەدەبوومەوە. ئەوەی پێ بڵێ. هەر چاوم بە تۆ روون بۆوە، دڵم وەترپە کەوت و بەخۆمم گوت، ئەوجار دەبێ ئاشت ببمەوە. بەڵام بە پێی رێوشوێنەکانی ئۆغوز. هێرۆدۆتی مێژوونووس دەڵێ... هەروەها نەعیمای مێژووزان و ئەولیا چەڵەبیی مەزنیشمان نووسیوێتی: بەگەکانی سێ ئۆغوز، رەسەنترین و بە رەچەڵەکترین و مەزنترین بەگی دنیان. ئەفلاتوونی مێژووزانیش قسەکەی ئەوان پشتڕاست دەکاتەوە. هێرۆدۆتی مێژووزان دەڵێ: کە، هەروەها مەزنەکانمان نەعیما و ئەولیا چەڵەبی و ئەوجار هەمووان پشتڕاستی دەکەنەوە کە لە نێو ئۆغوزەکاندا فەرماندەیەکی گشتی هەستاوە بە ناوی چەنگیزخان، کە ژیانی لەسەر پشتی ئەسپ بووە تا مردووە...."

دەروێش بەگ هەژابوو:"گوێت بکەرەوە و ئەو قسانەم جوان و زەریف لێ وەرگرە رەشید ئاغا."

رەشید گوێی راگرتبوو و چاوی لە زاری دەروێش بەگ هەڵنەدەگرت.

"چەنگیزخانی بابمان، بابی من و تۆ، دوای ئەوەی هەر لە سەر پشتی ئەسپ، هەموو دنیای گرت... رۆژێکیان نەخۆش کەوت. پێیان گوت، لە ئەسپەکەت دابەزە و لە نوێنێدا پشوویەك بدە با چاك بییەوە. بەڵام باپیرەی مەزنمان وەڵامی دانەوە، کە ئۆغوزەکان لە نوێن و باندا نامرن بەڵکو بە سەر پشتی ئەسپەوە دەمرن. رۆژان و مانگان بەسەر پشتی ئەسپەوە رێی بڕی و چیا و دەشت و بیابانانی بڕی تا سەر لە بەیانیی رۆژێکیان دیتیان باپیرەی مەزنمان گیانی دەرچووە. مردبوو، بەڵام وەك زیندووان قیت و زیت وەك خەدەنگ بەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە چەقیبوو. کەس نەیزانی چەند رۆژە مردووە..."

رەشید ئاغا کە چاوی پڕ ببوون لە فرمێسك، بەدەست خۆی نەبوو گوتی:"وای، وای، هەزار جار ئاخ و مخابن. بارەقەڵڵا، وەی لەو پیاوەی، بابەگەورەمان..."

دەروێش گوێی لێ نەبوو، یان بیستی و گوێی نەدایێ، دەستی پێ کردەوە:"رەشید ئاغا، سەیری من بکە. ئەی پیاوی رەسەن، ئەی ئەو کەسەی رەچەڵەکت دەچێتەوە سەر ئەو چەنگیزخانەی بەسەر پشتی ئەسپەوە مرد، ئەی کۆڵەکەی لەسەر پێی هەر سێ ئۆغوزەکە، رەشید ئاغا، گوێت لە برای خۆت بێ. بچۆ و دابونەریتی ئاشتبوونەی ئۆغوزەکانی وەك چۆن بووە ئاوا بۆ ماهیر بەگی قاباقچی ئۆغلی بگێڕەوە و پێی بڵێ، دەروێش بەگ لەبەر خاتری من و بە حورمەتی رەچەڵەکی ئۆغوزەکان، بە ناوی ئاسمانیی دابونەریتی ئۆغوز لەگەڵت ئاشت دەبێتەوە. بڵێ ئەگەر بە شێوازی ئۆغوز قەبووڵتە ئاشت بێتەوە، ئەوە لەگەڵت ئاشت دەبێتەوە. بڵێ بەگەکان تەنیا بە شێوازی ئۆغوز، ئاشت دەبنەوە، باشە؟"

"دەڵێم، وا دەڵێم... بە چاوان... دەڵێم بە شێوازی ئۆغوز. پێی دەڵێم، بەگ پێی گوتم، کە بەگەکان بە پێی دابونەریتی ئۆغوزەکان ئاشت دەبنەوە. ئەگینا بەگەکان بە شێوەی دیکە ئاشت نابنەوە."

بەگ، بە دوو هەنگاوان ئەوسەر و ئەوسەری دیوەخانی دەکرد. کەیفی ساز بوو، پێدەکەنی و قسەی دەکرد و لە خۆشیان وەخت بوو بفڕێ. دەهات و شڵپ لە نێوشانی رەشید ئاغای رادەکێشا و پێی هەڵدەگوت. رەشید ئاغاش دەیویست شادییەکەی خۆی دەربڕێ، بەڵام زمانی نەدەگەڕا و قسەیەکی وای نەدۆزییەوە. سوور سوور هەڵگەڕابوو و لێوەکانی دەلەرزین.

کە کەفوکوڵی دەروێش بەگ تۆزێك دامرکایەوە، هات و دەستی رەشید ئاغای گرت و گوتی:"ئەمشەو میوانی خۆمی. ناهێڵم بڕۆی."

بە دەنگێکی بەرزتر بانگی خوارەوەی کرد:

"رەشید ئاغا ئەمشەو میوانمانە."

بەرامبەر رەشید ئاغا دانیشت و هەر دوو دەستی ئەوی گرت و لەسەری رۆیشت:

"بەڵێ، رەشید ئاغا، ئێمە بە ئۆغوزی لە دایك بووین و هەر واش دەمرین. دابونەریتی ئۆغوز، ئاڵاکەی ئەو چەنگیزخانەی بەسەر پشتی ئەسپەوە گیانی دا، تا هەتایە هەر سۆمای چاو و تاجی سەرمان دەبێ. بەشێوەی دیکە ئاشت نابینەوە. ئەگەر بە شێوەیەکی دیکە بێ، ناهێڵم لاقی پیس و چەپەڵی ئەو نامەردە بە ماڵی ئۆغوزدا بێ. ئەوەم چۆن پێ گوتی، بۆی دەگێڕییەوە."

رەشید ئاغا:"بۆی دەگێڕمەوە. تۆ زۆر مەزنی بەگ. ئەتۆش وەك بەگی مەزنمان، چەنگیز، بەسەر پشتی ئەسپەوە دەمری. ئەوەیە ئاشتبوونەوە. نەك جۆرێکی دیکە..."

پەنجەی شایەتمانی هەڵێنا:"ئاوا، ئاوا، بە قاباقچی ئۆغلی بڵێم ئاوا، جۆرێکی دیکە نا."

دەروێش بەگ پێدەکەنی و رەشید زۆر خۆمانە و میهرەبانانە دەستی بەسەر رەشیدئاغادا دێنا. لە خۆشییان وەخت بوو باڵ بگرێ. دەبوو شتێکی کردبایە، بەڵام ترسی ئەوەی هەبوو لە خۆشییان بتەقێ و بەڵایەکی بەسەر بێ. ماوەیەك هەر وا لە ژوورەکەیدا هات و چوو و ئاخرییەکەی بانگی خوارەوەی کرد:"ئەسپەکەم بۆ زین کەن."

رووی لە رەشید ئاغا کرد و گوتی:"ئەتۆ پشوویەك بدە بەگ، ماندووی. ئەمنیش دەڕۆمەوە."

لە پلیکانەکان چووە خوارێ و خۆی خستە سەر پشتی ئەسپەکەی و بەرەو دەشتەکە باڵی گرت و تاوێك دواتر لە تاریکایی دەشتەکەدا نوقم بوو.

## ٦١

چاوەکانی ژنەکەی ماهیر قاباقچی ئۆغڵی وەك گۆمی خوێن وابوون. تووك و دووعای لە ڕەشید ئاغا دەکرد:

"ڕەشید ئاغا، کوڕە خۆزگە تیری نەبەدیت وێ کەوتبا و نەچووبایە لای ئەو سەیە. خۆزگە ئەستۆت دەشکا و زمانت مووی لێ دەهات و ئەو خەبەرە ڕەشەت بۆ نەدێنایەنەوە. خۆزگە چاوت کۆرە دەبوون و ڕێیەکانت نەدەدی... ماڵوێرانت کردین. ژیانت تێك داین.... یاخوا زەلیل و داماو بی. یاخوا زگت سووتێ، یاخوا..."

ماهیر قاباقچی ئۆغڵی بەبێ تاقەتی و بە نیوەنووزەیەکەوە گوتی:"بیبڕەوە خاتوون، بیبڕەوە بەسە. بەشکم بتوانین ڕێگەچارەیەکی بۆ بدۆزینەوە. ئەوە جارێ رازیمان کردووە ئاشت بێتەوە. ئەوە گرنگە و هەنگاوێکە بەرەو پێشەوە. بەشکم بتوانین قایلی بکەین بەوەی شتەکە تۆزێك کەم بکاتەوە."

ژنە بە گریانەوە گوتی:"جا دەتەوێ کوێی کەم بکاتەوە. ئەو زاڵمە دەیەویست تۆ بێنێتە ئێرە و ریسوای عالەمت بکا. ئاخرییەکەشی کاری خۆ کرد. ئاخرییەکەی بە ئارەزووی خۆی گەیشت. بێ دینە گەیشت، ئەو پیاو کوژە گەیشت..."

مەرجەکانی ئاشتبوونەوەی ڕەشید ئاغا ئەستەم بوون. بەڵام چ دەکەی، دەروێش هەر وا لاسار گەورە ببوو. بەشکم ڕێیەك هەبوایە بۆ پاشگەزکردنەوەی. ئەو پیاوە شێت بوو. باشە مەرجی ئاوا سامناك چۆن قەبووڵ دەکرا؟ ژنەکەی پیشی دەخواردەوە و تووڕە دەبوو. هەمووان دڵبەخەم، بوون و دەم لیچیان تێك نابوو. ماڵەکەیان ماتەمبار ببوو.

ماهیر قاباقچی ئۆغڵی بۆ ئەوەی خەم و خەفەت لە دڵی ژن و منداڵەکەی دەربێنێ و دڵیان بداتەوە، دەیگوت:"قەبووڵی ناکەم. بشمرم، تەنانەت هەموو ملکەکەشم لە دەست بچێ، دیسان ئەو مەرجانە قەبووڵ ناکەم."

دەنگی هەڵدێنا:"شتێکی وا نییە. مەرجی ئاوا بۆ قەبووڵکردن نابێ. سەگیش شتی وا قەبووڵ ناکا. هەر دەڵێی دابونەریتی ئۆغوز، دابونەریتی چەنگیزخان بووە... گووی سەگ بە ریشی چەنگیزخان و رەچەڵەکەکەی ئەو پیاوکوژە. ئۆغوز؟ ئەغوز دابونەریتێکی ئاوا وەحشیانەی نییە. ئەو شتانە هەر لە مێشکە نەخۆشەکەی ئەوەوە هەڵدەقوڵێن."

سات بە سات وای دەهاتە بەرچاوی کە دەچێ بۆ ئاشتبوونەوەکە. مووی لێ دەبوونە نەشتەر و بە دەست خۆی نەبوو، لێوی دەپەڕین. "وەی ی ی ی، وەیی ی ی ی."

ئەگەر دەروێش پێداگر بێ؟ زوڵم، زوڵم نا، بڵێ مەرگ. سووکایەتی، ئەگەر دەروێش پێ دابگرێتەوە، مەحاڵە شتی وا قەبووڵ بکا. بێت و کاری وا بکا، تا هەتایە ئەو رووداوە دەبێتە بنێشتە خۆشکەی سەر زار و زمانان و لەوانەیە بکەوێتە نێو گۆشەی رووداوەکانی رۆنامە بیانییەکانیشەوە و بە هەموو دنیادا بڵاو بێتەوە. تا هەیە، بچێتە هەر کوێیەك، ئەو رووداوەی وەك قیڕی سەر کەوای سپی، هەر لەگەڵ دەبێ و تووشی هەر کەس بێ، قاقا پێی پێدەکەنێ. کوردەکان بە بەگە کوردەکان پێنەدەکەنین، چونکە شتی وا لە نێویاندا باوە. ئەگەر لێرەش شتی وا باو بوایە، ئەویش ئاگای لێ دەبوو. دیارە ئەو فێڵبازە ئەوانەی لە خۆوە ساز کردووە. لە مێژووی ئێمەدا باسی شتی وا نەکراوە. نە تورکمانەکان نەریتی وایان هەبووە نە هەوشارەکان.

رەشید ئاغای جارێکی دی ناردەوە کۆشك بۆ ئەوەی لەو مەرجە مەحاڵە پاشگەزی بکاتەوە. بەڵام دەروێش بەگ قایل نەدەبوو و دەیگوت:"مەحاڵە بە شێوەیەکی دیکە ئاشت ببمەوە."

پێی قەبووڵ نەدەکرا. بەڵام ئەو خاکەی کە ئەگەر بەردی لێ بچێنی، مارچەوەی (جۆرە گیایەکی دەرمانییە) لێ شین دەبێتەوە، نەك هەزار، دوو هەزار، بە هەزاران دۆنم خاکی بەپیت و بەرەکەت. خاکێکی ئاوا بەپیت و بەرەکەت لە هیچ کوێی دنیایە دەست ناکەوێ. مەملەکەتەکە، میللەتە هەژارەکە دەکاتە خاوەن وەها زەوی زارێکی میکانیزە کە... لە دوا سەفەریدا بۆ ئەمریکا، مەزرا پێشکەوتووە گەورەکانی دیتبوو. مەزرا(زەوی و زار)ێکی وەك ئەو مەزرایانە و تەنانەت لەوانیش جوانتری رەعەمەل دێنا. ئەو کارە هەر بەو دەکرا. چونکە خاکێکی وەك ئەو خاکەی چوکووراوا کە بەدی شین دەکردەوە، نەك لە ئەمریکا تەنانەت لە دەم رووبارەکەی نیل‌یش پەیدا نەدەبوو. لە نزیکەوە دەم رووباری نیلیشی دیتبوو. ئەو بەرەکەتەی سەدەکان و بەدیهێنەری شارستانیەتە گەورەکەی تێر بە دڵ بۆن کردبوو. زەوییەکی نموونەی گەورە بە تەراکتۆر و گیادروو و ئەندازیارەکانی خاك و دانەوێڵە و گیاکانییەوە، بە کارگە و

ئیرکۆندیشنەکانییەوە، بە بینا جوانەکانییەوە و بە باخچە و دارستان و گوڵستان و یانە و مەیدانی تەنیس و پارکەکەیەوە. ئەگەر نەتوانێ کێڵگەیەکی ئاوا رەعەمەل بێنێ، بە حەژمەتەوە دەمرێ. تەنانەت کرێکارەکانیشی ترۆمبێل دەکرن. ئەوانەی رێیان دەکەوێتە ئەوێ، بە ئاسانی نازانن کێ خاوەن ملکە و کێ کرێکارە. بیانییەکان و گەشتیارەکان دێنە سەیری مۆدێرنترین و پڕ بەرەکەتترین مەزرای جیهان. کۆشکە گەورەکەی هیتی قاراتپێ، شارە مەزنە رۆمییەکەی ئاناوەرزاش نزیکە. رێگەیەکی ئەسفاڵتیش دەبێ بۆ ئاناوەرزا لێ بدرێ و میوانەکان بە گردەکەی ئاناوەرزادا بگەیەنێتە نێو شارە کۆنەکە.

ئەگەر ئەو کارە بکا... چما خەڵکەکە، گیانی خۆیان لە رێگەی نیشتیمان و وڵاتەکەیاندا ناکەنە قوربانی؟ چما سەدان و هەزاران و بگرە ملوێنان رۆڵەی نیشتیمان خوێنی خۆیان لە پێناوی بەختەوەری ئەو وڵاتەدا نەڕشتووە؟ بەڵێ، بەڵێ، رشتوویانە. خوێنی تورک هێندەی رووبارەکان بەسەر ئەو خاکەدا رژاوە. ئەگەر ئەویش جارێکیان، یەك جار خۆی بە فیدا بکات و ببێتە گاڵتەجاڕی ئەم و ئەو، چ دەبێ؟ چما هەموو کەسێك و هەموو شتێك بۆ ئەو نیشتیمانە ئازیزە و بۆ ئەو خاکە پیرۆزە نییە؟ چما ئەو بارگرانی و تاڵییە چەندە دەخایەنێ؟ ئەوپەڕەکەی سێ سەعات. دوای ئەوە بەختەوەری. خەڵك، ئەو جانەوەرە هەزار سەرە سامناك و نەزانە، زۆر زوو لەبیری دەچێتەوە. بێ ئینسافە. کە بنیادەمی وەچنگی دەکەوێ، دەکەوێتە سەر زار و زمانی، ئیتر لێی نابێتەوە، بەڵام زوو لەبیری دەکا. باب و باپیرەکانمان لە خۆڕاییەوە نەیانگوتووە، لەبیرچوونەوە بەڵای مێشکی بنیادەمە. هەموو شتێك بە تێپەڕینی کات لەبیر دەکرێ. لەو دنیایە هیچ شتێك بەقای نییە و شتێك نییە لەبیر نەکرێ. لە هەمبەر ئەو مەزرایەدا، ئەو بەهەشتی سەر زەوییەی بەشی هەرە گەورەی چوکووراوای داگرتووە، هەموو شتێك لەبیر دەکرێ و تەنیا سەرسووڕمانەکە دەمێنێتەوە.

چەند رۆژ دواتر، فکرێکی دیکەی بە مێشکیدا هات. چۆنە داوای لێ بکات ئەو نەریتە بێزارکەرەی ئۆغوز، لە کاتی شەودا بەڕێوە بەرن؟ ئەگەر مەبەستت ئەو جانەوەرە ناپیاوە نائینسانە مەبەستی هەر بەڕێوەچوونی نەریتەکە بێ، دەی جا چ دەبێ ئەگەر بە شەو بیکا؟ دەمودەست چوو و رەشید ئاغای دۆزییەوە و بە ترۆمبێلەکەی ناردییەوە بۆ کۆشکەکەی دەروێش بەگ. دڵی زۆر بەو تەگبیرە تازەیەی خۆش کردبوو.

دەروێش بەگ قەبووڵی نەکرد. دوانیوەڕۆ و بەیانییشی قەبووڵ نەبوو. دەبوو ئەو کارە رێك لە نیوەڕۆیەدا بێ. رۆژەکەشی هەینی نەبێ هەر رۆژێکی دیکە دەبێ با ببێ. ئەگەر ئەو

ئاشتبوونەوەی بویٚ، ئەویش چاوەڕوانی دەبیٚ یان تا دەمریٚ هەر لە ئاگری پەشیمانیدا دەسووتیٚ. هەموو هیچ و پووچیٚك ناتوانیٚ ئاشتبوونەوە بە ریٚوشویٚنی ئۆغوز قەبوولٚ بکات. بەشیٚك لەو خاکەی ئەو چاوی تیٚوەبڕیوە، گوندییەکان دەستی بەسەردا دەگرن و بەشیٚکی دیکەشی دەدەمە دوژمنە بەخویٚن تینووەکەی ئەو بە فەرهادبەگ. ئەو ئیتر بەرگەی ئەو دۆڕاندنە ناگریٚ و دیق دەکا.

ئەگەر ئاشت بوایەتەوە، ماهیری بیٚ دایك و بابی ئاگر دەدا، ئاشتیش نەبوایەتەوە...

جاریٚکیان لە جەیحوونی کوڕی پرسی:"تۆ دەلٚیی چی؟ پیٚت وایە دەیکا یان نا؟ بانگی بە نویٚژی نیوەڕۆ لە نیٚوەڕاستی شارۆچکە، لە چەقی بازاڕدا چ دەقەومیٚ؟"

جەیحوون پشتەملی خوراند و چووە فکردەوە و وەلاٚمی دایەوە:"کاکم لە نزیکەوە دەیناسیٚ. کاکەم دەلٚیٚ، جاریٚ هەر مل نادا، بەلاٚم ئاخرییەکەی کە زانیی چاری ناچارە، مل رادەکیٚشیٚ. کوڕە خۆ شتیٚکی سەیر نییە، چەند کەسیٚك پیٚدەکەنن و تەواو دەبیٚ. کاکەم دەلٚیٚ ماهیر بەگ پیاویٚکی ژیر و تیٚگەیشتووە. دەلٚیٚ ئەو ناو و ناوبانگی بە گیرفانی بەتالٚەوەی بە پووشیٚك ناویٚ."

دەرویٚش بەگ سەری سووڕ مابوو. چۆن، چۆن دەبیٚ بنیادەمیٚك ئەوەندە خۆی سووك بکا. نایکا، ناتوانیٚ شتی وا بکا. بیهیٚنە بەرچاوی خۆت، لە نیٚوەڕاستی بازاڕ و لەبەر چاوی هەزاران کەس... یانی بە بەرچاوی هەموو خەلٚکی شارۆچکە و گوندەکانی دەورووبەرەوە کە دیٚنە سەیری، شتی وا دەکات؟"

جەیحوون زۆر لیٚبڕاوانە گوتی:"کاکەم دەلٚیٚ دەیکا."

"دەیکا، دەیکا. هەموو چەپەلٚی و چەوتییەك لەوانە دەوەشیٚتەوە. بەلاٚم بیٚت و مل بۆ ئەوە راکیٚشیٚ، منیش قەبالٚە و تاپۆی هەموو ئاقچاسازی بەناو دەکەم. لیٚی گەڕیٚ با بەو سووکایەتییەوە مراد و مەقسوودی دلٚی حاسلٚ بیٚ."

ماوەی دوو سیٚ مانگیٚك قاباقچی ئۆغلٚی مرەی نەهات. دەرویٚش بەگیش پیٚی وابوو ئیدی وازی هیٚناوە و پاشگەز بووەتەوە. خەریك بوو خۆشەویستییەکی تیٚکەلاٚو بە ریٚز و حورمەت بەرامبەر بەو، لە دلٚیدا چەکەرەی دەکرد کە دیسان نیٚوبژیوانەکان سەروسەکتیان پەیدا بۆوە. تاقمیٚك خەلٚکی بیٚ نرخ و هیچ و پووچ کە لە پاڕانەوە و پیٚداگرتنەوە ماندوو نەدەبوون. دەرویٚش بەگیش گویٚی دەدایە قسەکانیان و هەموو جاریٚکیش دەیگوت:"یان بە شیٚوازی تورکمانان، یان هیچ..."

نێردراوەکانی هەموو جارێ بە دەستی بەتاڵ دەگەڕانەوە. لە تووڕەییان لە دین دەهری دەبوو و چاوی دەقووچاند و زاری دەکردەوە و مردوو و زیندووی دەروێش بەگی نەدەهێشت، بەڵام بێهیواش نەدەبوو. لەوانەیە لە ژیانیدا ئەوە یەکەمین جاری بوو ئەوەندەی رق لە بنیادەمێك دەبوو. ژەهری ئەو رقە ژیانی لێ تاڵ دەکرد. ئامادەبوو دەروێش بکوژێ، بە دەستی خۆی بیخنکێنێ، خوێنەکەی بخواتەوە و پێستی سەری هەڵقەنێ و گۆشتەکەی پل پل بخاتە بەر سەگان. کە ناوی دەهێنرا، دڵی تێکەڵ دەهات و جاری واش بوو رێك دەرشایەوە و بە دەم هێڵنجەوە دەیگوت:"ئەمن ماهیر قاباقچی ئۆغلێم پێ دەڵێن. لێت سوور بێ ئەگەر رەزامەندیت لەسەر نەبێ، چیی بڵێی دەیکەم و سەرم بۆ هەموو شتێك شۆڕ دەکەم. ئەو زەوی و زارە بەخوای گیانی بنیادەمیشی تێدا بچێنی، شینی دەکاتەوە. ناهێڵم بەو گوندییە پیس و گلاّوانە ببڕدرێ کە قەدر و قیمەتی هیچ شتێك نازانن تەنانەت قەدری گیانی خۆشیان. بە قسمەتی ئاغا و بەگی وەك تۆ کەریش نابێ. کام سووکایەتی لە هەمووان خراپترە، لەسەر ئەو زەوییە نموونەیە قەبوولّی دەکەم هەر بۆ ئەوەی تۆش لە داخان بتەقی. هەر بۆ ئەوەی تۆ بەچاوی خۆت بیبینی و چاوەکانت کوێر بن. هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارێ چەند نۆکەرێکی لەسەر دادەنێم ئێشکی بگرن و هەموانیش جلوبەرگی نیلیی کۆبەگێراویان لەبەر بێ. جا جلوبەرگی تورکمانیانەشیان لەبەر دەکەم و وایان لێ دەکەم رێك لە تۆ بچن. دوای ئەوەش بەڵای وات بەسەر دێنم ئەو شیرەی دایکت پێی داوی، لە بنی ددانتی دەردێنمەوە. ئەتۆ بەو ئەقڵەتەوە، بەو مێشکە بۆشەتەوە، تووشی رەزالەت و داکشانێك دەبی کە... بەزەییم پێتدا نایەتەوە. زگم پێت ناسووتێ. چیت بوێ دەیکەم. ئەمن بەو جۆرە کارانە ناشکێم. رێگەیەك هەر دەدۆزمەوە بۆ ئەو رێوشوێنە تووك لێکراوە قۆڕە تورکمانی یان چووزانم ئۆغوزییەی تۆش.... ئەوەت لێ سوور بێ کە ئەمن چەندی بشکێمەوە، گەورەتر دەبمەوە. کاتەکەی دیاری بکە، ئەمن ئامادەم. ئامادەم بەگی خۆم، ئامادەم براله. ئەتۆش ئامادە بە ساری زادە دەروێش پاشا، ئامادە بە، کوڕەکەی قاباقچی خەلیل دێ."

شەوانە وەك دۆڵپا سواری بووبێ، پشووی سوار دەبوو و لە بەر گریان دەکەوتە هەنیسکدان. تۆ خوا وەرە ئەو هەمووە دووکەڵی چرایە هەڵمژە و لە ڤیەننا بخوێنە و ئەوجار وەرە ببە بە گاڵتەجاڕی هیچ و پووچێکی ئاوا کۆنەپەرست. ئەو دەردە بێ دەرمانە پیاو دەکوژێ. لەو نێوەدا تەنیا سوکنایی بەوە دەهات، کە لە پێناوی بەختەوەریی نیشتیماندا ئەو کارە دەکات.

گۆشەیەك لە نیشتیمانەکە ئاوەدان دەکاتەوە و ناهێڵێ زەوییە بێ خاوەنەکان بکەونە دەست ئەو تورکانەی نە دەزانن خاك چییە و نە دەزانن بنیادەم چییە و لەگەڵ وەحشییە قولەرەشە رووت و قووتە ئەفریقییەکان هیچ فەرقێکیان نییە.

تاوێك دواتر وازی لەو بیر و خەیاڵە هێنا. کارێکی ئەستەم بوو، ئەستەم. کارێك بوو کە پێنەدەچوو کردنەکەی زۆر مەحاڵیش بێ. کەسانی وەك خالیدە شێت و دەوران بەگ و برایم ئاغا و تاشقین بەگ، وەك ئاوخواردنەوە پێیان دەکرا و مێشێکیشیان لێ میوان نەدەبوو. ئەی عوسمان راسم؟ وەك موو لە ماست دەرکێشێ. ئەویش بۆ پەنجا لیرە، نەك بۆ زەوییەك کە هەر قولانجێکی، مستێکی زێڕ دێنێ. بەڵام سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە، قۆرت بۆغا، جافر ئۆز پۆلاد و رۆستەم بەگ شتی وایان نەدەکرد...

چووە لای عوسمان راسم و لێی پرسی:"ئەتۆ لە جێی من بوایەی ئەو کارەت دەکرد؟"

عوسمان راسم قاقایەکی کێشا و گوتی:"بۆ، بۆ نەمدەکرد؟ هەر ئێستاش بە خۆڕایی دەیکەم هەر بۆ ئەوەی خەڵك تۆزێك رابوێرن و دڵیان خۆش بێ. ئەتۆ پەنجا لیرەم بدەیە، هەر ئێستا دەیکەم. بەڵام ئەتۆ چۆن دەتوانی؟"

ئەوەندە پێکەنی وەخت بوو بدڕێ و دەیگوت:"بیهێنە بەر چاوت. خۆت لەو حاڵەتەدا بێنە پێش چاوت.... بەڵام قسەی خۆمان بێ، زۆر سەیر دەبی.... بەو حاڵەتە قێزەون و ورگە پڕ شکۆ پەرلمانتارییەتەوە.... وەی... وەی. ئەگەر تۆ ئەو کارەت پێ بکرێ، پێنج هەزار لیرەش لە من وەرگرە. وەك شیری دایکت حەڵاڵت بێ. هەر بەراستی کاری وات پێ دەکرێ؟ ئەگەر توانیت، زۆر خۆش دەبێ."

عوسمان راسمیش چووبوووە زانکۆ. ئەویش مڵکێکی گەورەی هەبوو. مەرەزەجاڕ و ئاش و باغێکی گەورەشی هەبوو. زۆریش دەوڵەمەند بوو.

راستی دەکرد. عوسمان راسم ئەو کارەی زۆر سووك و سانا و بە پێکەنین و گاڵتەوە و تەنیا لە پێناوی پەنجا لیرەشدا دەکرد و کەسیش لۆمەی نەدەکرد، بگرە دەستخۆشانەشیان لێ دەکرد و خۆشەویستتریش دەبوو و قەشمەری و دڵپاکییەکەشی پتر جێ دەکەوت. ئەو ئاوا بوو. ژیانی خۆی وا دانابوو، مەسەلە لەوە دابوو. ئەگەر ئەمیش وەك عوسمانی کردبا، هەتا رۆژ بازاڕەکەی قیامەتێ لەبیر نەدەچۆوە. عوسمان، کە دەیهێنایە پێش چاوی خۆی، وەخت بوو لەبەر پێکەنین ببوورێتەوە.

"یانی ئەگەر من شتێکی وا بکەم چ دەبێ؟"

عوسمان راسم لە حاڵێکدا لەبەر پێکەنینان دەستی بە زگییەوە گرتبوو و خۆی وێك دێنا، بە قەڵتوبڕەوە گوتی:"زۆر خۆش دەبێ. قیامەت دەبێ، قیامەت. پێشنیار دەکەم وا بکەی. تۆ خودا بیکە."

ئەی خۆزگە نەهاتبایەتە لای ئەو سەگبابە. کوڕە خۆ ئەو بێ حەیایە هیچی پێ عەیب نییە. ئەو چەندی قەشمەریی دەکرد، ماهیر پتر تەریق دەبۆوە. کوڕە خۆ سەگی سەگبابە ناشیبڕێتەوە. چاوەکانی لەبەر پێکەنین پڕ بوون لە ئاو.

دڵی گیرابوو. هەمووان پێیان وابوو ئەو کارە لەو ناوەشێتەوە. لەگەڵ هەر کەسێ باسی دەکرد، بە قاقا و پێکەنین و تریقانەوە پێشوازیی لێ دەکرا. خەڵکی بەرچاوتەنگ. ناکرێ نا. هیچ لەو نەدەوەشایەوە. خۆزگە ئەویش لە قوماشی عوسمان راسم دەبوو. ئەگەر وا بوایە لێی دەوەشایەوە. ژنەکەی، کچەکەی کە لە کۆلیژی ئەستەنبووڵ دەرسی دەخوێند، دوو کوڕەکەی و برا و خوشکەکانی، خزمە دوور و نزیکەکانی هەموو ماتەمبار بوون و لەبەر دەپاڕانەوە، واز بێنێ و دەست هەڵگرێ.

دوای ماوەیەك جینگڵدان، ئاخرییەکەی رەشید ئاغای راسپاردەوە، کە بڵێ ئەوە بەو ناکرێ. ئۆغوز هەرگیز وەها سووکایەتییەکی پێ نەکرابوو. خەریك بوو شێت بێ. داهاتووەکەی فەوتابوو. چاوی لەو زەوی و زارە بێوێنەیە پۆشیبوو، بەڵام چما دەیتوانی؟ کەڵکەڵەی دڵ، ئۆقرەی لێ بڕیبوو.

هەموو رۆژێ بەیانی سواری ترۆمبێل دەبوو. دەچوو و لەسەر ئەو خاکە رەشەی لە ئاوەی زۆنگاوەکە هاتبووە دەرێ و لە کچۆڵەیەکی عازەب دەچوو، کە خۆی هەڵخستبێ و ئامادەی زاووزێ بێ، دادەنیشت و تاسەبارانە چاوی تێوە دەبڕی.

باشە ئەو جۆرە ئاشتبوونەوەیە چۆن بە مێشکی ئەو سەیەدا هاتبوو؟ شەیتانیش فکری بۆ شتی وا ناچێ. دوژمنە ئیتر، دوژمنێکی بەخوێن تینوو. دوژمنی ئاوا هیچی لێ بەدوور نییە. دوژمنی وا، چ بەڵایەکی لەدەستی بێ، بەسەر پیاوی دێنێ. دیسان ئەگەر بە جۆرێکی دیکە بوایە و ئاوا غرورشکێن و پڕ لە سووکایەتی و لە هەمووش خراپتر دوور لە چاوەڕوانی نەبوایە، دەکرا داخوازییەکەی جێبەجێ بکەی. ئەوی هەر بە بنیادەمیش دانەدەنا... ئەو شێتێك بوو بەدەم رێگاوە گووی دەکرد. ئەو مەرجەی لە هەرگیز و لە هیچ جێیەك بۆ جێبەجێ نەدەکرا، بەڵام ئاخر ئەوەشی نەکردبا، دەبوو واز لەو هەمووە زەوی و زارە زێڕینە بێنێ. ئاخ ئەو نەریتە قۆڕەی ئۆغوز بەقوڕێدا بچێ. سەگی سەگباب. تەنانەت ئەگەر گوتبایەی دەبێ بێیە بەر

دەرگاکەم و رووت و قووت بیتەوە، دەکرا بیکەی. هەر ئەوەندە بەسەر کەس ئاگای لێت نەبێ و تەواو. گەمەی نێوان ئەو جووتە، بە سووکایەتی لە قەڵەم نادرێ. ئەگەر گوتبای دەبێ بەو زۆنگاوەدا  بە گاگۆڵکێ و بە سەر و دەموچاوی قوڕاوییەوە وەك خزۆك و خشۆکان بە گاگۆڵکێ و سینەخشکێ بێیە لام، هێشتا قەبووڵی دەکرد... هەمووی ئەوانە دەکران. بەڵام ئەو مەرجەی ئێستای قەبووڵ نەدەکرا. ئەوجار برادەران و بنەماڵە و خزم و کەسەکانی، هیچ کامەیان رازی نەدەبوون ئەو گەمە سامناکە بکرێ.

ماهیر چەند مانگێك هەر وا ژیانی لێ تاڵ و دڕدۆنگ بوو. لە بەیانییەوە تا ئێوارێ بەسەر ئەو خاك و زەوییانەدا پیاسەی دەکرد و بیری دەکردەوە و تووڕە دەبوو. شێت دەبوو و لە خۆشی و شادییەوە ئاوەژوو دەبۆوە بەرەو دڕدۆنگی و لە هیواوە بەرەو بێ هیوایی و رۆژەکانی ژیانی ئاوا بە سەرلێشێواوییەوە تێدەپەڕین. بەڵام بەهیچ جۆرێك نەیدەتوانی دەست لەو زەوی و زارە هەڵگرێ. تەگبیر و رای دەکرد و جار و بارە تاڵە تیشکێکی هیوای لەدڵی دەگەڕا، کە ئاخرییەکەی ئەو دڵە بەردەی بە فێڵێك هەر نەرم دەکەم. جاری وابوو بیری دەکردەوە: ئەگەر بچم و خۆ بخەمە سەر پێڵاوەکانی، واز دێنێ؟ ئەگەر بچووکترین هیوایەکی بە نەرمبوونەوەی دڵی هەبوایە، چرکەیەکیش چیە دەرفەتەکەی لە کیس نەدەدا و بە سەر، تا کۆشکەکەی ساری ئۆغڵی رای دەکرد.

لەو مانگانەدا زۆری بیری لە دەروێش کردبۆوە و پێی وابوو لە رەگی قوونیشی تێگەیوە. بە پێی توانایی خۆی، ترس و قین و خۆشەویستی و هیوا و بێ هیواییەکەی و... هەموو لایەنەکانی لێك دابۆوە و لێی ورد ببۆوە. زۆری قسە لەگەڵ ئەو کەسانە کردبوو کە لە نزیکەوە دەیانناسی. لایەنە لاواز و بەهێزەکانی کەسایەتیی ئەوی تەواو بۆ دەرکەوتبوو. بەڵام هەر نەیزانیبوو، چ شتێك دەتوانێ لەو بڕیارە وەحشییانەیە پاشگەزی بکاتەوە.

ئێستا ئەگەر دەروێش لە جێی ئەو دەبوو، دەستی لە هەموو دار و نەداری خۆی هەڵدەگرت. بە ئارەزووەکەی دەگەیشت، بەڵام لە خالیدە شێت خراپتر، وەسواڵ دەکەوت. دەروێش ئەگەر کەوتبایەتە وەها رەوشێکەوە، یان شەوێکیان لێی دەدا، یان پیاوکوژێکی بۆ دەنارد و تەنانەت ئەگەر ترسی کوژرانی خۆشی بوایە، کارەکەی دەبڕییەوە و ئەو ژیانە پڕ لە نەهامەتییەی بەو جۆرە و بەو نرخە درێژە نەدەدا.

بە گشتی و بە هەموو جۆرێك، ئەوەی لەسەر کەسایەتییەکەی دەروێش فێری ببوو، ئاخری رۆژێك بەکاری دەهات. بەڵام جارێ نا... چراکەت بۆ تاریکی هەڵگرە...

## ٦٢

خەریك بوو بەیان دەنگوت. بەلای ڕۆژهەلاّتدا لێواری گەواڵە هەورێك بریسکەی دەدا و خاك و خۆڵەکە لە نێو لەپی ماهیر قاباقچی ئۆغلێدا نەرم نەرم هەڵدەڕژا. نەیتوانیبوو دڵ لەو خاکە بەربدا. ئەو خاکەی نەیتوانیبوو بیکاتەی هیی خۆی. وای دەست بەسەر خاکەکەدا دێنا دەتگوت دەست بە ژنێکدا دێنێ. خاکەکەی لویێچ لویێچ هەڵدەگرت و وەك ئەوەی مانگایەك بدۆشێ، بەسەر عەرزەکەیدا هەڵدەڕشتەوە. خاکی ئێرە، ئەو بۆنەی لێوە دەهات، کە گڵی دوای باران لێی دێ و ماهیر پێی سەرخۆش دەبوو و گێژی دەکرد. هەموو دەمو ساتێك بیری لەوە دەکردەوە چۆن دەست بە سەر ئەو خاکەدا بگرێ. ئیتر هەموو هیوای بەوە بوو دەروێش بەگ بمرێ. بەلاّم ئەو ساغ و سلاّمەت و بێ وەی دیار بوو و هیچ پێنەدەچوو وازوو بمرێ. ئەی بەکوشتدانی بە پیاوکوژێك؟... بەلاّم چما کەس هەبوو بوێرێ کاری وا بکا؟ کۆنە یاخی و گەنجی لە خۆڕادیتووی کارامەی نێو خزم و کەسان نەمابوو پەنای بۆ نەبردبێ. گەلێ وادە و بەڵێنیشی بە هەر کامەیان دابوو. بەلاّم مخابن، زەوی و زاری میکانیزە و مەکینەی دروێنە و تەراکتۆر و سەروەت و سامان و ئیعتیباری بانك، کەسیان هەڵنەفریواندبوو. کەچی هەر ئەوانە زۆربەیان بۆ دووسەت سێسەد لیرەیەك، بۆ شیربایی کچێك، بۆ جووتە گایەك، پیاویان کوشتبوو.

جاری واش بوو بیری لە مستەفا ئاق یۆللی دەکردەوە. مستەفا بەگ چیی بەسەر هاتبوو؟ یانی دوای مەرگی دایکی، ئیتر دامرکابۆوە؟ ئیتر هەڵلاّ بڕابۆوە. بەلاّم یانی ئەو وەجاغی مەرگە تازە دانەدەگیرسایەوە؟ نەدەکرا ئەو مەنجەڵی مەرگە وەجۆش و کوڵ بێننەوە؟ مستەفا بۆ کوشتنی دەروێش زۆر ڕێگەچارەی تازەی دۆزیبۆوە، بەلاّم دەروێش ئەو دەروێشە سەگسارەش، هەموو تەڵە و داوەکانی ئەوی تێك دابوو و لە ماوەی چەند ساڵاندا لەوانەیە سەد جاران لە زاری مەرگ دەرباز ببوو. لە چنگی دابونەریت دەرباز هەر نابێ. مستەفا بەگ هەر شتێك بکا، تەمەنی بگاتە سەد

سالآنیش، بکەوێتە ئاویلکەدانیش، ناچارە و دەبێ خوێنی براکەی بستێنێتەوە. ناتوانێ وەریگرێتەوە. دوای تۆڵەکردنەوەکەیەتی، کە دەتوانێ وەك پیاوان بێتە نێو خەڵکی و بجەسێتەوە. ئاخۆ مستەفا بەگ ناتوانێ ئێستا ئەم کارە راپەڕێنێ؟ باشە بۆچی لەگەڵ ئاق یۆللی رێك نەکەوێ؟ باشە بۆچی پێکەوە دەست نەدەنە دەستی یەکتری دژی ئەو دوژمنە هاوبەشەیان؟ ئەو پارەی هەبوو، حیزبیشی پشتیوان بوو و هەموو پیاوەکانی دەوڵەتیشی لەبەر دەستدا بوون. مستەفا ئاق یۆللیش پیاوکوشتن و ئاوخواردنەوەی پێ وەك یەك بوو.

خاکە رەشەکە هەروا لە دەستییەوە دەڕژایە خوارێ، بڕیاری دا بچێتە لای ئاق یۆللی. جارێ تاقە هیوای هەر ئەو بوو. تووڕەییەکەی و هیواکەشی سات بە سات پتر دەبوو. پێی دەڵێم پووتێك چەند کیلۆیە. بەو کەرە، بەو زاڵمە، بەو پیاوکوژە دەڵێم، نەریتی ئۆغوز یانی چی. دەبێ ئەو نەریتی ئۆغوزە بەڵایەکی بەسەر بێنێ ئەوسەری دیار نەبێ. جەستەی کوژراوی زەرد زەرد... سینگی وەك سوزمە. وا بێ دوکتۆرەکان بۆیان ساغ نەبێتەوە چەند فیشەکی وێکەوتووە؟ کەلاکەکەی دەروێشی لە پشتی سەیارە دەبەست و وەك کەلاکی سەگێك بەسەر رێگا پڕ لە خۆڵ و خاك و بەردەکانی چوکووراوادا دەیکێشا. نا، نا، تەرمەکەی نا، بەزیندوویی. پەتێکی لە ملی دەکا و لە سەیارەکەی دەبەستێ و بە خێرایی سەد و بیست، سەد و سی و سەد و چل....

کۆشکەکەی مستەفا ئاغای ئاق یۆللی بەو گلێنە کاڵەوەبووانە و بە بەردە رەش هەڵگەڕاوەکانییەوە، لە دەشتەکەی چوکووراوادا لە کۆگایەك دەچێ. لەسەر کۆگایەك، کۆشکێکی گەورەی بەردین کە دیوارێکی هێندەی دوو مەتری بە دەوردا کێشرابوو. دارە چڕ و گەشەکانی تووت و چنارەکان لە حەوشەکەدا هەستابوون. کە پێی نایە حەوشەوە، سەری سووڕ ما. هەندێ شت گوێبیست ببوو، بەڵام پێی وا نەبوو ئاواش بێ. ئەو حەوشە پان و بەرینە، چۆڵ و کپ و بێدەنگ بوو. کۆشك و حەوشەکەی لە کاولاشێك دەچوو. هەر دەتگوت چۆلەکەکوژی تێدا ناچی. بەوحاڵەشەوە ئەسپەکەی لە دارێك بەستەوە و وردە وردە بەرەو پلیکانەی کۆشکەکە چوو. زیندەوەرێك نەدەبینرا. دەرگای هەموو ژوورە چۆڵەکان کرابوونەوە. دەرگایەك پێوەدرابوو بە پارێزەوە کردییەوە. پێی وا نەبوو کەسێکی تێدا بێ. هەر کردییەوە بزانێ چیی تێدایە. باوەڕی بە چاوەکانی خۆی نەکرد. ماوەیەك لە دەرەوە راوستا و روانیی. ئەو بنیادەمەی لە نوێن و بانەکەدا سیس هەڵگەڕابوو، هەر دەتگوت مستەفا بەگ خۆیەتی. بەدەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:" سەلامو عەلەیکوم."

ئەویان سەری لەسەر سەرینەکەی هەڵگرت و دەمانچەکەی دەستی سەر لێفەکەی کەوتە سەر کۆگایەك فیشەکی بریقەدار. بە چاوێکی بێ گیان و بەتاڵ، سەیری ئەو کابرایەی کرد کە لە لاشیپانەی دەرگاکەدا وشك هەڵاتبوو. لە پێشدا پێی وابوو دەروێش بەگە و نێوچاوانی تێك نا، بەڵام کە زانیی ئەو نییە، لێوی جووڵاند:"عەلەیکەسەلام.... بەخێر بێ.... تۆ کێی؟"

ماهیر لە خۆشییان چووە پێشتر و گوتی:"خودا راوەستاوت بکات، سێبەرت هەر بە سەرمانەوە بێ بەگ. منم، ماهیر قاباقچی ئۆغڵی."

چوو و لەسەر کورسییەکی شەق و شەوێقی بن دیوارەکە دانیشت و گوتی:"بێ بەڵا بی بەگ، خودا وەخێری بگێڕێ."

مستەفا بەگ وەڵامی نەدایەوە. تاوێك بێدەنگ بوون.

دەستەکانی ماهیر دەلەرزین. چاوە حەپەساو و پڕ لە پرسیارەکانی ئەو بنیادەمە، تا رادەیەك چیی لە دڵ و دەروونیدا نەهێشتبۆوە. تاوێك بە دڵی دا هات هیچی لەگەڵ نەهێنێتە گۆڕێ. بۆ ئەوەی قسەیەکی کردبێ و دراوی زاری تاقی کردبێتەوە، باسی شارۆچکە و باس و خواسی حیزبایەتیی هێنایە گۆڕێ. بەڵام هەر بەراست مەسەلەی حیزبایەتی بۆ باسکردنێ دەبوو؟ دیارە دەبوو. یارمەتییەکەی ئەو بە حیزبی دیموکرات هێشتا لەبیر نەچووبووەوە. تەنانەت لە دوایین سەفەریدا بۆ ئەنکەرە، سەرۆك وەزیران خۆی، ئەحواڵی ئەوی لێ پرسیبوو. گوتبووی ئەرێ ئاغا چۆنە؟ لە منەوە سڵاوی بگەیەنە. چاوەکانی ماچ دەکەم، بێت و رێم بکەوێتە باشوور، بە دڵنیاییەوە دەچمە خزمەتی.

قسەی دەکرد و دەیگێڕاوە و پێیدا هەڵدەگوت و لەوەی تا ئێستا نەیتوانیبوو بێتە خزمەتی، داوای لێبوردنی لێ دەکرد. بەڵام مستەفا ئاغا هیچ گوێی بەو قسانە نەدەبزووت. چاوە پڕ لە پرسیارەکانی تێوەبڕیبوو و هەر دەتگوت لێی دەپرسێ بۆچی هاتووە و چیی دەوێ؟ ئاخرییەکەی خۆی پێ نەگیرا و بە دەست خۆی نەبوو لە زاری دەرپەڕی:"بۆ ئەوە هاتووم کە..."

ئەوجار بە تێر و تەسەلی باسی دەروێشی کرد، کە چەندەی سووکایەتی پێ کردووە. دەروێش برا و دایکی ئەوی کوشتبوو. بەڵام تەماحی لە گیان و ماڵ و بنەماڵە و لەوەش خراپتر لە نیشتمانیش هەبوو.

"ئەمنیش بەڵێن دەدەم و لە هەنتەشی بەرێزتدا سوێند دەخۆم، هەتا ئەو رۆژەی ئەو بنیادەمە بەسەر ئەوخاکە بە پیت و بەرەکەتەدا هەنگاو دەنێ و لە بن میچی ئەو ئاسمانەدا و لە بەر تریفەی ئەو ئەستێرە جوانانەدا هەناسە دەکێشێ، ژیانی ئاسوودە و ئینسانیانە لە نێو

مرۆڤەکاندا، لەو دنیای وەك بەهەشتە و لە بەر ئەو تاوەی دەڵێی گوڵە پشکووتووە، لێم حەرام بیّ. با دژی ئەو دوژمنە هاوبەشەمان یەك بگرین."

دەکرا یارمەتییەکی زۆری بدات. زۆر شتی بە دەستەوە بوو. ئەو شتانەی خەڵکی دیکە نەیانبوو. ئیمکاناتی مستەفا ئاغاش جێی سەرنج بوون. ئەگەر هەموو تواناکانیان وەسەر یەك خستبایە، کێویان لە بن دێنا. زۆری قسە کرد و ئاخرییەکەی پێی وابوو توانیوێتی قایلی بکات. سەری هەڵێنا و بێدەنگ بوو.

بەڵیّ، مارەکە چیی گوتبوو؟ نە مار کلکی لەبیر دەچیّ، نە باغەوانیش کوڕەکەی... چاوەڕوان بوو، ئێستاش ئەوە ئەو بوو، کە چاوە پڕ لە پرسیارەکانی لە مستەفا ئاغا بڕیبوو.

مستەفا چاوەکانی لە عەرزی بڕیبوون و زاری ببووە تەڵەی تەقیو. ماهیر ماندوو بوو لەوەی سەیری بکات و نیگای بەرەو ئەو دەمانچەیە خزی کە لەسەر لێقەکە دەبریسکایەوە.

ئاخرییەکەی مستەفا ئاغا سەری هەڵێنا و بەندی جەرگ و دڵی ماهیر پسا. ئێستا لەو زارە قووچاوەوە قسەیەك دەهاتە دەریّ و داهاتووی ژیانی ئەوی روون دەکردەوە. بە نزگەرەوە گوتی:"زۆر داوای لێبوردن دەکەم ماهیر ئاغا."

بۆچی نزگەرەی دەکرد؟

جا لەسەر قسەکەی رۆیشت:"بە داخەوە ناتوانم یارمەتیت بدەم. زۆر سوپاست دەکەم. دوژمن، دوژمنی منە."

دیسان زاری بۆوە بە تەڵەی تەقیو. ماهیر هەر چاوەڕوان بوو و بوو و مستەفا ئاغا ئیتر نە سەری هەڵێنایەوە و نە متەقی لێوە هات. ماهیر نوقمی ئارەقە بوو. هیچ چاوەڕوانیی ئەوەی نەبوو مستەفا ئاغا ئاوا رووی نەداتیّ.

# ٦٣

دەروێش لە خۆشییان وەخت بوو بفڕێ، ماهیر هێشتا دەستی هەڵنەگرتبوو. سەری لە هەموو بەرد و کوچکێك دەدا و تا دەشمرێ هەر وا دەبێ. هەموو ڕۆژێ هەواڵی ماهیر بەگی بۆ دەهات. چیی دەکرد و چیی دەگوت و تەنانەت پژمیبایەش، دەسبەجێ ئاگادار دەکرایەوە. ئەوەشی بیستەوە کە چووەتە کۆشکەکەی ئاق یۆللی و ویستوویەتی لەگەڵ ئەو ڕێك بکەوێ. لە هەواڵەکەی دواییدا بیستییەوە، کە مستەفا بەگ رووی نەداوەتێ. کاری ئاوا زۆر گاڵتەجاڕانە بوو و لە ماهیر نەدەوەشانەوە، بەڵام ڕاستیش بوون. ماهیر سەری بۆ زۆر شوێندا کردبوو بۆ ئەوەی یەکێك بدۆزێتەوە بۆی لەو بدات. ئەوانەی سەردانی کردبوون، یەکێکیان خەلیل ئاردیچلی بوو، کە کۆنە یاخییەك بوو. پارەیەکی زۆریشی بۆ تەرخان کردبوو و خەلیل لە وەڵامیدا گوتبووی:

"بەر لەوەی دەستم بگاتە دەمانچەکەم، دەروێش بەگ دەمکوژێ. ئەمن لەو چوکووراوایەدا کەسم پێ شك نایە بوێرێ دەست لە سەر دەروێش بەگ بەرز بکاتەوە. ئەگەر قسەی منت دەوێ، پێت دەڵێم واز لەو کارە بێنە."

ئیتر بە پێکەنینەوە وەشوێن کاری خۆی کەوتبوو.

"ئای ماهیری گەواد، ئای. یانی ئاوا؟ وات لێ هاتووە پیاوکوژم بۆ دەنێری؟ ئەگەر من تۆم ناچار نەکرد بە شێوازی تورکمانی ئاشت بیتەوە، وەرە تفێکم لە روو بکە. ئەگەر لەو چوکووراوایەدا حەیا و ناموستم نەبرد... لە ڕاستیشدا تۆ فلسێك ناهێنی."

چەند ڕۆژ دواتر خەبەرێکی بۆ هات بڕوای نەدەکرد. ماهیر کابرایەکی دۆزیبۆوە کە ئامادەبوو لە دەروێش بدات. دەروێش بنج و بناوانی کارەکەی لێك دایەوە. ڕاست وا بوو. کوردێکی گوك سۆنیی ئازا و بەدەستوبردە ـــ لە لای سەروو، لە تۆرووسەوە. ماهیر پارەیەکی زۆری دابوویێ. ئەو خەبەرە وەك بڵێی لە لایەکەوە دڵی دەروێش بەگی خۆش کرد و لە لایەکی

دیکەشەوە بڵێی و نەڵێی نارەحەتی کرد. پارە، پارەیە و خەڵکی حەوجێ، وا لێ دەکا هەموو کارێك بکەن. لەوانە بوو ئەو کوردە چارەڕەشە غەریبە بەبێ ئەوەی بزانێ دەروێش بەگ کێیە، هەوڵی کوشتنی بدات.

مزەفەر کە لە مێژبوو ئاگای لە هەموو ئەو شتانە بوو، ئاخرییەکەی خۆی پێ نەگیرا:"ئاخەر بابە، ئەتۆ نابێ وا لەو کابرایە بکەی و وەك پشیلەیەك کە گەمە بە مشك دەکات، گەمەی پێ بکەی. کابرا ئەو هەمووە زەوی و زارەمان دەداتێ و ئەتۆ هەر گاڵتەی پێ دەکەی. ئاخرییەکەی ئەوەتا ئاوای لێ دێ. ئەو کەسەی دەیویست دۆستایەتیمان بکات، ئەوەتا بووەتە دوژمنێکی داخ لە دڵ و مەترسیدار."

دەروێش بەگ لەبری ئەوەی تووڕە بێ، قاقایەکی کێشا:"قاباقچی بۆتە هەڕەشە لەسەر من؟ کوڕە وەرە بزانە چیمان لێ هاتووە. دۆستمان لێ بووەتە دوژمن. بەخوای یەگێکی باشم لەکیس خۆم داوە و نەمزانیوە. کوڕم، ئەتۆ ئەقڵت پارسەنگی دەوێ، ئەو لەوەتەی هەیە دوژمنی ئێمە بووە. دەڵێی ئێستا بووەتە هەڕەشەیەکی مەترسیدار، ها؟ ئەو و کەسانی وەك وی بۆ ئێمەمانان، بۆ ئەم نیشتیمانە هەر مەترسی و هەڕەشەن. ئەتۆ زۆرت ماوە ئەو بێ شەرەفانە بناسی."

مزەفەر بێدەنگ بوو. باش دەیزانی ئەگەر بابی لەو کاتەدا کەیفخۆش نەبوایە، ئاوا بە نەرم و نیانی وەڵامی نەدەدایەوە. هەر ئەوەندەی بەسەریدا نەینەڕاندبوو و دەری نەکردبووە دەرێ، شوکرانەبژێر بوو. دەبوو قوون بداتە سەر دەرپێکەی خۆی. بەڵام لە فکریشدا بوو. هەر وەك ئەو کاتەی پشیلەیەك دەکەوێتە تەنگانەوە، وەختە چاوی بنیادەم دەربێنێ، ماهیریش ئێستا وەك پشیلەیەکی لێ هاتووە کە کەوتووەتە تەنگانەوە.

دەروێش بەگ ئیتر هیچی نەگوت. هەستا و یەکێك لە نۆکەرەکانی لەخوارەوە بانگ کرد و بەبێ ئەوەی بە سیلەی چاویش سەیرێکی مزەفەر بکات، لە دیوەخانەکەدا کەوتە هاتوچۆ. مزەفەر خۆشی دەیزانی، کە ئەو حیسابی سەگێکیشی بۆ ناکات هەر بۆیە جار بە جار پتر رقی لە بابی دەبوو.

"فەرموو بەگ."

"رەسووڵ، جەمشید، شەوکەت، ئاپتۆ، قۆجادۆران، هیدایەت و عەلی بانگ بکە و خۆشت وەرە ئێرە... بانگی یوسفیش بکە."

که گەڕایەوە، تووشی ژنەکەی هات. دەموچاوی ژنەکەی لە بن لەچکە سپییەکەدا، باریك و درێژ و زەردەڵە دیار بوو. پەژارەیەکی قووڵ لە گلێنەی چاوە گەورەکانیدا هێلانەی کردبوو. چەنە ناسکەکەی و قورتمەی گەرووی، پەژارەی ئەو روخسارە باریکەی تەواوتر دەردەخست.

دوو هەنگاو بەرەو لای ژنەکەی چوو و دەستی لەسەر شانی دانا. زەردەی گاڵتەجاڕانەی منداڵێکی کە بزۆزیی کردبێ، لە روخساریدا بوو.

"خاتوون، خاتوون، خۆ تۆ کوڕت نەبوو، گووی کەروێشکی تورکمانیت بۆ هێناومەتە دنیا. کوڕە لاوەکەت لە ترسی حەزرەتی ماهیر قاباقچی ئۆغڵی زراوی چووە. ئەتۆ ماهیر قاباقچییەکی دیکەت لێ بووە بۆ من."

ژنە متەقی نەدەهات. دەیتوانی چ جوابێك بەو شێتە بداتەوە؟ ماوەیەك بوو دیسان لەسەری دابوو. ما هەژابوو، لە تاریف نەدەهات. دیسان بۆ وای لێ هاتبوو؟...

دەروێش بەگ هێشتا نەگەیشتبووە سەر قەنەفەکانی دیوەخانەکەی، کە پیاوەکانی گەیشتنێ. هاتن و لە بەرامبەریدا بە ریز راوەستان. هەر هەموو سەریان داخستبوو و بە نیشانەی رێزەوە، سەیری دەموچاوی بەگیان نەدەکرد. بە دەنگێکی تێکەڵاو بە شادییەوە پرسیی:"خۆ گوێتان لێ بوو کوڕینە؟"

جا هەوڵی دا پەژارەیەك بخاتە دەنگییەوە:"گوێتان لێ بوو چیمان بەسەر هات؟ ماهیر پاشا، ماهیر پاشا قاباقچی زادەی شێرئاسام کە پێك لە پێکی خۆیلۆ شێتە قارەمانەکەی کوێر ئۆغڵیی ناوداریش نادات، لە چیاکانەوە پیاوکوژی بۆ کوشتنم هێناوە. ئەو پیاوەش دێ و لە ماڵەکەی خۆمدا لێم دەدات."

پیاوەکانی بەبێ ئەوەی سەر هەڵێنن، هەر کامەیان وەك منداڵێکی شەرمن، بزەیەکیان هاتێ.

"پێ مەکەنن، پێ مەکەنن. گاڵتە ناکەم. بە راستیمە. ئاگام لێیە، کابرایەك لەو نزیکانە بۆسەی ناونەتەوە تا لە کات و هەلێکی گونجاودا لێم بدات. چەکەکانتان هەڵگرن و بچن و ئەو کابرایەم بۆ بێنن ئەگەر لە کونە مشکیشدا بێ، بیدۆزنەوە و بۆمی بێنن."

پیاوەکانی یەك پشوو بزەیان دەهاتێ. دەتگوت شەرم دەکەن لە هەنتەشی بەگەکەیاندا پێ بکەنن. چونکە پێکەنینی نۆکەر لە هەنتەشی بەگدا، لەگەڵ نەریت نەدەهاتەوە و بێ رێزی بوو.

"بەڵام مەیکوژن. مەگەر نەیەوێ خۆی بەدەستەوە بدات. ئەو کات خوێنی خۆی لە ئەستۆی خۆی."

پیاوەکانی بە پەلە لە پلیکانەکان چوونە خوارێ. یەکیش چەکمەکانی بەگی هێنا. بەگ چەکمەی لە پێ کرد. تاوێك دواتر یۆسف ماوزەرە بریقەدارەکەی بەگ و فیشەکدانە کۆبەگیراوەکانی هێنا. بەگ داوای دووربینەکەشی کرد.

تاوێك دواتر ئامادە بوو. یوسف بە چاوی پڕ لە تکاوە سەیری بەگی کرد. ئەو بەو چاوە درشت و سرك و ئاگرینانەیەوە تکایەکی لە بەگی خۆی هەبوو. هەر هەژدە ساڵان دەبوو.

دەروێش بەگ تێی گەیشت. ماوەیەك بیری کردەوە. دڕدۆنگ بوو. تاوێ بە چاوی پڕ لە خۆشەویستییەوە سەیری چاوەکانی یوسفی دەکرد و جارێ چاوی لێ وەردەگێڕا و خەیاڵ هەڵی دەگرت. ئاخرییەکەی وەزمان هات:"بچۆ ماوزەرێکیش بۆ خۆت هەڵبژێرە. یەکێك لە ماوزەرەکانی من هەڵگرە. ئەو ئەسپە کوێتەش کە لە مستەفامان ئەستاندووە، بۆ تۆ. ئەو سەگەم بۆ بدۆزەوە، بەڵام مەیکوژە."

یوسف چاوەڕوانی ئەو گەورەییەی نەبوو. ساتێك چاوەکانی ڕەشکەوپێشکەیان کرد و سەری لەگێژەوە هات. هەوڵی دا بچێتە ژوورەکەی. لاقەکانی تێك دەئالان. کە چووەو ژوورەکەی، پاڵی بە دیوارەکەوە دا و لە خۆشییان چاوی پڕ بوون لە ئاو. ڕۆژی ئاوای هەر بە خەون دیتبوو. بەگ، هەم ماوزەر و هەم باشترین ئەسپەکەشی پێشکەش کردبوو.

## ٦٤

میرۆ ملی ڕێیەی گرت. لێوە قووچاو و وشکهەڵاتوو و قەڵشیوەکانی لە نێو دەموچاوەکەیدا هەر لە هێڵێك دەچوو. چاوی بەحاستەم هەڵێنابوون و کوڵمەی وێك دەهاتن. قیت قیت بە ڕێگەدا دەڕۆیشت. لکی لەچکەکەی بە دەم باوە دەشەکاوە. برۆ ئەستوور و پڕەکانی تێك نابوو و روخسارە رەنگ بزڕکاوەکەی لە یەکەم نیگادا سەرنجی رادەکێشا. زاری و چاوەکانی و نێو لووتی وشك ببوون. قرچەی گەرماکە دەیبرژاند. پێڵاوەکانی پڕ دەبوون لە خۆڵی ڕێگاکە. گوڵەماهووری زەردباو و قەڵغان و توو و چنار و دار بووزی دەم ڕێیەکە لەبەر تۆز دیار نەبوون... میرۆ هیچ کام لەوانەی نەدەدی. یەك ریتم و وەك سەردولکەیەك بەبێ هەڵکشان و داکشان ڕێی دەبڕی. دوو کەزییەکەی وەك دوو ماری رەشی ئەستوور دەگەیشتە نێو قەدی. ڕێگە و تەپوتۆزی نەدی و هەستی بە گەرماکە نەکرد. ئارەقە لە هەموو گیانی دەچۆڕایەوە و مێشوولە بە دەم چاوییەوە دەنووسا، بەڵام هەر بای خەیاڵیشی نەبوو. هەر دەتگوت بە دەم خەوەوە ڕێ دەبڕێ، گەیشتە شار. گەیشتە مەیدانەکە و بەرەو لای سەپۆشە مەڕمەڕییەکەی سەر گۆڕەکە چوو و چەند هەنگاوێك بەر لەوەی بیگاتێ راوەستا. مەحموود لە سەر پشت کەوتبوو و دەستەکانی بەولاولایدا کەوتبوو و لاقەکانی کۆ ببوونەوە. خوێن بە دەموچاو و سمێڵ و کاکۆڵە لوولەکەیەوە وشك هەڵاتبوو. قژە پێکەوەنووساوەکەی لە بەر تاوەکە رەش دەچۆوە و دەبریسکایەوە. ملە درێژبۆوەکەی رەش و شین هەڵگەڕابوو. مێشی سەوز سەوز لە مەحموود دەنیشتن و هەڵدەفڕینەوە. زەردەواڵە و مێشەنگوین و مێشەکەرانە لەسەری دەسووڕانەوە. مێشەکانیش وەك گەواڵە هەورێکی رەش... میرۆ، مەحموودی دیت. سەیری چاوەکانی و لووتە قیتەکەی کرد. لێوەکانی هەڵقرچابوون و بیچم و شکڵی خۆیان لە دەست دابوو و لە نێوانیانەوە سێ ددانی سپیی بێ پەڵە دیار بوو. پێڵاوی لەپێدا نەبوو و یەکێك لە پێیەکانی بێ گۆرەوی بوو. گۆرەوییەکەی لاقی راستەی دەرهاتبوو و بە کەڵەموستی پێیەوە گیر ببوو و شۆڕ ببۆوە.

پێیەکانی زەرد و پەنجەکانی درێژتر ببوونەوە. هەر دەتگوت لە بەردە مەڕمەڕەکەوە خوێن هەڵدەقوڵێ و دەچێتە سەر بەردە داغەکانی شۆستەکە. یان وەك لەتە سەهۆڵێکی سوور کە دەتوێتەوە، سوورایییەکەی رەش دەچۆوە... بازاڕەکە پڕ بوو لە هەڵلا. ئەگەرچی کەسیش دیار نەبوو، بەڵام هەڵلاکە گوێی بنیادەمی کەڕ دەکرد. لە سەرووی هەڵلاکەوە دەنگی چەکوچ دەهات. ئەوە هەموو لەوانەیە غەڵەبایی بێدەنگییەکی دوورەدەست بێ. میرۆ کە بەرەو لای مەحموود دەچوو، گوێی لە دەنگی پێی خۆی بوو. سێبەرە رەشەکەی خۆی کە کەوتبووە بەر پێیەکانی و ئەوجار خۆرەتاوەکەش کە دەتگوت بە چەقی ئاسمانەوە نووساوە و ئاگری لێ دەبۆوە و تەپوتۆزەکەی ئاگر دەدا، دیت. بە چاوی قیچی بەر تیرێژی تاوەکەوە، چووە پێشێ و دەستی مەحموودی گرت. لەوێ، لە لای مەحموود بەبێ ئەوەی مەحموود و خۆرەتاو و نیسارەکان و ئەو مێشانەی مەحموودیان داپۆشیبوو و خوێنە مەیوەکە ببینێ و هەست بە بۆنی خوێنەکە بکات، حەپەسا. خەڵکی شارۆچکە هاتن، کۆ بوونەوە. قسەیان کرد و کردیانە هەڵلا. دەنگەدەنگەکە زۆر بوو. نوزانەوە و دیسانیش هیچی نەدی و نەیبیست. لە دوورەوە و لەوپەڕی نووزانەوەکانەوە، جار نە جارێك دەنگی قوقەی کەڵەشێرێك و هەروا تەقەی چەکوچی ئاسنگەرێك لەوبەری بازاڕەکەوە دەهات.

بەرەبەری عەسرێ بای شەماڵ هەڵی کرد. سێبەری میرۆ بەرەو سپیدارەکەی پێش خۆی، کشا. سێبەری تەرمە بۆگەن بووەکەی سەر سەرپۆشە مەڕمەڕینەکەی گۆڕەکەش هەستا. لەسەر عەرزەکە، راکێشراو ... نیوەدەموچاوێکی ئاشنا، لووتێکی هەوکردوو و سمێڵێك کە بە خوێنە وشکبووەکە، بە پشت لێوی سەرەوەی و گۆشەکانی زارییەوە نووسابوو....

عارەبانەیەك کە گوڵی کەسکی لەسەر تەختە سوورەکانی درابوو، لەوبەری بازاڕە چۆڵەکەوە دەهات. زەنگوڵەی ملی ئەسپەکە وێکڕا زڕەیان دەهات و زایەڵەی دەنگی زەنگەکان، دەتگوت لەوبەری چیایەکی دوورەوە دێ. هەوساری ئەسپە تیمارکراوەکان نوێ بوو و بۆنی رۆنی لێ دەهات. بریسکە و بریقەی خشڵە زەردەکان لەبەر تاوەك تێکەڵی مووە نەرم و خاوێنەکانی ئەسپە کوێتەکان دەبوون. عارەبانەکە هات و چەند هەنگاوێك لەولای میرۆوە رای گرت. سێبەری ئەسپەکان و عارەبانە و سێ کەسەکەی سەریشی بەرەو سپیدارەکەکە کشان. پیاوەکان لە عارەبانەکەوە خۆیان فڕێ دایە خوارێ و مەحموودیان هەڵگرت. دەستە بێ گیانەکانی مەحموود لە دەستی میرۆ بەربوون. لەسەر عارەبانەکە درێژیان کرد. میرۆش سوار بوو. لە تەنیشت تەرمەکە دانیشت و سەری مەحموودی لەسەر رانی دانا. عارەبانەچییەکە قەمچیی لە

پشتی ئەسپەکان راکێشا و خێرا لە شارۆچکەکە چووە دەرێ و ملی رێگەیەکی پڕ لە خۆڵ وخاکی گرت. لە بن سمی ئەسپەکان و تۆپەی عارەبانەکەوە، خۆڵ و خاك وەك خۆڵەمێشی تەندوور هەڵدەستا. سەری مەحموود لە سەر رانی میرۆ هەڵدەبەزییەوە و مێشی رەنگاوڕەنگ لەسەر چاو زاری مەحموود هەڵدەنیشتن و دەفڕینەوە. میرۆ لە سەر جێی خۆی دەنووزاوە و هەندێ شتی لە بن گوێی مەحموود دەچرپاند، کۆمەڵێك شتی سەردەمانی کۆن، کەس لێیان تێنەدەگەیشت. دەنگی نەدەبیسرا، خوێنی وەك خوێنەکەی مەحموود لووزەوی بەستبوو. دەنگی زەنگوڵەی ئەسپەکان و عارەبانەکە وەك مردووان، خەفەتبار و ماتەمبار، یەك بە یەك، قورس و داهێزراو لە گەرماکەدا دەبیسران.

ئەسپەکان شەلاڵی ئارەقە و هەوسارەکەیان کەفاوی و دەماری لا ملیان هەستابوو. میرۆ ئیتر ئارەقەی نەدەکرد. وشك هەڵاتبوو. یەك پشوو دەنووزایەوە. دەستەکانی مەحموودی هەروا لە دەستیدا بوون.

تاو لە ئاوابوونێ بوو. عارەبانەکە بە بەر کۆشکەکەدا تێپەڕی و بەرەو ماڵەکەی مەحموود چوو و لە بن دارە توویەکی چڕ کە لك و پۆیەکانی هەموو حەوشەیان داپۆشیبوو، راوەستا. لك و پۆی دارەکە لەبن باری سەدان و هەزاران چۆلەکەدا داهاتبۆوە. دەنگی جیکەجیکی چۆلەکە حەوشەکەی ئاخنیبوو.

میرۆ هەروا لەبەر خۆیەوە دەگریا. هیچ ئاگای لە راوەستانی عارەبانەکە و بێجووڵەیی سەری مەحموود نەبوو. ئەسپەکان بە کلك مێشیان لەخۆ دەردەکرد. بۆنی مردووەکە ئاواییەکەی داگرت. بۆنی مردووەکە گەیشتە دەروێش بەگیش. بۆنی جەستەی هاڕدراو و پواوی مەحموودی بۆچووبوو و هەتا بەیانی لە کۆشکەکەیدا هات و چوو. کە بەیان ئەنگوت، زریکەیەکی تیژ و دڵتەزێن، دەروێش بەگی ماندوو و بێ هێزی لە جێی خۆی دەرپەڕاند و مووی لێ کردە نشتەر.

ئاخۆ میرۆ تازەی تەرمی مەحموود دیتبوو؟ ئاخۆ ئێستا لە خەوە قووڵەکەی بەخەبەر هاتبوو و شینە دڵتەزێنەکەی بە دەشتی ئاناوەرزا وەرکردبوو؟

خەبەری مەرگی مەحموودیان هەر رۆژی کوژرانەکەی بە میرۆ دابوو و ئیزنیان دابوو بچێ تەرمەکەی بەرێتەوە. بەڵام میرۆ دوو رۆژی رێك، تاسا بوو و وەك خەواڵووان لە بەر دەرگای ماڵەکەی ئەوسەرەوسەری کردبوو. ئەوجار بەبێ ئەوەی شتێك بە کەسێك بڵێ، بەرەو شاری ملی رێیەی گرتبوو و تەرمی مێردەکە لە سەر بەردە تاشراوە مەڕمەڕییەکەی نێوەڕاستی گۆڕەپانەکەی شاری دۆزیبۆوە. لاقەکانی زەرد زەرد...

دەروێش بەگ لە داخان هەموو گیانی گرژ بوو و ئازای ئەندامی دێشا. هەر گوێی لە شین و گریانەکەی میرۆ بوو، ژان و ئازار و رق و قینەکەی پتر بوو. ئیتر خۆی لە ماڵەوە پێ نەگیرا. پشووی سوار دەبوو. وەك ماسییەکی لە ئاوێ فڕێ درابێتە دەرەوە، زاری دەکردەوەو وێکی دێنایەوە و هەوڵی دەدا سییەکانی پڕ بکات لە هەناسە، بەڵام نەیدەتوانی...

ساتێك بەری چاوی رەش بوون و ترسی مەرگ نیشتە گیانییەوە. چیی نەمابوو لە پێ بکەوێ. هەرچۆنێك بوو خۆی بەسەر پێوە راگرت و بەدڵیدا هات:"خەریکە دەمرم."

شین و گریانێکی بەتەوژمتر بەرز بۆوە. یەکێکی دیکە. بەبێ هێزییەوە و لەخۆوە هەرای کرد: "ئەسپەکەم بۆ بێنن. شەودێز نا، ئەسپە کوێت."

بە غاردان لە پلیکانەکان چووە خوارێ و خۆی خستە سەر خوانی زینێ و بە لینگدان لە ئاوەدانی دوور کەوتەوە. ئەسپەکە بەچوارناڵ دەڕۆیشت و سوار بەدڵیدا دەهات:"ئاخ... ئاخ... ئاخ بۆ مەحموود، حەیف بۆ مەحموود، حەیف بۆ ئەو پاڵەوانە، پیاوی پیاوان... دەتگوت شێرە... وەك پیاوان لەسەر ئاد و پەیمانەکەی راوەستا... پەمانی نەشکاند... گیانی دا و نهێنیی نەدا..."

تەرمەکەی مەحموود هەپروون هەپروون بوو. بای کردبوو و رەش هەڵگەڕابوو... هیچیشی لەگەڵ نەدەرکا. دکتۆر راپۆرتەکەی نووسیبوو. بڕوا ناکرێ... هەر بەراستی ئاق یۆللی سەبارەت بەو کارانە دەڵێ چی؟ بەو جۆرە کوژرانەی مەحموود؟ ئەو بەرازانە مەحموود نا، ئەمنیان لە ژێر ئەشکەنجەدا کوشت...

بایەکە لە دەم و چاوی دەدا و زەینی روونتر دەبۆوە. هیچ کەس نەیدەتوانی بەو جۆرەی ئەوان مەحموودیان کوشتووە، بیکوژن. ئەو نەقیبە چاوشینە و ئەو ئاغا بێ دایك و بابانە لە هیچ جەنایەتێك ناپرینگێنەوە و دەست ناگێڕنەوە. ئاخۆ مستەفا ئاق یۆللیش هیچ لەوانە دەچێ؟ دەکرێ لەوانە بچێ؟ نەیانتوانی شەیتانیمان لێ بکەن و لێرەمان دەرپەڕێنن و بمانفەوتێنن... ئاخۆ مەحموودیان بۆیە ئاوا زەجرکوژ کرد، بۆ ئەوەی چاوترسێنمان بکەن و لەپێمان بخەن؟ ئاخۆ وا هەیە ئاق یۆللی لە پێناوی لەناوبردنی تاکە کەسێك، دوژمنەکەیدا، لەگەڵ ئەوان رێك بکەوێ؟ دەموچاوە زەردەکەی مستەفا بەگ و دەمە قووچاوەکەی و جەستە رووتە لەرزۆکەکەی و لاشەکەی هاتەوە پێش چاوی کە وەك کورتان بەسەر پشتی ئەسپە رووتەکەیدا دابوو. هەر بەراستی کە بیستوویەتی مەحموود بە ئەشکەنجە کوژراوە، چیی گوتووە و بیری لە چی کردووەتەوە؟

لە نەکاو دۆڵپایەکی ترسناك سواری شانی بوو. لە لووتکەی تۆرووسدا، هەموو وڵات تووش و بەستەڵەك و بۆران بوو. نەقیبی لە دارێکی سنۆبەر بەستبۆوە و چوارمێخەی کێشابوو و جەستە رووتەکەی بە مووسێکی دەلاکی ئەنجن ئەنجن دەکرد. خوێنەکەی هەر دەهاتە دەرێ، دەییبەست.

وەخۆ هاتەوە و بزەیەکی بزڕکاو لەسەر لێوەکانی نیشت. نۆبەتێی تۆڵە، شتێکی وەك ژیان.

لەو کاتەدا، لەو خراپترین رۆژەی ژیانیشیدا دەیزانی ئاق یۆللی بەشوێنییەوەیە، یان پیاوەکانی وەشوێنی کەوتوون. ئاخۆ ئەگەر مستەفا بەگ زانیبای چ بەڵایەك بەرۆکی گرتووە، دیسانیش هەر وەشوێنی دەکەوت؟ بنیادەمە ئیتر، دەکوژێ و دەکوژرێتەوە. ئەوە ئاساییە. بەڵام کوشتنی بەوجۆرە، زۆر چەپەڵییە، نا ئینسانی و چەوت و دوور لە پیاوەتییە. چما مەرگ هەر بۆ ئەوە نییە تەواوی بکەی؟ شتێکی لەو جۆرە... کوشتنی لەو چەشنە، مرۆڤایەتی و دڵی بنیادەمەکان خراپ دەکات. مەرگی مەحموود... مووسێکی دەلاکی بە دەستییەوە، لە بن دارێکی سنۆبەر... قیمە قیمە... خوێنی بەستوو... لووتێکی بڕاو، چاوی لە کاسەسەر دەرهاتوو، چاوەکەی بە دەمارێکەوە هەڵواسراو، نا، نا نا... مرۆڤایەتی زامار دەبێ....

مستەفا ئاق یۆللی ئاگای لە هەموو شتێك بوو. تەنانەت دەیزانی لە دوو رۆژی رابردوودا ئەسپەکەی بەرەو لای بۆسە و سیپەکان، بەرەو لای ئەو دەوەنانەی شوێنی بۆسەنانەوەیانە، تاو داوە.

ئێستا ئەسپەکەی بەرەو لایەك لێ دەخوڕی کە جارێکیان بەسەر بۆسەدا کەوتبوو و گیرابوو. لەو ساتەدا لەوانەیە مستەفا بەگیش چاوی لێی بێ. شیوەنەکانی میرۆ هێشتا لە گوێیدا دەزرینگانەوە. بۆ ئەوەی لەو عەزابە نەجاتی بێ، قەمچیی لە ئەسپەکەی رادەکێشا. کە بەلای شوێنی بۆسەکەدا تێدەپەڕی، ئەسپەکەی سڵەمییەوە و خۆی بە هێمنییەوە چاوەڕێی دەنگی تەقە و فیشەك ما. گوێ قوڵاغ بوو دەنگی تەقە بێ. ئەسپەکەی لە چاوترووکانێکدا وەك با بە بۆسەگاکەدا تێپەڕی. دەروێش بەگ لەسەر قەپۆزی زینەکە خۆی نووشتاندبۆوە و دەست و پێی دەلەرزین.

ئاوڕێکی دایەوە و سەیری دواوەی کرد. قامیشەڵانە سەوزەکەی بۆسەگاکەی، کە رەش دەچۆوە بەجێ هێشتبوو. جارێکی دیکەش لەو مەرگە رەشە دەرباز ببوو. لە خۆشیان هاوارێکی کرد. ئەسپەکەی کە راهاتبوو لە جێی نارێك غار بدات، بە قەڵەمبازان بەسەر خەرەند و دەوەنەکاندا جار بە جار خێراتر دەبوو. دەروێش بەگ لە مەرگێکی مسۆگەر رزگاری ببوو لە سەر خوانی زینەکە خۆی لەبەر یەك کێشایەوە و جڵەوی بۆ ئەسپەکەی شل کرد. ئەسپەکە

بەرەڵڵا و بە کەیفی خۆی غاری دەدا. ئەوەندە لە ئاوایی دوور کەوتبۆوە کە... خانووبەرەکانی نەدەبینران. بەڵام شین و گریانەکەی میرۆی هەروا لە گوێیدا دەزرینگایەوە. ئێستا دەروێش بەگ پێی وابوو، ئەو شیوەنە سامناك و تیژە وەك مووسی دەلاکی، بە گوێیەکانییەوە نووساوە. تەرمە لەتوکوتکراوەکەی مەحموود... و سەرەڕای هەموو ئەوانەش شەرمێونی و خاکەڕاییە منداڵانەییەکەی مەحموود، پێکەنینە بێگەردەکانی کە لە قووڵایی دڵییەوە هەڵدەقوڵێن، و وەك یەکێ بوو یەکێ نەبوویان لێ هاتبوو...

میرۆ لە بەر دەرگایماڵەکەی لە سەر خۆڵەکە دانیشتبوو و خۆی رادەژاند و خۆڵی وەسەر خۆی دەکرد و دەموچاوی هەموو بە نینۆکان تێك کردبۆوە. سەر و قژ و دەموچاوە خوێناوییەکەی لە تەپوتۆزەکەدا سپی دەچۆوە. سەردولکەیەکی بە زمانی کوردی دەچڕی. هەر دەتگوت لایی لایە دەڵێ. لە کاتی چڕینی سەردولکەکەدا، چووبووەوە زێدەکەی خۆی و بە لە دەم دەریاچەی وان و لە چیاکەی سوبحان دەگەڕا. بیری لەو پیاوانە دەکردەوە کە ریزیان بەستبوو و تەرمێکی کەڵەگەتیان لە سەر دارەمەیتێك دانابوو بە وایلۆك و چەمەری چڕین بەرەو گۆڕەستانەکەی بنیاری چیاکەیان دەبرد. پیاوەکان سەردولکەکەیان وا دەچڕی، دەتگوت دەیەوێ دەنگیان بگەیەننە لووتکەی چیاکە و ئەو کەسەی لەسەر لووتکەکە دانیشتووە. ئێرە پیاوێکی لێ نەبوو بە مەحموو هەڵبڵێ. لەوانەیە تۆزێك دواتر ژنە تورکمانییەکان بگەنێ. نەکا مەحموود بەبێ سەردولکە و چەمەری، بچێتە بن گڵ. میرۆ بیری دەکردەوە و دەیچڕی و ئەوجار لە نەکاو تێی دەچریکاند:"مەحمودم رۆۆ ۆ ۆ ".

شیوەنێك کە دەتگوت دەیەوێ لەوپەڕی دنیاوە بیگەیەنێتە گوێی:

مەحموود:"مەحموودەکەم، مەحمووووو دە کەم."

یۆسفی کوڕی مەحموودیش بەسەر سەری دایکییەوە وشك هەڵاتبوو. رەنگی بزڕکابوو و چاوە درشتە رەشەکانی زەق زەق ببوونەوە. چاوەکانی دەتگوت لە گلێنەی هاتوونە دەرێ.

وەکوو خەڵفی دار توویەك بێ جووڵە و بێدەنگ بوو. بەبێ ئەوەی چاوی بترووکێنێ، سەیری دایکی دەکرد. پەژارەی بنیادەمە داماو و لێقەوماوەکانی بە روخسارییەوە نیشتبوو.

تاوێك دواتر ژنی گوند، بە لەخۆدان هاتن و لەسەر خۆڵەکە دانیشتن و وێڕانی میرۆ دەستیان کرد بە شینگێڕان و بۆیان ئەستاندەوە. چەند بنەماڵە کوردی دیکەش لە ئاوەدانییەکە بوون کە هەر لە سەردەمی شەڕی یەکەمەوە هاتبوونە ئەو گوندە. ئەوانیش وەك میرۆ خۆڵیان وەسەر

خۆیان دەکرد و سینگ و بەرۆکیان دادەدڕی و روومەتی خۆیان دەڕنی و جار نە جارێکیش دەیانگوت:

"مەحموود رۆ، باوکی یۆسف."

ئەوجار ژنەکان چوونە بن پیلی میرۆ و هەڵیانستاند و بردیانە ژوورەوە. ژنێك جلوبەرگە خوێناوییەکانی مەحموودی هێنا و لە نێوەڕاستی ژوورەکە دانان. هەر کام لە ژنە سەردولکەبێژەکان لەتێك لە شمەکە خوێناوییەکەیان هەڵدەگرت و تێیان دەچریکاند و سەردولکە و شینگێڕییەکە، کە دەگەیشتە ئەو سەر، ئەوجار وێکڕا دەنووزانەوە. کە ژنێك تێی هەڵدەکرد، ژنەکانی دیکە بێدەنگ دەبوون و ئەوجار وێکڕا و یەك دەنگ لە بانگیان دەدا. تا دیسان ژنێکی دیکە ئەو تیتۆڵە شمەکەکەی دەستی بەرز دەکردەوە و دەیانزانی دەیەوێ سەردولکە بێژێ. ژنێك کە بەر لەو سەردولکەی چڕیبوو، بێدەنگ دەبوو بۆ ئەوەی ئەو تێی چریکێنێ.

خێزانەکەی بەگیش هات و کەوتە گەڵ وایلۆکچڕ و سەردولکەبێژەکانەوە. ئەوە کاتێکی دیکە بوایە، هەر لە دوورەوە سەری ئاغاژنیان دیتبایە، هەموو یەك پێ لەبەری هەڵدەستان، بەڵام ئێستا کەس گوێشی پێی نەبزووت. لە کۆڕی پرسە و سەرەخۆشیدا نەك بەگم و خانم و خاتوون، بگرە پادشای عوسمانییش هاتبایە، کەس لەبەری هەڵنەدەستا. خاتوون دەستی برد و ملپێچە هەورێشمییەکەی مەحموودی هەڵگرت و یەك دوو جاران دەستی راوەشاند و ئەوجار دەستی کرد بە گریان. پێنج خولەکێك هەمووان وێکڕا نووزانەوە. ئەوجار خاتوون دەنگی لێ هەڵێنا. بە ئازایەتی و دۆستایەتییەکەی مەحموودی هەڵگوت. مەحموود لە هەموو گوڵەکانی سەر زەوی و ئەستێرەکانی ئاسمان دەچوو. وەك خەڵفی چنار لەسەر ئەسپی عارەبان دەچەقی و بەخۆی دەنازی. رۆژێکیان لە رێیە تووشی هاتبوو و رایگرتبوو لە رەچەڵەك و باب و باپیرانی پرسیبوو. مەحموود، راهێنەری ئەسپە خۆشبەز و سەرکەشەکان، باوکی یۆسف و مێردی میرۆی بەگزادە و خۆشی لە بنەماڵەیەکی بەرز و خانەدان بوو. خزم و کەسەکانی مەحموود هەڵۆی هۆردووی چوارەم بوون. ئەو خاکە رەشەی مەحموود دەگرێتە ئامێز، شادمان دەبێت، چونکە گەوهەرێکی تاقانە دەگرێتە خۆی. ئەوانەی مەحموودیشیان کوشتووە، با بەخۆیان بنازن، چونکە پاڵەوانێکیان لەپێ خستووە. ئەگەر بەگ، بەگی بەگەکان، دەروێش بەگی خانەدان تۆڵەی نەستێنێتەوە، کچەکەی مورسەل لی، تۆڵەی خوێنی مەحموود لە دوژمنەکانی دەکاتەوە.

دەنگی خاتوون بەردی دەتواندەوە. قیت و قنج دانیشتبوو و تاس کڵاوە زێڕکفتەکەی کێشابووە سەر تەوێڵی.

خاتوون کچی بەگە تورکمانێکی گەورە بوو. نەریتی تورکمانیی بەرز رادەگرت و قەڵافەت و رواڵەتی تورکمانانەی خۆی دەپاراست. دەسماڵی کۆبەگیراو و تنۆکەی ئەتڵەس و مەخمەر و سکەدراوی دەسك کراو بە نێوچاوانەوە و تاسکڵاوی زێڕی هەر فڕێ نەدابوو. تەنیا شتێکی وەلاوە نابوو، ئەویش پێڵاوی گوڵبەهاری ماراشی بوو. کەس نەیدەزانی بۆچی ئەوەی بەلاوە ناوە. بەگ جاروبارە دەهاتە سەری لێی بپرسێ، بەڵام لە رووی هەڵنەدەهات. خاتوون وەستای سەردولکە و وایلۆك چڕینی کۆنی تورکمانی بوو.

سەردولکە و شینگێڕییەکە تا ئێوارەی کێشا و بە پێی نەریتەکەیان، هەر ماڵە و سفرەی خۆی دێنا بۆ میوانی غەریبە. لەو کاتانەدا بەپێی دابونەریتە، ژنەکان لە سەر سفرەیەك دادەنیشتن و پیاوەکانیش لەسەر سفرەیەکی دیکە، بەڵام سفرەکانیان بە تەنیشت یەکەوە رادەخست.

سفرەی پرسە، سەعاتێك بوو راخرابوو. بەڵام کەس دەستی بۆ خواردنێ نەدەبرد. هەموو چاوەڕێی بەگ بوون. ئاخرییەکەی بەگیش هاتەوە. بە لینگدان هات و لەبەر دەرگای ماڵەکەی مەحموود جڵەوی ئەسپی کێشا. لە ئەسپەکەی دابەزی و رێ و راست چووە سەر سفرەکە. هەتا بەگ دەستی بۆ سفرە نەبردبوو، کەس پارووی هەڵنەدەگرت.

تا نان نەخورا، کەس متەقی لێوە نەهات. دوای نانی شێوان، بەگ هەستا و ئەوانی دیکەش هەستان. بەگ رۆیشت و ئەوان دانیشتنەوە و هەتا نوێژی خەوتنانێ هەموو باسی مەحموودیان کرد. بەگ دوای مەرگی مەحموود ئاوی لە گەرووی نەدەچووە خوارێ. بەگ تاقەتی ئەو خەمەی نەدێنا. خۆ هەموو کوڕەکانی مردبایەن، نەك بەگ و نە خاتوون ئاوا جەرگیان نەدەسووتا. هەر هەمووان وایان بیر دەکردەوە.

بەگ مانگێ دوای مەرگی مەحموود هەر سەردانی ماڵی میرۆی کرد و گوتی:"کچی خۆم میرۆ، ئەتۆ لە کچەکانی خۆم فەرزتری. تۆ هێشتا گەنجی، ئەگەر ویستت مێرد بکەیەوە، بیکەوە."

میرۆش لە وەڵامیدا گوتی:"لە دوای مەحموود، ئەوی پیاوە لێم حەرام بێ."

"کچی خۆم میرۆ، سەد دۆنم زەویم بۆ جوێ کردوویەتەوە. لەوەودوا چۆنی پێت خۆش بوو، ئاوای کەڵك لێ وەرگرە. بچۆ سێ سەر مانگاش لە گاڕانەکە هەڵبژێرەو بیهێنەوە ماڵی خۆت."

"خودا سێبەرت بەسەرمانەوە بهێڵێ بەگ."

"یۆسفیش خۆم گەورەی دەکەم. ئەمن ئێستا هەر کوڕێکم هەیە و ئەویش یوسفە. ناهێڵم بێ باوکیی پێوە دیار بێ."

"هەر تۆمان هەی بەگ. خودا سێبەری تۆمان لەسەر کەم نەکا."

"تۆڵەی خوێنی مەحموودیش دەکەمەوە."

"لە سەرت گەڕێم بەگ."

ئەوجار بەگ دراوێکی درشتی لە لەپی دەستی نا و لە ماڵەکەی وەدەر کەوت.

دەروێش بەگ بەڵێنەکەی خۆی بردە سەر. هیچ جیاوازییەکی نەخستە نێوان یوسف و منداڵەکانی خۆی. یوسفی لە پێشدا لە قوتابخانەیەك کە لە گوندەکەی دراوسێیان بوو، نایە بەر خوێندنێ. دەتگوت تەمەنی یوسف بۆ خوێندنێ، تێپەڕبوو، بەڵام هەتا ئەو کاتە هیچ کەس بەبیریدا نەهاتبوو بینێتە بەرخوێندنێ. وای دانابوو ئەویش وەك کوڕەکانی خۆی بنێرێتە کۆلێژە ئەمریکییەکەی تەڕسۆس. یوسف تا پۆلی دووەمی خوێند و دوای ئەوە لە قوتابخانە رای کرد. ئیتر گەورە ببوو و شەرمی دەکرد لەگەڵ منداڵی لەخۆی کەم تەمەنتر لە پۆلێکدا دابنیشێ. هەر ئەوەندەی دەیتوانی نامە بنووسێ و رۆژنامان بخوێنێتەوە، ئیدی خوێندنی بۆ چی بوو.

دەروێش بەگ ماوەیەکی زۆر، زۆریی لەخۆی کرد. نەدەبوو چەك بداتە دەستی یوسف و تووشی چارەنووسەکەی مەحموودی بکات. بەڵام هەر کەس نەیزانیبایە تەقە بکا، بە پیاویان نەدەزانی... یوسف چووبووەوە سەر بابی خۆی و بەگ رۆژ بە رۆژ زیاتری خۆش دەویست. قەد ئەوەندەی سۆز بۆ کوڕەکانی خۆی نەبوو. دوای ماوەیەکی زۆر، ئاخرییەکەی بڕیاری خۆی دا. یوسفیش وەك باوکیی لێ دێ. بەڵام هەتا بەگ مابێ، ناهێڵێ تاڵە موویەکی لەسەری کەم بێتەوە و تووشی چارەنووسەکەی باوکی بێت. بەگەکەی، هەرگیز بەکوشتنی نادات. یوسف تێدەگەیەنێ، کە پیاوکوشتن چەندە قێزەونە. ئەگەر چەکی نەداتێ و وەك پیاو راینەهێنێ، ئەویش وەك کوڕەکانی خۆی بێ غیرەت دەبێ. لە راستیشدا هەر لەبەر ئەوە بوو چەکی دەدایە.

یوسفی بە سووللی ئاغا، پیاوە هەرە باوەڕپێکراوەکەی ئەو ماڵە سپارد، کە لە سەردەمی باوکییەوە پیاویان بوو. سوللی ئاغا لەگەڵ ئەوەی کە حەفتا ساڵی تەمەن بوو و چاوەکانی کەم حوکم ببوون و دەستەکانی دەلەرزین، دیسان تەیری لە ئاسمانێ بە فڕەی باڵی دەنگاوت. لەگەڵ یوسف قۆڵیان لێ هەڵماڵی. یوسفیش ئەو ئاواتەی لە خودا دەخواست. هەر فیشەکێکی دەیهاویشت، جا ئەنگاوتبای یان نا، لە خۆشییان دەفڕی.

سوللی ئاغا، پێ بە پێی راهێنانی لە تەقەکردن و تفەنگ هاویشتن، رێوشوێنی جوامێری و پیاوەتییشی فێر دەکرد. بنیادەم نابێ بەرد لەو کانیاوە بخات، کە ئاوی لێ دەخواتەوە. نابێ سپڵە بێت و نان بخوا و ناندێن بدڕێنێ. هەموو بنیادەمێك لە پێشدا خوای هەیە و دوای ئەوە دایك و باوك و بەگەکەی. گەلەگورگێك ئەگەر سەردەستەیان نەبێ، دەبنە دیلی دوو سەگی

بەرەڵڵا. بەگ وەك سەرکردەی گەلە گورگ وایە و نابێ مل لە هیچ فەرمان و ئەمرێکی بابدەی. کە گوتی بمرە، دەبێ بمری و ئەگەر گوتی بژیێ، دەژیێ. کە دەشڵێ بکوژە، دەکوژی.

سوللی ئاغا، هەموو شتێکی، هەر هەموو شتێکی فێر دەکرد. دۆستایەتی و پیاوەتی و بەستراوەیی و نهێنی پارێزی و نهێنی درکاندن و نەدرکاندنەکەی و کورتی بڕینەوە هەموو رێگەکانی بنیادەمبوونی نیشان دەدا. بابی ئەو، مەحموود پیاوێکی جوامێر و دۆست و سەربەوان بوو. هەر بۆیەش گیانی شیرینی خۆی کردە قوربانیی بەگ. دەیزانی و خۆبەخشانەش بوو. چونکە بەگ ئەوی بە کوڕی خۆی دانابوو و خوشکی یەکێك لە هەڵۆکانی هۆدووی چوارەمی بۆ خواستبوو. ئەو رێیە، رێی ئازایەتی و پیاوەتی و رێگەی مەرگە. پیاو ئەوەیە کاتێ خوێن دەڕشێتەوە، بڵێ بەڵاڵووکم خواردووە. ئەوجار ئەگەر تێی هەڵدرا، چوارمێخە کێشرا، وایەری کارەبایان لێ بەست، زمانی نابزوێ. بابی یەك وشەشی لە زاری دەرنەهات. ئەگەر بابی قسەی کردبایە، بەگ سەری تێدا دەچوو. دەروێش بەگ بۆچی ئەوی لە منداڵەکانی خۆی پتر خۆش دەویست؟ لەبەر باوکی. جا یەك بە یەك باسی باشییەکانی باوکی کرد. تفەنگ هاویشتنەکەی، پێزانینەکەی، نهێنی پارێزییەکەی و پیاوەتی و عەشقەکەی. مەحموود بنیادەمێك بوو پڕاوپڕی عەشق و خۆشەویستی و خۆمانە و خۆشەویست و لەبەردڵان. ئەگەر مەحموودت دیتبایە، دەتگوت هەموو کەسێك لەم دنیایەدا پیاوی پێ بکوژرێ، مەحموود پێی ناکوژرێ. کابرایەکی هێمن و لەسەرخۆ و بە رواڵەت نەرم و نیان و بێ وەی، بەڵام دڵێکی وەك بەردی لە سینگیدا بوو. بە کردەوە ئەمری بەگی بەجێ دێنا و گیانیشی کردە فیدای بەگ.

ئەدی خۆی؟ ئەو سوللییە تێکسمڕاوە؟ دوژمنەکەی باوکی بەگی کوشتبوو و پانزە ساڵان بەندیخانەی چێشتبوو. یوسف لە ماوەی چەند ساڵاندا وا لە تفەنگ هاویشتنێ شارەزا بوو، دەرزیی هەڵدەگرت و لە ئاسمانێ چاوی دوڕنا و لە راکردنێدا قاچی کەروێشکی دەنگاوت. مامۆستاکەی کوچکێکی بۆ هەڵداویشت و یوسف بە ئاسمانێ بەردەکەی پەرش و بڵاو دەکرد. هەم بە تفەنگ و هەمیش بە دەمانچە. مامۆستاکەی شانازیی بە یوسفەوە دەکرد و بەخۆی دەنازی. ئەوەندە خێرا راهاتبوو کە... هەتا ئێستا شاگردی وای نەببوو هەموو شتێك ئان و دەم هەڵگرێ.

کە یوسف بووە حەڤدە ساڵان، سوللی ئاغا چووە لای دەروێش بەگ و پێی راگەیاند:"پیاوێکی شیاوی متمانە. بۆ وەی دەبێ گیان و ماڵ و ناموسی پێ بسپێری. جوامێر و ئازا و بە گیان و وەفاداری بەگی خۆی...."

بەگیش چەند ئەوەندەی دەستخۆشانەی دوای راهێنانی هەر شەڕکەرێك پێی دەدا، نایە بەر دەستی.

دەروێش بەگ کە خۆی، بە فیشەك ناوەکەی خۆی لەسەر تەختە دەنووسی، رۆژێکیان ویستی یوسف تاقی بکاتەوە. لەگەڵ سوللی ئاغا چوونە دەم ئاقچاساز و لەوێ تفەنگیان هاویشت. دەروێش بەگ سەری لە لێوەشاوەییەکەی یوسف سوور ما. دەبوو وەفادارییەکەشی تاقی بکاتەوە. جارێکیان پێی گوت:"کوڕم یوسف، گەورەترین دوژمنی ئێمە کێیە؟"

یوسف دەمودەست وەڵامی دایەوە:"ئاق یۆللییەکان."

"هەر ئێستا دەمانچەکەت هەڵدەگری و رێك خۆی بە کۆشکەکەی ئاغ یۆللیدا دەکەی و مستەفا ئاق یۆللی دەکوژی و دێیەوە."

یوسف بەبێ چووکترین دڕدۆنگی گوتی:"بەسەر چاو."

هەر ئەو شەوە وەڕێ کەوت. ئەگەر بەگ پیاوی لەدوو نەناردبایە و نەیگێڕابایەتەوە، پەلاماری کۆشکەکەی ئاق یۆللیی دەدا. جا یان دەکوژرا یان دەیکوشت. بەگ لە ماوەی شەش مانگدا چەند جارێکی دیکەش تاقیی کردەوە. یوسف لە هەموو تاقیکردنەوەکان سەربەرزانە دەرچوو.

بەو جۆرە دەروێش بەگ چەکێکی کەوتبووە دەست، کە خەرمانێکی تەقەمەنی و چەکوچۆڵی دێنا. یوسف بەتەنێ هێندەی هۆردوویەك بوو. بەڵام بەگ بەڵێنی بەخۆی دا یوسف، کە لە ژن و منداڵەکەی خۆی خۆشتر دەویست، لە پیاوکوشتن و مەسەلەی مەرگ وەرنەدا. حەزی لێ بوو وەك رۆڵەیەك، وەك برایەك لە تەنیشت خۆی رایگرێ. بیستبووی کە دڵی چووەتە سەر گوڵعوزار. وای دانابوو گوڵعوزاری بۆ بێنێ. لە وەچەی بنیادەمە ئازاکان تەنیا چەند کەسێك مابوون کە دەبوو هەتا هەیە، لە هەموو بەڵایەکیان بپارێزێ. ئەو یوسفە کوڕێکی لێهاتووی بێ وێنە بوو. خۆزگە کوڕەکانی خۆی نیو هێندەی ئەو شیاو و پیاو بوایەن. دوای ئەو فکرە، چزووی شەرمەزاری بەدڵیدا رۆچوو. چما یوسف کوڕی خۆی نەبوو؟ چما مەحموود کوڕی نەبوو؟ بوونی دڵی بە یوسف روون دەبۆوە. یوسف گەنجێك بوو وەك شاخێك، کە ئەو پاڵی پێوەدابوو. ئەو کاتەی تەواو پەست و خەفەتبار دەبوو، ئەوەندەی بەس بوو کە چاوی بە روخساری یوسف بکەوێ، دڵی پڕ دەبوو لە خۆشەویستی و کەفوکوڵ و عەشق. یوسف گیانی ئەوی لە هەموو چەپەڵی و دزێوییەك پاکژ دەکردەوە و گەش گەش و جوان و تازەی دەکردەوە و دڵە پڕ لە ژان و تەمگرتووەکەی تیف تیفە دەدایەوە و گەشی دەکردەوە.

ئەگەر کەسێکی دیکە لە جێی نەنە میرۆ بوایە، لە خۆشیی روخسار و بەژن و باڵا و شان و باهۆی کوڕە بێ کەس و کارەکەی کە ئێستا هەموو شتێکی هەبوو، لە خۆشییان شاگەشکە دەبوو. باشە هەموو دایکێك ئەو بەختەوەرییەی بە نەسیب دەبێ؟ باشترین ئەسپی گەوڕەکەی دەروێش بەگ، فیشەکدانی کۆبەگیراو و ماوزەری بریقەدار... وەك خەڵفی چنار لە سەر خوانی زین... بەڵام نەنە میرۆ ئاگرێك لە ناخیدا بڵێسەی دەسەند. پەژارەیەك بە روخسارییەوە بوو، کە لە هەست و کەفوکولێکی تێکەڵ و پێکەڵەوە سەرچاوەی دەگرت و سێبەری دەخستە سەر دڵی و ئەو هەستی بەخۆنازینەی لێ دادەپۆشی کە بە دیتنی بەژن و باڵای وەك خەدەنگی کوڕەکەی سەری هەڵدەدا. سەردەمانێك باوکی یوسفیش وەك ئەو سواری ئەسپێکی عارەبی دەبوو و بەخۆی دەنازی و سەرنجی خەڵکی بۆخۆی رادەکێشا و کەس نەبوو ئافەرینی بۆ نەڵێ. هەموان دەیانپرسی، ئەو سوارچاکە کێیە؟ میرۆ بیری دەکردەوە، چارەڕەشییەکەشی هەر لەو کاتەوە دەستی پێ کردبوو. خودا نەکا یوسفیش بە مەرەدی بابی بچێ.

سەری هەڵێنا و نیگای نوقمی سەیرکردنی کوڕەکەی بوو بەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە. چاوی لە کوڕەکە وەرگێڕا و گوڵعوزاری دیت، کە لەولاترەوە راوەستابوو و لێی دەڕوانی. بەندی جەرگ و دڵی پسا. کاتی خۆی، ئەویش ئاوا شێت و شەیدای مەحموود ببوو. گوڵعوزار بە گۆزەیەکەوە دەهاتە سەر بیرەکە. گۆزەی دانا و بەرەولای رای کرد.

"نەنە میرۆ، نەنە میرۆ."

لە دەنگەکەیەوە، لە گەرما و لەرزینی دەنگیڕا دەکرا بزانی دەیەوێ چ بڵێ. گوڵعوزار، ئەو کچە تورکمانییە، دڵی چووبووە سەر یوسف. میرۆ دەیزانی و یوسفیش، کە ئەو کچەتیوەیە ئاشقی بووە، بەڵام خۆشەویستییەکەی خۆی بۆ ئاشکرا نەدەکرد، هەر بۆیە لە خۆباییبوون و رەزامەندییەکی نامۆی لە ناخیدا هەست پێ دەکرد. ئەگەر تفەنگێکیان دابوایەتە دەست یوسف، بەلایەوە زۆر لە گوڵعوزار گرنگتر بوو. هەوڵ دەدا وا بنوێنێ زۆری بۆ گرنگ نییە. بەڵام ئاگری ئەشقی دوو لایەنەی ئەو دووانە شتێك نەبوو لە چاوی خەڵك شاراوە بمێنێتەوە.

گوڵعوزار کچی ئاقچادۆرسون، یەکێك لە رەعیەتە نیوەکارەکانی بەگ بوو. کچۆڵەیەکی بەخۆوە و گورج و گۆڵ بوو. لە کێڵگە و مەزرایە، لە پیاوەکان باشتر و چاکتری کار دەکرد. زەویی دەکێڵا و دروێنەی دەکرد و خەرمانی هەڵداویشت و... زۆریش جوان بوو. وەك هەموو ژنە تورکمانییەك وا بوو. خۆڕاگر و بە بەرهەم و میهرەبان و... چاوەکانی رەش و خوماربوون و زگماك کل تێکراو بوون. ریزی مژۆڵە درێژەکانی، چاوە خەمبارەکانیان پەرژین کردبوو.

روخساره گەشەکە لەگەڵ ئەو چاوە خەفەتبارانەی یەکی نەدەگرتەوە. روخسارەکەی گۆڕەپانی ململانێی بێ بڕانەوەی خەم و شادی بوون. گوتی:"نەنە میرۆ."

ئەوجار پێکەنی. بەختەوەری لە روخسار و دەستی و سەر و قژی دەباری.

"نەنە میرۆ."

دەستەکانی میرۆی گرتبوو و چاوی لە چاوەکانی بڕی. ئەوی بانگهێشت دەکرد بۆ لای سەرچاوەی بەختەوەری، بەڵام کە سەیری ئەو پەژارەیەی کرد وا لە ناخی چاوەکانی میرۆدا خێوەتی هەڵداوە، کزەی لە جەرگی هات. خوا بکا بەهەڵە چووبێ. دیسان سەیرێکی کردەوە، نا بە هەڵە نەچووبوو. میرۆ پەژارەیەکی لە دڵیدا بوو. پەژارەیەکی رەش و سامناك. بۆچی؟ لەبەر چی؟ لە حاڵێکدا ئەو پێی وابوو میرۆ لەو کاتەدا لە خۆشییان وەختە بفڕێ. دەستەکانی میرۆی لە دەستی بەربوونەوە. گۆزەکانی هەڵگرتن و بە لەبزێکی سەرسووڕماو و دڵێکی شکاوەوە گوتی:"نەنە میرۆ، نەنە میرۆ، ئەوە بۆ وای؟"

ئیتر وەڕێ کەوت. بە دەم رێگاوە، وەك لەگەڵ خۆی بدوێ، دووپاتەی دەکردەوە، نەنە میرۆ؟ نەنە میرۆ، ئەوە بۆ وای؟ ئەوە چیتە؟..."

لاوێتی چەنێ جوانە! موچڕکەی گەنجێتی چەندێ خۆشە؟ مەرگ، مەرگی بێ ئەملا و ئەولای بەگیان کڕیبوو و شانازییەکانی براکانی، هەڵۆکانی هۆردووی چوارەمی پێخوست کردبوو. باشە چۆن دڵی چووبووە سەر مەحموود؟ براکانی چەندە لەبەری پاڕابوونەوە واز لە مەحموود بێنێ؟ ئاخرییەکەشی بەزەییان پێیدا هاتبۆوە و وازیان لێ هێنابوو و ئەویش ناچار سەری خۆی هەڵگرتبوو و لێیدابوو و رۆیشتبوو.

میرۆ بە شوێنیدا نەرم نەرم لەبەر خۆیەوە دەیگوت:"گوڵعوزار، گوڵعوزار، میرۆ لە دەورت گەڕێ. لە دەوری ئەو چاو رەشەی تۆ ئاشقی بووی. ئیشەڵڵا ئەو کوڕە خۆی کەر ناکات و ئەتۆ وەك میرۆ لە وڵاتی غەریبایەتی بێکەس و بێدەر ناکەویتەوە. گوڵعوزار، گوڵعوزار، گوڵعوزار گیان."

گوڵعوزار کچێکی بەحەیا و شەرم بوو. دەتگوت هەموو کەس بە ئەشقەکەی و یوسفیان زانیوە، بەڵام ئەو نە لەبزی دەلەبزی یوسف گەڕابوو و نە یوسفیش بەر لەوە، هەست و کەفوکوڵەکەی خۆی تەنانەت بۆ جارێکیش بۆ میرۆ ئاشکرا کردبوو. نهێنیی خۆشەویستی و ئەشقەکەشی، هەر زارای دەستەخوشکی لەقاوی دابوو. زارا بەبێ ئەوەی گوڵعوزار ئاگای لێ بێ، هەر بۆ چاکەی ئەو و بۆ ئەوەی یوسف بیبیستێتەوە، ئەو رازەی لەقاو دابوو.

گوڵعوزار، بەکەیف و گەش بوو و شای بە سەپان نەدەگرت. یوسف بە روخسارێکی لەخۆباییانەوە و گەردنێکی قیتەوە، بە سواری چارەوێیەکی کوێت و بە ماوزەرێکی بریقەدارەوە، بەبێ ئەوەی سەیری دەوروپشتی خۆی بکات، دوو جار بە بەردەرگای ماڵیاندا تێپەڕیبوو. لەو کاتەدا گوڵعوزار لەبەر دەرگا دەبێ. ئەی بۆچی ئاوڕێکی نەدابۆوە و سەیرێکی گوڵعوزاری نەکردبوو؟ هەر سیلەی چاوێك، نیگایەك بە سیلەی چاو؟ دواییش وای لێك دابۆوە یوسف شەرمنە. هەموو دەیانزانی یوسف ئەوەندەی ئازا بوو ئەوەندەش شەرمن بوو. لە کچۆڵەیەك شەررمێونتر بوو.

گوڵعوزار لە خۆشییان شاگەشکە ببوو. بەڵام کە چاوە خەفەتبارەکانی میرۆی وەبیر دەهاتەوە، بۆ چرکەیەك شادییەکی دادەمرکایەوە و بێهیوایی جێی دەگرتەوە. یانی میرۆ لێی زویر ببوو، یان شتێکی دیکەی لە دڵدا بوو؟ بەڵام ئەو بۆچی دەبێ زویر بێ؟ ئەوەندە بە خۆشییەوە گوتبووی گوڵعوزار، خۆشەویستی لە دەنگیدا شەپۆلی دەدا. تەنیا دەیتوانی بەو گەرموگوڕییەوە بە یوسف بڵێ "یوسف گیان".

نا هیچ لێی زویر نەبوو. دەبوو شتێکی لەدڵدا بێ. بەڵام ئەو گرێیە چ بوو؟ دڵی سۆسەی کردبوو کە میرۆ ئەوی بەبووکی خۆی هەڵبژاردووە. هەموو هەڵسوکەوت و کرداری ئەوەی دەردەخست. گوڵعوزار هەڵەی نەدەکرد.

یوسف ئەمرۆ دەچووە راوی ئادەم. ئەگەر بەڵایەکی بەسەر بێ؟ هیوای، خەیاڵەکانی، خەون و ئارەزووەکانی جوانەمەرگ دەبن.

بەخۆی دەگوت:"بێت و بکەوێتە بەندیخانەوە، دەساڵانی لەسەر دادەنیشم، پانزە ساڵی. وەك ژنەکەی دۆرسون چەتە. ئەو، چەندین ساڵان هەر چاوەڕوانی بوو هەتا مرادی دڵی حاسڵ بوو. ئەمنیش چاوەڕێی دەبم. هەتا رۆژی مردنێ هەر چاوەڕێی دەبم."

شەوێ تا بەیانی خەو لە چاوی نەکەوت. دڵەخورپەی بوو. چاوەڕێ بوو. لەوانەشە چاوەڕێی یوسف بووبێ. بەڵام خۆ یوسف وا زوو نەدەگەڕاوە. بەو حاڵەشەوە چاوەڕێ بوو. ئاخۆ یوسف جارێکی دیکەش بە سواری ئەسپە کوێتەکەی بە بەردەرگای ماڵەکەیاندا رادەبرد؟ لە سەر پشتی ئەسپەکەی وەك خەڵفی چنار قیت و قنج دادەنیشت؟ ئاخۆ جارێکی دیکەش بەو قەڵافەت و بەژن و باڵایەوە دەیبینێتەوە؟

لە ناخی دڵییەوە هەڵقوڵی:"خوایە، جارێکی دیکە، یوسفم پێشان بدەوە، جا دوای ئەوە حەز دەکەی بمکوژە."

## ٦٥

سێ رۆژ بوو یوسف لە ئاوەدانیدا دیار نەبوو. رۆیشتبوو و کەس بە سەروشوێنی نەدەزانی. ئەوانی دیکەش، واتە ئەوانەی لەگەڵ یوسف چووبوونە راوی "ئادەم"*، بە هەواڵی جۆراوجۆرەوە دەگەڕانەوە. یەکێ دەیگوت ئادەمی دیتووە و لێی بزر بووە. ئادەم ببووە ئاو و عەرز قووتی دابوو. ئەویتر دەیگوت، فیشەکێکی لە ئادەم داوە و بە ناڵەناڵ بەرەو زۆنگاوەکە رای کردووە. بە شوێن خوێنەچۆڕەکەیدا هەتا زۆنگاوەکە چوبوو و لەوێ بزری کردبوو. گەڵای دەوەنێك لە زۆنگاوەکەدا خوێناوی ببوو. کەوابوو دەکرێ بڵێی ئادەم بە زۆنگاوەکەدا رۆچووە. یەکی دی لە شوێنێکی دیکەوە هەواڵی دێنا. ئادەم چووە و بە قاباقچیی گوتووە، "هانێ، ئەوە پارە و دراوەکەت. هانێ پارەکەت سەرت بخوا. ئەمن بەخاتری ماڵی دنیا، بەگێکی ئاوا ناکوژم. دوای ئەوەی زانیومە دەروێش بەگ کێیە، ئیتر چۆن دەتوانم هەوڵی کوشتنەکەی بدەم هەی بێ شەرەف."

خەبەری لەو چەشنە... بەگ لەمێژ ساڵ بوو گوێی بەو خەبەرانە راهاتبوو. چاوەڕێ بوو هەموو شتێکی لێ روون بێتەوە.

لەوانەی رۆیشتبوون، هەر یوسف دیار نەبوو. بەگ دڵی دەترسا. ئەو هەتیوە لە کوێ گیرسابۆوە؟

یوسف وای بیر کردبۆوە، کە چونکە بەگ سێ جاران لە چاتاڵ بورنۆ، بەسەر بۆسەدا کەوتبوو، هەر جارێکی پێی لە رکێف دەنا، هەر بۆ لاساری، بە مێشەڵانەکەی بورنۆدا تێدەپەڕی. جا دۆست و دوژمن ئەوەی دەزانی و لەوانەیە قاباقچی ئۆغڵییش بەوەی زانیبێ. چ

---

* لە دەقە فارسییەکەیدا ئەو کابرایەی دێ بۆ کوشتنی دەروێش بەگ، هەتا خۆی دەناسێنێ، هەر بە ئادەم ناوی هاتووە. لەوانەشە مەبەستەکە لە "ئادەم" وەك ئەوە وابێ کە لە کوردییشدا جاری وایە نووسەر نایەوێ ناوی کەسەکە بێنێ و دەڵێ کابرا.

لەوە باشتر هەر لەو مێشەڵانەدا بۆسە بنێتەوە و چاوەڕێ بێ. دەبێ چاوەڕێ بێ. بەڵام لەبیری چوبوو، پێخۆر لەگەڵ خۆی بەرێ. دەی باشە، چ نییە، دەکرێ خۆی راگرێ. ئاد و بەڵێنی بەخۆی دابوو هەتا ئادەم نەگرێ، نەگەڕێتەوە ئاوایی.

ئەگەر ئادەمی گرتبایە، زۆر باش دەبوو. چاکەی بەگی دەدایەوە و بۆی دەسەلماند، کە بەکاری دێ. لە لای بەگ گەورەتر دەبێ و بەگ ئەوەندەی دیکەی خۆش دەوێ و دەکەوێتە بەر دڵی و دەڵێ: دەی باشە، گیا لەسەر پنجی خۆی شین دەبێتەوە. کوڕەکەی مەحموودیش چووەتەوە سەر بابی خۆی. وەك هەڵۆ. باوکی وا، هەر کوڕی ئاوای لێ دەکەوێتەوە... گوڵعوزاریش لە خۆشییان شێت دەبێ. دەیزانی گوڵعوزار چەندەی خۆش دەوێ. دیتبووی کە چۆن کاتێك تووشی دەبێ، سوور هەڵدەگەڕێ و دەست و پێی تێکەڵ دێن. کچەتیوە دەیوست دان بەخۆیدا بگرێ و وەڕووی خۆی نەهێنێ کە شڵەژاوە، بەڵام بۆی نەدەشاردراوە. بەکورتی، کچۆڵەیەکی بزۆزی وەك گوڵعوزار نەیدەتوانی هەست و کەفوکوڵەکەی خۆی بشارێتەوە و باشاری نەدەکرد، دەی دیارە لە تەوقی سەرییەوە تا بەری پێی لە تای ئەشقدا دەسووتا.

بەخۆی گوت:"ئەو کچەتیوە تەواو سووتاوە. ئاه و ئاگرەکەی داوێنی پیاوی دەگرێ. ئاهی ژنان، زۆر بەتین و بەهێزە. وەك هیی پیاوان نییە...."

ئاخۆ ئەویش حەزی لە گوڵعوزار بوو؟ ئەشق شتێکی چۆنە؟ باشە ئەویش کە گوڵعوزاری دەدی، مەست و سەرخۆش دەبوو؟ کە ئەوی دەدی، ئەوەندەی دیکە شەرم دایدەگرت و نەیدەزانی چ لە دەستەکانی بکات. دەتگوت دەستەکانی زیادین. کە بە بەر دەرگای ماڵەکەیاندا تێدەپەڕی، ئاگای لەخۆی نەدەما و چیی نەدەما لە ئەسپەکەی بەربێتەوە. شتگەلێ لە ناخیدا ئەویان بەرەو لای گوڵعوزار پەلکێش دەکرد.

کە ئادەمی گرت، دەستەکانی شەتەك دەدا و پەتێکی لە ملی دەکا و بە راکێش راکیش بە بەردەرگای ماڵی گوڵعوزاردا دەیکێشێ. ئەوجار دەچێتەوە کۆشکەکە و ئادەم وەك ئەسپ بە دارەکەوە دەبەستێتەوە و ئەوجار بە هەڵەداوان خۆ دەگەیەنێتە بەگ و بەو جۆرەی سوللی ئاغا فێری کردبوو و وەك باوکی خۆی، رێز لە بەگ دەگرێ و دەڵێ:"دوژمنت تەمەنی کەم بێ." و بە هەر دوو دەستەکانی تفەنگەکەی لە بەر پێی بەگ دادەنێ.

شەوێکی تاریك و ئەنگوستەچاو بوو. گەڵای دارێك نەدەبزووت. ئەگەرچی شەوێکی پاییزی بوو، بەڵام هەواکەی گەرم بوو. بۆنی گژ و گیای رزیو و رەگی رزیو و خاکە رزیوەکەی زۆنگاو

بڵاو ببۆوە. بۆنە تیژ و سەرگێژکەرەکەشی داری "بابادەم"یشی تێکەڵ دەبوو. هەوایەکی سەیر بوو. پیاوی بێهێز دەکرد.

یوسف بە پەنای پۆلە قامیشێکەوە دانیشتبوو. لە نەکاو لوورەلوورێکی سامناك بوو لە زۆنگاوەکەوە هەستا. زۆنگاوەکە، بڵقەبڵقێکی زۆری دەهات و دەکوڵی. سەگەل لە دوورەوە، لە گوندەکانی بناری ئاناوەرزا دەوەڕین. سەعاتێك دواتر گوێی لە حەپەی سەگەل بوو. دەنگی سەگەل هێوری کردەوە.

وردە وردە و بە ئەسپایی و نوقمی تەنیایی، لە تاریکایی ترسێکدا نوقم دەبوو. لە دوورەوە و لە کەناری زۆنگاوەکە، لە تەنیشت مێشەڵانێکەوە، دەنگی پێ دەبیسرا. کە جوان گوێی هەڵخست، زانیی دەنگی پێی بەرازە.

ئەسپەکەی بە دار توویەکی باریکی پشت سەرییەوە بەسترابۆوە و خرمەخرم گیای دەخوارد. جار نەجارێکیش سەری هەڵدێنا و گوێی قوت دەکردن و ماوەیەك هەروا لە دووری دەڕوانی. یوسف هەستایە سەر پێ و سەیری ئەو لایەی کرد کە ئەسپەکە لێی دەڕوانی. هیچ دیار نەبوو. بەخۆی گوت، ئەسپەکان بەشەو، چەندییش تاریك بێ، دیسان هەر دەبینن.

لە نەکاو ترسێك لەناخیدا سەرەتاتکێی کرد و هەستا. هیچ کوێ لە شەوانی دەم زۆنگاو ترسناکتر نییە. لەوانەیە هەر ئێستا هەژدیهایەکی حەوت سەر لە زۆنگاوەکەوە بێتە دەرێ. لە ڕەوەزەکانی ئاناوەرزاوە، چیی هەژدیها و مار و ماری خۆڵەمێشی و زەرد و کوێرەمار و کەومار هەیە، شەوانە هەر هەمووی بەرەو زۆنگاوەکە دادەگەڕێن. سواری باڵدار، جنۆکە بە سواری ئەسپ کە وەك لەشکری تەیر و باڵندان بەسەر زۆنگاوەکەدا دەفڕن. شەمشەمەکوێرەی ئەشکەوتی ڕەوەزەکانی ئاناوەرزا، هێندەی هەڵۆیەك دەبن و خواردنیشیان گۆشت و خوێنی بنیادەمە. ترسەکەی ناخی، تێکەڵاوی بێزاریی بیرکردنەوە لە شەمشەمەکوێرە دەبوو و بای دەکرد و گەورە دەبۆوە. شەمشەمەکوێرەکان بە تەنیشتیدا، بە بەردەمیدا، بە سەر ئەسپەکەی و بن زگی ئەسپەکەیدا دەهاتن و تیژ تێدەپەڕین. بەڵام شەمشەمەکوێرەی ئەمشەوی زۆنگاوەکە بچووك و بێ ئۆقرە بوون.

بەسەرهاتێك بە مێشکییەوە نووسابوو و لێی نەدەبۆوە. ڕووداوی بەسەرهاتەکە دەتگوت هەر لێرە، لەو بنارەی ئاناوەرزا و لە دەوروبەری ئەو لێڕەوارەی دەتگوت قاژووە ڕەشەیە، ڕووی داوە. چیرۆکەکە وەك بەسەر زمانیدا هاتبێ، لە گوێیدا دەزرینگایەوە.

دەیویست سوار بێت و  رابکات. ئەوەندە ترسابوو نەیزانی چۆنی خۆ فڕێدایە سەر ئەسپەکەی. لە سەر ئەسپەکەی ئۆقرەی گرت. شەرمی لە ترنۆکییەکەی خۆی کرد و  لە ئەسپەکەی دابەزی و لەسەر جێیەکەی دانیشتەوە. ماوزەرێکی بە دەستەوە بوو کە باشترین چەکی دەروێش بەگ بوو، نەوغانێکیش بە قەدییەوە.

هەقایەتەکە هەڵی گرت. هەقایەتێکی کوردی بوو. حەمە پاشای سوورەملی، بەگێکی گەورەی یەکێك لە عێلاتی ئەنەدۆلی لای رۆژهەڵات بوو. کووزان ئۆغڵی دژی سوڵتان راپەڕیبوو. پاشا ئەو شەڕکەرە ناودارەی ناردبوو بۆ سەرکوتی کووزان ئۆغڵی. بەگە کوردەکە بەر لەوەی لەگەڵ کووزان ئۆغڵیدا پێك هەڵپڕژێن، نیوەی شەڕکەرەکانی خۆی بە نۆبەتیێ و هورووژمی تەپۆ لەدەست دابوو.

ئێستا بۆ کووزان، بۆ کووزان، بۆ کووزان ئێستا بۆ کووزان. شەوەکانی چوکووراوا پڕ لە هەڵلا و هات و هاوار، رۆژەکانی لەبەر تەپوتۆز و مێشوولە و مێش، پیاو دەمریێ و شەوەکانیشی لەبەر گەرمای شێدار. وەك کەوتبێیتە سەر کڵی خەرمانێکی گڕەوە. ئاگرێکی شێدار و خنکێنەر، سووتێنەر....

شەوانەی لەبەر گەرمی و رۆژەکانیشی قرچەی تاو... بەرد و خاك و رۆژ و شەوی هەموو سوورەوەبوو. ئێستا بۆ کووزان بۆ کووزان... باڵندە و دار و گوڵ و خاکەکەی لەبەر قرچەی گەرمایە دەناڵێنن. چیی بوونەوەرە هاوار دەکات، سووتام سووتام. گەرما، گەرما، گەرما. گەرمایەکی خەست، گەرمای دەریا... گەرمای خاك... بنیادەم لەو گەرمایەدا خۆ ناگریێ. پیاوی کوێستانی کە هەموو دەڵێی چیان، لەو دۆزەخەدا خۆ ناگرن. هەڵۆکانی رۆژهەڵات بەر لەوەی دەرفەتی تەقەکردنێکیان بیێ، وەك چنارە بەرزەکان، بەلادا دێن. پیاوەکان لە نۆبەتێدا هەڵدەچۆقین. خاکەکەی بەر پێیان، دەلەرزی و وەك بەفر لە دەشتەکەی ئاناوەرزادا دەتوانەوە. شەو بوو. گەرماکە پیاوی دەخنکاند. باڵندە و ئاژەڵ و جانەوەر و گژ و گیا و دار و دەوەن و بەرد و ئاو و بنیادەم هەموو لەسەر خۆڵەکە کەوتبوون و لەبەر ئەو گەرما سامناکە دەیانناڵاند. حەمە پاشای سوورەملی کە گوێی لە ناڵەناڵی هەموو مەخلووقات دەبیێ لە خێوەتەکەی دێتە دەریێ. گوێی لە فشەفشێکی ترسناك دەبیێ. ئەو هاشوهووشە بەسەر هەموو ناڵین و هاوارهاوارەکانی شەوەکەدا زاڵ بوو. تاریکاییەکە وەك دیوارێك وابوو. هاشوهووشەکە هەر دەهات نزیکتر دەبۆوە. لە نەکاو دوو گلۆڵەی ئاگری دیت کە لەو پەڕی شەوەکەوە و بەسەر زۆنگاوەکەدا بەرەو وی دێن. ترسێکی گەورە هەموو گیانی حەمەپاشای سوورەملیی داگرت.

بەڵام ئەویش حەمە پاشای سوورەملییان پێ دەگوت. خۆ نەیدەتوانی لە بەرامبەر ترسەکەدا بەچۆکدا بێ. شمشێری هەڵکێشا و لە چەقی شەوە ئەنگوستەچاوەکەدا چاوەڕوانی ئەو دوو گلۆڵە ئاگرە راوەستا کە وەك دوو ئەستێرەی پڕشنگدار بەرەو لای دەخوشین. هاشوهووشەکە بەرزتر دەبۆوە و گلۆڵە ئاگرەکانیش نزیکتر و درەوشاوەتر. پاشا تێگەیشت ئەو گلۆڵە ئاگرانە، چاوەکانی حەزیایەکی بێ ئەمانن.

حەمە پاشا و هەژدیهاکە لێیان دەبێتە شەڕێك کە هەتا بەیانی دەکێشێ. کە بەیان دادێ، هەژدیها بریندارەکە دەگەڕێتەوە زۆنگاوەکە و بە خوێنەکەی خۆی زۆنگاوەکە سوور هەڵدەگێڕێت. ئێسك و پرووسکی ئەو هەژدیهایە ئێستاشی لەگەڵ بێ هەر لە نێوەڕاستی زۆنگاوەکەی ئاقچاسازدا ماوە. تەرمەکەی حەمە پاشای سوورەملییش لەسەر خۆڵە سوورەوەبووەکەی چووکووراوا بەجێ دەمێنێ.

چیرۆکێکی دڵتەزێن و پڕ نەهامەتی. یوسف لەوانەیە هەزار جاری ئەو چیرۆکە بیستبوو و گەلێ ساڵان لە شەوەکانی زستانە پڕ بەفر و بۆران و کڕێوە و بارنەکاندا، چاوەڕێی هەژدیهایەکی چاو ئەستێرەیی ببوو کە لە زۆنگاوەکەوە دەهاتە دەرێ. ئێستا لەوانەبوو ئەو هەژدیهایە لە زۆنگاوەکە بێتە دەرێ. ئەو خەیاڵە زەینی یوسفی داگیر کردبوو. لە چاوەڕوانیدا پشووی دەرنەدەهات. نەیدەویست بترسێ. دەیزانی یەك چرکە بسڵەمێتەوە، بڕستی لێ دەبڕێ. لەگەڵ خۆی لە شەڕدا بوو. بێت و ئێستا دوو گلۆڵە ئاگر بەسەر زۆنگاوەکە دەرکەوتبایەن، دەسبەجێ دڵی دەتۆقی و گیانی دەردەچوو. بۆ ئەوەی نەهێڵێ ترسەکە بەسەریدا زاڵ بێ خۆی بە تفەنگەکەیەوە خەریك کرد و بەردەوام فیشەکی لەبەر دەنا و بەتاڵی دەکردەوە. بەڵام بێ سوود بوو. جا ئەگەر پشتی ئاوا بەو تفەنگە گەرم نەبوایە و دڵی وا پێی خۆش نەدەبوو، تەنانەت چرکەیەکیش چییە لێ خۆی نەدەگرت. شەوەکە، رێك وەك ئەوێ شەوێ تاریك بوو. جاری وابوو ترسەکەی خەستتر و بەتەوژمتر دەبوو و هەموو گیانی دێنایە لەرزین. جا فیشەك چ لە هەژدیهایەکی وا گەورە دەکا کە... لە حاڵێکدا پیاوێکی ئاوا زل و زەبەلاح بە گورز و گۆپاڵ باشاری نەکردبوو، یۆسفێکی داماو چیی لەگەڵی پێ دەکرا؟ سات بە سات چاوەڕێ بوو جووتێك ئەستێرەی درەوشاوە بەسەر زۆنگاوەکەدا بەرەو لای بێن.

لە ئاسمانەکەی سەرووی زۆنگاوەکەدا و بەسەر سەری ئاناوەرزاوە چەند ئەستێرەیەك راخۆشین و درەوشانەوە و هەموو جارێ یوسف لەجێی خۆی دەردەپەڕی و رمبێك هەڵدەبەزییەوە. تەنانەت جارێکیان هەر نەیزانی چۆن خۆی خستووەتە سەر ئەسپەکەی.

ئێستا کاتی ئەوە بوو هەژدیهاکە بێ. ئەسپێکی خۆشبەزی لەبندا بوو وەك بای شەماڵ دەفڕی. بۆ ساتێك بیری لەوە کردەوە ئاخۆ هەژدیها ئەسپ دەگرێتەوە یان نا؟ ئەگەر گلۆڵە نوورانییەکان لە دوورەوە ببینێ، ئەسپەکەی تاو دەدا و وەك بای ئەماڵ لەوێ دەردەچوو. جا ئیدی هەژدیها چۆنی دەگرتەوە. بیرکردنەوە لەوەی ئاخۆ هەژدیها ئەسپ دەگرێتەوە یان نا، تا رادەیەك ترسەکەی رەواندەوە. دیسان هەر چاوەڕێ بوو و دڵی لە سینەیدا وەك باڵی چۆلەکە فڕەی دەهات. دەتگوت ئاگریان لە بن پێی کردووەتەوە.

سێ رۆژ بوو چاوەڕوان بوو. سێ رۆژ بوو بە ترس و خۆفەوە و بەبێ ئەوەی تۆسقاڵێك لەو ترسەی لە دڵی دەرهاویشتبێ، لە ترسەکەدا تلابۆوە و تەواو پاکژ ببۆوە و وای لێهاتبوو ئیتر لەوە نەدەترسا بچێتە نێو زاری هەژدیهاوە. سێ رۆژبوو لەو قامیشەلانەدا چاوەڕوان بوو. بەردەوام بابە کوژراوەکەی خۆی لە بەندیخانەدا و خاڵەکانی، ئەو هەڵۆیانەی هۆردووی چوارەم و گوڵعوزار و بەگە خۆشەویستەکەی کە لە گیانیی خۆشتر دەویست، دێنایەوە بیر خۆی و لە ناخ و قووڵایی دڵییەوە هەستی بە خۆشەویستییەکەی بەگەکەی دەکرد جاری وابوو وەك گیایەك بەلادا دەهات. لەو سێ رۆژ و شەوەدا ، هێندەی هەموو ئەو شتانەی لە تەواوی تەمەنە کورتەکەی دا بیری لێ کردبۆوە و هەستی پێ کردبوو، لەسەر یەك هەستی کردبوو و بیری لێ کردبۆوە.

لە کۆتایی سێهەم شەویدا ئیتر بڕستی لێ بڕابوو. هەموو گیانی دەلەرزی و لە حاڵێکدا بە نووکی پێیەکانی هێز و وزەی لە ئەسپەکەی وەردەگرت کە لەتەنیشتییەوە کاوێژی دەکرد، هەر خۆی رادەگرت. لە سەر عەرزەکە تخێڵ ببوو و کەوتبوو. ئەستێرەکان بە ئاسمانێدا دەخوشین و بەردەبوونەوە. باڵندەکان گۆرانییان دەچڕی. شەوە تاریکەکەی زۆنگاوەکە بۆنێکی تێکەڵاوی قوڕ و لیتە و گیای "بابادەم"ی لێوە دەهات. گۆرانییەکەی حەمە پاشای سوورەملییش بۆ ساتێك چییە لە زەینی لانەدەچوو. گۆرانییەك لەگەڵ بۆنی تفت و شێداری زۆنگاو و بۆنی "بابادەم" کە لەبۆنی خوێنێکی گەرم دەچوو و تێکەڵاوی شەپۆلێك هەستی لێڵ و روون ببوو و وەك ئارەزوویەك بە مێشکێدا دەگەڕا.

خۆ ئادەم ئەمشەو نەهاتبایە، ئیتر خۆی پێ نەدەگیرا و ناچار بوو بگەڕێتەوە. بەڵام ئاخ خۆزگە ئادەم هاتبایە. بەگ ... گوڵعوزاری لەو خۆشتر دەویست. ئادەم دەبوو بێ. نەدەکرا نەیە. هەر بێرەدا، بەو زۆنگاوەدا دێ. باشە چۆنی دەزانی دێ؟ دەیزانی ئیتر. لە دڵی گەڕابوو دێ.

لە نەکاو برسێتییەکی تاقەتبڕی هەست پێ کرد. لەو سێ رۆژەدا هیچ شتێکی لە گەرووی نەچووبووە خوارێ.

بێستانێکی لەو نزیکانە شك دەبرد کاڵەك و شووتیی هەبوو. ئەوەندەی سەر دڵی داماڵیبوو توانای نەمابوو. بە زۆری هەستا و هەرچۆنێك بوو سوار بوو و خۆی گەیاندە بێستانەکە. بێستانچییەکەی لەخەوێ هەستاند. نانی لێ وەرگرت. شووتیەکی لەت کرد و بە نانەکەوە خواردی. ئەوجار کورتانەکەی پڕ کرد لە شووتی و کاڵەك و گەڕایەوە دەم زۆنگاوەکە. دڵنیا بوو لەوەی ئادەم دێ و ئەویش دەیگرێ و ناوی بە ئاواییەکاندا بڵاو دەبێتەوە و دەکەوێتە سەر زار و زمانان. هەموو دیانگوت کورەکەی مەحموودە کوردە، بووەتە وەها پاڵەوانێك. گەڕایەوە دەم زۆنگاوەکە، بەڵام نەیوێرا بگەڕێتەوە نێو لێڕەکە و لە سەر جێیەکەی هەوەڵێی دابنیشێ. چاوەکانی، بێ ئۆقرە بەسەر زۆنگاوەکەدا لە گلۆڵە پڕشنگدارەکە دەگەڕان.

یەك پشوو چاوەڕوان بوو کە گلۆڵە ئاگرەکان بەگرمە گرمێك کە زەوی و ئاسمان دەلەرزێنن دەرکەون.

تاریك بوو. ئاسمان ئەستێرەباران و زۆنگاوەکە پڕ لە هەڵڵا و قریوە. بۆنی زۆنگاوەکە لووتی دەکزاندەوە، بەڵام یوسف ئیتر لەگەڵ ئەو بۆنە راهاتبوو. هەر پێیوانەبوو ئەو بۆنەیش هەیە. مێشوولەو تەپۆ وەك گەواڵە هەور، پەلاماریان دێنا. دەست و دەموچاوی یوسف ئەستوور ببوون. ئیتر وەڕەز ببوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت، کوڕە چاوی ئەو هیچ و پووچە و بەگ و گولعوزار و ناو و ناوبانگ و کوڕی مەحموودبونیش دەربێ. چما بنیادەم دەتوانێ لێرە خۆ راگرێ؟ ئەگەر ئادەم بۆ کوشتنی بەگ بێ، ناچێتە هیچ جێیەکی دیکە. ئەگەر بیەوێ بۆسە بنێتەوە، هەر لێرەی دەنێتەوە. ئەگەر ئەسپە عەرەبییە رەسەنەکەی بۆنی بۆسەدانەرەکانی نەکردبا و دەرنەپەڕیبا، خۆ تفەنگچییەکانی ئاق یۆللی ئەنگاوتبوویان. بەگ دوای ئەوەی گیانی رزگار بوو، هەمیشە راستە و رێ ئەسپەکەی بەرەو ئێرە لینگ دەدا. قاباقچییش ئەوە دەزانێ. کەوابوو پیاوەکەی قاباقچی بۆ دەبێ لە جێیەکی دیکە خۆی مات بدات؟

بەڵام خۆ ئەگەر درۆ بێ، ئەگەر هەموو ئەو هەقایەتەی کە قاباقچی ئۆغلی یەکێکی راسپاردووە بەگ بکوژێت، درۆ بێ، ئەودەم چی؟ خۆ هەموو ریسەکەی دەبێتەوە خوری؟ بیهێنە کە ئەوەی هێنایە پێش چاوی، لە دین دەهری بوو... ئەگەر وابێ، ئەگەر وابێ ئەو قاباقچییە بێ دایك و باوکە دەبێ وەك سەگ بتۆپێنم.

لە نەکاو بیرێکی بە مێشکیدا هات. باشە بنیادەم چۆن دەکوژرێ؟ زۆری بیر لەوە نەکردبۆوە.

لە ئەسپەکەی دابەزی و بەر لەوەی بچێتە نێو لێڕەکەوە، لە تەنیشت ڕێگاکە لەسەر خۆڵە تەڕەکە ئەژنۆی دادا و گوێی بە عەرزەوە نا و ساتێك ئاوا مایەوە. لەو کاتەدا شەپۆلێکی شادی و بەشوێن ئەوەدا ترسێك لە ناخیدا سەری قوت کردەوە و دەنگی ترپەی دڵی خۆی دەبیست. بەهەڵە نەچووبوو؟ ئەو دەنگی خشەخشەی جار بە جار دەهاتە پێشتر چ بوو؟ خۆ هەژدیها ئاوا نایە؟ بڵێی و نەڵێی هەستا و خۆی خستە سەر پشتی ئەسپەکەی و چاوەڕوانی دوو گلۆڵە ئاگرەکە بوو. هەر گلۆڵەکانی دی، بەلینگدان لەوێ دوور کەوتەوە. بەڵام ئەی ئەگەر هەژدیهاکە بیگرێتەوە چی؟ خشەخشەکە جار بە جار نزیکتر دەبۆوە. یوسف زراوی چوبوو. چاوەڕوانی، چاوەڕوانییەکیی زۆر، یوسف دەستی لەخۆی شوشت و بە هەموو توانیاوە گوێی دابووە ئەو دەنگەی خەریك بوو لێی نزیك دەبۆوە... ئێستا نا چەند ساتێکی دیکە، بە شڵپەشڵپ لە ئاوەکە دەهاتە دەرێ.

شەوەکە روونی کردبۆوە و خەریك بوو کازیوە دەئەنگوت. سەر لووتکەکانی بەری رۆژهەڵاتی شارۆچکەکە وردە وردە روون دەبوونەوە. لە نەکاو دڵی لە ترپە کەوت. دەنگێك گرمەی لە پەردەی گوێی هەستاند. وەخۆ هاتەوە. دەنگەکە، دەنگی تارماییەك بوو، کە لە دڵی شەوەکەوە دەرکەوتبوو و دەهاتە پێشێ. مووی لێ بوونە نەشتەر. هەموو هێزی خۆی کۆ کردەوە و قۆنداغی تفەنگەکەی بە سینگییەوە ناو گوڕاندی"مەبزوو."

دەنگی وەك چەقۆ وابوو. تیژ. دەنگەکە، بوولێڵەکەی بەیانیی وەك شمشێرێك بڕی:"مەبزوو. پێ ببزێوی، تەقە دەکەم. چەك دانێ."

قامکی لەسەر پەلەپیتکە بوو. نەیزانی چۆن پێیدا هێنا. ئادەم خۆی بەعەرزی دادا و دەنگە بێهێز و ماندووەکەی ناڵاندی"تەسلیم، تەسلیمم برا، تەسلیم."

یوسف ترسەکەی تەواو رەویبۆوە. ماندویی و شەکەتیی و داهێزراوییەکەشی هەروا. لەسەرخۆ فەرمانی دا:"چەکەکەت دانێ. جا وەرە پێشێ."

گوێی لە دەنگی بەربوونەوەی شتێك بوو. نەڕاندی:"وەرە پێشێ."

ئادەم وردە وردە لێی هاتە پێش.

یوسفە لەسەرخۆیەکەی تاوێك لەوە پێش، دیسان گیانی وەلەرزین کەوتەوە. وا دەلەرزی، چیی نەمابوو تفەنگەکەی لەدەست بەربێتەوە. کە دیتی ئاوا بلەرزێ خۆی لەسەر زینەکە پێ ناگیرێ، دابەزی، بەڵام بەسەر پێشەوە خۆی ڕانەگرت و ناچار بوو ئەژنۆی دادا. ئەوە چ ترسێك بوو وەختابوو بیکوژێ؟ یانی هەموو بنیادەمەکان ئاوا دەترسن؟ مەحاڵە. گومانی تێدا نییە

باوکی وەها ترسێکی هەر نەناسیوە. خاڵوەکانیشی. بەگیش. زۆر کەسی دیکەش. تەنانەت سەگەکانیش لە ترسی سەگ ئاوا نالەرزن. ئەو بیرە، تۆزێك ترسەکەی کەم کردەوە، بەڵام هێشتا نەیدەتوانی لەجێی خۆی هەستێ. ئادەمیش هەر لێی دەهاتە پێشێ. چاوی لێ هەڵنەدەگرت.

"ئەتۆ کێی؟"

"غەریبەم. لە کوێستانێوە هاتووم.

"بەو شەوە لێرە چ دەکەی؟"

"ڕێم لێ ون بووە."

یوسف هیچ هیوایەکی لەدڵدا نەما. کەوابوو هەموو شتێك، هەموو کەفوکوڵەکەی و ترس و کوێرەوەرییەکەی بێ ئاکام مابۆوە.

ئادەم چەند جارێك بە دەنگێکی لەرزۆکەوە دووبارەی کردەوە:"ڕێم لێ ون بووە."

دەنگەکەی پڕ لە دڕدۆنگی و ماندوو و بڵێیی و نەڵێیی تەوساوی بوو.

ئیتر نە یوسف هیچی لێ پرسی و نە ئادەمیش هیچی گوت. هەتا خۆرەتاو هێندەی سپیدارێك هەڵکشا، هەر وا ڕووبەڕووی یەکتری بێ جووڵە ڕاوەستان.

ئاخرییەکەی ئادەم بێدەنگییەکەی شکاند:"ئیزنم دەدەی بچم چەکەم هەڵگرم؟"

یوسف تێی خوڕی:"قسەی زیادی مەکە، وەپێشم کەوە."

ئادەم لە پێشەوە و یوسف بە شوێنیدا چوونە نێو لێڕەکە. دەمانچەکەی کەوتبووە بن قامیشێکەوە. یوسف ویستی هەڵیگرێ، بەڵام هەر داهاتەوە، ئادەم خۆی هاویشت و هەڵیگرتەوە. ئەو قەڵافەتە زەبەلاحە، خۆ دەستی گەیبایە یوسف، دەیهاڕی. دەبوو دەمانچەکەی لێ بستێنێتەوە. خۆ دەرفەتی بە ترسەکەی دابا، تێداچووبوو. ئەگەر چووبایەتە پێشێ و دەمانچەکەی لێ ئەستاندبایە، جێیەکی دەکەوتە چنگی ئادەم و نەجاتی نەدەبوو. دیسان بەهەموو تینەوە گوڕاندی:"دەمانچەکەت فڕێ دە."

دەمانچەکە کەوتە سەر عەرز.

"بکشێوە."

ئادەم گەڕاوە و چەند هەنگاوێك بەرەو لای لێڕەکە ڕۆیشت و ڕاوەستا. یوسف دەمانچەکەی هەڵگرتەوە و لە گیرفانی پانتۆڵەکەی نا. ئادەم هەروا پشتی لە یوسف بوو و ڕاوەستابوو. یوسف لە ترسان نەیدەوێرا لێی بچێتە پێشێ. دەبوو شتێکی گوتبا. بەڵام دەیتوانی چ بەو زەبەلاحە بڵێ؟ لەخۆوە بەسەر زمانیدا هات:"ئەتۆ کێی؟"

ئەو پرسیارە فریای کەوتبوو. ئادەم، بە ماندوویی و شەکەتییەوە سەیرێکی لاقە قوڕاوییەکانی خۆی کرد. هەتا نێوقەدی قوڕاوی بوو. ئەوجار بەسپایی ئاوڕێکی دایەوە. تاوێك بە نیگایەکی بەکەمگرتنانەوە لە یوسفی روانی بە لەبزێکی بڕوابەخۆبوونەوە لەوەیکە دەیناسێ، گوتی:"ئەمن مستەقە بۆرم پێ دەڵێن. ئەی تۆ کێی؟"

یوسف وەك ئەوەی گوێی لەو پرسیارە نەبووبێ، پرسیی:"ئەتۆ هاتووی بەگ بکوژیی؟"

ئادەم وەڵامی نەداوە.

"قاباقچی ناردووتی؟"

ئادەم دیسان بێ دەنگ مایەوە. یوسف وەخۆ هاتبۆوە.

"ئەتۆ بەگ دەناسی؟ دەزانی بەگ کێیە؟ چۆن دڵت دێ پیاوێکی ئاوا نازدار بکوژیت؟ هیچ بیرت لەوە کردووەتەوە ئەگەر ویستبایەت بەگ بکوژیت، دەستت نقوستان دەبوو؟ چما پیاو بۆ پارەی قاباقچی، هەوڵ دەدات بەگ بکوژێ؟ ئەگەر وای دانێین، کوشتبایەت، هیچ دەزانی چووبایەت ئاسمانی حەوتەمیش، دیسان دەماندۆزییەوە و بە زەجرێکەوە دەمانکوشتی، تەیری ئاسمانێ بۆت گریابایەن؟"

پاشەوپاش بەو لای ئەسپەکەی چوو و گورج خۆی فڕێ دایە سەر ئەسپەکە. لەو کاتەشدا ماوزەرەکەی لێ راست کردەوە و فەرمانی دا:"وەپێشم کەوە."

ئادەم بێدەنگ و گوێڕایەڵ، سەری بەردایەوە و وەڕێ کەوت. یوسف لە خۆشییان وەخت بوو بفڕێت. خۆزگە توانیبای دەستەانی لە پشتەوە ببەستێ... سەری پەتەکەی لە ملی بکات و بە راکێش راکێش بە بەر دەرگای ماڵی گوڵعوزاردا بیباتە کۆشکەکەی بەگەکەی. ئاواش هەر بە بەر دەرگای ماڵی گوڵعوزاردا تێدەپەڕی. دەی چ باشتر، لەوە باشتر؟...

ئەسپەکەی لینگ دا و لەو پیاوەی لە پێشیەوە دەڕۆیشت، نزیکتر بۆوە. هەندێ شت زەینی ئەویان بەخۆوە خەریك کردبوو. ئاگرێك کەوتبووە ناخییەوە. دەتگوت لەوەوپێش ناوی مستەقە بۆرەی بیستووە. ئەو ناوە هەستێکی خۆمانەی لە ناخیدا بزواندبوو. بۆ؟ گوتی:"بڕوان مستەق بۆرە. چونکە لەوەپێش ناوەکەتم بیستبوو، نەمویست دەستت ببەستم."

وەخت بوو شێت بێ کە نەیتوانی بوو دەستی ببەستێ.

مستەق بە زەردەیەکی سەر لێوییەوە راوەستا و دەستی جووت کردن و هێنانییە پێشێ و گوتی:"ئێستا کە منت گرتووە، ئەگەر دەخوازی ها دەستم ببەستە."

یوسف بە تۆزە شادییەك لە دەنگیدا گوتی:"ئەمن، من کوڕەکەی مەحموودم. مەحموودە کوردە. هەر ئەو مەحموودە کوردەی لە زیندانێدا کوشتیان. هەر ئەوەی مورتەزاغای ئاق یوللیی کوشت... ئەوەی پیاو بێ، قەدری پیاویش دەزانێ. ئەتۆ چۆن دلّت هات هەولّ بدەی بۆ کوشتنی بەگی ئێمە؟ دەستەکانت کۆ کەوە و وەڕێ بکەوە."

ئادەم گوێی نەدایە قسەکەی و وەڕێش نەکەوت. بەو بەژن و بالاّ کەلّەگەتەیەوە لە رەوەزێك دەچوو. پەنجەی یوسف لەسەر پەلەپیتکە بوو و ئادەمیش چاوی لە یوسف. یوسف رەنگی بە رووەوە نەما. بە دەنگێکی لەرزۆك و توورەوە گوڕاندی:"پێم گوتی وەڕێ کەوە، چما نابیستی؟"

مستەق بۆرە چاوی لە یوسف بڕی. هەتا چاوی پڕ بوون لە ئاو. ئەوجار زەردەیەکی کالّی لە لێوانی گەڕا و بە سەرسووڕمانەوە گوتی:"بەلّێ، لەو دەچی. دەلّێی سێوێکن و لەت کراون. یانی تۆ کوڕی مەحموودە کوردە، ها؟ خودا لە بابت خۆش بێ. بابت برادەری من بوو. برادەری گیانی گیانیم. گیانێك بووین لە دوو جەستەدا. چیمان وەگیر دەکەوت، پێکەوە دەمانخوارد. ئەتۆ ئەوەت دەزانی؟ بابت ماوەیەك لای من بوو. ئەو خوالێخۆشبووە پیاوێکی جوامێر بوو. برادەرێك بوو لە رێی برادەرایەتیدا گیانی خۆشی دادەنا. ئەدی بابی تۆ جوامێر بوو یوسفەکەم..."

جا سەرێکی لەقاند و لەسەری رۆیشت:" یانی تۆ کوڕەکەی مەحموودی منی، ها؟ چاوم بە دیتنت روون بۆوە کوڕم. ماشەللاّ هەزار ماشەللاّ لەو بەژن وبالاّ و شان و باهۆیەت. کوڕە بوویەتە پیاوێك ماشەللاّ. خوایە شوکرت نەمردم و تۆم دیت."

یوسف فرمێسکی چاوی مستەق بۆرەی دیت. ئێستا جوان وەبیری دەهاتەوە. ئەو باشترین برادەری بابی بوو. باشە ئەوە خۆی بوو؟ مۆرکەی دوودلّی ناخی دەجوی.

مستەق بۆرە پێدەنگ بوو و رووی وەرسووڕاند و کەوتە رێ. زۆر بە خێرایی دەڕۆیشت و جار نە جارێکیش ئاوڕێکی دەدایەوە و میهرەبانانە سەیرێکی یوسفی دەکرد و بە دلّێکی خۆشەوە زەردەیەکی دەهاتێ و دەیگوت:"کەوابوو تۆ یوسفی، ها؟ کوڕەکەی مەحموودە کوردە؟"

"من یوسفم."

کابرا لە حالّێکدا هەولّی دەدا فرمێسکەکانی نێو گلێنەی لووزەو نەبەستن، گوتی:"ئەو دەمی بابت رای کردبوو، پێکەوە بووین. سێ سالّی رەبەق... لەو کوێستانە پان و بەرینەدا شوێن نەمابوو نەچین و کون نەما سەری پێدا نەکەین. بابت نەیدەویست، لێرە لە چوکووراوا

بمێنێتەوە. ئەو دەویویست بچێتەوە لای  گۆلی وان و چیا بەفراوییەکەی سوبحان. ئەمنیش دەمویست بچمەوە ئەوێ. لای گۆلی وان."

به پێکەنینێك ددانە زێڕەکانی دەرخستن و لەسەری ڕۆیشت:"ئەگەر ویستت، ئەتۆش لەگەڵ خۆم دەبەم."

ئەمجارە زەردەیەکی هاتێ و گوتی:"ئەگەر بابت مابایە... حەیف ئەو جوامێرە حەیف بوو کوشتیان. ئەتۆ تەرمەکەیت دی؟ ئەمن بەگ داوام دەکا؟ دەروێش بەگ چ کارێکی بە منە؟ خۆ ئەو بنیادەم نییە... ئەگەر ئەو بنیادەم بوایە، کێ دەیتوانی ئاوا بەسەر بابت بێنێ... هەناوی ڕەش بێ پیاوی وا. ئەستۆی بشکێ و ببڕێتەوە هەی. ئەتۆ من بەرە بۆ لای ئەو کوڕەکەی مەحموود دەی. ئەتۆش... بنیادەم... مەحموود بەردەوام باسی چیاکانی وان و گوندەکەی باوکیی دەکرد کە هیچ کات نەیدیتبوو... گۆرانیی بە چیای سوبحان هەڵدەگوت. ئەمن کوردیم نەدەزانی. ئەتۆ حەز دەکەی بچیتە وان؟"

یوسف گوڕاندی بەسەریدا:"نەخێر نامەوێ بچم."

"تەرمەکەی بابتت دی؟"

دیسان نەڕاندی:"دیتم."

"ئەی تەرمەکەی کامیل؟"

"دیتم."

بایەکە هەڵی کردبوو و کەروێشکەی بە قامیشەڵانەکە دەکرد.

"دیتم، دیتم، دیتم."

"هەڵۆکان بەسەر پردەکەوە، لە تەنیشت سولمیش دەگەڕان... ئەو هەڵۆیانەی بۆنی خوێنیان کردبوو. سەری بابت هێندەی سەری دوو پیاوی لێ هاتبوو. هەمووی برین بوو و خوێن و زنچکاوی لێ دەهات. بۆنی خوێن... هەموو شارۆچکەکە بۆنی خوێن دایگرتبوو..."

"دیتم، دیتم، دیتم."

دەنگەکە بەسەر قامیشەڵانەکەدا تا دوور دوور چوو.

یوسف ئەسپەکەی لینگ دا و گەیشتە شانی پیاوەکە. شان بە شانی یەکتری دەڕۆیشتن. یوسف پێی شەرم بوو ئەو بە سوار ئەسپ بڕوات و برادەرەکەی بابی، بە پێیان. بەڵام کێ ئەسپەکەی بن خۆی دەدایە کەسێکی کە هاتبوو بەگەکەی بکوژێ؟ دڵی بەوە دەگوشرا.

مستەق بۆرە راوەستا و سەیرێکی ئەسپە ئارەقەکردووەکە و ماوزەرە بریقەدارەکەی ئەوی کرد و ئەوجار چاوی لە چاوەکانی بڕی و گوتی:

"زوڵمە، زوڵم."

لە حاڵێکدا هانکەهانکی بوو، گەڕایەوە و پشتی تێکردەوە و وەڕێ کەوتەوە.

سەری لە نێوان شانە پتەوەکانیدا بەرز بوو و پشتی تۆزێك کۆمابۆوە. هەنگاوی خۆش کردن. یوسف کە بەشوێنیدا ئەسپەکەی لێدەخوڕی، بەردەوام بیری دەکردەوە:

"حەیف.. حەیف... زوڵم، زوڵم..."

مستەق بۆرە، دوای تاوێك دیسان لە چەقی رێیەکەدا راوەستا و بە تووڕەییەوە گرماندی:"بیستتەوە بابتیان چۆن کوشت؟"

یوسف وەك مەستان، لەوانەیە بە چاوەکانی، لەوانەیە بە دەستەکانی، لەوانەشە بە هەموو گیانی و لەوانەشە بە هەوساری ئەسپەکەی یان قەمچی وەشاندنەکەی لە ئەسپەکەی، بۆ گێڕایەوە.

"دەروێش بەگ کامیلی چۆن کوشت؟ دەزانی؟"

یوسف بە دەنگێکی کپ کە بەحاڵ دەبیسرا، و تۆزە شەرمێکی پێوە دیار بوو، بەبێ ئۆقرەییەوە گوتی:" نازانم."

بە چاوی خۆی رووداوەکەی کامیلی دیتبوو. بەڵام ئەو کات منداڵ بوو، کەچی هەمووشی مووبەموو لەبیر مابوو. بەر ئاواییەکە دڕووەڵانێکی لێ بوو. دڕکەکان دەتگوت نەشتەرن. رەق و تیژ. هەر چڵێك و سەدان دڕکی پێوە و ئەوەندەش چڕ و تێك چڕژاو کە ماریش نەیدەتوانی بخزێتە نێوی. سێ پیاوی قەمچی بە دەست کامیلیان بە رووت و قووتی لەو دەریای پان و بەرینی دڕکە تیژانە کردبوو. سەرتاپێی شەڵاڵی خوێن و بە بەر بارانی قەمچییاندا گرمۆڵە ببوو و لە تاوان لە پنچکە دڕوویەکەوە پەنای دەبردە بن پنچکە دڕوییەکی دیکە. گەنجە شەڵاڵی خوێنەکە دەهاتەوە بەرچاوەکانی یوسف کە ددانە سپییەکانی لە نێو ئەو هەمووە سوورایییەدا بریقەیان دەهات. لە حاڵێکدا قەمچییەکان پەیتا پەیتا وەپشتی دەکەوتن. بە گیانێکی نوقمی خوێن، خۆی بە نێو کۆمای دڕووەکاندا کرد و بۆ چەند ساتێك ون بوو... و چاوەکانی لە حەژمەتان و لە ترسان دەرپەڕیبوون. چاوەکانی بەگیش لە ژێڵڵا هاتبوون و ئاگریان لێ دەباری. هەموو چاویان زەق زەق ببۆوە.

بابت، بابت، بابتیان ئاوا کوشت. هەموو ئێسکی گیانیان هاڕیبوو. وەك جیوە، وەك لوێچیێ گۆشت و ئێسقان... تەرمەکەشیان لە دەم رووباری ساورۆن خستە پێش دەمی سەگەل. ونجڕ ونجڕ و ئەنجن ئەنجن... هەموو خەڵکی شارۆچکە بە منداڵ و پیر و لاو و ژن و پیاوەوە سێ شەو و رۆژان بە تەنیشت ئەو تەرمە ئەنجن ئەنجنکراوەدا تێپەڕین... ونجڕ ونجڕ...

یوسف هەر ئەوەندەی لەبیر مابوو. هەر کات تەرمەکەی بابی لەبەر دەم ماڵەکەیان وەبیر دەهاتەوە، دڵی دەگوشرا. هەرکاتێ کامیلی وەبیر دەهاتەوە، شتێك لە قوڕگیدا عاسێ دەبوو و دڵی تێکەڵ دەهات. بۆنێك، بۆنێکی هێڵنج هێنەر...

مستەق بۆرە لێی نەدەبڕییەوە و هەر دەیگوت. یوسف دەیەویست را بکا. دوو سێ پنچکە دڕوو لەو دەوروپشتە بوون... پەیتا پەیتا قسەی دەکرد و کامیل و بابیی لێ تێکەڵ دەبوو.

لەخۆی دەگوت، ئەگەر ئەو تووك لێکراوە، ئەو تووك لێکراوە ـ جا هەر کەسێکە ـ را بکا... ئەگەر ئەو نەفرەتییە را بکا، دەحەسێتەوە. نە بانگی دەکرد و نە تەقەشی لێ دەکرد. ئاخ ئەگەر را بکا. خۆزگە رای کردبایە. باشە بۆ باسی بابی دەکا؟ بۆچی باسی کامیلی دەکرد؟ مستەق بۆرە لە بەگ دەترسا. زەندەقی لێی چوبوو. ئەگەر بردبایە لای بەگەکەی خۆی، ئەویشی بە دەردەکەی کامیل دەبرد. بە خەرەزەنێك وێی دەکەوت و راوی دەنا و بە دڕووەڵانەکەیدا دەکرد و هەپروون بە هەپروونی دەکرد. هەر چاو و ددانەکانی سپی دەچوونەوە و هەموو گیانی لە خوێندا شەڵاڵ دەبوو. بەگ قسەی یەکە. قسەیەکبوون باشە. کێ چووزانێ کامیل چ خراپەیەکی دەرهەق بەگ کردبوو. مەحاڵە بەگ بەبێ تاوان یەکێك ئاوا بکوژێ. ئەو مستەقە بۆرەش زۆری لێ دەڵێ. کوڕە لەبری ئەو هەمووە وەڕینە را بکە. پیاو لە روخسارییەوە دیارە. یانی بێ تاوانە؟ لەوانەیە هەر مستەق بۆرەش نەبێ...

لەو کاتەدا مارێك پەیدا بوو. بە بەردەمی مستەقدا و لە دەم جادەکەوە دەخوشی. جار نەجارێك ئاوڕێکی دەدایەوە و سەیرێکی دواوەی دەکرد. مستەق بۆرە هەر گوێشی پێی نەدەبزووت. جاری وابوو دەهات پێی لە کلکی بنێ. ئەو برادەرەی بابیشم پیاوێکی سەیرە. یەك پشوو قسە دەکا... مارەکە، خۆڵاوی، بە قەف و پێچەوە دەخوشی. سەری هەڵدێنا. زمانە سوورەکەی دەردێنا و ئاوڕێکی لە دواوەی دەداوە. لاقەکانی مستەق بەسەر رێگەکە و شوێنی مارەکەدا دەکشان و خۆڵەپۆتینەکەی هەڵدەستاند...

ئەو بنیادەمە هەر نازانێ ترس چییە. هیچ بیر لە راکردنێ ناکاتەوە. گیانی لەسەر دەستی داناوە... هەر دەهاتن و لە ئاواییەکە نزیکتر دەبوونەوە. سەری قیت راگرتبوو و لە پێش

ئەسپەکەیەوە دەڕۆیشت. دەموچاوی پیاوانە و پانتۆڵە مەرەزە جوانەکەی و... چاکەتکەشی هاواری دەکرد قاچاغە. لە قوماشێکی خەت خەتیی زیوین دوورابوو. تۆزێك دەشەلی. نا، نا. رێك خۆیەتی. مستەقە بۆرە خۆی. لە دایکیی بیستبوو کە "مامە مستەقت تۆزێك دەشەلیٚ." بەڵام ئەو بێدینە هەر گوێشی پێی نابزویٚ. هەر دەڵێی بەرەو مەرگیش ناچیٚ. یانی نایەویٚ را بکا؟ چیی لە ئاوەدانییەکە نزیکتر دەبوونەوە، ئەو هەنگاوەکانی خۆشتر دەکردن. ئاخری خۆی پیٚ نەگیرا و وەزمان هات:"مامە مستەق."

خۆشەویستییەکی گەرم لە ناخییەوە شەپۆلی دا و بە راستگۆییەکی منداڵانەوە گوتی:"ئەگەر بتبەم و بتدەمە دەستی بەگ، دەتکوژیٚ."

مارەکە پانزە هەنگاو لە پێشییەوە دەخوشی.

مستەق بۆرە ساتێك راوەستا و سەیرێکی روخساری یوسفی کرد و زەردەیەکی هاتیٚ و دیسان وەڕیٚ کەوتەوە.

یوسف دامابوو. شڵەژابوو. ئێستا دەبوو چ بکا؟ تێنەدەگەیشت، رای نەدەکرد و نەیدەکرد. پانزە بیست دەقەیەکی دیکە دەگەیشتنە نێودیٚ. دوای ئەوە ئیتر کار لە کاریٚ دەترازا و بەگ ئەویشی بە مەرەدی کامیل دەبرد. دەبوو چ بکا؟ لە نێوان ددانییەوە گوتی:"بەگ دەتکوژیٚ، وەك کامیل... لە دڕووەڵانەکەت... رووت و قووتت..."

مستەق ئاوڕی داوە و دیسان پێکەنی. بریسکەی پێکەنینەکەی لە چاوەکانیدا بوو.

کە دەڕۆیشت، تەپوتۆزێکی زۆری هەڵدەستاند. یوسف بیری کردەوە:"چۆنە لێرە راوەستم؟ ئەویش کە بزانیٚ ئەمن بەجیٚ ماوم، ملی رێیە دەگریٚ و دەڕوا. جڵەوی ئەسپەکەی راکێشا. مستەقیش بەبیٚ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە، بەناخی خۆیدا رۆچوبوو و دەڕۆیشت. یوسف چاوەڕیٚ بوو دوور بکەوێتەوە و خۆ بە قامیشەڵانەکەدا بکا. هەروا جڵەوی ئەسپەکەی کێشابوو و لەجێی خۆی چەقیبوو. بیری لەو بۆشاییە دەکردەوە کە دوای راکردن و نەمانی وی هەستی پیٚ دەکرد. ئەو هەموو زەحمەت و ئەو هەمووە خۆشی و هەژانەی لیٚ بەتاڵ ببۆوە. مارەکەش لە حاڵێکدا بە تۆز و خۆڵەکەدا رۆدەچوو و دەهاتەوە دەریٚ، بە بەر پێیانیدا دەخوشی.

مستەق هەر وا لەخۆیدا بوو تا گەیشتە دەم قامیشەڵانەکە. لەویٚ راوەستا. نوقمی سەیرکردنی قامیشەڵانەکە بوو کە گوڵی دابوو و کەروێشکەی دەکرد. قامیشەڵان و دەشتە گەورەکە هەتا چاو هەتەر دەکات، تا ئەوبەری رەوەزەکانی ئاناوەرزای گرتبوو. کیٚ دەیزانی ئەو قامیشەڵانە چیی تێدایە؟ قامیشەڵانەکە گۆشەیەك بوو لە دنیایەکی ئەفسووناوی. مارەکەش

لەگەڵ پێی ئەودا راوەستا. سەری هەڵێنا و سەیرێکی مستەق بۆرەی کرد. دەتگوت پێدەکەنێ. گەمەی بەکلکی کرد و رایوەشاند. درۆشە سوورەکەی دوو لك بوو. مستەق کە دوای سەیری قامیشەلانەکە تێگەیبوو یوسف بەجێ ماوە، ئاوڕی دایەوە و سەیری کرد یوسف لە جێی خۆی چەقیوە. لە پێشدا تۆزێك مات بوو، بەڵام ئەوجار دەتگوت لێی تێگەیوە. لەجێی خۆی نەبزووت و چاوەڕێی یوسف ما. یوسف چاوەڕێ بوو خۆی بە قامیشەلانەکەدا بکا. هەروا ماوەیەك لە دوورەوە لە یەکتریان روانی. هیچ کامیان نەدەبزووتن. یوسف کە دەیدی مستەق خۆ بە قامیشەلانەکەدا ناکات، وەختبوو شێت بێ لە داخانی. مستەق لەوەیکە بۆچی ئەو هەتیوە شێت و شوورە دواکەوتووە، پێکەنینی هات. دەبوو تێی بگەیەنێ کە نایەوێ را بکا. مارەکە دوور کەوتبۆوە و رۆیشتبوو و شوێنە پێچەڵاوپێچەکەی بەسەر خۆڵەکەوە مابووەوە.

یوسف لە نەکاو وەبیری هاتەوە کە دەمانچەکەی مامە مستەق بەوە. پیاوی پاڵەوان و بەدەستوبردی وەك ئەو بەبێ چەك ناتوانن هەنگاوێکیش بەڕێیەدا بڕۆن. لە ئەسپەکەی خوڕی و لێی چووە پێشێ. مستەق بە زەردەیەکی پڕ لە میهرەبانی و نیگای پڕ لە توس و پلارەوە راوەستابوو و باوکانە لێی رامابوو. لەو جەنگەیەدا مارەکەش لە قامیشەلانەکە هاتەوە دەرێ.

یوسف دەمانچەکەی بۆ راداشت و بە دەنگێکی فەرماندەرانەوە گوتی:"هانێ خۆ بە قامیشەلانەکەدا بکە."

مستەق بۆرە هەر وەك گوێی لە دەنگیشی نەبووبێت، دەمانچەکەی لێ وەرگرت و لە بەر پشتوێنەکەی نا. بزەی سەر لێوی نەدەڕەوییەوە. لە بری ئەوەی خۆ بە قامیشەلانەکەدا بکات، لە پێش ئەسپەکەوە بەرەو ئاوایی وەڕێ کەوت. یوسف لە داخانی شێت بوو. ئاخ خۆزگە ئەو مستەق بۆرەیە برای بابی نەدەبوو، جا باش دەیزانی چیی بەسەر دێنێ. دەست و پێی شەتەك دەدا و بە راکێش راکێش دەیبردە ئاوایی. بەڵام حەیف و مخابن. بە توڕەییەوە گوتی:"بەگ ئەمر دەکا بتکوژن. دەتکوژێ."

ئاخێکی قووڵی لە ناخییەوە هەڵکێشا و لەسەری رۆیشت:"بەگ ئەمر دەکا بتکوژن و تەرمەکەت فڕێ دەدەنە بەر سەگان. باشە ئەوە تۆ تێ ناگەی چیت پێ دەڵێم؟ چما نابیستی؟"

دیسان زەردەیەکی پڕ لە خۆشەویستی و تۆزە تەشەرێکیش لەسەر لێوەکانی مستەق بۆرە نیشتەوە. یوسف کە وەڵامی پرسیارەکەی خۆی وەرنەگرتبۆوە، لە دین دەهری بوو و گوتی:"ئەتۆ پیاوێکی ترسنۆکیت. زۆر ترسنۆکیت مامە مستەق."

مستەق ئاوڕی دایەوە، ماوەیەك لە ئامێزی نیگای خۆی گرت:"بە من دەڵێی؟ ئەمن ترسنۆکم؟"

قاقایەکی کێشا و لەسەری ڕۆیشت:"یۆسف گیان، کوڕم، لەو دنیایەدا کەس نییە نەترسێ. لە دەنگی تۆشدا کە دەتگوت "مەبزوو، خۆت بەدەستەوە بدە"، ترس شەپۆلی دەدا. هیچ شتێك لەو بنیادەمە مەترسیدارتر نییە کە ترساوە. کە گوێم لە دەنگی تۆ بوو، بە خۆمم گوت، هاوارە لەمن، ئەو کوڕە دەمکوژێ. ئەمن پتر لە هەموو شتێکی دیکە، زراوم لە ترس چووە. چیی نەمابوو لێم بدەیت و نقوستانم بکەی."

یوسف دیسانەکە دەرهەڵبوو و نەڕاندی:"ئەتۆ هەر ئەو مستەق بۆرەیە نیی کە برادەری بابم بوو. ئەتۆ درۆزنێکی و هیچی دی."

مستەق پێشی پێکەنینەکەی خۆی گرت و سەری داخست.

ئێستا کە دەمانچەکەی بەخۆی بوو و لە دواوەش بەجێ مابوو، ئەی بۆ رای نەدەکرد؟ دیسان بەجێ ما. مستەق بۆرە، دەمودەست زانیی و راوەستا. مارەکە لە ڕێگاکەوە هاتە دەرێ و خزییە نێو قامیشەڵانەکەوە.

هەتا لە قامیشەڵانەکە دوور نەکەوتبوونەوە، یوسف چەند جارێکی دیکەش بە ئانقەست خۆی وەدواوە دا بۆ ئەوەی مستەق بۆرە را بکا. بەڵام مستەق هەر هەستی دەکرد لێك دوور کەوتوونەتەوە، رادەوەستا و چاوەڕوان دەما. یوسف چەقۆت لێ دابوایە خوێنی نەدەهات. چیی نەمابوو بداتە قوڵپەی گریان و دەستەوداوێنی بێت و لێی بپاڕێتەوە کە:"تۆ خوا رابکە مامە گیان. تۆ خوا را بکە." چیی لە ئاوایی نزیکتر دەبوونەوە، یوسف پتر دەشڵەژا و هەموو ئازای ئەندامی دەلەرزی. جاری وابوو بە زەینیدا دەهات بیکا بە قوربانی فیشەکێك. ... لەوانەشە نەتوانێ را بکا. لەوانەشە پێی شەرم بێت لەبەر منداڵێك هەڵێ کە کوڕی نزیکترین هاوڕێیەتی. دەمانچەکەشی خۆ بە دەستییەوە بوو. چیی پێی خۆش بوایە دەیتوانی لەگەڵی بکات. ئەگەر گوتباشی ئەوە بەرم دای و وەشوێن کاری خۆت بکەوە مامە گیان، خراپ دەبوو. نەیدەتوانی بە برادەری بابی خۆی بڵێ ئەوە بەرم دای و بڕۆ خوات لەگەڵ. ئەگەر سەری ئەسپەکەی خۆی وەرگێڕابایە و بەرەو دەشتەکە تێی تەقاندبایە، چ دەبوو؟ ئەگەر گوتبایەی بڕۆ خوات لەگەڵ بێ و لەکۆڵم بەوە، چیی لێ دەکەوتەوە؟ بەڵام ئاخۆ ئەو کات برادەرەکەی بابی نەیدەگوت، ترسنۆك بووە و نەیتوانیوە پیاوێك بەرێتەوە لای ئاغاکەی؟ ئاخۆ مامە مستەق بەو کەللە شەقییەی خۆی نەیدەویست ئەو تاقی بکاتەوە؟

ئیتر گەیبوونەوە بەر ئاوەدانی. یوسف ئەسپەکەی لینگ دا و وەپێشی کەوت. چەپۆکێکی لەسەر شانی مستەق دا و رایوەشاند و بە لەبزێکەوە کە زیاتر لە پاڕانەوە دەچوو نەك هەڕەشە، گوتی:"ئەو بەگە زۆر بێ بەزەییە مامە مستەق. ئەو بەگە دەتدا بتکوژن. ئەمن باشی دەناسم. بە خوای دەتکوژێ. تێدەگەی؟"

چیی نەمابوو گریانەکە ئەوکی بەربدات و بداتە قوڵپەی گریان. چاوی پڕ بوون لە ئاو و لەدین دەهری ببوو. بەڵام مستەق بۆرە هەر بای خەیاڵیشی نەبوو. یوسف لە بن لێوانییەوە گرماندی:"چاوت دەرێ."

لە بن لێویەوە گوتی:"چاوت دەرێن بە جەحەندەم. جەحەندەمت لێ پڕ بێ. ئێستا بشتکوژن، پەیوەندیی بەمنەوە نییە. خوێنی خۆت لە ئەستۆی خۆت."

چوونە نێو ئاواییەوە. تووڕەییەکەی یوسف دامرکایەوە. ئیتر چیی پێ دەکرا؟ چیی لەبەری پاڕابووەوە، نەیویستبوو را بکا. ئەو ئیتر پتر لەوەی کردبووی، چیی دیکەی کردبا؟ دایکی دەڵێ چ دەڵێ با بیڵێ. هەر کەس چ دەڵێن با بیڵێن. کە بیری لەوە کردەوە بە بەر دەرگای ماڵی گوڵعوزاردا تێدەپەڕێ، شەپۆلێکی شادی و خۆشی گیانی تەنییەوە. دەی چ باشتر ئەو کەرە پیاوە رای نەکرد.

ئەمجارە بە هەژاوییەوە گوتی:"مامە مستەق بەولایەدا."

جا بە لەبزێکی تەوساوییەوە گوتی:"بەگ ئەنجن ئەنجنت دەکا."

ئەوجار نۆرەی ئەو بوو کە گاڵتەی پێ بکا. ئیتر کار لە کارێ ترازابوو. بەو حاڵەشەوە دیسان بەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە، رەنگی بزڕکابوو و ددانی چیڕ دەکردەوە.

گوڵعوزار کە ئەوی بەسەر ئەسپە خۆشەبەزەکەیەوە دیت کە دەتگوت ئاسکە، سوور هەڵگەڕا و پێکەنینێکی پڕ لە خۆشیی پێشکەش کرد و رایکردەوە ژوورێ. بریسکانەوەی ددانی منداڵانەی و درەوشانەوەی حەز و ئارەزووی لێوە گۆشتنەکانی، لە چاوەکانی ئەودا مانەوە.

کە گەیشتنە بەر دەرگای کۆشکەکە، یوسف ئیتر لەسەر ئەسپەکە خۆی رانەگرت. خۆی فڕێ دایە خوارەوە و لە مستەق بۆرە چووە پێشێ. وەك دوژمنان سەیری کرد و بە تووڕەیی و تەوسەوە گرماندی:"دەمانچەکەت بدە من، هەر لێرەش راوەستە. لە جێی خۆت نەبزووی."

بەگ لەسەر هەورەبانەکە راوەستابوو و ورد ورد ئاگای لە هەموو هەڵسوکەوتەکانی یوسف بوو. لەو کاتەدا ئەوانەی بیستبوویان یوسف ئەو پیاوەی گرتووە کە هاتبوو بەگ بکوژێ، لەبەر دەرگای کۆشکەکە کۆ دەبوونەوە.

مستەق بۆرە دەمانچەکەی، کە لەبەر پشتوێنیّ دەریهێنابوو، بە بزەیەکەوە دایە یوسف. پێکەنینە ناشیرنەکەی ئەو پیاوە ئەوی شێت دەکرد. یوسف کە رەنگی بە رووەوە نەمابوو، بە ئەژنۆی لەرزۆکەوە، لە پلیکانەکان وەسەر کەوت. دەمانچەکەی مستەق و ماوزەرەکەی خۆی لەبەر پێیەکانی بەگ دانا و بە دەنگێکی بیّ هێز و شەرمنانەوە گوتی:"تەمەنی دوژمنت کورت بیّ، بەگ."

"ئەو پیاوە هەوە؟ خۆیەتی؟ لە زمانیت دەرکێشاوە خۆیەتی؟"

"بەڵیّ خۆیەتی. لە زمانیم دەرکێشاوە. ناویشی مستەق بۆرەیە."

بەگ فەرمانی دا:"بیپشکنە و بیهێنە سەرەوە."

یوسف چووە خوارەوە و لە حاڵێکدا گیرفانەکانی مستەق بۆرە دەگەڕا، گوتی:"بەگ دەتکوژیّ. وەك کامیل دەتکوژیّ. منیش هیچ تاوانێکم نییە. خوێنت لە ئەستۆی خۆت."

مستەق بۆرە زەردەیەکی نەرمی لەسەر لێوەکانی و لەخۆباییبوونێك بە روخسارییەوە بوو. ئەو لە پێشەوە و یوسف بە دوایدا لە پلیکانەکان وەسەر کەوتن.

بەگ دوای ئەوەی بە تەوقی سەرییەوە تا بەری پێی سەیرێکی مستەق بۆرەی کرد، بە نەرم و نیانی و بەبیّ ئەوەی هیچ تووڕەییەکی لە دەنگیدا بیّ، لێی پرسی:"قاباقچی ناردبووتی بمکوژی؟"

مستەق بە پێکەنینەوە وەڵامی دایەوە:" ئەو ناردمی بەگ. ئەمنیش هاتم."

یوسف لەو نەرمی و نیانییەی بەگ سەری سووڕ ما. کەوابوو مامە مستەق ئاگای لە هەندیّ شت بوو، بۆیە ئاوا بیّ خەم دەهات. بە دڵیدا هات:"گوو بەو شانسە، کوڕە وەرە سەیر، بەو هەموو دەردەسەرییەوە گرتم و هێنامە ئێرە."

بەگ بە ئاماژەی برۆ، بە یوسفی گوت بڕۆ. یوسف لە پلیکانەکان چووە خواریّ. دایکی لەماڵەوە نەبوو. رێك گەڕایەوە کۆشك. سەری لیّ شێوابوو. ئەگەر دایکی دۆزیبایەوە، تێی دەگەیاند. کە سەیری کرد دایکیی لە نێو ژنەکاندا دیت ئەوا دەگری و سەر و رووی خۆی دڕنیّ. دایکی هەر چاوی پێی کەوت، وەك فیشەکە شێتە دەرچوو. یوسف باش دەیزانی ئەگەر میرۆ هەڵبچیّ، بەبیّ ئەوەی گویّ بداتە تەمەن و قەد و قەڵافەتەکەی، هەر بە بەرچاوی ژنەکانی ئاواییەوە تێی هەڵدەدا. هەر بۆیە، دەمودەست بەرەو ماڵەوە تێی تەقاند. میرۆش سەری لە دووی نا.

میرۆ رای دەکرد و چیی دەهاتە سەر زاری، پێی دەگوت:"هەی ناجسن... نارەسەنی بیژوو... هەی زۆڵی...یاخوا کوێر و زەلیل بی، خوا تێر عەمرت نەکا... کوڕە هەی تیری

نەبەدیت وێکەوێ... یاخوا ئەو بەژن و بالآیەت بەریتە بن گڵ... چووی مستەق بۆرە، برادەرە گیانی گیانییەکەی بابتت گرتووە و هێناوتە بەگ بیکوژێ؟ ها؟ هەی دەستت بشکێ..."

یوسف خۆی بە ژوورێدا کرد و دەرگای لە پشتەوە گالە دا. میرۆ لە دەرەوە دەیقیژاند و تووك و نەفرەتی لێ دەکرد و جنێو نەمابوو پێ بدات. یوسفیش لە پشتەوەڕا هەر لەبەری دەپاڕایەوە.

"باشە دایە تۆخوا مەقیژێنە. لەسەر خۆ بە. لەسەر خۆ بە با پێت بڵێم چۆناوچۆن بوو..."

بەڵام دایکە هێور نەدەبۆوە. "کوڕە خۆ بێت و بەگ بیکوژێ، ئەمنیش تۆ دەکوژم."

دوای ئەوە میرۆ هێور بۆوە و لە زمان کەوت، یۆسف دەرگاکەی کردەوە....

یوسف دوای ئەوەی هەموو شتێکی بۆ دایکی لە بنی کوولەکە دا، گوتی:"هەستە بچۆ لای بەگ و رزگاری بکە. بڕۆ و داوا لە بەگ بکە لێی خۆش بێ. پێی بڵێ لەبەر تۆ و بابم لێی خۆش بێ."

میرۆ دیسان زاری لێ کردەوە:"کوڕە هەی تێر عەمر نەبی... خودا بتباتەوە... کوڕە هەی دەرد و تووکت بەرامبەر بن.... گەمژە، کەللەکەر... ئاخ، ئاخ... ئاخ ئاورت لە جەرگم بەردا... باشە ئەمن لەمەودوا چۆن سەر هەڵێنم؟ ئەگەر ئێستا بابت زیندوو بوایە، سەرتی پان دەکردەوە..."

میرۆ ئەوەندەی لێ گوت، کە ئیتر زاری کەفی کرد و بە شڵەژاوییەوە لە ماڵێ وەدەر کەوت و چووە کۆشك. هەر گەیشتێ، خۆی بە عەرزی دادا و بەربووە پاڕانەوە:"لێی خۆشە بەگ، لەبەر مەحموود... لە بەر من..."

بەگ بەبێ ئەوەی قسەیەك بکات، پێدەکەنی.

"لەبەر خاتری مەحموود، لە براکەی خۆش بە بەگ... چکۆڵە هەڵەی دەکەن و گەوران خۆش دەبن..."

بەگ هەڵیستاندە پێ. میرۆ چاوی لە چاوەکانی بەگ بڕی و لێبڕاوانە گوتی:"ئەگەر ئەتۆ ئەو برایەی مەحموود بکوژیت، ئەمنیش لە پێشدا یوسف و دوای ئەویش خۆم دەکوژم."

"ئەو قسانە چین میرۆ؟"

"ببوورە بەگ، ئەمنیش، یوسفیش..."

بەگ یەك پشوو پێ دەکەنی، نەرم و گەش و مزگێنیدەر."

میرۆش شڵەژاو و بێ ئۆقرە و ئالۆز"بیبوورە..."

بەگ روخسارێکی شێلیگرتری بەخۆیەوە گرت:"لەسەرخۆ بە میرۆ... ئەگەر براکەی مەحموود بۆ کوشتنی منیش هاتبێ، دیسان هەر برای منە و لەسەر سەرمانی دادەنێین. میوانەکەت بەرەوە ماڵی خۆت. کاریشت بە یوسف نەبێ."

میرۆ بە هەژاوییەوە کە نەشیدەزانی چ بکا گوتی:"باشە، باشە."

لای کردەوە بەلای مستەقدا:"وەرە برالە. یوسف کوڕی خۆتە. لێی خۆش بە. وەرە ئەمشەو میوانی ئێمە بە."

مستەق بۆرە لە پێشەوە و میرۆ بەدوایدا هاتنەوە ماڵێ. یوسف لە شەرمان سەری هەڵنەدەهات.

مستەق بۆرە هەتا بەرەبەری بەیانی هەر باسی ئەو کاتەی مەحموودی بۆ دایك و کوڕە گێڕایەوە کە پێکەوە لە زیندانێ بوون. کەس باسی بەگ و پیلانی کوشتنی بەگ و قاباقچیی هەر نەکرد.

مارێکی کەسك، بە بریسکەیەکی بەشەپۆلەوە، بە زمانێکی سوور سوورەوە، درێژ و خۆڵاوی، بەو سەری دیواری بەندیخانەکە هەڵدەگەڕا. هەڵۆکان بە داوێنی لای باشووری گردەکەی سولمیشەوە هەڵدەفڕین... خوێنەکە وشك ببۆوە و رەش هەڵگەڕابوو و توێژ توێژ ببوو...

ئاوە روونەکە، کە رووناکاییەکە لە تەرکی بنی دەدا، لووزەوی بەستبوو. سەری مەحموود لە نێو خڕکە بەردەکاندا، بای کردبوو و دوو سێ ئەوەندە گەورە ببۆوە و قەڵشیبوو و بڵاو ببوو...

گوتی:"ئاخ، ئاااخ. نەیاندەهێشت کەس لە تەرمەکەی نزیك بێتەوە."

نەقیب لەسەر تەرمەکەی مەحموود هەڵترووشکابوو و دەینالاند. تەرمەکە ونجڕ ونجڕ کرابوو و بۆگەن ببوو و بای کردبوو و دوو سێ ئەوەندە گەورە ببۆوە.

## ٦٦

مستەق بۆرە لەگەڵ یوسف و دوو کەس لە پیاوەکانی دەروێش بەگ چوونە شارۆچکە بۆ ماڵی قاباقچی ئۆغڵی. لەو نۆکەرەی دەرگاکەی لێ کردنەوە، لێیان پرسیی:"ئاغا لە ماڵێیە؟ ئەگەر لە ماڵەوەیە، زەحمەت نەبێ با بێتە خوارێ. پێی بڵێ دەروێش بەگ پیاوی ناردووە." تاوێك دواتر قاباقچی ئۆغڵی بە بێ هێزییەوە لە پلیکانەکان هاتە خوارێ و مستەق بۆرە نەیهێشت قسەیەك بکات و بەسەریدا نەڕاندی:"کاتێ ئەمن بە دنەدانی تۆ دەچووم دەروێش بەگ بکوژم، ئەوم باش نەدەناسی. دواتر کە تێگەیشتم و بۆم روون بۆوە ئەو کابرایە کێیە و کوڕی کێیە، کە چاویشم بە روخسارە نوورانییەکەی کەوت، دڵم هەر نەهات بیر لە کوشتنی وەها جوامێرێك بکەمەوە. شتێکت پێ بڵێم قاباقچی زادە؟ هەر نینۆکێکی دەروێش بەگ سەد هەزار گەندوگووی وەك تۆ دێنێ."

ماهیر بەگ پێی بە عەرزییەوە رەق ببوو. هەوڵی دەدا شتێك بڵێ، بەڵام بۆی نەدەگوترا. مستەق بۆرە دەمانچەکەی کە لەبەر پشتوێنی دەرهێنابوو، لەگەڵ بەستە دراوێکیش بۆ لای راداشت و بە لەبزێکی فەرماندەرانەوە گوتی:"هانێ ئەوانە."

دەنگەکەی ئەوەندە توند و بە ئەمر بوو، ماهیر بەگ نەیزانی چۆن دەستی برد و دەمانچە و بەستە دراوەکەی لێ وەرگرتەوە.

"ئەوانە بدە بە ژنەکەت با ئەو بچێ و دەروێش بەگت بۆ بکوژێ."

ماهیر بەگ حەپەسابوو و وەك مریشکێکی سەریان هەڵپڕووسقاندبێ، پەلەقاژەی بوو، بەڵام هەر چەند قسەیەکی بە بڕگە بڕگە لە زاری هاتە دەرێ:"لایەك... هەڵە... حاشا... بەگی ئێمە..."

مستەق خێرا لە دەمی دا:"ئەگەر لە گیانی شیرینت تێر نەبووی، دەرگای زارت داخە، هەی یەگی بەرەڵڵا."

بۆ ئەوەی ڕێبواری ڕێ و ئەوانەی گوێیان لە دەنگەکەی ببوو و بەو دەنگە دەنگە لە ماڵەکانیان هاتبوونە دەرێ، هەموویان گوێیان لە قسەکانی بێ، بە هەموو هێزی خۆی نەڕاندی:"هەموو دەعبایەك گۆشتی ناخورێ. قاباق پاشا... گۆشتی دەروێش بەگ ناخورێ. ئەمن باش لەوە تێگەیشتم قاباق پاشا، ئەتۆش زۆر زوو لێت روون دەبێتەوە."

ئەوەی گوت و گورج و گۆڵ وەڕێ کەوت و پیاوەکانی دەروێش بەگ و یوسفیش بە شوێنیدا لە کۆڵانەکە لایان کردەوە. هێشتاش هەر دەیگوڕاند:"گۆشتی هەموو دەعبایەك بۆ خواردنێ نابێ قاباقچی ئەفەنی. گۆشتی دەروێش بەگیش خۆ وەك ژەهری ماری وایە، لە گەرووت دەگیرێ."

ماهیر بە دەمانچە و بەستە دراوەکەی دەستییەوە، لە جێی خۆی وشك ببوو. مێشکی لەکار کەوتبوو و لە حاڵێکدا خێرا خێرا چاوی دەترووکاند، بە چاوی پڕ لە پرسیارەوە سەیری ئەو خەڵکەی دەکرد وا لە بەردەمی کۆ ببوونەوە. لە نەکاو وەبیری هاتەوە چیی بە دەستەوەیە و وەك ئەوەی دەستی سووتابێ، دەستە دراوەکە و دەمانچەکەی فڕێ دا و دەرگاکەی پێوە دا و وەك راویان نابێ، بە هەڵەداوان لە پلیکانەکان وەسەر کەوت و سەرلێشێواو و شڵەژاو لە ماڵەکەیدا کەوتە هات و چۆ.

ژنەکەی، منداڵەکانی و یەکێك لە خزمە دوورەکانی کە هاتبوو و میوانی بوو و برادەرە هاوپۆلییەکەی کوڕەکەی لە زانکۆ راوەستابوون و سەیریان دەکرد کە وەك شێتان دەهات و دەچوو. دەهات و دەچوو و دەستەکانی وەك ئەوەی پیس و گول بووبن، پەیتا پەیتا ڕێکی دەخشاندن و...

دەمانچە و دراوەکە هەتا بەیانی لەبەر دەرگاکە لە تەنیشت بەردێك مابوونەوە بەبێ ئەوەی کەس دەستیان بۆ بەرێ. ماهیر کە لە داخی ئەو ڕووداوە تا بەیانی نەنوستبوو، کە لە ماڵێ هاتە دەرێ، نە دەمانچەکەی دیت و نە بەستە دراوەکەی. ئەی کێ ئەوانەی هەڵگرتووە؟ ماهیر ئەوەندەی ئاگا لەخۆی بوو کە بزانێ بۆچی ئاوای لێ بەسەر هاتبوو. بەڵام چیی لە دەست دەهات؟ چاری نەبوو جگە لەوەی دان بەخۆیدا بگرێ. بە هەر حاڵ، ئەو زەبرە گورچوبڕە تەواو لە پەڕ و پۆی کردبوو.

قسەکانی مستەق بۆرە کە بەشاریدا گەڕابوو و گوتبوونی، هێشتاش لە گوێیدا دەزرینگانەوە:"هەموو دەعبایەك گۆشتی ناخورێ. فسۆس هەر بۆ خواردن نابێ قاباقچی. سەگباب داخوا پێی وایە بووەتە چی وا ئەمن دەنێرێ پیاوی بۆ بکوژم. خۆ ملوێنێکیشت

دابامیٚ، محاڵ بوو ئەو جوامێرە بکوژم. بەڵام سەگێکی وەك تۆ بۆ تاقە جگەرەیەك دەکوژم... هەر بە خوت و خۆڕاییش دەیکوژم. چونکە ئەتۆ خوێنت حەڵاڵە و هەر کەس بتکوژیٚ، ڕێك دەچێتە بەهەشتیٚ..."

تا ئێواریٚ ئەو قسانەی جار نە جاریٚ، بیستەوە و تەواو لە مێشکیدا چەسپابوون.

هەموو شارۆچکە و گوندەکانی دەوروبەر، ڕۆژ بە ڕۆژ و تەنانەت چرکە بە چرکەش هەواڵەکانیان وەردەگرت. ئەوان هەموو شتێکیان موو بە موو دەزانی. بە تێر و تەسەلی دەیانزانی هەتا دەروێش بەگ قایل نەبیٚ، ماهیر بەگ ناتوانیٚ زەوییەکانی زۆنگاوەکە بخاتە سەر مڵکەکەی خۆی و کلکە سووتیٚ بۆ دەروێش دەکات و دەروێشیش بە سەگێکی دانانیٚ و دەڵیٚ، بە مەرجێك ئاشت دەبمەوە کە ئاشتبوونەوەمان بە ڕێو شوێنی باب و باپیران و نەریتی ئۆغوز بیٚ.

پیاوانی شارۆچکە و گوندەکانی دەوروبەر لەو پەیوەندییەدا کە ئاخۆ ماهیر بەگ قەبووڵی دەکات بە پێی نەریتی ئۆغوز بچێتە ئاشتبوونەوە یان نا، ببوونە دوو دەستە. هەندیٚ دەیانگوت مەحاڵە ماهیر مل بۆ ئاشتبوونەوەیەکی وەها ڕاکێشیٚ. لایەنگرەکان پێیان وابوو هیچ کەس نەك لەبەر ملیۆنان، بگرە بە نرخی ژیانیش ناتوانیٚ مل بۆ وەها ئاشتبوونەوەیەکی پڕ لە شەرمەزاری ڕاکێشێت و ببێتە گاڵتەجاڕ و ریسوای زەمانە. هەندێکیش دەیانگوت کە ئەویش ماهیر قاباقچی زادەی پیٚ دەڵێن، لوێچیٚ خاکی پیٚ بدە و نامووسەکەی لیٚ بکڕە. لەبەر ئەو هەمووە زەوی و زارە، نەك هەر جارێك، ئامادە دەبیٚ هەموو ڕۆژەکانی ساڵ بە پێی ئەو نەریتی ئۆغوزە ئاشت بێتەوە. دواییش ئەو هەواڵە دوور لە چاوەڕوانییە بە شارۆچکەدا بڵاو بووەوە. ماهیر هەموو کارێکی پیٚ دەکرا، ئەوەیان نەبیٚ. مستەق بۆرەش بە بازاڕەکەدا دەگەڕا و دەیگوت:"کە چاوم بە دەروێش بەگ کەوت، دەستم ڕەق بوون و نووری ماقووڵی و چاکەکاری لە نێوچاوانییەوە دەباری. لەو حاڵەدا ئەو ماهیرە بۆگەن و ترسنۆك و دەستەوستانەم وەبیر هاتەوە و بەخۆمم گوت: بۆ ماڵی دنیا، پەلاماری ئەو بەگە ڕەسەنە نادەم."

هەموو شتێکی لەبنی کوولەکە دەدا: ئەوەی ماهیر ئەوی چۆن دۆزیبۆوە و چۆن زمانچەوریی کردبوو و چەندەی پارە دابووییٚ و بەڵێنی چەند دۆنم زەوییشی دابووییٚ و... لە بەرامبەریشدا نە ماهیر متەقی لێوە دەهات و نە پیاوەکانیشی. خەڵکی شارۆچکەش دەیانگوت:

"هەر بژی پیاو. ئەو پیاوە بەو کارەی خۆی سەلماندی کە تەنانەت پیاوکوژێکی بەکرێگیراویش مایەی ئەوەی تێدایە پیاوەتی بکات و ببێتەوە ئینسان. بە قاباقچیی گوتبوو،

رێك رووبەڕووی خۆی کە... هەر نینۆکێکی دەروێش بەگ... بە هەزاران بێ دایك و بابی وەك تۆ... ناگۆڕمەوە."

ساری مستەق حەوتووەکی تەواو بە شارۆچکەکەدا گەڕا و تووشی هەر کەس بوو، بۆی گێڕایەوە و دوای ئەوە بزر بوو.

ئێستا شارۆچکەکە دیسان لەبەردەم رووداوی دیکەدا بوو. کارەکە بە کوێ دەگەیی؟ ماهیر تەنانەت بە نرخی گیانیشی بووبێ، وازی لەو زەوی و زارە بەپیتانە نەدەهێنا. دەروێش بەگیش مەحاڵ بوو واز لە نەریتی ئۆغوز هەڵگرێ.

رۆژ و حەوتووی بەسەردا هات. ماهیر بەگ خۆی لە ژوورەکەیدا قەتیس کردبوو و وەدەرنەدەکەوت. خەڵك دەیانگوت پیاوی پیاو ئاوایە. گەمەکەی مستەق بۆرە، خانەنشینی کردووە و ئیتر ناتوانێ لە هیچ کوێ وەدەرکەوێ. تەنانەت هەندێ لەوەش پتر پێیان لێ راکێشا و دەیانگوت:"هەتا ئەو رۆژەی زیندووە، نایەتە دەرێ. زۆر کەسیش بڕوایان دەکرد. شارۆچکەکە وردە وردە بەزەیی بە ماهیر بەگدا هاتەوە و رقیان لە دەروێش بەگ هەڵگرت و لێی بێزار بوون.

ماهیریش لە ماڵەکەیدا چلەی گرتبوو و مشووری لێ دەخوارد. بەڵام دەستی بۆ هەر لکێك دەبرد، دەشکا. رەنگی زەرد هەڵگەڕابوو و بن چاوەکانی رەش داگەڕابوون. لەو چەند مانگەی رابردوودا، پیر ببوو و تێك شکابوو. هێزی لەبەردا نەمابوو. ژنەکەی، منداڵەکانی، برا و خوشکانی، خزم و نزیکەکانی زگیان پێی دەسووتا، بەڵام هیچیان لەدەست نەدەهات. ئەو دەروێشە تووك لێکراوە، جانەوەرێك بوو کە دین و ئیمان و رەحم و بەزەیی و جوامێری کاری تێ نەدەکرد.

"کوڕە هەی گووی سەگ بەو ئۆغوزە. هەی ئەو نەریتی ئۆغوزییەت بە میرات بێ. ئینساف و پیاوەتی شتێکی باشە. چما پیاو دێ کەسێك، هاوڕەگەزێکی خۆی لە بەر خاتری نەریتێکی چاخی دەقیانووس، ئاوا ماڵوێران دەکا؟ کوڕە هەی خودا گول و کوێرت بکا دەروێش بەگ. ئۆغوز کوێیە؟ ئەتۆ نەریتی ئۆغوزت لە کوێ دیتووە؟ کێ هەتا ئێستا لەو دەوروبەرانە باسی ئۆغوزی بیستووە؟ باب و باپیرەکانی ئێمە نە ئۆغوز بوونە و نە ئۆغوزیش وەها نەریتێکی هەیە. هەی بەرازی فێڵباز، پیاوی چەپەڵ. هەر بۆ ئەوەی ئەو داماوە بکاتە گاڵتەجاڕی ئەم و ئەو و ئابڕووی بەرێ، ئەو تورەهاتەی لەخۆوە دەرهێناوە. چما ئێمە تورك و ئۆمەتی محەمەد و چوکووراوایی نین؟ چما باب و باپیرانی ئێمە لێرە نەژیاون؟ لەوەتەی هەین، نە ئۆغوزێکمان دیت

و نه نەریتەکەشی. کوڕە بۆخاتری خودای، هەر کەس تا ئێستا ئۆغوزی دیتووە و شتێکی لە سەر نەریتەکەی بیستووە، ئێمەش ئاگادار بکاتەوە."

"میللەتێك ئۆغوز نەناسیٚ و بەپێی نەریتی ئۆغوز نەچێتە پێشیٚ، بە میللەت لەقەڵەم نادریٚ. کوڕە وەرن بۆ خاتری خودای، ئەو دەروێشە فێڵباز و درۆزنە..."

زۆربەی خەڵکی شارۆچکە نەفرەتیان هەبوو لە وشەی ئۆغوز کە تەنیا لە کتێبە مێژوویی و گۆڤارە خۆرکەلێدراوەکاندا دەبینرا و خۆیان لە هاودەردی ماهیر دەزانی و لەنێو خۆیاندا دەیانگوت ئەگەر ئەو نەریتە قۆڕە نەبوایە، ئێستا دەمێك بوو دەروێش و ماهیر ئاشت ببوونەوە. چەند مانگێك بوو لایەنگرەکانی ماهیر لە شاریدا ڕێبەرایەتیی دارودەستەی دژە ئۆغوزیان دەکرد. ئاخرییەکەی ڕۆژێکیش داهات کە ئۆغوز واتای خەیانەتکار و نیشتیمانفرۆشی بەخۆوە گرت.

دەروێش بەگیش ورد ورد ئاگای لە هەموو پیلان و ڕەوتە دژ ئۆغوزەکان بوو و دەیگوت:"ئەمن ئەو گەمژانە تێدەگەیەنم. بۆ ئەو بیٚ شەرەف و بیٚ نامووس و بیٚ دایك و بابانە و بۆ ئەو دوژمنانەی نەژاد و میللەت و نیشتمان و ناموسانەی دەسەلمێنم... وایان لیٚ دەکەم تا لە سەر ئەم دنیایەن، نەوێرن ئاوا بە خراپە و بە زمانێکی وا پیس باسی ڕەچەڵەك و تۆرەمە ڕەسەنەکەمان بکەن. ئەو نیشتیمانەیان ئاوا تێدا برد. ئاوا زەلیل و داماویان کرد. ئێستاش ئەوە بیٚ کار لێی دانیشتوون... پاشماوەی دەوڵەتی تورکان..."

دەروێش بەگیش دەیەویست گرووپێك لە بەرامبەر ئەو سەگانەی شارۆچکەدا قوت بکاتەوە. بەڵام بەستێنەکە بۆ وەها کارێك لەبار نەبوو. قسەی سەگی وەك ماهیر دەچەقین. ئۆغوز و نەریتەکەی ئۆغوزیان وا کردبووە گاڵتەی سەر زار و زمانان هەر مەپرسە.

قسەی ئۆغوز، ڕەچەڵەك و تۆرەمەی بەرزی ئۆغوز، نەوەیەك کە چەنگیز و تەیموور و ئاتیلا و ئەلب ئەرسەلانەکانی لیٚ کەوتبۆوە، لەو شارۆچکەیەدا ببوونە مایەی ڕابواردن و گاڵتەجاڕی چەند کەسێکی بەرەڵڵا.

دەروێش بەگ جاری وابوو خۆی پیٚ نەدەگیرا و دەینەڕاند:"ئەو شارۆچکەیە بۆوەی دەبیٚ ئاگری بدەیت و هەرچیی تێیدایە لە منداڵی سەر پشتی لانکەوە تا پیری سەر لێوی قەبر، قەڵتوبڕیان بکەی. ئاااخ، باپیرە تەیموورە شەلەکەم... ئاخخخ باپیرە چەنگیز... ئاااخ ئاتیلا... چیتان لیٚ هات؟ کوا ئەو ڕۆژە خۆشانەی ڕابردوو؟..."

## ٦٧

ئاوێنەیەکی دیکەیان بۆ جارچییەکە بە رادان دابوو. زنجیرەکان گەردن و گوێزینگ و قولەپێ و دەستەکانیان رەش و مۆر کردبۆوە. پێستەکەشی چرچ و لۆچ ببوو. مێشە شاخدارەکان و مێشەکەرانە و زەردەواڵەی زەرد و زەرگەتەی مەیلەوڕەش و کەسك بە وزەوزەوە لەسەر ئەو توێکڵە شووتی و کاڵەکانەی لە بەر دیواری بەندیخانەکە فڕێ درابوون دەنیشتن و هەڵدەفڕینەوە. جارچییەکەش بەو هێڵەکەی رایسپاردبوو لە دەرەوەڕا بۆیان هێنابوو، سووك و سانا دەیگرتن و باڵێکیانی هەڵدەقەند و لەسەر ئاوێنەکە بەرەڵڵای دەکردن. زەردەواڵە و مێشی جۆراوجۆر و رەنگاورەنگ بە پۆل لەسەر ئاوێنەکە لەجێی خۆیان باڵەپڕژەیان بوو.

دەنگێك لە هەموو زیندانەکە گەڕا:"نەقیب چاوشین هات."

نەقیب قەمچییەکی بەدەستەوە بوو و پەیتا پەیتا لە ملیوانی جزمەکەی دەدا. پیاوێکی زۆر کەڵەگەتی لە تەنیشتییەوە بوو. دیاربوو نەقیب بەردەستی ئەو بوو. رێك بەرەو لای جارچییەکە چوون کە لە بن دارە هەنجیرەکە بەسەر ئاوێنەکەدا چەمابۆوە و بە ژوور سەرییەوە راوەستان. جارچییەکە نوقمی سەیرکردنی ئەو پۆلە زەردەواڵە و مێشەبوو کە لەسەر ئاوێنەکە تێك دەچرژان و دەجوولان.

نەقیب لاقی راستەی بەرز کردەوە و بە زەردەیەکی سەر لێوانەوە، بە ئاوێنەکەی دادا. ئاوێنەکە شکا و جارچی یەك بەخۆی هەڵبەزییەوە و هەر چاوی بە نەقیب کەوت، راچڵەکی و لە جێی خۆی دانیشت و کرووشمەی کرد. زەردەواڵەکانیش لە نێو خۆڵ و خاك و وردە شووشەی ئاوێنەکەدا بڵاو بوونەوە.

کابرا کەڵەگەتەکە لە سەرۆکی بەندیخانەکەی پرسی:"جەنابی مودیر؟"

"بەڵێ گەورەم."

"ئەو کۆت و زنجیرە چییە؟"

"هەر ئاوا ناردوویانە."

"نەقیب."

نەقیب خۆی خڕ کردەوە.

"دەڵێم ئەو کۆت و زنجیرانە چین؟"

"لەبیرمان نەبووە گەورەم."

"تا زووە بیانکەنەوە، دەی. با بزانم ئەو کوورە شێتە وا بەردەوام لەگەڵ مێش و مەگەزان خافڵاوە؟"

"شێت نییە، بەڵام گەمەیان پێ دەکات.

"بینێرنە لای دوکتۆر."

"بەچاوان گەورەم."

نەقیب پێی لەسەر وردە شووشەکان هەڵگرت. جاڕچییەکەش لەگەڵ پێی ئەودا هەستایە سەر پێ و قیت و رەپ رووبەڕوویان راوەستا و زەردەیەکی کاڵ لە بن کوڵمە وشك هەڵاتووەکانی گەڕا و چرچ و لۆچیان تێخست. دوو هەنگاو بەرەو لای کابرا کەڵەگەتەکە رۆیشت و سینگی بە سینگییەوە نا:"ئەمن کوشتم. ئاسنگەرەکە من کوشتم. بیشمکوژن پێتان ناڵێم لەسەر چی کوشتم. حەز دەکەی لە دارم بدەن. ئاسنگەرەکە من کوشتم. سڵاوی من بگەیەنە قۆرت بۆغا نەقیب..."

کابرا کەڵەگەتە لەخۆباییانە گرماندی:"بێدەنگ بە."

نەقیب بە تووڕەییەوە نەڕاندی:"بێدەنگ بە کوورە سەگ، بێدەنگ بە."

پاسەوانەکان جاڕچییەکەیان کە کووڕاییەکەی پشتی نەمابوو و قیت راوەستابوو، گرت و بردیانە ژوورەکەی مودیر و زنجیرەکانیان لە دەست و پێ و گەردنی کردەوە.

جاڕچییەکە وەك شتێکی لێ بزر بووبێت، رووت و قووت مابۆوە. لە ناخیدا هەستی نە کەمایەسی و بۆشاییەك دەکرد. کە بەبێ کۆت و بەند و زنجیر گەڕایەوە حەوشەی بەندیخانەکە. خۆر لە رەوەزەکان ئاوا ببوو. جاڕچییەکە راستە و رێ چووە بن دارە هەنجیرەکە. زەردەواڵە خۆڵاوییەکانی یەك بە یەك هەڵدەگرتەوە و تووڕی دەدانە پشت دیواری حەوشەکە. دەرگای ژوورەکان پەیتا پەیتا دادەخران. جاڕچییەکە لە بەر دەرگای ژوورەکە دەهات و دەچوو و حەزی لێ نەبوو بچێتە ژوورێ. هەر دەتگوت بێت و وەژوور بکەوێت بەڵایەکی بەسەر دێت.

پاسەوانە پیرەکە گوتی:"برۆ ژوورێ جەنابی جاڕچی."

هەروا کە کلیلەکانی لە نێو دەستیدا رادەوەشاند، گوتی:"تکایە برۆ ژووری جەنابی جارچی"

جارچی دەتگوت لەگەڵ ئەویشی نییە. دەموچاوە درێژ ببۆوە و چاوەکانی دەرپۆقیبوون، دەتگوت چاوی زەردەواڵەن. زەردەواڵە خۆڵاوییەکان بە باڵە هەڵکەندراوەکەیانەوە، بە لارە لار بە دەموچاوی هەڵدەگەڕان...

ئەوجار ئیتر بن پیلی گرت و لەسەخۆ رایوەشاند و لێی دووپات کردەوە:"کاکی جارچی، بچۆ ژووریٚ."

جارچی تازە وەخۆ هاتبۆوە و زەردەی دەهاتیٚ. هێشتا پێیەکی تەواو لە ژووریٚ نەنابوو کە گوتی:"ئاسنگەرەکە من کوشتم. چاك چاکیشم کرد و دەستیشم خۆش بیٚ. ئەگەر خۆیشیان بکووژن هەر من کوشتوومە."

دەنگەکەی لە نووزەیەك دەچوو کە لە بنی بیرێکەوە بیٚ. بەڵام پاسەوانە پیرە گوێی لە قسەکانی بوو.

"چاك، چاکت کرد. دیارە شتێکت دەزانی کە... کاری چاکت کرد، چاکە..."

پێشبینییەکەی راست دەرنەهات. زیندانییەکان بەپێچەوانەی جاران، زۆر بە حورمەت و رێزەوە وەریانگرت. هەر باسی زنجیرەکانیان نەکرد و نەك قەشمەرییان پیٚ نەکرد و بە سووك سەیریان نەکرد، تەنانەت چایەکی وەك خوێنی کەروێشکیشیان بۆی لە ئیستیکانە قەدباریکەکە کرد و لە پێشیان دانا. کەس باسی زەردەواڵەکانیشی نەکرد. یەکێك لەوسەرەوە گوتی:"خودا وەخێری بگێڕیٚ برالە."

ئەوجار هەمووان یەك بە دوای یەکدا بە پەژارەوە دووبارەیان کردەوە:"خودا وەخێری بگێڕیٚ برالە."

جا هەستان و لێی هاتنە پێشیٚ. لە روخساریاندا دیار بوو گاڵتە ناکە. گەورەی ژوورەکە وەقسە هات:"ئاسنگەرەکە تۆ کوشتووتە و هەمووان لێیان سوورە. بەڵام سبەی تۆ لە دادگایە نابیٚ بڵێی ئەمن کوشتوومە، تێگەیشتی؟ لێرە کەس ناڵیٚ من فلانەکەسم کوشت. لەوەتەی دنیا دنیایە، ئەو هەمووە خەڵکە پیاویان کوشتووە، بەڵام هیچ کام لای قازی نەیانگوتووە ئەمن کوشتوومە."

جارچی قیت و رەپ راوەستا و راشکاوانە گوتی:" من کوشتوومە."

گەورەکە گوتی:"بەڵێ تۆ کوشتووەتە و هەمووشمان ئەوە دەزانین. بەڵام تۆ لە دادگایە نابێ بڵێی من کوشتوومە. کەس ئەتۆ بە بنیادەم نازانێ، کەس بڕوا ناکات تۆ پیاوت کوشتبێ."

حەسەنە شێت لە دڵسۆزییان وەقسە هات کە:"زۆریش بۆ زنجیرەکانت بەداخین."

وسوو وەقسە هات:"ناکرێ. ناکرێ کاکە جارچی لی. وای دانێین هەر تۆ ئاسنگەرەکەت کوشتبێ، دەبێ حاشای لێ بکەی لۆ... ئەتۆ نەتکوشتووە .... نا، ئەتۆ نەتکوشتووە، لەخۆڕایی گوتووتە من کوشتوومە، تێگەیشتی برالە؟"

فەرهۆ:"برا جارچییەکەم، کاکە وسوو ڕاست دەکا..."

گەورەکە:"ئەمڕۆ زۆرمان بەدڵ بووی و بەزەییشمان پێتدا هاتەوە. نامانەوێ ڕەنج بەخەسار بی. ئەگەر لە دادگا بڵێی ئەمن ئاسنگەرەکەم کوشتووە، کەس بڕوا ناکات. ئێمە لەو ژوورەدا هەموو ئەقڵی خۆمان کۆ کردەوە و خستمانە سەر یەك و بەوە گەیشتین. دیارە هەموومان دڵنیاین کە تۆ ئاسنگەرەکەت کوشتووە؟"

"کوڕە قەبوولمانە، بەڵام نابێ لە دادگا بڵێی ئەمن کوشتوومە، تێگەیشتی؟ ئەگەر بڵێی ئەمن کوشتوومە، مودیری گەورە بڕوات پێ ناکات و ئەو کاتە ئیتر بەرت دەدا و ڕەنج بەخەسار دەبی، تێگەیشتی؟"

جارچییەکە گوتی:"ئەمن کوشتم. من کوشتم."

سەری لە قەپیلی خۆی نابوو و کووڕییەکەی لە سەری بەرزتر ببۆوە و نێوچاوانی تێك نابوو.

گەورەکەیان، ددانەکانی چیڕ کردەوە و بە لەبزێکی پڕ لە لۆمەوە گوتی:"کوڕە هەی خۆڵت وەسەری، بەخۆت و ئەو مێشکە بۆشەتەوە. ئەمڕۆ بەزەییمان پێتدا هاتەوە و گوتمان..."

جارچییەکە ئەمجارەیان بە دەنگێکی تەواو دڵنیا و پتەوەوە گوتی:"من کوشتم."

گەورەکە لەدین دەهری بوو:"کوڕە لێی گەڕێن بابە، خۆ ئەوە بنیادەم نییە. وەك سەگ درۆیان دەکات. کووڕەی گڵاو، پێی وایە دەتوانێ ئێمەش بەکەر بزانێ... ئەوە دامنا خزمەتێکیشمان پێ کرد، بەڵام چما لە چاوی دایە؟... دەی بچۆ لای قازی هەر بڵێ من کوشتم، ئەویش بەرت دەدا و جا ئەوجار ڕووڕەش و ریسوای دنیایە بە... ئەوەی لە خودای دەوێ بابە. دەی کوڕینە بچنەوە سەر جێی خۆتان و ئیتر بە سەگێکیشی دامەنێن...."

بەندی، ئەوەندەی یەك و دوو بڵاوەیان کرد و ئەویش کە ئیستیکانێکی نیوەی لەبەردەم بوو، لەسەر جێیەکەی خۆی مایەوە. تۆزێك دواتر ژوورەکە یەکسەر خەوی لێ کەوت.

زەردەواڵەکان، چاوە دەرپۆقیوەکانیان، مل و گەردەنە چرچ و لۆچەکەی قۆرت بۆغا، بە لاکە لاك ڕێکردن و سمێڵە شۆڕ و پیسەکەی، مژۆڵەکانی کە وەك مژۆڵی ئەسپ درێژ و ڕەق بوون... قۆرت بۆغا لە بازاڕ، لە بن دارچنارەکە لە سەیارەکەی دابەزی. مێرسدێسەکەی لە تۆز و خۆڵدا سپی دەچۆوە. شۆفیرەکە ماستاوچییانە دەرگاکەی بۆ کردەوە. قۆرت بۆغا دابەزی. ئەوی لە قاوەخانەکە بوون، لە سەر کورسییەکان هەستابوون. لەولاترەوە، لەبەر دووکانی ئاسنگەرەکە، سەگێکی زل کە دیار نەبوو لە کوێوە ڕێی لێ هەتڵە بووە، سەری لەسەر لاشیپانەی دەرگاکە دانابوو و لێی خەوتبوو.

"ئەمن نەمکوشت گەورەم، دادوەری مەزن. چما بنیادەم دەستی دەچێتە خوێنی برای خۆی؟ ئەشکەنجەیان کردم و ئێسك و پرووسکیان هاڕیم. بە زۆر وایان لێ کردم بڵێم ئاسنگەرەکە من کوشتم. خۆت هەموو شتێك دەزانی دادوەری مەزن. ئەمن بۆ دەبێ ئاسنگەرەکە بکوژم؟ چما دڵم دەهات؟ چما دەمتوانی؟ من نەمکوژتووە. ئەمن پیاوم پێ ناکوژرێ."

سەگەکەی مێگەل، جار جارێ بە دەنگێکەوە سەری هەڵدێنا، دیسان لەسەر باسکی دایدەناوە و دەخەوتەوە.

"هەستن هەی سەگینە، ئەوە کێیە؟ ئەو قۆرت بۆغایە پیاو کوژە. سەد ژنی لە ئاقچاساز شوێن بزر کردووە. ئەوەندەی پیاوکوشتووە لە ژمار نایەن. ئێستاش، ئاسنگەرەکەی کوشتووە. لە جێی ئەویش... هەستە هەی قۆرت بۆغای سەگ... قۆرت بۆغا... قۆرت بۆغا... هەستە با بتبینن... هەستە با بزانم چۆن نغرۆ دەبیت... هەستەەەەە."

قۆرت بۆغا وەك بینی ئاو دەلەرزێ. لێوەکانی ڕەش هەڵگەڕاون و شۆڕ بوونەتەوە. زاری داپچڕیوە و دەیەوێ شتێك بڵێ، بەڵام دەنگی دەرنایە. دەماری لاملی هەستاون... چاوەکانی نیوەکراوە و بەقووڵدا چوون و وشك هەڵاتوون و لێوەکانی شەقارشەقار بوون وەك قەپۆزی بارگین، هەستە.

"وەرە، وەرە، وەرەپێشتر."

قۆرت بۆغا زمانی دەگیرێ:"نەکەی، ئەمن کوێرەوەریم زۆر دیتووە. هەرچی زوڵم و زۆری و خراپەی کردوومە هەموو لە چارەڕەشیی خۆم بووە. پیاوی داماو زاڵمە. بنیادەم نییە، خراپە. نەکەی، نەکەی... هەمووی، هەموویم لەبەر ئەوە کردووە. ئێستاش کە ژیانم کەوتووەتە سەر ڕەوڕەوەی خۆی، ئەتۆ دەتەوێ بمکوژی..."

دەمانچەکەی فڕێ دەداتە سەر عەرزەکە و لە نێوان ددانەکانییەوە دەڵێ:"ناتکوژم. سەی وەك تۆ نابێ بکوژرێ. وەرنە سەیر، چۆن دەپاڕێتەوە و هەڵدەلەرزێ. بڕۆ جەهەندەم پڕ بکە. سواری ترۆمبێلەکەت بە و لەبەر چاوم بزر بە."

وسوو بە خەوالووییەوە هات و لە تەنیشتی دانیشت.

"هۆی جارچی لو، ئەوە بۆ وای؟ چیتە؟"

جارچی بە دەنگێکی گڕەوە وەڵامی دایەوە:"هیچم نییە. زۆریش باشم."

"باشە جارچی ئەفەنی، بۆچی درۆیان دەکەی ئەفەنی؟ کێ ئاسنگەرەکەی کوشت؟"

"من. من کوشتم..."

قۆرت بۆغا لە ترۆمبێلە مێرسدێسەکەی دابەزی و ئەوی لە قاوەخانەکە بوو لەبەری هەستان. ئەویش لەسەر کورسییەکە دانیشت و پێی لێ ڕاکێشا. بەو دەسرۆکەیەی لە سەر ملی هەڵیگرتبوو، ئارەقەی دەموچاوی سڕییەوە و لاقەکانی لەبەر یەك بڵاو کردن. یەخەی کراسەکەی هەتا سەر ورگی کرابۆوە و تووکە سپییەکانی سینگی دەبینران. بە قاوەچییەکەی کە بەروانکەیەکی بەملییەوە هەڵواسیبوو، گوت:"قاوەیەك، با سادە بێ."

بەدەم خۆ لەبەریەك کێشانەوەوە، بەبێ ئەوەی رووی لە کەسێکی دیاریکراو بێت، گوتی:"یانی ئاوا، دیسان برنج دەچێننەوە. جا ئەمن چیم لەدەست دێ؟ چیی لەبەر ئەو وەرزێرانە پاڕامەوە دەست لەو کارە هەڵگرن، بەگوێیاندا نەچوو و نەچوو. رۆڵەی ئەو میللەتە وەك گەڵای دارێ هەڵدەوەرن، نیشتمانپەروەرێك نەماوە. هەر کەسە و بیر لە گیرفانی خۆی دەکاتەوە. خۆ منداڵی وەرزێرەکان نامرن... ئاااای، لەو سەیرەی. ئەو وەرزێرانە بۆوەی نابن لەگەڵیان رێك کەوی. زۆر سەگن. ئەمن دەرەقەتیان نایەم..."

چەند کەسێك وێکڕا گوتیان:"کوڕە خەفەتی لێ مەخۆ، بۆخۆت سەلامەت بی..."

تەراکتۆر و کامیۆن و دەڕاسەکان بە نێوەندی بازاڕەکەدا تێدەپەڕین و زەوییەکەیان دەلەرزاندەوە.

شین و نارنجی و کەسکێکی روون... لەسەر هەر کامەشیان شۆفیرێك بە کڵاوێکی ئاسنەوە و سمێڵێکی قەیتانی و قەڵافەتێکی تا رادەیەك لەخۆباییانەوە. یەکێك لە شۆفیرەکان، تراکتۆرەکەی خێرا کرد و رووی کردە قۆرت بۆغا. خۆ ئەگەر قۆت بۆغا و ئەوانی دیکەش دەمودەست لەبەر هەڵنەهاتبایەن، لە بن تۆپە زلەکانی تەراکتۆرەکەدا دەپلیشانەوە.

تەراکتۆرەکە هەتا پێنج شەش کورسیی ورد و خاش نەکرد، رانەوەستا:"ببوورن برادەرینە. بەدەست خۆم نەبوو. باش بوو بەخێر گەڕا. قاوەیەك بێنە قاوەچی.."

قۆرت بۆغا پەیتا پەیتا سەری دەلەقاند و لە بنەوە دەیبۆڵاند:"هەی خودا بتانباتەوە، بتانباتەوە. کورە خۆ چیی نەمابوو هەموومان بهاڕی. سەیری ئەو کورسییانە بکە..."

شۆفیرەکە وەڵامی دایەوە:"دەیبژێرین مامە گیان. قاوەچی... ها وەرە پارەی کورسییەکانت..."

دراوێکی پەنجا لیرەی بۆ قاوەچییەکە راداشت و ئەوجار پێی لەسەر گازدەری تەراکتۆرەکە دانا و کەوتە رێ. گەنجەکە ئاوڕێکی دایەوە، هەرای کرد:"مامە گیان، مامە گیان، مامە گیان... ئێمە وەك تۆ جەلادی ژنان نیین کە هەموو ئەوانەی لە قاوەخانە دانیشتوون وەبەر بدەین. ئاسنگەرەکە بکوژین و بیخەینە ئەستۆی جارچییە داماوەکەوە..."

ئیتر بە تەراکتۆرەکە خێرا دوور کەوتەوە و تەپوتۆزێکی لەپاش خۆی بەجێ هێشت.

"هەی خودا پاکتان بکاتەوە، بتانباتەوە... جا پێتان دەڵێم. بەو جارچییە بەڕەڵڵایەش دەڵێم."

کە بیری لە جارچییەکە دەکردەوە، شێت دەبوو. لەو رۆژەوەی جارچییەکە جنێوی پێ دابوو، هەموو گاڵتەیان پێ دەکرد. ئێستا وای لێ هاتبوو رووی تەراکتۆریان تێ دەکرد. پێت دەڵێم سەگباب. سەگباب لێم بووەتە پاڵەوان. لە زیندانێ سینگی دەرپەڕاندووە و گوتوویەتی، من ئاسنگەرەکەم کوشتووە. تەنانەت زنجیرەکانیشی وەك میدالیای شانازی لەملی کردووە. ئەوە میدالی شانازییەکەیم لە ئەستۆی کردەوە و گووم لە دەمی بەست. دەبێ بەڵایەکی بەسەر بێنم عەرەب بەسەر گامێشی نەهێنابێ. ئەمن پیاوێك نیم کە ئەو حاجی قۆرت بوغایەی بە حاڵی سەگ گەیاندوومەتە ئەمڕۆ، هەر وا بیخەمە بەر پێی سەگێکی پشتکووڕەوە کە دینارێك ناژی."

بەرەو ترۆمبێلەکەی چوو. لێی دەهری دەبوو. "ئەو دڵە بێ عارەش هەر ئەوەی دەویست. ئاخر بە دڵ و گیان منەتباری بوو. خۆ ئەگەر ملیۆنێکیشی خەرج کردبایە، نەدەگەیشتە ئەو شتەی من پێم داوە. ئەوە ئەوەتا بە دەستی خۆمان بەڕەڵڵایەکمان کردە پاڵەوان کە هەموو گیانی فلسێکی نەدێنا. ئەویش چ پاڵەوانێك... گەودای خوێڕی. ملیۆنێك لیرەت دەوێ، یان شانازیی کوشتنی ئاسنگەرەکە؟ سەگی سەگبابی بەرەڵڵا، ملیۆنێکت دەوێ یان کۆت و زنجیر؟ ژن... شەو و رۆژ ئاڵقەی زنجیرەکانی مشتوماڵ داوە. ئەوە زنجیرەکانم لێ ئەستاندییەوە، راوەستە با شانازیی کوشتنی ئاسنگەرەکەشت لێ بستێنمەوە و دیسان بەڕەڵڵای کووچە و کۆڵان

و شەقامەکانت بکەمەوە و وات لێ بکەم بکەویتە کلکەسووتێ... سەی بەڕڵلا، لێمان بووەتە پاڵەوان. چۆن وەك قورِنوو، بە کوشتنی ئاسنگەرەکەوە نووسابوو و هیچ وەسەر خۆشی نەدێنا. چما ئەمن ئاسنگەرەکەم بە دەستی مورتەزا کوێرە نەکوشت؟ ئاخۆ تۆ لەکوێ و پیاو کوشتن لە کوێ؟ وەڵڵا بمری باشترە. کورِە خۆ هەر دەڵێی بە راستی برِوای بەخۆی کردووە..."

سواری مێرسدێسەکەی بوو و بە شۆفیرەکەی گوت:" هەڵی بکە، هەڵی بکە با بچینە مەزرا (کێڵگەکە).

لە رێی مەزرایە هەر لەناخی خۆیدا جینگڵی دەدا. لە داخی جارِچییەکەی چیی نەمابوو شێت بێ و ئەو مەسەلەی تەراکتۆرەش کە ئەمرۆ هاتە پێشێ، ئەوەندەی دیکەی توورِە دەکرد. ئەو بوودەڵانە، ئەو مێروولانە، ئەو مێش و مەگەزانە... چ دەکرێ... خۆ بنیادەم نەبوو تا وەك بنیادەم لەگەڵی بجوولێیتەوە. لە راستیدا ئەوە مێشێکە و هەڵۆیەکی راو کردووە، ئەمن تەپوتۆزەکەیم دیت. ئەگەر هەڵۆ بکەوێتە چنگ مێش، چیی پێ دەکرێ... پێی دەڵێم... لە پێشدا... ئاخ بێ دایك و بابی... یانی وات لێ هاتووە لە زیندانێ خۆت لێ بووەتە کوێرئۆغڵی؟ ئاخ گەمژە. ئەتۆ خۆتت... هەی گلاوی چەپەڵ... هەی نەگبەت ئاخ... کە قۆرت بۆغا، ئەوەی ئەو هەمووە بەخۆی دەنازی تێداچوو، جا لێت روون دەبێتەوە. سەگ بە بەر سێبەری دیوارێدا دەرِۆیشت و پێی وابوو سێبەری خۆیەتی...

ئەو شەوە هەتا بەیانی خەو لە چاوی میوان نەبوو و بۆ ئەوەی جارِچییەکە سووك بکات و وەك هەوەڵێی لێ بکاتەوە، گەلێ تەگبیر و رای کرد و رێ و نیشانی کێشا.

## ٦٨

ماهیر بەگ هەموو خزم و کەس و کارەکەی خۆی بانگ کردبوو و لە ماڵەکەی خۆی کۆی کردبوونەوە. دڵنیایی لەو بڕیارەی دابووی، لە دەموچاویدا شەپۆلی دەدا. ئەوی لەوێ بوو، بە هەڵسوکەوت و رەفتارەکانی دڵخۆش بوون و بێ ئۆقرەی ئەوە بوون زوو بێت و پریاسکەی دڵی بکاتەوە.

دوای نانخواردن و قاوەخواردنەوە، هەر کەسە و باسی شتێکی کرد، بەڵام لە راستیدا هەر هەمووان چاوەڕوانی بیستنی خەبەرێکی خۆش بوون و هیچ کەیفیان بەو قسە و باسانە نەدەهات.

ماهیر بە روخسارێکی گەشەوە دەنگی لێ هەڵێنا:"دەروێش بەگ راستی دەکرد و ئێمە نەماندەزانی. ئەمن لە چەند مانگ لەمەوبەرەوە دەرگام لەسەر خۆم پێوەدا و دەستم کرد بە کتێب خوێندنەوە. کتێبە ئینگلیز و فەرەنسی و ئەڵمانییە زل زل و ئەستوورەکانم پەڕ بە پەڕ خوێندنەوە و سەنگ و سووژنم دان و ئاخرییەکەی بۆم روون بۆوە کە دەروێش بەگ راستی دەکرد. میللەتێکی بێ رەگ و ریشە و بێ دابونەریت قەت نابێتە هیچ. خۆ ئەگەر نەشتوێتەوە، وەك ئێمە دەبێتە دیلی چنگی دواکەوتوویی و هەژاری و نەزانینەوە. چما ئەوەش پێی دەگوترێ ژیان؟ ئاخۆ ئێوە ئەنەدۆڵتان دیتووە؟ خانووی لێیە لە بن عەرزیدا. خانووی چیی؟ ئەشکەوت و کاژێر و کونەگورگ... کە دەگەیتە بەر ئاواییەکەش هەر نایانبینی. رێگاکان بە سەربانەکاندان. زەوییان کۆڵیوە و خۆیان تێ خزاندووە. دە ملوێن گوندی لەو کاژێرانەدا، دەژین. لەگەڵ ئاژەڵەکانیان و زۆربەی جارانیش هەر لە تەویلە و گەورەکەی ئەواندا دەنوون و لەگەڵیاندا دەژین. ژنانی چی، وەك کرم بەسەریەکدا کەوتوون. هەموو ژنەکانیان پێخاوس و منداڵەکانیان قوون رووتن. پیاوەکانیشیان شڕ و شپرێو. خواردنیان دۆی ترش و گیای خۆڕسکە. لە نۆبەتێ و ئازارەباریکە و هەموو جۆرە نەخۆشییەکدا دەناڵێنن و پۆل پۆل مەرگ و شەوە دەیانباتەوە.

چوکووراوا خۆ لەبەر چاوتانە. ئەو شوێنەی بەپیتترین زەوی و زاری دنیای لێیە. ئەمن خۆم پیاوێکی گەڕیدەم، بەڵام لە هیچ کوێی ئەو دنیایە جێیەکم نەدیتووە هێندەی ئەو شوێنە بەپیت و بە رێژەو بێ. بنیادەم لەسەر عەرد و زەوییەکی ئاوا چۆن دەبێ برسی بێت و بە نۆبەتێ بمرێ؟ ئەوە جەنایەتە. خۆتان لە من باشتر دەزانن، کە خواردنی زۆرینەی خەڵکی لێرە گژ و گیای دەشتێیە و نەخۆشی و چەپەڵی وەك داسێکی هەسان لێدراو منداڵ و گەنج و پیر دەدروێتەوە. ئەگەر خەڵکی وڵاتێك لەم سەردەمەی ئێمەدا ئاوا نیوەڕووت، یان نیوە برسی وەك بنیادەمەکانی سەردەمی ئەشکەوت نشینی بژین، دەبێ بڵێی ئەو مەملەکەتە تێداچووە و فەوتاوە و خەڵکەکەشی مردووە."

هەڵچوبوو و چاوە تەڕبووەکانی دەبریسکانەوە. بە دەنگێکی کە بڵێی و نەڵێی دەلەرزی، ئاوا لەسەر قسەکانی رۆیشت:"زۆر باشە، لە حاڵێکدا لە هەموو دنیادا خەڵك ژیانێکی مرۆییانەیان هەیە و دەچنە سەر مانگ و لە ئاسماناندا دەچنە راوی ئەستێران، باشە بۆچی دەبێ ئێمە وا چارەڕەش بین؟ دەزانن بۆ؟ هەر لەبەر وەڵامی ئەو پرسیارە بوو کە ئەمن چەندین مانگان دەرگام لەسەر خۆم داخست و کەوتمە پشکنینی کتێبان. ئاخرییەکەشی بەوە گەیشتم کە تاوانی ئەو هەژارییە تاقەتبڕە، ئەو برسێتییە گیان ئەستێنە و ئەو دواکەوتنە پشووبڕە و ئەو نەزانینە رەشە، هەر هەمووی لە ئەستۆی خۆمانە. هەرچی هەیە بە دەستی خۆمان لە خۆمانمان کردووە... ئێمە هەموو کوێر و کەڕ و لاڵ بووینە. بەڵام کەسانی وەك دەروێش بەگەکان بە چاوی کراوەوە لە دنیایان روانیوە و زۆر زیرەکانە پەنجەیان لەسەر ئازار و برین و ژانەکان داناوە."

ئەوجار تۆزێك دەنگیشی هەڵێنا:"هۆکارە سەرەکییەکەی دواکەوتوویيمان، نکۆڵی و حاشاکردنە لە نەریتەکانمان و لە باب و باپیرانمان و نکۆڵیکردنە لە ئۆغوزی مەزن. بەڵێ، حاشاکردن لەو باب و باپیرانەی کە بە سەر پشتی ئەسپەوە هەموو ئەوروپا و ئاسیا و ئەفریقایان گرت. نکۆڵیکردن لە خوێنی رەسەنی تورکان، حاشاکردن لە خوێنێکە کە لە هەموو خوێنێك رەسەنتر و بەرزترە. ئەمن ئێستا بە پشتبەستن بە بەڵگەی مێژوویی حاشاهەڵنەگر، بۆتان دەسەلمێنم، کە بۆچی وەدوا کەوتووین. خوێنی تورك بە دەماری هەر هەموو سەرۆکە مەزنەکانی مێژووی شەش سەد ساڵەی عوسمانییەکاندا گەڕاوە. پادشا عوسمانییەکانیش هەرگیز زەماوەندێکیان لەگەڵ کچە تورکان نەکردووە. لە خوێنی ئەوانیشدا پتر لە یەك لەسەدی خوێنی تورکان هەر مابۆوە. دەمەوێ بڵێم هۆکاری سەرەکیی هەموو چارەڕەشی و داماوییەکانمان ئەوەیە، کە بە درێژایی سەدەکان دوژمنەکانمان دامودەزگا و ئیدارەکانمانیان بەڕێوە بردووە.

ئەوان بۆ لەناوبردنی ئەو مەملەکەتە لە پێشدا دابونەریتەکانیان خستە بەر هێرش و پەلاماری خەیانەتکارانەی خۆیان و ئەوجار قۆڵیان هەڵماڵی بۆ لە ناوبردنی زمانەکەی. لە دەربار، نەك بە زمانی تورکی، بەڵکو بەو زمانە عوسمانلییەی وەك چێشتی مجێور وابوو و لە تورکی و فارسی و عەرەبی پێك هاتبوو، قسەیان دەکرد. بەڵام ئاواش هەر نەیانتوانی میللەتەکەمان لەناو بەرن.... هاتن نەخشەیەکی دیکەیان بۆ فەوتاندنی ئەنەدۆل، ئەو وڵاتەی تورکە رەسەنەکان دارِشت. هاتن و پیلانێکی سامناك و مەترسیداری دیکەیان بۆ گەنجەکانی ئەو سەرزەمینەی ئەنەدۆل، ئەو وڵاتی پاڵەوان و جوامێر و شێرەکورِانە، بۆ ئەو زێدی تورکە رەسەنانە دارِشت. گەنجەکان، تورکە رەسەنەکانی ئەنەدۆلیان وەك سەرباز لێرەوە ناردە قەفقاز و ڤیەننا و ئەلجەزایر و بیابانی یەمەن. یانی بەڵێ، ئیمپراتۆریایەکی گەورە و هەراومان بنیات ناوە، بەڵام ئەنەدۆلیش یەکسەرە توایەوە و هەڵچۆرِا. ناتوانم بڵێم لەناو چوو، چونکە لەوەش خراپتری بەسەر هات."

"بەڵام ئێستا ئیتر رزگاری و رابوونی ئەو مەملەکەتە دەستی پێ کردووە. ئەنەدۆل وەك پردێك وایە. نەژاد و جسناتی جۆراوجۆر هاتوون و بێرەدا تێپەرِیون. هەر بۆیە ئێمە نەمانتوانیوە رەسەنایەتییەکەمان و خوێنە رەسەنەکەمان بپارێزین لەوەی خوێنی دیکەی تێکەڵ بێت و بێخەوش بمێنێتەوە. ئێستا زۆر دەگمەن ماون ئەو کەسانەی خوێنی پاك و خوێنی ئۆغوزی رەسەنیان لە دەماردا مابێتەوە. پادشاکانی عوسمانلی و سەرۆکوەزیر و وەزیرەکان و ئەمیرەکانیان، کە خوێنەکەیان تێکەڵاو بوو، ئەنەدۆلیان تووشی ئەو رۆژە رەشە کرد. بەڵێ، لەمرِۆوەیە رزگاریمان دەست پێ دەکات. لە پێشدا دابونەریتەکانمان زیندوو دەکەینەوە و توند دەیانپارێزین و ئەوجار ئەوانەی کە لە حەوت پشتەوە هەر وا بە رەسەنایەتی ماونەتەوە و خوێنیان پیس نەبووە، دەیاندۆزینەوە و دایاندەمەزرێنین. هەر بەو جۆرە لە کۆت و بەندی دواکەوتوویی رزگار دەبین و پێ دەنێینە شارێگای پێشکەوتن و سەرکەوتنەوە. ئەمن دوای چەند مانگ لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون، ئینجا لەگەڵ هاتمە سەر بیر و بۆچوونەکەی دەروێش بەگ. ئەو پیاوێکی مەزن و ژیر و نەجیم و رەسەنە. ئەوی دەڵێن، رەسەن لە بنێرِا بەهەڵە ناچێ، بنەمایەکی زێرِینە و بە پاڵوێنەی سەدەکاندا تێپەرِیوە. منیش وا لێرە لە هەنتەشی ئێوەی خۆشەویستدا پێی لێ دەنێم و بە دەنگێکی بەرز رایدەگەیەنم، کەرێتیم کردووە کە ئەوەندە مانگە ملم بۆ نەریتەکانی ئۆغوز رانەکێشاوە و ئەو پەرِی گەمژەیی بووە... لەوانەیە بڵێن لەو ئەنەدۆلەدا پتر لە هەزار کەس نادۆزیتەوە لە رەچەڵەکی ئۆغوز و خوێنەکەی پاك بێت.

هاوەدەنگ و هاوڕا لەگەڵ قسەی یەکێ لە نووسەرە ناودارەکانمان، ئێمەش بۆ بەڕێوەبردنی ئەو وڵاتە، دەچین یەکێك لە رەچەڵەکی باپیرە قەرقیزەکانمان دێنین کە لە دەشتەکانی ئاسیای ناوەڕاستدا دەژین و خوێنیان بەخوێنی هیچ کەس پیس نەبووە. ئەوانەی کە ئێستاشی لەگەڵدا بێ وەك باب و باپیرەکانی خۆمان لە سەر پشتی ئەسپ دەژین و خێوەتەکانیان لە کۆشك دەچێت. دوای بانگێشتی ئەوان، دوای داوەکردنی ئەو برا رەسەنانەمان کە لە کۆت و زنجیری یەخسیریدا دەناڵێنن، بۆ ئەنەدۆل و دوای پابەندبوونمان بە خوێن و رەسەنایەتی و دابونەریتەکانمانەوەیە کە ئینسانیەتمان لەو سووکایەتی و دیل و کۆیلەتی و هەژارییە رزگار دەبێت. لەوەیکە دەروێش بەگی ماقووڵ زادە یارمەتیی داوم ئەو راستییەم بۆ روون بێتەوە و چاوم بکرێتەوە، منەتباری کردووم و لە ناخی دڵمەوە سوپاسی دەکەم."

ماندوو ببوو. داوای لە ژنەکەی کرد ئاوی بۆ بێنێ. کلفەتەکە رای کرد و پەرداخێ ئاوی هێنا. ئەوی لە هۆڵەکە بوون، زانیبوویان بۆچی بانگی کردوون. ئیتر پێویست نەبوو لەوە پتر درێژدادڕیی بکات.

ماهیر بەگ دوای خواردنەوەی ئاوەکە و تەڕکردنەوەی گەرووی و ماندووحەسانەوەیەك، دیسان دەستی پێ کردەوە:"ئێمە دابونەریتی باب و باپیرەکانی خۆمانمان بزر کرد، هەر بۆیە چاومان بە رزگاری ناکەوێ."

ئەوجار هێور ببۆوە. دەنگیشی تۆکمەتر و گران و سەنگینتر دەهاتە دەرێ. ماهیر بەگ دەیزانی ئەگەر لە پێشدا خۆت بڕوا بەو شتە نەکەیت، هەرچیی بیلێی و هەرچۆنێکی دەریببڕیت، ناتوانی کەس قایل بکەیت. هەر بۆیە هەوڵی دا ئەوەندەی پێی دەکرێ وا قسە بکات خۆیشی بڕوا بەو قسە پڕ و پووچانەی رەسەنایەتی و خوێنی پاك و بێ خەوشەی بکات.

"ئێمە بۆچی وا لە ئەورووپا دوا کەوتووین؟ چونکە نەریتەکانمان، رەچەڵەکی رەسەنی باپیرە ئۆغوزمان لەبیر کردو لە رەگ و تۆرەمەی خۆمان دوور کەوتینەوە. ئێوە سەیرێکی بەریتانیا بکەن. ئەو وڵاتە بچووکە چۆن توانیی دنیا بگرێت و ئیپمراتۆریایەك وەسەر یەك بنێ کە خۆر تێیدا ئاوا نەبێ؟ هیتلەری خودا لێخۆشبووش بە خۆی چەند سەربازێکەوە ئەو دنیا پان و بەرینەی چۆن گرت؟ رێك وەکوو تەیموورە شەلەی باپیرەمان. هیچ لەخۆتان پرسیوە ئاخۆ هیتلەر شەش ملیۆن جوولەکەی بۆچی کوشت؟ بۆچی سووتاندنی و کردنی بە کۆڵوو؟ ئاخۆ هەر بۆ رابواردن؟ نەءءءە... بۆ ئەوەی خوێنە رەسەنەکەی ئەلمانیا پاکژ و بێ خەوش بکاتەوە.

بەریتانیاش هێندەی سەرە دەرزییەك چییە لە دابونەریتەکانی خۆی لای نەدا هەر بۆیەشە ئیمپراتۆرییە مەزنەکەی هەر وا لەسەر پێیە."

بە کۆخەیەکی کز، سینگی خاوێن کردەوە و لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:

"بەڵام مخابن خەڵکەکەی ئێمە، ئەو خەڵکە قوون رووت و هیچ و پووچەی ئێمە، نەریتە دەوڵەمەندەکەی ئۆغوزەکەی خۆمانی وەلا ناوە و لە رەچەڵەك و رەسەنایەتیی خۆی دوور کەوتووەتەوە. جگە لەوەش کە هەر ناشزانی نەریتە مەزنەکانمان چین، بە داخەوە گاڵتە بەوانەش دەکەن، کە بەشێکن لە پیرۆزایەتییەکانمان. گرێکوێرەکە لێرەوەیە، بەڵام دەبێ ئەو گرێکوێرەیە بکەینەوە. لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجدا، ئەویش ئامانجێکی پیرۆز، نابێ گوێ بدەینە کێشە و گێر و گرفت و کوێرەوەرییەکان. لێرەدا بەرژەوەندیی نەتەوەیەك لەگۆڕێیە. ئەوی حەزی لە تاوس بێ، دەبێ ئازار و زەحمەتی ڕێی هیندستانیش بکێشێت و وەك دەڵێن (ئەوی ماسی بگرێت دەبی قوونیشی تەڕ بێت). ئەمن بڕیاری خۆمم داوە بە پێی نەریتی ئۆغوزی لەگەڵ دەروێش بەگ ئاشت ببمەوە. ئەگەرچی دەزانم ئەو خەڵکە هیچ و پووچ و نەدی و بدی و برسی و رەشوڕووت و نەفامە هەزار ناووناتۆرەم لێ هەڵدەدەن، بەڵام ئەمن گوێم لێ نییە و بەپێی نەریتەکە ئاشت دەبمەوە. ئەمن دارێك نیم بەو بایانە بلەرزێم. لە مێژە خۆم لەگەڵ ئەو تانە و تەشەرە نەزانینانەیە یەکلا کردووەتەوە. ئەو بەرڵلایانە ئەگەر پیاو بوایەن، مشوورێکیان لەخۆیان دەخوارد و ئاوا رووت و قووت، وەك جڕ وجانەوەر و کرم و مێروو لە کەپرەکانیاندا بەسەر یەکدا نەدەکەوتن. جا کێ ئەوانە بە پیاو دەزانێ؟ دەروێش بەگەکان و کەسانی رەسەن و تێگەیشتووی وەك ئەو، نەریتەکان لەسەر چاو و سەری خۆیان دادەنێن و بە هەر نرخێك بووە، تەنانەت بە نرخی گیانیش بووبێ، دەیانپارێزن. بەڵام پۆلە بەرڵلایەکی هیچ و پووچ، دێن و گاڵتە بە مەزنە پیاوی ئاوا دەکەن. خۆم دەزانم سبەی ڕۆژێ ئەمنیش کە دەمەوێ بەپێی نەریتی ئۆغوز لەگەڵ دەروێش بەگ ئاشت ببمەوە، گاڵتەم پێ دەکەن، لێیان گەڕێ هەر گوویەکی دەیخۆن با بیخۆن. کاروان دەڕوا و سەگ دەوەڕێ. ئەوان پێدەکەنن، بەڵام بەوێی دایکیان پێ دەکەنن. ئەوان گاڵتە دەکەن، بەڵام پیاوی رەسەنی وەك دەروێش بەگ ڕێزم دەگرێت و باوەشم بۆ دەکاتەوە..."

دەنگی هەڵێنا و بە نەڕەنەڕ لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:"لە پێناوی سەرکەوتن و پێشکەوتنی ئەم وڵاتەدا، بۆ ئەوەی نەتەوەکەمان زووتر بگاتە کاروانی پێشکەوتن و تەنانەت بکەوێتە پێش بەریتانیاش و دیسان بتوانێت ئیمپراتۆری پێك بێنێتەوە، بۆ گەیشتن بۆ ئارەزووی لەو جۆرە، پێویستە هەر هەمووومان شێلگیرانە بگەڕێینەوە بۆ نەریتەکانمان. دیسان دووپاتەی دەکەمەوە

کە دەروێش بەگ ڕاست دەکات. بنیادەمێك، کابرایەك کە ئۆغوز بێ، تورك بێ، ئەگەر بیەوێ ئاشتەوایی بکات، دیارە دەبێت بە پێی بنەماکانی نەریتی ئۆغوزی ئاشت بێتەوە. من لە ناخی دڵمەوە سوپاسی دەروێش بەگ دەکەم، کە ئەوەندە پێی لەسەر نەریتی ئۆغوز داگرتەوە بۆ ئاشتبوونەوەمان. دان بەوەشدا دەنێم، کە ئەمن بە ڕاستی لەو شتە تێنەگەیشتبووم بۆیە ملم نەدەدا و با بێ پێچ و پەنا ئەوەش بڵێم ئەمن کەرێتیم دەکرد. هەموو قسەکانم، جگە لەو دوو سێ ڕستەیەی کۆتایی دەبێ بۆ گوندییەکان باس بکرێت و بۆیان بگێڕنەوە. میللەتێك بەبێ نەریت ناتوانێ بژییێت. ئەوانەی دەبنە پێشەنگی پاراستن و زیندووڕاگرتنی نەریتەکان، دەبێ ناویان بنێین گیانلەسەردەستە مەزنەکان و نیشتمانپەروەرە گیانبەختکردووەکان."

ئەوەی لەوێ بوون، جوان و زەریف بۆیان ڕوون ببۆوە کە دەرەنجامەکەی چ دەبێ.

"ئێمە لەو شارۆچکەیەدا خزم و کەسمان زۆرن. گەنجی پان تورانیستی نەتەوەپەرست لەو شارۆچکەیەدا هەن، کە دەبێ ئەوانیش ئاگادار بکرێنەوە. بەشی زۆری ئەو گەنجانە گیرفان بەتاڵن و دەبێ پارەیان بدرێتێ. دەبێ وا ڕێك بخرێ، کە ئەو گەنجە بەتوانایانە بە یارمەتیی ئێمە گۆڤارێك دەربکەن. جواب لە دەروێش بەگیش دەگێڕمەوە، کە لەو کارە خێرەدا یارمەتیدەرمان بێت."

ئەو کۆبوونەوەیە کە وەك کۆنفرانسێکی ڕەگەزپەرستانە و پەسن و پێداهەڵگوتنی توورانییەکان و خۆشویستنی نەریتەکان وابوو و بانگەشەی ئەو بنەمایەشی دەکرد کە میللەتێك تەنیا لە سێبەری خوێنە ڕەسەنەکەیدا پێشدەکەوێت، لە نیوەی شەوێدا کۆتایی هات.

لە قاوەخانەکان و گوند و بازاڕ باس باسی قسەکانی ماهیر بەگ بوو. گەنجە دڵگەرمەکان شێعری وایان بە وڵاتی تووران و ڕەگەز و نەژاد و ڕەچەڵەك و خوێنی خۆیان هەڵدەگوت، بۆنی خوێن و بارووتی لێوە دەهات. دەتگوت گەلەکۆمەگیی لێ کراوە. گەلەکۆمەگییەك کە... دەبوو خوێن لە دەمی شمشێر بتکێ. دەبێ خوێن بێ و سەران بەرێ. دەبێ وەك باب و باپیرە ئازاکانمان سەدان هەزار سەلکە بنیادەم بە زەبری شیرێك بپەڕێنین. دەبێ بە ئەسپ، پەلاماری چەقی ئاسیای ناوەندی بدەین و ئەوەندەیان لێ بکوژین هەرد و بوو هەڵی نەگرێ. باسی ئاشتبوونەوە و پێکهاتن و دژی شەڕ، خەیانەتێك بوو بۆ لێخۆشبوونێ نەدەبوو.

یەکەم قوربانیی ئەو کەشە ڕەگەزپەرستانەیە، عەلی فەندیی عەریزەنووس بوو. دەیانگوت لە جێیەك گوتوویەتی:"پەنا بەر خودای، شەڕ لە ئەنەدۆڵدا بابی میللەتی گا. ئەو برسێتی و هەژارییە، بەرهەمی زوڵم و زۆری ئاغاکان و چەوساندنەوەی خەڵکەکەیە. هەر ئەو ئاغایانەی

کە کە ئێوە تیژ دەکەن و هانتان دەدەن. دەست لەو کارانە هەڵگرن. مەبنە گۆپاڵی دەستی ئاغاکان. خۆ پشیلە بۆ رەزامەندیی خودا مشك ناگرێ."

کوڕە هەی خەیانەتکاری نیشتمانفرۆش، هەی بێ شەرەف، ئەتۆ بە رەتکردنەوەی شەڕ نکۆڵی لە شانازییەکانی ئەو نەتەوەیە دەکەی. گیانی جوامێری و ئازایەتیی ئەو میللەتە دەکوژی. چما ئەتۆ هەر ئەو نیشتمانفرۆشە نیی، کە هەموو رۆژێ دەچیتە سەر گردەکەی سۆلمیش و بە بێتەلەکەت راپۆرت و زانیاری دەدەیتە رووسەکان؟ هەر راپۆرتێك بەس بوو بۆ ئەوەی ئەو دادوەرە گشتییەی دەمێك بوو ئەم کۆمۆنیستە خاوەنپێشینە و لایەنگرەی دابەشکردنی زەوی و زارەی خستبووە ژێر چاوەدێرییەوە، فەرمان بدات بیگرن. ماڵەکەی عەلی فەندیی عەریزە نووسیان پشکنی. دادوەرەکە، کە بێتەلی نەدۆزیبۆوە بۆیە تووڕە ببوو، زۆر بەڵگەی کۆ کردەوە بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ ئەو کۆمۆنیستە. بەڵگەکان بریتی بوون لە کتێبی "شەڕ و ئاشتیی تۆلستۆی، برایانی کارامازۆف و تاوان سزای دۆستۆڤسکی. بەرهەمی نووسەرانی رووس... چما بەڵگەی لەوە باشتر هەیە بۆ سەلماندنی کۆمۆنیستبوونی کەسێك؟ یەکێکی دیکە لە هۆکارە بەهێزەکان و بەڵگەپتەوەکان کتێبی (دەوڵەت)ـەکەی ئەفلاتوون بوو. دادوەری بە مرازی دڵی خۆی گەیشتبوو. ئەو دژە شەڕە، لایەنگری ریفۆرم و نیشتیمانفرۆشەی وا کەوتبووە بەر دەست کە مەحاڵ بوو رزگاری بێ. چما خزمەتی لەوە گەورەتر هەبوو بە نیشتمانەکەی بکات؟ دادوەرە گەنجەکە، لەوەیکە وەها دەرفەتێکی زێڕینی بۆ هەڵکەوتبوو، بە تڕ گۆزەڵەی دەشکاند و وەك فەرماندەیەکی لەخۆبایی کە لە مەیدانی شەڕ سەرکەوتبێ، بە بازاڕیدا دەگەڕا و تووشی هەر کەس دەبوو، باسی ئەو بەڵگە پڕ لە نهێنییانە و بەرهەمە رووسییانەی دەکرد کە لە ماڵی ئەو نیشتیمانفرۆشەدا دۆزرابوونەوە. بیانوویەکی دیکەشی دەست کەوتبوو، کە بەشێك بوو لە نهێنییە حکوومییەکان. ئەو نهێنییەی تەنیا دەکرا بە مەحرەمەکانی بڵێ. بەڵێ لە ماڵەکەی عەلی فەندیی عەریزەنووسدا شێعری بڵاونەکراوەی دادال ئۆغلی دۆزرابۆوە (کە شاعیرێکی میلیی کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەم بوو و بە چوکووراوا و ئەنەدۆڵدا دەگەڕا و باسی خۆڕاگری و بەربەرەکانێی تۆرکمانەکانی دەکرد لە بەرامبەر نیشتەجێکردنیاندا). ئەو کە بە هۆی ئەرك و کارەکانییەوە، شارەزای هەموو کەلێن و قوژبنەکانی ژیانی عەلی فەندی ببوو، دەیزانی کە عەلی فەنی سالآنی ساڵ بە گوندەکاندا گەڕابوو و شیعری ئەو شاعیرانەی کۆ کردبۆوە. بۆچی؟ هەهە... چما دادوەر دەست هەڵدەگرێ؟ ئەو کابرایە شیعرەکانی دادال ئۆغلی و پیر سوڵتان عەودالی بۆچی کۆ دەکردەوە؟ بۆچیی بوون؟

ئەو کابرایە لەبەر چی ئەوەندە ساڵە بە پێیان لە گوندێکەوە چووەتە گوندێکی دیکە و ئەوەندە گیانفیدا بووە؟ باشە بۆ؟ ئەو کارە لەخۆڕاییەوە نییە. بۆ برادەرەکانی لە ئەستەنبۆڵ و بۆ مامۆستای ئەدەبیاتەکەی نووسی و تکای لێ کردن، لەسەر ئەو دوو شاعیرە کۆمەڵێك زانیاریی بداتێ. دادال ئۆغلی کابرایەك بوو کەوتبووە گەڵ کۆزان ئۆغلی و دژی پادشا ڕاپەڕیبوو. پیر سوڵتانیش لەبەر ئەوەی چل هەزار کەسی بە شیعرێکی هان دابوو و ڕاپیەڕاندبوون، بە فەرمانی پادشا لە دار درا. ئێستا ئیتر دادوەری بەڕێز، بە پشتبەستن بەو بەڵگە پتەوانەی بەدەستییەوە بوون، دەیتوانی ئەو نیشتمانفرۆشە دەسبەسەر بکات و میللەتی تورك لە شەڕی ئەو خەیانەتکارە بێ نیشتیمانە لاڕێ و زمان ژەهراوییە رزگار بکات. حەوتووەك دواتر لیژنەیەك، کە ماهیر قاباقچی ئۆغلی سەرۆکی بوو، پێك هات بۆ ئەوەی حوکمی ئەو دژەبەری شەڕ و سەروەت و سامان و لایەنگرەی ریفۆرمی زەوی و زار و نیشتمانفرۆشە بدەن.

هەواڵیان بە هەموو لایەك دابوو کە ڕۆژی هەینی بە مەبەستی مەحکوومکردنی نیشتمانفرۆش و سیخوڕی رووس، عەلی عەریزە نووس، کۆبوونەوەیەك پێك دێ. ماهیر بەگ لەو نێوەدا دەیەویست وای ڕێك بخات کە عەریزەنووسەکە تێدابچێت. چونکە ئەگەر عەلی تەمبێ کرابایە، لانیکەم بۆ ماوەی ساڵێك دەبووە بنێشتەخۆشکەی سەر زاری خەڵکەکە. دادوەریش قایل ببوو. دەبوو ژیانی نیشتمانفرۆشێك کۆتایی بێت. بەڵام مودیر ناحیە و قایمەقام و سەرۆکی پۆلیس قایل نەدەبوون. دادوەری و ماهیر بەگ زۆریان گوێ نەدەدایە ناڕەزامەندییەکەی قایمەقام و مودیرناحیە و سەرۆکی پۆلیس و دەیانویست خەڵکەکە بەرەو بەندیخانەکە ڕاکێشن و عەلی فەندی بە دەستی ئەوان لە زیندانەکەدا بفەوتێنن. هەموو هەوڵ و بانگەشەکانیشیان هەر لەو پێناوەدا بوو. شارۆچکە ڕۆژانی هەینی زۆر لە ڕۆژەکانی دیکە قەرەباڵغتر دەبوو. جگە لەوانەی لە گوندەکانی دەوروبەرەوە بۆ نوێژی جومعە دەهاتنە شاری، ژمارەیەکیش خەڵکیان بە بانگەشە و هەرا و هۆریا و سەیارەوە دێنایە شاری و شارەکە وای لێ دەهات دەرزیت هەڵاویشتبایە وەعەرزی نەدەکەوت.

بەڵام بەر لە ڕۆژی هەینی، ڕووداوێك هەموو ریسەکانی لێ کردنەوە خوری. عەلی فەندی بە فەرمانێکی نووسراو کە لە ئەنکەرەوە هاتبوو، سەرەڕای ناڕەزایەتیی دادوەر لە ڕۆژی چوارشەممەدا ڕاگوێزرا بۆ بەندیخانەی پارێزگا.

ڕۆژی کۆبوونەوەکە گەیشت. ماهیر بەگ چووە پشت مینبەری وتاردان. لە حاڵێکدا دەگریا، وتارێکی نیشتیمانپەروەرانە و پڕ کەفوکوڵی پێشکەش کرد. باسی نەریتەکان و خوێنی پاك و

بێخەوش و باسی هۆکارەکانی دواکەوتووییمان و برسێتی و هەژارییەکەمانی کرد. باسی ئیمپراتۆریای بەریتانیا و سەرکەوتن و دەستکەوتەکانی و باپیرە ئۆغوزمانی کرد. تورکمانەکان شەڕکەر بوون. تورکەکان پێیان شەرم بوو لە نوێندا بمرن و وایان بە باش دەزانی لە مەیدانی شەڕێ بمرن و لە خوێنی خۆیاندا بگەوزێن و زەوی بە خوێنی خۆیان سوور بکەن. تەنیا نیشتیمانفرۆشەکان، ئەوانەی قۆڵیان بۆ کوشتنی پیاوەتی و جوامێریی ئەو مەملەکەتە هەڵماڵیوە، دژی شەڕکردنن و دیارە ئەوانە بە سزای خۆیان دەگەن. تورکەکان لە سەر پشتی ئەسپ لەدایك دەبوون و لە مەیدانی شەڕێ گیانیان دەدا و...

"ئەمن گیانفیدایەکی نەریتەکانم. بەو زووانە بۆتان دەردەکەوێت کە لە پێناوی نەریتە مەزنەکەماندا چ دەکەم. ئەگەر لە پێناوی زیندووکردنەوەی نەریتێکدا لە گیانی خۆم نەبوورم، یاخوا مەرگی عەولادەکانم ببینم."

ئەوجار دەنگی بەرزتر کرد:"لەسەر مەیتی هەر پێنج منداڵەکانم دانیشم."

جەماوەرەکە شێتانە و وێکڕا چەپڵەیەکیان بۆ ئەو گیانفیدای نەریتە لێدا.

"بەڵێ، بەڵێ، ئەو سەگە مل بە پەتانە، ئەو دوژمنە شەڕانە، ئەو دوژمنە نیشتمانفرۆشانە و ئەو دوژمنانەی پیاوەتی و جوامێرییانەی نیشتیمان، گاڵتە بە من و بە فیداکارییەکانم دەکەن و فشەیان بەوە دێ ڕێز لە نەریتەکان دەگرم... بەڵام وا باشترە جوان و زەریف تێ بگەن کە گاڵتەکردن بە من یەکێکە لە نیشانە حاشاهەڵنەگرەکانی نیشتیمانفرۆشی."

هەر قسەی کرد و کردی. ئەوەندەی لێ ڕست هەتا دەنگی نووسا. وا گەرم داهاتبوو، ڕەش هەڵگەڕابوو. هەمووان لەوە دەترسان، جەڵتە لێی بدات. بەو دروشمانە کۆتایی بە قسەکانی هێنا:"بەرەو پێشەوە بۆ ڕزگارکردنی قرقیزە هاوڕەگەزەکانمان. بەرەو پێشەوە بەرەو هەڵخستنی داری سێدارە، بەرەو مەیدانەکانی شانازی خولقاندنی شەڕ."

خەڵکە ورووژاوەکە، بێ خەبەر لەوەی ڕۆژی چوارشەممە عەلی ئەفەنی بۆ زیندانی پارێزگا ڕاگوێزراوە، لەبری ڕۆیشتن بەرەو مەیدانی شەڕ، هرووژمیان کردە سەر زیندان و دەرگای بەندیخانەکەیان شکاند، بەڵام کە چوونە نێو بەندیخانەکەوە، سەیر دەکەن عەلی لەوێ نییە.

یەکێك بە سرتە لە بن گوێی خەڵکەکەی خوێند کە بەڵێ، ئەوە مودیر ناحییە ڕێی بۆ کردووەتەوە ڕا بکات و ئەو گەنجەی سێ ساڵ بوو لە تاقیکارییەکانی کۆتایی دواناوەندی دەرنەدەچوو و بە خوێنی سەری ڕاگری قوتابخانەکەیان تینوو بوو، دەنگی هەڵێنا:"ڕاگری

قوتابخانەکەمان وەك عەلی فەندی تاوانبارە. ئەویش سرت و خورتێکی لەگەڵ رووسییەکان هەیە. هەمووان باش ئاگادارن. ئێستاش ئەوە لە قوتابخانە لەگەڵ مودیرناحیە دانیشتووە."

جەمارەکە، جەماوەرە رەش و رووت و برسییەکە روویان کردە قوتابخانە.

راگری قوتابخانە و مودیرناحییەیان لە پلیکانەکانەوە خلۆر کردەوە و پێستی سەریان هەڵقەندن و مارکوژیان کردن. خۆ ئەگەر سەرۆکی پۆلیس لەو کاتەدا بەخۆی و بیست پۆلیسی چەکدارەوە نەگەیشتبایە و پەیتا پەیتا تەقەیان نەکردبایە، مودیرناحییە و راگری قوتابخانەکە فەوتابوون و تێداچوبوون.

مودیرناحییە کە تووکی بەسەرییەوە نەمابوو و چەند جێیەکیشی بریندار ببوو، لە سەر لێواری مەرگ گەڕایەوە، بەڵام راگری قوتابخانەکە چەند مانگێك هەر لە جێ کەوت. دواییش لە نەخۆشخانەوە نێردرایە ئەو بەندیخانەیەی عەلی ئەفەنیی تێدا بوو. عەلی ئەفەنی دوای مانگێك بێ تاوان ناسرا و بەر درا. راگری قوتابخانەکەش دوا ساڵێك، بێ تاوان ناسرا.

کورتی ببڕینەوە لە ماوەی چەند مانگدا شارۆچکەکە وا گەڕابۆوە بۆ نەریتەکان کە شەو و رۆژ باس باسی باپیرە ئۆغوز و خوێنی رەسەن و شەڕ و نەریت بوو. گۆڤاری قانداش، کە گەنجە پان تورکیستەکان دەریان دەکرد، بە هەموو شارۆچکەکەدا بڵاو دەبووەوە و رووبەرگی گۆڤارەکە، گورگێکی پێوەبوو کە هەستابووە سەر پاشووان. گۆڤارەکە بۆنی خوێن و بارووتی لێوە دەهات و دوژمنێکی نەناسراوی جنێوباران دەکرد.

ماهیر بەگ ماوەیەك بوو زۆر بەخۆی رادەگەیشت و ئەو جلوبەرگانەی لەبەر دەکرد کە جاران پێی حەیف بوو لێرە لەبەریان بکات. لە دەرەوە پەیتا پەیتا ئاوڕی لەملاولای خۆی دەدایەوە و دەستی بۆ دووکاندارەکان لە سەر سینگی دادەنا و سڵاوی لێ دەکردن و تووشی هەر کەسێك دەبوو، بە گەرموگوڕییەوە ئەحواڵی دەپرسی. ئەوە گۆڕانێکی هەست پێکراو و دوور لە چاوەڕوانی بوو لەودا. پێشتر کاتێ بە بازاڕێدا تێدەپەڕی، قیت و رەپ بە رێیەدا دەڕۆیشت و خەڵکی بەهیچ نەدەگرت و ئەگەر یەکێکیش سڵاوی لێ دەکرد، خۆی لێ کەڕ دەکرد. بەڵام ئێستا دەیەویست لەگەڵ هەمووان گەرم و گوڕ بێت و خۆی لەبەر چاویان شیرین بکات. خاکەڕایانە خۆی دەنواند و دەتگوت دەیەوێ داوای لێبوردن بکات. چیی وای نەمابوو بچێت دڵی سەگە بەرەڵڵاکانیش بداتەوە.

لە هەموو جێیەك، هەر لە یانەکانەوە بگرە هەتا قاوەخانە و دووکانەکان یەك پشوو قسەی دەکرد. لە لایەکەوە خۆی قسەی دەکرد و لە لایەکی دیکەوە گەنجە پان تورکەکان و برادەرەکانی

و ئەو خەڵکە ساویلکەیەی کەوتبوونە بەر تۆفانی بانگەشە وورووژێنەرەکان، قسەیان بۆ دەکرد. بێ برانەوە قسەیان دەکرد.

"میللەتێك پشت بکاتە نەریتەکانی، میللەت نییە و ناشکرێ پێی بڵێی میللەت. ئەو میللەتە بریتییە لە کۆمەڵێك زۆڵی خوێن پیس و کۆمەڵگایەکی بێ رەچەڵەك. دەروێش بەگ ژیرترین و رەسەنترین و نیشتیمانپەروەرترین و میللەت پەرستترین پیاوی ئەو مەملەکەتەیە. دوای ئاشتبوونەوەم لەگەڵیدا، هەر کەسێك بیەوێ ئاشت بێتەوە، دەبێ بەپێی نەریتی ئۆغوز ئاشت بێتەوە و ئەو نەریتەش لەمەوپاش هەتا رۆژی بازاڕەکەی قیامەتێ هەر بەردەوام دەبێت. لەگەڵ دەروێش بەگی رەسەنزادەی پیاوماقووڵ تۆزێك نێوانمان تێك چوبوو. پێم گوت ئەی دەروێشی رەسەنزادە، ئێستا کە دەمانەوێ ئاشت بینەوە، وەرە با بە نەریتی ئۆغوز ئاشت بینەوە بۆ ئەوەی ئەو نەریتە بەرزەمان ببووژێتەوە. ئەویش پێشوازیی لە پێشنیارەکەم کرد. لەوانەیە هەندێ کەس پێ بکەنن، گرنگ نییە. ئەوان کۆمەڵێك خەڵکی نیشتیمانفرۆش و بێ رەچەڵەك و خوێن چەپەڵ و دووڕە و چەند رەگەن. چەندی نەگونجاو و تەنانەت قۆڕ و نەشیاویش بنوێنێت، گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە ئەو نەریتە کۆنەی باب و باپیرە پیرۆزەکانمان زیندوو بکەینەوە. ئەگەر زۆڵ و حەرامزادە نیت، دەبێ رێز لە نەریتی باب و باپیرەکانت بگریت. ئەمنیش لە قووڵایی دڵمەوە و بەو پەڕی شانازیمەوە ئەو نەریتەی کە یادگاری باب و باپیرانمانە، جێبەجێی دەکەم و سوپاسی دەروێش بەگی مەزن دەکەم کە ئەو جۆرە ئاشتبوونەوەیەی قەبووڵ کردووە و خۆم بە قەرزباری دەزانم. ئەمن دوو ساڵان لە بەریتانیا ژیاوم، بەریتانییەکان نەریتیان هەیە کە بە رواڵەت زۆر زۆر ماقووڵن کەچی ئەگەر لێرە بوایەن، قوون رووتێکی وەك ئێمە ئەوەندەمان گاڵتە پێ دەکرد دەبوورواینەوە. لە بەریتانییەکانم پرسی: ئەو نەریتانە چین؟ هیچ کامیان نەیانتوانی وەڵامێکم بدەنەوە قایلم بکات. لەبیریان چوبووەوە. تەنانەت پادشاکەشیان بە پەیڕەوی لەو نەریتانە وەك ژنان، تەنوورەی کورت لەپێ دەکات. لێیانم پرسی ئەوە چ جلوبەرگێکە لەبەرتانی دەکەن؟ بەریتانییەکان وەك هیچ لەو پرسیارەی من تێ نەگەیشتبن، بە واق وڕماونەوە سەیریان دەکردم و پێدەکەنین. جا تۆ وەرە و لێرە تەنوورەیەکی کورت لەپێ بکە، جا بزانە چیت لێ دەکەن؟ ئەو لات و لووتە لووتبەرزانەی ئێمە هەر بە کێوتدا دەکەن. وا نییە؟... وەك قوزی کچۆڵەیەك وەدەر کەوتبێ، لەبەر پێکەنینان دەمرن و دەبوورێنەوە."

چالاکییە بانگەشەییەکانی ماهیر بەگ و خزم و کەس و برادەرەکانی و رەگەزپەرست و ئەو پان تورکیستە چاوقایمانەی سەرنجیان بۆلای راکێشرابوو، بە پارە و بەهۆی ئەو نەریت

پەرستانەوە کە خۆبەخشانە هاتبوون، کاریگەریی خۆیان لەسەر دەوروبەر دادەنا. لە شارۆچکەکەدا کەس نەبوو خۆی بە تۆرەمەی ئۆغوز نەزانێ و بە رێزەوە باسی ئۆغوزیان دەکرد و خۆیان بەوەوە دەبەستەوە و بەو هۆیەوە بەخۆیان دەنازین. شەڕ و خوێن ڕشتن، ئیش و کاری ئۆغوز بوو. زۆر کەس وێنەکانی چەنگیز و تەیموورە شەل و ئەلب ئەرسەلانیان بەپەلەپەل پەیدا کردبوو و لە ماڵەکانیاندا لەدیواریان دابوو. ئەوانە خوایانی جەنگ بوون. لەو مەملەکەتەدا کۆنە سیاسەتمەداری وای لێ بووە کە شانازییان بەخۆیانەوە دەکرد لەوەی نەیانهێشتووە ئەو مەملەکەتە لە خوێنڕشتن و ئاگرەکەی شەڕی دووەمی جیهانیدا تێوەبگلێ و ئەو بەڵایە داوێنی بگرێتەوە. لە حاڵێکدا هەر ئەو خەیانەتکارانە بوونە هۆی مەرگی پیاوەتیی ئەو میللەتە. ئاگری خوێنی رەسەنی رەچەڵەکی شەڕخوازی ئۆغوز کە بە ئاواتەوە بوون لە مەیدانی شەڕێ و لە شەڕێکی دەستەویەخەدا بمرن، و ئەو ئاواتە لە دڵی تاك بە تاکی رۆڵەکانیدا بڵێسە دەدات، پێشانی ئەو بێ نیشتیمانانە دەدرێت و خەرمانی بوون و نەبوونیان دەکاتە خۆڵەمێش.

ئەو بانگەشەیە لە چەند مانگێکدا کاری وای کردبوو کە دەروێش بەگ بە چل ساڵان پێی نەکرابوو. ئەوە لە پەرجۆیەك دەچوو. چیی نەمابوو هەندێ لە لاوە پڕ لەکەفوکوڵەکانی شارۆچکەکە لە حەوشەی ماڵەکانیاندا خێوەتی لبادی هەڵدەن و تیر و کەوان دروست بکەنەوە و بچنەوە تۆرووس بۆ راوی پڵنگ. خوێندنەوە و چڕینی سروودی حەماسی تەواو ببووە باو. قوڕ بەسەر ئەو کەسەی باسی ئاشتی و تەبایی کردبا. عەلی ئەفەندیی عەریزەنووس لەو رۆژانەدا پەنای بردووە بەر ماڵی خزمێکیان لە یەکێك لە گوندە دوورەکان. گوندییەکان هیچ سەریان لەو هات و هۆریایە دەرنەدەچوو کە لەسەر باسی ئۆغوز و شەڕ و رەسەنایەتی وەڕێیان خستبوو. بەڵام لێرە و لەوێ وشەی خوێن و باروت و شەڕ دەبیسترا و پیرەژنەکان هەر ئەوەندەی گوێیان لە خوێن و شەڕ دەبوو، دەیانکردە شین و گریان. ئەوان کوڕ و خۆشەویست و مێرد و برایان ناردبووە شەڕەکانی پێشوو و هیچ کام لەو ئازیزانەیان نەگەڕابوونەوە. ژنە گەنجەکان و کیژۆڵەکان، بە شڵەژاوی و شێواوییەوە لەخۆیان دەپرسی، ئەرێ دیسان؟ پیاوە بەساڵاچووەکانیش تووڕە دەبوون و گەنجەکان دەترسان. ئەوان پێیان وابوو گەنجەکانی شارۆچکە بە هەڵەداوان خۆیان بۆ شەڕ و رۆیشتن بەرەو رووسیا ئامادە دەکرد. هەرچۆنێك بێت هەتا پشت کێوی قاف دەچوون و برا هاوخوێن و هاوڕەگەزەکانی خۆیانیان رزگار دەکرد.

برایم وەکیلی بێ لێفە، کە تەمەنی حەفتا ساڵانە بوو، کە لە شەڕەکەی ساری قەمیش بەزیندوویی دەرچوبوو و دەیگوت:"با بچنە دەرەك و ئەسفەلەسافلین. خۆ ئەوانە هەر نازانن شەڕ

چییه و نەیاندیتووه کە چۆن لە ماوەی مانگێکدا چل هەزار کەس لە سەرما و لە بەر سپێ و نەخۆشی و کوشتاردا تێدادەچن.... با بڕۆن. جا خۆیان دەبیننەوە... تێدەگەن... با بڕۆن. لێیان گەڕێ با بڕۆن و بە چاوی خۆیان ببینن شەڕ یانی چی."

برایم وەکیل بە بیستنی هەر بانگەشەیەکی شەڕ لە شارەوە لەدین دەهری دەبوو و دەیگوت:"باشە شوکر، عیسمەت ئینونۆ هەیە. ئەو کابرایەکی شەڕدیتووە. ئەو دەزانێ کە سەرما و برسێتی یانی چی. تەنانەت ئەگەر دەسەڵاتداری یەکەمی حکوومەتیش نەبێ، تێیان دەگەیەنێ کە شەڕ پیس و چەپەڵە. تێیان دەگەیەنێت و بەرەنگاری کەسە بێ مێشکە زگ تێرەکانی شاریش دەداتەوە."

چەندی باس و مەسەلەی کەفوکوڵی شەڕ و نەریت لە شارۆچکەکەدا خەستتر دەبووەوە، تۆفانی ترس و سامەکەش بەتەوژمێکی پترەوە لە ئاواییدا هەڵی دەکرد. هەواڵە ناخۆش و ترسناکەکان و پڕ لە نیگەرانییەکان پەیتاپەیتا دەهاتن. دەیانگوت حکوومەت هەموو گوندییەکان دەخزێنێتە نێو خێوەتانەوە. بۆ؟ کەسیش نەیدەزانی بۆ. بەشێك لەو گوندییانە تازە، هەندێکیان بیست و پێنج ساڵ لەوە پێش، هەندێکیان دە ساڵ و تاقمێکیش تەنیا دوو ساڵێك بوو لە بەڵایەك بەناوی خێوەت رزگار ببوون. خێوەت واتە سەرما، بەفر، تۆفان، قوڕ و شێداری. خێوەت نشینەکانی پێشوو دەیانزانی خێوەت چ بەڵایەکە، لێبڕاوانە دژایەتییان دەکرد:"بەخوای روو دەکەینە شاخ و ئەو ماڵانەمان تەنانەت ئەگەر لە قامیش و چەپەریش بن، بەجێ ناهێڵین و ناگەڕێینەوە نێو خێوەت."

ئەوان هیچ بۆیان نەدەچۆوە سەر یەك کە ئاگری ئەو شەڕە و شێتی و تیر و کەوانە لە گۆڕێ کێ هەڵدەستێ. عەلی ئەفەندی هەوڵی دەدا ئەوەندەی پێی دەکرێ ئەودیوی سکەکەیان نیشان بدات، بەڵام نەیدەوێرا پرێسکەی دڵی خۆی بۆ کەس بکاتەوە.

چما دەروێش بەگ و ماهیر بەگ، بە تایبەتی ماهیربەگ کە بەئەستۆی شکاوی لە ئەورووپاش خوێندوویەتی، شێت بوون؟ ئەوانە چ کاریان بە شەڕ و خوێن و خێوەتە؟ چما پیاوی ژیر و تێگەیشتووش لایەنگری لە شەڕ و بەڵای ماڵوێرانکەری ئاوا دەکات؟ کوشت و کوشتار هەتا ئێستا چ چەپکە گوڵێکی لە بەرۆکی ئەوان داوە؟ کێ شتێکی دەوێ کە زیانی بۆ هەموان هەیە؟

ئۆغوز، توووران و سێوی سوور (وەك هێمای یەکگرتوویی هەموو تورکانی جیهان) و...
تەنانەت چوبوونە نێو گەمە و یارییەکانی منداڵانیشەوە. منداڵەکان لەتە لبادێکیان دەدایە دەست دایکیان بۆ ئەوەی کڵاوی لبادیی نووك تیژیان بۆ دروست بکەن.

جا کڵاوی لەو جۆرەیان لەسەر دەکرد و تیر و کەوانیان هەڵدەگرت و لەبری ئەسپی عەرەبی سواری گوێدرێژی لەڕ دەبوون و بەرەو مەیدانی شەڕێ وەڕێ دەکەوتن. نیوەیان چاویان مەنگولی بوو و هەندێکیان چاویان وەك چاوی چینییەکان و نیوەشیان ئۆغوزی بوون.

ئاشتبوونەوەش بە شێوە ئۆغوز ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەی دەستاند. چیی نەمابوو هەموو گەنجەکانی شاری ببنە دوو دەستە و پێك هەڵپڕژێن و ئەوجار بە شێوازی ئۆغوز ئاشت ببنەوە.

ماهیر بەگ گوێزی لە کلك دەشکاند. بە چەند مانگێك هەوڵ و تێکۆشان هەموو شارەکەی کردبووە شارێکی نەریتخواز. جا ئەوجار ئەگەر بە نەریتی ئۆغوزیش لەگەڵ دەروێش بەگ ئاشت بوایەتەوە، ئیتر کەس گاڵتەی پێ نەدەکرد، بگرە وەك گیانفیدایەکی ڕێگەی نەریتەکان و کەسێکی ڕێزداریش سەیریان دەکرد.

ئەو هەواڵانەی گەیشتبوون، لێیانەوە دەردەکەوت، کە دەروێش بەگ زۆر بە تامەزرۆییەوە ئاگای لە هەموو ئەو ڕووداوانەیە. تەنانەت دەیانگوت، لە ماهیر بەگی ڕاسپاردووە ئەوی لە منداڵەکانی خۆی خۆشتر دەوێ.

هەر شتە و لە جێی خۆیدا جوانە و هەر کارەش لە کاتی خۆیدا. جا لەبەر ئەوەی ئەو تووڕەهاتی نەریت و خوێن و بارووت و پەلامارە تین و تاوەکەی خێرا دەگەیشتە چەقی ئاسیای ناوەندی، دەبوو هەتا تەندوورەکە داغە، نانەکەی پێوە بدات.

دەسبەجێ چووە لای عەلی ئاغا و داوای لێ کرد بچێتە لای دەروێش بەگ و پێی بڵێ ئامادەیە بۆ ئاشتبوونەوە بە نەریتی ئۆغوز و سوپاسیشی بکات لەوەی کە پێداگرییەکەی بووەتە هۆی بووژانەوەی نەریتە مەزنەکەیان.

ڕەشید بەگیش بە ڕوویەکی گەشەوە گوتی:"ئیشەڵڵا خێر، خێر. ئاشتی کارێکی خوداییە. لەبەر باوکە ئۆغوزەکەمان. هەر ئێستا دەچم و بە بەگ دەڵێم."

## ٦٩

خوشکە بە دوایدا گوتی:

"رادەکا. لەوەتەی لە دایك بووە وەلی شەماڵ رادەکا. چل ساڵە چاوێکم کردووەتە چوار چاو و ئاگام لێیەتی و تا ئێستا نەمدیتووە ئەو بنیادەمە بۆ تاقە یەك چرکەش لە شوێنێك بحەوێتەوە. یەك پشوو رادەکا و رادەکا."

مەستان گوتی:"با رابکا. ئیشی ئەو راکردنە. ئەمنیش لەو دەمەوە وەلی شەماڵ...."

خوشکەکەی وەلی شەماڵ بە روویەکی گەشەوە قسەکانی پێ بڕی:

"زۆری پێ چوو تا زانیم وەلی دەترسێ. لە ترسانە رادەکات. دەترسێ و رادەکا، رادەکا و دەترسێ. پێم گوت مەرگ وشترێکە لەبەردەرگای هەموو ماڵێك دەخەوێ. گوتی تۆ خوا من حەیف نیم؟ گوتم خۆ ئەگەر ببیتە باڵندە و هەڵفڕیت و ببیتە ماسی و بچیتە بن بەحرانەوە و هەموو رۆژێ دەوری دنیایە لێ بدەیت، دیسانیش ناتوانێ خۆت لە مەرگ قوتار بکەیت. گوتی ئامینە گیان روون نییە، دیار نییە. کەس نازانێ. ئیتر ئاخێکی قووڵی لە ناخی دڵیەوە هەڵکێشا..."

مەرگ دەردی بێ دەرمانە. دەسەڵات چییە؟ مەرگ دەردی بێ دەرمانە، دەسەڵات چییە؟ مەرگ دەردی بێ دەرمانە، روو لە کوێ بکەین؟ مەرگ چاری نییە، ئەی پەنا بۆ کوێ بەرین؟ مەرگ درەمانی نییە، وەلی شەماڵ، ئاخۆ دەکرێ باڵ بگریت و بفڕیت؟

"پێی وایە ئیزرائیل نایگاتێ. لە مێژ ساڵە بێوچان رادەکا و رادەکا."

مەرگ دەرمانی نییە و ئاخری دەبێ لە شوێنێك و لە بستە خاکێکدا ئارام بگریت. ئەگەر مەرگ دەرمانی نەبێت، ئیتر نابێ کەس بکوژرێت، لە کەس تووڕە بیت و رق و قین لە دڵدا راگریت. بۆوەی نابێ خەم و خەفەت بخۆی و دڵی کەس بشکێنی و ئازارێك بە مێروولەش بگەیەنیت. خۆ ئەگەر مەرگ دەردی بێ دەرمان بێت، دەبێ پەلاماری بدەیت. ئەگەر مەرگ

چارسەری نەبیٚ، دەبیٚ هەیبیٚ. ئەگەر دەرمانی مەرگ ترس بیٚت، دەبیٚ ریٚك پەلاماری نیٚو چاوی ترس بدەیت. ئەگەر مەرگ چارەسەری نەبی، کەواتە مەرگ نییە. دەبیٚ ئاوا لەوە تیٚبگەی. دەبیٚ وەلی شەماڵ ئاوا لەوە تیٚ بگات.

مەستان گوتی:"راوەستە، راوەستە وەلی شەماڵ. دوو قسەم پیٚتە. راوەستە جا دوایی بۆ کویٚ دەچی بچۆ شەماڵ. ئەز دوور و گەز نزیك."

بە هانکە هانك گوتی:"ناتوانم راوەستم. ناتوانم راوەستم براله. ئیٚستا ناتوانم راوەستم. لە شویٚنیٚکی گونجاو دەگەریٚم بۆ خۆمان. ئەوجار، چما نابینی بە دوامەوەن؟ وا بەشویٚنمەوەن."

خوشکەکەی بە شویٚنیدا رای کرد و زریکاندی:"راوەستە، راوەستە براله، راوەستە قسەیەکم پیٚتە."

وەلی شەماڵ بە هاوارەوە وەلامی دایەوە:"ناتوانم، ناتوانم راوەستم. چما نابینی بە شویٚنمەوەن؟ لیٚم گەریٚ با خۆم بگەینمە شەویٚ و شویٚنەونکەی بکەم، دواتر دەگەریٚمەوە."

ئامینە هەرای کرد:"شیٚتە، شیٚتە، شیٚتە..."

جا لەسەر پۆلە قامیشیٚك دانیشت.

"شیٚتە، شیٚتە، شیٚتە... هەتا ئیٚستا کیٚ توانیویٚتی لە چنگی مەرگ را بکا، هەتا تۆ دووەم کەس بیت؟ شیٚتە، شیٚتە، شیٚتە... شیٚتی نیٚو شیٚتان..."

مەستان خەیاڵ هەڵیگرت و لەو حالەدا وەك ئەوەی لەگەڵ خۆی قسان بکات، لەبەرخۆیەوە دەیگوت:"لەم دنیایەدا کەس نامیٚنیٚ. ئەوی هاتووە، مردووە. هەمووانیش تا دوا هەناسە بۆ مانەوە هەولیٚان داوە. سلیٚمانیش کە زمانی هەموو بوونەوەرانی دەزانی، ئاخرییەکەی مرد. حەزرەتی عەلی، شمشیٚری ریٚبوارانی ریٚی هەق و ریٚی ئەشق و ریٚی برایەتیش مالاوایی لە ژیان کرد. محەمەد مستەفاش سلاوی خوای لیٚ بیٚ لەو دنیایە نەما. ئەنبیا و ئەولیاش هەموو مردوون. مرۆڤ زۆر مردوون، زۆۆۆر، بیٚ ژمار. ئەگەر لە نیٚوان ئەو هەمووە مەرگەدا کە لایەکی بیٚ بن و سنوورە و ژیانیش کە دیسان هەر لایەکی بیٚ بن و سنوورە، هەر تۆ بمیٚنی، چ دەبیٚ؟ بە تاقی تەنیٚ دەمیٚنی، ئەی بۆ رادەکەی؟

ئامینە گوتی:"زۆرم گوت، ئەوەندەم گوت زمانم مووی لیٚ هات. زۆر سالان گوتم، شەویٚش گوتم، رۆژیش... ناچیٚتە گویٚ. ناتوانیٚ لە رازی مەرگ تیٚ بگا. قایل نابن. چیی دەکات ناتوانیٚ قەناعەت بەخۆی بیٚنیٚ. سەیری ئاویٚنە دەکا و ورد دەبیٚتەوە و ئیتر ئارا و ئۆقرەی لیٚ دەبریٚ و یەك پشوو دەڵیٚ:"کەوابوو، کەوابوو، کەوابوو من دەمرم ئەوجار لە لاقانی وەردیٚنیٚ...

هەموو شەوێ دێ و بە تاڵووکە دەڵێ، هەستە، هەستە، هەستە خوشکێ، هەستە دەبێ بڕۆم. ئێمە لێرە خێرێك نابینین. هەستە، هەستە، هەستە خوشکێ... ئیتر وڵاتێك نەماوە پێیدا نەگەڕابێتم و شوێن نەماوە نەمدیتبێ. دە ساڵە لێرە بار و بنەمان بە عەرزی داداوە. دیسان رادەکا. بەڵام هەر بە چوکووراوادا... لوقمانی حەکیم لێرە دەرمانی مەرگی دۆزیوەتەوە..."

وەلی شەماڵ لە چیای دولڎولڎ وەسەر کەوت. هەرای کرد هەیەتی، هەموو شتێك دەرمانێکی هەیە، مەرگیش هەیەتی. دەبێ هەیبێ.... ئەوجار بە نەڕاندن حەوت جاران بە دەوری چیای دولڎولڎا خولایەوە... مەرگ دەرمانی هەیە. هەیەتی، هەیەتی، هەیەتی... مەیە، مەیە ئەی مەرگ، بەسپایی مەیە، مەیە، مەیە، مەیە، بەسپایی مەیە...

لە داوێنی چیای دولڎولڎ، گەیشتبووە چەقی ئەو تیشکە مسییەی بەسەر چیاکەدا کەوتبوو. لێرە لە سەر رەوەزێك راوەستا و یەك پشوو هاواری کرد ئەی مەرگ، ئەی مەرگ ناتوانم ملکەچت بم.

"ئەوە شێت بووی، شێت بووی وەلی شەماڵ؟ بتمەمە لای نووشتەنووس، پێشنوێژ و مەلا و شێخ؟ با بتبەمە لای یەکێکی دووعای قەبووڵ بێت."

وەلی شەماڵ نەڕاندی:"ئێوە شێت بوون. ئێوە شێت بوون کە ئاوا دەستتان لەسەر دەست داناوە و راوەستاون. مەرگ وا وردە وردە دێ. جارێ خێرا و جارێ لەسەرخۆ... تەنیا لوقمانی حەکیم ئاقڵ بوو... تەنیا ئەو هەوڵی دا بۆ چارەکردنی مەرگ. هەر ئەو بەرەنگاری مەرگ بووەوە... هەی شێتینە، شێتینە، شێتینە، بێ ئەقڵینە، گەمژەیینە."

هاتە بن دار چنارە ئەستوورەکان. چنارەکان پڕ بوون لە هێلانە، هەر لکێك هێلانەی جۆرە مەلێکی لەسەر بوو. لك و پۆپەکانی سەرەوەش هێلانەی گەورەی لەگ لەگەکان. بە سەر خەرەندێکا بازی دا و کیسەڵەکان هەموو خۆیان هاویشتە نێو زەلکاوەکەوە. پۆلە ماسیگرەیەك هەڵفڕین، هەزاران.... ئاسمان پەمەیی بوو. دندووکە درێژەکانیان بەرەو پێشەوە و لاقە درێژەکانیشان بۆ دواوە درێژ کردبوو. تاوێك دواتر وە گوڵۆڵەیەکی پەمەیی لێ هات و لە گۆشەیەکی تەنکی زۆنگاوەکەدا نیشتەوە. لەگ لەگەکان لە سەر لۆقە درێژەکانیان، بارەو بار دەکرد. رێوییەك ملۆمۆی بوو و بە دیتنی وەلی شەماڵ خۆی بە دەوەنەجاڕەکەدا کرد. بۆقە شین و زلەکان لە نێو قامیشەڵانەکەدا خۆیان دابووە بەر ئەو تیرێژە خۆرەی خۆی بە نێو قامیشەکاندا دەکرد. وەلی شەماڵ راوەستا و پڕ بە سییەکانی هەوای هەڵمژی و بە غاردان بەرەو نێرگزەجاڕەکە رۆیشت. نێرگز دەگەیشتە ئەژنۆی. بۆن و بەرامە رووناکاییە زەرد و سپییەکە،

پیاوی مەست دەکرد و دوور دوور دەڕۆیی. کە گەیشتە کۆتایی نێرگزەجاڕەکە، پیاوێکی دیت کە بە گایەکەوە لە دەم زۆنگاوەکە جووتی دەکرد. پیرەژنەکەشی لە تەنیشتییەوە بوو.

"سلاو، ماندوو نەبن."

"سلاو وەلی شەماڵ. سلاو. عەمرت درێژ بێ براله، راوەستاو بی. ئەو زەوی و زارە بەمن دەبڕێ. ئەو خاکە... ئیتر لە گیانی خۆم وەڕەز بووم. کارکردنی شەو و ڕۆژمان کۆتایی هات.... ئەتۆش، ئاخۆ ئەتۆش پارچە زەوییەك بۆ خۆت لەو زۆنگاوەدا بڕ دەدەی یان نا؟"

پیاوەکە بە ددانە کەوتووەکانی و لێوە چرچ و شەقار شەقارەکانی و لاملە پڕ لە چرچ و لۆچەکانی و روومەتی وشك هەڵاتوو و دەرپەڕیو و چاوی بەقووڵداچووی و چەناگە باریکەکەیەوە پێدەکەنی. پیرەپیاوەکە جۆرێك پێدەکەنی وەك بەختەوەر بووبێت. قاقای پێکەنینەکەی بە دەموچاوە پڕ لە چرچ و لۆچەکەیدا بلاو ببۆوە و چاوە بەقووڵداچووەکانی گەش دەکردەوە. پیرەژنەکەش وەك مێردەکەی پێدەکەنی. ئەو تاکە گایەش کە گاسنەکەی دەکێشا و گاسنەکەش وێڕای ئەوان پێدەکەنی.

"هیوادارم خودا کارت راست بێنێ."

"ئەتۆ پێت وایە ئەو قامیشەلانە هەڵچۆڕێ و وشك بێتەوە؟ ئەتۆ دڵنیای وەلی."

"بەرد و کوچك و هەرچی وبەر دەستت دێ، بیخە نێو زەلکاوەکەوە. هەرچی بەردەستت کەوت، زۆر زوو وشك دەبێتەوە. دەستی لێ هەڵمەگرە. لەسەری پێداگر بە. مەبەزە."

لە هەر هەنگاوێکی قامیشەلانەکەدا کەسێك دەبینرا... هەندێ خەرەندیان هەڵدەکەند، هەندێ بەرد و خۆڵیان لە زەلکاوەکە دەکرد... پیرەکان، گەنج و منداڵ و ژنان و کچان...

مەلا حەیدەر، لە دەم قامیشەلانەکە و لەسەر تەپۆڵکەیەك دانیشتبوو و جگەرەی بەبادا دەکرد. ردێن و قژ و سمێڵی ماش و برنجی ببوو. دووکەڵی جگەرەکەی سەری تووکی سمێڵە بژەکەی زەرد کردبوو. پەنجەکانی دەستی راستەشی زەرد هەڵگەڕابوون. دەموچاوی وەك باینجانی بەر هەتاو چرچ ببوو و لەو چرچ و لۆچانەدا چاوەکانی قووڵتر دیار بوون... کە وەلی شەماڵی دیت وەدەنگ هات:"راوەستە وەلی شەماڵ! راوەستە. وەرە ئێرە، وەرە کارم پێتە."

وەلی شەماڵ هەنگاوی شل کردنەوە و سەری بەردایەوە و دەستی شۆڕ کردنەوە و بەرەو لای مەلا حەیدەر چوو. مەلا حەیدەر دەستی لە خاکەکە دا و گوتی:"وەرە لە لام دانیشە. هەر لێرە دانیشە."

وەلی شەماڵ وەك مەڕ سەری بەرداوە و هات و لە تەنیشتییەوە دانیشت.

"دوڵدوڵ لە شوێنێکی ئەوبەری یەمەن، ئێستاش وا شەڕ دەکات، دەزانی؟"

"نەمدەزانی."

"دوو ئەسپ هەن کە نامرن. ئەوانە ئاوی حەیاتیان خواردووەتەوە... یەکێکیان دوڵدوڵەکەی حەزرەتی عەلییە و ئەوی دیکەش قیراتەکەی کوێر ئۆغڵییە. هیچ بنیادەمێك ناگاتە ئەو پلە و پایەیەی ئەو دوو ئەسپەی تێدان. دەزانی بۆ؟"

وەلی شەماڵ وەڵامی دایەوە:"نازانم. ئەمن هیچ سەر لەو شتانە دەرناکەم."

مەلا حەیدەری لێو بەخەندە گوتی:"زۆر رادەکەن. بەردەوام رادەکەن و مەرگ هەرگیز تۆزی پێیان ناشکێنێ. خودا ئەوە بە نەسیبی هیچ کەس نەکا... هەتا دنیا دنیایە دەرد و داخ و ئازار و کوێرەوەری دەبینن. دنیای دەوروبەریان کاول دەبێ و ئەوان هەروا سەیری دەکەن. هەموو رۆژێ لەگەڵ هەر کەسێکدا کە دەمێ، دەمرن و لەگەڵ هەر کەسێکدا کە ئازار دەچێژێ، ئەوانیش ئازار دەچێژن. کەس نازانێ ئەو ئەسپانە چ تاوانێکیان کردووە کە خودا تووشی ئەو چارەنووسەی کردوون و نایانمرێنێ."

وەلی شەماڵ نەڕاندی:"ئەمن چووزانم."

مەلا حەیدەر گوتی:"جا بۆ دەنەڕێنی؟ مەگورێنە، گوێ بدەیە. ئەو ئەسپانە شەڕ دەکەن... دوڵدوڵ لە پێناوی برایەتی و ئاشتی و ئازادیدا شەڕ دەکات. قیرات لە پێناوی یەکسانیدا بە نێو شەپۆلی خوێندا قەڵەمباز دەدات. هەر دەڵێی خودا وەك نەمری کردوون، ئەرکەکەشیانی دیاری کردووە."

وەلی شەماڵ دیسان نەڕاندی:"کوڕە ئاخر من چووزانم."

مەلا حەیدەر، پیرە عەلەوییەکە هەستا و گوتی:"مەرگ شتێکی باشە. مەرگ بۆ ئەو کەسەی تێدەگات، باشترین ژیانە، وەلی شەماڵ."

"من تێناگەم، ناتوانم تێی بگەم."

مەلا حەیدەر لە نێوشانی وەلی شەماڵی راکێشا و گوتی:"چاوەڕێم. چاوەڕوانم براله. ئەتۆ ئەو سەیارە و کامیۆنە زەبەلاحانەت دیتبوو، کە هاتبوونە دەم زەلکاوەکە و دوای ماوەیەك ررۆیشتن؟ چاوەڕێی ئەوانم. دەڵێن دێنەوە. دەڵێن کە هاتنەوە لە ماوەی چەند مانگێکدا ئەو زەلکاوە هەڵدەچۆڕێنن. چاوەڕێم بزانم ئەو کارەیان چۆن پێ دەکرێ. دەمەوێ بزانم چ شتێك لە بن ئەو ئاوانەوە دێتە دەرێ؟ خەوم لێ ناکەوێ، هەر دەمەوێ بزانم. دەزانی ئەو کامیۆن و شتە کەی دەگەڕێنەوە؟"

وەلی شەماڵ وەڵامی دایەوە:"نازانم."

دەرپەڕی و لە لاقانی وەراندەوە. مەلا حەیدەریش بە دوایدا هەرای کرد:"را بکە، ئادەمیزاد ملیۆنێك ساڵە رادەکا، بەڵام بە هیچ کوێ نەگەیوە. مرۆڤایەتی دوو هەنگاو نەچووەتە پێشێ. رااااابکە..."

وەلی شەماڵ رووی لە رێیەکە کرد و خێراتر رایکرد. دارەکانی بەجێ هێشت و پۆلە بنیادەمێکی دیت کە لە نێوقەدیانەوە بەرەو ژوور رووت بوو و پاچ و پێمەڕەیان پێ بوو. دەموچاوی هەموان تاو بردبووی و روخسارێکی وشك و تووڕەیان هەبوو. قولینچکی چاوەکانیان پڕ بوو لە چرچ و لۆچ و پەراسوویان دەرپەڕیبوو. دەلینگیان لێ هەڵکردبوو و بەلەکیان بریندار و رووشا بوو. گوتیان" ئەوە بۆ کوێ ئاوا بە تاڵووکە؟ ئەتۆش وەرە دەست بدە پاچ و پێمەڕە و لەگەڵمان بە وەلی شەماڵ."

"ناتوانم."

ئەوەی گوت و رای کردەوە. لە مەودایەکی دوورتر، نزیك لێواری رووبارەکەی جەیهان پاناوکە زەوییەك ئاگری تێبەرببوو و تا چاو هەتەری دەکرد دووکەڵ و بڵێسە بوو. بەرەو ئەوێ رۆیشت. دیسان پۆلە پیاوێك بە پاچ و پێمەڕەوە دەهاتن و رادەبردن و دەیانگوت:"وەرە وەلی شەماڵ، لەگەڵمان وەرە."

هەمووان وێکڕا پێدەکەنین. هەمووان شەڵاڵی ئارەقە بوون. وەلی شەماڵ نەڕاندی:"ناتوانم."

ئیتر چاوەکانی لێك نا و بە شڵەژاوییەوە بەرەو ئەو عەردە رۆیشت وا بڵێسەی لێ بەرز دەبووەوە. گرمەیەك لە دواوەی هات. چەندی پتر رایدەکرد، گرمە و هاڕەهاڕەکەش بە دوایدا دەهات. خۆی بە بڵێسەکاندا کرد. دەوری دەوەنەکانی لێدا و لە خەرەندێك پەڕییەوە و خۆی دایە پەنا چیمەنکەکان و لە زەوییە گڕگرتووەکە پەڕییەوە و گەیشتە دەم چۆمەکەی جەیهان. چۆمەکە دەتگوت راوەستاوە. تاوەکە کەوتبووە سەری و دەدرەوشایەوە. سێبەرەکەی خۆی دەدی کە کەوتبووە سەر ئاوەکەوە. جووڵەی پێیەکان بەسەر ئاوەکەوە ترسێنەر بوون. بنیادەمی رووت و قووتی پاچ و پێمەڕە بە دەستیشی لە ئاوەکەدا دیت و گوێی لە هەڵا و هەنگەمەشیان بوو. سەری لە ئاوەکە نا. دەنگ و هەڵا و گرمە گرمەکە لەنەکاو بڕایەوە. لە ئاوەکە هاتە دەرێ و گەڕایەوە. پۆلە پیاوێکی پاچ و پێمەڕە بەدەستی دیکەشی دیت. منداڵ و پیر و نەخۆش و کچ و ژنان پۆل پۆل بە بەردەمیدا تێدەپەڕین و بە تەور و تەورداس و کەلوپەلی دیکەوە... ریزیان

بەستبوو و شەلاڵی ئارەقە بەرەو ئاناوەرزا دەڕۆیشتن. وەلی شەماڵ بە تەنیشتیاندا تێدەپەڕی و بۆنی ترشاوی ئارەقەیانی بۆ دەهات. دەموچاوە رەشهەڵگەڕاو و تاوبردووەکانیان، ئارەقەی کردبوو و لەبەر تاوەکە دەبریسکایەوە. خۆڵ و ئارەقە تێکەڵاوی یەکتری ببوون و لەسەر برۆ و مژۆڵەکانی ببووە سواغ. گوتیان:"وەرە، وەرە وەلی شەماڵ"

ئەوجار راوەستان. لە پێشدا منداڵەکان پێی پێکەنین، ئەوجار ژنەکان و بەساڵاچووەکان و کیژۆڵەکان. هەموو روخساریان زەرد هەڵگەڕابوو. هەموویان لە نۆبەتێدا چەقوچۆیان بوو.

"وەرە، وەرە وەلی شەماڵ... دەچین زەلکاوەکە وشك دەکەینەوە. ئەتۆش لەگەڵمان وەرە. پاچ و پێمەڕەیەك بۆ خۆت پەیدا بکە و وەرە..."

"ناتوانم، ناتوانم."

گوتی و ئاوڕێکی دایەوە.

گوتیان:"کەست بەدواوە نییە. مەترسە. ئێمە لێرەین."

"ناتوانم، ناتوانم."

لەو لاترەوە، ژن و پیاوێك تا نێوقەدیان لە زۆنگاوەکە رۆچوبوون و قامیشیان دەبڕی. ئەو قامیشانەی دەیانبڕین، منداڵە رووت و قووتەکانیان دەیانبردنە دەرەوە. وەلی شەماڵ کە بەوێدا تێدەپەڕی، کابرا سەری هەڵێنا و دەستی کردە سێبەری چاوەکانی و گوتی:"وەلی شەماڵ کارێکی باشتان کرد. ئەتۆ و مەستان دەڵێم. کاریچکی باشتان کرد. زەوی و زارێکی زۆرمان دەبێ. زۆر و زەبەند. ئەمنیش دەکەومە گەڵ وەرزێر و جووتیارەکان. قامیش بۆ کەپر دەبڕم. کاتێ کارم نەما، لەگەڵ ژن و منداڵەکەم پاچ و پێمەڕەی هەڵدەگرین و دەچینە بەتاڵکردنی ئاوەکەی ئاقچاساز. ئەتۆش وەرە. ئەتۆش... ئاوا نابێ. دەستێك بە تەنیا تەقەی نایە."

وەلی شەماڵ:"ناتوانم. ئێمە ئاقچاساز پڕ دەکەینەوە لە خۆڵ."

پیاوەکە:"ناکرێ. ناکرێ."

جا تەوەرداسە تیژەکەی داهێنا. سێ قامیشی مەیلەوڕەشی ئەستوور هەر یەکەی هێندەی مەچەکی دەستێك بە گوڵەکانیانەوە بەلاداهاتن و کەوتنە نێو ئاوەکەوە. لەگەڵ هەر داهێنانەوەیەکی تەورداسەکەی و کەوتنی قامیشەکان، دەنگی وەشاندن و کەوتنەکان هەڵدەستا. گوتی:"دەست راگرە برالە، دەست راگرە با من تێپەڕم."

دەمی تەورداسەکەی وەك مووسی دەلاك دەبریسکایەوە.

"دەست راگرە برالە، دەست راگەر."

ڕەوەیەك بنیادەمی زەردهەڵگەڕاو بە دەم قامیشەڵانەکە وەربوون. هەندێکیان قامیش و هەندێ جەگەن و هەندێ سێ سوو و هەندێ حەیزەران و هەندێ داریان دەبڕی و هەندێکیش گیایان دەدووری. هەندێکیشیان برد و لم و کوچکیان دەبرد بۆ زۆنگاوەکە. هەندێ کەسیشیان جۆگەیان لێ دەدا بۆ ئەوەی ئاوی ئەو زۆنگاوە پان و بەرینە هەڵچۆڕێنن.

دوور لە باوەڕ بوو. بەڵام زۆنگاوەکە هەر دەهات و وشکی دەکرد و زەوی و زارە وشکەوەبوو و شەقار شەقارەکان وردە وردە پتر دەبوون. ئەوە چۆن دەکرا؟ تەنانەت ئەوانەی خۆیان بۆ وشککردنەوەی زۆنگاوەکەش ماندوو دەکرد، نەیاندەزانی چۆنە. سەدان کەس لە سەدان لاوە بێوچان جۆگەلەیان لێ دەدا...

پیرە ژنێك، کە مەمکەکانی چرچ ببوون وەك جووتە گۆرەوییەکیان لێ هاتبوو، بە دەستی پەڵەپەڵە و لەڕ و لەرزۆکەوە، گڵی لە قوڵکەیەك دەکر.

"وەرە، وەرە وەلی شەماڵ، وەرە یاریدەی من بدە... وەرە..."

وەلی شەماڵ ڕاوەستا و سەیرێکی کرد. قوڵکەکە هێندەی ئەژنۆیەك قووڵ بوو. ژنە گوتی:"ئێمە پێویستیمان بە زەوییە. منداڵ و نەوەکانم نۆبەتێیان گرت و ئەمن بە تەنێ قامیشەڵانەکە وشك دەکەمەوە. لێرە خانوو دروست دەکەین."

ژنە شوێنێکی قامیشەڵانەکەی نیشان دا و لەسەری ڕۆیشت:"لە هۆوەندێش ڕێحانە دەچێنم و ئا لێرەشەوە گوڵی مەخمەر و شەوبۆ و ... جا لە بەیانییەوە هەتا ئێوارێ هەر بۆن و بەرامەیان بە وڵاتدا بڵاو دەبێتەوە."

وەلی شەماڵ لە بن لێوانەوە گوتی:"نازانم. ناتوانم تێی بگەم. بەخودا ناتوانم... گوندیی سەگباب... وەك مار و مێروو بەو قامیشەڵانە وەربوون... وەك نەدی و بدییان وێی کەوتوون دەڵێی هەموو ئاوی ئەو قامیشەڵانە هەڵدەلووشن. هیچ کەس باشاریان ناکا. تەنانەت چیا بەرزەکانیش خۆیان لەبەر ناگرن."

سەدان ژن و پیاو و منداڵی دی، کە هەر هەموویان قوڕاوی و تۆزاوی بوون.

بە کوێرە ڕێیەکی نێوان قامیشەڵانە چڕەکەدا کە سەریان لێك دابووەوە، تێپەڕی و گەیشتە گوندێك کە خانووەکانیان لە قامیش دروست کردبوو. خەڵکەکە بە پیر و گەنج و منداڵەوە، لە بن چنارێکی نێوەڕاستی گوندەکە بەسەر یەکدا کەوتبوون و دەیاننالاند و دەکڕووزانەوە:

"ئای سووتام، ئاورم تێبەربوو... باوکەڕۆ "تا" کوشتمی."

"کوا ئەوە ژیانە."

عەلی رەزا درێژە بە ناڵینەوە گوتی:"زەوی و زارمان هەیە. زەوییەك، کە ئەگەر رۆحی بنیادەمیشی لێ بچێنی، شین دەبێتەوە . گوندەکەمان ناو ناوە گیان رزگارکەر. ئێرە رزگاریدەرە."

"تۆ خوا ئەوە ژیانە؟ ئاخر ئەوە چ ژیانێکە؟"

"نۆبەتێیە، دێ و دەڕوا. مردنێکی ئاوا زۆر باشترە لە مەرگی دیکە."

وەلی شەماڵ گوتی:"تێناگەم، ناتوانم تێی بگەم."

بای رۆژئاوایی هەڵیکرد و گێژەڵووکە لە دەم دەریای ناوەڕاستەوە هەستان. گەواڵە هەورەکان هەستان.

"ناتوانم تێ بگەم، ناتوانم..."

پیرە پیاوێك کە چاوەکانی سەوز سەوز، ردێنەکەی سپی سپی، روخسارێکی گەشی وەك گوڵ و چەناگەیەکی جوان و لێوەکانی باریك بوون، گوتی:"بە ئێرە دەڵێن چیپلاق لار واتە (رووتەکان). زۆرمان بە نۆبەتێ و لە برسان مردن. بەڵام هەرچۆنێك بێ، ئەو گوندە کە لوێچە خۆڵێکی، خوێنی پیاوێك دێنێ، ئێستێ ئیی خۆمانە..."

وەلی شەماڵ کەوتە نێو گەواڵە تەپۆیەکە و کە هاتەوە دەرێ، دەست و دەموچاو و پێ و پشتی ئاوسابوون. تەپۆکان لەسەر کراسەکەشییەوە پێوەیان دابوو.

وەلی شەماڵ گوتی:"تەپۆی ئیسقاندار. ئێسقاندار. ئەوانە تەپۆ نین، باڵندەن و لە تەپۆ دەچن. باشە خودا ئەوانەی بۆ دروست کردووە؟ بۆچی ئاوای دروست کردوون؟ نازانم، بۆم ناچێتەوە سەر یەك..."

کە گەیشتەوە ماڵێ، بۆنی ساوار و ئەو رۆنە هەڵقرچاوەوی بۆهات کە بەسەری داکرابوو. دەسبەجێ دەرپەڕی. خوشکەکەی بە شوێنیدا دەنگی لێ بەرز بۆوە:"مەڕۆ وەلی شەماڵ. شتێکی تاڵمان لێ قەوماوە. کێشەمان تووش بووە، وەگەڕێ، راوەستە."

مەستان نەڕاندی:"راوەستە."

لە میلی تفەنگی راکێشا و گوتی:"رانەوەستی لێت دەدەم. راوەستە وەلی شەماڵ."

وەلی شەماڵ راوەستا و گوتی:"برسیمە مەستان. لە برسان وەختە بمرم."

کوڕەکانی مەستان و بووك و وکچ و کوڕەکانی، و بووك و کچ و نەوەکانی خوشکەکەی هەر کامە و بە جەواڵێك خۆڵیان دەبرد بۆ قامیشەڵێنەکە. رێگەیەکیان بە نێو قامیشەڵێنەکەدا کردبۆوە کە پانایییەکەی هەر پێنج هەنگاو و درێژییەکەشی هەر سەد هەنگاوێك دەبوو. بەڵام

ئەوانەی کاریان دەکرد، ئەوەندە ماندوو ببوون تین و گوڕیان تێدا نەمابوو. کە بەڕێیەدا دەڕۆیشتن لاقیان تێك دەئالآن و بەلادا دەهاتن و جاری وابوو بەسەر یەکتریدا دەکەوتن و وەبن جەواڵە گڵەکان دەکەوتن.

"وەرە بە قوزەڵقورتی بکە."

خوشکەکەی بوو ئەوەی گوت و قاپە ساوارێك و پیاڵە دۆیەك و چەند نان و پیازێکی لە سەر چیمەنەکە لەبەر دەمی دانا. وەلی شەماڵ پەلاماری خواردنەکەی دا. ئەگەر چاوت لە خواردنەکەی بوایە، دەتگوت دەمێکە برسێتیی کێشاوە.

مەستان بەرەوڕووی دانیشتبوو و سەرسووڕماوانە سەیری خۆی و چێشت خواردنەکەی دەکرد. وەلی شەماڵ ئەوەی بۆیان دانابوو، حەپەلووشی کرد و لە حالێکدا بە پشتی دەستی دەم و سمێڵی دەسڕییەوە، هەرای کرد:"خوشکێ چۆڕێکم ئاو دەیە."

مەستان هێشتا سەری لێی سووڕ مابوو. تا ئێستا شتی وای نەدیتبوو کە نەفەرێك لە چاوترووکانێکدا ئاوا سفرەیەك راماڵێ.

"ئەی هاوار، سوبحانەڵڵا."

وەلی شەماڵ دوای خواردنەوەی ئاوەکە، گوتی:" وشکی دەکەنەوە. لە رێگە و چیا و چۆڵان، خەڵکێکی رەش و رووتم دیت بەپاچ و پێمەڕەوە دەهاتن.... ژن و منداڵ و کچم دیتن کە وەك مار و مێروو بەرەو زۆنگاوەکە کەوتبوونە رێ. هەر کەسە و لە لایەکەوە جۆگەلەیەکی لێ داوە و بە پێی توانای خۆی خەریکی هەڵچۆڕاندنی ئاقچاسازە. هەموو تاسەبار و برسیی زەوین. خەڵکی ئەو لایە هەموو بێ زەوی و زارن. سەد خۆزگە بە خۆمان. بنیادەم لە دەم ئاقچاساز وەك کرم بەسەر یەکدا کەوتوون... لە سەر چاوم مەرج و گرێو دەکەم، مانگێکی دیکەی پێناچێ ئەو ئاقچاسازە هەڵدەچۆڕێنن. گوندی چیپلاق لار و جان قوتاران "گیان رزگارکەر"م دیت. هەموو، لە حەوت ساڵانیانەوە تا حەفتا ساڵانەیان لە نۆبەتێدا وەك سەگ هەڵدەلەرزین و چەقوچۆیان بوو، بەڵام زەوی و زاریان هەبوو. زەوییەك ئەگەر گیانی بنیادەمت تێدا چاندبایە، شینی دەکردەوە. ئەگەر بنیادەمێك سەعاتێك لە جێی خۆی نەجووڵێت، لاقەکانی لە زەوییەکەدا پنج دادەکوتن و تەپڵی سەری چرۆ دەکات."

مەستان گوتی:"راوەستە."

خوشکەکەی گوتی:" راوەستە. یاخوا کوێراییت دایە وەلی. تاوێك ئۆقرە بگرە، دوو قسەمان پێتە."

کوڕ و بووکانیش گوتیان:"راوەستە، راوەستە، قسەیەکمان پێتە."

وەلی شەماڵ دوای خواردنەکەی دەمودەست دەرپەڕی و وەڕێ کەوت و لە چاوترووکانێکدا لە چاوان ون بوو و لە دوور دوورەوە، لەو بەری مێشەڵانەکەوە دەنگی دەبیستر‌ا:"دەگەڕێمەوە، تاوێکی دی دێمەوە."

بنیادەمەکان بە ئەستۆی بێ هێز و لارەوە، سەرتاپا قوڕاوی و دەلینگی هەڵماڵدراو و روخساری زەردەوە، لە نۆبەتێ و هەوڵێکی بێ وچاندا.

خەڵکێك لە سەر وای وایلییەوە، لە لای چانکازاوە دەهاتن. جەماوەرێکی زۆر کە بە درێژایی رێیەکە ریزیان بەستبوو. هۆزێك بوون لە حاڵی کۆچکردندا. هەرایان کرد:"ئەهۆی کاکی رێبوار، راوەستە کارمان پێتە."

وەلی شەماڵ راوەستا. پیرە پیاوێك کە بە شەلەشەل دەرۆیشت، هاتە پێشەوە و لاقە خواروخێچەکانی لێك ئاوەڵاکردن و راوەستا. نێوشانی پان و شەویلکەی توند و تۆکمە بوون. تاڵی ردێنی دەتگوت شریتن. پرسیی:"ئەو رێیە دەچێتە ئاقچاساز؟ دەڵێن ئاقچاساز دابەش دەکەن، وایە؟"

وەلی شەماڵ وەڵامی داوە:"نازانم. تێناگەم. سەرەدەر دەرناکەم..."

گەیشتە ئەو شوێنەی ئاقچاساز و رووباری جەیهان دەگەیشتنەوە یەك. کۆمەڵێك پیاو، کە لە نێوقەدیانەوە بەرەو سەر رووت بوو، لە جەیحانەوە هەتا قامیشەڵانەکە، بە دووی یەکتریدا ریز ببوون و بێ راوەستان زەوییەکەیان هەڵدەکەند. پەیتا پەیتاش هەر شەپۆلی بنیادەم بوو کە لە خوارووی کۆزان و میسیس و چیاکانی فەککە و زینوێی موغارە و گوك سۆ و ئاندیرین و ئێل ئۆغڵی و دەوروبەری ئەنتێپ و زنجیرلی و ساقچار گوێزووەوە... دەهاتن. هەر دەگەیشتنێ، بە پاچ و پێمەڕە و بێڵەکانیان، دەستیان دەکرد. ئەوانەی لە نێوقەدیانەوە بەرەو ژوور رووت بوون، شان بە شانی یەك نوقمی کارەکەیان بوون. هەندێ لە وەرزێرەکان دەیانگوت:"ئەو ئاوە بە کەس هەڵناچۆڕێ. هەموو رەنج بە خەسار دەبن."

"دەوڵەت ئەو هەمووە گەلابە و شۆفلْ و کامیۆنەی هێنا، هەر یەکەی هێندەی دێوەزمەیەك دەبوون، هاتن و نە رۆژێك و مانگێك، بگرە چەند مانگان لە دەم ئاقچاسازێ مانەوە و لێی ورد بوونەوە، بەڵام چونکە زانیان هیچیان پێ ناکرێ، چۆنی هاتبوون ئاوا گەڕانەوە. جا ئەوە ئێستاش ئەوانە دەیانەوێ بە پاچ و پێمەڕان وشکی بکەنەوە، هەی تڕحێو، لێگەڕێ با دوای هەڵچۆڕاندنی ئاقچاساز بچن دەریای سپیی ناوەڕاستیش هەڵچۆڕێنن. تڕحێو. ئێوە دەزانن چیها زەوی لە بن ئەو ئاوەدا نووستووە؟"

"کەس ناتوانێ ئاقچاساز هەڵچۆڕێنێ. ئەوە کاری بنیادەمان نییە."

ئاقچاساز هەزاران کانیی لە بنییەوە هەڵدەقوڵێن.

"ئاقچاساز نەك بە هەزار چاوەکانی، تەنانەت ئەگەر بە سەد هەزار چاوەکانیشەوە هەڵقوڵێ، خۆ لە بەر ئەو هەمووە بنیادەمە راناگرێ. لە هەمبەر ئەو هەمووە بنیادەمەدا، نەك ئاقچاساز، بگرە هیچ شتێك خۆی ناگرێ. هیچ شتێك."

وەلی شەماڵ کەیفی ساز بوو. تارمایییەکەی پاش خۆی لەبیر کردبوو.

"ئەگەر ئاقچاساز بە سەد هەزار، بە ملیۆنێك چاوەکانیشەوە هەڵقوڵێ، دیسان هەڵیدەچۆڕێنن."

وەلی شەماڵ رای دەکرد. راکردنی لێ ببووە عادەت. رای دەکرد و دووپاتەی دەکردەوە:"سەد هەزار کانی، سەد هەزار..."

مەستان بانگی کرد:"بەسە راوەستە وەلی شەماڵ. نامەردی مەکە. سەیر بکە ئەوەندەم بەکۆڵ، خۆڵ کێشاوە، هەموو پشتم بلۆقی کردووە. وەرە سەیری خوشکەکەت بکە، سەیری بووکەکانی و کچەکانی و کوڕەکانی، وەرە بڕوانە، هەر هەموومان ئەوەندەمان کوێرەوەری دیتووە، وەك کۆیلە گاورەکانمان لێ هاتووە."

وەلی شەماڵ گوتی:"هەڵدەچۆڕێ. لە جەیهانەوە تا ئاناوەرزا، دەرزی هەڵاوێیی وەعەرزی ناکەوێ. هەر جمەی دێ. هەمووشیان پاچ و پێمەڕەیان پێیە و بۆ هەڵچۆڕاندنی ئاقچاساز جۆگە لێ دەدەن."

هەموویان یەك دەنگ هەرایان کرد:"وەرە ئەتۆش کار بکە."

مەستان گوتی:"تووشی کێشەیەك بووین وەلی شەماڵ. دەڵێی سەرمان بێ بەڵا و قوونمان بێ گێچەڵ نابێ. جافر بەگ هات و گوتی دەبێ لێرە بڕۆین. دیسان دێتەوە. تۆ دەڵێی چ بکەین؟"

وەلی شەماڵ هیچی نەگوت. چووە پشت چنارە چڕەکەوە و دەستی کرد بە هەڵکۆڵین. هەڵیدەکەند و جەواڵەکەی پڕ دەکرد و بەکۆڵی خۆی دادەدا و دەیبرد و لە ئاوەکەی دەکرد. بەبێ ئەوەی قسەیەك بکات زەردەیەکی دەهاتە سەر لێوانی بۆ ئەو خوارزایەی کە زارکی جەواڵەکەی بۆ دەکردەوە. زەردەیەکی بەختەوەرانە. چیی بە دڵیدا دەهات کە ئاوا شەڵاڵی ئارەقە، یەك پشوو زەردەی دەهاتی؟ کەس لە روخسارییەوە هیچی لێ تێنەدەگەیشت.

## ٧٠

ئاوەکە کشابۆوە. خاکەکە بەرە بەرە وشك دەبۆوە و شەقار شەقار دەبوو. مەستان دەیگوت:"وا باشترە ئاوا بڕی بدەین."

زەوییەکەیان بەو گڵەی هەڵیان دەکەند و دەیانهێنا، بڕ دەدا و پاوانیان دەکرد و ئەو بەشەی مابوو وردە وردە وشك دەبۆوە و دەقەڵشی.

"ئەگەر ئاوا دەوری بدەین، ئاوەکە دەکشێتەوە... ئای پشتم، وەی باوکە، ئای پیری و هەزار حەیف..."

وەلی شەماڵ کەڕەی بەیانی لەخەوێ هەڵدەستا و هەمووان وەخەبەر دێنا و ملیان لە کار دەنا. بەریانە گڵەکەیان بەرەو چەقی زۆنگاوەکە دەکشاندەوە و ئەوجار دەوری ئاوەکەیان دەدا. ئاوە دەورگیراو و دابڕێندراوەکە خێرا وشك دەبوو. زەوییە دەورەدراوەکان ڕۆژ بە ڕۆژ زۆرتر و بەرینتر دەبوونەوە. وشککردنەوەی هەر پارچەیەك بۆ ئەوان جێژنەیەکی خۆش بوو. هەر کامەیان لە ماڵەوە، وەك داهێنانێکیان کردبێت و سەرکەوتنێکیان دەستەبەر کردبێت، مەست و سەرخۆش و بەکەیف بوون. وەلی شەماڵ دەیگوت:"ئەوە بە چاوی خۆم دیتم هیچ شتێك لە چنگی ئەو بنیادەمە قوتار نابێ. لە بناری ئاناوەرزاوە هەتا ڕووبارەکەی جەیهان، جۆگەیەکیان لێداوە هێندەی بەژنی بنیادەمێك. ئەو جۆگەیە زۆری پێناچێ ئاوەکەی ئاقچاساز هەڵدەچۆڕێنێ."

ئەو کاتە ئەی دارەکان چییان لێ دێ؟ ئەو گوڵ و باڵندە و مێشەنگوین و مار و ڕێوی و کەروێشك و چەقەڵ و ماسییانە و... چییان لێ دێ؟ تۆ بڵێی بمرن؟ چما ئەو قامیشەڵانە ئەو هەمووە ساڵە شوێنی حەوانەوەی ئەوانە نەبوو؟"

مەستان و وەلی شەماڵ و هەموو ئەوانەی لەو دوو ماڵەدا دەژیان، هەر ئێسك و پێستیان پێوە مابوو، بەڵام بەکەیف و شاد بوون و لە بەیانییەوە تا ئێوارێ تاسەبارانە خۆیان ماندوو دەکرد.

مەستان دەیگوت:"زەوی شتێکی دیکەیە. زەوی شتێکی دیکەیە کاکە وەلی. بڕوانە، بنیادەمێکی وەك تۆ بە چل پەت و گوریسەوە بەخۆیەوە شەتەك دا."

وەلی شەماڵیش دەیگوت:"وەڵڵا شەتەکی دام. باشیشی شەتەك دام. جا ئێستا لێگەڕێ با گوندی خەرەندەکەیان لێ بدەن. ئاوەکە زوو هەڵدەچۆڕێ. لە ڕۆژێکدا."

پشت ئەو چنارەی گڵەکەیان لێ دێنا، قووڵ ببوو. مەستان گوتی:

"هەر بارانێك بباریٚ ئێرە دەبێتە گۆل، کاکە وەلی."

"دەی با ببیٚ، وشکی دەکەینەوە."

وەلی شەماڵ، مەرگ و ترس و تارماییەکە و هەموو شتێکی لەبیر چووبۆوە. هەموو شتێکی خاك... کە دادەنیشت بۆ ئەوەی پشوویەك بدات، یان ئارەقەی نێوچاوانی دەسڕییەوە و پاچ و پێمەڕەکەی دادەنا، چاوی لەسەر ئەو خاکە لەنگەری دەگرت، کە لە قامیشەڵانەکە دەرهێنرابوو. دوو پیاوە بەساڵاچووەکە وەك دوو منداڵیان لیٚ هاتبۆوە. دڵیان کەیلی خۆشی و شادییەکی منداڵانە بوو.

"سەیرکە کاکە وەلی... لێرە هەنار دەچەقێنم، لە بەشەکەی خۆمدا. ئەگەر ویستت لە بەشەکەی تۆشدا دەچەقێنم. هەناری باش. هەر یەکەی هێندەی سەری بنیادەمێك. هەنار میوەی بەهەشتە و لەو خاکەشدا باش پێدەگا. هەناری متوربەکراو... لێرەش هەنجیر دەچەقێنم... لە بەشەکەی خۆمدا. هەنجیری هەنگوینی، وەك کارەبا. لەوانەی شیلە لە درز و کونیانەوە دێتە دەریٚ. هەنجیرەکان هەتا زستانێش دەمێننەوە و بە سەر لك و پۆپەکانییەوە دەبرژێن. دیارە بە مەرجێك قومرییەکان تالانیان نەکەن. بەڵام چما دەهێڵم قومرییان لیٚ نزیك بێتەوە... تا ئێرەش پرتەقاڵی لیٚ دەچەقێنم. ئێرە پەنایە و بای ڕۆژهەڵات نایگرێتەوە..."

وەلی شەماڵ گوتی:"بای ڕۆژهەڵات نایگرێتەوە. قومرییەکانیشی لیٚ دەردەکەین. دەبیٚ ڕەزیش بچەقێنین، کەپریشی بۆ بکەین. هەر دەنکە ترێیەکی هێندەی سەرە پەنجەیەك. وەك زێڕ... هێشوو شەپۆل دەدەنەوە. وەك ئەوەی تیشك بارببیٚ. ئەسپ لە کێڵگەکانیدا بزر بیٚ...."

"باینجانی ڕەش و بریقەدار..."

"دەبیٚ بیرێکیش هەڵکەنین. هەرچوار قولانج هەڵکەنی ئاوی لیٚ دیٚ. ئاوەکەشی وەك سەهۆڵ، ڕێك وەك ئاوی کەرێزە."

مەستا جار نە جارێك دەیناڵاند:"ئای پشتم."

رۆژێك لە پێ کەوت. لە پێشدا لە تەندووری نۆبەتێدا هەڵدەچۆقی و دوای ئەوە سەرمای دەبوو و لەبەر قرچەی خۆرەتاوەکە خۆی هەڵدەخست و دەلەرزی. بەردەوام خۆی لەبەر یەك دەکێشایەوە و دەستەکانی وا دەکێشاوە دەتگوت دێنە دەرێ. کە ئێوارە دادەهات، نۆبەتێیەکەی دەبڕایەوە. هەموو رۆژێ لەگەڵ تاوهەڵاتنێ، مەستان نۆبەتێی لێ دەهاتەوە و لەپێی دەخستەوە. مەستان لە گڕی تا دا دەسووتا و پەلەقاژەی بوو. وڕێنەی دەکرد و دەیگوت:"مستەفا... ئاق یۆللی... بە سەر ئەسپێکی رووتەوە. رامەکە وەلی شەماڵ. رامەکە. را مەکە وەلی شەماڵ، رامەکە. ئەو هەمووە ساڵەی راتکردووە چیت وەدەست هێناوە؟ دەروێش، هۆی دەروێش، وەجاغت کوێر کردمەوە، یاخوا وەجاغ کوێر بی. هەر چۆنێك بێ میوەکانی هەتا پاییزێ... هەنارەکانی...

وەلی شەماڵ سەری زۆر قاڵ بوو. ئەگەر جاری جران بوایە، رێك دەچووە شارۆچکەکە و لاوێچێك "کینین"ـی بۆ ئەو برا ئازیزەی دێنا و لە ئازار و ژانە رزگاری دەکرد. بەڵام ئێستا بە ملی درێژ و لۆقە بنێس و لەڕبووەکانییەوە، هەر لە کەڕەی بەیانییەوە تا شەوێ خۆڵی بە کۆڵ دەکێشا و بەبێ ئەوەی پشوویەك بدات لە قوڵکەکەوە دەچووە قامیشەڵانەکە و لە قامیشەڵانەکەوە دەچۆوە لای قوڵکەکە.

مەستان کە لەبەر تاوەکە شەققەی ددانی دەهات، هەرای کرد:"جافر بەگ، دەستمان لێ هەڵگرە. ئەو خاکە هیی کەس نییە. هیی حکوومەتیش نییە جافر بەگ... ئاقچاساز زەویی خودایەو هەرکەسە و چەندی بیەوێ بۆ خۆی بڕ دەدات. بڕۆ و ملت بشکێنە جافر ئاغا ئۆز پۆلاد ئۆغلی، کۆسپ و تەگەرەمان مەخە سەر رێیە. ئەگەر هەزار پیاویشت هەبێ، کەس ناتوانێ مەستان لێرە دەربکات. بڕوانە، بڕوانە، بڕوانە جافر بەگ، بڕوانە چ خاکێکی بە ڕێژەوە. ئەمن ئێرە بەجێ بێڵم بچمە کوێ؟ کوێم هەیە رووی تێکەم؟"

جافر بەگ نەڕاندی:"بۆ کوێ دەچی، بچۆ."

مەستان پشتی قیت کردەوە و نەڕاندی:"دەستم لێ هەڵگرە کاکە جافر. پازدە پیاوی چەکدار نا، ئەگەر هەزار پیاویش بێنی، دەبێ بەسەر مەیتی مندا بڕۆی و ناتوانی لێرە دەرم بکەی. هیچ کەسیشت پێ دەر ناکرێ."

وەلی شەماڵ بەبێ ئەوەی جەواڵەکەی لەکۆڵی دابنێ، وەقسە هات:"چما ئەو خوارووەت نەدی؟ هەزار کەس، دوو هەزار کەس دەلینگیان هەڵکردووە و خەریکن جۆگەیەك لێ دەدەن بۆ ئەوەی ئاوەکەی ئاقچاساز بەتاڵ بکەن، جا بەتاڵیشی هەر دەکەن. هەموو دنیا بووەتە هیی

ئێوە، ئەم کاتەش هیی ئێوەیە، زۆنگاوەکەی ئاقچاسازیش دەبێتە هیی ئێمە ئۆز پۆلاد ئۆغڵی. ڕێی خۆت بگرە و لێرە بڕۆ..."

جافر ئۆز پۆلاد ئۆغڵی تاوێك متەقی لێوە نەهات و هەر وا بەبێ دەنگی و تووڕەییەوە قیت ڕاوەستا و ئاخرییەکەی سەری هەڵبڕی و گوتی:"ئەوەت لەبیر نەچێ مەستان. ئەوەت لەبیر نەچێت وەلی شەماڵ. ئەنگۆ بە چ شتێك پشت قایمن؟"

جا قەمچییەکی لە ئەسپەکەی سرەواند و بەرەو ئاناوەرزا تاوی دا.

کە گەیشتەوە شارۆچکە، ماندوو و شەکەت بوو. یەك سەر چووە ماڵی ماهیر قاباقچی ئۆغڵی و بە شڵەژاوی و لەبزێکی ئاگادارکردنەوەوە گوتی:"نەمگوت؟ نەمگوت ماهیر بەگی بەڕێز؟ ئەوەی نەدەبوو ببێ، بوو. گوندی ئاقچاسازیان بەتاڵان بردووە. سەدان گوندی وێکڕا دەستیان داوەتە دەستی یەك و کەناڵێکیان هەڵکەندووە. زۆر سەیرە ئاغا، سەیرە... ئیتر ئاقچاساز فت... ئاقچاساز هەر لە ئێستاوە وەك گۆشتی قوربانی پارچە پارچە کراوە... لە چیاکانی سەرەوە و دەشتەکەی خوارووەوە هەر کەس گوێی لێ بووە، دێ. هەرچی بیستوویەتییەوە دێ بۆ ئەوەی لەو لبادە کلاوێك بۆ خۆی دروست بکات. ئاقچاساز وەك مەلێك وایە لە قەفەزێ بەربووبێ. ئێستا ئەگەر ئەو گوندییانە جێ قوونی خۆیان لەوێدا خۆش بکەن، ئەتۆ ئیتر ئەگەر پیاوی وەرە و ئاقچاسازیان لێ بستێنەوە. وەك مار و مێروو، هەر وە... تێك چڕژاون... ئەگەر خێرا شتێك نەکەین و گوندی ئەو کەناڵە تەواو بکەن، ئاقچاساز لە ماوەی پازدە ڕۆژاندا هەڵدەچۆڕێ و وشك دەبێتەوە و جا ئەو جار وەرە سەیری ئەو ڕفێن ڕفێنەی بکە... چیی نەمابوو بمکوژن. ئەوە حەڤدە چەکداریشم لە پشت بوون، دەیانویست لێم بدەن. چاویان چووەتە تۆقی سەریان. هەر کامەیان وەك جانەوەرێکی خوێنمژ. بێت و حەوتوویەکی دیکەی پێ بچێ و ئاوا بڕوات، قولانجێکیش چییە لە خاکی ئەو ئاقچاسازە بە ئێمەمانان نابڕێ."

ماهیر قاباقچی ئۆغڵی بە ڕوخسارێکی ڕەنگ پەڕیو و دەست و دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:"چ بکەین؟ زۆر قۆڕە. خۆ ئەمن کارەکەم..."

چیی نەمابوو لە زاری دەرپەڕێ، بەڵام زۆر بەجێ توانیی قسەکەی بخواتەوە و باسەکە بگۆڕێ.

"ئەوە هەر من و تۆ نین کە دەبێ سوود لە ئاقچاساز وەرگرین... با قسەیەك لەگەڵ برادەران بکەین و تەگبیرێکی لێ بکەین و ئەو جانەوەرانەی لێ دەربکەین..."

جافر ئۆز پۆلاد گوتی:"زۆر چاکە، چاکە."

لە پێشدا سلێمان سۆوی بەنجە هات. بە دوای دا مامۆستا رۆستەم بەگ و دوای ئەویش زالم ئۆغلی و حاجی قۆرت بۆغا هاتن. سلێمان سامی و ئەوانی دیکەش هاتنە مالەکەی ماهیر قاباقچی ئۆغلی.

ماهیر قاباقچی ئۆغلی شلەژاو و توورە بوو. پەیتا پەیتا دەستی لێك دەخشاندن بەلام چیی نەدەگوت. دەتگوت چاوەڕییە. لەو جەنگەیەدا ئالاتەمیریش هات. لە رۆژەکانی پێشوو پیرتر ببوو.

لە کاتی قاوەخواردنەوەدا ماهیر قاباقچی ئۆغلی کەوتە قسەکردنێ:"هەمووتان دەزانن لە دەم ئاقچاساز چ باسە. ئەستەمە نەتانزانیبێ. دیارە لەوەش ئاگادارن کە گوندییەکان ئاقچاسازیان بەر لە وشکبوونەوەی وەك گۆشتی قوربانی بەسەرخۆیاندا دابەش کردووە. ئەمڕۆ جافر بەگ ئۆز پۆلاد ئۆغلی زۆر توورە و گرژ لە ئاقچاسازەوە گەڕایەوە. جا ئێستا چیی بە چاوی خۆی دیتووە، بۆتانی دەگێڕێتەوە. بۆیەشمان داوەت کردن کە هەموومان بەرژەوەندمان لە ئاقچاسازدا هەیە و دەمانبێ... دەبێ مشوورێکی لێ بخۆین. ئەگەر نەتوانین تەگبیرێکی لێ بکەین، ئەو کات دەبێ بیرێك لە حالی خۆمان بکەینەوە. چونکە ئەو گوندییە خۆشکانە، دینامێت لە بن کۆلەکەکانی دوایی دەولەتی تورکدا دادەنێن و دژی بەرژەوەندە نەتەوەییەکەمان لەگەل زلهێزێکدا دەسازێن و ئەو نیشتیمانە لەبنەڕەتەوە هەلدەتەکێنن. بە رای من ئەو دراما تراژێدییەی ئەمڕۆ لە ئاقچاساز دەینوێنن، سبەی دەتوانێ لە هەموو تورکیادا بەڕێوە بچێت و بیهێننە پێش چاوتان کە ئەو گوندییە رەشوڕووتانە، تورکیا بەسەرخۆیاندا بەش دەکەن. ئەمن کە لە ئەلمانێ بووم، بە چاوی خۆم دیتم جەماعەتی گوندی، چۆن ئەو ئەلمانە گەورەیەیان کاول کرد و چۆن هەموویان کردە تۆزی بانان و بەسەرخۆیاندا بەش دەکردن. بەلێ، بەو ئاوانەی خۆم دیتم برادەرینە، وەرن بزانن ئەگەر ئەو دوایین... ئەو دوایین... راشکاوانە بلێم ئەگەر ئەم... خۆ تێگەیشتن، ئەگەر نەبوایە، ئەلمان تێدا چوبوو. بۆیە بارودۆخە گشتییەکە تا بلێی کارەساتبارە برادەرینە. فەرموون، فەرموون برای گەورەمان جەنابی جافر ئۆز پۆلادزادە، فەرموو ئەوەی بەچاوی خۆت دیتووتە بیگێڕەوە. ئێمە دل و گوێمان لەلاتە، تکا دەکەم. ئەو نیشتیمانە... و ئەو دوایین دەولەتەی تورك... بە تایبەتی سەرنج بدرێتە ئەو خالە. بەلێ..."

جافر ئۆز پۆلاد ئەوەی بە چاوی خۆی لە ئاقچاساز دیتبوو، هەمووی بۆ لەبنی کوولەکە دان. دەنگێکی یەك ریتم و شەکەت و وەڕەزکەری هەبوو.

سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە لەجێی خۆی دەرپەڕی و قسەی پێ بڕی:"ئەتۆش، ئەتۆش، ئۆز پۆلاد ئۆغلی جافر بەگ، بە حەڤدە سواری چەکدارەوە خۆت رانەگرت و رات کرد، ها؟ لەبەر مەستانێکی مردەلۆخە هەلاتی، مەستانێکی پیر و زورهان..."

"بەلێ، راکردنم پێ باشتر بوو لە خۆڕاگرتن سلێمان ئاغا. جا بۆ درۆیان بکەم. هەر ئاوڕێکیشم نەدایەوە. چاوی چوبووە پشتی سەری. بۆ زەوییەك نا، بەلکو بۆ بستۆکە خاکێك هەموو تورکیای دەدایە بەر فیشەك... دیتم کە..."

"چاکە، چاکە."

سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە ئەوەی گوت و لە جێی خۆی دانیشتەوە و دەستی بە قسە کردەوە:"چاکە، چاکە، یانی ئاوا؟ یانی ئێمە ئەو نیشتیمانەمان لە چنگی کافران دەرهێناوەتەوە کە ئۆز پۆلادزادەی ئازیز، دەرمان هێناوەتەوە کە مەستانێکی مردەلۆخەی لووتی بگری گیانی دەردەچێ، بێ و دینامێت و بارووت بخاتە بن کۆلەکەی ئەو نیشتیمانەوە، بن هیم و بناغەی دوایین دەولەتی تورکەوە و بیتەقێنێتەوە، ها؟ رزگارمان کردووە بۆ ئەوەی سەد هەزار سەگی برسی، گوندیی لەبرسان مردوو لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە و ئاوەکەی ئاقچاسازمان، نیشتمانمان وشك بکاتەوە، ها؟ چاکە، چاکە. وەلڵاهی هەر زۆر زۆر باشە... و ئەتۆش ئۆز پۆلاد ئۆغلیی رەسەن و بە رەچەلەك بە خۆت و حەڤدە چەکدارەوە دوو قاچیش قەرز بکەیت و بۆی دەربچیت و ئاوڕێکیش نەدەیتەوە... کوڕە هەی بارەقەلڵا، ئافەرم... هەی نەمری...ئافەرم، ئافەرم جافر هەزار ئافەرم..."

جافریش دەستی پێ کرد:"هەر دەلێی باش تێنەگەیشتی ئاغا. مەستان دەستی لە گیانی خۆی شوشتبوو. چاوەکانی وا لە ژێلڵا هاتبوون ... گوندییەکان کە جۆگە و کەنالیان لێ دەدا، سوپایەك بوون. سوپایەکی چاو لە ژێلڵاهاتوو. هەر لە کەڕەی بەیانییەوە هەتا نیوەی شەوێ و لە نێوەی شەوێوە تا کەڕەی بەیانی کار دەکەن. ئەمن هیچ، بەخوای سوپایەکیش لەمەودوا باشاری ئەوانە ناکا."

سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە بە هەڕ و گیڤەوە گوتی:"ئەمن دەرەقەتیان دێم."

ئالاتەمیر کە دەستی لەسەر ئەژنۆی دانابوون، هەروا کە چاوی لە پێش خۆیەوە بڕیبوو و دەیڕوانی، گوتی:"من دەیاننانسم... ئەو گوندییانە من دەیانناسم. م م م ن ن ... کەس باشاریان ناکا. ئەگەر بە قسەی من دەکەن، دەست لە ئاقچاساز هەلگرن..."

ئاوڕی لە سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە دایەوە و چاوە ڕەش هەڵگەڕاوەکانی قیچ کردن و بە تیزە بزەیەکەوە گوتی:"ئەتۆ سلێمان ئاغا، تۆ؟ تۆ تەنانەت گوندییەکیشت لە ئاقچاساز پێ دەرناکرێ."

سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجەش وەك برێشکە هەڵبەزییەوە:"هەی ترسنۆکینە، ترسنۆکینە... من پێتان دەڵێم ئەسلان سۆوی پەنجە کێیە... ئێوە ئەوان بە من بسپێرن. لە دەم ئاقچاساز نەك گوندی، تاقە باڵندەیەك، مێشوولەیەکی وزەوزکەریش چییە ناهێڵمەوە. هەر لە بەیانییەوە مێشوولەیەکی وزەوزکەر."

"سەیر بکەن ئاغای من، کاکی سۆوی ئەسلان پەنجە..."

"ئەسلان سۆوی پەنجە."

"بەڵێ، بەڵێ. ببوورن، ئەسلان سۆوی پەنجە، گوێ بدەیە... خەتەرە. نابێ بەبێ تاقیکردنەوەی دەراوەکە، لە ئاوێ بدەین. لە سەر ئەو گۆی زەوییە هیچ شتێك لەو جووتێرە مەترسیدارتر نییە کە وەك قوڕنوو بە زەوییەکەوە نووساوە و چێژی لە خاکەکە وەرگرتووە... هیچ شتێك هێندەی ئەو گوندییە خەتەرناك و تێکدەر نییە کە تامی خاکی چێشتووە."

"کوڕە ئەمن گوندی باش دەناسم. ئەنگۆ بە منیان بسپێرن. ئەوان لە ئەستۆی من. هەر لە سبەی بەیانییەوە هیچ گیانلەبەرێك ناتوانێ لە ئاقچاساز نزیك بێتەوە. تەنانەت ئەو باڵندە پەمەییانەش ناتوانن بەسەر ئاقچاسازدا بفڕن و لەوێ بنیشنەوە. سەیرکەن برادەرینە..."

"گوێ بدەنێ..."

"قسەیەکم پێتان بوو، قسەیەکی کۆن. نەکا زاری گورگ بگاتە خوێن. نەکا، نەکا نەکا. نەکا زاری بگاتە خوێن. بێت و گورگ دەمی وەخوێن بکەوێ، جا ئەو کاتەیە دەبێ لێی بترسی. بێت و گوندی تاقە جارێك پێمانەوە بدا، ئیتر بە زەبری حوکمەتیش دەرەقەتیان نایەین. خۆ بێت وا بێ تازە سەرمان تێدا چووە. ئێمە دەبێ بە تەوس و پلار و تانە و تەشەر دەریانپەڕێنین و ئەگەر نەشکرا..."

"تکایە گوێ ڕاگرن..."

"ئەگەر نەکرا.

"جوان ئاگادار بن و هەرگیز نەهێڵن گورگ دەمی بگاتە خوێن."

"نەگاتە خوێن..."

ماموّستا رۆستەم بەگ ئەوەی گوت و لە حاڵێکدا دەموچاوە درێژوکە و خرپنەکەی سوور هەڵگەڕابوو، لەسەری رۆیشت:"سلێمان بەگ لە هەمووومان باشتر لە زمانی ئەو بوونەوەرانە تێدەگات کە پێیان دەڵێن دێهاتی. سلێمان ئاغا لە هەر هەموومان باشتریان دەناسیٚ."

"لەم دنیایەدا، لەم سەرزەمینەی چوکووراوادا کەس لە من باشتر ناتوانیٚ گوندییەکان بێهیوا بکات."

سلێمان ئەسلاّن سۆوی پەنجە هەستا و دانیشتەوە. ماهیر قاباقچی ئۆغلێیش گوتی:"گویٚ بدەنیٚ، هیچ کەس وەك سلێمان ئاغا ناتوانیٚ... ئاقچاساز رزگار بوو."

حاجی قۆرت بۆغاش کە بەبیٚ دەنگی دانیشتبوو، گوتی:"رزگار بوو."

ئالاتەمیر وەقسە هات:"گوندی پێیان بگاتە زەوی، ئیتر هیچ گیانلەبەرێك باشاریان ناکا."

ماهیر قاباقچی ئۆغلّی بە دەنگی بەرز گوتی:"بفەرمووون."

سلێمان ئەسلاّن سۆوی پەنجە هەستایە پیٚ، ئامبازی ئالاتەمیر بوو و بەسەریدا نەڕاندی:"یانی ئێستا وات لیٚ هاتووە قسە لە قسەی مندا بکەیەوە، سەی گڕویٚ؟ هەر بەو دوو قامکەم، ئەو دوو چاوە ملبۆقەت دەردێنم... کوڕە وەرە لەو سەیرەی کێچیش دەڵیٚ ئەزم هەڵدەبەزم..."

هەر چۆنێك بیٚ هەستان و نێوبژیوانییان کردن. ئالاتەمیر تیٚ کەوتبوو، دەستی لەسەر ئەژنۆی دانابوو و بە شلّەژاوییەوە بلّێی و نەلّێی بە رەنگی هەڵبزرکاوەوە و لە حاڵێکدا خێرا خێرا چاوی دەترووکاند، بە سەرسووڕمانەوە گوتی:"بۆ چ بووە، چ بووە؟ خوای نەکردە هەڵەیەکم کرد؟ نە بەخوای، نا، برادەرینە، دوور لە رووتان..."

وەردە وردە وەخۆی هاتەوە، لێوەکانی دەلەرزین و رەنگ و رووی زەردتر هەڵدەگەڕا. ماهیر قاباقچی ئۆغلّی بە گوڕە گوڕەوە گوتی:"گەورەیی بفەرموون، گەورەیی بفەرموون تەمیر ئاغا."

"وەی بە چاوان... بە چاوان... ماهیر بەگ."

رۆستەم بەگ:" ببوورە ئاغا ئەفەنی، ئاغامان، سلێمان سۆوی ئەسلاّن پەنجە..."

جا سلێمان دەسبەجیٚ بۆی راست کردەوە:"ئەسلاّن سۆوی پەنجە."

حەزی لیٚ نەبوو کەس بە سۆوی ئەسلاّن پەنجە بانگی بکات. لە حاڵێکدا هێشتا لە تووڕەییان سوور سوور هەڵگەڕابوو و ئاگری لیٚ دەبووە و دڵی وەك باڵی چۆلەکە فڕەی دەهات، نەڕاندی:"ئاخ، ئاخ، ئاخخخ، هەرچی بەسەرمان دیٚ، هەمووی گووی ئەو دۆست و برادەرانەیە دەیشێلین کە ئەو گوندییە ترسنۆکانە بە بنیادەم دادەنێن..."

بە حاڵە حاڵ هەستایە سەر پێ و بە لەبزێکی متمانەبەخۆوە و توند و قایم لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:"جا ئێوە بەیانی گوێ بدەنە ئەو هاوار و گریانەی لە دەم ئاقچاسازەوە دەگاتە ئاسمان. ئەمن دەبێ جارێ بڕۆم و تەدارەکی کارەکە رێك بخەم. بەر لەوەی دەمی گورگ بگاتە خوێن... خوا حافیز."

ئەوەی گوت و دەستی راوەشاند و ڕۆیشت و ئەوانیش تا بەر دەرگا بەڕێیان کرد.

جافر ئۆز پۆلاد گوتی:"سلێمان ئاغا راست دەکا. نابێ بهێڵین زاری گورگی بگاتە خوێن."

حاجی قۆرت بۆغا:"خەتەرە. خەتەرە گورگ دەمی بگاتە خوێن، زۆر خەتەرە. هەر ئەوەندەی گوندی لێی روون بێتەوە کە دەتوانێ دەست بەسەر زەویدا بگرێ، ئیتر کار لە کارێ دەترازێ."

مامۆستا رۆستەم بەگ کە روخساری گەش ببۆوە، وەقسە هات:"راست دەکەی، راست دەکەی."

ئالاتەمیریش گوتی:"ئەمن رای خۆمم گوت. سلێمان ئاغای ئەسلان سۆوی پەنجە لە خۆڕا دەرهەڵبوو[1]. ئەمنیش هەر گوتم، گوندی هەر ئەوەندەیان بەسە پێیان بگاتە سەر زەوییەکەو، ئیتر بە حەزرەتی فیلیش دەر ناکرێن. بێت و وای لێ بێ، تەنانەت حکوومەتیش ئەستەمە باشاریان بکات."

هەموان هەستانە سەر پێ. ئالاتەمیریش هەستا. هێشتا هەر حەپەسابوو. بۆی نەدەچۆوە سەر یەك کە ئاغاکان لە سەر چی وا لێی تووڕەن.

"ئێستا بە هەناران، هەناران... ئێستا بە کێڵگەکان، بە کێڵگەکان... بەو کێڵگانەی پلینگیان لێ دەرنەچێ... ئێستا بە زەوی، بە زەوی، بە زەوییەك کە ئەگەر گیانی لێ بچێنی شین دەبێتەوە. ئێستا بە شلێرەجاڕ، بە شلێرەجاڕ... ئێستا بە شلێرەجاڕ."

مەستان لەبەر تاوەکە، لە تەندووری تادا هەڵدەچۆقا، تەزووی سەرمای پێدا دەهات و وەك لاواندنەوە تێی هەڵکردبوو:"ئێستا بە هەناران، بە هەناران.... ئێستا بە زەوی، بە زەوی، ئێستا بە شلێران، بە شلێران..."

وەلی شەماڵێش بەبێ ئەوەی پشوویەك بدات، خۆڵی بۆ قامیشەڵانەکە دەکێشا. بە بارستایی جەواڵە خۆڵەکانەوە رای دەکرد... هەتا بە پێنج کەسان ئەو جەواڵەیان پڕ دەکرد، ئەو بە کۆڵی دادەدا و ئەوەندەی یەکدابەدوو هەڵیدەڕشت و بە غاردانێ دەگەڕایەوە و هەرای دەکرد:"زوو بن، خێرا بکەن، دەی گورج بن و رامەگرن."

---

[1]. دەرهەڵبوون: تووڕەبوون، هەڵچوون. لە دین دەهری بوون...

دەستە سوارێك پەیدا بوون. وەلی شەماڵ بە ترسەوە و بە زراوچووییەوە خۆی گەیاندە مەستان و گوتی:" وا دێن. بۆنێ خەبەرێکی ناخۆشم لەو هاتنەیانەوە بۆ دێ."

"ئێستا بە هەناران، بە هەناران...."

"زۆر زۆریشن..."

"های ی ی ئێستا بە زەوی ، بە زەوی..."

"خودا بکا گەرێکمان پێ نەکەن."

"ئێستا بە شلێران، بە شلێران... بە شلێرە و بە پەپوولان..."

"بە زاتی خودای ئەوانە بە خێر و خۆشییەوە نایەن. کورە خۆ چەکداریشن کاکە مەستان."

"هەی لە گوڵان و لە گوڵان، لە گوڵی پشکووتوو..."

خۆر بە تاقی ئاسمانەوە راسابوو و قرچەی گەرماکە پیاوی دەسووتاند. هەموو شتێك لە پشت هەڵمە دووکەڵ ئاساکەوە دەتگوت لە هەڵکشان و داکشان دایە. دار هەنار لە ئاقچاسازەوە هەتا دەریای نێوەڕاست پشکووتبوون. سووراییەك بە دەشتەکەوە، لە ئاقچاسازەوە دایگرتبوو هەتا دەریای نێوەڕاست. لە ژێر ئەو هەتاوە هەڵماوییەدا، دەشتە سووربواوەکە شەپۆلی دەدا. سوورایی دەشتەکە لە هەورەکانیشدا رەنگی دابۆوە. گێژەڵۆوکەی سووربواو، بە چەرخ و خول، تەندوورەی دەکێشا و کۆڵەکەی دەکرد و پەیتا پەیتا دەگەیشتێ. سوورەگوڵەکان لە بەر مێشەنگوین دیار نەبوون و هەتا دەریای ناوەڕاست هەر وزەوز بوو. لە هەنارستانەکەدا دنیایەك لەجۆش و خرشدا بوو. دەشتێکی پان و بەرین بە دەم دەریای نێوەڕاستەوە و پڕ لە سوورایییەکی شەپۆلداری هەڵماوی، بە مارەکانییەوە، بە مێشەنگوینەکان و پەپوولەکانییەوە، بە جڕ و جانەوەری هەزار رەنگ و هەزار و یەك دەنگییەوە، ساز و ویرەویر و هەنگەمە و قریوەکە..."

بەسەریدا نەڕاندی:"مەستان، مەستان."

"جارێ بە هەناران، بە هەناران."

"ئێرە زەوی و زاری بابتە مەستان؟ بە زمانی خۆش پێت دەڵێم بار و بنەت خڕ کەوە و لێ دە بڕۆ، تێگەیشتی؟"

"وەشوێن کاری خۆت بکەوە سلێمان، کارت بە کاری من نەبێ."

"مەحاڵە بهێڵم کەسی وەك ئێوە ئەو ئاقچاسازە قۆرخ بکەن. پێم گوتی سڕ و سیپاڵتان هەڵگرن و ملی خۆتان بشکێنن ئەگینا..."

"دابەزە و کووپێ قاوەی تاڵمان لەگەڵ بخۆوە سلێمان. بەو جۆرەش مەنەڕێنە. ئەمن ناتوانێ لێرە بۆ هیچ کوێی دیکە بچم سلێمان. نۆبەتێ خەریکە دەمکوژێ. وەی وەی ی ی ی باوکە سووتام، هەڵدەلەرزم سلێمان.... جارێ بە هەناران، بە هەناران... سلێمان..."

"ئەمن قاوەی تۆ ناخۆمەوە مەستان. ئەگەر دەسبەجێ سرِ و سیپاڵت کۆ نەکەیەوە، ماڵەکەتت بەسەردا دەڕووخێنم...."

بێدەنگ بوو و بە نێوچاوانێکی گرژ و تاڵی وەك قوزەڵقۆرتەوە بەسەر خوانی زینەکەیەوە مایەوە. مەستان هیچی نەگوت. وەلی شەماڵ لە بن جەواڵەکەدا نەیدەزانی چ بکا. هەر دەتگوت بچووکتر بۆتەوە. لە ناخی مەستاندا دەشتە سوورەی بە گوڵەهەنار داپۆشراو شەپۆلی دەدا و دەکوڵی:"ئێستا لە هەناران، لە هەناران..."

سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە بە خۆی و پتر لە چل چەکدارەوە، مەستان بە لەرزە لەرزەوە و وەلی شەماڵ لە بن جەواڵە خۆڵەکەدا کرووشمەی کردبوو و بەرامبەر یەك راوەستابوون و کەس متەقی لێوە نەدەهات. دەنگێکی درێژ و تیژ لە دوورەوە لەوبەری ئاقچاسازەوە، بەر هەوا و ئەو بێدەنگییە دەکەوت کە وەك شووشەیەك تا ئاسمان کشابوو و دەیلەراندەوە. هیچ کام لەو سێ پیاوە ئاگایان لەوە نەبوو کە چەندە چاوەڕوان بوون و بیریان کردەوە. ئاخرییەکەی دەنگی سلێمان ئاغا بوو کە هەمووانی وەخۆ هێنایەوە:"خانووەکان ئاگر بدەن."

مەستان وەك فەنەر لە جێی خۆی دەرپەڕی و توند رکێفەکەی سلێمانی گرت:"نەکەی سلێمان، نەکەی. ئەتۆ من دەناسی، ئەمنیش ئەتۆ باش دەناسم. زۆرمان نان و نمەکی یەکتری کردووە، قاوەمان خواردووەتەوە، کاری وا لەگەڵ من مەکە."

سلێمان بەبێ ئەوەی متەقی لێوە بێ، قەمچییەکی لە ئەسپەکەی سرەواند و بەرەو ئەودیوی چنارەکە لێی خوڕی. مەستان کە دەستی لە رکێفەکەی بەربوو، خۆی بە عەرزی دادا و رێك لەو دەمەدا بڵێسە لە هەر دوو کەپرەکە بەرز بوونەوە. مەستان هاواری کرد:"وەلی، کاکە وەلی، ئەو تفەنگەم بۆ بێنە."

وەلی شەماڵ جەواڵە خۆڵەکەی فڕێدایە عەرزی و بە قەڵەمبازێك و ئەوەندەی چاوترووکانێك، تفەنگەکەی لە نێو بڵێسەی ئاگرەکەدا هێنایە دەرێ و دایە دەست مەستان. مەستان هەر دەستی گەیشتە تەفەنگەکەی، رووی لە سلێمان کرد و پەنجەی بە پەلەپیتکەدا هێنا. سلێمان لە پشت ئەسپەکەیەوە بەربۆوە و لە خۆڵ گەوزی. سێ فیشەکی وێ کەوت و مێشکی پژا و خوێنی فیچقەی کرد. سوارەکانی دیکەش بە دوای تەقەکەی مەستاندا، سەری

ئەسپەکانیان وەرسووڕاندەوە و لە چاوترووکانێکدا لە چاوان ون بوون. وەلی شەماڵیش لە لاقانی وەراند و بزر بوو.

مەستان لەسەرخۆ وەك نەبای دیتبێ و نەبۆران، لە جێی خۆی هەستا و چووە بن چنارەکە. تەرمەکەی سلێمان تۆزێك لەولاترەوە لە سەر پشت کەوتبوو و خوێنی لەبەر دەڕۆیی.

منداڵ و نەوەکانی بانگ کرد و بە دەست شوێنێکی نیشان دان و گوتی:"لێرە کۆ بنەوە."

بانگی خوارزاکانی وەلی شەماڵیشی کرد:"وەرن، وەرنە ئێرە..."

هەموان کۆ بوونەوە. شڵەژابوون. پەیتاپەیتا ئاوڕیان دەدایەوە و سەیری تەرمە لەخوێنگەوزیوەکەی سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجەیان دەکرد.

"من وا رۆیشتم. بە تووتووش ئێرە بەجێ مەهێڵن. کەپرەکە هەڵبەستنەوە."

تفەنگەکەی لە دەستی بەربۆوە و بە دەستی شۆڕەوەبووەوە وەڕێ کەوت. دوای ئەوەی تۆزێك لەوێ دوور کەوتەوە، دەستی کرد بە خولانەوە بەدەوری خۆیدا. دەخولایەوە و بە چەرخ و خول بەرەو پێشەوە دەڕۆیشت. تێی هەڵکردبوو. گۆرانییەکی کۆن، گۆرانییەك کە وەك دەڵێن لە یەکەم رۆژەکانی خولقانی زەوییەوە مابۆوە، دەیگوت:"جاریێ بەرەو هەناران، بۆ هەناران... جاریێ بە هەناران، بە هەناران،... جاریێ بە هەناران، بۆ هەناران..."

دەیچڕی و دەخولایەوە و دەخولایەوە و دەیچڕی. بە چەرخ و خول بە نێرگزەجاڕەکەدا تێپەڕی و گەیشتە پنگەڵانە پشکووتووەکە. کێڵگە یونجەکەی بڕی. گەیشتە گردەکە، لە داوێنەکەی وەسەر کەوت. هەڵدێری بناری گردەکە بەرز بوو و ئاوی زەلکاوەکە لەو خوارەوە گێژی دەدا. مەستان هەروا تێی هەڵکردبوو...

دەخولایەوە. دەتگوت سەما دەکا، سەمایەکی سەیر و سەمەرە. خەواڵووانە و بە چەرخ وخول گەیشتە سەر هەڵدێرەکە و لەوێشەوە چەند خولێك سووڕایەوە و ئەوجار لەسەر خۆی، بەربۆوە نێو ئاوەکە. زەلکاوەکە لەبەر یەك کشایەوە و قووتی دا. تاوێك دواتر کەلێنی ئاوەکە پڕ بۆوە.

## ٧١

ڕەشید ئاغا حەوتووەك دواتر هەواڵێكی خۆشی لە دەروێش بەگەوە هێنا:

"سڵاوی ماهیربەگی برامان بگەیەنە و هەر دوو چاویم بۆ ماچ بكە. ئاگام لە هەموو كار و كردەوەی هەیە. میللەتی تورك هەرگیز ئەو هەوڵ و تێكۆشان و خزمەتانەی ئەو لەبیر ناكات كە ئەو لە پێناوی ڕەچەڵكی ئۆغوزماندا دەیانكات. ئەو یەكێكە لە گەورەترین پاڵەوانەكانی ئۆغوز و لەوانەشە پێشەنگی هەمووانیش بێت. دیارە كاتێك ئەو وەك گیانفیدایەكی ڕێی نەریتەكان دێتە مەیدانێ، هەندێ كەسی بوودەڵە و هیچ و پووچ گاڵتەی پێ دەكەن. هەندێ بە هاونیشتمانەكان و كەسانی بێ ڕەگیش بۆ سووكایەتیپێكردنی لە هیچ ناپرینگێنەوە. هەر ئەوەندەیە با ئەو برایەمان لەبیری نەچێ لەو كاتەدا كە باری قورسی نەریتی ئۆغوز دەخاتە سەر شانی، وەك شانازیی هەرە گەورەی پاڵەوانی تۆرەمەی ئۆغوز ناوی لە مێژوودا دەنووسرێ. ئەو ئەگەرچی وەك ئەل ئەرسەلان و چەنگیزخان لە مەیدانی شەڕێ تەپۆڵكە و گردی لە تەرم و كەلاكی دوژمن دروست نەكردووە، بەڵام كارەكەی زۆر گرنگتر و بە بایەخترە و پاڵەوانێتیی ئەو لەوانیش پیرۆزتر دەبێ. چونكە ئەو ویستوویەتی كەسایەتیی خۆی بخاتە مەترسییەوە لە پێناوی ئەوەدا كە نەریتێكی ڕەسەنی لەبیركراو زیندوو بكاتەوە. ئەو پەڕی ڕێز و حورمەتم بۆی هەیە و پێی بڵێن جگە لە ماهیر بەگی قاباقچی ئۆغلێی ناودار كە ئەو هەمووە كارە بەنرخەی كردووە، لەودنیایەدا برایەكی دیكەم نییە. ئەو تاقە برای هاودەم و هاودڵی منە."

بۆ چۆنێتیی بەڕێوەچوونی نەریتەكەش، ڕێوشوێنێكی تێر و تەسەلی نووسیبوو و ناردبووی...

دەروێش بەگ داوای كردبوو ڕێوڕەسمی ئاشتبوونەوەكەیان ڕۆژی سێ شەممە نۆزدەی نۆڤەمبەر بێ. ڕۆژەكانی سێ شەممە لە شارۆچكە حەفتەبازاڕ بوو و حەشیمەتێكی زۆر لە گوند و شارۆچكەكانی دەوروبەرەوە و تەنانەت لە ناوەندی شاریشەوە دەهاتنە شارۆچكەكە.

لەگەڵ ئەوەدا دەروێش بەگ لە شار و گوندەکانیشی رادەسپارد و جارچی جاڕیان دەکێشا:"هۆۆۆۆی خەڵکینە، دوایی نەڵێن نەمانبیستووە، سێ شەممەی داهاتوو دەروێش بەگی ساری ئۆغڵی و ماهیر بەگی قاباقچی ئۆغڵی بە پێی ڕێوڕەسمی ئۆغوز ئاشت دەبنەوە. هاتنی ئۆمەتی محەمەد و خۆشەویست و لایەنگرانی میللەت و ئەو کەسانەی ڕێز لە باپیرە ئۆغوزمان دەگرن، بۆ ئەو ڕێوڕەسمە پیرۆزە و دیتنی چۆنێتیی بووژاندنەوەی نەریتی سێ هەزار ساڵەی ئۆغوزمان خێر و بەرەکەتی پێوەیە. هۆۆۆۆی خەڵکینە، مەڵێن نەمانبیست و دەرفەتی بەشداربوون لەو ڕێوڕەسمی ئاشتبوونەوەیەدا لە کیس خۆتان مەدەن. لەبیرتان نەچێ، بێت و بەشدار نەبن وەك ئەوە وایە لە گەورەیی و رەحمەتی خودای گەورە و باپیرە ئۆغوزی مەزنمان بێبەری بن. ... هۆی خەڵکینە..."

خۆ ئەگەر جارچییش جاڕی نەدابایە، دیسانیش لە رۆژی ئاشتبوونەوەکەیاندا خەڵك هەر لە حەوت ساڵانەوە بگرە هەتا حەفتا ساڵانە بە پیاو و ژنەوە وەك لافاو روویان لە شارۆچکەکە دەکرد. چونکە هەر هەمووان چەند مانگێك بوو بە هۆی ئەو بانگەشەیەوە کە بە سەرۆکایەتیی ماهیر قاباقچی ئۆغڵی لە سەر ئۆغوزو نەریتەکەی دەکرا، ئاگادار ببوون. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆربەیان دەیانزانی مەسەلەکە چییە، دیسانیش، بە باوەڕێکی پتەوتر لە باوەڕی دەروێش بەگ و ماهیر بەگەوە لەو ڕێوڕەسمەدا بەشدار دەبوون یان لانیکەم وایان دەنواند، زۆر لەوانیان پتر باوەڕ بەو شتانەیە. دەشیان زانی ئەو تای شێتییەی ئۆغوز لە ماوەی چەند حەوتوویەکدا دادەمرکێتەوە. ئەوەشیان دەزانی لەو نێوەدا هەر شتێك روو بدات، سەرەڕای هەموو هەوڵەکانی ماهیر بەگ، هەر بەسەر ئەو دەهات و دەبووە گاڵتەجاڕی هەمووان.

رۆژە دیاریکراوەکە گەیشت. هەر بە راستی خەڵکەکە لە هەموو لایەکەوە وەك لافاو روویان لە شارۆچکەکە کردبوو. رووداوێکی ئاوا لەوانەبوو هەر لە هەزار ساڵدا جارێك هاتبایەتە پێشێ. کەس نەیدەزانی کەنگێ جارێکی دیکە بەگەکان ئاوا تێك بەر دەبنەوە و سەیر و خۆشییەکی ئاوا هەڵدەکەوێتەوە. ئەسپ سوار و پیادە و کەر سوار و عارەبانە و منداڵ بە کۆڵ و پیری پشت کۆماوە لە هەموو لاوە لە چیاو دەشتەکانەوە بەرەو شارۆچکەکە بەڕێوە بوون. هەمووان باشترین جلوبەرگەکانی خۆیانیان لەبەر کردبوو و خۆیان تازە کردبۆوە. بە ڕێکەوت هەواکەشی تاو و ساو بوو. رۆژێکی ساو و سامالی پاییز بوو..

بازاڕەکە، ئەو مەیدانەی حەفتەبازاڕی تێدا بەڕێوە دەچوو و ڕێگە دوور و درێژەکانی نێوان ماڵی دەروێش بەگ و ماهیر بەگ دوو سێ سەعات پێش نیوەڕۆ ئەوەندە قەرەباڵغ بوو دەرزیت هەڵاویشتبایە نەدەکەوتە عەرزی و سەگ خاوەنی خۆی نەدەناسییەوە. دەتگوت بازاڕی شامە.

چیای دوڵدوڵ لە دوور دوورەوە، نوقمی نوور، بە هەڵمێکی چڕی سووردا ڕۆچوبوو و لووتکەکانی بەفرێکی سپییان لەسەر کەوتبوو. جوان و بەشکۆ و تیشکی خۆر و سوورایییەکی مس باو، لە بەفرەکەوە دەترووسکایەوە. ڕووت و قووت، هاتبووە نزیکتر و دەتگوت بەرەو شارۆچکە دێ.

دەروێش بەگ دوای ئەوەی بیستی خەڵکەکە بەرەو شارۆچکە وەڕێ کەوتوون، لە خۆشییان شاگەشکە ببوو و بە کەیفخۆشییەوە قسەی دەکرد و نەیدەبڕییەوە:

"ئەو خەڵکە، ئەو نەوە و نەتیجەیەی ئۆغوز سەد ساڵە تینووی نەریتەکانی خۆیانن. گوندییەکان مەزرا و کێڵگەی خۆیانیان جێ هێشتووە و کرێکار دەستیان لە کار هەڵگرتووەوە و دێن بۆ ئەوەی بووژانەوەی یەکێك لە نەریتە کۆنەکانی خۆیان بە چاو ببینن. ئۆغوز لەناو ناچێ. ئەو جۆش و خرۆشە لە رادەبەدەرە نیشانەی ئەو راستییەیە..."

نزیك نیوەڕۆ ئیتر شارۆچکەکە جێی کەسی دیکەی نەدەبووەوە. بەر دەرگا و پەنجەرە و سەربان و سەر دیوار و دراەکانیش لە حەشیمەت هەر جمەی دەهات. ئەوانەی دەهاتنە شارۆچکەکە، هێشتا چەند کیلۆمەترێك بەر لەوەی بگەنێ، لە غەڵبەغەڵب و هەڵڵا و هەنگەمەکەڕا دەیانزانی شتێك لەگۆڕێیە. حەپە و وەڕینی سەگەل و زەڕی گوێدرێژ و حیلە و کوڕژنی ئەسپ و قووقەی کەڵەشێر کە هەر بە غەریزە زانیبوویان بارودۆخەکە ئاسایی نییە، لەگەڵ هەڵڵا و هەنگەمەی بنیادەمان تێکەڵ ببوو. شارۆچکە لە گەرمای پاییزدا بۆنی ئارەقەی جەستە و چەرمی تازە و کەڕووی لێ دەهات.

ماهیر کە لە ژیانیدا ئەوەندەی حەشیمەت نەدیتبوو، هەر چاوی پێیان کەوتبایە، تێك دەچوو. ژنەکەی و کیژۆڵەکەی کە لە کۆلێژی ئارناووت کۆی ئەستەنبۆڵ دەرسی دەخوێند، کوڕە قوتابییەکەی و خزم و کەسە نزیکەکانی کە لەبەر ئەوان ماڵەکەی جێی کەسی دیکەی نەدەبووەوە، ئەوەندەی دیکەیان شڵەژاندبوو.

ژنەکەی ماهیر بەگ پەیتا پەیتا دەینالاند و دەگریا و بە دەستەکانیدا دەنووسا و لەبەری دەپاڕایەوە:

"مەکە، ئەو کارە مەکە. ئەو پەڵەی شوورەییە هەتا رۆژی قیامەتێ بە تەوێڵی منداڵەکانمەوە دەمێنێتەوە. سبەی رۆژێ لە رۆژنامەندا دەنووسرێ و بە هەموو ئەو وڵاتەدا بڵاو دەکرێتەوەو دەبیتە بنێشتەخۆشکەی سەر زاری خەڵکی و ئیتر منداڵەکانم لە هیچ کوێ سەریان هەڵنایە. نەوەکانیشم هەر لەو ئاگرەدا دەسووتێن کە تۆ هەڵگیرساندووە. هەتا هەین هەر دەبینە گەپجارِ. ئەوەندەی ملکەی هەمانە لێمان سەر و زیادە، ئێمە زەویمان بۆچییە؟ یاخوا ئەو ئاقچاسازە کاول بێ..."

ماهیر بەگ هەروا بێدەنگ بوو و لەسەر مۆبلەکەی کرووشمەی کردبوو و رەنگی بە روویەوە نەمابوو.

دەنگی کچەکانی و ژنەکەی و ژنی خزم و کەس لە ژوورەکەی تەنیشتەوە دەبیسترا کە یەك پشوو تووك و لەعنەتیان لە دەروێش بەگ دەکرد. پیاوەکانیش چەندی جنێوی دەیانزانی بە دەروێش بەگ و نەریتەکەی ئۆغوزیان دەدا.

ماهیر بەگ کە بەڵێ، گیانفیدای ئۆغوز بوو و گاڵتەپێکردن بە گیانفیدایەکی نەریتەکان خەیانەت بوو لە نیشتیمان، بەڵام خۆ کەس گوێی بەو قسانە نەدەبزووت... سەیری ئەو حەشیمەتە بکە لەو شارۆچکەیەدا رژاون... ئەگەر گوتبایان سەد هەزار قەشمەر و سێرکچی لەو مەیدانەدا قەشمەرێتی دەنوێنن و عیسا لە ئاسمانەوە دادەبەزێ و... ئەوەندە خەڵکە یەك جێ کۆ نەدەبوونەوە.

دەروێش بەگ تۆڵەی دەکردەوە. لەو کەسانەی لە پڕێکدا ببوونە کوڕێك و سەد ئەوەندەی ئەویان ملك و ماڵ و پارە و سامان وەسەر یەك نابوو، ئاوای تۆڵە لێ دەکردنەوە. ئەگینا چ دەرد و مەرگێکی بوو کە ئاوا پیاو بنێرێتە شار و گوندان و خەڵك کۆ بکاتەوە؟ پانزە بیست ساڵ دەبوو کە ئیتر دەروێش بەگ و کەسی وەك وی لێ کەوتبوون و کەس بەهیچی دانەدەنان و ئەوانەی تازە پێگەیشتبوون، کۆنەی وەك ئەویان زویر کردبوو. ئیتر دەروێش بەگ خەریك بوو دەتوایەوە، بەڵام بە هەموو ئەو هێز و توانایەی لەبەریدا مابۆوە، تۆڵەیەکی دەکردەوە کە... دڵی ئاوپڕژێن بێتەوە.

هەموو ئەو قسانەیان بە گوێی ماهیربەگدا خوێند. بەڵام ماهیر بەگ لە گوێیەکی هاتە ژوورێ و بەوی دیکەیدا چووە دەرێ و هەر جار نە جارێك سەیری سەعاتەکەی دەکرد.

چارەگێکی مابوو بۆ سەعات دوازدە کە خێرا لە جێیەکەی خۆی هەستا و بەبێ ئەوەی سەیری دەوروبەری خۆی بکا، چووە ژوورەکەی تەنیشتی و دەرگاکەی لەسەر خۆی داخست.

کات و ساتەکان تێدەپەڕین و خەڵکەکە ئیتر سەبر و ئۆقرەی نەدەما و هەڵڵا و هەنگەمە و هات و هاواریان گوێی گەردوونی کەڕ دەکرد.

هەمووان چاویان لە دەرگای ماڵە دوو نهۆمە پەمەییەکەی ماهیر بەگ بڕیبوو. هەر خولەکێك لە ساڵێك تێدەپەڕی. تاوێك دواتر کلیکێك لە قوفڵەکەدا سووڕا و دەرگاکە کرایەوە و ماهیر بەگ بەخێرایی لە ژوورەکە هاتە دەرێ و بەرەو پلیکانەکان وەڕێ کەوت. ژنەکەی لە بەر دەرگای ماڵەوە خۆی گەیاندێ و خۆی بەسەر پێیەکانیدا کێشا:

"نەکەی ماهیر، مەکە. بۆ ماڵی دنیایە خۆت مەگە گاڵتەجاڕی دنیا. ئەو پەڵەی شوورەییە بە نێوچاوانی منداڵەکانتەوە مەنێ. ئەو پەڵەی شوورەییە هەتا قیامەتێ ناشۆڕێتەوە. زەرەر لە نیوەشی بگەڕێتەوە هەر..."

ماهیر بە پەلە لای دا و لاقەکانی لە چنگی دەرهێنا و بەرەو دەروازەی حەوشەکە بەغاردان ڕۆیشت و خۆی گەیاندە کۆڵانێ.

لە نەکاو دەنگەدەنگەکە کپ بوو و بێدەنگییەك باڵی بەسەر کۆڵانەکەدا کێشا، گوێت لە دەنگی باڵی مێش دەبوو. بنیادەم بێت و گوێی هەڵخستبایە، ترپەی دڵی خەڵکەکەش دەبیسرا.

ماهیر قیت و ڕەپ لە نێوەندی کۆڵانەکە ڕاوەستابوو. دەموچاوی وەك ڕوخساری مردووان بێجووڵە بوو. چاوە خڕەکانی لە بن برۆ چڕ و بژەکانییەوە بڕیبووە خەڵکەکە. هەر جار نە جارێك وەك تیشکێکی تیژ لە چاوی بدات، چاوی قیچ دەکردن و دەیترووکاندن.

نێوەڕاستی سەری رووتابۆوە. قژە ماش و برینجییەکانی کە بەرەو دواوە هەڵدرابوونەوە، ڕوخسارە سارد و سڕەکەی بێگیانتر دەکرد. دەموچاوی لە منداڵێکی داماو دەچوو کە تاوێك لەوە پێش گریابێت و بەناچاری ژێر بووبێتەوە. لاقەکانی ڕووت و هەموو گیانی وەك مردووان کفن پۆش بوو. جاوە سپییەکە لەبەر تاوەکە دەدرەوشایەوە و زەردیی ڕوخساریی پتر دەردەخست. ئەو شمشێرە رووتەشی کە چەند ئایەتێکی بە ئاوی زێڕ لە سەر دمەکەی نووسرابوو، ستوونی بەدەستەوە گرتبوو. گەردنیشی تۆزێك چەمابۆوە. پەنجەکانی دەستی چەپەی بەبێ ڕاوەستان دەجووڵان. هەر وەك چۆن شەمشەمەکوێرەیەك لەبەر ڕووناکاییەکی زۆر سەری لێ دەشێوێ، ماهیر بەگیش لە بەردەم ئەو حەشیمەتە زۆرەدا سەری لێ تێك چوبوو...

ساتێك وای بە زەینیدا هات واز لە زەحمەتەی بێنێ کە چەند مانگ بوو کێشابووی و دڵ لەو خاکە ڕەش و بەپیت و بەرەکەتەش بکاتەوە و بە غاردان بگەڕێتەوە ماڵەکەی. بەڵام تازە کار لە کارێ ترازابوو و خەڵکەکە ئەویان بەوجۆرە دیتبوو کە دەروێش بەگ گوتبووی.

خەڵکەکە سەریان سوورِ مابوو. قەت پێیان وانەبوو ماهیر بەگی بەناوبانگ، خوێندەوارەکەی ئەورووپا و مڵکدارە گەورەکان بەو قەد و قەڵافەتە گاڵتەجارِانەیەوە ببینن. ئەوەبەخێر جارِچی جارِیان دابوو و ئەو هەمووە هەقایەتە لەسەر نەریتی ئۆغوز کەوتبووە سەر زار و زمانان، بەڵام دیسانیش ئەوەندەیان پێ سەیر بوو خەریك بوو شاخیان لێ برِوێ...

لەو کاتەدا دوو سوار بە ئەسپی شەودێزەوە کە زین و لقاوەکانیشیان کۆبەی گیرابوو، لە دەرگاکەی پشتەوەی ماڵەکەیەوە هاتنە دەرێ. هەر کامەیان ئاڵایەکی گەورەیان بەدەستەوە بوو. سوارێك لە شانی راستی ماهیر بەگەوە و ئەویتر لە شانی چەپییەوە راوەستا.

حەشیمەتەکە متەقی لێوە نەهات. هەمووان چاویان برِیبووە ماهیر بەگ و ماهیر بەگیش چاوی لەوان برِیبوو.

تاوێك دواتر ئەوانەی کۆت و شەلواری کۆبەگیراویان لەبەر کردبوو و مێزەر و جامەدانیی رەنگاورەنگیان لەسەر کردبوو و پێڵاوی گوڵ سووری ماراشیان لەپێ کردبوو، لە دەرگاوە هاتنە دەرێ. وەلی بە قەڵافەت و نێوچاوانێکی گرژەوە لە پێش ئەو پیاوانەوە دەرِۆیشت. پیاوەکان پانزە بیست هەنگاو لە ماهیر بەگەوە دەرِۆیشت و دەمودەست لەسەرخۆ وەرِێ کەوتن. ماهیر بەگ زۆری بەلاوە ئەستەم بوو بەدوایاندا برِوات. هەر هەنگاوی هەڵێنایەوە، بەلاداهات و خەڵکەکە وەیانزانی ئێستا دەکەوێ. بۆیە هەموو پشوویان لە سینەدا راگرتبوو. بەڵام ئەو هەرچۆنێك بوو خۆی راگرت و توانیی بەسەر پێوە بوەستێ. سوارەکانیش جڵەویان توندکردبوو و هەوڵیان دەدا ئەسپەکانیان پێ بە پێی ئەو برِۆن.

حەشیمەتەکە کاتێ رۆیشتنەکەی ئەوانی دیت، هەموو پشوویان لە سینەدا قەتیس کردبوو. ماهیر بەگ وەك دارێك قیت وراست راوەستابوو. حەشیمەتەکەش کە لەو سەرسوورِمانەی پێشوویدا نەمابوو، لە جێی خۆی جمی و غەڵبەغڵب دەستی پێ کرد. رێك لەو کاتەدا رووداوێکی دیکە خەڵکەکەی خرۆشاند. هێشتا ماهیر بەگ چەند هەنگاوێکی نەنابوو، کە دەستەیەك موزیکژەنی سەربازی کە هەموویان جلوبەرگەکانیان بە رەنگی جۆراوجۆر دوورابوو، یۆنیفۆرمیان لەبەر و کڵاویان لەسەر کردبوو، دەرکەوتن. ئەوانە لەگەڵ هەر دوو هەنگاویاندا هەنگاوێك بەرەو دواوە دەکشانەوە و بە دەم ژەنینی مارشی "ئێمە هەموو عوسمانلیین... ناودارین" هاتنە پێشەوە... ئەوان لە پێشەوە و پیاوە جامانەبەسەرەکان بە شوێنیانەوە و ماهیر بەگی کفنپۆش بە نێوان دوو سواردا بەدوایاندا...

دەستەی موزیکیش سروودێکیان دەخوێند کە دیار نەبوو کێ و چۆن وەسەر یەکیان خستوونەتەوە:

"رەچەڵەکە ئەسڵەکەمان، ئاغای دنیا، ئاڵای ئۆغوز لە مۆسکۆ هەڵدەکەین، لە ئاسیای ناوەڕاست، لە واشنتۆن لە بەرزترین شوێنی زەوی و لەسەر مانگ و لە ئاسمان... ئاڵای ئۆغوز، ئاڵای ئۆغوز..."

ماهیر بەگ هەر ئاگای لە دەستەی موزیکە سەربازییەکە نەبوو. لە بەرنامەکەدا هیچ ئاماژە بەوە نەدرابوو. هەی بێ شەرەف، هەی گەواد، هەی هەی... هەی فلانی فیسار پێکراو. بەڵام دەستەی موزیکەکە ئەگەر بۆ ساتێکیش بێ دڵی خۆش کرد و تۆزێکی وەخۆی هێنایەوە. کفنەکەی لەبەر تاوەکە دەدرەوشایەوە و روخساری زەردتر هەڵدەگەڕا. خوێنی لەبەردا نەمابوو و چاوەکانی لە شوێنێك بڕیبوون و سەری قیت راگرتبوو و بەبێ ئەوەی شتێك، حەشیمەتەکە و دەستەی موزیکەکە ببینێ، کوێرانە رێگەی دەبڕی. دەنگی دەستەی موزیك و گرمە و هەڵڵای جەماوەرەکە لە گوێیدا بوو. سەری کاس و وڕ بوو. دەتگوت سەری بە لەشییەوە نییە... و چیای دوڵدوڵ سووربـاو، لە مژەکەدا نوقم ببوو. دەتگوت لەو دیو پەردەیەکی وەك تۆڕەوەیە. لووتکەکەی بەفر داپۆشیبوو و بنارەکەی دەدرەوشایەوە. دەتگوت جار لە جار پتر دێتە پێشەوە. ئەوەندە دێتە پێشێ کە دەتگوت هەر دوو هەنگاوی دیکە بنێ، دەگاتە شارۆچکەکە. بەڵام هەنگاو نانێ، دەخوشێ، دەخزێ. هەر دەتگوت خاکەکەی بەر پێیان دەخزێ... دوڵدوڵ جار نەجارێ بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە و وەك برووسکە دەکشێ و خۆی دەشارێتەوە و دەردەکەوێتەوە و دێتەوە پێشێ و دەکشێتەوەو ئاخرییەکەی بەسەر تاقە دارەکەوە و لە تەنیشت هەورە دەروشاوەکەوە لەنگەر دەگرێ... بە سەدان باڵندە بە جیکەجیك لە چنارە گەورەکەوە هەڵدەفڕن...

"عوسمانلیین، ناودارین."

چەپڵەلێدان.

تا گەیشتنە بازاڕەکە هەر وا رۆیشتن. ئەوە حاڵەتێکی جێگەی رێز بوو. لە راستیشدا هەر کەسێك دیتبایەی جا دۆست بایە یان دوژمن، هەستی دەکرد نەریتی ئۆغوز شیاوی رێزلێ نانە. بەڵام سەگەلە بەرەڵڵا کارەکەیان تێك دا. جوانی و پیرۆزایەتیی کارەکەیان...

حاجی مووسا کوێرە هەر چاوی بە کاروانەکەی ماهیر بەگ کەوت، فیکەیەکی کێشا و هەرای کرد:

"وەی باوکە ڕۆۆۆۆۆۆ، باوکەڕۆۆ براله، خۆ شانۆ و سێرکیشت هێنابایە ئەوەندەت خەڵك پێ کۆ نەدەکرایەوە. ئەگەر تیپی تۆپێنی فەنەری باخچەشت هێنابایە دیسان بۆت کۆ نەدەبوونەوە. ئەو نەریتی ئۆغوزە شتێکی سەیر بووە..."

دەنگی:"شتێکی سەیر بووە، شتێکی سەیر بوووە بە قوولە قوول و قاقاوە تێکەڵ بەیەك بوون. ڕێك لەو کاتەدا بوو کە دەنگی گڕ و ناسك و بەرز هەستان و بەسەر دەنگەکانی دیکەدا زاڵ بوون:

"هۆی ی ی ی خەڵکینە، نەڵێن گوێمان لێ نەبوو، گوێتان بکەنەوە و جوان گوێ بدەنێ... شتێکی گرنگ، لە شتێکی زۆر گرنگ ئاگادارتان دەکەمەوە... بێدەنگ بن و گوێ بدەنێ..."
کەس نەیدەزانی ئەو دەنگە کێیە و لە کوێوە دێ. دەنگ و قریوەکە کەوت. تەنانەت دەستە میوزیکیش کپ و بێدەنگ بوو.

"گوێ بدەنێ، گوێ بدەنێ، دابونەریتی ئۆغوزیی لەو جۆرە هەر نەبووە. ئۆغوز و موغوز و تڕەماشیش هەر نەبوونە. گوێ بدەنە من. باشە هەتا ئێستا ناوی ئۆغوزتان بیستووە؟ ئاخۆ بنیادەم هۆزێك، تیرەیەك، میللەتێك لەو دنیایەدا هەیە بەو ناوە؟ گوێ بدەنە من... دەروێش هەر بۆ ئەوەی حەیای ماهیر بەرێ و بیکاتە گەپجاڕی خەڵکی، ئەو شتەی هەڵبەستووە. هەر بۆ ئەوەی بیکاتە پەند و ریسوای عالەمێ. گوێم بدەنێ..."

گرووپی میوزیکەکە لە نەکاودا و بە پەلە دەستی کرد بە ژەنین و دوو هەنگاو بەرەو پێش و هەنگاوێك بەرەو دواوە. بە دوایشیدا کەوتنە ڕێ. ئەوجار هەڵڵا هەنگەمەی جەماوەرەکە دەنگەکەی قووت دا.

دیسان دەنگێك لە دواوە هەستا:"خراپتریان لێ بێ، خراپتریان لێ بێ."

دەنگێکی دیکە:"ئەوانە لەوەش خراپتریان پێ دەکرێ... خراپتریان بەسەر بێ."

ئەمجارەیان دەنگەدەنگ و قریوە و هەڵڵاکە ئەوەندە زۆر بوو کەس لە کەس حاڵی نەدەبوو. بەڵام هیچ شتێك بە قازانجی ماهیر نەبوو.

حەشیمەتەکە لە نێوەندی بازاڕەکە تێك چڕژا و ڕێگەکە گیرا و ماهیر بەگ ناچار بوو ڕاوەستێ. وەك دەروێشی بە زیکر و تەسبیح لە سەر جێیەکەی خۆی سەری بەلای ڕاست و چەپیدا دەسووڕاند. ئارەقە لە بەری پێی دەچۆڕایەوە. چاوەکانی ئیتر نەدەدرەوشانەوە. لە دوو کونی ڕەش و تار دەچوون. دەموچاوی ئیتر نەك زەرد بەڵکو یەکسەر ژاکابوو و ڕەنگی پێوە نەمابوو، وەك خۆڵەمێش.

وەلی و چپگەن پۆشەکانی دیکە هەوڵیان دەدا خەڵکەکە لا بدەن و خۆیان بگەیەننە ماهیر بەگ:

"لاچن، لاچن، بیکەن بەخاتری خودای، بۆ خاتری باپیرە ئۆغوزمان لا چن، ڕێمان بکەن. ڕێمان بکەن با نەریتی ئۆغوز تێك نەچێ. دەست لە بەگ نەدەن. هەر کەس بەبێ دەستنوێژ دەست لەو کەسە بدات کە دەچێ بۆ ئاشتبوونەوە، گوناحی دەگاتێ. خودا غەزەبی لێ دەگرێ. بکشێنەوە، بکشێنەوە... هەر کەس نیشتمانی خۆی خۆش دەوێ، با بکشێتەوە و ڕێگا بکاتەوە. هەر کەس خوێن و ڕەچەڵەکی خۆی خۆش دەوێ بکشێتەوەو ڕێگە بکاتەوە با ئێمە بتوانین درێژە بە ڕێیەکەمان بدەین. ئەوە نەریتی ئۆغوزە. بیکەن بە خاتری باپیرە ئۆغوزمان... ڕێگەی گیانفیدایەکی نەریتەکان بکەن..."

تکا و پاڕانەوە کاریگەریی نەبوو و ماهیر بەگ بەلادا هات و هەموو هێزی خۆی کۆ دەکردەوە بۆ ئەوەی نەکەوێ.

لەو کاتەدا ئەو گەنجانەی لە نێو حەشیمەتەکەوە هاتبوونە پێشەوە، هەرچۆنێك بوو ڕێگەیان بۆ کردەوە.

ماهیر بەگ کاتێ ویستی هەنگاو بنێ، سەرەنگرێ بوو. بەر لەوەی بکەوێ، وەلی فریای کەوت و پیلی گرت و ڕایگرت و بە سرتە پێی گوت:

ئاگات لە خۆت بێ بەگ. نەکا، نەکا... حەیامان دەچێ... چیی وای نەماوە."

ماهیر بەگ سەری لە گێژەوە دەهات و هەموو گیانی وەك دار و بەرد وشك و قورس دەبوو. هەوڵی دەدا هەرچۆنێك بی خۆی بگەیەنێتە بەر دەرگای دەروێش بەگ، بەڵام دەترسا خۆی ڕانەگرێ و بەلادا بێ. چاوی ڕەشکەوپێشکەی دەکرد و تاریك دەبوو. ئیتر گوێیەکانیشی بەو هەرا و زەنازەنا و قریوە قریوە سامناکەی نەدەبیست. وەدەنگ هات:

"وەلی، وەلی"

دەنگی وا نووسابوو وەلی گوێی لێی نەبوو. لێوەکانی وشك وشك ببوون.

"وەلی لێم دوور مەکەوە. ئاگات لێم بێ."

لە ناخەوە دەکوڵی. بۆ ساتێك نەیتوانی چیای دوڵدوڵ ببینێ. هەر دەتگوت شتێکی بەسەر هاتووە. کاڵ ببۆوە و هەتا چاو هەتەری دەکرد دوور کەوتبۆوە.

له نه‌كاو به‌ری چاوی روون بۆوه و سه‌ره گێژه‌كه‌ی ره‌وییه‌وه و وه‌خۆی هاته‌وه. له ناخه‌وه هه‌ڵچوبوو. بێت و ئه‌مجاره به سڵامه‌ت ده‌رچووبا، جا ده‌یزانی چ له‌و ده‌روێشه هیچ و پووچه ده‌كات. به‌ڵایه‌كی به‌سه‌ر دێنا عه‌ره‌ب به‌سه‌ر گامێشی نه‌هێنابێ.

"هه‌ر لێره، ئاد و په‌یمان له گه‌ڵ خودای ده‌به‌ستم، هه‌رچۆنێك بێ، تۆڵه‌ی ئه‌و سووكایه‌تییه له‌و سه‌یه ده‌كه‌مه‌وه."

زه‌نا زه‌ناكه هه‌ر ده‌هات و پتر ده‌بوو و جنێو و ته‌شه‌ر و دروشمه‌كان زیاتر ده‌بیستران. ئه‌ویش سات به سات پتر هه‌ڵده‌چوو. ئه‌گه‌ر ئه‌و تووڕه‌ییه نه‌بوایه له‌وانه‌بوو به‌رگه‌ی ئه‌وه‌نده‌ی نه‌گرتبایه و هه‌ر له‌وانه‌بوو نه‌توانێ هه‌نگاوێكیش بنێ و ته‌نانه‌ت پێده‌چوو وه‌ك شێتان وه‌عه‌رزی كه‌وتبایه.

بۆ ساتێك چاوه‌كانی به‌سه‌ر حه‌شیمه‌ته‌كه‌دا گێڕا. حه‌شیمه‌ت چ حه‌شیمه‌ت! ده‌رزیت هه‌ڵاویشتبایه وه‌عه‌رزی نه‌ده‌كه‌وت. حه‌شیمه‌تێك هه‌مووی به‌ڕڵا و ره‌شوو رووت و تۆڵه‌ئه‌ستێن و قین له زگ. هه‌موو له‌گه‌ڵ ده‌روێش كلكیان تێك ئاڵاندبوو و گاڵته‌یان پێ ده‌كرد و به جنێو و تانه و ته‌شه‌ر و ته‌وس و پلاران كوڵی دڵیان داده‌مركانده‌وه. ئه‌وه‌نده له‌و حه‌شیمه‌ته په‌ست و پێزار بوو كه ده‌تگوت هه‌ژدیهایه‌كه و وه‌ك ئه‌شكه‌وتێكی تاریك زاری داپچڕیوه و ده‌یه‌وێ ئه‌و هه‌ڵلووشێ.

نه‌ده‌بوو ئه‌وه‌ی كردبایه. نه‌ده‌بوو ئه‌و سووكایه‌تییه قه‌بووڵ بكا. یانی بۆ ئه‌و حه‌یاچوون و ریسواییه بوو ئه‌و هه‌مووه زه‌حمه‌ته‌ی كێشابوو و چوبووه ڤیه‌ننا؟ ئاخۆ هه‌ر بۆ ئه‌وه‌ی ببێته گاڵته‌جاڕی كۆمه‌ڵێك گه‌ڵ و قوون رووت؟ ئیتر نه‌یده‌توانی بگه‌ڕێته‌وه دواوه. ده‌بوو تا زووه كۆتایی به‌و گه‌مه‌یه بێنێت. ویستی هه‌نگاوی خۆشتر بكات، به‌ڵام لاقه بێ هێزه‌كانی له‌گه‌ڵی نه‌ڕۆیشتن. چیی هه‌وڵی ده‌دا نه‌یده‌توانی خێراتر بڕوات. هێشتا زۆری مابوو بگاته ماڵه‌كه‌ی ده‌روێش به‌گ، ماڵی ئه‌و نامه‌ردی بێ ناموسه. ئیتر ئه‌ژنۆكانی له دووی نه‌ده‌هاتن و ده‌نووشتانه‌وه.

له نێو ئه‌و حه‌شیمه‌ته وه‌حشییه‌دا خۆی ئه‌وه‌نده به‌ته‌نیا دیته‌وه كه... به‌زه‌یی به‌خۆیدا هاته‌وه. ئه‌وه‌نده‌ی به‌زه‌یی به‌خۆیدا هاته‌وه وه‌بیری نه‌ده‌هاته‌وه تا ئێستا ئاوا به‌زه‌یی به كه‌س یان شتێكی دیكه‌دا هاتبێته‌وه.

حه‌شیمه‌ته‌كه له پشته‌وه‌ڕا پاڵیان پێوه ده‌نا. ئه‌و سوارانه‌ی له‌گه‌ڵی بوون، وێڕای ئه‌و له نێو حه‌شیمه‌ته‌كه‌دا قه‌تیس مابوون و به‌هیچ جۆرێ نه‌یانده‌توانی بیگه‌نێ. یۆنیفۆرم له‌به‌ره‌كانیشی كه رێیان بۆ ده‌كرده‌وه، لێ دیار نه‌بوون. له نه‌كاو دڵی تێكه‌ڵ هات. چیی وای نه‌مابوو

بڕشێتەوە، بەڵام هەرچۆنێك بوو بەسەر خۆیدا زاڵ بوو. ئێستا ترس خەریك بوو ناخی دەتەنییەوە. خۆ بێت و لێرە کەوتبایە و مابایەتەوە... ئیتر وا حەیای دەچوو، بە سەدان ساڵیش دەبووە گەپجاڕی خەڵك. دەستی کرد بە پاڕانەوە و دوعا و نزا:

"خوایە، تۆ غەفووری، کەریمی کارسازی، رەحیمی، ئەرحەمەڕڕاحەمینی... خوایە پشت و پەنام بە بەشکم بەبێ کێشە و بەڵا بگەمە دەرگای ئەو یەیە. خوایە نەزر بێت، بمگەیەنیتە دەرگای ئەو سەیە، گایەك دەکەمە قوربانی. دوو گا... خوایە..."

ئەوە هیچ باوەڕیشی بە خودا نەبوو، دەیگوت:

"خوایە ئەگەر لەو بەڵایەم نەجات بدەی، دیارە هەی... ئەو کاتە ئیمانت پێ دێنم و جووتێك گات بۆ دەکەمە قوربانی و ئیتر تا هەم بێ ئەمریت ناکەم."

ئارەقەی رەش و شینی دەرکردبوو. نێوچاوانی و دەموچاوی نوقمی ئارەقە بوو. کفنەکەی بەریشی نوقمی ئارەقە بوو و بە پشتییەوە نووسابوو.

چەندی دەچووە پێشتر، خەڵکەکەش وەك لافاوێکی مەند لە جێی خۆی پتر مت دەبوو. ئێستا ئیتر جموجۆڵەکە تا رادەیەك نیشتبۆوە و زەنا زەناکە دامرکابۆوە. حەشیمەتەکە ئیتر نەیدەگوڕاند و لە هەرا و هۆریا کەوتبوو، بەڵام پێدەکەنی و جنێوی دەدا و مشتومڕی دەکرد. گرووپی میوزیکەکەش ئاوازێکی گشت و شادی لێ دەدا.

"هەر بەراست باب و باپیرانیشمان هەر ئاوا ئاشت بوونەتەوە؟"

"ئێمە تا ئێستا شتی وامان نەدیتووە و نەمانبیستووە."

"چما دەروێش بەگ ناناسن؟ دەغەڵ و فێڵبازێکە دەستی شەیتانی لە پشتەوەڕا بەستووە. ئەو شتانەی هەڵبەستووە تەنیا بۆ ئەوەی حەیای ماهیر بەرێ."

"بەڵام قسەی خۆشمان بێ، ئەویش حەقێتی."

"ماهیر ئەگەر هێندەی نووکە دەرزییەك شەرەفی بوایە، ئەو سووکایەتییەی قەبووڵ نەدەکرد."

"لە پێناوی دابو نەریتەکاندا بووە."

"ئەو گیانفیدایەکی نەریتەکانە."

"گیانفیدای نەریتی چیی، گیانفیدای ئەو زەوی و زارەیە، کە لە ئاقچاساز دەردەکەوێ."

"لە پێناو هەر شتێکدا بێ..."

"پیاوی بە شەرەف کاری ئاوا ناکا و خۆی ناکاتە گەپجاڕی خەڵکی..."

ماهیر گوێی لە هەموو ئەو قسانە و لەوانەش خراپتر و لە هەرچی قسەی ناخۆش و تەوس و توانجە دەبوو. لەو جەنگەیەدا ئاگای لێ بوو وێنەی دەگرن. راچڵەکی. هیچی بۆ نەچۆوە سەر یەك. کەوابوو دەروێش هەر بەوەندەشەوە نەوەستاوەتەوە کە لە شارۆچکەدا ئابڕووی بەرێ، چووە هەواڵنێر و پەیامنێریشی بانگ کردبوو و بۆ ئەوەی لە هەموو تورکیادا حەیای بەرێ... دەی باشە، باشە، تۆڵەی لێ دەکاتەوە. هەر شتێك تۆڵەی لە دوای بێ، گلەیی پێ ناوێ...

لەو کاتەدا ئەوانەی سەیری ماهیربەگیان دەکرد، هەستیان دەکرد گەش دەبێتەوە. بیرێك وەك برووسکە بە زەینیدا هات. ئەو بیرە جارێ دڵی خۆش دەکرد و تاوێ ترسێکی زۆر سەیری دەخستە دڵییەوە. دەروێش دەکوژێ. هەر بگاتە بەر دەرگاکەی، ئەو کاتەی شمشێرەکەی دەداتە دەستی، رێك لە زگی رۆدەکات. سەگی سەگباب خۆی دەبینێتەوە. هەر جار نەجارێ لە دڵیدا و لە بن لێوانەوە دووپاتەی دەکردەوە:

"دەیکوژم، دەیکوژم، دەیکوژم... دەیك..."

ئەو قسەیە تین و گوڕی دەدایە و بەرەو پێشەوە دەڕۆیشت و هەوڵی دەدا لە ناخەوە ئەو بیرە قەبووڵ بکات. بەڵێ دەیکوژێ. دوای کوشتنەکەی ئەو دەمودەست خۆشی ... تاوێکی دی دەروێش تێدا دەچوو. ئەو بیرکردنەوەیە وەخۆی هێنایەوە. هەنگاوی خۆشتر کردن.

وەولی هەرای دەکرد:"

"بکشێنەوە، بکشێنەوە، بکشێنەوە... بۆ خاتری باپیرە ئۆغوزمان..."

خەڵکەکەش بە لاسایی ئەو:

"بکشێنەوە، بکشێنەوە، رێی بکەن... بۆ خاتری گوڵی روخساری باپیرە ئۆغوزمان."

گەنج و منداڵ فیکەیان لێ دەدا و ژنەکان وایان دەقریواند دەنگیان دەچووە کەشکەڵان.

"دەیکوژم. هەمووشیان بڕوا دەکەن بۆ کوشتنی ئەوم ئەوە قەبووڵ کردووە."

دەستی راستەی شمشێرەکەی هەڵێنابوو، بەڵام دەستی ماندوو بوو و ئیتر نەیدەتوانی قیت رایگرێ. بەپێی نەریت نەیدەتوانی شمشێرەکەی بێنێتە خوارێ و نەشیدەتوانی بیداتە دەستی چەپەی. وای لێ هات ئیتر هەستی کرد دەستی سڕ بووە. شمشێرەکە دەهات بەربێتەوە. شان و پیلی تەواو بێ هێز ببوو. بەخۆی گوت: کوڕە چش، بە جەحەندەم و شمشێرەکەی دایە دەستی چەپەی. شمشێر بە دەستی چەپەیەوە، بەرەو پێش دەچوو، کە یەکێك لە پیاوەکانی دەروێش بەگ هاتە پێشێ و تێی خوڕی:

"شمشێرەکە بە دەستی راستەت بگرە. دەروێش بەگ چاوێکی لێ کردوویەتە چوار چاو و ئاگای لێتە. ئەگەر وانەکەی وەرت ناگرێ و هەموو ریسەکەت لێ دەبێتەوە خوری."

ماهیر بەگ بەناچاری شمشێرەکەی دایەوە دەستی راستەی.

"دەیکوژم..."

ئێستا خەریکی خەیاڵ پلاوان بوو. دەچێ و ئەو کاتەی دەروێش بەگ لە بەر دەرگای ماڵەکەی پێشوازیی لێ دەکات، لەو کاتی دەستەملانبوونێدا رێك شمشێرەکەی لە سینگی دەچەقێنێ... شمشێرەکە لە سینەی رۆدەچێ و لە پشتی دێتە دەرێ... دەروێش بەگ بەرەوپشت دەکەوێ و ئەو دەیداتە بەر پێلەقە... پێ بەسەر دەموچاو و سەریدا دێنێ...

ماهیر کە سەری هەڵێنا و سەیری دەوروبەری خۆی کرد، سەیری کرد گەیشتووەتە چەقی بازاڕ. بازاڕەکە هەر جمەی دەهات. وەلی و زرێ پۆشەکانی دیکە هەوڵیان دەدا رێی بۆ بکەنەوە. ئەوکاتە دژوار و ئەستەمەدا چاوی بە شتێکی دیکەش کەوت. هەموو دووکانەکان وەك رۆژانی جێژن ئاڵایان هەڵکردبوو. کەوابوو ئەو دەروێش بەگە بێ شەرەفە هیچ شتێکی لەبیر نەکردووە...

"دەیکوژم..."

هەروا کە بە رێگە کراوەکەدا بەرەو پێشەوە دەڕۆیشت، تێگەیشت کە لە بازاڕەکە چووەتە دەرێ. ئێستا گەیشتبووە مەیدانە پاناوکەکەی حەفتە بازاڕ. حەشیمەتەکە لێرە زۆر چڕتر و زیاتر بوو. قریوەی حەشیمەتەکە گوێی کەڕ دەکرد. دەنگە دەنگەکە، نەیاندەهێشت گرووپی میوزیکەکە نووزەی بێ.

ماهیر بەگ لە نەکاو رقەکەی نیشتەوە. لە هەمبەر ئەو حەشیمەتە زۆرەدا کە گاڵتەیان پێ دەکرد و تەوس و پلاریان پێدا دەدا، هەستی کرد تەنیاییەك وەك چەقۆ بەدڵیدا رۆچووە. بەر چاوی تاریك بوون و هەوڵی دا بەسەر خۆیدا زاڵ بێ بەڵام نەیتوانی. لە پێشدا شمشێرەکەی لەدەستی بەربۆوە سەر بەردچنەکە و زرینگەی لێ هەستا و بەدوای ئەودا خۆشی بەربۆوە. وەلی لە پێشەوە و چەپگەن پۆشەکان*ی دیکەش بە دوایدا گەیشتنێ و هەڵیانستاندەوە. کە وەعەرز کەوتبوو، تەشك و داوێنی کفنەکەی هەڵدرابۆوە و هەموو گیانی وەدەر کەوتبوو. چاوەکانی وا هەڵێنان کە دەتگوت لە خەوێکی قورس وەخەبەر هاتووە، بە سەرسووڕمانەوە سەیری دەوروبەری خۆی کرد. کە زانیی چ قەوماوە، شمشێرەکەی لە وەلی وەرگرت کە بۆی راداشتبوو.

---

* چەپگەن: جلوبەرگێکی سەرتاپایە و پەلکەی هەیە و سەر قۆڵەکانی داتلێشاوە. جلوبەرگی ژنە تەتەرەکانە.(قامووسی دێهخودا)

هەنگاوێکی نا و راوەستایەوە. خەڵکەکە لە دەنگەدەنگ کەوتبوون و جگە لە ئاوازی گرووپی میوزیکەکە لە هیچ کوێوە دەنگ نەدەهات. ماهیر بەگ هەنگاوێکی دیکەی نا و دیسان راوەستا. لە بیرێکی قووڵ رۆچووبوو. لە هەڵسوکەوتیڕا دیار بوو، کە دەیەوێ بڕیارێك بدات. لە زاری دەرپەڕی:

"دەیکوژم."

ئەوەی گوت و پێی راستەی لە عەرزی کوتا و خێرا وەڕێ کەوت.

قیت و قنج بوو. رووناکایی پاییزی چوکووراوا بەرد و خۆڵ و خاك و خانوو و شووشەی خانووەکان و حەشیمەتە تێکچڕژاوەکە و هەموو وڵاتی داگرتبوو. ئاسمانەکە شین شین و ساماڵ و بێ پەڵە و ساو بوو. چیای دوڵدوڵ هاتبۆوە و لەبەردەمی قوت ببۆوە. سەیرێکی مژە رەنگ مسییەکەی کرد. ماهیر ئەوجار بە هانکەهانك و خێرا دەڕۆیشت و بە ئاماژەی شمشێرەکەی خەڵکی لەسەر رێیەکەی لادەدا.

ئیبۆ کەچەڵی جاڕچی بە دەنگی بەرز دەینەڕاند:

"خوایە، خوایە، بیکە بۆ خاتری رێز و حورمەتی رەچەڵەکی ئۆغوزی مەزن تین و تاقەت بدەیە ئەم گیانفیدایەی نەریتی ئۆغوز، بەو مرۆڤە مەزن و گەورەیە..."

حاجییە کوێرەش لەو دوا نەدەکەوت و دەنگی بەسەر دەنگی ئەودا هەڵدێنا:

"ماهیر بەگی ناودار دێ، ئەوەی مایەی شانازیی تورکیایە، ئەوەی ئاڵای ئۆغوز لە دنیادا دەشەکێنێتەوە... دێ... بکشێنەوە، رێی بدەن، بکشێنەوە..."

"خوایە، خوایە تین و تاقەت و هیممەت..."

خوێندەوارێك شیعرە ناودارەکەی ئاڵای خوێندەوە:

"مێژووم، شەرەفم، شیعرم، هەموو شتێکم
لەو سەر زەوییە شوێنێك هەڵبژێرە
هەر کوێت حەز لێیە پێم بڵێ
با لەوێ بتشەکێنمەوە."

گرمە و هەڵڵاکە دیسان لەگەڵ خوێندنەوەی شیعرەکە و نەڕەنەڕەکەی حاجی کوێرە و ئیبۆ کەچەڵ دەستی پێ کردبۆوە. گۆرانی و قریوە و جنێو تێکەڵ دەبوون.

که له بازاڕەکه وەدەر کەوتن، وەلی له ماهیر بەگ دوور نەدەکەوتەوە و بە تایبەتی دوای کەوتنەکەی زۆری ئاگا لێی بوو. له نەکاو دیتی ئەوە روخساری ماهیر بەگ دیسان هەڵدەبزڕکێ و چیی نەماوە له پێ بکەوێ، بۆیە پیلی گرت و بە سرتەیەك پێی گوت:

"دان بە خۆتدا بگرە ئاغا، غیرەت بدە بەر خۆت. هەر لەو کۆڵانە پێچ بکەینەوە ماڵەکە رێك رووبەڕوومانە."

دیسان لە خۆی نووسا و لە دڵی خۆیدا دووپاتەی کردەوە:"دەیکوژم، دەیکوژم." بەڵام ئیتر ئەو قسانەش کاریگەرییان نەمابوو. تین و تاقەتی لە ئەژنۆیدا نەمابوو. ئیتر رق و قینیش هێز و توانای پێ نەدەبەخشی و تینی وەبەر نەدەنا. ئیتر گوێی لە هیچ نەدەبوو و ئاگای لە هیچ نەمابوو.

لە نەکاو گرمەیەکی سامناك وەخۆی هێناوە. گرووپە موزیکە بێدەنگەکە و تەپڵ و دەهۆڵ و زوڕنا لێیان دایەوە. ئیتر گەیشتبووە پاناوکەکەی بەر دەرگای دەروێش بەگ. بەر ماڵەکەی دەروێش بەگ بە داری مۆرد و گوڵی داودی و ئاڵای گەورە و بچووك و وێنەی ئەتاتۆرك رازێنرابۆوە. بە پیتی زۆر درشتیش لە سەر قوماشێکی سپی نووسرابوو:

"ئاڵای ئۆغوز لە دنیادا دەشەکێنینەوە. خوێنی ئۆغوز بە لامانەوە لە هەموو خوێنێك رەسەنتر و بە نرختره. بمرن دوژمنەکانمان."

ماهیر بەگ کە ئەو رستانەی خوێندەوە لە بن لێوانەوە بۆڵاندی:

"خوا بتباتەوە دەروێش..."

دەروێش بەگ لە پشت پەنجەرە پەمەییەکەی ماڵە دوو نهۆمییەکەیەوە سەیری دەکرد. شادییەکی لە تاریف نەهاتوو لە روخساری خزابوو. ماهیر بەگ کە چاوی پێی کەوت، نەیتوانی سەیری نەکا. لەو کاتەدا وەلی هاتبووە لای و لە بن گوێی گوتی:"دەبێ لەبەر دەرگاکە راوەستین بەگ. غیرەت بدە بەر خۆت. چەند هەنگاوێك پتر نییە..."

ماهیر بەگ بەرەو دەرگا رازاوەکە وەڕێ کەوت. ئیتر شمشێرەکەی بە دەستی راست پێ رانەدەگیرا.

وەلی بەربووە پاڕانەوە:

"نەکەی بەگ، نەکەی. بە قوربانی چاوەکانت بم بەگ، شمشێرەکە بە دەستی راستەت راگرە. ئەو بێناموسە لە بیانوویەك دەگەڕێ. ئەگەر داوا بکا سەر لەنوێ رێورەسمەکە دووپاتە

بکەینەوە، ئیتر تێدا دەچین. هەتا ئێستا موو بە موو جێبەجێمان کردووە. تۆ خودا شمشێرەکەت بە دەستی راستەت راگرە..."

ماهیریش لە حاڵێکدا ئەو پەڕی هەوڵی خۆی دەدا کە شمشێرەکە قیت راگرێ، گەیشتە بەر دەرگای ماڵەکەی. بەشێك لە پاناوکەکە پڕ بوو لە دار چناری بەرز و دارتووی پیر. لك و پۆپی دار پرتەقاڵ و لیمۆکانی نێو حەوشەکە لە بن باری میوەی زەرد و نارنجیدا چەمابوونەوە.

کابرایەکی رەش ئەسمەری بەژن بەرزی جزمە لەپێ کە سێ تەنوورە و چەپگەنی رەشی پۆشیبوو و مێزەرێکی رەشی لەسەر نابوو و شمشێرێکی رووتی بەدەستەوە بوو، هات و بن باڵی ماهیر بەگی گرت و واوەی برد و بەرەو لای باشوور وەریسووڕاند. جڵەوی ئەسپەکانیشی گرت و هەر کامەیانی بەرەو لایەك کێشا و هەوڵی دا هەردوو ئەسپەکە شان بە شانی یەکتری راگرێ. یەکێك لە سوارەکان تۆزێك نووشتابۆوە کە داوای لێ کرد قیت و رەپ دانیشێ. سوارەکە قیت بۆوە وەك سوارەکەی دیکە خۆی رەپ کرد. وەلییشی هێنا و رێك لە پشت ماهیرەوە رایگرت. ئەوانی دیکەشی لە پشت سەرییەوە ریز کرد و خێرا چۆوە ژوورێ و نەدیو بوو.

دەنگی تەپڵ و دەهۆڵ و زوڕنا هەستابوو. گرووپە موزیکەکەش هاتبوو و لە مەیدانەکە ریزیان بەستبوو و دەستیان کردبوو بە لێدانی مارشەکەیان. هەر دەتگوت لەگەڵ دەهۆڵ کوتەکان کەوتووەتە کێبڕکێ. خەڵکەکە لە پاناوکەکە هەر جمەیان دەهات. زۆربەی منداڵ و مێرمنداڵان لە دارەکان وەسەر کەوتبوون یان لە سەربانەکان راوەستابوون. ئیتر کەس متەقی لێ نەدەهات و هەموو پشوویان لە سینەدا قەتیس کردبوو و چاوەڕێ بوون بزانن چیی لێ دێتەوە.

هەتاوێکی گەش و خۆش هەموو وڵاتی داگرتبوو. لك و پۆی دارەکان و چیمەنەکان دەدرەوشانەوە. چارەگێك بیست خولەکێك تێپەڕی...

ماهیر بەگ دەشیزانی دەبێ چەندە لەوێ راوەستێ، بەو حاڵەشەوە چەند جارێك بەبێ ئەوەی بەدەست خۆی بێ، ئاوڕی دایەوە و سەیری ماڵەکەی کرد. ئیدی خەریك بوو دڵی تێکەڵ دەهات. ئیتر تینی تێدا نەمابوو شمشێرەکە بەدەستییەوە راگرێ. ئەنۆی دەنووشتانەوە. لە ترسی ئەوەی نەکا دیسان بەعەرزیدا بکەوێ و حەیای بچێتەوە، هەموو گیانی تەنیبوو. دەبوو سەعات و نیوێکی دیکەش لەو هەوا گەرمەدا چاوەڕێ بێ. کیلۆمەترێك مەودای نێوان ماڵەکەی خۆی هەتا ئێرەی بە سەعاتێك بڕیبوو... ئەگەر پەرجۆیەك نەبوایە، خۆی پێ نەدەگیرا و تاقەتی نەدێنا. دڵی تێکەڵ هات، بەر چاوی رەش دەبوون و سەرە وڕ و کاسەکەی بە سەر ملییەوە خۆی نەدەگرت. دەهات لەپێ بکەوێ، بەڵام چیی تین و توانای لە ئێسکانیدا بوو، کۆی دەکردەوە بۆ

ئەوەی خۆی ڕاگرێ. دیسان خۆی دایەوە دەست بیری کوشتنی دەروێش و ڕقەکەی هەستایەوە بەڵام زوو دامرکایەوە.

زەمەن تێدەپەڕی و خەڵك بەبێ ئۆقرەییەوە چاوەڕێ بوون. لە نەکاو خەڵکە ئۆقرە لێ بڕاوەکە هەڵڵا و قریوەیەکی لێ هەستا عەرزی لەرزاندەوە. ماهیر بەگ وەك مردووان سەری هەڵێنا و بە چاوە پرووش و بێ گیانەکانی سەیرێکی حەشیمەتەکەی کرد و ئەوجار سەری بەردایەوە. سەر و ملی نەدەگرت. دڵ و ریخۆڵەی تێکەڵ دەهاتن و ئەو بەهەموو هێز و توانای خۆی دایدەمرکاندنەوە و خۆی ڕادەگرت. ئەژنۆکانی جار بە جار پتر دەلەرزین.

دەستەیەك گەنج لە حەشیمەتەکە جوێ بوونەوە و دەوری دەهۆڵ کوتەکانیان دا و کەوتنە هەڵپەڕکێ. دەروێش بەگ کە لە پشت پەنجەرەکەوە سەیری دیمەنەکەی دەکرد، لە بن لێوانەوە دەیگوت:"

"باوکەڕۆۆ، باوکەڕۆۆ، بە ڕاستی هیچ کەس بۆ ماڵی دنیایە فیداکاریی ئاوا ناکا. قاباقچی زۆر پیاو دەرچوو.... ئەو سەلماندی ئۆغوز زادەیەکی ڕەسەن و بێوێنەیە. با هەموو ئاقچاساز و ئەگەر ویستیشی چیی ملك و ماڵی خۆیشمە بۆ وی. هەقی خۆیەتی. پاش ئەو جوامێرییەی نواندی تەنانەت ئەگەر داوای گیانیشم بکات پێشکەشی دەکەم."

لێوەکانی مزەفەری کوڕی کە لە تەنیشتییەوە ڕاوەستابوو، دەپەڕی بەڵام نەیدەتوانی بە بابی بڵێ:"چما ئەوەندەش سووکایەتی بە پیاو دەکەن؟ ئەوەندەی دێنێ؟" و کاتێك کە نەیتوانی قسەی دڵی بکا، ڕای کردە لای دایکی و گوتی:"دایکە، تکات لێ دەکەم دایە، بە بابم بڵێ ڕێی بدات بێتە ژوورێ. ئیتر حەیای بە کابراوە نەهێشتەوە. سووکایەتی نەما پێی نەکا.... بچۆ تکا لە بابم بکە با کۆتایی بەو ئەشکەنجەیە بێنێ. بچۆ دایە تۆخودا بچۆ و لەبەر بپاڕێوە..."

خاتوونیش نەفرەتی لە کەسی وەك قاباقچی زادە بوو، بەڵام ئیتر کەمیشی نەکێشابوو، خوا بزانێ ئەو داماوە بە چ حاڵی سەگێك خۆی گەیاندبووە ئەو بەر دەرگایە. لە ڕاستیدا چواردەست و پێ و بە سینگەخشکە هاتبوو. ئیتر خوا هەڵێناگرێ ئەوا دوو سەعاتیش چاوەڕێ بکا. هەر بۆیە هاتە لای مێردەکەی و بە تووڕەییەوە گوتی:

"بەسە بەگ. لەوە زیاتر چاوەڕێی مەکە. ئیزن بدە بێتە ژوورەوە."

بەڵام دەروێش بەگ قەبووڵی نەکرد:

"ئەو نەریتە من دامنەهێناوە خاتوون... ئەو نەریتە ەو جۆرە لە باب و باپیرانمانەوە بە ئێمە گەیشتووە."

خاتوون بە تەوسێکەوە گوتی:" وەك بڵێی لە سەر دەمی باب و باپیرەکانی ئێمەدا کاتژمێریش هەبووبێت؟"

"کاتژمێر نەبووە خاتوون، بەڵام ئەوانەی ئەو کات بۆ ئاشتبوونەوە دەچوونە بەر دەرگای ماڵێك، کەرەی بەیانی دەهاتن و هەتا نوێژی نیوەڕۆیە چاوەڕوانییان دەکێشا. خۆ من ئەو نەریتەم لە گیرفانم دەرنەهێناوە."

خاتوون دەیزانی ئەو هەوێنی ئەم نەریتەی لە کوردەکان وەرگرتووە و خۆی هەندێ شاخ و باڵی پێوە ناوە و لە راستیدا خۆی هەڵیبەستووە. بەڵام چما دەیتوانی وەڕووی خۆی بێنێ؟ بە لەبزێکی تێکەڵ لە پاڕانەوە و بڕیار گوتی:"بەگ، ئەگەر بە قسەی من دەکەی، ئیتر لەوە پتر مەهێڵە چاوەڕوان بێ. دەترسم بەڵایەکی بەسەر بێ. خۆت دەزانی ئەو داماوە تا خۆی گەیاندووەتە ئێرە دوو جاران لە هۆش خۆی چووە."

دەروێش وەك شێتان نەڕاندی:" بە ئێوە چی؟ ئەو پاڵەوانە. ئەو پاڵەوانێکە لە تۆرەمەی ئۆغوز. لێی گەڕێن با بەبێ کەموکووڕی کارەکەی تەواو بکات بۆ ئەوەی ببێتە نموونە و سەرباشقەی نەوەی داهاتوو. ئیتر ئەو جار یان کارێکی وا ناکەن دڵی کەسیان لێ بێشێ، یان ئەگەر یەکێکیان زویر کرد، ئاوا سزاکەی وەردەگرنەوە. باب و باپیرانمان ئەوەیان بۆ داهێناوە؟ بۆ ئەوەی کەس دڵی کەس نەیەشێنێ و بزانێ ئەگەر یەکێك لەخۆی زویر بکات، دڵ بەدەستهێناوەکەی زۆریش سووك و سادە نییە. ئێوە کارتان بەسەرییەوە نەبێ."

لە پەنجەرەوە ئاگای لێ بوو ماهیر بەگ سەری وردە وردە بەسەر سینگیدا شۆڕ دەبێتەوە و ئیتر چیی نەماوە شمشێرەکەی لە دەستی بەر بێتەوە.

دنیا بە سەر سەری ماهیرەوە دەخولایەوە. حەشیمەتەکە لە بەرچاوی و لە گۆڕەپانەکە وەك دەریایەکی بەلرفە هەڵدەستا و دەنیشتەوە...

دەروێش بەگ دیتی کە ئەگەر تۆزێکی دیکەشی پێ بچێ، خەڵك تاقەتیان نامێنێ و بڵاوەی دەکەن. تۆزێکیش دەترسا. لەوانەیە دیسان لەهۆش خۆی بچێتەوە و گیانی دەربچێ... ئیتر تینی لەبەردا نەمابوو شمشێرەکە راگرێ. خۆ ئەگەر سەرەدەرزییەك پیاوەتی و ئینسانییەتی تێدا بێ، هەر ئەوەندەی بەسە. هەتا ئەو و کەسانی وەك ئەو هەبن، هەر لەبەر ئەوەی کە چەند دینارێکیان هەیە، بەربینگی کەس ناگرن و دژی ئەوانە راناوەستن کە رەچەڵەکێکی چەند هەزار ساڵەیان هەیە و ئەگەر لە بەرژەوەندیان بێ، دیسان دژایەتییەکە بکەنەوە، لەبەر چاوی هەرچی و پەرچییان؟ هەر کەس خودا غەزەبی لێ بگرێ، تووشی بە تووشی ئێمەوە دەکا.

لە پێشدا پیاوە جل ڕەشەکەی نارد. ئەو ئێستا ئالآیەکی کەسکی بەدەستەوە بوو. بە دوای ئەویشدا دەروێش بەگ لە سەرخۆ لە دەرگا رازاوەکەوە هاتە دەرێ. ئەویش جلوبەرگی ڕەشی لەبەر کردبوو. کلآوە ڕەشەکەشی نوێ نوێ بوو. بۆینباخێکی ڕەشی بەستبوو کە کوڵی سووری لەسەر بوو. دەروێش بەگ بەو قەڵافەتەیەوە ئەگەر چووبایەتە نێو بەگزادەکانی پاریسیشەوە هەر رێکپۆش دیار بوو.

لە پێشدا لە حاڵێکدا کە لە بن لێوانەوە ویرە ویری بوو، بە دەوری بنیادەمە چەپگەن پۆشەکانی ماهیردا هات. ئەوجار لەگەڵ سوارەکان سێ جاران بە دەوری ماهیر بەگدا خولایەوە و لەبەردەمیدا ڕاوەستا. دوای ئەوەی دەستەکانی بەرەو ئاسمان هەڵبڕی پاڕایەوە و گوتی:"بەخێر هاتی، خێر و بەرەکەتت هێنا براکەم ماهیر. هەتا دنیا دنیایە تۆرەمەی ئۆغوز شانازی بەو پاڵەوانێتییەی جەنابتەوە دەکا."

دەستی درێژ کرد و بۆ وەرگرتنی شمشێرەکەی چاوەڕێ ما. ماهیر کە تۆزێك وەخۆ هاتبووەوە، هەر چاوی بە دەروێش کەوت لەبەردەمیدا، لە تووڕەییەکی ڕەشدا تلایەوە و شمشێرەکەی بە تووڕەیەوە ڕاوەشاند و ئەوجار بە بێ هێزییەوە بەرەو لای دەروێشی ڕاداشت. دەروێش بەگ دوای ئەوەی شمشێرەکەی لێ وەرگرت، هەر بەو شمشێرە سێ جاران لە پشت ملی ماهیری دا و ئەوجار لە باوەشی کرد و ماچی کرد. بن پیلی گرت و بەرەو ماڵەوە وەڕێ کەوتن. بەڵام ماهیر لاقی تێك دەئالآن و وردە وردە قورسایی خۆی دەخستە سەر دەست و شانی دەروێش بەگ.

لەو کاتەدا حەشیمەتە بێدەنگ و بێ جووڵەکە نوقمی سەیرکردنی ئەو ڕێوڕەسمی ئاشتبوونەوەیە بوون. بەشێك لە ژنە بەساڵاچووەکان دەگریان و گەنجەکان دەیانقریواند.

"بژی ئۆغوز"

ئەوان کاتێ گەیشتنە بەر دەرگا رازێنراوەکە، کابرایەك بە کێردێکەوە، بەرانێکی کە پەڕۆی سووری لە شاخی بەسترابوو، لە بەر پێیانیان لەعەرزی دا و چەقۆی لەبەر گەرووی نا. خوێنی ئاڵ فیچقەی کرد و کفنە جاوەکەی ماهیر بەگی سوور هەڵگێڕا. لەو کاتەدا قریوەی خۆشی هەستا و دار و بەردی لەرزاندەوە. دەروێش بەگ داهاتەوە و پەنجەی شایەتمانی دەستی راستەی بە خوێنی قوربانییەکە سوور کرد و لە تەوێڵی ماهیر بەگی خشاند و ئەوجار وەژوور کەوتن. هەر لەبەر چاوان ون بوون، دەنگی دەهۆڵ و قریوەی شادی و خۆشییەکە دامرکایەوە.

ماهیر بەگ کە هەتا بەر پلیکانەکان قورساییەکەی خۆی هەروا خستبووە سەر شانی دەروێش بەگ، لە سەر پلیکانەی پێنجەم لاقی وەرگەڕا و بەربۆوە و لە بەر پلیکانەکە وەعەرزی

کەوت. هەموو پەرۆشیان بوو. هەڵیان گرتەوە و بردیانە سەرێ و لە جێوبانێکدا کە بۆیان ئامادەکردبوو درێژیان کرد. چپی ئاویان بەسەر و دەموچاویدا هەڵدەپرژاند و عەتر و بۆنی خۆشیان بۆ لووتی برد چاری نەکرد. ماهیر بەگ لەهۆش خۆی چوبوو و رەنگی روخساری رەش داگەڕابوو. ناردیانە شوێن دکتۆرێك کە لە نزیك ماڵەوەیان عەیادەی هەبوو. دکتۆر هات و دوای هەوڵێکی زۆر ئاخری ماهیر بەگی وەهۆش خۆی هێنایەوە.

ماهیر بەگ سەری هەڵنەدەهێنا سەیری خەڵکەکە بکا. بە ئاماژەی دەست داوای ئاوی کرد. هێنایان و دایانێ. ئاوەکەی یەك بین خواردەوە و هاتەوە سەرخۆ. دەروێش بەگ پرسیی:"قاوە دەخۆیەوە؟"

ماهیر بەگ بە سەرلەقاندنێك گوتی بەڵێ.

بەر لەوەی قاوەکەی بۆ بێنن، دەروێش بەگ داوای لێ کرد بچنە دیوەخانەکە. بەڵام ماهیر بەگ تینی لەبەردا نەبوو لەجێی خۆی هەستێ. هەموو گیانی دەیزیڕاند. بەڵام هەرچۆنێك بوو هەستا و چوونە دیوەخانە گەورەکە، کە فەرشێکی سووری تورکمانیی لێ راخرابوو.

پیاوماقووڵ و دەستڕۆیشتووەکانی شار هەر دەهاتن و دیوەخانەکەیان پڕ دەکرد و ماهیر بەگیش وردە وردە دەهاتەوە سەرخۆ. ماهیر و دەروێش بەگ لە تەنیشت یەکترییەوە دانیشتبوون. دەنگەدەنگەکەی دەرەوە وردە وردە دەنیشتەوە. هەر دوو سوارەکە هێشتاش لەولاولای دەرگاکەی حەوشەوە قیت و رەپ لەسەر پشتی شەودێزەکانی خۆیان دانیشتبوون. دەبوو تا رۆژ ئاوا دەبێ هەروا لەوێ راوەستن. وەلی و چەپگەنپۆشەکانی دیکەش لە بەر دەم ئەسپەکان بە ریز چاوەڕێ بوون. ئەوانی شدەبوو تا تاریك دادێ لەوێ بمێننەوە.

مودیر ناحیە و شارەوان و سەرۆکی دارایی و پاراستنی بەڵگەنامەکان و موفتی و ملکدارە گەورەکان و کارخانەدارەکان و... بە دوای یەکدا دەهاتن و کە چاویان بە قەڵافەتی ماهیر بەگ دەکەوت، بۆ ئەوەی پێشی قاقای پێکەنینەکەیان بگرن، لێوی خۆیان دەکرۆشت و زۆرییان لە خۆیان دەکرد و ئەوجار بە رێزێکی قەستینەوە دەستیان دەگوشی و بەو جۆرە پیرۆزباییان پێ دەگوت بۆ ئەو خزمەتە مەزنەی بە میللەتەکەی کردووە. ماهیریش سەری هەڵنەدەهات سەیری کەس بکا.

کە هاتنی میوانەکان بڕایەوە، دەروێش بەگ هەستی کرد دەبێ لە پەیوەندی لەگەڵ ئەو شتەدا وا ئەمرۆ رووی دابوو قسەیەك بکات بۆیە دەستی پێ کرد:

"ئێمە بۆ ئەوەی نەریت و مەزنایەتیی باب و باپیرەی ئۆغوزمان بۆ خەڵکە ئۆغوزەکەی ئێمڕۆمان بسەلمێنین و وایان لێ بکەین قەبووڵی بکەن، ئەو فیداکارییانە دەکەین. ماهیر بەگ، هەر ئەو ماهیر بەگەکەی لە بەر چاوتانە، پاڵەوانێکە هاوشانی ئەلب ئەرسەلان و چەنگیزخان و تەیموری لەنگ. ئەو گیانفیدایەکی نەریتەکانە. ئەوانەی لە تۆرەمەی ئۆغوزن و دوای ئێمە دێن، بۆ ئەوەی تووشی ئاشتبوونەوەی لەو جۆرە نەیەن، بە تووتووش دڵی کەس لە خۆیان نایەشێنن. وا نییە ماهیر بەگ؟"

ماهیر بەگ بە نێوچاوانی گرژەوە وەك منداڵێکی تێی هەڵدرابێ، لە کفنەکەیدا کرووشمەی کردبوو. هەر لەوە دەترسا خەڵکەکە دەست بکەن بە گەپ و گاڵتەو سوعبەتکردنێ. ئەوی لەوێ بوو بە دیتنی ئەو سەر و سیمایەی ماهیر بەگ پێشی پێکەنینەکەی خۆی پێ نەدەگیرا. ماهیر بەو قەڵافەتەیەوە زیاتر لە مردووەك دەچوو کە زیندوو بووەتەوە و لە گۆڕ دەرپەڕیوە. ماهیر کە هەستی کردبوو دەروێش شتێکی لێ پرسیوە، زۆر زۆرری بۆخۆی هێنا هەتا بە سەرلەقاندنێك توانیی بڵێ بەڵێ. دەبوو خۆ لە قسەکانی ئەو گێل بکا.

دەروێش بەگ پەیتا پەیتا قسەی دەکرد و وشەی ماهیر بەگ و پاڵەوان و دۆست و برای دووپاتە دەکردەوە و دەیگوت رەچەڵەکی ئۆغوز بە سەدانساڵیش دەبێ پاڵەوانی ئاوای لێ نەکەوتووەتەوە و لێشی هەڵکەوتبێ هیچ قارەمانێك وەها خزمەتێکی بێوێنەی بە تۆرەمەی ئۆغوز نەکردووە. ئەو نەریتەی ئەمڕۆ لە پێش چاوەکانمان سەرلەنوێ لەدایك بووەوە، سبەی رۆژێ لە ناحییەکان و دووسبەی لە ویلایەت و چەند ساڵ دواتر لە هەموو وڵاتدا دەبێتە باو و هەموو بۆ ئەو نەریتە مەنەتباری ماهیر بەگ، پاڵەوانەکەی تۆرەمەی ئۆغوز دەبن.

دەروێش بەگ ئەوی دەبردە کەشکەڵان و لە رادەبەدەر گەورەی دەکردەوە و رێزی دەگرت، بەڵام ئەوانیتریش لە دوویان دەدا و قسەکانیان پشتڕاست دەکردەوە. ماهیر بەگ گوێی لێ دەبوو و سەری سووڕ دەما.

وردە وردە خۆی دەگرتەوە و بۆ یەکەم جار سەری هەڵێنا و لە بن چاوانەوە سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد. لە روخسار و چاوی هەمووواندا گاڵتە و تەوس و توانجێکی بەدی کرد و دیسان سەری داخستەوە. سەری بەردایەوە بەڵام قسەکانی دەروێش بەگ ئەگەر درۆش بوایەن هێشتا لەدڵی خۆش دەهاتن و کەیفیان ساز دەکرد. وردە وردە بڕوای کرد کە هەر بەراستی ئەو گیانفیدایەکی نەریتەکان بووە. نەوەکانی داهاتووی تورك ئەو گیانفیدایی و فیداکارییەی ئەو

لەبیر ناکەن. بەڵێ، ئەو بنەمای باشترین شت واتە ئاشتبوونەوە و پێکهاتنەوەی دارِشتبوو. بەڵێ، بەڵێ ئاوا بوو و لەوە زیاتر نەبوو.

دەروێش بەگ هەروا قسەی دەکرد:"ئەوە پاڵەوانەکان مێژوو دروست دەکەن و رەچەڵەکە مەزنەکانیش نەریتەکان. بەڵام مێژوو و نەریتەکان لە سەردەستی مرۆڤ و تۆرەمەی مەزنتر دەمێننەوە. مەگەروا نییە برای بەرِێز ماهیر بەگ؟ ئێوە باشتر دەزانن. ئێوە مرۆڤێکی مۆدێرن و خوێندەواری ئەوروپان. ئێوە سەرتان بە هەموو کەلێن و قوژبنەکانی گەوهەری کولتووری ئەوروپادا کردووە، وا نییە؟"

ماهیر بەگ وردە وردە تەواو ئاسایی دەبووەوە. ئەگەر ئەو کفنەشی لەبەردا نەبوایە، تەواو وەك خۆی لێ دەهاتەوە و هەرچی ئەمڕۆ بەسەری هاتبوو، بە ئاوی ئەو قسانە دەشۆرانەوە و لەبیری دەکرد. ئەگەر ئەو گەوادەی شێت و ماخولیای ئۆغوزە لەبری ئەو زمانلووسی و شووتی وەبن هەنگڵدانە دەستێك جلوبەرگی دابایە و لەو گۆرِەوشارە نەجاتی دابا... ئاخۆ دەروێش بەگ بۆیەی ئاوا لێ نەکردووە حەیای بەرێ؟ یانی هەموو ئەو قسە و هەڵسوکەوتانەی درۆن یان هەر بەراست لە دڵەوە دەیانکا؟ چیی دەیهێنا و دەیبرد، بۆی نەدەچۆوە سەر یەك. لە برسان دڵی تێکەڵ دەهات.. چەندی زیاتریش دەهاتەوە سەر خۆی، زیاتر هەستی بە برسێتییەکەی دەکرد. وەبیری هاتەوە نانی نیوەڕۆی نەخواردووە. قاوەڵتییشی نەخواردبوو. ئەو سەگەی ماخولیای ئۆغوزەش خۆ یەك پشوو قسەی دەکرد و پرسیاری دەکرد. لەو کفنەدا هەستی دەکرد رووت و قووتە و لە شەرمان دەبووە تنۆکە ئاوێك. بەدەنگێکەوە کە ئاشکرا زویربوونی پێوە دیار بوو گوتی"بەڵێ وایە".

دەنگی درزی بردبوو. دوای راوەستانێکی زۆر دیسان دووپاتەی کردەوە:"بەڵێ وایە."

ئەوجار بە تووڕەییەوە گوتی:"ئەگەر لە پێناوی ژیاندنەوەی نەریت و بەرزکردنەوەی نیشتمان و نەتەوەکەمدا نەبوایە و ئەگەر نەمویستبایە ببمە نموونەیەکی رەسەن، لە بەردەم ئەو خەڵکە نەزانەدا..."

چەند ساتێك بێدەنگ مایەوە و بیری کردەوە و لێی زیاد کرد:"لە کفنێکی ئاوادا..."

دیسان بێدەنگ بۆوە. ئاخۆ بڵێ؟ ئاخرییەکەی گوتی:"بەو قەد و قەڵافەتە قەشمەرەوە... ئەمن دوو ساڵان لە بەریتانیام دەرس خوێندووە. بە چاوی خۆم پادشام دیتووە، کە چۆن کفنێکی سپیی لەخۆیەوە پێچاوە و بە سەرو پێی پەتی و لە حاڵێکدا پەتێکی چەوری لە

ملی کردبوو به شەقامەکانی لەندەندا بەپێیان دەڕۆیشت بۆ ئەوەی بچێت سەر لە گۆڕی باب و باپیرەکانی بدات."

ئەوجار بێدەنگ بوو. خۆشی دەیزانی تاقەتی قسەکردنی نییە. بەڵام زۆر تووڕە بوو. دەیدی کە مودیر ناحیە و بەرپرسە حیزبییەکانی دیکە و لێکۆڵەری حیزبی ئەیالەت و نوێنەری پەرلەمان ـ کە تازە زانیبووی لەوێن ـ چەندە بە بەزەییەوە سەیری دەکەن.

ئەوجار هەمووان بۆ خواردنی نانی شەویٚ چوار مەشقی لەسەر سفرەبەرەکان دانیشتن.

ماهیر بەگ بەر لەوەی دانیشێ، سەری بردە بن گوێی دەروێش بەگ و بە سرتەیەکەوە لەبەری پاڕایەوە:"دەڵێی چیی ئەو کفنە داکەنم دەروێش بەگ؟ تکا دەکەم، باشە؟"

دەروێش بەگیش بە دەنگێك کە هەمووان گوێیان لێی بێ گوتی:"نۆرەی ئەویش دێ. تازە ئەو هەمووە فیداکارییەمان کردووە و نەریتێکمان زیندوو کردووەتەوە، وا باشترە هەموو شتێك لە کات و جێی خۆیدا بکرێ، وا نییە؟ "

بە نابەدڵییەوە، هەر بە کفنەکەوە لەسەر سفرەکە دانیشت.

ئێستا هەمووان خەریکی خواردنێ بوون و قاقایان دەکێشا. لە رواڵەتدا پێکەنینەکانیان بەو قسە و سوعبەتانە بوو کە دەیانکردن، بەڵام ماهیر بەگ باش دەیزانی ئەوان بەو و بەو گەد و گیپاڵەی ئەو پێدەکەنن و هەرچۆنێك بێ وەڕووی خۆی نەدێنا و لەگەڵ ئەواندا وای دەنواند بە سوعبەتەکانی ئەوان پێدەکەنێ. لە سەر سفرەکە ئەوەندە پێکەنین و قاقایان کێشا، چاویان پڕ ببوو لە ئاو.

شێو خورا. پەرلەمانتارەکە و مودیرناحیە هێشتاش هەر لە بنەوە سەیریان دەکرد و دەتریقانەوە. ئەگەر ئاشیق حوسێن بە سازەکەیەوە وەژوور نەکەوتبایە، پێکەنینەکەیان نەدەبڕییەوە. کە ئاشق حوسێن هات، هەموو چاوە تەڕەکانیان سڕییەوە و گوێیان دایە ساز و ئاوازەکەی.

ئاشیق حوسێن یەکێك بوو لە ئاشیقە هەرە بەناوبانگەکانی ئەو ناوچەیە. کەس نەبوو ناوی ئەو و گۆرانییەکانی نەبیستبێ. هەندێکیان یەکەم جار بوو دەیاندیت بەڵام ماهیر بەگ جارێکیان بە جنێوان لەماڵەکەی خۆی دەری کردبوو. ئەو رقێکی زۆری لە شاعیر و ماعیر و شتی وا بوو.

ئاشیق حوسێن سازەکەی بە سینگییەوە نا و دەستی کرد بە تاریف و پەسنی بنە و بنەچەکی ساری ئۆغلی و هەر سێ باپیرە ئۆغوزەکەی. ئەوەش بەشێك بوو لە نەریتەکە.

دەروێش بەگ ئەوەی لە ڕێوڕەسی ئاشتبوونەوەی بەگە کوردەکاندا دەیتبوو و ئاشیق حوسێنی ڕاسپاردبوو کە هەندێك بە بنە و بنەچەکی قاباقچی ئۆغلێیش هەڵبڵێ، بەڵام ئاشیق خۆی لێ گێل دەکرد و لە گۆرانییەکەوە دەچووە سەر هەوایەکی دیکە.

دەروێش بەگ هەڵچوو و وەقسە هات:"هۆی ئاشیق، هەر دەڵێی لەبیرت چووەتەوە ئەتۆ دەبێ دوای پەسنی بنەچەکی یەکێك لەوانەی ئاشت دەبنەوە، پەسنی بنەچەی ئەوی دیکەش بکەی."

ئاشیق لەوەڵامیدا گوتی:"ئێمە تەنیا بە بنەچەی ئەوانە هەڵدەڵێین کە ڕەسەنزادەن. ئەوانەی بێ ڕەگ و ریشەن، سەگەل پەسن و تاریفیان دەکەن."

ئەوەی گوت و وەدەر کەوت و بەجێی هێشتن. دەروێش بەگیش بە تووڕەییەوە نەڕاندی:"سەگی بنی سەگ... ئەو ئاشیقانەش هەموو شێتن."

ئەوجار بۆ دڵدانەوەی ماهیر بەگ دەستی کرد بە زمانلووسی. پێی وابوو ماهیر بەگ وا دەزانێ ئاشیق بە تایبەتی و بە پێی ڕێککەوتنی پێشوویان ئەو گووکارییەی کردووە. نەخێر، نەهێر، ئیتر ماهیر گیان و دڵی ئەو بوو. ئیتر لە تەرازووی دڵیدا، تای تەرازووی ماهیر لە هەر چوار مندالەکەی قورستر بوو. لەوە خراپتر ئەوە بوو کە هەرچی میوانی بەناوبانگی هەیبوو، ئاگایان لەوە بوو.

میوانەکان دوای ئەوەی تاوێك سەیری یەکتریان کرد و لە بنەوە سەیرێکی ماهیربەگیان کرد دایانە قاقای پێکەنین. بەشێکی شەو نیوەش ببوو هێشتا ئەوان لە پێکەنین نەکەوتبوون، کە هەستان و ڕۆیشتن. دەروێش بەگیش ئەو ژوورەی بۆ ماهیر بەگی دەسنیشان کردبوو، پێشانی دا. ماهیر بەگ دەسبەجێ کفنەکەی فڕێ دا و خۆی خزاندە جێوبانەکەیەوە، بەڵام هەتا بەیانی خەو نەچووە چاوییەوە و هەر ئەمدیوەودیوی کرد. لەسەر ئەو هەڵسوکەوتەی ئاشیق، هیچ لە دەروێش بەگ تووڕە نەببوو. ئەمڕۆ ئاشیقیش تۆڵەی دەرکردنەکەی لێ کردبۆوە.

بەیانی زوو، کارەکەرێکی ژیکەڵە و جوان جلوبەرگ و پێڵاوی بۆ هێنا و لە سەر مۆبلەکەی دانا و ڕۆیشت.

ماهیر بەگ لە خۆشییان لە جێوبانەکەی دەرەپەڕی. کەواتە ئیتر ناچار نییە بەو کفنە تووك لێکراوەوە بگەڕێتەوە ماڵەکەی. جلوبەرگەکانی بەدەستەوە بوون و سەیری دەکردن. لە قوماشێکی هەرەباشی بەریتانی دوورابوون. کراسەکە چنراوی ئەمریکا بوو. پێڵاوەکانیشی

دەستکردی ئیسماعیل کەمالی ئەستەمبوولّی بوو. دەسبەجیّ لەبەری کردن. جلوبەرگ و کراس و گۆرەوی و پیّلاوەکانی پڕ بە پیّ و بەری بوون. ماهیر زۆر دواتر بیستییەوە کە ئەو جلوبەرگانە لە ئەدەنە لای ئەو بەرگدرووە بە دوورین درابوون کە جلوبەرگی بۆخۆی دەدووری.

لە حالّیّکدا لە خۆشییان بەو حالّەتە گالّتەجارِییە پیّ دەکەنی بە خۆی گوت:"بەلاّم ئەو نەریتی ئۆغوزەش نەریتیّکی سەیر و سەمەرەیە ها."

چووە ئاودەست، ردیّنی پاك تاشی و بۆینباخی بەست. دوای ئەوە بانگیان کردە سەر سفرەی بەرچایی. کە دەهات بۆ سەر سفرەکە، دەرویّش چەند هەنگاویّك بەپیرییەوە چوو و بن پیلی گرت و لە سەر سفرەکە و لە تەنیشت خۆیەوە داینا.

ماهیر بەگ دوای خواردنی قاوەلّتییەکە زۆر سوپاسی کرد. ئیتر کاتی رۆیشتنی بوو. ئیّستا لە مالّەوە چاوەریّ و نیگەرانی بوون. دەرویّش بەگ گوتی:"ئەها، فەرموون. لە خوارەوە ئەسپیّکی عارەبیی زینکراو چاوەریّتە. بەپیّی نەریتی ئۆغوز، کاتیّ دۆستیّك لە مالّی دۆستەکەی دەرِوات، جوانترین ئەسپی عارەبیی بەدیاری دەدەنیّ. ئەوە ئەسپە هەرەجوانەکەی نیّو گەورِەکەمە. خیّری لیّ ببینی برالە، بەخیّر و خۆشییەوە سواری بی."

ماهیر بەگ لە حالّیّکدا کە چاوەکانی لە خۆشییان دەدرەوشانەوە، گوتی:"ئەو هەمووە زەحمەتەی نەدەویست. زۆرم زەحمەت دان، نۆکەری خۆت شەرمەزار کرد. جا مادام نەریتەکەمان، نەریتی ئۆغوزمان وا دەخوازیّت، قەبوولّی دەکەم."

ئەمرِۆ بەرهەمی زەحمەت و زەجر و ئازارەکەی دویّنیّی بە زۆرەوە وەدەگرتەوە. باش بوو دویّنی فریوی شەیتانی نەخواردبوو و شمشیّرەکەی لە زگی دەرویّش بەگ رۆنەکردبوو.

وەك گەنجیّکی گورج و گۆلّ لە پلیکانەکان چووە خواریّ. ئەسپەکەیان بۆ هیّنا و لیّی سوار بوو. ئەی لەو ئەسپە جوانەی. دابەزی و هەتا بەر دەرگای حەوشەکە پیّ بە پیّی دەرویّش بەگ رۆیشت. لە بەردەرگا دەستیان لە ئەستۆی یەکتری کرد و مالاّواییان کرد. ماهیر بەگ سواری ئەسپە دیارییەکەی بۆوە. لە دەرەوەی گوند، پازدە سوارچاك کە چەپگەنی کۆبەگیراویان لەبەردابوو و قەلاّفەتیّکی میللییان هەبوو، چاوەرِوانی بوون. ئاورِی دایەوە و لە دەرویّش بەگی پرسی:"ئەی ئەوانە چین برالە؟"

ئەویش وەلاّمی داوە:"ئۆغوزەکان میوانی خۆشەویستی خۆیان بەرەلّلا ناکەن. هەتا بەر دەرگای مالّیّ بەرِیّی دەکەن."

ماهیر بەگ لە پێشەوە و سوارە چەپگەنپۆشەکان لە دواوەی بەڵام ئەمجارەیان لە سەرداوای ماهیر بەگ ڕێك بە نێوەندی بازاڕێدا ڕۆیشتن. دەتگوت یەك لە هەزاری حەشیمەتەکەی دوێنێش لە بازاڕێ نەبوون، بەڵام با وابێ، دیسان دووکاندارەکان هاتنە سەیری. ئەمجارەش پێی پێدەکەنین و بەسەرسووڕمانەوە سەیریان دەکرد.

ماهیر قاباقچی ئۆغڵی و دەروێش بەگی ساری ئۆغڵی بەو جۆرە بە پێی نەریتی ئۆغوز بوونەوە برا.

# ٧٢

دڵەڕاوکێ و هەژانێکی سەیر شارۆچکەکەی داگرتبوو. هەواڵی ناخۆش ناخۆش لە ئاقچاسازەوە دەهاتن و وەك دۆڵپایەك سواری پشتی شارۆچکەکە دەبوو. هەموو دەشتەکەی خواروو و دەشتی ئاناوەرزا و دەوروبەری دۆملی و خوارووی کووزان و خوارتر راپەڕییبوون و ئاقچاسازیان بەسەر خۆیاندا دابەش کردبوو و هەرکەس پێشی گرتبایەن، دەیانکوشت. جەستەی سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجەیان بە فیشەك وەك بێژینگ دابێژتبوو. نە سەری پێوە مابوو و نە گۆشت و نە چاو و نە دەست و نە لاق و نە ئێسقانێك. لەتوپەتیان کردبوو. سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە، ئەو شێرەکوڕە، ببووە لوێچێ گۆشت و پێستی کونکون و ئەنجن ئەنجنکراو.

"تف، تف، تف! یاخوا موسوڵمان نەیبیستێ و کافریش نەیبینێ."

رێوڕەسمی ناشتنەکەی سلێمان سۆوی پەنجە زۆر بە شکۆوە بەڕێوە چوو. بۆ هێنانەوەی تەرمەکەی جگە لە بیست سەیارە، کامیۆن و تەراکتۆر و عارەبانەیەکی زۆر و بێ ژماریش چوون. لە سەر رێگا و گوندەکان بە هەزاران کەس بە چاوی فرمێسکاوییەوە تەرمەکەی سلێمان سۆوی پەنجەی قارەمان و شەهیدی رێی نیشتمانیان بەڕێ کرد. هەمووان بە دەست و دڵاوایییەوە ئەرکی خۆیان بەرامبەر ئەو پاڵەوانەی نیشتمانەکەیان بەجێ دێنا. حەفتەنامەی قانداش بە بۆنەی شەهیدبوونی سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە، ژمارەیەکی تایبەتی دەرکرد. لەو ژمارە تایبەتەدا شازدە پارچە شیعر بڵاو کرابۆوە. باسی قارەمانەتییەکانی ئەو کرابوو لە شەڕە رزگاریخوازییەکاندا و جنێو درابوو بەو کۆمۆنیستانەی کوشتبوویان و هەڕەشەیان لێ کرابوو.

دەیانگوت ئەو هەڵۆیەکی سووربالّ بوو. ئەوە کێ بوو لە چیای تۆرووس و پەلی هاچین، هەزار و پێنج سەد کافری گرتبوو جا هەر لە منداڵی بەرمەمکانەوە بگرە هەتا پیری نەوەد ساڵەیان ورد ورد ئەنجنیبوونی و جۆگەلەی خوێنی لێ وەڕێ خستبوون و سێ شەو و رۆژان ئاوی رووبارە خوڕەکەی بەخوێنی سوور ئاڵ کردبوو؟ شەهێنە بەرزەفڕەکەی بین بۆغان، ئەسلان سۆوی

پەنجەی قارەمان. کێ بوو لە ئاسیای ناوەڕاست، لە چیاکانی ئاڵتاییدا ئەسپی لینگ دا و چووە سەر ترۆپکی ئەو بێن بۆغایانەی سەریان لە ئاسمانێ دەسوی و بە زەبری شمشێر چوکووراوای مەزنی گرت؟ سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە. ئەو خوێن پاکە ئەو رەسەن و بەر و پشت ئەتڵەسە، ئەوەی وا ئالای چەنگیزی مەزنی لە چەقی ئاسیادا شەکاندەوە، کێ بوو؟ باپیرەگەورەی مەزنمان، ئەسلان سوی پەنجەی شەهێن ئاسا. ئەوەی رووباری بەخوڕی خوێنی وەڕێ دەخست و دوژمنی بە زبر و زەنگ دەردەپەڕاند، مائۆی چینی دەترساند، کێ بوو؟ ئەسلان سۆوی پەنجەی ناودار، ئۆغوزی نەوەی ئۆغوز. ئەوەی ولاتی مەزنی تورکی بە هەتیوی و بێکەسی و بێ سەرپەرست بەجێ هێشت، کێ بوو؟ مەزن و گەورەمان، گیانمان ئەسلان سۆوی پەنجە.

باسی ژیان و بەسەرهاتی ئەسلان سۆوی پەنجە لاپەڕەیەکی پڕ کردبۆوە. جا ئەسلان سۆوی پەنجە چیی بۆ ئەو ولاتە نەکردبوو. ئەسلان سۆوی پەنجەیەك، کە بە دەستی نامەرد و چەپەڵان کوژرا، نەك بە پێنج شەش گوللەش بەڵکو بە چل گوللەی گەرم کە دڵە گەورەکەی دابێژ دابێژ کرد و کوشتی...

دەمەدەمی بەیانی بوو، کە تابووتی لە ئالای تورکان پێچراوی ئەسلان سۆوی پەنجەیان هێنایەوە و لە گۆڕەپانەکەی شاری دایاننا. دوو منداڵ، کچ و کوڕێك بە جلوبەرگی پێشەنگانەوە لە تەنیشت تابووتەکە ئێشکگر بوون. دواتر دەستەیەك قوتابییان هێنا. پەنجا شەست کەس دەبوون و ئەوانیش جلوبەرگی پێشەنگییان لەبەردا بوو و بە ریز لەبەر تابووتەکەوە راوەستان. ئەوانەش دیار نەبوو بە چ بۆنەیەك و بەپێی چ بڕیارێك بە دەنگێکی بەسۆزەوە سروودی سەربەخۆییان دەخوێندەوە و دووپاتەیان دەکردەوە.

لەو جەنگەیەدا بە فەرمانی ماهیر بەگ کە لەبەر دەردەسەری و گرفتاریی خۆی، کاتی وەی نەبوو سەری بخورێنێ، قوماشێکی حەوت مەتریی بەنەخش و نیگاری گورگێکی خۆڵەمێشینیان هێنا، کە گورگەکە وەك بلوورێنێ قەپۆزی هەڵێنابوو بەرەو ئاسمان و لە میلەیەکەوە هەڵکێشرایە سەرێ. ئالاکە هەروا هێور هێور هەڵدەکێشرا و منداڵە پێشەنگەکان بە گوتنەوەی "گورگی خۆڵەمێشی، گورگی خۆڵەمێشی" مڕاندیان و لووراندیان. لەو کاتەدا کورسییەکی وتاردانیش لە بەر ئالاکە دانرا. لە نێو شارۆچکەکە هەر کەس زاری قسەکردن یان قسەیەکی هەبوو، بە نۆرە چووە پشت کورسییەکە و وتاری خۆی دا و دروشمی دا.

دەیانگوت خوێنمان لە هەموو خوێنێ ئاڵترە، نەژادی تورك لە هەموو نەژادێك مەزنترە. دەیانگوت تۆڵەی خۆمان، تۆڵەی خوێنی تورك، تۆڵەی نەژادی تورك لە گوندییە دڵڕەقەکان، لەو

کۆمۆنیسته پیسه نیشتمانفرۆشانەی دەکەینەوە کە هاوخوێنە رەسەنەکەمان، ئەسڵان سۆوی پەنجەی مەزنمانیان بە سەد برینەوە کوشت. سوێند دەخۆین، دەیانگوت سوێند دەخۆین بەو ئاڵا پیرۆزە بەو گورگە پیرۆزە...

ئەو ئاڵایە و ئەو گورگە بە شایەت دەگرین کە... ئەو زەوییە، ئەو ئاسمانە، ئەو ئاوەی لەبەری دەڕوا و ئەو خاکە شایەت بن کە تۆڵەی خۆمان لەو گوندییە کۆمۆنیستە خوێنمژانە دەستێنینەوە کە بۆ پارووە نانێك لە میللەت و دەوڵەت یاخی دەبن و پشێوی وەڕێ دەخەن.

دوای ئەو وتاردانە تەرمەکەیان بردە مزگەوتی گەورە و دوای ئەوەی نوێژی مردوویان لەسەر کرد بردیان لە سەر گردەکە و لە نێو شین و ناڵین و دروشمدا بەخاکیان سپارد.

لەوەتەی ئەو شارۆچکەیە هەبوو ڕێورەسمی مردووناشتنی ئاوای تێدا بەڕێوە نەچوبوو. دەرویش بەگ ئەو ڕێورەسمەی زۆر بە دڵ بوو و لە ناخی دڵییەوە سوپاسی رۆڵە هەرە ئازاکانی ئۆغوز و ماهیر قاباقچی ئۆغلێی ناوداری کرد و گەورەیی نواند و گوتی هەرچی ملك و ماڵم هەیە و هەموو دەشتی ئاناوەرزا و ئاقچاساز پێشکەشی ئەو برا ئازیزەمان، گیان و سەر و ماڵیشم بە قوربانی..."

دەرفەتێکی باش رەخسابوو بەڵام بارودۆخەکە رۆژ بە رۆژ خراپتر دەبوو و هەواڵی ناخۆش پەیتاپەیتا دەهاتن. ماهیر بەگ بە شڵەژاوییەوە پەنای بۆ هەموو کەس دەبرد:"

"دەبێ چ بکەین؟ چ دەکرێ؟ ئەو گوندییانە هار بوون، دەترسم هەموومان بکوژن. هەر بەراستی دەبێ چ بکەین؟ کوڕە خۆ ئاوا بڕواتە پێشێ دوور نییە پەلاماری شارەکانیش بدەن و هەمووی بسووتێنن و دەستدرێژی بکەنە سەر ناموسمان و ئادارمان بە سەر پادارمانەوە نەهێڵن."

هەڵڵا و هەنگەمەیەك شاری داگرتبوو بێوێنەبوو. کەس بەکەس نەبوو و لە هەر گوندێکەوە هەواڵێك دەهات.

ماهیر بەگ ئەگەرچی دەترسا، بەڵام لە ناخی دڵەوە خۆشحاڵ بوو. دابەشینی ئاقچاساز لە لایەن گوندییەکانەوە و راپەڕین و کوژرانی سلێمان بەگ ببووە هۆی ئەوەی کەس حەیاچوون و ریسوابوونەکەی ئەوی لەبیر نەمێنێ. دەسبەجێ چووە لای نەقیب و دادوەری گشتی و گوتی:"بکوژەکەی بێ ئەملاوئەولا دەبێ بدۆزرێتەوە."

نەقیب:"بکوژەکەی خۆی خستووەتە زەلکاوەکەوە."

دادوەر:"نوقم بووە."

"ژنەکانی و کچ وکوڕەکانی... دەسبەجێ جەنابی نەقیب... دەسبەجێ جەنابی نەقیب... دەبێ ئەوانە بهێنرێنە شاری و بیانگێڕن بە نێو شاردا. ئەو سەرهەڵدانە بۆوەی نابێ جۆرێکی دیکە بەرپەرچی بدرێتەوە. ئەوە شوێن پەنجەی کۆمۆنیستەکانی پێوەیە، ئەگینا ئاقچاساز... دەسبەجێ..."

نەقیب گوتی:"دەسبەجێ."

دادوەر:"دەسبەجێ."

دوانیوەڕۆیەك ژنە پیر و پشت کۆماوەکەی مەستان و کوڕ و بووکەکانی و هەر سێ کچەکەی و خوشکەکەی وەلی شەماڵ و پێنج کوڕەکەی و شەش بووکەکەی و کچە ئیفلیجەکەی و نەوە وردەکانیان هێنایە شاری. هەموو مەچەکیان کەلەپچە کرابوو. بارانی جنێو و قسەی ناخۆش و بەرد و تف و پیسایی و مست و پێلەقەیان بەسەردا دەباری و ئەوان بە زراوچوویییەوە خۆیان راگرتبوو و متقەیان لێوە نەدەهات.

بازاڕەکە یەك پشوو دەیگرماند:

"نیشتمانفرۆشینە، دوژمنی دین، کۆمۆنیستینە، گوندییە کۆمۆنیستەکان."

ماهیر بەگ گوتی:"دەی، دەی، دەی، ئاوا، هەموو کارەکان جێبەجێ دەبن... هەموو شتێك ئامادەیە، بەڵام... بەڵام شتێك ماوە، بەڵام."

"فەرموون بەگ."

"هەموو شتێك بۆ برادەران بگێڕەوە با ئاگادار بن."

وەلی وەقسە هات:"عەرزتان بکەم، عەرزتان بکەم، هەر کام لە گوندییەکان دێوەزمەیەکن، پەتایەکی بێدەرمانن. ئەویش چەند؟ چەندە؟ ئەمن بڵێم سێ هەزار، ئێوە بڵێن پێنج هەزار، دە هەزار دانە، ژنەکانیشیان... دەستیان کردووە بە هەڵکەندنی خەرەندێك لە نێوان جەیحان و ئاقچاسازدا. ئەگەر من بڵێم لە ماوەی پازدە رۆژ، مانگێکدا ئێوە بڵێن لە ماوەی دوو مانگدا... خەرەندێك سێ گەز پان و گەز و نیوێك قووڵە. لێم پرسین کە بۆچی ئاوا لە زەویی ئەو حوکمەتە دەکەن؟ خۆ زەویی بابتان نییە؟ لە وەڵامدا گوتیان:"هەڵیدەکەنین بۆ ئەوەی ئاوی ئاقچاساز لە رووبارەکەی جەیحان بکەین و چاقچاساز هەڵچۆڕێت. لەوێ نیشتەجێ بین و گوندێك دروست بکەین و ببینە خاوەن زەوی و زار. پرسیم چما ئاقچاساز هەڵدەچۆڕێت؟ ئاقچاساز دەریایەکی ئاو تێدایە. چما ئاقچادنیز(دەریای سپی) هەڵدەچۆڕێ هەتا ئاقچاسازیش هەڵچۆڕێت؟ گوتیان تۆ نەخشانەی خراپ لێ مەدە ئۆغوزی ئاغا گەماڵ. گوتیان هەڵدەچۆڕێ.

گوتیان هەڵیش نەچۆڕێ ئێمە هەڵی دەچۆڕێنین، چونکە هیچ چارمان نییە. ئەوجار لەوێ دوور کەوتمەوە و بەپێی فەرمانی ماهیر بەگ دەورێکی ئاقچاسازم لێ دا. چیم بەو چاوانەی خۆم بینی، چیم دی و چیم نەدی... هەموو گوندییەکانی ئەو دەوروبەرانە، منداڵەوردکە و پیر و گەنج و ژن و پیاو هەموو وەك قوڕنوو، وەك مێش و مەگەزی دەوری قاپی هەنگوین بە ئاقچاسازەوە نووساون. ئاقچاساز وردە وردە وشك دەکەنەوە. وشکی دەکەنەوە و دار و باری لێ دەچەقێنن. جا لەوێ چ دەکەن و چۆنی وشك دەکەنەوە، ئەوە کەس نازانێ. من ئەقڵم بەو شتانە ناشکێ. ئەوەی راستی بێ ئەوەیە کە لە دەوروبەری ئاقچاساز سەدان و هەزاران سەیوان و کەپریان دروست کردووە. کار دەکەن و دەچێنن و دەچەقێنن. ئاغام تۆ بی، هەر هەموویان لە حەوت هەتا حەفتاساڵەیان چەکدارن. هەر کەپرێك خۆی عەمبارێکی چەکوچۆڵە، بەرمیلە باروتێکە. پێیان بڵێی گیانە دەڵێن قوزەڵقۆرت. سڵاویان لێ بکەی جنێو بە دایك و خوشکت دەدەن. چاویان سوور بووە. نۆکەری خۆت عەرزت بکا ئەو گوندییانە هیچ هێزێك، نە هێزی دەسەڵات و نە چەتەی ملهوڕ و نە سەرباز و نە جەندرمە و نەهیچ هێزێکی دیکەش ناتوانێ لە ئاقچاسازیان دەر بکا. ئەو شوێنەشم دی کە سلێمان ئاغای لێ کوژرابوو. ئەمان، ئەمان، ئەمان خوایە گیان، گوندی دەڵێن بێت و حوکمەت هێزمان لەسەر بکا، بێت و ئاغا بێنە سەرمان، سوێندە و خواردوومانە و پەیمانە بەستوومانە هەتا دوا دڵۆپی خوێنمان و تا ئاخرین فیشەکمان شەڕ دەکەین. چیمان پێ کوژرا دەکوژین و دواجار خۆمان دەخەینە زەلکاوەکەوە و خۆ دەخنکێنین. وەك مەستان... وەك مەستانی ئازا و جوامێر، پیاوی پیاوان..."

ماهیر بەگ گوتی:"خۆ گوێتان لێ بوو؟ ئەوەتا نیشتمانەکەمان، دوا دەوڵەتی تورکمانان تووشی چ خەتەرێکی گەورە بووە؟ چ خەتەرێکی سامناك...

ئاخرین دەوڵەتی تورك بە دەستی ئێمە خەریکە تێدا دەچێ. ئاخۆ رازی دەبین بەوە ئەو گوندییە چەپەڵانە، ئەو خاین و خۆفرۆش و نیشتمانفرۆش و لەبرسان مردووانە بۆ پاروە نانێك نیشتمانە خۆشەویستەکەمان بفەوتێنن؟ ئاخۆ دەتوانین چاو لەو راستییە تاڵانە بنووقێنین و گوێی نەدەینێ؟ خۆ بیستتان چ فیتنەیەکیان هەڵاییساندووە، خۆ دیتتان برایینە؟ ئەوانەی بەبێ سڵەمینەوە قارەمانێکی نەتەوەیی وەك سلێمان ئەسڵان سۆوی پەنجە دەکوژن، لە چاوتروکانێکا وەك مێشکێکیشیان لێ میوان بێ هەموومان ناکوژن؟ خۆ گوێتان لێ بوو و دیتتان بەڵای چۆن بەسەر ئەو نیشتمانە ئۆغوز نەژادە هاتووە و چ رۆژە رەشییەك چاوەڕوانێتی؟

ماهیر بەگ هەڵچوبوو. دەنگی بەسۆز و گریاناوی بوو. کافر بەزەیی پێیدا دەهاتەوە.

حاجی قۆرت بۆغا گوتی: ناکریّ. ئاوا نابیّ. نابیّ وابیّ. وەك بڵێی لە ئێمە لێقەوماوتریان نەدۆزیوەتەوە. هەرچی دیّ و هێزی خۆی لەسەر ئێمە تاقی دەکاتەوە. هەر کەس رقی لە داکی هەڵدەستیّ، نووکە شەقێك لە نیشتمانەکەی ئێمە دەوەژێنیّ. خۆ ئاوا بڕواتە پێشیّ، نیشتمانەکەمان کاول دەبیّ. ئێستا دەبیّ لێرەوە راستەوڕیّ بچینە لای نەقیبەکەمان و لەو شتانەی ئاگادار بکەینەوە. ئەو بارە نالەبارەی نیشتمانەکەمان کە کافر ئاوری بۆی تێبەردەبیّ، بۆ پاسەوانی رەسەنی نیشتیمانمان، بۆ جەنابی نەقیبی خاوەن شکۆمان بگێڕینەوە بۆ ئەوەی بزانیّ وەزعەکە چەندە شپرزە و هەتا درەنگ نەبووە، زەبری گورچوبڕی خۆی لەو کەسانە بوەشێنیّ کە خەریکی کاولکردنی نیشتمانەکەمانن، لەو خۆفرۆشانەی خۆیان بۆ کەوچکە ئاوێك و پاروونانێك فرۆشتووە. لەو گوندییە هیچ و پووچانەی خاکی نیشتمانەکەمان هەڵدەکەنن و ئاوەکەی هەڵدەچۆڕێنن بۆ ئەوەی نیشتمانەکەمان وەك ئاسیای ناڤین ببێتە بیابان و سەحرایەکی رەملینە... وشککردنەوەی قامیشەڵان یانی چی؟ یانی چی؟ یانی وشککردنەوە و بەبیابانکردنی نیشتمان، وا نییە؟ ئەگەر قەرار بیّ قامیشەڵانەکە وشك بکرێتەوە، ئەی حوکمەت لە کوێیە؟ ئاغاکان چییان لیّ هاتووە؟ ئەگەر حوکمەت ویستبایەی زەلکاوەکە وشك بکاتەوە، ئاخر ئەی گوندیی نەفام، ئەوکات حوکمەت ئەو هەمووە کامیۆن و شۆفڵ و مۆفڵەی سیّ چوار مانگ لە دەم ئاقچاساز مانەوە، دەبردەوە؟"

ئالاتەمیر کە رەپ و قیت دانیشتبوو و چاوە کەسکە رەن پۆڵاییەکانی لە خاڵێکی نادیار بڕیبوو وەقسە هات:"گوندیی خەیانەتکار، گوندیی خەیانەتکار... خوایە لەبەرت مرم، ئەو خاکەی ئاقچاساز چیی لیّ شین دەبوو و چ بەرهەمێکی دەدا! ئەو گوندییە پیس و پۆخڵانە لە کوێوە هاتن و وەك مار و مێروو، وەك مێرووڵەی زەرد بە ئاقچاسازیّ وەربوون و تاڵانیان کرد...."

رۆستەم بەگ هەستا و گوتی:"با بچینە لای نەقیب."

جافر ئۆز پۆلاد"هێشتاش گیانم مێرووله دەکا و موچڕکەی پێدا دیّ. مووم لیّ بوونەتە نەشتەر. مەستان دەیویست من بکوژیّ. چیی نەمابوو پەنجەی پەلەپیتکەی بترازێنیّ... خوایە شوکرانەبژێرم، خوایە شوکر توانیم دەربچم... عەرزتان بکەم وەك باز لە چاوترووکانێکدا پڕی دایە ماوزەرەکەی و ئەژنۆی دادا و سێرەی لیّ گرتم. منیش هەر زانیم کارەکە لەنگ و لارە، سەری ئەسپەکەمم بەرەو ئاناوەرزا وەرگێڕا و دامە بەر قەمچی و تاوم دا... گۆڕاون، ئەوانە

گوندییەکانی جاری جاران نین. جاری جاران هەر لە دوورەوە ئەسپەکەمیان دەدی، دەستەونەزەر رادەوەستان، بەڵام ئێستا هەر سەیریشم ناکەن..."

ئالاتەمیر:"گۆڕاون..."

دەیویست بڵێ، هەر ئەوەندەیان بەسە پێیان بگاتە سەر زەوی، بەڵام خێرا پاشگەز بۆوە. خۆ کەر نییە سەری نایەشێ پرێسکەی لێ ببەستێ. دیسان وەك جاری پێشوو، یەکێك لەو ئاغا تازە پێگەیشتووانە پێی هەڵدەبەزێتەوە و تێی دەخوڕێ.

مامۆستا رۆستەم بەگ لە پێشەوە و ئەوانی دیکە بە دوایدا بە نێوچاوانی گرژەوە لە نەقیب وەژوور کەوتن. نەقیب لەبەریان هەستا و شوێنی دانیشتنی نیشان دان و بانگی جەندەرمەیەکی کرد و ئەمری کرد قاوە بێنێ. مامۆستا رێك چووە سەر قسەکەی:"مەپرسن، مەپرسن جەنابی نەقیب... وەزعەکە شڕە. دەشتی ئاناوەرزا هەستاوە..."

نەقیب بە نێوچاوانی گرژەوە لەبەری پێیەوە تا تەپڵی سەری سەیرێکی کرد و پرسی:"چی؟ کێ؟"

"هەر لەو رۆژەوە کە سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجەی برامانیان کوشتووە."

"مەحاڵە بابە. ئەو قسانەچین. ئەمن خۆم دوێنێ لەوێ بووم. هیچ جموجۆڵێك لە گۆڕێ نییە و هیچ شتێکم نەدی پشێویی لێ بەدی بکرێ. سەریان بەرداوەتەوە و سەرقاڵی کاری خۆیانن. خەرێکن جۆگە و خەرەند لێ دەدەن. دەیانەوێ زەلکاوەکە هەڵچۆڕێنن و زەوی و زارێك بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن. جا بە چ تاسە و حەزێکیشەوە کار دەکەن. وەڵڵاهی کە دیتمن ئاوا بە جۆش و خرۆشەوە کار دەکەن فرمێسکم لە چاوی هاتە خوارێ. کەوابوو وەرزێری تورکیش ئەگەر حەزی لێ بێ زەحمەت دەکێشێ؟ ئەمن لەوێ جگە لە هەوڵ و تێکۆشان هیچ شتێکی دیکەم نەدی. مەسەلەی کوژرانی سلێمان ئاغاش شتێکی دیکەیە... هیچ دوور نییە دوژمنایەتییەکی کۆن لە نێوان ئەو و مەستاندا بووبێ. هەر بەراستی ئەمن زۆر دڵم بەو جۆش و خرش و کار و تێکۆشانانەی ئەوان خۆشە. ئەوەی حکوومەت دەیەویست بیکا، ئەوەتا گوندی خۆیان دەیکەن."

شادییەکی پڕشنگدار، روخسار و دەموچاوی نەقیبی گەش کردبۆوە. ئەو پێدەکەنی و لێوەکانی دەتەقاند و دەستەکانی رێکدەخشاندن و ئەمسەرەوسەری ژوورەکەی دەکرد و لە جێیەکەی خۆی دادەنیشت و خولقی ئاغاکانی دەکرد بۆ جگەرە کێشان و قسەی دەکرد:"خۆ ئاگاتان لێیە؟ ئەو زەلکاوەی وشککردنەوەکەی بەملیۆنان لیرەی دەخستە سەر شانی

حکوومەت، ئەوەتا وەرزێر بۆخۆیان هەڵیدەچۆڕێنن. بیهێننە بەرچاوتان، زەلکاوێکی ئەوەندە گەورە هەر لە ئێستاوە هەڵچۆڕاوە. زۆری پێ ناچێ ئەو زەلکاوە کە خۆی سەرچاوەی نۆبەتێ و ئەو بۆگەنە ژەهراوییەیە، نامێنێ و لە جێیەکەی گوند دروست دەکرێن و خەڵکێکی تەندروست و ساغ و زەحمەتکێش هەموو رۆژێ دەیکەنە جێژن و شایی لۆغان. ئەوە جێی خۆشحاڵی و پێخۆشبوونە برایینە..."

ماهیر بەگ قسەکەی پێ بڕی:"بەڵێ جەنابی نەقیب... بەڵام هەر ئەوەندەیە... بەڵام مەسەلەکە بەو جۆرە نییە جەنابت بیری لێ دەکەیتەوە. ئێوە بە داخەوە هەر بەرێکی پوولەکە دەبینن."

نەقیب کە دەتگوت گورگێکی زەردەڵە، نێوچاوانی تێك نا و پرسیی:"یانی چی؟"

ماهیر خاکەڕایانە و لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە:"عەرزت دەکەم. ئەگەر لە لایەکەوە، تەنیا لە لایەکەوە سەیری مەسەلەکە بکەین، تۆ راست دەکەی... بەڵام مەسەلەکە جۆرێکی دیکەیە جەنابی نەقیب. ئەوانە پەرە بە ئانارشی دەدەن. ئەویش ئانارشییەتێك، کە نەك ئێمە بە ئەمریکاش دانەمرکێتەوە."

"ئەمن ئانارشی و شتی وام نەدی."

حاجی قۆرت بۆغا لە جێی خۆی دەرەپەڕی و گوتی:"زۆنگاوەکە وشك دەکەنەوە. ئەو گوندییانە هار بوون. لێیان گەڕێ با لە قامیشەلانەکەدا جێی خۆیان خۆش بکەن، جا دەبینی چ دەکەن و چ ناکەن. بە حەواوە دەمانبرژێنن. یاخوا ددانیان نەگاتە خوێن... گورگ هەر ئەوەندەیە جارێك دەمی بگاتە خوێن... هەر جارێك..."

مامۆستا رۆستەم بەگ بە ئاماژەیەك بێ دەنگی کرد و رێك لەو کاتەدا ئالاتەمیر هاتە پێشێ:"وەك ئاسیای ناوەڕاست ئێرە وشك و برینگ دەکەن... ئێمەش دوور دەخەنەوە بۆ وڵاتان و هەندەران."

جافر ئۆز پۆلاد بەبێ ئەوەی کەس ئاگای لێ بێ، بە دەست پێش زاری گرت و ماهیر بەگ بە لەبزێکی کە تۆزە تووڕەییەکی پێوە دیار بوو، وەقسەهات:"بەڵێ، جەنابی نەقیب. جەنابت راست دەفەرمووی. وەك ئاگاداری حکوومەت قۆڵی هەڵماڵی ئەو زۆنگاوە وشك بکاتەوە، تەنانەت ئەوهەمووە ئامێر و کەلوپەل و کامیۆن و شتەش نێردرابوون. دیارە حکوومەت هەندێ شتی دەزانی بۆیەش هەمووی گێڕانەوە. ئێستاش ئەوە کۆمەڵێك گوندیی پێ پەتی کەوتوونەتە وشککردنەوەی زەلکاوەکە. چۆن شتی وا دەبێ؟ ئەوەیە ئەو ئانارشییەی دەیڵێم."

نەقیب گوتی:"ئەمن وا بیر ناکەمەوە. خەریکن جۆگەیەکی زۆر باش لێ دەدەن. پێنج ڕۆژی دیکەش تەواوی دەکەن و ئاوەکە بە جۆگەکەدا دەبەن. بۆ خۆیان وایان داناوە لە ماوەی مانگێکدا تەواو هەڵچۆڕێ. ئەوە وەرزێرێکی بەسالاچوو پێی گوتم کە..."

پێکەنینی هات و دەموچاوی نوقمی شادی بوو و لەسەری ڕۆیشت:"ئەگەر پێویست بێ، ئێمە ئاوی ئاقچاساز نەك بە جۆگەدا بەڵکو بە سەتڵ هەڵدەکێشین. ئای لەو پێداگری و ویست و هێزەی؟ بنیادەم سەری سووڕ دەمێنێ."

حاجی قۆرت بۆغا وەقسە هات:"سەری سووڕ دەمێنێ. سەری سووڕ دەمێنێ. لێگەڕێ با ئەوان هەر لە خۆیانەوە فێر کار بن... لێ گەڕێ با بگەنە ئەوەی کە ئەو کارەی حوکمەت پێی نەدەکرا، ئەوان توانییان بیکەن، جارێ لێگەڕێ با لێیان ڕوون بێتەوە... جا ئەو کات نە حوکمەتێك دەمێنێتەوە و نە هیچ شتێکی دی. نە تۆ دەمێنی جەنابی نەقیبەکەم، کوڕی خۆم، نە ئەمنیش..."

"خەتەرەکە زۆر گەورەیە ئاغای من. هەر بە ڕاستی گەورەیە جەنابی نەقیب. گوندییەکان دەیانەوێ هەر لە خۆیانەوە و بەبێ ئەوە حیساب بۆ هیچ کەس بکەن، کار دەکەن. جا کارکردن چییە؟ ئەوە هەر تەعبیرێکی سادە بوو، هەر بەگاڵتەش گوتم. مەسەلەکە زۆر لەوە هەستیارتر و ناسکترە.... مەسەلە کاکردن نییە... هەر ئەوەندە بەسەر عادەت بگرن... خوو بە کارکردنەوە بگرن. جا ئەو کات وەرە و ئەو کەرە لەو قوڕەی دەربێنەوە. جا ئەو کات کێ هەیە بتوانێ باشاریان بکا؟ ڕێك و ڕاست پێت بڵێم ئیتر هەموومان تێداچووین. چونکە هەر کات بیانەوێ، دیسان ئەو هێزە لە شوێنێك کۆ دەکەنەوەو ئاداری ئەو مەملەکەتە بەسەر پادارییەوە ناهێڵن."

ماهیر بەگ بوو کە ئەمجارە قسەکەی لێ وەرگرتەوە و لەسەری ڕۆیشت:

"جەنابی نەقیبی ئازیز، بە هیچ جۆرێ نابێ مەیدان بەو جۆرە کارانە بدرێ. لەو وڵاتەدا گوندیی زۆرینەن، کەچی ئێمە و حکوومەتەکەمان و ئێوە کەمینەیەکین. جەنابی نەقیب، تکا دەکەم ورد بەوە. لە تورکیا زەلکاو زۆرن. ئەگەر سبەری ڕۆژێ ئەو زەلکاوەی ئاقچاساز وشك بکرێ، دڵنیام زەلکاو وشککردنەوە دەبێتە مۆدێل و ئەوانە زەلکاوەکانی دیکەش هەڵدەچۆڕێنن. دواتر... دواتر، دواتر... دواتر لە شان و باهۆی خۆیان ڕادەبینن و ڕاشکاوانە دەبنە بەلشڤیك.... جا ئەوجار، ئەوجار، ئەوجار، ئاگادار بە، ئێوە و ئێمە و هەر هەموومان لەتوپەت دەکەن. پێستی سەرمان هەڵدەقەنن، چاوەکانمان دەردێنن. وەك ڕوسیا."

حاجی قۆرت بۆغا بە هەژاوییەوە قسەکانی لە زاری ماهیر بەگ وەرگرتەوە:"ئەمن دەزانم، وا دەکەن، دەیکەن. خەڵکی گوندی بێ ئینسافترین و بێ بەزەییترین و لەخودانەترسترین بوونەوەری خودان. بێت و دەرفەتیان هەبێ هەر هەموومان لە حەوت هەتا حەفتا ساڵە چوارمێخەمان دەکێشن."

ئالاتەمیر وەقسە هات و گوتی:"دەمانکوژن، مەگەر هەلیان بۆ هەڵنەکەوێ، ئەگینا خودا عالمە... بەڵام دەرکردنیشیان لە ئاقچاساز زۆر ئەستەم و دژوارە... زۆر زۆر..." و بە ترسێکەوە سەیرێکی دەوروپشتی خۆی کرد. شوکری خودای کەس گوێی لە دوا قسەکانی نەببوو. دەمودەست بێدەنگ بوو.

مامۆستا رۆستەم بەگ گوتی:"نەقیبی بەڕێز، حوکمەت ئەو زەلکاوە وشك دەکاتەوە. بڕیاری لێبڕاوانەی لەسەر دراوە. بەڵام بێت و وشك بکرێتەوە، بەتاڵان دەچێ. لە حاڵێکدا ... خاکەکەی پەرش و بڵاو دەکرێ... لە حاڵێکدا... ئێمە شان بە شانی حوکمەتەکەمان... کۆمپانیایەکی بەشداری کشتوکاڵی گەورە لەسەر ئەو زەوییە دادەمەزرێنین کە لە بن ئاوەکەوە دێتە دەرێ. بە شێوەیەکی پیشەیی حاسڵاتی لێ بەرهەم دێنین. بۆ وێنە دارستانێکی گەورەی ئۆکالیپتۆسی لێ دەچەقێنین. لەو کۆمپانیا کشتووکاڵییەدا هەموو کەس دەتوانێ بەشی خۆی هەبێ. بۆ وێنە هەر جەنابیشت، جەنابی دادوەری گشتی و دادوەرەکان و برا کارمەندەکانی دیکەشمان کە مووچەکەیان بەشیان ناکا... دوای دە پانزە ساڵان جەنگەڵێك دورست دەبێ کە داهاتووی بەشدارەکانی دابین دەکا. جەنابی نەقیبی بەڕێز، بەڵام ئەگەر ئەو ئانارشییە هەبێ، چ لەو پیاوکوژانە بکەین؟ جا خۆ ئەو هەواڵە ناخۆشانە بگەنەوە سەرەوەش، بۆ ئەنکەرە، بە قازانجی هیچ لایەکمان نابێ."

بێ هیچ بیانوویەك پرسیی:"باوکت هەیە؟"

رێك لەو کاتەدا هەمووان بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامەکەی نەقیب بن، هەستان و گوتیان:"لەسەر ئیزنت جەنابی نەقیب. سوپاس، هەر بژین، تەمەن درێژ بن."

نەقیب هەتا بەر دەرگایان لەگەڵ چوو و دەسبەجێ گەڕایەوە و رووبەڕووی مامۆستا رۆستەم بەگ دانیشت و گوتی:"هەمە، هەمە مامۆستا گیان."

"ئەی برا؟"

"هەمە."

"کەسوکار؟"

"هەمە."

"بڕوانە جەنابی نەقیب، زەلکاوەکە زۆری پێناچێ هەڵدەچۆڕێ. بەشێك بۆ خۆت و خزم و کەسەکەت لە کۆمپانیا کشتوکاڵیەکەدا... ئێوەش دەبێ بیر لە داهاتووتان بکەنەوە. ئەمن مامۆستایەکم کە هەزاران قوتابیم پەروەردە کردووەو داومەتە کۆمەڵگا... ئەوجار دڵنیاش بە ئەنکەرە هەرگیز ناهێڵێ ئەو گوندییانە لە خۆوە زۆنگاوەکە وشك بکەنەوە. ئەویش لە حاڵێکدا کە ئەو گوندییانە سلێمان ئاغا، قارەمانێکی شەڕە رەزگاریخوازییەکەیان کوشتووە.... هەموو رۆژنامەکانیش هەواڵەکەیان بڵاو کردووەتەوە... ئێوە دەتوانن گوندییەکان لە دەوروبەری ئاقچاساز دوور بخەنەوەو دەریان بکەن... ئەو کارە سەرسەرییەی گوندییەکان رووداوێکی ئەوەندە گەورەیە کە دەوڵەت و میللەت هیچیان ناتوانن پشت گوێی بخەن. خۆ بێت و ئەو هەواڵانە بگەنەوە ئەنکەرە، دنیا دەشێوێ. ئەمە شتێکە لە گوێن سەرهەڵدانی کوردەکان. خەڵف هەتا شلکە دەبێ دایبێنی دەنا پیر بێت بۆت ناکرێتە گۆچان."

نەقیب:"لێم گەڕێن با بیرێکی لێ بکەمەوە..."

"کاتی بیرکردنەوە نییە نەقیب. لە پێشدا بیر لە داهاتووی خۆت بکەوە و دوایی لە میللەتەکەمان و نیشتمانەکەمان جەنابی نەقیب، هەر ئەوەندە... ئەمن ئەوەی لەسەرم بوو گوتم و لەوە پتر نایڵێم و دووپاتەشی ناکەمەوە."

نەقیب لە حاڵێکدا قژی سەری بە دەستەکانی دادەهێنا، لە جێی خۆی هەستا و چاوە کەسکەکانی کە سێبەرێکی سەرقاڵبوونیان کەوتبووە سەر، لە مامۆستا بڕی و گوتی:"باشە. هەرچۆنێکی تۆ بفەرمووی مامۆستای خۆشەویست. سبەی من دەیانگێڕمەوە ئەو شوێنەی لەوێوە هاتوون. بەڵام ئەگەر رووداوێك پێش هات..."

"لەو بابەتەوە ئارخەیان بن. تا ئێستا بە سەدان تەلەگراف لەسەر ئەوەی کە دەشتی ئاناوەرزا هەستاون و گوندی کێڵگەکان تاڵان دەکەن و پیاو دەکوژن و دەست بە سەر زەوی و زاراندا دەگرن، بۆ ئەنکەرە دەنێردرێن. سبەی بەیانی فەرمانی ئەنکەرەت پێ دەگا. تۆش هەر فەرمانەکەت پێ گەیشت دەست پێ دەکەی."

تاوێك راوەستا و چاوی لە چاوەکانی نەقیب بڕی و لەسەر قسەکەی رۆیشت:"براکەم، نەقیبەکەم، دەبێ بیر لە داهاتووت بکەیتەوە. سبەی دێینەوە خزمەتت. دوای ئەوەی گوندییەکان لە ئاقچاساز وەدەر نران... سپاست دەکەم."

نەقیب هەتا بەر دەرگای لەگەڵ چوو و بە حورمەتییەوە پاژنەکانی لێك دا.

چەند سەعات دواتر تەلەگرافێك لە وەزارەتی ناوخۆوە گەیشتە دەست نەقیب. فەرمان درابوو راپەڕینەکەی ئاناوەرزا دەسبەجێ سەرکوت بکرێ. لەگەڵ ئەوەدا فەرمانیش درا هێزی پشتیوان لە ئەدەنەوە بکەونە رێ.

نەقیب بە سەربازەکانی خۆیەوە هەر ئەو شەوە بە جیپ و کامیۆن و پاس و ترۆمبێل بەرەو ئاقچاساز وەڕێ کەوتن. چیی ئامرازی هاتوچۆ و راگواستن لە شارۆچکەدا هەبوون، هەمووی خرابوونە بەردەستی نەقیب.

دەستەی جەندەرمە بەر لە کازیوە لەو جۆگەیەدا سەنگەریان گرت کە جووتیارەکان هەڵیانکەندبوون. کە بەیان ئەنگووت و جووتیار بە پاچ و پێمەڕەوە دەرکەوتن، لێیان راست بوونەوە و لە نەکاو دەنگی دەستڕێژێك هەمووان لە جێی خۆیان وشك کرد. هەموو حەپەسابوون و نەیاندەزانی چ قەوماوە. لەو کاتەدا نەقیب لە جۆگەکەوە هاتە دەرێ و خۆی خستە سەر تەپۆڵکەیەك و بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد:"من نەقیب... ئێوە، کە لەخۆڕاوە دەستتان کردووە بە وشکككردنەوەی ئاقچاساز، بەرەنگاری حکوومەت دەبنەوە. ئەمشەو فەرمانی دامرکاندنەوەی ئەو سەرهەڵدانەم لە حکوومەتەوە پێ گەیشتووە کە ئێوە بە وشككردنەوەی ئاقچاساز دەستتان پێ کردووە. ئاگادارتان دەکەمەوە نەکا بیر لە بەربەرەکانێ بکەنەوە. پاچ و پێمەڕەتان فڕێ دەن."

هیچ کەس لەجێی خۆی نەجوولا. نەقیب دوای تاوێك نەڕاندی:"

"تەقە."

حەشیمەتەکە رایانکرد و هەندێکیشیان خۆیان بەعەرزی دادا. پەیتا پەیتا تەقە دەکرا. نەقیب بە دەمانچەیەکەوە لە پێش جەندەرمەوە ئەو جووتیارانەی راو دەنا، کە پاچ و پێمەڕەیان فڕێ دابوو و رایان دەکرد... جووتیاران وەك پۆلە کۆترێکی باشوو لێی دابێ، لێك بڵاو ببوون و لەهەوڵی خۆدەربازکردندا بوون. هاوار و باوکەڕۆی سەدان کەس تێکەڵ بە یەك ببوو... نەقیب و جەندەرمەکانیشی پەیتاپەیتا تەقەیان دەکرد.

ئەو هێزی پشتیوانەی لە ئەدەنەوە کەوتبووە رێ، بەر لە رۆژاوابوون گەیشتە ناوچەکە. ئیتر جووتیارێك لەوێ نەمابوو. نەقیب دوای ئەو عەمەلیاتە ئاگراوییە سەرکەوت بەخۆی دەستە سەربازە قارەمانەکەیەوە ئەوەی پێی دەگوترا شۆڕش و راپەڕینەکەی ئاناوەرزا، سەرکوت بکات و هەزاران جووتیاری یەکگرتبوو پەرش و بڵاو بکات. هێزە پشتیوانەکە هەر ئەوەندەی پێ کرا

له عەمەلیاتی راوەدوونان و گرتنی جووتیارە راپەڕیوەکاندا و دەرکێشانیان لە حەشارگەکانیان بەشدار بێت. هەر ئەوەندە شانازییەشیان بەس بوو.

لە ماوەی سێ رۆژاندا هەموو ئەو جووتیارانەی لە وشککردنەوەی ئاقچاسازدا بەشدار ببوون، گیران و لە قەراغ شاری زیندانی کران. شارۆچکەکە شوێنێکی وای نەبوو هەمووانی تێدا جێ بکرێتەوە... قایمەقام لە ئەدەنە و فەرماندە و لێکۆڵەر لە ئەنکەرەوە هاتن. ئەوانەی دەهاتن، لە پێشدا دەچوونە سەر گۆڕەکەی سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە و چەپکە گوڵیان لەسەر دادەنا.

هەواکەی گەرم بوو و نێو دۆڵەکەش وەك جەهەندەم وابوو. نە دڵۆپێك ئاو و نە شتێکی بۆ خواردن لێ دەست دەکەوت. ژن و منداڵ دەیانناڵاند و دەکڕووزانەوەو ئەو جەنجەرمانەی لە خوارووی شیوەکەوە کێشکیان دەکێشا، لە زیندانییەکان گەڕان بە سەتڵ لە رووبارەکەی خوارووەوە ئاو بێنن. لە لای سەرووی شیوەکەشەوە جەندەرمە کێشکیان دەکێشا. جووتیارەکان کە لێیان روون بوو چ بەڵایەکیان بەسەرهاتووە، لەو گەرما تاقەتبڕەی شیوەکەدا هەر دەکڕووزانەوە.

نەقیب مانگێك دواتر بە بۆنەی سەرکەوتنە گەورەکەیەوە، رێزی لێ نرا.

# ٧٣

ئەو رووداوانە لەسەر یەك وایان دەکرد دەروێش بەگ و ماهیر بەگ رۆژ بە رۆژ پتر پاڵ وەیەك بدەن. هەر رۆژێکی بەسەردا دەهات دەروێش بەگ پتر هۆگری ماهیر بەگ دەبوو و زیاتر متمانەی پێ دەکرد و پشتی پێ دەبەست. ئەو پێی وابوو هەوڵەکانی ماهیر بەگ لە نییەتێکی مرۆییانەوە سەرچاوەیان دەگرت. ماهیر بەگ کابرایەك بوو کە لە رێگەی بنیاتنانی کەسایەتییەکدا بۆخۆی لەم دنیایەدا هەوڵی دەدا و بۆ ئەوەی بسەلمێنێ کە بەڵێ ئێمەش لەو دنیایەدا پیاوین، چیی لە دەستی دەهات دەیکرد. بۆ دەروێش بەگی لە بنی کوولەکە دابوو کە چۆن هێشتا منداڵێکی سەروپێچکە بووە کە لەو چیایانەوە داگەڕاوە و چۆن بە کوێرەوەری و دەردەسەری خۆی پێگەیاندووە و چووەتە ڤیەننا و ئەویش دوای بیستنی سەربوردەکەی، دەستی کردبووە ئەستۆی و تێر گریابوو.

ئێستا ئیتر هەر دووکیان وێڕا بیریان لەوە دەکردەوە چۆن پێشکەوتووترین کێڵگە و مەزرای ئەم دنیایە لە چوکووراوادا دامەزرێنن. قسە تێدا نەبوو لەوەدا کە ئاقچاساز بە ڕێژەوترین خاکی دنیایە بوو. دەروێش بەگ زۆر بیرۆکەی جوان و پڕشنگداری بۆ ئەو زەوی و زارە هەبوو و هەموو رۆژێش بیر و تەگبیری نوێی دێنایە گۆڕێ. دەروێش بەگیش وەك ماهیر هەموو فکر و زیکری ببووە کێڵگە و زەوی و زارێکی میکانیزە کە لاسکە گەنم خۆی لە بن باری گوڵەگەنمەکەدا و لك و پۆی داریش خۆ لەبەر میوەی هەنجیر و پرتەقاڵ و کۆخەکانیدا رانەدەگرت. هەموو رۆژێ نەخشەی بۆ دەکێشا و رۆژ بە رۆژیش بەرینتر و هەراوتر دەبووەوە.

دەروێش بەگ وا وەکەفوکوڵ کەوتبوو کە حەزی لێ بوو سەرانسەری زەلکاوەکەی ئاقچاساز دوای وشکبوونەوەی بخرێتە بدرێ بە ماهیر قاباقچی ئۆغڵی.

زۆر سووك و سانایە، کە بەڕێژەوترین خاکی ئەم دنیایە بدرێتە دەست دۆست و دوژمن، بدرێتە دەست ئەمریکا و چین."خۆ ئێمە بنیادەم نین... ئێمە هەر دەزانین چاوی یەکتری بکۆڵین،

لە حاڵێکدا دەتوانین نموونە بدەینە دۆست و دوژمن و ببینە نموونە و سەرباشقەی ئەم دنیایە. ها ها ها ها ها، خۆخۆری.. باشە باب و باپیرەکانمان، عوسمانلییە تورکەکان کارێکی خراپیان کرد کە هەموو دنیایان فێری جیهانگیری و فەرمانڕەوایی کرد؟ ئەوان یەکیان گرت و توانییان لە سیبەری ئەو یەکبوونەیاندا وەها نموونەیەك بخەنەروو." هەر ئەوەندە بەسەر یەکگرتوو بن. یەکیەتی بنەمای هەموو شتێکە. نەکەی یەکیەتیی نەتەوەیی تێك بدەی، نەکەی بەردی سارد و گەرم بخەیتە سەر ڕێی دوایین دەوڵەتی تورك.

لە قەباڵەی ئەو زەوییەی دەروێش بەگ دابووی بە ماهیر بەگ، باسی کەوشەنی لایەکی کرابوو و نووسرابوو:"ڕۆژهەڵاتەکەی جادە و قامیشەڵانە". جادەکە لابەرە و بیبە هەر شوێنێکی دڵت دەخوازێ، حەز دەکەی بیکشێنەوە ئەوپەڕی قامیشەڵانەکە... چەند شایەتی شارەزا و تەواو. دۆزینەوەی شایەتی ئاگادار، تەنانەت سەد سەد و پەنجا شایەت، کاری دەروێشە. "ڕۆژئاواکەی قوولکەکەی بۆداقلی تاش." قوڵکەکەی بۆداقلی تاش دەکەوێتە کوێ؟ هاااا، لێواری ئاقچاساز! لە ماوەی چەند حەوتووەکدا ئاوەکەی ئاقچاساز هەڵچۆڕێنە و دنیایەك زەوی بڕ بدە... ئەوجار عەرزت بکەم ئەو زەوییە هەتا ماندوو دەبێ، چل ساڵان یەك و چل حاسڵی لێ دەکەوێتەوە. پەین و پاڵ وهێزدەریشی ناوێ. ئەوەندە زەوییە نەك ماهیر بەگ، بەڵکو هەموو ئەو دەشتی ئاناوەرزایە بە هەژار و دەوڵەمەندەکەیەوە دەکاتە قاڕوون، قاڕوون.

هەموو کاروبارەکان لە چەند ڕۆژێکدا جێبەجێ ببوون. یەك، دوو سێ قەباڵەی بەس نەبوو. دەروێش بەگ پەیتا پەیتا قەباڵەی پارچە زەوییەکانی دەم ئاقچاسازی دەدۆزییەوە و بەناوی ماهیر بەگەوەی دەکردن.

ماهیر بەگ تێر دەبوو، بەڵام دەروێش بەگ کە کاری بۆوی دەکرد، دەستی هەڵنەدەگرت. مەزرا نموونەییەکەی ماهیر بۆ ساتێکیش لەبەر چاوانی دەروێش بەگ لانەدەچوو و بەردەوام دەهاتە پێش چاوی و تەیار دەبوو. دەروێش بەگ دۆستێکی پەیدا کردبوو کە بۆووەی دەبوو سەر و گیانی پێ بسپێری و پیاوێك بوو، کە دەبوو وەك چیایەك پاڵی پێوە بدەی. ژیر و چاکەکار و جوامێر و خۆمانە.

لەو دنیا بۆگەنەدا کە مرۆڤەکانی هەزار روخساریان هەبوو، ئەو دۆستێکی دۆزیبۆوە، کە دەیتوانی بەبێ هیچ کەڵکەڵە و خەمێك، ماڵ و گیان و ژن و منداڵەکەی لەبەر دەستی بنێ. ئەوەش گەورەترین ئاواتی ئەو بوو کە بۆ ماوەی چەند ساڵان لەگەڵ مەرگ و تەنیایی ژیابوو. وەك چەقە و بنێشت پێوەی نووسابوو. ئەو ماهیرە چەندەش دەست و دڵاوا بوو. بۆ هەر پارچە زەوییەك وەك خێز

و خۆڵ پارەی هەڵدەڕشت. دەروێش بەگ پێی عەیب بوو پارەی لێ وەرگرێ، بەڵام چیی لەدەست دەهات. پارەشی پێویست بوو و دەشترسا لەوەی کە ئەگەر ئەو پارەیەی ماهیر بەگ دەیداتێ وەری نەگرێ، دڵی بیێشێ. چما دەکرا برادەرێکی ئاوا بۆ ماڵی دنیا لە خۆی زویر بکا؟ کوڕە جا ماڵی دنیا چییە؟ چڵکی دەستە ماڵی دنیا، بیشۆی دەڕوا، ماڵی دنیا چییە...

خەڵکەکە هەموو لە سەر قسە و فرمانی دەروێش بەگ بوون و چیی ئەو گوتبای قسەیان نەدەشکاند. ئەوەش بەلای ماهیرەوە یەکێك لە تایبەتمەندییە هەرە سەیر و سەمەرەکانی دەروێش بەگ بوو. ئەوەش خواپێدراوی و نهێنییەکی یەزدانی بوو.

ماهیر بەگ بیری دەکردەوە و پەسنی دۆستایەتی و وشەی دۆستایەتیی دەکرد. کاتێ ئەو هەمووە بەژەوەندی و قازانجە هاوبەشەیان هەبوو، بۆ دەبوو دوژمنایەتییان هەبێ؟ وەختایەك دۆستایەتی و برایەتی و چاکەکاری لەو دنیایەدا هەیە، دوژمنایەتی بۆ دەبێ هەبێ؟ کاتێ دنیا ئەوەندە رووناك و خۆش و زەوی و زار ئەوەندە زۆر و زەوەند و بەرێژەو و بەپیت و بەرەکەتە، دوژمنایەتی بۆ چ دەبێ؟ بۆ چ دەبێ؟ بۆچی... هەی خوای گەورە و بێ هاوتا، ئەو هەمووە چەپەڵی و چەوتی و زوڵم ئەشکەنجەیە لە پای چی؟ بۆ چ دەبێ و چیی لێ شین دەبێتەوە؟...

ماهیر بەگ رۆژێکیان بۆ ئەوەی بتوانێ دڵی دەروێش بەگ خۆش بکا، بە دڵێکی شاد و لێوی بەخەندەوە هاتە لای و باوەشی پێداکردبوو و گوتبوو:"دۆزیمەوە، دۆزیمەوە برای ئازیزم، دۆزیمەوە، دۆزیمەوە بەگ... "خزللەزی" زیندوو دەکەینەوە. ئەوەیان یەکێکە لە جوانترین و کۆنترین نەریتەکانمان. میللەتەکەمان هەتا ئەو ساڵانەش هەر دەچووە "خزرللەزی"، یەك دوو ساڵە لەبیری چووەتەوە، دەتوانین بیبووژێنینەوە..."

تێگەیی کە دەروێش بەگ هیچ گەش نەبووەتەوە و بە زۆر پێ دەکەنێ... پێی سەیر بوو. قسەکەی بردەوە سەر باسی رەچەڵەکی ئۆغوز و دیسان سەیری کرد دەروێش بەگ بەحاڵ زەردەیەکی دێتێ.

هیچ کامیان نەیانزانی، چۆن چوونەوە سەر باس و خواسی وشککردنەوەی ئاقچاساز و لە ئاقچاسازی وشککراوەوە چوونەوە سەر مەزرا و زەوی و زارە نموونەییەکە.

کرمێك لە ناخی ماهیردا دەجوولا. ئەو کرمە لە ناخەوە دەیجوی و ئەوی کردبووە داربییەکی کرمۆڵ. چەندی لە دەروێش بەگ نزیکتر دەبووە، رقەکەی ئەستوورتر دەبوو. دەروێش بەگی چەندی پتر هەستی بە دۆستایەتی لەگەڵ ئەو دەکرد، ئەویش ئەوەندە و بگرە سەد ئەوەندەی رق لێی دەبووەوە. چیی دەروێش بەگ پتر متمانەی پێ دەکرد، ماهیر لێی بێزارتر دەبوو. بەڵام

هەستی خۆی دەرنەدەبڕی. دەروێش بەگ ئەگەر لە شتێکدا دۆستایەتیی خۆی دەردەخست، ئەو سەد ئەوەندە خۆمانەتر خۆی دەنواند. دەروێش بەگ ئەگەر جوامێری و چاکەیەکی لەگەڵ کردبایە و تۆزێك نەرم و نیان بوایە، ماهیر دەبووە کانیاوێکی خۆشەویستی و دلۆڤانی و جوامێری و پاکی. بەڵام لە دیوەوە، لە دوور دورەوە، لە ناخی گیانیدا ئەو کرمە دەجووڵایەوە و برینەکەی پتر لێ دەهێنایەوە سۆ.

لەوە تۆقیبوو رۆژێکیان لە زاری دەرپەڕێ و ئەوەی لە دڵی دایە بیدرکێنێ. هەر بۆیە هەمیشە لە لای دەروێش بەگ زۆر ئاگای لە خۆی بوو نەکا هەڵەیەك بکا. بەردەوام ئاگای لە خۆی بوو، ئاگای لە دلۆڤانی و دۆستایەتی و پیاوەتی و راستگۆییەکەی. بنیادەمێکی بەهێز نابێ هەرگیز لەلای کەری ئاوا خۆی بدۆڕێنێ. کوڕە بنیادەمیش دەعبایەکی سەیرە. جاری وایە هێشتا قسەت نەکردووە، دەزانێ مەبەستت چییە، ئەوەی بە دڵ و زەینت دا دێ، تەنانەت ئەگەر لە قووڵایی دڵیشتدا بێ، دەیخوێنێتەوە. بەڵام هیوا و ئارەزووەکان، بنیادەم کەر دەکەن. ئەگینا ئەگەر دەروێش بەگ ئەوەندە شێت و خولیای دۆستایەتی و دلۆڤانی و پیاوەتی و راستگۆیی نەبوایە، چما نەیدەزانی ماهیر بەگ چیی لە دڵیدایە؟ ماهیر بە پێداگرتنەوە لەسەر ئەمە هەوڵی دەدا خۆی قایل بکات بە دۆستایەتی و خۆشەویستنی ئەو. ئەو دەروێش بەگە تاقە کەسێکە تاقانە پیاو و تاقە برادەرێکە کە لەو دنیایەدا بۆ برادەرایەتی دەبوو. پیاوێکی خۆشەویست بوو. خۆشەویستیی لێ دەباری. هەرگیز درۆی بەسەر زاریدا نەدەهات و هەر نەیدەزانی فرت و فێڵ چییە.

لە رێگا، لە ئەنجوومەن، لە یانە و لە هەر جێیەکی دیکە تووشی هەر کەس دەبوو، تاریفی دەروێش بەگ و دۆستایەتی و پیاوەتی و جوامێریی و راستگۆیی و ئینسانییەتی ئەوی دەکرد.

کە لە جێوبانی خەوێدا جینگڵی دەدا و ئەمدیوەودیوی دەکرد و لە داخی دەروێش بەگ چیی نەدەما شێت بێ و وەك ئێسك و پرووسکیان هاڕیبێ، هەموو گیانی دەیزیڕاند و بەردەوام بیری دەکردەوە و پیلانی دادەڕشت. ماهیر باش دەیزانی لە بەر چاوی دەروێش بەگ وەك شتومەکێکی تازە وایە. لەوانەشە وەك کاتژمێرێکی قورمیشدار... ئەو هەموو ئەو شتانەی دەزانی و بەو پەڕی لەسەرخۆیی و پارێزەوە رۆڵی خۆی دەگێڕا.

کە لە جێوبانی خەوێدا جینگڵی دەدا و ئەمدیوەودیوی دەکرد و لە داخی دەروێش بەگ چیی نەدەما شێت بێ و وەك ئێسك و پرووسکیان هاڕیبێ، فکرێك وەك برووسکە بە زەینیدا تێپەڕی. کچۆڵەکەی دەروێش بەگ ئەمساڵ بۆ خوێندنی زانکۆ دەچووە ئەستەمبووڵ. زۆر باشە.

دەیتوانی لە ئەستەمبووڵ یەکێك بەو کچەی فێر بکا. مەسەلەی نامووس خاڵی هەرە لاوازی دەروێش بەگ بوو. بە تایبەتی زۆر لەسەر کچەکەی هەستیار بوو. لەوانەش بوو دڵی لەسەر کچەکەی بووبێ. هەر دەکرێ ئەوی لێ لە قاو بدرێ کە دڵی چووەتە سەر کچەکەی خۆی. دوای ئەوە، دوای ئەوە... لەگەڵ کچەکەی... هەر دەمگۆیەکی لەسەر ئەو کافرە بڵاوی بکەیتەوە خەڵك بڕوا دەکەن. خەڵك هەڵدەگرن و ئامادەن هەر جۆرە دەمگۆیەکی سەیر و سەمەرەیان بۆ بڵاو بکەیتەوە. هەر ئەوەندەیە تۆ هەوێنەکەیان بۆ بگرییەوە. دەکرێ لە یانەیەك کچە و کوڕە خافڵگر بکەی و بەسەریاندا بچی و جا ئەوجار بۆیان لە دەهۆڵ و زوڕنای بدەی. کێ دەیزانی ئەو ئاورە لە گۆڕێ کێوە هەڵدایساوە؟ تەنانەت شەیتانیش فکری بۆی نەدەچوو. جا بۆ دیق پێکردنی ئەو دەروێش بەگەی خۆی بە بەڵگەی سێ ئۆغوز دەزانی، بەس بوو. ئیتر دوای ئەوە لای خەڵك سەری هەڵنەدەهات و نەیدەتوانی لە ماڵەکەی بچێتە دەرێ. جا ئەو کاتەیە کە دەڕووخێ. کچەکەی تەنانەت دەتوانێ سەماش بکا. تەنانەت دەتوانێ لە باڕەکانی ئەستەمبوولێشدا سەمای پێ بکا.

بەڵام چما دەروێش بەگ گوێی بەوە دەبزووت؟ لەوانەشە لە ناخەوە هیچ گوێی نەداتێ، بەڵام بە رواڵەت پێی شێت دەبێ. دەی با ببێ، فەرقی چییە. هەر ئەوەندە بەسە شێت بێ، چۆن دەبێ با ببێ...

تەڵەکەی خۆی نابۆوە. چاوەڕوان بوو. ئەوەندەی بەس بوو کچەکە بگاتە ئەستەمبووڵ. بەبێ ئۆقرەییەوە چاوەڕوانی هاتنی پاییز و رۆیشتنی کچە بوو بۆ ئەستەمبووڵ. هەر لە ئێستاوە لە گەنجێکی ژیکەڵە و دڵڕفێن دەگەڕا کە کچە بخەڵەتێنێ و دۆزیبووشییەوە.

کوڕەکەی هەمزە بەگ خودا دابینابوو بۆ ئەو کارە. بەژن و باڵایەکی جوانی هەبوو، هەم دەوڵەمەند بوو و هەمیش ئەهلی رابواردن. هەر جارێکی رێی دەکەوتە ئەستەمبووڵ، ئۆرگین دەچوو مامی بە هەموو شوێنێکدا دەگێڕا. ئەو سەگبابە کەلێن و قوژبنێك نەبوو پێی نەزانێ. هەر کچە بەرەو ئەستەمبووڵ وەڕێ بکەوێ، خێرا لێی سواری فڕۆکە دەبێ و دەچێ و کچە دەدۆزێتەوە و لەگەڵ ئۆرگین پێکیان دەناسێنێ و جا دەڵێ ئۆرگین هۆشت بێ و بزانە چ شتێکت وەچنگ کەوتووە. گەش و شەقڵ نەشکاو و لاو و تازە پێگەیشتوو. مامی خۆت شەمەزار مەکە.

چۆنی نەخشەکەی کێشابوو، دوای ڕۆیشتنی کچەکە، بە فڕۆکە چوو بۆ ئەوێ. ئۆرگینی هەڵگرت و چوونە زانکۆ کچە ببینن. هەر دووکیانی بانگهێشت کرد بۆ یەکێك لە رستورانتە بەرزەکان.

ئۆرگین هەر لە ئێستاوە دەستی کردبوو بە جەفەنگ و ڕابواردن لەگەڵ ئەو کچە ساویلکەیە.

کاتێ لە ئەستەمبووڵیش دەڕۆیشت ئۆرگینی ڕادەسپارد:"ئۆرگین گیان، چەندەی پێت دەکرێ ڕوو بدە بەو کچۆڵەیە. تەنانەت ئەگەر نەشت توانی هیچی لێ بکەی، دیسان بۆ هەر کوێ چوو لەگەڵی بچۆ. ئەوەشت لەبیر نەچێ هەر ڕۆژ نا ڕۆژێك جارێك لەگەڵ بە بەردەرگای زانکۆکەی ئەدەنەدا پیاسەی بکە."

ئۆرگیشنیش بەڵێنی دا:"خەمی ئەوەت نەبێ مامە گیان. ئەگەر عەلی سارەوان بێ، دەزانێ وشترەکەی لە کوێ ئیخ بدات. هەر بەراستی کچۆڵەیەکی ناسکۆڵەیە. سێ مانگ نابا وەك دایکیی لێ دەکەم."

ماهیر بەگیش دەستی لە گیرفانی نا و چەپکە دراوێکی دەرهێنا و دایێ و گوتی:"ئەوەش خەرجی ئەو سێ مانگەتان. ئی دیکەشت بۆ دەنێرم."

بەو جۆرە برا گیانی گیانییەکەی دەروێش بەگ دوای ئیمزای کوشتنی ئەو، بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە ئەستەمبوولی بەجێ هێشت.

مانگێکی بەسەردا هات، دوو مانگ تێپەڕی، بەڵام ئۆرگین دەنگی نەبوو. لە شارۆچکەش هیچ باس نەبوو. باشە ئەی ئەو سەیە چ گوویەکی خوارد؟ خۆ دەست و پێی بەخەنە نییە؟ ئەو هەمووە پارەیەی دەرابوویە... مانگێکی دیکەش چاوەڕوان بوو و کە دیتی دیسان هیچ باسێك نییە، بە فڕۆکە خۆی گەیاندەوە ئەستەمبوولّ و ئۆرگینی دۆزییەوە.

ئۆرگین گوتی:"خۆ ئەتۆ کچت پێ نەناساندووم، دەعبایەکی سلۆکت پێ ناساندووم مامە گیان. دوای ئەو هەمووە کاتێ ویستم دەستێکی بە بناگوێیدا بێنم، کافر بە چاو نەیبینێ چیی بەسەر هێنام. وەك برێشکەی سەر سێڵ هەڵبەزییەوە. کوڕە لای بەرە بابە، خۆ ئەوە بنیادەم نییە، دەڵە گورگێکی وەحشییە. ئیتر قسەمان پێکەوە نییە. وا سووك و ئاسان نانوێ. پێم وانییە ساڵی داهاتووش بتوانم هیچی لێ بکەم. هێشتا بۆنی ئەنەدۆلی لێ دێ. یەکەم ساڵ هەمووان ئاوا بەناموسن."

"ئەی چا چییە ئۆرگین؟"

"چار نییە مامە گیان."

ماهیر بەگ دەست لە گونان درێژتر لە ئەستەمبوولەوە گەڕایەوە و وەك جاری جاران دیاریی بۆ دەروێش بەگ بردەوە. ڕۆژ بە ڕۆژ نێوانیان خۆشتر دەبۆوە. ماهیر جار بە جار رقەکەی ئەستوورتر دەبوو. دەروێش بەگیش لێی تێگەیبوو و هەر جارێکی سەیری دەموچاوی دەکرد، هێلنجی دەدا. نەشیدەتوانی بەسەر ئەو ئیحساسەی خۆیشیدا زاڵ بێ. خەڵکی شارۆچکەکەش وردە وردە هەموو تێگەیشتبوون کە ئەوان هەر لە ڕواڵەتدا دۆستن و لە بنەوە بەخوێنی یەك تینوون. ئۆغوز و مۆغوزیش کە ئەوان ئاوا قوڕیان بۆ دەپێوا و ئەوەندەیان پێدا هەڵدەگوت، هەر قسەی قۆڕ و هەڕ و گێڤ بوو.

ئەگەر ڕێیەکی دەدۆزییەوە... ئەگەر ڕێیەکەی دەدۆزییەوە... کە ئاخرییەکەشی دۆزییەوە. لە چیا خزمێکی هەبوو جارێکیان هاتبووە لای کاری بداتێ، بەڵام ئەو ڕووی نەدابوویێ. هەرچۆنێك بێ خزم گۆشتیشت بخوا ئێسکت ناشکێنێ. بەڵام ئاخر چۆن توانیبای داوای یارمەتی لە خزمێك بکات، کە پێشتر دەستی بە ڕوویەوە ناوە؟ باوکەڕۆ... ئەگەر بەکارت هات کەڵکی لێ وەردەگری، ئەگینا تووڕی دەدەی. دەبێ چاوی بەو کوڕە بکەوێ. لە خزمەکانی راسپارد کوڕەی بنێرنە لای بۆ ئەوەی بیکاتە بنیادەم. کوڕە دەبوو لە کێڵگەکەی ئەودا کار بکات و کاروبارە تایبەتییەکانی ماهیر بەگ بۆ ئەوەی نەدەبوو بە بێگانەیەکی بسپێرن بەڕێوە بەرێ. کوڕەش کە لە خودای دەویست داگەڕێ و بێتە چووکووراوا، دەسبەجێ وەڕێ کەوت. ماهیر بەگیش هەر چاوی پێی کەوت، بەدڵی بوو، بەڵام بۆ ئەوەی باش بیناسێ، یەك دوو مانگێك هەر چاوی بەسەرییەوە بوو و تاقیی کردەوە. گەنجێکی بەخۆوە و تۆکمە و بەژن و باڵا جوان و قژ کاڵ بوو. زۆریش بوێر و ئازا.

ماهیر زۆری تاقی کردەوە و زۆری شێر و ڕێوی بۆ هێنایەوە هەتا بە کوڕەکەی گوت چیی لێی دەوێ. گەنجەش بەزیرەکیی خۆی لێی تێگەیشت و دوای تۆزێك منگەمنگ، قەبووڵی کرد. دەی چما کاری لەوە ئاسانتری دەست دەکەوت؟

قورئان و دەمانچەیەك لەسەر مێزەکە بوو، لەگەڵ چەپکێك دراو. ماهیر بەگ هەستا سەرپێ و ئەحمەدی بانگ کرد و دەست گرت و لەسەر دەمانچە و قورئانەکەی دانا و گوتی:"دەی بڵێ، سوێند بەو قورئانە و بەو دەمانچەیە بخۆ و بڵێ بەو قورئانە و بە دین و ئیمان و شەرەفی خزم و کەسم سوێند دەخۆم دار و دیوارەکان و هەر شوێنێکم بۆ هەڵکەوت دەنووسم و ئەگەر دەسگیریش کرام، بیشمکوژن لە زارم نایەتەدەرێ و ناوی قاباقچی بە زارمدا نایە و هیچ باسی خزمایەتییەکەشمان ناکەم و ئەو نهێنییە لەگەڵ خۆمدا دەبەمە بن گڵ."

ئەحمەد دووبارەی کردەوە:"سوێند دەخۆم."
ماهیر بەگ ئەمجارەیان دەستی خۆی دایە دەست ئەحمەد و لەسەر قورئانەکەی دانا و چاوەکانی لێك نا و گوتی:"بەو قورئانە، ئەگەر بێت و ئەو ئەحمەدە، ئەحمەدی خزمم، کوڕی خۆم، لە کاتی گیرانیدا یان تەنانەت چەند ساڵ دواتریش ئەو نهێنییە لای کەسێك تەنانەت لای دایك و باب و براکانیشی بدرکێنێت، شوێن بزری دەکەم. ئەو دەمانچەیەش بە شایەت دەگرم."
دەستی لەسەر قورئانەکە هەڵگرت و لەسەر شانی ئەحمەدی دانا و پرسی:"گوێت لێ بوو؟"
ئەحمەد کە چاوی لە چاوەکانی بڕیبوو، گوتی:"گوێم لێ بوو، بەڵام هیچ پێویستییەکی بەوە نەبوو. ئەمن خۆ سوێندم خوارد. سەر دادەنێم و نهێنی نادرکێنم."
ماهیر بەگ ئامێزی پێدا کرد و گوتی:"هەر بژی، بژیت تۆرەمەی قاباقچی."
ئیتر چەپکە دراوەکەی لە سەر مێزەکە هەڵگرت و لە گیرفانی ئەحمەدی ئاخنی و گوتی:"هەر بۆخۆشم ژنت بۆ دێنم. ئەمن پێویستیم بە پیاوی ئازا و نەترس و جێ متمانەی وەك تۆ هەیە. خوا راوەستاوت بکا رۆڵە، عەمرت درێژ بێ. هەر لەم شەوەوە دەست پێ بکە. هەر شتێك بێ، خزم پشت و پەنای یەکترین و گۆشتی یەکتریش بخۆن، ئێسقانی ناشکێنن. خزمان لە عەیب و عار و شانازیی یەکتریدا هاوبەشن."
ئەحمەد لە پێشدا لەبەر رووناکایی فانۆسەکە دیوارە سپییەکەی مزگەوتی گەورە و ئەوجار قەدی چنارەگەورەکەی نێوەندی بازاڕەکەی نووسی. دار و دیوار و دەرگا و شۆستە چیمەنتۆکان و هەر جێیەکی بە باشی زانی، نووسیی. لە سەر دەرگاکەی ماڵی دەروێش بەگیش بە خەتێکی جوان نووسی و بەر لەوەی رۆژ بێتەوە، خۆی گەیاندەوە مڵکەکەی ماهیر بەگ لە دەشتێ.
نووسینەکان وەك بۆمب لە شارۆچکەدا دەنگیان دایەوە. هەر نووسراوەی کۆمەڵە خەڵکێکیان لەبەردەم کۆ ببووەوە و سەریان رادەوەشاند و پێدەکەنین و نێوچاوانیان تێك دەنا و مووچڕکەیان پێدا دەهات.
"ئەو دەروێش بەگە ناودارەی... لێرە خۆی بە بەگ و ئاغا دەزانێ... کچەکەشی لە ئەستەمبووڵ بەرەڵڵا و هەرەڵڵا دەخولێتەوە."
لە جێی دیکە وەك نووسینی کتێبان بەپەلەپەل ئاوا نووسرابوو:"کچەکانیان لە یانە و مەلهاکانی ئەستەمبووڵدا لەشفرۆشی دەکەن و خۆشیان لە شارۆچکەدا لەشفرۆشی دەکەن."
خەڵکێکیش لە دەوری چنارەکەی نێوەندی بازاڕێ کۆ ببوونەوە.

"دەروێش بەگ! برۆ کچەکەت لە بن هەتیومەتیوی ئەستەمبولێ بێنەوە دەرێ. بیهێنە دەرێ و بۆ ئێمەی بێنە. ئێمەش بنیادەمین. ئێمەش..."

لەگەڵ کۆمەڵێك نووسینی زۆر بێ ئەدەبانەی دیکە لێرە و لەوێ.

ماهیر بەگ قاوەڵتوونێ بوو چووە بازاڕێ. هەر وەك نە بای هاتبێ و نە بۆران...

کە خەڵکەکەی دی لە دەوری دارەکە کۆ بوونەتەوە لێیان چووە پێشێ و پرسیی:" ئەوە چ بووە؟"

نووسینەکەیان نیشان دا. چاویلکەی لە چاوی کرد و بە وردی خوێندییەوە و ئەوجار دڕی بە خەڵکەکە دا و چووە پێشتر و لە بەر نووسراوەکەوە راوەستا و بە دەنگێکی بەرز بە خەڵکەکەی گوت:"ئەوە جینایەتە، جینایەت. ئەوە بێناموسییە، بێناموسی. لەمەودوا ئیتر کەس لەو شارەدا ناتوانێ ئاگای لە شەرەف و ناموسەکەی خۆی بێ. بیسڕنەوە. بێناموسی، ئەی خوایە گیان، وەی لەو قەباحەتەی، بەخوای عەیبە. تۆ خوا حەیف نییە بۆ دەروێش بەگ؟ کوڕە ئەوە داماننا کچەکەی لە ئەستەمبوولێ دەرپێکەی بەسەر شانیدا داوە، خۆ هەمووومان ئەوەمان بیستووەو، بەڵام باشە بۆ لە سەر دارودیوارانی دەنووسن؟ کوڕە عەیبە شوورەییە و ئەمن دەڵێم جینایەتە جینایەت. خۆ بێت و دەروێش بەگ گوێی لەوە بێت، دیق دەکات. جا ئەوجار مەملەکەتەکەمان رۆڵەیەکی ئاوا رەسەن و شیاو و بلیمەت و زانای لەکیس دەچێت. هەتا شتێك نەقەوماوە پاکی بکەنەوە. زوو بن خێرا برادەرینە. پاکی بکەنەوە با چیدی چاوم پێی نەکەوێتەوە."

دوو گەنج دەمودەست چوونە سەر کورسییەکان و ئەو نووسینەی بە تەباشیر نووسرابوو، سڕییانەوە. گەنجێك گوتی:"ئاغا، سەر شۆستەکان و دەرگای دووکان و دیواری مزگەوتی گەورە و شوێن نەماوە شتی ئاوای لێ نەنووسرابێ. خۆ هەر یەك دوو جێ نییە."

ماهیر بەگ گوڕاندی:"بیسڕنەوە، بیسڕنەوە، هەمووی بسڕنەوە."

ئەوجار کەوتە رێ و دیسان راوەستا و لەسەری رۆیشت:"تۆ خودا هەر هەمووی پاك بکەنەوە. مەهێڵن، شارۆچکەکەمان لەبەر قەحپەیەك حەیای نەچێ و ناوی نەزڕێ. بزنە گڕوییەك مێگەلێك گڕوێ دەکا... باش نییە. ئەوە بۆ دەروێش بەگ و بۆ ئێمەش خراپ دەشکێتەوە. بێت و لە ئەستەمبوولێ ئەوجار ناوی شارۆچکەکەی ئێمە بێنن، دەڵێن خەڵکەکەی ئەوێ بێ غیرەتن. پیاوی تێدا نییە. پاکی بکەنەوە ئەو نووسراوانە. پاکی بکەنەوە با ریسوا و رووڕەشی دنیایە نەبین."

"هەی قورمساغینە، وەك پشیلە عەیب و عاری یەکتری دادەپۆشن. بێ شەرەفینە. یەکێ چووە لە ئەستەمبوولێ گانی داوە، یەکێکیش هەستاوە و ئاوا ئێرەی نووسیوە. ئیتر بە ئێمە چی پاکی بکەینەوە؟ لێ گەڕێن با هیچیان نەسڕێنەوە.

ماهیر بەگ گوێی لەو قسانە بوو بەڵام وەڕووی خۆی نەهێنا. لە خۆشییان نەیدەزانی چ دەکا. خۆی خستە نێو ترۆمبێلەکەیەوە و بە شۆفێرەکەی گوت:"هەڵی بکە با بڕۆین بچینە ئاواییەکەی دەروێش بەگی داماو."

لە رێگایە خۆی تەمرینی گریانی دەکرد. دەیهێنایە بەر چاوی خۆی، کە دەروێش بەگ بێت و گوێی لەو هەواڵە بێ چ دەکات و هەوڵی دەدا لەگەڵی بگریێ، بەڵام هەرچیی دەیکرد، فرمێسکی نەدەهاتە چاوییەوە. لە حاڵێکدا دەبوو هەر چاوی بە دەروێش بەگ بکەوێ، لە کوڵپەی گریانێ بدا. بەڵام چاوە کوێرەکانی... لە خۆشییانیش خۆ پیاو چاوی پڕ دەبن لە ئاو. بەڵام چاوەکانی دەتگوت هەڵچۆڕاون. تا گەیشتنە ئاواییەکە، هەوڵی دا و تەنانەت ئەو کاتە تاڵ و ناخۆشەی خۆیشی هێنایەوە پێش چاوی کە کفنی پۆشیبوو، بەڵام دیسانیش نەیتوانی دڵۆپێك فرمێسك هەڵوەرێنێ.

ترۆمبێلەکە لە بەردەم دەروازە راوەستا. کەس دیار نەبوو. کۆشکەکە دەتگوت زیندەوەری تێدا نییە. بەر لەوەی دابەزێ، بە رواڵەت خۆی خەمبار و پەرێشان کرد. نێوشانی وێك هێنا و تۆزێك پشتی کووڕ کردەوە. بێ تاقەت و بێهێز بەرەو دەرگاکە چوو و بەسپایی کردییەوە. لە کوێی بیستبوو؟ کێ وای گوتبوو؟ کێ وێرابووی بە دەروێش بەگی بڵێ؟ بە دڵنیاییەوە کەس نەیدەتوانی باسی ئەوەی لەگەڵ بکا، بەڵام ئەی کۆشکەکە بۆ وا کپ و بێدەنگ بوو؟"

بەر لەوەی لە دەرگا بدات، دەرگا کرایەوە. ماهیر لەسەرخۆ و بە کۆخەکۆخەوە و جار نەجارێکیش رادەوەستا و لە پلیکانەکان دەچووە سەرێ. باشە چۆناوچۆن ئاوای لێ هاتبوو. خۆیشی پێی سەیر بوو. پێ سەیر بوو و فرمێسکیشی هەڵدەوەراند.

دەروێش بەگ بە شڵەژاوی و سەرسووڕمانەوە پرسیی:"چ بووە ماهیر؟ چ بووە؟ چ بەڵایەکمان بەسەر هاتووە؟"

ماهیر هێندە گریابوو نزگەرەی دەدا. وەك لافاو فرمێسکی بە روومەتیدا دەهاتە خوار. بە دەنگێکی ماندوو کە کوڵپەی گریان لەرزۆکی دەکرد، گوتی:"چما نەتبیستووە چ بەڵایەکمان بەسەر هاتووە؟ چما نازانی تووشی چ نەهامەتییەك بووین؟"

دەروێش بەگ بە دڵەخورپەیەکی ڕاشکاوانەوە گوتی:"گوێم لە هیچ نەبووە."
"ئەی بۆ وات لێ هاتووە؟"
"عەلی‌یە شوانمان نەخۆشە. ناردوومە بە شوێن دکتۆر ئادەمدا و هێشتا نەهاتووە. هەر چاوەڕوانیم."
ماهیر هەر وا بە دەنگێکی بەرز دەگریا و بە دەم گریانەوە گوتی:"کەوابوو ئاگات لێ نییە. نەتبیستووە براله..."
ئیتر سەری بە سینگییەوە نا و لەسەری ڕۆیشت:"هەر باشتر کە گوێت لێ نەبووە. هەر گوێت لێ نەبێ باشترە. لە قازانجمان نییە گوێت لێ بێ. ئیتر لەمەودوا نە تۆ پێکەنینت دێتە سەر لێوان و نە من. جوامێرەکەم، ڕەچەڵەك ئۆغوزەکەم... وەرە بزانە چۆن خەم و ژان بەسەر بنیادەمدا دەبارێ. کافر نەیبینێ، یاخوا بەسەر کەس نییە، یاخوا دوژمنیش نەیبینێ. ئەستەمە، زۆر تاڵە، تاڵە براله."
دەروێش بەگ کە سەرسووڕمانەکە ڕەوییەوە، سەری گرت و توند ڕایوەشاند و دەستی گرت و لەسەر مۆبلەکەی دانا و گوتی:"دەی بڵێ بزانم چ بووە؟ بیڵێ و بیبڕەوە ئیتر. بۆ وەزگ بە پیاوی دەدەی؟ واز لە گریانەکەت بێنە، گریان بۆ ژنانە. سەری بێ گێچەڵ لە بن گڵە."
ماهیر نووزایەوە:"هەموو بەڵایەك بەڵا نییە براله. خودا بەڵای ئاوا بەڵای ئاوا بەسەر هیچ بوونەوەرێك نەهێنێ."
سەری خستبووە نێو دەستەکانی و لە سەری جێیەکەی خۆی بە هێمنی خۆی ڕادەژاند...
"دوژمنمان زۆرن. هەموو ئەو قوون ڕووتانە بە خوێنی سەرمان تینوون. ئەگەر دوژمنمان نەبوایەن، چما بەڵای ئاوایان بەسەر دێنایین؟ ئەو پەڵەی شوورەیییەیان بە نێوچاوانمانەوە دەدا؟ خەریکە دەمرم براله، لە بن بارستای ئەو خەم و ژانەدا وەختە بخنکێم. ئێستا کە نەتبیستووە، با هەر نەیبیستی. واباشترە پێت نەگوترێ. هەر مەیبیستە. ئەو داخە دەتکوژێ."
دەروێش بەگ ئاگری گرت. دەرپەڕی و پڕی دایە بەرۆکی و نەڕاندی:"بیڵێ، دە بیڵێ دەی. بیڵێ و بیبڕەوە. خۆ منت کوشت. کوڕە ئەگەر خەبەری مەرگیشمە بیڵێ دەی."
"لە مەرگیش خراپترە برای بە ڕەچەڵەك ئۆغوزم. وەی خۆزگە زمانم لاڵ بێ و ئیتر نەتوانم هیچ بڵێم ڕەچەڵەك ئۆغوزەکەم. ئەوە لە بنەماڵەی بەرز و خانەدانی تۆ ناوەشێتەوە. پەڵەی شوورەیی..."

رایوەشاند و بەسەریدا نەڕاند:"بیلێ دەی. دەی بمره و بیلێ. بیلێ و شێتم مەکە. ئاگرم مەدە."

ماهیر خۆی بە شان و قۆڵییەوە هەڵواسی و لە حاڵێکدا شانی هەڵدەبەزینەوە، بە دەم گریانەوە گوتی:"ئاخر بڵێم چی... نووسیویانە... کوڕە یاخوا دەستیان گۆج و ئیفلیج بێ..."

"چییان نووسیوە ماهیر؟"

"شتی زۆر شوورەیی. عەیب و عارمان."

"چ عەیب و عارێك؟ دەی بڵێ دەی، شێتم مەکە کابرا. بڵێ خەریکە شەق بەرم."

"لە هەموو بازاڕ و قەدی دارەکان و لەسەر دەرگا و دار و دیوار و شوستەکان..."

"چییان نووسیوە؟"

"باسی ئەو شتانەیان کردووە کە گۆیا نوور خاتوونی کچمان لە ئەستەمبووڵ دەیکا. دوژمن دەوروپشتمانی گرتووە. هەموو، هەر هەموویان نووسیوە. وەك دەڵێن کچە زۆر خراپ داوێتە باری بێ ئابڕوویی. تۆ هەقت بوو."

"نوورخاتوون؟ چما چیی کردووە؟"

"تۆ هەقت بوو براله. کچ بۆ دەرس خوێندنێ نابێ."

"دەڵێم نوورخان چیی کردووە؟..."

"هیچ، نووسیویانە بۆتە سەماکەر لە یەکێك لە باڕەکاندا..."

"بێدەنگ بە، بێدەنگ. ئەوانەیان نووسیوە؟ کێ نووسیوێتی، کێ؟"

"دوژمنەکانمان، ئەو دوژمنانەی بە خوێنمان تینوون، دوژمنە قەستەسەرەکانمان..."

دەروێش بەگ دەرهەڵبوو*:"ئەو شارۆچکەیە ئاگر دەدەم. ئاداری بەسەر پادارییەوە ناهێڵم. بە خودایەتیی خودا ئاگری دەدەم، دەیسووتێنم."

"بەیانی چووبوومە بازاڕێ، ئەی خۆزگە پێم شکابایە و نەچووبایەم. دیتم ئەوە خەڵك پۆل پۆل لێرەو لەوێ کۆزیلەکەیان بەستووە. چوومە پێشەوە و دیتم. هەی خۆزگە کوێراییم دابوایە... دنیا لەبەر چاوانم رەش بوو. ئیتر نەمزانی چ قەوما. وەك شێتان پەلاماریانم دا و بەسەریاندا نەڕاندم:"دەی بۆ راوەستاون و حەپەساون؟ دەی دەست دەنێ و بیانسڕنەوە..."

* دەرهەڵبوو: واتە ئاگری گرت. هەڵچوو. لە دین دەهری بوو. تووڕەبوو.

دەروێش بەگ هەر دوو دەستی شۆڕ ببوونەوە و لە جێی خۆی وشك هەڵاتبوو. ساتێك سەری هەڵێنا و گوتی:"دەبێ ببینم. بە چاوی خۆم دەبێ ببینم، مەسەلەی نامووس وەك هیچ شتێکی دیکە نییە دەبێ..."

قسەکەی تەواو نەکرد و بە پەلە لە پلیکانەکان رۆیشتە خوارێ و هەرای کرد:"ئەسپەکەم بۆ بێنن."

ماهیر بە نیگایەکی بەدفەڕانەوە لە دواوە سەیرێکی کرد و لە دڵی خۆید گوتی:"پەنجە بە دەرگای کەسەوە مەنێ با بە مست لە دەرگات نەدەن." و جا هەستا و لە پلیکانەکان چووە خوارەوە و گوتی:"با بە ترۆمبێل بڕۆین بەگ، زوتر دەگەینێ. بەر لەوەی پاکیان کردبێتنەوە..."

لەو کاتەدا ئەوەندەی حەز دەکرد سواری ترۆمبێلەکەی بکات کە... دەروێش بەگ بە سەر پشتی ئەسپەوە سام و شکۆیەکی هەبوو. دەرفەتی ئاوا سووك و ئاسان بۆ کەس نەدەڕەخسا... شڵەژاو و بێتاقەت... خۆشی لە بازاڕەکەی لە ترۆمبێلێ دادەبەزێ، ئەویش لەو بارودۆخەدا...

دەروێش بەگ سەری لێ شێوابوو و نەیدەزانی چ دەکا. بەبێ ئەوەی بیری لێ بکاتەوە سواری ترۆمبێلەکە بوو. ژنەکەی و ئەوانی دیکە ئاگایان لە مەحموودی بێ زەواد نەبوو و بە سەرسووڕمانەوە سەیری ئەو دووانەیان دەکرد کە ڕەنگیان بزڕکابوو و تەواو شڵەژاو دیاربوون.

ترۆمبێلەکە وەڕێ کەوت. دەروێش بەگ پەیتا پەیتا لە شۆفێرەکە ڕادەخوڕی: "خێراتر لێی خوڕە..."

زۆری پێنەچوو گەیشتنە شاری. لە بازاڕەکە، خەڵك پۆل پۆل لە دەوری یەکتری کۆزیلکەیان بەستبوو. دەروێش بەگ لە ترۆمبێلەکە خۆی خستە خوارێ و ماهیریش بەشوێنیدا، دەروێش بەگ لە حاڵێکدا بەرەو دەستەیەك لە حەشیمەتەکە دەچوو، پرسیی:"لەکوێیە:"لە کوێیە؟ کوا؟ نیشانم بدە ماهیر."

دەروێش بەگ کە چووە پێشتر، ئەو نووسراوەی خوێندەوە:"ئاگاداری، ئاگاداری، نوورخانی سەماکەر بەم زووانە دێتە ئێرە."

دەروێش ئاوڕی دایەوە و سەیرێکی ماهیر بەگی کرد، یانی هەر ئەوەندە؟ خراپ تێگەیشتوون. خراپ تێگەیشتنێك بەهۆی وێکچوویی ناوەکانەوە. لەوانەیە گرووپێك بێنە شارۆچکە بۆ کۆنسێرت. بارێکی قورس لەسەر شانی لاچوو. دەموچاوە ڕەنگ بزڕکاوەکەی وردە

وردە هاتەوە سەر خۆ و زەردەیەك نیشتە سەر لێوی و لەوێ دوور کەوتەوە. ئەو خەڵکەی کۆ ببوونەوە، بە بەزەییەوە سەیرێکیان کرد.

"با بچینەوە ماڵێ، ماهیر. هەڵەیەك کراوە."

ماهیر زەردەیەکی هاتە سەر لێوان و گوتی:"خودا بکا وابێ، خودا بکا هەڵە کرابێ. خۆزگە ە ە..."

دەروێش لە ترۆمبێلەکەدا یەك پشوو دەیگوت:"زۆرم پێ سەیر بوو ماهیر، زۆر. مەسەلەی نامووسی وەك شتی دیکە نییە. ئابڕوو، ئاوەڕۆ نییە. ئابڕوو تنۆکێکە، بتکێ، کۆ ناکرێتەوە. وانییە براله؟"

ماهیر هیچی نەدەگوت.

ئاوا گەیشتنەوە ماڵێ. ماهیر کە دابەزی، راست بەرەو دەرگای حەوشەکە چوو و لەنەکاو راچڵەکی و لە جێی خۆی وشك بوو و دەنگێکی نامۆی لە قوڕگییەوە هێنایە دەرێ. لەو دەنگانەی لە گەرووی یەکێکەوە کە خەریکە دەخنکێ، دێنە دەرێ. دەروێش بەگ دەسبەجێ غاری دا، کە گەیشتە بەر دەرگا، ئەویش لەجێی خۆی پێی بە عەرزییەوە وشك بوو. بڕوای بە چاوەکانی خۆی نەدەکرد. نووسینەکەی سەر دەرگاکە ئەوە بوو:

"دەروێش، کچەکەت لە ئەستەمبووڵ قوون بادەدا و سەما دەکا. ئاگادار بە شاخەکانت ئەوەندە درێژ بوونەتەوە گەیشتوونەتە ئەستێرەکان."

ئەی لەو سەگبابە. هەتیو ئەو ئەحمەدە دەڵێی پارچە بزووتە. چیی دراوەتە دەستی، بەبێ کەموکووڕی نووسیوێتی هیچ، لە خۆشییەوە شتی لێ زیاد کردووە.

ئەگەر ماهیر زوو نەجووڵابایەوە و نەچووبایەتە بن باڵییەوە، دەکەوت. زۆر بە زەحمەت لە پلیکانەکان بردییە سەرێ و لە سەر مۆبلەکەی رایکێشا. دەروێش بەگ لەهۆش چووبوو و دەینالاند و ماهیر لە خۆشیاین وەخت بوو بفڕێ. گوێزی بە کلك دەشکاند.

"لە دەرگای کەس مەدە با لە دەرگات نەدەن. گاڵتە بە ئابڕووی کەس مەکە با گاڵتە بە ئابڕووت نەکەن. ئەگەر شان و باهۆت بەهێزن، راست بەوە لە بن ئەو بارە قورسەدا دەروێش."

"ئاخ براله، نەمگوت ئەو کافرانە، بێ دین و یەزیدن؟ نەمگوت ئەوانە دوژمنی ئێمەن؟ نەمگوت دەفەرتیان بدەین، پێستی سەرمان هەڵدەقەنن؟ ئەوە ئاخر زەمانە. ئەو شارە ئەستەمبووڵە. کچ و کوڕ، لە ئەستەمبووڵ دڵداری و سەد کاری دیکە دەکەن. جا ئەو لەدەهۆڵ کوتانەی بۆ چییە؟ ئاخر کەری کەران بابگاوانە، مردارینە، چەپەڵینە، دواکەوتووانە، کچی ئەم

دەوروزەمانەیە دڵدارییش دەکات. ماچیش دەدات و قوونیش بادەدات. دەی جا چییە؟ خۆ دنیا خراپ نابێ؟

دەروێش بەگ زۆر دڵتەزێنانە نالاندی:"بیبڕەوە، بیبڕەوە ماهیر. کچی من بۆ کەس نانوێ. ئەمن دەیکوژم. زیندەبەچاڵی دەکەم. ئەو ناتوانێ حەیای تۆرەمەی ساری ئۆغڵی بەرێ. کچی من وەك کچی خەڵك نییە. ئەگەر وابێ، دڵنیابە دەیکوژم. کچی من کاری وا ناکا."

"نارەحەت مەبە بەگ. بەشکم درۆش بێ. لەوانەشە، بەڕەڵلایەکی بێ دایك و باب، یەکێك لە دوژمنەکانمان بۆ ئەوەی وەزگمان پێ بدات، ئەو بوختانەی بۆ هەڵبەستبێتین."

"بەڵام ماهیر، قسەی خۆشمان بێ، دووکەڵ بەبێ ئاگر نابێ. ئەو کچە دەبێ سەری بە گۆمێدا بکرێ. ئەمن ئێستا ناتوانم بیر لە هیچی دیکە بکەمەوە. جارێ هیچی دیکەم بە زەیندا نایە. پێویستیم بە یارمەتیتە براله. ئەمن هەتا ئێستا بە گوێرەی پێویست لە غیرەت و برایەتیی تۆ تێ نەگەیشتبووم. لە رەسەنایەتی و دەماری تۆ تێ نەگەیبووم. دانی پێدا دەنێم، پێی لێ دەنێم کە هەتا ئێستا تۆم پێ کەم بوو. دەمگوت کوڕی قاباقچییەکی بەرەڵلایە ئیتر. بەڵام داوای لێبوردنت لێ دەکەم براله. بمبوورە. گەردنم ئازا بکە. کەس لە تۆ پیاوتر نییە. یارمەتیم بدە با ئەو پەڵەی شوورەییە لە داوێنی بنەماڵەکەم بکەمەوە."

"ئەمن خزمەتکارتم براله. هەر تۆ سەرێك بلەقێنە با من بە سەر سەران بێم. دۆست ئەویە لە کاتی لێقەوماویدا بە دەنگتەوە بێ. پێشینیان گوتوویانە: دۆست لە بەندیخانەدا دەردەکەوێ، ئەگینا لەسەر خوان و سفرە دوژمنیش وەك دۆست خۆ دەنوێنێ. سەیر بکە براله، ژیانی ئێمەمانان لە نێو ئەو خەڵکە رزیوەدا، ئەو خەڵکە چەپەڵ و بەرژەوەندخوازەدا زۆر ئەستەمە. ئێمە دەبێ ئاگامان لە یەکتری بێ، ئێمە دەبێ پشتی یەکتری بگرین و یەك بین."

دەمەدەمی نیوەڕۆ بوو کە خاتوون و مزەفەر و جەیحوون و عارفی برای دەروێش بەگ و چەند کەسێك لە حزم و کەسەکان دەرکەوت.

دەروێش بەگ پەیتا پەیتا دەیگوت:"دەبێ سەری ئەو کچە بە گۆمدا بکرێ. دەبێ بیفەوتێنی..."

مزەفەر دەیگوت:"لەسەر خۆ بە باوکە. کێ دەڵێ وایە و کچە شتی وای کردووە؟ چما ئێمە نوورخان ناناسین؟ نوورخان لە کوێ و قوون بادان لە کوێ؟ ئەوە بوختانە بوختان. کاری دوژمنانە..."

دەروێش بەگیش دەیگوت:"ئەمن دەزانم، راستە. وایە. ئەمن مردووی خۆمە دەیناسم. زۆر باشیش دەیناسم. کچ کە لێی گەڕای بخوێنێ و بچێتە ئەستەمبوڵ... جوانیان گوتووە، کچ هەر نەبێ و تۆوی ببڕێ، ئەگەر بووش، یان بۆ مێرد و یان بۆ گۆڕ..."

ماهیر، دەروێش بەگی لەگەڵ بنەماڵەکەی بەجێ هێشت و لەوێوە راست و ڕێ چووە پۆلیسخانە و بە نەقیبی گوت:"ئەوە کارەساتە. دەروێش بەگ، ساری ئۆغلی دەروێش بەگ وەختە لە داخان جەڵتە لێی بدا. چوکووراوا خەریکە ئەو تاقە بەگە رەسەنەیشی لەکیس دەچێ. ئەگەر ئەو لەکیس بچێ، ئیتر بەگێکی رەسەن، بەگێکی بە رەچەڵەك ئۆغوز و رێکوپێکی وەك ئەو دەست ناکەوێتەوە. بەگێکی رەسەن و نەریت پەرست و بێوێنە خەریکە تێدا دەچێ. کچەتیوەیەك لە ئەستەمبوڵ خەریکی بەڕەڵڵایەتییە، کەس لەوێ کار بەسەرییەوە نییە، بەڵام لێرە هەڵدەستن دار و دیوار دەنووسن و حەیای بنەماڵەیەکی رەسەن دەبەن. ئەوە وەحشیگەرییە کاکە گیان، وەحشیگەری. دەبێ تا زووە ئەو کەسەی ئەم قسە قۆڕانەی نووسیوە قۆڵبەست بکرێت. گاڵتە نییە. حەیا و شەرەفی بنەماڵەیەکی مەزن و لەمێژینە لە گۆڕێیە. پاشاگەردانی و هەرکەس هەرکەس نییە. مەملەکەتی ئەمڕۆ یاسای هەیە، یاسایەکی یەکگرتوو. خۆ ناکرێ بانێك و دوو هەوا بێ. نابێ رێگە بەو چاوقایمی و بێ ئابڕووییە بدرێت جەنابی نەقیب."

ناوی پێنج کەسی داایە نەقیب کە وای دەنواند گومانی لێیانە و هەر پێنج کەسەکەشیان لایەنگری تۆخی دەروێش بەگ بوون. هەتا ئێوارەی ئەو رۆژە هەر پێنج کەسیان و چەند کەسی دیکەش قۆڵبەست کران و گیران. گیراوەکان شەوانە ئەشکەنجە دەدران بۆ ئەوەی کەتنەکە وەئەستۆ بگرن.

ماهیر لە پۆلیسخانەوە گەڕاوە ماڵی دەروێش بەگ و گوتی:"ناوی چەند گومانلێکراوێکم دایە نەقیب. چەند کەسێکیان گرتووە. هەتا سبەینێ لە بنی زمانیانی دەردەکێشن. چیی نەمابوو کە گیراوەکان کەتنەکە بگرنە ئەستۆیان کە من هاتمەوە. ئەو کەسەی ئەوەی کردووە، دەیدۆزینەوە. دەیدۆزینەوەو سزاشی دەدەین. بەرڵڵا و هەرەڵڵا لە دژمان کلکیان تێك ئالاندووە."

دەروێش بەگ گوتی:"راست دەکەی براله. ئەمن گوێم نەدەدایە، هەرچی و پەرچی و بەرەڵڵا دوژمنمانن. ئەو کچەتیوە بێننەوە. تەلەگرافێکی بۆ بکەن دەسبەجێ سواری تەیارە بێ و بێتەوە."

ماهیر بەگ هەر لەوێ، دەمودەست تەلەگرافێکی توندی بۆ نووسی.

ئەو شەوە کەس خەوی لێ نەکەوت. نە دەروێش بەگ و نە ماهیر بەگ و نە کەسی بنەماڵەیان. بەیانی روون بۆوە کە گیراوەکان کەتنەکەیان گرتووەتە ئەستۆ. ئەوان دار و دیواریان نووسیبوو. بەڵام وا باشتر بوو لێیان خۆش بن. کەرێتیان کردبوو. دەروێش بەگ مەزن بوو، رەسەن بوو و ئەوانیش خەتابار و داوای لێبوردنیان لێی دەکرد. دەروێش بەگیش دەیگوت:"وا باشە لە بنیادەمەکان خۆش بیت، بەڵام ئەمن ناتوانم لەوانە خۆش بم، چونکە ئەوان گەمەیان بە نامووسی من کردووە و حکوومەت دەبێ سزایان بدا. ئەگەریش نەیدا، بە دەستی خۆم سزاکەیان لە بەری دەستیان دەنێم."

ماهیریش پێی دادەگرتەوە:"دەبێ سزاکەی ببینن، ئەو هەرچی و پەرچییانە بۆ لێخۆشبوونێ نابن."

ئەو شەوە ماهیر بەگ بە ئاسوودەیی نوست. لە ژیانیدا ئەوەندە بەختەوەر نەبووە. هەتا ئێستا چێژی تۆڵەی نەچێشتبوو. وا سووك ببوو دەتگوت باڵی گرتووە و هەڵدەفڕێ. ئێستا دەروێش بەگی باشتر دەناسی.

دوو رۆژ دواتر وەڵامی تەلگرافەکەی نوورخان هاتەوە:

"بۆچی داواتان کردووە بێمەوە؟ خەریکی دەرسەکانم. ناتوانم بێمەوە. خۆ، خودای نەکردە بابم هیچی لێ نەهاتووە؟ تکایە زوو ئاگادارم بکەنەوە. ئەگەر شتێك قەوماوە، دەسبەجێ دێمەوە."

دەروێش بەگ کە تەلەگرافەکەی خوێندەوە، ئاگری گرت و وەك فیشەکە شێتە لەجێی خۆی دەرپەڕی و بەسەر مزەفەردا نەڕاندی:"دەسبەجێ سواری تەیارە بە و بچۆ بۆ ئەستەمبوڵ و ئەو کچەتیوە بەرەڵڵایەم بۆ بێنەوە."

مزەفەر لە هەمبەر ئەو تووڕەییە شێتانەیەی ئەودا هیچی پێ نەدەکرا. دەسبەجێ سواری ترۆمبێلەکەی ماهیر بەگ بوو و بەرەو ئەدەنە کەوتە رێ و لەگەڵ یەکەم تەیارەدا بەرەو ئەستەمبوڵێ کەوتە رێ. پەیتا پەیتا لەبەرە خۆیەوە دەیگوت:"نوورخانی قوڕ بەسەر، سەما و قوون بادانی چی، ئەو هەر سەیری پیاو دەکا سوور هەڵدەگەڕێ. ئەمن دڵنیام تا ئێستا هەناسەی پیاوی بەسەردا نەهاتووە..."

کە نوورخانی دیت، سەری بەسەر کتێبەیدا گرتبوو و شڵەژاو و ماندوو دیار بوو. هەر چاوی بە براکەی کەوت، دایە بەر پرسیاران...

مزەفەر نەیدەتوانی ڕاستییەکەی بە خوشکەکەی بڵێ. نەشیتوانی پێی بڵێ. هەر ئەوەندەی توانی بڵێ:"بابم نەخۆشە و داوات دەکا."

"زۆر نەخۆشە."

"هیچی نییە، بیانووی گرتووە."

"ئاخر من دەرسم هەیە..."

"چار نییە، دەبێ بڕۆین."

هەر ئەو ڕۆژە خوشك و برا گەڕانەوە. مزەفەر خوشکەکەی بردە ئاوایی. نەیدەتوانی بیباتەوە لای بابی.

"نوورخانم هێناوە و بردمە گوند. کچە ئاگای لە مەحموودی بێ زەواد نییە. چاوی جگە لە دەرسەکانی هیچ نابینێ." دوای حەفتەیەك ئاخرییەکەی دەروێش بەگیان قایل کرد بەوەی کچەکەی هیچ تاوانێکی نییە. بەڵام نوورخان ئیتر نەیدەتوانی بگەڕێتەوە ئەستەمبووڵ و ئیتر ڕووی لەوێ نەکردەوە. زانیبووی چ ڕووی داوە و هەر خۆی دەخواردەوە و هیچیشی لەدەست نەدەهات.

چەند مانگ بەسەردا هات و هەموو شتێك لەبیر کرا، بەڵام دەروێش بەگ هەرگیز نەیتوانی سەیری چاوی کچەکەی بکاتەوە. بەخێر کچە بێتاوان دەرچووبوو، بەڵام ئەو چاوی بەرایی نەدەدا سەیری چاوی بکات. چونکە هەر شتێك بێ، ئەو حەیای بردبوو و سەری نەوی کردبوو، و بەردەوام تووك و لەعنەتی لە کچە دەکرد.

ڕووداوەکە خەریك بوو لەبیر دەچۆوە و ئەوانەش، کە بەپێی دانپێدانانەکەی خۆیان حوکم درابوون، بەر درابوون.

لەو نێوەدا ڕووداوێکی تازە، هەموو شتێکی تێك دا.

## ٧٤

بە روویەکی گەش و گەرم و گوڕ بەپیر سلێمان سامییەوە چوو:"وەرە براله، وەرە، وەرە، خۆ هەر لێمان دەقەومێ، تۆمان بیر دەکەوێتەوە و دیسان بۆ ماوەی چەند ساڵان لەبیرت دەکەین و هەر ناپرسین ئەرێ براله سلێمان سامی چۆنی؟ چۆن دەژییێی؟"

دەستی لە ئەستۆی کرد و هەر دوو روومەتی ماچ کرد و لەسەری رۆیشت:"ئەگەر راستیت دەوێ ئێمە بێ ئەمەگ و سپڵە بووین و نەمانتوانیوە بەو جۆرەی شیاوی لێوەشاوەیی تۆیە، سوپاست بکەین و رێزت بگرین، بەڵام هەر گوومان لە قوونی دەگیرێ..."

"تکا دەکەم... تکا دەکەم..."

"هەر تەنگاو دەبین، پێش هەموو کەس هانا بۆ تۆ دێنین... فەرموو دانیشە. فەرموو دانیشە برای ئازیز. رووڕەش و شەرمەزارم. شەرمەزارم، بەڵام چۆن بتوانم لە بن باری ئەو هەمووە تاوانە بێمە دەر و قەرەبوویان بکەمەوە؟ چن دەتوانین ئەو هەمووە زەحمەتەی لە پای ئەو میللەتە و ئەو شارۆچکەیە کێشاوتە، بۆت قەرەبوو بکەینەوە، چۆن..."

"تکایە... تکایە..."

"ئەو میللەتە، ئەو میلـ لـ لـەتە تەنانەت کۆشکی زێڕینیشت بۆ دروست بکەن و تاجی پادشایەتیشت لەسەر بنێن، دیسان چاکەی خزمەتی خێرخوازانەی تۆیان پێ نادرێتەوە."

ئەوجار دەنگی پتر هەڵێنا:"بە هیچ جۆرێك ناتوانن چاکەی تۆ بدەنەوە، بە هیچ جۆرێك. هەرچی بۆتی بکەن هەر کەمە."

"تکایە... تکایە..."

سلێمان سامی خاکەڕایانە لەسەر مۆبلەکە دانیشت. ماهیر بەگ خولقی کرد بۆ جگەرەیەك و بە چەرخە زێڕینەکەی جگەرەکەی بۆ داگیرساند و ئەمری کرد قاوەی بێنن.

سلێمان سامیش کابرایەکی دنیا دیتە بوو و دەیتوانی لێکی بداتەوە کە ئەو زمانچەوری و دەمتەڕییە بۆ چییە و لەو سۆنگەیەوە بزانێ ئاخۆ چیی دێتە گیرفانی؟ لە دڵی خۆیدا دەیگوت:" بێت و ئەمجارەیان بە قورئانم سوێند بۆ نەخۆن کە دەمکەنە پەرلەمانتار، کارم بەسەر کاریانەوە نابێ.

ماهیر بەگ وەك ئەوەی زەینی ئەوی خوێندبێتەوە، بە دەنگێکی دڵنیاکەرەوەوە گوتی:

"ئەگەر راستیت دەوێ سلێمان سامی، ئێمە چاکەی تۆمان نەدایەوە براله. ئەگەر ئەتۆمان بە نوێنەرایەتیی چوکووراوا ناردبایەتە پەرلەمان، هەم میللەت و هەم خۆشمان سوودمان لەو تواناییانەی تۆ وەردەگرت. ناهەقیمان لێ کردی براله، ناهەقی. هەر کێشە و بەڵایەك بەربینگمان پێ دەگرێ... گفتت دەدەمێ، بەڵێنی مەردانە، هەم خۆم و هەم خەڵکی ئەو شارۆچکەیە و هەم دەروێش بەگی برام کە لە براش لێم نزیکترە، لە هەڵبژاردنەکەی داهاتوودا هەرچۆنێك بێ، دەتنێرینە پەرلەمان."

"سوپاستان دەکەم، سوپاستان دەکەم، خوا راوەستاوتان بکا."

"هەر زەمانەتێکیشت بوێ بەە ناوی شارۆچکە و دەروێش بەگ و خۆشم، دەتدەمێ."

سلێمان سامی لە حاڵێکدا چاوەکانی زیت زیت دەردرەوشانەوە، گوتی:" ئەمن هیچ زەمانەتێکم ناوێ ماهیر بەگ. هەر ئەوەندە ببەنە لای دەروێش بەگ و ئەو بە زمانی خۆی بڵێ بەڵێن دەدەم لە هەڵبژاردنی داهاتوودا دەتنێرمە پەرلەمان، هەر ئەوەندە و زەمانەتی دیکەی پێویست نییە."

"هەر ئێستا. قاوەکەت بخۆوە با بڕۆین. با قسەی خۆمان بکەین و سواری ترۆمبێل بین و بچینە لای دەروێش بەگ. زۆرم باسی تۆ بۆی کردووە و دڵنیام بە دیتنت کەیفخۆش دەبێ."

سلێمان سەرێکی لەقاند و گوتی:"زۆرم بەزەیی پێی دا دێ. زۆرم بەزەیی بە مستەفای ئاق یۆللیدا دێ. دەڵێن کوڕەکەی دار و نەداری لێ فرۆشتووە و لەگەڵ رۆستەم ئۆغڵی خەریکن کارخانەیەك دادەمەزرێنن. گوژمەیەکی زۆریشیان وەرگرتووە. ئەو حەمە عەلییە زۆر وریا و زیت دەرچوو. بزووتێکە کێچ ناڵ دەکات. وەك دەڵێن مزەفەری کوڕی دەروێش بەگیش یەکێکە لە شەریکەکانی ئەو کارخانەیە. هیچ دەزانی حەمەعەلی و مزەفەر کلکیان تێك ئاڵاندووە؟ لە ئەدەنە هەموو رۆژێ، بۆ هەرجێیەك چووبایەن قۆڵیان لە قۆڵی یەك دەکرد."

ماهیر بەگ گوتی:"دەزانم، مزەفەر کوڕێکی ژیرە، زۆر..."

"دەڵێن مزەفەر چووەتە لای حەمە عەلی و لەگەڵی ئاشت بووەتەوە. خۆ دەروێش بەگ ببیستێتەوە، مزەفەر دەکوژێ."

ماهیر بەگ گوتی:"هیچ نابێ. من پێم وایە دەروێش بەگ ئاگای لە هەموو شتێکە. ئەو چاو و گوێی لە هەموو شوێنێکن. ئاگای لێیە بەڵام بەڕووی خۆی ناهێنێ. لەوانەیە لە دڵی خۆیدا زۆریشی پێ خۆش بێ."

"پیاو بەزەیی بە مستەفا بەگدا دێتەوە. بە تاقی تەنێیە لەو کۆشکە کاولەیدا... حەمە عەلییش هەموو شتێکی لێ کردووەتە پارە، تەنانەت ئەو نوێن و بانەی لەسەریشی دەنووست."

ماهیر بەگ لە بن ددانە لەچیڕەوەبردووەکانییەوە گوتی:"خەریکە سزای کردەوەکانی وەردەگرێتەوە. مستەفا پیاوێکی لاسارە."

سلێمان سامی گوتی:"داماوە نەخۆش و لێقەوماو لە سەر قەرەوێڵەیەکی فەنەریی لەگرێژەنەچوو کەوتووە و لە رۆژ هەتا ئێوارە دەست لە دەمانچەکەی وەردەدات. خودا ئەوە بەسەر هیچ گیانلەبەرێك نەهێنێ. ژنەکەی، منداڵەکانی و خزم و کەسی هەموو پشتیان تێ کردووە. زۆر ناخۆشە، ناخۆش. دڵتەزێنە.... جا ئەوجار کوڕەکەشی چووە لەگەڵ گەورەترین دوژمنی بووەتە برادەر... هەی بە قوربانت بم مەرگ... بەقوربان.. داماوە..."

ماهیر لە پڕێکا و بەبێ هیچ پێشەکییەك چووە سەر باسێکی نوێ:"سەیر کە، ئێستا داواکەی من لە تۆ، تەنیا داوای خۆم نییە. ئەوە داوای شارۆچکەکە و چوکووراوا و ئەو میللەتە رەسەنەیە..."

"تکا دەکەم، تکا دەکەم، من تکا دەکەم، جەنابت ئەمر بفەرموو، ئەمر بفەرموو. هەر تۆ ئیشارەتێك بکە، با من بە سەر سەران بێم..."

"عەرزت بکەم کە تەپۆ ئیتر کردوویەتە قیامەت. نۆبەتێ هەموو وڵاتی داگرتووە. ئیتر هەر لە منداڵی بەر مەمکانەوە بگرە هەتا پیری نەوەد ساڵانە کەست دەست ناکەوێ نۆبەتێی نەگرتبێ. هەرچی جڕ و جانەوەر و مشکە و ماری چوکووراوایە، بەڵێ مشك و مار و ماسییەکانی نێو ئاوەکەی و هەرچی گیانلەبەرێتی و تەنانەت خۆڵ و خاك و دار و بەردەکەی و گژ و گیایەکەشی هەموو لە نۆبەتێدا خەریکن هەڵدەچۆقن و دەسووتێن و هەڵدەلەرزن. بنیادەمی چوکووراوا خەریکن یاخی دەبن. هەر دوێنێ بوو کە هێزەکانی ئاسایش راپەڕینی ئەو گوندییانەی سەرکوت کرد، کە هەر لەبەر ئەوە لە دەوڵەت راپەڕیبوون چونکە پێش بە نۆبەتێ ناگرێ. حکوومەتەکەمان و هەر وەها نەقیبە بەڕێزەکەشمان و دادوەرە گشتییەکەمان..."

سلێمان سامی گوتی:"باسی دادوەری گشتی هەر مەکە، چونکە ئەو بەرتیلخۆرێکی هیچ و پووچە. ئەمن گوویەکم خوارد، بەڵام ئیتر بەهیچ شێوەیەك لەبەرچاوی هیچ کەسێ ئەو هەڵناکێشم."

ماهیر کە دیار بوو تەریق ببووەوە گوتی:"دەی باشە، باشە. باسی مەکە."

"قسەم لەسەر نەقیب نییە. ئەو تورکمانێکە قسەی لەسەر نییە..."

"من بە نەقیبم گوتووە چۆن لەو دەڕوانم. نەقیبە ئازاکەشمان، قایمەقامەکەمان، مودیرناحییەکەمان ئەگەر نەبوایەن... بەڵام نا، نا، باسی مودیر ناحییە هەر مەکە، ئەویش کابرایەکی بێ کەڵکە."

"باسی ئەویش ناکەم."

"ئەگەر ئەوانە نەبوایەن، خاکی چوکووراوا لەخوێندا دەخووسا و بە سەدان گوندی و سەرباز دەکوژران. خەڵك خۆ لەبەر نۆبەتێ راناگرن و رادەپەڕن."

"بەڵێ، رادەپەڕن. رانەپەڕن چ بکەن. چارەیەکی دیکەیان نییە."

"مەستان ناوێك، کە چاردە منداڵ و نەوەکەی لە نۆبەتێیان مردبوون، لە حاڵێکدا خۆشی لە ئاگری لەز و تادا نەیدەتوانی بجووڵێ، برادەری لەمێژینەی خۆی، پاڵەوانەکەی شەڕی نیشتیمانیمان، سلێمان بەگی ساواشکان (دلێر و بوێر)، ئەسلان سۆوی پەنجەی، کە چووبوو سەری لێ بدات، کوشت و بەیداخی رەشی تازیەباری لە لوولەی تفەنگەکەی بەستووە و لە چوکووراوادا دەگەڕێ. لە چاوترووکانێکدا سێ هەزار نۆبەتێگرتوو لە دەوری کۆ بوونەتەوە و دژی حکوومەت راپەڕیون و دەستیان کردووە بە شکاندن و کاولکردن و سووتاندن. دیسان خودا نەقیبە ئازیزەکەمان بپارێزێ، کە گەنجێکی خوێن پاکی کۆمارییە و دەسبەجێ ئاگادار دەبێت و بە پشتیوانیی ئەو هێزانەی لە ئەدەنە و کوزان و شارەکانی دەوروبەرەوە نێردرابوون، راپەڕینەکەیانی سەرکوت کردبوو و خەڵکێکی زۆری لە راپەڕیوەکان هێناوە و لە پۆخلۆدەڕەی باشووری شارۆچکە بەندی کردوون. ئەگەر زۆنگاوەکە هەر لەم هاوینەدا وشك نەکرێ، گوندییەکان ناچار دەبن دیسان سەر هەڵدەنەوە. گوندی دەڵێن لەبری ئەوەی نۆبەتێ بمانکوژێ، باشترە لە شەڕی گەڵ ئەو حکوومەتەدا بکوژرێین، کە ئەو نۆبەتێیە بنەبڕ ناکا."

سلێمان سامی بە چاوێکی گومانایییەوە لێی روانی و پرسیی:"یانی لە ئەنکەرە هەموان بڕوا بەوە دەکەن."

ماهیر بەگیش بە دڵنیاییەوە وەڵامی دایەوە:"بەڵێ بڕوا دەکەن. بۆچی بڕوا نەکەن؟ ئەتۆ پێت وایە ئەوان ئاگایان لێرە هەیە؟ ئەگەر خەڵکێکی ئاسایی بن، بڕوا ناکەن، دەبێ لێکۆڵینەوە بکەن... چما شێت بووی؟ چما ئەنکارا چوکووراوای بۆ گرنگە؟... ئەتۆ خەمی ئەوەت نەبێ. بڕوا دەکەن و وا گوێ لە قسەت دەگرن وەك ئەوەی ڕووداوێکی هەژێنەریان بۆ بگێڕیتەوە. جا چونکە بە بیستنی وشەی ڕاپەڕین زراویان دەچێ، دەسبەجێ کەلوپەل و ئامرازەکانیان دەنێرنەوە بۆ ئێرە. دوای ئەویش چاوت بە عوسمان ڕەمزی دەکەوێ، دیارە بە دزییەوە. هەموو کارەکان جێبەجێ دەبن. ئەمن بۆ ڕێکخستنی کارەکانی ئەوە، کە دەتنێرمە ئەنکەرە، ئەگینا عوسمان ڕەمزی خۆی دەتوانێ نەك جارێك، بیست جاران، کامیۆن و شۆفلێ و شتەکان بنێرێ و بیانگێڕێتەوە. دەتەوێ کێت لەگەڵ بێ؟"

"هەر ئەوانی جاران. وەفدێکی ئەنکەرەیی باشمان هەیە. ئەمجارەیان با مورتەزا قاراداغلییش بێ. ناتوانم دەست لە حاجی قۆرت بۆغا بەردەم."

"ئێستا دوای ئەوەی چوویتە لای دەروێش بەگ و گەڕایەوە، بە ناوی هەر کام لە دووکاندارەکانی شارۆچکەوە تەلەگرافێك بۆ وەزارەت دەکەی... ئەو تەلەگرافانە، ئەو عەلی ئەفەنییە عەریزەنووسە پیسە بۆلشەڤیکە بێ دینە نووسیبوونی. ئەوە پێنج ساڵە کەڵك لەوانە وەردەگرین. هانێ، ئەوە سی و چوار نموونەی تەلەگرافی دڵتەزێن، کە هەر کەس بیانخوێنێتەوە، کزەی لە جەرکی دێ. بە ناوی هەرکام لە کوێخای گوندەکانیشەوە تەلەگرافێك بنێرە. ها ئەوەش تەلەگرافی گوندییەکان، دوای جێبەجێکردن و ناردنی تەلەگرافەکان خۆتان ئامادە دەکەن بۆ ئەنکەرە، باشە؟"

"باش."

ئەوەی گوت و دوای ئەوەی قومێك قاوەی خواردەوە، لێی زیاد کرد:"دەی ئێستا دەچین بۆ لای دەروێش بەگ."

"بەڵێ، دەچین. هەستە با بڕۆین. دەروێش بەگ بە دیتنت خۆشحاڵ دەبێ."

ماسیگرە پەمەییەکان لە تەمومژەکەوە دەهاتنە دەرێ و وردە وردە سپیاییەکەیان، دەکردە ڕەنگێکی مەیلەو یاسەمەنی. بە تێکچڕژان و جووڵەیانەوە دیار بوو ئەوە پۆلە باڵندەیەکن. تاوێك دواتر تاو هەڵات و پەردەی مژەکە لادرا و هەتاو هەموو وڵاتی داگرت. باڵندەکان لە سپیایەتییەکەدا جارێ نوقم دەبوون و جارێ دەردەکەوتنەوە. لە بن مژەکەدا لەوانەبوو کۆمەڵێك

پیاوی چەقۆ بەدەستی تاوانکەر یان خەمسارد، لەوانەبوو هیوادار یان زراوچووش لە چاوەڕوانیدا بوون.

ماهیر قاباقچی ئۆغلی، لە لایەکەوە خۆشحاڵ بوو. بیری لە خۆشحالّییەکەی دەکردەوە و لەوەیکە پێویستیشە خۆشحاڵ بێت و هەر وا بەدەم بیرکردنەوەوە، جار بە جار بێهیوا و رەش بین دەبوو. ئاخۆ ئەو شتانەی دەیکردن، بایی ئەو سووکایەتییانە دەبوون کە پێی کرابوون؟ ئەی دوایی؟ لە ئەنکەرە بە سووکایەتییەوە کارەکەیان لیّ ئەستاندبۆوە. تازە لە ئەنکەرەوە هاتبوو. هێشتا کارمەندێکی سادەی تازە گەیشتوو بوو. هەر کەسە و چاوەڕوانییەکی لێی هەبوو. هەڵەیەکی بچووك، کارەکەیان لیّ وەرگرتەوە. بیّ کەس و بیّ دەر بوو. گەڕایەوە شارۆچکە. لای هەموو کەس باسی دەرکرانەکەی نەکرد. کەسیش نەیدەزانی. بیانوویەکی هێنایەوە کە بۆچی ئەو وازی لەو پلە گرنگەی هێناوە و هەمووانیش بڕوایان کردبوو. دەرکرانەکەی، چەند ساڵان هەر وەك برینێك لە سەر دڵی بوو و خوێنی لیّ دەچۆڕا. ئێستاش پێم وایە یەکەم جاری بوو هەستی بە دڵخۆشی دەکرد. پەشیمانی لە ناخیدا جێی خۆی دابوو بە شادی. سەرەڕای شادمانییەکەی، شتێکی وەك مۆتەکە خەریك بوو هەناوی دەتەنی. خۆی لەو کابووسە دەدزییەوە. شین و گریان و کڕووزانەوەی ئەو گوندییانەی لە شیوەکە پەستێورابوون، لە گوێیدا دەزرینگایەوە. هەستێکی نامۆی بەرامبەریان هەبوو کە زیاتر لە بەزەیی دەچوو. رێك لەو کاتەدا کابرایەکی کفن پۆش وردە وردە لە مژەکە دەهاتە دەریّ و لە بەر چاوی قوت دەبۆوە... زۆنگاوەکە کەوتە کوڵین و دەنگەکان، دەنگی بەریەککەوتنی باڵ دەبیستران و ئەو دیوی مژەکە وردە وردە رەنگی یاسەمەنی بەخۆوە گرت. لە حاڵێکدا ماسیگرەکان یەك لە دوای یەك بەرەو سەرووی مژەکە هەڵدەکشان... ئەو دنیایە، ئەو دنیا لەجۆش و خرۆشە، ئەو تەکووزییە تایبەتەی ئەو ئاوە، ئەو خاکەی رەشەبای لیّ هەڵدەستیّ، بە درێژایی چەندین ساڵان خولّقابوو، هەر هەمووی تێدا دەچوو و جێی خۆی دەدا بە شتێکی دیکە، بە دنیایەکی دیکە، بە رەنگێکی دیکە و بە عەتر و بۆنێکی دیکە و حاڵ و هەوا و تام و چێژێکی دیکە.

باڵندەکان، مێشەنگوین و گژ و گیاکان دەگۆڕدران و بنیادەمەکان دەگۆڕدران و ئەسب و تاژییەکان دەگۆڕدران... و حەژمەت و داخی مەستان کە "ئێستا بەرەو هەنارستان، هەنارستانەکە" لە زۆنگاوەکەدا نوقم بوو، لەوانەیە تەنیا دار هەنارێکی پڕ لە گوڵووك بوو بیّ. حەژمەت و داخەکەی لەوانەیە پارچە زەوییەکی بە رێژەو بوو بیّ کە خۆی کاری تێدا بکا. ئەوەی بەشوێنییەوە بوو، دۆزیبوویەوە، ئەویشیان لە چنگی... دێنا، دنیایەك بوو کە تێیدا ماسییە

گەورەكان، ماسییە بچووكەكانیان قووت دەدا. بابی زەحمەتەكەی نییە. ڕاست وایە. هەر كەسە و چاڵ بۆ یەكێكی دی هەڵدەكەنێ. ئیتر زۆری نەدەبرد كامیۆن و شۆفڵ و ئامرازی زەبەلاحی دیكە، لە بن مژەكەوە دەردەكەوتن و ئەو گورگە سامناكانە پەلاماری خاكەكەیان دەدا و هەر لەو شوێنەوە كە گوندییەكان هەڵیاندەكەند، دەست دەكات بە لێدانی كاناڵ. ئەندازیارەكان دوای حەفتەیەك بە كەلوپەلی جۆراوجۆرەوە، لەو پەڕی سەرسووڕماندا گەیشتبوونە ئەو ئاكامەی كە باشترین جێگە بۆ لێدانی خەرەند و كاناڵ هەر ئەو شوێنەیە كە گوندییەكان هەڵیاندەكەند.

بە هەژاوییەوە چاوەڕوان بوون. مژەكە هێور هێور هەڵدەستا. كامیۆن و شۆفڵە نارنجییەكان لەگەڵ باڵندەكانی بەیانی، وردە وردە لە مژەكەوە دەردەكەوتن. سێبەرەكانیان كەوتبووە سەر ڕەوەزەكانی ئاناوەرزا و لەنەكاو گرم و هۆڕ و هاڕەیان تێكەڵی دەنگی لەخەوهەستانی زۆنگاوەكە بوو. دەنگی دەهۆڵ و زوڕناش هاوكات لەگەڵیان بەرز بۆوە. وەرزێرەكان كە لە مەودایەكی دوورترەوە ڕاوەستابوون، بەبێ ئەوەی لە جێی خۆیان ببزوێن، چەپڵەیان لێ دا. چەقۆ زلەكان هەڵكێشران و بە ملی گا و مەڕەكانیاندا هێنان. بێڵ و دەمە بریقەدار و كاركردووەكانی شۆفڵەكان، كە دەتگوت شان و باهۆ و زاری جڕ و جانەوەری زەبەلاحن، بەو شوێنانەدا هێنران كە خوێنەكانی لێ ڕژابوو. ئەوەندەی یەك و دوو خاكەكە هەڵدڕا و لە نێوەڕاستەوە كرایە دوو بەش.

گوڵەشلێرە و پەمۆ و هەنجیر....

ماهیر بەگ ئەوەندە بە خەفەتەوە سەیری ئاقچاسازی كرد، ئەو شوێنەی مژەكەی لێ هەڵدەستا، دەتگوت ئیتر چاوی پێی ناكەوێتەوە و بە شادییەكی كپ كراوەوە چاوی گێڕا و لە شوێنێك دەگەڕا كە بیناكەی خۆی لەوێ دروست بكات. وەرزێرەكان لەوبەرەوە، لە دوورەوە ڕاوەستابوون و سەیری ئەو ئامێر وئامراز و كامیۆن و شۆفڵە زەبەلاحانەیان دەكرد كە زەوییەكەیان هەڵدەكەند و خاكە تازەكەیان لەسەر یەك كەڵەكە دەكرد و هەر جار نە جارێك لەسەرخۆ و وەك بەدەست خۆیان نەبێ، دەستیان لێك دەدا.

ماهیر بەگ پیرۆزبایی لە یەك بە یەكی ئەو كرێكارانە كرد كە لەسەر سەیارەكان بوون. پیاوماقووڵانی شارۆچكەكە، نەقیب و مودیر ناحییە و داوەرەكانیش، پیرۆزباییان لە وەستا و ئەندازیارەكان كرد. ئەوجار ئەو حەشیمەتەی لە شارۆچكەكەوە هاتبوون، سواری كامیۆن و پاس و عارەبانەكان بوون و بە قریوە و قوولەقوول كەوتنە ڕێ.

ماهیر بەگ بە شۆفێرەکەی گوت:"هەڵی بکە کوڕم. دەبێ ئەو هەواڵە خۆشە دەسبەجێ بگەیەنینە دەروێش بەگی برامان."

هەر بیری لەوە دەکردەوە کە کوێ بکاتە کێڵگەی نموونەی خۆی و ئیتر چێژی ئەو نقورچکەی لەبیر چووبۆوە کە لە دەروێش بەگی دابوو.

## ٧٥

یەکەم ئەزموونی ماهیر بەگ واتە مەسەلەکەی نوورخان، بە کەیفی ئەو باش کەوتبۆوە. ساڵ و مانگ تێدەپەڕین و ئەو بەپێی نزیکبوونەوەی لە دەروێش بەگ و ئاگاداربوونی لە کون و کاژێرەکانی ژیانی، هەر جارە و شتێکی لێ هەڵدەگرت و لە نهێنییەکی دەگەیشت. لە دنیادا ئەوەندەی چێژی لەو سەرکەوتنەی وەرگرتبوو، هەرگیز هێندەی چێژ نە لە ژن وەرگرتبوو، نە لە مەشرووب و نە لە خەیاڵ پڵاوی شەوانەی بۆ ئەو خاکە بەپیت و بەرێژەوە.

بەڵام نەدەبوو ئەو کارە بە نیوەچڵی بهێڵێتەوە. دەبوو بیگەیەنێتە کۆتایی. هەرچیی لەگەڵ ئەو دەروێشەی بکا، هەر کەمە. بە پێخاوسی و کفنپۆشی... کە وەبیری دەهاتەوە، شێت دەبوو. ئەوجار، خۆ ئەو سووکایەتییە هێشتا نەبڕابۆوە... وێنەی بە کفنی سپی و شمشێری دەستییەوە لە رۆژنامەکاندا چاپ کرابوو. خۆی نەیدیبوو و نەشیویستبوو بیبینێ، بەڵام ئەوانەی دیتبوویان، دەیانگێڕایەوە. دەیانگوت ئەو وێنەیە لە رۆژنامە گەورەکانی دنیاشدا چاپ و بڵاو ببۆوە. راتیب کوللی ئۆغڵی سوێند و قورئانی دەخوارد، کە وێنە کفنپۆشەکەی ئەوی لە رۆژنامەکانی بەریتانیا و ئەمریکادا دیتووە. ئەو بە پێکەنینەوە دەیگوت:"ماهیر لە خرۆشۆف و کێنێدییش بەناوبانگتر بووە."

جا قسەکەی خۆی ئاوا پشتڕاست دەکردەوە:"هەر بەراستی بەناوبانگتر بووە."

"ئەوەی چوو، هەر چوو. یاخوا لەوەش بەناوبانگتر بێ."

"کوڕە ئاوا بڕوا، دەروێش ئۆغوززادە لەوەش بەناوبانگتری دەکات..."

دەچووە هەر کوێ و تووشی هەر کەس دەبوو و رێی دەکەوتە هەر ئەنجوومەنێکەوە، دڵەخورپەی ئەوەی بوو نەکا گاڵتەی پێ بکەن و پێی پێبکەنن و بەخۆیدا بشکێننەوە. هەموو شتێك، ئەو حاڵەتی کفنپۆشی و ئەو رۆژە ناخۆشەی وەبیر دێناوە.

ماهیر بەگ، پتر لە هەموو شتێك لەوە تۆقیبوو، سووکایەتیی پێ بکرێ. چیی پێی کرابوو، کردبووی بۆ ئەوەی پێش بەوە بگرێ. هەتا ئێستاش هەموو هەوڵەکانی بۆ ئەوە بوون، کە لەبەر چاوی خەڵکەکە سووك و چرووك نەبێ. ئاخرییەکەشی ئەوەی لێی تۆقیبوو، بەسەری هاتبوو، جا چۆن بەسەرهاتنێکیش. ئیتر تەمەنێك نەك هەر لە شارۆچکە، بەڵکو لە هەموو تورکیادا گاڵتەیان پێ دەکرد و دەیانشکاندەوە. هەر لە ئێستاوە کەوتبووە سەر زار و زمانان... دەبوو تۆڵەی خۆی لەو دەروێش بەگە بکاتەوە کە ئەوی لە پیاوەتی خستبوو. دیسان، دیسانیش تۆڵەی دەکردەوە.

جاری واش بوو، بیری دەکردەوە، کە کوڕە ئەوە گاڵتەیەکی قۆڕ بوو و رابرد و چوو. زۆر کەسان ئەو رۆژەیان هەر لەبیریش نەمابوو و زۆر کەسیش هەر بەراستی بڕوایان کردبوو کە ئەو رێك لەبەر خاتری رێزگرتن لە نەریتی ئۆغوز ئاوا بە لەخۆبوردووییەوە هاتبووە مەیدان. هەر بۆیە تەنانەت بە رێز و حورمەتیشەوە لێیان دەڕوانی. بەڵام ئەو شتانە نەك ئۆخژنیان پێ نەدەبەخشی و جاری وابوو لە تاریکاییەکی تۆڵەکەرەوانەدا نوقم دەبوو و تف و تووکی لە خۆی دەکرد کە بۆچی ئەو سووکایەتییەی قەبووڵ کردبوو. کێڵگە و مەزرا گەورەکەی، گەورەترین و مۆدێرنترین مەزرای دنیا دەبێت. تەنانەت ئەو شادی و خۆشییە بێ سنوورەی لەبیرکردنەوە لەو مەزرایەدا لەدڵی دەگەڕا، هێشتا پێشی پەشیمانی و خۆخواردنەوەکەی نەدەگرت.

ماوەیەك بوو، مەسەلەکەی نوورخن، تەواو کەیفخۆشی دەکرد. ئەو رووداوە رووناکایی بە هەموو ئەو بیرە رەش و تاریکانە دەبەخشی و تیشکی بەختەوەریی دەڕژاندە ناخییەوە. رۆژێکیان، لەوانەشە دوای مەرگی دەروێش بەگ، جا خەڵکی شارۆچکەکە دەیانزانی هەموو ئەو شتانەی بەسەر دەروێش بەگ دەهاتن، لە بن سەری ئەودا بووە. دەبێ ئەو جۆرە کەتنانە، هەتا ئەو رۆژەی وەزگ بەدەروێش بەگ دەدەن، بەوپەڕی وردبینییەوە درێژەیان هەبێ. نەخشەکە تەواو لە مێشکیدا بیچمی دەگرت. نەخشەیەکی گەورە کە دەروێش بەگی دەفەوتاند. نا، نا، ئیتر دەرباز نابێ. هەرچۆنێك بێ، تۆڵەی ئەو قەڵافەتەی خۆی لێ دەکاتەوە کە دەتگوت مردووە و لە گۆڕ دەرپەڕیوە، ئەگینا ژیان لەو سووکایەتییەدا بە کەڵکی چی دێ.

لە یەکێك دەگەڕا کە بتوانێ نەخشەکەی بۆ جێبەجێ بکا. خزم و کەس و دۆست و برادەر و ئەوی خەڵکی شارۆچکەکە کە توانای جێبەجێکردنی ئەو کارەی هەبێ، یەك بە یەکیانی دەهێنایە پێش چاوی. ئاخرییەکەی دوای گەلێك هێنان و بردن و سەنگ و سووککردن، حاجی شێتەی هەڵبژارد. کەس لە حاجیە شێتە باشتر نەبوو بۆ جێبەجێکردنی ئەو شتەی لە مێشکی

ئەودا بوو. حاجی یەکێکی چوارشانەی قومارباز و لات و ڕێگر بوو و بۆ ئەوەی دەبوو پشتی پێ بسپێری.

شەوێکیان، خزمێکی گەنجی حاجیی نارده شوێنی و له ژوورەکەی خۆیدا لەگەڵی دانیشت.

"کارێکم پێتە حاجی. کارێکی ئێجگار گرنگ. بەر لەوەی باسی ئەسڵی شتەکەت بۆ بکەم، جارێ پێشنیارێکم هەیە، ئەویش ئەوەیکه دەبێ له پێشدا بەڵێن بدەی و بە قورئان و بە گیانی عەولادەکانت و بە خوای گەورە سوێند بخۆی، کە ئەو نهێنییەی بە نامووس و گەورەیی تۆ دەسپێردرێ، جا قەبووڵی بکەی، یان نەیکەی، بە هیچ کەسێك و بە هیچ گیانلەبەرێکی نەڵێی؟"

حاجی زەردەیەکی هاتێ، دەستی لەسەر قورئان دانا و گوتی:"سوێند دەخۆم."

لەو کاتەوە هاتبوو، چاوی له سەر ئەو چەپکە دراوانه هەڵنەدەگرت کە لەسەر مێزەکەی دانابوو. کە ماهیر و چەپکە پارە و قورئانی سەر مێزەکەی دی، دووقرانییەکەی کەوت و لەو حاڵەدا بەبێ ئەوەی ژماردبێتی، زانیی دراوەکە چەندەیە. تۆزێك ڕاوەستا و گوتی:"هەتا ئێستا، هەر کەس نهێنییەکی پێ سپاردبێتم، داوای سوێندخواردنی لێ نەکردووم. بەڵام باشە، سوێند دەخۆم، بە خودا و بە قورئان و بە گیانی ژن و منداڵەکانم... ئەو نهێنییەی ماهیر بەگ پێمی دەڵێ، گڵێش لێمی نابیستێ."

ماهیر بەگ له خۆشییان دەستەکانی گرت و دەستی بەسەردا هێنان و بە تەتەپەتەوە گوتی:"مە مە ما ا الّت ئا ئا ئاوەدان بێ. عەمرت درێژ بێ. لێت دڵنیام. مەسەلەکە ئیجگار گرنگە. گاڵتەی پێ ناکرێ... مەسەلەی مەرگ و ژیانە. کارێکی سووك و سانا نییە..."

ماهیر بەگ ماوەیەك بە کەفوکوڵ و خۆشی و شادییەوە قسەی کرد. حاجی ئیتر گوێی له هیچ نەدەبوو و بەبێ ئۆقرەییەوە چاوەڕێ بوو بزانێ ئەو نهێنییە گەورەیە چییە. زۆر کونجکۆڵ ببوو. ئاخری ماهیر بەگ چاوی بە چەپکە دراوەکەی سەر مێزەکە کەوت و بەپەلە هەڵیگرت و دایە دەست حاجی. حاجییش بەبێ ئەوەی سەیری بکا له گیرفانی خست.

"کارەکە هەم ئەستەم و دژوارە و هەم زۆریش سووك و سادە. بە تایبەتی کە ئەتۆ وەك ئاوخواردنەوە جێبەجێی دەکەی، ئیزن بدە، پەلە مەکە کاکە گیان، سۆمای چاوەکانم، تۆزێك سەبرت هەبێ، تۆزێك سەبرت بێ. ئەوی لەسەر سەبران بێ له سەر خێرانە. پەلە مەکە، حاجی بەگ، براله گیان. ئەمن ئەوەم لێت دەوێ ئەو سەرەم بە نامووس و شەرەفی تۆ دەسپێرم، کە ئەتۆش له هەنتەشی خودای گەورەدا سوێندت خوارد، بە ناوی خودا و بە گیانی ژن و

منداڵەکانت کە تەنانەت گڵێش لێتی نەبیستیٚ. ئەمن ئیمانم پێتە. ئەتۆ کابرایەکی بەغیرەت و جوامێری. ئینسانی و پیاوێکیشی لە تۆرەمەی ئۆغوز. ئێستا کاکی خۆم، گیانی من، ئەگەر رۆژێك دیتت ئەوە دەروێش بەگ لەگەڵ مودیر ناحییە، شارەوان و بەرپرسە حیزبییەکان و جا ئەگەر پەرلەمانتاریشی لیٚ بیٚ، هەر حەجی دوو حەج دەبیٚ، لە باغی شارەوانی دانیشتووە، جا ئەوە بۆ خۆت دەزانی چۆن هەلەکەی دەقۆزییەوە، هەر ئەوەندەیە باغەکە خەڵوەت نەبیٚ... رێك لەو کاتەدا لە دەروێش بەگ دەچییە پێشیٚ و بە دەنگی بەرز پێی دەڵێی:"کورە هۆی گەووادی شاخدار، کە شاخێکت لە مەغریبە و یەك لە مەشریق، شاخی شارۆچکەکەش لە سایەی سەری تۆوە خەریکن ئاسمان دەسوون، ئەتۆ شەرم ناکەی سەرت هەڵدێنی و لە نێو پیاوان دادەنیشی؟" هەر ئەوەندە. هەر ئەوەندەی پیٚ دەڵێی. ئەوەی پیٚ دەڵێی و لە لاقانت وەردێنیت و تێی دەتەقێنی. ئەگینا، هیچ دوور نییە دەمانچەت لیٚ بکێشیٚ و دەسبەجیٚ بتکوژیٚ. دوای ئەوەش لانیکەم شەش مانگ بەشوێنتدا دەگەڕیٚ بتکوژیٚ... هەر بۆیە دەبیٚ برۆی و لە شوێنێکی دوورەدەست خۆت بشاریتەوە. خەرج و موخاریجی خێزانەکەشت بۆ ماوەی شەش مانگ لە ئەستۆی خۆم. دوای ئەوەش وەرە دووهەزار و پێنج سەد لیرە لەمن وەرگرە. باشە؟ ئەگەر گیراشی و دەروێش وەقسەی هێنای..."

حاجی وەك برێشکەی سەر سێلٚ هەڵبەزییەوە:"سەیرکە، ئەوە هیچ نییە. چما ئەتۆ ناتەویٚ ئەو قسانەی لە پێش چاوی خەڵکێکی زۆر پیٚ بڵێم؟ ئەمن دەیلێم، ئەتۆ کارت بە کاری من نەبیٚ. خەمی نهێنی پاراستنەکەشمت نەبیٚ. دڵنیا بە، سەرم بچیٚ، نهێنیم لە زمان دەرناپەڕیٚ. بەڵام ئەتۆش ئێستا هەزاری دیکەشم بدەیە، جا لێم گەڕیٚ."

ماهیر بەگ دراوێکی هەزار لیرەیی دیکەشی دەرهێنا. حاجی دراوەکەی وەرگرت و کەوتە ریٚ. کە دەیەویست لە ماڵیٚ وەدەرکەویٚ، گوتی:"هەر بژی بەگ، ماڵت ئاوەدان بیٚ. قەول بیٚ وای ئابرِوو بەرم هەر نەتوانیٚ لە جێی خۆی ببزویٚ، چ بگا بەوەی تەقەم لیٚ بکا. ئەتۆ خەمت نەبیٚ. ئەمن نە تۆم دیتووە و نە قسەشم لەگەڵ کردووی."

ئەوەی گوت و بەپەلە لە پلیکانەکان چووە خواریٚ. لە خۆشییان وەخت بوو بفڕیٚ. لە دەرەوە، یەکەم شتێکی کردی، ئەوە بوو پارە و دراوەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و لە بەر تیشکی چراکە بژاردی. رێك ئەوەندە بوو کە مەزەندەی کردبوو. هەزار و پێنج سەد لیرە. هەزار لیرەشی وەرگرتبوو. دەیکردە دوو هەزار و پێنج سەد لیرە. دووهەزار و پێنج سەدی دیکەشی دواتر وەردەگرت، ئەوە پێنج هەزار. کوێر چیت لە خوا دەویٚ؟ دوو چاوی ساغ. برِوا ناکریٚ.... ئەو

هەمووە پارەیە هەر بۆ دوو قسەی قۆڕ. شەش مانگ خەرجیماڵەوەش... سامان... کوڕە ئەو دەوڵەمەندانەش زۆر کەرن. لەو قسانەش خراپتری نەك بە دەروێش بەگ، هەر بەرەوڕوو بە سەرۆکوەزیران دەگوت. دەشیتوانی بیڵێ. بۆ ئەو پێنج هەزار لیرەیە ئامادە بوو هەتا مردن، هەموو رۆژێ لە بەر دەرگای ماڵی دەروێش بەگ بیکاتە هەڵلا و هەنگەمە.

لە خۆشییان شاگەشکە ببوو. ئەو پارەیە، خەمی خەرجی ساڵێکی ماڵەوەی لەکۆڵ کردبۆوە. ئەویش چۆن! دوای ئەوە لەوەودوا هەموو بنەماڵەکەی وەك شازادە دەژیان. ئەو ژنە داواوەی لەو رۆژەوە مێردی پێ کردبوو، بۆ جارێکیش ئاوێکی خۆشی لە گەرووی نەچووبووە خوارێ. دوو هەزارییەکەی دەدایە ژنەکەی و بە پێنج سەدەکەشی... تەزووی شەهوەت لە هەموو گیانی گەڕا... ئەدی، بە پێنج سەدەکەشی...

ژنەکەی بە سەرسووڕمانەوە پرسیی:"ئەو هەمووە پارەیەت لە کوێ هێناوە؟"

"کەرێکم بۆ هەڵکەوتووە ژنەکە. کەرێکی قەڵەو. ئەتۆ کاڵەك خۆری یان بێستانڕن؟ تەنانەت خۆشم بکوژم، دینارێکی ئەو پارەیەم نادەیتێ. پارەکە لە شوێنێك بشارەوە تەنانەت سمایل گوێبڕاویش نەیدۆزێتەوە. تێگەیشتی؟ تەنانەت خۆشم بکوژم... ئەو پارەیە هیی تۆ و منداڵەکانە."

جا دراوە پێنج سەد لیرەییەکەی نیشان دا و گوتی:

"ئەوەش بۆ..."

ژنە چەندی لەبەری پاڕایەوە، حاجی نەیگوت ئەو پێنج سەدەی بۆ چییە. هەر دووکیان بەبێ ئۆقرەیی چاوەڕێی ئەوە بوون رۆژ بێتەوە حاجی لە خۆشییان نەیدەزانی چ بکا. تەواو سەرخۆش بوو. شاگەشکە ببوو. هەتا نیوەی شەوێ دەستبازییان کرد. دوای ئەوەی ژنەکەی خەوت، دیسان ئەو خەوی لێ نەکەوت و تا بەیانی ئەمدیوئەودیوی کرد. هەم دارتاشی شارۆچکە بوو، هەم جامچی. هەم سپیکاری بوو هەم شێوەکار و تەنەکەسازەکەی. لە وایەرمەنییەوە بگرە تا چاککەرەوەی کەلوپەلی کارەبایی هەتا مسگەری، هەموو شتێکی پێ دەکرێ. لە ژیانیدا هەمیشەی خودا بۆ دینارێك ئامانەخانمی دەگوت. ورد و درشتی خەڵکی شاری خۆشیان دەویست. حاجی کردییە هەرا:"هەستە بابە. چما دەتەوێ تا نوێژی نیوەڕۆیە بنووی؟ بنیادەم ئەوەندە دەنوێ؟..."

وەستا مەمەد چاوی هەڵێنا کە بزانێ چ باسە و سەیری کرد ئەوە حاجیە شێتەیە.

"هەستە وەستا، کارێکم بۆ دیتوویەوە. ماڵەکەم وا بۆ جوان دەکەی وەك پەردووی زاوا. ها ئەوەش پارە."

ئەوەندە بەجۆش و خرۆش و شاد و بە کەیف بوو، وەستا نەیتوانێ هەڵنەستێ. لە جێی خۆی هەستا و گوتی:"بیسمیللا، ئەوە شێت بووی؟ وەڵڵاهی تۆ شێتی، ئەگینا پێیان نەدەگوتی حاجییە شێتە."

حاجییە شێتە پێدەکەنی، بێ ئۆقرە بوو:

"زوو بە دەی وەستا، خۆ مەگنخێنە.گ

پێکەوە هاتنە بازاڕ. هەموو دووکانەکان داخرابوون. حاجی دڵی توند بوو و دەستی پێ کرد: "باشە دووکان و بازاڕ دەبێ تا ئێستا نەکرابێتەوە خۆڵتان بەسەر؟ ئەوە تاو دەکەوێ. ئێوە هەر بۆ ئەوەی دەبن لە برسان بمرن. سەگی تەمبەڵ، تەوەزەلینە..."

لە بەر دەم دووکانەکان پیاسەی دەکرد و چیی جنێوی پیس بوو پێی دەدان.

لەو جەنگەیەدا دەرگای قاوەخانەکە کرایەوە. هەرچۆنێك بێ، لەگەڵ وەستا چوون ئەوێ و چاوەڕێ بوون دووکانەکان بکرێنەوە. حاجی جار نە جارێك هەڵدەستا و سەرێکی بازاڕی دەدا بۆ ئەوەی بزانێ دووکان کراونەتەوە یان نا و بە جنێوی پیس پیسەوە دەگەڕایەوە و لە جێیەکەی خۆی دادەنیشتەوە. لە بێ ئۆقرەیی نەیدەتوانی لە سەر جێی خۆی دانیشێ و ئەوەندە هەژابوو، هەر بۆڵەبۆڵی بوو.

"دەروازەکە شین دەکەی. شینێکی مەیلەو کەسك... نێو ماڵەکە سپی دەکەی. سپی سپیی وەك شیر. هەموو پەنجەرەکانیش شووشەیان تێ دەخەی."

لەو کاتەدا دەڕابەی دووکانەکان هەڵدرانەوە. حاجی دەستی وەستای گرت و هەردووکیان لە قاوەخانەکە وەدەرکەوتن.

حاجی هەندێ رەنگی رۆنی و شووشە و وردە و پردەی دیکەی کڕی کە بە کاری نۆژەنکردنەوەی دەهاتن و هەمووی بە کۆڵی دادابوو و بە خێرایی بەرەو ماڵەوە دەڕۆیشت و وەستاش بە شوێنیدا بۆ ئەوەی بەجێ نەمێنێ، بە هانکە هانك بە دووایدا رای دەکرد.

ئەو ماڵەکاولە کە دیوارەکانی هەموو زگیان دابوو، دوای سێ رۆژان نوێ نوێ بۆوە. حاجی لەو سێ رۆژەدا وەستای بەجێ نەهێشت و هەر لەبەر دەستیدا کاری کرد. کە خانووەکە نوێ کرایەوە، لە پێشەوەی راوەستا و چەند سەعاتان بە سەرسووڕمانەوە سەیری کرد. جار نەجارێ لە ژنەکەی دەپرسی:"چۆنە؟ چۆنە ژنەکە؟ وەك چەپکە گوڵە، وا نییە؟"

چاوی لە خۆشییان هەر بریسکەیان دەهات.

ئەو جار ژنەکەی هەڵگرت و بردییە بازاڕ و قوماشی بۆ ژن و منداڵەکانی کڕی.

"لێرەوە راست دەچیتە لای نەباهەت خاتوونی بەرگدروو و پێی دەڵێی بۆ ئەمڕۆ دوانیوەڕۆ و چەندیشی ویست پارەی بدەیە. بیدەیە با تا ئەمڕۆ دوانیوەڕۆ کۆك و پۆشتەتان بکاتەوە."

هەموو دەر و جیران کارەبایان هەبوو، هەر ماڵەکەی ئەو نەیبوو. وایەرمەنی هێنا و هەتا دوانیوەڕۆی ئەو رۆژە نێو ماڵ و دەرەوەی بە گلۆپان رازاندەوە و هەموو گلۆپەکانیشی بە شەو و رۆژ داییساند. ماڵەکەی حاجی ئەو شەوە لە کۆشکی شای پەرییان دەچوو.

ئەوی لە کۆڵانێ بوو هەموو سەریان سووڕ مابوو. ماوەیەکە ئەو حاجییە بۆ وای لێ هاتووە؟ دەستی لە مەشرووبخواردنەوە هەڵگرتبوو و لەگەڵ ژنەکەی بەشەڕ نەدەهات و ... منداڵەکانی وەك چەپکە گوڵ کۆك و پۆشتە ببوونەوە و ماڵەکەشی خاوێن و جوان...

ئیتر ماڵەکەی حاجی هەموو شەوێ چراخان بوو... حاجییش لە خۆشییان شاگەشکە ببوو و هەر ویرەویری دەهات...

هیچ لەو قسەیە نەدەترسا، کە دەبوو بە دەروێش بەگی بڵێ. بیری لە دژکردەوەی دەروێش بەگیش نەدەکردەوە. ئەگەر زۆرییان لێ کردبایە، دەیگوت، بەگ، ئەگەر ئەوەندە پارەیەیان بەتۆش دابایە، دەچووی قسەی لەوە پیسترت بە سەرۆکوەزیریش دەگوت. جا خۆ ئەوە ناخۆش نییە...

ئەوانە رۆژ هەتا شەوێ بە یەکتریان دەگوت "گەواد"، دەی چ دەبوو؟ بەڵام ئەگەر کارەکە هەر وا سووك و ساناش بوایە، ماهیر ئاوا سوێندی دەدا؟ ئەوەندەشی پارە دەدایە؟ بەوەندە پارەیە، بە یەك لەسەر چواری ئەو پارەیەش پیاو دەکوژن.

کوڕە ئەوەندەی لە بنی کوولەکە مەدە. دەی باشە، لێ ی ی ی گەڕێ... لە یەکەم دەرفەتدا کارەکەی دەکرد. خۆ دەروێش بەگیش بە قسەیەك گەواد نابێ، تا دەستی خۆی بەخوێنی ئەو سوور بکا. دوایی دەچێ و داوای لێبوردنی لێ دەدا. چما کچەکەی لە ئەستەمبووڵ گانی نەدەدا و لە باڕ و دیسکۆ نەیانگرتبوو؟ یان خوشکەکەی؟

# ٧٦

لەبیری چووبۆوە. زۆر لەو رۆژە تێپەڕیبوو کە ماهیر بەگی دیتبوو. لەوەش خراپتر، ماهیر ئەو هەمووە پارەیەی دابوویێ، تەنانەت بۆ جارێکیش چییە لێی نەپرسیبۆوە... هەتا ئەم ساتە، کە دەروێش بەگی دەدیت، بۆ چرکەیەکیش چییە ئەوەی بە زەینیدا نەهاتبوو. تف. زۆر خراپ کەوتبوو. ئێستا ماهیر بیر لە چی دەکاتەوە؟ ئێستا دەڵێ، حاجی دووهەزار و پێنج سەد لیرەی لێ خواردین و گونیشی پێشان نەداین. ئیتر کاتی هاتووە. دەبێ هەڵەکە بەدەرفەت بزانی و بیقۆزییەوە. ئەو قەرزبارە و قەرزیش ئەگەر زۆر بچووکیش بێ، هەر دەبێ بدرێتەوە. ئەوە هاتووەتە بەردەستت. دەروێش بەگ دانیشتووە و مودیرناحییە و بەرپرسی حزبی و نەقیببیش لە دەوری. باشە نوێنەری پەرلەمانیش لەوێیە. دوو کەسی تەرپۆشی قەڵەویشیان لە تەنیشتە.

کە چووە نێو باغەکە، هەر وا زەردەی دەهاتێ. راستەوڕێ بەرەو مێزەکەی دەروێش بەگ چوو. بەدفەڕییەك لە زەردە و بزەیەکەیدا شارابۆوە. دەروێش هەر دیتی کە بە بزەبز بۆلای دێ، ئەویش زەردەیەکی هاتێ و گوتی:"دەی وەرە بزانم حاجییە شێتە. چۆنی چۆن؟ کارێکت بە من بوو؟"

هەر دەمودەست پەشیمان بووەوە، کە بۆچی لەبەر چاوی ئەو هەمووە خەڵکە پێی گوتووە شێتە و لەسەر قسەکەی رۆیشت:"ئەمن ئەتۆم خۆش..."

حاجی مۆڵەتی پێ نەدا و زۆر چاوقایمانە قسەکەی پێ بڕی:"کارم بە پیاوی وەك تۆ بێ؟ بە بێغیرەتێکی وەك تۆ، کە شاخێکی لە مەغریبە و یەك لە مەشریق؟..."

دەروێش بەگ وەك فیشەکێکیان لێ دابێ، تاسا و لەجێی خۆی وشك بوو.

"جا ئێستاش بەو شاخانەوە و لە نێو ئەو هەموو پیاوەش..."

تا دەروێش بەگ وەخۆ هاتەوە، حاجی تێی قووچاند. گەیشتبووە دەرەوەی باغەکە و نەڕاندی:"بەو شاخانەتەوە چۆن لە دەرگا دەچییە ژووری؟"

دەروێش بەگ دوای ڕەوینەوەی حەپەساوییەکەی، دەمانچەکەی کێشا، بەڵام ئیتر حاجی ون ببوو. تاوێك هەر نەیتوانی لە جێی خۆی ببزوێ. دەست و پێی وەك مێژۆکە دەلەرزی و نەیدەتوانی دەمانچەکەی بخاتەوە جێی خۆی. مودیر ناحییە لێی وەرگرت و بۆی خستەوە بەر پشتوێنەکەی. ئەوانەی لەگەڵی بوون دڵیان دەدایەوە:"کوڕە چ نییە بەگ. شێتە شێت. خۆت تێك مەدە بەگ. قسەی ئەو بنیادەمانە بادی هەوایە."

"دەتگوت داوایەکی لێت هەبوو، جا چ شتێك تووڕەی کرد، خوا بزانێ..."

"بنیادەمی شێت خۆ بەر و پشتی بۆ کەس نییە."

ئەوجار یەکدەنگ گوتیان:"نییەتی."

دەروێش بەگ گوێی لەو قسانە نەبوو. سپی سپی هەڵگەڕابوو و مێشکی پڕ بوو لە هاڕە و گرمە. لەو نێوەدا هەر خۆی بە تاوانبار دەزانی. باشە چما پیاوی ژیر دەم لە دەمی شێتێك دەنێ و پێی دەڵێ شێتە؟ چ پێویست بوو؟ ئیتر کار لە کاریێ ترازابوو. بەڵام ئیتر ئەوە نابێ لەم دنیایەدا بژیێ. جا ئێستا ئەو قسەیە لە شار و گوندەکانی دەوروبەردا دەکەوتە سەر زار و زمانان. تا ئێستا کەس نەیوێرابوو سووکایەتییەکی ئاوای پێ بکا. دەروێش بەگ ئەو پەڵەی شوورەییەی بە خوێن دەشوشتەوە.

دەروێش بەگ کە ماوەیەك دواتر وەخۆ هاتبۆوە، زەردەیەکی تاڵی هاتێ و هەستا و بەرەو ماڵەوە کەوتە ڕێ. چەقۆت لێ دابایە خوێنی نەدەگەڕا. هەر لەدوورەوە لەقەڵافەتییەوە دیاربوو گرژ و تووڕەیە. ئاگری لە چاوی دەباری. کە گەیشتەوە کۆشکەکەی، داوای ئەسپەکەی کرد و سوار بوو. وەك شێتان ئەسپەکەی لینگ دەدا. ئەسپی تاو دەدا و هەر فکر و خەیاڵی دێنا و دەبرد و قەڵەمبازی دەدا. باشە بڵێی یەکێك لە دوژمنەکانی، بۆ وێنە مستەفا ئاق یۆللی پارەی دابێتێ کە بێ و لەبەر چاوی خەڵك حەیای بەرێ؟ بەڵام نا، نا، هیچ کەس، هیچ بنیادەمێك ئەوەندە خۆی سووك ناکا، تەنانەت ماهیریش. مستەفا ئاغا، کە ئیتر پیاوێکی ماقووڵ و جوامێر بوو. مەحاڵ بوو نامەردییەکی ئاوا بکا. ئەو دوژمن بوو، بەڵام دوژمنێکی بەشەرەف و جێگەی ڕێز.

هەرهاتەوە سەر ئەوەی، کە حاجی، بۆیەی وا پێ کرد، چونکە ئەو لەبەر چاوی ئەو خەڵکە پێی گوتبوو شێتە و ئەویش بۆ ئەوەی خۆی بنوێنێ و بڵێ، ها خەڵکینە سەیر بکەن ئەمن چ بەڵایەکم بەسەر ساری ئۆغڵی هێنا، بە من دەڵێن حاجییە شێتە و... ئەوە بۆیە ئەو بێ ئەدەبییەی کرد. یانی وات لێ هاتووە سەر بنێیتە سەری من؟ خۆ بنوێنی؟ باشە، باشە، وا بکە، سەگە شێتە؟ خۆت دەبینییەوە، ئەویش بەخوێنی خۆت.

وەك با لە پردەكە پەڕییەوە. پێشتر بە دەگمەن ئاوا خێرا لەو پردە پەڕیبۆوە. ئەو پردە کە پێیاندەگوت داوی مەرگ، لایەکی بەردەڵێن بوو و لایەکی دیکەشی مێشەڵان. ئەمجارە بە ڕێیەکەدا لینگی دا. ئەو بایەی لەبەر خێرایی ئەسپەکەی هەستابوو، وەك قەمچی وەسەروچاوی دەکەوت. چەندی ئەسپەکەی خێراتر غاری دەدا، بایەکی بەتەوژمتر دەبوو. بایەکی فێنك کە لە ڕووبەڕوویەوە دەهات، دەیهێنایەوە سەرخۆ. بەخۆیدا شکابۆوە. لەو ساڵانەی دواییدا بۆ وای بەسەردەهات؟ هەموو شتەکان، هەموو کارەکان پێچەوانە ببوونەوە. ئەگەر بیست ساڵچ لەمەوبەر پیاوێك پەیدا بوایە و وێرابای ئاوا بێ ئەدەبیی بەرامبەر بکا ـ کە هەرگیز پەیدا نەدەبووـ هەر خەڵکەکە دەسبەجێ دەیانکوشت. هەر بەراستی ئەو خەڵکە بۆ وایان لێ هاتبوو. دنیا گۆڕابوو... بەڵام خۆ لە تۆرەمەی ئاغا و بەگەکان هەر یەك کەس مابۆوە، کە ئەویش نە سووکایەتیی بەکەس دەکرد و نە بەکەمی دەزانین و تەنانەت وەك بنیادەمیش لیی دەڕوانین، ئەو کەسەش دەروێشی ساری ئۆغلی بوو. جاری جاران، وەك ئێستا خەڵکی بەهەند نەدەگرت و ئەوەندەی پشتی نەدەگرتن. ئەی بۆ وابوو؟ باشە چ هەڵەیەکی کردبوو؟ جاری جاران ئەگەر بەکەسێکی وەك حاجیی گوتبایە شێتی گەواد، کابرا خەنی دەبوو و وەیدەزانی بووەتە شا. ئەی باشە چ شتێك گۆڕابوو، نەمابوو، لەناو چووبوو؟ هەر شتێکی لەم دنیایە کەم ببایەتەوە، ئەو هەستی پێ دەکرد. بەڵام بۆچی، بۆچی ئەوەی بۆ روون نەدەبۆوە؟ ئەو پرسیارەی بە مێشکییەوە نووسابوو، هەر ئەوە بوو. ئاخۆ زەمان، مستەفا ئاق یۆللیشی گۆڕیبوو؟ بڵێی وازی لە کوشتنی هێنابێت و ئەو ئاگای لێ نەبێ؟ تەنانەت گومانێکی لەو جۆرەش شێتی دەکرد و هەموو ژیانی لێ پووچەڵ و بێ مانا دەکردەوە. هەر بیری دەکردەوە و دەیهێنا و دەیبر و بۆی نەدەچۆوە سەر یەك. دەیگوت:"نا، نا."

لەو دنیایەدا هەموو شتێك دەبێ، بەڵام ئەوەیان مەحاڵ بوو. ئەو پیاوەی ئەو دەیناسی، مستەفا ئاغا، نەیدەتوانی لە خوێنی براکەی، برا گەنجەکەی خۆش بێ. ئاخۆ کوژرانی برایی بەدەستی دایکی بەتۆڵە لەقەڵەم دابوو و ئیتر وازی لە تۆڵەئەستاندنەوە هێنابوو؟

باشە ئەی خۆیشی، هەر دەروێشەکەی جاری جاران بوو؟ هیچ نەگۆڕابوو؟ تاوێك بیری کردەوە کە ئەو نەریتی ئۆغوزەی هەر بۆ سووککردنی ماهیر هێنابووە گۆڕێ. بەڵام، بە "نا بابە نا بابە" ئەو بیرەی لە مێشکی دەرهاویشت. پێداگربوونەکەی لەسەر ئەو نەریتانە هەر لەبەر یەك شت بوو و ئەویش ڕێز و حورمەتی باب و باپیران و ئۆغوزی مەزن و نەریتەکان و خوێنی

رەسەن. هەموو شتێك گەندەڵ دەبوو و ئەو لەم دنیای فانییەدا، سەربەرز و بەشەرەف دەمایەوە و وەك مرۆڤ دەمرد.

با فێنكەكە وردە وردە دەیهێنایەوە سەرخۆی و ئەسپەكە دەكەوتە نەرمەغار و كەمتر رایدەتلەكاند.

باشە نەدەكرا واز لە كوشتنی ئەو حاجییە بێنیٚ، هەر لەبەر شێتبوونەكەی؟ تەزوویەك لە هەموو گیانی گەڕا. نا، ناكریٚ. ئەوە واتە گەندەڵ بوون، واتە بەر لە مردن، كەوتنە نێو گۆڕ. هەتا پتر دەهاتەوە سەرخۆ، پتر لە حاجی قەڵس دەبوو و هەموو گیانی دەیزیڕاند و ژانی دەكرد.

وەك شێتان ئەسپەكەی تاو دەدا. ئەسپە شارەزاكە، لە ریٚ لای دابوو و بەسەر دەوەنەكاندا بازی دەدا و وەك مار بە نێو قامیشەڵانەكەدا دەڕۆیشت و جار بە جار خێراتر دەبۆوە.

نەیزانی ئەسپەكەی كەنگیٚ لەبەر دەرگا راوەستا و كەنگیٚ دابەزیبوو و كەنگیٚ لە پلیكانەكان چووبووە سەریٚ و كەی خۆی خستبووە سەر مۆبلەكە. بریندار بوو. شەرەفی، دڵی، پیاوەتییەكەی رووشابوو. ئەگەرچی بە دەستی شێتێك، بەڵام بڵێی و نەڵێی زامار ببوو. دەكرا بڵێی ئەوە خەڵك بوو ئەو سووكایەتییەیان پیٚ كردبوو. كەوابوو وای لیٚ هاتبوو سووكایەتیی پیٚ بكریٚ. دەی ئەگەر وابیٚ حاجی بڵیٚ چی؟"

جاریٚ خۆی و جاریٚ رۆژگاری بەتاوانبار دەزانی و دوای ئەوە دیسان هەموو خەتاكەی دەخستەوە ئەستۆی حاجی. دەی باشە، ئەو كە وێرابووی سووكایەتی بەو بكا، دەبیٚ ئازایەتی و بوێریی ئەوەشی هەبیٚ بكوژرێت.

حاجی دەكوژریٚ... بەڵام كوژرانەكەی ئەو چ دەگۆڕیٚ؟ هیچ...

ئاخێكی قووڵی هەڵكێشا و گوتی:"لێی سوار بوون و لێیاندا و رۆیشتن."

هەستی كرد دەنگەكەی چەند جاران بەر دیوارەكە كەوت و دەنگی دایەوە...

## ٧٧

له نەکاو تێگەیشت کە پیاوێکی وای نییە لێیڕاببینێ، حاجیی بۆ بکوژێ. بیری کردەوە و یەك بە یەك پیاوەکانی خۆی لە گوندی و لەسەردەمی منداڵییەکەیاندا هێنایەوە بەرچاو و لە ڕاستیشدا کەسێکی وای نەدۆزییەوە لێی ڕاببینێ. سەری زۆر لەوە سووڕ ما. چ قەومابوو؟ ماڵی ساری ئۆغڵی چیی بەسەرهاتبوو؟ جگە لە سەرسەریبوونی منداڵەکان چ گۆڕانێکی دیکە بە ماڵەکەی ساری ئۆغڵیدا هاتبوو، هیچ؟ هەموو شتێك، دابونەریتەکان لەجێی خۆیان بوون. گوندەکە هەر گوندەکەی جاران و کۆشکەکە هەر کۆشکەکەی جاری جاران. بنیادەمەکان لەسەر یەك هەر بنیادەمەکانی پێشوو، هەموو شتێك وەك ساڵی ساڵان. ئەو بنیادەمانەی کە دەبوو گیان و دڵیان لەسەر کۆشکەکە بێ، هەر وەك جاری جاران پەروەردە دەکران. ئەی چ شتێك گۆڕدرابوو؟

جاری جاران، ئەگەر شتێکیشی لێ قەومابایە، کە هەر نەشدەقەوما، لانیکەم دە پیاوی لەبەر دەست بوون کە بە سەرلەقاندنێك، ئەو کابرایەی دەبوو بکوژرێت، وەك ئاوخواردنەوە بۆیان دەکوشت. بەڵام ئێستا سەری خستبووە نێوان دەستەکانی و خەیاڵ هەڵیگرتبوو. باشە لەو گوندەدا پیاوێکی باوەڕپێکراوی تێدا نەبوو؟ ئاخۆ ئەو وەسواسی ببوو و گۆڕابوو؟

ماوەیەك هەر لە مێشکیدا هێنای و بردی. یەك بە یەك، ئەو خووخدانەی تازە لێی دەرکەوتبوون، پیاوەتییەکەی، ترسنۆکییەکەی، لەکیسچوون و نەچوون، بڕوای بە مرۆڤەکان، ڕووداوەکانی یەك بە یەك هێنایەوە پێش چاوی و لێکی دانەوە و ئاخرییەکەی ساغ بۆوە لەسەر ئەوەی خۆی گۆڕدراوە.

کە تووشی کێشەیەك دەبوو، لەگەڵ ژنەکەی باسی دەکرد. ئەم جارەش باسی کرد و بە گاڵتەوە لێی پرسی:"خاتوون، لەو ماوەیەدا، لەو ساڵانەی دواییدا هیچ گۆڕانێکی بەرچاو لەمندا بەدی هاتووە؟"

خاتوون لەو کاتانەدا بە زیرەکیی خۆی تێدەگەیشت کە ئەو کێشەیەك، گرفتێکی ئالۆزی هەیە. چەندی واشی دەنواند کە هەر بۆ گاڵتە ئەو پرسیارەی کردووە، خاتوون هەر دەیزانی لە کاتە هەستیار و ناسکەکاندا، پرسی پێ دەکا، هەر بۆیە پرسیارەکەی بەهەند وەردەگرت.

بەپێکەنینەوە وەڵامی دایەوە:"وەڵڵا جا بیرم لەوەی نەکردووەتەوە. هەر بەراستی چوونەسەری تەمەن، نەیگۆڕیوین؟ تۆزێك دەرفەتم بدەیە..."

دەسبەجێ چووە ژوورەکەی و نوێژی دابەست. دوای نوێژکردن، لەسەر بەرماڵەکەی دانیشت و چووە فکرەوە. خاتوون لەوەتەی هەبوو لەسەر بەرماڵ و بە بیرکردنەوەکانی دوای نوێژەکەی، یارمەتیی مێردەکەی دابوو.

دەروێش بەگیش ئەوەی دەزانی، پیاوێکی ترسنۆك چەندی پارەشی بدەیتێ، پیاوی هەر پێ ناکوژرێ. دەروێش بەگ ئەوەشی باش دەزانی کە هیچ کەس بڕوا بەو بنیادەمە ناکات کە خۆی بڕوای بەهیچ کەس نەماوە. ئەوانە باوەڕی تاقیکراوە بوون.

ڕۆژێکیان گیزیك دۆران، بەناوبانگترین یاخییەکەی تۆرووس هاتبووە لای و گوتبووی:"بەگ، من بڕوام بە هیچ کام لە هاوڕێکانی خۆم نەماوە. ئیتر ناتوانم پشت بە هیچ کامیان ببەستم، بۆیە لە دڵم چەقیوە ئیتر بەرگە ناگرم و تێداچووم. دوو مانگم بیر لێ کردەوە. پێم وایە هاوڕێیەکانم بە هەزار پێوەر تاقی کردەوە. ئەوان ئاگایان لە مەحموودی بێ زەواد نییە. هەر لە خۆڕاییش ئاوا ناتوانم پشتیان پێ ببەستمەوە و متمانەیان پێ بکەم. ئەوەندە دەزانم ئیتر متمانەم پێیان نەماوە. پێم وایە ئەگەر دەستەیەکی دیکەش پێك بێنم، لەوانیش دەسڵەمێمەوە. تێ ماوم و نازانم چ بکەم. ئەگەر را بکەم و خۆم حەشار بدەم، دڵم دەڵێ، ئاخرییەکەی ڕۆژێك هەر بەدەستەوەم دەدەن. ئەگەر لە چیاکانیش بمێنمەوە، هاوڕێیەکانم دەمکوژن. هەموو دەرگاکانم لەسەر داخراون و هیچیشم پێ ناکرێ. ئیتر من تەواو تێدا چووم."

داماوی و بێدەسەڵاتی و هیوابڕاوییەکەی بنیادەمێکی وەك گیزیك دۆران ئەوی تەواو راچڵەکاندبوو. بەو حاڵەشەوە هەوڵی دەدا باوەڕ بە قسەکانی نەکا. بەڵام ڕێك پازدە ڕۆژ دواتر ئەو گیزیك دۆرانە بە فێڵ و دەهۆ کوژرا. چەندی چەند ساڵان بیری لەو ڕووداوە سامناکە کردبۆوە. ئاخۆ گیزیك دۆران، سۆسەی ئەو سووکایەتییەی کردبوو، کە دەیانویست پێی بکەن، بۆیە متمانەی بە بنیادەمەکان نەمابوو؟ یان پاش ئەوەی متمانەی بە کەس نەما، ئیتر ئینسانەکان سووکایەتییان پێ کردبوو؟ لەمێژ ساڵ بوو لە بن بارستایی ڕووداوەکەی گیزیك دۆراندا ورد دەبوو، بەڵام بۆی نەدەچۆوە سەر یەك.

چاوەکانی خاتوون کە چەند سەعات دواتر هاتە لای، پێدەکەنین. خاتوون گوتی:"ناوەڵڵا بەگ، هیچ نەگۆڕاوی. ئەو دنیایە وردە وردە گەندەڵ دەبێ. خەتای تۆ نییە. حکوومەتیش گەندەڵ بووە. ئەو حکوومەتەی جاری جاران لەگەڵ ئێمە بوو و قسەی لە قسەماندا نەدەکردەوە، ئێستا بەخوێنی سەرمان تینووە. چما بیرت چووەتەوە کە ماوەیەك لەوەپێش دەیانویست شاربەدەرمان بکەن؟ خودا چاکە بۆ سەرۆکە گەورەکە بکات فریامان کەوت..."

ئەو قسانە دڵی دەروێش بەگیان خۆش کرد، بەڵام هەر نەیتوانی ئاگرەکەی ناخی دامرکێنێتەوە. شتێك هەبوو کە وای لێکردبوو متمانەی بە ئینسانەکان نەمێنێ، بەڵام باشە ئەو شتە چ بوو؟

ئێستا مەحموود زیندوو بوایە، یانی متمانەی بەویش نەدەکرد؟ گیان و ماڵ و ژن و کچەکەی و هەموو شتێکی، بەبێ تۆزەگومانێکیش، بەو دەسپارد. ئەو خەیاڵە ناخی پڕکرد لە شادی. بیرکردنەوە لە مەحموود، یوسفی هێنایەوە پێش چاوی. یۆسف؟ یۆسف؟ یۆسف، تایبەتمەندییەکان، دوایین ئیمتیحانەکەی، هەر هەمووی لە چاوتروکانێکدا هاتنەوە پێش چاوی. یۆسف زۆر گەنج بوو. هێشتا منداڵ بوو... لە نەکاو بەبێ ئەوەی هەست بکات پێویستی بەبیرکردنەوەی زیاترە، بەسەر دوودڵییەکەیدا زاڵ بوو. گیان و ماڵ و ناموس و هەموو شتێکی دەتوانی بەبێ تۆزە گومانێك بە یۆسف بسپێرێ.

وەك منداڵێکی شاد و زیت و گورج رای کردە لای ژنەکەی و دەستی کرد بە قسەکردن و دەتگوت قسەکانی وێڕای پێکەنینەکەی لە گیانییەوە هەڵدەقولێن:"راست دەکەی. تۆ راست دەکەی. تۆ زۆر ژیری. دەی دیارە، نەوەی کوچك عەلی ئۆغڵیی... ئەتۆ راست دەکەی. ئەمن هیچ نەگۆڕاوم. متمانەم بە ئینسانەکانیش هەر ماوە. بەڵێ ئەو دنیایە گۆڕاوە."

کەوابوو با حاجیش هەر یۆسف بیکوژێ. لەو کاتەدا هەستی کرد گیانی پڕ پڕ بووە لە خۆشی و شادی. دوایی، دوایی... ئەو چیی دەکرد؟ باشە ئەو شێت بوو؟ چما بەڵێنی بەخۆی نەدابوو یۆسف لەو شتانە نەگلێنێ و نەهێڵێ موویەك لەسەری کەم بێتەوە؟ ئەی ئەگەر بەڵایەکی بەسەر هات و گیرا؟ شتی وا مەحاڵ بوو. ئەویش وەك باوکی... کزەی لە جەرگی هات... وەك بابی لە بن ئەشکەنجەدا...

یوسف لەبەردەستی خۆیدا وا پەروەردەکرابوو، کە ناخ و رواڵەت و قسە و کردەی وەك یەك بوو. هەموو منداڵەکانی لایەك و یۆسف لایەکەی دیکە. هەر بەراستییش یۆسفی لە منداڵەکانی خۆی خۆشتر دەویست. ئاخۆ دەکرێ نەفەرێك، منداڵی کەسێکی دیکەی لەخۆی

خۆشتر بویٚ؟ ئەستەمە بڕوا بکەی. لە حالێکدا مندالەکانی خۆی زەق و زیندوو بوون... لە دلی خۆیدا گوتی:"باشە، باشە، باوابیٚ..."

ئاگای لە یۆسف دەبیٚ. گولٚ بەهارەکەی، لە پێناوی بەڕەللایەکی وەك حاجییە شێتەدا لیٚ هەلٚناوەڕێنیٚ. دەبیٚ ڕێگەیەکی دیکە بۆ کوشتنی حاجی بدۆزێتەوە، بەلاٚم کیٚ؟

ئەو پیاوانەی تۆزە متمانەیەکی پێیان بوو، یەك بە یەکی هەلٚسەنگاندن. خسلەت و خولق و خووی هەمووانی دەزانی. ئەو بنیادەمانە، دەرگایەکی کراوە و لایەکی رزیو و لەرزۆك و نقوستانییەکی شاراوەیان هەبوو، بۆیە بەهیچ جۆریٚ بۆوەی نەدەبوون لەسەریان حیساب بکا. هەستی دەکرد ئەو پیاوانە، جوان دیارە گۆڕاون. بەلاٚم ئەو گۆڕانە چ بوو؟ بۆی ساغ نەدەبۆوە؟ بڕیاری دا یەك یەك بیاندوێنیٚ تەنانەت ئەگەر چەند حەفتەش بخایەنیٚ، بەشکم هۆکارەکەی ئەو گۆڕانە بدۆزێتەوە. لەو نێوەدا شتێك رزیبوو کە بۆنەکەی بۆ دەهات. ئەو بۆنە لەکوێوە و لە رەگی کام لکی رزیوەوە دەهات؟

بەبیٚ ئەوەی بهێلیٚ پیاوەکان هەست پیٚ بکەن، چەند سەعاتان سوعبەتی لەگەلٚ دەکردن. بۆ ساتێك لایەکی جیٚ متمانە و بەهێز و خۆڕاگری دەدۆزییەوە و تەواو دلی پێی خۆش دەبوو و تاوێك دواتر لە چاو و دەست و لاق و قسەکانیاندا جۆرێك زۆلێتی و سەگ و سەگبابێتیی هەست پیٚ دەکرد و دنیا شادەکەی تۆزێك لەوە پێشی لیٚ کاول دەکرد.

شێت دەبوو. باشە ئەو بنیادەمانە لەوەتەی هەن، هەر وا بوون؟ کیٚ چووزانیٚ، لەوانەشە... لەوانەیە متمانەی بیٚ سنووری ئەو بە بنیادەم، نەیهێشتبیٚ ئەو بۆگەنەی بۆ بێت کە لە لایەکی رزیوی مرڤەوە دەهات. دەی باشە، کەوابوو چۆنی تێگەیشتبایە؟ کارەکە دیسان ئالۆزتر دەبوو. کە خۆشی تاوانبار دەکرد و دیسان گریٚکوێرەکەی نەدەکرایەوە، سواری ئەسپەکەی دەبوو و وەك هەورەتریشقە بە دەشتە کاکی بە کاکییەکەدا تاوی دەدا و سینگی دەدایە بەر ئەو با بەتەوژمەی کە لە ئاکامی لینگدانی ئەسپەکەیەوە دەهات و تۆزێك وەخۆ دەهاتەوە.

# ٧٨

لەبەری گران بوو. شێت و پێتێکی بەرەڵڵا لە شارۆچکەدا، لەبەرچاوی کاربەدەستە پایەبەرزەکانی حکوومەت و خەڵکی کووچە و بازاڕێ سووکایەتیت پێ بکا و ئەتۆش، ساری ئۆغڵیی گەورە، ئەو دەروێشەی وەك ئاسمان دەگرمێنێ و هیچیشت لەدەست نەیە و ئەو کابرا هیچ و پووچەش قیت و قنج لە شارۆچکەکەدا بسووڕێتەوە و گاڵتەت پێ بکا.

تووك و نەفرەتی لەخۆی دەکرد. چما بەوەش دەڵێن پیاو؟ مایەی شەرم و شوورەیی رەچەڵەك و تۆرەمەی ساری ئۆغڵیی ناودار و مرۆڤایەتی بوو. گەیشتبووە ئەو تەمەنەش، کارێکی وای نەکردبوو، شتێك بخاتە سەر خەرمانی ناوبانگەکەی ساری ئۆغڵی. هەر بەو منداڵانەی بەخێوی کردبوون، دەکرا بزانی چ پیاوێکە. هەر کامەیان پەڵەیەکی شوورەیی بوون. باشە ئەوانە چ فەرقێکیان لەگەڵ منداڵی خەڵکی سووك و چرووك و خوارەوە هەبوو؟

جاری وابوو هەڵدەچوو و هەرای دەکرد:"ئەمن بەو دەستانەی خۆم ئەو سەگە شێتە دەخنکێنم."

ئەوجار نەخشەی سەیر و سەمەرەی بۆ کوشتنەکەی دادەڕشت. بە دزییەوە بیکوژێ یان بە رۆژی رووناك و لە نێوەندی بازاڕێ و بچێتە چیا؟ گەلێ جاران نەخشەکانی دێنا و دەبردن و لە ئاکامەکەی ورد دەبۆوە.

چوونە چیا... چوونەچیا و خڕکردنەوەی هەژارە بێ مڵك و زەوی و زارەکان لە دەوری خۆی و گرتنی ئەو ئاغا تازەپێگەیشتووە مشەخۆرە خوێنمژانە و دابەشکردنی زەوی و زارەکانیان بەسەر هەژار و نەدارەکاندا... دواییش دامەزراندنی حکوومەتی سێ ئۆغوزەکە، بەڵێ، دامەزراندنی و سەقامگیرکردنی بنەماکانی یەکسانی و بەرابەری... لەو نێوەدا، بەردەوام عەلیی عەریزەنووسی دەهاتەوە بەرچاوی کە چەند ساڵان زیندانیی کێشابوو و لە رێباز و قسەی خۆی پاشگەز نەببۆوە و بەردەوام پێداگربوو لەسەر یەکسانی و دادپەروەری. چ دەڵێن با

بیلێن. نیشتیمانفرۆش، سیخوڕی رووس و ... ئەو هەتیوە بەشەرەفە، یەك رەنگ و بوێر و ئازایە. لەو دنیا سووك و چرووکەدا جگە لە یوسف، تەنیا دەیتوانی متمانە بە عەلی عەریزەنووس بکا. دڵی بەو فکرە خۆش دەبوو. کەسێکی دیکە، مرۆڤێکی دیکەی لەو دنیایەدا دۆزیبۆوە. لە دڵی خۆیدا شەرمی لە عەلی دەکرد. ئەو کوڕە چەندی چەند ساڵان هەژار و نەدار و برسی و رەشوڕووت لە چاڵەڕەشدا مابۆوە، بەڵام سەری لەبەر کەس دانەنواندبوو و داوای دیناری لەکەس نەکردبوو. ئەو دەیتوانی لەو تەنگانەیە نەجاتی بدا. رۆژێکیان ویستبووی پارەی بۆ بنێرێ، بەڵام ئەو مزەفەرە بێ مایە و هیچ و پووچە پاشگەزی کردبۆوە. هەر بۆیە لە رووی هەڵنەدەهات چاو لە چاوی عەلی ئەفەنی بکا. هەر دەتگوت ئەو بەرپرسی برسێتی و ئازارکێشانی عەلی بووە لە زینداندا.

عەلی ئەفەنی لە حکوومەتی ئەو مرۆڤە یەکسانیخوازانەدا دەیتوانی رۆڵێکی کاریگەری هەبێ. لە یەکەم دەرفەتدا دەینارد لە دووی ئەو بنیادەمە ئازارچێشتوو و جوامێرە و دڵی دەداوە و رێزی دەگرت.

چیاکان... دوای ئەوەش گوللەبارانکردنی ئاغاکان و گەڕانەوەی بۆ دەشتایی... هەزاران و ملیۆنان وەرزێریش بە سەما و هەڵپەڕکێ وەك رزگاریدەری خۆیان پێشوازییان لەو و هاوڕێیەکانی دەکرد. ئەوجار زەوی و زارەکان و مڵکەکانی خۆیشی دابەش دەکرد... ئەوجار پشکووتنی زەردەخەنە لەسەر لێوی ئەو خەڵکە دڵپاکەی سەدان ساڵە زوڵمی لێ دەکرێ و ئازار دەچێژێ...

وەك بەهێزەوە سەریت بەدیواردا کێشابێ، لەو بیر و خەیاڵە دەبۆوە و بە تیزە بزەیەکەوە، بیری لە مەحاڵ بوونی وەدیهاتنی ئەو ئارەزووانە دەکرد لەو تەمەن و عومرەدا. خۆ ئەگەر گەنج بوایە... باشە، بەدەستهێنانی رەزامەندیی ئەو خەڵکە ئازارچێشتووەی لە ژیانیدا زەردەی لە لێو نەگەڕابوو، شتێکی کەم بوو؟ گەنجییەکەی بەخۆڕایی رۆیبوو و گەورەترین دەرفەتەکانی ژیانی لەدەست دابوو. ئەو ئاقا سووك و بێ رەچەڵەکانە کە، هیچ کەس نەیدەزانی لە کام جەهەندەمەوە هاتبوو، وەك سەگ سەیری خەڵکیان دەکرد و لە هیچ سووکایەتییەك دەرهەق بەو خەڵکە باشە نەدەپرینگانەوە و وەك زەروو خوێنیان دەمشتن. باشە ئەی بۆ رانەدەپەڕین؟ چونکە کەس نەبوو پێشیان بکەوێ... ئەگینا، ئەگینا...

ئاخ پیری، وەجاغت کوێرەوە بێ. ئاسانترین و گەورەترین هەل و دەرفەتی مێژووی لەکیس چوو. نەهێشتنی ئەو ئاغایانە و دابەشکردنی زەوییەکانیان بەسەر هەژاراندأ... لە بەرچاوی

خەڵك ببی بە ئەولیا و پیرو پیاوچاك و پێغەمبەر... عەلی ئەفەنی ئەو کارەی پێ نەدەکرا، چونکە ئەو کەسێکی بێ رەچەڵەك بوو، بەگزادەیەکی رەسەن نەبوو. خۆ ئەگەر یەك لە هەزاری ئەوەی بەدەست دەروێش بەگەوەیە بەو بوایە، جا دەتدیت چیی دەکرد. جا خەڵکیش چاکەی لەبیر ناچێتەوە. هەر کەس ئەو چاکەیەی لەگەڵ کردبایەن، هەتا دنیا دنیایە، گۆڕەکەیان بۆ دەکردە چراخان. کێ چووزانێ، لەوانەیە ئەو هەتیوە وردیلە چاو قیچەش، ئەو عەلییە بچکۆلەش، گەیشتبایە ئەو پلە وپایەیە. لەوانەبوو، ئەویشیان بە ئەشکەنجە کوشتبایە، بەڵام خۆ ئاخرییەکەی خەڵك گۆڕەکەیان گوڵباران دەکرد.

ساتێك تەواو ئێرەیی بە عەلی برد. ئەو پلەو پایەی مرۆڤایەتییەی ئەو کوڕیژگەیە بەدەستی هێنابوو، دەروێش بەگی ساری ئۆغڵی تەنانەت کە بەگزادەش بوو، نەدەگەیشتە ئەو ئاستە. بە رواڵەت هەرچی لەو شارۆچکەیەدا بوو دوژمنی قەستەسەری ئەو بوو. بە هەژار و دەوڵەمەندییەوە. بەڵام دەبوو چاوی درەوشاوە و روخساری گەش و بووژاوەی وەرزێر و جووتیاران لەبەر بەختەوەری ببینی، ئەو کاتەی ناویان دێنا و یادیان دەکردەوە. ئەو، کە هێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە سی ساڵان، ببووە جێی هیوای خەڵکەکە. ئەوانەی چاویان کوێربوو، ئاغا چەپەڵەکان، نەیاندەتوانی ئەو راستییە ببینن. چونکە ئەوان هیچ پەیوەندییەکیان لەگەڵ خەڵکدا نەبوو. هەر ئەو دەیزانی عەلی ئەفەنی لە نێو خەڵکدا چییە و کێیە؟

لەحاڵێکدا لەکیسچوونی دەرفەتە هەرە مەزنەکانی تەمەنی ئاگری لە هەناوی بەردەدا، لە خەوێکی قووڵ بەخەبەر دەهات.

رۆژێکیان، لەحاڵێکدا تووڕە و هیوابڕاو، ئەسپەکەی وەك با لینگ دەدا، تێگەیشت کە خۆی حاجیی پێ ناکوژرێ. ئەو خەیاڵە شێتی کرد. بە تووڕەییەوە ئەسپەکەی بەرەو زۆنگاوەکە تاو دا. ئەگەر توانیبای چەند هەنگاوێکی دیکەش ئەسپەکەی بئاژوێ، بەخۆی و ئەسپەکەیەوە لە زۆنگاوەکەدا نوقم دەبوون. کە گەڕایەوە ئاوەدانی، نە خۆی دەناسرایەوە نە ئەسپەکەی. ئەسپەکە هەتا بن گوێچکەکانی قوڕاوی بوون و هەر ددانە سپییەکانی دەروێش بەگ دەبریسکانەوە. وەك پەیکەرەیەك سەرتاپا قوڕاوی بوو...

ئەسپەکەی لەبەر دەرگا بەرەڵڵا کرد و خۆی وەك فیشەك لە پلیکانەکان وەسەر کەوت. کە گەیشتە یەکەم کەس پێی گوت:"بڕۆ یوسفم بۆ بانگ بکە با بێ."

خاتوون لە درزی دەرگاوە سەیری ئەو تووڕەییە سامناکە و ئەو قەڵافەتە قوڕاوییەی دەکرد و دڵەخورپەی بوو. دیار بوو شتێك دەقەوما. بە ئەزموون تێگەیشتبوو کە دوای ئەو پشێوییانە بەڵایەکیان بەسەر دێ.

تاوێك دواتر یوسف هات. کە بەگی خۆی ئاوا دیت، حەپەسا و لەبەردەمیدا وشك بوو.

بەگ دوای دیتنی یوسف هاتەوە سەر خۆی و لە ناخی دڵییەوە زۆر دڵتەزێنانە ناڵاندی:"کوڕم یوسف، دانیشە با جلوبەرگەکانم بگۆڕم و بێمەوە."

داماوی و لێقەوماوی لەدەنگەکەیدا شەپۆلی دەدا. یوسف لە بن بارستایی و گەورەیی بێسنووری ئەو خۆشەویستییەدا ورد ببوو. خاتوون و کارەکەرەکان یارمەتییان دا جلوبەرگەکەی بگۆڕێ و خۆی بشواتەوە. یوسفیش وەك لە هەنتەشی بەگدا راوەستابێ، دەستەونەزەر لەجێی خۆی راوەستا.

تاوێك دواتر، بەگ جوان و خاوێن هاتەوە. دەموچاوی شین هەڵگەڕابوو، بەڵام ئاواش زەردەی لە لێوی نەدەڕوینەوە. زۆر بە نەرم و نیانی و بە خۆشەویستییەکەوە وەك بڵێی ئیتر نایبینێتەوە، لە سەتاپای یوسف ورد دەبووەوە و روخساری وردە وردە گەش دەبووەوە و هەستی بەختەوەری لە روخساریدا دەپشکووت. خۆی کەوتە رێ و بە یوسفیشی گوت بەدوای کەوێ. دوای ئەوەی چوونە ژوورێکەوە، ئاوڕی دایەوە و گوتی:"دەرگاکە داخە."

کە یوسف دەرگاکەی داخست و گەڕایەوە، چاوی لە چاوی بڕی و بە لەبزێکەوە کە وەك بڵێ بچۆ لە بازاڕێ جگەرەم بۆ بکڕە، گوتی:"یوسفەکەم، حاجییە شێتەم بۆ دەکوژی. خۆ دەزانیی چ قەوماوە؟"

دوای ئەوەی بەبێ ئەوەی دەنگی بەرز و نزم بکاتەوە، باسی ئەوەی بۆ کرد کە کەنگێ و لەکوێ و چۆن بیکوژێ. لەسەر قسەکەی رۆیشت:"ئەمن یەك دوو رۆژان سەرێکی ئەستەمبووڵ دەدەم. دوای من بچۆ شارۆچکە و بڕۆ بەر دەرگای ماڵەکەی. ماڵەکەی چۆڵە. وریابە کەس ئاگای لە هاموشۆت نەبێ."

یوسف هیچی نەگوت، نە "باشە" و نە "ناتوانم". چونکە بەگ لێی نەپرسیبوو، ئاخۆ دەبێ یان نا؟. چاوە رەشە درشتەکانی لە پێشدا تاریك داهاتن و وەك دوو مەل لە نێو هێلانەیاندا سەرگەردان بوون. لە پێشدا نێوچاوانیشی تێك نا، جار بە جار پتر سوور و دواتر مۆر هەڵگەڕا. تاوێك دواتر چاوەکانی بریسکانەوە و دەموچاوە گرژەکەی گەش بۆوە و شادییە منداڵانەییەکەی تێ گەڕاوە. وەك منداڵێك کە لەپێشدا لەخەونیدا کەلوپەلی یارییەکانی بزر کردبێت و دواتر

هەستابێ و سەیری کردبێ هەمووی لە تەنیشتی دانراون، روخساری، دەتگوت روخساری خەمباری منداڵێکی لەخەو هەستاوە، تۆزێك سەرسوورماو...

دەروێش کە چاوی لە یوسف بڕیبوو، بەپێی ئەزموونەکانی ژیانی خۆی، لە هەڵسوکەوت و گۆڕانی دەموچاوی یوسفەوە، هەموو شتێکی خوێندبۆوە و لە پڕ پەشیمان ببۆوە کە بۆچی ئەو ئەرکە قورسەی خستبووە سەر شانی منداڵێکی ئاوا دەست و پێ سپیلکە. بەڵام فیشەکە و لە لوولەی تفەنگەوە دەرچووە و ئیتر گەڕانەوەی نەبوو. ئیتر نەیدەتوانی بڵێ"ئەوە وازم لێ هێنا یوسف." ناڕەحەت بوو و هەر بۆ ئەوەی یوسف فرمێسکەکانی نەبینێ، گوتی:"دەی بڕۆ، بڕۆ یوسفەکەم. بڕۆ و خۆت ئامادە بکە."

دەنگی لەرزۆك ببوو.

یوسف وەدەر کەوت. هەر ئەو لە ژوورەکە چووە دەرێ، نیگای پڕ لە حەژمەتی دەروێش بەدوویدا وێڵ بوو. دەتگوت دەیەوێ بە نیگا هەڵیلووشێ. لەوانەبوو ئیتر چاوی بە یوسف نەکەوێتەوە. لەوانەشە حاجی ئەو بکوژێ. لەوانەش بوو، ئەو کارانە پێچەوانە ببنەوە و ئەوەی دەچێ بۆ کوشتن، خۆی بکوژرێت. بەشکم یوسف هەر نەشتوانێ کارەکەی راپەڕێنێ و بکەوێتە زیندانەوە و بەڵایەکیشی بەسەر بێ.

باشە ئەوشتانەی بۆ لێ دەقەوما؟ چما چ تاوانێکی بەرامبەر خودا و سرووش کردبوو؟ ناهەقیی لە کێ کردبوو؟ کەس ئەوەندە بە چارەڕەشی لەدایك نەببوو. لەو رۆژەوە لە دایك ببوو، ترس وەك دۆڵپا و مۆتەکە چۆکی لەسەر سینگی دادابوو و هەڵنەستابوو لەسەری. لە سەردەمی منداڵییدا ویستبووی ئێرە بەجێ بهێڵێ و لە دەست ترس و وەحشەت پەنا بەرێتە بەر چیایەکی دوورەدەست و لە ئەشکەوتێکدا بژیێ کە بنیادەم رێی لەوێ نەکەوێ. بەڵام نەیتوانیبوو ئەو ئارەزووەی وەدی بێنێ. دوایی ویستبووی بچێتە ئەورووپا و لەوێ خۆی بشارێتەوە و ناوەکەی بگۆڕێ و ببێتە کەسێکی دیکە و لەو ترس و سامە خنکێنەرە رزگار ببێ، بەڵام نەیتوانیبوو وەجاغی ساری ئۆغڵی کوێر بکاتەوە. نەشیدەتوانی کارێك بکات خەڵك هەستن و دانیشن بڵێن، لە بەر ئاق یۆللییەکان بەزی و رای کرد و تێی قووچاند. جا خودا دەزانێ چیها حیکایەت و قسە و قسەڵۆکیان بۆ هەڵدەبەست. نا، ئەو هەر لە گەوهەریدا نەبوو، ژیان و سەرێکی بێ گێچەڵ و گۆنگەڵ هەڵبژێرێ و واز لە شەرەف و غیرەت بێنێ و لە بەر دوژمن هەڵێ.

چەند ساڵان لە ماڵەکەی خۆی وەدەر نەکەوتبوو. ئەو هەمووە ساڵە بە راستەڕێیەکدا ئەسپەکەی لێنگ نەدابوو. ئەو هەمووە ساڵە بە ئاسوودەیی و بێ خەمی سەرخەوێکی

نەشکاندبوو. هاوینان، کاتێ چوکووراوایییەکان هەر هەموویان بە هەژار و خوداپێداوەوە، دەچوونە کوێستانی تۆرووس، ئەو ناچار بوو لە گەرمای چوکووردا هەڵچۆقێ و لە حاڵێکدا ئەوانەی کە لە چوکوور مابوونەوە، شەوانە لە سەربان و کەپرەکانیاندا دەنووستن، ئەو لەو شەوە تاڵ و سامناك و پڕ لە تەپۆیانەدا، کە تەپۆکانیان، کەژاوەی تەپۆگریان دەدڕاند، ناچار بوو لە نێو چواردیواریی کۆشکەکەیدا کە دەتگوت دۆزەخە بنوێ.

چەند ساڵان هاواری کردبوو:"تۆ خوا بەوەش دەڵێن ژیان؟ ئەوەش ژیانی بنیادەمانە؟:"

گەلێ جاران مەرگی بە ئاوات خواستبوو و ماڵ بە ماڵ لێی گەڕابوو. بەڵام مەرگیشی بە نەسیب نەببوو. لە پێناوی مردنێدا کاری شێتانە نەمابوو نەیکا... گوتبووی:"ئەوەندەم دەوێ بمرم، جا چۆن دەبێ با ببێ. بە دەست ئاق یۆللی، دوژمنی ساری ئۆغلێیش ئەگەر بکوژرێم، گرنگ نییە. هەر ئەوەندەم دەوێ بکوژرێم. جا کێ دەمکوژێ با بمکوژێ." ئەگەرچی ئەو هەمووە ساڵە لە مەرگ رای کردبوو، بەڵام دیسان بە رۆژی رووناك، ئەسپەکەی بەرەو کۆشکەکەی ئاق یۆللی تاو دابوو.

باشە ئەو بەڵایانە بۆ هەر بەسەر ئەو دەهاتن؟ باشە ئەو چ تاوانێکی کردبوو، کە خودا ئاوا تۆڵەی لێ دەکردەوە؟ خودا؟ چما خودایەك...

جا تۆ خوا وەرە سەیری ئەو کارەساتەی دوایی. وەك بڵێی سووکایەتیکردن هەر بۆ پێخۆشبوون بە کەسێك، چێژێکی تێدا بێ. دەی باشە، بەڵام خوێنی خۆتی لەسەر دادەنێیت.

ئاخرییەکەی وەڕەز بوو لەوەی بیربکاتەوە و بەزەیی بەخۆیدا بێتەوە و خۆی سەرکۆنە بکا و پیش بخواتەوە و تووڕە بێت. زەردەیەکی کرد و بەخۆی گوت:"دەی باشە، چ دەبێ با ببێ. یوسفیش ئەگەر پیاو بێ، هەرچۆنێك بێ، دەرەقەتی کابرایەکی بێ کەس و بێ دەری وەك حاجییە شێتە دێ. جا پیاوێکی نەتوانێ کارێکی ئاوا راپەڕێنێ، نە من پێویستم پێیەتی و نە رەچەڵەکی ئۆغوز و نە مرۆڤایەتییش. بنیادەمێکی دەستەوستان. دەی باشە ئەم دنیایە دنیایەکە، کەس تێیدا لە مەرگ قوتار نابێ.

بەڵام هەرچۆنێك بێ، یوسف گەنجێکی لەبەردڵان و بەژن و باڵا جوانە. دەڵێی کچۆڵەیەکی شەرمنە و بەگی خۆشیی دەپەرستێ. بە هەڵسوکەوتییەوە دیارە. ئەو روانینەی ئەو... تەنیا ئەوانەی تاسەبار و خەریکی پەرستنن، نیگایەکی ئەوتۆیان هەیە. نیگایەك لە قووڵایی گیانەوە. ئەڤیندارە مەزنەکان و تەنانەت ئاشقەسووتاوەکانیش ناتوانن ئاوا جوان و دلڕفێن بڕوانن.

ئااااخ، ئەگەر یوسف ئێستا هاتبا و گوتبای:"بەگم، ئەوەم لەدەست نایە، ئەمن تا ئێستا مریشکێکیشم سەرنەبڕیوە و هیچ گیانلەبەرێکم نەکوشتووە و تەنانەت مێروولەیەکیشم ئازار نەداوە...." چ باش دەبوو. وازی لە بەگێتی و ساری ئۆغڵی بوونەکەی دێنا و سەر و چاو و دەست و پێی ماچ دەکرد. بەڵام یوسف وا گەورە کرابوو، کە نەیدەتوانی بێ و قسەیەکی ئاوا بکا. لە بن لێوانەوە گوتی:"بنیادەمی گەمژە، ئاوا لە سەر هیچ و پووچ خۆیان دەفەوتێنن. خووخدەی ئەو سەیانە ئاوایە. دەبنە قوربانیی هیچ و پووچ. باوکەکەی لە بەندیخانەدا کوژرا و کوڕەکەی تەنانەت بۆ جارێکیش چییە بیری نەکردەوە کە باشە باوکم بۆ لە زیندانێدا کوژرا؟ ئەگەر تاقە جارێك بیری لەو مەسەلە ناسکە کردبایەوە، ئێستا کوشتنی حاجییە شێتەی وەئەستۆ نەدەگرت. ئاخر حاجییە شێتە چ خراپەیەکی لەگەڵ ئەو کردبوو؟ تەنانەت هەر ناشیناسێ. دەی باشە، چما پیاو لەخۆی ناپرسێ، بۆ دەبێ ئەو کابرایە بکوژم؟ حاجییش هەر ئاوا یوسف دەکوژێ. ئەو کەرێتی و گەمژەییە چییە لەوانەدایە؟"

ئەو دنیایە هەر وا بووە و هەر واش دەبێ. ئەو داماوانە کە ساڵ دوازدەی مانگێ بۆ پاروە نانێك، کە تەنانەت ئەو پاروە نانەش دەست ناکەوێ، هەر لەبەر دڵی بەگ و ئاغاکان و بە ئەمری ئەوان یەکتری دەکوژن. هەر بە راستی ژیانی ئەو خەڵکە چەندێ سامناکە. برسێتی، هەژاری و رەشوڕووتی... دواییش بۆ بەدەستهێنانی ئەو رووتییە لە بەیانییەوە تا شەوێ وەك سەگ راکە راك و نەحەسانەوە... نەخۆشی و پەتای پەرەئەستێن و دواتریش ئەوانە هەر نەوەستاون، شەڕەکان... لەبەر هەوا و هەوەسی ئەند بەگ و ئاغایەك... لە بەرامبەری هەموو ئەوانەشدا پەرستنی ئەو بەگ و ئاغایانە...

بەزەیی پێیدا دەهات. بەڵام چیی لە دەست دەهات؟ حاجی دەکوژرا. جا بە دەستی یوسفیش. دەنگێك لە قوڕگییەوە هەستا:"سەگەلینە، چاوتان هەڵێنن و ببینن."

لە دەنگەکەی خۆی راچڵەکی.

بەڵام چۆن بیکەنەوە؟ چما بچووکترین هەل و دەرفەتیان پێ دەدرا چاو هەڵێنن؟... بۆ ئەوەی بیرێك لە خۆیان بکەنەوە و چاو هەڵێنن؟ ئاخر هەر وا لەخۆوە نەیاندەتوانی چاو هەڵێنن. ئەوجار، بە فرت و فێڵی ئاغا و بەگەکانیش هەڵدەخەڵەتان و بۆ کوشتنی کەسانی وەك عەلی ئەفەنی کە خۆیان چاویان کردبۆوە، پەلاماری زیندانیان دەدا.

دەروێش بەگ، بەو پەڕی داماوییەوە گوتی:"چاوی هەموویان دەربێ."

هەستا و بەرەو خوارێ هەرای کرد:"ئەسپەکەم بۆ زین کەن."

زۆر باشە، ئەو عەلی ئەفەنییە عەریزەنووسە زیت و وشیارەی لە پێناوی ئەو خەڵکەدا خەباتی کردووە و گیانی لە ڕێی ئەواندا گیانی لەسەر دەستی دانابوو، کاتێ بیستی ئەو خەڵکە کەر و گایە، دەرگای زیندانیان شکاندووە بۆوەی ئەو بکوژن، چیی گوت؟ یانی دیسان حازرە لە پێناوی ئەو جانەوەرانەدا خەبات بکا؟ ئاخۆ یوسفی خۆش دەوێ کە تەنیا بە ئەمری بەگەکەی خۆی، قۆڵی هەڵماڵیوە بۆ کوشتنی پیاوێکی هەژاری وەك خۆی؟

خەم و ژان خەریك بوو بیخنکێنێ، کە لێی سوار بوو و بەرەو دەشتەکە ئەسپەکەی لینگ دا.

هەورە سپییەکان، کە وەك باڵۆنی پڕ لە تیشك دەدرەوشانەوە، لە دوورەوە، لە ژوور دەریای سپیی ناوەڕاستەوە بەرەو ئەملایە، بەرەو تۆرووس هەڵدەکشان و دەهاتن. ئەو هەورە سپییانە کە تاوێکی دیکە دەگەیشتنە ئێرە، لەبری باران، تیشکیان لێ دەباری.

"با ببنە بنیادەم. ببنە ئینسان. دەست هەڵگرن و چیتر سەگ نەبن. دەست لە ملکەچی هەڵگرن و ڕاپەڕن."

عەلی عەریزەنووس، بەو قەڵافەتە خەمبار و وشك و ڕەقەڵەیەوە و بە چاوە ڕەش و درشت و گەشەکانییەوە هات و ڕێك لەبەر چاوی وەستا. ئەو عەلییەش ڕۆڵە بوو ها. لەوانەی ڕادەپەڕن. بەسەر زمانیدا داهات:"با وەك ئەو بن."

ئەسپەکەی بەسەر خەرەندەکەدا بازی دا. وەك بای شەماڵ دەفڕی. کونەلووتی لێك ڕەویبوونەوە و پەڕەی لووتی هەڵیانداویشت. بە بای غاری ئەسپەکەیەوە بۆنی زۆنگاوەکە و ڕەگی قامیش و مۆرد دەهات.

## ٧٩

ماهیر لەو ترۆمبێلەی لەبەردەرگاکەوە رایگرتبوو، دابەزی.

ماندوو و شەکەت بوو. هەر دوو پلیکان وەسەر دەکەوت، لە پەیژەی سێهەم پشوویەکی دەدا. دەروێش بەگ لەسەر پلیکانەکانەوە راوەستابوو و سەیری دەکرد. خالێ لاوازی ئەو کابرا شێتە، هەر خاکە. نەماوە بۆ زەوی و زار. بەدەم دووپاتەکردنەوە خاکەوە دەمرێ. هەر خاك و گڵی گۆڕیش چاوی تەماحی پڕ دەکا. ئەگەر بڵێین هەرچی خاك و زەویی ئەو چوکووراوایە بۆ تۆ، ناڵێ باشە ئەمن چ لەو هەمووە زەوییە بکەم. لەوانەیە لە خۆشییان گەشکە بیگرێ. هەرکەسە و بەجۆرێك شێتە و شێتییەکەی ئەویش ئەوەیە. ماهیر، شێتێکی بێدەرمانە. ئاشقی زەوی و زارە. مردووە بۆی. زەوی و زار نەبێ هیچ شتێکی بەلایەوە توورێك ناهێنێ. نە پارە و نە هیچ شتێکی دیکە. باشە ئەگەر زانیبای ئەو هێندە شێتە، چما ئەزیەتی دەکرد؟ بەڵام لە لایەکیشەوە ناوی ئۆغوزیش بە هیممەت و لە سایەی سەری ماهیرەوە گەیشتە تەشقی ئاسمان. بەو حاڵەشەوە زۆری ئازار دابوو، زۆر. ئەگەر پێشتریش ماهیری ئاوا جوان ناسیبایە، ئاخۆ دیسان... ئاا ا ای باپیرەکان، ئۆغوزەکان؟...

ماهیر کاتێ بە هەناسەبڕکێ و شێواوی و دەموچاوی سوورهەڵگەڕاوەوە گەیشتە سەر پلیکانەکان، بە ناڵینەوە پرسیی:"ئەوە چییە بەگ؟ چیمان بەسەر دێ؟ ئەو بنیادەمە کێیە؟ ئەو کابرایە کێیە؟ ئەوە چ بوونەوەرێکی نزم و هیچ پووچ و نامەردە، کە هەرچی و پەرچی و بەرِڵڵا لێمانی تین دەدەن؟"

دەروێش لەسەرخۆ پرسی:"چما چ بووە؟ چ رووی داوە؟"

ئەوجار دەستی گرت و لە حاڵێکدا بەرەو لای مۆبلەکەی دەبرد: گوتی: " وەرە دانیشە. دانیشە بزانم چ بووە دیسان."

ماهیر دانیشت و گوتی:"هەر مەپرسە، مەپرسە بەگ... مەپرسە چ بەڵایەکم بەسەر هاتووە. هیچ مەپرسە. نازانم چ بکەم. ئەمشەو مەزراکەمیان گەمارۆ دابوو و مەك تەرزە و گلێرە فیشەکم دەباری. نازانم چ خراپەیەکمان بۆ ئەو خەڵکە بووە... ئاخر من نازانم دۆستایەتیی نێوان من و تۆ، زیانی بۆ کێ هەیە؟ چما ئێمە خراپمان کرد بووینەتە دۆست... دۆستایەتیی ئێمە زۆر بەئاسانییش سەری نەگرتووە. لەو کاتەوە ئێمە دۆستایەتیمان گرتووە، بەڵا نەماوە بەسەرمانی نەهێنن. دەفەرمووی چ بکەین بەگ؟ دەستم بە داوێنت، ڕێیەکم پێشان بدە..."

"مەزراکەتیان دایە بەر گوللە؟ ئەویش هەتا بەیانی؟ ئەی تۆ چیت کرد؟"

"ئەمنیش هەتا بەیانی... لە ترسی ئەوەی نەکا بمکوژن، لە ژێرزەمینەکەدا خۆم شاردەوە. لە ژێرزەمینەکەمدا حەشارگەیەکم هەیە هیچ کەس ناتوانێ لەوێدا بمدۆزێتەوە. جا چا نەبوو ئەوەشم دروست کردبوو. ڕێنوێنیم بکە بەگ. ئەمجارەیان بە حاڵی سەگ نەجاتم بوو..."

"تۆ پێت وایە کاری کێ بێ؟"

"کاری کێیە؟ وام پرسیار لێ دەکەی وەك جەنابت نەزانی کێیە؟ دەی دیارە، روونە کاری دوژمنەکەمان."

"یانی دەتەوێ بڵێی، ئاق یۆللی؟"

"ئەی..."

دەروێش بەگ وەك سووکایەتیی پێ کرابێ، بە تووڕەییەوە قسەکەی پێ بڕی:" نا، نا، شتی وا نابێ. مەحاڵە ئاق یۆللی کاری وا سووك بکا و خۆی بچووك بکاتەوە. لەوانەیە... کێ چووزانێ."

کەسی لە شارۆچکەدا پێ شك نەدەهات کاری وا بکا...

ماهیر گوتی:"داوای لێبوردن دەکەم بەگ. ئاق یۆللی کابرایەکی جوامێرە و قەت خۆی ئەوەندە نزم و سووك ناکات مەزرای من بداتە بەر فیشەك."

ئەو کابرایە شتێکی تێدابوو پیاو لێی بێزار دەبوو. بەڵام ئەوە چ بوو؟ کوێی بوو؟ جاروبارە دەهاتە پێشەوە و نزیك دەبۆوە و لەو کاتەدا کە دەیویست بیگرێ، دەستی بەتاڵ دەمایەوە. بۆی نەدەدۆزرایەوە. چاوی لە چاوەکانی ماهیر بڕی. بەبێ چاوترووکاندن لێی ورد دەبۆوە و ماهیر هەوڵی دەدا چاوەکانی لە تیری نیگای ئەو بدزێتەوە. دەروێش بەگ، وەك نیگایەکی تۆقیو و سلۆك و فێڵباز و گزیکار و خەیانەتکار، نیگای ئەوی دەخوێندەوە. هەرچەندەش چاوی

دەدزییەوە، دیسان بەگ دەرفەتی نەدەدا. شك و گومانەکەی بوو بە دڵنیایی. لە نەکاو بە زەینیدا هات و هەستی کرد ئەو کابرایە شتێکی لەبن سەری دایە. شتێك هەیە، نارەسەنی، خەیانەت... ئەو جۆرە بنیادەمانە چیی بڵێی لێیان هەڵدەوەرێ.

بەڵام برادەرە، دەیزانی ژیانی ماهیر لەمەودوا بەدەست ئەوەوەیە. زۆنگاوەکە وشك دەبوو و تاسە و ئارەزووی ئەویش بۆ خاك و زەوییەکە بێسنوور بوو. ماهیر خۆی بە تەنیایی نەیدەتوانی لوێچە خۆڵێکیش چییە لە زاری ئەو گورگانە دەربێنێ. ماهیر کە پیاوێکی ژی و قازانج پەرست بوو، چ پێویستی دەکرد گاڵتە بە کابرایەك بکات، کە ئەوەندەی کار پێیەتی؟ مەحاڵە، مەحاڵە. بەڵام ماهیر لەوە ترسنۆکترە کاری وا بکا. بەتایبەتی ئەوەندە لە دەروێش دەترسا، هێندە لە ئیزرائیل نەدەترسا. گاڵتە بە تاقە پشتیوانەکەی خۆی، بە سەرچاوەی هێزەکەی؟... باشە لەو ماوەیەدا ئەو هەمووە خەیاڵە قۆڕە چ بوون بە مێشکیدا دەهات؟ بیری کردەوە، بڵێی هۆی پیری بێ؟ پیری، پشتی بنیادەم دەشکێنێ."

لەوانەیە ئەو گومانەشی، گومانی لە ماهیر، هەر لەبەر ئەوەبێ کە ئەو ماویە لە هەموو کەس کەوتووەتە گومانەوە. بەڵام دیسان بەخۆی گوت:"ترسنۆك و خایینە. بنیادەمی ناپاك، پیاوی خراپ و تاوانبار قەت ناتوانن راست و دۆستانە سەیری نێو چاوت بکەن. تەنانەت ناتوانن بەبێ ترس و دڕدۆنگی سەیری چاوی ژن و منداڵ و برا و خوشك و خزمەکانیشیان بکەن. ئەوانە تەنانەت زۆر بە سووك و ساناییەوە ناتوانن چاو لە چاوی ئەسپەکەشیان و سەگەکەی بەردەرگاشیان بکەن. لەو دنیایەدا شتێك نییە، ئەوانە لێی نەترسن و خۆی لێ نەدزنەوە و لێی بەگومان نەبن.

"ئەمن بۆ ماوەی  چەند حەفتەیەك دەچمە ئەستەمبووڵ ماهیر."

ماهیر راچڵەکی و گوتی:"چی؟ کوڕە بەقوربانت دەبم بەگ. ئەمن لە زاری ئەو گورگ و دەعبایانەدا بەجێ دەهێڵی و بۆ کوێ دەچی؟ دەترسم تۆ لێرە نەبی، بمکوژن."

دەروێش زۆری گوێ نەدایێ:"ئەو بوختانەی بۆ ئەو کچەیان هەڵبەست... لەو رۆژەوە ناتوانم چاو لە چاوی ئەو بەستەزمانە بکەم. ئەتۆ پێت وایە کێ وەی کرد؟ کچە دوو مانگی رەبەقە لە ژوورەکەی نەهاتووەتە دەرێ و متەقی لێوە نەهاتووە. کە دەیبینم ئاگرم بۆی تێبەردەبێ. بۆخۆشم ماندوو بووم. دەڵێم کچە بەرم و چەند رۆژێك لە ئەستەمبووڵ بگەڕێم، تا هەندێ شتەکان ئاسایی دەبنەوە، بەشکم بێتەوە سەرخۆ و لە دڵیشی دەربێنمەوە."

ماهیر کە ویستی لەسەر جێیەکەی دابنیشێتەوە، لێبڕاوانە گوتی:"هەتا ئەو بنیادەمە، ئەو کابرایەی ئەم بەڵایەی بەسەرهێناین، نەدۆزیتەوە، ناکرێ لێرە بەتەنێ بەجێم بێڵێ و بڕۆی بەگ."

ئەوجار دەنگی هەڵێنا:"ناکرێ بڕۆی. ژیانی من ئیتر بە ژیانی تۆوە بەندە. ناکرێ لەخۆتم دوور بخەیتەوە."

"ماهیر گیان، برالە، مەترسە. هیچ نابێ. کەس ناتوانێ دەستت لێ بدا. تێگەیشتی؟ ناتوانن."

ماهیر بە داخەوە سەری لەقاند و گوتی:"چۆن، چۆن هیچ نابێ؟ چۆن ناتوانن؟"

بەگ دیسان هەروا بە ساردوسڕییەوە دووپاتی کردەوە:"نابێ، نا، هیچ نابێ."

ئەوجار وەك ئەوەی زەردی بێتێ، لەسەری ڕۆیشت:"زۆرم پێخۆشە ئەو پیاوە بناسم."

ماهیر دەرپەڕی:"هەرچۆنێك بێ، دەبێ ئەو کابرایە بدۆزرێتەوە. دەبێ تۆڵەی لێ بکەینەوە. ئەوەی بەسەرمان هاتووە، لە خۆڕاوە و بە ڕێکەوت نییە. ئەمڕۆ کە لە بازاڕێ دەگەڕامەوە، دوو شێت و شوور لە پشتەوە بانگیان دەکردم گەواد. گومانی تێدا نییە ئەو ئاگرانە لە گۆڕی یەکێکەوە هەڵدایسێن، ئەگینا شێت چۆن دەوێرن شتی وا بڵێن؟ دەبێ ئەو کابرایە بدۆزینەوە، ئەتۆش ئەوە دەڕۆی."

وەك منداڵێکی بیەوێ بگریێ، دەم و لیچی تێك نا.

"بەشکم کەسیش نەبێ. ئەمن ئەو شێتانە دەناسم."

ماهیر دەنگی هەڵێنا:"ئەوە دەڵێی چی بەگ؟ پێم سەیرە. هەر بەراستی سەیرە. ئەگەر یەکێك دەست لە پشتیان نەدا."

بەگ بە گوتنی:"باشە، باشە ماهیر." بێدەنگی کرد.

ماهیر تاوێك دواتر لە حاڵێکدا کە دەیویست لە سەر جێیەکەی دانیشێتەوە، گوتی:"چاویان بە دۆستایەتییەکەمان هەڵنایە."

دەستە گۆشتنەکانی حەجمینیان نەبوو. دەروێش ئەگەر جارێکی دیکە سەیری دەستەکانی کردباوە، هەموو شتێکی لێ روون دەبۆوە. دەستەکانیش، وەك چاوەکان خووخدە و ناخی خاوەنەکانیان لەقاو دەدەن. ماهیر لەمێژبوو وا ڕاهاتبوو، کە ڕاز و نهێنییەکانی دڵی لە چاوەکانییەوە ئاشکرا نەکا، بەڵام ئاگای لە دەستی نەبوو و پێشی وا نەبوو لەوانەیە ڕۆژێك ئەو

دەستە خرپنانە لەقاوی بدەن. پیاوێکی وشیار و وردبین دەیتوانی لە ڕێی جووڵەی دەستەکانییەوە بزانێ چیی لە دڵێدا هەیە.

لە بەبێ ئۆقرەیی حاڵێکدا دەستەکانی دێنا و دەبرد، بە لەبزێکی پڕ لە گلەییەوە گوتی:"باشە بەگ، ئەتۆ بڕۆ. لێرەم بەتەنیا بەجێ بێڵە و بڕۆ. ئەمن هەموو هەوڵی خۆم دەدەم دوژمنەکەمان بدۆزمەوە. ئەتۆ بڕۆ بۆ ئەستەمبۆڵ..."

ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا.

دەروێش بەگ وەك غیرەت بنێتە بەر منداڵێك، گوتی:"متمانەم پێتە ماهیر بەگ. ئەگینا چۆن دەتوانم لەو وەزع و حاڵەدا بچمە ئەستەمبۆڵ. جوان بگەڕێ."

"ئەی چ لە حاجییە شێتە بکەم؟"

بەگ تۆزێك سەری لەو پرسیارە دوور لە چاوەڕوانییە سووڕ ما، بەڵام زۆری بیر لێ نەکردەوە. سرووشتی بوو پرسیاری وا بکا.

ماهیر باش دەیزانی دەروێش پیاوێك نەبوو لەو کاتەدا و لە خۆڕایی بچێتە ئەستەمبۆڵ. دیارە شتێکی گرنگ هەبوو و لەوانەش بوو هەر لەبەر حاجییە شێتە بووبێ. بەدڵێدا هات، کە ئیتر لە داو کەوتووی دەروێش. ئەستەمبولْ نا، حەز دەکەی بچۆ مانگ. ئەگەر حاجییە شێتە بمرێ، لە کۆڵت نابمەوە. لە تەویلەت دەکەم*. دەستەکانیشی هەر وایان دەگوت. بەڵام دەروێش بەگ سەیری دەستەکانی ئەوی نەدەکرد. حاجییە شێتە بە سەرلەقاندنێکی تۆ دەکوژن. دەستەکانیشی هاواریان دەکرد کە حاجییە شێتە دەکوژێ. هەزاران کەس بە هات و هەڵڵا لە شارۆچکەکەدا کۆ دەکەیەوە و بە کفنێکەوە دەمهێنیتە نێوەندی بازاڕ و وەك عەنتەر پێشانی حەشیمەتم دەدەی؟ دەستەکانیشی... زەبری خۆت وەشاند، جا خۆت بگرە. دەستەکانیشی...

"بە جوانی پرسیارم کرد و لێم کۆڵییەوە. حاجییە شێتە ڕۆیشتووە و لە گۆندەکەی ساری گێچیت خۆی شاردووەتەوە. لە خانوویەکدا. دەڵێن لەوێشەوە بەرەو مەڵبەندێکی دیکە تێی دەتەقێنێ. وا باشتر نییە بەر لەوەی بچیتە ئەستەمبولْ، هەتا لەدەستمان دەرنەچووە، سللاری بکەینەوە؟"

دەروێش بەگ کە گوێی لەو قسەیە بوو، وەك نهێنییەکەی لێ ئاشکرا بووبێ، دالْغەی لێدا و مات بوو. بەڵام زوو وەخۆ هاتەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: کوڕە سەیری ئەو ترسنۆکە بکە، چاو، چاو. ئەی لەو ئازایەی دەیەوێ بە دەستی یەکێکی دیکە پیاو بکوژێ... خەڵکی ترسنۆك

* لە تەویلەکردن: کینایەیە بۆ زیندانیکردن.

هەموو ئاوا کێچیان لە کەوڵی دەکەوێ. بۆ کوێ رای کردووە؟ دەروێش بەگیش هەر لەوێ رۆژێوە لەفکری حاجییە شێتەدا بووە. راکردنی چی! بیستبووی حاجی وەك ئەوەی نە بای پێداهاتبێ و نە بۆران، قیت و قنج بە بازاڕێدا دەسوورِێتەوە.

"هەیهوو، کورِە ئەوە شتێکی زۆر گرنگ نییە. ئەو کابرایە دەستی بە کڵاوی خۆیەوە گرتووە با نەیبا. رەنگبێ لە پێناوی چەند دینارێکدا ئەوەی کردبێ. دەی باشە، شێت، هەر ئەوەندەی هۆیتێکی لێ بکەی. ئەو داردەستێك پتر نییە. ئەتۆ کارت بەو نەبێ. کێ دەستی خۆی بە خوێنی ئەو جۆرەکەسانە پیس دەکا؟ کە لە ئەستەمبوڵ گەڕامەوە، حاجی بانگ دەکەمە گۆشەیەك و چەند دراوێکی دەدەمێ و پێی دەڵێم بزانم کێ تیژی کردووە ئەوەم پێ بڵێ. ئەویش وەك بولبول بۆم لەبنی کوولەکە دەدا. ئەتۆ کارت بە حاجییەشێتە نەبێ. لێی گەڕێ ئەوە بۆخۆم... جارێ با بچم و بێمەوە. ئەگەر بە پارەش نەرم نەبێ، بە دار...ئەگەر تێهەڵدانیش چاری نەکرد.... دەیبەیە زۆنگاوەکە و لەوێ لوولەی دەمانچەکەی نیشان دەدەی... حاجییە شێتەی تۆ بولبولە. دوای بەقسەهێنانی حاجییش... دوژمنەکەمان دەبێ خۆی بۆ مەرگ ئامادە بکا. گووی پێ دەکەین.... ئەتۆ خەمی ئەوەت نەبێ برالە."

دەروێش بەگ ئەو قسانەی بە لەبزێك کردن، کە ماهیر بڕوای کرد. دەروێش قسەی خۆی دەبردە سەر. حاجییش هەر ئەوەندەی چەند تێلایەکی وێکەوت، هەمووی لەبنی کوولەکە دەدا. دەوێش بەگیش ئەوی دەگرت و رووت رووتی دەکردەوە و بە خەرەزەنەکەی لە دڕووەڵانەکەی دەکرد و بە زەجر و ئازارەوە دەیکوشت.

ماهیر رەنگی بە روویەوە نەمابوو. ئێستا دەیزانی چۆنی لێ قەوماوە و خەتەرەکە چۆن لە بناگوێیەتی. هەی لەو کەرێتییەی کردبووی. هەی کەری کەر. بیرت لەوەی هەر نەکردبۆوە. پێی وابوو دەروێش بەگ وا تووڕە دەبێ، دەمودەست حاجی دەکوژێ. ئیتر کار لە کار ترازابوو. هەی لەو کەرێتییە. لەو خەتایەی. باشە هەر ئێستا ئەگەر بەبێ ئەوەی کات بەفیرِۆ بدات، خۆی بەسەر کەوشەکانی دەروێشدا بکێشێت و بڵێ، ئەمن کردم تۆ نەیکەی، تاوان بچووکەکان دەیکەن و بەخشینیش گەورەکان، بڵێی نەیبەخشێ؟"

نەیدەتوانی ساغ بێتەوە. ئەگەر دەمانچەی هەڵکێشێ و دەسبەجێ بیکوژێ؟ ئەو شێتە کەس نازانێ چ دەکا... بۆ ئەوەی خۆی بەسەر کەوشەکانیدا نەدا، بەزۆری پێشی خۆی گرتبوو.

دەروێش بەگ هەستی بە قڕوقپبوون و بێدەنگبوونەکەی ماهیر کرد. تاوێك وا کرووشمەی کرد و وێك هات و بچووك بۆوە، دەتگوت لەچاوان نەدیو بووە. بەدڵی دەروێش بەگدا هات کە

ئەو ترسنۆك و داماوە، دوو فیشەکیان بەسەر مەزراکەیدا تەقاندووە زراوی چووە. کوڕە سەیری بکە. پێویست بوو تۆزێك غیرەتی بنێتەوە بەری.

"زۆری گوێ مەدەرێ ماهیر بەگ. بەهەندی مەگرە برالە. زۆری بیر لێ مەکەوە. سەرمان سلامەت بێ. دوژمنەکانی ئێمە ئەو پیاوە نین پیاویان پێ بکوژرێ. نەکا بترسی لەوەی دوێ شەوێ مەزراکەتیان داوەتە بەر گوللە. ئەوان هیچ گوویەکیان پێ ناخورێ. زۆری گوێ مەدەرێ. خۆت سەغلەت مەکە. هەر بەسەر خۆشتی مەهێنە. وەك هیچ نەبووبێ. ئەوەندەش بزانە، ئەگەر زۆر هەڵبەزودابەز بکەی، ئەوان هارتر دەبن. هەتا لە ئەستەمبوڵ دەگەڕێمەوە هیچ شتێك مەکە. کە گەڕامەوە خۆم جێبەجێی دەکەم."

ماهیر هەرچیی دەیکرد، زەردەیەکی نەدەهاتێ. دەتگوت لە گیانەڵڵا دایە. وەك کەرسەکێکی ئاوی پێداکرابێ، تولابۆوە.

"ئەوە چتە ماهیر؟"

بە ئاستەم توانیی بڵێ:"نەخۆشم بەگ. خۆمم... بە زەحمەت خۆمم گەیاندە ئێرە."

لە راستیشدا ئەو کابرایە دەتگوت ئێستا نا تاوێکی دیکە دەمرێ. هەناسەی سوار ببوو. چ بکا؟

"هیچ باش نیم. دەبێ خۆم بگەیەنمە دوکتۆر، خۆم بگەیەنمەوە شارۆچکە. ئەتۆش ماتڵ مەبە، بڕۆ بۆ ئەستەمبوڵ. دێم و لە ئەستەمبوڵ دەتبینم. شتێکت پێ بڵێم؟ ئەو حاجییە شێتەیە دەبێ وەك سەگ بتۆپێ. ئەگەر دوژمنەکانمان بزاننەوە ئێمە دەمانەوێ وەقسەی بێنین، رێی بۆ خۆش دەکەن دەربچێ و بڕوا بۆ ناوچە و مەڵبەندەکانی دیکە یان سەری بەگۆمێدا دەکەن."

بەگ گوتی:"باشتر."

ماهیر بەبێهێزییەوە، لەحاڵێکدا ملی بەلادا کەوتبوو، گوتی:"دواییش بە ئەستۆی ئێمەیدا دێنن."

"ناتوانن."

"وا دەکەن."

دەروێش بەگ قاقایەکی کێشا و پڵتۆکێکی لە سەرشانی دا و خەمساردانە گوتی:"ئەتۆ کارت بەوە نەبێ برالە. ئەمن بۆخۆم مشووری لێ دەخۆم. ئەتۆ خەمت نەبێ نا. رۆژێك دێ، هەموو شتێك لەو ولاتەدا رێکوپێك دەبێتەوە. ئاش بە نۆرە. گەنگر و ماست بە وادەی خۆی.

ئەو نیشتیمانە، ئەو نیشتیمانەی دەڵێی بەهەشتە و رۆڵەکانی ئۆغوز تێیدا دەژین، رۆژێك دەبێتە گوڵستان. هەموو شتێك بە نۆرەی خۆی، گیانی من، برالە ماهیر گیان... بڕوانە ئەو زەوی و زارەی لە ئاقچاساز دەرکەوتووە، چ پارچەیەکی پڕ لە داروبار و گوڵ و گوڵزار دەخاتە سەر ئەو نیشتیمانی وەك بەهەشتە. باغ و بێستانێکی ئەوتۆ، کە هەر ئەورووپییەکی بینینیٚ، پەنجەی خۆی بگەزیٚ و سەری سوورِ بمێنیٚ."

قسەکانی دێنا و دەبرد بۆ ئەوەی ماهیر بەگ تۆزێك راوەستیٚ و بێتەوە سەرخۆ.

کە دیتی ماهیر لە نێوان پێکەنین و گریاندایە، هەستی کرد کاری لیٚ کردووە. باسی ئەوەی کرد کە مەزراکەی ماهیر چۆن دەبیٚ و لە ماهیر باشتریش تاریفی کرد. هەر دەتگوت چیرۆکی هەزار و یەك شەوەی بۆ دەگێڕێتەوە. پیٚ بە پێی گێڕانەوەکەی ئەو، ماهیریش دەهاتەوە سەرخۆ.

"سەبارەت بەو سەگە بەرِەڵلایەش، ئێمە کە ئەو هەمووە کارە گرنگەمان هەیە و ئەو نیشتیمانە چاوەڕوانی ئێمەیە خزمەتی بکەین، تۆخوا بایی ئەوەی دەبیٚ دەستمان بەخوێنی سەیەکی ئاوا گلاو بکەین؟ ... ئەتۆ بلیٚ برالە، بایی ئەوەی دەبیٚ؟"

ماهیری هێزلێبڕاو، بە چوست و چالاکییەکی کە چاوەڕوان نەدەکرا، قیت بۆوە و نەڕاندی:"بایی ئەوەی دەبیٚ، ئەوەندەی دێنیٚ، دێنیٚ. زۆر دێنیٚ بەگ. ئێمە دەبیٚ بیکوژین. مادامەکی ئەو بە شەقام و کۆلاندا بیٚ ترس دەسووڕێتەوە، ئەو شارە بۆ ئەوەی نابیٚ من و تۆی تێدا بژیێن. ئێمە ناتوانین سەرمان هەڵێنین و سەربەرزانە بگەڕێین. هەر سەیەك بیٚ و جنێو بە دایك و ژنمان بدا. ئەمن و تۆ لەسەرمانە ئەو چەپەڵە بفەوتێنین. لەبەر چاوی خەڵك سووکی کردووین. ئەمن ئەو کەسە دەدۆزمەوە کە هانی داوە. لەوەتەی دنیا دنیایە کەس نەیوێراوە سووکایەتی بە تۆرەمەی ساری ئۆغڵی بکا.

دەبیٚ ئەوەت پیٚ بڵێم کە، ئەگەر ئەتۆش نەیکەی، خۆم دەیکەم. کەس بۆی نییە سووکایەتیی ئاوا بە دەروێشی ساری ئۆغڵی، برای گەورەم، باب و برام، رەسەنترین تۆرەمەی ئۆغوز بکات. بەو کەسەی زەوی و زاری پیٚ داوم. ئەگەر ئەتۆ بۆت گرنگ نییە و واز لەو هەرچی و پەرچییە بێشەرەفە بێنی، ئەمن هەموو ماڵ و سامان و مەزراکەی خۆم کە لە گیانی خۆمم خۆشتر دەویٚ، بەفیدای تۆ دەکەم و ئەو سەگە بەرِەڵلایە دەتۆپێنم."

لە حاڵێکدا کە ددانەکانی چیڕ کردبوونەوە و چاوی لە ژێڵلا هاتبوون, بە هانکەهانك دەیگوت:"دەیکوژم... دەیکوژم..."

دەروێش بەگ کە دیتی ئاوا دۆستایەتیی خۆی دەردەبڕێ، بەخۆی دەنازی و چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو. خۆ ئەگەر لەم دنیایەدا هیچ کارێکی پێ نەدەکرا، دەیتوانی کارێك بکات خەڵکەکە هۆگری بن و لای بگرن. ئەوەیانی وەك ئاوخواردنەوە دەزانی. ئەو بنیادەمە کە ساڵانی ساڵ دوژمنی قەستەسەری بوو، ئێستا بۆی بووەتە دۆستێك کە ئامادەیە لەسەر سووکایەتییەکی زۆر بچووك کە پێی کراوە، گیانی خۆی فیدا بکا.

ماهیر دیسان گیانی وەبەرهاتبۆوە و بە دەنگێکی بەرز گوتی:"ئەمن پیاوم نییە. کەس و کاریشم نییە. ئەزموونی پیاوکوشتنیشم نییە. بەڵام داکی ئەو سەگە شێتە رەشپۆش دەکەم و جەرگی بە کوچکەوە دەدەم. دەیکوژم با لەزیندانێدا بڕزێم. دەیکوژم و نامووسی تۆ و نامووسەکەی خۆشم رزگار دەکەم بەگ، بەگ. ئەمن پێم قەبووڵ ناکرێ سەیەکی بەڕەڵڵا لە لاقی ساری ئۆغلی، رەسەنترین بەگی ئۆغوز رۆبێ. خۆم بە فیدای وەجوابهاتن لەسەر شەرەف و شانازییەکانی ئەو دەکەم. ئێمە بەگێکی رەسەن و بەروپشت ئەتڵەسی ئاوامان هەر وا سووك و سانا بەدەست نەهێناوە."

ئەوجار گیانێکی وەبەر هاتبۆوە و هەموو هێزی خۆی تەرخان کردبوو، کە کار بکاتە سەر دەروێش بەگ. دەروێش بەگیش کە رەنگی رەزامەندیی لە روخساری گەڕابوو، وەك مەزنان زەردەی دەهاتێ و دەیگوت:"گوێی مەدەرێ ماهیر. ئاخر ئەو سەیە ئەوەی دێنێ بیکوژی؟ ئەوەی دێنێ، پیاوی دەستی خۆی بە خوێنی سەیەکی ئاوا گلاو بکا؟"

ماهریش هەر کات گوێی لەو قسانە دەبوو، یان لە دین دەهری دەبوو، یان دەکەوتە گیانەڵلا.

بە دەنگێکی لەرزۆك و زیقی تێکەڵ بە کڕووزانەوەوە گوتی:"دێنێ بەگ. زۆریش دێنێ. ئەگینا ئیتر ئێمە لەو شارۆچکەیەدا کەس بەپیاومان نازانێ. هەموو کەس و ناکەسێك گاڵتەمان پێدەکات و دەبینە قەشمەر. هەمووان تفمان لە رووی دەکەن." دەروێش بەگ نەڕاندی:"ماهیر، ماهیر، هەرکەس لە گیانی خۆی بێزار نەبووبێ، ناتوانێ تف لە روومان بکا. ئەتۆ دەڵێی چی؟ تۆ خەمت نەبێ. ئاخرییەکەی ئەو حاجییە شێتەیە دەگرم و لەبنی زمانی دەردەکێشم بزانم کێ دەستی لە پشتی داوە. دواییش هەر رۆژەی پارچە گۆشتێکی هەر دووکیان لێ دەکەمەوە یان هەردووکیان لە پشتی ترۆمبێلەکەی تۆ دەبەستم و ئەوەندەیان رادەکێشم هەتا گیانیان بە قوونیاندا دێتە دەرێ. تا عومری حاجییە شێتە بێ بۆ پێنج فلس ... یان... دەڵێ."

ماهیر بە کرووزانەوە گوتی:"بەگ، ئەمن بەو سووکایەتییە نەخۆش کەوتم. نەخۆشم. وەختە بمرم. ئەگەر ئەمشەو بێن و مەزراکەم لێ ئاگر دەن، چ بکەم؟ دیسان دەمدەنە بەر فیشەك. دەمکوژن..."

"هیچ گوویەکیان پێ ناخورێ. پێم گوتی، دڵت ناخۆش مەکە و خەمی لێ مەخۆ. جا دەبینی تا لە ئەستەمبولێ دێمەوە، هەموو شتێك جێبەجێ بووە."

زاری گەزێك بە پێکەنینەوە داپچڕیبوو و پەیتاپەیتا پێدەکەنی. کوڕە ئەو ئەورووپادیتوویانەی دیپلۆمی باڵایان وەرگرتووە، چەندە دەستەوستان و دەستوپێ سپیلکەن. خۆ ئەگەر ئەوانیش لە منداڵییەوە وەك دەروێش بەگ، حوکمی سێدارەی خۆیانیان بە ئەستۆیانەوە هەڵگرتبایە، لانیکەم تۆزێك وەك دەروێش بەگ دەچوون.

دیتی ماهیر بەگ جار بە جار خراپتر دەبێ. بۆیە، هەر قسەی کرد بەشکم بێتەوە سەرخۆ. سەروبنی قسەشی هەر ئەوە بوو: خەمت نەبێ حاجی و ئەو کەسەی دەستی لە پشتی داوە و تیژی کردووە، دەدۆزمەوە و سزایان دەدەم. ماهیر جار بە جار خراپتر دەبوو. دەروێش بەگ ترسا. چونکە ماهیر وەك بەفر سپی هەڵگەڕابوو. بانگی شۆفێرەکەی کرد و ئەمری کرد دەسبەجێ بیگەیەننە دکتۆر. بن باڵی گرت و گەیاندییە ترۆمبێلەکەی و لەوێ بە سرتەیەك پێی گوت:"هەم ئەو دەدۆزمەوە و هەم ئەو کەسەی دنەی داوە... بەتایبەتی ئەوەی دنەی داوە دەیئەنجنم.... ئەتۆ خەمت نەبێ. خەمت نەبێ، مەترسە. پیاو لە دەوروبەری ماڵەکەت دادەنێم بۆ ئەوەی هەتا لە ئەستەمبولێ دێمەوە ئاگایان لێت بێ..."

ماهیر بە هەموو تینی خۆیەوە توانیی بلێ:"نامەوێ. پێویست نیی ی ی ە."

شۆفێرەکە کەوتە رێ.

ماهیر لە ترۆمبێلەکەدا گرمۆڵە ببوو. کەوتبووە سەر لاتەنیشت و وەخۆ نەدەهاتەوە. یەکپشوو بەخۆی دەگوت:"کەری کوڕی کەر، ئەو گووە چ بوو خواردت و حوکمی ئیعدامی خۆتت بە دەستی خۆت ئیمزا کرد. جا ئەوجار راوەستە با دەروێش بەگ ورد ورد بتئەنجنێ و لە پشت ترۆمبێلت قایم بکا. باشە ئەگەر ئێستا لێی روون بێتەوە ئەوەی شێتەی دنە داوە، کەس نەبووە جگە لەو برا گیانی گیانییەی... چما کەوڵی ناکا؟ هەقیشێتی، هەقێتی..."

چۆنە بگەڕێتەوە و خۆی بخاتە سەر پێلاوەکانی؟ نایکوژێ؟ باشە پیاو کەسێك دەکوژێ کە خۆی بەسەر کەوشی کێشابێ؟ دەروێش بەو سووکایەتییانە وا هەڵدەچوو و ئاگری دەگرت، هەر دەمودەست لە ژوورەکەیدا بەندی دەکرد و هەر رۆژەی پارچەگۆشتێکی لە لەشی دەپچڕی. باش

بوو خۆی بەسەر پێیانیدا نەکێشا و خۆی ئاشکرا نەکرد. کوڕە خۆ ساتێك ویستبووی خۆی بخاتە سەر پێیانی و بڵێ:"ئەمن کردم ئەتۆ نەیکەی." هەر جارێکی وەبیری دەهاتەوە، خوێنی لە دەماریدا وشك دەبوو و ئارەقەی ساردی دەکرد و موچڕکەی بە تیغەرەی پشتیدا دەهات. باش بوو ئەو هەڵەیەی نەکردبوو کە گیانی دەخستە مەترسییەوە.

لەنەکاو بیرێکی بەزەینیدا هات. وەك ئەوەی لە خەوی مەرگ رابووبێ، هەستا و دانیشت. چاوەکانی گەش بوونەوە و دڵی خۆش بوو. ئەو ترس و دڵەڕاوکێیە چ بوو؟ باشە بۆ ئەوەی بە زەیندا نەهاتبوو؟... هەناسەیەکی ئاسوودەی کێشا. چما قەول وا نەبوو حاجییە شێتە شەش مانگا لە شار بڕواتە دەرێ؟ قایلی دەکرد، بە پارە قایلی دەکرد بچێتە شوێنێکی دوور دوور. دەی باشە. تەواوە. ئیتر ترسی نەدەویست. ... باش بوو خۆی لەقاو نەدابوو. حاجییە شێتە دەستی ژن و منداڵەکەی دەگرت و دەچووە عەنتەب یان ئۆرفە... یان لەوانەش بوو بچێتە وان. خەرج و موخاریجی سێ ساڵیشی لە بەری دەستی بکە و بینێرە شوێنێك کەس نەیگاتێ. دەی خۆ خودا کەری نەکردووە نەچێ.

ئەو عەزابەی لەو چەند سەعاتەدا کێشابووی، لە هەموو ژیانیدا نەیکێشابوو. لەو کاتانەدا بنیادەم ناتوانێ بەسەرخۆیدا زاڵ بێ و لەسەرخۆ بێ...

گاڵتە نییە، مەسەلەی گیان لەگۆڕێیە... پیاو چۆن زەندەقی ناچێ و لە ترسان هەتا سنووری مەرگ ناچێ؟ باشە ئەگەر بەگ حاجی بگرێ و تێی هەڵدەن، حاجی ئەوی لەبن بەڕەدا نایهێنێتە سەر بەڕە؟ هەزار ئەوەندەشی ناخاتە سەر؟ ناڵێ ماهیر بەگ دەهەزار لیرەی داومەتێ و سەد دۆنم زەوی و خەرجی بیست ساڵانی منداڵەکانیشمی گرتووەتە ئەستۆی خۆی؟ باشە لێی ناپرسێ ئەتۆش لەجێی من بوایەی و ئەوەندە هەژار و نەدار بوایەی بۆ نانی شەوێ ماتڵ بوایەی، سەد جاران بە دەنگی بەرز بە پادشات نەدەگوت گەوادی بێشەرەف؟ جا ئەو کات بەگیش لەو خۆش دەبوو، بەڵام دنەدەرەکەی چوارمێخە دەکێشا و ئەنجن ئەنجنی دەکرد و زەوی و زاری لێ ئاگر دەدا و ژن و کچەکەشی دەدایە دەست نۆکەرەکانی... وا نییە؟

کورتی ببڕینەوە، گەورەترین مەترسییەکانی لەکۆڵ ببوونەوە. باش بوو. ئەو دەروێش بەگەش کەری وەك خۆی نییە ها. هیچ شکی بۆ ئەوە نەچوو. ئەو هەمووە خۆی ئاشکرا کردبوو، بەڵام دەروێش بەگ هەر شکیشی بۆی نەچوو. سەگی لەخۆبایی. ئەگەر ئەوەندە لووتبەرز نەبێ، لەو دنیایەدا کەس باشاری ناکا. باش بوو ئەو لووتبەرزییە کەرانەیە پەردەی بەر بەرچاویدا دەکێشێ و کوێری دەکا. پێی وابوو لە ترسانە ئاوا تێك چووە. لە ترسی

سووتاندنی مەزراکەی... لێگەڕێ با ئەو گەمژەیە هەر پێی وابێ. بەڵام نابێ زۆریش گەشبین بی. شکی بۆ هەندێ شت چووە بۆیە تا ئێستا حاجییە شێتەی نەکوشتووە. ئەگەر جاری جاران دەبوو، دەسبەجێ حاجیی شرت و گوم دەکرد.

خۆ ئەگەر باسی گوللەبارانکرانی مەزراکەی نەکردبایە، دەروێش بەگ لەو شێواوی و شڵەژاوییەوەی هەندێ شتی لێ روون دەبۆوە... باش بوو، باش بوو...

لە خۆشییان کۆخەیەکی کرد و جگەرەیەکی داگیرساند.

لە زاری مەرگێکی سامناك رزگاری ببوو. ئیتر گووی وا ناخواتەوە... تۆبە، تۆبە... تۆبە...

## ٨٠

دڵی دەگوشرا و حەجمینی نەبوو. سێ رۆژ بوو دەچووە کەناری زۆنگاوەکە و لە بن دار بییەکاندا بەردەوام دەمانچەکەی پڕ و بەتاڵ دەکردەوە. لەسەر لمەکە یەك پشوو شێوەی بنیادەمی دەکێشاوە.

لك و پۆی دارەکان پڕ بوون لە هێلانەی مەل. هێلانەی مەلی جۆراوجۆر. دوانیوەڕۆیان ئەوەندە پاساری لەسەر لك و پۆی بی و دار تووە بەرزەکە دەنیشتنەوە، لك و پۆیەکانی دەچەمینەوە. جیکەجیکی چۆلەکە هەموو دەشتەکەی دەتەنی. دوانیوەڕۆیان دەبووە هەڵڵا و هەنگەمە.

هەر قاو و قیژ و جیك و فیکی چۆلەکە بوو، کە دەیتوانی وای لێ بکا ئەوەندە پیش نەباتەوە بەرخۆی و هێندە بیر نەکاتەوە. ئەویش زۆر بە ئەستەم. شادی و خۆشییەکانی یەکەم رۆژەکان لە شەقەی باڵی دابوو و رۆیشتبوو. بەڵام یوسف تاسەباری شادمانی و خۆشی بوو. چیی پتر لەخۆی دەنووسا، بەهیچ جۆرێ نەیدەتوانی وەك یەکەم رۆژەکان دڵخۆش و بەکەیف بێ. شادی وەك باڵندەیەك لە دڵی فڕیبوو.

بۆ یەکەم جار پیاوی دەکوشت. بۆ یەکەمین جار... تەنیا بەگی، بەو نهێنییەی دەزانی. لەوانەبوو دواتریش دایکی و گوڵعوزارەکەشی بزاننەوە. لەوانەبوو زۆر دواتریش مزەفەر و نوورخان و خاتوونی گەورە و جەیهوونیش ئاگادار ببنەوە. دوای چەند ساڵانیش، هەموو شارۆچکەکە دەیانزانی. بەڵام بەبێ شاهید هیچ کەس نەیدەتوانی ئەو تاوانبار، واتە قۆڵبەست بکا. بەخۆی گوت"باشە، زۆر باشە." ویستی وەك رۆژەکانی پێشوو پێ بکەنێ، شاد بێ، بەڵام نەکرا. هەمووان وەك باوکی، وەك مەحموود، وەك ئادەم، وەك ئادەمی پیاوکوژ سەیر دەکرد. ویستی شانازی بەخۆیەوە بکا و بەخۆی بنازێ، بەڵام نەیتوانی. بۆ وای لێ هاتبوو؟ بۆچی دڵی دەگوشرا؟ ئەو بێ ئۆقرەییە لەکوێوە دەهات؟ لە نەکاو بەدڵیدا هات، نەکا بترسم؟ زەردەیەکی

هاتیٚ. بە بزەبز سەیرێکی دەستەکانی کرد. ئەی لەو قامکە شووش و باریکانەی. دەتگوت قامکی خاڵوانێتی. سیٚ پیاوی چوارشانەی پەستەك لەبەر، کە قەتاری فیشەکیان راست و چەپ بەستبوو، هاتنە بەر چاوی. دوایی ئەو گۆلەی هاتە بەرچاوی کە کەوتبووە نێوان ئەو چیایانەی لە بەفردا نوقم ببوون. ماسییەکانی نێو گۆلەکە. ئەو ئاوە روونەی لە گۆلەکەیان دەکرد. کەڵەکێوییە شاخدارەکانی نێو گابەرد و رەوەزە سوورباوەکان. دەستەکانی چوبوونەوە سەر دەستی خاڵوانی.

"نەکا بترسم؟"

بێکەس و بێدەرە. جا کیٚ حاجییە شێتە بە بنیادەم دەزانیٚ. کوشتنی ئەو لە کوشتنی مێرووڵەش ئاسانترە. بەردەوامیش مەست و سەرخۆش... قومارباز... نقورچکێکی لیٚ دەی دەکەویٚ.

ئەی ئەو دڵگوشرانە هیی چییە؟ هەر دەهات و دڵی توندتر دەبوو و چەندی دڵیشی توندتر دەبوو، پتر شێوەی بنیادەمی لەسەر لەکە دەکێشایەوە. بیچمەکان، لە پەیکەر و بیچمەکانی قاراتپیٚ دەچوون. ماوەیەك دواتر لەو وێکچوونە تێگەیشت. بنیادەمی کلکدار... بەخۆی گوت زۆر سەیرە. سەری لەو وێکچوونە سوورِ ما. بەڵام زەینی خۆی زۆر پێوە ماندوو نەکرد.

ئاخۆ هیچ شتێك هەیە وەك پیاوکوشتن؟ پیاوێك دەکوژی و ئیتر هەتا هەی، لە نێو خەڵکدا سەربەرزانە دەژییێ. هەمووان رێزت دەگرن و لەبەرت دادەنوێنن. وەك بنیادەمێکی سەیر و سەمەرە لێت دەروانن. بنیادەمێکی لەوان مەزنتر. تەنانەت بەگیش بەچاوێکی دیکەوە سەیرت دەکا. ئەگەر دیسان گوتی پیاوێکی دیکە بکوژە... نەەەە بەگ. ئێمە ئەرکی خۆمان راپەڕاند. لەو مەملەکەتەدا هەر ئێمە پیاوین؟ با ئەوانی دیکەش لە سێبەرتدا پیاو بکوژن و ببنە پیاو. ئێمە بەنۆرەی خۆمان ئەرکەکەمانمان راپەڕاند و لە سایەی خوداوە ناوبانگمان دەرکرد.

لێوەکانی خۆی لستنەوە و بەخۆی گوت، پیاوکوشتن کارێکی سەیرە.

بەهیچ کلۆجیٚ نەیدەتوانی ئەو گرێپووچکەیەکی ناخی بکاتەوە. شتێکی وەك بۆشاییەك، شوێنێکی تاریك. خۆ ئەگەر جێژنێك هەبوایە ئێستا، دەچوو و سەرچۆپییەکەی دەگرت و سواری و جلیتانی دەکرد، لەوانەبوو دڵی بکرێتەوە.

لەنەکاو بە زەینیدا هات، بچێتە شاری. بەشکم دڵی بەشاری بکرێتەوە... لەویٚ کاریشی هەبوو. حاجییە شێتەش هەر ئەو رۆژەی بەگ چوبووە ئەستەمبوڵ، لە حەشارگەکەی هاتبووە دەریٚ. سەگباب، حەیوان، خۆ بنیادەم نییە. وەك مامۆستا قاراتۆپاکلی دەیگوت: هەر کەس

لەو کەسانە بدات، دەستی نوورانی دەبێت. هەر بەراستی قسەکەی جوانە. زۆر جوانە. بێ دین و ئیمان و قومارچییەکی ئاوا بەکاری چی دێ؟ بوونەوەری ئاوا نەك قازانجێکیان بۆ خەڵك نییە، ئەوەندەش چاوقامێتی و بێ ئەدەبی دەکەن، بە رۆژی رووناك سووکایەتی بە پیاوێکی مەزنی وەك دەروێش بەگ دەکەن. بە چ هەقێك؟ جا ئێستا نۆرەیەتی بێ و بزانێ پووتێك چەند کیلۆیە. دەبا هەڵیگرێتەوە.

باشە بچێتە شارۆچکە؟ هەر پێویستە بچێ؟ مادام رۆیشتووە خۆ ناکرێ... بەڵام ئەی ئەگەر لە شاری بیناسن؟ هەموو دەیناسن، هەر هەموو.

ناکرێ بچیتە شاری و ناشتوانی چاو لە چاوی ئەو کابرایە بکەی. چۆن دەتوانی چاو لە چاوی پیاوێك بکەی و بیدوێنی کە قەرارە بیکوژی؟ وا نییە؟ ئاخۆ دەکرێ بچییە شاری؟ نەشچێ دەبێ. شەوێکیان دەچێتە شاری و لە دەرگای ماڵی بەگ دەدا. دەستی بۆ گیرفانی برد. کلیلەکەی لە گیرفانیدا بوو. دەبوو بچێتە ژوورەوە. ئەی لەو ماڵە گەورەیە. کەسیشی تێدا نەبوو. هەموو دەرگاکان نەخش و نیگاریان لێ کۆڵرابوو. لەوانەیە هەزاران ژوور و هەر ژوورەش چەند قەرەوێڵە و سیسەم. جا لە سەر کامیانت کەیف لێیە بنوو.

لە دەم زۆنگاوەکەوە بەرو ماڵەوە بوو. لەوبەری زۆنگاوەکە قاووقیژی پۆلێك باڵندە دەهات کە هەموو دەشتەکەی داگرتبوو.

هاتەوە ماڵەوە. دایکی لە دەرەوەی ماڵەوە ئاگری کردبووەوە و چێشتی لێ دەنا. نەیتوانی سەیری چاوی دایکی بکا. ماوەیەك دەبوو نەیتوانیبوو سەری هەڵێنێ و سەیری چاوی دایکی بکا. میرۆ هەر چاوی پێی کەوت گوت:"یوسفەکەم لەکوێ بووی؟"

"چوبوومە بن بییەکان... دایە؟"

"گیانی دایە؟"

"بابم لە هیچ دەترسا؟"

میرۆ نیگا شڵەژاو و شێواوەکانی تێوە بڕی. ئەوجار نەرمە بزەیەکی لە لێوانی گەڕا:"چما پیاو هەیە نەترسێ؟ دەترسا، زۆریش دەترسا...

"من چوومەتەوە سەر بابم، وایە؟ لەو دەچم، وایە؟"

میرۆ هەروا بەسەرسووڕمانەوە بەڵام پێکەنینەوە گوتی:"نا، بەقوربانت دەبم. دەستەکانی تۆ لە دەستی خاڵوانت دەچن. هەر دەڵێی قەڵەمن. چاوەکانیشت لە چاوی باوکی من دەچن. هەر چەناگەت لە چەنەی مەحموود دەچێ."

یوسف سەیرێکی دەستەکانی کرد و پرسیی:"خوالۆانیشم دەترسن؟"

"ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی کوڕم؟ خالۆانی تۆ شێری هۆردووی چوارەمن. چما نەتبیستووە؟ ئەوان هەر نازانن ترس چییە. ئەوان وەك ئیزراییل وان. ئەو قسانە چین رۆڵە. چما ئەوان دێنە بن باڵ و سێبەری بەگ؟ ئەوان بازی چیای سوبحان و هەڵۆی ئاگری داغ و شێری هۆردووی چوارەمن. جارێکی دیکە قسەی ئاوا نەکەیەوە ها."

"کەوابوو من چوومەتەوە سەر بابم."

میرۆ سەری لەو قسانەی کوڕەکەی سووڕ دەما. لەپێشدا بۆ چەند ساتێك نەیدەزانی چ بڵێ و تێدا دەما و دوایی بەخۆشییەوە وەڵامێکی بەکوڕەکەی دەدایەوە:

"ئەگەر ئەتۆش هۆردووی چوارەم بوایەی، وەك خالۆانت پەروەردە دەبووی."

یوسف سەیرێکی دایکی کرد و هیچی نەگوت. ژنێکی سەیر بوو. قەت دانەدەما و ملی نەدەدا. لەکەسی قەبووڵ نەدەکرد خراپەی براکانی بڵێ و هەڵدەچوو و ماوەی چەند سەعاتان هەر بە بنەماڵە و براکانی هەڵدەگوت.

"خالۆانی تۆ..."

ئەوەی گوت و مەنجەڵەکەی لەسەر کوچکاورەکە هەڵگرت و پرسیی:"برسیتە؟ سفرەکە راخە ترخێنەت بۆ تێکەم."

یوسف سفرەکەی راختس و دانیشت. میرۆ دەمودەست قاپێکی ترخێنە کە هەڵمی لێ هەڵدەستا بۆ هێنا و لە پێشی دانا.

بەبێ دار و بار، دنیایەکی رووت و قاقڕ. لە کەلێنی تاشەبەردە سوورباوەکانەوە گیا شین ببوونەوە. کەڵەکێویی شاخدار، هەڵۆکان، مێگەلی رەش... گۆلەکەش تار و تەماوی. چیاکانی و گۆلەکەی هەر هەموو نوقمی مژ و دووکەڵ و تەم...

هەتا قاپەکەی هەڵنەقوڕاند، هەر بێدەنگ بوو. لە قەڵافەتییەوە دیار بوو شتێکی لە دڵی دایە. بەڵام چ ژانێك؟ ئەو کوڕە بۆ وایە، چییەتی؟

"دایە، ئەمن ئەمشەو دەچمە شاری. قەرار وایە پاسەوانی خانووەکە بم. بەگ بەر لەوەی بچێتە ئەستەمبوڵ وای گوت. بە کەس نەڵێی ها من لە شاری. تەنانەت بە مزەفەر بەگیش."

"بۆ نەڵێم؟"

"من چووزانم، بەگ خۆی گوتی مەڵێ. گوتی بڕۆ هەتا دێمەوە، ئاگات لە ماڵەکەی شاری بێ."

میرۆ سەری لەقاند و وەك ئەوەی قسە لەگەڵ خۆی بکا، بە سەرسووڕمانەوە گوتی:"کەس سەرەدەر لە کارەکانی بەگ دەرناکا... ماڵی چۆل و هۆڵ پاسەوانی بۆ چییە؟"

یوسف:"دڵم دەڵێ مەڕۆ..."

میرۆ هەڵچوو:"نەچی؟ چما دەکرێ نەچی؟ چما دەکری قسەی بەگ بشکێنی؟ دەبێ بچی."

یوسف لە قسەکەی پاشگەز ببۆوە. ئیتر میرۆ لەکۆڵی نەدەبۆوە و هەر دەیگوت بۆ نەچووی، بۆ ناڕۆی؟ سەهووی کردبوو.

هەر واش دەبوو. میرۆ هەموو رۆژێ و لە هەموو کاتێکدا هەر دەیگوت:"هاااا، یوسف، بۆچی ناڕۆی؟ چما پیاو قسەی بەگی خۆی دەشکێنێ؟ ئیتر ئەمشەو بڕۆ."

یوسف رۆژێك، دوو رۆژ، سێ رۆژ خۆی خافلاند. ئاخرییەکەی دیتی بۆڵەبۆڵی میرۆ جەرگی دەکۆڵێ و ئیتر نیوەشەوێ بەرەو شارۆچکە کەوتە رێ. بەڵام دڵی بۆی نەدەچوو. هەردەتگوت دەیبەنە دۆزەخ. لاقەکانی خێرا پەلکێشیان دەکرد بەڵام دڵی دەیەویست بگەڕێتەوە و بچێتە بن دار بییەکان...

حەمەڕەشێك هەبوو، رای کردبوو. کەس نەیدەزانی لە چی فیرارە. لە نێو چڵ و چێو و لك و پۆی بییەکاندا، بەڵام ئەو بییانە نا، بییەکانی نێوەڕاستی زۆنگاوەکەدا شوێنێکی بۆخۆی چێ کردبوو و سێ ساڵی رەبەق لەوێدا ژیابوو. حەمە رەش، ژنێکی هەبوو، روخساری زەرد زەرد بوو. هەموو شەوێ خواردنی بۆ حەمەڕەش دەبرد و کە بەیان دەئەنگوت، دەگەڕایەوە. هەموو شەوێ هەتا نێوقەدی لە ئاوی دەدا و بە نێو مار و جڕ و جانەوەردا دەپەڕییەوە و دەچووە لای مێردەکەی و دەهاتەوە. ئا بەوە دەڵێن ژن، ئینسان. جێوبانەکەی رێك لەنێو لك و پۆکاندا بوو. رێك وەك هێلانە. باشە چۆنە لەوێ خۆی بشارێتەوە؟ بەڵام لەوێش خۆ مێش و تەپۆ پیاو کەوڵ دەکەن. حەمەرەش سێ ساڵان لەوێ مابۆوە، بەڵام ئیتر تەپۆ و مێش شتێکیان پێوە نەهێشتبوو. ئیتر کەس نەیدەناسییەوە. دوای ئەوەش قەت چاك نەبۆوە و نۆبەتێ هەر بەری نەدا.

حەمەڕەش دەیگوت، هەر مێشێکی نێوەڕاستی زۆنگاوەکە هێندەی بڕگەی پەنجەیەکە. ئەوی هەرە بچووکەکەیان بەقەد کەرمێشێك دەبێ و هەمووش ئێسکیان هەیە.

چیی دەبێ با ببێ، دەڕۆم. هەر ئەوەندە یەکێك خواردنەکەی بۆ بێنێ. ئەی تۆڕی مێشگر(پەردەکوللە)یان بۆ چی دروست کردووە؟ ئەی بۆ چ رۆژێك دەبێ... باشە ئەی گوڵعوزار خواردنی بۆ ناهێنێ؟ تاوێك لە نێوەندی رێیەکە چەقی. شارۆچکەکەی لێ وەدەر کەوتبوو. لە

یەك دوو شوێنەوە ڕووناكایی دەهات. وەك ئاگری شوانان لە دوورەوە تیشكیان داویشت. ئاسمان ئەستێرە باران بوو.

باشە بۆ دەبوو لە زۆنگاوەكە بدا و بچێ و لەنێو لك و پۆی بییەكان هێلانە دروست بكا؟ نەرمە بزەیەكی هاتێ. گۆرانییەك لەناخییەوە هەڵقوڵی و بە زاریدا هات. شادییەك گیانی تەنی. ژنەكەی حەمەڕە سێ ساڵی ڕەبەق خواردنی بۆ مێردەكەی بردبوو. گوڵعوزار پازدە ساڵان ئەوە دەكا و نێوچاوانیش تێك نانێ. وەفادارییەكەی ئەو سنووری نییە. بەڵام بۆ دەبێ لە نێوەندی زۆنگاوەكە هێلانە بكا؟

كە سەری هەڵێنا گەیشتبووە بەر دەرگای خانووەكەی بەگ. هەر نەیدەزانی ئەو هەمووە ڕێیەی چۆن بڕیوە و چۆن لە پردەكە پەڕیوەتەوە و بە دەم ماڵەكاندا تێپەڕیوە؟ هەر ئاگاشی لێ نەببوو. پێكەنینی هات. ئەوجار لە ناكاو تاریكییەك ناخی تەنی. كلیلەكەی لە كونی قوفڵەكەدا گێڕا. دەرگاكە كرایەوە وەك بەشوێنییەوە بن، بەپەلە لە پلیكانەكان چووە سەرێ و چراكەی داگیرساند. دەرگای یەكەم ژووری كردەوە. شمەكەكانی داكەند و چووە نێو نوێن و بانەكەوە و لێفەكەی بەسەر خۆی كێشا و خۆی گرمۆڵە كرد.

# ٨٢

زۆر لەمێژ بوو، هەر پیشی دەبردەوە بەرخۆی و متەقی لێوە نەدەهات. تەواو هیوابڕاو ببوو. جا وەرە، عومرێك بە وردبینی و لێكدانەوە بژی و كتوپڕ تووڕە بە هەموو ژیانی خۆت بكە تۆزی بانان. چۆن لەو چاڵە كەوتبوو؟ بەڵام باشە، ئینسانێك دەبوو ئەوەی لەگەڵ بكرێ كە ئەو هەتیوە نەفرەتییە وەحشییە كردی؟ قەبووڵ دەكرا؟ كێ دەیتوانی ئاوای لێ بكەن و تووڕە نەبێت و قەبووڵیشی بكا؟ لەوەتەی دنیا دنیایە، كێ ئاوای پێ كراوە؟

باشە، بەڵام پیاوی ژیر و ئاقڵیش نابێ، لەدین دەهری بێ. حاجییە شێتە لە نێوەندی بازاڕێ و لەبەر چاوی مودیرناحییە سووكایەتیی بەدەورێش بەگ كردبوو. دەروێش بەگیش لە دین دەهری ببوو. چیی لەو كارە پێ بڕابوو؟ پارەیەكی زۆری بەدەست هێنابوو؟ لای خەڵك ماقووڵ ببوو؟ چ شتێك گۆڕابوو؟

حاجییە شێتە چەندەش دان بەخۆداگر بێ، دیسانیش هەر وەقسەی دێنێ. پارەی دەداتێ، زەوی و زاری دەداتێ، هەرچی مڵك و ماڵی هەیەتی دەیداتێ و ئەگەر هەر نەشكرا، ئەوەندەی تێهەڵدەدا لە مردنێی دەكا و ئاخری هەر وەقسەی دێنێ و لە بنی زمانی دەردێنێ كە كێ دەستی لەپشتی داوە و دژی ئەو هانی داوە. جا ئەو كات دێ و لە نێوەڕاستی بازاڕێ، ڕێك لە چەقی بازاڕەكە، لەو هەڵدەدا. بەشكم هەر لێشی نەدا، بەڵكو كابرا دەگرێ و ورد ورد بیئەنجنێ. جارێك دەستێكی بپەڕێنێ، جارێك چاوی دەربێنێ، جارێك گەرووی بقڵیشێنێ و وردە وردە زەجركوژی بكا.

قوڕی كوێ بەسەریدا بكا؟ چۆن خۆی نەجات بدا؟ تەنیا یەك ڕێی دەربازبوون هەبوو، ئەویش ئەوە بوو حاجییە شێتە بكوژێ كە بەپێچەوانەی ئەو بەڵێنەی دابووی، شارۆچكەكەی بەجێ نەدەهێشت. دەبوو بەر لەوەی دەروێش لە ئەستەمبوڵ دەگەڕێتەوە، حاجی سەری بەگۆمێدا بكرێ. ئەگینا سەری خۆی تێدا دەچوو.

حەیف بۆ ئەو هەمووە ساڵەی رابردوو. بەر لە هەزار و نۆسەد و سی و سێ... لە چیا چەند یاخییەکی هەبوو. وەرزێرەکانی تۆقاندبوو و پارچە پارچە زەوی و زارەکەی لە چنگیان دەرهێنابوو. هەندێ لەو گوندییانە ئەوەندە ترسنۆکن هەر مەپرسە. بۆ ئەوەی نابن بە بنیادەمیان بزانی... ئەگەر جاری جاران دەبوو، هەر بە ئاماژەیەك حاجییە شێتەیان دەبردە کێوی و لەوێ سەریان بەگۆمدا دەکرد، وەك هەر لەدایك نەبووبێ. دەیانکوشت و تەرمەکەشیان دەسووتاند... ئەگەر جاری جاران دەبوو، کوشتنی حاجیە شێتە وەك ئاوخواردنەوە وا بوو. دەیتوانی دەروێش بەگیش لەناو بەرێ...

هەر بەراست ئەو جاری جارانەی لەکوێوە هێنابوو؟ چۆن خەیاڵانی هەڵدەبەست؟ خۆ ئەو لە عومریدا یاخیی نەبووە. نە لە رابردوودا و نە هیچ کاتێك.. کەیفی دەکرد کە ئاوا خەیاڵان هەڵبەستێ و باسی رۆژانی رابردوو و یاخییەکانی بکا.

"ئاااخ ساڵی ساڵان."

بەلای راستدا وەرسوورِایەوە. هەر لەبیریشی نەمابوو وەلی لەوێیە. گوتی:"وەلی، ئەگەر جاری جاران دەبوو، ئەو کاتەی ئەتۆ یاخی بووی، سەری ئەو دەروێش بەگەت هەڵدەقەند، وا نییە؟"

وەلی زەردەیەکی هاتێ و هیچی نەگوت. بە دڵیدا هات کە ماهیر ئەوەندە بەپارێز بوو، ئەوەندە... کە سێ ساڵی تەواو لەسەر ئەوەی ئاخۆ راسپێرێ "دال قارا ئۆغلی" بکوژن یان نا، بیری کردبۆوە و شەن و کەوی کردبوو و ئاخرییەکەشی پاشگەز ببۆوە. کوشتنی دەروێش بەگ؟ چما ئەو کات کەس دەیوێرا توخنی دەروێش بەگ بکەوێ؟ خۆ ئەگەر چی دەر و دەشت پڕ بوو لە یاخی و چەتە و رێگر، بەلام لە سەرانسەری چوکووراوادا پیاو هەبوو بوێرێ دەست لە دەروێش بەگ هەڵێنێتەوە؟ قسەی وا دەڕۆییشت، کە ئینسان سەهلە، تەنانەت عەرزیش لەبەری دەلەرزی. پیاوی وەك ماهیر شانازییان بەخۆیانەوە دەکرد ئەگەر دەستی دەروێش بەگیان ماچ دەکرد و هەر نەیاندەتوانی بە سەراوردی زەوی و زاریشیدا بڕۆن. ئەوانە دوایی بوونە پیاو. ئەوانە نەك بە پیاوەتی، بەڵکو بە پارە و سەروەت و سامان بوونە بنیادەم.

ماهیر گوتی:"ئاخ وەلی، ئاااخ، ساڵی ساڵان... ئاوا نەبووین وەلی. بۆخۆمان بگرە و بەردەمان هەبوو. ئەو دەمەی لە چیایێ بووی، لێم رادەسپاردی ئەو دەروێشەم بۆ بەرە کێوی. ئەتۆش دەتبرد. دەتبرد و خۆڵەمێشەکەیت بەدەم باوە دەکرد. ئیتر ناو و نیشانی دەروێش بەگ نەدەما. وا نییە وەلی؟"

"بەڵێ. بەڵام ئەو رۆژانە هاتن و رابردن ئاغا. سەردەمی یاخیگەری بەسەرچوو."

"بەڵێ... بەسەرچوو. ئاااخ رۆژانی رابردوو."

بە نیگایەکی مکوورِ لە وەلی ورد بۆوە. روخسارە تێکسمڕاوەکەی، پتر تێك چرژابوو. گنجەکانی دەموچاوی وەك چەقۆ تیژ بوون و چاوەکانی قین و رقیان لێ دەباری. وەك رێوییەکی فێڵباز و وەك پڵنگێك دڕندە بوو. ئەگەر هەلی بۆ رەخسابایە، هەر جووقەواری بەگ و ئاغای لە چوکووراوا دەبڕییەوە."

هەی دا و بێداد. ئەوە ئەقڵمان چیی لێ هاتووە؟ ملیۆنان ملیۆن "وەلی"ـی چاوپڵنگ هەن و ئێمە هەر وا لەگژ یەکتری رۆچووین. سەلا لە ئەقڵمان. چما کاتی لەگژ یەك راچوونە؟ دوژمن لە پشت دەرگا راوەستاوە و چاوەڕێی هەلە دەروێش. ئێمە گەمە دەکەین دەروێش. ئەتۆ لە خەیاڵی کفن پۆشکردن و ئەمن لە بۆسەی ئابڕووبردندا... هۆی دەروێش، با چاومان بکەینەوە. ئەگەر چاو هەڵنەهێنین، "وەلی"ـیەکان کەوڵمان دەکەن. ئەتۆ چیت لەو کفنپۆشکردنە وەدەست کەوت و ئەمن لەو ناوزڕاندنە چیم پێ گەیشت؟ چما هەر بەو خەیاڵانەمانەوە، یەکترمان لە بنێ نەهێنا، دەروێش؟ دەروێشی گەمژە؟

دەزانم، حاجییە شێتە دەگری و وەقسەی دێنی، وەك بولبولەکانی چوکووراوا. بولبولی گەرمێنێ باش دەخوێنن، دەروێش، حاجی وەقسە دێنی و هەر راناوەستی، لێی سواری ئەسپ دەبی و دێی و پەتم دەکەی دەروێش، بەڵام چ قازانجێکت لە کوشتنی من دەست دەکەوێ؟ ئەمن چ سوودێکم لە ناوزڕاندنەکەی تۆ پێ بڕا؟ ئەوە مەزرایەکی گەورەم پێ بەخشیت دەروێش. خراپەت کرد و هەڵتگرتەوە پاشای من؟ دوای گەڕانەوەت لە ئەستەمبوڵ و وەقسەهێنانی حاجییە شێتە... رێیەکی دیکە نییە دەروێش. ئەمن باشت دەناسم.

وەلی، جۆرە پاڕانەوە و شێواوییەکی لە چاوەکانی ماهیردا دەدی و لەدڵی خۆیدا پێدەکەنی و متەقی لێوە نەدەهات. داوایەکی هەبوو. ئەو بەرازە داوایەکی گرنگی هەبوو، بۆیە ئاوا لە سەرتاپای پیاوی ورد دەبۆوە.

تاوێك دواتر گوتی:"وەلی، ئەتۆ ئێستاش وەك ساڵی ساڵان پیاوت پێ دەکوژرێ؟"

وەلی سەری سوورِ ما. ئیتر وەها چاوەڕوانییەکی لێی نەبوو. دەیەوێ کێ بکوژێ؟ چاوێکی پڕ لە پرسیاری لە ماهیر کرد. زۆر شێلگیر بوو. چاوێکی کردبووە چوار چاوان و سەیری دەکرد، بۆ ئەوەی بڵێ دەکوژم. ئەوەندە مکورِ سەیری دەکرد...

وەلی گوتی:"ئەوە رابرد ئاغا. تازە ئێمە چی و پیاو کوشتنی چی. ئەمن پیاوەکەی سالان نیم. ئەو رۆژانە رابردن و ئێمەش لە پەڕ و پۆ بووین."

هەر لەو کاتەشدا بەدڵی داهات:"دەکوژم، جا چۆنیش دەکوژم. ئەگەر کەرێکی وەك تۆم گیر بکەوێ جا بزانە چۆنت دەتۆپێنم. ئەگەر دەروێش، هەموو ئەو ئاغایانەم وەچنگ کەون... ئای گیانم بە قوربانی عەلی ئەفەنی.../ لەسەری گەڕێم. بەڵام ئەو سەگبابەش بەگوێرەی پێویست خۆی ناناسێنێ... شتی باشی زۆرە، ئەوە قسەی لەسەر نییە، بەڵام مەبەستە باشەکانی دەرناخا. بەو حاڵەشەوە لەسەر یەك دیارە چیی دەوێ. بەڵام باشە شتی وا سەر دەگرێ؟ ئێستا، قسەکانی ئەو سەربگرن یان نا، خودا هەڵناگرێ، ئەو قسەیەی راستە کە بەگ و ئاغا خراپن. کافران هەر بۆ ئەوەی دەبن سەریان پان بکەیەوە.

ماهیر دیسان گوتی:"ئاخ بۆ ساڵی ساڵان. ئااخ وەلی، جاری جاران. ئەو دەم ئێمەش وەك پڵینگ وابووین. پارە و پێگەمان هەبوو، بەڵام ناومان نەبوو. وا نییە؟"

"بەڵێ."

ئەوەی گوت و بەدڵیدا هات:"ئەو درۆیەت سەرت بخوا هەتیوی قاباقچی. ئەتۆ لە کەروێشك ترسنۆکتر بووی. ئەگەر ئەودەم داوای ژنەکەتم کردبایە دەتهێنا و..."

ماهیر کە دیتی، وەلی جێی هیوایە نییە، دیسان بەرامبەری راوەستا و لە سەرتاپای ورد بۆوە و گوتی:"یانی وەلییەکەی جاری جاران رۆیوە و یەکێکی دیکەی هاتۆتە جێی، ها؟"

"بەڵێ ئاغا. باشە پێویستە کەسێك بکوژرێ؟"

"نا ا ا... هەر گوتم بزانم ئاخۆ ئەگەر پێویست بوو وەلی بەدەنگمانەوە دێ؟"

"وەلی لەمەودوا مێرووولەیەکیشی پێ ناکوژرێ. تازە لە ئێمە رابرد."

"زۆر باشە. ئەتۆ ئێستا بڕۆ و لای عەسرێ وەرەوە. دەبێ حەفتا بەرمیل نەوتە رەشە ببرێ بۆ مەزرا. لەبیرت نەچێ. هەتا شەوێ دەبێ بیبەن. گیادرووەکە تێك چووە. کەلوپەلیان بۆ پەیدا کردووە؟ نابێ هیچ شتێك کەم بێ. تێگەیشتی؟"

"بەڵێ تێگەیشتم."

"یانی پیر بووی وەلی، ها؟"

"بەڵێ ئاغا، پیر بووم."

"وەلی."

"بەڵێ ئاغا."

"حاجییە شێتەم بۆ بدۆزەرەوە و دەسبەجێ بۆمی بنێرە. هەر ئێستا."

"باشە. بەڵام با شتێکت پێ بڵێم ئاغا...."

"بڵێ."

"کوڕە حاجی جێی بەقایە نییە، ها."

ماهیر دیسان چاوی لە وەلی بڕییەوە و گوتی:"ئاااخ وەلی."

حەزی لێ نەبوو چەندی چەند ساڵان حاجییە شێتە بەخێو بکا. ئێستا نا تاوێکی دی لەوانەبوو بکەوێتە چنگ دەروێش بەگ. ئەوجار ئەگەر بتوانێ سەری بەگۆمدا بکا، هەمووان دەڵێن، بەخوای بەفیتی دەروێش بەگ شرت و گوم کراوە. بەردێك و دوو کێل...

یەك دوو هەنگاوی نا، دەستی لەسەر شانی وەلی دانا و پرسی:"وەلی، ئەتۆ پیاو ناکوژی، ها؟"

وەلی چاوی لە چاوی بڕی و ئەو هەر لەسەر قسەیەکەی ڕۆیشت:"پیاوێکی خراپ و چەپەڵ، پیاوێکی بێ کەس و کار، ناکوژی، نا؟"

"هەر مێروولەیەك چییە،... مێروولەیەکم پێ ناکوژرێ. پێم وایە هیچ شتێك لە پیاوکوشتن خراپتر نییە. ئەگەر ناچاریش بم پیاوێك بکوژم، وام پێ باشترە خۆم بکوژم."

"زۆر باشە، بڕۆ دەی... بڕۆ حاجییە شێتەم بۆ بنێرە."

وەلی نەیویست بیڵێ، بەڵام لە زمانی دەرچوو:"ئەو بۆ متمانە نابێ ئاغا."

ماهیر دیسان بزەیەکی تاڵی هاتێ:"ئەمن پشت بە پیاوی وەك حاجییە شێتە نابەستم."

وەلی ڕۆیشتە دەرێ. تێك چووبوو. ئەو کابرایە دەیەویست کێ بکوژێ؟ کەوابوو ئەو قاباقچییە دەستەوستانەی ئێمەش خەیاڵی پیاوکوشتنێی کەوتووەتە سەر؟ کەوابوو بڵێ وردە وردە خەریکە لێمان دەبێتە بەگ. پیاوکوشتن یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی ئاغایەتی. ئەتۆ وەرە سەیری ئەو قاباقچییە خوێڕییە بکە. وەك بڵێی ئەگەر پیاو نەکوژێ، هیچی بۆ ناچێتە سەرێ....

ئەو ئیتر خۆی هەرگیز دەستی خوێناوی ناکا و لە برسانیش بمرێ و هێندەی ئەو چیایانەشی زێڕ بدەیتێ، نەك بنیادەمێك، تەنانەت سەگێکی گڕوێیش ناکوژێ. بەهیچ کلۆجێ. بەڵام بۆچی، لە بری شتێك پیاو دەکوژێ. تەنیا لە سەر یەك شت. ئەوەش لە عەلی ئەفەنییەوە فێر ببوو. ئەو کات ئیتر پیاو کوشتنەکە واجب دەبوو. لەو کاتەدا نەبێ، لەسەر هەر شتێکی دیکەبێ پیاوکوشتن حەرامە. ئەوەی مەخلووقێکی بێ تاوان دەکوژێ، دەکرێ بڵێی خالقەکەشی لەگەڵ دەکوژێ.

یەکەوڕێ چووە دووکانەکەی عەلیی عەریزەنووس. عەلی ئەفەندی نوقمی خوێندنەوەی کتێبێك بوو. تاوێك لەبەر دەرگا راوەستا و سەیری عەلی ئەفەندیی کرد. دەموچاوی وشك و رەقەڵە و مۆنی هەبوو. وەلی بیری کردەوە، ئەو کابرایە چییە. ئاگای لە هەموو شتێکە، بەڵام منداڵێك دێ و درۆیەکی بۆ دەکا و ئەویش دەمودەست بڕوا دەکا. چیت پێخۆشە بیڵێ، قسەی وای بۆ بکە شێتیش باوەڕی پێ نەکا، بەڵام ئەو دەسبەجێ بڕوا دەکا. باشە بۆ وا خۆش باوەڕە؟ هیی کەم ئەقڵییەکەیەتی؟ لەو چوکووراوایەدا کەس هێندەی ئەو نازانێ. ئەی باشە بۆ وایە؟ ئەستەمە یەکێکی دیکە هەبێ، هێندەی ئەو متمانەی بە خەڵکی بێ. ئەو داماوە چەندیش کز و لاوازە. ئێسك و پێستێکە. هەر دەڵێی هیچ ناخوا. پارەی عەریزەنووسین لە هەژار و دەستکورتانیش وەرناگرێ. ئەو ماستە بێ موو نییە... ئەو پیاوە نهێنییەکی خوایی تێدایە. دیارە هەر وایە. هەر کێشەیەکت هەیە، ئەگەر لە داخ و خەفەت و پەژارە وەختە بمری، باب و برات بمرێ، هەر کێشە و گرفتێك بەرۆکتی گرتبێ، بچییە لای ئەو عەلی ئەفەندییە، هەموو تاریکی و کێشەکانت دەڕەوێنەوە و دڵت روون دەبێتەوە. شادییەکی روون لە ناخی ئەو کابرایەوە سەرچاوە دەگرێ و هەموو مرۆڤ و مەخلووقەکان دەگرێتەوە.

وەلی هەر کاتێکی تێگیراوییەکی دەبوو و دادەما، سەرێکی لە عەلی ئەفەندی هەڵدێنا و چەند ساتێك لەلای دادەنیشت و خەمەکانی دەڕەوینەوە و پاك و سووکبار بەدڵێکی خۆش و شادەوە دەگەڕایەوە ماڵەکەی. خەڵك هەرچی دەڵێن، کەیفی خۆیانە، ئەو عەلی ئەفەنییە کەراماتی هەیە. گێلۆکە و بەستەزمان و خەمسارد و ترسنۆك و... لە هەمانکاتدا جوامێر و ئازا و ... خودایەگیان ئەو عەلییە چییە؟ سوور سوور دەزانێ ئەو ئاغا وەحشییانە قۆڵیان هەڵماڵیوە بیکوژن، دیسان هەر کۆسپ و تەگەرەیان دەخاتە سەر رێیان. بۆ دابەشینی زەوی و زاری ئاغاکان بەسەر وەرزێراندا، چیی لەدەست دێ دەیکا. واتە شادەماری ئاغاکان دەگرێ. ئەوە سوور سوور دەشزانێ ئەو ئاغایانە بە قوربانی گوللەیەکی گەرمی دەکەن و ساردی دەکەنەوە. بەڵام هێندەی نووکە دەرزییەك ناترسێ و دوودڵ نابێ و ناکشێتەوە. هەر جارێکی پێشی دەڵێی و ئاگاداری دەکەیتەوە وا نەکا، دەڵێ:"بڵێین چی. بۆ ئەوەی بژیێین، چیمان لەدەست دێ دەیکەین. ئیتر ئەگەر مردیشین، ئەوە مردووین." ئەوجار منداڵێکی بستەباڵا دێت و شرت و شۆی دەردێنێ و ئەویش متەقی لێوە نایە و لەجێی خۆیشی نابزوێ. دەڵێن هەر چاوی بە دەمانچە دەکەوێ زراوی دەچێ. هەر ناوێرێ سەیری چەقۆ و کێرد و شیتی وا بکا.

هەر قسەیەکی دەیکا، مانایەکی تێدایە. قسەکانی پڕ واتا و قووڵن. دەڵێی پەندی پێشینیانن. ئەوەی دەیڵێ... ئەگەر بێت و حوکمەت بیانبیستێتەوە پەتی لەملی دەکەن. دەیخەنە زیندانەکەی سینۆپەوە بۆ ئەوەی هەر لەوێدا بڕزێ. خۆ ئێمە برای نین، چۆن متمانەمان پێ دەکا؟ لای ئێمە قسەی وا دەکا بۆنی خوێنیان لێ دێ. قسەی وا دەکا، ماستی لەسەر ڕۆبکەی و لەپێش سەگی دانێی نایخوا. بەخوای ئەو ماستە بێ موو نییە. نهێنییەکی سەیر و سەمەرەی تێدایە. خەڵکەکەش لەبەر ئەوەی ئەو متمانەی پێ کردوون، خۆ ئەگەر دوژمنی قەستەسەریشی بن، ڕاپۆرتەکەی بە حوکمەت نادەن. کەس دڵی نایە ڕاپۆرتی لێ بدا. ئاخۆ عەلی ئەفەنی خۆی ئەوە دەزانێ؟ چۆن دەبێ نەیزانیبێتەوە. کوڕە سەگی وەك خۆی نییە.

عەلی ئەفەنی سەری بەرز کردەوە و وەلیی دیت، کە لەبەر دەرگاکەی حەپەساوە. بە ڕوویەکی گەشەوە هەستا و بەرەولای چوو و بە پێکەنینەوە دەرگاکەی بۆ کردەوە و گوتی:"سڵاو کاکە وەلی. ئەوە چۆنە ڕێت کەوتووەتە ئێرە. باش بوو ئێمەت هاتەوە بیر. ئەوە خۆر لە کام لاوە هەڵاتووە وا بیری ئێمەت کردووە. وەرە برالە، وەرە خۆ پیاو بەتەنێ دەمرێ..."

شادی لە چاو و ڕووی و موو و پێست و دەستەکانییەوە هەڵدەقوڵی. ئەو شەپۆلی شادییە وەلییشی داگرتەوە. ئەویش کەیفخۆش بوو و پێکەنین نیشتە سەر لێوی.

"ئاااای هەی. وەلی ئاغا، دا بڵێ بزانم ئاغا و بەگەکانی تۆ خەریکی چین؟"

"دەفەرمووی خەریك چی بن ئەو گەوادانە؟ سەعاتێك لەمەوبەر ئاغاکەم لێی پرسیم ئاخۆ پیاوم پێ دەکوژرێ؟"

"یانی ئەویش دەست پێ دەکا. کەوابوو نۆرەی تۆش هات. دەستیان خوێناوی نەبێ، کاریان سەر ناگرێ. ئەی تۆ چیت گوت؟"

"ئەمنیش گوتم، تەنانەت مێروولەیەکیشم پێ ئازار نادرێ."

"ئەی لێی نەپرسیی، چۆن ئەوهەمووە پیاوەت کوشتووە؟"

"ناتوانێ لێم بپرسێ."

"دەروێش چۆتە ئەستەمبوڵێ. لەخۆڕایی نەچووە. بێ و نەبێ شتێك لە گۆڕێیە. با بزانین چ دەقەومێ. ماوەیەکە کلکیان تێك ئاڵاندووە لەگەڵ ئاغاکەی تۆ."

"ئەگەر خراپی بۆ نەچووبێتم, پێم وایە ئاغاکەم خەریکە داوێکی بۆ دەنێتەوە."

"شکم کردبوو. پێم وایە ئەو مەسەلەی دیوارنووسینەش هەر لەبن سەری ئەو دایە. کاری وا چەپەڵ هەر لەو دەوەشێتەوە. حاجییە شێتەش لە خۆوە نایە ئەو قسانە بە دەروێش بڵێ. پێم

وایە ئەوەش هەر بەفیتی ئەوە. بەڵام دەروێش چۆن ئەوانە قەبووڵ دەکا؟ ئەوەم پێ سەیرە. دەروێش بەگ کابرایەکی زیرەکە. ئەتۆ دەڵێ چی، وەلی ئاغا؟"

"پێم وایە جارێ دان بەجەرگی خۆیدا دەگرێ. چاوەڕوانی دەرفەتە. هەموو شتەکان وەك ڕۆژی روون دیارن. هەمووی لە ڕۆژی ڕێپێوانەکەوە دەستی پێ کرد. یانی دەروێش بەوە نازانێ؟ خۆ ئەگەر دەروێش لێی روون بێتەوە کە هەموو ئەو کارانە لە بن سەری ماهیردا بووە، خۆڵ بەسەر ماهیر. تێدا دەچێ. ئەوجار ئاغام کارێکیشی بە حاجییە شێتەیە. پێم وایە هەر لەسەر ئەو مەسەلەیە بێ. ئێستا تێدەگەم..."

دوای ئەوە یەکێك هات بۆ عەریزەنووسین. عەلی ئەفەندی عەریزەکەی زوو بۆ نووسی و کابرای بە ڕوویەکی گەشەوە بەڕێ کرد. هەر کەس دەهاتە ئەو دووکانە، بە دڵێکی خۆشیەوە لەوێ دەڕۆیی. وەلییش هەر وای دەگوت. دیسان دەستیان کردەوە بە سوعبەت و جەفەنگ و باسی ئەو هاوڕێیانەیان کرد کە لە نێو فەلا و جووتێراندا خەریکی قسە و بانگەشە بوون. ئەوجار بۆلات مستەفا هاتە دووکانەکە. وەلی کەیفی پێی نەدەهات. نەك هەر کەیفی پێی نەیە، زۆریش خۆی لێ دەپاراست. هەر ئەو هات، وەلی هەستا و ڕۆیشت.

بۆلات مستەفا دوای سڵاو و چاك و خۆشی چووە سەر قسەکەی:"هەی ی ی ی، دەروێش چووەتە ئەستەمبوڵ. تۆ دەڵێی چی عەلی ئەفەندی؟ ئەو ماستە بێ موو نییە، دەزانی؟..."

عەلی ئەفەندی بە تووڕەییەوە گوتی:" با یەکتری بخۆن. یەکدی بخۆن و شەڕیان لە کۆڵ ئەو خەڵکە بێتەوە."

بۆلات مستەفا گوتی:"تۆویان نابڕێتەوە. مەسەلە شتێکی دیکەیە. یەکێکیان تێدا دەچێ، پێنجی دیکەیان جێی پڕ دەکەنەوە."

عەلی ئەفەندی بە پێکەنینەوە گوتی:"پێنجی دیکە دێن. دەی دیکەیان دێن و ئاخرییەکەی هەمووان یەکجێ دەڕۆن. وێکڕا."

عەلی ئەفەندی سەری لە ژیری و تێگەیشتنی ئەو بۆلات مستەفایە لە دنیا و پەیوەندیی نێوان خەڵك سووڕ مابوو. کابرایەکی سەیر بوو. سەیر و سەمەرە و کەللەرەق. شێست و پێنج ساڵان بوو. نەخوێندەوار بوو. لە گەنجێتیدا لە سەربازی رای کردبوو و نەچووبووە یەمەنێ، هەموو گەنجی ئەو دەڤەرەی لە خشتە بردبوو و لەبری ئەوەی بچن بۆ یەمەنێ، هەمووی بردبوونە چیای تۆرووس. کە باسی یەمەن دەکرا، بۆلات مستەفا ئاگری دەگرت.

"ئەمن هیچ کەیفم بەو وەلییە نایە کە هاتوچۆت دەکا. دەترسم بەڵایەکت بۆ بنێتەوە. ئەتۆش خۆ زمانی خۆتت بۆ ڕەوگیر نابێ و هەرچی بەدڵتدا دێ، بێ پێچ و پەنا دەریدەپەڕێنی. من زۆر دەترسم. ئەوە لەو کاتەوە کە یاخی بووە، دەیناسم. پیاوکوشتن و ئاوخواردنەوە لای وەك یەك بوو. وەك قەساب. لە حاڵێکدا لای تۆ خۆی دەکاتە پیر و پیاوچاك، کلکەسووتێ لەبەر ماهیر دەکا. ئەگەر بە قسەم دەکەی، خۆی لێ مەدە. پیاوکوژێکی وا هیچ خێر ناداتەوە. ئەو سەگەی بە سەولەی ئاغایان بەخێوکرابێ و بۆ بارەقەڵای ئەوان دەوەڕێ، نابێتە بنیادەم."

عەلی ئەفەنی زەردەیەکی هاتێ:"دەزانم. بەشکم نەشبێتە بنیادەم. بەڵام خۆ ناکرێ بنیادەمێك فڕێ بدەی لەبەر ئەوەی، ئەم لایەنەی باشە و ئەویتری خراپ. هەر باشێك لەوانەیە لایەنێکی خراپ و هەر خراپێکیش لەوانەیە لایەنێکی باشی هەبێ.

لەو کاتەدابوو وەلی دیسان گەڕایەوە و گوتی:"ئەو شێتە کەرانبابگاوەم نەدۆزییەوە."

خۆی پێ نەگیرا و ڕۆیشت. عەلی ئەفەندی کە هەستی کردبوو وەلی ناتوانێ چاو لە چاوی بۆلات مستەفا بکا، گوتی:"کاکە مستەفا، باشە کابرا ئەگەر خراپەشی کردبێ، هەر واباشتر نییە لەگەڵی باش بی؟ ئیتر وەختێك ئەوان لە خراپەی خۆیان پەشیمان دەبنەوە، باشتر نییە وەڕوویان نەدەیەوە؟"

"ڕۆڵە گیان، چاوی هیوات لە نارەسەنان بێ، چاوت پڕ دەبێتەوە لەخۆڵ. ئەو وەلییەی من دەیناسم، تەپکە و داو بۆ دایك و باوکیشی دەنێتەوە. ئەمن ئەو هەمووە یاخی و چەتەیە دەناسم، لە ژیانمدا فێڵبازتر و قەسابتر و ڕقنتر و بەچاوتەنگتر و بێبەزەییتر لەوەم نەدیتووە و نەمبیستووە. ئەوە پێم گوتی. ئەگەر ئاگات لەخۆت نەبێ، بەڵایەکت بەسەردێنێ هەر مەپرسە. جا بزانە چەند گۆبەندێکیش بەسەر ماهیر دێنێ. ئەوە من گوتم و تۆش بیستت..."

وەلی چەند جارێکی دیکەش بە بەر دووکانەکەدا هات. سەیرێکی ناوەوەی کرد. بۆلات مستەفا هێشتا لەوێ دانیشتبوو. ئاخر جار کە بەوێدا رابرد، حاجییە شێتەشی لەگەڵدا بوو.

حاجی یەکێکی باریکەڵەی درێژی چاوی درشت و کاڵ بوو و دەموچاوێکی چرچ و لۆچاویی هەبوو. زۆربەی جاران شادییەکی خەست لە دەموچاوەکەی دیار بوو. جاری واش بوو ئەوەندە گرژ و مۆن بوو نەتدەوێرا سەیری بکەی.

وەلی، حاجیی هێنایە بەر دەرگا و گوتی:"ماهیر ئاغای برادەرت دەیەوێ بتبینێ. کارێکی گرنگی پێتە. بڕۆ بزانە دەڵێ چی. خودات لەگەڵ بێ."

حاجی بە پێکەنینەوە وەژوور کەوت. ماهیر بە پێوە بوو و پیاسەی دەکرد. ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو و چاوەکانی گرژ و مۆن بوون.

"وەرە بزانم حاجی. دەنگ و باس؟ دەرت خست پیاوی و زۆر مەردی. بەڵام تۆ قەرار نەبوو لە شاری بڕۆی؟ دەروێش چووەتە ئەستەمبوڵ. ئەو لە خۆڕایی ناچێتە ئەستەمبوڵ. لێت سوور بێ بەلایەك بەژوور سەرتەوە دەخولێتەوە. بەلایەکی گەورەش. کە ڕۆیشت بەمنی گوت: دەچمە ئەستەمبوڵ، بەڵام کە گەڕامەوە، ئیتر حاجی زیندوو نابێ. ئەوە خەتای منە، بەڵام هەڵەیەکە و کراوە. تۆ لە بەلایە دوور نی برالە. ئێستا دەڵێی چ بکەین؟ دیارە دەبێ ڕزگارت بکەین. لەوەودوا باش نییە تۆ لە شارۆچکە بی. دەترسم پیاوەکانی دەروێش سەرت بەگۆمدا بکەن. تا زووە خۆت دەرباز بکە. ماڵ و منداڵت هەڵگرە و یەکەوڕێ بچۆ بۆ ئەدەنە یان ئەنتەپ یان ماراش. هەرچۆنێك بێ، دەبێ بچیتە جێیەك و دوو سێ ساڵان بەو لایەدا نەیەوە. هەموو خەرجەکەشت لە ئەستۆی من. هانێ ئەوەش پارە. بەیانی بڕۆ. ئەگەر گیانی خۆتت خۆش دەوێ..."

حاجی پارەکەی لێ وەرگرت و چاوی لە ژێڵڵا هات. پارەکەی زۆر بوو. ماهیر ئەو هەمووە پارەیەی بۆچی دەدایێ؟ دیارە شتێك لەگۆڕێ بوو. دیار بوو تێی گیراوە. کابرا ئەو هەمووە پارەیە بدات، دەکرێ زیاتریشی لێ دەربێنی. چەند جارێك پووڵەکەی دەستاودەست کرد و گوتی:"ئاغا، ناتوانم لێرە بڕۆم. ناتوانم بچم هیچ کوێ. لەهیچ کوێ ناژیم. ئەتۆ دەفەرمووی دوو سێ ساڵان، ئەمن هەر لەو شارۆچکەیە وەدەر کەوم، دەمرم. دەروێشیش هیچ نازانێ. ئەو لەمن تۆقیوە. ئیتر ئەو دەورو دووکانە بەسەرچوو کە بە ئامازەیەکی ئەو پیاویان دەکوشت. ناتوانێ گونیشم بگرێ. ئەو پارەیەش بەشی هیچ کوێ ناکا. دوایی دەڵێن حاجیە شێتە لە دەروێش ترسا و دەستی لە ماڵ و حاڵی خۆی هەڵگرت و بۆی دەرچوو. ئەمن ئیتر ناتوانم تا مردن ئەو پەڵەیە لە شانم بکەمەوە. ئیتر کەس بە سەگیشم دانانێ. ئەو پارەیەش بەشی هیچ ناکا. بۆ ئەوەی بچمە شوێنێکی دیکە پارەی زیاترم پێویستە..."

ماهیر بەبێ ئەوەی متەقی لێوە بێن چووە ژوورەکەی دیکە و لە حاڵێکدا دەرگای ژوورەکەی دەکردەوە، بە ڕقەوە سەیرێکی حاجیی کرد. حاجیی ئاگای لێ بوو. بەدڵیدا هات، تەڕ لە داوێ کەوتووە.

ماهیر بە چەپکە دراوێکەوە گەڕاوە و گوتی:"ها. ئەوەش پارە. بەشی شەش مانگی ئەدەنە یا ئەستەمبوڵت دەکا. دواتریش بۆت دەنێرم. چاکەیەکی باشت لەگەڵ کردم. دەبێ ژیانت

بپارێزم. ئەگەر لەو شارۆچکەیەدا بمێنیتەوە، پیاوکوژەکانی ئەو دەتفەوتێنن. هەر لەوانەیە ئێستاش بەدووتەوە بن. ئاگات لە خۆت بێ. ئەگەر دەتوانی هەر ئێستا بڕۆ. دوایی کەلوپەلەکەت بەرە."

حاجی گوتی:" ناتوانم ئێستا بڕۆم. بۆ ئەوەی بتوانم خۆم بۆ رۆیشتنێ ئامادە بکەم، لانیکەم دە رۆژم پێ دەچێ."

ماهیر بە رەزامەندییەوە گوتی:"باشە، دە رۆژ. بەر لەوەی دەروێش بێتەوە بڕۆ. ئەو منداڵەکانت هەتیو دەکا. بەر لەوەی بڕوا وای پێ گوتم. گوتی ئەستەمە بێڵم بژی. کارێکی خراپم کرد. بەلایەکم تووش کردی کە... عەزابی ویژدانم هەیە. ئەگەر ئەو جانەوەرە تۆ بکوژێ، ئەمن ئیتر ناژیم. دەچی و ئیتر روو لەو شارۆچکەیە ناکەیەوە. تێگەیشتی؟ پێ لەم چارۆچکەیە نانێیەوە. هەتا ئاو بە ئاورێدا نەکرێ، بەولایەدا نایەوە. نابێ کەسیش بەشوێنت بزانێ. ئەو دەستت لێ هەڵناگرێ. بەڵێنم دەدەیەی؟"

"بەڵێن بێ، بەڵام ئەگەر بیری شاریم کردەوە، چی؟ بۆ یەك دوو رۆژیش ناکرێ بێمەوە؟"

"نا، نابێ بێیتەوە. هەر پێت بزانێ، دەتکوژێ. هەتا لە هەندەران بی، خۆم سەراسۆی منداڵەکانت دەکەم. ئەگەر باشیان پێ رانەگەیشتم، بگەڕێوە. ئەو کات ئیتر بەرپرسیارەتیی منداڵەکانت لە ئەستۆی من نابێ. ئیتر عەزابی ویژدانیش ناکێشم. ئەو دەم دەڵێم ئەوە خۆی هاتەوە و خۆی بەکوشتن دا. هەموو مانگێ پێنجسەد لیرەت بۆ دەنێرم. مووچەی مودیر ناحییەیەك..."

حاجی چووبووە فکرەوە. بێ و نەبێ شتێك لەگۆڕێ بوو. ماهیر کابرایەك نەبوو مانگێ پێنج سەد لیرە بدا بۆ رزگارکردنی گیانی وی. دیارە تێگیراوییەکی هەبوو. بەڵام چ تێگیراوییەك؟

گوتی:"باشە. مادام تۆ بە ژن و منداڵەکەم رادەگەی، ناگەڕێمەوە. چ بکەم گیان لە هەموو شتێك شیرینترە. سوپاسی تۆش دەکەم کە پەرۆشی گیانی منی. بەڵام ئەو ناتوانێ من بکوژێ. دیسانیش دەڕۆم. ئەگەر لێرە بمێنمەوە، کێ ئەوەندەم پارە دەداتێ... لە ماوەی دە رۆژاندا خۆم ئامادە دەکەم. ماڵاوایی لە دۆست و برادەران دەکەم و دەڵێم: برادەرێکی دەوڵەمەندم لە ئەسکەندەروون هەیە، بانگی کردوومەتە لای خۆی."

ماهیر چاوی زەق بوونەوە و گوتی:"نا، نا، بەکەس مەڵێ دەچییە کوێ. ئەودەم دەتدۆزێتەوە و دەتکوژێ. ئەوە چ دەکەی؟"

حاجی بەدەم پێکەنینەوە، گوتی:"ئەوەندەش کەر نیم ئاغا. کە دەڵێم دەچمە ئەسکەندەروون، لە مەرسین سەر هەڵدێنم. دەمەوێ بچمە مەرسین. برادەرێکی سەردەمی سەربازیم لەوێیە بە ناوی قورقوت. دەچمە لای ئەو."

"هەر لەمنت کەوێ حاجی. ئەتۆ زۆر ئاقڵی. گاڵتە نییە، گیان لەگۆڕێیە. خەمی گیان پیاو ئاقڵتر دەکا."

"ئاقڵتری دەکا ئاغا. ئاقڵتری دەکا. بەڵام ئەگەر راستیت دەوێ، دڵم لێرە بەر نابێ... ژیانی دوور لەو شارۆچکەیە بۆ من دۆزەخە. بۆن و بەرامەکەی لە زەینم نایەتە دەرێ... باشە ناکرێ لانیکەم هەر بە دوو مانگ شەوێك سەرێك لێرە هەڵێنمەوە؟"

"جارێ بۆ چەند مانگێك واز لێرە دێنی. گوتم نابێ بێرەدا بێیەوە. بەڵێن بدە نایەوە. بەڵێن، بەڵێنی پیاوانە."

"ئەمن پیاوم ئاغا. گفتم گفتی پیاوانە، ترِ نییە. گفتی خۆم ناشکێنم."

"زۆر باشە. دەکرێ برۆی. خێرت بێتە رێ. ئەمنیش چەندساڵێك دواتر دەچمە ئەستەمبوڵ. پێوەم ناوەندێکی بازرگانی لەوێ بکەمەوە. ئەتۆش دەبەمە ئەوێ. زۆرم پێویستی بە پیاوی راستگۆ و دەست و دڵپاکی وەك تۆیە و هەر وا سووك و ئاسان لە کیس خۆمت نادەم. دڵم نایە بهێڵم پیاوکوژەکانی دەروێش بتکوژن. خێرت وەرِێ بێ براله. بەخوات دەسپێرم. کاری خێر تا زوو بیکەی درەنگە. تا زووتر برۆی درەنگە..."

تا بەر دەرگایە حاجیی بەرِێ کرد. هەردووکیان لە خۆشییان گەش ببوونەوە. ئەگەر پێیان شوورەیی نەبوایە، هەردووکیان سەمایان دەکرد.

حاجی هێشتا چەند هەنگاوێك دوور نەکەوتبۆوە، تێی هەڵکردە گۆرانی. گۆرانیی دەگوت و بەدەم رێگەوە چەقڵەسەمای دەکرد. گیانەکەم گیان. بەردەوام دراوەکەی لە گیرفانی دەردێنا و سەیری دەکرد. باشە ئەو هەمووە پارەیەی بۆچی دابوویێ؟ ماهیر پیاوێك نەبوو مفت و خۆرِایی پارە بە یەکێك بدا...

نایدا. بەڵام چیی لە حاجیدا شك دەبرد؟ گەرمای دراوەکەی لە دەستیدا هەست پێ دەکرد. ئەو دە رۆژە لەو شارۆچکەیەدا وەك شا دەیگوزەرێنێ. لە پاشان لێ دەدا و دەرِوا. لێرە چیی هەیە؟ ئەو شارە نەبێ یەکی دی. ئەوی دیکە. بەڵام ئەگەر تۆزێك پتر خۆی راگرێ، بلێی نەتوانێ پارەی زیاتری لێ دەربێنێ؟ دیارە دیسان دەیتوانی فێڵێك بکا. کورِە وەرە بزانە لەو چەند رۆژەدا چەندەی پارە وەرگرتووە؟ بەڵام کابرا ئەوەندەی پارە هەیە مەگەر خودا بزانێ.

لەنەکاو قەڵافەتە تووڕەکەی دەروێش بەگی هاتەوە بەر چاوی. چۆن دەمانچەی لێ ڕاکێشابوو لێ بدا. ئەی لەو کابرایە چەندە تووڕەیە و زوو هەڵدەچێ. چەندەش شایی بەخۆیە. بە گەوادێك، وەك برێشکەی سەر سێڵ هەڵبەزییەوە. خەڵکی ڕۆژێ هەزار جاران بە یەکتری دەڵێن "شاخدار" و هیچیشیان لێ نایە. نە دنیا خراپ دەبێ و نە ئاسمان دەڕووخێ. بەڵام ئەو دەروێشە دەڵێی چاوی لەچاوی خەڵکی ڕەشترە. وەك بڵێی ئەو لەوان مەزنتر بێ... کوڕە نەکا، وەك ماهیر دەڵێ، ڕێ و نیشان بکێشن بۆ کوشتنی؟ ئەو وا و وا پێکراوانە هەموو شتێکیان لێ دەوەشێتەوە. بەڵام کوڕە نا، ئەوە هەر هەڵچوونێك بوو. کوا لەسەر "گەواد" گوتنێك پیاوی دەکوژن. بەشکم بیەوێ بمکوژێ. خۆ ئەوانە وەك نیسك بەر و پشتیان بۆ کەس نییە.... ئەوانە لە سەر هیچ و پوچ ڕادەسپێرن پیاو بکوژن، بەخودا ڕادەسپێرن. بێ ئەملا و ئەو لا دەکوژن و هیچیش نابێ.

مووی لێ بوونە نەشتەر. شادییەکەی لەپڕ کاڵ بووەوە. مەرگ هات و لەبەردەمیا قوت بۆوە. مەرگ چەقۆیەکی خوێناوی بوو. حاجی لە ژیانیدا چەقۆی لە چەند کەسێك دابوو. بەڵام نەك بۆ کوشتنێ. هیچ کامیشیان نەمردبوون. هەر بۆ ئەوەش کە بڵێن چەقۆکێشە... زۆر لێزان بوو بۆ چەقۆ وەشاندنێ. هەر بەراستی ماهیر بۆ ئەوەندە پێداگرە لەسەر ئەوەی لەو شارەم دوور بخاتەوە؟ نەکا داوێکی نابێتەوە؟ نا بابە، داوی چی؟ بنیادەمێکە و نایەوێ لەسەر ئەو بنیادەمێك بکوژرێ. نایەوێ...

ماهیر لە پەنجەرەوە چاوی لێی بوو. بەخۆی دەگوت، پەکوو، ئەگەرچی زۆریشی تێ چوو، بەڵام لە مەرگ ڕەخساین. تۆ بڵێی ئەو شێتە نەگبەتە لەسەر بەڵێنەکەی خۆی بێ؟ دیارە دەبێ. هەرچۆنێك بێ، پیاوە و بەڵێنی پیاوان، قورسە. دیارە ترسنۆکیشە. خۆ ئەگەر بڕوا بکا دەروێش دەیکوژێ، دوو قاچی هەیە، دووی دیکەش قەرز دەکا و خۆی دەرباز دەکا. بەڵام زۆری تێچوو. مانگێ پێنج سەد لیرە. لەوە کەمتری قەبووڵ نەدەکرد. قەیناکا، بە جۆرێك لە دەروێشی دەردێنمەوە. ئەگەر یەکێکم دەست کەوتبایە سەری ئەو حاجییەی بەگۆمێدا کردبا...

ئێستا دەبێ بچێتە ئەدەنە. دەبێ چەند ڕۆژێك بەخۆی ڕابگا و کەیف و نەهەنگێك بکا و زگی تێر بکا... جاری وابوو ماهیر زۆر دڵی توند دەبوو. لە ژیانیدا زۆر مەترسیی بەسەردا هاتبوو. بەڵام شتی ئاوا نا. ئەوەیان زۆر سامناك بوو. مەرگ لەسەر سەری لەنگەری گرتبوو. حوکمی ئیعدامەکەی بە ملیەوە هەڵواسرابوو. هەر ئەوەندە دەروێش بەگ ببیستێتەوە، کە ئەو ئاگرە لە گۆڕی ئەو هەڵاییساوە، نەیدەهێشت چرکەیەکیش چییە بژیێ.

ئەگەر حاجییە شێتە رۆیبایە، هەموو شتێك دەبڕایەوە... رۆژ بە رۆژ پتر دەروێش بەگی دەکەوتە بەر چنگی و تۆڵەی کفنە سپییەکە و شمشێر و سەر و پێ رووتەکەی لێ دەکردەوە. لەو رێگەیەدا دەستی بە پارەوە نەدەگرت. چش لە مڵك و ماڵ.

لە حاڵێکدا نەیدەتوانی ئەو خەیاڵانە لە مێشکی دەرباوێ، بەخۆی دەگوت: ئەتۆ شێت بووی ماهیر. چما یەکێك شێت نەبووبێ، ئەوەندە رق ئەستوور دەبێ؟

منداڵە هەرە بچووکەکەی هاتە لای. منداڵەکەی هەڵگرت و لەباوەشی گرت. بەدەم ماچکردنی منداڵەکەوە دەیگوت:"رۆڵە، رۆڵە گیان. رۆڵەکەم، قلی قلی قلی..."

منداڵەکە پێدەکەنی و ئەویش پێدەکەنی. ژنەکەی چاوی لە گەمەی ئەو و منداڵەکەی بڕیبوو. ماهیر بە دەگمەن یاریی لەگەڵ منداڵەکانی دەکرد. ئەو دەمانە نەبێ کە زۆر بە کەیف و دەماخ دەبوو. لەو ساڵەی رابردوودا زۆر پیسی لێ قەومابوو. دنیای لێ ببووە زیندان. منداڵەکەی دانا و گوتی:" مەلاحەت گیان، دەچمە ئەدەنە. ئەگەر شتێك قەوما، تەلەفۆنم بۆ بکە. بۆ کریستاڵ پالاس، باشە؟"

ژنە سەری بەرداوە و گوتی:"باشە."

# ٨٣

گوتی:"هەموومان خەریکین دەڕۆین... هەموومان دەڕۆین. ڕۆیشتن ئەستەمە. ئەستەم چییە؟ دوای ئەوەی هەموو شتێك لەدەست چوو، ئیتر مانەوە مانای چییە. چش..."

مەرسینی پێ دەزانی. یەکەمجار لە مەرسین دەریای دیتبوو. ئەو ڕۆژەی وەبیر هاتەوە کە دەریای دیبوو. ئەو کات تەمەنی هەر حەڤدە سالێك دەبوو. لە شەمەندەفەرێ دابەزیبوو و لەو شارە غەریبەدا کەسی نەدەناسی. چووبووە مەرسین دەریا ببینێ. بەیانی باران دایکردبوو و دواتریش خۆشی کردبۆوە. ڕێ و ڕێ چوبووە کەنار دەریا و لەسەر تەپۆلکەیەك دانیشتبوو. دەریا هەتا چاو هەتەری دەکرد سوور دەچۆوە. سوورباو و قوڕاو. زۆر لە دوورەوە ڕەش دادەگەڕا، خۆ دەریا هەمیشە ئاوا نابێ. لە سۆنگەی ئەو بارانەوە وای لێ هاتبوو، بەڵام ئەو لەو ڕۆژە بەدواوە هەر بەوجۆرەی دەریا هاتبووە بەرچاوی. تامی تاڵە و تفت و تێکەڵ پێکەڵی دەریای لە مێشکیدا مابۆوە.

مەرسین بەرەوخۆی ڕادەکێشا. دڵی بۆ دەریای قوڕاوی تۆسقاڵێکی لێ هاتبۆوە. مەرسین دەمێك بوو دەریای لەبیر چووبۆوە. حەژمەتی دەریای لیخن لە ناخیدا بەخەبەر هاتبوو. ماسیگرەیەی سپی بەسەر دەریاکەوە باڵی لێك کردبۆوە و دەخوشی. هەر مەلێکی دەریایی؟...

"دەچینە مەرسین."

لە مەرسین قاوەخانەیەك دەکاتەوە. مانگێ پێنج سەد لیرە. پارەیەکی زۆرە. قاوەخانەش نەکاتەوە پێی بەڕێوە دەچێ. تەنانەت حەوجێی بە قومار و شتی واش نابێ. ئەو بێت و مانگێ پێنجسەد لیرەی داهات هەبێ، چما خودا لێی گۆڕیوە قوماریش بکا؟ هەموو ڕۆژێ دوانیوەڕۆیە دەچێتە دەم دەریا دادەنیشێ. منداڵەکانیشی وەبەرخوێندنێ دەنێ.

بەڵام وەك بلێی فێڵێك لەگۆڕێ بوو. ماهیر قاباقچی ئۆغلی، خودا کەری نەکردبوو، کە مانگێ پێنج سەد لیرە بداتە ئەو. مووچەی مودیر ناحیەیەك... زۆر سەیرە. بەڵام بێت و پارەشی نەداتێ و لە مەرسین پشتی تێ بکا، جا ئەویش دەزانێ چیی بەسەر دێنێ. کاتێ نەفەرێك قوڕ بەسەر دەکەی، دەبێ ئاگاشت لێی بێ. قوڕبەسەرکردنی بنیادەمێك یانی چی؟

یانی چی بنیادەمێك بخەیتە مەترسییەوە؟ دەروێش بەگ زۆری کوشتبوو. هەر ئاماژە بکا، پیاوی بۆ دەکوژن. باشە دەروێش بەگ قەبوولّی دەکا؟ لە نێوەندی بازاڕێ لەسەر هیچ و خۆڕایی پێی بلێی ئەتۆ قورمساغی. شتی وا دەبێ؟ هەقیشێتی. باشە گەوادبوونی ئەم و ئەو بەتۆ چی؟ هەستە، بەتۆ چی. دەی بیشێلە، ئەوەیە ئاکامەکەی. ئێستا دەربەدەر دەبی و دەنێردرێیە مەرسین. دەرت دەکەن. جا ئەتۆش مەڕۆ. مەڕۆ بزانە چ دەقەومێ. سەگباب. چما ئەتۆ بنی رانت دەخورا لەگڵ بەگ رۆچووی؟ جا بزانە چیت لێ دەکەن. هەتا گۆڕ بە گۆڕیان نەکردووی، بیپێچەوە و بڕۆ. خێراکە. هەتا ئەو کافرە لە ئەستەمبولێ نەگەڕاوەتەوە، ملی خۆت بشکێنە. گەوادی سەگباب. شاخەکانی لە ئەستێرەکانیش تێپەڕیون، کوڕی ئەستەمبولّ نەماوە سواری کچەکەی نەبووبن. کچی شارۆچکە ناتوانن بە کوڕە ئەستەمبولّی بلّێن نا. کوڕی سمێل باریك و کچانی. زۆربەیانم لە سینەماکان دیتووە. کە لە سینەمادا فیلمەکانیان دەبینن، وەختە بۆیان شێت بن، جا مەخوازە رووبەڕوو خۆیان ببینن، هەر مەپرسە. خۆیان پێ ناگیرێ...

بەرەو پردەکە دەڕۆیشت. بەبێ ئەوەی بەخۆی زانیبێ، لە بازاڕەکە پەڕیبۆوە. یەك دوو کەس سلّاویان لێ کردبوو، هەر ئاگاشی لێیان نەببوو. شتێکی وەك گۆرانیی لە بن لێوانەوە دەگوتەوە. وەزمان هاتبوو کە "قەوزە بەر چاوەکانی گرتووە. ئەمن دەڕۆم، چاو ڕەشەکەم تۆ بمێنەوە، تۆ لێرە بە. ئەمن دەڕۆم..."

گەیشتە پردەکە. چاوی لە ئاوەکە بڕی. تەرکی ئاوەکە دەبینرا. پێنج شەش مانگێك دەبوو بەپێچەوانەی لووزەوی ئاوەکە مەلەی دەکرد. بایەکی فێنك هەلّیکردبوو. بە دینامێت زۆریان ماسی گرتبوو. ماسیی داماو. دوایی دەستیان کردبوو بە خواردنەوە. گوتی:"تۆ، بمێنەوە."

ئیتر لەوێ دوور کەوتەوە.

عارەب سائیم لەکوێیە؟ دەبێ بیدۆزمەوە. عارەب سائیم بەگ کوڕە غەوارەیەکی، بە تین و گوڕ. پیشەکەشی ئاسنگەری بوو. زۆر لەگەلّ قومارکەرەکاندا برادەر بوو، بەلّام خۆی قوماری نەدەکرد. دەمیشی لە ئارەق نەدەدا. بەلّام لە ئارەق خۆرەکان جوێ نەدەبۆوە. پارەی دەدا بەوانەی دەیاندۆڕاند و ئارەقی بۆ ئەوانەش دەکڕی کە پارەیان نەبوو.

ئاسنەوالّەیەکی سوورەوەکراوی دەکوتا. پزیسك لە ئاسنەکە دەبووەوە. بنەبانی دووکانەکە تاریك بوو. ئاسنە سوورەوەکراوەکە جار و بارە پەردەی تاریکییەکەی دەدڕی. تا ئێستا سەری بە دووکانەکەی عارەب سائیمدا نەکردبوو. سائیم هەر چاوی پێی کەوت، زەردەیەکی لە لێوانی گەرشا. سەرسووڕمانێکیش بە چاوانیدا هات. ئاسنەوالّەکەی لە ئاوەکە رۆکرد. ئاوەکە چزەی لێوە هەستا. گوتی:"بەخێر هاتی حاجی گیان. دەنگ و باس.

حاجی گوتی:"دەڕۆم براله. ئیتر کەس چاوی پێم ناکەوێتەوە. ئیتر پێ نانێمەوە ئەم شارۆچکەیە. هاتم ئاگادارت بکەمەوە."

"بۆکوێ؟ بۆ؟ باشە بۆ دەڕۆی؟"

"دوور دەخرێمەوە. زۆر دوور، دەچمە ئەسکەندەروون. دەروێش بەگ لەدین دەهری بووە و گوتوویەتی ناهێڵم بژیێ. هاتمە لات کە... نەکا پێت وابێ ترساوم. شتێکی دیکە لە گۆڕێیە. موویەك لەو ماستەدایە. ئەمن هەر نازانم ترس چییە. چما بنیادەم لە مەرگیش دەترسێ؟ ئاخۆ دەروێش بەگ هەر بەراستی من دەکوژێ؟ مەگەر من چیم پێ گوت؟ تەنیا سوعبەتێکی ئاساییم لەگەڵ کرد. بەڵام گۆیا لەدڵی گران هاتووە و زۆریشی پێ تێك چووە."

"باشە بۆ دەتکوژێ؟ بێت و بەڵایەکت بەسەر بێ، هەمووان دەزانن بەفیتی ئەو بووە."

"وایە، بەڵام هەر دەشبێ بڕۆم. دەشڕۆم."

"یانی دەتەوێ بڕۆی، ها؟"

"دەمەوێ بڕۆم. ئەویش بۆ ماوەیەك درێژ. بەڵام مانگێ شەوێك دێمەوە سەرتان لێ دەدەم."

"هەی یی ی."

"ئێستا تۆ پێت وایە ئەو کابرایە ئەمر دەکا بمکوژن؟"

"لێی گەڕێ. بۆ دەبێ ئەمری کوشتنت بکا؟ ئیتر ئەو سەردەم نەما. ئێستا هەر پێ لە مێرووله‌یەك بنێی، سەرت هەڵدەقەنن. کەیفی خۆتە چ کارەی. جا بەگی یان پادشا. مەحاڵە. بەڵام ئەگەر هەر بڕیارت داوە بڕۆی، بڕۆ."

"ژن و منداڵەکەشم دەبەم. منداڵەکانم دەنێمە بەر خوێندن. زیاتریش لەبەر منداڵەکانە کە دەڕۆم. ئەگەر لێرە بن، دەرس و مەرس ناخوێنن و ئاخرییەکەشی وەك خۆم بەرەڵڵا دەردەچن. بەڵام لەوێ دەرسێ دەخوێنن و بۆ خۆیان دەبنە پیاو. نا، نا، لە دەروێش بەگ ناترسم. لە مەرگیش ناترسم. مەرگ دەرمانی نییە. ئەو حوشترە لە بەر دەرگای هەمووان دەنوێ. وەك دەڵێن هەمووان قافڵەی بەر و دواین. ئاخۆ کەس دەتوانێ لە چنگ مەرگ دەرچێ؟"

"نا، نا، نابێ."

"دەی باشە. ماڵاوا. ئەمشەو وەرە باخچەی عومەر. بەزم و ئاهەنگێك بۆ هەڤاڵان دەگرم. بەزمێك بۆ هەموو هەڤاڵان، کە گەردوون سەری سوور بمێنێ. چەندی دڵت دەخوازێ پارەم هەیە."

بە کەیفخۆشییەوە سائیمی بەجێ هێشت. لە خۆشییان باڵی گرتبوو. لە بازاڕێ تووشی هەر کەس دەبوو، سلاو و چاك و چۆنیی لێ دەکرد و دەیگوت:"ئێرە بەجێ دێڵم. خودا بتانپارێزێ برادەرینە. دەڕۆم بۆ ئەوەی منداڵەکانم بنێمە بەر خوێندنێ، با بچنە زانکۆ. ئەگینا هێندەی مێشێك ناترسم لە گەوادییەکەی دەروێش."

هەر دەڕۆیشت، خەڵکەکە وێکرا قاقایان دەکێشا. دەیانگوت کوڕە وەرن بزانن کێ دەیەوێ منداڵەکانی بنێتە بەر خوێندنێ. ئەوەیان دەگوت و قاقایان دەکێشا.

چووە ئاشەکە. چاری بڕییە ئەو ئاوەی بە هاش و هووش لە لووساوکەوە دەڕژایە کۆرەگەی ئاشەکەوە. ئاشەکە بۆنی ئاردی لێ دەهات. ئاوەکە، دەبووە تۆز و کەف. کەف. هاشوهوش و گرمەی ئاوەکە گوێی پیاوی کەڕ دەکرد. هەرای کرد:"هۆی ی ی ی، دەمەوێ بڕۆم. بەڵام نەك لە ترسان، گووی سەگ بە گۆڕی بابی وەی لە مەرگ دەترسێ..."

لە نەکاو مەرگ لەبەر چاوی قوت بۆوە. لە پڕ خۆی بەمردوویی هاتە بەرچاو. دەست و پێی سڕ بوون. ئەو مەرگە سەمەرەیەکی تاڵ و ئەستەمە. لە هیچ شتێکی دیکە ناچێ. گاڵتەی پێ ناکرێ. بنیادەم دەفەوتێ و تێدا دەچێ... بۆ تاهەتایە. ئیتر ناشبێتەوە. ساڵ و مانگان تێدەپەڕن و بنیادەم ئیتر نییە و نییە. گۆشتیشی کرم دەیخوات. ئێسك و پرووسکی دەڕزێ. کاژەڵاك و کاسەسەری لە گۆڕستانان دیتبوو. دیتبووی و نەیتوانیبوو سەیریان بکا. بۆ سەیرکردنێش نابن. مەرگ زۆر دژوارە، زۆر... بنیادەم دەمرێ و ئیتر هیچی لێ نامێنێتەوە. هیچ شتێك.

بە هەڵەداوان لەوێ دوور کەوتەوە. مانەوەی لە شارۆچکەکە، تەنانەت بۆ چرکەیەکیش حەرامە. ئەو سەگە پیاو دەکوژێ. بێ ئەملا و ئەولا.

چیی نەمابوو خۆر ئاوا بێ. یەکەوڕێ بەرەو ماڵەکەی رای کرد. ژنەکەی وەك جاری جاران، بە مرچ و مۆنییەوە بەپیرییەوە چوو. ئەو ژنە قەت زەردەیەکی نەدەهاتە لێوی. بەڵام ژنێکی فیداکار بوو. دایك بوو. دایك، ژن بوو. ژنێکی بەتەواو مانا. شای ژنان. نەریمان.

"دیسان چ بووە ژنەکە، قوڕت بەسەرداکردووە؟ نێوچاوانت بکەوە بزانم. پێ بکەنە گیانەکەم، پێ بکەنە. خەریکە دەڕۆین. دەچینە ئەسکەندەروون... لەوێ دەژێین. منداڵەکانیش دەنێرمە خوێندنێ. هەموو مانگێش پێنج سەد لیرەمان بۆ دەنێرن. چاو سەیری ئەو هەمووە پارەیە بکە..."

ژنە، پتر نێوچاوانی تێك نا. پارەی وا زۆری، گەلێ جاران پێ دیتبوو. بەڵام چما بەدەستییەوە دەمایەوە؟ دەیزانی پاش سەعاتێکی دیکە هەمووی بە ئاوێ دادەدا. دەستی برد و گوتی:"بەشێکی بدە بە من."

هەرچەندی لە چنگی دەرهێنابایە، بە قازانجی بوو.

حاجی چەپکی دراوەکەی بۆ فڕێ دا و گوتی:"ها، هەر هەمووی بۆ تۆ. پارەی قومار نییە. پارەی کۆچکردنە."

دراوەکە، بڵاو بووەوە. ژنە دەستی کرد بە کۆکردنەوەیان.

"بڕێکم بدەیە. دەمەوێ جێژنەیەك بۆ هاوڕێکانم بگرم. کۆڕێك بۆ دابڕانمان. ئیتر دەبێ بڕۆین. لە زێدی خۆمان دەردەکرێین. لە نیشتمانەکەمانمان دەردەکەن. دەروێش بەگ، خۆ دەستی لەسەر دەست دانەناوە. داوێکی بۆ ناوینەتەوە. بیستوومە پیاوی داناوە بمکوژن. بیستووتە؟ ئەگەر زۆر زوو دەرنەچین، سەرمان بە فەتەرات دەچێ."

ژن:"دیارە دەست لەسەر دەست دانانێ. ئەتۆ دەچی و لە نێوەندی بازاڕێ و لەبەر چاوی دۆست و دوژمن شرت و شۆی کابرایەکی ئاوا مەزن دەردێنی، دەشتهەوێ ئەو کاری بە کارتەوە نەبێ؟ جا مادام وایە، هەتا درەنگ نەبووە، گیانی خۆت نەجات بدە."

حاجی بە پێکەنینەوە گوتی:"چ نییە ژنەکە. مەسەلەی کوشتن و شتی وا لە گۆڕێ نییە. ئەو چووەتە ئەستەمبوڵێ و بەو شارۆچکەیەدا نایەتەوە. گوتوویەتی ئەمن ئیتر دوای ئەو دەردەی حاجییە شێتە پێی دام، ناتوانم روو لەو شارە بکەمەوە. مەسەلەی کوشتن نییە. بەڵام شتێك لە گۆڕێیە، چیی دەکەم ئەقڵم نایبڕێ. ئەو رۆیشت و ئێمەش دەڕۆین. مانگێ پێنج سەد لیرە، مووچەی پارێزەرێکە. دەساڵ، پازدە ساڵان، مانگێ پێنج سەد لیرەمان بە دەست دەگا. جارێ ئەو پارەیە راگرە. چەند رۆژێکی دیکە لیرە بار دەکەین. ئەگەر نەشڕۆین، چ نابێ. پارێز، خراپ نییە. بەدەردی گۆتەنی، ماڵی خۆت توند بگرە و کەس بە دز مەگرە. ئیتر لەو شارە وەڕەز بووم. ئەگەر تا قیامەتیش لێرە بمێنییەوە، وەك کلکی ئێستر نە درێژ دەبییەوە و نە کورت. نازانی دڵم چەند خۆشە ژنەکە. وەختە بفڕم. زۆر بەکەیف و بە دەماغم. منداڵەکانمان لە مەدرەسەی باڵا دەخوێنن. وەك منداڵەکانی دەروێش بەگ..."

یەکێك لە منداڵەکان لە لاشیپانەی دەرگاکەدا دانیشتبوو و بەدەم هەڵلووشینەوەی چڵمەکەیەوە، شووڵکێکی دەتاشی. منداڵەکەی هەڵگرت و لە باوەشی کرد و گوتی:"دەرس دەخوێنی و بۆخۆت دەبییە پیاو. هەر بۆیە دەست لە ماڵ و زێدەکەم هەڵدەگرم. کچەکەشم دەنێمە بەر خوێندنێ. وەك کچەکەی دەروێش بەگ لەگەڵ هەیتو مەتیوان دڵداری دەکا. با بیکا. کچ بۆ دڵداری لەدایك بووە. چما لەسەر ئەوە پیاو دەکوژن؟ کچەکەم با هەم دەرس

بخوێنیٚ، هەم لە گەڵ کوڕە ئەستەمبوڵی دڵداری بکا. با لە کچۆڵەکەی دەروێش بەگیش خراپتر بکا. کچی دڵتەڕ لەو سەردەمەدا پەسندە."

ژنە بە بزەبز سەیری مێردەکەی دەکرد.

"پیاوەکە دەڵێی شێت بووی. کەواتە ئەتۆش پێدەکەنی و ئێمە نەماندیتووە. پیٚ بکەنە گیانەکەم، پیٚ بکەنە نازدارەکەم..."

"با بخوێنیٚ. کچەکەم دەرس بخوێنیٚ و گانیٚ بدا. گاندەرێکی خوێندەوار لە فریشتەیەکی نەخوێندەوار باشترە. کچەکەم گانیٚ دەدا، بەڵام ئەوەندەش دەخوێنیٚ تا دەبێتە دکتۆر. نەریمان گیان. خۆت بۆ سەفەر ئامادە بکە و بەکەسیش مەڵیٚ. بڕوانە ژنەکە، جوان گویٚ بگرە بزانە دەڵێم چی. ئەمن لە ترسان نییە لێرە دەڕۆم. لەبەر دوارۆژی منداڵەکانمە کە خۆم فیدا دەکەم. دەرفەتێکە و هەڵکەوتووە و نابیٚ لەکیسی بدەین. کەلوپەلەکان کۆ بکەرەوە. یەکەوریٚ دەچینە ئەسکەندەروون. بەکەسیش ناڵێی دەچینە کویٚ. نا، نا، هەر کەسیش لێتی پرسی، بڵیٚ، حاجی مامێکی هەبوو، لەکاتی ڕەشبگیرەکەدا شوێنبزر ببوو. ئێستا دوای چەند ساڵان ئەو مامەی هاتووەتەوە. زۆریش دەوڵەمەندە. حاجیی کردووەتە کوڕی خۆی و لە داری دنیایە، لە حاجی زیاتر کەسی نییە. ئەو ناردوویە لەدوومان و دەچینە لای ئەو. باشە؟"

ژنە پرسی:"هەر بەراست؟"

"بەڵیٚ، چۆنی دەڵێم هەر وایە. لەو پارەیە سەد لیرەیەکم بدەیە با بچم جێژنێك بۆ برادەرەکانم بگرم."

منداڵەکەی دانا. دراوێکی سەد لیرەیی وەرگرت و خێرا وەدەرکەوت. خۆر خەریك بوو ئاوا دەبوو.

لە پێشدا سلێمانی لە قاوەخانەکەی تۆفیق دۆزییەوە و گوتی:"خەریکە دەڕۆم سلێمان. لێرە دەڕۆم. ئاغاکان لە زێد و نیشتمانەکەی خۆم دەرم دەکەم. بڕوانە سلێمان، ئەمشەو هەتا بەیانی جێژنەیە. خوانی ماڵاوایی. ئەگەر نەڕۆم دەروێش بەگ بەڵایەکم بەسەر دێنیٚ. دەبیٚ بڕۆم. بیست ساڵ دواتر، پاش مەرگی دەروێش دێمەوە. بە برادەران رابگەیەنە. هەمووان. بە کۆسەدۆران و نوورییە شەل و ئەوانی دیکەش..."

ئەو شەوە هەموو برادەران لە باخچەکەی عومەر کۆ بوونەوە و هەتا بەیانی راکییان خواردەوە و سوعبەتیان کرد.

حاجی دەستی کردبووە گریان و دەیگوت:"ئێوە لێرە وەمێنن برادەرینە. ئاغا و بەگەکان من شاربەدەر دەکەن. کورە ئەو دنیایە بۆ ئەوانی نامێنێتەوە. ئەوان حاجییە شێتەیەکیان تەحەمول نەکرد. دەنا تۆ بڵێ، دوو قسە چ بوو ئاوا.... چما ئێمە هەموو رۆژێ سەد جاران بە یەکتری ناڵێین گەواد؟ نەیانتوانی حاجییە شێتەیەك تەحەمول بکەن، و ئێستا دەیانەوێ بیکوژن. ئەویش بەبێ ئەوەی تۆزێکیان لێ بترسێ، دەچێ و دەڵێ، ئەمنیش، هەر کەسە نەیەوێم، نامەوێ. بەڵام خۆ حاجی تا هەتایە ئێرە بەجێ ناهێڵێ. دیسان دەگەڕێتەوە. دەوێش پیرە و سلار دەبێتەوە و حاجی گەنجە. هەر دەروێش بەلادا هات، حاجی دیسان دەگەڕێتەوە شارۆچکەکەی."

کە دەیگوت، ناتوانن تەحەمولی بکەن، لەخۆباییبوونێکی پێوە دیار بوو و ئەوەندە بەخۆی دەنازی هەر مەپرسە. لەسەر یەك بە یەکی وشەکان رادەوەستا و دەیگوت:"ناتوانن تەحەمولی بکەن. حاجییە شێتەیەکیان لەو شارۆچکە گەورەیەدا پێ راناگیرێ. دەی باشە. قەیناکا. ئێمەش پشت لە نیشتمانمان دەکەین و دەڕۆین برادەرینە..."

ئەی ئێمە؟ چما ئێمە ژنین؟ چما دەهێڵین برادەرەکەمان بکوژن؟ ئەتۆ نابێ بڕۆی. ئێمە دەرەقەت دەروێش بەگ و هەموو بەگەکان دێین."

وێکڕا گوتیان:"دەرەقەتی دێین."

ئەوانی دیش گوتیانەوە:"خەڵك بەهێزترە یان بەگ؟"

حاجی هەستایە پێ:"ئەنگۆ خۆش بن برادەرینە. هیچ کەس ناتوانێ حاجییە شێتە لەو شارۆچکەیە دەر بکا. پێتان وانەبێ، حاجی لە ترسی گیانی دەڕوا. خەڵك بەهێزترە یان بەگ؟ دەی دیارە خەڵك. من ئەوەم لێ سوورە. کاتێ ئەوان دەمرن، مڵك و ماڵ و ژن و منداڵیان لەپاش جێ دەمێنێ. بەڵام کە ئێمە دەمرین، هیچمان لەپاش بەجێ نامێنێ. هەر بۆیە ئەوان هەمیشە لە ئێمە تۆقیون و ئێمە لەوان ناترسین. کەوابوو هەر ئێوە خۆش بن. مەسەلە شتێکی دیکەیە. حاجی دەڕوا بۆ ئەوەی منداڵەکانی بنێرێتە قوتابخانەی باڵا."

یەکێك گوتی:"با بیاننێرێ. با بیاننێرێ و هەر کامەیان ببنە کەڵە پیاوێك."

حاجی:"کچەکەشم دەنێمە بەر خوێندنێ. جا لە ئەستەمبوڵیش. ئەگەر یەکێك هات و گوتی، کچەکەت خەریکی شتی لابەلایە، دەڵێم با خەریك بێ..."

هەتا بەیانی کەیف و چەپڵە بوو.

## ٨٤

لە شارۆچکەکەدا کەسی نەدەناسی. لەوێش کەس ئەوی نەدەناسی. کەسی شك نەدەبرد بچێتە لای و سوعبەتێکی لەگەڵ بکا و تۆزێك دڵی سووك بێ. لە سەر مۆبلێك پاڵ کەوتبوو و بیر و خەیاڵ بردبوویان. جار جارێ دەیەویست هەستێ و بچێتە دەرێ، بەڵام دەسبەجێ پاشگەز دەبۆوە. بچێتە کوێ؟ چ بکا؟

لە دەرەوە، هەتاوەکەی پێش نیوەڕۆ هەر دەهات و گەرمتر دەبوو. چەند مریشکێك لە سێبەری شۆڕە بییەکەدا چینەیان دەکرد. جووچکە وردەکان لە دەوریان بڵاو ببوونەوە. ماوەیەك سەیری شۆڕە بییەکە و مریشکەکانی کرد. مۆبلەکە قوماشێکی هەوریشمینی سووری بەسەردا درابوو. قوماشێك کە لە تورکمانە کۆنەکان بەجێ مابوو. بەری دەستی بە قوماشە هەوریشمییەکەدا هێنا. برسیی بوو. گیرفانیشی پڕ بوو لە پارە. هەمیشە حەزی لێ بووە بچێتە شاری و تێیدا بگەڕێ؟

زۆر لەوە پێش، ئەو دەمی منداڵ بوو، شەوێکیان، سەعاتێکی مابوو ڕۆژ بێتەوە، بە پێدزە لە کەپرەکە هاتبووە خوارێ و هەتا دەم زۆنگاوەکە رای کردبوو و لە بن ئەو شۆڕە بییەی سەری چڵە شۆڕەکانی گەیبوونەوە عەرزی، کرووشمەی کردبوو. دڵی پڕ بوو لە ترس و خۆف. لە هیچ کوێوە سریوەیەك نەدەهات، بەڵام لوورەیەکی درێژ بەردەوام لە مێشکیدا دەگەڕا. جار بە جار پتر زراوی دەچوو و پتر خۆی گرمۆڵە دەکرد. باشە بۆ لە جێوبانەکەی هاتبووە دەرێ و خۆی گەیاندبووە بن ئەو شۆڕە بییە؟ نەیدەزانی بۆ. ئاخرییەکەشی هەر نەیزانی.

بەردەوام خەونی دەدی. خەونی سەیر و سەمەرە. لە خەونیدا هەورە سپییەکان دەهاتنە سەر زۆنگاوەکە. هەورەکان پەیتا پەیتا لە زۆنگاوەکەوە بەرەو رووبارەکەی جەیهان دەکشان. دوای ئەوە لە رەوەز و گابەردەکاندا دەنوست. رەوەزی رژد و هەڵدێر و پڕ لە هەڵۆی گەورە گەورە. هەڵۆکان باڵیان جووت دەکرد و لە چەقی ئاسمانەوە بەرەو زۆنگاوەکە لوور دەبوون.

وەك قەلە رەشەیەك. هاشوهووشەکەیان هەموو دەشتەکەی داگرتبوو. خەون بوو یان راستی؟ لێی روون نەبوو.

هاوین بوو. کێڵگەکان وشك داگەڕابوون. دەشتەکە دەدرەوشایەوە. بە نێو کێڵگەکاندا بەرەو ئاوایی کەوتبووە رێ. خەیاڵ بردبووی. لە نەکاو گوێی لە هاشوهووشێك بوو. کە ئاوڕی دایەوە، مارێکی رەشی دیت. کلکە بریقەدارەکەی لە لاقی دا و تێپەڕی. مارەکە قەڵەمبازی دەدا. بە پێچەوانەی رەوتی مارەکە، گەڕایەوە و غاری دا. هەتا پشووی تێدامابوو رای کرد. دوای ئەوە لە نێوەڕاستی رێیەکە لێی درێژ بوو. هەناسەی دەرنەدەهات. لە ترسی ئەوەی نەکا مارەکە شوێنی کەوتبێ، خوێنی بەدەماریدا نەدەگەڕا... خۆی قەبوولّی بوو، کەسێکی ترسنۆکە.

هەتا نیوەڕۆ هەروا بێ جووڵە مایەوە. تەنانەت نەیدەتوانی سەیری ئەو دار بییەش بکا سەری چڵەکانی گەیشتبووە سەر عەرزی. جووچکەکانیش لەبەرچاوی ون ببوون.

هەستا و بەبێ ئەوەی بزانێ دەیەوێ چ بکا، بە هۆڵەکەدا کەوتە هات و چۆ. دەستە بێهێزەکانی بە لاتەنیشتیدا شۆڕ ببوونەوە.

لە پڕ، لە پلیکانەکانەوە بەخێرایی هاتە وارێ. بەپەلە کەوتە رێ. گەڵای دارە هەنجیرەکان لەبەر تۆز و خۆڵ دیار نەبوون. حەشیمەتەکە لە پشت سەری ماهیری کفنپۆشەوە، لە تەنیشت ئەو دار هەنجیرە راوەستابوو. هەڵڵا بوو.

لە شوێنی حەفتە بازاڕەکە چاوی هەڵێنا. چەند وەرزێری شڕۆڵ و چڵکن لەوێ تخێڵ ببوون. لەولاترەوە کامیۆنێك راوەستابوو. گەنجێك هەرای دەکرد:"ئەدەنە، ئەدەنە. جەیهان، جەیهان."

چۆنە سواری ئەو کامیۆنە بێ و بچێتە ئەدەنە. لە ئەدەنە چ کارێکی هەبوو؟ نە شوێنێکی دەزانی و نە کەسیشی دەناسی. لە گوندێ، کابرایەکی ئەدەنەیی بەناوی رەجەب ناسیبوو. رەجەب گەنجێکی خوێنگەرم و رووخۆش بوو. بەڵام چۆنی دۆزیبایەوە؟ خۆ ناو و نیشانی لێ وەرنەگرتبوو. دەڵێ ئەدەنە بێ سەر و بنە. بنیادەم تێیدا ون دەبێ. هیچ لێرە ناچێ. بێ سەروبنە. ئەگەر بچێتە ئەدەنە و دەستیشی بەخوێنی ئەو پیاوە گلاو نەکا... دایکی چیی پێ دەڵێ؟ دەروێش بەگ دەڵێ چی؟ گوڵعوزار دەڵێ چی؟ دەڵێن ترسنۆکە و پیاوێکی وەك حاجییە شێتەی پێ نەکوژرا. دەڵێن، ئەوەش کوڕەکەی مەحموود، ئاگر هەر خۆڵەمێشی لێ بەجێ دەمێنێ.

لە ئەدەنەوە دەچووە هۆردووی چوارەم. سواری شەمەندەفەر دەبوو و دەڕۆیشت. شەمەندەفەری نەدیتبوو. هەر دەتگوت خانووی رەشن و بەدووی یەکتریدا ریزت کردوون. دووکەڵەکەی هەموو دەشتێی دادەگرت. دووکەڵێکی وەك گەواڵە هەوری رەش... چیاکانی

وان... وان دەریای هەیە، لەوێ بەفر و کڕێوە و بارِن کردوویەتە قیامەتێ و بنیادەمی تەنگاو کردووە و دەست و پێی بەستوویەتی. ساڵ دەری دوازدەی مانگێ بەفر باریوە و خۆشی نەکردووەتەوە. شڵێوە و بۆران. دایکی دەیگوت: دەڵێی تەرزەیە نەرم بووەتەوە.

"ئەدەنە، ئەدەنە. جەیهان، جەیهان..."

دنیا لە دەوروبەری کاول بوو و هەر ئەوی تێدا ما. تاریکییەکە رەوییەوە. بەرەو کامیۆنەکە وەڕێ کەوت. پارەیەکی زۆری پێ بوو. لە تەنیشت کامیۆنەکە، لە تەنیشت تۆپەکانی دواوە لەلای چەپییەوە راوەستا. بە ترسەوە دەستی لە تۆپە(تایە)کانی دا. کامیۆنەکە سێ ژنی تێدا بوو و پۆلێکیش پیاو. ئەوانە دەچوونە ئەدەنە. دەتگوت لەرزێکی لەگیانی گەڕا. دڕدۆنگ بوو، سوار بێ یان نا. دەستی لەسەر تۆپەی کامیۆنەکە دانا. تۆپەکە سارد بوو وەك سەهۆڵ. خێرا دەستی کشاندەوە. پیاوێك بە سێرەی چاو لێی دەڕوانی. گەڕایەوە و بەپەلە و بەهەشتاو لەوێ دوور کەوتەوە و تاوێك دواتر کە سەری هەڵێنا، گەیشتبووە نێوەندی بازاڕێ.

جیپێك بە تەنیشتیدا تێپەڕی. چاوەکانی بەشوێن جیپەکەدا رۆیشتن. پیاوێك لە جیپەکەدا دانیشتبوو هەر دەتگوت دەروێش بەگە. بەڵام، هەتا ئەسپی سووری مەیلەوقاوەیی و ئەسپی رەش لە دنیایەدا بمێنێ، دەروێش سواری ئەو نەفرەتییانە نابێ. ئەسپ جوانی و خشڵی پیاوە.

بەرەو بازاڕی ئاسنگەرەکان رۆیی. ئاسنگەرەکان یەك پشوو کۆتکیان دەوەشاند. راوەستا و چاوی بڕییە ئاسنگەرێك، کە ئاسنەواڵەیەکی سوورەوەبووی دابووە بەر کوتکان. بیری کردەوە کە بنیادەم دەبێ ببێتە ئاسنگەر. ئاسنگەرێکی لێزان. ئاسنگەر قەت برسی نابێ. بچێتە هەر کوێ و رێت بکەوێتە هەر وڵاتێك، هەوجارِ و گاسن و مازەی عارەبانەیەك هەر پێویست دەبن دروست بکرێن. لە نەکاو گوێی لە دەنگێك بوو:"یوسف جوق یوسف."

دەنگێك بوو وەك دەنگی باوکی. ئاوڕی دایەوە و روانیی. بەڵام کەسی نەدی.

ئێستا ئەگەر ئاشنایەك، برادەرێکی لەو شارە هەبوایە، دەچوو سوغبەتێکی لەگەڵ دەکرد و لەو تەنیاییە نەجاتی دەبوو. پاشەو پاش گەڕایەوە. شۆستەکە بەردەچن کرابوو. کە دەڕۆیشت، پێی لەسەر بەردە سپییەکان دادەنا. پاك و خاوێن بوون. ماستت لەسەر رۆکردبایە پیس نەدەبوو. شووشەی پەنجەرەی ماڵێك بریسکەی هات و لەچاوی دا. لە کەبابخانەیەك وەژوور کەوت و بە شاگردەکەی گوت:"کەبابێکی ئەدەنە."

کەبابخانەکە پڕ بوو لە دووکەڵ و چەوری. دووکەڵەکە قوڕگی بنیادەمی دەبرژاندەوە. کەبابەکەی خوارد. لێرە هەستی بە غوربەت نەکرد. زۆر چووبووە کەبابخانەکان. ئەگەر لێی سوور بوایە کەبابچییەکە دەنگیٚ ناکا، هەتا عەسریٚ لێرە دادەنیشت.

بازاڕ هەر دەهات و قەرەباڵغتر دەبوو. دەستەیەك پیاو بە دەنگی بەرز قسەیان دەکرد. ئەوە چ قسەکردنێکە؟ بنیادەمی تەڕپۆشیش جار و بارە بەوێدا تێدەپەڕین. بەخۆی گوت:"ئەوانە ئاغان. ئەوانە دوژمنی دەروێش بەگن و هەمووشیان ژنەکانیان کڵاویان بۆ دەدروون. هەر بای خەیاڵیشیان نییە، کە ژنەکانیان چ دەکەن. هەر بۆیەش دەروێش بەگ رقی لێیانە... ئیرەیی بە جلوبەرگی خەڵکەکە هات.

دیسان گەڕایەوە شوێنی حەفتەبازاڕەکە. کەس ئاوڕی لە شانی چەپی دایەوە، چاوی بە عەلی ئەفەندی کەوت کە لە دووکانەکەیدا دانیشتبوو و کتێبی دەخوێندەوە. لە دڵیدا گوتی:"وەجاغت کوێر بێتەوە پیاو، لە بەیانییەوە لێرە دانیشتووە سەری لەو کتێبە ناوە. چ باسە پیاو؟ توخوا کتێبخوێندنەوەش بوو بە کار؟ کەسیش ناوێریٚ تخوونت بیٚ. بیستوومە کابرایەکی جوامێری، پشت و پەنای هەژارانی و دوژمنی بەگ و ئاغاکان. بۆ ئەوەی ناوت بزڕێنن، پەڵەکیان لەسەر شانت دا، ئەگەر دەتوانی بیسڕەوە. لە زیندانیٚ برادەری باوکم بووی. هەر کەس هاتووەتە لات، بە ناهومێدی نەگەڕاوەتەوە. ئەوەندەی پێت کراوە، چاکەت لەگەڵ هەموو کەس کردووە. مەڵهەمت بۆ دەرد و ژانی تەنانەت دوژمنەکەشت دۆزیوەتەوە...."

هەر لەویٚ لەسەر بەردێك دانیشت و بەبیٚ ئەوەی چاوی بترووکێنیٚ، چاوی بڕییە عەلی ئەفەنی. عەلی ئەفەنی هەر جارێکی سەری لەسەر کتێبەکە هەڵدەگرت، هەتاوەکە چاوی ئەزییەت دەدا و پەیتا پەیتا چاوی دەترووکاند. لەوانەش بیٚ لە سۆنگەی زۆر خوێندنەوەوە ئاوا چاو بترووکێنیٚ. ئەو ماڵ کاولە هەر ماندووش نابیٚ لە خوێندنەوە. بووەتە ئێسك و پرووسك. دەموچاویشی هەر هێندەی لەپە دەستێك دەبیٚ. ئەو هەمووە کارەشی لەدەست دیٚ. وەك دەڵێن، کوڕی بێوەژەنێك بووە، هەر بستێك منداڵ بووە کە باوکیان کوشتبوو. کەسیش نایە عەریزەیەکی پیٚ بنووسیٚ. لێی دەسڵەمێنەوە. دەڵێن خوێنی لە قەڵەمی دەچۆڕیٚ. بەڵام ئاغاکان خەڵکی لیٚ دەتۆقێنن. زۆریش ترسنۆك بووە.... رۆژانی کۆبوونەوە مەکینەی تایپەکەی هەڵگرتووە و پەنای بردووەتە بەر چیاکان. چ بکا لە نێو ئەو هەمووە خەڵکەدا؟ داماوە نەترسیٚ چ بکا؟ خۆ ئاغاکان دەستیان پێی راگەیشتبا، خوێنیان دەمشت.

باشە ئەو هەمووە بۆچی دەخوێنێتەوە؟ چ دەخوێنێتەوە؟ بۆچی دەخوێنێتەوە؟ دەی باشە ئەو هەمووە کتێبەت خوێندووەتەوە، دەی بۆخۆت ببە بە ئاغایەك، برای من، کاکی من، چما دەهێڵن ببێتە ئاغا... دەیانگوت باوکی ئاغایەکی گەورە بووە، خۆشی بە رەچەڵەك دەچۆوە سەر هۆردووی چوارەم. دەروێش بەگ باش دەزانێ. دەروێش بەگ لەبەر ئەو رەچەڵەکە بەرزەی، زۆری خۆش دەوێ.

لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەگەر سکاڵایەکم هەبوایە پێم دەنووسی. بۆ نووسینی سکاڵاکەش دە لیرەم دەدایێ، چووبا کتێبی پێ کڕیبا و خوێندبایەوە. چیی پارەی دەکەوێتە دەستی دەیدا بە کتێبی کوفر.

عەلی ئەفەنی لەو کاتەدا سەری لە سەر کتێبەکەی هەڵگرتبوو و بە دەم چاوترووکاندنەوە، زۆر خۆمانە سەیری گوندییەکی کرد کە بەوێدا تێدەپەڕی و بزەیەکی هاتێ. یەکێکی ئاوا زەردەی بێتێ، خراپەی لێ هەڵناوەرێ. دەموچای خراپ، جۆرێکی دیکەیە. مەحموودە کوردەی بابم بە برادەرەکانی گوتبوو، گیان و دایك و ناموسم تەنیا دەتوانم بە دەستی یەکێك بسپێرم و پشتی لێ بکەمەوە، ئەویش هەر عەلی ئەفەندییە و کەسی دی.

دەبێ بچم و قسەی لەگەڵ بکەم. بەڵام قسەی چی؟ لەو کاتەدا عەلی ئەفەندی سەیرێکی کرد. سەرسووڕمانێکی منداڵانە لە چاوەکانیدا شەپۆلی دەدا. دوایی نەرمەبزەیەك لە سەر لێوەکانی پشکووت و لەدەموچاوی گەڕا. باشە بچێ و قسەی لەگەڵ بکا؟ چیی پێ بڵێ؟ لەو دەمەدا بە زەینیدا هات کە دەچێ و دەڵێ، کوڕی مەحموودە کوردەیە. دەیانگوت عەلی ئەفەندی مەحموودە کوردەی زۆر خۆش دەویست. بە دیتنی کەیفخۆش دەبێ، وا نییە؟

لە سەر ئەو بەردەی دانیشتبوو، هەستا و زەردەیەك بەسەر لێوەوە، بەرەو دووکانەکە کەوتە رێ.

عەلی ئەفەندی بە دەنگێکی گڕ و گەرموگوڕ و خۆمانە و پڕ لە دڵنیاییەوە گوتی: "فەرموو براکەم."

یوسف منگەمنگێکی لێوە هات و گوتی:"ئەمن کوڕی مەحموودە کوردەم. بیستووم ئەتۆ برادەری بابم بووی. دایکم دەڵێ، بابم تۆی زۆر خۆش دەویست."

عەلی بە پێکەنینەوە گوتی:"ئا ای ... باوکتم زۆر خۆش دەویست. چاو و دڵم پێت روون بۆوە. ماشەڵا، هەزار ماشەڵا بۆخۆت بوویەتە پیاوێکی تەواو. دەی دایکت چۆنە؟ ئەو باشم دەناسێ. کە لە زینداتێ بوو، سەری دەدام. باوکت پیاوێکی مەزن بوو. بوو بە قوربانیی ئەو

بەگە بێناموسانە. ئەوان باوکتیان بەکوشت دا. ئاااا، ئەگەر مەحموود زیندوو دەبوو، ئەو بەگ و ئاغایانە دەیاندی. لە زیندانێ چاوی کرابۆوە."

یوسف چاوێکی لێ کرد. ئەگەر ئەو کابرایە لە زیندانێ لەگەڵ باوکی بووبێ، ئەو کات هەر منداڵێك بووە.

عەلی ئەفەندی:" لە پێشدا زۆری خۆ راگرت. باوکت "بەگ"ــەکە خۆی وەك خودا دەپەرست. کە باسی بەگەکانم بۆ کرد، مانگێك قسەی لەگەڵ نەکردم. بەڵام ئاخرییەکەی تێگەیشت. گوتی، سەد خۆزگە پێشتر تۆم دیتبا. ئەگەر لێرەم نەجات بێ، باش دەزانم چ دەکەم. ئێمە خەریکە پێخوست دەکرێین و ئەوان خۆش رایدەبوێرن. ئەتۆ، ئەتۆ وریا بە و هیچ شتێکت بەفیدای بەگەکان مەکە. ئەوەندەی پێت کرا، خراپەیان لەگەڵ بکە."

لە کاتی قسەکردنێدا زەردەی لە لێوی نەدەڕوییەوە. یوسف بە ناڕەحەتییەوە گوتی:"دەروێش بەگ ئەتۆی لە مزەفەری کوڕی خۆشتر دەوێ."

"ئەمنیش ئەوم خۆش دەوێ. پیاوێکی خراپ نییە. بەڵام ئەمن بێزم هەڵدەستێ لەوانەی پیاو دەکوژن. پیاوکوشتن کارێکی دزێوە. جوامێرێکی وەك مەحموود بوو بە قوربانیی ئەو."

یوسف:"دایکم دەڵێ، بابت زۆر ترسنۆك بووە. ئەتۆ بابمت لە نزیکەوە دەناسی، تۆخوا پێم بڵێ هەر بەراستی ترسنۆك بوو؟"

عەلی ئەفەندی بەو پرسیارە منداڵانەیەی زۆر پێکەنی و بە پێکەنینەوە گوتی:"چما پیاو هەیە نەترسێ یوسف گیان؟ بنیادەم دەترسێ. ئەمنیش لە ترسان زراوم چووە. ئەی دایکت چۆنە؟"

یوسف خێرا و بە ساردی وەڵامی دایەوە:"باشە."

ئەوجار گوتی:"دایکم دەڵێ، خاڵوانم لەهیچ ناترسن."

ئیتر چاوی لە چاوانی بڕی و چاوەڕێی جواب بوو.

"پیاو نییە نەترسێ، یوسفەکەم."

یوسف ویستی هەستێ. عەلی ئەفەنی گوتی:

"خۆزگە پتر دادەنیشتی. چاو و دڵم بە دیتنی کوڕەکەی مەحموود روون بۆوە. بابت پیاوێکی باش بوو. زۆریش زیرەك بوو. ئەگەر ئەو نەدەبوو، ئەمن کە ئەوکات هەر بستەمنداڵێك بووم، لە زیندانێ دەیانخواردم. حەوجێت بەهەر شتێك بوو وەرە لای خۆم. سڵاوی دایکت دەگەیەنم."

"بەسەرچاو."

لە دووکانەکە هاتە دەرێ. هەر تۆزێك دوور کەوتەوە، بەخۆی گوت:"ئەمن پیاو ناکوژم. زۆریش ترسنۆکم. لەو دنیایەدا بنیادەمێك نییە نەترسێ."

عەلی ئەفەندی بیری کردەوە و گوتی ئەو کوڕە کێشەیەکی هەیە... شتێکی لە خەیاڵ دایە، بەڵام چی؟

لاقەکانی یوسف بەرەو ئاوەدانی پەلکێشیان دەکرد. هاتە دەم رووبارەکەی ساورۆن. سەیری ئاوەکەی کرد. لە پردەکە پەڕییەوە. کە زانیی بەرەو ئاوایی دەڕوا، راوەستا و پێی بە عەرزەوە وشك بوو. ئەگەر بچێتەوە ئاوایی، تەنانەت بشیکوژن، ناگەڕێتەوە شاری. گەڕایەوە و خێرا کەوتە رێ. کە گەیشتەوە ماڵێ، هەناسەبڕکێی بوو و ئارەقەی شین و رەشی دەرکردبوو. لە پلیکانەکان وەسەر کەوت. دەرگای ژوورەکانی کردەوە و دایخستنەوە تا گەیشتە ئەو دیوارەی چەند ئاوێنەیەکی زێڕکراو و وێنەیەکی گەورەی دەروێش بەگی تێدا بوو. ئەو وێنەیە، وێنەی لاوێتیی دەروێش بوو. سمێڵی باریك و چاوی وەك بڵێسە بوون. تاوێك راوەستا و لە وێنەکە ورد بۆوە. دوای مەرگی دەروێش بەگ ئەو وێنەیەی دەمێنێتەوە. ئاااخ ئەگەر وێنەیەکی ئاوا گەورەی دەگرت و بۆ منداڵەکانی بەیادگاری بەجێ دەهێشت... نەدەفەوتا. لە ئاوێنەکەدا سەیری دەموچاوی خۆی کرد. هەستی کرد ئەو لەگەنجێتییەکەی دەروێش بەگ جوانترە.

چەند سیسەمێك لە ژوورەکەدا هەبوو. هەمووش بە لێفەی هەوریشمین. ژوورێکیان سەلاجەیەکی گەورەی تێدا بوو. کردییەوە. بەتاڵ بوو. دیوارەکانی ژوورێکیش بە مافوور داپۆشرابوون و دەتگوت نێو خێوەتە. ژوورێك کەلوپەلی وەك دیزە و گۆزە و کیتەڵە و تفەنگی چەخماغداری بەنەخش و نیگار و دەهۆڵ و ساز و ئاڵایەکی کەسك و سووری تێدا بوو. ئەو ئاڵایەك، ئاڵای باپیرەی دەروێش بەگ بووە. پادشا دابووی بە باپیرەی.

تەنگی ئێوارە بوو. چووە نهۆمی وارەوە. لە پشت دەرگا پاچ و پێمەڕەیەکی دیت. دڵی خۆش بوو. پێمەڕەکەی هەڵگرت و چووە باغچەکە. باغچەکە پڕ بوو لە گژ و گیا. دەستی کرد بە شیو و وەردانەوەی. ئەوەندە بە کەفوکوڵەوە وەری دەدایەوە کە وەخۆ هاتەوە، سەیری کرد، تەواوی کردووە. تاریکی باڵی بەسەر وڵاتدا دەکێشا. برسێتی هێرشی بۆ هێنا و یەکەوڕێ بەرەو بازاڕ رای کرد.

دووکاندارەکان بەهاڕەهاڕ دەڕابەکانیان دادەدایەوە. دە دوازدە دەڕابە وێکڕا دەکێشرانە خوارێ و بێدەنگییەکەی شاریان دەشکاند. یوسف کەیفی بەو دەنگەدەنگە هات.

چووە کەبابخانەیەك و دوای خواردنی کەبابەکە هاتە دەرێ. چەند جاران ئەمسەرئەوسەری بازاڕەکەی کرد. ئەوجار چووە قاوەخانەکە. حەجمینی نەبوو. حەزی دەکرد را بکا بۆ شوێنێك. ئێرە نەبێ، جا هەر کوێ بێ. دوای خواردنەوەی چایەکەی، لە قاوەخانەکە هاتە دەرێ. بازاڕ چۆڵ بوو. چ بکا. خەویشی نەدەهات. وڕ و کاس بوو.

چیاکانی وان... ئاخۆ خاڵوانی هەر زیندوون؟ ئەگەر بچێتە ئەدەنە و لە کێڵگەیەك ئیش بکات...

تاریکی وردە وردە خەستتر دەبۆوە و وەك دیوارێك لەبەر چاوی هەڵدەچنرا. دەریاچەکەی وان دیوارێکی گەورە و تاریك. ئەدەنە چۆڵ و هۆڵ. لە نێوەندی بازاڕەکە چەقیبوو. هەموو وڵات نوقمی تاریکی ببوو.... تاریکییەکی بێسنوور...

شەکەتییەکی سەیر گیانی داگرت. بڕستی لێ بڕابوو. ماندوو و شەکەت بە لارەلار بەرەو ماڵەوە چوو. بە بێ وازییەوە دەرگاکەی کردەوە و چراکەی داگیرساند. رووناکاییەکە، خۆشییەکی رشتە دڵییەوە. هەر کلیلەی چرایەکی پێ هەڵدەبوو. دڵی خۆش بوو. رووت بۆوە و خۆی خزاندە نوێنەکەوە. حەزی لێ نەبوو چراکە بکوژێنێتەوە. دەترسا. ماوەیەك لە جێوبانەکەیدا هەر بیری کردەوە. بەردەوام تەرمێکی لەخوێن شەڵاڵ دەهاتە بەرچاوی. بە هیچ کلۆجێ نەیدەتوانی دڵی خۆی قایل بکا بە کوشتنی حاجی. هەتا حاجیی نەکوشتبا، نەیدەتوانی پێ بنێتەوە ئاوەدانی و خۆ پێشان دایکی بداتەوە. ئەگەر رای کردبایە بۆ شوێنێك... خۆ هیچ کوێی نەدەزانی هەتا... بۆ هەر کوێ چووبایە، وەك ئەو شارە، بەتەنێ دەکەوتەوە. باشە وای کردبایە، گوڵعوزار خۆشی دەویست؟ کێ سەیری بنیادەمێکی ترسنۆك دەکات کە پیاوی نەکوشتووە و...

ئێستا دەمێك بوو دایکی نوستبوو. گوڵعوزاریش لە حەوت ساڵان راست ببووەوە. کزەی لە جەرگی هات. ئەو رووناکاییەش سەیر چاوەکانی دەکزاندەوە. یەکەم جاری بوو، چرا نەکوژێنێتەوە و بنوێ. چراکەشی نەدەکوژاندەوە. لە جێوبانەکەیدا هەر تەنیشتاوتەنیشتی دەکرد.

باش دەیزانی کە فیشەك چۆن لە دەمانچەوە دەردەچێ و بەرکوێ دەکەوێ. بنیادەمی نەدیتبوو فیشەکی بەرکەوتبێ. بەڵام سەگی زۆر دیتبوو ئەنگێورابوون. یەگێکی زەرد بوو. مەلا عوسمان سێرەی لێ گرتبوو و پەنجەی بە پەلەپیتکەدا هێنابوو و ئەویش چاوەکانی لێك نابوو. تا چاوی هەڵێنابوو، سەیر دەکا ئەوە سەگەکە لە خوێنی خۆیدا دەگەوزێ و نووزە و قڕووچکەی دەگاتە ئاسمانێ. زۆری پێ چووبوو تا سەگەکە گیانی دەرچووبوو. زاری شەڵاڵی خوێن و قوڕاوی

ببوو. دوایی سەگەکە لە نەکاو هەڵدەستابوو و رای کردبوو و ئەمجارە کەوتبووە عەرزی و جووڵەی لێ بڕابوو. کە ئەوەی دیتبوو، مووچڕکەی بەگیانیدا هاتبوو. ئیتر نەیتوانیبوو سەیری سەگی ئەنگێوراو بکاتەوە.

هەر جارێکی حاجییە شێتەی دێنایەوە پێش چاوی خۆی، ئەو سەگە ئەنگێوراوەی دەهاتەوە پێش چاوی. بۆ چەند ساتێك دەتگوت لە هۆش چووە. دەستەکانی بە خوێنێکی گەرم سوور بوون. راچڵەکی و لە سەر جێیەکەی دانیشت. سەیری دەستی کرد. دەستی خوێناوی نەبوو. لەخۆی پرسی، ئەوە چییە بۆ وام لێخات؟

بەرەبەری بەیانی بوو خەوی لێ کەوت. تۆزێك دواتر لەخەوێ راچڵەکی. هەستا و تاوێك لە تەنیشت جێوبانەکەی حەپەسا.

وردە وردە جلوبەرگەکانی لەبەر کرد و هاتە دەرێ. گڵە شییکراوەکە لەبەر تیشکی هەتاو دەبریسکایەوە. داهاتەوە و لوێچێ گڵی هەڵگرت و لە مستیدا وردی کرد. چەند کرمی دیت. رێك لەو کاتەدا کەلاکی سەگە ئەنگێوراوەکەی هاتەوە پێش چاوی. دەسبەجێ گڵی بەسەر کرمەکاندا کردەوە.

بەرەو بازاڕێ کەوتە رێ. بەر لەوەی بگاتە بازاڕ، بای دایەوە. شەرمی دەکرد سەیری خەڵك بکات و بچێتە لایان. دەتگوت گلاو و گول بووە.

عارەبانەیەك کە نەخۆشێکی زەردهەڵگەڕاوی تێدا دانیشتبوو، بە تەنیشتیدا تێپەڕی. نەخۆشەکە، کچۆڵەیەك بوو کە هەر ئێسك و پرووسکی لێ مابۆوە. دایکی سەری کچەی خستبووە سەر رانی و چاوە فرمێسکاوییەکانی تێوە بڕیبوو. تۆزێك لەولاوەتر دوو گوێدرێژ لە تەنیشت یەکتری خەوتبوون. بە غاردان لە شارۆچکەك رۆیشتە دەرێ و هاتە کەناری ساورۆن. ئاوەکە بە رێڕەوی خۆیدا دەڕۆیی. روون وەك چاوی قرژاڵ. نەیدەتوانی خۆی بە ئاوەکەدا نەدا. شوێنێکی چۆڵی دیتەوە و لە نێو دەوەنەکاندا جلوبەرگەکانی داکەند و خۆی بە ئاوەکەدا دا. لە ئاوەکەدا خۆی تلاندەوە و چەند جاران بینی کێشا و ئاخریەکەی هاتەوە دەرێ و شمەکەکانی لەبەر کردەوە. کە دەمانچەکەی لە قەدی دەبەستەوە، حەزی لێ بوو سەیرێکی بکاتەوە. دەمانچەکە لەبەر تیشکی خۆرەکە بریسکایەوە. زۆر جوان بوو. ماوەیەك بە سەرسووڕمانەوە سەیری دەمانچەکەی کرد و رۆیشت.

جا پیاو کوشتن چییە. هەموو کەس پیاوی پێ دەکوژرێ. چما چ بووە؟ کوشتنی حاجییە شێتەیەك هەر هیچ نییە. چارێکی دیکەی نییە. دواى کوشتنی حاجییە شێتە ئیتر پیاو

ناکوژێ. جا ئەو جار ئەگەر کەسیش نەکوژێ، کەس ناوێرێ پێی بڵێ ترسنۆك. ئەو کات دەڵێن، کەیفی ناهێنێ و ناکوژێ...

بە کەیفخۆشییەوە هاتەوە نێو شار. ئاااخ، ئەگەر یەك دوو دۆست و برادەری دەبوو. چەند باش دەبوو.

کە بە بەر دووکانی عەریزەنووسەکەدا تێپەڕی، دیسان عەلی ئەفەندیی دیتەوە. دیسان سەری نابووە سەر کتێبەکەی. بەخۆی گوت، ئەو شێتە گەمژەیە دەڵێی دەیەوێ دنیا دروست بکا. بەم زووانە ئاغاکان دەتکوژن و هەر ئا لێرە کەلاکەکەت لەبەر دووکانەکەت فڕێ دەدەن. تەنانەت دایکیشت نایەتە سەر مەیتەکەت. ئای عەلی ئەفەندیی بێ مێشك. جا وەرە گەڕت لە گەڕی ئاغایان بهاڵێنە. سەی کوڕی سەی. کەیفی بە پیاوکوژان نایە. ئەی بۆچی بابمت خۆش دەویست بەرازی پیس.

بەو حاڵەشەوە لەخۆڕاییی بەرەو لای عەلی ئەفەنی پەلکێش دەبوو... حەزی لێ بوو بچێ و تێر بەدڵی قسەی لەگەڵ بکا... بەڵام ئیتر لێی نەدەچووە پێشێ. لێی دەترسا. لەو چاوە درشت و زیت و گەشانەی کە بە ناخی بنیادەمدا ڕۆدەچوون، دەترسا.

پێی وابوو ئەو زەینی هەموو بنیادەمەکان دەخوێنێتەوە و دەزانێ چییان لەمێشکی دایە. ئیتر ببڕای ببڕ نزیکی نەدەکەوتەوە. تۆبە، تۆبە... ئەگەر بەگ پێی گوتبا ئەو عەلی ئەفەندییە بکوژە، بەخودایەتی خودا هەر ئێستا دەیکوشت. لە ترسی ئەوەی نەکا چاوی بە عەلی ئەفەنی بکەوێ، بەبێ ئەوەی سەری هەڵێنێ، بەخێرایی بە بەردەمیدا تێپەڕی و پشوویەکی ئاسوودەی هەڵکێشا. بارێکی قورسی لەسەر شانی لاچووبوو. دوایی بەبێ ئەوەی خۆی بیەوێ گەڕایەوە و جارێکی دیکەش بە بەردەم دووکانەکەیدا رابرد. جارێکی دیکە و جارێکی دیکەش بە خێرایی بەوێدا تێپەڕی. بەرازی گلاو، سەری لەسەر ئەو کتێبە نەفرەتییەی هەڵنەدەگرت. با هەڵێنەگریچ. با هەتا هەتایە هەر وا سەری لەو کتێبەدا بێ.

لەولاترەوە، گەیشتە بەر دەم قەسابییەك. پاڵی بە دارە ئەقاقیاکەوە دا و چاوی بڕییە عەلی ئەفەندی. هەر وا نوقمی کتێبەکەی بوو و سەری لەسەر هەڵنەدەگرت. سکاڵاشی نەدەنووسی. یانی کەس سکاڵای پێ نەدەنووسی؟

عەلی ئەفەندی دەتگوت لە خوێندنەوەی ماندوو ببوو، سەری هەڵێنا. بەڵام بەر لەوەی چاو بە دەوروبەریدا بگێڕێ، یوسف خۆی شاردەوە. لەوە دەترسا چاوی بەچاوی بکەوێ. چوو و

لەولاترەوە، خۆی لە پشت دووکانێك شاردەوە. دڵی وەك باڵی چۆلەکە فڕەی دەهات. هەستی دەکرد ئەوە دەیخنکێنن.

کە دڵی هێور بۆوە، لەسەرخۆ و بەسپایی چووە پێشەوە و لە حاڵێکدا لە بن چاوانەوە سەیری عەلی ئەفەندیی دەکرد، چووە پێشێ. دیسان دڵی کەوتەوە ترپە و بەبێ ئەوەی خۆی بیەوێ، بەخێرایی بە بەردەمیدا تێپەڕی.

عەلی ئەفەنی لە بنەوە ئاگای لێی بوو. دەیدی و لەسەر خۆی پێدەکەنی و بە سەرسووڕمانەوە لەخۆی دەپرسی، ئەوە بۆ وایە....

ئەی کافری رووس، کە دنیا کاول دەکەی، دەبێ وەك سەگ بتۆپی... دەبێ بتۆپی و لە دەستت رزگار بین...

جارێکی دی، کە بە بەر دووکانەکەیدا تێدەپەڕی، لەگەڵ عەلی ئەفەندی چاویان تێك ئاڵقا. ئەو نیگایەی لە چاوە درشتەکانی عەلی ئەفەندییەوە دەدرەوشایەوە، کوناودەری کرد.

بە دەم دوورکەوتنەوەوە، ئاد و پەیمانی بەست ئیتر روو لەو بازاڕە نەکاتەوە. حاجییە شێتەی دەکوشت. جا چۆنیش... هەر ئەمشەو.

لە نەکاو سەگە ئەنگێوراوەکەی هاتەوە بەر چاوی. بەرەو پردەکە غاری دا. لە پردەکە پەڕییەوە و بەرەو ئاوایی کەوتە رێ. قوبەی لێ دەرکەوت. زانیی بە کام رێدا و بەرەو کوێ دەچێ. دەست و پێی مردن و لەجێی خۆی وشك بوو. ئەوجار بێهێز و شەکەت، بە لارەلارەوە گەڕایەوە ماڵێ و چووە نێو جێوبانەکەی و خەوی لێ کەوت. تەنانەت لەبیری چووبۆوە نانیش بخوا. هەر خەونیشی نەدی. خەوت بەبێ ئەوەی بەخەبەر بێ.

## ٨٥

تاو کەوتبوو کە لەخەوێ هەستا. ئەوەندە شەکەت بوو کە... دڵی تێکەڵ دەهات. هەموو گیانی دێشا. چیی کردبوو ئاوا لە پەل و پێ کەوتبوو؟ وەرددانەوەی باخچەکە؟ جا خۆ هەموو رۆژێ کاری وای دەکرد و هیچ گیانیشی بەخاو نەدەکەوت.

زەردەواڵەیەکی زەرد، لەسەر جامی پەنجەرەکە، کردبوویە وزەوز. هەڵدەفڕی و دەخولایەوە و جار نەجارێکیش خۆی بە شووشەکەدا دەکێشا. زۆنگاوەکەی ئاقچاساز نیشتمانی ئەو زەرگەتانە بوو. ئەوانە لە سەر هەر چڵە زەڵێ و قامیشێك پێنج هێلانەیان هەبوو. پەڵەی سوور بەسەر گیانەزەرد و ئاڵقەئالقە رەشەکانییەوە. جاری وایە هەزاران زەردەواڵە لەسەر ئاوە روونەکە هەڵدەنیشنەوە و هەر لەوێ خەویان لێ دەکەوێ. ئاوەکە بە شنەی با شەپۆل دەدا و نەرم نەرم دەیانبزێوێ.

لە جێی هۆی هەستا و هەوڵی دا بیگرێ. کە دەستی بۆ برد، زەرگەتەکە هەڵبەزدابەزی کرد. نیو سەعاتێك ئاوا هەوڵی دا و ئاخرییەکەی گرتی و زەرگەتەکەش پێوەی دا. بە دەم راوەشاندنی دەستییەوە، چوو دایە بەر بەلوعەی ئاوەکە. ئەوجار دەستی کرد بە مشتنی ئەو شوێنەی چزووەکەی پێوەدابوو.

جلوبەرگەکانی لەبەر کرد و وەدەر کەوت. بەبێ ئەوەی ئاگای لێ بێ رووی کردە بازاڕەکە. بە دەم رێگاوە پەنجەی دەمژی. کە سەری هەڵێنا، گەیبووە بەر دەرگاکەی عەلی ئەفەندی و دەسبەجێ لەوێ دوور کەوتەوە. جنێوێکیشی بە عەلی ئەفەندی دا کە...

نەدەچووە شوێنی حەفتە بازاڕەکە. ماوەیەك لەبەر دەم دووکانی ئاسنگەرەکاندا پیاسەی کرد. کابرایەکی کەڵەگەت هات و لە تەنیشتی راوەستا. وەیزانی حاجییە شێتەیە. لێی دوور کەوتەوە و سەیری کرد. ئەو نەبوو. لە نەکاو ئەوەندەی حەز لێ بوو حاجییە شێتە ببینێ هەر مەپرسە. دواییش دڵی کەوتە زرم و کوت.

بەرەو مزگەوتی ئالاّ کەوتە ریّ. مالّێکی گەورەیان شین کردبوو. بەدلّیدا هات باشە بۆچی بەگی ئێمەش خانووەکەی ئاوا نارازێنیێتەوە. کۆشکی بەگ دەبیّ چ رەنگێکی لیّ بدریّ؟ لە پێشدا رەنگی پەمەیی هاتە بەرچاوی. دوایی کەسك و دواتر نارنجی و ئاخرییەکەی لەسەر شینەکە ساغ بۆوە. راوەستە با بەگ لە ئەستەمبولّ بگەرێتەوە. بەر لە هەموو شتێك داوای لیّ دەکرد، کۆشکەکەی رەنگ بکا. هەتا لە شاری وەدەر کەوت، هەروا بیری لە رەنگکردنی کۆشکەکەی بەگ کردەوە.

خۆی بە نێو دەوەنە مۆرتکەکاندا کرد. شوولّێکی شکاندەوە. دەستی کرد بە جوویتنی شەری چلّەکەی. تامێکی تفت و تالّ و بۆنێکی خۆش بە گیانیدا گەڕا. مووچرکەی پێدا هات. بەو جۆرە چەند چلّێکی دیکەشی هەلّپساند و ئەوەندەی جووینەوە هەتا تامە تفت و تالّەکەیان نەما. لەولاترەوە چۆلەکە و کلك هەلّتەکێنە هەلّدەفڕین و دەنیشتنەوە. بەردێك هەلّگرت و لە کلك هەلّتەکێنەیەکی گرت. دەستی زۆر راست و ئەنگێوە بوو. خەتای نەدەکرد... دایکی دەیگوت ئەنگێوەییت چووەتەوە سەر خالّوانت. ئەوان لە ئاسمانیّ دەرزی دەنگێون.

بەردەگەی هاویشت، بەلاّم نەیگرت. بالّندەکەی لە جێی خۆی نەبزووت. دووەم بەردی هەلّگرت. بالّندەکە کەوت. یوسف رایکرد و سەری هەلّکەند و لە دەستیدا سەنگ و سووکی کرد و لە بن لێوانەوە گوتی، قەلّەوە، شەویّ دەیبرژێنم.

بەرەو دۆموزتەپە دەچوو. گیاچەقە گولّیان کردبوو. گولّە وردیلەکان وەك فەرش لەسەر عەرزەکە پان ببوونەوە. یوسف داهاتەوە و دانەیەکی هەلّپساند و چیی لە زەینیدا بۆی گەڕا نەیزانی ناوی چییە. رێك لەو کاتەدابوو حاجییە شێتەی بیر کەوتەوە و دوای ئەو سەگە ئەنگێوراوەکە...

هەتاوەکە جار بە جار گەرمتر دەبوو. زەردەوالّە و مێشەنگوین وزەوزیان بوو و مەلەکانیش لەسەر لك و پۆی داران ئەمبەرەوبەریان دەکرد. زەردەقۆڕەیەکی دیت کە بە زاری داپچڕاوەوە بەملاولادا رای دەکرد. لەسەر لکی دارێك بالّندەیەکی دیکەشی دی. لە سێروو(رەشۆلّە) دەچوو. بەردێکی دیکەی هەلّگرت بەلاّم بەر لەوەی تێی گریّ، پاشگەز بۆوە. بەردەکەی فڕیّ دا و سەیری سێبەرەکەی خۆی کرد. بەرەو لای چوو. هەولّی دەدا فریوی بدا. بەلاّم نەیتوانی. پێکەنینی هات. سەیرێکی دەوروپشتی خۆی کرد و گوتی:"تەواو مندالّ بوومەتەوە. کوڕە خۆ مندالّیش شتی وا ناکا. ئەوجار گوتی، باش بوو کەس نەیدی.

حاجییه شێتەی هاتەوە پێش چاوی. ئەو سەگەی فیشەکی لێ درابوو... وەلی‌یە گۆج بۆقێکی گرتبوو و زگی هەڵدڕیبوو و لەبەر تاوێ وشکی کردبۆوە. شتێکی پیس بوو. کە زگی بۆقەکەی دەدڕی، چاوی بۆقەکە، چاوی بۆقە زیندووەکە وا لە ژێڵڵا هاتبوون کە... دەتگوت دوو مەڕمەڕی شووشەن. جوان سەیری چاوە لە ژێڵڵاهاتووەکانی بۆقەکەی کردبوو. دوایی وردە وردە درەوشانەوەکەی کاڵ ببۆوە. چاوەکان لە پێشدا زەرد هەڵگەڕان و ئیتر وەك ئاوێکی لیچق، وەك چەرمێکیان لێ هات.

رقی لە وەلییە گۆجە هەڵدەستا. چما بۆق بۆ ئەوەی دەبێ بە زیندووی زگی هەڵدڕی، بەرازی پیس؟ تۆ هەر دەڵێی بنیادەم نی؟

ژنەکەی وەلییە گۆجە بۆقە وشککراوەکەی لە نێو قژیدا شاردبۆوە. زۆر ژنی دیکەش کە منداڵیان بۆ نەدەمایەوە، لاشەی وشککراوەی بۆقیان وەك گوڵ بە تیتکی خۆیانەوە دەبەست. ژنەکەی وەلییە گۆجە یازدە جار زابوو و هەموو منداڵەکانیان حەوتوویان نەچووبوو، مردبوون. وەلییە گۆجەش هەموو ساڵێ لاشەی بۆقە وشککراوەکەی نێو تیتکەکانی ژنەکەی نوێ دەکردەوە.

هەردوو دەستی لە گیرفانی نا. لە سەر گردەکەوە بەرەو خوار داگەڕا. سواڵەتەکانی سەربانی ماڵێك نوێ نوێ و سوور سوور بوون. سواڵەتی سەربانەکانی دیکە هەموو کاڵ بوونەوە. گوتی، چما ڕەنگیش لە بەردەم ئەو هەتاوە بەتینەدا خۆی دەگرێ؟ لە هۆردووی چوارەمدا عەرد، هەشت مانگان تاو نابینێ و داری تەلەگراف هەر لە بن ئەو شتەدا دەمێننەوە، کە پێی دەڵێن بەفر.

جار بە جار دڵی توندتر و بێ ئۆقرەتر دەبوو. هەموو وڵات کپ و بێدەنگ بوو. باڵندەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و بەهەموو تینی خۆی تووڕی دا. ئەوجار بە غاردان چۆوە نێو شاری. خۆی بە کۆڵانێکدا کرد، کە بەلای راستدا دەڕۆیشت و لەوێوە بۆ کۆڵانێکی دیکە. ژنێك لە کانییەك، ئاوی دێنا. یوسف دەستی ژنەکەی دیت. تەح لەو دەستە زلانە... تەح ح ح ح لەو لاقانە...

لە کۆڵانێکی دیکە دوو منداڵ پێك هەڵدەپڕژان. بە دڵیدا هات لێکیان بکاتەوە. دوایی پاشگەز بۆوە. لە کۆڵانێکی دیکەش سێ گوێدرێژی دی. گوێدرێژەکان دەتگوت خۆیان لەبەر تاوەکە هەڵخستووە و لەجێی خۆیان نەدەبزووتن. تەنانەت چاویشیان لێك نابوو. چما گوێدرێژیش چاو لێك دەنێن؟ چەند کۆڵانی دیکەشی بڕی. هەر بیری لەوە دەکردەوە ئاخۆ گوێدرێژی لە کاتی نوستنێدا چاو دەقووچێنن؟

که گەیشتە بازاڕەکە، دەستی لە گیرفانی دەرهێنا. ڕێك لەبەر دەم کەبابخانەیەك بوو. هەر بۆنی کەبابەکەی بەسەردا هات، دڵی خاو بۆوە و بەپەلە وەژوور کەوت و گوتی:"کەبابێکی ئەدەنە. زوو بە. بەپەلەم. کەباب و نیوێك..."

کەبابچییەکە گوتی:"ئامادەیە. هەر ئێستا. باوەشێنی بکە. باوەشێنی بکە ڕۆڵە. باوەشێ ێ ێنی بکە."

کەبابەکەیان خێرا بۆ هێنا. یۆسف لە چاوترووکاندنێکدا کەبابەکەی خوارد و هاتە دەرێ و بەرەو پردەکە چوو. سێ کچۆڵە کە دەستیان نابووە نێو دەستی یەکتری و قژیان بەدەم باوە دەشنایەوە، بەرەو سۆلمیش دادەگەڕان. لە دوورەوە چاوی لەسەریان بوو. کچەکان ئاوڕیان دایەوە. یوسف لە دەم ڕێیەکە ڕاوەستابوو. کە کیژۆڵەکان بە بەردەمیدا تێدەپەڕین، پشتی تێ کردن.

لە خوارەوە، ساورۆن لووزەوی بەستبوو. لەتە قامیشێك بەسەر ئاوەکەوە بوو. ئەو قامیشە، خستییەوە بیر ئەسپە قامیشییەکەی. دوای قامیش و ئەسپەکەی، بۆقەمردووەکە و دواییش سەگە ئەنگێوراوەکە و ئەمجار حاجییە شێتەی هاتەوە بیر..

لە هەڵەداوان گەڕایەوە نێو شار. بۆنێك وەك بۆسۆی قوماشێکی سووتاوی بەرلووت کەوت. سەیرێکی خۆی کرد. هیچ کوێی نەدەسووتا. بەبێ ئەوەی سەیری کچەکان بکا، بە تەنیشتیاندا تێپەڕی. کە بە بازاڕ و بەردەم دووکانەکاندا تێدەپەڕی، نە کەسی دیت و نە هیچ شتێ. لە کۆڵانێك منداڵێکی دیت، لە حاڵێکدا دڵی زرم و کوتی بوو، لە منداڵەکە چووە پێشێ و گوتی:"ئەرێ، ماڵی حاجییە شێتە لە کوێیە؟"

منداڵەکەش پرسیی:"ماڵی حاجییە شێتە؟"

"بەڵێ، ماڵی حاجییە شێتە."

"ئەو؟ خۆ ئەو لێرە ناژی... خراپ هاتووی."

"ئەتۆ دەزانی ماڵی لە کوێیە؟"

"بەڵێ دەزانم. دەتەوێ پێشانتی بدەم؟"

منداڵەکە کەوتە ڕێ و یوسفیش بەدوویدا. ئەژنۆی لەدوو نەدەهاتن. دەلەرزین. چاوی ڕشکەوپێشکەیان دەکرد... منداڵەکە ڕاوەستا و گوتی:"ئەوەیە."

ماڵۆچکەیەك بوو، دەرگاکەی کەسك و وێنەی مراوییەکی بە ڕەنگێکی سپی لەسەر کێشرابوو کە مەلەی دەکرد. منداڵەکە گوتی:"ئەوە ماڵەکەیەتی. بچۆ. بچۆ ژوورێ."

یوسف نەیزانی چ بکا:"نا، نامەوێ بچمە ژوورێ..."

"ئەی بۆ هاتی؟"

"بۆ ئەوە نەهاتم... هەر پرسیم. هەروا..."

ڕەنگی بە رووەوە نەمابوو و لێوەکانی دەلەرزین.

منداڵەکە گوتی:"بەڵام ئەتۆش کابرایەکی سەیری ها، کاکە."

ئەوەی گوت و لێی دا و ڕۆیشت.

یوسف لەوێ بەجێ ما. دەتگوت سیحریان لێ کردووە. نەیدەتوانی بڕوا.

دەرگای ماڵەکە داخرابوو. هەست و خوست لە ماڵیانەوە نەدەهات. دەتگوت ماڵی مردووانە. چەند لەوێ مایەوە؟ نەیزانی. پاش تاوێك ژنێك بە سێ منداڵەوە پەیدا بوو. ژنەکە هاتە پێشێ و دەرگا کەسکەکەی کردەوە و وەژوور کەوت. منداڵەکان یەکێکیان چووە ژوورێ و دووانەکەی دیکە لە دەرەوە کەوتنە کایە و یاریکردن.

یوسف لەپڕ زانیی ژنەکە لە پەنجەرەوە سەیری دەکا. بەپەلە لەوێ دوور کەوتەوە.

## ٨٦

ماهیر بەگ لە ترۆمبێلەکەی دابەزی و لە پلیکانەکان وەسەر کەوت. دەست و دەموچاوی شوشت. کلّفەتەکە قاوەی بۆ هێنا. روومەتەکانی چرچ و لۆچ و داچۆڕابوون و هەر لاکەی سەری دەهات. لە ژنەکەی پرسی:"وەلی لە ماڵە؟"

"ناردمە بازاڕێ، ئێستا دێتەوە."

ماهیر بەگ چوو لە سەر مۆبلەکە تخێلّ بوو. سەری لێ تێك چوبوو. کووپە قاوەکەی بەدەستی راستییەوە بوو و دەستی چەپەی بەسەر برۆکانیدا دێنا.

"دەنگ و باسی سەبری؟ لۆکە ڕنینەوە دەستی پێ کردووە؟"

ژنە وەڵامی دایەوە:"کرێکارەکان لە چیاوە هاتوون. ئەمساڵ کرێکار ئەوەندە زۆرە... سەبری دەیگوت، لۆکە رنینەوەی ئەمساڵ زۆر هەرزان دەکەوێ. زۆر بەکەیف بوو."

ماهیر بەگ گوتی:"باشە. باشە. زۆر باشە. کاروباری حیزبیش باش دەچنە پێشەوە. حیزبەکەمان بەتەمایە بەرهەڵستکارەکانی سەرکوت بکا. لەوانەشە تۆویان ببڕێنێتەوە. جا ئەو دەم ئەو مەملەکەتە دەبێتە مەملەکەت. دیموکراسیی وڵاتانی رۆژهەڵاتی و یەك لە وان وڵاتەکەی ئێمە، لە پشێوی و تێکەولێکە بەولاوە بەرهەمی نابێ. تازە خەریکن پێ دەزانن."

ژنە:"حکوومەت بە دەنگی ئەو پێخاوسانە دادەمەزرێنن. ئەوانە چووزانن حکوومەت چییە؟ چما ئەوانە لە شتی ماقوولّ تێ دەگەن؟ دامەزراندنی حکوومەت کاری خەڵکی رووناکبیر و تێگەیشتووە. ئەو گەمەی دیموکراسییەیان لە کوێوە هێناوە؟ ئەو پارووە کێ بۆی کردووین؟"

ماهیر بەگ تۆزێ بووژاوەو قیت بۆوە:"کێ بێ باشە؟ هەر ئەو پیرەمێردە. هەموو ئاگرەکان لە گۆڕی ئەوەوە هەڵدایبسێن. بەو زووانە سزاکەی دەبینێ و هەڵێدەگرێتەوە. دەبێ بەڵایەکی بەسەر بێ، ناچاری بێ بۆ هەمیشە دەستی سیاسەت ماچ بکا و ماڵاوایی لێ بکا. بڕیارەکەیمان وەرگرت. ئەو گەمە و یارییانە دەبێ ببڕێنەوە و مەملەکەت گەشەی پێ بدرێت. ئەو کاتە، ئەو

کاتەیە کە کا لە پێستی دەروێش پاشا دەئاخنم. ئەودەم هەر خۆی ڕەگ و پنجی وشك دەبێ. ئەو هەر دەمە و دژی شتێکە. لە زیندانێدا دەڕزێ. مایەپووچ دەردەچێ. ناچار دەبێ، دەست لە مڵکەکەی هەڵگرێ. لە خالیدەشێتی خراپتر بەسەر دێ. بۆ سواڵ دێتە بەر دەرگای من... ئەمن خۆم کاریگەرییم زۆر بوو. گوتم ئەگەر حیزبی بەرهەڵستکار کۆ نەکرێتەوە، ئەو مەملەکەتە پێش ناکەوێ. ئەم نیشتمانە دەبێ بە یەکێتی و یەکگرتوویی بەڕێوە بچێ. حیزبی بەرهەڵستکار وەك کۆت و سندم وایە بۆ وڵات. لە بەردەم هەر کردەوەیەکی باشدا ناڕەزایەتی دەردەبڕێ و چەت لە کاروباری دەوڵەت دەها و بەرد و کۆسپ دەخاتە سەر ڕێگەی پێشکەوتنی ئەو وڵاتە."

ژنە:"بەڵێ وا دەکەن."

دوایی ماهیر بەگ تاوێك بێدەنگ بوو. ئەو ژنەی زۆر تێگەیشتوو بوو. لە پێشدا ئەو گوتبووی حیزبی بەرهەڵستکار ناهێڵێ پێش کەوین. دیموکراسی پووشێك ناهێنێ و مەملەکەت تووشی پشێوی و کێشە و فەوتان دەکا. حکوومەتێکی باش، بە دەنگی هەرچی و پەرچییان دانامەزرێ.

ماهیر بەگ هەر ئەوەندەی نوقمی بیر و خەیاڵەکانی خۆی بۆوە، ژنەکەی لە ژوورەکە چووە دەرێ و ئەویش دوای خواردنەوەی قاوەکەی، لەسەر تەختەکەی درێژ بوو.

بڵێی حاجییە شێتە رۆیبێ؟ نەیدەوێرا ئەو پرسیارە بکا. ئەی ئەگەر نەڕۆیبێ؟ دەروێش سەری مانگێ لە ئەستەمبوڵ دەگەڕێتەوە و بێت و حاجییە شێتەی وەچنگ بکەوێ، لێی دەردەکێشێ و ئیتر بێ ئەملا و ئەولا دەیکوژێ. ئەوەی لێ روون بوو. چووبایەتە هەر جێیەك و پەنای بۆ هەر کوێیەك بردبایە، هەر دەیدۆزییەوە و دەیکوشت. خۆ ئەگەر رایکردبایەتە چیاکانیش، هەر لە ئەماندا نەدەبوو.

"بیت و حاجییە شێتە نەڕۆیبێ، حوکمی ئیعدامەکەمان بە ئەستۆمانەوە هەڵواسراوە."

ئاخۆ ئەو هەمووە ساڵە خۆی بۆ ئەوە کوشتبوو؟ لە لایەکی دیکەوە ئێستا هەتاوی بەختەوەری هەڵدەهات. بەرهەڵستکاری تەواو دەبوو. لەو هەڵبژاردنەدا، هەر لەو شتەدا کە ناویان ناوە هەڵبژاردن، دەبێتە نوێنەری پەرلەمان. نوێنەرێك بەبێ ئەوەی کەسی لەبەردەم بێ. دوای ئەوە، هەموو شتێك، هەموو دنیا هیی ئەو بوو. هەموو کاروبارەکان بەدڵی ئەو دەچوونە پێش، ئەگەر ئەو حاجییە شێتەیەش...

خۆی پێ نەگیرا و ئاخری بانگی ژنەکەی کرد و پرسیی:"ئەرێ کامیۆنەکە لە دەشتێ هاتەوە، کەلوپەلەکەی حاجییە شێتەی برد؟"

"کامیۆن هاتەوە، بەڵام حاجییە شێتە نەڕۆیشت. گوتبووی بە ماهیر بەگم گوتووە چەند ڕۆژێکی دیکەش دەمێنمەوە. هەر کات ویستم بڕۆم خۆم ئاگادارتان دەکەمەوە."

ماهیر بەگ وەك برێشکەی سەر سێڵ هەڵبەزییەوە و زاری کردەوە و چیی لە زاری هاتە دەرێ حەواڵەی حاجییە شێتەی کرد. ڕەنگی وەك گەچ سپی هەڵگەڕابوو و دەلەرزی.

"پێت دەڵێم... پێت دەڵێم... سەگباب بە کەرم دەزانێ. زانیوێتی ناچارم. لەمەودوا تاقە دینارێکی نادەمێ و وەك سەگیش دەیتۆپێنم."

ڕێك لەو کاتەدا وەلی هاتە دیوەخانێ و بە ڕێزێکی درۆزنانەوە گوتی:"بەخێر بێیەوە ئاغا."

ماهیر بەگ جوابی نەداوە. هەر دەتگوت لە دنیایەکی دیکەیە. هەر وا سەری بەرەو پێشەوە شۆڕ کردبۆوە. بەبێ ئەوەی سەری هەڵێنێ، بە دەنگێکی نیوەزیندوو گوتی:"وەلی..."

ئیتر بێدەنگ بوو. وەلی گوت:"ئەمر کە ئاغا."

بێدەنگییەك باڵی بەسەردا کێشان. ماهیر دیسان خەیاڵ ڕفاندی. تاوێك دواتر:"وەلی."

"فەرموون ئاغا."

"ئەمن متمانەم پێتە. زۆرم خۆش دەوێی. بۆ ئاوایە، وەلی؟"

"وەڵڵا بڵێم چی ئاغا. دڵ ئاوێنەی دڵە گەورەم..."

"وایە وەلی، دڵ ئاوێنەی دڵە. ئێمە یەك دڵین..."

"لەگەڵ ئەوەشدا برادەری کۆنین. دۆستایەتیی باب و باپیرانمان. ئەوەش هەیە ئاغا."

"بەڵێ گیانی من، ئەوەش هەیە. ئەوەش هەیە وەلی گیان. ئەتۆ لە کۆنی کۆنەوە وەلی بووی. فەمانڕەوای چیاکان بووی. ئەگەر ئەو تۆرووسە گەورەیە زمانی بوایە... ئەگەر بەردەکانی تۆرووس وەزمان دەهاتن... لە کۆنی کۆنەوە وەلی گیان، ئەتۆ نیوەی گیانی من بووی. ئەمن پشتم بەتۆوە بووە. کە تۆ لە چیا بووی، هەمووان لە من دەترسان وەلی. دەستێکم لە دەستی حوکمەتدا بوو و دەستەکەی دیم لە نێو دەستی تۆدا. ئێستا دەستێکم بە جوانی لە دەستی حوکمەت دایە. دەستێکمان گەیوەتە ئەنکەرە، بەڵام ئەو دەستەمانیان شکاند کە بە تۆرووسەکانەوە بوو. ئەگەر ڕاستیت دەوێ، دەبێ بڵێم بۆخۆمان شکاندمان وەلی. خۆزگە هەر لە تۆرووس دەمایەوە و پادشایەتیی خۆتت دەکرد. ئەو کات دەستمان بەسەر هەموو ئەو چوکوراوایەدا دەگرت. ئێستا بووینەتە کۆیلەی ئەو زەوی و زارە و چەقیوین. ئەتۆش سەرت لێ شێواوە و ئەمنیش سەرم لێ تێك چووە. چمان دەست کەوت؟ دەروێش وەك گورگ خۆی لێ مەڵاس داوین. ئەمانمان نادا. وەلی گیان، دیسان لێت دەپرسم، ئەتۆ ئیتر پیاو ناکوژی؟"

وەلی هەر لە ئەوەڵەوە دەیزانی ئەو هەمووە شێر و ڕێوی هێنانەوەیەی بۆ چییە و دەیەوێ بڵێ چی، بۆیە وەڵامەکەشی لە گیرفانیدا بوو.

"ئەمن عەرزم کردی گەورەم. ئەم تەنانەت ناتوانم مێروولەیەکیش لە بن پێیاندا بفلیقێنمەوە. ئەمن ئێستا لە ژنم خراپتر لێ هاتووە. هەر چاوم بە دەمانچە دەکەوێ، بێزم هەڵدەستێ."

ماهیر بەدەنگێکی لەرزۆکەوە وەڵامی دایەوە:"چما پیاو ئاوا دەگۆڕدرێ."

وەلی گوتی:"ئاااخ، هەژاری و بێکەسی و پیری، بنیادەم ئاوا سەروبن دەکا.:"

ماهیر هەستایە پێ. لە وەلی چووە پێشێ و ڕووبەڕووی ڕاوەستا و چاوی لە چاوەکانی بڕی. دەستیشی لەسەر شانی دانا.

"لەبەر منیش ئامادە نی ئەو کارە بکەی، وەلی؟ ئەوە ئاخر جار بێ. زۆریش ئاسانە. خۆ ئەگەر دژوار بوایە، تەکلیفم لێ نەدەکردی. کارەکەی ئێمە دەیکەین و بە ئەستۆی یەکێکی دیکەیدا دێنین."

وەلی زەردەیەکی تاڵی هاتە لێوانی و سەبرێ گوتی:"ئەوە بەمن ناکرێ ئاغا. بەخوای پێم بڵێی ئەو مێشە بکوژە، هەموو گیانم دەلەرزێ. بۆخۆشم نازانم بۆ وام لێ هاتووە."

"کەواتە ناکرێ. ها؟"

"نەخێر، کردەنی نییە."

وەلی بڵێسەی ڕق و قینی لەو چاوانەدا دیت کە لە چاوی ئەو بڕابوون. بەدڵیدا هات، دوا ئەو هەمووە ساڵە زەحمەت و کوێرەوەرییەی بۆم کێشاوە و ئەو هەمووە نهێنییەی لێی دەزانم، ئەستەمە دەرم بکا. خۆی باش دەزانێ، بێت و دەرم بکا، لێفەی لەسەر هەتیوان هەڵدەدەمەوە.

دەنگی هەڵێنا:"هەرکەسە و سەردەمێکی هەیە ئاغا. کە سەردەمی بەسەر چوو، دەگۆڕێ. خۆ لەمن باشتر ئەوە دەزانی. ئەو هەمووەت لە فەرەنگ خوێندووە..."

ماهیر ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:"دەزانم وەلی."

گەڕاوە و خۆی خستەوە سەر مۆبلەکە.

هەرچی هێنای و بردی، هیچی بۆ نەچۆوە سەر یەك. ئەگەر زۆر لە حاجی بکەین و بینێرینە مەرسین، ئەو کاتە دەبێ، تا دەمرێ هەر خەرجی بکێشین و دابینی بکەین. خۆ ئەگەر هەر ئەوەندەش بێ، ئەوە شتێك. ئەگەر هات و ڕۆژێك لە بنی کوولەکەی دا... بەو نەڕۆیشتنەشیڕا دیارە هەندێ شتی بۆ ڕوون بۆتەوە... دوای ئەوە عومرێك، مانگێ پێنج سەد لیرە. کوڕە

دنیاخرابوونە... کەس لە عۆدەی دەرنایە... دارێکم بەدەستەوەیە هەر دوو سەری گواوییە. (وەك شمشێرەکەی داموکلێس بەسەر سەرتەوەیە.)... ئەی ئەگەر کەوتە چنگ دەروێش و وەقسەی هێنا؟ هەتا مردن پیش خواردنەوە. چار نییە جگە لەوەی سەری بەگۆمێدا بکرێ، بەر لەوەی دەروێش بگەڕێتەوە. بەڵام ئاخر چۆن؟ لە وەلی رانابینم.

وەلی لەبەر دەمیدا چەقیبوو. بە تووڕەییەوە تێی ڕاخوڕی:"وەلی، بچۆ مەزرایە. ئەحمەدم بۆ بنێرەوە. ئەحمەدی ئامۆزام دەڵێم."

وەلی قسەی لەدەم دەرنەدەهات. کەس بۆ متمانە نەدەبوو. بەڵام وەلی هیچ نهێنییەکی ئەوی لەقاو نەدەدا. ئەویش هێندێ رازی وەلیی لا بوو.

وەلی:"ئەحمەد لێرەیە. لەگەڵ وەستا هاتووەتەوە کاری هەبووە. ئەحمەد دەڵێی گوڵە ئاغا. خودا بیپارێزێ. بنیادەم گیانی خۆی بەقوربانی خزمی ئاوا دەکا. گیان و دڵی لەسەر کارەکەیەتی."

"بچۆ بیدۆزەوە و خێرا بیهێنە بۆ ئێرە."

وەلی رۆیشت.

ئەو هەتیوە بۆ پشت پێ بەستن دەبێ. دەکرێ پشتی پێ ببەستی، بەڵام پیاوکوشتن کاری هەموو کەس نییە. کوشتن هونەرە و لێزانینی دەوێ. لەوانەیە کارەکە قۆڕتر بکا و بەڵایەکی گەورەتری بەسەر بێنێ. بەڵام ئەی چار چییە؟ مەرگ هەر مەرگی لێ دەکەوێتەوە و خراپەش خراپە... پیاو چاری نییە جگە لەوەی رەنگ و خووی ئەوانە بگرێ کە لەگەڵیانە. کە تووشی دەروێش بەگ دەبی، پێت خۆش بێ یان ناخۆش، وەك ئەو دەجووڵێیەوە. چەندی رێزیشی لێ دەگری، دیسانیش هەر تێت هەڵدەکێڵێ. پیاو بەدەست خۆی نییە، هەر وێیان دەکەوێ و لەگەڵیان تێکەڵ دەبێ. خۆ ئەگەر ئەو حیزبە بەرهەڵستکارە تێدابچێ، ئەوانە ئیدی هێز و دەسەڵاتیان نامێنێ. ئەو کاتە ئیتر هیچ کوێی نامێنێ پشتی پێوە بدا. ئەوان لە سەردەمی تاکە حیزبیدا چیی پێیان خۆش بوو دەیانکرد. دەیانوەشاند، خەڵکیان دەگرت، دەیانکوشت... جا ئەوجارە نۆرەمانە. چیی دڵمان بخوازێ و لەدەستمان بێ دەیکەین. رۆژە رووناکەکان وا دەگەنێ. داهاتوو بەدەست ئێمەوەیە. ئەگەر ئەو گێچەڵەشمان لەکۆڵ بێتەوە... ئەگەر بە سلامەتی رزگارمان بێ... بەڵام چۆن نەجاتمان بێ؟... دوای ئەوە پشوویەکی ئاسوودە دەدەین و چێژ لە ژیان دەبینین... وەی لەو بەڵایە. ئاخر بێناموس، بێشەرەف، کە ئەو هەمووەش خۆت بە پیاوێکی بەشەرەف دەزانی، کەس هاتووە، یەکێك هاتووە و لەنێوەندی بازاڕێ پێی گوتووی

بێشەرەف، خۆ ئەگەر شەرەف و نامووست هەیە، بیکوژە ئیتر... ئەتۆ لەبەر سپێیەك، لێفەیەك دەسووتێنی، لەسەر شتێکی هیچ و پووچ ئەمری کوشتن دەردەکەی، چما سووکایەتی هەیە لەوە گەورەتر؟ ئەو هیچ و پووچە بکوژە ئیتر. ئەگەر دایکی درۆت نەگاوە، تەواوی بکە.

وەلی لەگەڵ ئەحمەد هاتن. ئەحمەد هاتە پێشێ و دەستی ماچ کرد. وەلی دەسبەجێ چووە دەرێ. ماهیر بەدوایدا گوتی:"لە خوارەوە چاوەڕێ بە وەلی."

ماهیر سوور هەڵگەڕابوو. چووە ژوورەکەی تەنیشتێ و ئاماژەی بە ئەحمەد کرد و گوتی وەرە. کە ئەحمەد وەژوور کەوت، دەرگاکەی داخست. قورئانەکەی لە کتێبخانەکە هێنا دەرێ. دەمانچەکەشی لە چەکمەجەکە دەرهێنا و هەردووکیانی لەسەر مێزەکە دانا و گوتی:"کوڕم دەستیان لەسەر دانێ."

ئەحمەد بە دڕدۆنگییەوە دەستی لەسەر قورئان و دەمانچەکە دانا و بە حەپەساوییەوە چاوی بڕییە ماهیر بەگ. ئەوجار لەسەرخۆ دەستی کێشایە دواوە.

ماهیر تێی گەیشت و گوتی:"باشە. لەپێشدا با پێت بڵێم دەبێ چ بکەی؟"

مەسەلەی حاجییە شێتە و ئەو بەڵایەی لە سۆنگەی ئەوەوە بەسەری دەهات و لە مەترسیدابوونی ژیانی و ئەوەی کە لەو چەند رۆژەدا دەبێ حاجی بکوژرێ، هەمووی بۆ لەبنی کوولەکە دا.

"یان حاجییە شێتە دەبێ زیندوو بێ، یان من. یەکێکمان... مەملەکەت زۆر پێویستیی بە منە. لە حاڵێکدا ئەو کرم و مشەخۆرێکی ئەو کۆمەڵگایەیە و بەکاری هیچ نایە. تۆ، ئەحمەد گیان کوڕم، دەبێ ژیانی من رزگار بکەی. ژیانم قەرزبار و منەتباری تۆ دەبێ. ئەمنیش بیر لە داهاتووت دەکەمەوە. زۆر فکری باشم بۆت هەیە. بڕوانە، رۆڵە، ئەحمەد گیان، کچەکەشم وا گەورە دەبێ. هەرچیم هەیە بە تۆ دەبڕێ..."

ئەحمەد وەك گەچ سپی هەڵگەڕابوو و رەنگی بە رووەوە نەمابوو. دەستیشی دەلەرزین و متەقی لێوە نەدەهات.

ماهیر یەك پشوو قسەی دەکرد و زاری کەفی دەکرد و دەستی دەلەرزین و دەیگوت و لێی دەڕست و داوای لێ دەکرد ژیانی نەجات بدا. هەموو سەروەت و سامانەکەی دەدایە ئەحمەد. مەزرا و کچەکەی و تەنانەت ژیانیشی بۆ ئەو بوو.

ئەحمەد متەقی لێوە نەدەهات. دەمیی ببوە تەڵەی تەقیو.

ماهیر لە نەکاو پڕی دایە دەستی ئەحمەد و لەسەر قورئان و دەمانچەکەی دانا. ئەحمەدیش وەك دەستی بەرئاگر کەوتبێ، کێشایەوە دواوە. ماهیر بڕوای نەدەکرد، گوتی:"ئەوە چییە ئەحمەد؟ چییە؟ دەترسی؟"

ئەوجار وەك شێتان، لە حاڵێکدا چاوەکانی بە هەرچوار دەوریدا دەگێڕا، گوتی:"کەوابوو، لێم دەگەڕێی بمرم، ها؟ یانی، ئەمن دار و نەداری خۆمت دەدەمێ، مەحکووم دەکەی بە مەرگ؟ کوڕە وەرە سەیری، ئێمە ماری چۆنمان لە باخەڵماندا گەورە کردووە... کێمان کردووەتە منداڵی خۆمان و پشتمان پێ بەستووە. یانی ئاوا..."

ئەحمەد بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:"ئەمن تا ئێستا پیاوم نەکوشتووە."

ماهیر رووبەڕووی راوەستا و بە تەوس و سووکەوە سەیری کرد و گوتی:"تف لەو روویەت. کوڕە چاو ئێمە کێمان بە بنیادەم داناوە. گوتم ئەگەر گرێ کوێرەیەکمان هەبوو، بە سەری پەنجەی دەیکاتەوە. گوتمان لە رۆژی تەنگانەدا بەکارمان دێ. یارمەتیدەرمان دەبێ، بەڵام ئێستا وەرە بزانە چ خەیاڵ پڵاوێکمان کردووە. یانی هەر بەراستی، هیواکانی من تۆزی بەر با بوون؟ هەموو هەوڵەکانم پووچ بوون؟ کوڕم، ئەحمەد گیان. من دەمرم. دەزانی دەڵێم چی؟ ژیانم لەبەردەم مەرگ دایە. وەرە و شەڕی ئەو حاجییە شێتەیەم لەکۆڵ بکەوە. کوشتنی ئەو شتێك نییە. حاجییە شێتە، کێ بە بنیادەمی دەزانێ؟ کێیە هەیە لەسەری بکاتەوە؟ ئەوجار، ئەگەر هات و گیراشی، خۆ من نەمردووم، وەفریات دێم و بەرت دەدەم. ئیتر حیزبی بەرهەڵستکاریش لەگۆڕێ نەماوە، رۆڵە. لەمەودوا لەو مەملەکەتەدا ئاغا و کوێخا خۆمانین، کوڕم. حوکمەت هیی خۆمانە. حوکمەت خۆمانین. سەرۆك وەزیر بارگە و بنەی حیزبی بەرهەڵستکار تێکەوە دەپێچێ.... بە تەلەگرافێك لە زیندانێ بەرت دەدەم. ئەتۆ کە ماهیر بەگێکی وەك کێوت لە پشتە، کێ دەتوانێ دەستبەسەرت بکا؟"

دەستی گرت:"دەی یاڵڵا، شتێك بڵێ کوڕم. بیڵێ و بیبڕەوە. زوو بە دەی... لە دار و دیوار نووسینەکە ئاسانترە. دەی تەواوی بکە. دەی بڵێ..."

ئەو دەستەی گرتبووی، لەسەر قورئانەکەی دانا. ئەحمەد دیسان دەستی وا کشاندەوە، دەتگوت لەسەر ئاگریان داناوە. هەموو گیانی دەلەرزی.

ماهیر زانیی دەلەرزێ و گوتی:"ئەوە چتە؟ دەترسی؟"

دەنگی بەسۆز و پڕ لە تکا بوو. ئەو دەنگە کاری خۆی کرد و ئەحمەدی هەڵچزاند و رایچڵەکاند. چیی نەمابوو دەست بکاتە گریان. دیسان بە دەنگێکی پچڕ پچڕ گوتی:"ئەمن قەتم پیاو نەکوشتووە."

ماهیر بەسەریدا نەڕاند:"بڕۆ ون بە لەبەر چاوم. خزم و کەسی خەڵك، وردکەنانخۆری دەروێش، ئەوەندەی چاوترووکانێك، پیاو دەکوژن، پیاوی ئێمەش، خزم و کەسەکەی ئێمەش، حاجییە شێتەیەکی پیسیان پێ ناکوژرێ. ئای لەو بێ شانسییەی. کوڕە رەگ و ریشەیەکی سەیرمان هەبووە و نەمانزانیوە. بریا تۆوتان بڕابایەوە. ئەو رەچەڵەکەی هەمانە، رەچەڵەکێکی کەرانەیە. هەی لەو بنیادەمە دەستەوستانانەی بە دەورەمەوەن. لەو بنەماڵە گەورەیەدا، لەو هەمووە نانخۆرە پیاوێك نییە، پیاوی پێ بکوژرێ."

ماندوو و شەکەت و داماو بوو. تەواو بێزار ببوو. مەترسییەکی زۆر گەورە لە سەر ژیانی بوو. خۆی بەسەر مۆبلەکەدا دا و تخێڵ بوو. سەری وەختابوو بتەقێ...

دەروێش ئێستا لە ئەستەمبووڵ بوو. بچێتە لای و هەموو شتێك بدرکێنێ. من کردم، تۆ نەیکەی. ئەگەر دەمکوژی، بمکوژە، بەڵام لە تاوانم خۆش بە. هەتا هەم هەر نۆکەریت دەکەم.

باشە ئەگەر دیسان بەسەری رووت و پێخاوسی و بەکفنی سپییەوە و بە شمشێری لەکالان دەرکێشراوەوە بچێتە خزمەتی و بڵێ، ملم لە موو باریکترە و ئەستۆم کەچە و تاوانم بۆ لێخۆشبوون نابن، بڵێی بیبەخشێ؟ دەمانچەکەی لێ ناکێشێ و بەقوربانی گوللەیەکی ناکا؟ هەموو شتێکی هاتە پێش چاوی. ورد و پوخت بە روونی هەموو شتێکی هێنایە بەرچاو و بڕیاری خۆی دا. دەروێش هەر بە شمشێرەکەی دەستی، دەیئەنجنی. کابرایەکی رق ئەستوور و شێت بوو. ئەو کارەش بۆ گاڵتە نەدەبوو.

## ٨٧

جارچی ئەو ڕۆژە دەچووە دادگا. جموجۆڵێکی بەرچاو کەوتبووە زیندانەوە. وسوو، حەسەن جنۆکە و ئەوانی دیکە سەرقاڵ بوون. دەمێك بوو لە ژنەکەی جارچییان راسپاردبوو، دەستێك جلوبەرگی نیلی و بۆینباخ و کراس و پێڵاو بێنێ.

"خوشکێ، لێت سوور بێ، قازی ئەو شتانەی زۆر بەلاوە گرنگە. هەرچۆنێك بێ، دابینیان بکە."

ژنەکەی جارچییش، رێك دەستێك جلوبەرگی ئاوای بە وەستا وایسی بەرگدروو، بە دوورین دابوو و هێنابوویە زیندانێ. پێڵاو و کراس و بۆینباخ و گۆرەوی و شمەکی بنەوە و مێزەریش هەر لەپێشدا ئامادە کرابوو. وەستا وایس کۆتەکەی ئەوەندە جوان و لێزانانە دووریبوو، تەنانەت کووڕاییەکەی پشتی جارچییش دیار نەبوو.

کەڕەی بەیانی ردێنی جارچییان پاك تاشی. دەموچاویان بۆ تیف تیفە دا و جلوبەرگیان لەبەر کرد و جارچی بە رەنگی هەڵبزرکاو و چاوی زیتەوە، بەبێ ئۆقرەیی چاوەڕێ ما، تا بانگی بکەن. بەبێ ئەوەی قسە لەگەڵ کەس بکا، بیری دەکردەوە و لەحاڵێکدا لێوەکانی دەجووڵانەوە، وەك بەدەم خەوەوە بێ، دەسووڕایەوە. جار نەجارێ لەبەردەم ئاوێنەی دەلاکەکەدا رادەوەستا و سەیرێکی خۆی دەکرد، پانتۆڵەکەی هەڵدەکێشا و جار نە جارێکیش دەچووە بەر دەرگاکە و بە چاوەڕوانییەوە ملێکی دەکێشا و چاوێکی لە دەرەوە دەکرد و ئەوجار دەگەڕایەوە بەندەکەی خۆی و لە تەنیشت جێوبانەکەی رادەوەستا. لەو حاڵەتەدا جار و بارێ دەسرۆکە زەردەکەی لەگیرفانی دەردێنا و دیسان لە گیرفانی دەناوە. دەستێکی بە سمێڵیدا دێنا. ئەو لسپە قژەی دەکەوتە سەر تەوێڵی، هەڵی دەدایەوە. لە نووکی پێڵاوە بریقەدارەکانیدا سەیری روخساری خۆی دەکرد، بەڵام نەیدەتوانی و لەو حاڵەتەدا زنجیرەکانی، وێنەی دەموچاوە درێژەکەی دەهاتەوە بیر کە دەکەوتە سەر ئاڵقە بریقەدارەکان. لەو دۆزەدا شارۆچکە و بەرپرسەبالاکە و دەروێش بەگ و

ماهیر بەگ و گەمەکانی خۆنواندنەکانی ماهیر بەگ و حاجی قۆرت بۆغا و سلێمانە کوڵکنە کوژراوەکە واتە سلێمانی پاڵەوان و ئاڵاهەڵگری، ئۆغڵی ئەسلان سۆوی پەنجە و زۆر شتی دیکە، وەك پەردەی سینەما هاتنەوە بەر چاوی. جارچی بیری لەو شتانە نەدەکردەوە کە بە زەینیدا تێدەپەڕین، نە پێی خۆش بوون و نە پێی ناخۆش. هەروا، شارۆچکە و بنیادەمەکان...

بەردەوام سرتوخرتی قسەکردن لە بن گوێی دەهات. قسەی وەك یەك کە جار بار دەنگەکان دەگۆڕدران. هەر بەندییەك، بە شێوەیەك خرمەی لە تەزبێحەکەی دێنا و جارچی بەبێ ئەوەی سەیری کابرا بکا، هەر بە دەنگی تەزبێحەکەی دەیناسییەوە. ئەگەر چاوی جارچییان بەستبایە و بەندییەکانیان یەك بە یەك بە بەردەمیدا هێنابایە، هەر بەدەنگی تەزبێحەیەکەیانڕا دەیتوانی یەك بە یەك ناویان بێنێ. ئەوەش شتێکی زۆر سەیر نەبوو. زۆربەی بەندییەکان خلەی تەزبێح هاتبایە، دەیانزانی کێیە دەیگێڕێ. بنیادەم چۆن دەنگی یەکێك دەناسێتەوە، ئاواش ئەگەر خۆی ڕاهێنابێ و زەینی دابێتێ، دەتوانێ دەنگی تەزبێح گێڕانەکەشی بناسێتوە. جارچی تەنانەت بە دەنگی تەزبێح گێڕانەکەدا، بەبێ ئەوەی سەیری کابرا بکات، دەیزانی خەمبارە یان تووڕەیە، دڕدۆنگە یان شادە، هیوادارە یان بێهیوایە،... دوای ئەوەی زنجیرەکانیان لێ ئەستاندەوە، هۆگری تەزبێحەکان ببوو و خووی دابووە ئەوان...

ڕۆژێکیان چووبووە لای زەکی بەگ و بە سرتە پێی گوتبوو:"یوسف دەتکوژێ."

"چووزانی؟"

"بەدەنگی تەزبێحەکەیڕا زانیم."

زەکی بەگیش پێکەنیبوو و گوتبووی:"ئەتۆش وردە وردە خەریکە تێك دەچی، کاکی جارچی."

جارچییش سوور ببوو لەسەر قسەی خۆی:"ئەمن دەزانم کاکی خۆم. هەر دەگاتە لای تۆ، تەزبێحان داوێ. تەزبێحەکەشی وا دەهاوێ، کە تەنیا ئەو کەسانەی دەیانەوێ پیاو بکووژن ئاوا تەزبێح دەخەن. ئەوە من پێم گوتی. کەیفی خۆتە."

زەکی بەگ دەستێکی بەسەر کووڕاییەکەی پشتیدا هێنابوو و تەزبێحە دەنك درشتە کارەباییەکەی خستبووە خلەخل و دوور کەوتبووەوە.

هەر ئەو ڕۆژە لای عەسرێ، یوسف لە کاتی پیاسەکردنێدا، بە سێ گوللەی گەرم، زەکی بەگی سارد کردبۆوە.

که زەکی بەگ کەوتبووە عەرزی، هاواری کردبوو:"ئەمن سۆسەم کردبوو. دەمزانی و بەخۆشیم گوتبوو، بەڵام بەگوێی نەکردم."

بەڵام نەیتوانیبوو بەکەس بڵێ، کە هەر لە تەزبێح گێڕانەکەی یوسفەوە بۆی دەرکەوتبوو دەیەوێ زەکی بەگ بکوژێ.

هەڵسوکەوت و جۆری ڕێگا ڕۆیشتن و نزیکبوونەوە و لەبز و دەنگەکان و رادەی دلۆڤانی و خۆمانەبوون و هەڵچوونەکان دەگۆڕدران. بەڵام قسەکان نەدەگۆڕدران:"خۆ ناڵێی من کوشتم."

"ئەگەر بڵێی من کوشتوومە، کەس بڕوات پێ ناکا."

"هیچ حووکمدراوێك ناڵێ من کوشتوومە."

"ئەگەر بڵێی من کوشتوومە، هەم کەس بڕوا ناکا تۆ پیاوت کوشتبێ و هەم ئەوەیکە حووکمیشت دەدەن."

"دەبیتە فیدای.... کەر...."

"ئەگەر وابێ..."

"قازییش دەزانێ نەتکوشتووە..."

"حوکمی سێدارەکەشت دەدا."

"بە قوبانی کەر."

دەرگاکە کرایەوە. هەتاوەکە حەوشەی زیندانی کردبووە جەحەندەم. پاسەوانەکە دەنگی لێ هەستا:"جاڕچی، با بێ."

بەندییەکان لە دواوەی دەیانگوت:"یەك بەخۆت هاوار بکە... بگوڕێنە... بیکە قەرەچی ئۆینێك هەتا سەرۆکی گەورە لە خەوێ هەڵدەستێ. ئەگەر ئەو هەستێ، ئەتۆ بێتاوان دەردەچی... زۆر هاوار بکە... لەبیرت نەچێ...

دەنگی"هاوار بکە، لەبیرت نەچێ"ی بەندییەکان لە گوێیدا دەنگی دایەوە.

هەر گەیشتە دادگا، کەلەپچەیان لە دەستەکانی جاڕچی دەرهێنا. جاڕچی دەیەویست خۆی ئامادە بکا بۆ هاوارکردن، کە چاوی بە سەرۆك کەوت وا چاوەکانی لە چاڵی چاویدا دەخولێنەوە. وەك کێوێك لە پشت مێزەکەوە دانیشتبوو. نێوشانی پان بوون. ورگە زلەکەی کەوتبووە سەر مێزەکە. لچە گۆشتنەکەی داچۆڕابوو. بەرخەبەبەی کەوتبووە سەر جلەسوورە دادوەرییەکەیەوە. دادوەرەکانی دیکە لە تەنیشتییەوە وردیلە دیار بوون. جاڕچی چاوەکانی بڕیبووە زنجیرەکانی کاتژمێرە زێڕەکەی ئەو و بۆی مەزەندە نەدەکرا چەند قەفن.

قازی لە پێشدا لێی پرسی خەڵکی کوێیە. جاڕچی بە دەنگێکی کە لەبەر شڵەژاوی و هەژاوی لەرزی تێکەوتبوو، وەڵامەکەی دایەوە. دوای وەڵامدانەوەکە بوو کە لە پشتەوەڕا گوێی لە زریکەیەك بوو، وەختێ ئاوڕی دایەوە، لەگەڵ ژنەکەی چاویان تێك ئاڵقا. چاوە پڕ بڵێسەکانی ژنەکەی، لەبەر دەپاڕانەوە و تکایان لێ دەکرد. جاڕچی ئاگای لەخۆی نەما. ئەژنۆی نووشتانەوە، هەموو گیانی کەوتە لەرزین و سەری لەگێژەوە هات.

سەرۆك بە دەنگە گڕەکەی پرسیاری لێ دەکرد و ئەویش وەك ئەوەی قورمیشیان کردبێ، وەڵامی دەدایەوە. چاوەکانی لە کورسییە شەق و شڕە چڵکن و مۆرکەخواردووەکەوە دەچووە سەر عەبا کۆن و شپرژەکەی کە کۆبەکانی لە هەندێ شوێنەوە هەڵوەشابوونەوە. لە نەکاو گوێی لێ بوو:"من کوشتم."

دەتگوت دەنگەکە لە قوڕگی خۆی نایەتە دەرێ. لە شوێنێکی دیکەوە، لە کەسێکی دیکەوە دەهات. حەپەسا. سەرۆکی گەورە، زنجیری سەعاتە زێڕینەکەی و عەبا کاڵەوەبووەکەی و کورسییە شڕ و شەوێقەکەی، دادوەرەکانی دیکە هەموو لەودیو دووکەڵێکی خۆڵەمێشییەوە مانەوە. دوای ئەوە چاوەکانی وردە وردە کەوتنەوە درەوشانەوە و بڵێسەیان دا و دەنگێکی پڕ زایەڵە و لەرزۆك لە قوڕگییەوە هەستا:"من کوشتم، من، من، من کوشتم."

دەنگەکەی وردە وردە نزم بۆوە و دامرکایەوە.

دوای ئەوە گوێی لە هیچ دەنگێ نەبوو. نە دەنگی خەڵك و نە دەنگی خۆیشی. لە نەکاو دەنگی قۆرت بۆغای بیست. دەنگی هانکەهانکەکەی لە پشتەئەستۆی خۆیەوە هەست پێ کرد و راچڵەکی و مووی لێ بوونە نەشتەر و قیت بۆوە و وەخۆ هاتەوە. هەستابوو. هەموو گیانی داهێزابوو و دەیزیراند. تاوێك هەستی بە زیرەی دڵی کرد. قەڵت و پەڵت گوێی لەو قسانە دەبوو کە باسی ئەو بوون. کوورەی ئاسنگەری، بڵێسە، ئاسنگەر، نایب عەریف، بازاڕ، نانەوا، دەمانچە، کێرد، سندان، کێڵگە، جاڕچی، ئاش، ئاشەوانەکە... جاڕچی لەپڕ هەستی کرد برسییەتی. دڵی خاو بۆوە.

"شایەتحاڵەکان دەڵێن، تۆ دەستت نەدەچووە کوشتنی ئاسنگەرەکە... ئەو کاتەی ئەو کوژراوە، تۆ هەتا بەیانی لە ئاشەکەی بووی و زراویشت چووبوو و لە ترسان پەنات دەبردە بەر تاریکایی، بیستووتە؟ هەموو ئەوانە شایەتی دەدەن."

جاڕچی چاوە لەژێلڵاهاتووەکانی کە رەش رەش داگەڕابوون، بڕییە ژمارەیەك لەوانەی لەوێ راوەستاون. هەمووانی دەناسی، بەڵام بۆ هاتبوونە ئێرە؟ یانی ئەوانە ئاسنگەرەکەیان کوشتبوو؟

له نێویاندا ئاسنگەرەکەی دیت و دوایین شیوی وەبیر هاتەوە، کە لەگەڵ ئەو خواردبووی و لە حاڵێکدا کە چاوی لێ دادەگرت، زەردەیەکی دۆستانەی بۆ کرد.

"ناسیتەوە؟"

جاڕچی بە سەر گوتی بەڵێ.

"ناسیتەوە؟ بە سەر نا، بە زمانت بیڵێ."

جاڕچی بەسپایی گوتی:"ناسیمەوە."

بەڵام شتێکی بۆ نەدەچووەوە سەر یەك. هەر بەراست ئەو شەوە تا بەیانی لە ئاشەکە مابۆوە؟ چاوێکی پڕ لە رق و قینی لە ئاشەوانەکە کرد.

دەنگی سەرۆکی دادگا وەك کوتکێك وەتەپڵی سەری کەوت:"ئەی بۆ شایەتیی ئەو شایەتحاڵانە دەڵێی چی؟ وایە؟"

"نازانم."

چۆن نازانی کە لە ئاشەکە بووی یان نا؟ بڕوانە، ئاشەوانەکە ئەو شەوە کولیچەی بۆ دروست کردووی و هەتا بەیانییش لەوێ بووی."

"نازانم."

"ئاسنگەرەکەت چۆن و بەچی کوشت؟"

جاڕچی هاوای کرد:" بە دەمانچە. شەش فیشەکم لێ دا. هەر شەش جارەکەش... نازانم. نازانم بەچی کوشتم. هەر شەش فیشەکەکەم لە سەردڵی دا، ڕێك لەسەر دڵی..."

سەرۆکی دادگا دەیگرماند. دەنگی شڵپ و هۆڕ بەسەریدا دەڕژا. زۆر ئاڵۆز بوو. لوورەیەکی دوورودرێژ بە مێشکیدا دەگەڕا. زەنازەنای خەڵکەکە و دەنگی سەرۆك تێکەڵاو دەبوون و دەبووە چەق و لوور. میچەکە، کورسی، عێزەدین فەخرەدین دادئەستێن، ئەو پشیلەیەی لە قوژبنێك وەرکەوتبوو، خزمەتکارەکە، دارە تۆزاوییەکان کە لە پەنجەرەوە دیار بوون و ئەو تەراکتۆرە نارنجییانەی لە بن دارەکان بوون هەر هەموو بە هاڕەهاڕ و لوورەلوور تێکەڵاوی یەك بوون و دەسووڕانەوە و دەنگی سەرۆك بەسەر ئەو لوورە و زەنازەنا و خولانەوەیەدا و قەڵافەتەکەی کە جار بە جار زەبەلاحتر دەبۆوە و هێدی و لەسەخۆ دەیگوت:"

"لێی پێچرایەوە... شایەتحاڵەکان... دادگا..."

ئەوجار رووی تێکردبوو و لێی دەپرسی:"لە بنکەی پۆلیس زۆریان تێهەڵدای؟"

"خوری شۆریان کردم. مارکوژیان کردم. کەوڵیان کردم. پشتمیان لە زگم نەرمتر کرد."
ئیتر چووە فکردەوە و سەری شۆڕ بووەوە و ئاوا مایەوە.

"قسەیەکت بۆ گوتنێ هەیە؟"

جاڕچی شەرمەزارانە و بەترسەوە سەری هەڵێنا و چاوی پڕ لە تکا و پاڕانەوەی لە چاوەکانی سەرۆك بڕی و گوتی:

"مەهێڵە بمکوژن... مەمدەرەوە دەست نەقیب..."

ئیتر بە تووڕەییەوە گوتی:"من کوشتم، من، من، من کوشتم، ئاسنگەرەکە، براکەم، من..."

سەرۆك بە دەنگێکی پڕ لە تووڕەییەوە پرسیی:"بەچی؟ بە چ شتێك کوشتت؟"

جاڕچی راچڵەکی، ترسا و لەبەردەم کورسییەکەدا کرووشمەی کرد و بچووك بۆوە. جلوبەرگەکانی وا لەبەریدا بچووك ببوونەوە، دەتگوت ئێستا دادەکەون. بێهێز و تین ببۆوە و... خەیاڵ هەڵیگرتبوو و لە دوودڵی و دردۆنگیدا وەخت بوو دڵی بێتە دەرێ. لە نەکاو سەری هەڵبڕی و گوتی:"بە ماوزەر، بە فیلینتای ئەڵمانی."

دەمودەست قسەکەی گۆڕی:"نا، نا، بە دەمانچە."

ئەوجار وەك ئەوەی پرسیار لەخۆی بکا، پرسی:"ئاسنگەرەکە بەچی کوژرا؟ ..."

نەیزانی بەدەنگی بەرز بیر دەکاتەوە.

شتێك، شتێکی سەیر و سەمەرە، کەس نەیزانی چۆن و لە کوێوە هات و لەبەر دەمی قوت بۆوە. حاجی قۆرت بۆغا لە حاڵێکدا دەستی رادەوەشاند و جارنەجارێ دەستی راستەی لە سەر سینەی دادەنا، قسەی دەکرد. هەر چاوی بەو کەوت دڵی روون بۆوە. تەمتومان و دووکەڵەکە رەوییەوەوە و هەموو شتێك لەجێی خۆی دەرکەوتەوە. ئیتر بە روونی دادوەر و شایەتحاڵەکانی دەدی و بیری دەکردەوە. بەسەر پێشەوە نەبوو. کەی دانیشتبوو، کێ لێرەی دانیشاندبوو؟ ئاوڕی دایەوەو ژنەکەی دی. ژنەکەی بزەیەکی بۆ کرد. روومەتەکانی کە بەقووڵدا دەچوون و وێك دەهاتن، چاوە رەشە جوانەکانی کە ئەشق و خۆشەویستی و داوا تێیاندا شەپۆلیان دەدا، جاڕچییان دەبردە دنیایەکی دیکە....

سەرۆك سەری بردبووە بن گوێی دادوەرەکان و بە سرتە پرسیاری لێ دەکردن و ئەوجار گوێی لێ رادەگرتن و وەڵامەکانی لێ دەبیستنەوە. سەری سەرۆك ماوەیەك لە نێوان ئەو دادوەرانەدا کە لە راست و چەپی دانیشتبوون، دەهات و دەچوو. دواتر ئەویان بردە دەرێ و ژنەکەی هاتە

پێشەوە. دەستی گرت و بۆ ساتێك دەستی خستە نێو دەستەکانی خۆیەوە. دەستی گەرم بوو. ئەوجار دەستی بەردا و کشایەوە. زەردە و بزەی لە لێوی نەدەڕەوییەوە. ئاشەوانەکە هات و فەرمووی جگەرەیەکی کرد و گوتی:"ئەتۆ ئاسنگەرەکەت لەکوێ کوشت؟ تۆ نەتکوشتووە، بۆ درۆیان دەکەی؟"

ئیتر دوور کەوتەوە. یەکێك لە جەندەرمەکان چەرخی جگەرکەی کە بە دەستییەوە مابوو، بۆی هەڵکرد.

"بە درۆیان سەری خۆت بە فەتەرات مەدە."

"تۆ نەتکوشت."

"سەرۆکی داگاکەش و هەموو دنیاش ئەوە دەزانن، تۆ نەتکوشت..."

دیسان دنیا لەبەرچاوی کەوتە سووڕان:"تۆ نەتکوشت. ئەگەر تۆ کوشتووتە دەی بڵێ بزانم بەچی کوشتت؟ ئاسنگەرەکەت بەچی کوشت؟ بە کێرد، شمشێر، خەنجەر، ماوزەر، فیلینتا، بەچی؟ دەی بڵێ، بڵێ بزانین بەچی؟"

"من چووزانم، لەبیرم نەماوە. بەهەرشتێکی بەردەستم کەوتووە. لەو کاتدا چیم لەبەر دەستی بووە..."

جگەرەکەی نیوە کردبوو، کە دیسان بانگ کرایەوە. دیسان مێزەکەی وەك شتێکی رەشی زۆر زەبەلاح هاتەوە بەرچاو. حەشیمەتەکەش وەك گەواڵە هەورێك... لەولاترەوە، ئەموستیلە زلەکەی قۆرت بۆغا لە قامکیدا دەدرەوشایەوە. چاوەکانی جارچی لە ئەموستیلەکە نەدەبوونەوە.

دیسان دەنگی گڕی سەرۆك بەرز بۆوە. دەنگەکە بەسەریدا رژا. دیسان دەیگوت:"شایەتحاڵەکان، ئاشەوان، ئەوێ شەوێ، نانی فەتیر، ترس، گەردن ئازادیی، برینەکە، ئاسنگەر، مستەفا، عەلی، نایب عەریف، حەمە کوێرەی نانەوا، عەلیجیك، دەروێش بەگ، حاجی قۆرت بۆغا، ئاق یۆللی. دیسان دەیگوت، لێی پێچرایەوە.

دوای ئەوە گوێی لە دەنگەدەنگی هەستانەپێی حەشیمەتەکە بوو. خۆشی هەستا. لە راستیدا هەڵیانستاند. کەی دانیشتبوو؟ دیسان سەرۆکی گەورە هەندێ شتی دەگوت. پاش لابردنی لەبەرچاوی سەرۆك و بردنەوەی بۆ زیندان و هاتنی ژنەکەی و بردنەوەی لە زیندانێوە و هاتنیان بۆ ماڵێ و نیگای سرك و رەوەك و پڕ لە پرسیاری منداڵەکانی بە چاوی لە

ژێلڵاهاتووەوە کە ئەوە کێیە و... خەوتنەکەی هەر لەوێ لەسەر حەسیرەکە و لە تەنیشت کوانووەکە.

سەرۆك دوای ئەوەی جارچیی ئازاد کرد، بەپەلە خۆی گەیاندەوە ماڵێ و دەسبەجێ جلوبەرگە فەرمییەکانی دەرهێنا و بە دەنگێکی کە زایەڵەی شادیی تێدا بوو، گوتی:"خانم، خانم، دەبێ بنووم. ئەمشەو کاروبارم زۆر دەبێ. دەبەی بەنزینەکە پڕە؟"

"پڕە."

سەرۆك هەر سەری نایە سەر بالیفەکە، خەوی لێ کەوت. ئەمڕۆ لەبەر جارچی نەیتوانیبوو لە دادگا بنوێ، بەڵام بایی ئەوەندە دەبوو نەخەوێ.

# ٨٨

تەنگی ئێوارە بوو. گورج و گۆڵ لە جێوبانەکەی دەرپەڕییە دەرێ و جلوبەرگەکەی لەبەر کرد. دڵەخورپەیەك ناخی داگرتبوو. لەخۆوە دەستی بۆ دەموچاوی چوو. ردێنی هاتبوو. بڕیاری دا بەر لە داخرانی دووکانەکان و دادرانەوەی دەڕابەکان، بچێتە سەرتاشخانە. باشە ئەو چەندە رۆژە بەو ردێنەوە چۆن هەڵی کردبوو؟ ئەگەر دایکی دیتبای، چیی دەگوت؟

کە لە سەرتاشخانەکە وەژوور کەوت، خۆر خەریك بوو ئاوا دەبوو. گوێی لە خڕەی دادرانەوەی دەڕابەکان بوو. باش بوو سەرتاشخانەکە کەسی دیکەی لێ نەبوو. دەلاکەکە سابوونی لە دەموچاوی دا. دەلاك زۆربلەن. یوسف دەیزانی. لێی پرسی:"خەڵکی کوێی؟"

یوسف دەیزانی ئەو پرسیارەی لێ دەکرێ، بۆیە وەڵامەکەی ئامادە کردبوو:"خەڵکی گوندی ساری تانیشمانلیم. هاتوومە لۆکە رنینەوە. لێرە چاوەڕێی کرێکارەکانم. کرێکارەکان بگەنێ، دەچینە خوارێ بۆ یۆرە گیر."

"ئێرە لۆکەی زۆرە. لە گوندەکەشتان نزیکە. ئەی بۆچی لێرە کار ناکەن؟"

"راستە لۆکەی زۆرە ئێرە، بەڵام، پێشکە و تەپۆشی زۆرە. زۆر زۆریش. ئاخۆ ئێرە مەرەزەجاڕی هەیە... بەڵام یۆرەگیر تەپۆی نییە. ئێمە هەموو ساڵێ دەچینە ئەوێ، لەوێ ئاغا و کێڵگەمان هەیە."

باش بوو دەلاکەکە پرسیاری دیکەی نەکرد. هەر لەبەرخۆیەوە قسەی دەکرد. باسی کێڵگەی برنج و ئاغا و بەگەکان، لێی نەدەبڕییەوە. تەپۆ لە مەرەزەجاڕانەوە هەڵدەستان، مەرەزەجاڕ هیی ئاغاکان بوون و منداڵی خەڵك تێیدا دەفەوتان... جنێوی پیس پیسی بە ئاغا و بەگەکان دەدا.

یوسف بەدڵیدا هات کە هەموو خەڵکی ئەو شارۆچکەیە لە عەلی ئەفەنی خراپترن. هەر هەموو دوژمنی ئاغاکانن. هیچ کامیشیان ناترسن و سڵ ناکەنەوە. میللەت چیی بە سەر زاریاندا دێ بە ئاغای دەڵێن.

دووکانەکە بۆنی سابوون و ئاوی گەرمی لێ دەهات. ردێنی تاشی. یوسف لیرەیەکی دایە دەلاکەکە و رانەوەستا باقییەکەی وەرگرێتەوە. بازاڕ تاریك بوو. تەنیا چرای دووکانێك داییسا. رووبەڕووی بەڵام دوورتر راوەستا. نەیدەویست ئیتر چاوی پێی بکەوێتەوە. دوای ئەوەی ماوەیەك لەوێ راوەستا، خێرا بەرەو ژوور هەڵکشا.

کە گەیشتە ئەو کۆڵانەی ماڵی حاجیی لێ بوو، هانکە هانکی بوو. ئەوە بۆ وای لێ دەهات؟ ئەو دڵەکوتەیە چ بوو؟ کە حاجیی وەبیر دەهاتەوە، دەستی تێکەڵ دەهاتن و دەلەرزی. تیشکێکی کز، لە ماڵەکەی حاجییەوە دەهات. ئەو داماوە پارەیەکی لەگیرفانی دا نەبوو، کارەبا بۆ ماڵەکەی بکێشێ. بنیادەمێکی بێ کەس و بێدەر. نەیدەزانی حاجی ماوەیەك لەوە پێش ماڵەکەی چراخان کردبوو.

لە کۆڵانەکەدا رێك بەرامبەر ماڵەکە، حەپەسابوو. بەڵام خۆ نەدەبوو وا بێ. بێت و بەگ دیتبای؟ کەسیش بەو کۆڵانەدا رانەدەبرد. لە پشت دەرگای ماڵەکەیانەوە دار توویەکی لك پۆ چڕی لێ بوو. چەند لکێك بەسەر ماڵەکە کشابوون. دەستبەجێ چووە پشتەوەی ماڵەکە و پاڵی بە دارێکەوە دا. دەست و پێی هێشتا دەلەرزین. چێژێکی لەو لەرزینەش وەردەگرت.

لە نێو ماڵەکەوە دەنگی منداڵ دەهات. منداڵەکان بێدەنگ بوون. ئەوجار دەنگی دایکیان هات. تووك و نەفرەتی لە مێردەکەی دەکرد. یوسف تووك و نەفرەتی وای لەکەس نەبیستبوو. ژنە دەیگوت:"یاخوا بەپەلاس بی. ببیتە بەرد پیاوەکە. کابرا ئەو هەمووە پارەیەی دایتێ، بڕۆی و گیانە سەگەکەت رزگار بکەی، ئەتۆ هەستای چووی هەموویت دۆڕاند. ئەو هەمووە پارەیەت لە چنگم دەرهێنا و مەفحت کردەوە. لەمەودوا، ئەگەر چاوت بە پشتەگوێت کەوت، جا چاوت بە پارەش دەکەوێ."

حاجی بە دەنگێکی کز و لەرزۆك گوتی:"دیسان دەمداتێ. دەمداتێ... ئەو کەسەی پێنج هەزاری داوە، دە هەزاریش دەدا."

"ئیشەڵڵا وەك سەگ دەتتۆپێنن. ماڵوێرانت کردم. منداڵەکانت برسی و رووت و رەجاڵ کرد. ئەوەندە پارەیە تازە لە کوێ پەیدا دەبێتەوە؟"

حاجی بە پێکەنینەوە گوتی:"ئەتۆ سەد لیرەم بدەیە، ئەمشەو ئەوەی دۆڕاندوومە، هەمووی دەبەمەوە."

"ناتدەمێ. تاقە دینارێکیشت نادەمێ. هەی دژومنی منداڵەکانم. تا ئێستا کەنگێ پارەی دۆڕاوت بردووەتەوە، بەرازی گڵاو."

لەبزی حاجی توندتر و ناخۆشتر بوو:"بیبڕەوە. بیبڕەوە و بێدەنگ بە. چما پارەی خۆم نییە؟ دەڵێم سەد لیرەم بدەیە... ئەگەر ناتهەوێ پێستی سەرت هەڵکەنم، بمدەیە و بیبڕەوە..."

بێدەنگ بوون. ئەوجار دەنگی هاوار و زیقەی ژنەکە هەستا. دوایی کۆڵێك تووك و نەفرەت و جنێو... ئەوجار دەنگی پێکدادانی دەرگا. دەرگاکە وا پێکدا درا، دار و دیواری ماڵەکە لەرزین.

یوسف دەسبەجێ لە بن دار تووەکەوە خۆی خزاندە کۆڵانەکە. حاجی دوور کەوتبووەوە. لە پێشەوە، تارماییەکەی کەڵەگەت بەخێرایی لەوێ دوور دەکەوتەوە. یوسف کەوتە شوێن تارماییەکە.

بە دڵیدا هات، کوشتنی ئەو کابرایە واجبە. هەر کەس ئەوە بکوژێ، دەستی نوورانی دەبێ. کوڕە وەرە سەیری ئەو بێناموسە، سەو کافرە، رسق و رۆزیی منداڵەکانی بە قومار دۆڕاندووە. منداڵەکانی برسی کردووە. ژنی داماو کار دەکا و ئەویش بەرهەمی ماندووبوونەکەی دەبا و لە قوماردا دەیدۆڕێنێ. نامەردی بێشەرەف. گڵاو... توخمی بەراز. چما بنیادەم هەقی ئەو منداڵە وردانە دەخوا؟ ژنە چیی دەگوت؟ دەیگوت ئیشەڵڵا وەك سەگ دەتتۆپێنن و لە کۆڵێ من و منداڵەکانم دەبیتەوە. چما پیاو رۆزیی منداڵەکانی دەبا و قومار دەکا؟ هەقدەستی ژنێك وەردەگرێ و بە قومار دەیدۆڕێنێ؟ پیاو منداڵەکانی خۆی برسی و تینوو دەکا؟ تۆ دەبێ لەسەر ئەو زەوییە پاك بکرێیەوە بۆ ئەوەی منداڵەکانت بحەسێنەوە. ئەتۆ بەکاری هیچ شتێك نایەی؟

جار بە جار تووڕەتر دەبوو. زۆری پێ خۆش بوو ئاوا لە حاجی تووڕەیە و لێی داخدارە. لە دڵی خۆیدا پەیتا پەیتا جنێوی دەدایێ.

گەیشتنە بازاڕەکە. بەرەو ئاشەکە رۆیشتن. یوسف هەنگاوی شل دەکرد مەودای لێ بگرێ، نەکا بزانێ بە شوێنییەوەن. حاجی لە نزیك باخچەکەی مام بەشارەت هەنگاوی خاو کردنەوە. یوسفیش خۆ لە تاریکایی ئاغەڵێکدا لێ مات کرد و هەڵی نا. هەموو گیانی وەك بینی ئاو کەوتە لەرزین. دەستی بۆ دەمانچەکەی برد، بەڵام نەیتوانی لە قایشەکەی دەربێنێ.

لێره بۆ لێدان نابێ. دەنگی تەقەکە دەبیستن و تا خۆی دەرباز دەکا، دەیگرن. چەقۆکەی لە ماڵەوە لێ بەجێ مابوو. لە داخان وەخت بوو شێت بێ. سەد بریا ئێستا توانیبای ئەو سەیە لەکۆڵ بکاتەوە. ئاخۆ جارێکی دیکەش ئاوا لێی بەقیندا دەچێتەوە؟ پیاو هەمیشە لە پیاوی ئاوا، لە بنیادەمی ئاوا کە دوژمنی ماڵ و منداڵیانن و زۆر بۆ ژنیان دێنن و زوڵمیان لێ دەکەن، بەقیندا دەچێ.

حاجی وەڕێ کەوت. دەستی کرد بە فیکە لێدان. لە فیکەی دیار بوو کەیفخۆشە. بای داوە بەرەو باخچەکەی عومەر. یوسف تاوێ لەبەر دەرگاکە راوەستا. بچێتە ژووریێ یان نەچێ؟ ئەگەر بیبینن؟ چووە ژوورەوە.

لەو لاترەوە رووناکاییەکی کز دەهات. حاجی بەپەلە بەرەو فانۆسەکە چوو. لە تەنیشت فانۆسەکەوە سفرەیەك راخرابوو و حەوت هەشت کەسێك لەسەر سفرەکە بوون.

"ئۆ ۆ ۆ حاجی، درەنگ گەیشتی، بێ و نەبێ ژنەکەت بەربینگی پێ گرتووی."

"کوڕە نازانن چ گەندوگوویەکە. ئەو گووسەگە، پارەی نەدەدامێ. بە زۆری لە چنگی رزگارم بوو. ژنی چی، ئەوە ژانە. وەیش، وەیش، هەتا ئەو پارەیەم لە چنگی دەرهێنا، گیانم هاتە سەر لووتم. ئای برادەرینە، من ئیتر دەبێ بڕۆم. ئاغا و بەگەکان لە وڵاتەکەم دەرم دەکەن. سبەی دەستی ژن و منداڵەکەم دەگرم و دەڕۆم بۆ ئەسکەندەروون. بەیانی دەبێ بڕۆم."

گوتیان:"جارێ دانیشە بزانین. دانیشە و پێکێ هەڵدە."

"ئەتۆ دڵت لێرە بەرنابێ. ناتوانی ئێمە بەجێ بێڵی و بڕۆیتە جێیەکی دی."

"بەگەکانیش ناتوانن شاربەدەرت بکەن."

"کێ دەتوانێ لێرەت دەر بکا؟ خۆ گیانی بەگەکان لە گیانی ئێمە شیرینتر نییە..."

حاجی پێکەکەی هەڵدا و گوتی:"بە خۆشیی شاربەردەکرانم..."

یوسف لە بن دارێك پاڵ کەوتبوو و سەیری دەکردن. ئێستا ئیتر تەواو کەیفخۆش ببوو. حاجیی دەکوشت و لە کۆڵ ژن و منداڵەکەی دەکردەوە.

جا دوای گەڕانەوەی بەگ داوای لێ دەکرد، مانگانەیەك بۆ ژن و منداڵەکەی حاجی ببڕێتەوە. رەنگ بوو بەگ قایل نەبایە، بەڵام ئەو هەموو ساڵێ لەسەر خەرمان ئارد و پەڵخۆر و برنج و ساواری بۆ دەبردن. پارەشی دەدانێ، تەنانەت خەرج و تێچووی خوێندنی منداڵەکانیشی دابین دەکرد.

حاجی دوای ئەوەی سەری گەرم داهات، زاری داپچڕی، جا لە پێشدا ژنەکەی دایە بەر جنێوان و دوای ئەوە چیی لە زاری هاتە دەرێ حەواڵەی ئاغا و بەگەکان و زۆر کەسی دیکەشی کرد. زیاتر لە هەمووان شرت و شۆی مردوو و زیندوو قاباقچی ئۆغڵیی دەرهێنا.

یوسف نوقمی خۆشی و شادی بوو. حاجییە شێتەی دەکوشت. جا لەگەڵ گەڕانەوەی بەگ بە ئەستەمبوڵ، دەمانچەکەی فڕێ دەدایە بەر پێی و دەیگوت، دوژمنت عومری دا بە تۆ. بەگیش ژنی بۆ دەهێنا. لەوانەش بوو نوورخانی کچی بداتێ. ئەی گوڵعوزار.... گوڵعوزار؟ ئەو دەبووە ژنی دووەمی. زۆر کەس دوو، سێ یان چوار ژنیان هەبوو. دەی خۆ بەردی زیادی سەری پیاوی ناشکێنێ. هەر ئەوەندە دەوڵەمەند بی... ئەمڕۆش نەبی، سەبەی. سبەینێش نەبێ، سبەی. چیی واشی نەماوە بەگ بگەڕێتەوە. کوڕە جا کێ هەیە وەپێ و شوێنی حاجی بکەوێ؟ ئەو گەندو گووانەی دەور و پشتیان گرتووە؟ جا بەگ سلامەت بێ، ئەوانە چییان پێ دەکرێ؟ بنیادەمێکی ئاوا خراپ... جگە لەوەش، بەڵێنی بە بەگی خۆی دابوو....

لە تاریکاییەکەدا بە پێ دزە لێیان دەچووە پێشێ. لە نەکاو زانیی لە دە مەتر پتر لێیان دوور نییە. هەوڵی دا لە سەر جێی خۆی نەبزوێ. ئەو جێیەی لێ راکشابوو، دەوەن بوو. خۆ ئەگەر نەجوولابایە و خشەخشی نەکردبایە، کەس پێی نەدەزانی.

"ئێستا هەر هەمووان سەرخۆش بوون. یەکێکیان گوتی:"با دەست پێ بکەین."

ئەوانی دیکەش گوتیان:"با دەست پێ بکەین. دەست پێ بکەین... لە پێشدا حاجی مۆرە هەڵداوێ."

حاجی مۆرەکانی گرت و لە دەستیدا هەڵیخلاند و گوتی:"ئەی مۆرە، تف لە گۆڕی باپیرەت، باوکت، هەی..."

هەڵی هاویشت. داهاتنەوە و گوتیان:"یەك و دوو."

مۆرەکان دەست بە دەست دەگەڕان. حاجی بێ بڕانەوە جوێنی دەدا.

"جووت شەشێك بێنە گیانەکەم."

یوسف وا نوقمی گەمەکەیان ببوو، بیری لە هی نەدەکردەوە. حاجی هەر جارێکی مۆرەکەی هەڵدەگرت، دەیگوت:"جووت شەشێك بێنە، دەی بێنە..."

جنێوی بە مۆرەکە دەدا. چەندی زیاتری دەدۆڕاند، پتر جنێوی دەدا.

ئەوانی دیکە پەیتاپەیتا دەیانبردەوە و حاجی دەیدۆڕاند و یەك پشوو دەیگوت:"هەی خوا بتبڕێ مۆرە، ئەمڕۆ شانسەکەم نووستووە. لەوانەیە لە نێوگەڵی... دەی بێنە..."

یوسف:"هەی خوا بتباتەوە مۆرە، شانسەکە خەوتووە.... قەحپە، دەی بێنە."

حاجی:"جارێکیش بۆ ئێمە، یەك جاریش بۆ ئێمە."

یوسف:"جارێکیش..."

حاجی جاروبارە جنێوی بە مۆرەکە دەدا و دەکەوتە پاڕانەوە:"دەی بێنە گیانەکەم. بێنە ئازیز، چاوڕەشەکەم، برالە دەی هاوڕێ... ئەی بۆ ئەمڕۆ لێم زویری؟ هەر یەك جار. ئەی کەنگێ دەتەوێ پێ بکەنی؟"

مۆرەکەس بە دەستی چەپەی هەڵدەگرت و دەستی بەسەردا دێنا. دەستی لە سینگی دەکوتا و هەڵیداویشت و دەیگوڕاند.

"هەی سەگباب، دایك حیز، هەی ..."

یوسفیش بەبێ ئەوەی خۆی بزانێ، لاسایی دەکردەوە:"هەی سەگباب، هەی... حاجی ماوەیەك مۆرەکەی لە دەستیدا هەڵخلاند و چەند جارێك دەستی لە سینگی کوتا و گوتی:"دەی بیهێنە گیانی من... دەی بیهێنە."

لە پڕ لەخۆشییان هاواری کرد:"جووت شەش دایکەکەم. هەی بە قوربانی ئەو چاوە ڕەشانەت بم."

چیی وای نەمابوو یوسفیش وەك ئەو لە خۆشییان هاوار بکا:"جووت شەش دایە گیان، هەی بە قوربانی..."

حاجی مۆرەکەی هەڵگرت و سێ جاران ماچی کرد و گوتی:

"هاتەوە. شانسەکە هاتەوە. هەی شانسی دایك...! نا، تازە کە هاتییەوە ئیتر ناهێڵم بڕۆی."

یوسف:"هاتەوە، شانسەکە، بە قوربانی ئەو چاوە رەشانەی بم. هاتەوە. جارێکی دیکەش..."

حاجی یەك پشوو دەیبردەوە و یوسف بە خۆشییان وەخت بوو بفڕێ.

شەوگار شەق ببوو. دەنگی رووبارەکەی ساورۆن لە بێدەنگیدا دەهات.

لە نەکاو بوو بە هەڵڵا و قومارچی پێك وەربوون و تێك بەربوون و دەستیان کرد بە تێك هەڵدان.

سواری سەری یەك بوون و بە مست و نووکە شەق و جنێوی پیس پیس، کە بە یەکتریان دەدا... لەو نێوەدا حاجی وەبنەوە کەوت. ئەوەی سەرەوە وای دابووە بەر شەق و پێلەقان، دەتگوت لە گەچ دەدا. یوسف هەوڵی دەدا لە جێی خۆی هەستێ و فریای حاجی بکەوێ. بەزۆر

خۆی گرتبوو. کەس ئەویتر بە شەق لێی دەدا، یوسف دەردەپەڕی و دیسان وەخۆ دەهاتەوە و لە سەر عەرزەکە رادەکشایەوە. جارێکیان بەدەست خۆی نەبوو، هەستا و بە تووڕەییەوە بەرەو لایان چوو. دەیویست بچێ و تۆڵە لەو کەسە بکاتەوە کە لە حاجیی هەڵدەدا. دوای ئەوەی یەك دوو هەنگاویش چووە پێشێ، ترسا و خێرا خۆی خستەوە نێو دەوەنەکان. وەخت بوو مێشکی بتەقێ. ئەوەندە بێ ئۆقرە بوو، خەریك بوو بخنکێ. شەڕەکە وا گەرم بوو و ئەوانیش وەها مەست و سەرخۆش بوون، هەر ئاگایان لە یوسف نەبوو.

تاوێك دواتر شەڕەکە دامرکایەوە و دەستیان کرد بە قسە و مشتومڕ لەسەر ئەوەی خەتای کێ بوو... ماوەیەك دواتر ئاشت بوونەوە و دەموفلچی یەکیان ماچ کرد. یوسف کە تەواو حەپەسابوو، لە بن لێوانەوە گرماندی:"باشە ئەوانە چ بنیادەمێکن؟ چما بنیادەمی ئاواش هەیە؟..."

دوایی بە دەم قسەی خۆش و پێکەنین و بە گۆرانیگوتن لە باخچەکە چوونە دەرێ. یوسفیش وەدوویان کەوتبوو و لە دوورەوە ئاگای لێیان بوو. لە پشتماڵەکەی مام بەشارەت لێك جوێ بوونەوە. حاجی بەرەو ماڵەکەی خۆی کەوتە رێ و یوسفیش کەوتە شوێنی.

حاجی لە بن لێوانەوە گۆرانیی دەگوت. گۆرانیی شاد و گشت. یوسفیش لەگەڵیدا شاد دەبوو. لە پڕ بەخۆی گوت:"ئەو کابرایە دەبێ بکوژرێ. پیاوێکی کەرە، بنیادەم نییە، سەگباب... قومارچی..."

هەرچی دەیگوت و چیی دەکرد، نەیدەتوانی رق و قین لە حاجی داگرێ. ئەی خۆزگە ئەو دەمەی وا لێی بەقیندا چووبوو، مشووری خواردبایە. ئیتر لەمەودوا دەمانچەکەی دادەنا و دەستی دەدایە خەنجەرەکەی. ئەگەر لەو ساتەدا خەنجەرەکەی پێ دەبوو، تەواو دەیبڕییەوە. کەسیش لەو تاریکاییەدا نەیدەدی.

حاجی هێشتا نەگەیشتبووە بەر دەرگای ماڵەکەی، کە هەرای کرد:"ژنەکە، کچێ ژنەکە، دەرگا بکەوە، هاتمەوە."

دەرگاکە کرایەوە. حاجی ژنەکەی، کە چرا لالەیەکی بەدەستەوە بوو، لە ئامێز گرت و بە شادییەوە گوت:"دراوەکەمم بردەوە. ئەوەندەی دیکەش زیادی. ئەوەتا، بزانە، ئەتۆ سەد لیرەت دامێ. بڕوانە ژنەکە. دەڵێی چی واز لە رۆیشتنێ بێنین؟ وا باشتر نییە؟ دەڵێی چی؟"

ژنەکە بە خۆشیرینکردنەوە گوتی:"جارێ وەرە ژوورێ. یاخوا لە دەورت گەڕێم پیاو... ئاخر من بڵێم چی... لەوەندە زیاتر پارەمان نەمابوو. ئیتر تاقە فلسێکیش چییە لەو ماڵەدا

نەدەمایەوە. دەترسام سبەی رۆژێ منداڵەکان برسی بمێننەوە. خۆ نەمدەتوانی توورەکەی سواڵێ بە کۆڵمدا بدەم."

حاجی وەڕوور کەوت. پووڵەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و فڕێی دایە سەر عەرزەکە.

"هانێ ژنەکە. دیوتە چەند زۆرە؟"

یوسف دیسان خۆی لە بن دارتووەکەی پشت ماڵەوە مات دابوو و گوێی هەڵخستبوو.

"بەیانی یەکی دوو دەست جلوبەرگ بۆ ئەو منداڵانە بدوورە. ئەو پارەیە هەمووی بۆ خۆت. دەی پێنج تەنوورەش بۆ خۆت بکڕە. ماتۆیەکیش بکڕە. لەو پارەیە یەك فلسیشی بە من مەدە. لە جێیەکی بشارەوە من بۆم نەدۆزرێتەوە. حەز دەکەی بیبە و بیدە بە سەفەری دووکاندار. ئەو فلسێکیش چییە وەمن نادا."

باوەشی بە ژنەکەی دا کرد و ماچی کرد.

"بشمری، فلسێکی ئەو پارەیەت نادەمێ. بشمکوژی ناتدەمێ..."

یوسف گوتی:"رووت سپی بێ خوشکێ. مەیدەیە. ئەتۆ شێرە ژن بووی ها. هەر نینۆکێکت هەزار حاجییە شێتە دێنێ. هەی بارەقەڵڵا ژنەکە..."

بەدڵیدا هات:"باش بوو بردییەوە. دۆڕاندبای، سبەینێ منداڵەکانی برسی دەبوون. باش بوو بردییەوە..."

دەنگەدەنگەکە نەمابوو و یوسف لە بن دارەکە نەدەبزووت. دوای ماوەیەك سەری هەڵێنا و سەیری کرد سەر دەموزتەپە خەریکە روون دەبێتەوە. دەسبەجێ هەستا و بەرەو ماڵ بۆوە.

## ٨٩

ئەمساڵ خەڵکێکی زۆر بۆ لۆکەڕنینەوە لە چیاکانەوە هاتبوون. ئەوە باشتر بوو. بەر لەوەی پاییز بێ، چیی لۆکەیە دەڕندرایەوە. ئەو دارکالیپتووسانەی لە زۆنگاوەکەدا نێژرابوون، باش هەڵیا دابوو. زەوی و زاری بەبێ مێشەڵان بەکار نایە. لە ئەمریکاش هەر مەزرایەك دارستانێکی هەیە. لە خۆڕایی نییە بەوێ دەڵێن دنیای نوێ. لەوێ، کەسی وەك دەروێش بەگی لێ نییە. ئەوان ئەو مڵۆزمانەیان دەمێکە لە کۆڵ خۆیان کردووەتەوە. ئەو دەروێش و شتە، مایەی نەهامەتی و چارەڕەشیی میللەتن. کابرا دەیەوێ لەم سەردەمەدا وەك سەدەی یازدەیەم بژی. چەندەش پێداگر و سوورە لە سەر ژیانێکی وا. نازانم چ قازانجێکی لەوە پێ دەگا؟ خۆشی و خزم و کەسەکەشی و مەملەکەتیش زیان دەبینن. ئێمە شۆڕشمان کرد، بەڵام نەمانتوانی ئاغا و دەرەبەگایەتی لابەرین. وا زووش مەفح نابنەوە و لەنێو ناچن. ماوەیەکی زۆر بە رەچەڵەکی خۆیان دەنازن و کای کۆن بەبا دەکەن. ئەو سەگبابانە بە باب و باپیریان دەنازن. سەگەلێکن دڵیان بە ئێسك و پرووسك خۆش کردووە. بۆ لەنێوبردنی ئەوانە، دەبێ رەگە سەرەکییەکەیان لەنێو بەری و رەگی سەرەکیشیان هەر ماڵ و مڵکەکەیانە. ئەوانە ماڵ و مڵکیان نەبێ، کەس سەیریشیان ناکا. ئێمە چارمان نییە جگە لەوەی هەموو هەوڵی خۆمان بدەین بۆ ئەوەی ماڵ و مڵکیان بە دەستەوە نەهێڵین. بەڵام حوکمەت و کەسی دیکە پشتیان دەگرن. تەنانەت خەڵکی وەك ئێمەمانانیش پشتیوانییان لێ دەکەن. ئەگەرچی ئەوان بە هەموو بارێکدا سووکایەتیمان پێ دەکەن و بەڵامان بەسەر دێنن، دیسان هەر دەستیان دەگرین.

بەر لەوەی کرێکارەکان بێنە کێڵگە پەمۆکەی من، لۆکەجاڕەکانی ئەو پڕ دەبن لە کرێکار. خۆ ئەو نیوەی ئەو پارەیەیان دەداتێ وا من دەیاندەمێ. ئەو خەڵکە دواکەوتوون. هێشتا کۆت و بەندی پەیوەندییە عەشیرەتییەکانیان لە ئەستۆی دایە. ئەوەی لەبن دەستین، مێگەلە ئینسانێکن کە هەر بە سەر لەقاندنێك ملی خۆیان دەشکێنن.

ردێنی قاباقچی ئۆغڵی درێژ ببوو. لەوانەیە سێ حەفتە دەبوو گوێزانی وێ نەکەوتبوو. وەبیر نەدەهات قەت ردێنی ئاوا زۆر بووبێ.

دەبێ ئەو خەڵکە لە چنگی دەروێش بەگ رزگار بکرێن. تاقە رێگەچارەشی ئەوە بوو خوێندەواریان بکا. بەڵام ئەگەر دەرسیان خوێند و خوێندەوار بوون... کاتێك ئەو مێگەلە دەستکورت و پێ پەتییە دەرسی خوێند و چاوی کرایەوە... جا ئەو کات وەرە و ئەو کەرە لەو قوڕەی دەربێنەوە. دیسان هەر وا باشترە، لەگەڵ دەروێشەکان رێك بکەوی. دەبێ خۆیان لێ نزیك بکەیتەوە و وردە وردە جا پتشیان بەردەی و رەگەکەیان وشك بکەیت و لەناویان بەری. باشە ئەمریکا ئەو کارانەی چۆن راپەڕاند؟ خەڵك لەوێ تێر و پڕن. خەڵکی ئەوێ چاویان لە زەوی و زار نییە. خەڵکی ئەوێ وەك خەڵکی ئێرە وەحشی نین. ئەوانە بۆیان هەڵکەوێ، بەڵایەکمان بەسەر دێنن، هەر نەبێتەوە.

ئاخ دەروێش بەگ، یاخوا کوێر بی. باشە ئەگەر خۆت پێ پیاوە، بۆ ئەو کەسە ناکوژی کە لەبەر چاوی هەمووان، جنێوی پێ دای؟ بۆ ئەو ناکوژی؟ بۆ ئەوەی دنەدەرەکەی بدۆزیتەوە؟

کزەی لە جەرگی هات. موچڕکەی بەگیاندا هات. هەر لە ئەستەمبوڵ بگەڕێتەوە، حاجی دەدۆزێتەوە و هەرچۆنێك بێ لە زاری دەردەکێشێ. جا ئەو کاتەیە کە ئاگر دەگرێ. هەم ئەمن لەنێو دەبا و هەم خۆشی. باشە جگە لە دەسبەجێ کوشتنی حاجیە شێتە چارەیەکی دی هەیە؟

حاجییە شێتەش لە کۆڵان و بازاڕێ تووشی هەر کەس دەبێ، دەڵێ: بەگەکان دوورم دەخەنەوە. هەموو ئەم شارۆچکەیە، ئەم شارۆچکە پیسە بێکەڵکەش گاڵتەجاڕێکی بۆخۆی دۆزیوەتەوە. تازە ملی خۆشی ناشکێنێ و بڕوا. ئەو هەمووە پارەیەی لە من وەرگرتووە، چووە لە قوماردا دۆڕاندوویەتی. چیی واشی نەماوە دەروێش بە ئەستەمبوڵ بگەڕێتەوە. چار نییە، حاجییە شێتە ئەمڕۆ یان سبەی دەبێ لەنێو بچێ. دەست بەکار بە ماهیر. هەرچی لە ژیانتدا بەدەستت هێناوە، بە بادا دەڕوات.

گەرمای گوندەکانی دەشتێ، تاقەتبڕە. قاباقچی خەلیلی بابم، چیی بەمیرات بۆ بەجێ هێشتووم... دووسەد و پەنجا دۆنمێك زەویی شۆرەکات... بۆخۆشی بە زگی برسی مرد. لە گۆڕستانەکە، هەر وشکەڵەدارێك هەبوو. لەو گەرما و تەپوتۆزە خنکێنەرەدا قاباقچی خەلیلی بە یارمەتیی سێ کەس ناشتبوو...

گوللەیەکی وەتەختی سینگی کەوتبوو. دەستی لەسەر سینگی دانا. هەستی کرد کزایەوە. لە پڕ دەرپەڕی بەڵام زوو وەخۆی هاتەوە. هەر ئەو حاجییە شێتەیە نەمێنێ، هەموو

کاروبارەکان جێبەجێ دەبن. هەموو شتێك، هەموو شتێك جێبەجێ دەبن. ئیتر کاری وا قۆڕیشی نەدەکردەوە. لە نەکاو دڵی خۆش بوو، بەڵام دڵخۆشییەکەی زۆری نەبرد. باشە کێ ئەوەی بۆ دەکرد؟ دیسان کەوتەوە گێژاوی بێهیوایی و ترسەوە.

وەلی، ئاااخ وەلی. ئەوە ساڵی ساڵان بوایە، کوڕە سەرشێتێك بوو، بە یەك ئاماژە پێنج کەسی لە رۆژێکدا دەکوژت. بەڵام ئێستا مێرووڵەیەکی پێ ناکوژرێ.

بەڵام من ناچاری دەکەم، حاجییە شێتە بکوژێ. نەیکوژێ، خۆی دەکوژرێ، یان وای لێ دەکەم مەرگ بە ئاوات بخوازێ. دۆڵك حوسێن کێ کوشتی؟ باشە وەلی و دۆڵك حوسێن بابی یەکتریان کوشتبوو؟ چما وەلی، ئەو دەمەی یاخی بوو، براکەی دۆڵك حوسێنی نەکوشتبوو؟ چما دۆڵك حوسێنیش لێرە و لەوێ سوێندنی نەدەخوارد دەیگوت وەلی دەکوژێتەوە؟ چما تەرمەکەی دۆڵك حوسێن ساڵی رابردوو لە خەرەندێکی لای مەزراکەی ئێمەدا نەدۆزرایەوە؟ چیی گەڕان و پرسیاریشیان کرد، نەیانتوانی قاتڵەکەی دۆڵك حوسێن بدۆزنەوە. باشە وەلی نەبێ، کێ کوشتبووی؟

ئەگەر وەلی بڵێ حاجییە شێتە ناکوژم، ئەو تاوانە بەستۆی ئەودا دێنم. گاڵتە نییە کاکە، خەریکە تێدا دەچم. ئەوانەی لەو دەموساتەدا پشتم تێ دەکەن و یارمەتیم نادەن، لێگەڕێ با تێدا بچن. کوشتنی حاجییە شێتە بۆ وەلی، کە ئەو هەمووە پیاوەی کوشتووە، وەك ئاوخواردنەوە وایە. کێ هەیە وەپێ و شوێنی سەیەکی وەك حاجییە شێتە بکەوێ؟ بۆخۆمان دیزە بە دەرخۆنەی دەکەین. ئەگەر نەشمانتوانی و بوو بە هەڵڵا، کە هەر واشی لێ هاتووە، چ لەوەی باشتر. خۆ هەمووان دەزانن پەیوەندیی نێوان دەروێش و حاجییە شێتە چۆنە. هەمووان پێیان وا دەبێ، نەخێر هەر دڵنیا دەبن کە دەروێش حاجیی کوشتووە. وەلی، دوژمنایەتیی هەیە. دەزانێ چەندە پەشێو و پەشۆکاوم و تەفرەم دەدا. ئاگام لێیە لە بنەوە بە کلك گوێزی دەشکێنێ. باشە. پێی دەڵێم. قاتڵی دۆڵك حوسێن، کەس نییە جگە لەو.

دڵی بێ ئۆقرە بوو و تەنانەت نەیدەوێرا بەسەر پێیانیشەوە راوەستێ. جار نەجارێك گوێی لە ترپەی دڵی رادەگرت. دڵی وەك باڵی چۆلەکە فڕەی دەهات و دوایی دەتگوت لە لێدان دەکەوێ. سەریشی کاس کاس دەبوو. دەتگوت مێشکی کای تێدایە.

بۆ وەلی دۆڵك حوسێنی کوشتووە؟ خۆ ئەو نەیکوشتووە؟ ئەی چۆن دەیخەیە ئەستۆی ئەو؟ ئەی ئەودەم وەلی لەتۆش نادا؟ جگە لەوەش، چۆن دڵت دێ کەسێکی بێ تاوان بخەیە زیندانەوە؟ ئەوەی چۆن پێ دەڵێی؟

خۆ ئەگەر چووبایەتە پاریس، لەندەن یان نیویۆرك و دوو ساڵێکی بەسەردا هاتبایە و لە چنگی ئەو وەحشییە خوێنمژە رزگار ببوایە... هەتا دوو سێ ساڵی دیکە زۆر شت دەگۆڕدرێ. کێ مردووە و کێ زیندوو؟ هەتا ئەو کات ئاوێ بە ئاگردا دەکرێ و لەوانەیە دەروێش بەگیش هەموو ئەوانەی لەبیر بچێتەوە. لەوانەشە دیسان بە نەریتی ئۆغوز ئاشت بێتەوە... بەڵام ئەگەر بچمە ئەورووپا یان ئەمریکا، دەروێش دەست لە زەوی و زار و ماڵ و منداڵەکەمان هەڵدەگرێ؟ مەزراکەم ناسووتێنێ؟ چما لێ دەگەڕێ، چما دار بەسەر بەردمانەوە دەهێڵێ؟ چما جووقەوار لە تۆرەمەی قاباقچی نابڕێ؟ شێت و شووری ئۆغوز...

ئەگەر ئەو ئۆغوزە شتێکی لێ شین بووبایەتەوە، پێکەوە دەستمان دەخستە دەستی یەکتر و دەوڵەتێکی ئۆغوزمان دادەمەزراند... باشە ئەگەر وا بێ و سەری بەو شتەوە بخافڵێنم، مەسەلەکەی حاجییە شێتەی لەبیر ناچێتەوە؟

هیچ ناکرێ. دەروێش دێتەوە. هەر ئەم رۆژانە سەر و سەکتی پەیدا دەبێتەوە و حاجییە شێتە دەگرێ.... وەی باوکەڕۆ، باوکەڕۆ... جا ئەوجار بانگی ماهیر دەکا و شەوێك بە سێ کەسانەوە لە ماڵێ هەڵیدەگرێ و دەیباتە چیا و لەوێ هەر لە چەند چرکەدا جارێك پارچە گۆشتێکی لەشی لێ دەکاتەوە و لە ماوەی حەفتەیەکدا بە ئەشکەنجەیەك دەیکوژێ مەگەر خودا خۆی بزانێ. دەوێش کابرایەك نییە هەر وا سووك و ئاسان بە فیشەکێك ساردی بکاتەوە... جا ئەوجار لەتوکوتەکانی فڕێ دەداتە نێو خەرەندێکەوە. شوێنێك کەس نەیدۆزێتەوە... هەموو لەتوکوتەکانیش کرم تێی دەدا. کرم تێیدا دەجوولێنەوە بەسەر یەکدا. مار دێن و لەسەری پەپکە دەخۆن. مێروولەی زەرد، پیسترین مەخلووقی ئەو دنیایە و هەر یەکەی هێندەی سەرە دەرزییەك، قێزەون، ملوێنان ملوێن... ئەو تووك لێکراوانە بەر لە هەموو جێیەك چاوی بنیادەم هەڵدەکۆڵن. مێروولەی زەرد هەتا چاوی مردوو نەکۆڵن، کاریان بە هیچ کوێی دیکەی نییە. خودا دەزانێ چەندەیان کەیف بە چاوی بنیادەم دێ.

قاباقچی ئۆغڵی ئیمانی بە خودا نەبوو. تەنیا لە سەروبەندی هەڵبژاردنەکاندا وای دەنواند ئیمانداره و دەچووە مزگەوت و نوێژی دەکرد.

ئەژنۆی دادەدا و دەستی هەڵدێنا. خوایە، ئەی خودای گەورە، لەو بەڵایەم رزگار بکە. ئەگەر لەو بەڵایە رزگارم بکەی، ئیمان دێنم هەی. پێنج فەرزە لە مزگەوتێ نوێژان دەکەم. خوایە، یارەبی، رزگارم بکە. کارێکی وا بکە یان دڵی ئەو دەروێش بەگە نەرم بێتەوە یان ئەو سەرەی بردوویەتی، نەیهێنێتەوە لە ئەستەمبوڵ... فڕۆکەکەی بەربێتەوە. خودایە، خوای

گەورە، ئەو کاتە ئیمانت پێ دێنم. ئەم جارە گیانم رزگار بکە. ئەگەر لەو بەڵایەم نەجات بدەی، لە هەموو دنیا ئیماندارتر دەبم. خودایی خۆت بنوێنە خودایە. موو بە موو ئەمر و فەرمانت بەجێ دێنم. رۆژوو دەگرم، زەکات دەدەم و ئەگەر دەوڵەمەند بووم و سامانەکەم زیاتر بوو، مزگەوتێك دروست دەکەم. لە زاری ئەو گورگە خوێنمژە نەجاتم بدە خودایە.

لە مەیدانەکەی قاراکۆی ئەستەمبوڵ... ئەو دەمەی لە شەقامەکە دەپەڕێتەوە... ترۆمبێلێکی رەش، کادیلاکێك بە خێرایی... دەروێش باڵتۆیەکی درێژ و خۆڵەمێشی لەبەر، لە کاتی پەڕینەوەدا... تیشکی زەرد، سوور، مۆر... جوانترینیان تیشکی شین. کەسك لە شەوانەدا خۆش نییە. کەسك پێویستیی بە رووناکییە... مێشکی دەروێش پژاو... خوێنەکەی لە پیادەڕۆیەکە دەچۆڕێتەوە. لاقەکانیشی ئەنجن ئەنجن. بە کاغەزی رۆژنامە دایانپۆشیوە. حەشیمەتێك لە دەوری مەیتەکەی کۆ بوونەتەوە. هەویە و ناسنامەی پێ نییە. ئااخ، خوای گەورە، ئەوە بکە....

وەلی، وەرە ئەو کارە بکە. .. ئەگەر بیکەی دەوڵەمەندت دەکەم. دەتکەمە خاوەنی زەوی و زار. لە زۆنگاوەکەی ئاقچاساز سەد و بیست هەزار دۆنمت زەوی دەدەمێ. هەر دۆنمەی کوڕێکی شیرین دێنێ. یەك و پەنجا، یەك و شەست، یەك و هەشتا بەر دەدا. نیوەی ئەو گوندییە چەپەڵانە خواردیانە، نیوەشی بە دەست نێرگز ئۆغڵیی گەمژەوە ماوە. ئەستەم نییە لە چنگی دەربێنی... خوایە نووری ئینسانییەت بخەیتە دڵی ئەو وەلییەوە. دەتناسم و ئیمانت پێ دێنم... درەهێنانی زەوی لە چنگی گوندییەکانیش ئەستەم نییە....

ئەگەر وەلی نەیەوێ بیکوژێ، من، من...

چارم نییە. شەوێکی حاجییە بانگ دەکەمە دمۆزتەپە و بە قوربانی گوللەیەکی دەکەم. کێ دەزانێ. هەموو وا دەزانن دەروێش شرت و گومی کردووە. جا ئەوجار وەشوێن نەقیب بکەوە و وەشوێن دائەستێن بکەوە... دەروێش دەگرن...

هۆی دەروێش، ئەوە تۆ بووی منت کردە گەپجاڕی عالەمێ؟ بە تەڵەیەکەوەم کردووی قەت بەر نابی. بۆخۆم دەتکوژم. بە دەستی خۆم...

کە دەیگوت خۆم، کەیفی دەکرد... هەر دەیگوت و دەیگوت خۆم. خۆم دەیکوژم. پێویستم بە یارمەتیی کەس نییە. خۆت نینۆکت نەبێ کەس پشتت ناخورێنێ...

دڵی زرمەی دەهات. ئەوە چییە؟ دەتگوت دەست و پێی دەمرن. خوایە... دەستەکانی زەرد هەڵدەگەڕێن و پشووی دەوەستێ، دەخنکێ... من، من دەیکوژم. بە قاپێك راکی دەیبەمە دمۆز تەپە... لەوێش دەمانچەیەك... رێك لە تەختی نێوچاوانی. دەستەکانی زۆر سەیر

دەلەرزین... لەویٚ، دوای ئەوەی نێوچاوانی هەڵتەکا... دەردەچیٚ... لە رێگە کە دەهاتەوە، بەلادا دەهات. لاقی لە بەردێك هەڵدەنگوت، سەرەنگریٚ دەبوو، دەکەوت و خوێن لە لووتی دەهات. دەستیشی دەشکا...

بەڵام ئەی ئەگەر گوللەکە نەیپێکا؟ حاجی دەمانچەکەی لیٚ دەستاند و لیٚی دەدا. شەڵاڵی خوێن... لەشی کرم تیٚی دەدا و کرم بەسەر یەکدا دەجوولاٚن... تێك دەچڕژان... کەس نەیدەزانی.. ئەگەر حاجی بریندار بوایە؟ و شەڵاڵی خوێن پەلاماری دابا؟ تاریکی، نوقمی خوێن...

لەرزێکی سامناك لە گیانی گەڕابوو. چیی هەوڵی دەدا ئەو لەرزینە لەخۆی بکاتەوە، بیٚ هودە بوو.

من حاجیم پیٚ ناکوژریٚ. من پیاوم پیٚ ناکوژریٚ. ئەمن تەنانەت مێرووولەیەکیشم پیٚ ناکوژریٚ. هەموو گیانی دەلەرزیٚ. دەخنکێتەوە، زاری داپچڕیوە و هەوڵ دەدا هەناسە بدات. ئاو، ئاو... ئاوی دەویٚ. داوای ئاو دەکا بەڵام دەنگی دەرنایە. پیٚی وایە دەنگی دەردیٚ، هەر داوای ئاو دەکا بەڵام کەس ئاو ناهێنیٚ.

هەست دەکا دەنگی دەرنایە و هاوار دەکا:

"ئاو"

ژنەکەی بە پەرداخێك ئاوەوە دیٚ. ماهیر شەربە ئاوەکە یەك بین هەڵدەچۆڕێنیٚ.

ژنەکەی بە پەرۆشییەوە:"چ بووە؟ رەنگت بە رووەوە نەماوە، ئەی بۆ ئاوای؟ لەرزت لیٚیە. بچم ئۆدکلۆن(بۆن)ـت بۆ بێنم؟

خێرا دەڕوا و دەگەڕێتەوە و دەست و دەموچاو و لاملی بە ئۆدکلۆن دادەماڵیٚ.

"دەڵیٚی بانگی دکتۆر بکەم؟"

"نا، نامەویٚ. بەجێم بێڵە. سەرم..."

ژنە دەڕوا. لە بن لێوانەوە ورتەی دیٚ. من پیاوم پیٚ ناکوژریٚ. ناتوانم بکوژم... دەستم بە حاجییە شێتە راناگا. بۆچی بیکوژم؟ دەچمە پاریس... دەروێش دەرگای ماڵەکەم بە قوڕیٚ دەگریٚ. ماڵ و منداڵەکەشم لە ماڵەوە... ئاگریان دەدا... منداڵەکانم لەو نێوەدا دەبنە کۆڵوو. یانی هەر بەراستی ئاگریان دەدا؟ بەڵیٚ دەیدا. ئەو نە دەزانیٚ ئینسانەتی چییە و نە دین و ئیمان. ئاگری دەدا، دەیدا، جا چۆنیش؟ پاریس، لەندەن... هەرچی دەبیٚ با ببیٚ... خوایە، ئەی خوایە گیان، ئەگەر لەو بەڵایەم نەجات بدەی، جووت جووت قوربانیت بۆ دەکەم. جووتێك وشترت بۆ دەکەمە قوربانی. جووت جووت جوانەگا، جووت جووت بەران... ئەی خوای

گەورە... لە قاراکۆی کادیلاکێکی ڕەش... ئەوەم لە کۆڵ بکەوە. گاڵتە نییە، گیانم لە مەترسیدایە. من پیاوم پێ ناکوژرێ....

وردە وردە هێور دەبۆوە و خۆی قایل دەکرد بەوەی پیاوی پێ ناکوژرێ. لەرزەکەی ڕەویبۆوە. شادییەك لە ناخیدا سەری هەڵێنا.

"خاتوون، وەلی لەماڵە؟"

"لە خوارەوە چاوەڕێیە، کارت پێی بوو؟"

"پێی بڵێ بێتە ئێرە."

وەلی بەکاوەخۆ لە پلیکانەکان وەسەر کەوت. هات و بەرامبەری ڕاوەستا. دەموچاوی حاڵەتێکی سامناکی هەبوو... ماهیر لەدڵی خۆیدا گوتی، هەر دەڵێی پیاوکوژە. پیاوکوژێکی تەواو. هەستا و دەستی ڕاستەی گرت و بردییە ژووری کارەکەی و لەوێ گوتی:"دەرگاکە داخە وەلی."

دەستی بەرنەدەدا. وەلی بە پێ دەرگاکەی پێوە دا.

دەستی ماهیر دیسان کەوتنەوە لەرزین. بە ترسەوە دەستی وەلیی کە بەدەستییەوە بوو، کێشا و لە سەر قورئان و دەمانچەکەی سەر مێزەکەی دانا.

"برالە وەلی، ئەتۆ دەبێ حاجییە شێتە بکوژی. دەبێ بیکوژی. بە کوشتنی ئەو هەم ژیانی خۆت و هەمیش ژیانی من نەجات دەدەی. دەروێشی پیاوکوژیش لە بەندیخانەدا دەڕزێ. مەڵێ نا. با پێت بڵێم، لەوە زیاتر چارت نییە. ناچاری. دەستت لە سەر ئەو قورئانە دابنێ... و دەمانچە... بەو کارەت، دەبیتە خاوەنی مەزرایەك. چما کوشتنی حاجییە شێتە ئەوەندە ئەستەمە؟ ئەتۆ ناچاری حاجییە شێتە بکوژی. تێگەیشتی؟ دۆلك حوسێن..."

وەلی حەپەسابوو. ئیتر سپێنەی چاویشی زەرد هەڵگەڕا.

"گاڵتە نییە. گیانم لە مەترسیدایە وەلی. دەزانم ئەتۆ هیچ پەیوەندیت بە کوژرانی دۆلك حوسێنەوە نەبووە، بەڵام منیش چارم نییە... ئەتۆ دەبێ حاجییە شێتە بکوژی..."

وەلی دەیەویست شتێك بڵێ، بەڵام ئەو بێ پسانەوە قسەی دەکرد و دەرفەتی بە وەلی نەدەدا متەقی لێوە بێ.

"گیانی من شیرینە. گیانم دەربچێ، هەموو شتێکم تەواو دەبێ. گیانی منیش بە گیانی ئەو حاجییە شێتەوە بەستراوەتەوە. بۆ کوشتنی ئەویش لە تۆ زیاتر کەسم نییە. ئەتۆش چارت نییە جگە لەوەی بیکوژی. ئەتۆ وەك ئاوخواردنەوە ئەو کارەت پێ دەکرێ. دواییش، دیسان ئەگەر ویستت مێرووڵەیەکیش مەفلیقێنەوە... دوایی..."

*٩٠

چل ژووره و هەمووش پڕ لە باڵندە. یەکێکیان لە هەموو جۆرێ لەگ لەگ، بە دندووکی درێژ و سوور و چاوی شووشەییەوە. لەو ژوورانەوە پۆل پۆل لەگ لەگ بەرەو دەرێ لە شەقەی باڵ دەدەن. بە لاقی درێژ و ملی خوارەوە، لە کێڵگەکاندا دەخولێنەوە. مارێکی رەش لە دەوری گەردنی لەگ لەگێك هاڵابوو. لەگ لەگەکە مارەکەی بریندار کردبوو و مارەکەش لە ملی هاڵابوو و خنکاندبووی. هەموو گیانی لەگ لەگە سپییەکە خوێناوی بوو. ژوورێکی دیکە پڕ لە ماسیگرەی پۆپنەکی. ماسیگرەی پۆپنەکی فەرماندەی هەموو مەلانە. هەر دەڵێی بنیادەمە. باڵندەیەك کە پەڕ و پۆی لە بەر کەسکی شین دەچێتەوە. هەڵۆی گەورەی خەواڵوو لە ژوورێکی دیکەدا. چنجڕووکەکانیان گەورە و وەك شاخی کەڵە کێوی. چۆلەکەکان بێ ئۆقرەن و لە شوێنێکەوە هەڵدەفڕن بۆ شوێنێکی دیکە. باڵندەیەکیش هەیە بە ناوی تووتاکە. ئەو باڵندەیە تینووی نابێ. تووتاکەکان سپین و هەندێکیان خاڵ خاڵن. گەردنیان خستووەتە سەر یەك. ژوورێك پڕە لە باڵندەی (یوسف جوق) کۆترە باریکە. باڵندەیەکی بچووك، کە لە بنیادەم دەچێت. سەد هەزار (یوسف جوق) ژوورێکیان پڕ کردووە. گەم گەمیان دەچێتە ئاسمان. "(یوسف جوق) ، (یوسف جوق) ، شت و مەکەکانت دۆزییەوە، دۆزیتەوە، (یوسف جوق) دۆزیتنەوە؟" باڵندە هەر جمەیان دێ. ئەو کۆترە باریکانە باڵندەیەکی سەیر و سەمەرەن. خوشك و برایەك بوون. دایکیان مردووە و بابیشیان ژنێکی دیکە دێنێتەوە. زڕدایك رۆژیان لێ دەکاتە

---

* وەك لەگەڵ رەوتی خوێندنەوەی رۆمانەکەدا، "یوسف"ی کوڕی مەحموودە کوردەمان ناسیوە، لەم بەشەدا کە تایبەتە بە بیرکردنەوە و خەیاڵەکانی یوسف، نووسەر باسی باڵندەیەك دەکات کە لە دەقە فارسییەکەدا پێی دەڵێ "یوسف جوق یوسف) و لە پەراوێزی وەرگێڕانەکەشیدا شیی کردووەتەوە و دەڵێ"یوسف جوق یوسف) کۆترە باریکە یان کۆترە شینکەیە کە لە فارسیدا پێی دەڵێن:"کووکوو" یان "یاکریم". وەرگێڕە فارسییەکە دەڵێ کوردەکان بەو مەلە دەڵێن "کاکا یوسف". هەرچۆنێك بێت ناوی "یوسف جوق یوسف" لە دەقە فارسییەکەیدا زۆر لە ناوی پاڵەوانەکەوە نزیکە بۆیە منیش هەر ئەو ناوە دادەنێم و خۆ دەبوێرم لەوەی بیکەمە "کۆترە شینکە یان کۆترە باریکە".

شەوی رەش. رۆژێکیان زڕدایکە منداڵەکان دەنێرێتە دەم رووبارێ کەلوپەلی بۆ بشۆن. منداڵەکانیش هەر یەکە و شتێك بزر دەکەن. جا ئەوجار چۆن بگەڕێنەوە ماڵێ؟ چما زڕدایکە پێستی سەریان هەڵناقەنێ؟ تەگبیر و رایەکی زۆر دەکەن، دەزانن ناتوانن بگەڕێنەوە ماڵێ و دەست دەکەن بە گەڕان بە دوای شتە ونبووەکاندا. دەشت و چیا و بیابانان سەنگ و سووژن دەدەن. نە بە رۆژ پشوو دەدەن و نە بەشەو. برسی و سەرلێشێواو و بە پێی بلۆقاوی و جلوبەرگی شڕ و دڕاوەوە دەگەڕێن و دەگەڕێن. کچە بەردەوام گوتوویەتی:"خۆزگە هەر دووکمان دەبووینە باڵندە و کەلوپەلە ونبووەکانمان دەدۆزییەوە..." رۆژێك، دوو رۆژ، دوومانگ سێ مانگ هەر وا دەڵێ. رۆژێك سەیر دەکا بوونەتە باڵندە. کچە لە چیایەك و کوڕەش لە چیایەکی دیکە، کچە بانگ دێڵێ:"(یوسف جوق) ، (یوسف جوق) ، دۆزیتنەوە؟" شتی هەرە بەنرخی کە بزریان کردووە، راخەرەکەی ماڵەوە بووە.

ئێستا هەتا قیامەتێ کچە لە (یوسف جوق) دەگەڕێ. "(یوسف جوق) ، دۆزیتنەوە؟" ئەوە لە راستیدا سەربردەی ترس و سامە، ئەویش نەك لە بیچمی بنیادەمدا، بەڵکو لە بیچمی باڵندەدا...

زۆر باشە، (یوسف جوق)ـێك ئەو هەمووەی چۆن لێ کەوتووەتەوە؟ ئەوە ئەفسانەی مەلانە گیانەکەم.

بە جۆرێکی دیکەشی دەگێڕنەوە. کچە گراوی (مەعشووق)ێکی هەبووە بەناوی یوسف و لێی ون دەبێ. کچە، کە وەختە بۆی شێت بێ، لە چیا لێی ون دەبێ. وەشوێنی دەکەوێ و ساڵێك، دوو ساڵ و پێنج ساڵ شوێن نامێنێ لێ نەگەڕێ. یەك پشووش هەر ناڵاندوویەتی و گوتوویەتی:"خۆزگە دەبوومە باڵندە و خۆزگە دوو باڵم لێ دەڕوا... دەبوومە مەل... و رۆژێك بەیانی کە هەڵدەستێ، دەبینێ ئەوە بووەتە باڵندە. هەڵدەفڕێ و لە شەقەی باڵ دەدا بۆ سەر چیاکان و هەموو وڵات دەگەڕێ. یەك پشووش هەر بانگ دێڵێ:"یوسفەکەم، (یوسف جوق) ، یوسف."

ئەوە ئەفسانەی مەلانە گیانەکەم.

ژوورێك پڕ لە (یوسف جوق) . دنیایەك (یوسف جوق) . کۆترەباریکە هەموو خەمبار و مەلوول. دەنگیان وەك دەنگی بنیادەم:"گمەگم، گمە گم."

لەوانەیە هەر کام لە مەلەکانی دنیا، بنیادەمێك بوون و هەر کامەیان لە سۆنگەی بەڵایەکەوە بوونەتە مەل. ئەو کوندە، بێ و نەبێ پیرەژنێك بووە. پیرەژنێکی بە پرتە و بۆڵە و

بێ فەڕ. دوڕنا بووکێك بووە. ڕێگاڕۆیشتنەکەی هەر دەڵێی نوێ بووکە. ئەوەندە بە ناز بەڕێیەدا دەڕوا....

خەیاڵە یان زیندەخەو؟ یوسف چاوەکانی هەڵگلۆفی. هەزاران باڵندە لە شوێنێك هەڵدەفڕین. لە شوێنێك دیتبووی. لە چل ئەشکەوت، چل ملیۆن مەل، ئەگەر نەیدیتبوو، ئەی چۆن دەهاتنە پێش چاوی؟ خۆ زیندەخەویش نەبوو. زۆر لەوەپێش ئەو باڵندانەی دیتبوو.

بەخۆی گوت:"ئەگەر ببمە باڵندە، ئەگەر ببمە باڵندە... ئەی خوایە گیان، ئەگەر بمکەیە باڵندە... خۆ ناویشم یوسفە، کاکە یوسف. ئەگەر بمکەیە باڵندە و بمبەیتە نێو کاکەیوسفەکان... بەسەر چوکووردا تێر هەڵدەفڕم..."

زەردەیەك لێوی لێك ڕەواندەوە. چما بنیادەمیش دەبێتە باڵندە؟ ئەگەر نابێ، ئەی ئەوانە چۆن بوون؟

چاری نەبوو. ئەو حاجییە شێتە ببووەتە بەڵای گیانی. چ بکا؟ بۆ کوێ ڕا بکا؟ ترسەکەی جار بە جار لە دڵێدا هەڵی دەدا. ناتوانێ یەك هەنگاویش لەو شارە بڕواتە دەرێ. خۆ مەحاڵێشە حاجیی پێ بکوژرێ. ئەوەی بەدڵێدا دەهات، دەهاتە سەر زمانیشی:"بمکە باڵندە، بمکە باڵندە خوایە. جووتێك باڵم بدەیە و بمکە مەل."

بنیادەمی وا ترسنۆك تا ئێستا لە دایك نەبووە. ملی خۆت بشکێنە دەی. سەری خۆت هەڵگرە و ڕوو بکە کێوان. ناتوانی ڕا بکەی. دەست و پێت مردوون. هیممەتێ بکە و حاجی بکوژە. بیکوژە و بیبڕێنەوە دەی. کوشتنی ئەو شێتە سووك و چرووکە چییە. نە دەتوانی بیکوژی و نە دەشتوانی بگەڕێیتەوە ئاوەدانی. نە پێت دەکرێ بچیتە پێشێ و نە بگەڕێیتەوە. چیی واشی نەماوە بەگ بگەڕێتەوە. ئەگەر لەگەڵ گەیشتنەوەیدا لێتی پرسی، ها یوسف چیت کرد، چیی جواب دەدەیەوە؟ ئەوە لە مەرگیش خراپترە. بە ڕسوایی لە ئاوەدانیت دەردەکا. ئەی دوای ئەوە لەگەڵ دایکم بچمە کوێ؟ کوێمان هەیە بچین؟ چۆن سەیری چاوی دایکم بکەم؟ سەیری چاوی گوڵعوزار...؟ گوڵعوزار تفم لە ڕوو ناکا؟ دەروێش بەگ بێت و بە گوڵعوزار بڵێ بچۆ حاجی بکوژە، بێ ئەملا و ئەولا دەیکا. ئەو کارە بە هەموو کەس ناکرێ.

ئاااخ... خۆر خەریکە ئاوا دەبێ. با بچم حاجییە شێتە... ئێستا لە ماڵ وەدەردەکەوێ.

بەخێرایی جلوبەرگەکانی لەبەر کردن و بەرەو ماڵی حاجییە شێتە وەڕێ کەوت. بە ڕێگاوە بوو کە خۆر ئاوا بوو. کۆڵانەکان چۆل بوون.

بەخۆی گوت، هێشتا بوومەلێڵە و تاریکییەکە خەست نەبووە. دەبێ تۆزێك لە بازاڕێ خۆم بخافڵێنم. بەڵام نابێ حاجیشم لەدەست بچێ. ئەگەر لە کاتی وەدەرکەوتنی حاجی لەوێ نەبێ، سەرگەردان دەبێ. هەستی کرد ناخی بۆشە و نەیدەزانی چ بکا. دواییش بە داماوییەوە گوتی:"خودایە بمکوژە. گیانم بستێنە و رزگارم بکە. مەرگ لەو ژیانە پڕ کوێرەوەرییە ئاسانترە. پیاو شەوێك سەر دەنێتەوە و ئیتر هەڵناستێتەوە. هەرگیز..."

کەیفی بەو خەیاڵەی دێ و هەست دەکا خوروویەکی خۆش کەوتووەتە گیانییەوە. مەرگی خۆی دێنێتە بەرچاو و گریانی دایکی و شین و شەپۆڕی گوڵعوزار.. گوڵعوزار شێرە کچە. مێرد بە کەسی دیکە ناکا. هەتا دەمەساتی مەرگی "یوسفەکەم، یوسفەکەم" بانگی دەکا. ئاخۆ گوڵعوزار دەبێتە باڵندە؟

"ئەگەر جووتێ باڵم بدەیتێ، ببمە باڵندەیەکی سپی، ببمە باڵندە...."

باڵندەبوونی لە مەرگ پێ خۆشترە. دەچێ و لەسەر لکی دار بییەکەی بەر دەرگەیان هەڵدەنیشێ. لەوێ تێی دەچریکێنێ. خەڵك دەڵێن، کاکا یوسف غەیب بووە. دەڵێن چووەتە کوێ؟ لەبەر ماڵی گوڵعوزاریش هەڵدەنیشێ.

لە بازاڕەکەدا دەهات و دەچوو، بەڵام ئاگای لە کەس و لە هیچ شتێك نەبوو. زۆر دەمێك بوو برسیی بوو، بەڵام نەدەچوو نانێك بخوا.

تیشکێك چاوی بە شەوارە خست. راچڵەکی. سەیری کرد هاتووەتە بەر دەم قاوەخانەکەی عەلی. کە گوێی لە تەقەتەقی مۆرەی تاوڵەکە بوو، وەخۆ هاتەوە و هەموو گیانی لەرزی. ئەگەر هەر ئێستا حاجییە شێتە لە ماڵێ هاتبێتە دەرێ؟ بە غاردان بەرەو ژوور هەڵکشا. کۆڵانەکان کپ و بێدەنگ بوون و چاو چاوی نەدەدی. لە خەرەندەکە پەڕییەوە و خۆی گەیاندە بن دارە تووەکەی پشت ماڵەکەی حاجی. پشووی لە سینگیدا راگرت و گوێی هەڵخست. هەموو هەستی خۆی دابووە گوێیەکانی و هەست و خوستی لەخۆی بڕی. ماڵەکە دەنگی لێ نەدەهات.

ترسێك لە ناخیدا سەرەتاتکەی کرد. ئەو شێتەی لە کیس نەچووبێ؟ گەڵایەکی لە دارەکە لێ کردەوە و خستییە بەر ددانی. ئەوجار چڵێکی هەڵپساند. ئەویشی جوی. زاری سڕ بوو. تفی کردەوە.

وەك بەری دەستی فێر ببوو. هەموو ئەو شوێنانەی پێ دەزانی کە حاجی هاموشۆی دەکردن. باخچەکەی عومەرە کوردە، قاوەخانەکەی تۆفیق، خەیاتییەکەی عوسمان، ئەشکەوتەکانی دەموز تەپە، بن چنارەکە... ئێستا کە زووتر لە ماڵێ وەدەرکەوتبوو، دەبێ چووبێتە کوێ؟ ژن و منداڵەکەشی لە ماڵێ نین. لە ماڵ بوایەن، ئەو ماڵەیان وەسەر خۆیان دەگێڕا.

چەند رۆژێك بوو دەمانچەكەی هەڵنەدەگرت. دەستی بۆ قەدی برد. خەنجەرەكەشی لەبیر كردبوو. لەبیری نەكردبوو، نەیوێرابوو دەستی بۆ بەرێ، وای نواندبوو كە لەبیری چووە. بەبێ ئەوەی ئاگای لەخۆی بێ، لە پشت دارەكە قیت و قنج هاتە دەرێ.

شەو راشكابوو، كە گەیشتەوە ماڵێ. بەسپایی دەرگای كردەوە. نەیدەوێرا چراكە هەڵكا. دەمانچە و كێردەكەی لە سەر مێزەكە بوون. دەسبەجێ دەستی كشاندەوە. دوای ئەوە كێردەكەی هەڵگرت و دەمودەست لە باخەڵی نا.

هەر كێردەكەی لە گیرفانی نا، خۆشییەكی نامۆ ناخی تەنی. لە پێشدا باشترە بچێتە كوێ؟ ئەمشەو دەبێ لە كوێ بێ؟ دەبێ بیدۆزمەوە. ئەمشەو دەبێ تەواو بكرێ. ئەگەر ئاوا بڕواتە پێش، خۆی لەدەست دەچێت. گاڵتەی پێ ناكرێ، گیانە و گیانیش شیرینە. پیاو گیانی خۆی لا شیرینترە یان هی كەسێكی دی؟ بە گۆڕی بابی خەڵكی دی.

هەروا كە بەرەو باخچەكەی عومەرە كوردە دەڕۆیشت، بەخۆی دەگوت و دووپاتەی دەكردەوە:"بەگۆڕی بابی، بە گۆڕی بابی..."

ئیتر بە دیتنی حاجی دست و دڵی نەدەلەرزین. چما حاجییە كێیە؟ كوڕی باوكێتی؟ كابرایەكی بەرەڵڵا و هەرچی پەرچی كە تەنانەت سوودی بۆ ژن و منداڵەكەی خۆشی نییە."بەگۆڕی بابی، بەگۆڕی بابی. چار نییە."

چیی وای نەماوە دەروێش بەگیش بێتەوە. بانگی دەكا و لێی دەپرسێ:"دەی ی ی ی، بڵێ یوسف جوق... بڵێ بزانم... " دوای چەند ساتێك هیچ ناڵێ و بە زەردەیەكی تەوساوییەوە چاوێك لە سەرتاپای دەكا و ئاخرییەكەی لەدین دەهری دەبێ و بەسەریدا دەنەڕێنێ:"بڕۆ ملت بشكێنە. لەبەر چاوم ون بە. دایكیشت هەڵگرە و بڕۆ بۆ هەر جەهەندەمێكی دەچی، بچۆ. ئەو چاكەی هەموو ئەو زەحمەتانە بوو كە بۆتۆم كێشا؟ یاخوا حەرامت بێ.... بڕۆ جەهەندەم پڕ كە. هەر ئێستا... دەی بڕۆ دەی... بڕۆ لەبەر چاوم... بڕۆۆۆ."

خەڵكی ئاوەدانییش گاڵتەی پێ دەكەن. گوڵعوزاریش... دەڵێ:"كوڕە وەرە سەیری من، یوسفیشم بە بنیادەم دادەنا و گوتم كوڕی مەحموودە و دڵم كەوتە سەری ...

دەنگێك لە قوڕگییەوە هات:"دەڵێ دڵم كەوتە سەری ، دڵم كەوتە سەری..."

لە حاڵێكدا كوشتنی حاجییە شێتە وەك ئاوخواردنەوە وایە. لە نەكاو سەگە ئەنگێوراوەكەی هاتەوە بەر چاوی. لە لاقانی وەراند*. ئەوجار راوەستا. لە نێوەندی شەوەكەدا قیت و رەپ

---

*لە لاق وەراندن، دەلاق وەراندن: واتە لە نەكاو بەهەموو هێز و تواناوە راكردن.

راوەستا... لە خوڕەی ئاوەکەوە زانیی گەیوەتە ئاشەکە. بە ئاستەم تێگەیشت کە لە پردەکە پەڕیوەتەوە. هەر بەپێی عادەتی خۆی دەرگای باخچەکەی کردەوە. فانۆسی قومارکەرەکان لە کەلێنی دەرکەوە تیشکێکی کزی دەهات. ئەو تارماییانەی لە بەر فانۆسەکە تێك دەچرژان... نزیك بۆوە. لە پشت دارێك خۆی مات دا.

حاجی دەستی لە ملی یەك بە یەکیان دەکرد و ماچی دەکردن و لە بەزێکی پڕ لە حەژمەتەوە دەیگوت:"هاوڕێیان دەڕۆم. بەیانی ئیتر حاجی لێرە نییە. باڵ دەگرێ و دەفڕیچ. دوورەوڵاتی سەختە برادەرینە، سەختە، سەخت. بەگەکان دەربەدەریان کردم. شێتێکی تاك و تەنیا چۆن دەرەقەتیان بێ؟ بە زۆر دەڕۆم هاوڕێیان. دەی باشە. ئەو دنیایە هەر وا نابێ. ڕۆژێکیش دێ ئێمەش ئەوان شاربەدەر دەکەین. ئەمن دەچمە ئەسکەندەروون، لەوێ دەوڵەمەند دەبم و دەگەڕێمەوە. منداڵەکانیشم دەنێمە بەر خوێندنێ. منداڵەکانی حاجییە شێتە دەبیننەوە... گەردنم ئازا کەن براینە. زۆرمان نان و نمەکی یەکتری کردووە..."

وێکڕا گوتیان:"گەردنت ئازاد بێ."

حەسەنە پیرەی خاوەن گاڕان، کە سمێڵێکی شۆڕی هەبوو، وەدەنگ هات:"گەردنت ئازاد بێ، گەردنت ئازاد بێ حاجی. ئەتۆ کوڕێکی باش بووی. وەك زێڕی وابووی. جوامێر بووی... لەو شارەدا جێت دیار دەبێ. کوڕی وەك تۆ نابێتەوە برالە..."

لەو کاتەدا خۆی پێ نەگیرا و دایە پڕمەی گریان و بە لوشمەلوشمەوە گوتی:"دەرەقەتی بەگەکان نەهاتین برالە. بێ کەس و بێ دەر و دەستەوستانین. حوکمەتیش پشتیان دەگرێ. ئەگینا ئەو شارۆچکەیەمان بە بەگ و ئاغاوە دەکردە تۆزی بانان. بەڵام ناکرێ مل لەبەر ملی حوکمەت بنێی. ئەمنیش وەك تۆ تێهەڵدراوی حوکمەتم. حوکمەت لە وڵات و زێدی خۆم دەربەدەری کردووم. خۆ دەمبینی، لە وڵاتی خۆم منیش بەگ بووم. پاشا بووم، سەر و سامانێکم هەبوو. هەمووان دەزانن... ئاخ... چیاکانی وان...."

دیسان کۆنە برینی کولابوونەوە. ئێستا دەستی پێ دەکرد. باسی زێد و ماڵە خۆش و گەورەکەی و باسی میوانداری و بێنە و بەرە و گوند و ملکەکانی لە هۆردووی چوارەم و... گوتیان:"بیبڕەوە حەسەن ئاغا. پێویست نییە باسی بکەی. هەموومان دەزانین. دەربەدەری تاڵە برالە."

حەسەن ئاغا" ئەوە حاجی دەچێتە ئەسکەندەروون. لەوێ کێ دەزانێ ئەو لێرە بەڵای گیانی بەگ و پاشا و ئاغاکان بووە... کێ دەزانێ لە نێوەندی بازاڕێ دایك و خوشکی دەروێش بەگی

کردووەتە دوو فلس و دایناوە.... کێ چووزانێ، کێ؟ چما تۆ دەزانی من چ کارە بووم و لە کوێوە هاتووم؟"

گوتیان:"بیبڕەوە حەسەن ئاغا. هەمووومان دەزانین."

حاجی کوڵی گریانی هەستابوو و گوتی:"کێ چووزانێ. گەردنم ئازا کەن برادەرینە."

بە گیان و دڵ گوتیان:"گەردنت ئازاد بێ حاجی."

چەند جارێکی دیکەش دەستیان لە ئەستۆی یەك کردەوە. حاجی مەست بوو و هەر بەلادا دەهات و بەرەو دەرگای باخچە وەڕێ کەوت. ئەوانی دیکەش کەوتنە رێ.

یوسف لەجێی خۆی حەپەسابوو. ئەگەر یەکێك ئەحواڵی پرسیبایە، هۆڕ هۆڕ دەگریا.

لەبەر دەرگای باخچەکە جارێکی دیکەیش دەستەملان بوونەوە و یەکتریان ماچ کردەوە. حاجی وەڕێ کەوت و لە تاریکاییەکەدا بزر بوو. دوای ئەو گوتیان:"بەخوای کوڕێکی باش بوو."

"کوڕێکی باش بوو، بەڵام شێت بوو. تۆزسقاڵە ئەقڵێکی هەبوایە، بەربینگی بە ئاغاوات نەدەگرت. بنیادەمی ژیر، شەڕی خۆ تڕێنە ناکا."

"جنێو بە ژن و دایکی کابرا دەدەی.... بەتۆ چی؟ دەی باشە، دەیدەی، دەبخۆ، قوونت خاوێنە..."

"ماڵ و حاڵت کاول دەکەن."

"دەربەدەرت دەکەن."

"حوکمەتیان لە پشتە و ئێمە چمان لە دەست نایە."

یەکێکیان هەڵی دایە:"بۆ نایە؟ زۆر باشیش لەدەستمان دێ، بەڵام حاجی خۆی نەیویست. ئەگەر گوتبای، دەی برادەرینە، قۆڵ هەڵماڵن دەی... پشتمان دەگرت."

"حاجی خۆی نەیویست."

"خۆی حەزی لێ بوو بڕوا."

یەکێکیان کە لە پێشەوە دەڕۆیشت، راوەستا و رووی لە برادەرەکانی کرد:"ئەو ناڕوا. ئێستا ئەوە دە رۆژە، هەر دێ و گەردن ئازایی دەخوازێ و ماڵاوایی دەکا."

یوسف بەبێ ئەوەی بهێڵێ ئاگایان لێ بێ، بە تەنیشتیاندا تێپەڕی. دەبوو بگاتە حاجی. ئەگەر نەگەیشتبایە، دەتگوت بەڵایەکی بەسەر دێ... هانکە هانکێکی بوو کە حاجی پێی زانی و گەڕاوە و بانگی کرد:"راوەستە تۆ کێی؟ چیت لە گیانی من دەوێ؟ بۆچی بەردەوام بە شوێنمەوەی ها؟ دا بڵێ بزانم تۆ کێی؟ دۆستی یان دوژمن؟..."

چیی نەمابوو بیگرێ. لەوانەیە ئەگەر مەستیش نەبوایە، گرتبای. یوسفیش دەست و پێی تێکەڵ هاتبوون. ویستی دەست بۆ کێردەکەی بەرێ، بەڵام نەیتوانی. وەپێشی کەوت و دە، بیست هەنگاوێکی لێ دوور کەوتەوە. حاجی یەك پشوو جنێوی دەدا و دەیگوت:"دەی بڵێ دەی، بڵێ کێی، چکارەی؟ دۆستی یان دوژمن؟"

یوسف دەڕۆیشت و حاجی بە لارەلار و سەرەنگرێبوون و هەستانەوە وەشوێنی دەکەوت بەڵام تۆزی نەدەشکاند. حاجی جارێکیان بەردێك هەڵگرت و تێی گرت. بەردەکە بە تەنیشتیدا تێپەڕی. دووەم بەردی گرتی.

"ترسنۆکی بێناموس."

هەر ئاوا بەدوایدا گەیشتنەوە بەر دەرگای ماڵەکەی دەروێش بەگ. یوسف دڕدۆنگ بوو بچێتەوە ماڵێ یان نا؟ نەچوو. لەوێوە بەرەو ژوور هەڵکشا، بەرەو گردەکە.

"راکە، را بکە، را بکە تووتکە سەگ."

لە شار چووبوونە دەرێ. حاجی بە هانکەهانك هەرای دەکرد:"ئەگەر پیاوی راوەستە. دەی راوەستە سەگبابی ترسنۆك... راوەستە حیز..."

یوسف دەست و پێی نەدەلەرزی. دەتگوت گوێی لە هیچ نابێ. نە ئەو رای دەکرد و نە حاجی.

"راوەستە نامەرد. راوەستە. راوەستە بزانم کێی... ئەگەر پیاوی راوەستە...."

حاجی زۆر بەجێ مابوو. یوسف ئاوڕی دابۆوە و سەیری پشتەوەی دەکرد. تارماییەك لە دوور دەبینرا، قسەکانی لێڵ بوون. تارماییەکی دیکەی بەدواوە دی.

دەستی چووە سەر کێردەکەی و وەك کارەبا کشایەوە.

# ٩١

هێشتا شەونمی سەر گەڵا و گوڵووکە سوورەکانی پیرەهەنارە لك و پۆ خوار و خێچەکە، نەببووە هەڵم. لك و پۆی هەنارەکە رووبەرێکی زۆریان داگرتبوو. لك و پۆی بەری رۆژاوای بەسەر ئەو دیوارە قەوزەگرتووەدا کە جێ جێ قەوزەکەی وشك ببوو و هەڵوەریبوو، پەلیان بۆ باخچەکەی دیکە راکێشابوو. مێشەنگوینی سەر گوڵووکە درشتەکانی هەنارەکە، بە باڵی مەیلەوتەڕیانەوە دەتگوت نوستوون. تاوێك دواتر هەتاو دەکەوت و هەموو وڵاتی گەرم دەکرد و مێشەکانیش باخچەکەیان پڕ دەکرد لە گیزەگیز و ویزەویز.

دولدولیجە بچووکترین جۆری "باز"ە. بە سەدان و هەزاران دوڵدوڵێجە لە هەورەبان و بن میچ و لاشیپانەی کاولاشە خانووی هەرمەنییەکان و کەلێنی دیوارەکاندا هێلانەیان کردووە و لە کاتی رۆژئاوابووندا بە قاو و قیژ و وەك شێتان لە ئاسمانە سامالەکەدا دەیکەنە هەڵلا. ئەو شارۆچکەیە، تاقە شارۆچکەیەکە، کە ئەو باڵندەیەیان ناوناوە دوڵدوڵێجە. لە هیچ شار و شارۆچکەیەکی دیکە پێی ناڵێن دوڵدوڵێجە. هیچ باڵندەیەکی دیکەش وەك ئەو باڵندە بچووك و پڕ جموجۆڵە، ئاسمان و زەردەپەڕ وەك ئاسمانی رۆژی قیامەتێ لێ ناکا. منداڵانی شاریش بە شێوەی جۆراوجۆر ئەو باڵندە بەجموجۆڵە راو دەکەن. دەیگرن و چییان لێ دەکەن؟ ئەوەی کەس نایزانێ. نە منداڵەکان دەزانن و نە گەورەکانیش. بەهاران، هەر منداڵە و دوڵدوڵێجەیەکی بەدەستەوەیە کە رەنگی کەسك دەچێتەوە و دندووکە تیژ و درێژ و خۆڵەمێشییەکەی داپچڕیوە و پەیتا پەیتا پەلەقاژەیەتی. باڵەکانی باریك و درێژن.

تەرمەکەی سەرۆکی گەورە، نیوەی لە سێبەری دار هەنارەکە و نیوەشی لەبەر هەتاوەکە بوو. لاقەکانی لە سێبەر و سەریشی لەبەر تاوێ. چاوەکانی بەمۆڵەق وەستابوون. سەری رووت بوو. قژە پرە مەیلەو قاوەیی و لوول و فرەکەی پشتە سەری بەسەر سەرە رووتاوەکەیدا هاتبۆوە سەر نێوچاوانی. خوێنی لووتی لە قولینچکی زارییەوە شۆلاوگەی بەستبوو و لە بن سەرییەوە،

به قوولایی کاشییه رۆمییەکەدا کۆ ببۆوە. کەوێکی رەنگ سواڵەتی بە هێڵی مۆرەوە، دەندووکە رەشەکەی درێژ کردبوو و لاقی راستەی بەرز کردبۆوە و بەرەو ئەو خوێنە دەچوو کە لەسەر گوڵەکان گۆمیلکەی بەستبوو. پێنج ماسییش کە ئەوانیش رەنگیان سواڵەتی بوو، راوەشاندنی کلکە پانەکانیان بەرەو ئاوێکی دوور دەخوشین. سەرۆکی مەزن، لەسەر گازەرای پشت کەوتبووە سەر کاشییەکان. نیوەی زنجیرە زێڕەکەی کاتژمێرەکەی کەوتبووە بەر سێبەرەکە و بەشەکەی تری کە لە سەر ورگی قەفی خواردبۆوە، لەبەر تاوەکە دەبریسکایەوە و لە چاوی دەدا. تۆزێك لەولاترەوە دەبە بەنزینەکەی لە دەستی راستەی کە لێکی کردبۆوە، بەربببۆوە. چەند کوتە پەڕۆیەکی رەنگاورەنگ لە دەوری کەوبتوو... قاوغە شقارتەیەك، کە چڵە شقارتەکانی لە دەوری بڵاو ببوونەوە، لە بن لەتە پەڕۆیەکەوە دیار بوو. پەیژە نارنجی و درێژەکەی دادوەر لەسەر دیوارەکەوە بەرەو لایەك خلیسکابوو، بەڵام نەکەوتبووە عەرزی. لە بن دار هەنارەکە و دیوارەکە، چەند دوڵدوڵێجەیەکی سەر هەڵقەنراو و نیووە سووتاو و برژاو کەوتبوون. زارکی چەند کون و کەلێنێکی سەر دیوارەکە بە دووکەڵ رەش داگەڕابوو.

مێشێکی درشتی کەسك، کە لەبەر هەتاوەکە دەبریسکایەوە، بەخێرایی هات و باڵەکانی لێك نا و لە چاوتروکانێکدا چووە نێو کونە تفنی مردووەکەوە و هاتەوە دەرێ. کوڕی سەرۆکی مەزنیش تۆزێك لەولاترەوە، پێم وایە هەر لەسەر وێنەی کەوەکە، لەوانەیە لەسەر کەسکایی و رەشایی و سواڵەتی رەنگەکەی دارهەنارە گوڵ سوورەکە و لەوانەشە لەسەر سپیایی ئاوی نەخش و نیگاری کاشییە پڕ نەخش و نیگارەکان، کەوتبوو. هەر ئەو کوڕەی دوای نۆبەرە کوڕی مردبوو. ئەوی یەکەمیشی هەر لێرە کەوتبوو. ئەویش هەر ئاوا سەری شکابوو و خوێن لە لووتی فیچقەی کردبوو. بەڵام کەس بەجوانی لەبیری نەمابوو رێك لە کوێ کەوبتوو. سەرۆکی مەزن هەر لەو رۆژەوە فەرمانی کوشتنی دوڵدوڵێجەکانی دەرکرد و شەوانە بە پەیژە و بەنزین و کۆنەپەڕۆوە مشووری دەخواردن و ئاگری لە هێلانەکانیان بەردەدا و سەریانی هەڵدەپساند.

مێرووڵەکان بە سەر کاشییەکاندا بەرەو چاو و خوێنەکەی سەرۆکی مەزن ریزیان بەستبوو. تاوێك دواتر چاوەکانی سەرۆك لەبەر مێرووڵە دیار نەبوون.

کە خۆر پتر هەڵکشا و هەوا گەرمتری کرد، نێو لك و پۆی دار هەنارەکە، زەنا زەنا و لوورەیەکی دوورودرێژی لێ هەستا. مێشەنگوینە بە گەرما بەخەبەرهاتوو و هارووژاوەکان، لە گوڵە سوورەکاندا شێت بوون. مێشەکەرانە بە ویزەویزێکی سەرسووڕهێنەر بە دەوری کۆگایەکی خۆڵەمێشدا دەسووڕانەوە.

کەس نەیدەزانی کێ بەر لە هەمووان مەیتەکەی سەرۆکی گەورەی دیتبوو. خەڵکی شارۆچکە ئەوەندەی یەك و دوو لەوێ کۆ بوونەوە. چیی خەڵکەکە پتر کۆ دەبوونەوە، مێشەنگوینە زەرد و سوورەکان و مێشەکەرانەکان تووڕەتر دەبوون و وەك شێتان بە گەواڵە هێرشیان دێنایە سەر خەڵکەکە. جار جارەش زریکەیەك لە نێو حەشیمەتەکەوە هەڵدەستا و گەرما خەستەکەی دەبڕی.

هەوڵ و کۆششی جەندەرمەکان بۆ دوورخستنەوەی خەڵکەکەی دەوری تەرمەکە، بەهیچ نەگەیبوو.

جارچی دڕی بە خەڵکەکە دابوو و دەهاتە پێشەوە. کاکۆڵە ڕەشەکەی کەوتبووە سەر نێوچاوانی و چاوە گەورە و ڕەشەکانی ڕەشتر و گەورەتر ببوونەوە. خەڵکەکە کشانەوە و ڕێگەیان بۆ کردەوە. هەمووان بە سەرسووڕمانەوە سەیری ئەو پیاوە ریوەڵەیەیان دەکرد. هەر جارچییان دیت، خەڵکەکە بەشێوەیەکی گوماناوی بێدەنگ بوون. ویزەی مێشەکان دەتگوت نەك لە دار هەنارەکەوە، بەڵکو لە زەوییەوە هەڵدەستێ، کپ و لە دوور دوورەوە...

جەندەرمەش پێشیان بە جارچی نەگرت. جارچی هات و لە ژوور سەری تەرمی سەرۆکی گەورە ڕاوەستا و چاوی تێوە بڕی. ڕوخساری زەرد دەچۆوە و فرمێشك وەك بارێزە لە چاوانی هەڵوەرین. ئەوجار ئەژنۆی دادا و داهاتەوە و سێ جاران دەستی سەرۆکی ماچ کرد و بۆ نێوچاوانی برد و لەسەر دڵی دانا و تاوێك هەروا کروشمەی کرد. دەتگوت لە بن لێوانەوە دوعا دەکا. لەو کاتەدا کە دەستەکانی سەرۆکی گەورەی لەسەر دڵی دانابوو، ژنەکەی سەرۆك هات و بە گران و سەنگینی لە ژوور سەری ڕاوەستا. لە نەکاو زریکەیەك بێدەنگییەکەی شکاند و دەمودەست نیشتەوە. کە خانمیان لەوێ دوور دەخستەوە، جارچییش هەستا و بە دەنگێك کە بە حاڵ دەبیسترا، لەبن لێوەوە گوتی:"ئەتۆش، ئەتۆش، من ئەتۆشم کوشت."

ئیتر لەوێ دوور کەوتەوە، لە حاڵێکدا کە دووپاتەی دەکردەوە:"ئەتۆش، من تۆشم کوشت. سەرۆکی گەورەم، شێرەکەم..."

حاجی قۆرت بۆغا، لەوێ لە تەنیشت نەقیبەوە، سینگی هێنابووە پێشەوە و لاقی لێك بڵاو کردبوو و ڕاوەستابوو. چاوەکانی لە خۆشیان هەر دەبریسکانەوە و زەردەی لێوی لە هەموو ڕوخساری گەڕابوو. لە خۆشییان هەر خەریکی سمێڵەکانی بوو. تەزبێحە کارەباییەکەی بە دەستی چەپەیەوە بوو. نەقیب بەو چاوە کەسکانەی کە دەتگوت چاوی مارن، لێی دوور دەکەوتەوە و ئەمری بە جەندەرمەکان دەکرد، کە خەڵکەکە دوور بخەنەوە و دیسان دەگەڕایەوە و

قیت و ڕەپ لە تەنیشتی رادەوەستا. ماهیر قاباقچی ئۆغڵی، ڕۆستەم، وەسمان ڕاسم، جافر ئۆز پۆلاد، دادوەر و پارێزەرەکان، مامۆستا و ڕاگرەکانی دواناوەندی و مودیر ناحیە و ڕدێن سپییەکانی شارۆچکە و دکتۆرەکان و عێزەدین فەخرەدین بەگی دادئەستێنیش لەوێ بوون. قاباقچی ئۆغڵی دەیگوت:"چارەنووس، وەی لەو چارەنووسە باشەی."

بیری لەوە دەکردەوە، کە ئێمە دەرەقەتی حاجییە شێتەیەکی بێکەس و کار نایەین، کەچی خەڵك کەر وشتر بە بارەکەیەوە و مردوو بە گۆڕەکەیەوە دەخۆن و لێشیان دیار نییە. چارەنووس، چارەنووسی سەرۆکی مەزن... ڕێك چارەنووسی کوڕەکانی... ئێستا، تاوێکی دی دکتۆر پشتڕاستی دەکاتەوە کە بەهۆی خزینی پەیژەکەیەوە و بەربوونەوە و خوێنبەربوونی مێشکی، مردووە. تەواو... ئەی ئەو خوێنەی لە لووتییەوە دەچۆڕێ؟ ماهیر بەگ سەری سەرۆکی مەزنی هەڵێنا، ئەو کەلێنەی گەورەیەی چوار پەنجەی بەنێودا دەچوو و دیاربوو شتێکی رەقی وێکەوتووە، لە پشت سەرییەوە دیتبوو. ئەی ئەو برینە چییە؟ لە کاتی خزینی پەیژەکەیدا، سەری بەر بەردێك کەوتووە و تەواو. وەك دەرکێشانی موو لە ماست...

وردە وردە خۆی لە حاجی قۆرت بۆغا نزیك کردەوە و پەنجە بچووکەکەی دەستی تەزبێحەکەی ئەوی گرت و بە پێکەنینێکی شەیتانانەوە، سەبرێ گوتی:"چارەنووس، چارەنووسی ئەویش وەك کوڕەکانی بوو، کە لە کاتی ڕاوی دوڵدوڵێجەدا لە پەیژەوە بەربێتەوە و بمرێ. جەنابی حاجی بەگ دەفەرموون کە... هەی داد لە دەست قین لە زگی. نەکەی لەسەر بوغز و قینێك، کەسێك تەنانەت مریشکێکیش بکوژی... نەکا، گوناحە..."

حاجی قۆرت بۆغا بە دەنگێکی شاد و بەکەیفەوە گوتی:"نەکەی مەل و باڵندان ئازار بدەیت، تەنانەت زوڵم لە مێروولەیەکیش نەکەی، هێلانەیەك تێك نەدەی و ئاگری نەدەی..."

ئالاتەمیر کە بە باسکەشۆڕەکانییەوە لە تەنیشت جافر ئۆز پۆلادەوە ڕاوەستابوو و وەك منداڵێکی بیەوێ بداتە پڕمەی گریان، لیچی هەڵدەقرچاند و لەخۆوە سەری ڕادەوەشاند، گوتی:"وەیش سەرۆکی گەورە، وەیش.... وەیش پیاوی پیاوان، وەیش شێرەپیاو، وەیش سەرۆکی گەورە، وەیش..."

نەقیب هەوڵی دەدا، چەندی پێی دەکرێ وا بنوێنێ خەفەتبارە. عێزەدین فەخرەدین بەگی دادئەستێن، بەبێ ئەوەی هۆشی بە دەوروپشتی خۆیەوە بێ، داڵغەی لێ دابوو. تەنانەت بۆ جارێکیش چییە، سەیری تەرمەکەی سەرۆکی مەزنی نەکردبوو.

جافر ئۆز پۆرد وەقسە هات:"ئەگەر هێلانەی تەنانەت تاقە باڵندەیەکیش تێك بدەی، خودا هێلانەت لێ دەشێوێنێتەوە."

قۆرت بۆغا تەزبێحەکەی خستە خلەخل:"چ هێلانەی باڵندە بێت، یان لانی گورگ..."

تەزبێحەکەی خێرا خێرا پێکدا هات:"هەرشتێك بێ، چ مێرووی سەر عەرزی بێ یان ماسیی بن ئاو یان مەلی ئاسمان، نابێ هەوڵی کوشتنی بدەی. بۆ؟ لەبەر ئەوەی بەلای خوداوە جیاوازی نییە لە نێوان گیانی پێشکەیەك و مرۆڤێکدا. راستە خودا مرۆڤی لەسەر روخسای خۆی خولقاندووە، بەڵام بۆیەی وەك خۆی نەخولقاندووە کە بنیادەمێکی ورگن بێت و بەربێتە کوشتنی ئەو باڵندە وردیلە و داماوانەی دوای رۆژێك فڕین و هەوڵ و تێکۆشان دەگەڕێنەوە هێلانەکانیان."

جافر ئۆز پۆلاد:"بەڵێ."

مودیر ناحیە:"بەڵێ."

ئەو فکرە چووە مێشکی هەمووانەوە. خەڵکی شارۆچکەکە لە دەموساتێکدا بوونە لایەنگری باڵندەکان و دوژمنی سەرۆکی مەزن.

"وەرە تۆ بیست و پێنج ساڵی رەبەق، هێلانەی ئەو مەلە داماوانە، ئەویش کاتێك لەخەودان، ئاگربدە، بیانکوژە و دواییش... ئاخرییەکەی خوداش هەڵیناگرێ و وات بە عەرزیدا دەدا، هەرگیز راستەوە نەبی... شەقی خودا شەقەی نایە، وەهەرکەس کەوێ نانی زیندووان ناخوا..."

قۆرت بۆغا و ماهیر و ئۆز پۆلاد و ئالاتەمیر و زۆر لە خەڵکی شارۆچکەکە دژی سەرۆکی مەزن، کە بیست و پێنج ساڵان هێلانەی باڵندەکانی چوکووراوا ئاگر داوە و سەری هەڵپساندبوون و لە پشتیوانیی دولدولیجە بەستەزمان و مەزلوومەکان قسەیان دەکرد و قسەکانیان زار بەزار دەڕۆیشت و پەڕوپۆیان لێ زیاد دەبوو. چیی وای نەمابوو خەڵك خڕ بنەوە و هەرا بکەن، بژی دوڵدوڵیجە و بمرێ سەرۆکی مەزن و لەو سۆنگەی ئەو کارە نامرۆڤانەیەوە سەرۆکی مەزن بدەنە بەر تووك و نەفرەت.

"تۆخوا بنیادەم هەر لەسەر ئەوەی منداڵەکانی لە کاتی گرتنی دوڵدوڵیجەدا بەربوونەتەوە و مردوون، دوژمنایەتیی مەل و باڵندان دەکا؟ باڵندەی داماو بڵێن چی؟ سەرۆکی گەورە شێت بوو. شێت و شوور. بەڵام بنیادەمێکی باش بوو. پیاوێکی رێکوپێکیش بوو. گوێی لە هیچ کەسیش نەبوو. چووزانم، لەوانەشە، بە دڵنیاییەوە هەر لە سوێی ئەو دوو کوڕەی کە دەتگوت چەپکە گوڵن، وای بەسەر هات... وەیش، وەیش، وەیش لەو کەڵە پیاوەی، لەو جوامێرەی..."

قۆرت بۆغا ددانی چیڕ کردنەوە و داهاتەوە و لە نێوان ددانەکانییەوە بە چپە گوتی:"دەمت داخە. ئەو قسە قۆڕانە چین دەیانکەی کەرە پیاو. چما سەرۆکی گەورە بابت بوو ئاوا پێی هەڵدەڵێی؟"

دیسان چ کارێکی قۆڕی کردبوو، کە دەبوو ئاوا سەرکۆنە بکرێ؟ ئالاتەمیر بە سەرسووڕمانەوە گوتی:"باشە ئاغام، بێدەنگ دەبم."

ئێستا لە هەموو کاتێك پتر لە حاجی قۆرت بۆغا دەترسا.

لەو نێوەشدا دەرگای هومێدێك لە ماهیر کرابۆوە. دەبوو یارمەتیی حاجی قۆرت بۆغا بدات. لەو دەوروزەمانەیەدا بنیادەمی دڵڕەق و لێهاتوو و بەجەرگ و پوختە نەبێ، کارەکان سەر ناگرن. دەبێ باسی حاجییە شێتە بۆ حاجی قۆرت بۆغا بکات. جا هەر ئێستاش.

"ئاغا، دەمەویست باسی شتێکت بۆ بکەم، کارێکت هەیە لێرە؟"

حاجی قۆرت بۆغا تەزبێحێکی بەسەر مردووەکەوە خولاندەوە و گوتی:"دەی باشە، با بڕۆین."

بە ملیۆنان مێشەنگوین لەو باخچەیەداا کە گولۆوکە هەنار سووری داگێڕابوو، وەك گەواڵە هەور بە ویزەویز دەنیشتن و هەڵدەستانەوە.

مێشە کەسکەکانیش کە لەژمار نەدەهاتن، لەو گەرما تاقەتبڕەدا بە بریسکەبریسکێکی پۆڵایین بەسەر تەرمی مردووەکەدا دەسووڕانەوە. ماهیر بەبێ منگەمنگ ڕێك چووە سەر کاکڵی قسەکەی:"حاجییە شێتە... کێشەم..."

بەڵام حاجی قۆرت بۆغا نەیهێشت قسەکەی تەواو بکا:"دەزانم. ئاگام لە هەموو شتێکە. مانگێکم مۆڵەت بدەیە، مانگێکی دیکە هەموو شتێك جێبەجێ دەبێ."

"مانگێك. کوڕە دەستم بە داوێنت ئاغا..."

قۆرت بۆغا بە دەنگێکی لێبڕاوانە قسەکەی پێ بڕی:"هەتا مانگێکی دیکە هیچم لەدەست نایە. جارێ لێگەڕێ با سەرۆکی گەورە بەخێر و خۆشییەوە بشارینەوە... ئەو کات..."

# ٩٢

"مریشك خۆڵ بەسەر خۆیدا نەکا، کەس ناتوانێ وەسەری بکا حاجی. ئەمن هەڵەیەکم کردووە و پێشم ناخۆشە بنیادەمێك لە سۆنگەی هەڵەکەی منەوە بمرێ، ئەگینا ئەوە دەروێش ئەوەش تۆ. بڕۆن و پاك لە پاکی بکەن. ه ه ااا ، لەوانەیە شتی دیکەشت بێتە مێشکی. بۆ وێنە هەستی و بچی بە دەروێش بەگ بڵێی، بەگم، گەورەم، ئەگەر ئەوەندەیان پارە بەتۆ دابایە، نەدەچووی بە یەکێکت نەدەگوت شاخەکانت حەفتا قولانج درێژ بوونەتەوە؟ راست بڵێ بەگی من، دەتگوت یان نا؟ بە دڵنیاییەوە دەتگوت. پێی دەڵێی ماهیر ئەو هەمووە پارەیەی دامێ و داوای لێ کردم ئەو قسانەت پێ بڵێم. ئەمنیش گوتم. وایە؟ دەی بڵێ دەی. بەڵام گوێ بگرە حاجی، ئەتۆ چی دەڵێی بیڵێ. ئەمن هەموو ئەو شتانەم لێك داونەتەوە. بە دەروێش بەگم گوت، ئەگەر یەکێك دەست لە پشتی ئەو کابرایە نەدا، ئەو لەخۆڕاوە ناتوانێ قسەی وا بکا. بەڵام دەروێش بەگ قەبووڵی نەکرد. چیی من هێنام و بردم، هەر گوێیشی پێی نەبزووت. ئێستاش ئەتۆ بێت و پێی بڵێی ماهیر دنەی دام وا بڵێم، لێت قەبووڵ ناکا. ئەمن بە دەروێش بەگم گوت، تۆ چاوەڕێ بە و بزانە ناحەزانمان بۆ ئەوەی نێوانمان تێك بدەن، چۆن هەوڵ دەدەن ئەو مەسەلەیە بەئەستۆی مندا بێنن. ئەویش پێکەنی و گوتی، هیچ شتێك من و تۆ لێك ناکا."

"دەروێش کاتێ دەچووە ئەستەمبووڵ، بەمنی گوت، بەر لەوەی بێمەوە، ئەو کاری کراوە. شوێنبزرکردنی پیاوێکی بێکەس و کاری وەك حاجی هەر هیچ نییە. کوشتنی ئەو لە کوشتنی سەیەکیش ئاسانترە. ئێستا پێنج کەس لە پیاوەکانی دەروێش بەگ شەو و رۆژە بەشوێن حاجییەوەن. چما تۆ کە دەڕۆی ئاوڕ نادەیتەوە؟ نیوەشەوان سەراسۆیەکی پشتەوەی ماڵەکەت ناکەی؟ کوڕە هۆی شێت و شوور، خۆ لە خۆڕایی پێت نالێن شێت. ئەوەندە بێ خەم و خەیاڵ دەخولێیەوە، وەك هیچ هەڵەیەکت نەکردبێ، لە حالێکدا ئەوەی تۆ بەوت کردووە، لە راستیدا حوکمی ئیعدامی خۆتت خستووەتە گەردنت. ئەگەر ئەو کارە ئەوەندە گرنگ نەبوایە و

مەسەلەی گیان لە گۆڕێ نەبوایە، چما ئەوەندەم پارە پێ دەدای؟ ئاخۆ ئەتۆ بەخەونیش ئەوەندەت پارە دیتبوو؟"

"ئەمن ئینسانم و ئینسانەکانم خۆش دەوێن حاجی. هەموو هەوڵی من ئەوەیە کە نامەوێ تۆ لەسەر من، لەبەر چەند لیرەیەکی من بکوژرێی، ئەگینا مردن و زیندوومانەوەت هیچ سوودێکی بۆ من نییە. ئەوانەت بۆیە پێ دەڵێم، ئەتۆ سەری خۆت بخوێنیتەوە و ئەمنیش تووشی عەزابی ویژدان نەبم براله."

"ئەمن وەك رۆژ، لێم روونە، دەروێش تۆ دەکوژێ. خۆی پێی گوتم. لەهەموو کەس پتر متمانەی بە منە و ئاگام لە هەموو ئیشە شاراوەکانی هەیە. ئەگەر دەتەوێ خۆت بکوژی، براله، بڕۆ و خۆت لەسەر پردەکەوە هەڵدێرە. باشە بۆ دەتەوێ دەستی خەڵکی بە خوێنت سوور بێ؟"

مانگەشەوێك بوو وەك رۆژ رووناك. هەروا کە سێبەرەکانیان لە پێش خۆیانەوە دەخوشین، دەڕۆیشتن. حاجی و ماهیر بە پیاسە بەرەو گردەکەی دەموزتەپە دەچوون و ماهیر لە گوێی حاجیی دەخوێند.

حاجی لە هەناسە شێدار و بۆگەنەکەی مووچڕکەی بە گیانیدا دەهات. زاری ببووە تەڵەی تەقیو و متەقی لێوە نەدەهات.

گەڵای سپیندارە بەرزەکان کە دەتگوت تۆزی زیویان بەسەردا کردوون، لەبەردەم لووزەوی بایەکەوە دەتگوت سرتوخرتیانە.

"برای خۆشەویستم. تکات لێدەکەم لێرە بڕۆ. بڕۆ گیانی من، بڕۆ بابی بابم. ئەگەر خودات خۆش دەوێ لێرە بڕۆ و دەستم بەخوێن سوور مەکە. بڕوانە کاکەگیان، بێت و تۆ بکوژرێی، ئەمن خۆم بە قاتڵ دەزانم و هەتا دەمرم لەسەر دڵم دەبێتە گرێ. لەبەرت دەپاڕێمەوە، دەست و پێیانت ماچ دەکەم. لەوە پتر لێرە مەمێنەوە. تا زووە لێرە بڕۆ..."

دەمانچەکەی لە قەدی دابوو. کە هەنگاوی هەڵدێناوە، قورسایی دەمانچەکەی لەسەر سمتی هەست پێدەکرد و بۆ ساتێك لەبیری نەدەچۆوە. ئێستا دەکرێ ئەو کەرە شێتەیە بکەی بە قوربانی گوللەیەك. کەسیش ئاگای لەوە نییە کە پێکەوە بوون. ئای، ئەگەر دەستی تێکەڵ نەیە و بتوانێ دەمانچەکەی هەڵکێشێت و پەلەپیتکەی بترازێنێ... خوا دەزانێ حاجی چەندە سامناك دەبۆڕێنێ و هەموو دنیا تێدەگەیەنێ. هەر کات بیری لە کوشتنی حاجی دەکردەوە، هەموو گیانی سڕ دەبوو و کە خەیاڵی کوشتنەکەی لە مێشکی دوور دەکردەوە، وەخۆ دەهاتەوە.

ئاگای لێ نەبوو قسە دەکات یان نا. ئێستا دەیهێنێتە بەرچاوی کە لە حاجی دەدا. حاجی دوای فیشەکەی بەردەکەوێ، لێرە، لەبەر ئەو مانگەشەوە و لەو دەوەنە مۆرتکانەدا، دەتلایەوە. بە چنگ گژ و گیا و دەوەنەکانی هەڵدەکەند و لاسکە دەوەنەکانی دەشکاندەوە، و بە نەڕەنەڕ هەڵدەبەزییەوە و خۆی بە عەرزیدا دەکێشا و پەلەقاژەی دەکرد و لینگەفرتەی دەکرد و ئاخری جووڵەی لێ دەبڕا....

حاجی جار جار گوێی لە قسەی پچڕ پچڕ دەبوو:"ئینسان... ئەمن تۆم خۆش دەوێ... نامەوێ بمری... لە کوشتن... دەروێش. چارەیەکی دی... وەلیی سەگباب... دەی بە قوربانت، ئەتۆ... هەموو شتێك چاك دەبێ.... چ دەبێ؟ یانی ئەوەندە بەلاتەوە ئەستەمە؟ ئەو شارۆچکە گڵاوە... بەجێ هێشتن... وانییە؟ شاری مرسین زۆر جوانە، وا نییە؟..."

حاجیش بە زەحمەت لەو قسە پچڕپچڕ و بێ سەروبەرانەی تێدەگەیشت.

ماهیر بەگ هەر لە پشتەوەیان گوێی لە دەنگێك بوو، هاواری کرد و لە دەستەکانی حاجی نووسا و کەوتە پتەپت:"رایکێشە، دەمانچەکەت راکێشە. ئەها هاتن.. دەمانکوژن... هەردووکمان.. حاجی، حاجی بەگ."

لەولاترەوە سێ کەس کە زۆریش لێك دوور بوون، خۆیان خستبووە سەر گیاچەقە بۆنخۆشەکان.

"دەمانچەکەت هەڵکێشە، دەی ... بەر لەوەی ئەوان دەست بۆ دەمانچەکەیان بەرن... پیاوەکانی دەروێش... تەقە بکە... خۆت بە عەرزیدا بدە."

خۆی بەعەرزیدا دا.

تاوێك فزەی لێوە نەهات. حاجی هەروا بەسەر پێوە راوەستابوو و سەیری تارماییەکانی دەکرد و هیچی نەدەگوت. خۆ دەمانچەی پێ نەبوو هەڵیکێشێ...

ئەو سێ کەسەی لێك دوور بوون و لەولاوە و حاجییش لەم لایەوە رووبەڕووی یەکتری راوەستان. سێبەرەکانیان درێژ بوون. دەموزتەپە بۆنی مۆرتکە و گیا چەقە و خاکی شێدار و داری رزیوی لێ دەهات.

لە نەکاو هەر سێ کەسیان ون بوو،. هەر دەتگوت زەوی زاری داپچڕی و قووتی دان. وەك بڵێی تێکەڵی مانگەشەوەکە بووبن. وەك چۆن هاتبوون، ئاواش بەبێدەنگی رۆیبوون.

حاجی شانی ماهیری گرتبوو، هەڵیستاند. گەڵای گیاچەقە لە نێو لەپی ماهیردا ورد بوون. حاجی ویستی پەنجەکانی لێك بکاتەوە، بەڵام نەیتوانی. دەستەکانی دەقیان گرتبوو. زۆری پێ چوو تا توانی بڵێ:"دەستم لێك بکەوە حاجی."

حاجی کە نەیتوانی دەستە گۆجەکانی لێك بکاتەوە، وازی لێ هێنا. بن باڵی گرت و کەوتنە رێ. بەرەو شارۆچکە. تاوێك دواتر ماهیر بەخۆشییەوە گوتی:"دەستەکانم لێك بوونەوە."

بە دەم رێگەوە، ماهیر بیری دەکردەوە، کە گۆڕی سەدان "رۆمی" لە بن پێیانمانە. رۆمیی سۆل لەپێ، جوان و نوورانی و ردێن رەش و چاکەت سوور. رۆمییەکان بۆنی دلڕفێنیان لەخۆیان دەدا. لەگەڵ ژنی جوان دەنووستن و زەوی و زاری گەورەیان دروست دەکرد. قوولکەی خانەکانی شانۆیان پڕ دەبوو لە خوێن. چەند ساڵان لەمەوبەر لە بن عەردی یەکێك لە دراوسێکانیاندا، پەیکەرەی پادشایەکی رۆمی دەردەوتبوو. پەیکەرەی پیاوێکی کەڵەگەتی بەژن و باڵا جوانی ردێن لوول. لێوە ئەستوورەکانی پیاوەکە، زۆر شەهوەتاوی لێك کرابوونەوە.

ئێستا، کێ چووزانێ لەو تەپۆڵکەدا کە هەزاران گۆڕی تێدابوو، لەو بەهارە فێنکەی چوکووراوادا چەندە، چیها بنیادەم، چیها بنیادەمی گەنج، هێندەی مێشەنگوینەکان و مێرووڵەکان و هێندەی باڵندەکان و هێندەی زیخ و چەوەکان، جووت ببوون.... کێ دەزانێ، چەندە، چەندە، چەندە زۆر... هەموویانیش لەوەها مانگەشەوێکدا... بە سەدان هەزار کچ و کوڕی گەنج... لەبەر مانگەشەو، لە نێو دار سنەوبەرەکان و بۆنی عەتری پنگە و رەیحانە و خاکی باران لێدراودا... خاکەکەش وەك ئەوان لە شەهوەتان هەستاوە.... هەر هەمووشیان مردوون و رۆیشتوون...

لەپڕ گوتی:"حاجی برۆ."

دیسان دەستی گرتەوە و لەسەری رۆیشت:"حاجی برۆ، کوڕە لەبەرت مرم برۆ. گیان شیرینە."

ئێستا هەموو ئەو مردووانە... تەنیا گۆڕەکانیان... گۆڕەکانیشیان بەتاڵ و سارد و تاریك...

لەدەستی نووسا و خۆی بەعەرزیدا دا و لەپەڕی پاڕایەوە:"حاجی خۆت مات بکە. دەمانکوژن... دەمانکوژن..."

دیسان لە پێشیانەوە، زۆر لە پێشیانەوە، سێ کەس زۆر دوور لە یەکتری راوەستابوون.

حاجی بەهێمنی و لەسەرخۆ و بە دەنگێکی دڵنیاییەوە گوتی:"هەستە ماهیر بەگ."

پڕی دایە و هەڵیستاندە سەر پێ و دیسان گوتی:"هەستە بابە، هیچ نییە."

ماهیر راوەستابوو، بەڵام هەر دوو لوێچی پڕ بوون لە گیا چەقە. حاجی ئەمجارە نەیویست دەستی بۆ لێك بکاتەوە. تاوێك دواتر لێك دەبوونەوە.

له خواره‌وه، سپیداره‌كانی ئه‌م به‌ره‌ی شارۆچكه، وه‌ك په‌رده‌یه‌ك به‌ به‌ر شاره‌كه‌دا كێشرابوون. ئاوه‌كه‌ی ساورۆن وه‌ك په‌تێكی خواروخێچ هه‌تا دوور دوور راده‌كشا و له‌ خوار ده‌شتكه‌وه‌ له‌ مژێكی خه‌ستدا ون ده‌بوو. شارۆچكه‌ خه‌وتبوو. ماڵه‌ سپییه‌كانی له‌ مژ و دووكه‌ڵه‌كه‌دا نوقم و تارتر بوون و به‌ سواڵه‌ته‌ سووره‌كانی سه‌ربانه‌كانیانه‌وه‌ ده‌تگوت ولاتێكی خه‌یاڵین.

"حاجی ئه‌وانه‌ كێن؟"

"هیچ نییه‌ بابه‌، به‌ ئێمه‌ چی؟"

بنیاده‌مه‌كان دیسان بزر بوونه‌وه‌. به‌ر له‌وه‌ی بگه‌نه‌ شارۆچكه‌كه‌، چه‌ند جارێكی دیكه‌ش بنیاده‌مه‌كانیان دیت و ده‌ست و پێی ماهیر خوار و خێچ بوونه‌وه‌.

"حاجی ده‌ستی راسته‌ت له‌و گیرفانه‌م رۆبكه‌."

حاجی ده‌ستی له‌ گیرفانی راسته‌ی پاڵتۆكه‌ی حاجی رۆكرد و چه‌پكه‌ دراوێكی ده‌رهێنا.

"حاجی ئه‌و پاره‌یه‌ به‌شی ساڵێكی خۆت و ماڵ و منداڵه‌كه‌ت ده‌كا. ئیتر له‌وه‌ پترت پێ ناده‌م. جا ده‌ڕۆی بڕۆ، ناڕۆی كه‌یفی خۆته‌. ئه‌گه‌ر ئه‌مڕۆش نه‌تكوژن، سبه‌ی ده‌تكوژن. بڕۆ ده‌ی."

حاجی به‌بێ ده‌نگی وه‌ك تارماییه‌ك دوور كه‌وته‌وه‌ و ئه‌ویش تاوێك له‌به‌ر ده‌رگای ماڵه‌كه‌ی راوه‌ستابوو نه‌یده‌زانی چ بكا. له‌ بیری ئه‌وه‌دا بوو كه‌:"ناڕوات، ئه‌و حاجییه‌ ناڕوات، حه‌یف بۆ ئه‌و هه‌مووه‌ پاره‌یه‌."

له‌ به‌رده‌م خۆیدا مه‌رگی وه‌ك دیوارێك هاته‌ پێش چاو. له‌و شه‌هوه‌ته‌ی له‌گیانی گه‌ڕا، لێوه‌كانی وشك بوون و هه‌موو گیانی گڕی گرت. رێك له‌و كاته‌دا كه‌وته‌ بیر قه‌ره‌قیز به‌دیعه‌. وه‌ك شێتان به‌ره‌و ماڵی شۆفێره‌كه‌ی وه‌ڕێ كه‌وت... و له‌خه‌وێ هه‌ڵێستاند.

"هه‌سته‌ خێرا، جلوبه‌رگه‌كه‌ت له‌به‌ر بكه‌، خێرا ده‌ی..."

شۆفێره‌كه‌ هه‌ر ئه‌وه‌نده‌ی یه‌ك و دوو جلوبه‌رگه‌كانی له‌به‌ر كرد و هاته‌ ده‌رێ... ترۆمبێله‌كه‌ خێرا له‌ شارۆچكه‌ چووه‌ ده‌رێ. سه‌عاتێك دواتر ده‌گه‌یشته‌ ئه‌ده‌نه‌.

"خێراتر، خێراتر لێخوڕه‌ ده‌ی... به‌ سه‌د و بیست، سه‌د و سی، سه‌د و چل... لێخوڕه‌."

دیواره‌ ره‌شه‌كه‌ی مه‌رگ، جار به‌ جار به‌رزتر ده‌بووه‌ و ده‌وری ده‌ته‌نی و شێتی ده‌كرد.

هه‌ستی كرد زاری پڕ بووه‌ له‌ خوێنێكی سوێر و بۆگه‌ن و كه‌فاوی. تفی كرده‌وه‌. هه‌ر خوله‌كێك تفێكی ده‌كرده‌وه‌.

## ٩٣

"کچێ ژنەکە، هەر مەپرسە چۆن ترسا. چیی نەمابوو خۆی پیس بکا. بە پیاسەکردنێ چووبووینە گۆڕستانی گاوران. سەیرم کرد ئەوە کەسێك بە دوومانەوەیە. بەڵام بەهەندم نەگرت. دوایی بوونە دوو، بوونە سێ و دواتر بوونە چوار کەس. هەر ئێمە دەڕۆیشتین و ئەوان دەهاتن و هەر رادەوەستاین ئەوانیش رادەوەستان. هەر کامەیان لەبەر تریفەی مانگەکە هێندەی منارەیەك بوون... کە ئاوڕی دایەوە و زانی بەدوومانەوەن، زراوی چوو. خۆی بە عەرزی دادا و زمانی گیرا و لە نێو گیاچەقەدا کەوتە خۆگەوزاندن. چیی نەمابوو گیانی دەربچێ..."

دوای ئەوەی ورد ورد باسی ماهیری بۆ ژنەکەی گێڕایەوە، هاتە سەر باسی پارە. ئەویشی بە زمانێکی لووس هێنایە گۆڕێ و لەسەر قسەکانی رۆیشت:"ئیتر دەڕۆین ژنەکە. بەخت و شانس لە دەرگای داوین. ئەوەی دەڵێن، ئەسپ و ئێستر جووتەی داوێن و کەری وەك من بەروبووەکەی هەڵدەگرنەوە... رادەسپێرم لە ماوەی دوو رۆژاندا کارەبا بکێشن بۆ ماڵەکانمان. ئیتر پێی ناوێ تڕ و منەتی هاوسێکانمان بکێشین. خۆمان کارەبامان دەبێ. دوای ئەوەش عەرزی گیانی خۆمی بکەم، ژوورێکی دیکەش دروست دەکەین و بە کرێی دەدەین. مانگێ پەنجا لیرەشمان لێرەوە دەست دەکەوێ."

ئەوجار چووە سەر باسی مەرسین. دەنگی گڕ و گەرم بوو. نارگیل و خورمای دەم دەریا... شەقامی دوورودرێژ و سپی... دەشتێکی بە دارپرتەقاڵ داپۆشراو. بە ملیونان پرتەقاڵ لە نێوان لك و پۆ و گەڵاکاندا... بۆنی شێداری و سەرخۆشکەری پرتەقاڵ هەموو وڵاتی داگرتووە. ئەو دەشتە پڕ لە بۆنی پرتەقاڵەی کە وەك پارچەیەکی دەریا، دەریایەك لە پرتەقاڵ، کەسك و رەش و سوور دەچێتەوە، بە چیای پڕ لە بەفر، کە هەر دەستت درێژ بکەیەوە، وا دەزانی بەر لووتکەکەیان دەکەوێ دەوری دراوە. بازاڕ و دووکانەکانی مەرسین، هەرکامەیان کۆشکێکی بلوورین. گڵۆپەکانیشی هەرگیز ناکوژێنەوە. کلیل داگرە هەموو وڵات رووناك دەبێتەوە. هەر

شێره(بەلووعە) بابدە، ئاوی وەك چاوی قرژاڵ دێتە دەرێ. منداڵ دەچنە قوتابخانەی وا، هەر دەڵێی کوشکن. قومار و مەشروبخواردنەوە و هەستان و دانیشتن لەگەڵ سەگی ئاوا بەکاری چی دێ؟ هەهەهە، کوڕە ئەو ڕۆژانە نەمان، نا، بەسەرچوون...

قاوەخانەیەك لە کەنار، لەسەر لمەکانی دەم دەریاکە. دەریاکە هەر هەستاوە و هاتووەتە پێشتر و بۆن و ڕووناکی و تۆخییەکەی خۆی هێناوەتە بەرهەیوانی قاوەخانەکە. سەر بە دیوارەکانیدا دەکێشێ. چەنێ خۆشە هەموو بەیانیان لوێچێ تیشك لە دەریا وەرگریت و بۆنی بکەیت. قاوەخانەکە لەدرێژایی ساڵدا لاولاوی گەلا سوور و گەلا زەرد و کەسك دیوارەکانی دەتەنێ. لاولاوەکان بە درێژایی ساڵ گوڵی ڕەنگاوڕەنگ دەگرن. گوڵی بۆنخۆش... ئەو دارانەی ساڵ دوازدەی مانگ گوڵیان دەپشکوێ. وا نییە؟ ئەو خزمەتکارانەی کراسی سپی لەبەر دەکەن، هەر هەمووشیان کچۆڵە دەبن. چما بنیادەم بە چاوێکی خراپە سەیری ئەو کەسە دەکات، کە خزمەتی بۆ دەکات؟ بەتایبەتی ئەگەر ژنەکەی خۆی هێندە جوان بێ.

ژنەکەی حاجی سەرەڕای زاووزێ و ئەو هەمووە هەژاری و نەداری و نەگبەتییانەی بەسەری هاتبوو، هێشتا هەر جوان مابوو و یەکێك بوو لە جوانترین و سەرنجڕاکێشترین ژنەکانی شارۆچکەکە. ژنێکی مامناوەندی بوو. دەموچاوی منداڵانەی دەنواند و پێستێکی ئەسمەری هەبوو. سمت و سۆڵی خڕ و پڕ و چاوەی درشت و لێوی گۆشتن و لووتێکی قیت و هەستبزوێن کە هەستت دەکرد بەردەوام حەزی لە گانە و شەهوەتی لێ دەبارێ. پیاوان شێت و شەیدای ژنی ئاوا بە ناز و دڵبەر دەبن تەنانەت ئەگەر باشیش نەبن. ئەو بوونەوەرانە گەوهەری ژنایەتی و شەهوەتن. هەر کەس بیانبینێ، ڕادەچڵەکێ. هەرچی ئێرەیی و ماڵ و سامان دۆڕاندن و سەرخۆشی و خەم و خەفەت و جەنایەتی بێ بڕانەوە و خۆکوژیی لەسەر ئەو عەردەیە، لە سۆنگەی ئەوانەوەیە.

یوسف کە لە بن دار تووەکەی پشت ماڵەوەیان و لە نێو لکە چەماوەکانیدا خۆ مات دابوو و گوێی نابوو بەو چەپەرەوە باریکەوە کە کردبوویانە پەرژین، تەواو لە قسەکانی ژن و مێردەکە تێ دەگەیشت. ئەو کە نەیتوانیبوو گوێی لە ناوی ئەو کابرایە بێت کە بەلادا هاتبوو و کەوتبوو، ئێستا هەوڵی دەدا یەك قسەشیان نەبوێرێ و هەمووی گوێ لێ بێ.

قسەکانی ژن و مێردەکە لە بنیادەمە زراوچووەکە و شاری مەرسینەوە لای دا و گەڕایەوە هەتا یەکەم ڕۆژی زاوا و بووکێنییان و یەکەم جووتبوونیان. ژنەکە بەبێ شەرم و حەیا، هەموو شتێکی ئەو دەموساتەی دەگێڕایەوە... هەر هەموو شتێك موو بە موو. یەکەم ڕۆژ،

سەرلەبەیانیی ڕۆژێکی گەرمی بەهاری، بەر لەوەی تاو بکەوێ، لە نێو دارستانە سنەوبەرەکەی دەموزتەپەدا ڕاکشابوون. ئەوەندەیان یەکتر هەڵگلۆفیبوو و گەوزاندبوو، هەتا خۆرەتاوەکە گەیشتبووە سەریان و هێندەی منارەیەك لە نێوەندی ئاسمانێ بەرز ببۆوە و هەموو وڵاتی گەرم داهێنابوو و ئەوان هەر ئاگاشیان لەو ئاگربارانی هەتاوە نەببوو. لە حاڵێکدا حاجی ئەوی هەڵگرتبوو و براکانی کچە بە شوێنیانەوە بوون بۆ ئەوەی هەردووکیان بکوژن.

لە نەکاو دەنگەکان گۆڕدران. دەنگی هانکەهانکیان، کە تێکەڵ دەبوو لەگەڵ سرت و خرت و ناڵین و قسەی پچڕ پڕ و هەندێ جار ئاخ و ئۆف، دەمێك نزم دەبۆوە و دەمێك بەرز دەبووەوە هەموو سەرنجی ئەوی ڕاکێشابوو. دەیبیست و موچڕکەی بە تیغەرەی پشتیدا دەهات و دڵی هەڵدەچوو و هۆشی نەدەما. لە جێیەکەی خۆی لە بن دارەکە حەجمینی نەمابوو. لە بن تەوژمی ئەو حەزە سەرکەشەدا بێ ئەوەی بەدەست خۆی بێ، دەردەپەڕی و بەملاولادا ڕایدەکرد و جاری وابوو خۆی بە پەرژینەکەدا دەکێشا. هەناسەی وەخت بوو سینەی کون بکا، دەستی تێکەڵ دەهات و دیسان گوێی بە پەرژینەکەوە دەنووساند و ڕای دەکردەوە و دیسان دەستێکی نادیار لەشە داغ و گڕگرتووەکەی داخستەوە پشت پەرژینەکەو سەرلەنوێ گوێی هەڵدەخستەوە...

... یوسف گیانی لەبەردا نەمابوو و وەك مردووەکان هەر لەوێ لە پشت پەرژینەکە کەوت. کەوتبوو و هەموو گیانی چڵی دەدا.

لە نێوان خەو و بەخەبەریدا، گوێی لە دەنگی خۆ شوشتنەوە بوو و ئەوجار دەنگی حاجیی بیست:"برادەران لە باخچەکە چاوەڕێمن، دەبێ بڕۆم."

ژن و مێردە لێیان بوو بە شەڕ. ئەی ئەگەر پێنج کەسان بە شوێنییەوە بوون بیکوژن، کەوابوو نەدەبوو بەو وەختی نیوەشەوە لە ماڵێ وەدەر بکەوێ. یوسفیش خودا خودای بوو ئەو ژنە قایلی بکا و نەهێڵێ ئەمشەو بێتە دەرێ. چونکە خۆشی وا شەکەت و داهێزرابوو، تاقەتی نەبوو لەجێی خۆی هەستێ.

یوسف کە لە ژیانیدا چێژی سەرجێی و جووتبوونی نەچێشتبوو، ئەوەندە تاسەبارانە بیری لە گوڵعوزار دەکردەوە و ئەوی دیکە بەو سمت و لێوە گۆشتنە سوورانەیەوە بەردەوام دەهات و لەبەر چاوی جێی ئەوی دەگرتەوە. لەگەڵ یەکێکیان جووت دەبوو، بەڵام ئەویتری لەجێی ئەو دەدی... ڕۆژێکیان بەیانی، لەوانەیە هەر سێ ڕۆژ لەمەوبەر، تێك ئاڵقابوون و وەها نوقمی نیگای ئاگرینی ببوو، وەك برووسکە لێی دابێ.

حاجی بەدەم جنێودانەوە، دەرگاکەی وا پێکدا دا، دیوارەکان لەرزینەوە و ملی رێیەی گرت و رۆیشت. یوفیش وەك بە زنجیرێکەوە بەویانەوە بەستبێتەوە، بەبێ ئەوەی گوێ بداتە شەکەتییەکەی خۆی، هەستا و وەشوێنی کەوت.

حاجی لە خۆشیان نەیدەزانی چ بکا و بەبێ خواردنەوە سەرخۆش ببوو و بەلادا دەهات و یەك پشوو گارەگاری بوو.

لە پڕ ئاوڕی داوە و سەیری دواوەی کر و هەر چاوی بە یوسف کەوت، کردییە هەرا:"وەرن، وەرن سێبەرەکانم. وەرن هەی قوندەرینە، وەرن بزانم چ گوویەکتان پێ دەخورێ بیخۆن. وەرن پشووەکانی من."

یوسف خۆی بەنێو سپیندارەکانی دەم جۆگەی ئاشەکەدا کرد و حاجی بە جنێودان دوور کەوتەوە.

لە باخچەکەی عومەر لەوانەیە بیست پیاو دەبوون بە قریوە و هەرا بە پێشوازییەوە چوون. ئەمجارەیان بە بۆنەی رۆیشتنی حاجییەوە میوانییەکیان گرتبوو. بەڵام حاجی زۆر بە درەنگی کەوتبوو. لەوانەیە بیست پێك و پیاڵە دەبوو بۆ لای حاجییان راداشت و لە بەر مانگەشەوەکە لێك دران.

تاوێك دواتر حاجی لە پڕ دەستی پێ کرد:"ناڕۆم هاوڕێیان، ئیتر ناڕۆم. پێم شوورەییە لە ترسی مەرگ را بکەم. من ئەسکەندەروونم پێ خۆشە و ئەگەر بە ویستی خۆم بەجێم هێشتبایە ئەوە شتێکی دیکە بوو. بەڵام ئێستا ئیتر ناڕۆم. چارەنووسی بنیادەم هەر شتێك بێ، گەڕانەوەی نییە. راکردن لەچنگی مەرگ خۆڕاییە."

هەمووان وێکڕا ئەو گۆرانییەیان گوتەوە:"لە مەرگ مەترسە و رامەکە..."

کە گۆرانییەکە بڕایەوە، دەنگەدەنگەکە تێك چڕژا:"ناڕۆی."

"نابێ بڕۆی."

"خۆ ئێمە پنگە نین."

"حەزت لێ بێ هەموو شەوێ، بیست، کە کێشکی ماڵەکەت دەکێشین."

"ناڕۆی."

"ناڕۆم."

دەنگەدەنگەکە وردە وردە نیشتەوە.

دیسان گۆرانی و سوێندخواردنەکان. ساغ بوونەوە حاجی نەڕوا. دیسان بوو بە هەڵڵا. پێنج کەسان حاجییان دایە بەر شەق و مست و پێ لەقە و کەوتنەوە ئاشتبوونەوە و دەموفلّچ ماچکردنەوەی یەکتری.

یوسف لە پڕ تێگەیشت، خۆی و حاجی نەبێ کەس لە باخچەکەدا نەماوەتەوە. حاجیش خەریك بوو دەڕۆیشت.

حاجی ئیتر راهاتبوو ئاوڕ بداتەوە و سەیری دواوەی بکات. یوسفی دیت و هەرای کرد:"سەگەل."

داهاتەوە و بەردێکی هەڵگرت و بە داهێزراوییەوە تێی گرت. بەردەکە زۆر لەولای یوسفەوە کەوت. حاجی وەك بیەوێ هەڵکێشێتە دەمانچە، دەستی بۆ قەدی برد. یوسف بەرەو دەموزتەپە تێی قووچاند. حاجیش کە هەروا وەك باڕێژە جنێوی دەباراند، سەری لەدووی نا. یوسف رایدەکرد و ئەو بە شوێنیدا.

یوسف ئیتر شەکەت ببوو. دەوەنە مۆرتکە و دڕووەکان دەست و دەموچاویان رووشاندبوو و بریندارییان کردبوو و سوێرایی خوێنەکەی لە زاریدا هەست پێ دەکرد. جار جار پێی لە دەوەنێك، بەردێك دەئاڵقا و دەکەوت و دیسان هەڵدەستایەوە و رای دەکرد.

هەوا گەرم بوو. مانگەشەو بوو. دەنگی هانکەهانکی حاجی لەو شەوەدا دەبیسترا. جاری واش بوو هەرای دەکرد:

"راوەستە، راوەستە هەی دایك..."

گەیشتنە دارستانەکە. دار و گژ و گیا و دەوەن و خۆڵ و هەموو شتێك نوقمی لوورەیەکی گەورە بوون. مانگەشەوەکە رەش داگەڕا. ریزی سپیدارەکانی شارۆچکە لەچاو ون بوون. بۆسۆ و بۆچرووك دەهات. جلوبەرگەکانی یوسف خوێناوی ببوون.

حاجی هەروا دەینەڕاند:"راوەستە، راوەستە هەتیو. هۆی دایك حیز..."

یوسف دڵی تێکەڵ دەهات و جاری وابوو هێڵنجی دەدا. هەموو گیانی شەلاڵی خوێن بوو و بۆنی خوێنی بۆ دەهات...

لە نەکاو سێ کەسی دیت بە دوای حاجییەوە، کە بەرەو لای ئەو دەهاتن. دوور بوون و لە یەکتریش دوورتر بەلام دەهاتن.

یوسف کێردەکەی هەڵکێشا. حاجی لە بەر مانگەشەوەکە و بەر بایەکە وە سپینداریێك نەرم نەرم دەلەرییەوە.

## ٩٤

خەو نەدەچووە چاوییەوە.

ئەو ئاسنگەرەی لە شەشەمین دووکان کاری دەکرد، زۆر پیر بوو. دەموچاوی و لەویش پتر نێوچاوانی هەموو چرچ و لۆچ بوو و هەر کەس دەیدی، هەستی دەکرد، ئەو ئاسنگەرە تۆکمە و ئێسک ئەستوور و بەهێزە قەت منداڵ نەبووە. گەنج و گەڕاوە نەبووە و ئێستا چۆنە، هەر ئاوا لە دایکی بووە. ردێنە سپییە بریقەدارەکەی، لوول بوو. ردێنی ئەوەندە جوان و خاوێن بوو، دەتگوت گلۆڵەیەك تیشکە. ئەو گلۆڵە تیشکە بە دەستی نەبەدی دەشۆرا. چاوەکانی وەك دوو پارچە پۆڵا لە نێو چرچ و لۆچ و بن برۆ سپییە پڕەکانیدا دەدرەوشانەوە.

لە هەڵسوکەوت و جووڵەیەوە وا دیار بوو کە جگە لەخۆی ئاگای لە هیچ شتێك و هیچ کەس نییە. دەتگوت ئاسنگەرەکە بەو سندانە و بەو کوورە سوورەوەبووە و بەو توونە گەورەیە، بەو شمشێرە پڕ نەخش و نیگارانەی هەڵیواسیون بە دیوارەکەوە، بەو کێردە گەورە بییانەوە و بەو دەمانچانەوە لەدایك بووە و وەك چنارێکی گەش و چڕ تا هەتایە لێرە لەو دووکانەدا هەروا دەمێنێتەوە.

ئەو ئاسنگەرە کە وەقسە دەهات، کاری دەکرد، پیاسەی دەکرد، پێدەکەنی، سەرت لێی سوور دەما کە چۆن ئاوا دەکا؟ هەر دەتگوت خودا خولڤاندوویەتی بۆ ئەوەی کوتك بوەشێنێ و لەو کاتەدا کە بڵێسە سوور و سەماکەرەکانی کوورەکە دەموچاوی گڕ گڕ داییسێنن و ردێنە سپییەکەی دەلێسنەوە، ئەو جەستە پتەوەکەی کۆم بکاتەوە و بە تاقەتێکی بێ بڕانەوە پارچە ئاسنە سوورەوەبووەکان بنەخشێنێ.

منداڵەکانی زۆر خۆش دەویست. منداڵی زۆر بوو. هیچ کامیان تا ئێستاش پێیان نەنابووە دووکانەکەوە. منداڵی دیکەش بە بەر ئەم دووکانەدا نەدەڕۆیشتن. وەستا وەسمان زۆر سەیر بوو. هەرکاتێك منداڵێك ڕێی کەوتبایەتە بازاڕی ئاسنگەرەکان، کە دەگەیشتە بەر دووکانەکەی ئەو،

تیژ تێدەپەڕی. لە حاڵێکدا هەموو منداڵێك حەزی دەکرد بچێتە نێو دووکانەکەی وەستا و دەستکارەکانی ئەو ببینێ و یارییان پێ بکا. بەڵام وەستا سیحرێکی تێدابوو، ئەوان لێی دەسڵەمینەوە.

بەردەم دووکانەکەی پڕ بوو لە گوڵی شەمدانی. هیچ کەس تەنانەت سەری پەنجەشی بۆ ئەو گوڵانە نەدەبرد. هەر بە ڕاست، ئەگەر یەکێك وێرابای و دەستی لەو گوڵانە دابایە، چ دەقەوما؟ کەس تا ئێستا بیری لەوە نەکردبۆوە تاقیی بکاتەوە. نەشدەکرا بیری وا بکاتەوە. تەواو. وەستا وەسمان جگە لە شمشێر و کێرد، گاسنیشی دروست دەکرد. گاسنی دروست دەکرد و لە دەرەوەی دووکانەکە و لە تەنیشت گوڵەکانەوە دایدەنان. کەس چەنەی لەگەڵ لێ نەدەدا و ، لەسەرخۆ و بە ڕێز و پارێزەوە، پارەی ئەو شتەی کڕیبووی لە تەنیشت سندانەکەوە دادەنا و دەڕۆیشت. گاسنی دەستی وەستا وەسمان ئەوەندە قایم بوون، چەند ساڵان کاریان دەکرد هەر نەدەشکان و هەر جارێکی لە خاکەکە دەهاتنە دەرێ، وا لێك و لووستر و بریقەدارتر دەبوون. هەر بۆیەش ئەو گاسنانەی وەستا وەسمان لە تەنیشت گوڵەکانەوە دایدەنان، زۆر زوو دەفرۆشران.

ئاسنگەرە پیرە کراسێکی بێ ملیوان و خەت خەتی لەبەر دەکرد و ئەوەش بەژن و باڵا تۆکمەکەی جوانتر دەنواند. شان و قۆڵی، ساڵ دوازدەی مانگێ رووت بوون. نێو شانی زۆر پان و باسکی پتەو و بەهێز بوون. دەتگوت لکی چنارێکی ئەستوورن. دەستەکانی بەو پەنجە باریك و درێژانەیەوە کە لەسەرخۆ و جوان دەجووڵان، دەتگوت لە مەچەکی منداڵێکت لێ کردوونەتەوە و خستووتنە سەر مەچەکی ئەو. ئەو دەستانە هیچ لەو جەستە و شان و باهۆیە نەدەهاتنەوە.

هاوارێکی وەك چۆن دەڵێن زەوی و ئاسمانی لەرزاندەوە...

"کێردەکان...."

یوسف بەخۆی دەگوت کە:"هیچ کام لە برادەرەکانی بابم دینارێك ناهێنن. ئەوە عەلی ئەفەنییە، بەرازێکی خودایە. وەستا وەسمان کە هەر بۆوەی نابێ لێی بچیتە پێشێ و دوو قسەی لەگەڵ بکەی. تەنانەت بە بەر دووکانەکەشیدا تێپەڕی. شێتێکە ئاو ناپیاڵێوێ..."

عەلی ئەفەنی دوژمنێکی میللەت، مونافقێکی بێدینی خوێن حەڵاڵ... وەستا وەسمانیش تەرکە نوێژێکی مزگەوت نەدیتوو و مرتەدە، کە بە چوار مەزەبان خوێنی حەڵاڵە. چاو، ئەو برادەرانی بابم!

لەمێژ بوو دەیوست بچێ و دەردەدڵێکی لەگەڵ بکا. بەڵام چۆن دەبوو پرێسکەی دڵی بۆ ئەو کابرایە بکاتەوە، کە ساڵی لەخودا بڕیبوو؟ سەرەڕای ئەوەش بەردەوام سەری لە بازاڕی ئاسنگەرەکان دەدا.

بەیانی هەرچۆنێك بێ، دەبوو کێردێك لە وەستا وەسمان بکڕێ. ئەو کێردەی لەبەرقەدیشیدا بوو هەر دەستکردی وەستا وەسمان بوو. کێردێکی کارپێکراو. ئەوە بۆ پیاوکوشتنێ نەدەبوو. ئەو کێردەی پیاوی پێ دەکوژن، دەبێ نوێ نوێ بێ.... ئەگینا خۆ بە هەموو کێردێك پیاو ناکوژن. پیاوی سەقەت و نقوستان دەکرد، نیوەگیانی دەکرد، کە سەت خۆزگە بە مەرگ و ئەوەش بێ ویژدانییە.

ئەو هەمووە منداڵەی بە پارەی ئەو کێردانە گەورە کردبوو. خوا بزانێ چەند پیاو بەو کێردانە کوژرابوون. دایکی لە زمانی باوکییەوە دەیگێڕایەوە کە وەستا وەسمان هەر کێردێکی لە کوورەی دەردێنیا، دوای ئەوەی کۆمەڵێك دووعای لەسەر دەخوێند و لەعنەتێکی لە دەمەکەی و سێ تفیشی لێ دەکرد و ئەوجار بەهەموو هێزی خۆیەوە کێردەکەی بە عەرزیدا دەدا و هەڵیدەگرتەوە. جا بە ڕیزەوە بە دیواری دووکانەکەیدا هەڵدەواسی و جۆرێك دەستی پێدا دەهێنا وەك بڵێی شتێکی پیرۆز بێ.

بەیانی دەچێ و کێردێك دەکڕێ و هەر پێشی ناڵێ، کوڕی مەحموودم. چ پێویست دەکا، کە...

"کێردێکم دەوێ مامە گیان."

دەستێك لە کوورەکەی ڕۆدەکا و بە دەستەکەی دیکەی بەردەوام بای لێ دەدا. چاوە وردە پۆلاییەکانی لە چاوەکانی دەبڕێ و لێ ورد دەبێتەوە. ئەو چاوانە بنیادەم دەبڕن و هەتا سەر جەرگی ڕۆدەچن و نێو دڵی دەبینن و دەیخوێننەوە.

لافاوێك لە وردەئاسنی سوورەوەکراو و بڵێسەی سوور بەسەر دەستەکانیدا و بەسەر گوڵەسوورەکاندا، بەسەر گاسنەکاندا دەردەپەڕن. هرووژمە بڵێسەکە لە دووکانەکەدا جار بە جار هەڵدەکشێ. وەستا کە زەردەی نایەتە سەر لێوی، لەو کاتەدا بزەی دێتێ. روخساری لەبەر تیشکی بڵێسەکان وەك مسی لێ هاتووە. دەگاتە ئەژنۆکانی. ئەوجار بەر زگی و دواتر هەڵدەچێ بۆ نێو شانی، نە بۆنێك و نە شتێك... وەستا وەسمان ئاگر ناگرێ، ناسووتێ. لافاوی ئاگرەکە بەرەو میچەکە هەڵدەکشێ، وەك بڵێی سەری وەستا وەسمان بەسەر بڵێسەکانەوە کەوتووەتە مەلە. کێرد و شمشێرە سەدەفنیشان و نەخشێنراو و چەماوە و ڕاست و کورت و

درێژەکان، وەسەر ئاگر دەکەون. گاسنەکان لە خاك دەرهاتووەکانیش، کە بۆنی گڵی تەڕیان لێ دێ و دەدرەوشێنەوە، وەسەر ئاگرەکە دەکەون. وەستا وەسمان کە چیی وای نەماوە نوقم بێ و دەنگێکی وەك خنکان لە قوڕگی دێ، گاسنێکی گرتووە و لەگەڵ هەڵچوونی بڵێسەکان ئەویش هەڵدەکشێ.

سەگە ئەنگێوراوەکە شەلاڵی خوێن. مەمەدە رزیو رێك فیشەکی بەرچاوی کەوتووە. فیشەکەکە چاوی سەگەکەی بڕیوە و لە پشت ئەستۆیەوە هاتووەتە دەرێ. سەگەکە لە ترسان وەك بەرداش لەسەر عەرزەکە دەتلێتەوە. لە پڕ رادەوەستێ و لاقی راستەی درێژ دەکاتەوە. لاقەکەی تاوێك هەر وا بە راکێشراوی دەمێنێتەوە و دەلەرزێ.

لە شووشەی پەنجەرە ئینجانەدارەکەی خانووە سپییەکەی سەرەتای شەقامە گەورەکەی بازاڕەوە، دەستێك دیارە. دەستێك رێك لەبەر پەنجەرە و هەر دەڵێی خراوەتە پشت کورسییەکەوە، دەبینرێ. بەرەو هەر لایەکی دەچی بۆچی، بۆچی. لە هەر لایەکەوە دەڕوانی، بڕوانە، جگە لەو دەستە سپی و درێژ و جوان و ورووژێنەرە هیچ نابینی. ئەو دەستە هەر دەڵێی لە جەستەیەکیان لێ کردووەتەوە و بەوێیاندا کردووە. ئەگەر جار جارێ نەجووڵێ و قامکی دۆشاومژە رەق رانەوەستێ، وا دەزانی ئەو دەستە جوانە دەستی مردووەکە. کێ چووزانێ خاوەنی ئەو دەستە چەنێ جوانە؟

گژ و گیا سەربانەکانی داپۆشیوە. شووشە روونەکان. ئەو چنارانەی سەر لە ئاسمانێ دەسوون و لك و پۆی خۆیان بەسەر ماڵەکاندا رۆهێشتووە. دەستە سپییەکە، زیندووەکە بە نینۆکی درێژەوە و بەبێ ئەموستیلە. ئاخۆ بڵێی دەستێك هەبێ هێندە جوان بێ؟ ناتوانێ چاو لەو دەستە هەڵگرێ. وردە وردە دەگۆڕدرێ و دەکوڵێ و تەزوویەك لە تیغەرەی پشتیدا دێ. هەموو گیانی موچڕکە دەکات. چیی سەیری دەستەکە دەکات، شەهوەتێکی تاقەتبڕ لە ناخیدا هەڵدەستێ کە بەهیچ دانامرکێ و جار بەجار بەتەوژمتر دەبێ.

کێ دەزانێ خاوەنی ئەو دەستە چەندە جوانە؟

بەسەر ئەو پەرژینەدا، کە لە لك و پۆی چنارەکە پێك هاتبوو، پەڕییەوە و خۆی گەیاندە سەربانە قوڕینەکە. سەربانەکە رووبەڕووی پەنجەرەکە بوو. داهاتەوە و سەیری پەنجەرەکەی کرد. دەستەکە نەبێ، نەیتوانی چیی دیکە ببینێ. لەو بەری دووکەڵە زەردەکەوە شتی خەیاڵی دەجووڵان. چووە ئەولای سەربانەکەوە و دیسانیش نەیتوانی هیچ ببینێ. هەوڵی دەدا ببینێ. ماوەیەك لەسەربانەکە ئەملاوئەولای کرد. ئەسمەر یان کاڵ، خەمبارە یان گەش و رووخۆش؟

ماندووە یان حەساوە؟ چاوەکانی چ رەنگێکن؟ خاوەنی ئەو دەستە، تەمەنی لە بیست ساڵ پتر نابێ. دەستێکی ورووژێنەر و دڵبەر و سووتێنەر... تەنانەت لە بن مووەکانیشییەوە عەشق هەڵدەقوڵێ.

ئەو دەستەی ئاوا بە خەمباری خراوەتە سەر ئەوێ، لە پشت ئەو شووشانەوە، کەفوکوڵ و شەهوەت دەداتە کۆڵانەکە.

وەك بە چل زنجیر بەسترابێتەوە، نەیدەتوانی ئەوێ بەجێ بێڵێ و چاو لە دەستەکە هەڵگرێ. هەر کەس ئەو دەستەی دیتبایە، هەر ئاوای لێ دەهات.

وەك پشیلەیەك وەسەر دارەکە کەوت. لکێکی باریکی دارەکە کشابووە بەر پەنجەرەکە. وردە وردە بەرەو چڵووکی ئەو لکە خوشی. دەستەکانی بریندار ببوون. بەبێ ئەوەی ژان بکەن، خوێنیان لێ دەچۆڕایەوە. ئەو لکە باریکەی خۆی پێوە هەڵواسیبوو، خوێناوی ببوو. شووشەی پەنجەرەکەش خوێناوی بوو. بەڵام دەستەکە وەك بڵێ خستبێتیانە ئەوێ، هەر وا مایەوە. وەك بڵێی خاوەنی نییە. ئەگەر تۆزێکی دیکەش لە چڵووکی لکەکە نزیك ببایەتەوە، دەیتوانی پەنجەرەکە بکاتەوە و دەستێك بە دەستەکەدا بێنێ و خاوەنەکەشی ببینێ. ئێستا هەموو هەست و خوستی لای ئەوە بوو دەستێکیان لێ بدا. لەسەر لکەکەوە، بەو پەڕی وردییەوە بە سەر لکە باریکەکەی خوار ئەودا، دەهاتە خوارێ و لە پەنجەرەکە نزیك دەبۆوەوە.

هاتە خوارێ. نزیك بووەوە. دەستە سپییە درێژ و پەنجە بێجووڵەکەش لەو نزیك بۆوە. دەستی بۆ برد. لە نەکاو دەنگی زرینگەیەك هەستا و بەدوایدا شەققەیەك هات، کە هەر دەتگوت سەدان درەخت یەك جێ قەڵشیون. دەستەکە جێی گۆڕی. لە چاوترووکانێکدا بەبەر چاوییەوە دەستەکان هەڵفڕین و هەموو شتێك سپی داگەڕا. هەموو وڵات لە چاوترووکانێکدا پڕ بوو لە درەوشاوەیی و رووناکیی و دوای ئەوە هەموو وڵات نوقمی تاریکی بوو.

کەفکردن و مەیین و سوێریی خوێنەکەی لە زاریدا... و هەزاران مێشی کەسك کە وەك هەورەتریشقە لە خوێنەکە رۆدێن... مێشی کەسك... لوورە... مێشە کەسکان ئەوەندەی چاوتروکانێك خوێنە کەفکردووەکەیان داپۆشی. بۆنی گەرم و قورسی خوێنەکە هەستا.

چاوەکانی وەستا وەسمان ئاگریان لێ دەباری و ردێنی دەلەرزییەوە. دەستکردە بچووکەکەی هەڵدێنا و بە عەرزی دا دەدا و ئەوجار لەو ئاسنەواڵەیەی کەوتبووە سەر عەرزەکە، ورد دەبۆوە و بەو پەڕی رێزەوە وەك بڵێی نەوێرێ دەستی بۆ بەرێ، هەڵیدەگرت، لەو کاتەدا، چاوە پۆلاییینەکانی لە چرچ و لۆچدا ون ببوو.

دەنگی ترپەی دڵی یوسف لە گوێیدا دەرزینگایەوە. بازاڕی ئاسنگەرەکان ئەستێرەباران بوو و جگە لە تەپە و تەپەی چەکوچ و کوتك دەنگێکی دیکەی لێوە نەدەهات. دوایین دووکانی جۆشکاری (لەحیمکاری) تیشکە شین باوەکەی باوەش باوەش بەرەو کۆڵانەکە دەنارد.

چووە دووکانەکەی وەستا وەسمانەوە و بە دەنگێکی کپ و ترساوەوە گوتی:"کێردێکی گەڵا بی."

وەستا کێردێکی لە سندووقەکە دەرهێنا و لەپێشی دانا.

"بایی چەندە؟"

سەیری پێشەوەی دەکرد. روخساری وەك ئاگر داییسا.

وەستا نرخی کێردەکەی گوت. وەك ئەو دەنگە، لە زاری ئەوەوە نا، بەڵکو لە دیوارەوە هاتبێ. سەری هەڵێنا و سەیرێکی وەستای کرد. هەر بەراستی لێوەکانی وەستا نەدەجووڵان.

وەستا بۆ جارێکیش چییە، هەر سەیرێکی نەکرد. پارەکەی لێ وەرگرت و باوەڕی نەدەکرد کە چۆن خستییە نێو بەروانکە چەرمییەکەیەوە و خەریکی ئیشەکەی بۆوە.

یوسف ئەو رۆژە چوار جاران چوو و کێردی گەڵا بیی کڕی و هەر چوار جارەکەش وەستا وەسمان سەیری روخساری نەکرد. بەهەندنەگرتنەکەی وەستا وەسمان، جار بە جار وەڕزتری دەکرد.

بۆ سبەینێ، کەڕەی بەیانی لەخەوێ هەستا و هاتە بازاڕی ئاسنگەرەکان. هات و هەڵڵا و قریوە و زەنازەناکەی دوێنێی نەبوو. تاریکایی وردە وردە دەڕەوییەوە و رووناك دەبۆوە، و بازاڕەکەش هەروا کپ و بێدەنگ بوو.

دەڕابەی یەکەم دووکان، وەك تۆپێکیان تەقاندبێ، هەڵدرایەوە. دوای ئەو دووەم دەرابە و سێهەم و ئەوجار دووکانەکانی دیکەش یەك لە دوای یەك دەکرانەوە. دوای چەند ساتێك، لە دووکانێکەوە باوەشێك بڵێسەی سوور هاتە دەرێ. دوای ئەو لە دووکانەکانی دیکەشەوە. بازاڕی ئاسنگەرەکان لە تاریك و روونی بەیانیدا وەك رۆژ رووناك داگەڕا. ئەوجار دەنگی کوتانی چەکوچ و کوتك، بازاڕەکەی ئاخنی.

وەستا عوسمان ئانیشکی دابووە سەر سندانەکەی و دەموچاوی خستبووە نێوان دوو دەستە سپییەکەیەوە و داڵغەی لێ دابوو.

"کێردێکی گەڵا بی."

وەستا وەك لە خەوێ راچڵەکیبێ، وردە وردە پشتی قیت کردەوە. لە پێشدا دەستی لە دەموچاوی و دوای ئە ئانیشکی لە سندانەکە کردەوە و کێردێکی لە قوتووەکەی تەنیشت

مێزەکە هەڵگرت و بۆ راداشت. یوسفیش دەسبەجێ پارەکەی دایێ و لە دووکانەکە وەدەر کەوت.

روخساری وەستا ئەو کاتەی کێردەکەی پێ دەدا، تێك چووبوو و سەری سوورِما و نەرمە زەردەیەك خزیبووە چرچ و لۆچەکانی دەوری چاوەکانییەوە. لەوانەشە هەر وا دەرکەوتبێ.

تاو هەڵات، یوسف ئیتر هەر پانزە خولەك جارێك سەری دووکانەکەی دەداوە و بە دەنگی بەرز دەیوت:" گەڵا بیِیەك".

کێردەکەی وەردەگررت و بەپەلە لە دووکانەکە دەچووە دەرێ.

کێردەکانی وەستا وەسمانیش خۆ تەواو نەدەبوون.

ئەو وەستایە چ بنیادەمێك بوو؟ جنۆکە بوو، پەری بوو، یان شێتێك؟ ئەو هەمووە کێردەی لێ کرِی بۆ جارێکیش چییە سەری هەڵنەهێنا سەیرێکی رووخساری بکا. زەردەیەکیشی نەهاتێ و هەر پێی سەیر نەبوو و نەیپرسیی، ئەتۆ کێی و لە کوێوە دێی و بۆ کوێ دەچی و ئەو هەمووە کێردەت بۆ چییە؟ قسەی نەکرد. متەقی لێوە نەهات. تەنانەت بچووکترین گۆرِان لە دەموچاویدا نەبینرا.

ئێوارێ دیسان دەرِابەکان بە خرِەخرِ دادرانەوە و تاوێك دواتر هەرچی گیانلەبەرە، بنیادەم و پشیلە و سەگ و باڵندە و ئەوی پشووی لەبەرە، ئەوێیان چۆل کرد. ئێستا ئەو بازارِەی تاوێك لەوەپێش لە گرمە و هەرادا دەتگوت شێت بووە، کپ و بێدەنگ و جووڵە بوو.

یوسف لە نێوەرِاستی بازارِەکە، حەپەسابوو و دوایین کێردی کرِیبووی بەدەستییەوە بوو. شەو، شەوێکی خەست و قورس بەسەر شار دەکشا. یوسف تەنیایی و بێکەسی و داماوی و بێهیوایی لە ناخی گیانییەوە چێشت و ناڵاندی:

"چما پیاویش ئاوای لێ دێ؟ بنیادەمی وەك منیش هەیە؟"

بازارِی ئاسنگەرەکان بە دەنگە دەنگ کرایەوە. تاو هەڵات. چیا بەفرگرتووە دوورەکان نزیکتر بوونەوە و دەتگوت ئەوە هاتن و لە تەنیشت خانووەکانی قەراغ شارەکە راوەستان. جەنگەڵەکەیان، بۆن و بەرامەیان... ئەوجار بۆنی رەژوو و ئاسنی سوورەوەبوو بازارِەکەی ئاخنی.

چیای "مس"ـینی دولدول، لە پشت جریقەی پزیسکەکان و لە پشت ریزی چیا لووتکە تیژەکان، دڵگر و تار و وەك پەردەی تۆرِێکی ناسك، بەفرپۆش، قیت وەستابوو و سێبەرەکەی بەرەو رۆژئاوا دەکشا.

## ٩٥

یوسف سێ ڕۆژ بوو لەماڵ یان ڕاستتر بڵێین، لە جێوبانەکەی نەدەهاتە دەرێ. وای لێ هاتبوو دەتگوت لە ڕووناکایی دەترسێ و شەرم دەکا. دەست و پێی بەدەست خۆی نەبوون.

ژوورەکەی پڕ کردبوو لە کەلوپەل و کێرد و کەرەستەی جۆراوجۆری یاری. وەك شێتان دەستی کردبوو بە گەمەکردن بەو شتانەی یەکەم ڕۆژ هێنابوونی و کێردەکانی لەسەر عەرزەکە، جار جار بە پۆل لە تەنیشت یەکتری و هەندێ جارێش یەك یەك و جوێ جوێ ڕیز کردبوون و بە چاوی بەستراوەوە، چەند سەعاتێك بە نێوانیاندا ڕۆیشتبوو. لاقی بریندار بوون و کێردەکان شکابوون. کە شەویش داهاتبوو، ماندوو و شەکەت خزیبووە جێوبانەکەیەوە و خەوی لێ کەوتبوو.

ڕۆژی دووەم حەزی لە هیچ یارییەك نەبوو. ئەو کێرد و کەرەستە یارییانەی دوێنێ قاقایان دەکێشا و دەتریقانەوە، ئێستا مردبوون. چاوی بڕییە ئەو کێردانەی لە سەر عەرزەکە کەوتبوون و بەبێ جووڵە لە جێوبانەکەیدا مایەوە. هەتا بەیانی کێردەکان لەبەر چاوی لانەچوون.

ڕۆژی سێهەم هەموو شتێکی لەبیر کرد. هەستی دەکرد هەر لەجێیەکەی بێتە دەرێ، بەڵایەکی بەسەر دێ. لە نوێنەکەیدا کرووشمەی دەکرد و گرمۆڵە دەبوو. ئەگەر دەستەکەی پشت پەنجەرەکەشی نەهاتبایەتەوە بەرچاوی، دەکەوتە گێژاوی بۆشاییەکی سەیر و سەمەرەوە و دەتلایەوە. دەستەکەی پشت پەنجەرەکە، هەر جارێکی دەهاتەوە پێش چاوی، گڕی دەگرت و جینگڵی دەدا و هەموو دەمار و پێست و مووەکان پڕ دەبوون لەشەهوەت و وێك دەهاتن. ڕاکێشرانێکی شەلاڵی خوێن، سوێر، سوور و دڵبزوێن لە جەستەیدا... سووربوونەوە لەچێژدا... ئەوجار بەتاڵبوونەوە و بێهێزبوون و ...

چەند جاران هەوڵی دا هەستێ. جێوبانەکەی بۆگەنی ئارەقەیەکی ترشاو و بۆنێکی تاڵ و شێداری لێوە دەهات. سەری لە گێژەوە هات و نەیتوانی بەسەر پێوە ڕاوەستێ. چاوەڕێ ما هەتا دەستەکەی پشت پەنجەرە بێتەوە پێش چاوی و دیسان شێتی بکاتەوە. هەتا بەرەبەری

نیوەڕۆ هەر خۆ گرمۆڵە کردبوو، کە دەستەکە هاتەوەو لە پشت پەنجەرەکەوە دەرکەوتەوە. یوسف لە ناخەوە بزووت. جەستەی بەخەبەر دەهاتەوە. کە تینی هاتەوەبەر، هەستا و قیت راوەستا. سەری لەگێژەوە نەدەهات. جلوبەرگی پۆشی و چووە کۆڵانێ.

تاوە خۆش و نەرم و بلاوێنە پاییزییەکە کۆڵانەکەی پڕ کردبوو. دڵی تێکەڵ دەهات. هەستی بە شەکەتییەکی تاقەتبڕ کرد و بە هانکەهانك خۆی گەیاندە کەبابخانەکە. لە ئاوێنەکەدا خۆی دیت. روخساری زەرد هەڵگەڕابوو و بن چاوەکانی ئەستوور ببوون و مۆر ببوونەوە. وەك بپاڕێتەوە گوتی:"زوو بە برالە، زوو، زوو... زووبە دەی، برسێتی برستی لێ بڕیم."

دووکەڵە چڕ و چەورەکەی کەبابەکە، دووکانەکەی پڕ کردبوو. یوسف دووکەڵە چەورەکەی هەڵدەمشت. ئەوەندەی چاوترووکانێك ئەو سەوزە و تەماتە و بیبەرەی خوارد، کە لە پێشیان دانابوو.

کەبابچییەکە کەسی وەك ئەوی زۆر دیتبوو. گەنجی لەگوێن وی. سەیری ئەو پێڵاوانەی، چەنێ قوڕاوین. خوا بزانێ ئەو داماوە رێیەکی چەند دوو و درێژی بڕیوە.

یوسف بە تێر و پڕی لە دووکانەکە هاتە دەرێ.

"جەیهان، جەیهان، ئەددەنە، ئەددەنە."

لە ترس و گوماندا خۆی لەبەر یەك کێشایەوە و موچڕکەی پێدا هات.         چ بکا.

گەڕایەوە و بەرەو ماڵەوە غاری دا. رای دەکرد، بەڵام دەنگەکە لەکۆڵی نەدەبووەوە و یەك پشوو لە گوێیدا دەزرینگایەوە:

"جەیهان، جەیهان، ئەددەنە، ئەددەنە."

یوسف ئامادە بوو هەرچی هەیەتی، بیدات و ئەو دەنگەی لەکۆڵ بێتەوە.

"جەیهان."

ماڵەکە کپ و بێدەنگ بوو. لە ماڵەکە سام گرتی و تۆقی و ئەوەندە چاوترووکانێك گەیشتەوە بازاڕ. یازدە جار بە بەر دووکانەکەی عەلی ئەفەندیدا تێپەڕی بەبێ ئەوەی سەر هەڵێنێ و بەخێسێکیشەوە سەیرێکی ئەوێ بکا. ئەوجار گەڕایەوە و دیسان هەروا. جارێکی دیکە و جارێکی دیش... دەهات و دەچوو. لە پڕ وەی زانی عەلی ئەفەنی بانگی دەکا. ئەو دەنگە رایچڵەکاند و مووی لێ کردە نەشتەر.

ئەو یەزیدە دەبێ بکوژرێ. دەبێ بکوژرێ. هەتا ئەو نەکوژرێ، دنیا پاك نابێتەوە و چاك نابێ. ئەو سەرچاوەی هەموو گوناح و تاوانەکانە.

خەیاڵێکی لێڵ، بەبێ روخسار و تەماوی لە دوور و لە قووڵاییەکانەوە هەڵدەستا و بەسەریدا تێدەپەڕی. بنیادەم چۆن دەکوژرێ؟ باوکیان چۆن کوشت؟ بە ئەشکەنجە... ژووری بەندیخانە گۆمی خوێنی... هەموو گیانی شەلاڵی خوێن... کەوتووە، مردووە. چاوەکانی، زەق زەق، بە مۆڵەق وەستاوە.

کزەی لە جەرگی هات. ئەگەر ئەویش وەك باوکی بکوژن؟ چما کوڕێك هەڵدەکەوێتەوە تەواو چووبێتەوە سەر باوکی؟ ترسنۆك، جارجاریش ئازا... ترسنۆك... لە مەرگ خراپتر... نا، نا، نا، ئیتر بەسیەتی. ئیتر فززەی لێوە نایە و متەقی نایە.... جارێکی دیکەش گوڵعوزاری هاتەوە پێش چاوی. ئەویش نابینێتەوە. مردووەکان وەك وشکەڵە دارێك دەڕزن. خوایە؟ ئەی ئەگەر خوا نەبێ....

عەلی ئەفەنی دەبێ بکوژرێ. دەبێ خوێنی بخورێتەوە. هەر ئێستا. دەستی بۆ کێردەکەی چوو و چاوەکانی لە تووڕەییان چوونە پشتە سەری و زاری کەفی چڕی...

"جەیهان."

دەنگەکە رایچڵەکاند و وەخۆی هێنایەوە. سەری هەڵێنا، سەیری کرد ئەوە عەلی ئەفەنی کە بڵێی و نەڵێی خەپەسابووبە بزەیەکەوە، لەبەردەمی راوەستابوو.

"چییە، چتە براڵە؟ ئەگەر تووشی کێشەیەك بووی، پێم بڵێ، دانیشە بابە، دانیشە. دانیشە پیاڵە چایەکی بخۆوە. دێیەوە سەرخۆ."

دەنگەکەی میهرەبانانە و خۆمانە و برایانە بوو. گەرم و گوڕ بوو.

یوسفیش هەوڵی دا بزەی بێتێ، بەڵام نەیتوانی. نەیتوانی لێویشی ببزێوێ.

"دانیشە برا، دانیشە بزانم."

دەستی گرتبوو و گەرم دەیگوشی. تیشکێك لە ناخیدا تەقییەوە. بێهیوایی و تاریکاییەکەی ناخی جێی خۆی دا بە رووناکایی و هیواداری. روخساری ئەو کابرایە دڵنایی و هیوایی و برایەتییەکی تێدابوو لە تاریف نەدەهات. حاڵەتێکی گەرموگوڕ و خۆمانە و دڵخۆشیدەر روخساری داگرتبوو.

یوسف ئیتر بنیادەمەکەی چەند ساتێك لەمەوبەر نەبوو. ئەو بنیادەمە گرژ و مۆن و شێواوە، لە دوور دوورەوە، لەولاترەوە و لە تاریکاییەکاندا بەجێ مابوو. عەلی ئەفەنی قسەی دەکرد، لە دایکی دەپرسی و دەیویست بزانێ دوای مردنی باوکی، چۆن ژیاون. ژیانیان تاڵ تێپەڕیبوو، بەڵام هەرچۆنێك بێ، گەورە ببوو. دایکی لەگوێن دایکی ئەو پەیدا نەدەبوو. میرۆ، ژنێکی ئازا و مەردانە و لێوەشاوە و لە هەمووە روویەکەوە ساغ بوو. وا نییە؟

لەو کاتەوە لەو شارۆچکەی بووە و هەموو رۆژێکیش ئاوا شێواو و شڵەژاو بە بەر دووکانەکەیدا تێدەپەڕی، ئەی بۆچی بۆ جارێکیشی سەری بە دووکانی برادەرەکەی بابیدا نەکردووە؟ دەستی کرد بە تاریفی مەحموود. مەحموود پیاوێکی زۆر زیرەك و بەژن و باڵا جوان و لێوەشاوە بوو. سەرەڕای ئەوەی چەند کەسێکیشی کوشتبوو، بەڵام خووخدە و خەسڵەتی پیاوکوژیی لێ نەنیشتبوو. کابرایەکی نەرمونیان و گەرموگوڕ و میهرەبان و خۆمانە بوو. سەری لەوە سووڕ مابوو. بنیادەمێکی ئاوا چۆن توانیویێتی چەند کەسێك بکوژێ، کە نەیناسیببوون؟ ئەوە مەحاڵ بوو. بڕوای نەدەکرد. مەحموود چۆن توانیوێتی گەنجێك بکوژێ، کە قەت نەیدیتبوو و هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵیدا نەببوو؟ بۆچی؟ باشە چاری نەبووە؟ خوا بزانێ ئەو بەگە بێناموسە خستوویەتە چ تەنگانەیەکەوە و ناچاری کردووە وا بکا، وا نییە؟

ئەوەندەی باسی بەگ و ئاغاکان، ئەوانەی خوێنی برسی و هەژاران دەمژن بۆ مەحموود کردبوو، ئەوانەی لەوێ ببوون هەموو وەڕەز و شێت ببوون. هەندێ قەبووڵیان نەکردبوو و لۆمەیان کردبوو و جنێویان دابوویە و هەندێ ترسابوون و هەندێکیش پەلاماریان دابوو، بەڵام هەر هەموویان چووبوونە فکرەوە. مەحموود لە نێویاندا لە هەمووان پتر دەهری ببوو. مەحموود چاوی وەك گۆمی خوێنیان لێ هاتبوو و وە شێتان بە قەستی کوشتنی ئامبازی ببوو.

عەلی ئەفەنی مانگێکی رەبەق لەگەڵ مەرگ دەستەویەخە بوو. چ باشتر کە عێزەتی حەمام کۆیی لەوێ ببوو. هەموو بەیانیان کە مەحموود دەستی دەدا کێردەکەی و وەدەردەکەوت، عێزەت وەشوێنی دەکەوت و یەك پشوو لەگوێی دەخوێند و هەوڵی دەدا پاشگەزی بکاتەوە لەوەی کە بە کوشتنی عەلی هیچ دەردێك چاری ناکرێ. ئەوەندەی ئەوە گوتبوو و لەگوێی خوێندبوو، زمانی مووی لێ هاتبوو. چما چ بوو؟ بەگەکان، دیسان بەگ، کرێکارەکان، دیسان کرێکار... و مەحموود هەنگاوێکی دیکە لە سێدارە نزیکتر دەبووەوە. وا نییە؟

مەحموود لەو یەك مانگەدا لە پڵینگێك دەچوو کە مووەکانی گرژ بووبێنەوە. قسەی لەگەڵ کەس نەدەکرد و دەنگی لێوە نەدەهات. دەمی لە هیچ نەدەدا و جگەرەی بە جگەرە دادەگیرساند. وای لێ هاتبوو، پەنجە و سمێڵی بە دووکەڵی جگەرەکەی زەرد زەرد هەڵگەڕابوون. عەلی ئەفەنییش بە ترس و لەرزەوە، لە بنەوە ئاگای لە هەموو جووڵە و هەڵسوکەوتێکی مەحموود ببوو. ئەو کابرایە چ دەکا؟ ئەو بنیادەمە کە دنیای بەسەر یەکدا دابوو ودین و ئیمانی نەمابوو، یان دەبوو لە جانەوەرێکی دڕندە یان بە پیاوێکی ژیر و زانا. ئەو داماوی و تووڕەییە جگە لەوە شتێکی مامناوەندی لێ دەرنەدەچوو.

دەترسا. وەك سەگیش پەشیمان بوو، لەوەی لەبەرچاوی مەحموود پەردەی لەسەر نهێنیی دنیا و بنیادەمەکان لادابوو. چونکە مەحموود ئیتر لە داخان هەر جینگڵی دەدا. خۆی دەخواردەوە و هەڵدەچوو و شێت دەبوو. هاوژوورەکانی دەیانگوت، شەوێ هەتا بەیانی چاو لێك نانێ و یەك پشوو دەناڵێنێ و بۆ ساتێکیش کە خەو دەیباتەوە، بە نەڕنەڕە لە خەو رادەپەڕێ.

بەیانییەکیان کە دەرگای بەندەکان تازە کرابوونەوە، بەندی دەستیان کردبوو بە پیاسەکردن لە حەوشەی بەندیخانەکەدا. مەحموودیش بە هەژاوییەوە و زۆر خێرا، لە نێوان دوو دیوارەکەی حەوشەکەدا دەهات و دەچوو. دەهات و دەچوو و دەموچاوی لە ژانێکی تاڵەوە دەگۆڕدرا بۆ شادی و سەرسووڕمان و هیوا و بێهیوایی. سات بە سات دەگۆڕدرا. لە نەکاو یەك سەر بەرەو لای عەلی ئەفەنی چوو. عەلی رەنگی بە روخسارەوە نەما، بەڵام دانی بە جەرگی خۆیدا گرت. مەحموود هات و دەستی ئەوی گرت و ماچی کرد. هەموو بەندییەکان لە حەوشە راوەستابوو و سەیری ئەو دیمەنە دوورە باوەڕەیان دەکرد.

"ئێمە ئینسان نین... هەر کامێکمان دڕندەیەکین. تەمەندرێژ بی کاکە عەلی. یاخوا هەر بژیی کاکە عەلی. نۆکەرتم. بە قوربانت بم، بە قوربانی رێبازەکەت بم. ئەگەر هەزار گیانم هەبوایە، هەر هەزارەکەیم بە قوربانی خۆت و رێبازەکەت دەکرد. ببوورە کاکە عەلی. ئەمن دەڵێی ئێستا لە دایك بووم. ئەوەندە پاکژم... ئەو مەحموود ئیتر مرد."

عەلی ئەفەنی نەیدەزانی چ بکا. نەیدەزانی چ بڵێ. پێ بکەنێ یان بگری؟ دەکوڵی. "ئەتۆ چاوت کردمەوە. ئەتۆ بەهەشتت پێ بەخشیم. لەمەودوا یەکەم دوژمنی من دەروێشە. ئاغاکانن. هەر بژی کاکە، تەمەندرێژ بی براله."

عەلی چاوی پڕ بوو لە ئاو. دیار بوو بە گیان و دڵ مەحموودی خۆش دەوێ. هەر دوو دەستی یوسفی گرتبوو و دەیلاواندەوەو دەیگوت:"بەڵێ، بابی تۆ پیاوێکی ئاوا بوو. پیاوی پیاوان. ئاخ مەحموود."

یوسف وردە وردە رەنگی بە رووەوە نەدەما. عەلی زانیی تێك چووە، دەستی بەردا و گوتی:"بڵێ، بڵێ کوڕم. بڵێ گیانەکەم، بڵێم بزانم چیت لێ قەوماوە، دەردت چییە؟"

یوسف متەقی لێوە نەهات. تاوێك سەری داخست. دوایی لە نەکاو دەرپەڕی و وەك شێتان لە دووکانەکە دەرپەڕییە دەرێ و لە پشت دارەکانەوە لە چاوان ون بوو.

"جەیهان، جەیهان."

خۆی خستە نێو پاسەکەوە. لە پشت شۆفێرەکەوە دانیشت.

جەیهان و ئەدەنە، دیوارێکی تاریك و بۆشاییەکی بێ بن و نەناسراو بوون. کاتێ هەستی دەکرد تاوێکی دیکە لە شارۆچکە دەچێتە دەرێ، جارێ دەترسا و جارێ دڵی خۆش دەبوو. کەفوکولێکی سەیر دایگرتبوو. تاوێك دواتر پاسەکە دەکەوتە رێ و دوای بڕینی رێگە پڕ لە خاك و خۆڵەکان، پاش چەند سەعاتێك دەگەیشتە جەیهان... دواتریش ئەدەنە....

لە پێشدا سەرکەوتن و بەزینێك لە ناخیدا... خۆی وەك باڵندەیەك هاتە پێش چاو. ئەگەر زوو، خێرا، هەر ئێستا کەوتبایەتە رێ... ئای ی ی ، ئەی بۆ ناڕوا؟ خۆ پڕیش بووە. قژە پڕەکەی پشتەسەری شۆفێرەکە، پشتەملە چەور و چیرەکەی، یەخەی چاکەتەکەی... ئەو بۆگەنەی لە شۆفێرەکەی دەهات، تێکی دەدا. ئەگەر رۆیبا، ئەو سەگبابە ئەگەر رۆیبا...

سەری لەگێژەوە دەهات و بەرچاوی رەش دادەگەڕا. بە زەحمەت لە پاسەکەدا خۆی رادەگرت. هەر دەیویست خۆی فڕێ بداتە دەرێ. ئاااخ، ئەگەر پاسەکە رۆیبا... ئیتر خۆی پێ راناگیرێ. سەیری دەرەوە و دار ئەقاقییەکانی مەیدانەکە و گوندییە پێخاوسەکانی دەکرد و هەوڵی دەدا سەری خۆی بەوانەوە بخافڵێنێ و لەو جەنگەیەدا چاوی بە دووکانەکەی عەلی ئەفەنی دەکەوتەوە و خێرا رووی وەردەگێڕایەوە. پەیتاپەیتا لەدڵی خۆیدا دەیگوت:"بیبڕەوە، بیبڕەوە، بیبڕەوە سەگباب، دەی بڕۆ دەی."

دەتگوت بە زنجیری نادیار و نەبەدییەوە بەو شارەیانەوە بەستووەتەوە... رایدەکێشێ، رایدەکێشێ، بەری نادا.... ئەوبەریش ترسناك. وەك مەرگ، وەك نەمان، تاریکیی بێ بڕانەوە...

شاگرد شۆفێرەکە هەرای کرد:"تەواو، ئیتر رۆیشتین."

مەکینەکەی کەوتە کار و پاسەکە بە تڕەتڕ لە شەقامە پڕ تاسەکەوە بەرەو پردەکە خلۆر بۆوە.

رزگاری ببوو. دەتگوت بارێکی قورسی لەسەر شانی لاچووە، دڵی خۆش بوو.

پیرەژنێك لە تەنیشتییەوە دانیشتبوو. پیرەژنە، لە حالێکدا مڵچەی لە دەمە بێ ددانەکەی دێنا، هەر ئاوڕی دەدایەوە سەیری یوسفی دەکرد. هیچ ترووسکاییەك لە چاوە کزەکانیدا نەبوو. دەتگوت پارچەیەکی چرچولۆچ و گلۆڵەکراوە. ئەو پیرەژنە لە هەڵۆیەکی مردارەوەبوو دەچوو. هەڵۆیەکی مردووی خستبێیانەتە سەر کۆپەنکە پەینێك. یوسف بە تووڕەییەوە پشتی تێ کرد. پیرەژنەش کە گومانی لە سەیرکردنەکانی کردبوو، پشتی تێ کرد.

کابرایەکی تاوبردووی سەرزل، کە سەروقژ و ردێنە رەش و ئاڵۆزەکەی و مووی گرژی برۆکانی وەك درکی ژیژك قیت ببوونەوە، لەبەر دەرگاکەوە دانیشتبوو کچۆڵەیەکی بیست ساڵانەی لاواز و زەردەڵەش، کە دەتگوت منداڵێکی دە ساڵانەیە، سەری بە سینگییەوە نابوو. کچەکە رەنگی بە رووەوە نەبوو و لەگەڵ هەر راتلەکانێکی سەیارەکەدا سەری لەسەر سینگی پیاوەکە بەرز و نزم دەبۆوە. کابرا زۆر شێواو بوو. چاکەتەکەی شڕ و پانتۆڵەکەی کۆن و ئارەقاوی و پینەکراو و تۆزاوی... یانی بەو سەروپۆتراکەوە دەچنە جەیهان؟ دەموچاوە زەرد و تێك شکاوەکەی کچۆڵەکە ئارەقەی کردبوو.... بۆ کوێ دەچن؟ کوڕە سەیری ئەو شڕ و شپرزە! چاوە ئاگرینەکانی لە کابرا بڕیبوو و چاوی لێ هەڵنەدەگرت. کابرا بەو سەیرکردنەی تووڕە ببوو و نەیدەزانی چ بکا و چاوی بەنێو پاسەکەدا دەگێڕا. جاریٚ لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی دەکرد، جاریٚ لە شۆفێر و جاریٚ لە رێبوارەکان... جار بە جاریش شێوەی دانیشتنەکەی دەگۆڕی...

یوسفیش چەندی پتر بیری لە کابرا دەکردەوە، تووڕەتر دەبوو.

ئەو هەتیوە سەگبابەی لە پشتییەوە دانیشتووە، جاشکی کەرە، بۆینباغیشی بەستووە، هیچ لێشی نایە. ملی دەڵێی کلکە تەشییە. بۆینباخی لە کراسی بیٚ ملیوان بەستووە. هەر دەڵێی هەوساری ملی کەرێیە. هەر چاویشی لە پێشەوەیە. ئەهـ، لەسەر ئەو چاکەتە کاڵەوەبووەیەوە دەتوانی پەراسووی بژمێری. گەمژە. ئەتۆ چکارت بە جەیهانە. سۆلیشی لە پێیە... میکرۆبینە.

بە بێزارییەوە سەری وەرسووڕاندەوە. مراوییەکەی هاتە پێش چاوی کە سەری بڕدرابوو بەڵام تەواو لیٚ نەکرابۆوە. چاوی وەك مەڕمەڕی شووشە دەرپەڕیبوون و سەرە کەسکەکەی قوڕاوی ببوو. لە دواوەی پاسەکە جووتێك کاریلەی بینی. چەند قازێکیش لە قەفەزێکدا کردبوویانە قیڕە قیڕ. مراوی بە مردوویی زۆر گوناحە...

کابرایەکی رێکپۆشی ردێن تاشراو و سەر ڕووتاوەی گووپنی کوڵمە گەش لە تەنیشت شۆفێرەکەوە دانیشتبوو. ئوتووی پانتۆڵەکەی ئەوەندە شەق بوو، کاڵەکی دەبڕی و کراسێکی سپی لەبەر و گۆرەویی سوور و کەوشی رەش وێرنی لە پیٚ، زۆر گران و سەنگین دیار بوو و پیاو هەستی دەکرد لە بەرد داتاشراوە. کە ئاوڕی دەدایەوە، زۆر لەسەرخۆ و وەك ئەوەی بە زەحمەت بتوانیٚ ئاوڕ بداتەوە، سەیری دواوەی دەکرد. جا بۆنی شیریشی لێوە دەهات. پێشتە ئارەقکردووەکەی بۆنی شیری ترشاوی لیٚ هەڵدەستا و یوسف خەریك بوو بڕشێتەوە.

پاسەکە لە پردەکە پەڕییەوە و راوەستا. نزیکەی بیست ژن دەبوون، هەموو قوڕاوی، سوار بوون. پاسەکە نەدەکەوتە رێ.

"ئەوە چاوەڕێی چیین؟"

شۆفێرەکە ئاوڕی دایەوە و بە چاوە ریپۆقاوییەکانییەوە، چاوێکی تەوساویی لێ کرد و نێوچاوانی تێك نا و سەری وەرسووڕاندەوە.

پاسەکە بۆنێکی ناخۆشی لێوە دەهات. دڵی تێکەڵ دەهات...

پاسەکە کەوتە رێ. کاریلەکان کردیانە کارەکاڕ. کوڕێکی کاڵ لە پشتییەوە تێی چریکاند. ژنێك گوتی:"وەی لەو دەنگە خۆشەی. خوا داوێتی."

پیاوێك گوتی:"حەسەن لە ئەنکەرەوە، لە ئیدارەی پۆستەوە داوای کراوە."

دەنگی کوڕە مێشکی یوسفی تێکدابوو و شێتی دەکرد. کوڕە وەك جووچکە رەشۆڵە زاری لێك داپچڕیبوو و زمانەبچووکە سوورە پیسەکەی دیاربوو. دەنگێکی هەتا بڵێی ناخۆش. کە دەیچریکاند، دەماری لاملی وا هەڵدەستا، لەوانەبوو بتەقن.

بۆگەن، بۆنی پێ، شیر، ئارەقە، گاز، مریشك، قوڕ، کا، بەنزین و تەپوتۆز، پاسەکەی ئاخنیبوو و یوسف چیی نەمابوو بڕشێتەوە. یەکێکیش مراوییەکی کوژراوە...

پاسەکەی هەرجارێکی رادەوەستا و ئەو لەبەر بێ ئۆقرەیی بە دەنگی بەرز لە شۆفێرەکەی دەپرسی:"باشە چاوەڕێی چین؟"

شۆفێرەکەش دیسان ئاوڕی دەدایەوە و با چاوە پڕ لە نەفرەت و بەکەم زانینەکانییەوە سەیرێکی دەکرد و بەبێ ئەوەی قسەیەك بکات، سەری وەردەسووڕاندەوە.

وردە وردە پشووی سوار دەبوو و دڵی تێکەڵ دەهات و لەگەڵ هەر راوەستانێکی پاسەکەدا هاواری لێ بەرز دەبۆوە و بەزۆر خۆی رادەگرت کە لەو پاسە پیسە خۆی فڕێ نەداتە خوارێ...

لە رووبەڕوویانەوە پاسێك دەرکەوت، لەبەر تۆز و خۆڵ دیار نەبوو. کەس لە تۆزەکەدا پاسەکەی نەدی. نێو پاسەکە وا پڕ بوو لە تۆز و خۆڵ، چاو چاوی نەدی. شۆفێرەکە و کابرا رێکپۆشەکە و کچە نەخۆشە و پیاوە شڕ و شپرزەکەش نوقمی تۆز و خۆڵ بوون.

پاسەکە لەو تۆز و خۆڵەدا دیسان راوەستا. ئیتر پشووی دەرنەدەهات. کابرایەك کە لە دۆڵپا دەچوو، دابەزی. دەنگی"ئەرێ چاوەڕێی چیین؟"ی ئەو لە دەنگی پیاوێکی سەرەمەرگ دەچوو کە داوای یارمەتی بکا.

گرێیەکی گەورە و زبر کەوتبووە قوڕگییەوە... شۆفێرەکە ئاوڕی دایەوە. یوسف لە تۆزەکەدا دەموچاوی نەناسییەوە، بەڵام زانیی چۆنی سەیری کردووە.

پاسەکە کەوتەوە رێ. پاس و عارەبانە و تەراکتۆر رووبەڕوویان دەهاتن و وەك برووسکە بە تەنیشتیاندا تێدەپەڕین و هەورێکی تۆز و خۆڵی خنێکنەریان لەپاش خۆیانەوە بەجێ دەهێشت. بۆنی زۆنگ و لیتاوی گەنمەجاڕەکانیش هاتە سەر بۆنەکانی دیکەی نێو پاسەکە و ئەوەندەی دیکە بۆنەکان خەستتر بوونەوە. هەناسە دەرنەدەهات.

دیسان پاسەکە رایگرت. دەنگی:"ئەرێ ێ ێ!!!" و ئیتر هاوارێك بوو. هاوارێکی تەنگاو و یارمەتیخواز.

دەنگی لێکدان هات. هەموو شتێك بەسەریەکدا کەوت و لە تۆزەکەدا ون بوو. ئەوەندە روون بۆوە کە یەکێك لە یەکێکی دیکە دەدا. دوای هێرشی تۆزوخۆڵەکە، پاسەکە و شۆفێر و کچە نەخۆشە و پیرەژنە و قاز و کاریلە و ژنە قۆڕاوییەکانی بەرەو لای خۆی... بە سەهوو نەچووبوو، هەر هەمووان، هەمووان پەلاماریان دابوو.

کە سەیری کرد لە نێوەندی جادەکەیە. پاسەکە دوور کەوتبۆوە، لە نێو هەوری تۆز و خۆڵەکەدا دەڕۆیشت. زاری خوێناوی ببوو. هەستایە سەر پێ. ئەژنۆی لەدوو نەدەهاتن. گووپێك خوێنی تف کردەوە سەر رێگا پڕ لە خۆڵ و خاکەکە. پشتیشی دەیزیڕاند... بەحاڵ هۆشی لەسەرخۆی بوو. تۆزێك وەخۆ دەهاتەوە و دیسان لەخۆ دەچۆوە.

بایەك هەڵیکرد و گەنمەجاڕەکانی داگرت. گەنمەجاڕ کەوتنە خشەخش و کەروێشکەکردن. لە دەم رێییەکە و لەسەر تەپۆڵکەی دەم جۆگەیەك لێی کەوتبوو. دوای ئەوەی چەند جارێك زۆریی لەخۆی کرد، ئاخرییەکەی تەوانیی هەستێ و بکەوێتە رێ. دوای چەند هەنگاوێك، بەرەو لای شاری غاری دا، بەبێ ئەوەی ئاگای لێ بێ، کە نە کڵاوی بەسەرەوە و نە پێڵاوی لە پێدا ماوە.

## ٩٦

بەستێنە لمەکەی خوار پردێ، بە دەوەن و شووڵك و چڵە گەسگەسك و پێنج پەڕ و تاڵێشکە دەتگوت جەنگەڵە. دەوەنە تووترك و گەسگەسك و پێنج پەڕ و نەمامە چنار و تووەکان و زەڵ و جەگەن تێك چڕژابوون و کردبوویانە لێڕ. لە پاناوکە نیوە زۆنگەکەی سەر پردەکەشەوە کە دەوراندەوری داری بی و چنار بوو، پنگەی لێ روا بوو. ئەو پنگەیەی لەو زەوییە لیتەیەدا شین دەبێتەوە، لە باڵای پیاوێك پتر هەڵدەستێ.

گوڵی مۆری پنگەکان پشکووتبوون. لەو پاناوکە گەورە پڕ لە پنگەیەوە هەتا داوێنی تەپۆڵکەکە مۆرێکی درەوشاوە کەروێشکەی دەکرد و عەتری دەپژاند.

رووبارەکە، پنگەجاڕی کردووەتە دووبەش. لێرە کام بۆن خۆشە لەگەڵ بۆنی پنگەدا تێکەڵ دەبێ و بڵاو دەبێتەوە. ئەگەر لە بچیتە بن پردەکە و ئاو بخۆیتەوە، عەتراوییەوە و بڵێی و نەڵێی سەرخۆشت دەکا.

هەرکەس جارێك ئەمسەر و سەری پنگەجاڕەکە ببڕێ، سەری لەگێژەوە دێ. هەرکەس بێرەدا تێپەڕی، بە خۆشبەخت لەقەڵەم دەدرێ. لە بریسکەی چاوی و پێکەنین و هەڵسوکەوتییەوە تێدەگەیت لە دنیایەکی دیکەوە هاتووە. سەروپۆتراك و جلوبەرگی کەسێکی بەو پنگەجاڕەدا تێپەڕیبێ، بۆنی پنگە دەگرێ و ئەو بۆن و بەرامەیەش هەتا ناخی ئێسقانەکان رۆدەچێ، بۆیە کابرا رۆژێ: حەفتەیەك هەر بۆنی پنگەی لێ دێ.

لەو شوێنەی لم و پنگەکە دەگەیشتنەوە یەك، کەلاکی ئەسپێك کەوتبوو. سەگەلی شارۆچکە بەو کەلاکە لەتوپەتە وەربببوون. هەر ئەسپ و گوێدرێژ و مانگایەکی لە شاری مردارەوە بێ، لێرەی فڕێ دەدەن. ئێرە خوانی بەردەوامی سەگەلە. هەر بۆیە سەر زیخ و لمەکە پڕە لە ئێسك و پرووسك. لەوێ کاژەڵاکی ئەسپێك، سەلکی شاخداری گایەك...

ئێسك و پرووسك... کۆنە، نوێ، سپی سپی، کەوڵ نەکراو، خوێناوی، نیوەی وەبن لم کەوتووە... ئێسك و پرووسکی دە، پانزە ساڵان...

پنگەجاڕەکە، کە لە دوورەوە دەڵێی دەریاچەیەکە و کەوتووەتە نێوان چیاکانەوە و مۆر دەچێتەوە، بەدەم بایەکەوە کەروێشکە دەدکات. بۆنێکی سەرگێژکەر و گەرم لە پنگەجاڕەکەوە هەڵدەستێ. کەلاکی ئەسپەکە بۆگەنی دێ. بۆگەنی کەلاك و پنگە تێکەڵ دەبن.

ئاسمانەکە ساو و سامالە. دەنگی خوڕەی رووبارەکە دێ. گوێدرێژێکیش دوور دوور دەزەڕێنێ. سەگێکی زەردی درێژ و بنێس رانی ئەسپە مردارەکە رادەکێشێ. نە دەتوانێ لەتێکی لێ بپچڕێ و نە بەریشی دەدا. سەگە لاوازەکە پەراسووی دەرپەڕیون و سەگەکانی دیکەش وەك شێتان دێن و دەچن. هەرکامەیان لەتێکی کەلاکەکە دەپچڕن و رادەکەن لەولاوە بە ترسەوە دەیخۆن و ئامبازی یەکتری دەبن و شەڕ دەکەن و...

لە پڕ جگە لەو سەگەی لە رانەکە نووساوە و دەڵێی بە زنجیرێك بەوێیانەوە بەستووەتەوە، لە تەنیشت کەلاکەکە ئیتر سەگی دیکە نابینرێ. سەگەکەلە تۆزێك لەولاترەوە پێك وەربوون. تاوێك دواتر کەلاکەکە لە هورووژمی سەگەلەکەدا نابینرێ. دیسان بە مڕ مڕ لە کەلاکەکە دوور دەکەونەوە و خۆ بە یەکتری دادەن و دەبێتە جەنگی مەغلۆوبە. تاوێك دواتر دیسان لێك دەبنەوە و هەرکامەیان لە لایەکەوە پەلاماری کەلاکەکە دەدەنەوە. نە ئەوان کاریان بە سەگە زەردەکەیە و نە سەگە زەردەکەش گوێی لەوەیە لە دەوروبەری چ دەقەومێ. سەگە زەردەکە دەڵێی پارچەیەکە لە کەلاکەکە. قەپۆز و لاق و کلکی هەموو سەگەکان خوێناوییە. جگە لە سەگە زەردەکە، سەگێکی دیکە نابینی، خوێناوی و بەشێوەیەکی قێزەون قوڕاوی نەبووبێ.

ئەو کەلاکە زۆری پێناچێ و تا رۆژئاوا جگە لە ئێسکە تۆزێك خوێناوییەکانی هیچی لێ نامێنێتەوە. لەو کاتەدا، ئەو سەگانەی کەلاکەکە و یەکتریان هەڵدەدڕی، کلکیان لە گەلۆزیان ناوە و ماندوو شەکەت و خوێناوی و گوێشۆڕ هەر کامەیان بەرەو لایەك دەڕۆن. یەکێکیان سەری بردووەتە نێو لاشیپانەی قوڕاویی کادێنێکەوە و وەردەکەوێ. یەکێکی دیکە قوژبنێك دەدۆزێتەوە و یەکێك منداڵان پێی رادەبوێرن و یەکی تر بە قەپۆزی خوێناوییەوە دەگەڕێتەوە ماڵەوەیان بۆ ئەوەی خاوەنەکەی سەولەیەکی بداتێ. سەولەی گەرم لە گۆشتی کەلاکەکە خۆشترە. سەگەکە دوای ئەوەی سەولەکەی خوارد، لە گۆشەیەك وەردەکەوێ.

حەپەحەپ و وەڕینی سەگەل، بۆنی کەلاك، قێزون... بۆنێك کە لە پنگەجاڕەکەوە دێ، هەڵفڕینی مۆرایی، شینێکی مەیلەو سەوز... لافاوێکی تیشك... ئاوێك کە دەڵێی تیشکە و شۆلاوگەی بەستووە.

ئەحمەدە بێکەس و کارەکە، نە خۆی دەیگوت لە کوێوە هاتووە و خەڵکی کوێیە، نە کەسیش دەیتوانی ئەو نهێنییەی لە زاری دەرکێشێ. کە تازە هاتبووە ئەو گوندە، جلوبەرگێکی جوان و ڕێکی لەبەردا بوو. دەیانگوت، پارەیەکی زۆریشی پێ بووە. هەموو ڕۆژێ ردێنی وەك بەری مەلاژن لووس دەکرد[1]. پێلاوەکانی بۆیاغ دەکرد و کراسێکی خاوێنی لەبەر دەکرد. ئەودەم ئەحمەدە، لەماڵی "عەمارجەکان" دەمایەوە و دەستیشی دەگرتن. ئەحمەدە، گەنجێکی باریکەڵە بوو. دەموچاوی خەفەتباری هەبوو. هەر بیست ساڵان دیار بوو. دەنگێکی زیندوو و خۆمانەی هەبوو. کە قسەی دەکرد، دەتگوت، بابت، دایکت، براکەت، یان کەسێکی زۆر نزیکت دەتدوێنێ. بەڵام زۆر ئەستەم بوو بیهێنیتە قسە. ئەوەندەی وشترێك ناچار بکەیت لە خەرەندێك باز بدات.

کە زاری لێك نابا، بە حەفتە و مانگ لێکی نەدەکردەوە و چاوە بەمۆڵەق وەستاو و درشت و سلۆکەکان لە ژێللا دەهاتن و زوو زوو دەیپتاندن. ئەوەندە سلۆك و ڕەوەك بوو، پەقت لێ کردبایە، زەندەقی دەچوو. بەردەوام شێواو و بێ ئۆقرە بوو. دەتگوت لە سەر ئاگر دانیشتووە.

گوندییەکان زۆر بەسەرهاتیان لە ئەحمەدە دەگێڕایەوە. دیانگوت، خوێندەوارێك بووە و لێی قەوماوە و پەنای هێناوەتە ئەو گوندە. هەمووان بە جۆرێك سەیریان دەکرد. هەندێك بە سووکیان دەزانی و هەندێکیش لێی دەسڵەمینەوە و خۆیان لێ نەدەدا و بە هەڵسوکەوت و بە زمانیش پێیان دەگوت متمانەیان پێی نییە. ئەو لەو گوندەدا نامۆ و بێگانە بوو. بێگانە بوونەوەرێکی دیکەیە. شتێکی جیا لە بنیادەمێکی ئاسایی. بێگانە، ئەوەندەی باوە، هەر ئەوەندەی ڕێز لێ دەگیردرێ. یان زۆر زۆری ڕێز دەگرن یان لە بێزارییان لەبەری هەڵدێن. هەڵسوکەوتی ئەحمەدە نە ئاوا بوو، نە وەکی دی. خەڵکەکە بە گشتی یەکسەر بێ متمانە بوون پێی. بەو جۆرە ئەو گەنجە لەو نێوەدا سەرگەردان مابۆوە. گوندی، هەم بەزەییان پێیدا دەهاتەوە و هەمیش لێی دەپرینگانەوە. ئەوان دەیانگوت:"خودا غەریبی بەرێتەوە."

هەر باسی غوربەت دەکرێ گوندی و خەڵکی ئەو دەوروبەرە دەکەونەوە بیر ئەحەمەدە. گەلێ گۆرانییشیان بە سەر ئەحمەدە و غوربەتدا هەڵگوت.

---

[1]. فارسییەکەی هەر دەڵێ جوان دەیتاشی. ئەوەی دامناوە لەلای ئێمە بووەتە ئیدیۆم و پێم حەیف بوو بزر بێت.

غوربەت مەرگە و نابەڵەدییەکی سامناك و تاریك و کپ و بێدەنگ و بێبڕانەوە و بێ گەڕانەوەیە. هەموو گۆڕانییەکانی غوربەت خەمناکن. ئاخۆ پێت وایە ئەوەی تووشی غوربەت دەبێ، دەگەڕێتەوە؟ هەرچی چوبووە وڵاتی غەریبان و غوربەتان، چووبووە یەمەن و لە وڵاتی بێ گژ و گیا و وشك و بێ ئاو دوورەدەستدا نیشتەجێ ببوو، ئیتر نەیتوانیبوو بگەڕێتەوە. قەفقاز، عەرەبستان، هەموو مەرگەکانی دنیا، لێڕەوار و بەندیخانە و زوڵم و سووکایەتی پێکردن و سەرشکستەیی و ژان و ئازار و دڵەڕاوکێ و هەژاری و نەدارییەکان، هەموو غوربەتن... غوربەتی زاڵم.

"خودا غەریبی بەرێتەوە."

غوربەت، سەرەتا و کۆتایی هەموو ژان و بەڵاکانە. سەرەتا و کۆتایی نادیاری و تاریکی و تەنیایی و مردن، بەر لەوەی یەکێك بێ و لە کاتی ئاویلکەداندا دەستەکانت بگرێتە نێو دەستی خۆیەوە.

"خودا غەریبی بەرێتەوە."

ئەو رۆژەی نەخۆش دەکەوێ، دەبێ بڵێی رۆژێك بە گیانەڵڵاوەی. کەس نییە چۆڕە ئاوێکت بە دەمەوە بکا.

"خودا غەریبی بەرێتەوە."

پاسەکە دەڕوا. لە پردەکە پەڕییەوە. هەر لە پردەکە پەڕینەوە، شۆفێر سەیارەکەی راگرت. ئەو شۆفێرانە هەر هەموویان زۆڵن. خەڵکێکی دیکەشی لە سەربانی پاسەکە سوار کرد. ئەو ژنە چاوکاڵەی کە سوار بوو، بێ فەڕە. دەتوانم گرێو بکەم لەسەر ملم، ئەو پاسە برێك لەو لاترەوە یان هەڵدەێردرێتە نێو شیوەکەوە یان خۆ بە کامیۆن، درەخت یا تەراکتەرێکدا دەدات.

خودا تۆڵە لەو شۆفێرە گڵاوە زەردەڵەیە بکاتەوە کە پیاو بێزی لێی هەڵدەستێ. هەموو موسافیرەکانیشی قێزەونن. بەرازینە، دەموچاویان دەڵێی لاشەی خوێناویی ئەسپەکەیە. هەمووان دەڵێی بەرازن. هەر هەمووان بەدشوومن. ئەو پاسە بەو هەمووە خەڵکە بێ فەڕە چاو کاڵەوە بەڵایەکی بەسەر دێ... چما دەکرێ تووشی بەڵا نەیە؟ هەر ئێستا خۆ بە شتێکدا دەدا. هەموو موسافیرە چاوکاڵەکانیشی دەمرن...

ئەو تەپوتۆزە... کامیۆنەکە وەڕێ کەوت. وەی، وەی ، وەی، خوایە گیان، چەندە خێرا دەڕوا؟ خەریکە هەڵدەفڕێ. دەبێ وریا بن. سەیارەی جۆراوۆر لەو تەپوتۆزەدا دێن و وەك برووسکە تێدەپەڕن. ئێستا خۆ بە شتێکدا دەدا... چاوەکان هەموو لە ترسان لە ژێڵڵا هاتبوون.

کەس ڕەنگی بە ڕووەوە نەماوە. خەریکە دڵیان بتەقێ... ستۆپێکی سامناك... هەمووان بەسەر یەکدا دەکەن... دیسان چەند کەسێکی قوڕاوی سوار دەبن. هەمووان دەیانەوێ لەو پاسە دابەزن. بەڵام دەرگاکان داخراون.

"دەرگا بکەوە. شۆفێری گەواد، بی ی یکەوە."

پاسەکە کەوتە ڕێ و تاوێك دواتر فڕی. خەریکە هەڵدەفڕێ. دارەکان وەك دێوەزمەی ئەفسانەیی ڕا دەکەن و سەرەنخوون دەبن. ئەو پاسە شەق و شڕەی چاخی دەقیانووس، بەرگەی ئەو خێراییەی ناگرێ. هەمووان ئەوە دەزانن و لەجێی خۆیان وشك بوون و متەقیان لێوە نایە. هێندەی پێ ناچێ هەموو تێدا دەچن. زەق و زیندوو دەچنە قوڕگی مەرگەوە. هەمووان بۆ قوڕگی مەرگ...

شۆفێرە مل باریکە زەردەڵەکە، چاوی دەڵێی چاوی بۆقن... دەبێ گەروی بگری و بیگوشی، بیگوشی و بیگوشی. دەبێ بەرۆکی هەموو ئەوانە بگری وا زەق و زیندوو بەرەو مەرگ هەنگاو دەنێن. قوڕگیان بگری و بیانخنکێنی.

جادەش پڕ لە ترۆمبێلی جۆراوجۆر. هەمووشیان وەك فڕۆکە... خۆ بە یەکتریدا دەدەن. لە ترسان کەس پشووی دەرنایە. سەگبابینە، با دەرنەیە... لەو لاوە، لە دوورەوە، کامیونێکی زەبەلاحن هێندەی پێنج، نەخێر دە کامیۆن... خۆ بەیەکتریدا دەدەن... دەست و پێ و شان و پیل.. لەتوپەت... شەلاڵی خوێن. دوای نیشتنەوەی تەپوتۆزەکە، سەر و چاو و دەست و جەستە لەتوکوت لە نێو خوێندا، لە تۆزخۆڵ و خوێندا، قوڕاوی و خوێناوی... ناڵین و نووزانەوە و هاوار... نزیك دەبێتەوە... نزیك... ئێستا، هەر ئێستا خۆ لێك دەدەن...

موسافیر هەموو هەستان. هەموو دەستیان بەرەو ملی شۆفێر کشا. هاوار، نەڕە و زریکە... پاسەکە تێپەڕی.

یوسف دوای ئەوەی نەیزانی چ قەوما، کە وەخۆ هاتەوە، دیتی پاسەکە دوور دوور لە تەپوتۆزەکەدا وەك با دەڕۆیشت. تاوێك دواتر لە چاوان ون بوو. یوسف زاری وشك ببوو. هەموو گیانی دەیزریکاند. پاسەکە بێ و نەبێ تا ئێستا خۆی لە شتێك دابوو. یان لەبەر یەك چوبوو و هەلاهەلا ببوو. ئەو پاسە بەرگەی ئەو خێراییە ناگرێ. خۆ بەسەر پێوە ڕانەدەگرت. لە دەم جۆگەی مەرەزەجاڕەکە دانیشت. ئاوێکی گەرم و زەرد بە جۆگەکەدا دەڕۆیشت و بۆنێکی ناخۆش لە مەرەزەجاڕەکەوە دەهات، کونە تفنی دەبرژاندەوە.

خۆشحاڵ بوو. سەرەڕای ئەوەی هەموو گیانی دەیزریکاند و خوێنی لێ دەچۆڕا، دیسان دڵی خۆش بوو. هەستا و وەك لە مەرگێکی مسۆگەر نەجاتی بووبێ، بە دڵێکی خۆشەوە بەرەو شارۆچکەکە غاری دا.

گۆڕستانێك... سێ داری بێ لك و گەڵا و رووتەڵە لە گۆڕستانەکەدا. گۆڕێکی تازە هەڵکەنراو... گژ و گیا و دڕ و دەوەن هەموو وڵاتی داپۆشیبوو. تەرمی ئەحمەدە لە کفنێکی بۆر و چرچ و لۆچەوە پێچراو... چاوەکانی لە دەموچاوە درێژ و چرژاوەکەیدا زەق زەق...

دەنگی لێکدرانێکی سامناك و زیق وەخۆی هێناوە. بەڵام کەسی نەدی. هیچ ترۆمبێلێکیش بە جادەکەدا رانەدەبرد.

گەرم بوو. لە رێگەکەوە لای دایە پەرێز و گەنمەجاڕان. شەڵاڵی ئارەقە و بە هانکەهانك یەك پشوو رای دەکرد. رای دەکرد بۆ ئەوەی تا زووە بگاتەوە شارۆچکە.

## ٩٧

لە هەر قوژبنێکی ئەو ماڵە چۆڵ و کۆنەوە، هەر ساتەی بە سەدان خێو و جنۆکە دەردەپەڕین و دەیانخنکاند.

تاقە ئاواتێکی لەدڵدا بوو، ئەویش بگەڕێتەوە ئاوایی و چاوی بە دایکی بکەوێتەوە. بەڵام چۆن لای دایکی سەری هەڵێنابا؟ چما دایکی پێی نەدەگوت:"تف لەو روویەت... ئەوەش خوشکەزاری هەڵۆ رەشەکان، شێرەکانی هۆردووی چوارەم!"

بەسەریدا نەدەشریخاند:"بڕۆ، بڕۆ لەبەر چاوم ون بە."

لە بەر چاوی خەڵکی حەیا و شەرەفی نەدەبرد؟

ئەو شەوە هەتا بەیانی ئەو مۆتەکە و دۆڵپایانەی لەسەر شانی بوون. هەزاران، ملۆێنان بنیادەمی رووت و قووت، درێژ و کەڵەگەت، تاوبردوو، وەك لافاو بە شەقامی ئەو شارەدا کە خانووی گەورە گەورەی بوو، دەخولانەوە و هەر کامەشیان چوار چوکڵەیەکی ئاسنی سوورەوەکراو بەدەستەوە... وەك لافاو بەسەریدا تێپەڕین و پێیان لەسەر دەستی راستەی دادەنا و لە رووبارێکی گەورەی خوێن و لیتەدا بزر دەبوون.

پشووی دەرنەدەهات. ئاوەێکی سوور و قوڕاوی بەسەریدا تێدەپەڕی و سڕی دەکرد. هەتا بەیانی لە بن ئاوەکە خۆی مات کرد و موچڕکەی پێدا هات و هەڵلەرزی و نەیتوانی هەناسە بکێشێ. لەرزی و رەق بۆوە. دوایی ئاوەکە رایدا و لەگەڵ خۆی بردییە لێڕەوارەکە. لە لکە دارێك گیرساوە... هەرای کرد، هەرای کرد و دەنگی لە قوڕگیدا قەتیس مایەوە. لە نەکاو دارستانەکە گرمەیەکی سامناکی لێ هەستا و تەقییەوە. لوورەیەکی ترسناك هەستا و دەنگ و هەرای ئەو ئاژەڵانەی لە دارستانەکە دەردەپەڕین، زریکە و زیقە و قاووقیژی جڕو جانەوەر و ئەو دارانەی دەسووتان، تێکەڵ دەبوون. ئاگرەکە وەك لافاو دەڕۆیشت و ئەو بەبێ ئەوەی پشوویەکی بێتەوە بەر، هەرای دەکرد. زەوی و ئاسمان و چیا پڕ بەفرەکانی دەوروبەر لە بڵێسەدا نوقم ببوون.

بلێسەکە دەکشا و لە سەر ڕێی خۆی شار و گوند و بنیادەم و جرِوجانەوەر و ئاوەکانی دەماشتەوە.

هەموو گیانی قرچەقرچ دەسووتا... پاسەکان بەسەر ئەو لافاوی ئاگرەوە... ئەو پاسانەی لەسەر شەپۆلی لافاوی ئاگرەکە و لەنێو تۆز وخۆڵدا خۆیان لێك دەدا. دەست و سەلکە سەر و لاق و لەتەر و شان و پیل و رانی لەتوپەت، کە لە پاسەکانەوە هەڵدەڕژان... لەتوپەت، خوێناوی... سەگی کەڵپەدرێژی زل زل و خوێناوی... حەپە و وەڕنی ملوێنان سەگ... زەوی و ئاسمانێکی دوور و درێژ...

شڵپ بەربۆوە نێو لافاوی ئاگرەکە و سووتا. ماوەیەك هەر پشووی دەرنەهات. شەلاڵی ئارەقە بوو.

نەیزانی کەنگێ خەوت و کەی لەخەوێ هەستا.

کێردەکان، ئاسنگەرەکان...

هەتا نیوەڕۆ هەموو یەك بە یەك ژوورەکان گەڕا. چیی لە ماڵەکەدا بوو دەستی لێدا و سەروبنی کرد. ئەو "تەپڵە"ی لە باپیرەگەورەی بەگەوە بەمیرات مابۆوە، کێردێکی لەبەر نا. سێ دۆدانەش لە تەنیشت تەپڵەکەوە هەڵواسرابوون. نیوەی مووەکانی دۆدانەیەکیشی داڕنی. وەك ئەوەی شتێکی متفەڕکی خراپ کردبێ، تێك چوو. ئارەقەیەکی ساردی لێ نیشت و موچڕکەیەك لە گیانی گەڕا. دەمی دەتگوت قوزەڵقورتە. پەیتا پەیتا هەناسەی دەکێشا و پشووی سوار دەبوو و دەخنکایەوە.

رای کردە بازاڕ. بۆ ئەوەی ڕێی نەکەوێتە بەردەم دووکانەکەی عەلی ئەفەنی، بە پشت بازاڕەکەدا سووڕایەوە و گەیشتە وێستگەکە. دەنگێك وەك شەپلاخەیەك بەر روومەتی کەوت:" "جەیهان، جەیهان."

مێرمنداڵێکی وردیلە و تاوبردوو هەرای دەکرد."جەیهان، جەیهان."

یوسف وردە وردە و بە ترسەوە بەرو لای پاسەکە راکێش دەبوو و دوای چەند هەنگاوێك رادەوەستا. دەتگوت بە پەتێکی نەبەدی لە پشتەوە بەستوویانەتەوە و بەری نادەن و بە پەتێکی دیکەش بەرەو پێشەوەی دەکێشن. هەموو تینی دایە خۆی وبەرەو پاسەکە رای کرد، بەلاّم پاسەکە زووتر کەوتە رێ. بەدوایدا هەتا سەر پردەکە غاریدا. بەلاّم تۆزی نەشکاند و ناچار گەڕایەوە شارۆچکەکە.

پاسی دووەم...

"جەیهان، جەیهان."

ئەویان پاسێکی سوور و تازە بوو. هەتا کەوتە رێ، سێ جار سوار بوو و دابەزییەوە. تا ویستی سوار بێتەوە، ئیتر وەڕێ کەوتبوو. بەدوای ئەویشدا تا سەر پردەکە غاری دا،و دیسان گەڕایەوە.

هەتا ئێوارێ، گەلێ پاس لە وێستگەکەوە کەوتنە رێ. لە دوا ساتەکاندا ئەوەندە سوار دەبوو و دادەبەزییەوە ترمبێلەکانی لەکیس دەچوو و هەتا سەر پردەکە و لەوانەیە پتر لە کیلۆمەترێك بەدوویاندا غاری دەدا، بەڵام دەست لە گونان درێژتر دەگەڕایەوە. ئاخرییەکەی ماندوو و شەکەت، لە سەر کورسییەکی قاوەخانەی دەم وێستگەکە دانیشت. ئیتر تینی تێدا نەبوو لەجێی خۆی هەستێ.

پاسێکی خاوێن و شۆراو لەبەردەم راوەستابوو و ژن و منداڵ و پیر و لاو سواری دەبوون. کە وەخۆ هاتەوە، دیتی لە پاسەکەدا دانیشتووە و پاسەکە وەك بای شەماڵ لە شارۆچکە دەچێتە دەرێ. زۆر بێ ئۆقرە بوو. دەستێکی زل دڵی گرتبوو و دەیگوشی. نێو پاسەکەش زەنازەنایەك بوو سەگ ساحێبی خۆی نەدەناسییەوە.

دەستی کرد بە هەرا. یەك پشوو هەرای دەکرد و دەیگوت:"کاکی شۆفێر، کاکی شۆفێر رایگرە، ئەو گووە راگرە."

بەڵام نە شۆفێر گوێی لە دەنگی دەبوو نە کەسی تر. دەنگەدەنگی نێو پاسەکە دامرکایەوە و هەمووان دایانە قاقای پێکەنین. دەتریقانەوە... بەچی پێدەکەنین؟ پێدەکەنین و نەیاندەبڕییەوە.

گوتی بلێی بە من پێ بکەنن؟ هەر بەراستی بەمن پێدەکەنن؟ سەیر پێدەکەنن ها؟... باشە چۆن...

ئەوە... کوڕە چاو ئەو گاندەرە زاری چۆن داپچڕیوە. ئەو پیرە ئەسپێونە چڵمنە زەدەڵەیە. سەیری ئەو ردێنە کۆسە قێزەونەی؟ وەختە لە پێکەنینان بتەقێ... ئەو هەتیوە ریوەڵە پیسە. هەردەڵێی توڵەیە. ئێستا لە پێکەنینان دەمرێ. هەر دەڵێی چاوی بە قوزی داکی کەوتووە. تف لەو روویەت. تف لە رووت گلاو. سەی گلاو.

پاسەکە لە تۆز وخۆڵدا، لەو تۆز و خۆڵە سوورەی نەیدەهێشت تاوەکە دەرکەوێ، وەك لە تاریکاییدا بێ، دەڕۆیشت. موسافیرەکان بە چەپڵەلێدان دەستیان بەرەو ئەو رادەداشت و زمانیان دەرهێنابوو. زەمانی هەمووان سوور و خوێناوی.

هەوا نییە... دەنگی شریخەی شکانە لە پاسەکەدا. موسافیر و ئەوی تێیدا بوو، لە خۆڵ و خاك گەوزیو... هەرکەس و هەر شتێکی تێیدابوو... لە دوورەوە، ئەو ئاوەی لە تۆز و خۆڵەکەدا سوور دەچۆوە، لەبەری دەڕۆیشت. کە وەخۆی هاتەوە، هەستی کرد، تۆز و خۆڵەکە وردە وردە دادەمرکێتەوە. دەنگێکی لە هیچ لایەکەوە نایە. لە تۆزە سوورەکەدا دەڵێی، خۆر گیراوە و هەموو وڵات تاریکە.

هەتا ئەژنۆی لە خۆڵ ڕۆچووە. دەیەوێ هەستێ و ناتوانێ. تاریکاییەك لەو بەری تۆزە سوورەکەوە. تارمایی پاسەکە دەبینێ. ئیتر پاسەکە لەبەرچاوی ون دەبێ.

تاوێك بە گاگۆڵکێ دەڕوا. هەتا ئانیشکی لە خۆڵەکە ڕۆچووە. خاکی گەرم دەیسووتێنێ. خۆی دەگەیەنێتە سەر تەپۆڵکەی دەم جۆگەی مەرەزەجاڕەکە و دادەنیشێ. بۆنی تفتی زۆنگاو قوڕ و لیتە، قامیشی رزیو و گژ و گیا و شینکە نێو لووتی دێنێتە خورووی. لە نێو تۆز و خۆڵە سووربا‌وەکەوە سەوزاییەکی تۆخ و بێ پەڵە دەبینرێ. شارۆچکەکە لە دوورەوە، لەولاترەوە، دەڵێی تەپۆڵکەیەکە و لێرەوارێکی چڕ دایپۆشیوە. هەتاو دەدرەوشێتەوە. شارۆچکە بە شووشەی روون و سەربانە بریقەدارە کاڵەوەبووەکانی و دووکەڵ و هاڵاوەوە، لە نێوان تۆزە سووربا‌وەکەوە و لە دوورەوە دەڵێی شاری پەرییانە. بۆنی تۆزە سووربا‌وەکە چووەتە لووت و دەمییەوە. دەست و پێی خوێنیان لێ دێ. هەموو گیانی دێشێ.

سەرەگێژەکەی چاك دەبێتەوە. ڕەشکە و پێشکەی بەرچاوی دەڕوێنەوە و لەنەکاو دەبینێ هەستاوەتە سەر پێ و بەهەموو تینی خۆی بەرەو شارۆچکە رادەکا. بە نێو هەوری تۆزە سوورەکەدا را دەکا. چیی دەکا ناتوانێ لەو هەورە بێتە دەرێ. ڕێگەکە چۆڵ چۆڵە. نەکەس دێ و نە کەسیش دەڕوا...

## ٩٨

تاو هەموو وڵاتی داگرتبوو. تیشکی تاو هەموو گیانی گژ و گیا و دەوەن و دارەکانی داگرتووە. رووناکایی وەك هەواو و ئاو، نێوان گەڵا و کەلێنی پێست و توێکڵ و کون و کەلێن و بن بەرد و قەڵشتەکانی عەرز و هەموو وڵاتی تەنیوە. ئەمڕۆ سروشت بەو رووناکییە بێوێنەیەوە، تەنانەت ئەو شوێنانەشی دەشووشتەوە کە لەمێژ ساڵ بوو، تیشکیان وێ نەکەوتبوو. رووناکاییەکە وەها بوو، بێت و بەچاوی دڵ سەیرت کردبایە، دەشتە کاکی بە کاکییەکەی ئەو دیوی چیاکانی تۆرووسیشت دەبینی. هەموو شتێك لەبەر ئەو تیشکە روون و زوڵاڵ ببۆوە.

تاوەکە، لە تەرکی ئاوی رووبارەکەی دابوو. وردە چەوی سپیی تەرکی ئاوەکە، ماسی و قرژاڵ و کیسەڵ تیکشیان بەرکەوتبوو. ئەوەی بە سەریاندا دەڕۆیشت، نەك ئاو، بەڵکو لافاوی تیشك بوو. وردە ژەوی سپی، شین، زەرد، قەوزە و چنار و گەسگەسك و سپیدار و بیی دەم ئاوەکە دەگوت هەموو لە بلوورن.

ژەنگەسوورەی سەر ئەو لکەدارەی داهاتبووەوە بەسەر ئاوەکەدا، دەمێك بوو، جووڵەی لەخۆی بڕیبوو و سێبەرەکەی دەتگوت سێبەری باڵندەیەکی گەورەیە کەوتووەتە سەر ئاوە روونەکە. سێبەری تەرکی ئاوەکە، تێکەڵ دەبوو و جارێ باڵێکی و جارێ سەری و جارێکیش لاقەکانی لێ دەکردەوە. جارێ باڵی درێژ دەبۆوە و جارێ سەری... سێبەرەکەی ببووە بوونەوەرێکی سەیر و سەمەرە. لە باڵندە دەچێ، لە ژەنگەسوورەیەکی گەورە، لە سەگ، لە ماسی و لە ئەسپ و جاری واشە لە هیچ شتێ ناچێ. جار جاریش بەدەم ئاوەکەدا دەڕوا و بزر دەبێ. لە نەکاو دەبینی، بووەتە پەڵەیەکی رەش و کەوتووەتە تەرکی ئاوەکە و لە سەر وردە چەوێکی سپی لە پەڵەیەك دەچێ. جار نە جارێکیش رەنگی دەگۆڕێ. جارێك کاڵ دەبێتەوە و

نابینریٚ و دەمێك رەش رەش و جارێکی دیکە روون دەبێتەوە و جاری واش هەیە قاوەیی و هەندێ جاریش کەسك دەچێتەوە.

پۆلە ماسییەك بە بریسکەبریسکە پەیتاپەیتا بە بن ئاوەکەدا تێدەپەڕن. سێبەری ژەنگەسوورەکە لە پڕ دەکەوێتە سەر پشتی ماسییەکە و لە چاوترووکانێکدا لەگەڵیدا دەخزێ و دەڕوا و ئەوجار دیسان گەڕێتەوە سەر وردە چەوەکان و لەسەر جێی خۆی بەجێ دەمێنێ. سێبەری چڵە دارەکەش لە نێو ئاوەکەدا لەبەر یەك دەکشێتەوە و کورت دەبێتەوە و تێك دەشکێ و دەبێتە هەزار پارچە و ئەوجار پارچەکان وێك دەکەونەوە. ژەنگەسوورە هەڵدەفڕێ و دیسان دێتەوە سەر چڵووکی لکەدارەکە و لە سەر جێیەکەی خۆی دەنیشێتەوە. وردە شەپۆل و بریسکانەوەی بازنەکانی ئەو وردە چەوانەی خۆیان بە هەزار و یەك پرشنگەوە دەدرەوشێنەوە، لەبەر یەك دەکشێتەوە. ئەو بریسکانەوە بازنەییانە لەسەر شاخۆکە سەوزەکەی ژەنگەسوورەکە و گەڵای بییەکەش سەما دەکەن و جارێ دیار و دەمێ ون دەبنەوە.

چاوی ژەنگەسوورەکە درشتن، لەوانەیە لەسەریشی زلتر بن و وا زەق بوونەتەوە هەر دەڵێی چاوی خۆی نین. ئەو چاوانە هەر کامەیان دەڵێی ساچمەیەکی زیوین، مرواریییەك، ئەڵماسێك بە هەزاران رەنگەوە... باڵەکانی لێك کراونەوە... لە رەشاییەکی شەپۆلداردا، بە دەماری رەشەوە. سەری مووە رەشەکانی سەر پشتی دەبریسکێنەوە. نێوقەدی باریك باریکە. ئەوەندە باریکە هەر دەڵێی ئێستا دەپەڕێ. سێ هێڵی باریکی سووری بریقەدار بەسەر کلکیدا هاتووە و مووی قاوەیی مەیلەو زەردی لەسەرە. سەری چزووەکەی دەلەرێتەوە و دەجووڵێ. لاقەکانی توند توند بە کلکی گەڵاکەوە نووساندووە، هەر دەڵێی ئیتر لێی نابێتەوە. ژەنگەسوورە جار نەجارێ دروێشە درێژەکەی دەردێنێ و دیسان دەیخاتەوە زاری. هەر دەڵێی چێژ لەو دەرکێشانەی وەردەگرێ، کە لەگەڵ هەر دەرکێشانێکی بەحاستەم باڵی دەبزێوێ.

"چیی دەبێ با ببێ."

باڵی لێك دەکاتەوە. درەوشانەوەو روونییەکەیان کەم دەبێتەوە و رەنگ دەگۆڕن و وەك باڵی پەپوولەیان لێ دێ. تاوێك دواتر کە باڵەکان لێك دەبنەوە، دیسان روون دەبنەوە و دەدرەوشێنەوە و پزیسکیان لێ دەبێتەوە...

شنەبایەك هەڵی کرد. لکەکە نەرم نەرم جوولا. بەڵام ژەنگەسوورەکە هەڵنەفڕی. هەر ئەوەندە باڵی چەپەی تۆزێك شۆڕ بۆوە و قیتی کردەوە.

شتێکی وەك سێبەری هەورێکی سپی بەسەر ئاوەکەدا تێپەڕ. ژەنگەسوورەی مەیلەو رەش و زەرد و بریسکەدار، کە بریسکەی کەسیکی پۆلاییینی لێ هەڵدەستا، بوو بە گلۆڵەیەکی بچووکی قاوەیی. ئاڵقە بلوورینەکانی سەر پشت و کلکی تار بوون. کە سێبەرەکە تێپەڕی، وەك خۆی لێ هاتەوە.

ژەنگەسوورەکە، پەیتا پەیتا چاوە زلە رەنگاورەنگەکانی هەڵگلۆفی. دەتگوت قاچی راستەی ماندوو بووە، قاچی چەپەی خستە کار. باڵەکانی نەرم نەرم دەبزووتن. لە پڕ ورووژا و کەوتە وزەوز. وزەوزەکەی جار بە جار توندتر دەبوو.

"چی دەبێ با ببێ.

بە سەدان وردە شەپۆل بەرەو پێشەوە دەخوشین و لەسەر زیخ و لمەکە هەڵدەگەڕانەوە. گەڵا بەرێکیان لەسەر زیخ و بەرێکی دیکەیان لە ئاوەکەدا دەلەرییەوە. بە سەدان نەرمە تیشك لە ئاوەکەوە گەڕابوونەوە و کەوتبوونە سەر لك و پۆ و گەڵا و گژ و گیای کەنارەکە.

باڵی ژەنگەسوورەکە لە بەر لێکدران نەدەبینرا. وزەوزەکەی نەدەبڕایەوە.

"چی دەبێ با ببێ."

ژەنگەسوورەکە، باڵ و لاق و چاو و سەر و درویشە و جەسەی یەکسەر ورووژابوو و وزە وزی بوو. وەك شێتان، تووڕە... ئەوە بۆ وای لێ هاتووە؟ جار بە جار شێتتر دەبێ.

ئەوانە ژەنگەسوورەن. سوور سوور. ئاڵقەی سەر پشتیان و مووە گرژەکانیان لە رۆژە ناخۆشەکاندا رەش رەشن.

ئێستا گلۆڵەیەك پرزەپرزە و لەرزۆك. شاخۆکەی بن پێیانیشی دلەرزنەوە. داری بن ئاوەکە دەلێیی ئاوەکە تێکەڵ دەدات و قوڕاوی دەکات.

ئەو ژەنگەسوورەیە، تۆزێك لە پەنجەی ئەسپێ کوژە بچووکترە. لە هەموو زەردەواڵەیەك دڕندەترە. چەند دانەیەکی ئاوا بە بنیادەمەوە بدەن، تازە ناژی. زۆر وا هەبووە، بە منداڵێکیانەوە داوەو کوشتوویانە.

ژەنگەسوورەی ئاڵقەسوور و بریسکەدار... کەپرێك لە بێستانەکەدا... بڕکەی شووتی لەسەر عەرز خۆی راکێشاوە... شووتی و کاڵەك بە بڕکەوە... شووتیی کەسك و بەڵەك کەوتووەتە سەر گڵە رەشەکە. عەرزەکە وا سوور بووەتەوە، نەك ناتوانی پێی لەسەر دانێی، تەنانەت ناوێری سەری پەنجەشی پێدا بێنی...

کەپری بێستان، بن و دەوروبەری پڕە لە توێکڵی شووتی و کاڵەك و لەتە شووتی و کاڵەکی بێتام. بن هەر کەپرێك هەزاران ژەنگەسوورەی لێیە. ژەنگەسوورە لەسەر توێکڵی شووتییەکان نیشتوون. بەهەزاران ژەنگەسوورە، کە باڵیان بریسکەی کەسکی پۆڵاییینیان لێ دەبێتەوە و وەك برووسکە ئامبازی توێکڵەکان دەبن و هەڵدەفڕنەوە. جار هەیە ژەنگەسوورەیەك درۆیشەکەی لە توێکڵە شووتییە رۆدەکا و لە بەیانییەوە تا ئێواری جووڵە ناکا. ئەوجار درۆیشەی دەردەکێشێ و خۆی لەبەر یەك دەکێشێتەوە و دوور دەکەوێتەوە و لەولاوە دەنیشێتەوەو بە لاقەکانی تاوێك سەر و باڵی دادەماڵێ و ئەوجار لە پڕ وەك فیشەکێك دەردەپەڕێ و دوور دەکەوێتەوە.

بەیانیان و نیوەڕۆیانیش دوای گەرمداهاتنی هەوا، بۆنی شووتی و شیرینییەکی توند هەڵدەستێ و لە قرچەی گەرمادا، توێکڵی شووتی و شووتیی فڕێدراو ئەوەندەیان ژەنگەسوورە و زەردەواڵە لێ دەنیشێ، دیار نامێنن.

"چی دەبێ با ببێ."

ئەو ژەنگە سوورەیە شێت بووە. باڵی وا لێك دەدا، چاو نایبینێ. ئەو لکەی لەسەری نیشتووە، با دایهێناوەتەوە و چیی نەماوە بگاتە ئاوەکە. ژەنگەسوورەش لە سەر ئاوەکە، بەبێ ئەوەی بتوانێ باڵی تەڕبووی دەرکێشێ، نوقم دەبێ. بەڵام گوێی لێ نییە. وزەوزەکەی نیشانەی تووڕەییەکی بێ بڕانەوەیە.

ژەنگەسوورە بۆ ئەوەی نابن تێیان هەڵکێڵی. ئەوانە لە هەموو بوونەوەری دنیا تووڕەترن. کە منداڵ دار لە کونەکانیان دەوەژێنن، دەیکەنە قیامەتێك ئەوسەری دیار نەبێ. ژەنگەسوورەی ورووژاو، سەر لە دووی منداڵان دەنێن و هەتا پێیانەوە نەدەن، لێیان نابنەوە.

ئاوی کولێیو بە ژەنگەسوورەی سەر توێکڵە شووتییەکان دادەکەن، بەڵام ئەوان هەر نامرن. ئەگەر بە باڵی سووتاویش نەتوانن بفڕن، ماوەیەك زۆر لە نێو توێکڵەکاندا دێن و دەچن.

ژەنگەسوورە بگرە و لە نێوقەدە باریکەکەیەوە بیپسێنە. ئاواش چزووەکەی خێرا دەردێنێ بە دوژمنەکەیەوە بدات. لەتەکەی دیکەشی کە سەری پێوەیە، وەك هیچ نەقەومابێ، وا هەڵدەفڕێ و دەڕوا، وەك بە لاقوونەکەی بڵێ، بەبێ تۆش دەکرێ بژیم. ژەنگەسوورە بەبێ جەستەی، پارسەنگی نامێنێ و گێژ دەبێ. چاوی ئەو ژەنگەسوورانە، پڕ دەبێت لە خەمێکی بەژانتر لە خەمی ئەو بنیادەمانەی هەر دوو لاقیان لەدەست دەدەن.

"چی دەبێ با ببێ."

ئاخر سەگبابی هیچ و پووچ، بۆ تۆ فڕۆکەی؟ ئەوە چ هەڵڵایەکە دروستت کردووە؟

ئاوەکە شەپۆل دەدا... ماسی سەریان لە دووی یەك ناوە. ئەوی لەهەمووان گەورەتر لە پێشەوەیە و ماسییە وردەکانیش بە تووڕەییەوە بەدوویەوەن. بێت و بیگرن، لێی دەقەومێ. ئاوەکە دەکوڵێ. چیی نەماوە ببێتە هەڵم. ژەنگەسوورەکەش لەبەر وزەوز و تووڕیی نابینرێ... لکەدارەکە دەجوولێ. ژەنگەسوورەکە هەڵفڕی و وەك بریسکە بەرەو خوار لوور بوو و دیسان هەستاوە. وەك بڵێسەیەکی ئاگر لە ئاوەکەوە بەرەو هەواو دیسان بەرەو ئاوەکە دێتەوە. لە دەوری لکە دارەکەدا بازنەی ئاگرین دەکێشێ.

"چی دەبێ با ببێ."

ژەنگە سوورەکە بەرەو هەموو لا دەچێ. داوی سووری ئاگرین لە دارە بییەکەوە بەرەو رەگەکەی و بەرەو خاك و لە خاکەوە بەرەو لك و پۆیەکان، کورت و درێژ دەبێتەوە. داوی باریکی ئاگرین وەك داوی جاڵجاڵۆکە دەتەنێتەوە. پەلامار دەدا و خۆ بە دار و بەرد و عەرزیدا دەکێشێ و ئاخری لە جووڵە دەکەوێ و پێت وایە مردووە. بەڵام تاوێك دواتر دەبینی، سوورایییەکی ئاگرینی شێتانە، رەش، کەس، زیوین و... دەکاتەوە و دەخولێتەوە.

دوای تاوێك، کە ژەنگەسوورەکە دیار نەمابوو، دووی دیکەی لەگەڵ خۆیدا هێنا. ئێستا سێ دانە، وەك سێ بڵێسەی سوور بە بریسکەبریسك بەدەوری یەکتریدا دەسووڕێن و وزە وزەکەیان هەموو دەنگەکانی دیکەی کپ کردووە. ژەنگەسوورە بە کێشانی ئاڵقە و بازنەی گەورە و بچووك دێن و دەچن.

ماوەیەك هەر وزەوزیان بیسترا و ئیتر لە چاو ون بوون.

ئێستا لە کەف و کوڵ کەوتوون و وردەوردە دێن و دەنیشنەوە و هەڵدەستنەوە.

دوو ژەنگەسوورەکە لە ئاسمانێ بوونە یەك. تاوێك جووت بوون و وەك هەڵواسرابێن مانەوە. باڵ و لاق و جەستەیان نەدەجووڵان. ئەوجار لەسەرخۆ نیشتنەوە و لێك جویێ بوونەوە. تاوێك بە دەوری یەکتریدا هاتن و بۆنیان بە یەکەوە کرد. ژەنگەسوورەی سێهەم لە داخان هەر جارەی پەلاماری یەکێکیانی دەدا... تێك ئاڵان و ئەوجار هەردووکیان هەڵفڕین و بەرەو سەر هەڵکشان و لە شینایی ئاسمانێدا بوونە دوو خاڵی بریقەدار وەك سەری دەرزی. دوای ئەوە لەچاوان ون بوون. ژەنگەسوورەی سێهەم بە وزەوزەوە هەر وا بەسەر ئەو لکە بییەی بەسەر ئاوەکەدا کشابوو، دەهات و دەچوو. دێ و وا بۆن بە لکەدارەکەوە دەکا دەڵێ دەیەوێ بنیشێتەوە و رێك لەو کاتەدا هەڵدەکشێتەوە و بەرەوسەر و هەروا هەڵدەکشێ و دێتەوەخوار.

"چ دەبێ با ببێ."

ژەنگەسوورەکە ئاخرییەکەی دێتەوە و لەسەر چلۆوکی لکی دارەکە، لە کوێ بوو، لەوێ دەنیشێتەوە. وزەوزی باڵی دادەمرکێتەوە. وردە وردە دەکرێ باڵی ببینی... لە باڵەفڕکێ کەوت. باڵی لە پێشدا رەق راوەستان و ئەوجار لەبەر یەك کشانەوە و شۆڕ بوونەوە.

ژەنگەسوورەی شەکەت، وەنەوزی دەدا.

با، وەك بێشکە لکی دارەکە رادەژێنێ. هەوا هێشتا زۆر گەرم نەبووە. ژەنگەسوورەکە خاو بووەتەوە. هەموو گیانی نوقمی چێژی خاوبوونەوە و هێمنی. بایەکی گەرم، هەڵیکرد و گەڵا و گیای راژاند. تاوێك دواتر توندی کرد. ئەو لکەی ژەنگەسوورەکەی لەسەر هەڵنیشتبوو، بەرەو باکوور چەمییەوە و تیژ گەڕایەوە جێی خۆی. گەرمە بایەکە جار بە جار بەتەوژمتر دەبێ و لکەکەش خێراتر رادەژێ. ژەنگەسوورەکە لە نەکاو رێك بەرەو ئاسمان هەڵفڕی و لەو سەرە، دەستی کرد بە خولانەوە. چەندی پتر دەخولاوە، ئاڵقە سوورەکە گەورەتر و سوورایییەکەی جوانتر و تۆختر دەردەکەوت. ئەو خولانەوەیە هەر بەردەوام بوو، تا کۆمەڵێك باڵندە بە قاوقیژ پەیدا بوون. کە باڵندەکان زۆر دوور بەسەر سەریدا تێدەپەڕین، وەك مەڕمەڕێکی شووشە لەگەڵ ئەو چڵەدارەی لەسەری هەڵنیشتبوو، چووە نێو ئاوەکە. چڵەکە گەڕایەوە جێی خۆی و ژەنگەسوورەکە بەسەر ئاوەکەوە مایەوە و لەو کاتەدا گێژەنێکی بەسەردا هات و خولاندییەوە.

"بەخولانەوە و خولانەوە، بەخولانەوە و خولانەوە... بەخولانەوە و خولانەوە...."

لە گێژاوەکە هاتە دەرێ و لە حاڵێکدا بڵقاوەکانی بەجێ دەهێشت، لەوێ دوور کەوتەوە.

سێبەرەکەی پێنج شەش هێندەی خۆی دەبوو و کەوتبووە تەختی ئاوەکەوە. ژەنگەسوورە، باڵی تەڕببوون، بۆیە پەلەقاژەی بوو چۆن خۆی نەجات بدا. وزەوزی بوو. ئاوەکەی لێك دەدا و دەخولایەوە و بەهیچ جۆرێ نەیدەتوانی باڵە تەڕ و قورسەکانی لە ئاوەکە دەربێنێ و هەڵفڕێ.

ژەنگەسوورە، ماوەیەکی زۆر، هەتا بن پردەکە هەر هەوڵی دا. دیار بوو تینی لێ بڕاوە، لەسەر ئاوەکە کەوت. کە دەکەوتە گێژەنە بچووکەکانەوە، دەخولایەوە. لە سەر تەنیشتی راستەی کەوتبوو و باڵێکی کەوتبووە بن ئاوەوە و باڵی چەپەی وەك دوخی شمشێر رەق راوەستابوو، بەسەر ئاوەکەوە... سێبەرەکەی جارێ گەورە دەبۆوە و جارێ بچووك. ئاخرییەکەی لە جووڵە کەوت و خۆی دا بەدەست لووزەوی ئاوەکەوە و رۆیشت. بە چەرخ و خول، بە چەرخ و خول...

## ٩٩

جارچی ئەو ماڵە سێ ژوورەی، سەربانەکەی سواڵەتی سوور و دیوی دەرەوەی سپییە، بە دەستی خۆی دروست کرد. ئەو دەمەی دراوی درشتی دەژمارد بۆ کڕینی ئەو باخچەیەی لە پاش هەرمەنییەکان بەجێ مابوو، هەشت سپی چناری بەرز و یازدە هەنار و نۆ هەنجیر و بەهێیەك و بیست و چوار پیرەزەیتوونی تێدابوو.

جارچی رەزەکانی لە دەوری سپی چنارەکان ئالآند. ئەو کەپر و هێچکەی لە دەرگای حەوشەوە تا بەر دەرگای ژووری هەڵبەسترابوو، خۆی هەڵیبەست. هەر خۆیشی بیری ئاوەکەشی لە نێوەڕاستی باخچەکە و لە بن گەورەترین دارهەنار، هەڵکەند، بەبێ ئەوەی رەگی دارەکە زیانی پێ بگا. کەپرێکیشی لەسەر هەڵبەست. هاوینان ئەو دەمەی چرقەی گەرمایە، بن ئەو کەپرەی لە دەرگای حەوشەوە تا بەر دەرگای ژووری هەڵبەستراوە، فێنك فێنکە. سەر بیرە نسار و فێنکەکەی، بۆنی سوورەگوڵ و رەیحان و گوڵی مەخمەری لێ دێ. جارچی نەماوە بۆگوڵ. لە سەر بیرەکەیەوە کە تیشکی خۆر نایگرێ، تا دەرکی ژووری، ساڵ دوازدەی مانگێ، دارەگوڵی عوسمانی، گوڵی رەنگاورەنگ دەگرن و جارچی بەهار و هاوینان، مانگێ لانیکەم جارێك ژن و منداڵەکەی لە دەوری خۆی خڕ دەکاتەوە و سفرە رادەخا و لە خۆشییان دەست دەداتە سازەکەی و کام گۆرانی خۆشە ئەویان دەچڕێ و سەرخۆش دەبێ. پاییزان لەو رەزانەی بە سپی چنار و هێچکەکان هەڵگەڕاون، هێشوو ترێی زەرد زەرد و گەورە شۆڕ دەبنەوە وەختە هێچکەکان بشکێنن. پرتەقاڵی دیکەی لە جۆری هەرەباشی پرتەقاڵ لێ زیادکردبوو. نارنج و لیمۆ و چەند دارزەیتوونی دیکەشی چەقاندبوو. پاش بەربوونی لە زیندانێ، سێ نەمامی زەیتوونی دیکەشی ناشت. کێ چووزانێ بیری لەچی کردووەتەوە و بۆچیی ناشتوون. دارزەیتوون درەنگ بەر دەگرێ. چما جارچی نەیدەزانی؟ دەیزانی. لێم سوورە دەیزانی.

دوای هەر لافاوێك، لێرە و لەوێ کاشیی کۆ دەکردنەوە. ئەو کاشییانەی هێنا و تەختی ڕێڕەوی بن کەپرەکەی، کە سەد و بیست شەقاوێك درێژایی بوو، پێ فەرش کرد. تەختی کەپرەکە پێشانگایەکی ڕەنگ و نەخش و نیگار بوو. وێنەی شێر و ئاسك و کەو و خورما و تاووس لە سەر عەرزەکە بڵاو ببوونەوە و ئەو ئاژەڵانە وەك زیندوو بن، لە حەوشەکەوە دەچوونە نێو ماڵێ و سەر بیرەکە. ڕوخساری خەمین و چاوی خەفەتباری پیاوێکی گەڕاوەی پاڵتۆ سوور و ڕەنگ بزڕکاو، کە لە بن دار خورمایەکی بەرز دانیشتبوو، کزەی لە جەرگی جاڕچی دێنا. ڕەنگدانەوەی ئەو بیرکردنەوانەی لێیان دڵنیا ببووەوە، لە ڕوخساریدا دیار بوو. جاڕچی کە خەفەتێکی دەبوو، دەهات و لە بنەوە سەیرێکی ئەو کابرایەی دەکرد، کە "با" پاڵتۆ ئەرخەوانییەکەی فوو دابوو. بۆخۆشی نەیدەزانی بۆچی سەیری ئەو وێنەیە دەکات، بەڵام ئەو وێنەیە هەندێ شتی تێدا بوو. حاڵەتێکی هەبوو، دەتگوت دەیەوێ هەستێ و بڵێ:"دوێنێ لێرە وەڕەز بووم، ئیتر بەسمە." و بڕوات. ڕوخساری وێنەکە خەفەتبار بوو.

دەیانگوت ئەو وێنانە زۆر کۆنن. جاڕچییش کە دوای هەر بارانێ ئەو کاشی و موزاییکانەی لێرە و لەوێ هەڵدەکەند و دەهێنانەوە ماڵێ، هەر نەیدەزانی ئیی چ سەردەمانێکن. لە پێشدا ئەو پاڵتۆ لەبەرەی دیتبوو. ڕوخسارە خەفەتبارەکەی کەوتبووە بەر دڵی و هێنابوویەوە و لە سەر عەردەکەی دانابوو. وێنەکانی دیکەش لە ساڵەکانی دواتردا و وردە وردە و دوای بارانەکان کۆی کردبوونەوە. ڕۆژێك، کە سەرۆکی مەزن هات و چەند سەعاتان لەو کاشییانە ورد بۆوە کە عەرزەکەی پێ فەرش کردبوون، جا ئەوجار، بۆی دەرکەوت ئەوانە چەندە بەنرخن. زۆر شت سەبارەت بەو کاشییانە فێر بوو و دەیزانی. سەردەمەکەیان و جۆرەکەیان و شێوەیانی لێك دەکردەوە و حەزی لێ بوایە ناوی ئەو کەسەشی دێنا کە دروستی کردبوون.

جاڕچی حەڤدە ساڵانە بوو کە بە تەمبوورەیەکی بچووکەوە، لە گوندێکی خوارووی ئاناوەرزاوە هات. لە ماوەی یەك دوو حەوتوودا، بە سازەکەی و قسەکانی، ناوبانگی لە شارۆچکەدا دەنگی دایەوە. لە مێژ ساڵ بوو، جا لەبەر هەر شتێك بێ، هیچ چەرچی و گۆرانیبێژ و ژەنیارێك ڕێیان نەکەوتبووە ئەو شارۆچکەیە. هاتنی جاڕچی لەو کاتدا، هەم بۆ خۆی باش بوو و هەمیش بۆ شارۆچکەکە. جاڕچی بێکار بوو و ماڵ و منداڵیش بە گۆرانیگوتن بەڕێوە نەدەچوون. خۆ پارەشی لەکەس وەرنەدەگرت بۆ گۆرانیگوتنێ. جا بە ڕێکەوت، هەر لەو ڕۆژانەشدا بوو کە جاڕچییەکەی شارۆچکە مردبوو و کەس نەبوو لەجێی دانێن. ئەوانەی

کەیفیان بە ساز و دەنگی ئەو کابرایە هاتبوو، ئەویان لە جێی جاڕچییەکە دانا. چەند ساڵ دواتر، بە نرخێکی زۆر کەم، باخچەکەی لە قالەکوردە کڕییەوە. ماڵەکەشی شەش ساڵ دواتر لە نێوەندی باخچەکەدا دروست کرد، بیری هەڵکەند و رەز و سپی چنار و کەپر و هێچك و...

کە بابی مرد، چواردە ساڵانە بوو. ساڵێك دواتر دایکیشی مرد. بابی برایەکی سێ ژنەی هەبوو. جاڕچی بڵێی و نەڵێی هانای بۆ برد. زەوی و زاری مامی و براکەی زۆر و بەرێژەو بوون. مامی دوای ئەوەی زەوییەکانی جاڕچییەکەی خستە سەر زەوی و زارەکەی خۆی، بوو بە یەکێك لە هەرە دەوڵەمەندەکانی دەشتێ. مامی و ژنەکانی و منداڵەکانیان، بەڵایەك نەما بەسەر ئەو جاڕچییەی نەهێنن. ئاخرییەکەی گەیشتە ئێسقانی و سازەکەی هەڵگرت و هاتە شارۆچکە.

جاڕچی دوای ئەوەی ماڵی دروست کرد و بوو بە خاوەنی ژن و منداڵ، بۆ ئەستاندنەوەی ماڵ و مڵکەکانی سێ جاران چووە لای مامی و دوو جاریش لێی راسپارد. هەموو جارێ مامەکەی، چاوی لێ سوور دەکردەوە و دەیگوت:"ئەها، یانی ئەتۆ مڵك و ماڵت لای منە، وایە؟"

جا سەری با دەدا و نێوچاوانی تێك دەنا و لەسەری دەڕۆیشت:"ئای ی ی، ئای ی ی، ئای لەوە، ئەتۆ لای من مڵك و ماڵت هەبووە و من نەمزانیوە... سەیرە، سەیرە، شتی وا چۆن دەبێ..."

هەر ئەو وەڵامەشی بە راسپێردەکانی جاڕچی دابۆوە. جاڕچیی داماویش هەر تووك و نەفرەتی لێ دەکرد:"کە خودا لێی هەڵنەگرێ. خودا عەزابی زیاتر بکا. یاخوا خێر و خۆشی لەخۆی نەبینێ. یاخوا لێی نەخوا..."

کە کەوتە بەندیخانەشەوە، مامی هەر لێی نەپرسی.

جاڕچی کە لە بەندیخانە هاتە دەرێ، یەکەم کاری ئەوە بوو، چووە بازاڕێ و جلوبەرگ و پێڵاوی بۆ ژن و منداڵەکەی کڕی. رووکاری دەرەوەی ماڵەکەی نوێ کردەوە و سێ داری زەیتوونی دیکەی لە باخچەکەیدا ناشت. دوای ئەو کارانە دەمانچەکەی لە قەدی دا و راستەوڕێ چووە لای مامی. مامی بە روویەکی گەشەوە بەپیرییەوە چوو. لە بنەوەش لێی دەترسا. لە هەڵسوکەوت و دەموچاوییەوە دیار بوو درۆیان دەکا. چرچ و لۆچی پیرەییەکەی بە دەموچاوییەوە قووڵتر و درێژتر بوونەوە. جار نەجارێك شەپۆلی موچڕکەیەك دەموچاوی پێ تێك دەنا و دەیلەرزاند. دەستی دەلەرزین. لەسەر سفرەکە بەرەوڕووی یەکتری دانیشتن. مامەی، چاوێك کردبووە چوار چاو و سەیری جاڕچیی دەکرد. جاڕچی گەورەتر ببوو و کووڕییەکەی پشتی نەمابوو و بریسکەیەکی توند و چزوودار لەبری سەرکزی و پاڕانەوە لە چاوەکانی گەڕابوو.

قسەی دەکرد. پێدەکەنی و سوعبەتی دەکرد. لە ماڵ و منداڵ و ژن و حاڵ و ئەحواڵی دەپرسی، بەڵام بۆ ساتێکیش چییە چاوی لە دەمانچەکەی هەڵنەدەگرت کە دەسکەکەی دیار بوو.

جاڕچی لەپڕ خۆی قست کردەوە و روخساری گۆڕا و چاوی زەق بوونەوە و ئاگریان پژاند و گوتی:"هاتووم هەقی خۆمت لێ بستێنمەوە مامە."

لەبزێکی تیژ و گورجوبڕی هەبوو. وەك مووسی دەلاك.

"هەر ئێستاشم دەوێ. چیی پارەم لات بووە، دەمدەیەوە و زەوی و زارەکەشم، بەبێ ئەوەی بچینە دادگا و شتی وا، لە بەشی خۆت جویێ دەکەوێ و خێرا دەمدەیەوە."

مامەی، زۆر دەرگای بە قوون کردبۆوە و لە گەڵ زۆرکەسان ملەی کردبوو و هەڵسوکەوتی جۆراوجۆری گەلێ دیتبوون. هەربۆیە دەمودەست دووقڕانییەکەی کەوت و لە جاڕچی تێگەیشت.

"کوڕم، کوڕە شیرنەکەم، هەر ئێستا؟"

"ئێستا."

"دەکاتە چەند؟ چەندت پارە دەوێ؟"

جاڕچی، ئەوەی دەیویست گوتی و قسەی نەکرد. مامی هەستا و بە نێو ژوورەکاندا گەڕا و لەگەڵ کوڕ و ژنەکانی قسەی کرد و دوای ماوەیەك بە شەکەتی و بێهێزی هاتەوە.

"هەستە با پێکەوە بچینە شارۆچکە و لەوێ پارەکەتت بدەمەوە."

هەستان و لە پلیکانەکان چوونە خوارێ. ماڵ و منداڵی مامە، وەك بوونەوەرێکی سەیر و سەمەرە سەیری جاڕچییان دەکرد.

هەموو خەڵکی شارۆچکە دڵیان بەوە خۆش بوو کە جاڕچی توانیبووی پارە و زەوی و زارەکەی لە مامی وەرگرێتەوە. هەمووان دەیانگوت:"هەمووان لە پیاوی زیندانچێشتوو و پیاوکوژ دەترسن. جاڕچی ئیتر جاڕچییەکەی جاران نییە. ئەو داماوەی ملی بەلارەوە دەنا و کاری بە کاری کەس نەبوو... ئەو هەر ئەو شێتەیە وا پاڵەوانێکی وەك ئاسنگەری لە سەر هیچ و خۆڕایی کوشت. مامەی، هەرچی هەیبووە دابوویە و لە ترسان متەقی نەهات."

جاڕچی لە خۆشییان، ئیتر وەك بای شەماڵ بە شارۆچکەدا دەگەڕا و سەری بە هەموو شوێنێکدا دەکرد. دەچووە کارگە دارتاشییەکەی دەم ئاوەکە و لەوێوە دەچووە ئاشی و لە شاشەکەوە بۆ دووکانی زین و جەواڵ درووو... و گوێی لە قسە و جنێوە خەستەکانی "زین"سازەکە هەڵدەخست کە بە ترۆمبێل و ئاغا تازە پێگەیشتووەکان و خەڵکی بێ ئەمەگی

دەدا. وەستا حەمەی عارەبانەچی، سەربردەی بێ برانەوەو نیشتیمانیی بۆ دەگێڕاوە و باسی پارتیزانەکان بەلکان و یاخییەکانی تۆرووس و کۆچەرێتیی بۆ دەکرد و گوێی لە بیرەوەرییەکانی بەندیخانەی ئەویش رادەگرتەوە.

جارچی دوای ئەوەی لە بەندیخانە هاتبووە دەرێ، بۆ تاوێك نەسرەوتبوو. کاری کردبوو و زەحمەتی کێشابوو و تێر بەدڵی خۆی گەڕابوو و خۆرادبووی و تەمموورەی لێ دابوو و نەڕاندبووی و سەردانی دۆست و برادەرانی کردبوو و دڵخۆشیی پیر و پەککەوتە و نەخۆش و نەقوستانانی دابۆوە و لەو ماوەیەشدا سێ جاران سەری لە مستەفا بەگی ئاق یۆللی و جارێکیش سەری لە دەروێش بەگ دابوو. زۆری بەزەیی بە شپرزەیی مستەفا بەگدا هاتبۆوە، کە وەك مۆمیاکراو زەرد هەڵگەڕابوو و لە جێوباندا کەوتبوو و بە دیتنی قەڵافەتی سەرکەوتووانە و شاد و گەشی دەروێش بەگیش زۆر خۆشحاڵ ببوو.

لەو رۆژانەی کۆتاییدا، بێ خەم و خەیاڵ و بێ ترس، بە بازاڕێدا دەسووڕاوە. لە شارۆچکەکەدا، ترێکت کەندبا، دەنگی دەدایەوە و دەیانزانی. بۆ وێنە، یەکەم جار بوو، ئەو لە شاریدا چاوی یوسف کەوت. هەر ئەو بوو زانیی یوسف حاجییە شێتە هەڵدەنێ. هەر ئەویش تێگەیشتبوو ماهیر بەگ مات و شڵەژاو و پەشێوە. شەش وردە تیریشی بەسەر دەرزیلەی بۆینباخەکەی مامۆستا رۆستەم بەگەوە دەیتبوو. کەس ئەو شەش تیرەی نەدەدی. جارچی بەر لەوەی بچێتە بەندیخانەش ئاوا ورد و مووئەنگێو بوو. باڵندەکانیش لە نێو چڵ و لك و پۆی ئەو سپی چنارانەدا کە مێورەکانیان تێ هاڵابوو، هێلانەیان کردبوو. ئەوانەشی تازە دیتبوو. چەند وردە خاڵێکیش بە بناگوێی ژنەکەیەوە بوون، بەڵام تا ئێستا نەیدیتبوون.

تەپڵی سەری سەرۆکی مەزن رووتابۆوە. لە پشتەسەرییەوە شوێنێکی قووڵی تێکەوتبوو. کەس بەوەی نەزانیبوو.

پەپوولە و ژەنگەسوورەی سەر کۆما خۆڵەکان ئەوەندە نزم دەفڕین، دەتگوت بۆن دەکەن.

"زین"سازەکە، بەبێ ئەوەی بیدرکێنێ، نەخشەیەکی بۆ ئاغا و بەگەکان دەکێشا. بەر لەوەی ئەو نەخشەیە لە مێشکی زین سازدا خۆ بگرێ، بە زەینی جارچیدا هاتبوو.

جار هەبوو وا رێدەکەوت، بەر لە تاوهەڵاتێ لە ماڵێ وەدەر دەکەوت و لە پردەکە دەپەڕییەوە و بە دەم رووبارەکەدا بەرەو ژوور هەڵدەکشا و سەیری لووزەوی ئاوەکە و ماسی و کیسەڵ و قرژاڵی نێو ئاوەکەی دەکرد. رەگی کەرنەخۆرە بەنێو ئاوەکەدا بڵاو دەبۆوە. گوڵەکانیان پەمەیی پەمەیی مەیلەوسوور و سپی. دەیانگوت، ژەنگەسوورە لەسەر گوڵی کەرنەخۆرە

نانیشیێ و مێروو لێیان نزیك ناكەوێتەوە. مێروو و ژەنگەسوورەی دەدی و لێیان ورد دەبۆوە. ئاو بە هەزار و یەك شێوە ڕێچكەی خۆیان گرتبووە بەر و تاریكایی بەجۆرێكی دیكە دادەگەڕا. ئەو شوێنە، شوێنێك بوو كە لەوێدا شەو و ڕۆژ دەگەیشتنەوە یەك. هەژێنەر... ئەو هێڵە هەر ڕۆژە و ڕەنگێك دەگریێ. جارچی لەو ڕۆژانەدا سەری لە دنیا و ڕەنگاورەنگییەكەی سووڕ مابوو.

حەوتووەك، هەموو ڕۆژێ بە گردەكەی تەنیشت شارۆچكە هەڵگەڕا. هەڵاڵە و گیاچەقە و دەوەنی مۆرتكە و تووترك لەبەر گوڵ دیار نەبوون. شنەبایەك، شەپۆل شەپۆل بۆن و بەرامەی دڵبزوێنی لەگەڵ خۆی دێنا. لە خوارەوە، چوكووراوا بە رایەڵەی ڕێگاكانییەوە بە ئاقچاسازە مەیلەو تاریكەكەیەوەو بە گوندی دووكەڵاوی و قەڵای ئاناوەرزا و ڕووبارە هەڵماوییەكانییەوە، كە بە بریسكەبریسكێكی سەیر و سەمەرە وەك بڵێی لە سەر دەشتەكەوە و لە دڵی ئاسمانەوە سەرچاوە دەگرن، بەڕێوەن. ڕیز ڕیز سپی چنارە بەرزەكانی، چنار و گرد و شیو و دۆڵەكانی، لە وڵاتێكی خەیاڵی دەچیێ.

جارچییش لە گۆشەیەك لێی كەوتووە و لە نێو بۆنی خاك و هەتاو و گوڵ و بۆنی دار و جڕ و جانەوەردا خۆی لەبەر تاوەكە هەڵخستووە. تام چێژی خاك و ئاو و دار و ئەستێر و ئەو شنەبا عەتراویانەی هەڵدەمشت كە لە چیاكانەوە دەهاتن.

جووڵەیەكی بەحاستەمی مێش و مەگەز و قالۆنچە و مێرووله و ئەو زەردەواڵە و ژەنگەسوورە و مێشەنگوینانەی خۆیان بە نێو گوڵەكاندا دەكرد، نەدەبوارد.

مێرووله حەجەمانەیەكی سوور، سەری هەڵێناوە و لاقە درێژ و باریكەكانی هەر دەڵێی فەنەرن، ڕێك لە نێوەندی بازاڕەكەوە بەسەر بەردەچنەكە لێك و لووسكراوەكەدا دەڕیشت. مێروولەكە خێرا دەڕۆیشت و جار نەجارێكیش ئاوڕێكی دەداوە و لەو كاتەدا رادەوەستا. جارچی بە دوای ئەو مێروولەیەوە بوو كە بەتاقی تەنیێ ئەمسەرەوسەری بازاڕی دەكرد. مێرووله، كە گەیشتە دەم چاوی بن چنارەكە، تاوێك راوەستا و ئیتر ون بوو.

.... چیای دوڵدوڵێش جاریێ ئەرخەوانیی دەنواند و جاریێ مسی. بەیانیان، دەموساتی تاوكەوتنان، بەخۆی و لووتكە تیژ و بۆرە ڕەنگپەڕیوەكەیەوە، وەك هەورێكی بە ئاسمانەوە نووسابیێ و ئەوبەری دیار بیێ، وەك شەپۆلێك لە پشت قەتاری چیا پتر بزركاوەكانەوە، تار و دووكەڵ ئاسا، لەگەڵ ئاسمان تێكەڵ دەبوو و نەرم نەرم دەردەكەوت.

بە غاردان بەرەو ئاشەكە چوو. تاو جار بەجار كزتر دەبوو. بەختەوەری و كەفوكوڵ و شادییەك لە روخساریدا شەپۆلی دەدا. ئەو ئاوەی بە هاشوهوش دەڕژایە سەر پەڕەی چەخەكان

و بڵاو دەبوو، کەفکردوو و دامرکاو دەهاتەوە دەرێ. نمە بارانێك دایکردبوو و بۆن و بەرامەی پنگەکانی تێکەڵ بە بۆنی خاك و ئارد دەکرد.

بە دڕدۆنگییەوە لە بەردەرگای ئاشەکە راوەستا. بای باران، کە جارێ گەرم و جارێ فێنك، جارێ نەرم و جارێ توند بوو، بە بۆنی خاکەوە لە باکوورەوە هەڵیکردبوو...

ئاشەکان، دیتی ئەوە خووساوە و لەبەر دەرگا راوەستاوە. بەبێ ئەوەی تاقە قسەیەك بکا، پیلی گرت و کێشایە ژوورەوە و گوتی:"تەڕ بووی."

ئەو هیچی نەگوت. شەپۆل و شەکەتیی شادییەك لە روخساریدا. تاوێك دواتر بە سرتەیەك گوتی:"ئەو دەنگەدەنگە کپ بکە."

ئاشەوان دەمودەست ئاشەکەی راگرت.

"ئاگرەکەت کردووەتەوە؟ کولیچەکانت خستووەتە سەر پەنگران؟"

"هەموو شتێك ئامادەیە..."

تەمبوورەکەی بە سینگییەوە نووساند و تێی هەڵکرد. چریکەیەك کە جار بە جار پتر هەڵدەکشا و بە دەنگێکی بێوێنە، گۆرانییەکی چڕی کەس نەیبیستبوو.

باڵندە و دار و گوڵ و مەرگ و چارەنووس و گیانلەبەر و ئاوی چەم و رووبار و خاکی بە رێژە و هەور و ئاسمان و هەڵسوکەوتی ئینسان بەرامبەر ئینسان و خراپەی لەخۆڕاییی لەم دنیای فانییەدا، عەشق و ئەقڵ و هەتا و گەرما و عەتر و زوڵم، هەمووی کردنە گۆرانی. چاکە و برایەتی و دۆستایەتیی خستبووە گۆرانییەوەوە و وای دەگوت، دەتگوت هەموو ئاوات و ئارەزووی وەدی هاتوون. پڕ دەبوو لە بەختەوەری و روخساری لەبەر تیشکە کزەکەی چرانەوتییەکە، لە خۆشییان گەش دەبۆوە.

ئەوانەی جاڕچییان لە کاتی نوقمبوونی لە بەحری ساز و گۆرانیدا دیتبایە، بڵێی و نەڵێی لە دڵی خۆیاندا دەیانگوت:"ئەو جاڕچییە چەندە جوانچاك و لەبەردڵان و چاوجوان بووە." ئەوە هیچ بیانوویەکیشیان نەبوو ئاوا بیر بکەنەوە.

ئاشەوانە ردێن سپی و دنیادیدەکەش، تا ئێستا ئەو دەنگە و ئەو گۆرانییانەی لە هیچ کەس و تەنانەت لە جاڕچییەکەش نەبیستبوو. ئەوە نهێنییەکی تێدابوو. بەڵام ئەو نهێنییە چ بوو؟

## ١٠٠

یوسف وردە وردە لە خەوێکی قورس بەخەبەر دەهات و وەخۆ دەهاتەوە و هەوڵی دەدا هەندێ شت، کۆمەڵێك رووداو بێنێتەوە بیر خۆی. چیی هەوڵی دەدا نەیدەتوانی ئەو شتە پەرش و بڵاوانەی لە مێشکیدا مابوونەوە بخاتەوە سەر یەك. نەیدەتوانی ئەوەی لەو ماوەیەدا لەم شارە بەسەری هاتبوو، لێك بداتەوەو لێی تێ بگا، هەر بۆیە سڕ دەبوو و سەری لێ دەشێوا و وەك سەری پێوە نەبێ، بێهیوایانە جینگڵی دەدا.

لەسەر مۆبلی ئەوسەری دیوەخانە گەورەکە کرووشمەی کردبوو و چاوی بڕیبووە زنجیرە چیاکانی بەرامبەری و مێشکی خۆی هەڵدەگوشی و لە شتێك دەگەڕا، بەڵام بۆی جێبەجێ نەدەبوو. سەری هەندێ شوێنی دابوو و تووشی گۆڵمەزان بوو، بەڵام کوێ؟ چی؟

جار نە جارێ تەزووی شادی، بەختەوەری یان لەخۆباییبوونێك لە دڵی دەگەڕا و دیسان دادەمرکایەوە. لەمێژ بوو، هەستی بەختەوەری ئاوا لە ناخیدا نەدرەوشابۆوە. بیری دەکردەوە و لە تاریکاییەکی بێ سنووردا نوقم دەبوو هیچ شتێکی لەبەر چاوی نەدەما. هەر لە زنجیرە چیاکانی رووبەڕوویەوە بگرە ئەو سپی چنارانەی وەك پەردە بەر پەنجەرەکەیان تەنیبوو و ئەو دارەزەیتوونانەی قەدپاڵی گردەکەی ئەو بەریان رازاندبۆوە و سەیوانە بەرزەکانی گەڕەك و بیبەرە سوورە هەڵواسراوەکانی بن سەیوانەکان و ئەو پیرە گوێدرێژانەی گوێیان شۆڕ کردبۆوە و لە گۆڕەپانەکەی لای چەپەوە دەلەوەڕین، چنارەکەی تەنیشت ئاشی کە سەری لە ئاسمانێ دەسوی، جار لەگەڵ جار پتر لەبەر چاوی بزر دەبوون و شادییەکە تاوێك لە رووناکی و بەختەوەریدا نوقمی دەکرد و دەمودەست لێی دوور دەکەوتەوە. باشە بۆ؟ ئەو خۆشییە تیژتێپەڕە لە کوێوە دەهات؟ بێ و نەبێ هۆیەکی هەبوو... مەحاڵە لەخۆڕاوە بێ. جا چونکە نەیدەتوانی هۆیەکی بۆ بدۆزێتەوە، هیوای دەبڕا و سەری لێ دەشێوا. لە نێوان تاریکی و بێهیوایی و ئێش و ژاندا

پەلەقاژەی بوو و بەبێ ئەوەی بزانێ چ دەکا، لەپڕ ئەو هیوایەی کەفوکوڵی دەخستە ناخ و دڵییەوە، ئەو شتەی لە شادی دەچوو، بڵێسەی دەدا.

بەرەبەری عەسرێ، کە ئەو شتەی دۆزییەوە وا بەشوێنییەوە بوو، چیی نەمابوو لە خۆشییان شێت بێ. چیاکانی رووبەڕووی دیت، جوان بوون. گوڵعوزار و دایکی و ئاغاکەی لە ئەستەمبووڵ هاتەوە بیر. هەمووان باش و خۆشەویست و لەبەردڵان بوون. دنیا بەو دارە چڕ و تۆکمە و ئەستوورەکانیەوە و بە سپی چناری گەڵا زیوینییەوە و بە رووبارەکەیەوە کە وەك لافاوێکی تیشك بەسەر بەسەر چەوە سپییەکاندا دەخوشێ و بە گوێدرێژە لەڕ و بنێسەکانی و بە کرمەکانییەوە جوان بوو. وەسمانی ئاسنگەر و عەلی ئەفەنیی عەریزە نووس، پیاوی چاك و دۆست و دڵخۆشکەر بوون.

بەو کەفوکوڵ و هەستەوە کە شتێکی لێ بزر دەبێ و بێت و درەنگ بگاتێ ئەو شتە لەوێ هەڵدەگرن، نوقمی خۆشی و شادی و بەختەوەرییەکی لە رادەبەدەر، بە هەڵەداوان بەرەو بازاڕێ رۆیشت. کە گەیشتە نێو دووکانێ، دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوون و چاوەکانی لە خۆشییان بریسکەیان دەهات. سەیرێکی هەموو دووکانەکەی کرد.

دووکاندار کە لە دوورەوە دیتبووی چووتە نێو دووکانەکەیەوە، بە هەناسەبڕکێ خۆی گەیاندێ و گوتی:"فەرموو کاکە... چیت دەویست؟"

یوسف چەند هەنگاوێك بەنێو دووکانەکەدا گەڕا و ئاخرییەکەی گوتی:"لەو جلوبەرگانەی منداڵانم دەویست... یەکی سێ ساڵان و ئەویتر پێنج ساڵان و یەکێکیشیان شەش ساڵان... هەرسێکیشیان بۆ کوڕن. پارچە قوماشێکیش لەو کەسکە..."

کە سەیری قوماشەکەی دەکرد، لە نێوقەد بۆ خوارەوەی قەڵەو و لێوەکانی گۆشتن و دەموچاوێکی دڵڕفێن و چاوە پڕ لە شەهوەتەکانی دەهاتەوە بەرچاوی و سەری لەگێژەوە دەهات... ئاخ، ئەگەر ئەو بوونەوەرە هیی ئەو نەدەبوو... نەیدەویست بیری لێ بکاتەوە. بەڵام نەشیدەتوانی ئەو خەیاڵە لە زەینی دەربهاوێ. مێردی ئەو ژنە، باوکی ئەو منداڵانە... حەیف نییە ئەو ژنە جوانە، ژنی ئەو سەیە بێ؟"

بەشی سێ کراسی ژنانەی لە قوماشە کەسکەکە کڕی و یەکی دەستێك جلوبەرگیشی بە کڵاوەوە بۆ منداڵەکان کڕی. بە بوخچەیەکی گەورەوە، چووە دووکانی (عومەرەکەچەڵ) بۆ کەلوپەلی یاریی منداڵان. دووکانەکە پڕ بوو لە کەلوپەلی یاریی منداڵانە، هەر یەکەی لە رەنگێك. جەیحون بەگ کامیۆنێکی گەورەی هەبوو. دەروێش بەگ لە ئەستەمبووڵەوە بۆی

هێنابوو. جەیحوون ئەو کامیۆنەی زۆر خۆش دەویست و نەیدەهێشت کەس دەستی بۆ بەرێ. وەختابوو سۆی بێتەوە بۆ یاریکردن بەو کامیۆنە، بەڵام جەیحون بۆ تاقە جارێکیش چییە نەیدابوویە. چەند ساڵان دواتر ئەوکامیۆنەی بە کۆنی لە بن مۆبلی ژووری میوانەکە دۆزیبۆوە، بەڵام تازە سوودی چییە؟ ئیتر کار لە کارێ ترازابوو و یوسف گەورە بوو و لە تەمەنی ئەوەدا نەمابوو یاریی بەو کامیۆنە بکا. بەو حاڵەشەوە ماوەیەك هەر خۆی پێوە خافلاندبوو و تێر بە دڵی خۆی گەمەی پێ کردبوو و ئەو جار بۆ ئەوەی کەس نەیبینێ، وەك بڵێی دیسان بچێتەوە دەستەی و گەمەی پێ بکاتەوە، بەسپایی خستبوویەوە بن مۆبلەکە و پەڵاسێکیشی بەسەردا دابوو.

لە کامیۆنێکی ئاوا گەڕا. کامیۆنێکی وا گەورەی نەدۆزییەوە، بەڵام ئەوانەی دۆزینیشییەوە، بچووك نەبوون. یەکی سوور و یەکی کەسکی هەڵبژارد. دوای ئەوە سێ تۆپیش سەرنجیان راکێشا. لە تەیارە و قەتار و سەتڵ و دەمانچە و تفەنگ و عارەبانە و کەشتی و چیی دەست کەوت، سێ دانەی لێ جوێ کردنەوە و هەمووان خستە نێو توورەکە لایلۆنەکەوە. دوای ئەوەی پارەی دا، هەڵیگرتن و چووە دووکانی شیرینی فرۆشەکە. شیرینی و چوکلیت لە هەموو جۆرێك... بارەکەی ئەوەندە قورس بوو، هەتا گەیشتەوە بەردەرگای ماڵێ، لە ئارەقەدا خووسا.

ئۆقرەی نەبوو. کەی شەودا بێ؟ شەوێ لە تاریکیدا کە ئەوانەیان لەبەر دەرگا دەدۆزییەوە، لە پێشدا سەریان سوور دەما و دوای ئەوە گومانیان بۆ چەند کەسێك دەچوو و لەوانەش بوو لەسەر ناوێك هەڵوەستەیەك بکەن و بڵێن، خۆیەتی. جگە لەو دەبێ کێ بێ؟" یوسفیان هەر بە مێشکیشدا نەدەهات. شتەکانی لەبەر دەرگا دادەنا. وا باشتر بوو لە پەنجەرەوە بیانخاتە ژوورێ؟ ئەگەر لە پەنجەرەوە فڕێی دابانە ژوورەوە، لەوانەبوو بگیرێ و ئەگەر لە دەرەوەشی دانابایەن، لەوانەبوو یەکێك بێ و بیانبا. ئاخری ساغ بۆوە لەسەر ئەوەی لە پەنجەرەوە بیانخاتە ژوورێ. ئەوان، زۆربەی جاران عەسرانە لە ماڵەوە نەبوون و پەنجەرەکەشیان خۆ هەر کراوەیە.

کە بڕیارەکەی دا، دەستی لە بن باڵی نا و دانیشت و چاوی بڕییە چیا بەفراوییەکەی دوڵدوڵ و بێ ئۆقرە چاوەڕوانی شەوداهاتنێ بوو.

حەجمینی نەبوو. ئاخ خۆزگە خۆر ئاوا دەبوو. ئەگەر خۆر ئاوا بوایە.

لە جێی خۆی وا راپەڕی، ئەگەر یەکێك چاوی لێی بوایە، دەیگوت ئەو هەتیوە شێت بووە. دەمودەست توورەکەکەی کردەوە و کامیۆنە سوورەکەی دەرهێنا. کامیۆنەکەی جەیحوونیش سوور بوو. کەلوپەلەکەی دیکەی سواری کامیۆنەکە کرد و لەو دیوەخانە گەورەیەدا بەملاولادا غاری دەدا دەتگوت کارێکی زۆر قورس دەکا. لە حاڵێکدا وەك بارکێشەکان دەموچاوی قیچ و

چیڕ دەکردەوە، ئەو کەلوپەلانەی بەربوونەوە، دەیخستنەوە سەر کامیۆنەکە. جەیحوونیش بەو قەلافەتەوە کامیۆنەکەی خۆی بار دەکرد.

دوای تاوێك، یوسف ماندوو بوو لەوەی کەلوپەلی گەمەکردن لە کامیۆنەکە بار بکا، و بە شوێن شتی دیکەدا گەڕا. دەرگای ژوورەکەی تەنیشتی کردەوە. ئەو ژووره مۆزەخانەی بنەماڵەیی بوو. سێ تووتی، کە عوسمانلی پێشکەشی ساری ئۆغلێی کردبوون، بە دیوارەکەوە و ئالای بەگایەتی لە تەنیشت دەهۆلێکەوە و ئەمر و فەرمانی بەگایەتی دەوری زێڕکفت کرابوو و هەموو دیوارەکەی داگرتبوو. شمشێری دەسك مرواریی سەلاحەدینی ئەیوبی کە ئایەتی قورئانی لێ نووسرابوو و بەگێکی کورد بە دیاری ناردبووی، خەنجەری دەسك عاج و چەند کەوان و تردانی پڕ لە تیری نووك زێڕین... باسکبەند و گورزێك کە دەیانگوت هیی سالتۆن ئاغای باپیرە گەورەی ساری ئۆغلێیەکان بووە. تەشتی مسی و مەنقەلێ و قاوەکولێنی مسی و قاوەکوتێکی سووری چێویی بەنەخش و نیگار بە دەسکێکی ئاسنینەوە... کەوڵە پڵنگ و تاژپلێینگ بەسەر مافوور و بەڕەی رەنگاورەنگەوە... ئەو ژووره لە راستیدا بەشێك بوو لە دنیایەکی رەنگاورەنگ و سیحراوی و کۆن و بێگەڕانەوە. چەرمی تەپڵەکە، مۆرێکی سووری عەشیرەتی ساری ئۆغلێی پێوە درابوو. دەروێش بەگ ئەو مۆرەی لە هەموو جێیەك و پتر لە کەفەلی ئەسپ و سەر شانی گایەکان دەدا. یوسف دەستی برد و وە دەست لە شتێکی پیرز بدات، ئاوا بە پارێزەوە و بە سرکی و تاسەبارانە شمشێرەکەی سەلاحەدینی ئەیوبیی لە دیوارەکە کردەوە. تا ئێستا دەستی بەگ نەبێ، دەستی کەسی وێنەکەوتبوو. کەسیش نەیوێرابوو دەستی بۆ بەرێ. تەنانەت بەگیش نەیدەتوانی دەست لە ئالا و ئەو قورئانە دەستنووسە بدات کە لە سندووقە کۆبەتێگیراوەکە نرابوو. یوسف لە حالێکدا هەموو گیانی مێروولەی دەکرد و مووچڕکەی پێدا دەهات، قورئانەکەشی هەلگرت. ئەوجار خەنجەر و تیر و کەوانەکانی کردە کۆشییەوە و لەوێ چووە دەرێ و هەموویان لە نێوەراستی ژوورەکە رۆکرد. ئەوجار لە حالێکدا وەك بارکێشەکان، لە بن بارستایی و قورساییاندا دەموچاوی قیچ دەکردەوە، بە هانکەهانك و قنە قن سواری کامیۆنەکەی کردن و بە غاردان و هۆڕنلێدان کامیۆنەکەی کێشا.

بن ئەو لکە دارە بییەی لە بانیژەکەوە شۆڕ ببووەوە، وێستگەی شەمەندەفەری ئەدەنە بوو. یوسف وردەواڵەی بەنرخی دێنا و لەوێ هەلێدەڕشتن و لەوێشەوە باری دەکردن و دەیبرد و لە بەردەم ژوورەکە هەلێدەڕشتنەوە.

به نەرمە بزەیەکی بەختەوەرانە، کە روخساری گەش دەکردەوە، لەبن لێوانەوە دەیگوت:"ئەگەر یەکێك ئاگای لێ بێ... بێت و بەگ بمبینێ."

سەری وا خافڵابوو هەر ئاگای لێ نەبوو خۆر ئاوا بووە و شەو داهاتووە. بە شوێن ئەو شمشێرەدا دەگەڕا کە لە وێستگەکەی ئەدەنە بزری کردبوو، لەو کاتەدا تیشکێك بەرەوڕوو لە چاوی دا. سەری هەڵێنا و دیتی تاریك داهاتووە. شتەکانی بردەوە جێی خۆیان و بەپەلەپەل لایلۆنەکەی هەڵگرت و کەلوپەلەکانی خستوە ناوی و خێرا چووە خوارێ و بەرەو گەڕەکەی سەروو بەغاردان ملی نا.

باش بوو نە چرایەك لە ماڵەکە هەڵکرابوو و نە دەنگێك دەهات. پەنجەرەکەش کرابۆوە. ئەو دیارییانەی هێنابوونی، لە پەنجەرەکەوە فڕێی دانە ژوورەوە و دەمودەست گەڕایەوە و رۆیشت و لە پشت دار هەنجیرەکە خۆی مات کرد. لە خۆشییان هەموو گیانی دەلەرزی و وەخت بوو گڕ بگرێ.

هەر گوێی لە خرینگەی کرانەوەی قفڵی دەرگاکە بوو، دەتگوت دڵی لە لێدانێ کەوت. سەری بە پەرژینەکەوە نووساند و گوێی هەڵخست. ژنە بە دەستەکوتە هات و چرای داگیرساند. ئێستا راوەستابوو و سەیری توورەکەکەی دەکرد. ئەوانە چین؟ تاوێك بێدەنگی باڵی بەسەردا کێشا. ژن و منداڵ حەپەسابوون...

لە پڕ هەڵڵا و قریوەی منداڵ بێدەنگییەکەی شکاند. لە قسەکانیان تێنەدەگەیشت. هەڵڵا و هەنگەمەیەك بوو لە ژوورەوە ئەو سەری دیار نەبوو. دەنگەدەنگەکە وەك لە نەکاو ئاسمان قووتی دابێ، بڕایەوە. ئەوجار دەنگی فیقەنە و شمشاڵ و ترۆمپێت هەستا و ترۆمبێل کەوتنە کار. منداڵ جارێ بێدەنگ دەبوون و جارێ ماڵەکەیان وەسەر سەری خۆیان دەگێڕا و دەنگیان بەرز دەبۆوە.

حاجی درەنگ هاتەوە و هەر پێی نایە ژوورێ، بە دەنگێکی سەرسووڕماو گوتی:"ئەوانە چین؟ کێ؟... لە کوێوە؟"

ژنە بەسپایی گوتی:"لە پەنجەرەوە خستوویاننەتە ژوورێ. بڵێی کێ وای کردبێ؟"

دایە قاقای پێکەنین. قاقای دەکێشا و دەیگوت:"بازی پاشایەتی، بازی پاشایەتی. ئەتۆ دەزانی بازی پادشایەتی چییە؟ کاری ئەوە. هیچ شتێکی دی نییە. ئەم رۆژانە بازی پادشایەتی لەسەر شانمان نیشتووەتەوە."

پێدەکەنی و بە پێکەنینەوە دەیگوت:"هیچ نییە ژنەکە. تریێی خۆت بخۆ و مەلێ هیی کام باغە. تۆ کاڵەکخۆری یان بێستانڕن؟ هەر کەسێکە ماڵی ئاوەدان بێ. ئەوەی ئەو هەمووە دیارییەی بۆ ناردووین، بێ و نەبێ دۆستە. ناکرێ دوژمن بێ. دنیا پڕە لە دۆست و برادەری نادیار... ئەمن برادەری گیانی گیانیم زۆرن. ئەگەر هات و دیتت ئەو ماڵە پڕ بووە لە زێڕ و گەوهەر، پێت سەیر نەبێ. حاجی چاکەی بۆ زۆر کەس بووە و گیانی لە مەرگ نەجات داون. ئەتۆ چاکەی خۆت بکە و بەدەم ئاوێیدا بدە، دێتەوە ڕێت."

دیسان پێکەنی و بوورایەوە لە پێکەنینان... ژنەش پێکەنی. منداڵەکانیش وێڕای ئەوان.

یوسف هەروا پاڵی بە دار هەنجیرەکەوە دابوو.

حاجی:"ئەمشەوە وەدەر ناکەوم. برادەرەکانیشم دەڕۆن چاویان دەربێ. منداڵەکان بنوێنە... تۆ، من... تا بەیانی..."

یوسف وەك فیشەکە شێتە لەجێی خۆی دەرپەڕی و خێرا لەوێ دوور کەوتەوە.

حاجی گوێی لە ترپەی پێی ببوو و خۆی گەیاندە پشت پەنجەرەکە، بەڵام هیچی نەدیت. هێشتا مانگ هەڵنەهاتبوو.

# ١٠١

ئەو خاكە بەرپێژەو و بەپیتەی لە زۆنگەكە دەرهێنراوە، لەوانەیە لەوەتەی دنیا دنیایە گاسنی وێنەكەوتبێ و چیی شیلە و بەرەكەتی هەیەتی هەمووی لەخۆیدا هەڵگرتووە و وەك پوورە هەنگێك وایە سەد هەزارساڵ كەس دەستی بۆ هەنگوینەكەی نەبردبێ و شەقڵی نەشكابێ.

تەراكتۆر بە گاسنی گەورەوە بەرەگەیان لەو خاكە تازەیە گرتبوو. خاكی دەست لێنەدراو لەگەڵ گاسنی تەراكتۆرە رەنگاورەنگەكاندا ململانێی مەرگ و ژیانی بوو. هەموو توانای خۆی خستبووە گەڕ، بۆ ئەوەی ئەستۆی كەچ نەكات و خۆ بەدەستەوە نەدات و نەبێتە كۆیلە و یەخسیری ئاسن و تەراكتۆر و بنیادەم. بەڵام دیار بوو دەبەزێ و مسۆگەر بوو. دەبەزی و پرتەقاڵی پڕ ئاوی هێندەی سەلكی بنیادەمێك و قۆخی سووری وەك پتەی خوێن و هەنجیری سوور و زەرد و گەنم و جۆی گوڵ درشت و پەمۆی پڕ لە قۆزاخەی لێ دەكەوتەوە. ئەوە یەكەم خۆڕاگریی خاكە. خۆڕاگری و بەرگریی كچۆڵەیەك كە نایەوێ سووك و ئاسان كچێنیی خۆی لەدەست بدات. ساڵی داهاتوو وەك ژنێكی پێگەیشتوو و جوان و رازی و دڵ پڕ لە ئەوین خۆی دەدا بە دەستەوە.

وەستا حەبیبیش ئەوە لە پشت خولێنەرەوە(سوكان)ی تەراكاتۆرە نارنجییەكە دانیشتووە و بە دڵێكی پڕ لە حەز و تاسە و خۆشەویستییەوە زەوییەكە وەرد دەداتەوە. ئەو تەمەنی رێك پەنجا ساڵان بوو. دەموچاوی چرچ و لۆچ و تاوەسووت بوو و سەر و ردێنیشی سپی...

وەستا حەبیب تووشی هەر كەس دەبوو، بە شانازییەوە دەیگوت، ئەو یەكەم كەس بووە تەراكتۆری لە چوكووراوادا لێخوڕیوە. وەستا حەبیب تایبەتمەندیی دیكەشی هەبوو. لەگەڵ ئەوەدا پیاوێكی بە قەڵافەت جوان بوو و داهاتێكی زۆریشی هەبوو، قەتی بیر لە ژنهێنان نەكردبۆوە. پەنجەی بۆ تەراكتۆرەكە رادەداشت و دەیگوت:"بۆچیمە... بۆچیمە... ئەمن ئیتر لەگەڵ ئەوە زەماوەندم كردووە."

خۆ ئەگەر راستیت دەوێ تەراکتۆرەکەی لەخۆی خۆشتر دەویست.تا بڵێ هیچ پووچ بوو. دەکرێ بڵێم لەو دنیایەدا جنێوفرۆشی وا هەر نەبوو. لە چوکووراوادا بەناوبانگ بوو. زۆربەی شۆفێر تەراکتۆرەکانی چوکووراوا لەبەردەستی ئەودا فێر بوون و هەمووشیان گوێیان لە جنێوەکانی ببوو. ئەوەندە بەتام و چێژەوە جنێوی دەدا، هەر کەس گوێی لێ دەبوو، دەتگوت گوێی لە گۆرانییەکی خۆش و هەستبزوێن دەبێ. جا هەر کەسە و چیی فێڵی دەیزانی دەکاری دێنا، بۆ ئەوەی وەستا حەبیب تین بدەن و دنەی بدەن بۆ جنێودان.

جلوبەرگی وەستا حەبیب هەمیشەی خودا خۆڵاوی بوون. ئەو جلوبەرگانەی وەك متفەڕكێك دەپاراست. کەس نەیدیتبوو وەستا حەبیب سێ مانگ لەسەر یەك، لە مەزرایەکدا هەڵ بکا. خۆ ئەگەر خاوەنی مەزراکەش لەبەری دانواندبا و خاتری گرتبا و بیانووی لێ بڕیبایە، شەوێکیان بێ هەست و خوست، تەنانەت بەبێ ئەوەی بەراتەکەی وەرگرێ، بارگە و بنەی دەپێچاوە و دەڕۆیشت. خاوەن زەوی و تەراکتۆرەکان پێیان وابوو نێوچاوانی ئەو رسق و رۆزیی پێوەیە و وایاندەزانی لەگەڵ هەرکەس کار بکات، بەرەکەت دەکەوێتە خەرمانەکەیەوە.

ئەگەر وەستا حەبیب یەك دوو ساڵ لە شوێنێك خۆی راگرتبێ، دیارە شتێك لە گۆڕێ بووە. شتێکی تەواو تایبەت و دیار. واتە ئەو عەردەی کاری لەسەر کردووە، عەردێکی شەقڵ نەشکاو بووە کە سەدان ساڵ گاسنی وێنەکەوتبێ. وەستا حەبیب هەرچەندێکیشی خایاندبایە، هەتا عەردە شەقڵ نەشکاوەکەی تەواو نەکێڵابایە، نەدەچووە جێیەکی دی. تەنانەت ئەگەر خاوەنی ئەو زەوییە دەستلێنەدراوە هەقەکەشی نەدابایە و رووشی نەدابایە و بێ حورمەتیشی پێ کردبا، هێشتاش هەتا کارەکەی تەواو نەکردبایە، بەجێی نەدەهێشت. لە حاڵێکدا لەو دنیایە، لە هەموو شتێکی پتر رق لە بێحورمەتی و سووکایەتی بوو.

وەستا حەبیب کە بە تەراکتۆر زەوییەکی دەکێڵا، بە بۆنی خاکە تازە کێڵدراوەکە سەرخۆش دەبوو و وای دەزانی ئەوە لە باوەشی کچۆڵەیەکی دەست لێنەدراوی حەڤدەساڵانە دایە. بەڵام خاکی دەست لێنەدراو، ئەو خاکەی یەکەم جار دەمی گاسنەکەتی لێ دەچەقێنی... لە کاتی کێڵانی هەر خاکێکی دەست لێنەدراودا، شادی و بەختەوەری لە روخساری وەستا حەبیب دەباری. جا یەکەم رۆژی کێڵانەکە، هاوین بایە یان بەهار، پاییز یان زستان، شەوێ لەسەر گڵە کێڵکدراوەکە دەنوست.

هەموو پیاوێك، لە ژیانی خۆیدا، ئەوپەڕەکەی لەگەڵ یەك یان دوو کچی دەستلێنەدراو جووت دەبێ. بەڵام وەستا حەبیب هەرجارێکی خاکێکی شەقڵنەشکاوی دەکێڵا، لەگەڵ

کچۆڵەیەکی شەقڵنەشکاوی دەست لێنەدراوی مۆرمۆر و گەرموگوڕ و نەرم و سەرخۆشکەر جووت دەبوو. هەموو ساڵێ و هەموو مانگێ و لەوانەشە هەموو رۆژێ...

ئێستاش لەخۆشیی کێڵانی ئەو خاکەی سەد هەزار ساڵە زۆنگاوەو دەستی لێ نەدراوە، شاگەشکە ببوو. خاکەکە، توێژ توێژ لەگەڵ چنگی گاسنە گەورەکە هەڵدەگەڕایەوە و پشتە چەورەکەی دەدرەوشایەوە. چەندی گاسن دەچێتە پێشێ، بۆنێکی تەڕ و تازە و سەرخۆشکەری لێ هەڵدەستێ.

وەستا حەبیب دەڵێ:"دەی دەی دایکەکەم، دەی کچەکەم، وەی بە قوربانت بم."

لە هەر کونێکی پێستی لەشیدا و لە هەموو گیانیدا هەست بە سەرخۆشییەکی شیرین دەکات. سەرخۆشییەکی وا، مەستییەکەی نەبڕێتەوە. لەگەڵ خاك و عەترەکەی دەتوێتەوە و ئاگای لەخۆی نامێنێ.

خاکەکە دەکێڵدرا، ورد ورد و نەرم دەبۆوە، جوان دەبوو و بۆنە خۆشەکەی بڵاو دەبۆوە.

بە تەراکتۆرەوە بەرەگەی لە دەشتێکی کاکی بە کاکی گرتبوو و گوێی لە هاتن و رۆیشتنی شەو و رۆژ نەبوو و ملی لە بەر ملی خاکەکە نابوو. ئەوەندە چێژی لە کێڵانەکەی وەردەگرت، شەوێ لە یەك دوو سەعات پتر نەدەنووست. سێ چوار مانگی دیکەش لەسەر ئەو خاکە کاری هەبوو. بۆیەش کەیفی زۆ ساز بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا رقی لە هەموو ملکدارەکان بوو. بە دڵیدا دەهات، سەیری ئەوە، تۆخودا وەرە سەیری ئەوە، ئەو سەگبابەی دەڵێی مردووە و لە گۆڕ دەرپەڕیوە و چاوی دەڵێی چاوی گامێشن، سەگبابی خوێڕی. گەوادی ژن قەحپە.... دەیزانی بە چ فرت و فێڵ و کەڵەك و کولەکێك ئەو خاکەی وەگیر کەوتووە... بە بێزارییەوە سەیرێکی ماهیر بەگی دەکرد و دڵی لێی تێکەڵ دەهات و رووی وەردەگێڕا. دەیگوت، سەیری ئەوە دەڵێی گووی سەگە، ئەو گەندوگووە، ئەو کەڵپە سەیە، دەڵێی هەمبانەی کرم. چاوکوندی دەموچاو مار. شەیتانۆکەی گلاو. یانی ئەو هەر لەبەر ئەوی ئەم خاکە خۆش دەوێ، چونکە عەردە و هیچی دی؟ لەبەر بۆن و بەرامەکەی؟ لەبەر تیشك و رەنگدانەوەی، نەرمییەکەی، گەرمییەکەی... یانی ئەو دەتوانێ ئەو خاکە چەور و بریقەدارەی خۆش بووێ کە دەڵێی کچۆڵەیەکی دلڕفێنی تووڕەیە، جنێوان دەدا و بە ناز و ئەداشەوە خۆی دەدا بەدەستەوە؟

چەندی دەیهێنا و دەیبرد، سەرەدەری لە کاری ئاسمان و بنیادەمەکان نەدەکرد. زۆری بیر لێ دەکردەوە بەڵام هیچی لێ روون نەدەبۆوە، ئیتر چاوی دەقووچاند و زاری دەکردەوە و جنێوی وای بەهەمووان دەدا، ماست بایە و لە پێش سەگت رۆکردبا، دەمی لێ نەدەدا.

جا تۆخوا، ئێستا خاکێکی ئاوا جوان، خاکێك کە یەك بەچل و پەنجا بەر دەدات... خاکێکی جوانترین و گوڵ و رووەك و میوەی لێ شین دەبێ، حەیف نییە ملکی سەگبابێکی ئاوا بێ؟ تۆخوا یەکێکی خۆی نەیکێڵابێ و داینەچاندبێ و رووت و قووت لەسەر سینگی رانەکشابێ و نازی نەکێشابێ و تووڕەبوونی دانەمرکاندبێتەوە و لەگەڵی پێنەکەنیبێ و نەگریابێ، نرخ و قەدری ئەوخاکە دەزانێ؟ لە حاڵێکدا ملیۆنان کەس هەبوون دەیانزانی ئەو خاکە بایی چەندە و وەك ژن و منداڵ و ئازیزەکانی خۆیان خۆشیان دەویست و وەك گیانی خۆیان دەیانپاراست، بەڵام ئەوانە تەنانەت دەستیان بە بستێکیشی رانەدەگەیشت و لێی بێبەری بوون.

ئازقین گۆجەی سەرۆکی سەندیکای کرێکارانی تەراکتۆریش، هەر لەبەر ئەوە بوو، بەردەوام ئەوەندە تووڕە بوو، هەر هەڵدەچوو. ئەوان ئەو خاکەیان لەبەر ئەو پارەیە خۆش دەوێ، کە لێی دەکەوێتەوە، بەڵام زۆر ئەوانەی وەك گیانی خۆیان خۆشیان دەوێ و بە بۆن و بەرامەکەی سەرخۆش دەبن...

گۆرانی و ئاوازێکی خەمبارانەشی بە مێشکیدا دەهات:"وەی وای، های، های،های، های وەی لەمن وای... ئەو قاباق ئۆغلووە گووسەگەش، لەوەتەی لەدایك بووە، ئاوی بە دەموچاوی نەکەوتووە، وا دەجووڵێتەوە و دەست بەو خاکەدا دێنێ، یانی خۆشم دەوێ. لە کاتی کێڵانێدا لێی دوور ناکەوێتەوە. ئەوە هەر خۆنواندنە و هیچی دیکە...

"خۆت هیچ، شان و شکۆشت ناتوانێ ئەو خاکەی خۆش بوێ. تێناگا، لە هەرزن وردتر و لە تۆرووس گەورەتر... قووتی نەدەی، ئەو پارووە لە دەمت زیادە... لە چنگتی دەردێنن، سەریشت بەسەر نێزەوە دەکەن."

ماهیر قاباقچی ئۆغلی لەو زەوییە دەکێڵدرا، دوور نەدەکەوتەوە و بۆ هیچ کوێ نەدەچوو. چووبا کوێ؟ لەو دەموساتەدا تەنانەت حەزی لێ بوو لەو خاکەدا بینێژن... ناشتنێکی دەویست کە... ئیتر تین و توانای بەربەرەکانێی نەمابوو و لەسەر ئەو زەوییە بە تاقی تەنیا مابۆوە. ئەو گڵە رەشە، ماڵوێرانی کردبوو. لەو دنیایەدا کەس، هیچ مەخلووقێك، خۆی لەبەر نیوە ئەو چەرمەسەرییانەش رانەگرتبوو، کە ئەو لەسەر ئەو زەوییە کێشابووی. وەك سەگ پەشیمان ببۆوە، بەڵام جا فایدەی چی. کار لەکارێ ترازابوو و تازە کەوڵەکە ئاو بردبووی. دەست لە ملك

و ماڵ و زەوی و زار و ژن و منداڵی هەڵدەگرێ و خۆی دەرباز دەکا. بەڵام دەیتوانی بۆ کوێ بچێ؟ ئاخۆ دەروێش بەگ وازی لێ دێنا؟ ئەو هەمموو شتێکی دەزانی. ئەوەی کێ ئەو نووسینانەی بە دار و دیوارەوە دابوو. کێ دەستی لە پشتی حاجی دابوو و زۆر شتی دیکەشی دەزانی و خۆی بۆ ئامادە دەکرد. ئەگەر وانییە، ئەی بۆ یەکێکی راسپاردووە شەو و رۆژ ئاگای لە حاجی بێ؟ ترسی لێ نیشتبوو، نەکا حاجی بکوژرێ. بۆیە یەکێك لە گورجوگۆڵترین شەڕکەرەکانی خۆی راسپاردبوو ئاگای لێی بێ. ئەی ئەو سێ کەسەی دیکە کێن؟ هەتا دەروێش لە ئەستەمبوڵ نەگەڕێتەوە، کەس ناتوانێ موویەك لەسەری حاجی کەم بکاتەوە. شەڕکەرەکە بە دەمانچەیەکەوە، بەردەوام چاوی بەسەر حاجییەوەیە و تەنانەت لە تێهەڵدانی قومارچییەکانیش فریای دەکەوێ و لە بندەستیان رزگاری دەکات و دیارییشی بۆ دەباتە ماڵەکەی.

لە زەوییە رەشەکە، مس ئاسا و هەستاوەکە جوێ نەدەبۆوە. بەردەوام دەیگوت:"ئەگەر بمرم، لێرە دەمرم. لەسەر خاکەکەی خۆم..."

باشە حاجی ئەو هەمووە هەڕەشەیەی لێ کرابوو و ئەو هەمووە پارەیەشی درابوویە، بۆ نەڕۆیبوو؟ لە حاڵێکدا، بۆ ماوەی پێنج شەش ساڵ و لەوانەیە پتریش لە مەرسین بەبێ ئەوەی دەست لە رەش و سپی بدا، ژیانی دابین دەبوو. ئەی بۆ نەدەڕۆیی؟ بێ و نەبێ موویەك لەو ماستەدایە. دەروێش بە حاجیی گوتبوو:"مەڕۆ، لەوانەیە بیانەوێ بتکوژن. بۆیە بەدەستوبردترین پیاوی خۆمت بۆ دادەنێم ئاگای لێت بێ. ئەگەر پارەت دەوێ، ها، چەند هێندەی ئەوەی ئەو دەتداتێ، بەڵام هەر گەڕامەوە، ئەو دەمەی من و قازی و دادوەر و مودیر ناحییە و ردێن سپییەکانی دیکەی شارۆچکە دانیشتبووین، دێیە باخچەی شارەوانی و لە بەرچاوی هەمووان دەڵێی: ماهیر ئەو شتانەی پێ دەنووسیم و هەر ئەویش دنەی دام جنێوان بدەم." حاجییش هەرچی دەکەی، لەجێی خۆی نابزوێ. ئەوە پاسەوانیشی هەیە و ناشتوانی بیکوژی.

ماهیر لەبەر هەموو شتێك، لەبەر هەمووکەس و هەموو مەخلووقێك دەپاڕایەوە. چاوەڕوانیی پەرجۆی لە هەموو جووڵە و هەموو قسە و بەرد و دار و خاك و رووداوێك هەبوو. پەرجۆی نەجات. چاوی پڕ لە پاڕانەوەی وا دەبڕییە خەڵکی، ئاوری لە جەرگ و دڵی بەردەدان. دەچووە هەر کوێیەك، دەست و پێی و سەری و گیانی، هەموو هەڵسوکەوتی هاواری دەکرد:"فریام کەون. رزگارم بکەن."

چیی بیری لێ کردبۆوە، نەیزانیبوو چۆن لەو گێژەنە دەرباز بێ. بۆی نەدەدۆزرایەوە و نەشیدەدۆزییەوە. باشە چۆنە حاجی بە پاسەوانەکەیەوە لەنێو بەرێ؟ زۆر ئەستەمە. دەروێششی

دەبوو تا ئێستا بێتەوە... چاوەڕێی چی بوو؟ ئاخۆ هەر لەبەر ئەوە نەبوو ناچاری بکا لە بازنەیەکی لە مەرگ خراپتردا پەلەقاژەی مردنێ بکا؟

لەبەر ئەوەی ئاگر تێبەربىوو کە نەیتوانیبوو چێژ لەو خاکە وەرگرێ کاتێ دەکێڵدرا. تێر بە دڵی خۆی بۆن و بەرامەی ئەو خاکەی هەڵنەمژیبوو، کە سووك و ئاسان و بەخۆڕایی وەچنگی کەوتبوو. ئەوددەمەش کە یەکەم دەمی گاسنەکە لە خاکەکەدا چەقیبوو، مەڕێکی نەکوشتبۆوە و خوێنەکەی نەکردبووە نێو خەتی جووتەکەوە.

دەمرێ، وایە؟ بەبێ ئەوەی خۆشییەکی لە دنیا دیتبێ، بەر لەوەی بەری زەوییەکەی هەڵگرێتەوە و قۆزاخەی لۆکە وەك پەڵە هەورێکی سپی دەشتەکە داگرێ، دەمرێ؟

کوشتنی حاجی و پاسەوانەکەی... زەوی و زارەکەی بە قەباڵەوە بەناوی ئەو بنیاددەمە دەکا. خۆشی وەك سەرپەرشت لەو مەزرایەدا ئیش دەکا...

"وەلی، وەلی، براکەم، وەلی. ئەتۆ ئەوەندەت چەرمەسەری دیت... هەمووی بۆ تۆ. دەڵێن کوێ چیت دەوێ؟ دوو چاوی ساغ. مەزراکە بۆ تۆ. وەرە سەری ئەوانە بە گۆمێدا بکە. تۆ حەزت لێ بێ، سوپایەك قڕ دەکەی."

جا وەستا حەبیب لە پشت خولێنەری تەراکتۆر دانیشتبوو و بۆنی گڵی تازە کێڵدراو لە مێشکدا و نوقمی دەریای ئەو بەهارە ببوو کە بەڕێوە بوو و بەروبووی زۆروزەبەندی ئەو خاکە بەڕێژەوە لە بەرچاوی بوو و نوقمی بەختەوەری و خۆشیی کارکردنێ، تاوێك دەوری مەکینەکەی هێواش دەکردەوە و دەیگوت:"هۆی نالەبار، ئەمشەو دوای ئەوەی مانگ هەڵات، هەتا بەیانی دەکێڵێن. ئەو خاکە شێتم دەکا. وەی لەو خاکە. لە هەرچی ژنی دنیایە دڵڕفێنتر و بەنازترە."

زەردەیەکی بەختەوەرانەی لەسەر لێوی پشکوتبوو. لەولاترەوە، ئاقچاساز لە بن مانگەشەوە زیوین و هەڵماوییەکە خۆی هەڵخستبوو. جا ئەو ڕۆژەی هاتە بەر چاوی کە ئاقچاساز لە بن ئاوەکە دەهاتە دەرێ و وشك دەبۆوە و چێژ و خۆشیی یەکەم چەقاندنی گاسنەکە لە زەوییە شەقڵنەشکاوەکەیدا هەست پێ دەکرد. هەر ڕۆژ نا ڕۆژێك سەری لە شوێنی کاناڵ لێدانەکە دەدا کە پڕ بوو لە هاڕەهاڕ و گرمەی مەکینە و کەرەستەی زەبەلاح و بەوپەڕی سەرسووڕمان و شادییەوە دەیپرسی:"ئەو ئاوە کەنگێ، کەنگێ هەڵدەچۆڕێ؟"

ئەو خاکە دەستلێنەدراوەی هەزار ساڵ، دوو هەزار ساڵ، دە هەزار ساڵ گاسنی وێنەکەوتبوو... گەوهەرەکەی لەدڵیدا حەشار دابوو.

# ١٠٢

ئەو شەوە هەتا بەیانی یوسف خەوی لێ نەکەوت. پۆلێك کەومار بە بەرچاویدا هەڵدەفڕین. کەومار، ماری ڕەوەزە سوورەوەبووەکان، خالێی مۆر و کەسکیان هەیە. کەومار، لە جوانیدا سەرتۆپی مارەکانە. یەك شوولێکی ڕاست و بێ گرێ و زێڕین و هێندەی مەترێك، مەتر و نیوێکە و بەقەد قامکەتووتە باریکە و لە زێڕ بریقەدارترە. وەك مارەکانی دیکە پەپکە ناخوا و لە گەرمادا وەك چلێکی زێڕین و درەوشاوە، لەسەر گابەردە سوورەوەبووەکان خۆی هەڵدەخا. دەڵێی مردووە. لە پڕێکیشدا وەك تیرێك ئامبازی دوژمن دەبێ. بە دگمەن دیتراوە کەومار بەسەر عەرزیدا بخوشێ. کە سەیری دەکەی، دەبینی ئەوە تیرێکی زێڕین بەهەواوە دەفڕێ و ئاگری لێ دەبێتەوە. لە چاوترووکانێکشیدا ئەو هێڵە ئاگرپژێنە نەدیو دەبێ. نازانی ئەوەی دیتت، هەر بەراستی وابوو یان خەیاڵ بوو. ئەوانەی تیرماریان نەدیتووە و هیچیان لەسەر نەبیستووە، مەحاڵە ئەو پارچەئاگرەی جارێ دەدرەوشێتەوە و جارێ کپ دەبێ، بوونەوەرێکی زیندووە.

هەزاران تیرمار لە ڕەوەزەکانی ئاناوەرزا دەردەکەون. بە بریقەبریق لە ڕەوەزێکەوە دەفڕن بۆ ڕەوەزێکی تر. هیچ مارێك لە چوکووراوا، ئەگەر پێی لەسەر کلکی دانەنێی، کاری پێت نییە. بەڵام کەومار وا نییە. کەومار زۆر خەتەرناکە. لە نەکاو دەبینی ئەوە شتێکی زێڕینی سامناکی بە بریقەبریق هات و لە چاوترووکانێکدا پێوەی داوی. ئەو کاتەیە گرمۆڵەی دەبی و گیانت دەردەچێ. دژە ژەهر و داودەرمانیش کاری لێ ناکا. هەر باشیشە کەومار تەنیا لە نێو ڕەوەز و گابەرداندا دەژین و زۆر زیان بە بنیادەمەکان ناگەیەنن. سەرەڕای ئەوش دیسان هەر وەرزێرێکی لە ڕۆژە گەرمەکانی هاویندا، بەسەر خاکی سوورەوەبووی دەشتێدا تێدەپەڕێ، ترسی ئەوەی لە دڵیدایە نەکا کتوپڕ کەومارێك پەیدا بێ. ئەوانەی ڕێیان دەکەوێتە ڕەوەزەکان، چاوێکیان دەکەونە چوار چاو. تا ئێستاش کەس نەیدیوە و نەبیستراوە کەومار بە یەکێکەوەی دابێ و

کوشتبێتی. بەڵام گەلێك بە گەلێك کاریلەوەی داوە و کوشتوویەتی. ترسەکە دیارە لەوەیە کە ئەو لەپڕێك و لەناخافڵدا دەردەکەوێ.

کە منداڵ بوو، ئەو دەمەی دایك و بابی لێیان دەبووە قڕە و شەڕ، زۆری باسی کەومار بیستبوو. دایکی هەمووجارێ زاری دەکردەوەو دەیگوت:

"ئەتۆ کەوماری کەومار... کەس نازانێ لە کام لاوە دێی و پێوە دەدەی. براکانم، ئەو شێرەکوڕانەی هۆردووی چوارەم، هەر بە مێشکیشیاندا نەدەهات کە یەکێکی وەك تۆ دێ و داوای خوشکیان دەکا و دەیخوازێ. لەبەر تۆ و تەنیا تۆ، دڵی ئەو شێرانەم بە کوچکەوە دا و سەریانم نەوی کرد و مێردم لە رووت و قووتێکی وەك تۆ کرد کە ئاسمان پێخەفێتی. ئەتۆ کەوماری کەومار. ئەتۆ بەو کەسانەوە دەدەی، کە هیچ خراپەیەکیان بۆت نەبووە و کاریان بەکارت نەبووە...

لە پڕ دوو زریکەی دووردورێژ یوسفی رادەچڵەکاند... یەکێکیان شەوێ بوو. یوسف لە خەوێ راپەڕیبوو و زانیبووی بابی گیراوە. نەیدەزانی ئەوەیان کەنگێ بووە. کەگوێی لەو زریکەیەش ببوو، نەیدەزانی چ بکا. ئەمجارەشیان هەواڵی کوژرانی باوکیان هێنابوو. هەر جارێکی دایکی وەبیر دەهاتەوە، ئەو دوو زریکەیە لە گوێیەکانیدا دەزرینگانەوە.

"دایکی چەند جاران تانووتی لێ دابوو:

"ئەتۆش کەومارێکی وەك بابت. کەوماری کەومار."

ئەوەی قەت لەبیر نەدەچۆوە. دایکی دەیویست بڵێ چی؟ هەتا ئێستا خۆ خراپەی بۆ کەس نەبوو و زیانی لەکەس نەدابوو. دابووی؟

خۆ حاجیی باش دەناسی. ئەو کابرایەك بوو، خەریکبوو منداڵەکانی لەبرسیان بکوژێ. ژنەکەشی لەو قرچەی گەرمای هاوینەدا، لە زەوی و زاری چوکووراوا کاری دەکرد و ئەو دوو سێ دینارەش کە بەخۆی دڵ کۆ دەکردەوە، حاجی لە چنگی دەردێنا و دەیدۆڕاند و منداڵەکانی برسی و رووت و قووت دەکرد. جگە لەوەش، خۆ خودا غەزەبی لێ نەگرتبوو، بچێ گەڕ بە بەگێکی ئاوا مەزن بکا؟ کەوماری راستەقینە حاجییە و کەومار بۆ کوشتنێ باشن.

بەڵام میرۆ، دایکی، قەت مەحموودی بە هاوشانی خۆی نەزانیبوو. ئەو تووك و نەفرەتی لەو عەشقە کوێرانەیەی سەردەمی گەنجێتیی خۆی دەکرد و لەخۆی خۆش نەدەبوو کە چۆن بۆ مەحموودە قوون رووتی کوڕی حامەو سواڵکەر، پشتی لە برا شێرەکانی کردبوو. چما بنیادەم لە بەر کزەی جەرگێك، لەبەر سەروکاکۆڵێکی کاڵ و بەژن و باڵایەکی بەرز و چاوێکی ئاگرین،

دەبوو ئەو شێرانە سەرنەوی بکا؟ بەڵام لە لایەکی دیکەشەوە، بۆی شێت و شەیدا ببوو. شەش مانگ دوای مەرگی بابی، زۆر لە ئاغا و بەگەکان خوازبێنییان لە میرۆ کردبوو و ئەو لە وەڵامیاندا گوتبووی.

"دوای پیاوی وەك مەحموود، تەنانەت حەزرەتی عەلییشم لێ حەرام بێ. هیچ پیاوێك، تەنانەت مستەفا کەمالیش بێ، رێی ناکەوێ١ لە جێ پاڵەوانێکی وەك مەحموود بنوێ."

میرۆ ئەو شێرەژنە، چەندی دەیکرد و دەیکراند، چەندی خۆشیشی دەویست، بەڵام هەر قایل نەدەبوو بەوەی لە هەمبەر پیاوێکدا خۆی بشکێنێ و لە ناخی دڵیدا رقی لە مەحموود و کوڕەکەی بوو.

جاری وابوو لە بن دیوارێ هەڵدەکورما و ئەژنۆی لە باوەش دەگرت و چەنەی لەسەر چۆکی دادەنا و دەچۆوە نێو خۆی و نیگای، نیگا شێواو و سەرگەردانەکەی بەرەو دوور دوور دەفڕی... یوسف لەو نیگایەی دەترسا. دەسڵەمییەوە. ئەو بریسکەی نەفرەتێکی شاراوەی لەو نیگایەدا دەدی و لەو کاتانەدا لە دایکی دوور دەکەوتەوە و خۆی پێشانی کەس نەدەدا.

چەند رۆژێك بوو دایکیی بەو دوو زریکە دڵتەزێنەوە دەهاتەوە بەرچاوی و بە نەفرەتەوە سەیری دەکرد و گڕی دەگرت و تفی لە رووی دەکرد. جارێکی ئاوا بە نەفرەت و سووکایەتییەوە لە تقی رۆکردبوو. ئاخۆ میرۆ هەر ئەو و باوکیی دەشکاندەوە؟ دەروێش و هەموو پیاوێکی دیکەشی... ئەو هەر براکانی خۆی پێی پیاو بوو.

دوای ئەوەی دایکی لەپێش چاوی لاچوو، هەزاران کەوماری بریقەدار، بە هاشوهوش لە قرچەی هەتاوەکەی چوکووراوادا لە لایەکەوە بەرەو لایەکی دیکە دەفڕین.

جار بە جاری لە دایکیشی پتر بەقیندا دەچوو. هەوڵی دەدا، لەو نیگایانەی دایکی رزگار بێ، کە بەردەوام دەهاتنە بەرچاوی و هرووژمیان بۆ مێشکی دێنا. بەڵام نەیدەتوانی و میرۆ جار بەجار پتر بەسەریدا زاڵ دەبوو. لەو کاتانەدا تاقەتی نەدەما و هەڵدەچوو و لە دایکی تووڕە دەبوو و بەزەیی بەخۆیدا دەهاتەوە. خۆ وەك منداڵێکی خەمۆك و ساویلکە و زویر و سەرلێشێواو و بەلاوەنراو و تاك و تەریك و داماو دەهاتە بەر چاو و لەو بێکەسییەدا دایکی و کەومار و ئەو تاریکییە خەستەی تێکەوتبوو، دەستیان لە بەرۆکی نەدەکردەوە و پشووی سوار دەبوو وهەموو گیانیشی سڕ دەکرد.

---

١. رێی ناکەوێ: شیاوی ئەوە نییە. لەو ئاستەدا نییە.

سەگە ئەنگێوراوەکە... ئەو سەگە خوێناوییانەی کەلاکەکەیان لەتوپەت دەکرد... ژەنگەسوورەی سەر چڵی دارەکە... بۆقە وشکەڵاتووەکە، دەروێش بەگ، حاجی. تەپوتۆزە سووربارەکە، پاسەکان، بنیادەمە خۆڵاوییەکان، مەرەزەجاڕەکان، کە سەوزایی وەك ئاو قەڵبەزەی دەکرد، تیشك و کەومار و ئاسنگەر و شلێرە و زۆنگاو و بۆن و بەرامە و باڵندە و هەموو شتێك، تێکەڵ دەبوون.

لە پڕێکا شەپۆلی خۆشییەك لە ناخیدا وەك خۆرەتاو هەڵدەهات و نوقمی شادییەکی دەکرد، کەس نازانێ لە کوێوە سەری هەڵدەدا. بەگ پارەیەکی زۆری دابوویێ... بژاردی و بژاردی و نەیتوانی هەمووی بژمێرێ. دوێ شەوێش لەو پەنجەرەیەوە کە کەلوپەلەکانی یاریی لێوە فڕێدابووە ژوورێ، دراوی بۆ خستنە ژوورەوە.

ترسێك لە ناخیدا سەرتاتکەی کرد. حاجی هەموو ئەو پارەیەی لە ژنەکەی دەستاند و لە قوماردا دەیدۆڕاند. بە دوو ڕۆژان... بەڵام ئەگەر حاجی نەبێ، ئەو هەمووە پارەیە بەشی پێنج ساڵی ژنەی دەکرد. حاجی بەڵای سەری ئەو ژنە داماوەیە. بۆ پێنج ساڵی دواییش خودا کەریمە. دەروێش بەگ ئەوەندە بێ ویژدان نییە ئەو کۆزە ساوایە بە برسێتی و رووتی و قووتی بەرەڵڵا بکا... بەڵام ئەگەر حاجی ئەمشەو هەموو ئەو پارەیە لە ژنەکەی بستێنێ؟ ئەو ژنەش زۆر کەرە. هەر پارەکە بدۆزێتەوە، ڕێك دەچێ و بە حاجی دەڵێ... هەتا حاجی پارەکەی تەواو نەکردووە... بەر لەوەی هەموو بدۆڕێنێ... ئای لەو منداڵە وردیلانە. هەر بەراستی ژیکەڵەن.

غاری دەدا و لاقی لە دەوەن و ڕەگی گیاچەقە و بەرد هەڵدەنگوت. دوو جاران ڕێی کەوتە گۆڕستانی گاورانەوە. دەستی ژانی کرد. عەرز قوڕ و لیچق بوو. مانگ بەحاڵ دیار بوو. سێبەری دار و دەوەن و گیا و رەوەزەکان و ئەو گوێدرێژانەی لەولاترەوە دەلەوەڕان، هەتا سەر شارۆچکەکە دەکشا. سێبەر درێژ دەبوونەوە و تێك دەئالان. سێبەری بنیادەم، سەگ، لك و پۆ و رەوەز و گیشە و قامیش... تەپوتۆزی سوورباو... پشووی سوار دەبوو. سێبەری تۆزە سووربارەکان، پاسی ڕەنگاورەنگ، سەرگی خوێناوی، تێکەڵ پێکەڵ شەپۆلیان دەدا و تێك دەئالان.

رەشەبایەك هەڵیکردبوو. پیاوی دەبرد. دارەکانی دەنووشتاندەوە و بە عەرزییەوە دەنووساندن و لە ڕەگەوە دەریدێنان. لوورەی لە لێڕەوارێ هەڵدەستاند و دنیای سەروبن دەکرد.

مشتووی کێردەکەی، کە دەمێك بوو لە مستیدا دەیگوشی، شەڵاڵی ئارەقە ببوو. لە پڕێکدا گەڕایەوە. دەستی چووە سەر و هاتەوە خوارێ.

سێبەرە درێژەکە نالاندی:

"وەی دایکە سووتام."

ئیتر کەوتەعەرزی و پەلەقاژەی کرد. چنگی لە خاکەکە دادەگرت و دەوەن و گژ و گیای هەڵدەکەن و قەپی لە عەرزی دەرگرت. یوسف خۆی پێدادا و پەیتا پەیتا دایە بەر کێردان... قینێکی شێتانە هەموو گیانی داگرتبوو...

کە وەخۆ هاتەوە، دیتی ئەوە هەر کێردەکە هەڵدێنیێ و دایدێنیێتیێ.

هەستا و بە دەوری لاشەکەدا خولایەوە. دەبوو را بکا. بەڵام نەیدەتوانی لاشەکە بەجیێ بیێڵیێ و بڕوا. دەتگوت بەوەوە بەستراوەتەوە. یەك پشوو بەدەوریدا دەخولایەوە. دوایی بەبیێ ئەوەی بیری لیێ کردبێتەوە، دەمی کێردەکەی لستەوە. زاری خوێناوی کرد. هێندەی لوێچیێ خوێنی تف کردەوە و بە غاردان بەرەو شارۆچکە تێی تەقاند.

مانگ هەڵات. سێبەرەکان ڕەوینەوە. بایەکەش کەوت.

## ١٠٣

ئەمینە گۆج لەپێش هەمواندا دیتی. ئەمین ئاسنگەرێکی کورتە باڵا بوو. یەکی شەلی لاپان بوو. پانییەکەی لە درێژییەکەی پتر بوو. لەمێژ ساڵ بوو، دووکانەکەی نەك هەر پێش هەموو بازاڕی ئاسنگرەکان، بگرە لە پیش هەموو شاریشدا دەیکردەوە و دوای هەموانیش دایدەخست. ئەمین سەری خۆی بەردابۆوە و بێ دەنگ و بەبێ ئەوەی کاری بە کاری کەس بێ و خۆ لە شت هەڵقوتێنێ، نوقمی کارەکەی خۆی دەبوو و بەردەوام ئاگرەکەی خۆش دەکرد و ئاسنی لەسەر سندانێ دەکوتا. دنیای ئەو لە ماڵەکەیەوە دەستی پێ دەکرد و لە دووکانەکەی کۆتایی دەهات.

تەرمەکە، لە بن چنارە ئەستوورەکەی سەرتای بازاڕی ئاسنگەران، کە باوەشی پێنج پیاوی تێ وەرنەدەسووڕایەوە، کەوتبوو. سەری بەلای راستدا خوار ببۆوە و نیوەی زمانی لە زاری هاتبووە دەرێ و ئەو خوێنەی لە زاریدا مابۆوە، مەییبوو و دەتگوت هێشتاش لە زارییەوە خوێن دچۆڕێتە نێو گۆمیلکەخوێنەکەوە. تەرمی حاجی دەتگوت هەڵۆیەکە و خۆی گورج کردووە لە نێچیرەکەی رۆبێ. لە زیندوو دەچوو. بەڵام دەتگوت شەهێنێکە لە شەڕێکی گەورە گەڕاوەتەوە و پەڕ و پۆی هەڵوەریون، بەو حاڵەشەوە دیسان هەر ئامادەی ئامبازبوون و شەڕێکی گەورەیە. هەموو سەر و دەموچاوی بریندار و خۆڵاوی و تۆزاوی. لینگە پێڵاوێکیشی کەوتبوو.. ئەو قاچە درێژ و رەقەڵە و زەردە گۆرەوییەکەشی لێ داماڵکابوو و لە پەنجەکانییەوە شۆڕ ببۆوە.

تەرمەکە دەتگوت خوێنی راناوەستێ. تیزەبزەیەك بە زمانییەوە کە لە زاری هاتبووە دەرێ و بە دەموچاوییەوە دیار بوو. هەر چاوت لێکردبا دەتزانی لە جێیەکی زۆر دوورەوە بە راکێش راکێش هێناویانەتە ئێرە.

ئەمینە گۆج لە خوار لاقی مردووکەوە راوەستابوو و وا ترسابوو و سەری لێی سووڕمابوو، بەبێ چاوترووکاندن و وەك ئەوەی بیەوێ خۆی بدزێتەوە بەڵام بەری نەدەن، روخساری پڕ بوو لە تکا و پاڕانەوە و لەوێ چەقیبوو.

مراد مهاجری زبلڕێژ لە دوورەوە کە چاوی بە تەرمەکە و ئەمین کەوت، بە غاردان هات و بەسەر تەرمەکەدا نوشتایەوە و سەیرێکی کرد. دەتگوت دەیەوێ بچێتە کونە لووتییەوە. دەموچاوە سوور و لاملەچرچ و لۆچەکەی لە پێشدا زەرد و دوایی سوور هەڵگەڕا و ئەوجار شین و مۆر بۆوە و بە چاوی زیت و لەبزێکی پڕ لە بێزارییەوە گوتی:"چیی لێ هاتووە، کاکە؟"

ئەمین هیچی نەگوت. مراد مهاجر یەکێکی لووت زل بوو. مووەدەمارەکانی سەری لووتی لە بن پێستەوە دیار بوون. لە کەڕەی بەیانییەوە هەتا شەوێ بە بازاڕێدا دەسووڕایەوە و تووشی هەر گوندی و شاری و کارمەند و دووکاندارێك دەبوو، پرێسکەی دڵی بۆ دەکردەوە، کە بەڵێ، پێشتر مڵکدارێکی گەورە بووە و گوند و زەوی و زاری هەبووە و هەمووی لە "دلی ئۆرمانی بولگاریا" لەپاش بەجێ ماوە و ئێستاش لێی قەوماوە و ناچارە تەرسی ئەسپ و گوێدرێژان لە بازاڕی شارۆچکەدا کۆ بکاتەوە. کەس نەبوو لەو شارۆچکەیەدا گوێی لە بەسەرهاتی مراد نەبووبێ، بەڵام ئەو هەرجارە و بە فێڵێك یەکێکی دەدۆزییەوە و بۆ دەیەمین جار، بەبێ ئەوەی بۆی گرنگ بێ کە گوێی لێ رادەگرن یان نا، سەربردەی خۆی دەگێڕایەوە.

"کاکی خۆم، ئای کارەکەر و قەرەواشمان هەبوو، هەزار سەر ئەسق، دەهەزار گا و مانگا کاکی خۆم..."

چاوی لە ئەمین زەق کردەوە و دیسان پرسی:"ئەرێ چیی بەسەرهاتووە کاکی خۆم؟"

ئەمینە گۆج دەتگوت دار و بەردە.

"کاکی خۆم، لێتم پرسی، چیی لێ هاتووە؟"

بە دەوری تەرمەکەدا هەڵدەخولا و پەیتا پەیتا دەیگوت و دەیپرسی:"کاکی خۆم، مردووە، مردووە، لێیان داوە... لەتوپەتیان کردووە... باشە بۆ ئەو بەڵایەیان بەسەر هێناوە، کاکی خۆم... دابێژدابێژیان کردووە بە کێرد کاکی خۆم... کوڕێکی باش بوو حاجی..."

ئەو هەر وا بەدەوریدا دەخولایەوە و لەو کاتەدا شێخە قوڵە، لە منارەوە هاتە خوارێ. لەگەڵ ئەوەدا هەرگیز رێی نەکەوتبووە ئەو لایە، ئەمجارە رێك بەوێدا هات. بەیانیی ئەمڕۆ، نەگبەتییەك سێبەری خستبووە دەرروونی. لە حاڵێکدا گۆچانەکەی بەدووی خۆیدا دەکێشا،

بەغاردان هات و لە ژوور سەری مردووەکە راوەستا و داهاتەوە و چاوە زەقەکانی لێك نا. ئەوجار دەستی بەرەو ئاسمان هەڵێنا و کەوتە دووعا و پاڕانەوە.

کەس نەیدەزانی شێخ کێیە و لە کوێیەوە هاتووە. تەنانەت زۆربەیان هەر ناویشیان نەدەزانی. کابرایەکی خۆش مەشرەف و دەم بە پێکەنین بوو. لە قسەکانییەوە دیار بوو ئیمان و باوەڕێکی پتەوی نییە، بەڵام زۆر شتی لە ئیسلام دەزانی.

شێخ، لە حاڵێکدا بە داخ و کەسەرەوە سەری رادەوەشاند، دووعای دەکرد و جار نەجارێکیش دادەهاتوە و چاوە زەق و بەمۆڵەق وەستاوەکانی مردووەکەی بۆ چەندەمین جار لێك دەنایەوە.

حەسەن بۆیوکداغی پینجەچی، کە گەنجێکی دێهاتیی بەژن و باڵاجوان و دەم بە پێکەنین بوو، لە حاڵێکدا دەستی بە بەروانکەکەی وشك دەکردەوە، هاتە پێشەوە و وەك لەگەڵ خۆی قسە بکا پرسیی:"دیسان بەو کەرەی بەیانییە چ بووە؟"

هەر چاوی بە تەرمە ئەنجنراوەکە کەوت، رەنگی بە رووەوە نەما و ئازای گیانی کەوتە لەرزین و ئەژنۆی نوشتانەوە و دانیشت.

مراد بن پیلی گرت و هەڵیستاندەوە. شیخ دووعاکەی بڕی و گوتی:"لەهۆش چوو، ئاو بێنە مراد..."

تا مراد ئاوەکەی هێنا، حەسەن وەهۆش خۆی هاتبۆوە و شێخ پێی دەگوت:"لەمەودوا سەیری مردوو مەکە."

حەسەن پشتی کردبووە مردووەکە و راوەستابوو و نەیدەتوانی لەوێ بڕوا. لەو دەمەدا سەرو سەکتی رەزا قومارکەر پەیدا بوو. رەزا کابرایەك بوو، شەوانە خەوی لێ نەدەکەوت. زۆر تەڕپۆش و رێکپۆش بوو. کەس نەیدیتبوو جارێك جلوبەرگی شڕ و ئوتوکراو و کراسی ملیواندرای لەبەر نەبێ و پێڵاوی بۆیاغ نەکرابن. روخساری رەش ئەسمەر و گووپن و ددانی سپی بوون. قژی سەری رێك و لووس بەرەو پشتەوە هەڵدەدایەوە.

رەزا تا ئێستا سێ پیاوی کوشتبوو وهەموو جارێش یان بەر لێبوردنێ دەکەوت، یان لە دادگا شانس رووی تێ دەکرد. هەرچۆنێك بێ دوای چەند ساڵان زیندانی کێشان، بەزیندوویی دەرچوبوو. خوێندنی لە بواری کشتوکاڵدا تەواو کردبوو و چەند ساڵێك مامۆستایەتیی کردبوو و ئاخرییەکەشی ببووە یەکێك لە بەناوبانگترین قومارکەرەکانی شارۆچکەکە.

دوو ژنی هەبوو و لە هەرکامەشیان چوار منداڵی هەبوو. هەر هەشتیشیان کوڕ بوون.

هەر چاوی بە تەرمی حاجی کەوت، دەمودەست دەروێش بەگی هاتە بەرچاوی. زۆری کڵاو لەسەری نابوو. ئەو بەگی بەگانە و ئەو بنیادەمە رەسەنە، هەرگیز، شەو بووبێ یان رۆژ، بە دەستی بەتاڵ بەڕێی نەکردبۆوە. رەزا یاخی دەشیزانی لەو شارۆچکەیەدا، لە هەر سێ کەس، یەکێکیان سیخوڕی دەروێش بەگە و هەر شتێك بڵێ، دەمودەست پێی دەگاتەوە. پێشی نەگەیەننەوە، خۆی تاقەت ناهێنێ و رۆژێك بۆ دەروێش بەگی دەگێڕێتەوە و پێی دەڵێ: لەسەر تەرمەکەی حاجی ئاوام پێ گوتی؟ شتێکی دیکەش لەگۆڕێ بوو. سێهەم جار بوو ناوی رەزا دەخرایە ریزی پاڵێوراوەکانی نوێنەرایەتیی یەکێك لە حیزبە گەورەکانی وڵات و لە سۆنگەی دۆڕاندنی حیزبەکەیەوە، ئەویش دەکەوت، بەڵام لە نێو پاڵێوراوەکانی حیزبەکەیدا ئەو لەهەمووان پتری دەنگ دێناوە. بۆیەش بەخۆی دەنازی. ئەگەر بەگ زانیبایەوە، ئەو لایەنگرێتی، هەموو عێل و عەشیرەتەکەی ناچار دەکرد لە هەڵبژاردنێدا دەنگ بدەنە وی.

وەك ئەوەی بیەوێ وتار بدا، دەستی چەپەی لەسەر سینگی دانا و دەستی راستەی بەرز کردەوەو دەستی پێ کرد.

خۆ ئەگەرچی بە رواڵەت هەر بە دەروێش بەگ و ئەوانی هەڵدەگوت و ماستاوی بۆ دەگرتنەوە، بەڵام زۆری رق لێیان بوو. هەر لەخودای دەویست ئاغا و بەگ و دەوڵەمەندان سەریان پێوە نەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا، رێزێکی زۆری دەگرتن. تەنانەت زۆری تاریفی پیاوی وەك ماهیر دەکرد، کە خۆی پێگەیاندووە و چونکە خۆی نەیتوانیبوو وەك ئەوان بێ، ئێرەیی پێ دەبردن و بەردەوام بەخۆی دەگوت:"باشە ئەمن چیم لەوان کەمترە؟ ئەقڵ و هۆشم، ئازایەتیم، زانیاری و تێگەیشتوییم، سەر و پۆتراکم، چ شتێکم؟" ئەوەندە نەگبەت و نێوچاوان رەش بوو، بەڵا نەما بەسەری نەیە. ئەگەر یەکێك چارەڕەش لەدایك بوو، بەهیچ شتێك باری راست نابێتەوە و قەت خۆشی لەخۆی نابینێ.

پەیتاپەیتا دەیگوت و دووبارەی دەکردەوە:"باش بوو، ئەو گەوادە هەقی خۆی بوو... ئەی خۆزگە هەزرا کێردیان لەسەر ئەو دڵە پیسەی دابوایە و سەد فیشەکیشیان لە نێو ورگی کردبایە. لە ئێوە دەپرسم، دەروێش بەگ چ خراپەیەکی بۆ ئەو ببوو؟ چیی لێ کردبوو، کە لە چەقی بازاڕێ پێی گوت شاخدار؟ باشە خۆ شاخی خەڵکی نەدەچوونە قوزی ژنەکەیەوە؟ با بیخوا. ئەگەر دەروێش بەگیش لێ خۆش بوایە و تۆڵەی لێ نەکردبایەتەوە، من لێی خۆش نەدەبووم. باشە تۆ چۆن دەوێری، سووکایەتی بکەی بە پیاوێکی رەسەنی وەك دەروێش بەگ، بنە و بنەچەکی هەر رەسەن و نەجیمزادە بوون؟ باشە، باشە، باشت کرد...."

شێخ دووعاکردنەکەی بڕییەوە و چاوی سوورهەڵگەڕاوی بەرەو وی هەڵگێڕان و گوتی:"موسوڵمان لە پاش مردووان ئاوا قسە ناکا. شەرعی موبارەك وای فەرمووە، پاشی مردووان هەر رەحمەت باشە و دەبێ دووعای بەخێری بۆ بکەیز"

رەزا یاخی گوێی پێ نەبزووت و دەنگی هەڵێنا و چاوی لێ سوور کردەوە. خۆ لەو کاتەدا سلێمان قاوەچی، برادەرەکەی حاجی بە گوڕەو هەرا خۆی نەختسبا نێوانیانەوە، لەوانەبوو، کابرا قولە بدرێتە بەر شەق و مستان.

سلێمان خۆی بەسەر تەرمەکە کێشابوو و بە گریانەوە دەیگوت:"براله، هاوڕێکەم، ئەوە کام دەستی چەپەڵ خوێنی رشتی؟ دڵنیابە، ناهێڵم خوێنەکەت سارد بێتەوە تۆڵەت دەکەمەوە. قاتڵی تۆ، تەنانەت گیزیك دۆرانیش بێ، پادشای چیاکانیش بێ، تۆڵەی لێ دەکرێتەوە. دۆستی من، هاوڕێکەم."

رەزا کە زانیی وەزعەکە بەکەیفی وی نییە و هەر قسە بکا، سلێمان تێی هەڵدەدا، کەوتە پاکانە و داوای لێبوردن:"بمبوورە ئاغا، تۆ راست دەکەی. من هەڵچوبووم. مردوو دەبێ دووعای بەخێری بۆ بکەی. بمبوورە ئاغا..."

سامی ئاسنگەر هاتە پێشەوە و سلێمانی لەسەر تەرمەکە هەستاند و دڵی دایەوە:"چارەنووسەکەی وا بووە براله. بەشی ئەو وا بڕابووەوە. ئەو گەوادانە تاقەتی دوو قسەیان نییە. ئاخر چما لەسەر دوو قسان دەبێ پیاوێك بکوژن؟ بەشی ئەو وا برابووەوە سلێمان. ئەو چارەڕەشە، کۆزی ساوایە. منداڵەکانی هەتیو کەوتنەوە. وەختە ئاگرم تێبەربێ، کۆشێکی منداڵی ساوا هەیە."

برایمە کوێر بە هانکەهانك هات و لە تەنیشت تەرمەکەوە راوەستا و گوتی:"نەمگوت؟ نەمگوت؟ نەمگوت ئەوانە بەڵایەکت بەسەر دێنن؟ نەمگوت بە دەستی خۆت فەرمانی کوشتنی خۆتت خستە ئەستۆت؟ خۆ پێم گوتی حاجی؟"

تەرمەکە بۆگەن ببوو و کرمی هەڵێنابوو و رەشیش هەڵگەڕابوو. کرم لە برینەکەیدا دەجوولانەوە.

برایمە کوێر لووتی گرتبوو و بە منگ منگ دەیگوت:

"چۆن خودا هەڵیدەگرێ، بەگێکی ئاوا گەورە، دەستی بە خوێنی داماوێك سوور بکا؟"

دوای ئەوە وەك لە قسەکەی خۆی ترسابێ، گوتی:"دیارە تاوانێکی گەورەی هەبووە بۆیە کوشتوویانە. خۆ پیاو، کەتنێکی گەورەی نەکردبێ لە هیچ و خۆڕایی نایەن بیکوژن، وا نییە؟"

بەو قسانە باری سەر دڵی سووك بوو و دەمودەست ئەوێی بەجێ هێشت. باشە حاجیی چیی گوتبوو کوشتبوویان؟ کوڕە ئەوانە پیاوکوشتن و ئاوخواردنەوەیان پێ وەك یەکە. ئەگەر گوێیان لە قسەکانی بێ، ئەویش دەکوژن. وەك ئیزراییل دەگەنە سەری و سەری بەگۆمێدا دەکەن. حاجییش بزر بێ، تەرمەکەشی... ئەی خۆزگە قەڵەمی پێی شکابایە و نەچووبایەتە ئەوێ. هاتە بەردەم دووکانەکەی، بەڵام بەبێ ئەوەی دەرگاکەی بکاتەوە، گەڕایەوە لای مردووەکە و هەرای کرد:"کوڕە دەستیان خۆش بێ. خۆ خەڵکی کچ و ژنی خۆی لەسەر ڕێیان هەڵنەگرتووەتەوە. ناموس شەتڵ و چڵەگیا نییە لە بێستانێدا شین بێتەوە."

سلێمان هەڵچوبوو. پەلاماری دایە و سامی گرتی و برایمەکوێریش دڵی لە خۆشیی ئەوەی لە دەستی قوتار بووە، چوو دەرگای دووکانەکەی کردەوە و دەستی کردە پاڕانەوە. ئەمڕۆ کەڕەی بەیانی باشی بۆ نەهاتبوو و دەبوو بە دووعا و نزا شەڕی شەیتان و بەڵای لابەلا لەخۆی دوور بکاتەوە. لێوی پەیتا پەیتا دەبزووتن.

عەلی عەریزەنووسیش هات. دڵی لە خوێنەکە تێکەڵ دەهات، بەڵام گوێی نەدایێ. لە ژوور سەری مردووەکە فکر و خەیاڵ ڕفاندی. ئاخری ڕۆژێك ئەویش ئاوا دەکوژن و وەك کەلاکە سەگ لاشەکەی دێنن و لێرە لە چەقی ئەو گۆڕەپانەی بازاڕێ فڕێی دەدەن. چیی لەدەست دەهات؟ چۆن خۆی لەو مەرگە مسۆگەرە ڕزگار بکا؟ هەر لەوێ ساغ بۆوە. بێ ئەملا و ئەولا دەبێ ئەوشارە جێ بێڵێ.

کوژرانی حاجی لە بن سەری یەکێك لەو دووانەدا بوو. دەروێش یان ماهیر. قاتڵەکەش لەودوانە یەکێکیان بوو، وەلی، یان یوسف. بەڵام کامەیان؟

کەس نەیدەتوانی لەگوێی وەلی بخوێنێ. ئەو سارد و گەرمیی ڕۆژگاری چێشتبوو و زۆر دەرگای بە قوون کردبۆوە. خۆ ئەگەر دەرفەتی ئەوەی هەبوا و ماوەیەکی زۆر لەگەڵ یوسف بایە، لەوانەبوو بتوانێ ڕزگاری بکات. بەشکم قسەکانی ئەو، یوسفیان پاشگەز کردبێتەوە لە کوشتنی حاجی... وەبیری هاتەوە کاتێ قسەی بۆ دەکرد، یوسف چۆن ڕەنگی دەگۆڕدرا.

نا، نا، هەلومەرج، دەست و پێی یوسف و وەلیی وا بەستبوو، بە هیچ جۆرێك نەیاندەتوانی خۆیان لە کۆت و بەندی فەرمانی ئاغاکان ڕزگار بکەن و هەر ژاردەستی ئەوان دەبوون. ئەوان وا پەروەردە ببوون. مەحموودە کوردە، کە پێی وابوو بەندیخانە، چاو و گوێی کردووەتەوە و ئاقڵی کردووە و کردوویەتە دوژمنی قەستەسەری هەموو بەگەکان، هەر لە بەندیخانە بەربوو، ڕێك

چووەوە بۆ دەستماچکردن و نۆکەریی بەگەکەی و ئاخرییەکەشی... ئاخرییەکەشی... مەحاڵە، بەبێ گۆڕینی هەلومەرجەکان، ناکرێ بنیادەمەکان بگۆڕی.

ئاخۆ ئینسانێك پەیدا نابێ، بەسەر ئەو هەلومەرجانەدا زاڵ بێ؟ ئاخۆ لایەنێکی بنیادەم، سەرکەوتن نییە بەسەر هەلومەرجەکاندا؟ دوژمنایەتیی مەحموود لەگەڵ بەگەکان لە زینداندا، لایەنێکی ئەو نەبوو، کە کۆت و بەندەکانی دەپساند. لە راستیشدا تێکەڵبوونی ئەو بنیادەمانەدا کە لایەنی باشەیان هەیە لەگەڵ ئەو لایەنە باشەی رەگەزی مرۆڤ، دەروازەی رۆژە خۆشەکان بەسەر بنیادەمەکاندا دەکرێتەوە.

ئەو، بەو مێشکەوە ناتوانێ، خۆی لەگەڵ هەلومەرجەکانی ئەو شارۆچکەیە بگونجێنێ و بژی. ئەوە گومانی تێدا نەبوو.

"مالاوا شارۆچکە. مالاوا حاجییە غەریبە. سوپاست دەکەم... ئافەرم..."

خالس بەگ، مامۆستای خانەنیشنکراو، کە ترس لە هەموو جووڵە و هەڵسوکەوتێکی دەباری، لە حاڵێکدا دەموچاوی چەپ و چیر دەکردەوە، سەیرێکی مردووەکەی کرد و رووی وەرگێڕا و دەستی لەسەر دەماری دەستی دانا و لەوێ دوور کەوتەوە و تۆزێك لەولاترەوە، پاڵی بە دیوارێکەوە دا. چۆنی دەستی لەسەر دەمارەکە دانابوو، زاری داپچڕیبوو و هەوڵی دەدا، هەوا هەڵمژێتە نێو سییەکانی. چاوە روونەکانی لە ژێڵڵا هاتبوو و رەنگی بە رووەوە نەمابوو و یەك پشوو بۆڵەبۆڵی بوو.

"هەی نیشتمانفرۆشینە، چەپەڵینە، زاڵمینە... "ئاتا" ئەو ولاتەی لە دەست دوژمنان دەرهێنا و بە ئێوە ئەسپارد، بۆ ئەوەی هەژار و لێقەوماوی تێدا بکوژن؟ نیشتمانفرۆشینە...."

ئەو جار سوڵتان، ژنە شینگێڕەکە، هات ژوور سەری مردووەکە و ئەژنۆی دادا و بە دەنگێکی خەمناك پێیدا هەڵگوت. ئاوری لە پیاو بەردەدا. هەم دەگریا و هەمیش پێیدا هەڵدەگوت. بە ئازایەتییەکەی حاجی و بە پیاوەتییەکە. بەوەی کە دوو رۆژ لەوە پێش لێی پرسیبوو، چۆنی پووریێ؟ و گوتبووی، ئەگەر پارەیەکم دەست بکەوێ لەو هەژاری و دەستکورتییە نەجاتت دەدەم. بە دەستی جوان و سەروکاکۆڵە هەوریشمینەکەی حاجیی هەڵدەگوت و هەورە رەشەکانی تەشقی ئاسمان و ئاوە بێ بوارەکان، چیای پڕ لە گابەرد و رەوەزیشی دەخستە نێو گۆرانییەکەیەوە.

لەو نێوەدا حەمە رەش وەك رق و تووڕەییەکی لە زەوییەوە هەڵقوڵیبێ، هات و لە لای قاچی مردووەکەوە راوەستا و زەردەیەکی هاتە سەر لێوی، پڕ لە تەوس، یانی دەمزانی ئاوای لێ دێ. ئەوجار نیگا تیژەکانی بەسەر یەك بە یەکی ئەوانەدا گێڕا کە لە دەوری تەرمەکە بوون.

حەمە رەش کابرایەکی کتێبخوێن بوو. خۆی دەیگوت، زمانی فەڕەنسی وەك بولبول دەزانێ. بەرهەمی نووسەرە فەڕەنسییەکانی دەخوێندەوە و بەردەوام ئاراگۆنی لەسەر زمان بوو. قەتیش هۆشی لەسەر خۆی نەبوو. رۆژێك دەتدی ئەوە لینگێکی پێڵاوەکەی سوورە و ئەوی دیکەی رەش. زۆر قسە و چیرۆکیان لەسەر بێ هۆشی و پەرش و بڵاوییەکەی هەڵبەستبوو.

زۆر گێچەڵ و چەرمەسەریی دیتبوو و هەموو تورکیا گەڕابوو. بەڵام چونکە کابرایەکی وازوازی بوو، نەیتوانیبوو لە جێیەك بگیرسێتەوە. لەو دنیایەدا هیچ شتێك نەبوو، ئەو کوڕە دانی بەخێری پێدا بنێ. زۆر نەترس و چاوقایم بوو و لە نیشانەداکردنیش ئەوەندە ئەنگێوە بوو، دەرزیی بە ئاسمانەوە هەڵدەگرت. لە کەس نەدەترسا و چیی بەمێشکیدا هاتبایە، لەکەسی نەدەشاردەوە. بۆ وێنە، چیی پێ خۆش بوایە بە دەروێش بەگی دەگوت و زۆر لە حاجییشی خراپتر پێ دەگوت، بەڵام دەروێش بەگ وەڕووی خۆی نەدێنا. حەمە رەش جگە لەو تایبەتمەندییانەی، عەشیرەت و کەسوکارێکی زۆریشی لە پشت بوون. لەسەر یەك، هەموو خەڵکی خزم و تایەفە و هۆزەکەی، ملهوڕ و بەدەست و تفەنگ و ئەنگێوە بوون. ئەو بنەماڵەیە، هەر لە کۆنەوە شارۆچکەکەیان چاوترسێن کردبوو و بەدفەڕی نەمابوو نەیانکردبێ. ئەو بنیادەمە سەیر و سەمەرانە، رێگر و دز و تاڵانچی و تا رادەیەکیش لایەنگری هەژاران بوون. خۆیان بە رەچەڵەك خەڵکی ئەو شارۆچکەیە نەبوون. لەولای تۆرووسەوە هاتبوون، بەڵام خۆشیان نەیاندەزانی لەکوێوە هاتوون. بە چەك و تفەنگەوە لە دایك دەبوون و چەك بەدەستیش دەمردن. تەنانەت ژنەکانیشیان وەك پیاوەکانیان بەدەست و تفەنگ بوون. جگە لە دوو خێزانیان، باقی خێزانەکانی ئەو بنەماڵەیە هەژار بوون و دەستیان نەدەگەیشتە دەمی خۆیان. زۆربەیان یان قاچاقچی بوون یان میراو.

بەڵام حەمە رەش میکانیك(فیتەر) بوو. هەر چاوی لە ترۆمبێل یان مەکینەیەکی لەکارکەوتوو کردبایە، دەیزانی کێشەکەی چییە و چاکی دەکردەوە. ترۆمبێل و مەکینەیەکی وا لەو دنیایەدا نەبوو ئەو نەتوانێ چاکی بکاتەوە. لە هەموو ناوچەکەدا، لە ئەدەنەوە تا مەرسین و ئەنتاکیە و جەیهان و نیغدە و زۆر جێی دیکەش، کەس نەبوو ناوبانگی ئەوی نەبیستبێ. هەموو رۆژێ، ژمارەیەکی زۆر ترۆمبێل و تەراکتەر و مەکینەی گەمی(قایق) و کامیۆنیان لە

ڕێی زۆر دوورەوە بۆ دێنا و دەیانگوت بە کەس چاك نابنەوە. یارمەتیی وەستا عوسمانی دابوو. هەر ترۆمبێلێکی دەیانهێنایە بەردەستی، چاکی دەکردەوە و هەقدەستیش هەرچی دابایانیٚ، بەبیٚ ئەوەی قسەیەك بکا، وەریدەگرت. کەس نەیدیتبوو جلوبەرگەکانی پەڵەیەکیان پێوە بیٚ، لە حاڵێکدا بەردەوام دەستی چەور بوون.

پیلی ژنەشینگێڕەکەی گرت، هەڵیستاندەوە و گوتی:"بیبڕەوە، بیبڕەوە دایکە، بیبڕەوە با دەنگی زوڵم نەبیستریٚ... بیبڕەوە با ئاغا و بەگەکان، تەرمەکەی حاجی لە نێو خۆیاندا شرت و گوم بکەن. بەلای ئەوانەوە، بەلای ئەو زاڵمانەوە، ژیانی مرۆڤێك، لە ژیانی مێشوولەیەکیش بیٚ قیمەتترە. ئەتۆ بێدەنگ بە، بۆ ئەوەی ئەوان گاڵتە بە تەرمەکەی حاجی بکەن و بڵێن، سەگێك لە سەگەلێك کەم بۆوە. ئەتۆ بێدەنگ بە دایکە، تا خوێنمژەکانمان بە دەنگە بەسۆزەکەت تێك نەچن. بێدەنگ بە دایکە..."

هەناسەیەکی هەڵکێشا و فرمێسکی لە چاوی گەڕا و لەسەری ڕۆیشت:"ئەوان پشت لەو نیشتمانە دەکەن. هاکا ڕۆژێك دیتت، بەچۆکدا هاتین و تێداچووین. حاجی هەر هیچ، مەرگی حاجی هەر هیچ. ئەوان هەموو ساڵیٚ، هەزاران کەس لەو چوکووراوایەدا، بە هەژاری و نەداری و نەخۆشی دەکوژن. خۆ ئەگەر هەر حاجییەکیان کوشتبایە، هەموانم ماچ دەکرد و لەسەر سەرمم دادەنان. حاجی شێت و شوورێك بوو، ئاو نەیدەپالاوت. جگە لەوەش، حاجی زەڕی بۆ خەڵك هەبوو. ئەوان لەبری ئەوەی ئەو خاکە بەپیت و بەرەکەتە بکەنە لۆکە، بەو بیانووەی کە چاندن و هەڵگرتنەوەی برنج ئاسانترە، شەتڵی لیٚ دەدەن و هەواکەی ژەهراوی دەکەن و هەموو ساڵیٚ هەزاران گەورە و منداڵ لە نۆبەتێدا دەکوژن. حاجی هێچێك، شێتێك... ئێوەش بەو چاوە ترساو و لە ژێڵلاهاتووانەوە سەیری زوڵمەکانی ئەوان دەکەن. ئەوان تاوانیان نییە. ئێوە تاوانبارن... تاوانبار ئێمەین. ئێمەی وەك حەیوان. یەکێك لە نێو ئێمە حاجیی کوشتووە. بەگ خۆی نایە دەستی بە خوێنی داماوێکی ئاوا سوور بکا. سبەری قاتڵەکەی حاجی دەگرن و سزای دەدەن و پیاوکوژە ئەسڵییەکەش قیت و قنج دەگەڕیٚ. هەمووومان ئەوە دەزانین و دیسانیش هەر کۆیلەیان دەمێنینەوە. تاوانبار ئێمەین... پیاکوژینە... پیاوکوژینە."

زاری کەفی کردبوو و دەموچاو و لێوی ڕەش هەڵگەڕابوون. لەویٚ دوور کەوتەوە. یەکیٚ دەیگوت هەقی خۆی بوو بکوژریٚ. چما دەکریٚ ئاوا بە بەگێکی وا مەزن هەڵشاخێی؟ یەکێکی دیکە دەیگوت، چما دنیا خراپ ببوو، ئەوپەڕەکەی بڕێکی تێهەڵدابایە و تەمبێیان کردبا. چما لەسەر دوو قسانیش پیاو دەکوژن؟... مشتومڕەکە هەر بەردەوام بوو تا دادئەستێن هات. لە

سەر مردووەکە هەڵڵایەك بوو سەگ ساحێبی خۆی نەدەناسییەوە. بن چنارەکە ئەوەندەی خەڵك لێ کۆ ببووەوە، ئەوانەی تازە دەهاتن، نەیاندەتوانی تەرمەکە ببینن. چەند گەنجێك لە چنارەکان وەسەر کەوتبوون و زۆریش چووبوونە سەربانی ماڵ و دووکانەکان و لەوێوە سەیریان دەکرد.

لەو حەیس و بەیسەدا، ترۆمبێلێك گەیشت و لە پشت حەشیمەتەکەوە رایگرت و ماهیر لێی دابەزی. هەر کەس دیتبای، تێدەگەیشت، لەخۆشییان وەختە بفڕێز چاوەکانی، دەموچاوی، سەر و قژ و کاکۆڵی، شادییان لێ دەباری، تۆزێك لەو تەمی تازیەبارییەی دەڕەواندەوە. چرچ و لۆچەکانی دەموچاوی رەویبوونەوە دەتگوت دەساڵێك گەنجتر بۆتەوە... ئەو بە جەندەرمەکەی گوت:"رۆڵە رێگەم بۆ بکەوە. دەمەوێ تەرمەکە و جەنابی دادوەر ببینم."

لەبزەکەی ئەوەندە بەگوڕ و فەرماندەرانە بوو، جەندەرمەکە هەر ئەوەندەی توانی ئەمرەکەی بەڕێوەبەرێ و بە قۆنداغی تفەنگەکەی حەشیمەتی بۆ لابدا.

چیی دەیکرد، نەیدەتوانی بڕوا بەو موعجیزەیە بکا. چۆن بوو؟ باشە چۆن ئاوا سووك و سادە لەو بەڵا گەورەیە نەجاتی ببوو؟ چۆن بڕوا بکا حاجی، هەر بەراستی کوژراوە؟ دەبوو بە چاوی خۆی بیبینێ جا باوەڕی دەکرد و تەواو شاد دەبوو. هەربۆیە بۆ ئەوەی تا زووە مردووەکە ببینێ، وێڕای جەندەرمەکە خەڵکەکەی لادەدا.

بەحاڵی سەگ خۆی گەیاندە تەرمەکە. حاجی بە زەحمەت دەناسرایەوە. بۆ دڵنیابوون، داهاتەوە و بە وردی سەیری مردووەکەی کرد و جا خۆی قیت کردەوە و رووی لە ئاسمان کرد و لەبن لێوەوە گوتی:"خوایە گیان زۆر شوکر، زۆر شوکر. شوکر موعجیزەکەت. تۆ بەهەق هەی. تاقانە و تاکی."

لە دادئەستێن نزیك بۆوە و بە سرتەیەك پێی گوت:"خۆ پێم گوت، زۆر جار پێم گوت، بەگ، ئەتۆ بەگێکی بە رەچەڵەك ئۆغوزی و ئەو هەر شێت وشوورێکە. ئەوە دامنا دوو قسەی سارد و سووکیشی لە زاری دەرپەڕی، دەی جا چییە؟ گوتم، خۆت مەهێنە ریزی ئەو. ئەوە لە شان و شکۆی تۆدا نییە. دیارە ئەو کابرایە هەقی خۆی بوو وای بەسەر بێ. کەس نەبوو پێی بڵێ، هەتیو خۆ ئەتۆ بنی رانت ناخورێ، دەچی و لە نێوەندی بازاڕێ و لەبەر چاوی چاك و خراپ بە کابرایەك، کە سەدان پیاوی کوشتووە، دەڵێی "شاخدار". خۆ ئەتۆ بۆ نانی شەوێت دامابووی... خۆ ئەگەر سەگ ئەجەلی هات، دەچێ گوو لە نێو مزگەوتێدا دەکا و بزن ئەجەلی هەستێ، نانی شوانێ دەخوا. وانییە جەنابی دادوەر؟ ئاخ دەروێش ئاخ... ئا خ خ خ براڵە ئاااخ.

ئەو قین و تووڕەییەت سەرت دەخوا. لە سایەی ئەو قین و رقەتەوە، تێداچی و لە سوێیانت جەرگ و هەناومان رەش دەبێ.

ماهیر دایە پڕمەی گریان. دەگریا و دەموچاویشی لە خۆشییان گەش ببۆوە. دەموچاوە خرپەنەکەی هاوکات دەگریا و پێشدەکەنی. چاوەکانی دەتگوت خولخولەن و لە چاڵی چاویدا دەخولانەوە. دادئەستێن راوەستابوو و بە سەرسووڕمانەوە سەیری دەەکرد.

ماهیر بەگ دەستی بۆلای دادئەستێن راداشت و گوتی:"بمبوورە. بمبوورە. خەفەتبارم، خەریکە دەخنکێم. ئەمن دەروێش بەگم لە خۆم و منداڵەکانیشم خۆشتر دەوێ. نەدەبوو کاری وای کردبا."

لە حالێکدا بە دەسرۆکەیەکی سپی چاوەکانی وشك دەکردەوە، هەوڵی دەدا بە نێو حەشیمەتەکەدا رێچکەیەك بکاتەوە. خەڵکەکە، کە پێیان وابوو ماهیر بەگ هەر بەراستی لە سوێی ئەو شێتە داماوە ئاگری تێبەربووە، بە رێز و حورمەتەوە پاڵەپەستۆی یەکتریان دەدا و رێگەکەیان بۆ دەکردەوە.

دوو خاوەن مڵك، کە دەستیان دابووە دەستی یەکتری و کلکیان تێك ئالاندبوو، دوای ئەوەی لە دوورەوە سەیرێکی حەشیمەتەکەیان کرد، وەك هیچ نەبووبێ دوور کەوتنەوە. یەکێکیان بەویدیکەی گوت:"دەروێش بەگ بۆ هار بووە ئەو هەمووە خەڵکە دەکوژێ؟ یانی ئەوەش بەشێکە لە نەریتەکانی ئۆغوز؟"

ئەوی دیکە زەردەیەکی تەوساویی هاتە لێوی و گوتی:"ئەگەر ئەوەندە کەر نەبوایە، هەتا ئێستا، ئەوەندە دەوڵەمەند و بەدەسەڵات دەبوو، هەموو ئەو شارۆچکەیە و ئەدەنە و کووزانی بەدەستەوە دەبوو. وا نییە؟ دەی باشتر..."

هەوا گەرم داهات و مێشە سەوزەکان بەنێو حەشیمەتکەدا وەك بریسکە دەهاتن و لە تەرمەکە دەنیشتن. منداڵ و پیر و پەککەوتە و نەخۆش و هەمو خەڵکی شارۆچکەکە لە بازاڕی ئاسنگەران و لە دەوری کۆ ببوونەوە و بۆ ئەوەی زووتر تەرمەکە ببینن پاڵەپەستۆیان بوو و مشتومڕ و شەڕ و هەڵلایەك بوو کەوچکی تێ نەدەگەڕا.

ژنەکەی حاجی بەخۆی و منداڵەکانییەوە لە گۆشەی دووکانێك بێدەنگ کرووشمەی کردبوو. نە کەس دەیدی و نە کەس ئاگای لێی بوو.

مچە شەل، کە شۆستەکە لە بن قاچە دارینەکانیدا تەق و هۆڕی بوو، بەخێرایی دڕی بە حەشیمەتکە دا و هەر گەیشتە سەر تەرمەکە، داهاتەوەو سەیرێکی کرد و دەسبەجێ گەڕاوە و

له حەشیمەتەکە هاتە دەرێ و بە هەشتاو بەرەو ماڵ بۆوە. بە پەلەپەل لە دەرگای دا. خۆ ژنەکەی درەنگی دەرگا هەڵگرتبا، دەرگاکەی دەشکاند. هەر وەژوور کەوت، دەستی ژنەکەی گرت و بردی بەرەو ژووری نووستنەکە و بە کەفوکوڵەوە گوتی:"رووت بەوە، رووت ب ە ە وە."

وای دەگوت و بە دەستە لەرزۆکەکانی دوگمەکانی دەکردەوە و هەوڵی دەدا خۆشی رووت بێتەوە.

ژنە لە ماوەی پێنج ساڵی ژن و مێردایەتییەکەیاندا، قەت نەیدیتبوو مێردەکەی ئاوا ورووژابێ. بە سەرسووڕمانەوە خۆی بۆ رووت دەکردەوە و دەیپرسی:"ئەوە شێت بووی؟ چ بووە؟ دەڵێی تێك چووی."

تاوێك دواتر جووت بوون. کە لەشی شەلە بەر ژنەکەی دەکەوت، وەك ئاگر دەیسووتاند.

ماهیر بەگ، کە بە حاڵی سەگ دڕی بە حەشیمەتەکە دابوو، دیسان گەڕایەوە ئەوێ. ئەوجار نەقیب لای دادئەستێن بوو. دیتنی ئەو دڵی خۆش کرد. لە خۆشییان شاگەشکە ببوو و نەیدەزانی چ بکا. خێرا خێرا دەچووە سەر تەرمەکە و لێی ورد دەبۆوە و بڕوای نەدەکرد. بۆ ئەوەی پێش بە پێکەنینەکەی خۆی بگرێ و شادییەکەی بشارێتەوە، لێوی دەکرۆشت. خۆی خەمبار دەکرد و هەوڵی دەدا ناخۆشییەکانی رۆژانی رابردووی بێنێتەوە بیر خۆی، بەڵام هەرکەس دەیدیت، دەیزانی شایی لەدڵیدا دەگەڕێ. لە روخساری و چاوەکانی و سەر و قژ و رێگەڕۆیشتن و راوەستانییەوە، شادی و بەختەوەری دەباری.

بە دەنگێکی کە هەوڵی دەدا خەڵکی دیکەش گوێیان لێی بێ، لە بن گوێی نەقیب گوتی:"ئەمن گوتم. لەوەپێششیش دەمزانی چ دەقەومێ. هەر بۆیە پارەم دایە و گوتم لەو شارە بڕۆ. بانگم کردە ماڵەکەی خۆم و گوتم، حاجی حاڵ و مەسەلەکە ئاوایە. تۆ هەڵەیەکت کردووە و خۆت تووشی گێچەڵ کردووە. دڵنیابە تۆڵەت لێ دەکەنەوە. هانێ ئەو پارەیە و سەری خۆت هەڵگرە و لێرە بڕۆ. نەڕۆیشت. بەچەقی نەعلەتدا چوبوو. باشە من ئەو فیداکارییەم بۆ کرد؟ هەر لەبەر ئەو برا رەسەنەم. لەبەر ئەوەی دەروێش بەگەکەمان، کە هەموو دنیای بەمن بەخشیوە، لەسەر سەیەکی ئاوا تووشی سەرئێشە نەبێ..لەگەڵ جارچی چاویان تێك هەڵەنگوت. جارچی بڵێی و نەڵێی بە تیزە بزەیەکەوە و وەك بڵێی ئاگای لە هەموو شتێکە، و هەموو شتێك دەبینێ، سەیری دەکرد.

ماهیر لەسەری ڕۆیشت:"بەڵێ ێ ێ... شێتەکانی ئەو شارۆچکەیە هار بوون.... بەڵێ ێ، هار بوون جەنابی نەقیب و جەنابی دادوەری بەڕێز... سووکایەتی بەهەموو کەس دەکەن، بەبێ ئەوەی هێندەی..."

جا بەر لەوەی قسەکەی تەواو بکا، سەیرێکی جاڕچیی کرد. جاڕچییش نیگا تیژەکانی تێوەبڕیبوو و زەردەیەکی گاڵتەجاڕانەی لەسەر لێو بوو. دەمودەست رووی وەرگێڕایەوە و بن پیلی دادئەستێنی گرت و لەوێ دوور کەوتنەوە.

چەند چڵە گیایەك بە پەنجەکانی حاجییەوە نووسابوون. دوای ڕۆیشتنی ماهیر، جاڕچی چاوی چووە سەر ئەو چەند چڵە گیایە.

## ١٠٤

جاڕچی کەڕەی بەیانی، لەخەو هەستا. ژن و منداڵەکەی هیشتا بەخەبەر نەهاتبوو. دەستی بە سەرودەموچاویدا هێنا و تیف تیفەی دا. ئەو جلوبەرگانەی لەبەر کرد، کە وەستا وایس لەسەردەمی زیندانیدا بۆی دووریبوو و ئەو ڕۆژەی دەچوو بۆلای سەرۆکی مەزن لەبەری کردبوون. بە کۆنەپەڕۆیەك تۆز و خۆڵی پێڵاوەکانی سڕییەوە. قژ و کاکۆڵی داهێنا و دەستێکی بەسمێڵیشیدا هێنا و لە نێوەڕاستی ژوورەکە، باسکی شۆڕ کردنەوە و ڕاوەستاو خەیاڵ هەڵیگرت. دەتگوت شتێکی لەبیر کردووە... لەبیری کردووە و وەبیریشی نایەتەوە. ئاخرییەکەی بەمێشکیدا هات، بچێتە باخچە. باخچەکە شەونم خووساندبووی. سەیرێکی نەمامە زەیتوونە تازە نێژراوەکانی کرد، بۆ ئەوەی بزانێ بەریان گرتووە یان نا؟ تیشکێك کەوتە ناخییەوە. بەسەر کاشییەکاندا کەوتە پیاسەکردن. هەتا خۆر لە پشت چیاکان و لەبن هەورەوە گزینگی دا، ئەو هەر دەهات و دەچوو. وێنەی کابرای کتێب بەدەست و گرژ و مۆن، بە زویری و خەمبارییەوە سەیری دەکرد. ئەمڕۆ دەتگوت پاڵتۆ بارانییە ئەرخەوانییەکەی لەسەر شانی خزیوەتە خوارێ. کە خۆر هەڵات، ژن و منداڵەکانیشی لەخەوێ هەستان. دەنگەدەنگە شادەکەیان لە نێو ماڵەوە تێکەڵ دەبوو و دەهاتە دەرێ. گوڵی باخچە پشکووتبوون. گەڵای ڕەزەکە تورت و تازە و شێدار بوو و ڕووناکایی بەرەبەیانیش تێکەڵاوی هەڵم. مێشەنگوینەکان بە ئاسمانەوە، خۆیان وێك دێنا و جووت دەبوون. قەت لە شوێنێك، ئەوەندە مێشەی پێکەوە نەدیتبوو، جووت بن. ئەگەر ڕاستیت دەوێ هەرگیز جووتبوونی مێشی نەدیتبوو. مارمێلکەیەکی سەوز، لەسەر کۆتەرەی دەم بیرەکە، زمانە سوورەکەی دەرهێنابوو و وەنەوزی دەدا. بۆ ئەوەی خەوی مارمێلکەکە نەڕزڕێنێ، بەسپایی دەرخۆنەی سەر بیرەکەی لابرد. زەردەواڵە زەردەکان لە شانەی سەر دارهەنارەکەی ئەولاترەوە بێ هێز و خەواڵوو دەجووڵانەوە. جاڕچی لەبەر خۆیەوە گوتی: بەستەزمانانە بەو زوقمە سەرمایان بووە. دوای ئەوە گوتی، ئەو زەردەواڵانە منداڵەکان ئەزیەت

دەکەن. هەتا دەرفەتە با لەکۆڵیان بکەمەوە. چووە ژووریٚ، کۆنەجەواڵێکی هەڵگرت و هات و بەسەر شانە زەرگەتەکەیدا کرد. زەردەواڵەکان بە شانەکەیانەوە گیران. بە راکردن جەواڵەکەی برد و بەو ئاوەیدا دا کە لە چیاکانەوە دەهات و ئاوەکە بردی و رۆیشت. جارچی بیری کردەوە، ئەگەر بێت و ئەمرۆ بەیانی زوو لە خەویٚ هەڵنەستابایەم و بە سرِی نەمدیتبایەن و بە مێشکمدا نەهاتبا، لەوانەبوو بە منداڵەکانەوە بدەن، ئێستا زیندوو بوون و بەرەو خۆری دەم ئاسۆ هەڵدەفرِین. شتێکی وەك ژان، وەك خەفەتێك لە ناخیدا، لە قووڵایی دڵییەوە سەرەتاتکێی کرد. بە غاردان هاتە سەر بیرەکە. مارمێلکەکە هێشتا لەو شوێنەبوو، کە خەونووچکە دەیبردەوە. ئەژنۆی دادا و سەری بردە نێو بیرەکەوە و لە ئاوێنەی تەرکی بیرەکەدا، کە زۆر دووریش بوو، چاوی برِییە وێنەی خۆی. ئاوێنەی بیرەکە روون و زوڵاڵ و بێدەنگ بوو. لە ژوورەوە هەروا دەنگە شادەکە دەهات. لە زارکی بیرەکە لاچوو و دەرخۆنەکەی لەسەر داناوە. مارمێلکەکە هەستابوو و بە سەرسوورِمانەوە سەیری دەوروبەری دەکرد.

لە حاڵێکدا هەموو هۆشی لەسەر مارمێلکەکە بوو، ژنەکەی هات و لە تەنیشتییەوە راوەستا. کە چاوی بە مارمێلکەکە کەوت، پێکەنی. مارمێلکە، بەبیٚ ئۆقرەیی بەملاولادا رایدەکرد. تاوێك دواتر لە دیوارەکە سەر کەوت و لە چاوان ون بوو. ژنەکەی کە پێدەکەنی، قوڵکەیەك دەکەوتە کوڵمەی. جارچی وانوقمی جوانی و چاو و وخسارە گەشەکەی و کوڵمە گەشەکانی و قوڵکۆکەی کوڵمەی بوو، هۆشی نەما. ژنە پەلەی نەکرد و زانیی جارچیی نوقمی چ بووە. ژنە لە نەکاو قاقای کێشا. لێوی و بەدوایدا هەموو روخساری جارچی پێکەنی و دەستیان لە ئەستۆی یەك کرد و چوونەوە ژووریٚز بەرچایی ئامادە بوو. هاتنە سەر سفرە.

جارچی لەسەر سفرەش چاوی لە ژنەکەی هەڵنەدەگرت و ژنە، کە حەز و تاسەی ئەوی دەدی، وەخت بوو لە بەر پێکەنین ببوورێتەوە.

کە دەرِابەی دووکانەکان هەڵدرانەوە، اتە بازارِ. لاقەکانی راکێشیان کرد بۆ دووکانی ئاسنگەرییەکە. ئەو دەمەی ئەو لە زیندان بوو، ژنەکەی ئەو قوفڵە گەورەیەی لە دەرگاکە دابوو. ئاسنگەرەکە لێرە... خۆی دوای دیتنی تەرمە خوێناوییەکەی ئەو، لێرە دانیشتبوو... سندان، کوورە و کەلوپەلی ئاسنگەرییەکە، پێش کوژرانی چۆن دانرابوون، هەر لەجێی خۆیان بوون. دەتگوت چاوەرِوانن رۆژێك ئاسنگەرەکە بگەرِێتەوە و بێتەوە سەر کارەکەی. موو بە موو، ئەو دیمەنەی هاتەوە بەرچاوی، کە جەندەرمەکان لەو جێیەی وا ئێستا لێی دانیشتووە، گرتبوویان و بردبوویان. دیسان لەبەر ماندوویی و شەکەتی، رێك چۆوە لەویٚ دانیشت. نە

دەیتوانی بیر لە شتێك بکاتەوەو نە هیچی دەدی. لە نەکاو ئەوەندە روون هاتەوە بەرچاوی کە چۆن بردیانە پۆلیسخانە و لەوێ نایب عەریف چۆن ئەشکەنجەی کردبوو. دەتگوت هەر ئێستایە و ژان و ئازار تەنگی پێ هەڵدەچنێ. دەمودەست هەستا و بەرەو خوارووی بازاڕێ کەوتە رێ. زەردەواڵە و مێشەکەرانە بە وزەوز لەسەر توێکڵە شووتییەکان دەخولانەوە. پووشکەبەقوونە بە باڵی درێژ و روونەوە هەر قولانجێك لە بەردەچنەکەی بازاڕەوە بەرز دەفڕین. دەتگوت بۆن بە بەردەکانەوە دەکەن. دەهاتن و دەچوون. سێ مێروولە عەجەمانەی دیت رایان دەکرد. ئەوانە لە مێروولەکانی دی گەورەتر بوون. بەرەو چنارەکە غاریان دەدا، کە ئاوە زولاڵەکە گۆمیلکەیەکی لەبن دروست کردبوو. جارچی بەبێ ئەوەی چاویان لێ هەڵگرێ، لەسەرخۆ و لە حاڵێکدا پێ بە پێی مێروولەکان دەڕۆیی، بەرەو قاوەخانەی بن چنارەکە دەچوو.

ماهیر قاباقچی ئۆغلی لە رووبەڕوویەوە دەهات. رەنگی بە روەوە نەمابوو. ترس سێبەری خستبووە نێو چاوی. کە هاتە پێشتر، راوەستا و بە روویەوە پێکەنی. خۆی لێ گێل کرد. تاوێك مێروولەکانی لێ ون بوو کە بەسەر بەردە سپییەکاندا رایان دەکرد و بەشوێنیاندا گەڕا.

ماهیر بەگ گەڕایەوە و هات دەستی لەسەر شانی دانا:"ئەوە لە چی دەگەڕێی جارچی؟ شتێکت لێ ون بووە؟ دەڵێی زۆر سەرقاڵی، نامانبینی. دەڵێم حاجیی داماویش تێدا چوو، حەیف بوو. وا نییە؟"

جارچی وەك شتێکی گلاو و پیسی وێکەوتبێ، مووچڕکەی پێداهات و خۆی راوەشاند و شانی لەبن دەستی هێنا دەرێ.

مات و بێ هەست سەیرێکی کرد و کەوتە رێ. لە مێروولەکانی دەگەڕا. هەتا قاوەخانەکە، بەبێ ئەوەی چاو لە بەردەکان هەڵگرێ و لە هیچ شتێك خافڵ بێ، رۆیشت و مێروولەکانی نەدۆزییەوە. دیسان چاوی لە عەرزی بڕییەوە و بە چاوگێڕان، گەڕایەوە. کە گەیشتە سەرەتای بازاڕی ئاسنگەران و گوێی لە دەنگی چەکوچ و سندان بوو، سەری هەڵێنا. وەستا وەسمان، وەستا عەلی و ئاسنگەرەکانی دیکە راوەستابوون و سەیری شتێکی زۆر دووریان دەکرد. جارچییش سەیری ئەوانی کرد. بازاڕەکەی تەڕ بوو. لایەکی بازاڕی ئاسنگەران بە نیلوفەر داپۆشرابوو. نیلوفەر گوڵیان دابوو و بەسەر تایەی ژەنگاوی و کۆنە ترۆمبێل و کامیۆن و گاسن و ئاسنەواڵە و زنجیری ئاسنیندا کە هەموو دەوروبەرەکەیان داپۆشیبوو، بۆن و بەرامەی دەپژاند. بۆنی گوڵەکان لەگەڵ بۆنی ئاو و ئاسن و رەژوو تێکەڵ ەبوو. چیاکانی رووبەڕوو ناسك ببوونەوە و دیار نەدیار لە نیلییەکی بزڕکاودا بە ئاسمانەوە نووسابوون.

بەبێ ئەوەی بتوانێ چاو لە عەرزی هەڵگرێ، چووە پێشێ. وەستا وەسمان، ئەو پیاوە کەمدووە لێی پرسی:"چیت بزر کردووە جاڕچی ئەفەنی، وا لەو بازاڕەدا لێی دەگەڕێی؟"

وەستا "عەلی"ـیش پرسی:"چیت لێ بزر بووە؟"

وەستا سالّح ئاکارجەییش لە حالێکدا دەمی سوورەوەبووی کێردێکی گەورەی دەکوتاوە، پرسیی:"چییە؟ چیت لێ ون بووە جاڕچی؟"

هەموو وێکڕا پرسییان:"چییە، چییە، چیت لێ ون بووە؟"

دوای ئەوە لە پڕ دەنگی چەکوچ بازاڕی پڕ کرد. دەنگی چەکوچ لە مێشکی گەڕا. جاڕچی سەرلێشێواو و لە حالێکدا شتێکی لەبیر کردبوو و هەوڵی دەدا وەبیری بێتەوە، لە نێوەڕاستی بازاڕی ئاسنگەرەکان حەپەسا.

قەت وەبیری نەهاتەوە کەنگێ ئەوێی بەجێ هێشت و کێ واوەی هێنا و لە بن چنارەکەی دانا. وەبیری نەدەهاتەوە بەدوای مێروولەدا گەڕابێ. لە بازاڕەکەدا لە هەندێ شت دەگەڕا، بەڵام ئەو شتانە چ بوون؟ هەر بیری دەکردەوە، بەڵام برزبووەکەی نەدەدۆزییەوە. لە روخساری ئەوانەدا کە لە قاوەخانەکەدا دانیشتبوون، لە نێو چڵ و چێوی چنارەکەدا، لە جووچکە پەڕەسێلکەکانی بن میچی قاوەخانەکەدا کە ئەو دەمەی دایکیان دەگەڕانەوە، بە جیك و فیك دەندووکیان دادەپچڕی و ملیان وا درێژ دەکردەوە دەتگوت ئێستا هەڵدەکەنرێ، لە شەپۆلی سەر ئاوەکەدا، لە دەنگێکدا، لە ساتەوەختێکدا، لە رێگەرۆیشتنێکدا و... بە شوێن هەندێ شتدا دەگەڕا. لەو قەرەباڵغییە زۆرەی دنیادا، لە وردەکاریی و ئەو هەمووە جۆراوجۆرییەدا، بە تاقی تەنیا... قاوەکەی خواردەوە. نێرگەلەیەکی لە بەردەم بوو.

"فەرموو جاڕچی ئەفەنی."

پشکۆکانی نێرگەلەکەی بارەوبار کرد. یەك دوو مژی لێ دا و دووکەڵەکەی هەڵمشت و چاویش چووە سەر ئەو گژ و گیایانەی لەسەر کۆمایەك خۆڵەمێش رووابوون و ئاخرییەکەی لەسەر گوڵە وەنەوشەیەکی بەرز گیرسانەوە. مێشکێکی رەش و بریقەدار خۆی گرمۆڵەکردبوو و دەچووە نێو گوڵێکەوە و دەهاتەوە دەرێ. پۆلێك گیای سەوز و ناسك سەر کۆما خۆڵەمێشەکەی داپۆشیبوو. هەتا ئێستا، ئەوشتەی نەدیتبوو، کە ئەو هەمووە گەشی و جوانییەی لێ هەڵدەستا. دەتگوت ئەو شتەی لێی دەگەڕا، دۆزیبۆوە. لوولە پێچ پێچەکەی نێرگەلەی بە ملیدا کرد و هەستا و کەوتە رێ. هاتە کارگە دارتاشییەکەی دەم رووبارەکە. ئەمجارەش مشارە دووسەرەکە سەرنجی راکێشا. ددانەکانی مشارەکە، بە نێو ئالّودارەکەدا جوان دەهات و دەچوو.

لایەکی دەموچاوی کابرای دارتاش لە لایەکەی دیکەی بچووکتر بوو. دەموچاوە درێژەکەی وا دیاربوو، دەتگوت دەیەوێ پێ بکەنێ و ناتوانێ. دارتاشەکە باسکی چەپیشی لەوی دیکەی درێژتر بوو. بەبێ ئەوەی پێڵاوەکەی داکەنێ و دەلینگی هەڵبکا، لە رووبارەکە پەڕییەوە. پێنج پەڕەکە، گوڵی مۆر و پەمەیی و سپیی دەرکردبوو. دارتاش چیی دەگوت؟ باسی چیی دەکرد؟ زەرنەقووتەی پەڕەسێلکە دەندووکە زەردەکانیان داپچڕیبوو و چەندی دەیانتوانی سەری بێ تووك و پەمەییان دەکێشا و دەیانجریواند. گەڵای چنار نوقمی ترس. لەولاترەوە چاوی بە کەلاکی ئەسپێك کەوت. بیست، بیست و پێنج سیسارکەی سەر و مل رووت بەدەوریدا دەگەڕان و یەك دووانێکیان بە شەقەی باڵیان دەدا و دەفڕین. لەشی سیسارکەکان سپی و چڵکن و باڵەکانیان رەش بوون. گەردەنیان وێك هێنابوو و شانبەشان بە فڕینەوە گەمەیەکی ئالۆزیان دەکرد. لوورەیەکی کپ لەلای شارۆچکەوە هات. لە حاڵێکدا گوێی لە لوورەکەی شارۆچکە هەڵخستبوو و بەبێ ئەوەی ئاگای لە تەڕبوونی دەلینگی بێ، لە ئاوەکە پەڕییەوە. کە سەری هەڵێنا، دیتی ئەوە لە نێو دەنگ و تەق و کوتی چەکوچاندایە. پڕیشك و پزیسکی ئاگر لە کوورە و کوانووەکانەوە دەپەڕییە بازاڕەوە.

وەستا وەسمان گوتی:"ئەتۆ کێشەیەکت هەیە. وەرە کووپێك قاوەی بخۆوە."

جاڕچی وەخۆ هاتەوە و بەرەو چنارەکە کەوتە رێ. بەدەم سەیرکردنی نەخش و نیگاری بەردەچنی بازاڕەکەوە، سێ مێرووڵەی دیت بە دەوری توێکڵە شووتییەکەوە دەخولانەوە و غارغارێنیان دەکرد. لە دەم شۆستەکە دانیشت و چاوی بڕییە مێرووڵەکان. منداڵەکانیشی لە باخچەدا، لە سەر بیرەکەوە رایاندەکردە لای سپی چناری بن رەزەکان و لەوێوە غاریان دەدا بۆ بن کەپرەکە و جار جارەش لە چاوان ون دەبوون.

دووکەڵێك بازاڕەکەی داگرت. لە پشت دووکەڵە خەستەکەوە و لە سەرووی پڕیشکەئاگرەکانەوە، چیا رووتەی دودڵدوڵ، پەمەیی و مۆر و تەماوی و ئەوەندە هەڵماوی کە دەتگوت لە شینایی ئاسمانەکەدا دەتوێتەوە، جارێ لە چاو ون دەبوو جارێ قیت و زەق بە دڵی ئاسماندا دەچوو. نیوە رووناك، وردە وردە کاڵ دەبۆوە... زۆر دوور و جار بە جاریش دوورتر دەکەوتەوەو تیژتر دەبۆوە...

سەدان روخساری تێکەڵ و پێکەڵ، ریشن، شڵەژاو و رەشهەڵگەڕاو، خەمبار، بزە لەسەر لێو، تێکچڕژاو، بە گوڕە گوڕ، بە ئاخ و ئۆفەوە و لە بن سمێڵە پڕەکانیانەوە، تووڕە و هەڵچوو...

چەنەوەڕ، تکاکارانە، ریاییکەرانە، خۆنوێن، ترساو و چاوەکانیان لە ترسێکی هەتا ئەوپەڕی ئازایەتیدا زەق و لە ژێلڵاهاتوو... لە نۆبەتێدا خۆیان گرمۆڵە کردبۆوە و بە لینگەفرتە و زراوچوو لە ترسێکی سامناکتر لە ترسی مەرگ، سەرلێ شێواو، پشت کۆماوە، خوێناوی و شڕ و شپڕیو و بەسەریەکدا کەوتوو...

مێروولەکان، بە پشتی سوور و نێوقەدی باریکەوە لەرە تاوەکە دەخولانەوە. مێروولەیەکی گرت و لە نێوقەدەوە لەتی کرد.لەتێکی مێروولەکە، خۆی پێ نەدەگیرا و خواروخێچ و بەخولەخول و داماو چووە نێو توێکڵی شووتییەکەوە و نەهاتەوە دەرێ... لەوێدا خوێنی لەبەر دەڕوا و خوێنەکەی لەسەر عەرزی دەمەیێ. بەزەیی بە مێروولەکەدا هاتەوە و کزەی لە جەرگی هات. لاقەکانی و ئێسکی پاژنێی ژانێکیان تێ گەڕا...

هەستا. خەڵکەکە هەموو قیت و ڕەپ لەسەر کورسیی قاوەخانەی بن چنارەکە دانیشتبوون. زۆربەیان سمێڵیان درێژ و شۆڕ بوو. وا دانیشتبوون، دەتگوت چاوەڕێی ڕووداوێکن. نە قسەیان دەکرد و نە دەجووڵان.

بێچووەکان دەندووکە زەردەکانیان داپچڕیبوو و ملیان تەواو درێژ کردبۆوە و کردبوویانە قاو قیژێك ئەوسەری دیار نەبوو. ئاوی بن چنارەکە هێدی هێدی دەڕژایە سەر بەردێکی بچووك. مێشەنگوینە ڕەشەکە بە وزەوزێکی شێتانە، کە جوان پێوەی دیار بوو تووڕەیە، دەچووە نێو گوڵێکی مۆر و گەورەی سەر کۆما خۆڵەمێشەکە و دەهاتەوە دەرێ. روخساری بنیادەمەکانی نێو قاوەخانەکە، زۆر زوو زەرد هەڵگەڕا. حاجی قۆرت بۆغا نێرگەلەیەك لەبەردەم، ڕێك لەسەر ئەو کورسییە دانیشتبوو، کە تاوێك لەوە پێش ئەو لەسەری هەستابوو. کووپێك قاوەی لە پێش و تەزبێحێکی دەنك درشت بەدەستەوە، دەستی ڕاستەی لەسەر ورگی دانابوو و لە تەنیشت زنجیرە زێڕی سەعاتەکەی کە پانزە هەودای هەبوو، تەزبێحی دەگێڕا. لە زار و زمانە بچووکەکەی زەڕنەقووتە پەمەیی پەمەییەکاندا... لە لووتی قۆرت بۆغاوە مووی سپی هاتبوونە دەرێ. برۆی تێکەڵ ببوونەوە و لووتی هاتبۆوە سەر دەمی. سمێڵی کەوتبووە سەر دەمی داپۆشیبوو. چەند تاڵە موویەکی ڕەشیش لە نێو سمێڵە سپییەکەیدا بەدی دەکرا. دووکەڵی جگەرە سەری پەنجە و سمێڵی زەرد هەڵگێڕابوو. پێدەکەنی و بە دەم پێکەنینەوە، ورگی هەڵدەبەزییەوە. ترسێکی نامۆ لە روخساری گەڕا. تەزبێح گێڕانەکەی خێراتر بوو.

جارچی لە ئاوەکە پەڕییەوە و بەرەوڕووی قۆرت بۆغا ڕاوەستا. ئەوجار هەموو شتێك ڕەویبووەوە و بە روونی دەیدی. زەردەیەك بە دڕدۆنگییەوە لە نێو سمێڵەکەیدا سەری لێ

شێوابوو. لەپڕ ڕەنگی بزڕکا و سپی هەڵگەڕا و چرچ و لۆچی دەموچاوی وەك شێتان هەڵبەزینەوە، توند بوون و تێك چڕژان.

جاڕچی دەمانچەکەی هەڵکێشا. دەمانچەکە لەبەر تیشکی خۆرەتاو، بریسکایەوە. لەسەر خۆ گوتی:"ئەوە یەك."

قۆرت بۆغا خۆی وێك هێنا. سپی سپی هەڵگەڕابوو. که خۆی گرمۆڵە دەکرد، دەنگێکی لێوە هات:

"ئەوە دوو..."

که لە کورسییەکە دەکەوتە خوارێ، گوتی:

"ئەوە سێ."

قۆرت بۆغا بەربۆوە و لەسەر پشت کەوت. دەستی چەپەی بەسەر کورسییەکەوە مایەوە و لاقی ڕاستەی بەرەو ورگی نووشتاوە و دەموچاوی خوێناوی بوو.

جاڕچی بە دەمانچەکەیەوە، لەسەرخۆ، شێلگیرانە و وەك پارە بژمێرێ، دووپاتەی کردەوە:"ئەوەش سێ."

ئەوجار بەدەوری مردووەکەدا خولایەوە و هاتەوە سەر جێیەکەی پێشووی ڕاوەستا. دەمانچەکەی تێگرت و هەموو فیشەکەکانی لە سینگی قۆرت بۆغادا بەتاڵ کردەوە. فیشەکەکان تلێپ تلێپ وەسینگی قۆرت بۆغا دەکەوتن و تەرمەکە، دەتگوت هەڵدەبەزێتەوە.

که دەمانچەکەی فیشەکی لێ بڕا، جاڕچی چاوی بڕییە تەرمەکە و سێ چوار جار بە دەوریدا خولایەوە. تاوێك ڕاوەستا و دوای ئەوەی زۆر بە سووکی و گاڵتەجاڕانە سەیری کرد، وەك ئەوەی هیچ نەقەومابێ، بەرەو لایەکەی دیکەی بازاڕ، بەرەو بازاڕی ئاسنگەرەکان کەوتە ڕێ.

## ١٠٥

ماهیر قاباقچی دەیگوت:"منداڵەکانمت لەسەر گەڕێن وەلی. ئەو بەڵایەت لە کۆڵ کردمەوە. ئەتۆ برایەکی خۆشەویستمی. چەندی چەند ساڵە قەدری تۆم نەزانیوە. هێشتا بەباشی نەناسیبوو. داوای لێبوردنت لێ دەکەم، دەی ی ی ی. دەی بڵێ بزانم ئەو کارەت چۆن راپەڕاند؟ چما ئەتۆ نەتگوت، ناتوانی تەنانەت مێروولەیەکیش لە بن پێتدا بفلیقێنیتەوە؟ بەڵام کە کار گەیشتە دۆستایەتی و برایەتی، شێتەت وەك مێشێك وردوپرد کرد. ئەوەتا هەموو شارۆچکە دەروێش بە قاتلی حاجی دەزانن. دەی پێ بڵێ ئەوە چۆن بوو؟ چۆن توانیت ئاوا سووك و ئاسان ئەم کارە بکەی؟ پێت وابوو کوژرانی دۆلك حوسێن بە ئەستۆی تۆدا دێنم، وایە؟ کوڕە خۆ ئەمن هەر دەمویست بە هەڕەشە ئەو کارەت پێ بکەم. چما ویژدانی من رازی دەبوو بەوەی وەها بوختانێکت پێ بکەم؟ قسەی من هەر هەڕەشەیەکی پووچ و بەتاڵ بوو و هیچی دیکە. ئەگینا وەك رۆژی روون دیار بوو کە من دڵم نەدەهات هیچ شتێکت لێ بکەم. تۆ خۆشت ئاگات لە دڵی من بوو و بزەیەکت هاتێ و هیچت نەگوت. دەی ی ی . دەی پێم بڵێ بزانم ئەو کارەت چۆن پێ کرا؟ باشە من پێم نەگوتی ئەو کارە بۆ تۆ لە ئاوخواردنەوەش ئاسانترە؟ ئێستا با دەروێش بێ و لە ئەستۆی خۆی دایڕنێ. ئەوە گاڵتەی پێ ناکرێ. مەحاڵە بتوانێ کلکی لەو تەڵەیە بێنێتە دەرێ. تازە نەجاتی نابێ. های هەی، دەروێش ئیتر تێکەوت و خیچا. هەموو رێیەکی دەربازبوونی لێ گیراوە. سوپاس ولی، سوپاست دەکەم برای ئازیز. ماڵ و ملکەکەم هەمووی بۆ تۆ. گیانم پێشکەشت. ها، ها، بڕوانە وەلی، لەمەودوا بەمن ناڵێی ماهیر بەگ، ماهیر ئاغا. وەك برادەرێکی گیانی بەگیانی هەر پێم دەڵێی ماهیر. دەی ی ی ی، پێم بڵێ ئەو کارەت چۆن راپەڕاند؟"

وەلی سەری بەردابۆوە و هیچی نەدەگوت.

"دەی بڵێ گیانەکەم. بڵێ با بزانم چۆن بوو؟ کە لە لای من رۆیشتی، هیچ پێتەوە دیار نەبوو دەتهەوێ پیاو بکوژی. لە دڵی خۆمدا دەمگوت، جا وەرە ئەو هەمووە ساڵە وەك برایەك

ئاگات لێی بێ و ئێستاش کە پێویستیت پێیەتی، یەك داوات بۆ جێبەجێ ناکا. دیارە دوایی رای خۆتت گۆڕیوە. هەرچۆنێك بێ، بڵێ بزانم چیت لێ کرد؟ دەی بڵێ دەی. وەختە بۆ بیستنەکەی سوێم بێتەوە."

وەلی سەری هەڵێنا و چاوی لە چاوەکانی ماهیر بڕین و وەقسە هات:"من تەنانەت مێروولەیەکیشم پێ ناکوژرێ. کەسیشم نەکوشتووە. ئەتۆ بە یەکێکی دیکەت بەکوشت داوە. با شتێکت پێ بڵێم ماهیر ئاغا، ئەگەر بتەوێ کوشتنی حاجی بەئەستۆی مندا بێنێ، ئارخەیان بە، بەر لەوەی بگیرێم و بمبەنە زیندان دەتکوژم. ئیتر گەیوەتە ئێسقانم. بەخودایەتی خودا، ئەنجن ئەنجنت دەکەم. تێگەیشتی؟ ئەمن چکارم بە کوشتنی حاجییە شێتە داوە؟ داماوی ئاوا ئێوە دەیانکوژن. ئێوە خوێنیان دەڕێژن. ئەگەر لە گیانی خۆت بێزار نی، دەستم لە بەرۆکی بکەوە؟"

ماهیر حەپەسا. بەڵام زوو وەخۆ هاتەوە و گوتی:"وا مەڵێ برالە. باشە، متمانەت بە من نییە، پێم مەڵێ، بەڵام بێت و تۆ بگیرێی، منیش پێوە دەبم. تۆ راست دەکەی. ئەوە پرسیارم نەکرد. هانێ، ها چاوەکەم. ئەتۆ لەمەودوا برای منی. بەو کارەت رزگارت کردم. دەی باشە متمانەت نەبێ و هیچ مەڵێ. ئەوەی گرنگە، ئەوەیە کابرا کوژراوە. ئێستا چۆنت کوشتووە، کەیفی خۆتە."

وەلی گرماندی:"ئەمن کەسم نەکوشتووە."

ماهیر بە جامەلۆسکێوە گوتی:"دەی باشە، باشە، تۆ نەتکوشتووە. ئاگات لە مەحموودی بێ زەوادیش نییە. هەر لێرەش نەبووی. هانێ. ها ئەوە بۆ ماڵ و منداڵەکەت خەرج بکە."

دراوێکی پێنسەد لیرەیی لە دەستیدا دەلەرییەوە. وەلی نەیدەویست دراوەکەی لێ وەرگرێ، بەڵام نەشیدەتوانی وەری نەگرێ. تاوێك دڕدۆنگ بوو و ئاخرییەکەی دەستی برد و وەریگرت و وەدەر کەوت.

تاوێك دواتر ماهیر جلوبەرگی لەبەر کرد. لە خۆشییان شاگەشکە ببوو. زەبرێکی گورچوبڕی لە دوژمنەکەی دابوو. زەبر دەوەشێنی، جا خۆشت راگرە. جا چ زەبرێکیش. چما ئەتۆ بەو مێشکە کۆنەتەوە کە هیی سەردەمی دەقیانووسە، دەرەقەت کەسێکی ئەمڕۆیی دێی؟ خراپ لە خەوێ هەستاوی، سەی بێ مێشك. هێشتا گوێت لە شریخەی ئەڵماس نەبووە. لەمێژ ساڵە لەو شارۆچکەیەدا و لە هەموو چوکووراوادا هەر گوویەکی ویستووتە بیخۆی، خواردووتە و کەسیش باشاری نەکردووی، ئیتر بەسەرچوو، ئەو رۆژانە. ئەو مەمەیە پشەکە بردی.

ئێستا دەبێ سەرۆکی پۆلیسخانە ببینێ. دەبێ بچێ و ئەو گەرایەی لە مێشکیدا دابنێ. دەبێ دارەکە لەسەری دەروێش بەگدا بشکێ. هەستی دەکرد بووەتە پەڕە کایەك. وەك دوای سەد ساڵ زیندانی کێشان ئازاد بووە. دەتگوت کابرایەکە، ئەو دەمەی پەتی سێدارەیان لە گەردنی کردووە، ڕێك لەو کاتەدا عەفو کراوە و لێی خۆش بوون. بەو حاڵەوە زۆر شەکەت و لە رادەبەدەریش شاد بوو. لە جەندەرمە پاسەوانەکەی بەردەرگای پرسی:"جەنابی سەرۆك لەوێیە؟"

بەبێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵام بێ، چووە ژوور سەرۆکی پۆلیس.

"دەی ی ی. چۆنی جەنابی فەرماندە؟ ئەوانە ڕۆژ نییە گێچەڵێکت تووش نەکەن. دەزانم لە داخی ئەو بەرماوی ئاغایەتی و بەگایەتییە ژیانت لێ تاڵە. ئیتر خەڵك لە دەستیان وەزاڵە هاتوون. پیاو دەکوژن. ملهوڕی دەکەن، زوڵم دەکەن و زۆر شتی دیکەش... خەڵك لە دەستیان وەڕەزن. کچیان دەچێتە ئەستەمبووڵ و لەوێ گانێ دەدەن و ئەوان لێرە شێتێکی لێقەوماو دەکوژن، هەر لەبەر ئەوەی پێی گوتوون شاختان گەیوەتە ئەستێرەکان. ئەوە کەنگێ شەڕ و بەڵای ئەوانە لەسەر ئەو مەملەکەتە لادەچێ و دەبڕێتەوە؟ هەتا کەنگێ دەبێ ئەو تۆقی زوڵم و ناهەقییەمان لە گەردەندا بێ؟ میللەتە دەبێ هەتا کەنگێ  ئەو هەروا لە بن سێبەر و تارمایی ئاغایاندا وەگیان بێ؟ ئەورووپا گەیشتە سۆشیالیزم و ئێمە هێشتا لە قۆناغی دەرەبەگایەتیی و لە سەدەی یازدەدا پەلەقاژەمانە. وایە جەنابی نەقیب؟ ئەو مەملەکەتە زۆر پێویستیی بە ریفۆرمە... دەی ی ی، دەنگ و باس چییە، باشە چۆنیان کوشتووە؟ ئەو لێقەوماوە سێ منداڵی وردیشی هەیە. ئەو بەستەزمانانە هەتیو و بێ باب کەوتنەوە. پیاو ئاگری تێبەردەبێ بۆیان. دەبێ تا زووە کۆمیتەیەکی هاوکاری و یارمەتی پێك بێنین. دەی ی ی، جەنابی فەرماندە، باشە چۆن لێی دراوە؟ باشە بکوژەکەی گیراوە؟ ئەو دەروێشە خۆی پیاوێکی خراپ نییە، ئەمن زۆرم پێ گوت، بەڵام بەگوێیدا نەچوو و نەچوو. زۆر لاسارە. خوێن بەر چاوی گرتبوو. ڕەگی ئاغایەتییەکەی هەستابوو. پێم گوت دەروێش گیان، ئەوە ساڵی ساڵان نییە. کوڕە ئێستا مێروولەیەکیش بکوژی، توندت دەکەن. خۆ شێت، بنیادەم نییە. لێی گەڕێ چیی پێخۆشە با بیڵێ. دەی باشە، کوڕە، گووی وشك بەقوونی کەسەوە نانووسێ. کچەکەت گانێ دەدا، خەڵکیش باسی دەکەن. دەرگا و دەروازە دادەخرێن، بەڵام زاری خەڵك داناخرێ. خۆ زاری خەڵکی قوونی خۆت نییە بیقووچێنی و نەهێڵی بتڕێ. چار نییە، دەبێ گوێت بئاخنی. پێم گوت، ماڵی خۆت توند بگرە و کەس بە دز مەگرە. ئەگەر کچەکەتت باش گەورە کردبا، تووشی ئەو گێچەڵ و گۆنگەڵە نەدەبووی. گوتم، مێشکت وەکار بخە برالە. کڵاوەکەی خۆت بکە

قازی. خۆ تۆ بە گیانی ناخێرت خوێندەواری، بەخێر نەتەوەپەرستیشی... خودا هەڵناگرێ خۆ دەروێش چاکەی بۆ من زۆر بووە، خۆی لێرە نییە خودای لێرەیە. ئەو نەبوایە، چما من دەمتوانی دەست بەسەر ئەو زەوی و زارەدا بگرم؟، هەر ئەو زەوی و زارەی مڵکی باب و باپیرانم بوو! بەڵام چما گوێی لەو قسانەیە؟... بەگوێیدا نەچوو و خۆی تووشی ئەو گێچەڵە کرد. ئەویش چ گێچەڵێك؟ گاڵتەی پێ ناکرێ. خوێن لە گۆڕێیە. چما لەو دەورو زەمانەیەدا دەتوانی لە چنگی قانوون رابکەی؟ چما سەردەمی ئیمپراتۆرییەکەی عوسمانلییە، دەروێش؟ نەخێر براله، ئیتر ئەو دەور و دووکانە بەسەرچوو. وەك دەڵێن: ئەو دەفتەرانە، مانگا خواردنی و مانگاکەش قەساب بردی. ئێستا سەردەمی دەسەڵاتی قانوونە. لەم سەردەمەدا هەر بنیادەمەی نرخی خۆی هەیە. لە هەمبەری یاسادا شوانێك لەگەڵ ئینونۆ فەرقی نییە. تۆ، ئاغا نا، بگرە سەرکۆماریش بی، دیسان ناتوانی بە کەس بڵێی پشتی چاوت برۆیە، چ بگا بەوەی کابرا بکوژی. بە کوشتی بدەی. ئەو حوکمەتە، حوکمەتی کۆمارییە، حوکمەتی خەڵکێکی گەنج و بەختەوەر و ئایدیالیست و نیشتمانپەروەرە. لە هیچ شتێك نابوورێ.... دەی ی ی، جەنابی فەرماندە، ئەرێ هەر بە راست، وا هەیە دەروێش هەر بگاتەوە و قۆڵبەستی بکەن، یان لە ئەستەمبوڵ دەیگرن و دەیهێننەوە ئێرە؟"

نەقیبە گەنجەکە، لەسەر مێزەکە سەری بەردابۆوە و هێڵی بەسەر کاغەزێکدا دەکێشا و بەبێ ئەوەی سەر هەڵێنێ، گوێی دابووە قسەکانی. هیچ جووڵەیەکیش بە روخسارییەوە دیار نەبوو.

"خۆ تەرمەکەتان دیت، وایە؟"

"بەڵێ دیتم. پتر لە پازدە خەنجەری لە سینگی درابوو. ئەنجنراوە. هێشتا بکوژەکەی نەگیراوە. هەمووان گومانیان لە دەروێش بەگە، بەڵام هێشتا بەڵگەیەکی پتەو بەدەستەوە نییە. ئەوەی هەیە تەنیا بوختان و تۆمەتە و هچی دی. خۆ بەو بوختانەشەوە ناکرێ کەس بگری. کابرا کە لە ئەستەمبووڵە... هەڵبەت لەوانەشە یەکێك لە دوژمنەکانی دەروێش بەگ، هاتبێ بە کەڵکوەرگرتن لەو سووکایەتییەی لەبەر چاوی خەڵك پێی کرا و بۆ ئەوەی بەسەر ئەویدا ساغ بکاتەوە وای کردووە، وا نییە؟ خەریکین لێی دەکۆڵینەوە. تاقە بەڵگەیەکمان بەدەستەوەیە..."

هەر نەقیب گوتی:"تاقە بەڵگەیەکمان بەدەستەوەیە." ماهیر زراوی چوو و رەنگی بە روخسارییەوە نەما و شادییەکەی رەوییەوە.

"گەنجێك، پانزە بیست رۆژان بە شوێن حاجییەوە بووە. ئەگەر بزانین کێیە، پێم وایە مەسەلەکە روونتر دەبێتەوە. حاجییە شێتە، لەو رۆژانەی رابردوودا پارەیەکی زۆریشی هەبووە.

لەگەڵ ئەوەدا ویستوویەتی را بکا بۆ ئەسکەندەروون. هەڵبەت جەنابیشت دەست لەوەیدا هەبووە."

"من... من؟... ئەمن دەمویست لێرە رابکا و خۆی نەجات بدا. دەمویست هەرچۆنێکی بووە دەروێشیش رزگار بکەم. دەمویست چەندی پێم دەکرێ نەهێڵم ئەو کارەساتە بقەومێ. هەر وەك گوتم، دەروێش بەگ نەبوایە، هەرگیز نەمدەتوانی ئەو ملکەی بابم وەرگرمەوە. دەروێش چاکەیەکی زۆری بۆ من بووە و نەمدەویست تووشی چەرمەسەری و کێشە بێ. هەر بەراستییش لەبەر ئەو بوو کە دەمویست حاجی لە شارۆچکە دوور بکەمەوە..."

"تۆ دەتەوێ بڵێی، دەروێش ئەو کابرایەی کوشتووە، ئاخۆ دەتوانی شایەتی بدەیت؟ هەر ئەوەی گوتت، دەتوانی هەر ئەوەمان وەك شایەت بۆ بنووسیت؟"

ماهیر وەك برێشکەی سەر سێڵ هەڵبەزییەوە.

"نەخێر، هەرگیز هەرگیز. ئەمن ناتوانم کەس تاوانبار بکەم. ناتوانم وا بڵێم. کێ ئەو گەنجەی دیتووە؟ ئاخۆ دەتوانن بڵێن یەکێکی چۆن بووە؟"

"ناتوانن. هەر بە شەو دەرکەوتووە و رۆژانە بزر بووە. لەوانەشە لە یەکێك لەو گوندانەی دەروو بەرەوە هاتبێ. لەوانەیە هێشتاش لە نێو شارۆچکە بێ. هەموو شتێك شێواوە. من پێم وایە لە دەروێش نەترازاوە. بەڵام جارێ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نییە سووری بکەینەوە. هەتا ئەو گەنجە نەگرین، ناتوانین دەروێش قۆڵبەست بکەین. ئەگینا شارۆچکە دەشێوێ و میللەت تێك بەردەبن. گرتنی دەروێش بەگ کارێکی سووك و ئاسان نییە. من دڵنیام... بەڵێ، ئەو گەنجە بێ ئەملاوئەولا پیاوی دەروێشە بەڵام..."

ماهیر هەستا و گوتی:"زۆرم کەیف بەتۆ دێ جەنابی فەرماندە. تۆ رۆڵەی ئازای نیشتیمان و ئارمانجخواز و نیشتمانپەروەر و دوژمنی ئاغایەتی و دواکەوتوویت. تۆ رۆڵەی راستەقینەی ئاتای مەزنی. دەزانم چ دڵێکی عەدالەت پەرستت هەیە و چەندە سووری لەسەر ئەرك و کاروبارەکەی خۆت و چەندەش رەسەنی. تۆ پێت وایە کوژرانی هاونیشتمانییەك وەك ئەوە وایە سی ملیۆن هاونیشتمانی کوژرابێن. دەزانم، بەلای تۆوە جیاوازیی حاجییە شێتەیەك و سەرکۆمار نییە. بۆ ئەوەی پەردە لەسەر ئەو جەنایەتە هەڵدرێتەوە، چیم لەدەست بێ دەیکەم و درێغیی ناکەم. من دەکۆڵمەوە و روونی دەکەمەوە بزانم ئەو گەنجە پیاوە دەروێش بەگ بووە یان نا. خۆ ئەو جەنایەتە دەروێش بەگ نا، بگرە براکەشم کردبێتی، لەقاوی دەدەم و پێتی دەناسێنم. دەبێ ئەو پیاوکوشتنە ببڕێتەوە. جا تۆخوا ئەوەش ژیانە؟ ترسی مەرگ حەجمینی

لەخەڵك هەڵگرتووە. هیچ کەس لەخۆی ئەمین نییە. دڵنیا بن، هەموومان لەو شارۆچکەیەدا قۆڵی لێ هەڵدەماڵین. حەزم لێیە، ئەوانەی ئەو کارەیان کردووە، جا هەر کەس بن، سزا بدرێن. ئەودەم ئێمەش لە شارە جوانەکەماندا لەوپەڕی هێمنی و ئەمینیدا دەژیین. بێت و ئەوانەی ئەو کارەیان کردووە، نەدۆزرێنەوە، لەوانەیە جەنایەتکارەکانی دیکەش نەناسرێن و لەقاو نەدرێن. هەر تکایەکم لێت هەیە. دەروێش نابێ بزانێ من هەوڵ دەدەم. جگە لە خودا و خۆت نابێ کەس ئاگای لێ بێ. ئەگینا، ئەو جەنایەتکارە دڵڕەقە، ئەو دەروێشە خووی گرتووە بە پیاوکوشتنەوە و رۆژێك دێ و ئەمنیش وەك حاجییە شێتە دەکوژێ."

نەقیب:"دڵنیابە کەس لەهیچ کوێ باست ناکا. زۆر سوپاس."

ماهیر دەستی نەقیبی گرتبوو و دەیگوشی و بەهیچ جۆرێك نەیدەتوانی لێی جوێ بێتەوە.

"یارمەتیت دەدەم. یارمەتیت دەدەم... خوات لەگەڵ. ئەوی لە بن بەرەیە دێتە سەر بەرەکە."

سەیرە، یانی ئەوەی حاجیی کوشتووە، وەلی نەبووە؟ یانی دەروێش درۆی لەگەڵ کردووم؟ متمانەی پێ نەکردووم؟ پێنج سەد لیرەشم بەخۆڕایی دا بەو سەیە؟ ئەگەر ئەو کارە بەو جۆرە بچێتە پێشێ، خۆ دینارێکمان پێ نامێنێ. نەکا وەلی ئەو گەنجەی لە تاریکایی شەوەکەدا دیتبێ؟ بەڵام خۆ وەلی تاقە رۆژێکیش چییە نەکەوتووەتە شوێن حاجی... ئەی وەلی بە دڵێکی پڕەوە نەیگوت من نەمکوشت؟ ئەی بۆچی ئەوەندەم تڕ و مەنەتی ئەو سەیە کێشا؟ کەوابوو ئەتۆش خۆت پێوە دەنواند وەلی؟ کەوابوو درۆت بۆ دەکردم؟ هەی بێ شەشەرف، هەی، کەوابوو تۆ گاڵتەت پێ دەکردم، ها؟ هەی سەگباب.

دەبێ تا زووە خۆم بگەیەنمە ئاوایی بۆلای دەروێش بەگ. لەوێ هەموو شتێك روون دەبێتەوە. ئێستا دڵەخورپەی ئەو جەنایەتەیانە و دەکرێ سووك و ئاسان لە هەموو شتێك تێبگەی و سووری بکەیەوە و موو لە ماست دەرکێشی. مزەفەریش ئەوەندە بەمشوور نییە بتوانێ شتێك بشارێتەوە. هەر ئەوەندە بەسە بەکەری بزانی و شووتییەکی وەبن هەنگڵی بدەی، خۆی لێ دەگۆڕێ و لەبنی کوولەکەی دەدا. بەڵام نا، متمانەی نییە. ناتوانێ متمانەم پێ بکا. هەرچۆنێك بێ گیا لەسەر پنجی خۆی شین دەبێتەوە...

کە گەڕایەوە ماڵێ، جیپەکە لەبەر دەرگا بوو. لەو رۆژە ئاڵۆزانەدا جیپەکە لەبەر دەرگا رادەگیرا. شۆفێرەکەی بەبێ ئەوەی پێی بگوترێ دەیزانی دەچنە کوێز مەکینەی ترۆمبێلەکە گرماندی و هەستا. ماهیر گوتی:"بەرەو ئاواییەکەی ساری ئۆغڵی."

شۆفێرەکە زەردەیەکی هاتێ.

بلێی ئەو گەنجە کێ بێ؟ نەکا ئەحەی خۆمان بێ؟ یانی پێت وایە ئەحە کەوتبێتە شوێن کابرا؟ خۆ ئەو لە مێژە مەزراکەی بەجێ هێشتووە. دەکرێ؟ نا، شتی وا ناکرێ. تۆ بلێی دەروێش ئامادە و گورج و گۆڵی نەبێ؟ گەنجێکی لەسەرپێی نەبێ؟ هەیەتی و زۆریشی هەیە.

سەری بەردابۆوە و بیری دەکردەوە. وادیاربوو گەیشتبوونە دەرگای کۆشك، سەری هەڵنەدێنا. شۆفێرەکە چەند جاری گوت:"گەیشتین، گەیشتینێ بەگ."

"هاااا، گەیشتین؟ بەڵێ؟"

لە ترۆمبێلەکەی دابەزی و بە هەڵەداوان لە پلیکانەکان وەسەر کەوت. لە سەر پلیکانەکان خاتوون و نوورخان و مزەفەر، مات و پەشێو بەپێرییەوە هاتن. ماهیر بۆ ئەوەی شتێکی لێ روون بێتەوە، سەیری نێو چاوی کردن. دەیزانی چاوەکان زۆر شت دەدرکێنن. بەڵام جگە لە سەرسووڕمان و شێواوی هیچی بۆ روون نەبۆوە. یانی ئاگایان لێ نەبوو؟

دەبوو بەجۆرێك روونی بکاتەوە. وەقسە هات:"خۆ بیستتان؟ شارۆچکە شێواوە. هەمووان دەروێش بەگ بە تاوانبار دەزانن. فەرماندەی جەندەرمە، دادوەر، مودیرناحیەیش هەر پێیان وایە. تەنانەت باسی ئەوە دەکرا، هەر لە ئەستەمبوول دەروێش بەگ دەگرن و بە کەلەپچەوە دەیهێننەوە ئێرە. بەڵام من پێم گوتن، رۆحیشی ئاگای لەو شتانە نییە. جارێ واز لە قۆڵبەستکردنی بێنن، بەڵام زانیویانە کێ کابرای کوشتووە و بەشوێنییەوەن. بەو زووانە دەیگرن. ئەگەر قاتڵەکە بگرن، قوڕمان بەسەر دەبێ. دەزانن یەکێکی چۆن بووە.

گەنجێکی کەڵەگەتی هەژدە ساڵانە. ئەگەر یەکێکی ئاواتان هەیە، خێرا لێرەی دوور بکەنەوە. بێت و بگیرێ، لە بن زمانی دەردەکێشن و دەروێش تێدا دەچێ. بەگ کاری وا ناکا. من دڵنیام نایکا. دیارە ئەو کوڕە پێی ناخۆش بووە سووکایەتی بە ئاغای کراوە و بەبێ ئەوەی بەگ ئاگادار بکاتەوە، چووە ئەو حاجییە نەگبەتەی کوشتووە. جا کێ ئەو ئیزنەی پێ داوە، نازانم. ئەگەر بەگ خۆی لێرە بوایە، قەت ئیزنی ئەوەی نەدەدا. ئەو کابرایەکی دووربینە. ئەمن تا بۆم کرا لەسەر دەروێش بەجواب هاتم، بەڵام چما بەگوێیاندا دەچوو؟ بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگریان بەدەستەوەیە. هەمووان ئاگادارن کە حاجی سووکایەتیی بە دەروێش کردووە. هەمووان دەڵێن مانگێکە گەنجێك بەدوای حاجییەوەیە. گەنجێکی چاوڕەشی کەڵەگەت. تەنانەت دەزانن رەنگی چاویشی چۆن بووە. ئەگەر ئەو کوڕە لێرەیە، وا باشترە، دەستبەجێ دەرباز بێ و ئیتر بەولایەدا نەیەتەوە، هەتا کەفوکوڵەکە دەنیشێتەوە. یان با هەر ئەمڕۆ خۆمان شرت و گومی بکەین و بیخەینە زۆنگاوەکەی ئاقچاسازەوە. چار نییە. فەرماندەی پۆلیسخانە، زۆر بە

وردی لێی دەکۆڵێتەوە. ئەو دوژمنی قەستە سەرمانە. جاران نێوانمان زۆر خۆش بوو. بەڵام لەو رۆژەوە کە لەگەڵ دەروێش ئاشت بوومەتەوە، رقی لێ هەڵگرتووم. کە لێشم پرسی بۆ وای، دەزانن چیی پێ گوتم؟ گوتی من دوژمنی قەستەسەری دۆست و برادەری ئاغاکانم..."

خاتوون و نوورخان و مزەفەر و کوڕە چکۆڵەکە هەموویان بێدەنگ بوون و وەك خەتایان کردبێ، چاویان دەگێڕا. هەمووان لێیان سوور بوو ئەو کارە بێ ئەملا و ئەولا لە بن سەری دەروێش بەگ دایە. بەڵام کێ کوشتوویەتی؟ ئەوەیان نەدەزانی.

مزەفەر لێبڕاوانە و بەدەنگێکی پتەو گوتی:"شتی وا نابێ. مەحاڵە بابم کاری وای کردبێ. ئەو هەر شتی وەك حاجییە شێتە بە بنیادەمیش دانانێ، هەتا بچێ دەستی خۆی بەخوێنیان سوور بکا. بەبێ ئیزنی ئەویش کەس لێرەوە ناچێ پیاو بکوژێ."

"ئەمنیش هەروام بە فەرماندە گوت. گوتم بەبێ ئەمر و فەرمانی دەروێش بەگ، بەتایبەتی ئەویش لێرە نەبێ، خەڵکی گوندەکەی ئەو ناوێرن پیاو بکوژن. ئەگینا دەروێش بەگیان دەگرت و بە قۆڵبەستراوی بە نێوەڕاستی بازاڕێدا دەیانهێنا و دایانبردە زیندان. بەڵام ئەو سەگبابانە، بەڵگەی پتەویان بەدەستەوەیە. نەکا لێرە بمێنێتەوە. وا باشترە هەتا زووە بڕوات. یان وەکی گوتم، با بیبەین و لە ئاقچاساز بیخنکێنین و شوێنبزری بکەین. ئەگەر ئێوەش ئەوەتان لەدەست نایە، "وەلی"یە رێگری ئێمە وەك ئاوخواردنەوە کاری وا رادەپەڕێنێ. وای جێبەجێ دەکا، کەس هەستیشی پێ نەکا."

"بڕوانە ماهیر بەگ، ئێمە هیچ ئاگامان لەو رووداوە نییە. خەڵکی ئێمە هیچ کامەیان لە خۆڕا ناچن حاجییە شێتە بکوژن. بێ و نەبێ لەسەر قومار کوشتوویانە."

"لەسەر قومار؟... لەسەر قومار؟ بەڵێ ێ ێ. راست دەکەی. ئەمن ئەوەم هەر بەمێشکیشدا نەهات. ئەگەر بە زەینمدا هاتبا، بە فەرماندەم دەگوت... هەرچۆنێك بێ لێرە نەمێنێتەوە باشترە، هەتا زووە با خۆی دەرباز بکا، یان..."

ماهیر هەتا دوانیوەڕۆی ئەو رۆژە چەند جاران دووپاتەی کردەوە و نووزایەوە، با خۆی دەرباز بکا...

"کوڕە سەیری ئەو مزەفەرە بکە. بێچووە شەیتان، دەستی باوکی لە پشتەوە دەبەستێ. هەر وەڕووی خۆشی ناهێنێ. وەك هیچ نەقەومابێ. هەر بەراستی تۆ بڵێی ئاگای لێ نەبێ؟ ئاخۆ وەلی کوشتوویەتی؟ لەوانەشە قوماربازێك کوشتبێتی... نا، نا، ئەو کارە کاری دەروێشە و تەواو. بەڵام بە دەستی کێ، کام پیاوی بۆی کردووە؟ لەوانەیە فەرماندە سەرەداوێکی کەوتبێتە دەست و

نەیویستبێ بەمنی بڵێ. دەی باشە، با نەیهەوێ. ئاخری ڕۆژێك هەر وون دەبێتەوە. دەروێش بەگیش بە لایەنی کەمەوە پێنج ساڵان لە تەویلە توند دەکرێ. با بکرێ.

تەنگی نوێژی شێوان بوو کە گەڕایەوە شارۆچکە. ماندوو و شەکەت، بەڵام بە کەیف. ئەگەر پیاوکوەژەکە گیرابا، یان ئەگەر دەروێش بەگ گەنجێکی هەژدە ساڵانەی لە نێو پیاوەکانیدا هەبا، تەواو باری دەکەوت و لێی دەقەوما. ئیتر بنەماڵەی ساری ئۆغلی، دەروێشی بە رەچەڵەك ئۆغوز لە ترێ سەی دەچوو و گەورەترین کۆسپیش لەسەر رێگەی ئەو لادەچوو. لەوانەش بوو بە نرخێکی زۆر کەم زەوی و زارەکەی دەروێش بەگ بکڕێ. ئەو زەوی و زارەی خۆی هەر نەیدەزانین بایی چەندەن، بەر و بوویەکی دەدا، بەشی وڵاتێکی دەکرد. مزەفەر زیرەك بوو، بەڵام بێ ئەزموون.

"دەنگ و باس چییە فەرماندە؟"

"گومانەکە خەریکە دەڕەوێتەوە و روون دەبێتەوە."

"چۆن؟"

"قوماربازەکانم یەك بە یەك هەڵسەنگاندم و لێم پێچانەوە. هەمووان بێ تاوانن. ئەوان زانیاریی پتریان لەسەر گەنجەکە پێ دام. شەوی رووداوەکە لەگەڵ حاجی بەرەو گردەکە رایان کردووە. ژنەکەی حاجییە شێتەش جوان دیتوویەتی. یەکی باریکەڵەی کەڵەگەتی کاڵ و چاودرشت بووە. ژنەکەی دەڵێ، هەر بیبینێ، دەیناسێتەوە. لە هەکوێیەك بێ دەیدۆزینەوە. دەنگ و باسی ئاوەدانی؟"

"ماتەمبارن. خاتوون و کچە و مزەفەر هەموو دەگرین. ئەگەر کاری دەروێش بەگ نەبوایە، بۆ دەبوو لە خۆڕایی بگرین."

"جا گەنجێکی وا لەنێو پیاوانی دەروێشدا هەیە؟ چۆنە هەمووان بێنین و پێشانی ژنەکەی حاجییان بدەین؟ خۆی دەڵێ پتر لە دە جاران دیتوویەتی."

"ئافەرم جەنابی فەرماندە، ئافەرم. هەموو خەڵکی ئاواییەکە دێنینە ئێرە و پێشانی ژنی حاجییان دەدەین. ناوی هەر هەموویان لە دەفتەردا نووسراوە. هەرکامیان دیار نەبوو، دیارە ئەو کوشتوویەتی. ئاوا دۆزینەوەی پیاوکوژەکە زۆر ئاسانە. بارەقەڵڵا کوڕە نیشتمانپەروەرەکانی ئەو مەملەکەتە هەر بژین. ئەو مەملەکەتە بەهۆی شان و باهۆی ئێوەوە، رۆژ بە رۆژ پتر پێشدەکەوێ و مەزنتر دەبێتەوە. ئەمنیش دەبێ بچمە ئاوەدانی و دەست بکەم بە لێکۆڵینەوەی خۆم. هەر شتێکم لە دەست بێ، درێغیی ناکەم. تۆ خۆت دەیبینی، کە من لە بەختەوەریی نیشتمان و هاونیشتمانییەکانم زیاتر، بیر لە هیچ شتێکی دیکە ناکەمەوە. هەموو دار و نەدارم بە قوربانی پێشکەوتن و سەرکەوتنی نیشتیمانەکەم بێ. تەنانەت ئەو کفنەشم لە پێناو زیندووکردنەوەی نەریتە

مەزنەکانی ئەو نیشتمان و میللەتەدا لەبەر کرد و چوومە ماڵی دەروێش بەگ. دەروێش بەگ خۆی کابرایەکی خراپ نییە، بەڵام تۆزێك شێتە. زۆریش خۆپەرست و لووتبەرزە. ئەگینا رازی نەدەبوو هاونیشتیمانییەك، تەنانەت هاونیشتمانییەکەی وەك حاجییە شێتەش، لە حەشیمەتی وڵاتەکەمان کەم بێتەوە. خودا هەڵناگرێ ئەویش خوازیاری سەرکەوتنی وڵاتە، بەڵام ناتوانێ بەسەر خۆیدا زاڵ بێ. کە هەڵدەچێ، ئیتر چاوی نابینێ و جڵەوی هەموو شتێکی لەدەست دەردەچێ و خۆشی نازانێ چ دەکا. ئەوەتا، قسەیەك، گوتنی شاخدار، وای دەهری کردووە، تووشی ئەو جەنایەتەی بکا."

خۆ ئەگەر ئەو پیاوکوژەشیان کوشتبایە، جەنایەتەکە دەبووە دووان و ئیتر پشتی ساری ئۆغڵی دەشکا. لەوانەیە ئەو گەنجە دوای گیرانەکەشی نەیەتە قسە، یان بۆ وێنە بڵێ، شانم هەڵێنەگرت و هەڵچووم و بەبێ ئەوەی بەگ بزانێ، کوشتم. یان لەوانەشە بڵێ، چونکە لە قومارێ پارەی لێ بردمەوە، یان چونکە دەیەویست ئەتکم بکا، کوشتم. تەنانەت ئەگەر ئەگەر نەشیتوانیبا ناچاریان بکا قاتڵەکەی حاجییە شێتە بکوژن، هەر ئەوەندەی توانیبا ناچاریان بکا لەو شارۆچکەی دەرپەڕێنن، دیسان خراپ نەدەبوو. بنیادەمی راکردوو، درەنگ یان زووو دەگیرێ. بەڵام ئەگەر بتوانێ بە دەستی ئەوان شوێنبزری بکا... دوای دەرهێنانەوەی تەرمەکەی لە زۆنگاوێ... جەنایەتی دوو بەرامبەر، ئەوکات ئیتر دەروێش بەگ رێیەکی نامێنێ خۆی لە سێدارە دەرباز بکا.

سەعات دەوروبەری سێی بەیانی بوو کە لە دەرگای کۆشکی دا. پاڵە و سەپانی پەمۆ خەریك بوون لەخەوێ هەڵدەستان. مزەفەر لەسەر پلیکانەکانەوە گوتی:"کێیە؟"

"منم رۆڵە، من، ماهیر... کارەکە خراپتر بوو. وەرە خوارێ. کوڕەیان دۆزییەوە. دۆزییانەوە و قوڕمان بەسەر بوو. پشتی بنەماڵەی ساری ئۆغڵی شکا. ئەمنیش ماڵوێران بووم. داوێنی منیشی گرتووەتەوە و منیشان تێوەرداوە. دەڵێن ئەمنیش دەروێش بەگم دەنە داوە و دەستم لەو جەنایەتە دایە. فەرماندە لە رووی خۆم گوتی:"پیاوکوژەکە ناسراوە."

مزەفەر بەخێرایی لە پلیکانەکان هاتە خوارێ. چرایەکی بە دەستەوە بوو. ماهیر چاوی لە نێو چاوی کرد. چاوەکانی گۆمی خوێن بوون. بەدڵیدا هات و گوتی، پێکاومانە، ئەگینا ئەو چاوانە لەخۆڕایی ئاوایان لێ نایە.

"پیاوکوژەکە کێیە؟ کێ کوشتوویەتی؟"

"یەکێك لە پیاوەکانی ئێوە. گەنجێکی هەژدە نۆزدە ساڵانە. ژنەکەی حاجییە شێتە دە جاران پتر لە بازاڕێ دیتوویەتی. دەیانەوێ هەموو خەڵکەکەتان بەرنە پۆلیسخانە و پێشانی ژنەی حاجییان بدەن. زوو بە کوڕم. زووبە مزەفەر. هەتا دەرفەت لەکیس نەچووە، با سەری ئەو کوڕە بەگۆمێدا

بکەین. چار نییە. ڕێگەیەکی دیکەمان نییە بۆ دەربازبوون. من بیرم لە هەموو شتێك کردووەتەوە."

"ئێمە کەسی وامان نییە، ماهیر بەگ. کەسی واشمان نییە ئێستاش بیەوێ پیاو بکوژێ. فەرموو وەرە سەرێ، فەرموون..."

"کەوابوو کەسێکی ئاوا، گەنجێکی ئاواتان نییە، وایە؟"

"بەڵێ، نیمانە. ئەو قسانەیان لەکوێوە هێناوە؟"

ماهیر دەستی بەرەو ئاسمان هەڵێنا:"خودایە گیان شوکرت. زۆر شوکر. یانی نیتانە؟ دەی باشە، بلێ ڕزگارمان بوو. زراوم چوبوو. خەریك بوو لە ترسان بمرم. دەی باشە، کەوابوو من وا ڕۆیشتم. با بچم بە ئاسوودەیی بنووم."

"مەڕۆ. هەر لێرە پشوو بدە. ئەوەندەش خۆت ئەزیەت مەکە. دیارە ئەو کارانە زۆریان ماندوو کردووی. مەترسە. بەو زووانە پیاوکوژەکە دەگرێ و هەموو شتێك روون دەبێتەوە. من دلنیام قومارکەرێك کوشتوویەتی. ئەتۆ خۆت نارەحەت مەکە...."

ماهیر بەبێهواییەوە گوتی:"خوایە شوکرت، شوکر وا لەکۆڵمان بۆوە و رزگار بووین. کەوابوو ئێوە گەنجێکی واتان نییە، نا؟"

"گەنجێکی وامان نییە پیاوی پێ بکوژرێ.

"خواحافیز رۆڵە. سەرەڕای ئەوەش ئاگادار بە مزەفەر بەگ. دەروێش بەگ کەنگێ دێتەوە؟ دەبێ بۆخۆم بچمە پێشوازی... ئەگینا لەوانەیە سەرئێشەی بۆ دروست بکەن. گوتت کەی دێتەوە؟"

"چوارشەممە بە فرۆکە. دیارە تەلەگرافتان بۆ دەکا. بەخێرچی. ماڵت ئاوەدان بێ."

لەگەڵ رۆیشتنی ترۆمبێلەکەی ماهیر بەەگ، مزەفەر دیسان رای دەکردەوە بەرەو ماڵی میرۆ. هە نیو سەعات جارێك لە دەرگایان دابوو. میرۆ لە لاشیپانەی دەرگاکەدا کرووشمەی کردبوو و ترس و چاوەڕوانی نیوەمەرگیان کردبوو. کە مزەفەری دیت، راچلەکی.

"نەهاتەوە میرۆ؟"

میرۆ بە داغ لەدڵییەوە لالایەوە:"نەهاتەوە بەگ، نەهاتەوە. هەر نەهاتەوە. ئەوە مانگێکە چاوەڕوانیم. سۆمای چاوم سپی بوون هێندەی چاوەڕێی بم...."

## ١٠٦

جارێکی دیکەش وەلیی لە فەلاقە کرد. دەبوو بچێتە بنەبانی مەسەلەکە و سووری بکاتەوە. ئەحمەدیشی هەر وا لێ کرد.

دیسان ڕۆژە پڕ لە خەم و چەرمەسەرییەکان دەستی پێ کردبۆوە. یان دەبوو خەریکی خاك و زەویزارەکە دەبووی و مەزرای تازەت زیندوو دەکردەوە و بەروبووی نوێت لێ بەرهەم دێنا، یان لەگەڵ ئەو بنیادەمانە دەستەوئێخە دەبووی. شەڕی گەورە... نەك هەر یەك دوو کێشەی بچووکیش، بەڵکو دنیایەك کێشەکی گەورەت بە ملەوە دەبێ.

دەبێ قەرزێك لە بانك وەرگری. هەمووان تەنانەت دەروێش بەگیش چاویان لە پێگەی تۆیە. چاوێکیان کردووەتە چوار چاو. هەر هەنگاوێکی دەینێی، ئاگری ئێرەییان کڵپە دەستێنێ و هێلانەت لە چاویدا دەکەن. نەك دۆنمێك زەوی، تەنانەت پارووەکانیشت دەژمێرن. دەبێ سەگی بنی سەگ بی و خۆشت لەگێلی بدەی. دەبێ وا بنوێنی نانی شەوێت نییە. ئاواش هێشتا هەزار قسە و قسەلۆکت بۆ هەڵدەبەستن. دەڵێن گیانی لەگەڵ دینارێك دەردەچێ و گوو ناکا دەڵێ نەوەك برسیم بێ... لەو قسە قۆڕانە با هەر بکەن و گوو بخۆن. هەر گوویەکی دەیخۆن با بیخۆن....

پشتی دەروێشت شکاند. تەواو باری کەوت. بەڵام ئەی ئەوەی دی؟ خۆ هەمووان وەك دەروێش بەگ گەمژە نین. لە ڕێوی سەگترن. بەڵام هەرچۆنێك بێ دەبێ مشووری ئەوانیش بخۆی. هەر پارچەیەك لەو زەوییەی لە سەری دانیشتبوون، گەنجینەیەکە. ئەو شێوازە دەقیانووسییانە بەکار نایەن. دەبێ دامەزراوەی گەورە و شێوەی مۆدێرن بێنیتە کایەوە. بۆ ئەو کارەش پێویستیت بە زەوی و زاری زۆر و سەرمایەی زۆروزەبەند هەیە. جا لەمەودوا وڵاتێکی زەوی و زاری گەورە و مۆدێرن بنەبێ، بەختەوەر نابێ. ئەو قسەی چاکسازی و دابەشینی و زەوی و زارەش وا کەوتووەتە سەر زار و

زمانان. ولآت پارچەپارچە کراوە. دواکەوتوویی و بەدبەختییەکەشمان هەر لەوەڕایە. لەبری ئەوەی زەوی و زار دابەش بکەی، وەرە زەویی سەد هەزار، دووسەدهەزار دۆنمی دروست بکە و ئەو وکات جا دەزانی ولآتەکەت چۆن پێش دەکەوێ. کارخانە و کارگە دامەزرێنە. گوندییش با لەو کارخانانەدا ببنە کرێکار. ئەی ئەگەر بوونە کرێکار؟... ئەوە زۆر خراپتر و مەترسیدارترە... کە زۆرینەی ولآتێك بوونە کرێکار، خۆ تازە کارەکە خراپتر دەبێ. کرێکار بەڵای گیانی ولآتن. کارێکی زۆر مەترسیدارە. بەگ و ئاغا و حکوومەت و گوندی و کرێکار... هەموو لە پێشت راوەستاون. دەست بەسەر دۆنمە زەوییەکدا بگری، دەتکوژن.

خۆ ئەگەر دەروێشەکان ژێر بوایەن و بیریان لە دوارۆژ کردبایەتەوە... هاریکاریی ئێمە لەگەڵ دەروێشەکان بە قازانجی هەمووومان بوو. ئێمەش و ئەوانیش. چار نییە. کەڵك وەرگرتن لە هێز و دەسەڵاتی کەسانی وەك ئەو بەسوودتر و ژیرانەترە. ئاوا، یەکەم کار و ئەرکمان ئەوەیە دەروێش لەو بەڵایە رزگار بکەین. ئەگەر وەلی نەیکوشتبێ... نا ئەو دەستەوستانە کەسی پێ ناکوژرێ. ئەگەر ئەحە نەیکوشتبێ... لە ئاوی خوڕ مەترسە دەتبا، لە ئاوی مەند بترسە گێژت دەدا و دەتخنکێنێ. بەو دەکرێ. ئەو پێی دەکوژرێ. ئەگەر ئەویش نەیکوشتبێ، پیاوی دەروێش کوشتوویانە. ئەگەر واش بێ، پێویستە ئەو گەنجەی کوشتوویەتی، بدۆزرێتەوە و سەری بە گۆمێدا بکرێ. بەڵام ئاخۆ ئێمە هەقی ئەوەمان هەیە؟ بینێری پیاوی پێ بکوژی و ئەویش کارەکەی جوان راپەڕێنێ، ئەوجار بشیکوژی. باشە ئەوە پیاوەتییە؟ کوڕە هەر کامێکمان گورگێکمان لە ناخیدا نوستووە. بەڵام چما هەموو ساڵێ بەهەزاران منداڵ بە نۆبەتێ نامرن؟ چما زۆر سووك و سادە نامرن و ژێر خاك ناکرێن؟ ئەویش با بمرێ و بڕوا. ئەی بۆ ئەو دەستی چووە خوێنی یەکێکی دی؟ ئەویش نەدەبوو فریوی ئاغاکەی بخوات و هەر لەبەر خاتری ئەو کابرایەکی لێقەوماو بکوژێ. ماسییە گەورەکان، هەمیشە ماسییە بچووکەکان قووت دەدەن. دەی با قووت نەدرێن. با چیتر نەبنە داردەستی بەگەکان. با بە گیانی خۆیان، نرخی کەرێتی و نەفامییەکەیان بدەن، بەشکم ئاقڵ بن.

"وەلی کەی دێتەوە؟"

"دوێنێ لێم راسپارد. ئێستا لە هەر جێیەك بێ، دەگاتەوە. ئیزن بدە سەرێکی خوارەوە بدەم. لەوانەشە لە خوارەوە بێ. ئەحمەدمان دۆزییەوە. لە مەزراکەی کوێرقۆیو بووە. بەرپرسی کرێکارەکان بووە.

"ئەویش دێ."

"جیپەکەم نارد بیهێنێ."

ژنەکەی چەند ڕۆژێك بوو، نەیدەزانی ماهیر بۆ وایە. جاری وابوو لە خۆشییان شاگەشکە دەبوو و جاری واش بوو، کپ و بێدەنگ خۆی دەخواردەوە. وەك گەڵای پاییز زەرد هەڵگەڕابوو. ئەو کابرایە چیی لێ قەوماوە؟ بێ و نەبێ شتێکی لە مێشکیدایە. لەوانەشە پەیوەندیی بە مەرگی حاجییەوە بێ. یانی حاجییە شێتە بە فیتی ئەو کوژراوە؟ ئەو کابرایە دوای ئەو مەسەلەی کفن پۆشینە، بووەتە بنیادەمێکی دیکە. جاری جاران، جگە لە ئیشەکانی خۆی، کاری بەهیچ شتێکی دیکەوە نەبوو. بەڵام ئێستا هەر تاقەتی کاری نەمابوو. جاری جاران لە مەزراکەی خۆی دوور نەدەکەوتەوە و بە هەموو کێڵگەکەدا دەگەڕا. چەند مانگێکە نەچووەتە مەزراکەی. ئەگەر چوویێش، هەروا سەرێکی داوە و گەڕاوەتەوە... نازانم چ خەیاڵێك لەسەری داوە.

ماهیر پێی وابوو، ئەگەر ئەو بەڵایەمان لەکۆڵ بێتەوە... ئاخۆ دیسان خۆی تووشی ئەو بەڵایانە دەکاتەوە؟ خودا نەکا. ئەو دەروێشەش دەبێ رزگار بکرێ. یان دەبێ خۆی لێ نەدەی. کاری قۆڕ و چەپەڵ و دزێو نەبێ نایکا. رق و قین شتێکی خراپە. هەموو ئەو کارانە لە رق و قینەوە بەسەر بنیادەم دێن. دەروێش لەو گێژەنە رزگار دەکەم. لێقەوماوە. هەرچۆنێك بێ ئەویش ئینسانە...

"ئەمرێکت بوو ئاغا؟"

سەری هەڵێنا و وەلیی دیت. ژەهر و قوزەڵقورت لە نێوچاوانی دەباری. چاوی ئاگرین. هەستا.

"با بچینە ژوورەکەی دی."

وەلی بەدوویدا چوو. کە دەرگاکە داخرا، بۆ لای ئەو گەڕاوە و گوتی:"سەیرکە وەلی. شتێکە دەبێ روون بێتەوە. من دەبێ لێم سوور بێ ئەو کابرایە تۆ کوشتووتە یان نا؟ ئەگەر تۆ نەتکوشتبێ، بە ئەمر و فیتی دەروێش کوژراوە. لێکۆڵینەوەکان تا ئێستا وایان دەرخستووە، گەنجێکی هەژدە ساڵان لەمێژ بووە بە شوێن حاجییەوە بووە. ئەتۆ بەدووی حاجییەوە بووی؟ بڵێ وەی، بڵێ، دیسان هەر براین."

وەلی هەڵچوو و بە قەڵسی وەڵامی داوە:"پێم گوتی ئەمن تەنانەت مێروولەیەکیشم پێ ناکوژرێ. ئەمن هیچ پەیوەندییەکم بەو جەنایەتەوە نییە. حازرم دەستت بۆ بەقورئانێدا بدەم."

"ئەی تۆ پێت وایە کێ کوشتوویەتی؟ دەروێش؟"

وەلی زەردەیەکی تەوساویی کرد:"دەروێش نەبێ، بە کێ دەکرێ؟ چما دەروێش ئەو چاوقایمی و بێ ئەدەبییەی حاجییە شێتەی پێ قووت دەچوو؟ عەرز و ئاسمانیش سەر لێك بدا، تەحەمولی ناکا. هەموو دنیا ئەوە دەزانێ. تۆ لەخۆڕایی نیگەران بووی. چما دەروێش دەیهێشت نانی زیندوو بخوا؟ ملك و ماڵەکەی هەموو دادەنا و نەیدەهێشت حاجییە شێتە نانی زیندووان بخوا. ئەتۆ لەخۆڕایی خۆتت ماندوو کرد. ئارخەیان بە، دەروێشیش هیچی لێ نایە. ئەو کارێکی وا ناکا کلکی بە تەڵەوە بێ. ئەوجار، بەگەکانی ئەدەنەشی لە پشتن. بێت و پێی بڵێن پشتی چاوت برۆیە، دەیکەنە هەڵڵایەك کەوچکی تێنەگەڕێ. هەتا ئەنکەرە دەچن. ئەوەت نەدەزانی؟ پێت وایە دەروێش بەگ لەسەر حاجییە شێتەیەك لە زیندانێ توند دەکەن؟"

"یانی تۆ نەتکوشتووە؟"

"من نەمکوشتووە."

"زۆر باشە وەلی. بڕۆ بۆ مەزرا. ئەو پێنج سەد لیرەیەش کە پێم دای، لەسەر خۆتی دەنووسم. تۆ دیسان برای منی، پیاوی منی. مەزراکەم بەتۆ سپارد.

وەلی کە لە دەرگاکە وەدەر دەکەوت، ئەحمەد لە پلیکانەکان دەهاتە سەرێ.

"وەرە بزانم ئەحە، ئەوە لەکوێ بووی؟"

دەرگای پێوە دا و نێوچاوانی تێك ناو چاوی لە ئەحە سوور کردەوە:"جا راستییەکەی دەڵێی. من دەبێ لێم روون بێتەوە. بڵێ بزانم حاجییە شێتە تۆ کوشتووتە؟ تۆ پانزە بیست رۆژان بەدوویەوە بووی؟"

ئەحمەد بزەیەکی هاتێ، بەڵام چیی نەگوت. سەری هەڵنەدێنا.

"ئەوە زمانت شکاوە؟ مەترسە، بڵێ."

ئەحمەد هەروا بێدەنگ بوو.

"ئەگەر تۆ کوشتووتە، هەتا درەنگ نەبووە با مشوورێکی لێ بخۆین، بۆ ئەوەی دواتر تووشی گێچەڵ نەبین."

ئەحمەد متەقی لێوە نەهات. شانی گرت و رایتلەکاند:

"دەی بڵێ بزانم ئەتۆ، پانزە رۆژان بە دوویەوە بووی؟"

ئەحە دیسان هیچی نەگوت. ماوەیەك ئاوا بەرۆکی ئەحەی گرت و رایوەشاند و دایە بە مستەکۆڵە. ئاخریەکەی ئەحە زمانی پژا و گوتی:"پانزە رۆژان من بە شوێنییەوە بووم."

"تۆ کوشتت؟"

ئەحە دیسان هیچی نەگوت. زاری کردەوە  و چیی جنێوی دەیزانی پێی دا. بەڵام متەق لە دار و دیواریٚ دەهات و لەو کابرا چیاییە نەدەهات. ئاخرییەکەی کەوتە پاڕانەوە:"بڵێ، دەی بڵێ. ئەگەر قسە نەکەی دەتدەمە دەست جەندەرمان. بۆچی لاڵ بووی بەڵای گیانی من. بڵێ و بیبڕەوە دەی."

چونکە هیچ وەڵامێکی وەرنەگرتەوە، دیسان دەهری بوو و دەستی کردەوە بە هەڕەشە و گوڕەشە و ئاقیبەت نەرم بۆوە و لە حاڵێکدا چیی نەمابوو زۆڕ زۆڕ بگرییێ، کەوتە تکا و پاڕانەوە:"کوڕە ئەو لاقانەت ماچ دەکەم ئەحمەد. بڵێ، بڵێ گیانەکەم. مەمکوژە. وەزگم پێ مەدە. ئاخر من بەگیانی ناخێرم مامی تۆم. باشە تۆ کوشتت؟ ها؟ دەی بڵێ بزانم تۆ کوشتت؟ چما تۆ کێردەکەت هەتا بن دەسکەکەی لە زگی ڕۆنەکرد؟"

ئەحمەد متەقی لێوە نەدەهات. ماهیر لە قسە کەوت. ئیتر خۆی بەپێوە پێ ڕانەدەگیرا.

"کەواتە تۆ کوشتت. وایە؟"

ئەحمەد دیسان زاری بوو بە تەڵەی تەقیو. ماهیر ئاخرییەکەی لەبن لێوانەوە گرماندی:

"وەی خودا بتباتەوە. ڕاستەوڕیٚ بچۆوە مەزرا و لەویٚ وەدەر نەکەوی. بڕۆ دەی. نەگبەت."

جا ئێستا خەریك بوو دەیزانی دەروێش چۆنە. بەو بوونەوەرانە کە زار داناپچڕن و متەق لە دار و بەرد بێ لەوان نایە، بەو بنیادەمە بێ زمانانە، پیاوکوشتنی چی، دەکرێ کودتاش بکەی.

یانی، یانی ئەو گەنجە ئەحەی ئێمە بووە؟ کوڕە بڵێم خودا چیت لێ بکا... خودا بتباتەوە... یانی؟ ئەگەر ئەحمەد کوشتبێتی، باشترە بێ و دانی پێدا بنێ وا نییە؟ ئەو بنیادەمانە، بوونەوەرێکی ئەوەندە سەیر و سەمەرەن نازانن چۆن شانازی بەخۆشیانەوە بکەن. ئەو هەمووەیان بەسەر هاتووە، ئەوەندەیان تێهەڵدراوە، متمانە بە کەسی لەخۆیان گەورەتر ناکەن، ئەگەر بابیشیان بێ. ئەو سەگی سەگبابانە، دەڵێی پەیکەری گومان و دڕدۆنگین. تەنانەت متمانەی بە منیش نەکرد.

نەکا خۆی نواندبێ؟... نەکا بیەوێ نانێکی لێ بخوا؟ گوندی زۆر بەفرت و فێڵن. ئەوانە بۆ قازانجی خۆیان لە هیچ فرت و فێڵ و درۆ و دەلەسەیەك ناپرینگێنەوە.

تۆ بڵێی؟...

## ١٠٧

ماهیر قاباقچی ئۆغڵی پەشێو و بێ ئۆقرە بوو. دیسان پرسییەوە. لەوانەبوو لە بەیانییەوە تا ئێستا ئەوە دەیەمین جاری بوو دەیپرسی. وەڵامی وەرگرتەوە:

"فڕۆکەکە، نیو سەعاتی دیکە لە فڕۆکەخانە دەنیشێتەوە."

ماهیر قاباقچی ئۆغڵی گووپی هەڵدەدا و بایەکەی بەتاڵ دەکردەوە و بە پفە پفێکەوە دەیگوت:"نیو سەعاتی دیکە؟ نیو سەعا؟" و بەبێ ئۆقرەیی لە هۆڵی چاوەڕوانیی فڕۆکەخانەدا چاوەڕوان بوو.

ئەگەر مزەفەر بە پیر باوکییەوە نەهاتبوو... نایە، ناتوانێ بێ. ئەوان کەیفیان بەیەکتری نایە.

ئاخرییەکەی فڕۆکە دەرکەوت. ماهیر چاوی تێوە بڕی. دێی، دێ. بەخێر دێی و خێر و بەرەکەت دێنی. وەك شێر دێی. بەڵام وا دەکەویتە قەفەزەوە، تا مردن نەجاتت نابێ. شێرەکەی من، پاڵەوانەکەم، دەروێشە بەرەچەڵەك ئۆغوزەکەم. کەلەپچە و پەت چاوەڕوانتن. بەخێر هاتی و خێر و بەرەکەتت هێنا، گەوادی کفن خۆشەویست. ئەگەر ئەتۆ ئەو کفنەت لەبەر من نەکردبایە و ناچارت نەکردبام بەو گەد و گیپاڵەوە بە نێوەڕاستی بازاڕێدا بڕۆم، ئەو گێچەڵ و بەڵایانەشت تووش نەدەبوون. کفن پۆشینی من چ سوودێکی پێ گەیاندی شێرەکەی من؟ چەند لیرە چووە گیرفانتەوە؟ هۆی دەروێش پاشا، ئاخر رەچڵەکە ئۆغوزەکەتی پێ مەزنتر بوو؟ وای لێ هات ئیمپراتۆریات بۆ پێك بێنێ؟ هەر شتێك تۆڵەی لەسەر بێ، بۆ گلەیی نابێ. زەبری خۆت وەشاند، جا خۆشت راگرە. لە فڕۆکە دادەبەزی و دەستت دێنیتە نێو کەلەپچەوە و رێك بە نێوەڕاستی بازاڕدا بەرەو بەندیخانە دەڕۆی...

فڕۆکەکە نیشتبۆوە و موسافیرەکان یەك یەك و دوو دوو لە پەیژەکەوە دادەبەزین. هێشتا دەروێش دیار نەبوو. نەکا ئەو بێناموسە خۆی ون کردبێ؟ ئاگای لەو مەسەلەیە بووبێ و رای کردبێ بۆ ئەورووپا؟ یانی رادەکا؟ ئەو لە ئەورووپا هەڵناکا. پیاوەکانی ئەو لێرەن. هەر لە

شارۆچکە وەدەر بکەوێ، وەك فوودانەیەکی دەرزیی تێڕۆکرابێ، دەپووچێتەوە. هەموو کەسێك ناتوانێ لە ئەورووپا هەڵبکا. بۆ هەڵکردن و راهاتن لەگەڵ ژیانی ئەورووپا، دەبێ ئاقڵ و چاوکراوە بی. ئەورووپا جێی پیاوکوژی بێ مێشك و گەمژەی وەك دەروێش نییە. هەر کەسە و کاری خۆی.

تارمایی دەروێش لەسەر پەیژەکە دەرکەوت. دڵی کەوتە زرم و کوت.

دێ، دێ. نێچیرەکە بە پێی خۆی دێ بەرەو داو. دەروێش بەگ بەرەو پەتی سێدارە دێ. ئاخۆ رەچەڵەکی ئۆغوز، ئەو رەچەڵەکەی ئیمپراتۆریای دامەزراندووە، لە مەرگ دەترسێ؟ بەلارەلار دێ، دێ. وەرە، وەرە، وەرە... راستی و حەقیقەت چاوەڕێتە براله گیان. ماهیر ئاغات، کوڕەکەی قاباقچییە گوله، کە تۆی لە گیانی خۆی خۆشتر دەوێ...

دەروێش لە پلیکانەکان دابەزی و بەرەو ماهیر رۆیشت. چاویان تێك ئاڵقا و هەردووکیان بزەیان هاتێ. ماهیر چەند هەنگاوێك بەپیرییەوە چوو. کە گەیشتنە یەکتری، داهاتەوە و ویستی جانتاکەی لێ وەرگرێ. دەروێش نەیدەویست بیداتێ، بەڵام ماهیر بەزۆری لە چنگی دەرهێنا.

"بەخێرهاتییەوە براله. بەخێر هاتییەوە و خێر و بەرەکەتت هێناوە. نازانی چیها شتی باش لێرە رووی داوە. بیستووتە؟ حاجییە شێتەیان کوشتووە. حەفتا و پێنج برینی کێردی پێوە بوو. سینگی وەك بێژینگ دابێژرابوو. تۆڵەی تۆیان لێ کردەوە. لەو دنیایە گاڵتە بە شەرەفی هەر کەس بکرێ، ناکرێ گاڵتە بە شەرەفی دەروێش بەگی ئۆغوز زادە بکەی. هەر کەس بەربینگ بە وەچەی ئۆغوز بگرێ، ملی دەشکێ. هەموو دنیا بەوەی زانی. کارێکی باشت کرد براله. بەڵام ئەو منداڵەش زۆر کرچ و کاڵ و ناشییانە کارەکەی کردووە. تەواو پەتەی خۆی خستووەتە سەر ئاو و هەموو ناسیویانە. مانگێك زیاتر بەدووی حاجییە شێتەوە بووە و ئاخرییەکەی لێی داوە و کوشتوویەتی. دەڵێن گەنجێکی هەژدە نۆزدە ساڵانەیە. دیارە هەر دەیگرن. هەموو خەڵکی ئاوەدانی دێنن پێشانی ئەو کەسانەیان دەدەن، کە ئەویان دیتووە. شایەتەکان، یەك و دووان نین، بەڵکو پانزە کەسن. دیارە من حەددی ئەوەم نییە شت فێری تۆ بکەم و وەپێشت بکەوم، ئەگەر ئەو کارەت بە یەکێکی بەئەزموون راپەڕاندبایە... خۆ ئەگەر پیاویشت بەدەستەوە نەبوو، داوات لەمن کردبایە، بۆم دەناردی. من لەوانەیە پتر لە پانزە پیاوی ئامادەم لەبەر دەست بوون، کە هەر کامیان بە ئاماژەیەك و چاوداگرتنێك، ئەو شێت و شوورەیان شوێنبزر دەکرد... دیارە هەر دەیگرن. دەبێ کارێك بکەین را بکا، یان سەری بەگۆمێدا بکەین. بە مزەفەرم گوت..."

گەیشتنە لای ترۆمبێلەکە. ماهیر جانتاکەی برد و خستییە سندووقەکەوە و هاتەوە و دەرگای ترۆمبێلەکەی بۆ کردەوە و گوتی:"فەرموو بەگ، فەرموو... سەفەرکردن بە تەیارە زۆر خۆشە... مزەفەر بۆی گرنگ نەبوو. پێم وایە متمانەی بە منیش نەکرد. گوتم مزەفەر خان، وا باشترە ئەو کەسە شوێنبزر بکەین. پێم گوت، ئەگەر ئەو کوڕە بگرن،، بەگیش قۆڵبەست دەکەن. گوتم..."

دەروێش بەگ کە نێوچاوانی تێك نابوو، نەڕاندی و قسەکەی پێ بڕی:"ڕاست نییە و شتی وا نابێ. من پیاوی وام نییە ئەوەندە کەم بێ و خۆی سووك بکا، بچێ حاجییە شێتە بکوژێ. ئەوەی بەدووشییەوە بووە و کوشتوویەتی، بێ و نەبێ کەسێکی دیکەی ناردوویەتی، تێگەیشتی ماهیر؟ هیچ پیاوێکی من، بەبێ ئیزنی من و کاتێك من لە ماڵێ نیم، ناچێ پیاو بکوژێ. من خۆشم ڕازی نەبوومە حاجییە شێتە بکوژرێ. شتی وا مەحاڵە ماهیر."

"دادوەر، سەرۆکی پۆلیس و هەر هەمووان پێیان وایە. هەمووان سەروبنی قسەکانیان ئەوەیە، کار کاری دەروێش بەگە و تەواو. من نەبوایەم، هەر لە ئەستەمبووڵێ دەیانگرتی و بە قۆڵبەستکراوی دەیانهێنایەوە. ئەمن پێم گوتن... دەروێش دەستی ناچێتە خوێنی کەسێکی ئاوا هیچ و پووچ..."

"کێ؟ چۆن دەستبەسەریان دەکرد؟ خەیاڵیان خاوە. قسەی قۆڕیان کردووە. کێ دەتوانێ لەبەر هیچ و پووچێکی سووك و چرووك من.."

ماهیر لێرە، لەسەر مەسەلەی قۆڵبەستکران، دەروێش بەگی بە لاوازی دیت. دەمودەست هەڵنەچوو. تاوێك ڕاوەستا. دەتگوت ڕەنگی بزڕکا. هەر بۆیە غیرەتێکی وەبەر هاتەوە و گوتی:

"من پێم گوتن، ئێوە ناتوانن دەروێش بەگ دەسبەسەر بکەن. گوتم: بێت و شتی وا بکەن، نەك هەر لە شارۆچکە، لە هەموو تورکیاشدا وەك تۆپ دەنگ دەداتەوە و هەموو تیرە و تایەفە و وەچەی ئۆغوز هەڵدەستن."

دەروێش وەخۆ هاتەوە و گرماندی:"هەر کەس بیەوێ لەخۆڕایی و بێ بەڵگە من دەسبەسەر بکا، دنیای بەسەردا کاول دەکەم. بەو گەوادانە دەڵێم، پووتێك چەند کیلۆیە. خۆ وامزانیبایە، لەسەر ڕێیە، سەرێکی ئەنکەرەشم دەدا."

ماهیر باشی بۆ چوبوو. حاجی بە دەستی ئەو نەبێ، بە فیتی کەس نەکوژرابوو. بەڵام وەڕووی خۆی نەدێنا. ئەوانە زۆر دان بەخۆدا گرن. تەنانەت نهێنیی خۆیان بە نزیکترین برادەریشیان ناڵێن. هەی بێناموسینە، کوڕە وەرە بزانە ئێمە کێمان بە برای خۆمان داناوە.

نەدەبوو لەوە پتر لەسەر ئەو مەسەلەیە بڕوا.

"ڕاستەوڕێ دەچینەوە ئاوایی، یان ئەگەر حەز دەکەی تاوێك لە ئەدەنە پشوویەك بدەین."
"بۆ ئاوایی."
"سەرێکی شارۆچکەش بدەین؟"
"ڕاستەوڕێ بۆ ئاوایی."

لە ئەدەنەوە تا ئاوایی نە ماهیر قسەیەکی کرد و نە دەروێش بەگیش. ماهیر چەند جارێك ویستی دەروێش وەقسە بێنێ، بەڵام ئەو ڕێی نەدەدایێ. چاوی لێك نابوون و پاڵی دابۆوە. دەتگوت وەنەوز دەدا.

خۆر لە ئاوابوونێ بوو، کە گەیشتنەوە ئاوەدانی. ماهیر وەقسە هات:"گەیشتینەوە بەگ." لە ترۆمبێلەکە دابەزی و دەرگاکەی بۆ کردەوە.

مزەفەر لە دوورەوە ترۆمبێلەکەی دیتبوو و هاتبووە بەر دەرگا. باش دەیزانی بابی پیاوێك نییە سووك و ئاسان قسەی لەبن زمانی دەرکێشن. ئەو ماهیرە بێ و نەبێ شتێکی لەبن سەری دایە. دوور نییە شتێکی بە دمەوە بێ و گزەیەکی لەبن سەریدا بێ. دەبێ بەشێوەیەك بیرەتێنم. لمبۆزی بە هەر شتێکەوە بنێ، بۆنی دەکا. دەڵێی تاژییە.

مزەفەر ئەوەندە سارد و سڕ لەگەڵ ماهیر جووڵاوە، تەواو دڵی ئێشا. بەگیش هەروا. چوونە سەرێ و ماهیریش بە شوێنیانەوە. کەس فەرمووی نەکردبوو. کوڕە ئەو بێ چاووڕوویییەی. ماهیر لە سووچی مۆبلێکەوە کرووشمەی کردبوو. کە حیسابی سەیەکیشی بۆ نەدەکرد. خۆشیان وەك نە بایان دیتبێ و نە بۆران، دانیشتبوون و باسی ئەستەمبووڵ و دۆستەکانی ئەوێیان دەکرد و قاقا پێدەکەنین. ماهیر یەك دووجاران ویستی خۆی لە باسەکان هەڵقوتێنێ، بەڵام کەس گوێی نەدایە قسەی. ماهیر لەو ماڵەدا بەکەم گیرابوو. دانیشتبوو و یەك پشوو لە دڵی خۆیدا دووپاتەی دەکردەوە، باشە، زۆر باشە، پێتان دەڵێم. هەموو ماڵ و سەروەتەکەم دادەنێم، بەڵام بەڵایەکتان بەسەر دێنم، عەرەب بەسەر گامێشی نەهێنابێ. حاجییە شێتە بە فیتی ئێوە کوژراوە. ئێوە پیاوکوژن. ناهێڵم بەساغی دەرچن. ئیتر سەر بەو ماڵەشدا ناکەمەوە و چاو لە چاویشتان ناکەمەوە. دۆستایەتیمان لێرەوە بڕایەوە. ئەوانەی بە چاوی سووك سەیری خەڵك دەکەن، شیاوی یارمەتیدان نین. ئەوە من دەمەویست لەو گێچەڵە رزگارتان بکەم. ئەتۆش وەك دوژمنم سەیر دەکەی، دەروێش. هەی ژن و دایکت بگێم... ئەو ڕەچەڵەکە بەناوبانگەی ساری ئۆغڵیت بگێم... ئەو ڕەچەڵەکەت وا دەچێتەوە سەر ئۆغوز. ئەمڕۆ عوسمانلی پووشێك ناکا، چ بگا بە ڕەچەڵەکی ئۆغوز. تەنانەت پادشای بەریتانیاش تڕێك ناهێنێ.

تووڕەبییەکەی خواردەوە و هەستا.

"ئەمن دەبێ بڕۆم. درەنگە..."

مزەفەر بە سەری زمانی گوتی:"ئەمشەو لێرە بە، ماهیر بەگ."

بە لەبزێکەوە وەك بڵێ، هەتا ئێستاش لە زیادی دانیشتبووم، گوتی:

"ماڵتان ئاوەدان بێ. ئاوەدان بێ. ئەوە شوکر، بەگ بە سلامەتی گەڕاوەتەوە. ئەمنیش هەر ئەوەندەم لەخودای دەویست. شوکری خودا. خودا حافیز."

بەرەو پلیکانەکان رۆیشت. مزەفەر هەتا بەردەرگای بەڕێ کرد. دەروێش بەگ لەجێی خۆی نەبزووت. مزەفەر کە گەڕاوە، دەروێش بەگ سەیرێکی کرد و گوتی:"من پێم وایە، ئەو کابرایە، ئەو قاباقچییە گوو سەگە، خەریکە بوختانمان بۆ هەڵدەبەستێ و گێچەڵمان بەملدا دێنێ. دیارە هەوڵی ئەوەیەتی کوژرانی حاجییە شێتە بخاتە ئەستۆی ئێمە."

مزەفەر:"بیستوومە پارەیەکی زۆری دابووە حاجییە شێتە، کە لە شارۆچکەکەی خۆمان بڕوا. بەڵام حاجی دوای وەرگرتنی دراوەکە، ئەمڕۆ و سبەی کردووە و نەڕۆیشتووە."

دەروێش بەگ لە زاری دەرپەڕی:"دەی ی ی ی."

# ١٠٨

بارودۆخەکە شێوابوو. نەدەبوو متمانەی بە گەنجی ئاوا بێئەزموون بێ. بەڵام تازە... لە دووی چوان مەچۆ.

دەروێش بەگ پیاوێك بوو، ئەگەر کارەکەشی لێ تێك چووبایە و سەری نەگرتبا، پەشیمان نەدەبۆوە و ئەگەر باشیش راپەڕیبا، لە خۆشییان شاگەشکە نەدەبوو. هەر چەشنە رووداوێك بەلای ئەوەوە ئاسایی بوو و ئەگەر راستیت دەوێ، قەت ئاوڕی لە دواوەی نەدەداوە.

یەکەم کاری ئەوە بوو، یوسف ـ ئەو گەنجە کرچ و کاڵە ـ لەو بەڵایە رزگار بکات، کە خۆی تووشی کردبوو. لەوانەبوو لە ئاوایی خۆی شاردبێتەوە و مزەفەر و ئەوانی دیکەش ئاگایان لێی نەبووبێ. ئەگەر ئەوانە بەجێیان هێشتبایە، دەچوو سەرێکی لە ماڵی میرۆ دەدا... لەوانەبوو هەر یوسف خۆی بەپیرییەوە هاتبا. ئەو هەتیوە، هەرچۆنێك بێ، بەڵێنەکەی خۆی بردبووە سەر و وەك پیاوان بەر لە گەڕانەوەی ئەو کارەکەی راپەڕاندبوو. تەنانەت گرتباشیان، کەس نەیدەتوانی قسەیەکی لە زاری دەرکێشێ. جا ئەشکەنجەیان دابا، یان نینۆکەکانیان دەرهێنابا، یا کەوڵێشیان کردبا، یوسف ناوی ئەوی نەدێنا.

"میرۆ"

میرۆ لە دەم کوانووەکە کرووشمەی کردبوو و ئەژەنۆی گرتبووە باوەشی و مات ببوو. لە دڵی گەڕابوو، کە بەڵایەك بەسەر یوسف هاتووە. بەڵام چ بەڵایەك؟ مەزەندەشی دەکرد چ بووبێ، بەڵام دەترسا زەینی لەسەر راستییەکی ئاوا سامناك کۆ بکاتەوە. بیری لە شتی باش و جێی هیوا دەکردەوە.

کە گوێی لە دەنگی بەگ بوو، بەندی جەرگ و دڵی پسا و دڵی وەك باڵی چۆلەکە فڕەی دەهات. هەستا و بە قەڵەمبازێك خۆی گەیاندە دەرگا. ئەو شەوەش وا مەحموود، ئاق یۆللیی

کوشتبوو، بەگ ئاوا بانگی کردبوو. بەو دەنگە کز و لەرزۆکە بە هەڵپە و خەمبارەوە. میرۆ ئەو دەنگەی باش دەناسی.

کە لەگەڵ بەگ رووبەڕووی یەك راوەستان، راچڵەکی. لە پێشدا مێردەکەی لێ ئەستاندبوو و ئێستاش ئەوە کوڕەکەی لێ دەستاند. ئای خۆزگە مردبایە و مەحموودی نەدیتبا و مێردی پێ نەکردبا. دوای مەرگی مەحموود ئەوە یەکەم جار بوو، بەگ بەشەوێ دەهاتە ماڵەکەی. کەوابوو کار لە کارێ ترازابوو. هەر لە پێشدا دەیزانی بەگ چیی لێ دەپرسی:

"یۆسف لە ماڵێیە؟"

چەند ساڵان لەمەوبەریش هەر وای پرسیبوو:

"مەحموود لە ماڵێیە؟"

بە دەموچاوێکی رەق و تەق و چرچ و لۆچاوییەوە، لایەکی رووناك و بەرەکەی دیکەی تاریك و بە چاوی ماتەمبارەوە... ئەوێ شەوێش باران دەباری.

میرۆ وا لەپێ کەوتبوو، ترسا وەڵامی بەگی پێ نەدرێتەوە. دەی خۆ حەیای دەچوو و شوورەیی دەبوو بۆ خوشکی شێرەکوڕانی هۆردووی چوارەم. بۆیە بەهەموو تین و گوڕەوە بەسەر خۆیدا زاڵ بوو و وەڵامی دایەوە:"هێشتا نەهاتووەتەوە بەگ."

"کەی چووەتە شارۆچکە؟"

"حەوتووەك دوای رۆیشتنی جەنابت... جوان لەبیرم نییە."

بەگ ورد لە دەموچاوە درێژبۆوە و ژاکاو و پڕ ئازار و زویر و پڕچرچ و لۆچەکەی میرۆی روانی کە تیشکی کزی چراکە نیوەی رووناك کردبۆوە. کە هاتە ئاوایی، کچێکی بەجموجۆڵ و گورج و گۆڵ بوو. جوان بوو. دەتگوت بزووتە. هیچ لەو میرۆیەی بیست ساڵ لەمەوبەر نەدەچوو. باشە ئەو کچۆڵە دلڕفێنە جوان و باڵابەرز و شۆخ و شەنگەی دەتگوت ماینی کەحلانە، چۆن ئاوای لێهاتووە و بووەتە دێوەزمە؟

بەگ پرسی:"چۆنی میرۆ؟"

میرۆ گوتی:"بەگمان بێ وەی بێ، لەهیچمان کەم نییە."

بەگ بەتووڕەییەوە گوتی:"یوسف کە هاتەوە، ئاگادارم بکەوە باشە؟"

میرۆش بەو لەبزەوە وەڵامی دایەوە:"باشە بەگ."

ئەو خوشکی شێرە کوڕانی هۆردووی چوارەم بوو. لەبەر تاقە کوڕەی، خۆی لای کەس نەدەشکاند. کزەی لە جەرگی دەهات و بەلاّ و نەهامەتییەکەی بەچاو دەدی. بەلاّم چارەنووسە و بڕاوەتەوە و ناگۆڕدریّ.

بەگ گوتی:"شەو شاد میرۆ."

وەڕیّ کەوت و ڕۆیشت. دوای بەگ دەنگی میرۆ هات:"دەی خۆ هەر زەحمەتت کێشابوو و گەورەت کردبووین، چ دەبوو دانیشتبای و چاوەیەکت خواردباوە؟..."

بەگ لە دوورەوە وەلاّمی دایەوە:"رووت سپی بیّ میرۆ. بۆ جارێکی دی."

بارانێکی ورد بەسەر شەوەکەدا دەباری...

یوسف نابیّ لە یەکەم راونانیدا بگیریّ و بکەوێتە زیندانەوە. ئەگینا، ئەو مندالّە زویر دەبیّ. پیاوی زیندان چێشتوو، دەبێتە بنیادەمێکی دیکە. تێك دەشکیّ، قەدر و قیمەتی نامێنیّ و نامۆ دەبیّ. ئەو ئیتر نەیدەتوانی متمانە بەو بنیادەمە تێکشکاوانە بکا، ئەگەر زۆریش جوامێر و خۆمانە و ساغ و برادەریشی بوایەن. ئەو تاقیکردنەوەیەی یوسف، هەلّبەت ئەگەر نەگیریّ و نەکەوێتە بەندیخانەوە، دەیکاتە چەکێکی کاریگەر و بەدەستییەوە دەبیّ.

خالّە تەوسۆن لەبەر دەرگا بوو. ئەو کابرایەش پیاوێك بوو، بۆ ئەوەی دەبوو پیاو مالّ و سامان و ناموسی خۆی پیّ بسپێریّ. بەلاّم چووبووە بەندیخانەوە، هەربۆیە بەکار نەدەهات.

"تەوسۆن. تەوسۆن."

خالّە تەوسۆن بە هەلّەداوان هاتە دەریّ. ئەویش وەك میرۆ لەو دەنگەدا هەستی بە شتێکی ناخۆش و بیّ فەڕ کردبوو. قەت وا نەببوو بەگ دوای نیوەی شەویّ بۆ کارێکی خێر لە دەرگای مالّی بدا.

"فەرموو بەگ."

"تەوسۆن، دەلّێن بە شوێن یوسفەوەن، بیستووتە؟ وا دیارە یوسف لە شارۆچکە پیاوێکی کوشتووە و رای کردووە و لە جێیەك خۆی شاردووەتەوە. بەستەزمانە ترساوە. پێت وایە لە کوێی خۆ شاردبێتەوە؟ یان لەگابەرد و رەوەزەکانی ئاناوەرزادا، یان لە ئاقچاساز، یان لە قامیشەلاّنەکەی ئەو دەوروپشتەدا. چاوێك لە دەوروبەری بیرەکەی کۆکسوز چنار و نێو بیرەکەش بکەن. دەسبەجیّ پیاوەکانت ئامادە بکە. دەبیّ بەر لەوەی یوسف بکەوێتە دەست جەندەرمەکانەوە، بیگرن. تێگەیشتی تەوسۆن؟"

"تێگەیشتم بەگ. تۆ حەمت نەبێ بەگ. یوسف لە هەر کوێیەك بێ، بەر لە تاوهەڵاتێ دەیدۆزمەوە و دەیهێنمە خزمەتت."

بارانێکی بەلێزمە دەباری و تاریکییەکەی شیر نەیدەبڕی. بەگ نەچۆوە کۆشك. بە ئاواییدا دەگەڕا. دڵی بێ ئۆقرە بوو. دڵەخورپەی بوو. هەڵدەچوو و بریسکەیەك بە گیانیدا دەگەڕا... دڵی دەیگوت، تازە پشتت شکا، ئاوەدانی هەمووی خەوتبوو. لەو جەنگەیەدا، جگە لە سرت و خرتی هێمنی تەوسۆن لە کەلێنی دەرگاوە لەگەڵ پیاوەکان و شڵپ و هۆڕی بارانەکە لەسەربانی قامیشی کەپرەکانەوە دەنگی هیچ شتێکی دی نەدەهات.

باشە ئەو کوڕە بگیرێ، چۆنی رزگار بکا؟ تا دەساڵ لەوە پێش، زۆربەی پیاوەکانی خۆی بە بەرتیلێك بەر دەدا. زۆرجاران بەرتیلیشی پێویست نەبوو و بەرپرسە دۆستەکانی، هەر بە راسپاردنێك کارەکانیان بۆ راپەڕاندبوو. جگە لە مەحموود هیچ کام لە پیاوەکانی پتر لە سێ مانگ و ئەوپەڕەکەی ساڵێك لە بەندیخانەدا نەمابوونەوە. گیرانی مەحموود و کوژرانی لە بەندیخانەدا زەبرێکی گورچوبڕی لە پێگە و قەدر و قیمەتی دابوو و وای لێ کردبوو، کە ئیتر پیاوەکانی و دەستپەروەردەکانیشی لێی دڕدۆنگ ببوون.

لە کۆنەوە، ئەوانەی تاوانێکیان دەکر و پیاویان بەدەست دەچوو، لە سایەی ناوبانگەیەکەوە، لە زۆر دوورەوە، لە دەوروبەری ماراش و ئەنتاکیە و دیاربەکرەوە، پەنایان دێنایە دەرگای ئەو و لە ئاواییەکەی ئەو دەحاوانەوە. داڵدەدانی پیاوکوژان و پاراستنیشیان نەریتێکی کۆن بوو. رەتاندن و رانەگرتن و رادەستی حکومەت کردنەوەی پەنابەر، نیشانەی دۆڕاندنی پێگە و لێکەوتن و بێدەسەڵاتبوونی سەرۆکی هۆزێك بوو.

ئەوەدەمی بابی مابوو، کابرایەکی چوارشانە بەناوی زالو لە ئۆرفەوە هاتبوو و خۆی لە پەنایان هاویشتبوو. زالو پێنج کەسی بنەماڵەیەکی کوشتبوو و بۆی دەرچوبوو. کەس و کاری کوژراوەکان چەند ساڵان بە پرسیار و گەڕان دۆزیبوویانەوە. داوایان لە ساری ئۆغلی کردبوو زالویان رادەست بکاتەوە. بەڵام باوکی نەیدابووە دەستیان. نەشیدەتوانی بیانداتێ... ئەگەر بە روودا کەوتبایە و دابایەنێ، دەمودەست هەواڵەکە بە ئەدەنە و ئەنتاکیە و ئۆرفا و دیاربەکردا بڵاو دەبۆوە و هەمووان دەیانگوت، کوڕە وەرنە سەیری ئەو ساری ئۆغڵووە هیچ و پووچە، نەیتوانی داڵدەی کەسێك بدات کە پەنای بۆ بردبوو." دوژمنەکانی زالو بۆ وەرگرتنەوەی زالو، چیی پێیان کرابوو، کردبوویان. هەڕەشەیان کردبوو. کۆش کۆش زێڕیان هێنابوو، بەڵام نەیانتوانیبوو ساری ئۆغلی قایل بکەن.

زۆر کەسی گیانلەسەردەستیشیان ناردبوو زالو بکوژن. هەموو جارێك بابی دەروێش بەگ ئەو گیانفیدایانەی گرتبوو و ئامۆژگاریی کردبوون و بەری دابوون. کوشتنی زالو لە ئاواییەکەی ساری ئۆغلّی، وەك ئەوە وابوو هەموو خەڵکەکەیان کوشتبێ. دوای کوژرانی زالو، تۆڵە و خوێن دەکەوتە نێوان ساری ئۆغلّی و ئۆرفەییەکانەوە و ساری ئۆغلّی دەبوو یان خۆی بچێتە ئۆرفە، یان پیاو بنێرێ و تۆڵەی زالو بستێنێتەوە. دوژمنەکانی زالو تەنانەت بیریان لەوەش کردبۆوە، بەلاّم بۆیان نەلوا.

ئەوە یەك. دەروێش بەگ زۆر بەسەرهاتی لەو جۆرەی لەسەر ئەو کەسانە دەزانی کە پەنایان بۆ وەچەی ساری ئۆغلّی هێنابوو. ئاغایەتیش یانی ئەوە. جا دەروێش بەگیش ئێستا نەك پەناخواز و لێقەوماوەکان، بگرە پیاوەکەی خۆشی کە کابرایەکی سووك و چرووك و بێ قیمەتی کوشتووە، پێ ناپارێزرێ. بێ لەوەش، لە پۆلیسخانە، پیاویان لێ دەکوشت. ئەوەش هەمووی لە سۆنگەی ئەو بەرپرسە سپلّە و بێ رەگ و رەچەڵەکانەوە بوو. تەنانەت ئەگەر کوڕە دۆمێك، کرێکارێك و گوندییەکیش دەرس بخوێنێ، دەتوانێ ببێتە قازی و قایمەقام و دادئەستێن و ئەفسەر. جا بۆیە، خەڵکی بێ قیمەت و بێ رەگ و رەچەڵەك هەر نازانن رەسەنزادەیی چییە و خەڵکی وەك ماهیر بەگ کە دواتر دەوڵەمەند بوون، رێزیان پتر لێ دەگیردرێ لەوانەی رەسەن و بەرەچەڵەکن. ئێستاش دەبێ دەرگای نامەردان بەقوون بکاتەوە. خۆ بەگەکانی ئەدەنە نەبوایەن، هەر لێی دەقەوما. دیسان شوکرانەبژێر بوو، کە بەگەکانی ئەدەنە لە حکوومەتی ئەنکەرەدا دەستیان دەڕۆیی و پشتیان دەگرت... ئاگای لێ بوو ئەوانیش قورسایی جارانیان نەماوە. هەی ی ی، باشە بلّێی چیی لێ بێتەوە؟ تۆ بلّێی دەوڵەتێکی ئاوا گەورە، لەبەر ئەو رەشووڕووتانە ببەزێ؟

نا، نا، هەتا دوادلۆپەی خوێن و تا دواهەناسە دەست دەکاتەوە و ئیزن نادا وای لێ بێ. ئەوە مەحاڵە.

زرمەی ناڵی رەوە ئەسپێك، کە بە غار لە ئاوایی وەدەر دەکەوتن، وەخۆی هێناوە. تەوسۆن وەشوێن یوسف دەکەوت.

لە پڕ زانیی، بارانەکە هەتا سەر ئێسقانی چووەتە خوارێ و سەرمایەتی.

# ١٠٩

شارۆچکە دوورەکە، بە لوورە قوولە قوولێکی سامناك سەری لەدوو نابوو و ئەو چیی خێراتر رای دەکرد، شارۆچکە پتر تێی دەقوولاند و دەهات. لە هەموو لاوە دەنگی بانگ هەڵدەستا، کەڵەشێر دەیانخوێند، دەنگی هۆڕن دەهات، گوێدرێژ دەیانزەڕاند و سەگەل دەوەڕین و هەزاران هەزار بنیادەم دەیانگوڕاند. دەنگە تێکەڵەکان، لەگەڵ شارۆچکەدا وەك چیایەکی قوولە و لوورە بەدوویدا دەهات. عەرزەکەی بن پێیانی قرچ و هۆڕ درزی دەبرد. جاری وابوو لە هەوری تەپوتۆزێکی خنکێنەردا نوقم دەبوو و دەهاتەوە دەرێ و پەیتا پەیتا تفی دەکردەوە. هەستی دەکرد خوێن دەتفێتەوە و خوێنێکی شلەتێن و سوێر لە هەندێ جێی لەشییەوە دێتە دەرێ. قوولەقوولەکە سات بە سات توندتر دەبوو و نزیکتر دەبۆوە و ترپەی دڵیشی تێکەڵی ئەو لوورە و قوولەیە دەبوو. دڵی وا لێی دەدا دەتگوت خەریکە لە سینگی دێتە دەرێ... لە پەل و پێ دەکەوێ و دوای ئەوەی تاوێك لە تەپوتۆزەکەدا پەلەقاژە دەکا، ئاخرییەکەی لە حاڵێکدا لووت و دەمی پڕ ببوو لە تۆز و خۆڵ، هەڵدەستێتەوە و دیسان تێی دەقووچێنێتەوە...

کازیوە، دەخزییە بن پێستی شەوەوە و شەو پشووی لێ دەبڕا. لە پڕ گرمە و قوولەقوولەکە بڕایەوە. ئەو چیایەی بە شوێنیدا خلۆر ببۆوە، راوەستا. بۆ یەکەم جار راسوەتا و ئاوڕێکی دایەوە. شارۆچکە سپی سپی بە داوێنی چیاکەوە نووسابوو و خەیاڵبزوێن و لە نێو تەمەکەدا دەدرەوشایەوە. لەو بەرییەوە چیاکان، کە لەبەر تیرێژی خۆرەتاو سوور دەچوونەوە و لە تاریکایی شەو رزگار ببوون، و ئاسمانێکی ساماڵ بەژوور سەرییەوە.

ئەوە چ قەوماوە؟ دوێنێ بەیانی، ئەمشەو، ئێستا؟ ئەوە چ بوو هەر ئێستا ئێستا بەدوویدا دەخزی و سەری لە دوو نابوو؟ باشە بۆ وا رای دەکرد؟ وەخۆ هاتبۆوە. بەڵام هەندێ شت بوون کە بەهیچ جۆرێ نەیدەتوانی بیانهێنێتەوە بەرچاوی و بیانگرێ. نەیدەزانی چەند رۆژ و شەوە و بۆچی ئاوا بە هەشتاو را دەکا.

لەگەڵ ئەنگوتنی بەیانی، شارۆچکەش وردە وردە دەردەکەوت و ڕووناک دەبۆوە و دەدرەوشایەوە.

یوسف لە نەکاو، بە دەم سەیرکردنی شارۆچکەوە، هەموو گیانی کەوتە لەرزین و دیسان لە لاقانی وەراندەوە. منارەی سپی، درەخت و ئاسمان لەبەر چاوی تێکەڵ بوون. قوولە و لوورەکە دیسان بەدوویدا خلۆر بۆوە و دەهات. تاوێك دواتریش هەموو شتێك، دیسان وەك هیچ نەقەومابێ، بێ جووڵە کەوت. سەیری کرد لە نێوەڕاستی دەشتێکی کاکی بە کاکیدا، لە نێوان ئەو چیا بەرزانەدا بەتاقی تەیْ و ڕووت و بێ دەسەڵات ماوەتەوە. هەموو شتێك زەبەلاح و دێوەزمەئاسا و بێ بڕانەوە...

دەتگوت زەویی لەبن پێی دەردەکێشن. خۆی بە پێوە ڕانەگرت و کەوت و گەوزی. لە حاڵێکدا بەنێو دەوەنەکاندا بەرەو دەم ڕێگەکە دەخزی، دەست و پێی بریندار دەبوون و لوورەلوور و قوولەقوولەکە هەر دەهات و توندتر دەبوو و وەك بلێسەیەکی سوور لە شارۆچکەوە تێی ڕۆدەهات و سەدان و هەزاران بنیادەم بە چەقۆ و کوتکی ئاسنگەری و ئاسنی سوورەوەکراو و درەوشاوەوە پەلاماریان دەدا. هەموو شتێك لە نەکاو نوقمی تاریکییەکی ئەنگوستەچاو بوو.

کە وەخۆ هاتەوە، نێوەڕۆ بوو و تاو هەموو وڵاتی گەرم داگێڕابوو. چاوەکانی زەق زەق ببوونەوە و بە سەرسووڕمانەوە دەیڕوانی. دەوەنە دڕکاوییەکان، کلك هەڵتەکێنە لەسەر دەوەن و چنارە بەرزەکان. لەولاترەوە، وردە چەوی سپی کە لە ئاوەڕۆکەی بن دار تووتڕکەکان بڵاو ببۆوە، دنیایەکی نوێ و سەرسووڕهێنەر و بێوێنە بوو.

دەتگوت دەستی ڕاستەی شتێکی لێ هاتووە. سەیری دەستی کرد. خەنجەرەکەی دەتگوت بەدەستییەوە نووساوە... شتێکی ڕەشی وەك خوێنی وشکەوەبوو، دەست و خەنجەرەکەی ڕەنگ کردبوو. بە بێزارییەوە دەستی ڕاوەشاند و خەنجەرەکەی بەربۆوە و لە بن پنچکە دەوەنێك وەعەرزی کەوت.

لەگەڵ بەربوونەوەی خەنجەرەکە، دڵی هێور بۆوە و خۆشییەکی تێ گەڕا. هەستایە سەر پێ و ویستی بڕوا، بەڵام تینی تێدا نەبوو و نەشیدەزانی چ بکا. شادییەکەی لە چاوترووکانێکدا ڕەوییەوە. ڕاوەستا و دیسان نوقمی سەیریکردنی ئەو دنیا تازە و سەرسووڕهێنەرە بۆوە. دوایی هەر وا کە ڕاوەستابوو، لە خۆڕا هەستی بە مەترسی کردەوە و هەموو تین و توانای خۆی خڕ کردەوە و ڕای کرد. دیسان کەوتەوە دەشتەکە. لەو گەرمای نیوەڕۆیەدا هەموو شتێك بەتاڵ بەتاڵ بوو. نە بایەکی دەهات و نە گەڵایەك دەلەرییەوە. بەتاقی تەنێ بوو.

لەو کاتەدا چنارە بەرزەکان دیسان لە دوورەوە دەرکەوتن. ئەو چنارە گەڵا سوورانەی سەریان لە ئاسمانێ دەسوی، باش دەناسی. کە چاوی پێیان کەوت، تۆزێك هێور بۆوە. بەهیچ شێوەیەك نەیدەتوانی چاویان لێ هەڵگرێ. بۆ تاوێك، کە چنارەکان لەبەر چاوی نەدەمان، دەتگوت بارانی بەڵای لێ دەبارێ. دای لەسەری، بچێ و یەك بە یەك گەڵاکانیان بژمێرێ. تاوێك دواتر قاقا بەو فکرەی خۆی پێکەنی. هەستایە سەر پێ و بە لارەوە لارەوە بەرەو چنارەکان رۆیشت. لە بن چنارێك راوەستا. قەدی چنارەکە خاڵ خاڵ بوو. توێکڵەکەی لای باشووری قەڵش قەڵش ببوو. تەلاشێکیشی لێ ببۆوە و لەوێ وەك برینێکی زارداپچڕیو، کێم و چڵکی لێ دەتکایەوە. لکێکی چنارەکە داهابۆوە و عەرزەکەی دەماڵی.

هەتاوەکە جار بە جار گەرمتر دەبوو و پشتەملی دەسووتاندەوە. دەستی بە پشتەملیدا هێنا و چەند ساتێك ئاوا مایەوە و خوراندی.

کە خۆرەتاو بەرەو رۆژئاوا دەکشا، لە دوور دوورەوە قامیشەڵانێکی هەڵماویی بەرچاو کەوت. هەر بە راستی ئەوە قامیشەڵان بوو؟ قامیشەڵانەکەی یاریمجالار بوو؟ قامیشەڵانێکی پان و بەرینە و ئەوسەری دیار نییە و ئەگەر هەزار کەس، هەزار ساڵ خۆی تێدا بشارنەوە، کەس نایاندۆزێتەوە...

قامیشەڵانەکە رزگاریدەر بوو. یانی ئەوە ئەو بوو، تینی لەبەردا نەبوو بە رێگایەدا بڕوا و ئەژنۆی دەلەرزین؟ ئەوەی ئاوا وەك بای شەماڵ بەرەو قامیشەڵانەکە رای دەکرد؟ تاریکی باڵی بەسەر دنیادا دەکێشا، کە ئەو گەیشتە قامیشەڵانەکە و وەنێو کەوت. هەتا ئەژنۆی لە زۆنگاوەکە رۆچوو. زۆنگاوەکەی خێرا بڕی. گەیشتە وشکایی، بەڵام رانەوەستا. چووە نێوەڕاستی قامیشەڵانەکەوە.

شەو جار بەجار خەستتر دەبۆوە و تاریکاییەکەی شیر نەیدەبڕی. ئیتر چاو چاوی نەدەدی. بارانێك نمە نمە دایکردبوو. ئەویش بە دەم کەوتن و هەستانەوەوە بە نێوان قامیش و تووترکەکاندا بەرەو حەشارگەکەی دەڕۆیشت.

## ١١٠

باران خۆشی نەدەکردەوە و ئەو دەمەوڕوو لەسەر عەرزە شێدارەکە راکشابوو. لەوەتەوەی بەخەبەر هاتبوو، بۆنێکی تیژ و ناخۆشی بۆ دەهات. لەمێژبوو دەیویست هەستێ و بچێتەوە ئاوایی، بەڵام گیانی وا بەخاو کەوتبوو و دەست و پێشی ئەوەندە بێهێز ببوو، نەیدەتوانی لەجێی خۆی هەستێ. بەردەوام خۆی وێك دێنا و خۆی خاوکێش دەکرد.

لەوانەیە باران لێی کردبێتەوە و تاویش هەڵاتبێ. نەیدەوێرا چاوی هەڵێنێ. پێی وابوو هەر چاو هەڵێنێ، مردووەکە دەبینێ.

خۆشی نەیزانی چۆن بوو، کە سەری هەڵێنا، لە تەنیشت تەپۆڵکەیەك بوو. هەر چاوی کردەوە، ناچار بوو بیانقووچێنێتەوە. تاوەکەی ئەوەندە بەتین بوو... بۆ ئەوەی چاوی لەگەڵ ڕووناکایی رابێ، وردە وردە پێڵووی هەڵدێنا و چاوی دەترووکاند. یەك دوو جار پژمی. هەرچی هەوڵی دەدا هیچی وەبیر نەدەهاتەوە. سەری لەگێژەوە دەهات. دەتگوت خەونێکی ناخۆش و ئاڵۆزی دیتووە و لەپڕ بەخەبەر هاتووە. هەوڵی دەدا بزانێ چ قەوماوە، بەڵام بۆی نەدەچۆوە سەر یەك.

کە چاوی لەگەڵ ڕووناکییەکەی راهات، سەیری کرد ئەوە قامیش هەر یەکەی دەڵێی چنارێکن و بە دەم باوە دەشنێنەوە و تووتڕك و دەوەن و لاولاو و زۆنگاوێکی بێ بن کە دەکوڵی و قوڵتەی دەهات لەبەر چاوی بوون. لەبەر قامیشەڵان هیچ کوێ دیار نەبوو. ئێرە کوێیە؟ یوسف هەر وەبیری نەدەهاتەوە وەها زۆنگاوێکی بێ سەر و بن لەو دەوروبەرانە هەبووبێ. چ بوو، کوێ بوو؟

لەپڕ بەبێ ئەوەی بزانێ بەرەو کوێ، دەرپەڕی. بە چاوی لە ژێلڵاهاتووە، وەك بڵێی حەیوانێکی دڕندە سەری لە دوو نابێ، بە زراوچوویی رای دەکرد. هەتا ئەژنۆی لە زۆنگەکە رۆدەچوو و لە نێو تووتڕکەکاندا دەکەوت و هەڵدەستا و رێگەی نەدەدۆزییەوە. وەك گای گێرە،

بەبێ ئەوەی رێ دەربەرێ، بەدەوری دەوەنێك یان گۆلاوێکدا دەخولاوە و کە رێگەیەکی دەدۆزییەوە بەرەو دەرەوەی قامیشەڵانەکە رای دەکرد.

ئەمڕۆ بەیانی خۆر لەلای رۆژئاواوە بوو. لەوە پتر هیچی نەدەزانی و هەر بەو پێیەش لایەنەکانی دیاری دەکرد. لەو کاتەدا بەبێ ئەوەی بۆی گرنگ بێ ئاوەدانی کەوتووەتە کام لاوە، تەنیا بیری لەوە دەکردەوە رێگەیەك بدۆزێتەوە بۆ دەربازبوونی لەو زۆنگاوە.

پەرجۆیەك... لە دەم زۆنگاوەکە و لەبەر چاوی، رێگەیەك و کێڵگە رێك و تەختاییەکان... رێك لەو دەمەدا کە شادی دەهات لە ناخیدا پێ بگرێ و سەر هەڵێنێ، لوورە لوور و قوولە و هەرای بنیادەمەکان دەبیسترێ و بەناچاری دەگەڕێتەوە و بەرەو نێو قامیشەڵانەکە دەگەڕێتەوە.

خۆر ئاوا دەبێ. ماندووە. دەنگەدەنگ و وەڕین و حەپەی سەگەل دێ و جار بەجاریش نزیکتر دەبنەوە. بانگی دەکەن:"یوسف، یوسف." هەر زەندەقی دەچێ و هەتا شەو تەواو تاریك دانەیە، لە قامیشەڵانەکە نایەتە دەرێ. شەوگار شەق بووە و دەنگەدەنگەکە و حەپە و وەڕینی سەگەل دادەمرکێتەوە و دەنگی بانگکردنی "یوسف، یوسف" دەبڕێتەوە. شادییەك لەدڵی دەگەڕێ... هەوڵ دەدا لە قامیشەڵانەکە بچێتە دەرێ، بەڵام یەخەی کراسەکەی لە قامیشێك دەگیرێ و دەکەوێ. هەرچی هەوڵ دەدا ناتوانێ هەستێتەوە. لەبەر خۆیەوە دەڵێ، با پشوویەك بدەم، جار دەرۆمە دەرێ...

کە چاوی هەڵێنا، چ ببینێ؟ ئەوە تاو هەڵاتووە و هەموو وڵاتی رووناك کردووەتەوە. یا، گوڵە قامیشەکان وردە وردە رادەژێنێ. قامیشەکەی ژوور سەری یەکسەر هێلانەی ژەنگەسوورە بوو. هەر شانەیەکیش سەدان ژەنگەسوورەی پێوە بوو. باشە ئەمشەو چۆن لەبن ئەو هەمووە ژەنگەسوورەیە نوستووە؟

بەسپایی هەستا. ئەمڕۆ هێندەی دوێنێ گێژ و کاس نەبوو. شتی زیاتر وەبیر دەهاتەوە. شتێك لە مێشکیدا بوو. ئەویش ئەوەی ئاگای لێ بێ، خەڵك نەیبینن و نەگیرێ. بەڵام بۆ؟ نەیدەزانی بۆچی.

لەپڕ زانیی برسێتی. دڵی تێکەڵ دەهات. زگی بە پشتییەوە نووسابوو و ئەژنۆی دەلەرزین. لە ترسی ئەوەی لێرە لە برسان بمرێ، مووی لێ بوونە نەشتەر. هەرچۆنێك بووە، دەبوو لەو قامیشەڵانە بچێتە دەرێ و بچێتەوە ئاوەدانی.

بەرەبەری ئێوارێ لە تەنیشت پۆلە شۆڕەبییەکەوە، خانوویەکی دیت. زۆر دوور نەبوو. ئەی لەو خانووە جوانەی. ئەوە خانووی کامە گوندە؟ خۆی بەسەرپێوە رانەگرت و دانیشت. دوای

ئەوە گوێی لە قوولەیەك بوو و سەیری کرد ئەوە حەشیمەتێك لە ئاواییەوە بۆلای دێن. بەندی جەرگ و دڵی پسا، بەڵام هەرچی لەخۆی نووسا نەیتوانی ببزوێ. بەناچاری هەموو تینی دایە خۆی و بەرەو نێو قامیشەڵانەکە خزی. خۆی خزاندە نێو پۆلە قامیشێکەوە. ئێرە باش بوو، کەس نەیدەدی و کەس نەیدەتوانی بیدۆزێتەوە.

ئەوجار لە ژەنگەسوورە دەترسا. ئەگەر خەوی لێ کەوتبا و لە خەوێدا ژەنگەسوورە پێیانەوە دابا؟... دەتگوت هەزاران ژەنگەسوورە لە مێشکیدا وزەوزیانە... برسێتی لە لایەکەوە و ترسیش لە لایەکی دیکەوە خەویان لێ زڕاندبوو.

لە قامیشەکان هاتە دەرێ. سەرەڕای هەوا گەرمەکە، ئەو سەرمای بوو. هەروا لەخۆوە کەوتە ڕێ. کە گەیشتە دەم زۆنگەکە، گەڕایەوە. گوێی لە خشپەیەکیش بوایە دەگەڕاوە. باڵندەیەك فڕیبایە، مارێك خوشیبایە، شنەبا قامیشی لێك دابایە، ئەو دەسڵەمییەوە و ڕێیەکەی خۆی دەگۆڕی.

نیوەشەو بوو کە شەکەت و بێهێز لەسەر عەرزەکە تخێلْ بوو. پشووی دەرنەدەهات و لە تاریکییەکەدا ون ببوو. وەك خەیاڵێك بە زەینیدا دەهات، دەڵێی خەریکە دەمرم. ئەوە دەبێ گیانەڵڵا بێ. وردە وردە بەلادا دەهات و گیانی سڕ دەبوو. ئەگەرچی سەرماشی بوو، بەڵام تەنانەت ئەوەندەی تین لەبەردا نەبوو بشلەرزێ.

لەپڕ کۆڵەکەی تیشکێك دڕی بە تاریکییەکەدا و بەرەو لای کشا. تاوێك دواتریش ئەسپێکی دیت کە وەك بریسکە، لە لای تیشکەکەوە دەهات.

سێ تاڵە مووی بەدەستەوە بوو. هەرجارێکی مووەکانی لێك دەخشاند، (ئەسپێکی) شەودێز لە نێو تیشکە چڕەکەوە دەهاتە دەرێ و دەیخستە سەر پشتی و دەیبرد بۆ ئەو شوێنەی دڵی دەیویست. دوایی دیسان مووەکانی لێك دەخشاندنەوە و ئەسپەکە دەگەڕاوە. بە ئەسپەکەی دەگوت:

"ئەسپە گیان، پێکەوە دەچین و ئاوێنەی پادشای دێوەزمەکان دەدزین و دەگەڕێینەوە."

سواری ئەپەکە دەبێ و دەچینە مەڵبەندی دێوەزمەکان و ئاوێنەی زەبەلاحی دێوان، ئەو ئاوێنەیەی نهێنییەکان ئاشکرا دەکات، دێنن. شەودێز هەموو شتێکی دەزانی. کە چاوی هەڵدێنا، خەوتنی دێوەزمەکان و کە چاویشی لێك دەنا بەخەبەربوونەکەیان...

مووەکانی جارێکی دیکەش لێك دەسوی و ئەسپەکە دیسان دەهاتەوە. ئەسپ نا، هەژدیهایەك. ڕەش ڕەش. ڕەشێکی مەیلەو کەسك، کەسکێکی مەیلەو ڕەش. کلکی پەخشان و

پەرێشان و گوێی مووچ و قوت کردووە و وەك پەیکەرەی جوانترین بوونەوەری دنیا راوەستاوە. خۆشەویستی و دۆستایەتی لە چاوەکانیدا...

"وەرە چیت دەویَ داوا بکە."

جا چیی دەویَ؟ هەناری چاوبەفرمێسکی دەویَ لە باغی پادشای پەرییاندا. ئەو هەنارەی سەدان پەری پاسەوانین. ئەو هەنارەی باڵندە بە شاباڵ و مار بە لەش و لار و ژەنگەسوورە بە وزەوز ناتوانن بەلایدا بڕۆن. ئەوە کارێکی ئەستەمە. بەڵام هیچ دەردێك بێدەرمان و هیچ کێشەیەکی بیَ چارەسەر لەو دنیایەدا نییە و مەلی ئاوات بەرزەفڕە.

ئەسپەکە دەڵیَ:"ئەو کارە گەلێك ئەستەمە برالە."

ئەستەمە، ئەستمە، بەڵام ئەو هەنارە دڵپڕە هەرکات پیَ بکەنیَ، پێکەنین دەخاتە سەر لێوی هەموو ئینسانە ئازارچێشتوو و تێکشکاو و شەکەت و وەڕەز و بێهیوا و بەڵالێدراوەکان.

ئەسپەکە دەڵیَ:"سوارم بە. مادام وایە، سوار بە، بەڵام ئەو کارە بۆنی مەرگی لیَ دیَ. ئاخۆ دەتوانی بەرەو مەرگ هەنگاو بنێی؟"

بۆ نا! هەنارە دڵپڕەکە، پێدەکەنیَ... سواری ئەسپەکەی دەبیَ و بەسەر باغە هەنارە پان و بەرینەکاندا دەفڕن. لە هەموو لاوە دەنگی گریان و ناڵین دیَ. لە هەنارە پەمەیی و سوور و زەرد و کەسکەکاندا شینگێڕییەك... لەو سەرەوە هەنارەکە لە باغی پەرییاندا دەبینن. ناڵەی هەنارەکە دنیای داگرتووە. دار هەنارە گەورەکە، دەدرەوشێتەوە. ملیۆنان هەناری شینگێڕی پێوەیە...

ئەسپەکە دەڵیَ:"ئێستا دەکەوێنە سەر هەنارەکە. تۆ خۆت لکی هەنارەکە توند دەگری و بەری نادەی. هەنارەکە لە رەگەوە هەڵدەکێشریَ و لەگەڵمان دیَ."

هەر واش دەکا. لەگەڵ هەڵکەنرانی هەنارەکە لە رەگەوە، وڵاتی پەرییان دەبێتە هەرا و هەنگەمە. چیی هەنارەکە بەرزتر دەبێتوە و لە زەوی دوورتر دەکەوێتەوە، هەرا و هەنگەمەکەش چڕتر دەبێتەوە، بەڵام پەرییەکان تۆزی پێی ئەسپەکە ناشکێنن و ناتوانن هەنارەکەی لیَ بستێننەوە.

ئەسپەکە دەگاتە بەسەر مەڵبەندێکی چۆڵ و پان و بەرینی وەك چوکووراوا.

"هەنارەکە ئا لێرە دەچەقێنی. هەم باشتر هەڵدەدا، هەم سەد ئەوەند، سەد هەزار هێندەش گەورەتر دەبیَ و ئیتر ناشگرییَ و بەردەوام پیَ دەکەنیَ."

دەنیشتنەوە و لەگەڵ ناشتنی هەنارەکە لەویَ، هەنار دەست دەکات بە هەڵدان و گەورەبوون و پێکەنین.

ئاسمان پڕ دەبێ لەو شەودێزی ڕەشی وەك قەیتەران... و هەرکامەش سوارچاکێکی گەنج لەسەر پشت و هەر سوارچاکەش دارێکی هەڵکەنراوی باغی پەرییانی لەباوەشدا... سوارەکان یەك یەك و دوو دوو دادەبەزن و دار هەنارەکانیان دەچەقێننەوە. ئەو هەنارانەی تاوێك لەوەپێش دەگریان، دەست دەکەن بە پێکەنین و ئەسپە ڕەشەکان لە ئاسمانەوە دەنیشنەوە. دنیا پڕ دەبێ لە داری سووربا‌وی لێوبەپێکەنینی هەنار.

دوو تاڵە موو لێك دەخشێنی...

"چ دەخوازی لێم دەستێنی..."

"بۆ ئاوابییەکەی دەروێش بەگ."

ئەسپەکە دێ و دەیخاتە سەر پشتی. بە ددان هەڵیدەگرێ و لەبەر دەرگا دایدەنێ. دایکی خۆی بەسەر دەکێشێ و دەگری.

"ئەوە بۆ وات لێ هاتووە؟ بۆ وات لێ هاتووە؟ چتە، چی...؟"

"نازانم."

بەگ دێ... ئەسپەکان... سەدان هەزار ئەسپ...

تا بەیانی لە زیندەخەودا... ئەسپەکان، دایکی، بەگ، باغی هەنار، عەلیی عەریزەنووس... هەزاران سەگی کەڵپەگڕ بە مڕەمڕ و حەپەحەپ، ملیۆنان ژەنگەسوورە کە وەك هەورێك ئاسمانیان ڕەش داگێڕاوە. بازاڕی ئاسنگەران، شارۆچکەی خرۆشاو بە شوێنیدا، شارۆچکەی بە هەرا و گوڕە بە ئەسپ و سەگ و خانوو و دووکان و مزگەوت و منارە و زرۆ شتی دیکەیەوە، گوڵعوزار، سمت و کەفەڵی ژنەکەی حاجی، شەهوەتێکی هەوسار پچڕاو و زاڵ...

تاوەکە لایەکی گەرم دادێنێ و هەرچی دەکا تینی تێدا نییە هەستێ. لە خەوێدا، جینگڵ دەدا و بە سینگە خشکە هەتا دوور دوور ڕۆیشتبوو و پاڵی بە دارە توویەکەوە دابوو. قوڕ بە سەروردەموچاوییەوە وشك ببۆوە. ئاخێزێکی کرد و دیسان لەبەر بێهێزی لەسەر عەرزەکە پان بۆوە. دوای ماوەیەك توانیی هەستێ. دوای ئەوەی هەندێ بەڕێگادا ڕۆیشت، دیتی وا خەریکە لە قامیشەڵانەکە دەچێتە دەرێ... ڕاچڵەکی و ترسی لێ نیشت. هەموو وڵات هێمن و بێدەنگ بوو. ڕێیەکە تۆزێك لەولاترەوە لاکشابوو. هەموو تینی خۆی کۆ کردەوە و دایە لاقەکانی و گەڕاوە و وەك شێتان خۆی بە نێو قامیشەڵانەکەدا کردەوە. دەکەوت و هەڵدەستایەوە و دیسان دەکەوتەوە.

ئەو ڕۆژە دەمەدەمی ڕۆژئاوا هاتە قەراز قامیشەڵانەکە و بەترسەوە گەڕاوە دواوە.

ئەو قامیشەڵانە توند لاقی بەستووە و بەری نادا. لەسەر گازەرای پشت کەوتووە و زاری داپچڕیوە و هەناسە دەکێشێ و بە ژوور سەرییەوە ئەسپی رەشی وەك قەتران بە سوارچاکی گەنجی هاوتەمەنی ئەوەوە و هەرکامەیان دارهەنارێك لە باوەشدا تێدەپەڕن.

ئەو بەرەو شارۆچکە دەڕوا و شارۆچکەش بەرەو لای دێ. شووشەکان زۆر روون و درەوشاوە و بڵێسەدار و بە خرم و هۆڕ. هەموو شتێك لەتوپەت دەبێ. قامیشەڵان، گابەردەکان، دارچنارە بەرزەکان هەر هەموو دەڵێی هەڵکەنراون و دەفڕن. زۆنگاو و خاکەکە لە دوورەوە بە قوڵتەقوڵت و بە لەرینەوەی بەربڵاو و بەرین، هەناسەی قووڵ هەڵدەکێشێ. پێی بە دارێکی قەرەمووقەوە بەستراوەتەوە. دڕکەکانی ئازاری دەدەن. یەك پشوو و لە حاڵێکدا دەموچاوی گرژ بووەتەوە و لچی هەڵقرچاندووە قەرەمووق دەخوا... ژنێك سەری بە دیوارەوە ناوەو سەردولکە دەچڕێ، وەك خەیاڵێك. قژی بەسەر نێوچاوانیدا کەوتووە. کێردێکی بریقەداری بەدەستەوەیە. کێردەکە رادەوەشێنێ. سەری چڵووکی لکەهەنجیرێکی گرتووە و بەنێو خاك و خۆڵەکەدا رایدەکێشێ.

لە بێستانەکەدا، لاقی هەتا گوێزینگان رۆدەچێ. پێی لەسەر شووتییەك دانا و هەڵخلیسکا و کەوت. دەوەنە تووترك لە لاقی ئاڵابوون و دایاندەڕووشاند. جێ جێی لەشی خوێنی لێ دەچۆڕاوە. تفی نێو زاری لیچق و خوێناوی و سوێر بوو. هێڵنجی پێ دەهات. بچووك بووەتەوە، ئاگای لەخۆی نەماوە، خەواڵووە و سڕ و بێ تاقەتە وەك مردووان... ئەو بنیادەمانەی سواری ئەسپی بێ رەخت و زینن، لە دوورەوە تێدەپەڕن. دەستەیەك بنیادەم لە شوێنێکەوە کە زرمەی ناڵی ئەسپی لێوە دێ، لەوبەری تاریکاییەوە تێدەپەڕن... دەست لە گیرفاندا... تەرمێك بە نێو خۆڵی ئەو رێگەیەدا کە لاق تا گوێزینگان لێی رۆدەچێ، بەدوای خۆیاندا دەکێشن. وێنەی تەرمەکە راناوەستێ و رێچکەیەکی تەڕ لەسەر رێیەکە بەجێ دێڵێ. سوارەکان دار هەنارەکانیان لەباوەش گرتووە و بەسەر تەرمەکەدا تێدەپەڕن.

# ١١١

"بەڵێ جەنابی فەرماندە، چار نییە هەر دەبێ وا بکەن. ئەو متمانە بەهیچ کەس ناکا، تەنانەت بە منیش کە برای ئەوم. نەریتەکەیان وایە. نەریتی پیاوکوشتن، کە سەدان ساڵە هەیە. شوێنبزرکردن و شاردنەوەی. دەبێ وا بکەی: شەوێکیان لە ناخافڵێ، گوندەکە گەمارۆ بدەن و ئەوجار هەموو پیاوەکانی گوند لە گۆڕەپانەکە کۆ بکەنەوە، ژنەکانیشیان. چونکە لەوانەیە پیاوکوژەکە جلوبەرگی ژنانە لەبەر بکا و بۆی دەرچێ. دوای ئەوەی هەموو ماڵەکانتان پشکنی و دڵنیا بوون کەس لە ماڵەکاندا خۆی نەشاردووەتەوە، جا بچن ژنەکەی حاجییە شێتە بێنن و یەك بە یەك هەمووانی پێشان بدەن تا بکوژی مێردەکەی دەدۆزێتەوە. جا ئەو جار هەر ئەو کابرایە پێشانی مرادهەتیو بدەن. ئەگەر ئەویش گوتی خۆیەتی، بە دڵنیاییەوە دەسبەسەری بکەن.

فەرماندە:"بەڵێ تۆ راست دەکەی. چارمان نییە. بەڵام بەپێی قانوون ناتوانین وا بکەین. بە چ ئیجازە و بیانوویەك دەکرێ گوندێك گەمارۆ بدەی؟"

ماهیر قاباقچی ئۆغلی:"ببوورە جەنابی فەرماندە. خودای نەخواستە پێت وانەبێ دەمەوێ فێرت بکەم. ئیشەڵڵا خراپم لێ تێناگەی. دڵنیام تۆ زۆر لە من باشتر دەزانی چ بکەی. ئەگەر ئیزنم بدەی، ئەمن ناوی چەند کەسێکی گوندەکەت دەدەمێ و جەنابت ئەمری پشکنینی ماڵەکانی ئەوان لە دادگا وەردەگریت و دەچی و ماڵەکان دەپشکنی. گوندەکەش گەمارۆ دەدەی. ئەگەر حەزت لێ بوو، ئەمری پشکنینی ماڵەکەی دەروێشیش وەردەگریت. من پێم وایە تۆ هەر لە ماڵەکەی دەروێشدا پیاوکوژەکە دەدۆزیتەوە. ئەی پێت چۆنە لیستەی خەڵکی گوندەکە لە کوێخا وەرگری و خەڵکەکە بە پێی لیستی ناوەکانیان لە گۆڕەپانەکە کۆ بکەیتەوە؟"

"زۆر باشە ماهیر بەگ. هەر بەراستی مێشکت باش ئیش دەکا. ئاوا کەس ناتوانێ خۆی بشارێتەوە."

"من دڵنیام پیاوکوژەکە هەر لە گوندی ساری ئۆغڵییە جەنابی فەرماندە. خۆ ئاگاداری من بەپیر دەروێشەوە چوومە ئەدەنە. هەر چاوم پێی کەوت، دیتم گرژ و مۆنە و چاوەکانی پەشێون. دەروێش بەگ بۆ شوێنە ونکێ، گوتی ئێستا کەسی وای نییە پیاوی پێ بکوژرێ، لە حاڵێکدا هەمووان دەزانن، ئەو هەر ئێستاش بیهەوێ، لە گوندەکەی خۆیدا ئەوەندەی پیاوکوژ هەیە بتوانێ هەموو چوکووراوایان پێ بکوژێ.

نازانم راحەتی گیانم. دەروێش بەگیش نکوڵی لە هەموو شتێك دەکا. من دڵنیام ژنەکەی حاجییە شێتە و مرادهەتیو هەر لەوێ پیاوکوژەکە دەناسنەوە. بەڵام نابێ کەس لە گەمارۆدرانی گوندەکە ئاگادار بێ. ئەوجار، دەبێ وای رێك بخەی، کەی نەتوانێ لە بازنەی گەمارۆکە دەرباز بێ. جەندەرمەی زۆر بەرن و وەك ئەموستیلە بیتەنن. چونکە دەروێش بەگ بەفرت و فێڵە و بێت و سۆسەی بکا، پیاوکوژەکە هەر نەبێ لە بن باڵی باڵندەیەك دەبەستێ و دەربازی دەکا."

"ئەوەیان بۆ من ماهیر بەگ. ئەوەیان کاری ئێمەیە."

"زۆر داوای لێبوردن دەکەم. زۆر داوای لێبوردن دەکەم جەنابی فەرماندە. بە خودایەتیی خودا مەبەستێکی خراپم نەبوو. هەر ویستم بە جوانی پێت بڵێم دەروێش بەگ کێیە و چۆنە. خۆ دیارە ئێوە لەو شتانەدا زۆر لە ئێمەمانان شارەزاترن. کوێر بێ ئەوەی دەڵێ وا نییە."

نەقیب هەستابوو، لەسەرخۆ جووڵەیەکی کرد و دەستی پێ کرد:"بەڵێ ماهیر بەگ، پێم وایە دەتوانم بەبێ هیچ گرفتێك ئەو کێشەیە چارەسەر بکەم. ئەگەر ئەو مەملەکەتە لە چنگی ئەو ئاغا رێگر و چەتە و پیاوکوژانە رزگار نەکرێ، تێدا دەچێ. ئەوانە خوێنمژن. زۆریش بەدەسەڵاتن و بە ئاسانی پشتیان لە عەرزی نادرێ. هەر کەسی دیکە لە جێی دەروێش بەگ بوایە، هەر بەو بەڵگانە، دەکرا دەسبەجێ دەسبەسەری بکەین. بەڵام ناکرێ پیاوێکی وەك دەروێش بەگ بەو بەڵگانە، دەسبەسەر بکەی. بەگەکانی ئەدەنە لە ئەنکەرە دەیکەنە هەڵڵا و هەرایەك ئەو سەری دیار نەبێ. ئەوانە پشتی یەکتری بەرنادەن... بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو شتانەش، هەموو بەڵگەکان کۆ دەکەمەوە و پیاوکوژەکەش دەگرم و ناچاری دەکەم دان بەوەدا بنێ کە دەروێش بەگ دنەی داوە حاجی بکوژێ. جا ئەو کاتە دەکرێ سووك و ئاسان دەروێش بەگ قۆڵبەست بکەین. جا ئەو کات بەگەکانی ئەدەنەش کام رێگە سەختە با بیگرن و کوێیان پێخۆشە با بچن. جا دەچنە مانگ یان ئەنکەرە. ئەگەر دەروێشمان لە تەویلە کرد، جا ئاغاکان لێیان حاڵی دەبێ و دەست لە پیاوکوشتن هەڵدەگرن. خۆ بەدەست من بوایە، سزایەکی کەمم بۆ ئەو پیاوکوژە گەنجە دیاری دەکرد، بەڵام دەروێش بەگم لە سێدارە دەدا. پیاوکوژی سەرەکی و کوژارو... ئاخر چۆنە ئەو

کابرایە توانیویێتی ئەو هەمووە خەڵکە شوێنبزر بکا؟ پیاوکوژەکان لە بەندیخانەدا رزیون، بەڵام کەس بە دەروێشی نەگوتووە پشتی چاوت برۆیە..."

"دەروێش کابرایەکی فێڵبازە. لە پێشدا لەگەڵ مودیر ناحییە و قایمەقام رێك دەکەوێ و سمێڵیان چەو دەکا و جا ئەوجار دادوەری و کارمەندەکانی دیکە هەموو بەگوێی دەکەن. ئەو خۆی حوکمەتێك بوو لە حوکمەتدا. ئێستاش سەرەڕای ئەوەی لە پەرپوێ بووە، هێشتا خۆی بە حوکمەت دەزانێ. ئەوانە هێشتاش لە وڵاتەکەی ئێمەدا کۆیلەداری دەکەن. بنیادەم ناکڕن ودەفرۆشنەوە. ئەویش بە نرخێکی زۆر کەم. کار و زەحمەتی بنیادەمەکان بە دراوێکی سووتاویش دەکڕن. بە نرخی تێرکردنی زگی برسییان. یان بنیادەمێك بکڕە و بیفرۆشەوە، یان ئەوەندەی بچەوسێنەوە ژیانێکی مەمرە و مەژیی هەبێ، جیاوازییەکی هەیە؟ لەم سەردەمەشدا سیستەمی ئاغایەتی و بەگایەتی لە وڵاتی ئێمە هەر ماوە کاکی من. ئێمە خەڵکێکی پێشکەوتووین و شەڕی رزگاریخوازیمان بۆیە کرد، لەو کۆیلایەتییە رزگار بین. شەڕەکەشمان بە نرخی خوێنی هەزاران کەس بردەوە و تێیدا سەرکەوتین. بەڵام دەرەبەگایەتیمان کردە تاجی سەرمان. کەچی ئێستا ئەوە ئێوە رۆڵەی رەسەنی کۆماری هاتوونەتە مەیدان و نیشتمانەکەمان لە هەرچی و پەرچی و بەرەڵڵا و لەوانە رزگار دەکەن. ئێوە دەروێش بەگ دەگرن، لە حاڵێکدا بەر لەوەی تۆ بێی، هیچ لێپرسراوێکی حوکمەت نەیدەوێرا هەنگاوێکی ئاوا نیشتمانپەروەرانە هەڵگرێ. ئەوان بە عالەمی ئاشکرا کردەوەکانی دەروێشیان دیزەبەدەرخۆنە دەکرد و پێیاندا هەڵدەگوت و هەر بەپێچەوانەی ئەو جوولانەوە، وایان هەڵدەدێران مەگەر خودا بزانێ. ئەگەر راستیت دەوێ، ئەوان لە ئازایەتیدا، تۆزی پێی تۆیان نەدەشکاند.

تۆ بەرتیلخۆری کەس نیت، هەتا عەیبی بۆ داپۆشی و بە پێی ویستی ئەو بجوولێیتەوە. تۆ ناهێڵی خوێنی هاونیشتمانییەك بەفیڕۆ بچێ. چونکە ئێوە رۆڵەی رەسەنی ئەتاتۆرکی مەزنن. ئەمنیش خۆم بە یەکێك لە رۆڵەکانی ئەو دەزانم هەر بۆیەشە لایەنگری لە براکەی خۆشم، لە برا پیاوکوژەکەشم لە دەروێش بەگ ناکەم جەنابی فەرماندەی بەڕێز. چونکە کوشتنی کەسێك و نەناسرانی پیاوکوژەکە، یانی ئەوەیکە هەمموومان کوژراوین و بکوژەکەمان نەناسراوە. دەی وڵاتێکی ئاوا بێدادی و زوڵمی تێدا بێ، هەر تێدا دەچێ. بەڵام چونکە دادپەروەری بەردی بناغەی دەسەڵات و مەملەکەتەکەی ئێمەیە... ناتوانین ئیزن بدەین ئەو بناغەیە لەرزۆك بکرێ. چونکە ئەگەر ئیزن بدەین، هەموو تێدا دەچین. بەڵام دەروێشی برام، کە لە گیانی خۆمم خۆشتر دەوێ، نابێ بزانێ ئەمن کارتان لەگەڵ دەکەم، چونکە زۆری پێ ناخۆش دەبێ و دڵی دێشێ. ئەمن دەروێشم زۆر خۆش دەوێ. بەڵام دادپەروەریم خۆشتر دەوێ. چونکە پێشینیان گوتوویانە:"وڵاتێك

به کوفرەوە دەمێنێتەوە، بەڵام بە زوڵمەوە خۆڕاناگرێ و تێدا دەچێ." باشە ئێمە کە ئامادەین گیانی خۆمان بکەین بەقوربانی بەختەوەریی وڵاتەکەمان، چۆن دەتوانین ئیزن بە یەکێك ـ با خۆشەویستترین کەسیشمان بێ ـ بدەین بناغەی حوکمەتەکەمان تێك بدات؟ من دەروێشم خۆش دەوێ، زۆریشم خۆش دەوێ. ئەو دەمەی لە دار دەدرێ، لە بن سێدارەکەی ئاگرم تێبەردەبێ و قوڕ دەپێوم. کچەکەی، کوڕەکەی و ژنەکەی بە رواڵەت ئاخێکی بۆ هەڵدەکێشن، کەچی مەرگی دەروێش، مەرگی برای بەڕەچەڵەك ئۆغوزم، پشتی من دەشکێنێ و دوای ئەو ناتوانم بژیم. بەڵام دەسەڵات چییە. براکەم پیاوی بەدەست چووە و زیانی بە بناغەی حوکمەت گەیاندووە و ئەو زیانەش کاتێك قەرەبوو دەکرێتەوە، کە ئەو کەسەی وای کردووە لە دار بدرێ. وانییە جەنابی فەرمانده؟"

"براکەت لە دار دەدرێ ماهیر بەگ. هیچ کەسیش نابیستێتەوە کە تۆ هاوکارمان بووی. زۆر سوپاس و دەستت خۆش بێ بۆ زەحمەتەکانت. خۆمان ئامادە دەکەین بۆ کارەکەمان."

"خودا پشت و پەنات بێ جەنابی فەرمانده. عەمرت درێژ بێ. کزەم لە جەرگی دێ. وەختە ئاگرم تێبەربێ بۆ دەروێشی برام. بەڵام حاجییە شێتەیەکی نیشتمان، دادپەروەریی نیشتمان، بناغەی دەسەڵات بەلای ئێمەوە زۆر خۆشەویستتر و بەنرختره لە برا و خزم و کەسەکانمان."

"جا هەر دەبێ واش بێ ماهیر بەگ. جارێ بەخێر چی."

ماهیر وەك بای شەماڵ لەوێ هاتە دەرێ. تەواو، دەروێش بەگ پشتی شکا. جا ئەوجار بەکەرزانینی مزەفەر و دەرهێنانی مڵکی ساری ئۆغڵی لەچنگی، شتێکی زۆر ئەستەم نەبوو. لە پێشدا لەگەڵ مزەفەر دەبیتە شەریك و کۆمپانیاکە زەرەر دەکات. چەند سەد هەزار لیرەیەکی ئەو زیانە بەئەستۆی خۆت دەگری. دیسان زەرەر... دوو ساڵی دوای ئەوە بەناچاری مڵکەکان دادەنرێن بۆ فرۆشتن و خۆت ئەوکات هەمووی وێکڕا دەکڕیتەوە.

جارێ لێگەڕێ با فەرمانده پەلاماری شێرەکەی ئاوەدانی بدا. تەنانەت پیاوکوژەکەش نەگیرێ، هەر ئەوەندە بەسە هەواڵی پەلاماردانی گوندی ساری ئۆغڵی بە چوکووراوادا بڵاو بێتەوە، پشتی دەروێشیب پێ دەشکێ. دەروێش شێت دەبێ. لەوانەیە تەقە لە فەرمانده بکا، یان خۆی بکوژێ. دەروێش خۆی پێ ناگیردرێ و دڵنیام شتێك دەکا. هەر بژی فەرمانده. بژی رۆڵەی ئازا و بوێری کۆماری، کە لە دەرەبەگان ناترسی. هەر تەمەندرێژ بی. دەروێش هەر بە زەینیشیدا نایە ماڵەکەی بپشکنن. ئۆغوز رەچەڵەکە بەناوبانگەکەم. کۆشکە بەرزەکەت وەك ماڵی دزێك دەپشکێنرێت. چما پشتت ناشکێ؟ تاقەتی ئەوە دێنی؟ ناتەقی؟ تەنانەت عوسمانلییش لە نێو ئێوەوە پەیدا بوو. ئێوە بوون هەتا پشت دەروازەکانی ڤیەننا چوون. ئێستا

ئەفسەرێکی پلەنزم دێ و خەڵوەتیی ماڵەکەت دەپشکنێ دەروێش. هەستە لەخەو ئوغوز ڕەچەڵەکەکەم. بەیان ئەنگوت، جگەر سووتا و بوو بە بریانی...

گەیشتبووە پۆستخانە کە شتێکی وەبیر هاتەوە و دەمودەست گەڕایەوە. ئەی لەو هەڵەیە. لەو گێلێتیە. لەبیری چوبوو ناوی پیاوکوژەکە بڵێ. کوڕە مێشکێك چۆن بەرگەی ئەو هەمووە شادی و کەفوکوڵ و خۆشییە بگرێ؟...

لە حاڵێکدا پڕ بەزاری پێدەکەنی، دەرگاکەی کردەوە و گوتی:"زۆر داوای لێبوردن دەکەم جەنابی فەرماندە. گرنگترین بەشی کارەکەم لەبیر کردبوو. ئاخۆ ناوی پیاوکوژەکەم پێ گوتی؟"

فەرماندە:"نا... نا، پێم وانییە هەر بزانی ناویشی چییە. ئەگەر ناوەکەی بزانین هەر زۆر ئاسانە. دەسبەجێ حوکمی دەسبەسەرکردنەکەی دەردەکەم. ناوی چییە؟"

"کوڕە بە حاڵی سەگ ناوەکەیم دۆزییەوە. خۆ ئەگەر بۆتی شەرح بدەم، ئەو بەیت و باوە زۆر هەڵدەگرێ. عەرزت بکەم، ئەو گەنجە یەکێکە لەوانەی دەروێش هەر لە منداڵییەوە وەك گلادیاتۆرەکان بۆ پیاوکوشتن پەروەردەی کردوون. ناویشی یوسفە. یوسفی ئاق داماد. کوڕی مەحموود."

# ١١٢

دەروێش بەگ ئەو شەوە هەتا بەیانی خەوی لێ نەکەوت و بیری لە چارەنووسی یوسف کردەوە. لە ژیانیدا ئەوە یەکەم جاری بوو ئاوا هەڵدەچوو و خەریك بوو پەشیمان بێتەوە لەو کارەی کردبووی. یوسفی لێ ببووە برینێکی بێهەتوان و تیرێکی ژەهراوی لەسەر دڵی. باشە بۆچی ئەو کارەی بە گەنجێکی ئاوا شلکەنەمام ئەسپاردبوو و تووشی ئەو گێژەنی بەڵایەی کردبوو؟ ئەو منداڵە دەبێ بۆکوێ چووبێ و ئێستا چۆن بێ؟ دەبوایە دوای کوشتنی حاجی بگەڕێتەوە ئاوایی.

سەری سووڕمابوو. هیوای لێ بڕابوو. نەیدەزانی چ بکا. هیچ نیگەرانی خۆی نەبوو. یوسفیان کوشتبایەش، نەیدەخستە ئەستۆی ئەو. کزەی لە جەرگی هەستا. بێت و ئەو منداڵە، ئەو هەتیوە، ئەو گەنجەی چاوە خەمبارەکانی لە چاوی کەڵەکێوی دەچن بگرن، لە داری دەدەن. ئەگەر ئەوە روو بدا، جا دەروێش چۆن بژیی و چۆن نانی زیندووان بخوا؟ ئەو منداڵە هێشتا سەرەتای بەهاری تەمەنێتی.

بێت و ئەو منداڵە بگیرێ، ئاخۆ رێگەیەك هەیە لە سێدارەی رزگار بکەن؟ خۆ بیست ساڵ لەوە پێش بوایە، ئاااخ، بۆ بیست ساڵ لەوەپێش. هەر ئەمساڵ خۆزگەم بە پار. هەر بەراستی بۆ تووشی ئەو رۆژگارە ببوو و قەدر و قیمەتی نەمابوو؟ لەوەدەگەڕا بزانێ بۆ؟ هەندێ هۆکاری بەمێشکیدا هات، بەڵام هیچیان قایلیان نەدەکرد. ئەو دنیایە زۆر شتی تێدابوو، کە ئەو لێیان تێنەدەگەیشت، بەڵام ئەو شتانە چ بوون؟

یوسف ماوەیەك وەشوێن حاجی کەوتبوو و خەڵکیش پێیان زانیبوو. ئاخرییەکەشی بە کێرد ئەنجنیبووی و تەرمەکەشی لە دەموزتەپەوە بەسەر عەرزیدا هەتا شارۆچکە راکێشابوو. خۆ ئەوەی لەسەر سووربێتەوە، مسۆگەر لەسێدارەی دەدەن.

لەپڕێکدا تیشکی شادییەك لە ناخیدا تەقییەوە. یوسف رزگار ببوو. یوسف ئیتر لە سێدارە نەدەدرا. خۆ بە پێی قانوون کەسێکی تەمەنی لە خوار بیست ساڵانەوە بێ، لە سێدارە نادرێ. بەڵام خۆ هەتا هەتایە لە بەندیخانەدا دەبێ. دەروێش بەگ چارەسەری ئەوەشی دۆزییەوە. حکوومەتە دیموکراتەکان هەموو رۆژێ ئەمری لێبوردن دەردەکەن. دوای چەند لێبوردنێك، یوسفیش رۆژێك هەر بەر دەکەوت و بەردەبوو.

بەگ تا رادەیەك هێور ببۆوە و بەو بیرکردنەوەیە پشوویەکی کێشا. ئارەقەی نێوچاوانی سڕییەوە. بەڵام هێشتا ژان و ئازار چنگیان لە دڵی دادەگرت. هەوڵی دەدا خۆشحاڵ بێ و بڕوا بەوە بێنێ، کە یوسف زۆر زوو لە بەندیخانە بەردەبێ، یان هەر بە داویشەوە نابێ. بەڵام نەیدەتوانی و پتر هەڵدەچوو. کەچی ئەو تووڕەییە، هێندەی دڵسۆزییەکەی بەتەوژم نەبوو. ئەوەندەی بەزەیی پێیدا دەهات و خەمی بوو، چیی نەمابوو گیانی دەربچێ. هەر دەتگوت ژەهراوی بووە. خۆی گرمۆڵە دەکرد. پشووی دەرنەدەهات و خەریك بوو بخنکێ. بەڵام تووڕەییەکەی فریای دەکەوت و رزگاری دەکرد. خۆ ئەگەر توانیبای هەر وا تووڕە بێت، زۆر باش دەبوو. لە تووڕەییەوە بەرەو دڵسۆزیی و بەزەیی و لە دڵسۆزییەوە بەرەو تووڕەیی و لەنێوان ئەو دوو هەستەدا وەك خولخولە دەسووڕایەوە.

جارجاریش دڕدۆنگی لە دڵیدا سەرەتاتکێی دەکرد و رادەچڵەکی و کاتێ بەزەیینیدا دەهات کە لەوانەیە یوسف ناوی بهێنێ و پێوەی بکا، مووی لێ دەبووە نەشتەر. باشە بۆ پێوەی نەکا[*]؟ گەنجێکی خۆشی لەخۆ نەدیو... هەر واش دەبوو. جا ئەوکات دوژمنەکانی کلکیان تێك دەئاڵاند و لە سێدارەیان دەدا. بە ئاخ و داخەوە دەیگوت:"ئەی خۆزگە من تێوەرنەدا، خۆزگە..."

دەنگی دەرگا هات و یەکێك لە پیاوەکانی وەژوور کەوت. بەگ بەبێ ئەوەی ئاگای لەخۆی بێ هەستا و بەدەنگی بەرز پرسی:"چ بوو، چ باسە؟"

"بە خۆم و دە سەگەوە هەموو ئەو زۆنگاوەم سەنگ و سووژن دا و هەرام کرد "یوسف"، بەڵام نەمدۆزییەوە. ئێستاش دەچمە چنارلارئاراسی."

"گوتم با ئەمشەوە هەر کەس یوسفی دۆزییەوە بیهێنێتە لام، هەتا زیندووە، گوتم با..."

"بەگ، ئێستا دەچمە چنارلارئاراسی، بۆ قامیشەڵانەکە... لەوانەیە...

ئەو پیاوانەی وەشوێن یوسف کەوتبوون، یەك بە یەك دەهاتنەوە و بە سەرکزییەوە دەیانگوت، نەیانتوانیوە بیدۆزنەوە. هەر کامیان دەهاتەوە، تیشکی هیوایەك لە دڵی دەروێش

* پێوەکردن: بە داوەوەکردن. کردن بە داوەوە. خستنە تەڵەوە. لێرەدا مەبەست ئەوەیە کەسێك یەکێکی دیکە لە کەتنێك وەربدات.

دەگەڕا، بەڵام زۆر زوو لێی دەبووە دڵەکوتە. چیی نەمابوو ڕۆژ بێتەوە. بەگ وڕ و کاس بوو و ئەگەر سەریشیان بڕیبایە، هەستی پێ نەدەکرد. سەر لە شەوێ هەموو خەڵکی ئاوەدانی، هەموو گەنجەکانی ناردبوو. گوڵعوزار و میرۆش وەشوێن یوسف کەوتبوون. خەڵکی ئاوایی بە سوار و بەپێیان بە دەشتە کاکی بە کاکییەکەی ئاناوەرزا وەرببوون. سەگەلی نێودێشیان وەشوێن خۆیان دابوو. ئەگەر یوسف لەو دەوروبەرانە بوایە، بەدڵنیاییەوە دەیاندۆزییەوە. بە مردویی یان بە زیندوویی.

بەرەبەری بەیانی بەگ خۆی پێ نەگیرا و خۆشی لێی سوار بوو و بەرەو دەشتەکە ئەسپی تاو دا.

ئەو پیاوەشی وا ناردبوویە خانووەکەی شارۆچکە، بەدەستی بەتاڵ گەڕابۆوە. ئەی باشە ئەو منداڵە دەبێ لەکوێ خۆی شاردبێتەوە. کە بیری لەوە دەکردەوە، لەوانەیە بەسەر تەرمی خوێناویی یوسفدا بکەوێ، وەخت بوو شێت بێ... لەوانەیە هەزارەمین جاری بوو دووپاتەی دەکردەوە، بێت و وابێ خۆم دەکوژم. لەخۆی خۆش نەدەبوو کە گیانی کوڕێکی ئاوا بەشان و باهۆ و جوانچاکی... خستبووە مەترسییەوە، مێرمنداڵێك کە خۆشیی لە ژیان نەدیتبوو...

تیشکی لایتەکان، فانۆس و هاوار هاواری "یوسف جوق یوسف، یوسف جوق یوسف" لە هەموو لایەکی دەشتەکەوە دەبیسرا. بەگیش گەیشتە ئەوان. بەدەم تاودانی ئەسپەکەیەوە، بەهەموو تین و هێزی خۆی هەرای دەکرد:"یوسف، کوڕم یوسف."

بەدوای ئەوەدا گوێی لە زایەڵەی دەنگەکەی خۆی دەبوو لە دەشتە پڕ چەق و لوورەکەدا.

ئەسپەکەی هەر وا بە تاو هەتا شارۆچکە لێ خوڕی و لەوێ جڵەوی کێشا و گەڕاوە و بەرەو ئاوایی تاوی دا. تاوێك وەخۆ هاتبۆوە. ئەسپەکەی لە حەوشە بەردا، لە پلیکانەکان وەسەر کەوت. کۆشك کپ و بێدەنگ بوو.

دەروێش بەگ هەر پێی سەیر بوو و دەیگوت، بنیادەم دەعبایەکی سەیرە. هەتا ئێستا ئەو هەمووە بەڵایەی بەسەرهاتبوو و پتر لە پانزە جار لەمەرگ گەڕابۆوە، بەڵام قەت ئەوەندە نەشڵەژابوو. زۆر باشە، ئەو شڵەژانە لەبەر چی بوو؟ براکەی، بابی، مەحموودە خۆشەویستەکەی و دوو کوڕی کوژرابوون و هیچ کام نیوە و تەنانەت یەك بە دەی ئەو ڕووداوە کاریان تێ نەکردبوو. یانی ئەوەندەی یوسف خۆش دەویست و خۆی نەیزانیبوو؟

بەیان ئەنگوتبوو و چیی نەمابوو تاو هەڵبێ، کە گوێی لە دەنگی ڕاگیرانی ترۆمبێلێك بوو. لە پەنجەرەوە سەیری کرد. دیسان ماهیر بوو. جێی خۆی بوو بەهاتنی ئەو تووڕە بێ. چونکە

قەت متمانەی بەو نەبووە. بەڵام ئەمجارەیان پێی خۆش بوو هات. بەشکم خەبەرێکی خۆشی پێ بێ. بەپیرییەوە چووە سەر پلیکانەکان و پرسی:"دەی بڵێ بزانم ماهیر، چ باسە؟"

ماهیر بە لەبزێکی گریاناوییەوە گوتی:"ئەوەی نەدەبوو ببێ، قەوما. ئەوەی لێی دەترساین بەسەرمان هات. سووتاین و بووینە تۆزی بانان. وەجاغیان کوێر کردینەوە. ئاخر پێم نەگوتی دوژمنی ئێمە سووك و بێ شەرەفن؟ چما پێم نەگوتی بۆ ئەوەی پشتمان بشکێنن، لە هیچ جەنایەت و نامەردییەك ناپرینگێنەوە؟ یەکێك لە پیاوەکانتیان بە پارە کڕیوە و حاجییان پێ بەکوشت داوە. دەڵێن ئەو دەمەی تۆ لە ئەستەمبوڵ بووی، ئەمن چاوم بەسەر ئەو کارەوە بووە و پارەم داوە بەحاجی بۆ ئەوەی لە شارۆچکە رابکا. ئەوەم کردووەتە بیانوو و کوشتوومە. پیاوکوژەکەیان دۆزیوەتەوە براله."

بەگ بەدەست خۆی نەبوو، نەڕاندی:"دۆزیویانەتەوە؟ یانی گرتوویانە؟"

ماهیر بە هەناسەبڕکێ وەڵامی دایەوە:"هێشتا نەیانگرتووە. بەڵام دەیگرن. تەنانەت وێنەیەکیشان وەچنگ خستووە. دەڵێن دەزانن لە کوێ خۆی شاردووەتەوە و گەمارۆیان داوە و دوای گرتنەکەشی هەردووکیشمان دەگرن. فەرماندە ئەوەی بەخۆم گوت. ئەوانە دوژمنی سەروەت و سامان و دەستڕۆیشتووین. ئەوانە هەرکامەیان کۆمۆنیستێکی سوورن. ئەو عەلی سکاڵانووسی ئاگری بن کایە، هەمووانی تین داوە. کاکی من تۆ بی، هەم ناوی پیاوکوژەکە و هەم رەسمەکەشیان دۆزیوەتەوە.

"باشە پێم بڵێ بزانم قاتڵەکە کێیە؟"

لێرەدا دەنگی ماهیر وەك سەهۆڵ سارد و بێ بەزەیی بوو. بە لەبزێکی وەك بڵێی قەڵسە بگێڕێ، گوتی:"یوسف، کوڕەکەی مەحموود، باوکی..."

دەروێش کە ناوی یوسفی بیست، سەری لەگێژەوە هات و بەرچاوی رەش داگەڕا. ئەگەر دەستی بە پەرژینی پلیکانەکەوە نەگرتبایە، دەکەوت و هەموو ریسەکەی لێ دەبۆوە خوری. هەموو تینی خۆی کۆ کردەوە و بە لەبزێکی بێ خەمانە پرسیی:"بۆ لە نێو پیاوەکانی مندا، گەنجێك هەیە بەناوی یوسف؟"

"هەبووە، لێیان کۆڵیوەتەوە."

بەگ بەدەنگێکی لەرزۆك گوتی:"یانی هەبووە، ها؟"

دەمودەست لەبزی تووڕەبوو:"یانی توانیویانە پیاوی منیش بکڕن، ها؟:"

باش بەسەر خۆیدا زاڵ بوو. ماهیر لێرە مابایەوە، لەوانەبوو مەترسیی لێ بکەوێتەوە. دەستی لەسەر شانی دانا و لەسەری ڕۆیشت:"بەڵێ، ئەوجار تێگەیشتم کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لەکوێ دڕاوە. بەڵام خراپیان خەو لێ کەوتووە. تۆ خەمی ئەوەت نەبێ. یوسف پیاوی من نییە. ئێمە کەسێکمان بەو ناوە هەبوو. بەڵام وەك بیستوومە دوومانگ دەبێ مردووە. ئێستا تۆ بچۆوە شارۆچکە و گوێیەك هەڵخە بزانە چ داوێکمان بۆ دەنێنەوە. سبەینێ عەسر، لێرە چاوەڕێتم. هەتا عەسر لە ماڵێ نابم. دەی باشە، بەخێرچی. سبەینێ عەسر چاوەڕێتم."

ماهیر بەناچاری و لە حاڵێکدا هەزار جنێوی تەڕ و بڕی لە دڵی خۆیدا حەواڵەی دەروێش دەکرد، لە پلیکانەکان چووە خوارێ. بەگ ئیتر وازی لەوە هێنابوو خۆی بە خەتابار بزانێ. ئەوجار کەوتبووە جنێودان بە یوسف. خۆ ئینسان نییە. تەنانەت حەیوانێکیش ئاوا خۆی پێوە ناکا. خۆی پێشانی هەموو شارۆچکەکە داوە، وێنەکەشی... ئەو کەرە کەنگێ وێنەی گرتووە؟ نەکا لە شارۆچکە لێیان گرتبێ؟ تف لەو ڕوویەت، تف لەو شیرەی مژیوتە یوسف. بێت و بکەوێتە دەستی، لە پێشدا ئەوەندەی تێ هەڵدەدا شل و کوتی دەکا. جا بەدەستی خۆی دەیداتە دەست پۆلیس. تف لەتۆ، هەی بە نەفرەت بی. ئەی لەو کەرێتییە. گێلە. چما بنیادەم متمانە بە دەست و پێ سپلیکەیەکی ئاوا دەکا؟

ماندوو و شەکەت چوو خۆی خستە سەر جێوبانی خەوەکەی و دەسبەجێ خەوی لێ کەوت.

وەك بۆمبێکیان لەبن گوێی تەقاندبێتەوە، لەخەوێ ڕاپەڕی و لە جێوبانەکەی دەرپەڕی.

بڕوای بە چاوەکانی خۆی نەکرد. پێڵووی چاوی هەڵگلۆفین. چەند جارێك چاوی هەڵێنا و لێکی نانەوە. ئەوەی دەیدیت نە خەو بوو و نە خەیاڵ. ئەوەی بەرەوڕووی ڕاوەستابوو، یوسف خۆی بوو. ڕاست خۆی بوو. یەکێك لە پیاوەکانی بن پیلی یوسفی کە بەسەرپێوە هەڵدەلەرزی، گرتبوو و نەیدەهێشت بکەوێ.

بەگ چووە دەرێ و دەست و دەموچاوی شوشت و گەڕاوە. بە جزمەوە و بەبێ ئەوەی جلوبەرگی داکەنێ، خەوتبوو.

یوسف وای لێهاتبوو، نەتدەناسییەوە. هەموو گیانی قوڕاوی و خوێناوی بوو. جلوبەرگەکانی شڕ و تیتۆڵ تیتۆڵ ببوون. سەر برۆی ڕووشابوو و خوێنی لێ دەهات و لە چاوی ڕاستەیەوە هەتا سەر لێوی و لەوێوە هەتا گەردەنی شۆڵاوگەی دەبەست. چاوی دەرپەڕیبوون و وەك دوو مەڕمەڕ بەمۆڵەق وەستابوون و نەیاندەڕوانی. گژ و گیا هەڵکەنراوەکەی هەروا لە مستیدا بوو و دەیگوشین و دیار بوو لەبیری چوبوو دەستی بکاتەوە. سەروقژی پڕ بوو لە خۆڵ و خاك و پووش

و پەڵاش. هەر تاڵە موویەکی نووسەنەکەیەکی پێوە نووسابوو. قژی لەبەر نووسەنەکە دیار نەبوو.

بەگ بەدیتنی ئەو شاگەشکە ببوو. سەیری دەکرد و مووچڕکەی پێدا دەهات و نەیدەزانی چ بکا. ئەمری کرد:"بیبەنەوە ماڵەوەیان. بیشۆن و خاوێنی بکەنەوە. هەموو جلوبەرگەکانیشی بسووتێنن. برین پێچێکیش بێنن برینەکانی دەرمان بکا."

ئیتر بێدەنگ بوو و سەری گرتە نێوان هەردوو دەستی.

# ١١٣

چووە نێو حەشیمەتەکەوە و ڕاوەستا. حەشیمەت لەپڕ نەما. لەوێ، لە تەنیشت بەردە ڕۆمییەکانی ئیمامە کورد پێی بەعەرزییەوە ڕەق بوو. لووت و گوێچکەی تەرمەکە دەجوولان. مێشی ڕەش و بریقەدار و داهێزراو... گەرما هاتبوو. بازاڕ سریوەی لێوە نەدەهات. گەڵای دارەکان بێجووڵە، ژاکاو و چرچ و لۆچ و تۆزاوی، زەردەواڵە لە کەلێن و کولێناندا هەڵنیشتوو، پاساریش خۆماتکردوو لە هەورەبان و بانیژەکان. یەك دوو پەڕەسێلکە نزم ببوونەوە و چیی نەمابوو سینگیان بەر شۆستەکەی بازاڕ بکەوێ، تیژ دێن و وەك تیر هەڵدەستنەوە. تەرمەکە لەوێ کەوتووە و باسکی بەرەو لای سەری هەڵگەڕاونەتەوە و لەپی دەستی تۆزێ کراونەتەوە. دەڵێی وەیستوویەتی مستی بقووچێنێ و نەیتوانیوە. لاقەکانی ڕاست و لێك کێشاوەتەوە و تۆز و خۆڵ لە سمێڵی نیشتبوو. وەك منداڵێکی نامۆی گریاوی خەمبار و تێرنەخواردوو، کە لەیستۆکی لێ بزر بووبێ و لیچی هەڵقرچاندبێ و نێوچاوانی تێك نابێ، دەتگوت ئێستا قسە دەکا. هەر ئەو حاڵەتەی کە دەڵێی دەیەوێ قسەیەك بکا، یوسف شێت دەکا. بەدەوری تەرمەکەدا دەخولێتەوە و ڕادەوەستێ و چاوی تێ دەبڕێ و دیسان بەدەوریدا هەڵدەخولێ. ڕاوەستا و داهاتەوە و دەستی مردووەکە، مەچەکی دەستی ڕاستەی گرت و کێشای. ڕێك بە نێوەڕاستی بازاڕەکەدا... لوورەلوورێك لەگوێیدا دەزرینگایەوە. باسکی چەپەی خوێنی لێ دەهات. قۆڵی چەپەی کراسەکەی داکێشا و خەریکی پێچانی برینەکەی بوو. خوێنەکە ڕانەدەوەستا. کراسەکەی داکەند و جوان باسکی چەپەی بۆ بەست. خوێنەکە هەر هەڵدەقوڵی. چما برینی مردووش خوێنی لێ دێ؟ لەوانەشە نەمردبێ. لەوانەیە نەمردبێ. ئەوە حاجییە شێتەی پێ دەڵێن. چما حاجییە شێتەش دەمرێ؟ ئەو گلاوە، وەك سەگ حەوت گیانی هەیە. بێ شەرەف. باسکی چەپەی دایە بەر شەق. خوێنی پتر لێ هات. هەتا ئەژنۆی خوێناوی بوون. ئیتر ماندوو بوو. لە بن لێوانەوە گوتی:"چڤش". ڕادەوەستێ یان نا چاوی دەربێ. دەرنەچوونی

گیانی کوژراوێك و رانەوەستانی خوێنەکەی، شتێکی باشە. ئەوانەی ئاوا بە کێرد دەکوژرێن خوێنیان راناوەستێ. ئەوە نەبوو گەرووی خەلیلیش هەتا سێ رۆژان دوای هەڵبڕینەکەی هەر خوێنی دەهات. نەدەهات؟ کوژراوەکان زۆریان خوێنیان بەند نابێ. باشتر، ئەوە گۆمیلکەی خوێنەکەی تۆز و خۆڵ داپۆشی. گێژەڵووکەیەك هەڵیکرد و خاك و خۆڵێکی هێنا و هەموو وڵاتی داپۆشی. خاك و خۆڵەکەی بەسەر مردووەکە و ئەو برینەش داکرد، کە خوێنی لێ هەڵدەقوڵی و داپیۆشین. مردووەکە وەبن تۆزو خۆڵ کەوت و لە شوێنێکەوە دەنگی گۆرانییەك هات. شەوەکە لەرزی و ئاسمان لەبەر هەور دیار نەبوو. هەور دەکەوتنە سەر یەك و تێك دەچڕژان. با بفڕن. وەستا وەسمان هات. "ئامان"ـیش لە گوندی کۆتمەز، بە بەژن و باڵای کورت و نێوشانی پان و مەمکی قیت و لێوە گۆشتنەکەیەوە، وەی باوکە ئامان لێوی چەندە گۆشتنن. ئامان، بەڵێ ئامانیش هات. خەریك بوو رۆژ دەبۆوە. ماندوو و شەکەت دیار بوو. تیشکی هەتاو دەهات. دەمێکە دەبوو هاتبا. وەدرەنگی کەوتووە. ردێنی لە تاریك و روونی بەیانیدا وەك زیو دەدرەوشێتەوە. پشووی سوار بوو. قامیشەڵانەکە لە دوورەوە سەوز دەچێتەوە. دەبێ خۆی بگەیەنێتە ئەوێ. بەڵام ئەی چ لەو بنیادەمە بکات. شێت بوو. خودا بزانێ لەسەر چیی ئەقڵی لەدەست داوە. ئاوی ئێرە کرمی تێدایە و بۆ خواردنەوە نابێ. هەرکەس لێی بخواتەوە دەمرێ. لە بن خاکی بەخوێن خوساوەوە، شێیەکی نەرم نەرم دێتەدەرێ. خوێنەکە هەڵدەمژێ. مردووەکە هەست و بەسەرسووڕمانەوە سەیرێکی دەوروبەری کرد. چاوی هەڵگلۆفین و دیسان بەسەر سووڕمانەوە لە دەوروپشتی خۆی روانی و ئیتر دەستی راستەی لە سەر چاوی دانا و مەچەکی دەستی راستەی لە خۆڵەکە نا. هانێ ها پارەی ناوێ، هەموو چەقۆکان بۆ تۆ. ئەو چەقۆیانە دەمە تیغن... زۆر بەناوبانگن. لە چین و ماچین و فەرەنگ و لە عەرەبستان و عەرەبستانی بیابان... لە عەرەبستانی بیابان... ها بیگرە ها. لەوێ لە عەربستان پێویستت دەبێ. سەری جەواڵەکەت بکەوە، با بۆت پڕ بکەم. لە جەواڵەکەی بنێ. لەسەر مردووەکەی دابنێ. ئەتۆ بۆ هیچ لەبەر ناکەی. بۆچی بە زستان و هاوین ئاوا دەگرێی. پزیسك و پڕیشکە ئاگر لە کوانووەکە دەردەپەڕن. بڵێسە لە کوانووەکانەوە دێتە نێو بازاڕی ئاسنگەران و هەتا نێوەندی بازاڕەکە... هانێ وەریگرە، ها...

کوڕم پێویستیت پێیان دەبێ. وەستا وەسمان خۆی دەجووڵێنێ. لەوانەیە ناوی وەستا وەسمان بێ. هانێ کوڕم. لە مردووەکەی دەبەستی. چەقۆکان دەبێ لە مردووەکە ببەستی. مردوو چەقۆی پێوە بێ خوێنی لێ نایە. لەوێ لە بن چنارەکە، لە دەم ئاوەکەوە حەشیمەت، ئەرێ

کاکە کێ لەوەی داوە، کێ لێی داوە. ئەو منداڵە، ئەو کوڕیژگە لینگ درێژە کاکە، هەر ئەوەی لەوێ چاوی بەمۆڵەق وەستاون، لە حەفتا شوێنەوە. هەر خۆیشی بەسەر عەرزدا رایکێشاوە. دەی سەیری بکەن بزانە چۆن هانکە هانکێتی. سینگی دەف دەدا. لە جێی خۆشی نابزوێ. بۆ راوەستاوی کوڕم. دەی خۆت بشارەوە. رۆژ بێتەوە، جەندەرمە دێن. بەخوای گێلی. تۆی کەر و گەمژە، لێت داوە و کوشتووتە، ئەی چاوەڕێی چیی؟ هەتا جەندەرمە نەگەیشتوونەتێ بڕۆو خۆت دەرباز بکە. لە وڵاتی ئێمەش کوڕیژگەیەکی لێ بوو. وەك تۆ. کەنگێ بوو کە لێی دا وای لێدا خوێنی لێ هێنا برا، خوێنێك کە رانەدەوەستا. برا خوێنی شێتە برا را بکە. باران نمەنمە دای کردووە. ئەو بارانە لەکوێوە هات؟ بارانێکی ورد ورد. بۆنی خاکی باران لێدراو هەستاوە. بۆنی گەلای داریش دێ.

دەبێ مردووەکە ببرێتەوە سەر جێیەکە، بۆ قاوەخانەکە بۆ ئەوێ. دەست چەپەی گرت. هەڵی گرت و بە راکردن، دەستی مردووەکەی بەدەستەوە بوو، بن چنارەکە، دەوری قاوەخانەکە و چەند جاریش ئەوسەرئەمسەری بازاڕەکە گەڕان. مردووەی بە دار تووەکەوە نا. مردوو وەك بنیادەمێکی زیندوو پاڵی بە دارکەوە داو. پێم وایە چاویشی هەڵێنا. نەیدەتوانی چاوی لێك بنێ. هێشتا تاو هەڵنەهاتبوو. لە ژوورەوە دەنگی ژنەکە دەهات. کە گوێی لەدەنگەکە بوو، نەڕاندی. کە گەیشتە پشت دەرگاکە، راوەستا. ژنەکە لە ژوورەوە یەك پشوو دەیبۆلاند و جوێنی بە حاجی دەدا. دەلەرزی. ژنە سەیرێکی دەرەوەی کرد. بەدەم سەیرکردنەوە سمتەکانی بادەدا. دوای ئەوە شەق دەرگاکەی پێوە دا. مردووەکە لەو شوێنەی راوەستابوو، قیت بۆوە. ئیتر دیسان هەر وا پاڵی بەدارەکەوە دا و لەوێ مایەوە. مردووەکەی لەکۆڵ کرد و بەرەو شیوەکە غاری دا. دەنگی بۆڵەبۆڵی ژنەکەی هەر دەبیست. مردووەکەی برد و لە شیوەکەدا لەسەر لمەکە رایکێشا. هێشتا تاو هەڵنەهاتبوو. هەوا خۆش بوو. چووە نێو بێستانەکەوە. شووتییەکی گەورەی شکاند. شووتییەکە ئاوی لێ دەتکاوە. قەپاڵێکی لێ دا. کە گەڕاوە لای دار زەیتوونەکە، کڕ و کپ بوو. ویستی بە شان، پاڵێك بە دەرگاکەوە بنێ، نەیتوانی. لە ژوورەوە هیچ دەنگێك نەدەهات. چەند جارێك کۆکی. هیچ جواب نەبوو. خەریك بوو بۆ گۆشتێکی گەرم شێت و شەیدا بێ... لە نەکاو... بەدەستەوە و دەرپەڕی. خەریك بوو تاو دەکەوت. گوتی وا تاو هەڵدێ. دەستی راستی مردووەکەی گرت. زیخ و لمەکە دەنگی هات. بە راکێش راکێش هێنایە بازاڕ، بن چنارەکە. لە بن چنارەکە بردییە ئاشەکە و لەوێوە بۆ لای پردەکە و بۆ بناری گردێ... لە رێگایە کە دەڕۆیشت، تووشی گوێدرێژێك بوو. سەگەلی زار و کەڵپە خوێناوی بە مڕەمڕ

وەشوێنی کەوتبوون. سەگەلەکە زۆر بوون و دەوریان دا. کەڵپەی سپیی خوێناوی... مردووەکەی هەڵگرت و بە کۆڵی خۆی دادا. سواری گوێدرێژەکەی کرد. عارەبانەیەکی کەسك، بە خلەخلی زەنگوڵەوە دەرکەوت. مردووەکەی خستە سەری و لێی خوڕی بەرەو زۆنگاوەکە. بە زۆنگاوەکەی دادا و دیسان دەریهێنایەوە.

تاو هەڵاتبوو. مردووەکە لەوێ، لەسەر بەردە پڕ نەخش و نیگارەکانی ئیمامە کوردە کەوتبوو. سەری چڵووکی درێژی چنارەکە بەژوور سەرییەوە. مێشێکی سەو هات و چووە کونە لووتییەوە و هاتەوە دەرێ و چووەوە ژووریێ و هاتەوە دەرێ. مردووەکە لەوێ بەتاقی تەنێ کەوتبوو. بەتاقی تەنێ. بەر لە تاوهەڵات. لێوی خۆی کرۆشتبوو. سەرسووڕماو کەوتبوو لەوێ. خوێن بەسەر تاڵەمووی سمێڵیدا شۆلاوگەی بەستبوو. هەردوو دەستی قووچاندبوو و نینۆکی دەرهاتبوون. نینۆکێکی شۆڕ ببۆوە. لە خۆڵ و خاکەکەدا دەگەوزی. ئێسکی سپیی دەرپەڕیبوون... مستەقووچاوەکانی پڕ بوون لە چڵە دڕوو...

تاو هێشتا نەگەیبووە چەقی ئاسمان و مردووەکە هەر لەوێ کەوتبوو. لە پێشدا مراد مهاجر هات. دەیناسی. هەمووان دەیانناسی. هەر ئەسپ تەرسی کردبا، ئەو دەگەیشتێ و لە سەتڵەکەی دەخست. پارووی حەرام لە گەرووی مراد مهاجر نەدەچووە خوارێ و دۆخینی حەرامی نەدەکردەوە. هەربۆیە زۆر بەخۆی دەنازی. چاوی زەق کردنەوە و گوتی، ئەوەیان کوشتووە برا، کێ لەوەی داوە برا؟ داماوە... هەم قسەی دەکرد و هەم بە سەرسووڕمانەوە بەدەوری مردووەکەدا هەڵدەخولا. نەیدەزانی چ بکا. یەك دووجار زاری داپچڕی و سەری هەڵێنا و ویستی هاوار بکا، بەڵام نەیتوانی. بەرەو خوارووی بازاڕ رای کرد. ئەوجار بە راکردن هاتەوە لە ژوور سەری مردووەکە بێجووڵە راوەستا. سەیری ئەملاوئەولای دەکرد. دەتگوت چاوەڕێی کەسێکە. بەڵام کەسی نەدەدی. لەگەڵ دەنگی بانگ هات، وەخۆ هاتەوە و بەدەوری منارەکەدا دەستی کرد بە هات و هاوار. کە هاواری لێ هەستا، ئەوی تر رای کرد. لەولاترەوە لە پشت چنارەکەوە، لە تاریکایی پشت دارە ئەستوورەکەدا خۆی کۆم کردەوە. زۆری سەرمابوو. پاڵی بە دەرابەی دووکانێکەوە دابوو و دەترسا و هەڵیشدەلەرزی. دوای ئەوە سەر و سەکتی شێخ پەیدا بوو. گوێی لە قسەکانی ئەو بوو. هەر شێخ گەیشتە لای، هەستا. زۆر دەترسا. لە ترسانا پشووی دەرنەدەهات. دەیویست را بکا. لە نەکاو مردووەکەی وەبیر هاتەوە. دەویوست بزانێ چ باسە و چ دەبێ. گەیشتبووە دەرەوەی بازاڕیش، بەڵام گەڕاوە و هاتەوە لە تەنیشت شێخ راوەستا. شێخ ئاوڕێکی لێ داوە و دەستی کردەوە بە قسە کردن. چەندی ئەو پتری لێ دەگوت،

ئەو پتر دەترسا. لە پڕ داهاتەوە و دەستی شێخی ماچ کرد. حەزی لێ بوو دیسان دەستیان بەسەردا بێنێتەوە. شێخ گوتی، ئەی هاوار، هاوار، هاوار ئەی هاوار رۆڵە، بەڵا بەدوور، خودا نەکا... دوایی ئیتر خەڵك هاتن. هەموویان سمێڵ زل. زۆریان قسە دەکرد. تۆزاوی بوون و پرێسکەیان لەسەریان بەستبوو و چاویلکەی خۆر و چاویلکەی تۆزگریان لە چاوکردبوو و بۆنی ئارەقیان لێ دەهات و هەندێکیان دەسرۆکەی سووریان لەسەر شان، دەسرۆکەی سوور و چڵکن یەکێك لەو پیاوانەی چرچ و لۆچی لاملیان پڕ ببوو لە تۆز و خۆڵ و پووش و پەڵا بەردەوام ددانی جیڕ دەکردەوە حەشیمەتەکە سواری شان و ملی یەکتری بوون مردووەکە لەبەر خەڵکی دیار نەبوو. لاچن. لاچن. لەوێ دوور کەونەوە. تۆ بڵێی ئەو قەمچی بەدەستە دەرویش بەگ بێ؟ ئەو قەمچی بەدەستە کێیە، کێیە، کێیە. با هەڵێین. لەوێ لەنێو خەڵکەکەدا مایەوە. زاری پڕ بوو لە تفی لیچق و خوێن. زاری پڕ لە خوێن و زمانی دەرکێشابوو وەك مردووەکە. هەتا شیوەکە رای کرد. زار و لووتی پڕ بوو لە خۆڵ و ئەگەر رزگاری نەبوایە، ئەگەر ئەگەر ئەگەر لەوێ لە دەم جادەکە راوەستا و گوێی لە شارۆچکە هەڵخست. دەنگەدەنگێکی زۆر دەهات. لوورەلوورێك کە لە دوورەوە دەهات، بەرەو شارۆچکە دەکشا و دەنگەکە گەورە دەبێتەوە و پتر وڵات دادەگرێ. دێ و دەڕوا و زەنازەنای شارۆچکە دەڵێی پوورەی هەنگە لە دوورەوە دەبیسرێ. شووشەکانی دەبریسکێنەوە و لەبەر تاوە بەتینەکە ئەو دەمەی هەوا جار بە جار گەرمتر دەبێ مێشەکان جار بە جار پتر دەبن و کەس نازانێ ئەو مێشە سەوزانە لەکوێوە دێن. وەستا وەسمان عەلی سکالانووس تەرمەکەی کرم تێی داوە. کردم دەجوولێن مەحموودە کوردە مەحموودە کوردە تەرمە خوێناوی و ئەنجنراوەکەیان لەوێ لەسەر بەردەکەی دەم ئاوەکە داناوە و ئیتر بەجێی دێڵم و هەر ئەمجارە دەچمەوە و سەیرێکی دەکەوە و بەجێی دەهێڵم، بەجێی دەهێڵم. کەس نازانێ هیچ کەس نازانێ. کەس سۆسەی ناکاز خۆی بەنێو حەشیمەتەکەدا دەکا بەنێو زەنازەنای حەشیمەت بەنێو تەپوتۆز و خلەخل، بۆ ئەوێ هەی ماڵت کاول بێ عەلی ئەفەنی بڕوانە چۆن بەسەر مردووەکەدا نوشتاوەتەوە و لێی راماوە دەڵێی دەیدۆزێ، سەرە زلەکەی لەسەر سینگی دادەنێ. منداڵ لە دەوری مردووەکە گەمە دەکەن. هەڵماتێن دەکەن وا سەرقاڵی گەمەن، هەر دەڵێی مردووشیان لە تەنیشت نییە. لەنەکاو دەست لە یارییەکەیان هەڵدەگرن و دێنە سەر مردووەکە کۆ دەبنەوە و لێیان دەبێتە مشتومڕ دوایی لەپڕ بڵاوەی دەکەن و دەچنەوە سەر گەمەکەی خۆیان. ئەوجار کەس نازانێ بۆچی دیسان لەسەر مردووەکە کۆ دەبنەوە و دەکەونەوە قسە کردن و دوای ئەوە دیسان دەوری مردووەکە چۆڵ دەبێتەو و دەکەونەوە قسە

کردن. دیسان بڵاوەی دەکەنەوە و دەست دەکەنەوە بە گەمە کردن. دیسان کەس نازانێ بۆچی دیسان لە دەوری مردووەکە کۆ دەبنەوە دیسان کەسی بەدەورەوە نامێنێتەوە و کەس گوێی ناداتێ و بۆی گرنگ نییە کە مردوەك لەوێ کەوتووە یان شتێکی دیکە یان بەردێك بە تەنیشتیدا تێدەپەڕن. چایەك بێنە قاوەچی پەرداخێکیش ئاو، چما نابینی ئەو داماوەیان کوشتووە سێ منداڵیشی هەیە و شێتیش بوو بەڵام پیاوێکی خراپ نەبووە. شێت بوو، بەڵام کوڕە هۆی ئەوە چتە بۆ وا لێی راماوی و سەیری دەکەی دەڵێی دەتەوێ بە چاو مردووەکە بخۆی هەر دەڵێی مێشکت شڵەقاوە! لاچۆ لەسەر مردووەکە لاچۆ دەی، ژنەکەی هات، ئەوە ژنەکەیەتی. بەخوای عەجەب پەرییەکە. باشە کێ کوشتوویەتی کێ. یەکێك لە نێویاندا هەستا و لە ژنەکە چووە پێشێ ژنە داهاتەوە و دەستی مردووەکەی گرت و لەسەر دڵی خۆی دانا و کردییە شین و شەپۆڕ و بەسەریدا هەڵگوت یەکێك هات و هەڵیستاند و گوتی مەگری خوشکم کارێکە و قەوماوە حاجی مردووە و بە گریانیش زیندوو نابێتەوە. بڕۆ بیرێك لەخۆت بکەوە گریان هیچ دەردێك دەوا ناکا. دوایی هەر ئەو پیاوە هاتە لای ژنەکەی و گوتی ئەتۆ بۆچی لە بەیانییەوە لێرە راوەستاوی. ئاخۆ ئەوەی مردووە خزم و کەسی تۆیە؟ دەی بڵێ براله بڵێ دەی لە بەیانییەوە تا ئێستا متەقت لێوە نەهاتووە، بڵێ بزانم مردووەکە، مردووەکە، مردووەکە چیی تۆیە؟ لەوەتەی تاو هەڵاتووە ئاگام لێتە. لێرە بڕۆ. رابکە، هەڵێ هەڵێ. شێتە لاقی دێشێن، دەبرژێنەوە، هەوا کە گەرم بوو، ئیمامە کوردە لەوێ لە تەنیشت بەردە مەڕمەڕە نەخشینەکە لەسەر بەردەم مەڕمەڕەکە لیمۆنادی دەفرۆشت. دەی بڕۆ ملت بشکێنە

لە نیوەی رێیە نەیتوانی بڕوا. زەنازەنا و لوورەلوورەی شارۆچکە لە دوورەوە دەهات. ماندوو ببوو. ئەژنۆی دەلەرزین. سەرمای بوو. روو بە شارۆچکە دانیشت. زەنازەنا و لوورەی شارۆچکە جار بە جار نزیکتر دەبۆوە. جار نەجارێکیش دەنگی خرم و هۆڕ لەوێوە دەهات. شارۆچکە پڕ لە هەڵڵا و خرم و هۆڕ و زەنازەنا لە مەودایەکی نە زۆر دوور و نە زۆر نزیکەوە بە دەوری سەریدا کەوتە خولانەوە.

"بۆ لێرە دانیشتووی؟"

چاوی زەق بوونەوە و لە کاسەی سەریدا خولانەوە. جەندەرمە فیکەیان کێشا. دەنگی فیکە بەسەر زەنازەنا و لوورە لوورەکەی لای شارۆچکەدا زاڵ بوو.

"بیگرن. بۆخۆیەتی. بیگرن. مەهێڵن هەڵێ."

بەرەو شارۆچکە گەڕاوە. دەمی زەردەپەڕ بوو. دەرپەڕی. دەکەوت و هەڵدەستاوەو رای دەکرد. کە گەیشتەوە شارۆچکە، زەنازەنا و لوورەلوورەکە نیشتەوە. راستەوڕێ بەرەو ماڵەکەی حاجییە شێتە رۆیشت. بەسەر پەرژینەکەدا بازی دا و خۆی خستە بن دارەکە و گوێی هەڵخست. هیچ دەنگێك لە ژوورەوە نەدەهات. سەری هەڵێنا و روانیی. ژنەکە دانیشتبوو و سەری منداڵەکانی لەسەر کۆشی دانابوو و سەری بەردابۆوە و جووڵەی نەدەکرد. ژنە نەیدی. دەسبەجێ سەری بەردابۆوە. تاوێك دواتر خۆی پێ نەگیرابوو، دیسان سەری هەڵێنا و سەرلەنوێ دایخستەوە. تاوێك دواتر نەیتوانی بەسەر خۆیدا زاڵ بێ، سەری هەڵێنا. ئەمجارە سەری دانەخستەوە و چاوی لە ژنە بڕی. کە ژنەی ئاوڕی دایەوە، چاویان تێك ئاڵقا. ئەو سەری بەرنەداوە و هیچیشی نەکرد و هەروا چاوی لە چاوی ژنە بڕی و راوەستا. ژنە وەك بە چاوەکانی بەشوێن شتێکدا بگەڕێ و پرسیار و سەرسووڕمان و ترسێك لە نیگایدا بزووت و لەنەکاو راچڵەکی و لە جێی خۆی هەستا و زریکاندی و رای کرد. منداڵەکانیش دەستیان کرد بە زریکاندن و قیژەقیژ و وەشوێن دایکیان کەوتن. ئەویش قەڵەمبازێکی دا و بەرەو دەموزتەپە رای تێی قووچاند. دەنگی تێکەڵ پێکەڵی فیکە و چەند تەقەیەك لە شار گەڕا.

زریکەیەکی درێژ گوێچکەی لەراندەوە. شارۆچکە تاوێك نووزایەوە و دوایی هەموو شتێك لە شەو و بێدەنگیدا نوقم بوو. بە غاردان بەرەو شارۆچکە داگەڕا و هاتەوە بن چنارەکە . قاوەخانەکە داخرابوو. بەڵام کابرا هێشتا لەوێ راوەستابوو. تا ویستی بڕوا، مەچەکی گرت و گوتی:"راوەستە، راوەستە... ئاخری تۆم گرت. مەبزوو. مەبزوو کاکی من. مەبزوو."

چاوی وەك دوو گوڵمیخ لە چاوەکانی چەقاند و گوتی:"بڵێ بزانم تۆ کوشتت؟ ئەگەر تۆ نەتکوشتووە چیت لێی دەوێ؟ بردیانە مزگەوت. بەیانی دەینێژن ئەو داماوە. بۆ کوشتت؟"

ویستی خۆی لە چنگی قوتار بکا. دەستکانی کابرای چوار شانە وەك مەنگەنە گرتبوویان.

"من نەمکوشت. نەمکوشت. من... یەکێك کوشتوویەتی، لەکوێ، لەکوێ، لەکوێیە؟"

کابرا دەستی بەردا و گوتی:"لە مزگەوتە. حاجییە شێتە لەوێ نوستووە. ئەمشەو مشك لە دەورین. بەیانی کرم دەیخۆن. حەیف بۆ ئەو. چەنیش جوان بوو. چەندیش بەژن و باڵا جوان... ئەو داماوە بەو دنیایەدا دەگەڕا و رایدەبوارد. بەر لەوەی کرمەکان وردەوردە چاوی بکۆڵن... زمانی بخۆن..."

قسەکەی بڕی و توند مەچەکی گرت و بەنێوچاوانێکی تاڵەوە و لە بن ددانەکانییەوە گرماندی:"کەس حاجییە شێتەی نەکوشت؟ هیچ کەس؟ یانی ئەو گۆڕبەگۆڕە خۆی کوشتووە؟ بەکەرم دەزانی؟ وەرە بۆ پۆلیسخانە."

دەستی بەردا. هەروا چاویان لە چاوی یەك بڕی.

"دەی با بڕۆین، یاڵڵا... مەحموودە کورد نەبوو... من..."

"بڕۆ! دەی بڕۆ قوڕ بەسەر..."

کابرا دەرپەڕی و رای کرد. ئەویش بەدوایدا.

لە ئاوێك پەڕینەوە. گردێکیان بڕی و... چوونە کەپرێکەوە. کەپرەکە لە بن پۆلێك داری بووز بوو. لك و پۆی دارەکان پڕ بوو لە هێلانە. قاوقیژی باڵندە شەوەکەی ئاخنیبوو.

دەسبەجێ سفرەیەك لە کەپرەکەدا راخرا. ئاش و شلەی ئۆماج، ماست و ساوار و سێ سەلکە پیازی سوور لەسەر سفرەکە دانرا. هەی گیان. پەلاماری سفرەکەی دا و حەپەلووشی کرد. پەیتاپەیتا بنی قاپەکانی بە چەند قەپووچکەیەك رادەماڵی و قاپی پڕیان لەجێی دادەنرا. دوای ئەوەی تێر زگی خۆی خوارد، تا توانیی ئاوی فێنکی کانیی خواردەوە. دۆشاویشی خوارد. دۆشاوێکی خەست، زەرد، سوور...

"کوڕە ئەوە شێت بووی؟ تێك چووی؟"

هەر لەوێ کەوت و خەو بەردییەوە. کابرا بەڕەیەکی پێدا دا و خۆی لەبەر دەرکی کەپرەکە دانیشت و خەیاڵ رفاندی.

راچڵەکی و گوتی:"ناکرێ، شتی وا نابێ، ناکرێ. ئەوە ئینسانەتی نییە. پیاوەتی نییە."

خۆی بەژوورێدا کردەوە و بەڕەکەی لەسەر لادا و بەرۆکی گرت و هەڵیستاندە سەر پێ و دایە بە شەق و مستان. کوڕەی خەواڵوو بەعەرزیدا کەوت. نەیتوانی تووڕەییەکەی بخواتەوە و تێهەڵدانەکەی... کوڕە، کە بە زەبری شەق وەخۆ هاتبۆوە، خۆی لادا و... دەرپەڕی و رای کرد...

"بڕۆۆۆ ۆ دەنا دەتکوژم... بڕۆۆۆ ... نامەوێ خوێنی تۆشم بە ملیدا بێ... بڕۆۆۆۆ."

گەڕاوە.

لە بن دارەکە، لەبەر رووناکایی بەرەبەیان راوەستا و گوتی:

"بۆ لێت دام؟ بە چ هەقێك؟"

ئامبازی بوو. ئەمجارەیان ئەویتر رای نەکرد...

"بڕۆۆۆۆ."

ئەویتر لەسەرخۆ گوتی:"دەڕۆم."

بەترسەوە گوتی:"بۆ کوێ؟ شارۆچکە؟"

"نا، نا، دەچمە لای عەلی ریشە. چارم نییە. لەوێ لە چیا کەسێکی لێیە بەناوی عەلی ریشە... ئەسپی هەیە هەموو خۆشبەز...

خۆی راوەشاند و گوتی:"بەرم دە. بەخودا دەچمە لای عەلی ریشە. ئێرەیە گوندەکەی عەلی ریشە؟"

بەری دا. هەتاو رەمێك هەڵکشابوو. گەرم بوو. مردووەکە ئارەقەی کردبوو. تەپوتۆزێك لەسەرەوە دەباری. مردووەکەیان دەشوشت. لەسەر تاتە بەردێکی وەك بەردەکەی نوێژگە درێژیان کردبوو. ئیمامە کوردە، برۆشی ئارەقەی دەکرد. ئارەقەیەکی گەرم گەرم لە چاوی دەتکا.

خۆی بەنێو جەماوەرەکەدا کرد و هێور بۆوە. حەشیمەتەکە جار بە جار پتر بۆوە. مردووەکە لە نێوەڕاست. دڕی بە حەشیمەتەکە دا و چوو و لەسەر مردووەکە راوەستا. دەرووبەری مردووەکە جار بە جار قەرەباڵغتر دەبوو و هەر گوندییەی دەنگێکی لێوە دەهات. گەردەلوولێك بەسەر جەماوەرەکەدا هات و زار و لووتی هەمووانی پڕ کرد لە تۆز و خۆڵ.

ئەو دەستەی دەتگوت چەنگاڵ و مەنگەنەیە، هاتەوە و توند مەچەکی گرتەوە.

نالاندی:"بەرم دەن. بەخودای دەچمە لای عەلی ریشە..."

شارۆچکە لەوێ دەیلووراند، کپ، قووڵ، دوور. ئەگەر وەژوور کەوتبا، لوورە و زەنازەناکە دەنیشتەوە. رووی لە شارۆچکە کردەوە. عارەبانەیەکی پڕ لە شووتی بە پێشیدا تێپەڕی.

# ١١٤

دەروێش بەگ حەجمینی نەبوو. لە ژوورێکەوە دەچووە ژوورێکی دی. ورد دەیڕوانی و چاوی دەگێڕا بەسەر سندووق و کورسی و مێز و کەنتۆر و دۆڵابە گوێزە هەڵکۆڵراوەکانی دەستکردی ماراشدا، کە خۆرکە لێی دابوون. تۆز و خۆڵی لێ دەتەکاند و لە پەرداخە چێوییە نەخشێنراوەکانی چێشتخانە ورد دەبۆوە، کە قەوزەیان گرتبوو. دەروێش بەگ تەنیا بە پەرداخی چێوسنۆبەر ئاوی دەخواردەوە و لە تینوێتی خنکابایەش، هەتا لە پەرداخی چێو سنۆبەردا ئاویان بۆ نەهێنابا، دەمی لێ نەدەدا. لە پلیکانەکان دەچووە خوارەوە و دەهاتەوە سەرێ. بە روخسارێکی دەرفکر و خەفەتبارەوە، سەری لە پووره هەنگی بن دارەکانی پشت کۆشك دەدا، دەرکی پوورەهەنگەکانی دەکردەوە و دەستی لە شانە سپی و پڕ لە شیلەهەنوینەکان دەدا. بڵێی و نەڵێی خۆشییەکی لەدڵی دەگەڕا، بەڵام نەیدەزانی چۆن ئەو داڵغە و خەفەتەی لە دڵیدا خێوەتی هەڵدابوو، بڕەوێنێتەوە. دڵنیا بوو ئەگەر بزانێ دڵی بە چی توندبووە، دەزانێ چۆنیشی چارە بکا. دەرمانەکەشی دەدۆزێتەوە، بەڵام ئەو هەمووە دڵ توندبوون و خەفەتە، ناکرێ لە شتێکی ئاوا بچووك و بێ قیمەتەوە سەر هەڵبدا. دەی، گەنجێك چووە و پیاوێکی کوشتووە. دەی چ بووە؟ کەرێتیی کردووە و خۆی ئاشکرا کردووە. نەشی کردووە... ها، هەر لەو گوندەدەدا کەسی تێدا نییە ناوی یوسف بێ. دوو مانگ لەوەپێش مردووە. وا نییە؟ فەرماندەی جەندەرمە، ئەوانی دیکەش هەر گوویەکی بۆیان دەخورێ، با بیخۆن.. ئەو گوندە کەسی وای لێ نییە ناوی یوسف بێ. ئەی دڵی بەچی گیراوە؟ ئاخۆ پیاو لەخۆڕایی دڵەخورپەی دەبێ؟ دڵخۆشبوون و شادبوون و خۆ بە بەختەوەرزانین، چەندی ئاسایی بێ، وەڕەزبوون و وەگیانهاتن لە دەست دڵەخورپە و کەڵکەڵەی دەروون و ژان و ئازاریش ئەوەندە ئاساییە.

سواربوون لە ئەسپ و شێتانە تاودانی هەتا ئەوپەڕی چیاکان و لەچاو ونبوون، رزگاربوون لەدەست ئەو چەپەڵییانە و ئەو بنیادەمە هیچ و پووچ و بێناموسانە...

هەتا ئەو تەمەنە، قەت ئاوای بەسەر نەهاتبوو و تووشی ئەو حاڵەتە نەببوو. بژی با بیبینی... ئەو دڵناسکییە ئاخۆ نیشانەی پیرییە؟ باشە بۆچی بانگی ئەو کوڕێژگەیە نەکا و دەستخۆشییەکی پێ نەڵێ؟ بەڵام دامابوو و نەیدەزانی چ بکا و چۆن پیاوێکی ئاوا مەزن دەتوانێ چاو لە رووی مێرمنداڵێکی کرچ و کاڵ بکا؟

بابی رۆیشت. لەوانەیە ئەویش بڕوات. ئەگەر وابێ، میرۆی دایکیشی تاقەت ناهێنێ و لە سوێیانی دەمرێ... ژیانی ئەو بنەماڵەیە کارەساتێکی راستەقینەیە. نەدەبوو ئەوە لەگەڵ ئەم منداڵە بکا. بەڵام تووڕەیی و رق و قین، ئەقڵی پیاو کوێر دەکاتەوە. یوسفی ئەو شڵەژاوییەوە هاتە پێش چاوی و ئاگری لە جەرگ و هەناوی بەربوو. بەستەزمانە، کە دەزانێ ئەو سەیەی بە چ نرخێك کوشتووە... بەڵام بەڵێنەکەی خۆی بردووەتە سەر و هەرچۆنێك بێ کابرای کوشتووە.

ئەگەر چاوێکی بە یوسف کەوتبا، ئەو تۆفانەی هەناوی دەنیشتەوە. ئەوەی ئاگری لە هەناوی بەردەدا، ئەو سەرلێشێواوی و شپرزەییەی یوسف بوو. جگە لەوەش، دەیویست وردەکارییەکەی بزانێ. حەزی لێ بوو بزانێ حاجییە شێتەی چۆن کوشتووە... ئەگەر ئەوەندەی شەرم نەکردبا و پێی عەیب نەبا، ئەگەر توانیبای ئەو شەرمەی بشکێنێ و سەیری رووی یوسف بکا، دەسبەجێ دەیناردە شوێنێ.

ژنەکەی، منداڵەکانی و خەڵکی ئاوایی هەموویان دەیانزانی ئاوا شەرمنە.

کوێخا دیسان پرێسکەی دەردە دڵەکانی کردبۆوەو سکاڵای هێنابووە لای خاتوون.

کوڕە لەماڵێدا نییە زەوادی نانێ، پۆز و هەواکەی کەرێك نایتوانێ. کاکە لە پێشدا نان دوایی فەرمان. بە گۆڕی بابی ئەو کەسەی لەمەودوا لەو کاولبووەدا دەژی. ئیتر ناگەڕێمەوە، هەزار ئەوەندەی دیکەشم لەبەر بپاڕێتەوە. ئیتر ناتوانێ پێشم بگرێ. حەز دەکا با دەمانچەکەی هەڵکێشێ و بمکوژێ. جگە لەو دەمانچەیە و نێوچاوانە گرژەکەی چیی دیکەی نییە. بە زمانە شیرینەکەت، بە پارە زۆرەکەت یان رێگا نزیکەکەت؟ کاکی من شاباشی خۆت بدە و قیت هەڵپەڕە. وەرە زەکەریا ئاغا. ئەوە چ بووە کابرا؟ چما ئەتۆ خودای، شەددادی، فیرعەونی... سواری ئەسپەکەت بە و سەری خۆت هەڵگرە و بڕۆ داماوی ترسنۆك. کوڕە خۆ ناتوانێ دەستی لە دەمانچەکەی بکاتەوە. دا رایکێشە بزانم، ئەگەر پیاوی هەڵکێشە دەمانچەکەت. ئاخر تۆ و ئاغایەتی؟ ئەو رۆژانە رۆیشتن و ناگەڕێنەوە. ئەگەر گوێت لێ بێ، دیق دەکە. زەکەریا ئاغا، زەکەریا ئاغا هەی! کوڕە چیت لە گیانی زەکەریا ئاخا دەوێ؟ ئەگەر گوێت لێ بێ ئەوەندە سەرت لە درەختەکە دەکوتی، هەتا مردار دەبیەوە. ئەو پیرەچنارە خوێناوییە. رۆژ هەتا ئێوارێ

ئەو چنارە خوێنی لەبەر دەڕوا. خۆ بێت و گوێت لێ بێ دەمانچەکەت هەڵدەکێشی و... نە کەس دیتی و نە کەس بیستی... چما پیاو لانیکەم بۆ تاقە جارێکیش بووە، تەقەیەك بەو دەمانچە دەسك سەدەفەر ناکا؟ ئەوە چل ساڵی رەبەقە ئەو دەمانچەیەت بۆ رۆژی تەنگانە هەڵگرتووە. دە هەڵیکێشە دەی سەگباب، ئاخر بەگیانی ناخێرت تۆش پیاوی؟"

"بە خودایەتیی خودا گەیوەتە ئێسقانم خاتوون. هەر شەش ماتۆڕەکە رۆنە سووتاویان دەوێ. شۆفێرەکان وەزاڵە هاتوون. داوای مووچەی دواکەوتووی مانگێکیان دەکەن. چەند رۆژ لەوە پێش دەبینم ئەوە حەمیدە کوێر تەورێکی هەڵگرتووە و بەرەوڕووم دێ. کردبوویە هەڵلایەك، کە یان هەقەکەمم دەوێ، مووچەکەمم بدەیە یان دەتکوژم. ئەمنیش کە زانیم وەزعەکە شڕە، پێیەکم هەبوو، سەد پێم قەرز کرد و رام کرد. پیاوی برسی دین و ئیمانی دروستی نییە."

چما دەکرێ لێی نزیك بیتەوە؟ وەك ئاگر وایە... ئەو گەمژەیە، پێنج مەزرای ئاوا گەورەی، کە هەر کامەیان خوێنی کوڕێکیان دێنا، بە مفت و خۆڕایی لەکیس خۆی دا. ئەو چوکووراوایە... وەچەی گووی ساری ئۆغڵی، گووی وای بەخۆوە نەدیتووە. هەر هەموویان گووی نەوەی گوون. تۆخوا ژنیش سەرجێیی یەکتری دەکەن؟ شەش ژنی باپیرەی، وەك نێرەبارگینی کێوی یەکتریان هەڵدەگلۆفی. چما پیاو زیناح لەگەڵ خوشکی خۆی دەکا؟ ئەو بێناموسە ئاوایە. باشە ئەو هینەت بۆچییە و بۆ هەڵیدەگری؟ دەی رایکێشە و فیشەکێك لەخۆت بدە و لەکۆڵمان بەوە دەی. وا دەڵێن. هەرچییەکی دەشیلێن، راستە. چونکە ئێرەیی بەکچەکەی خۆی دەبرد، لە قوتابخانە هێنایە دەرێ و هێنایەوە ماڵێ. ئەو نووسینانەی سەر دیوارەکانیش هەر بەفیتی خۆی بووە. وەچەی ئەوانە گەندوگوون. دۆخینەکەی زۆر شلە. داوێن پیسە. هەموو خەڵکی ئاوایی دەزانن، ئەو بەگەـ کوڕە بەگی چی، تەنانەت کەرێك لەو بەشەرفترە ـ لەو ئاوەدانییەدا تەویلەیەکی ژن هەیە و هەرکامەیان دەڵێی ماینی کەحلانن... لەوانەیە سی دانەش. جا باشە پیاوێك سی ژنی بۆ چییە؟ ئەوەتا ئاوای لێ دێ. ئاوا پێوە دەبێ. کوڕە سی ژنیش بەشی نەکردووە، بەوەندەش تێری نەخواردووە... یانی بووە؟ بە ژنەکان تێری نەخواردووە، چووە لە ماکەر و ماینەکان پەڕیوە. رەنگی زەرد هەڵگەڕاوە. رەش و مۆر بووەتەوە. کاری هەر پەڕین و زەڕینە...

"خاتوونی خۆم، ئەمن نامەوێ لەسەر کەس بکوژرێم. من ژن و منداڵم هەیە. هەموو کەس ژن و منداڵی خۆی خۆش دەوێ. هەر کات چاوم بەتۆ دەکەوێ، بەسەرمدا دەنەڕێنێ و تێم

ڕادەخورێ. ئیتر لێی وەڕەز بووم. سەڵت و سبادەش نیم. تۆ بڵێ چ بکەم. دەست و لاقت ماچ دەکە..."

پیاو دەبێ زۆر شێت و بێ ئەقڵ بێ، لە ماوەی دە ساڵاندا پێنج مەزرای لە دەست ببێتەوە. هەرکەس داوای لێ بکا، جووتێك گای دەداتێ. ئەوە نەما. بەسەر چوو. هیچ نەما. ئەگەر دەیەوێ با بۆخۆی بیدا. ئیتر ئەمن پێم نادرێ. ئەگەر پێداگریش بوو، دەیکەمە هەرا. کلاش لەپێ لەگەڵی ڕاهاتوون. من پێم نادرێ.

"خاتوونەکەم، گوتم بڕۆن، ناڕۆن. ئیتر بەگ، بەگەکەی ساڵی ساڵان نییە. بەگ تەواو گۆڕاوە. ئەگەر بشڵێ بێنە، نایدەمێ. گوتم لەخۆڕا لێرە ماتڵ مەبن. نایدەم، پێم نادرێ. ئەگەر بەگوێشی بگاتەوە، دەمکوژێ. با بێ و بمکوژێ."

باسی خوشکەکەی هەر مەکە. نۆکەر و شۆفێر و کرێکار لەو گوندەدا نەمابوو... هەرکەسیشی بکەوێتە داوی، وای هەڵدەچۆڕێنێ، توخنی نەکەوێتەوە. ئیتر کەس نییە بەوە نەزانێ. لە ڕۆژێکدا لەگەڵ پازدە کەسان... دیسان هەر دانامرکێتەوە و خورووی ناشکێ... ناشکێ... خۆی لە گەسگەسك و دڕکی کاولاشەکان دەخشێنێ. چەندی گەسگەسکەکان دەیخورێنن، ئەو هەر دەناڵێنێ و ئاخ و ئۆفێتی... لە تاوان هەڵدەبەزێ، ڕا دەکا و خۆی بە ئاوێدا دەدا.... خەڵکی ئاوەدانی لە سەیری ئەو هەڵسوکەوتانەی تێر نابن. پیاو پێی عەیبە و شەرم دەیگرێ گیانەکەم. هەموو ڕۆژێ... هەموو ڕۆژێ هەتا گەسگەسك وشك دەبنەوە... میللەت بیست ساڵە دەمیان لە گەسگەسك نەداوە. هەمووی ئالوودە کردوون. هیچ لەخۆتت نەپرسیوە بۆچی ئێستا خەڵك ئەو گیایە ناکولێنن؟ تۆ هیچ دەزانی حەڵوای گەسگەسك چەند خۆشە* ؟ کچەش لەوە نامێنێتەوە.

"خاتوونەکەی خۆم، ئیتر گەیوەتە ئێسقانم. سەد و سی هەزار لیرە بە بانگ قەرزدارین و دەبێ بدرێتەوە. سەرۆکی بانك دەڵێ، ئیتر سەیری فرمێسکی چاویشی ناکەم. بەگ نا، بگرە پادشاش بێ، گوێم لێی نییە و دەست بەسەر مەزراکەیدا دەگرم. خۆ بێت و ئەمساڵ نەتوانین پارە لە بانك وەرگرین، هەر پشتمان دەشکێ. سێ هەزار دۆنم لۆکە چەندەی تێ دەچێ؟ ئەگەر خەرجی چاندنی سێ هەزار دۆنمان نەبێ، هەر هەموو تێدا دەچین. قەرزدار ناتوانن بچنە لای بەگ. شەرمی لێ دەکەن. بەڵام دەست لەو سەرە کەچەڵەی من هەڵناگرن. ئیتر ناوێرم بچمە

---

* لێرەدا نووسەر باسی گیای گەسگەسك دەکات، ئەو گیایە بەر پێست بکەوێت دەیخورێنێ. بەڵام ئەو لێرەدا باسی خواردنی دەکات. نازانم بەراستی دەخورێ یان نا. لانیکەم لە مەڵبەندی ئێمە ناخورێ یان من نەمدیتووە. (وەرگێڕ)

هیچ کویێ. ساڵی رابردوو نیو ملیۆن لیرەمان وەرگرت... هەر هەمووی بە بادا چوو. بمبوورە خاتوون، لەو ئەدەنەیە سەگێك نەماوە سەولەیەکی بەگی نەخواردبێ. ئەگەر ئێستا جیپەکان دەستیان لە کار کێشاوەتەوە و داوای مووچە دواکەوتووەکەیان دەکەن... ناهەقیان نییە. ئەگەر ئاوا بڕوا، مەزرایەکمان بەدەستەوە نامێنێ. هەر باش بوو قاباقچی ئەو زەوییە داینێ. خاکێکی ئەوەندە بەرێژەوی هەیە... بێت و ئەمساڵ ئەوێ بکەینە پەمۆ، میلۆنێکمان پێ دەبڕێ... هەی ی ی ، بەڵام ئەگەر پێمان بکرێ. هەر لە ئێستاوە ناکرێ. کوڕە بە نۆکەرت بم خاتوونەکەی خۆم. پێی بڵێ... وەزعمان شڕە. دەنا من ناتوانم لێرە بمێنمەوە. سەری خۆم هەڵدەگرم و دەڕۆم. ئەوە چل ساڵی رەبەقە لەو دەرگایە کار دەکەم. یانی باشە دوای ئەو هەمووە ساڵە...؟ ئیتر ناتوانێ هەڕەشەی کوشتنم لێ بکات، دەمانچەکەی جارێکی دیکە هەڵکێشێ و..."

دەمانچەکەی با راکێشێ و بە قوونییەوە بنێ. ئیتر ناترسم. پیاو جارێك دەمرێ. ئیتر بەسە. چەقۆم گەیوەتە ئێسکی. بە من چی مایەپووچ دەبی. بڕۆ ببە. خۆت ئەو خۆڵەت وەسەر خۆت کردووە. ئەمن ئیتر پیر بوومە. بەزەییم بەو خاتووونەدا دێتەوە. هەتا ئێستا ئاوێکی خۆشی لە گەرووی نەچووەتە خوارێ... بەخوای ژنی من بوایە، خەنیم دەکرد. هات و بوو بە ژنی سەیەکی وەك تۆ. بەخودا بە شیری مریشکم بەخێو دەکرد. چاوەکانی جوانترین چاوی دنیان. ئەو خاتوونەش نازانێ ئەمن بەگیان و دڵ خۆشم دەوێ. دڵم ئاگری تێبەربووە بۆت، ئەتۆش ئاگات لێی نییە...

"بەری پێیانت ماچ دەکەم خاتوونەکەم. دەرفەتی لێ بێنە و پێی بڵێ دەی."

دیسان چ بووە؟ دیارە دیسان کێچت لەکەولّی کەوتووە. وەچەی شێت. ئەگەر ئەو شێتییە هەر وا بخایەنێ، وەباڵ بەو ئەستۆیەم، لە ماوەی دەساڵاندا ساری ئۆغلی لە خالیدە شێتی خراپتر لێ دەقەومێ. خالیدە شێتیش ئاوا هەوساری نەپساندبوو. خوشکەکەی... گەسگەسك... هەموو لیری کردووە و زنچکاوی لێ دەتکێ... لەو دێیەدا کێ هەیە... ئەو کوزە هەنارییەی ئەوی نەدیتبێ؟ دیتبێتی و گەرووی وشك نەبووبێ؟ سەری لەگێژەوە نەهاتبێ؟ جڵەوی نەپساندبێ و پەلاماری نەدابێ.

مەرگ هاتووە و لە دەرگای ساری ئۆغلی دەدا. من دەڵێم هەستە لەخەو. هەستە ئاغا، بەیانە، بەڵام هەڵناستێ.

شانەی هەنگوین ئەمساڵ سپین. هەنگوینیان زۆر دەبێ. هەنگوینەکەیان بۆنی گوڵی نێرگزی لێوە دێ. بۆنەکەیان لە بۆنی هەنگوین خۆشتر...

پلیکانەکان... تەویلە... ئەسپەکان لە تەویلە... دەروێش بەگ بێ ئۆقرەیە. بێت و پێی عەیب نەبێ... چۆن سەیری چاوی بکا؟

جێ جێی لەشی بریسکەی پێدا دێ. دەتەقێ. خێرا لە پلیکانەکان چووە خوارێ و رای کردە حەوشە. گەیشتە بەردەرگای ماڵی یوسف. میرۆ بە روویەکی خۆشەوە بەپیرییەوە هات.

"یوسف لە ماڵێیە؟"

"لە ماڵێیە بەگ."

"ئەی چۆنە؟"

"سەری بەگ سلامەت بێ. یوسف بە دایکییەوە بە قوربانی نینۆکێکی بەگ."

بێ ئۆقرەیی خەریك بوو شێتی بکا.

"یوسف؟"

"فەرموو بەگم."

کە گوێی لە دەنگی بوو، هێور بۆوە. یوسف بەرامبەری راوەستابوو. بەگ چاوێکی لە میرۆ کرد و میرۆ رۆیشتە دەرێ بۆ ئەوەی بەتەنێ بن.

"دەستت خۆش بێ کوڕم یوسف."

بەگ دوای هەر جەنایەتێکی بە فیتی ئەو دەکرا، داوای لە پیاوکوژەکەی دەکرد، ورد ورد بۆی لە بنی کوولەکە بدا. ئەگەر پیاوکوژەکەی گێرابایە و بۆی نەڕەخسابا بۆی بگێڕێتەوە، دەتگوت شتێك لە ناخی بەگدا نقوستانە. بەتاڵاییەك دەمایەوە و ئەو بۆشاییە شێتی دەکرد. مەحموود دوای کوشتنی ئاق یۆللی بە چەند رۆژان وا بۆی لەبنی کوولەکە دابوو، دەتگوت بەگ خۆی کابرای کوشتووە. ئێستاش چێژەکەی لە گیانیدا مابوو. لەوانەشە هەر لەبەر ئەو لێهاتوویی‌یەی باوکی بۆ گێڕانەوەی رووداوەکە بووە، کە ئەرکی کوشتنی حاجییشی بە کوڕەکەی ئەسپاردبوو...

چاوی لە چاوی بڕیبوو و سەیری دەکرد و بێ ئۆقرە چاوەڕوان بوو. سەیرکردنەکە زۆری نەخایاند. بەگ چیی دەکرد نەیدەتوانی داوای لێ بکا بۆی بگێڕێتەوە چۆن بووە؟ بەڵام یوسف هەر متەقی نەکرد و بەگ تاقەتی نەهێنا و بە دەنگێکی کپ و لەرزۆك گوتی:"بلێ، بلێ کوڕم یوسف، بزانم چۆن بوو؟ موو بە موو بۆمی بگێڕەوە. ئەو سەگەت چۆن تۆپاند؟ لە کوێ کوشتت؟ بۆم بگێڕەوە."

یوسف سەری هەڵبڕی. روخساری زەرد هەڵگەڕابوو. بە لێوە لەرەوە گوتی:"ئەمن کەسم نەکوشتووە بەگ."

سەری بەردایەوە. ئەوەندە لێبڕاوانە و بڕوابەخۆ ئەو قسەیەی کرد، بەگ بە پێی ئەزموونی ژیانی تێگەیشت یوسف بەهیچ جۆرێ باسی ناکا. ئەو کەسانەی ئاوا لێبڕاوانە قسە دەکەن، شادەماریشیان هەڵبڕی، گۆشتی لەشیشیان بە گاز بگری و پل پل بیپچڕی و بیدەی سەگ بیخوا، دیسان هەر قسە ناکەن. هەر بۆیە لەوە پتر نەمایەوە و بەبێ ئەوەی قسەیەك بکا، بەجێی هێشت. کەە هاتە دەرێ، ئەو شادییەی بزری کردبوو، دۆزییەوە. لە قەڵافەت و هەڵسوکەوت و چۆنێتی ڕێگارۆیشتنەکەی دیار بوو ئیتر لە خەم خەلساوە.

زەکەریا بەخاتوونی گوت:"خاتوونی خۆم، تەواو تێداچووین. ئەتۆش هیچت پێ ناکرێ. ئەمن دەبێ لەگەڵ بەگ قسە بکەم و تێی گەیەنم چەندە شپرزەین. بێت و ئەمجارە نەیسەلمێنێ و دیسان شیڕاندی، لێ دەدەم دەڕۆم و وەشوێن کاری خۆم دەکەوم."

خوشکەکەی... گەسگەسك... بەوپەڕی ڕێزەوە دەستی لەسەر سینگی دانا و کڕنۆشێکی برد و لە بەردەم بەگ ڕاوەستا. بەگ بە هەڵپەوە گوتی:"دەنگ و باس زەکەریای ماڵ کاول؟ وەرە بزانم، وەرە بزانم چ مشوورێکت لێ خواردووین؟"

زەکەریا، کە وەك کچۆڵەیەك لە شەرمان سوور هەڵگەڕابوو گوتی:"گیانی بەگ سلامەت بێ."

کوڕە وا رووخاوی بەگی من، یانی ئەو قسانەی ئاق یۆلیت نەبیستووە؟ چما نەتبیستووە پاشای من؟ کوڕە خۆ بیانبیستی هەر شێت دەبی. چما من ناتناسم؟ چیی گوتووە؟ جا کێ دەوێرێ بۆتیان بگێڕێتەوە؟ دەزانم وا دەهری دەبی، ئەوەی بۆتیان دەگێڕێتەوە، کوڕی شیرینیشت بێ، هەر لەوێ دەیکوژی. گوتوویەتی ئەمن ئیتر کارم بە کوشتنی دەروێش بەگ نییە. لەمەودوا مردن بۆ ئەو رزگاربوونە. ئێستا کاتی ئەوەیە تێر بە دڵی خۆم سەیری بکەم. خوشکەکەی لە گەسگەسکەکاندا، کچەکەی لە شۆستە و کوڕەکەی لە... خۆشی ئەوە گرفتاری ئەو حەیاچوونە و ئەو شکان و مایەپووچییە و پەلەقاژەیە.... ئەو ئیتر دوژمنی من نییە. ئەگەر بێ و لەبەر چاوی خۆم هەموو منداڵەکانیشم بکوژێ، دیسان بە دوژمنی خۆمی دانانێم و دەیدەمە دەست حوکمەت.

چەند جاران تفی زاری قووت دایەوەوە و ئاخری دووپاتەی کردەوە:"گیانی بەگمان سلامەت بێ."

## ١١٥

بەرەبەری بەیانی بوو، کە یەکێك لە کێشکچییەکانی ئاوایی لە دەرگای دا. دەروێش بەگ و مزەفەر و هەر هەموویان لەسەر هەست بوون. لەگەڵ دەنگی دەرگاکە هەموو بەخەبەر هاتن. بەڵام دەروێش بەگ نەبێ، هیچیان لە جێوبانەکەیان نەهاتنە دەرێ. دەروێش بەگ دەمانچەیەك بەدەستەوە بە هانکەهانك لە پلیکانەکان چووە خوارێ.

"کێیە؟"

"منم ئاغا، مچە گزیر."

دەروێش بەگ دەرگای کردەوە.

"چییە، چ بووە مچە."

مچە بەپشوو سوارییەوە گوتی:"جەندەرمە ئاوایییەکەیان گەمارۆ داوە. هەست و خوستیان لەخۆیان بڕیوە و تەنانەت جگەرەش ناکێشن. وەسمانی خۆمان کە ویستوویەتی لە ئاوایی بچێتە دەرێ، گرتوویانە. ناهێڵن باڵندەش لە ئاوایی بچێتە دەرێ. ویستم ئاگادارت بکەمەوە."

"زۆر باشە، بڕۆ."

دەروێش دنیای لەپێش چاوی تاریك بوو. بە شێواوی لە پلیکانەکان چووە سەرێ و بەپەلە جلوبەرگی لەبەر کرد. دەمانچەکەشی لە بەر پشتوێنی نا و لە پلیکانەکان چووە خوارێ و بەرەو دەرەوەی ئاوایی کەوتە رێ. یانی چی؟ وەك هێزی داگیرکەر ئاوەدانی گەمارۆ دەدەن، ئەوە یانی چی؟ کێ وێراویێتی ئەو کارە بکا؟ دەبێ یوسف قوتار بکرێ. بەڵام بۆ کوێ؟ بۆ وان یان تۆرووس؟ وان زۆر دوورە. ئەو هەتیوەش منداڵە و کەم ئەزموون. لە تۆرووس لە کوێ خۆی بشارێتەوە؟ ئەو غیرەتی یاخیگەری و چەتەیی نییە کە... بەڵام بنیادەم زۆری بۆ بێ، یاخییش دەبێ، چەتەییش دەکات و دەبێتە جانەوەریش. یوسف کوڕێکی ئازا و زیرەکە. کێ چووزانێ، لەوانەیە دوای سێ ساڵی دیکە ناوبانگی یوسف وەك یاخییەکی گەنج و بەژن و باڵاجوانی

تۆرووس لە رۆژنامەکانی ئەورووپاشدا دەنگ بداتەوە. رۆژنامەنووسی بیانی دێن و ریپۆرتاژ لە ژیانی یوسف ئامادە دەکەن.

ئێستا دەبێ یوسف دەرباز بکرێ. ئەگەر هەموو گوندەکەیان گەمارۆ دابێ، چۆن دەرباز دەکرێ؟ باشە ئەگەر گوندەکەیان گەمارۆ دابێ، دیارە ماڵ بە ماڵ هەموو ئاواییەکەش دەگەڕێن. چۆنە، بە چەك بەرەنگاریان بێتەوە و پێشیان بگرێ و نەهێڵێ بێنە نێو ئاوەدانی؟ نا، ئەوە بەجێ نییە. ئەوە یانی ئەمن دزم و وەرن بمگرن. ئەوە خۆ پێوە کردنە. چار نییە جگە لەوەی یوسف دەرباز بکرێ. ئەو هەلە نابێ لەکیس بدەین.

بەرەو ماڵی میرۆ گەڕاوە. هێشتا نەگەیشتبووە حەوشە، دەرگای ژووری کرایەوە. یوسف بەپیرییەوە هات.

"ئەمرێکت هەبوو بەگ؟"

"جەندەرمە دەوری گوندیان داوە. لەوانەیە بۆ تۆ هاتبن. دەبێ لە جێیەك خۆت بشارییەوە. جار یان لە بیرەکەدا خۆت بشارەوە، یان را بکە. دیارە کاری خێریان بەدەستەوە نییە. پێم وایە ماڵ بە ماڵی ئاوایی دەپشکنن. نابێ دەرفەت لەکیس بدەی. چ دەکەی؟"

"رادەکەم. لە بیرەکەدا دەمدۆزنەوە. را دەکەم، بەڵام چەکم پێ نییە. بۆ کوێ هەڵێم؟"

"لە بوغەکێو کابرایەکی لێیە بەناوی "عەلی ریشە". بچۆ بۆ لای وی. ئەوەش دەمانچە. ها. ئەوەش فیشەك. سی فیشەکە. دواییش بۆت دەنێرم. ئەوەش پارە... هەوڵ بدە نەتگرن. بکەویتە دەستیان، هەردووکمان لە سێدارە دەدەن."

یوسفی لە ئامێز گرت و چاوەکانی ماچ کرد و گوتی:"کوڕە جوامێرەکەم، شێرەپیاوەکەم، خێرت وەڕێ بێ. چ بکەم چارەنووس وا بوو. هەتا من زیندووم، کەس ناتوانێ تاڵێك لەسەرت کەم بکاتەوە. بازنەی گەمارۆکە بشکێنە و خۆت دەرباز بکە.

خێرت بێتە رێ کوڕم. بە خودات دەسپێرم. ئەگەر زانیت دەگیرێی، ئاخر فیشەك لەخۆت بدە. نەهێڵی بە زیندوویی بتگرن.

یوسف هیچی نەگوت. چەند جارێك ئاوڕی لە دەرگای کراوەی ماڵەوەیان داوە. ئیتر بەسەر پەرژینی حەوشەکەدا خۆی فڕێ دا و لە بوولێڵەکەدا ون بوو. بەگیش بەرەو دەرەوەی ئاوەدانی کەوتە رێ.

دەنگێك لە پێشەوە هات:"مەبزوو. لەجێی خۆت مەبزوو. ببزووی تەقەت لێ دەکەم. تۆ کێی؟"

دەروێش بە دەنگێکەوە، وەك بڵێی هیچ نەقەومابێ، گوتی:"من دەروێش بەگم کوڕم. ببمە بۆلای فەرماندە."

"لەجێی خۆت مەبزوو. بزووی تەقە دەکەم."

دەروێش بەگ لەجێی خۆی چەقی. تاوێك دواتر دەنگێك هات:"ئەوە تۆی دەروێش بەگ؟ فەرموو، ئەوە هاتم."

دەروێش بەگ لەجێی خۆی نەبزووت. ئاوی لێ بوو تارماییەك لەولاوە بەرەولای دەهات. دیاربوو فەرماندەکەیە."

فەرماندە هەروا پەنجا مەترێکی مابوو بیگاتێ، گوتی:"زۆر زوو پێت زانی بەگ. هیچ نییە، لە راکردوویەك دەگەڕێین."

دەروێش بەگ دەنگی نەکرد. فەرماندە هاتە پێشتر و دەستی راستەی هێنا پێشەوە و تەوقەیان کرد. دەروێش بەهەندی نەگرت و بە لەبزێکی گاڵتەجاڕانەوە پرسیی:"راکردووەکە کێیە؟ رای کردووە و هاتووەتە ئاواییەکەی ئێمە؟ ماشەڵڵا و هەزار ماشەڵڵا ئاواییەکەی ئێمەتان وا گەمارۆ داوە، وەك بڵێی دوژمن چووبێتە سەر شارێك و گەمارۆیان دابێ. وا تەنراوە، دەرزیی لەبەرەوە ناچێ.

دەی فەرموو با بچینە ماڵێ. چیی نەماوە بۆ بەیانی، با بچین بەرچاییەکی بخۆین. راکردووەکەش دەدۆزینەوە و رادەستتانی دەکەم. ئەگەر پیاوی وا لە ئاواییەکەی مندا بێ، داوا لە من بکەن. لە تۆ دەشێتەوە لە نیوەی شەوێدا و بەبێ ئاگادارکردنەوەی من دێیەکەم گەمارۆ بدەن، جەنابی فەرماندە؟"

فەرماندە لێوی کرۆشت و بەتووڕەییەوە گوتی:"بۆ خۆم باشتر دەزانم لێم دەوەشێتەوە یان نا، دەروێش بەگ..."

دەروێش بەگیش بەدەنگی بەرزترەوە نەڕاندی:"ئەوەش هەر منم دەیزانم کە هیچ کەس ناتوانێ لەخۆڕایی مڵکی من گەمارۆ بدا. تۆ ناتوانی لە نیوەی شەوێدا وەك شاری دوژمن، گەمارۆی مڵکی من بدەی، گەنجۆ."

"ئەگەر قاتڵی داماوێك خۆی لێرەدا شاردبێتەوە، گەمارۆی دەدەم. گەمارۆی دەدەم و..."

"ناتوانی گەمارۆی بدەی."

"دەتوانم."

"ئەگەر دەتوانی، بیکە با بزانم چیت پێ دەکرێ."

"من بۆخۆم دەزانم چ دەکەم دەروێش بەگ. ئەتۆش باش دەزانی چ خەبەرە."

"یانی ئاوا فەرماندەی لاو؟"

"بەڵێ ئاوا دەروێش بەگ."

"ئەوە پێچەوانەی قانوونە."

"ئەی ی ی، ئێوە هەر زۆر رەچاوی قانوون دەکەن دەروێش بەگ."

"دنەیان داوی گەنجۆ. دوژمنەکانی من دنەیان داوی، چۆنت پێ خۆشە... ملمان لە موو باریکترە. قەیناکا."

"من نا، قانوون..."

لە دوورەوە بوو بە هەرا و بەدوایدا چەند تەقەیەك کرا.

دەروێش بەگ شلەژا و بەدەنگێکی لەرزۆکەوە:"باشە ئەگەر جەندەرمەکانت کەسێکیان ئەنگاوتبێ کە دەیەوێ بچێتە کارکردن، چۆن جواب دەدەیەوە جەنابی فەرماندە؟"

"جوابی دەدەمەوە دەروێش بەگ..."

تەقەکە توند بوو. فەرماندە بەرەو ئەولایە رای کرد کە دەنگی تەقە لەوێوە دەهات. دەروێش بەگیش گەڕاوە بەرەو ماڵەکەی خۆی. لە پلیکانەکان چووە سەرێ و ماوزەرەکەی لە سندووق دەرهێنا و چەند ریز فیشەکیشی هەڵگرت و لە پشت پەنجەرەکەوە راوەستا و ویستی تەقە بکا لەو شوێنەی لەوێوە دەنگی تەقە دەهات. لەپڕ بیری کردەوە، ئاگری فیشەکەکان دەبینن و دەزانن لە کۆشکەوە تەقەیان لێ دەکرێ. دەسبەجێ چووە خوارێ و لە کادێنەکەدا سەنگەری گرت و دەستی کرد بە تەقە.

مزەفەر بەسەر لێشێواوی و دەنگێکی کپەوە هەرای کرد:"بابە، بابە، ئەوە چ دەکەی؟"

دەروێش بەگیش گوێی نەدەدایێ و تەقەی دەکرد.

یانی یوسفیان ئەنگاوتووە؟ بێت و ئەنگێورابێ، فەرماندەکە دەکوژێ. دە جەندەرمەش دەکوژێ و ئاخرییەکەی خۆشی دەکوژێ.

"بابە، بابە، ئەوە چ دەکەی بابە؟"

دەروێش بەگ لوولەی تفەنگەکەی تێگرت و بەسەریدا نەڕاندی:"ملت بشکێنە دەنا..."

مزەفەر دەسبەجێ بۆی دەرچوو.

تاوێك دواتر تەقە نەما. دەروێش بەگیش وازی هێنا. لە کادێنەکەدا دەهات و دەچوو و بەخۆی دەگوت:"یوسفەکەم، یوسف، رۆڵەم. سەریان خواردی. یوسفەکەم... رۆڵە... لە تۆڵەی

خوێنی تۆ پانزەیان لێ دەکوژم. یەکێك لەوانە فەرماندەکە دەبێ. نەقیب خۆی. یەکێکیشان بابت، دەروێش. هەمووان دەکوژم. راوەستە با خەبەری مەرگت بێ، ئەو گوندە دەسووتێنم. هەموو شارۆچکەکە ئاگر دەدەم. ئاگری دەدەم، هەموو ئەو هیچ و پوچ و زۆڵانە، نەوەی رزیو و پواوی مرۆڤ قڕ دەکەم. پواوە پواو، پواوە پواو. کوڕم... یوسفەکەم..."

پیاوەکانی لەبەر دەرگای کادێنەکە چاوەڕێ بوون. هەمووشیان چەکی ماوزەریان پێ بوو. ئەوان نەیاندەزانی چ باسە و بەسەر سووڕمانەوە لەبەر دەرگای کادێنەکە راوەستابوون بزانن چ دەبێ.

دەروێش، کە تۆزێك وەخۆ هاتبووەوە، کاتێك لەبەر دەرگا چاوی پێیان کەوت، گوتی:"بڕۆن هەواڵێکم بۆ بێنن. ئەگەر کەسێکیان ئەنگاوتبێ، هەتا شەوێ لەگەڵ جەندەرمە شەڕ دەکەین و شەوێ دەچینە چیا. کەس لەگەڵم دێ؟ ئەگەر کەسیش نەیە، خۆم رێگەی چیا دەگرم و دەڕۆم."

چەند کەسێك وێکڕا گوتیان:"ئێمە لەگەڵتین بەگ."

پیرەمێردێك گوتی:"ئێمە هەم دۆستی رۆژە خۆشەکانین و هەم برای رۆژە ڕەشەکان. هەتا زیندووین ناهێڵین تەنیا بی."

دەروێش بەگ:"تەمەندرێژ بن. راوەستاو بن. هەتا زیندووین، هەر پێکەوەین. دەزانم. ئەوە دەچمە سەرێ. ئەگەر یەکێك مردبێ، ئاگادارم بکەنەوە. ئەگەر خەڵکێکی ئاوایی کوژرابێ، شەڕ دەکەین."

ئیتر بەرەو کۆشك رۆیشت.

لە سەرێ، لەسەر پلیکانەکان، نوورخانی کچی، جەیحوون و مزەفەریش بە رەنگ بزڕکاوی و واق وڕماوییەوە راوەستابوون و سەیری دەروێش بەگیان دەکرد، دە وردە وردە لە پلیکانەکان وەسەر دەکەوت.

# ١١٦

که به قەراغ پەرژینەکەی تەمیر ئۆغلێدا تێدەپەڕی، دەنگێك هات:

"کێی؟ راوەستە. لەجێی خۆت نەبزووی. ببزووی تەقە دەکەم."

یوسف بە بن پەرژینەکەدا خۆی گەیاندە نێو دار تووەکان. رێك لەو کاتەدا ویزی فیشەکێك هات. بەدوای ئەودا گوللەیەکی دیکەش. که تەقە توند بوو، خۆی بە ئاوە قوولەکە دادا. جەندەرمەکە پەیتا پەیتا تەقەیان دەکرد. لەو جەنگەیەدا لە لای کۆشکەکەی بەگیشەوە تەقە کرا. ئەوە بەگ شێت بووە؟ باشە شێت نەبووبێ، چۆن فیشەك بە جەندەرمەکانەوە دەنێ؟

یوسف یەکەم جاری بوو تەقەی لێ بکرێ. فیشەکیان پێوە دەنا. ئەویش بە قەستی کوشتنی. هەر بای خەیاڵیشی نەبوو. ئەوەی ترس بێ، تۆسقاڵێکیش چییە لە دڵیدا نەبوو.

لەپڕ تەقە راوەستا. بێدەنگی باڵی بەسەردا کێشا... لێواری رووناکی ئاسۆ لە دوورەوە نیشانەی بەیانی بوو. نەدەکرا لێرە بمێنێتەوە. دەبوو بەر لەوەی تاو هەڵێ خۆی بگەیەنێتە زۆنگاوەکە. لە جۆگەکە هاتە دەرێ و وەك بریسکە بەرەو خوارێ رای کرد. ترسێکی وای لێ نیشتبوو، تەنانەت لە ترپەی پێی خۆشی دەسڵەمییەوە. که شەکەت دەبوو، خۆی لە جۆگەکە داویشتەوە و پشوویەکی دەهاتەوە بەر و دیسان دەهاتەوە دەرێ و سەیرێکی دەوروبەری دەکرد و تێی دەتەقاندەوە. ئەگەر بەر لە تاوکەوتنێ بتوانێ خۆی بگەیەنێتە ئاقچاساز... ئەگەر بگاتە ئەوێ... ئەگەر نەتوانێ، لە نێوەراستی دەشتکە بیگرن، لە داری دەدەن. بەگیش لە دار دەدەن. که بیری لەوە دەکردەوە بەگیش لەگەڵ ئەودا لەدار دەدەن، تۆزێك لە ترسەکەی دەڕەواندەوە و ترووسکایی هیوایەکی لە دڵیدا دادەگیرساند. دواییش خەیاڵی دەچووە لایەکی دیکە. چمار بەگەکانیش لە سێدارە دەدرێن؟ نا، ئەوان پشتیوانی وایان هەیە وەك چیای قاف... حوکمەت هەیە، بەگەکانی ئەدەنە هەن... ئەوان رێگەیەك دەدۆزنەوە بۆ دەربازبوونیان.

بەهانکەهانك گوتی:"رزگار دەبن. ئەوان دەرباز دەبن... دەرباز دەبن."

چەندی لەسەر ئەو باوەڕەی سوورتر دەبوو، خێراتر رای دەکرد. ئیتر چیی نەمابوو تاو هەڵێ. ئای یوسفی ماڵ وێران، خەریکە تاو هەڵدێ؟ تاوێك دواتر، تاوێك دواتر... چیی نەمابوو... ماندوو مەبە یوسف، راوەستە...

"رێگەیەك دەدۆزنەوە، دەرباز دەبن."

لەپڕ تاو هەڵات. تا وەخۆ هاتەوە، خۆر لە لووتکەی چیاوە سەری بەرز کردبۆوە. تاوهەڵاتنی چوکووراوا هەر ئاوایە. لە حاڵێکدا، شوێنەکانی دیکە، زۆر جاران لە پێشدا لێواری ئاسمان وردە وردە سپی دادەگەڕێ، سپیایی ئاسمان دەتەنێ و کازیوە دەردەکەوێ و ئەوجار تاو هەڵدێ. لە پێشدا گۆشەیەکی، دوایی نیوەی و ئەوجار هەمووی. دوای ئەوە هەڵدەکشێ و بەرز دەبێتەوە. بەڵام لە چوکووراوا وا نییە. لە پڕێکدا هەڵدێ و دێتە سەر لووتکەی چیا و تیرێژ و گزینگی داوێ. تیشکێکی خەست و بەتین، وەك بڵێسە، دەڵێی دەستی پێدا بکێشی، ئاسمان دادەگرێ و وەك باران دادەگەڕێ.

یوسف سەری لێ شێوا. وەك سەد فیشەکیان پێوە نابێ. دەسبەجێ خۆی بە عەرزییەوە مەڵاس دا و بە دەستی، چاوی داپۆشی. ماوەیەك هەروا دەمەوڕوو درێژ بوو بەبێ ئەوەی چاوی هەڵێنێ.

تاوێك دواتر دەستی لەبەر چاوی هەڵگرت. دڕووەڵانێکی لەبەر دەم بوو. ئەگەر خۆی گەیاندبایەتە ئەوێ، قوتار دەبوو. دوای دڕووەڵانەکە، قامیشەڵان و دوای ئەویش زۆنگاو... بە دڕدۆنگییەوە سەیری دەوروپشتی خۆی دەکرد. کەسی لێ دیار نەبوو. چۆلەکوژێك لە دەشتەکەدا دیار نەبوو. دەشتەکە یەکپارچە تیشکی خۆر بوو و یوسف لە تەنیاییەکی بێ بڕانەوەدا پەلەقاژەی بوو. ئەگەر ئێستا مارێك پەیدا بێ، باڵندەیەك هەڵفڕێ... چۆلەکەیەکی بچووك... فڕۆکەیەك بە ئاسمانێدا تێپەڕێ... شتێك روو بدا. ئەگەر جەندەرمەکان دیسان بێنەوە و تەقەی لێ بکەن... شتێك روو بدا و لەو تەنیاییە نەفرەتییە رزگاری ببێ... دنیا ئاوا تەم داینەگرێ...

ئێستا بڵێی جەندەرمەکان چ بکەن؟ ئەگەر بەگ دەسبەسەر بکەن. بەگە دەرەقەتیان... ئەوان دەرەقەتی بەگ نایەن. ئەی لەو ئاگری رق و قینەی لە چاوی مزفەرەوە بڵێسەی دەدا. وەی لەو رقە. یاخوا ئەو چاوانەی کوێر بن. خۆ هەلی بۆ هەڵکەوێ، پیاو دەکوژێ. دەیئەنجنێ. مزەفەر خوێنمژە. مزەفەر وەك ئاوخواردنەوە پیاو دەکوژێ. ئەو جانەوەرێکی دڕندەیە. ئێرەیی دەبا. پێی ناخۆشە دەروێش بەگ ئەوی خۆش دەوێ. بە جەندەرمەکان دەڵێ. پێیان دەڵێ کە یوسف حاجییە شێتەی کوشتووە.

پشتەملی زوورایەوە. شەویلاگەی ئارەقەی کردبوو و دلۆپ دلۆپ دەچۆڕایەوە و بەردەبوونەوە. هێندەی قولانجێك سەری هەڵێنا. تیشکی خۆر چاوی بە شەوارە خست. تیشکی خۆر چاوی لەبەر هەڵنەدەهات. سۆمای چاوی دەبرد. دەسبەجێ سەری داختەوە و خۆی خستە نێو دڕووەکانەوە... تۆزێك لەولاترەوە ئاقچاساز... هەژدیهایەکی حەوت سەر لە ئاقچاساز، چاوەکانی پڕ لە ئاگر، نوقمی قوڕ و لیتە، بۆگەنی قوڕەڕەشە، ئەو کێم و چڵکەی لە زارییەوە دێتە دەرێ، ناتوانی لێی بچیتە پێشێ... هەژدیهای سەوز، زاری تاریك و ددانەکانی تیژ و بریقەدار.

لێرەوە تا دەریا، تا وڵاتی یورەگیر، دەبێ لێڕ و دارستان بێ.

خوێن شۆڵاوگەی بەستبوو بەسەر قولەپێیدا. شتێکی ناخۆش، لێستنەوەی کێردە خوێناوییەکە. ئەك دوو جاران هێڵنجی دا، بەڵام نەڕشایەوە. هەموو گیانی موچڕکەی پێدا هات و لەرزی. ترسێك گیانی تەنی، کە نەیدەزانی لەکوێوە سەرچاوە دەگرێ. چۆلەکوژی لێ دیار نەبوو. هەموو شتێك بۆش و بەتاڵ.

لەپڕ هەستی کرد شتێکی فێنك بەسەر دەستیدا رۆیشت. سەیری دەستی کرد. ریزە مێرووڵەیەکی دیت و تێیان فکری. ئەوجار دەستی راوەشاند. سەری هەڵێنا و تاریکاییەکی لە رووناکییەکە دی. چاوی خەریك بوو کوێر دەبوو. چاوی لێك نا و هەستایە پێ. نەکا فیشەکێکی بەر کەوێ. خۆی گرمۆڵەکرد. کە سەری هەڵێنا، گەیبووە دڕووەڵانەکە. لە نێو دڕووەڵانەکەدا خۆی درێژ کرد. هەموو گیانی وەك چووبێتە نێو ئاگر، دەبرژایەوە. سینگ و پێ و دەستی و هەموو لەشی پڕ ببوو لە چقڵ. لە پڕ گیانی وا ژانی کرد، خۆی پێ نەگیرا و هەستا و بەرەو دڕووەڵانەکە رای کرد. هەر گەیشتە ئەوێ، پێش هەموو شتێك، چقڵەکانی لە لەشی دەرهێنا و زۆریشی پێچوو. دەستەکانی شەلاڵی خوێن بوون. تینووشی بوو... هەتا ئێستا هەر چاوەڕێی گوللەیەك بوو، بێ و مێشکی بپژێنێ. سات بە سات چاوەڕێ بوو... جار نەجارێك دەستی بەسەریدا دەکێشا. دەتگوت، سەری خوێناوییە. وەك بڵێی فیشەکی بەرکەوتبێ. ئەگەر خۆی بگەیەنێتە ئەو قامیشەڵانەش... لەپڕ هەستا و دەرپەڕی.

قامیشەڵانەکە زۆنگە. هەتا ئەژنۆی لە قوڕ و لیتە رۆدەچوو. جێیەکی وشك... جێیەکی ئاوەڵا... چۆڕێك ئاو... ساورۆن بەو نزیکانەدا دەڕوا. دەبێ ساورۆن بدۆزمەوە. ئیتر لە فیشەك ناترسێ. کەسیش لەو قامیشەڵانەدا نایبینێ. دەرباز بوو. بەبێ ترس و خۆف دەچێتە پێشێ. چاوی چووە سەر قەتارێکی قاز و قورینگ کە بەتەشقی ئاسمانەوە بوون. لە پێشدا دەبێ خۆی لە ئاوێ هەڵکێشێ.

که تۆزێك چووە پێشێ، دیتی گەیوەتە دەم ساورۆن. دەسبەجێ رووت بۆوە و خۆی بە ئاوەکە دادا. بینی پێوە نا. کە هاتە دەرێ، حەسابۆوە. دەتگوت بووەتە پەڕە کایەك. ئەوجار برسێتی دڵی گوشی.

بن قامیشەکان سێبەر بوو بەڵام زۆنگاو. جێیەکی وشك... جێیەکی وشکی هێندەی دە مەتری دۆزییەوە. ئەو قامیشانەی لە وشکانییەکە رووابوون، شانەی زەردەواڵەیان پێوە بوو. شانەکانیان زیوین بوو. سەر شانە زیوینەکان زەرد دەچوونەوە. دەبوو بەبێ ئەوەی بیانورووژێنێ، راکشێ و بنوێ. ئەگەر نەبزووی، زەردەواڵەی کاری بەسەرتەوە نییە.

لەسەرخۆ راکشا و دەسرۆکەکەی دەرهێنا و بەسەرچاوی کێشا.

# ١١٧

فەرماندە لە دەروەی گوند راوەستا، هەتا چەند سەعاتێك لە رۆژ تێپەڕی. کە خۆر هەندێ بەرز بۆوە و سێبەر درێژ بوونەوە، لەوێ کۆمەڵێك جەندەرمەی لە بۆسەدا بەجێ هێشت و لەگەڵ کوێخا و گزیر چووە نێو ئاوایی. کوێخا خەڵکی گوندی ئۆکسوزلی بوو. ئەو ئاوەدانییەش هەر سەر بە گوندی ئۆکسوزلی بوو. دوێنی عەسرێ بانگیان کردبوو. وا بڕیار بوو تاوێك دواتر ئەندامەکانی ئەنجومەنی ئاوایی ئۆکسوزلییش بێن.

"جا تازە فایدەی چی، فایدەی چی، فایدەی چی، پیاوکوژەکە رای کرد و دەرچوو. بەڵام دەفتەر و لیستەمان بەدەستەوەیە، وا نییە کوێخا؟"

"بەڵێ لیستەیەکمان پێیە، سەری مار و مێرووی تێدایە."

"ناوی هەموو خەڵکی ئاوەدانییەکە لێرەدا نووسراوە، وایە؟"

"بەڵێ، هەر هەموویان، تەنانەت مانگاکانیشیانمان بژاردووە. ئەو ئاوەدانییە، ئی ئەوەی نییە بەکەمی بگری. جێیەکی سەر بەگێچەڵە جەنابی فەرماندە. ساڵێك نییە لێرە هەڵلایەك هەڵنەستێ. دەروێش بەگ بەبێ گۆنگەڵ و گێچەڵ ناژی."

فەرماندە لە حاڵێکدا لە چاوی کوێخا ورد ببۆوە، کەوتە قسە:"بەڵام رای کرد. زۆر پیس لە چنگمان دەرچوو. وانییە؟"

ئەوجار بە لەبزێکی دیکە گوتی:"کوێخا."

"فەرموو جەنابی فەرماندە."

"ئێستا دەبێ هەموو گوندییەکان لە جێیەك کۆ بکەینەوە. دەبێ ژنی کوژراوەکە و شایەتەکانی دیکەش بێنین بیانبینن. بە پێی لیستەکە بانگیان دەکەین. ئەوی لێرەش نەبوو، یەك بە یەك دەسنیشانیان دەکەین. لە هەر کوێیەك بن دەیاندۆزینەوە. ئەگەر زانیمان هیچ کام لەوانە پیاوکوژ نین، ئەوە دیارە دەروێش بەگ پیاوکوژی لە شوێنێکی دیکەوە هێناوە، وانییە؟"

"دەروێش بەگ پیاوکوژ لە شوێنی دیکەوە ناهێنێ. ئەو زۆر کارقایمە و لەجێیەك ماسی ناگرێ قوونی تەڕ بێ. ئەوەندەی من بزانم، ئەو شەڕکەرەکانی خۆی، هەر لە منداڵییەوە لەبەردەستی خۆیدا پەروەردە دەکا، یان لەنێو کەسانێکدا هەڵیاندەبژێرێت، کە چاکەیەکی بێوێنەی لەگەڵ کردبێن. مەبەستم ئەوەیە، پیاوکوژی دەروێش بەگ هەربە دەوەری خۆیەوەن و ئەگەر لێرەیان نەدۆزینەوە، لە هیچ کوێی دیکە نایاندۆزینەوە. مەگەر ئەوەی لێمان روون بێتەوە کوشتنی حاجییە شێتە بەفیتی دەروێش بەگ نەبووە.

فەرماندە بە تووڕەییەوە گوڕاندی:"بە فیتی ئەو بووە. ئەو دەرەبەگە... هەموو شتێك لەبن سەری ئەو دایە. ئەو نەبێ کەس حاجی ناکوژێ. ئەو بەڕەڵڵا داماوە، زەڕی بۆ کەس نەبوو... من پیاوکوژەکە دەدۆزمەوە و دەروێش بەگیش دەنێرمە پای سێدارە، با بزانێ دەوری چ پادشایەکە. ئەو ئاوەدانییە چەند گەنجی هەژدە ساڵانی تێدایە؟"

"دیاری کراوە. چواردە کەس. ئەو گوندە چواردە گەنجی مێرمنداڵی تێدایە. وەلیی کوڕی عومەر، عوسمانی دورمووش، مچەی کوڕی حەمە کەچەڵ..."

"پیاوکوژەکە یەکێکە لەوانە. دەبێ بیدۆزینەوە. گزیر، بڕۆ و جاڕ بدە."

فەرماندە و کوێخا لەوێ راوەستان. گزیر چوە پێشێ و دوای ئەوەی یەك دووجار کۆکی و قورگی خاوێن کردەوە و هەرای کرد:"هۆۆۆۆی، ئەهۆۆ ۆ ۆ ی ی ی خەڵکینە... ئەهۆی ی ی ، خەڵکینە هۆی ۆی ۆی دوایی نەڵێن گوێمان لێ نەبوو. فەرماندە فەرمانی داوە، هەموو خەڵکی ئاوایی بە ژن و پیاوەوە، بە پیر و لاوەوە بە ژن و منداڵەوە دەبێ هەر ئێستا بێنە ئەو گۆڕەپانە. جەنابی فەرماندە ئەمری کردووە. هەر کەس نەیەتە گۆڕەپانەکە، بە سەربزێو و یاخی لەقەڵەم دەدرێ و سزای دەدەین."

وەڕێ کەوت و چووە هەر چوار قوڕنەی گوندەکە و چەند جارێکی دیکەش هەرای کرد و جاڕی کێشا. جارێکیش بە دەنگێکی زۆر بەرز لە بەردەم کۆشکەکەی دەروێش بەگ هەرای کرد.

هەست و خوست لە ماڵەکانەوە نەدەهات. دەتگوت گوندەکە چۆل بووە. فەرماندە چەندی چاوەڕێ بوو، کەسی نەدی لە ماڵێ بێتە دەرێ، بۆیە بە گزیری گوت:

"لەوانەیە نەیانبیستبێ، جارێکی دیکەش بانگیان بکەوە."

گزیر یەك دوو جاری دیکەش بەدەنگێکی زۆر بەرز هەرای کرد. ئاوەدانی دەتگوت دە ساڵە چۆلەکوژی تێدا نەماوە.

"کەس نایەتە دەرێ. کوێخا، کەس نایەتە دەرێ. چ دەقەومێ؟"

کوێخا:"چ دەقەومێ جەنابی فەرماندە؟"
کوێخا:"یانی چی جەنابی فەرماندە؟ ئێوە دەیانکێشنە دەرێ و ئەوان رادەکەن."
"رادەکەن؟ ئەگەر وا بکەن، ئەوا لە قانوونی سەربازیی ئەو حکوومەتە یاخی بوون."
"شتی وا چۆن دەبێ جەنابی فەرماندە؟"
"دەبێ. زۆر باشیش دەبێ. راپەڕین راپەڕینە و یاخیبوونیش یاخیبوون."
"یانی هەر بەراستی وایە جەنابی فەرماندە؟"
فەرماندە نەڕاندی:"وره ئێره گزیر... جارێکی دیکەش هەرا بکە. ئەگەر گوندی لە ماڵ نەهاتنە دەرێ، یەك بە یەك بە جەندەرمە دەیانکێشینە دەرێ."
گزیر جارێکی دیکەش چووە پێشێ و بە دەنگێکی بەرزتر، دە جارێکی دیکەش هەرای کرد. بەناوی قانوون و حکوومەتەوە بانگی کردن. ناوی بەرهەڵستکار و یاخی و سەربزێوی لێ نان. گوتی سزاکەش زۆر سەختە و هەرچی بەسەر زاریدا هات گوتی.
فەرماندە پێی وابوو دوای ئەو هەمووە هەڕەشەیە لانیکەم یەك دوو کەسیان دێنە دەرێ. دەرگا داخرابوون. نەك کەس دەچووە ژوورێ و نە کەس دەهاتە دەرێ.
فەرماندە وا بەخۆیدا شکابۆوە، سوورهەڵگەڕابوو و بەردەوام بە دەسرۆکەیەك ئارەقەی دەموچاوی وشك دەکردەوە و دەیگوت:"نایەنە دەرێ. لەوانە نین بێنە دەرێ. پێت دەڵێم دەروێش بەگ."
چەند جارێك فیکەی کێشا. سەر و سەکتی چەند جەندەرمە و عەریف پەیدا بوون.
دەزانم چییان لێ بکەم. راپۆرتێك دەنووسم و دەڵێم ئەوانە دژی حکومەت راپەڕیون. ماڵی ئەو دەروێشە وێران دەکەم. ماڵوێرانی دەکەم."
کوێخا:"چۆنی پێت باشە جەنابی فەرماندە."
فەرماندە بە تووڕەییەوە چاوێکی لە سەرتاپێی کوێخا کرد. ئەو پێ پەتییە گاڵتەی پێ دەکرد؟ ناچار بوو بەڕووی خۆی نەهێنێ.
"بڕۆ بانگی دەروێش بکە بێتە ئێرە. دەمەوێ قسەی لەگەڵ بکەم. کوشتنەکە لە ئەستۆی ئەوە."
"نایە جەنابی فەرماندە."
"تۆ بچۆ بانگی بکە. ئەگەر نەهات، جا خۆم دەزانم چۆن دەیهێنم."
"سەربزێوی دەکا."

"سەربزێوییەکەی کردووە. دوێ شەوێ ئەو بوو لە پەنجەرەی ماڵەکەیەوە تەقەی لە سەربازەکانی من کرد."

"دیسان دەیکاتەوە. دەترسم شتەکە لەوە خراپتر بێ. دەروێش کابرایەکی تووڕە و تۆسنە. بێت و هەڵبچێ، هەمووومان دەداتە بەر گوللە و دواییش خۆی دەکوژێ."

فەرماندە سەرێکی راوەشاند و بۆڵاندی:

"تەڕ پێوە بووین."

کوێخا:"دەروێش بەگ، ئی ئەوەی نییە بەکەمی بگری. ئەو کوڕی ئەو بنەماڵەیەیە، لە دژی عوسمانلی راپەڕین. زۆر ئەستەمە، ئەستەمە..."

تاوێك دواتر عەریف و جەندەرمەکانی هاتنەوە.

"بڕۆن ئەو گوندییانە لە ماڵەکانیان دەرکێشنە دەرێ و بیانهێننە ئێرە. کەس نابێ لە ماڵەوە بمێنێتەوە. خۆشم دەچم ماڵەکەی دەروێش دەپشکنم."

بەرەو کۆشکەکەی دەروێش بەگ وەڕێ کەوت. بە دەستێکی لەرزۆکەوە لە دەرگای دا. نەیدەتوانی بەسەر تۆفانی رق و تووڕەیی خۆیدا زاڵ بێ. مزەفەر دەرگای کردەوە. ئەمری پشکنینەکەی پێشانی مزەفەر دا.

مزەفەر:"فەرموون"ێکی پێ گوت و لەبەری لاچوو.

فەرماندە زەردەیەکی هاتێ و گوتی:

"لە کەتنکەرێکی هەژدە نۆزدە ساڵان دەگەڕێین. کەسی واتان هەیە یان نا؟"

مزەفەر گوتی:"نیمانە. ئەگەر دەتەوێ فەرموو بگەڕێ."

فەرماندە هەر پێی نایە نێو دەرگاکەوە، ئەوەندەی دیکەش تووڕە بوو و ترسێك لە دڵێدا سەری هەڵێنا و بە زمانگیراوی گوتی:"نا، پێویست نییە. نامەوێ ماڵەکەتان بپشکنم. ئێوە داڵدەی پیاوکوژ نادەن. چاوەڕوانییەکی وام لە دەروێش بەگ نییە. تەنیا تکایەکم هەیە، ئیزن بدەن با گوندی لە ماڵەکانیان بێنە دەرێ. ئەوەتا ئەمری پشکنینی هەموو ماڵەکانی ئاواییم پێیە. دەبێ گوندییەکان پێشانی ژنی حاجییە شێتە بدەم. وا باشترە لاساری نەکەن."

مزەفەر گوتی:"ئیزن بفەرموون."

گەڕاوە و پشتی تێکرد و خێرا لە پلیکانەکان چووە سەرێ. لە دەرگای دا و چووە ژوورەکەی بابی. دەروێش رەنگی بە روخسارییەوە نەمابوو و لێوەکانی شین هەڵگەڕابوون. ئەوەندە خەفەتبار دیار بوو، هەر ئاگای لە وەژوورکەوتنی مزەفەر نەبوو.

"بابە، بابە، فەرماندە هاتووەتە  بەر دەرگا. فەرمانی پشکنینی هەموو ماڵەکانی ئاوایی پێیە. فەرمانی پشکنینی ماڵەکەی ئێمەش. گوندییش لە ماڵێ نایەنە دەرێ. ئەگەر بێنە دەرێ، ماڵەکانیان ناپشکنن.."

دەروێش بەگ، لەسەرخۆ سەری هەڵێنا و چاوی لە چاوی مزەفەر بڕی. چاوی دەتگوت گۆمی خوێنە.

"هیچ گوندییەك لە ماڵی خۆی نایەتە دەرێ. با یەك بە یەك ماڵەکان بگەڕێ. من ناتوانم رەعیەتی خۆم وەك کۆیلە و دیل بنێرمە گۆڕەپانەکە، سووکایەتییان پێ بکەن. با ماڵان بگەڕێن. هەر رێیەکی ئەستەمە با بیگرن."

دەروێش بەگ بیری لە هیچ شتێکی دیکە نەدەکردەوە. دیاربوو، یوسف دەرچووە. دەرچووە، بەڵام چووەتە کوێ؟ هیچ کوێ شك نابا بچێ. نەیتوانیبوو بەگوێرەی پێویست و بەکەیفی دڵی خۆی، یوسف پەروەردە بکا. دەبوو هەموو چیاکان و ماڵی برادەرەکانی لە چیا پێ بناسێنێ، بەڵام... تۆقی لەعنەتی ئەو حاجییە شێتە زوو لە ملیان ئاڵا. لەو سەردەم و رۆژگارەدا یوسف نەبێ، نەیدەتوانی متمانە بە کەس بکا. ئێستا یوسف لە کوێیە؟ چ دەکا، چ دەکا؟

"بابە، خۆ دنیا خرا نابێ، با بێنە دەرێ."

"تۆ گووی زیادی مەخۆ. نابێ بێنە دەرێ. تەواو."

دەروێش بەگ، هەمووی لێك دابۆوە. ئەگەر فەرماندە ماڵەکانی پشکنیبایە، تەقەی لێ دەکرد و فیشەکێکیشی لە زاری خۆی دەکرد. کە بیری لەو بڕیارە دەکردەوە، ترسێکی خۆش بەگیانیدا دەگەڕا.

"بابە..."

"تاکەی لە ماڵێ نایەتە دەرێ. بڕۆ بە فەرماندە بڵێ."

"بابە هەڵە..."

"هەر ئەوەیە پێم گوتی، بڕۆ دەی."

ئەوەندە بە تووڕەییەوە مای پێ گوت، مزەفەر نەیتوانی پتری لەسەر بڕوا. چاری نەبوو. باشە چ بە فەرماندە بڵێ؟

"جەنابی فەرماندە، ئەستەمە بتوانی گوندی لە ماڵەکانیان بێنیتە دەرێ. هەر شتێکی دیکەم لە دەست بێ، لە خزمەت دام. چیم لە دەست دێ؟"

"لەگەڵمان وەرە. ئەگەر هەندێکیان ملیان بادا..."

"بەقسەی من ناکەن."

فەرماندە لە کۆشك دوور کەوتەوە. مزەفەریشی لەگەڵ بوو. لە دوورەوە دەنگی هاوار و قیژە دەهات.

فەرماندە لە کوێخای پرسی:"چ باسە؟"

"دەتگوت نایب عەریف دەیەوێ بەزۆرەملی گوندییەك لە ماڵێ بێنێتە دەرێ و گوندییش نایەوێ بێتە دەرێ. ئەگەر هەموویان یەك بە یەك بێننە دەرێ، دیسان ناتوانن هەنگاوێك لە ماڵەکانیان دووریان بخەنەوە. سەریشیان ببڕن، دیسان ئەستەمە بێنە دەرێ و وەك مێگەل لەو گۆڕەپانە کۆ ببنەوە."

"ئەی ی ی ، چ بکەین؟"

مزەفەر:"خۆمان دەچینە ماڵەکان."

کوێخا:"چۆنە هەر خێزانەی لە ماڵەکەی خۆیدا سەرژمێریی بکەین. لیستەکەمان پێیە. ژنەکەی حاجییە شێتەشمان با لەگەڵ بێ."

فەرماندە:"چار نییە. من تێدا ماوم. دەی باشە، هەر رێیەکی سەختە با بیگرن. من ئەو تاوانبارە هەر دەدۆزمەوە جا لە ئاسمانیش بێ. ئەگەر نەمتوانی، ئەو ئەستێرانەی سەرشانم لێ دەکەمەوە و لەو شارۆچکەیەدا حەمباڵی دەکەم. بچن ژنەکەی حاجییە شێتە و شایەتەکان بێنن. ئەتۆش دەفتەرەکەت بکەوە و یەکەم ماڵ بژمێرە کوێخا."

"جەلال ئۆغڵی تەمیر کوێر ئۆغڵی."

فەرماندە:"ماڵەکەی کوا؟"

مزەفەر:"ئەم ماڵە هەوە. تەمیر ئۆغڵی پیرە. لە پیرەژنەکەی پتر کەسی نییە."

فەرماندە:"ئەی شایەتەکان لەکوێن؟"

"ئێستا دێن جەنابی فەرماندە."

کوڕم، بڕۆ بە نایب عەریف بڵێ، جارێ بێتە ئێرە."

زەنازەنا و قیژە و هاوارەکە کپ بوو. تاوێك دواتریش نایب عەریف هات:

"باوەشی لە کۆڵەکەی ماڵێ وەراندووە و ناتوانین لێی بکەینەوە. هاوار و قیژەشی دەگاتە ئاسمانێ. دەستیشی ببڕی ئەو کۆڵەکەیە بەر نادا. گوندیی ئەوەندە لاسارم نەدیتبوو."

"ئێستا دەچینە ماڵی تەمیر کوێر ئۆغڵی."

ژنەکەی حاجییە شێتە و شایەتەکانی دیکەش گەیشتنێ. ماڵی تەمیر ئۆغڵی بەرهەیوانێك و دوو ژووری تەسك و تاریك بوو. ئالاشی میچەکەی رزیبوو و پەرژینەکەی زگی دابوو. دەوراندەوری پەرژینەکەی بە شیاکە سواخ دابوو.

"دەرگا بکەوە تەمیر کوێر ئۆغڵی. من فەرمەندەی پۆلیسم. دەبێ ماڵەکەت بپشکنین."

چاوەڕێ ما. هەست و خوست لە ژوورەوە نەهات.

"سەیرە. سەیرە. یانی کەس لە ماڵێ نییە؟ یانی دەرگا ناکەنەوە؟ تەمیر کوێر ئۆغڵی، تەمیر کوێرئۆغڵی، دەرگا بکەوە."

سەری سمێڵی جوی. دەتگوت گورگێکی تووڕەیە.

"دەرگا بکەوە... بیکەوە... پێت دەڵێم ئەوە یاخیبوونە ها."

مزەفەر بە دەنگێکی کز و کپەوە گوتی:"تەمیر ئاغا دەرگاکە هەڵگرە."

دیسان دەنگێك نەهات. فەرماندە نەڕاندی:"دەرگا بشکێنن."

دوو جەندەرمە پاڵیان بە دەرگاکەوە نا و دەرگا کرایەوە. پیاوێکی تەمەن دەوری هەشتا ساڵان لە ژوورەوە دانیشتبوو. وەك هیچ شتێك نەقەومابێ، سەیری دەکردن. دانیشتبوو و ئانیشکی دابووە سەر جەواڵێك. ژنەکەشی وەك خۆی بەساڵاچووبوو. ئەویش لە تەنیشت کوانووە سارد و خامۆشەکە کۆمابۆوە و هەر دەتگوت هیچ نەبووە. دانیشتبوو و سەیری ئەوانەی دەکرد کە دەرگای ماڵەکەیان شکاندبوو.

"تەمیر کوێرئۆغڵی."

متەقی نەکرد.

"ناوت تەمیر کوێرئۆغڵییە؟"

دەنگ لەبەردەوە هاتبا، لەو نەدەهات.

"ئەو ژنە ناوی چییە کوێخا؟"

"سەنەم کوێرئۆغڵی."

"تۆ ناوت سەنەم کوێرئۆغڵییە؟"

سەنەم کوێر ئۆغڵییش متەقی لێوە نەهات.

"سەنەم کوێرئۆغڵی، ئەنەم کوێرئۆغڵی، هەی خودا بتباتەوە. براژن، وەرە بزانە ئەوانە هیچ لەو کەسە دەچن وا بە شوێن مێردەکەتەوە بوو؟"

ژنە وەژوور کەوت. سەیری پیرە پیاوە سەرو ریش ئاڵۆز و شپرێوەکە و پیرەژنە رەقەڵە و لاوازەکەی کرد و گوتی:"نا ئەوانە هیچیان لەو ناچن."

"ئەوانە کەڕن، لاڵن، چیین مزەفەر بەگ؟ تۆخوا بڵێ."

مزەفەر بزەیەکی هاتێ و گوتی:"نە کەڕن و نە لاڵیش. بەڵام قسە ناکەن."

"هەی ی ی ی... قسە ناکەن ها؟"

"بەڵێ، قسە ناکەن."

کوێخا:"وردوردیش بیانئەنجنی، گوشتیان بە گاز لێ بپچڕی، هەر قسە ناکەن."

"سەیرە، سەیرە، کەواتە دەروێش بەگ پاڵی بە هێزێکی مەزنەوە داوە؟"

چوونە دووەم ماڵ. ئەو ماڵەش دەرگای داخرابوو.

"ویسلە قوم گزەر. ویسلە قوم گزەر."

دەنگ نەهات. فەرماندە بە شڵەژاوی فەرمانی دا:"دەرگاکە بشکێنن."

جەندەرمە پاڵیان بە دەرگاوە نا. دەرگا بە تەق و هۆڕ کراوە. لە پێشدا سێ منداڵی وردیان دیت. کە دەرگاکە کرایەوە، تیشکی هەتاو چاوی بەشەوارە خستن. خێراخێرا چاویان دەترووکاند. کابرایەکی رەش ئەسمەریش، کە تەمەنی چل ساڵانە دیار بوو، سەری بەردابۆوە و وا کپ و بێدەنگ بوو، دەتگوت پشووی دەرنایە. چاوی ژنە هێندەی سێ چاو دەبوون. دەتگوت لە ترسان چاوی وا زەق بوونەتەوە.

" ویسلە قوم گزەر، ژنەکەشی حوسنا قوم گزەر، کوڕەکانیشی عەلی قوم گزەر، حوسێن قوم گزەر، عیسمەت قوم گزەر، کەمال قوم گزەر، فەوزییە قوم گزەر، عەدنان قوم گزەر..."

لە مرۆڤ نا، هەر لە بەرد دەچوون. تەنانەت گوێت لە دەنگی هەناسەشیان نەدەبوو. ئەوانە بنیادەم نا، پەیکەرە بوون. فەرماندە نەڕاندی:" ویسلە قوم گزەر، ویسلە قوم گزەر."

تەنانەت تووکیشی نەدەبزووت.

"ئەوانە قسە ناکەن. تف، هەی خودا پاکتان بکاتەوە. خوشکێ بڕوانە بزانە ئەوانە لەو کابرایە دەچوون وا بەشوێن مێردەکەتەوە بوو؟"

ژنە:"نەخێر، ئەوانە نین."

فەرماندە وردە وردە تووڕەتر دەبوو و دەهری دەبوو.

"عوسمان دۆلك دەدە، رەحمی دۆلك دەدە، تانر دۆلك دەدە، چاکر دۆلك دەدە... دەرگا بکەنەوە ئەگینا دەیشکێنین. دەرگاکە هەڵگرن... بیشکێنن."

جەندەرمە پاڵیان بە دەرگاوە نا.

هەمووان لە ژووریّ بوون. هەر هەمووشیان شڕ و شپڕێو و رووت و قووت. منداڵ لە شەرمان لەشی رووتی خۆیان دادەپۆشی. ئەو ماڵە هەموو رووت و قووت بوون.

"دۆلك دەدە... دۆلك دەدە..."

ئەو ماڵەش هەموو چاویان لە عەرزی بڕیبوو. وەك گوناهباران.

"سەیریان بکە خوشکێ."

ژنە سەیری کردن. چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك و بە دەنگێکی کپ و لەرزۆکەوە گوتی:"

"کەس لەو ماڵە لەو کابرا ناچێ."

کەس دەرگای لێ نەکردنەوە. هەموو دەرگاکانیان شکاند و کەس متەقی لێوە نەها.

ئێوارە داهات. هێشتا زۆر ماڵ مابوون بیپشکنن. جەندەرمە ئەوەندەیان دەرگا شکاندبوون، شان و قۆڵیان گیرابوو و دەستیان خوێناوی ببوو. تووڕەیی ئاگری لە گیانی فەرمانده بەردەدا و خەریك بوو شێتی بکا. نەیدەزانی چ بکا. سەری لێ شێوابوو.

# ١١٨

کەس لە ئاواییدا نەمابوو نەیزانیبێ. ئاوایی ئاوایە. هیچ شتێك بە شاراوەیی نامێنێتەوە و ئاخری ڕۆژێك پەردەی هەر ئاشكرا دەبێ. نە نهێنیی دزییەك، نە كوشتنێك، نە هیچ شتێكی دیكەش، هیچ شتێك بە شاراوەیی نامێنێتەوە. ئەگەر ڕووداوێك، تاكێك بەنهێنی مایەوە، ئەوە هیچ پەیوەندییەكی بەو ئاواییەوە نەبووە و لە دەرەوەی ژیانی باوی ئاوایی بووە و لە جێیەكی دیكەوە هاتووە، لە پەیوەندیی بە شوێنی دیكەوە هەبووە.

كوژرانی حاجی بە دەستی یوسف و بردنەوەی تەرمەكەی بە ڕاكێش ڕاكێش هەتا شارۆچكە، لەسەر زار و زمانان بوو. تەنانەت لە سەر زاری منداڵانیش. گەلێك ئەفسانەیان سەبارەت بە مەرگی حاجی هەڵبەستبوو.

"بەرەبەری بەیانی بووە. یوسف لە نێوەڕاستی باخچەكە لە شیرین خەودا بووە. حاجییە شێتە كە بەوێدا تێدەپەڕێ دەبینێ ئەوە مێرمنداڵێك تازە خەتی لێ داوە، لەوێ خەوتووە. لێی دەچێتە پێشێ و پێی دەڵێ، وەرە براڵە، وەرە با بڕۆین بۆ ماڵی من. لەوێ بنوو. لێرە سەرمات دەبێ. پێی دەڵێ، توخوا بەو گەنجییەوە تۆ حەیف نی؟ دیارە غەریبیشی... یوسف كە گوێی لەو قسانە دەبێ، دەڵێ، من ناتوانم پیاو بكوژم. مانگێك، دوو مانگ بە شوێنییەوە دەبێ و هەر دڵی نایە بیكوژێ. دوایی شەوێك كەس نازانێ چۆناوچۆن دەبێ..."

"یوسف پیلی حاجی دەگرێ و پێی دەڵێ وەرە با بچینە ئەو چیایە. حاجییش دەترسێ و وەك بەرخێك وەدووی دەكەوێ. یوسف پێی دەڵێ، دەبێ بتكوژم براڵە. ئەتۆ پیاوێكی باشی، پیاوێكی بێ فرت و فێڵ و سادەی، وەك برای خۆم خۆشم دەوێی، بەڵام ناچارم دەبێ بتكوژم. ئەگەر تۆ نەمری، بەگ قۆڵ هەڵناماڵێ و گوڵعوزارم بۆ ناخوازێ. ئەگەر تۆ نەمری بەگ زەوی و زارم ناداتێ. ئەگەر تۆ نەمری براڵە، كەس من بە بنیادەم دانانێ... حاجی گوتبووی، دەستم لێ هەڵگرە. لێم گەڕێ با بڕۆم بۆ وڵاتێكی دوور. بچمە شوێنێك هیچ كەس نەمناسێ و

هەمووان بڵێن حاجی مردووە. لێم گەڕێ با رابکەم بۆ ئەو جەنگەڵە و کەس بە سەر و سۆراغم نەزانێ. با وا بزر بم هەمووان بڵێن حاجی مردووە. بەرۆکم بەردە براله، لەکۆڵم بەوە با لێرەوە ببمە باڵندەیەك و لە شەقەی باڵ بدەم و بفڕم و کەس چاوی پێم نەکەوێتەوە و لەبیرم بکەن. لێگەڕێ با ببمە تۆز و ناو و نیشانم نەمێنێ برای ئازیزم. کراسەکەم بەرە و لە خوێنی مەڕێکی هەڵکێشە و بیبە بۆ دەروێش و پێی بڵێ، حاجی حەیای تۆی برد. جا هەر کەس سووکایەتی بەتۆ بکا، ئەوەیە ئاخری و ئاقیبەتەکەی. ئەوەش کراسە خوێناوییەکەی حاجی... ها بیخە بەردەمی سەگەل... لە گیانی شیرینم خۆش بە براله.

یوسف پێی دەڵێ، من ناتوانم متمانە بەتۆ بکەم حاجی. ئەتۆ پیاوێك نی لەسەر قەول و بەڵێنی خۆت بی. ئەتۆ بنیادەمێکی داماوی و دەبێ بتکوژم. حاجی دەست دەکاتە گریان و ئاخرییەکەشی پەلاماری یوسف دەدا و دەیەوێ دەمانچەکەی لێ وەرگرێ و بیکوژێ. بەڵام قەوەی پێی ناشکێ و یوسف دەیگرێ و لە عەرزی دەدا... یوسف بە دڵیشی دا دێ، بچێتەوە لای ئاغاکەی و پێی بڵێ، ئەوە حاجی وەك سەگ پەشیمانە و دەیەوێ بەپێی دابونەریتی ئۆغوز بێتە بەردەرگای ماڵەکەت و پێڵاوەکانت ماچ بکا و داوای لێبوردنت لێ بکا. دەروێش بەگیش کە پیاوێکی تا بڵێی سینگ فرەوانە... یوسف ئەژنۆی لەسەر سینگی حاجی دادەدا و دەڵێ، حاجییە شێتە، ئیتر کوشتنی تۆ لەسەرم واجب بوو. جا هەڵدەکێشێتە خەنجەر و سینگی هەڵدەدڕێ. حاجی چنگ لە گژ و گیا گیر دەکا و هەڵیدەکەنێ. یوسف هەزرا خەنجەریشی لە سەر دڵی دەدا، بەڵام حاجی وەك سەگ حەوت گیانی بووە و نامرێ. یوسفیش بەکۆڵی دادەدا و دەیبا و بە ئاوێی دا دەدا. ئاوەکە سوور هەڵدەگەڕێ.

...

"حاجی شێتە رۆژێکیان بەرۆکی یوسف دەگرێ و دەڵێ، ئەرێ کاك یوسف، ئەتۆ بۆچی وەك سێبەر وەشوێنم دەکەوی؟ شەو و رۆژ، وەخت و ناوەخت، وەك سێبەرەکەم لێم نابیتەوە. باشە پێت قەرزدارم؟ دەڵێ من تۆم زۆر خۆش دەوێ. یوسفیش دەڵێ، داوایەکم لێت هەبوو، بەڵام وازم لێ هێنا براله. ئیتر لەمەودوا وەشوێنت ناکەوم و ئەتۆش نامبینیتەوە. بڕۆ و خێرت وەڕێ بێ. دوای ئەوە حاجییە شێتە بە چەپۆکان لەسەری خۆی دەدا و بەرۆکی دەگرێ و رایدەوەشێنێ و دەڵێ، ئیلان و بیلان بەرت نادەم، هەتا پێم نەڵێی چیت لێم دەوێ. دەی داوا بکە، بزانم چیت دەوێ برای ئازیزم. یوسفیش جارێ لە ناڵ و جارێ لە بزمارێ دەدا و هەر خۆی لە باسەکە دەدزێتەوە و نایەوێ پێی بڵێ. حاجییە شێتەش هەر وا شێلگیر و سوور دەبێ و دەستی لێ

هەڵناگرێ و دەڵێ، هەر کەس گرفتێکی هەبێ، من پشتی بەرنادەم. ئەگەر گرێکوێرەیەك هەیە و بە پەنجەی من دەکرێتەوە، بۆ دەبێ دەستم بکشێنمەوە. تۆ هەر شتێکت بوێ، لەسەرمە بۆت جێبەجێ بکەم. دەڵێ حاجییە شێتە گیانی خۆی دەکا بە قوربانی برادەرێکی وەك تۆ. یوسف هەرچی دەکا و دەکرێنێ ناتوانێ حاجی لەکۆڵ خۆی بکاتەوە. ئاخرییەکەی پێی دەڵێ، براله سبەی شەوێ بە تەنیایی دێی بۆ ئەو گردەی رووبەڕوومان، سەر کانییەکە. لەوێ پێت دەڵێم چیم لێت دەوێ. حاجییش رێك لەو کاتەدا دەچێتە شوێنی دیاریکراو. بە یوسف دەڵێ، دەی بڵێ بزانم چیت دەویست هاوڕێ. یوسفیش لە وەڵامیدا دەڵێ من چارم نییە و دەبێ تۆ بکوژم هاوڕێ، خۆت ئامادە بکە.

حاجییش تووڕە دەبێ و چاوی لە ژێڵلا دێن و دەڵێ، ئاخر سەگی سەگباب، چۆن لە رووت هەڵدێ داوای گیانم بکە؟ ئیتر پەلاماری یوسف دەدا. یەکتر دەێنن و دەبەن و هەتا بەیانی و لە بەیانیشەوە تا نیوەڕۆیە لێك دەدەن و یەکتر دەگەوزێنن. ئاخری یوسف هەڵدەکێشێتە کێردەکەی و لە سینگی حاجیی رۆدەکا و حاجی دەمودەست دەمرێ. یوسفیش را دەکا. ماهیر قاباقچی ئۆغڵییش دەچێ بە حوکمەت دەڵێ یوسف حاجیی کوشتووە. خۆ دەروێش بەوەی نەزانیوە دەنا قاباقچی کەوڵ دەکا و کای لە پێستی دەئاخنێ..."

"یوسف دیار نییە، دەڵێن شەوێ رای کردووە و دەباز بووە."

"چیاکان یوسف بە دەستەوە نادەن..."

"بەو فەرماندە چڵمنە."

"دەروێش بەگ گوتوویەتی، تەلەگرافی لێداوە بۆ ئەنکەرە و گوتوویە، کوڕە ئەمن نەبم، چما تۆ دەتوانی حوکمەت بی؟ من نەبم کێ گوو بە کڵاوتان دەپێوێ؟ ئەوە فەرماندەکەت هاتووە و دەرگای ماڵی رەعیەتەکانی ئاوایی منی شکاندووە. شکاندنی دەرگا لە پیاوکوشتنێك خراپترە. ئەمن خوێنی دەرگاکانم لەتۆ دەوێتەوە. داوات لێ دەکەم هەر ئەمڕۆ ئەو فەرماندە دەرگا شکێنە چەك بکە و بانگی بکەوە بۆ ئەنکەرە، ئەگینا خۆت و حیزبەکەشت هەرچی دەیبینن لەچاوی خۆتانی دەبینن ها.

بەحوکمەتی گوتووە، براله، تۆ بەرتیل خۆری، پیاوەکانیشت خوێنمژن. نەکەی دەرگا بشکێنی، دەرگای دەرگاشکێنان دەشکێننەوە. یان ئەو فەرماندەیەت سزا دەدەی، یان دەرگات لە رێسمە دەبەنەوە... حوکمەتیش متەقی لێوە نەهاتووە شتێك بڵێ..."

دەروێش بەگ هەر لە بەیانییەوە تا شەوێ، ئەوسەروسەری ژوورەکەی دەکرد. قسەیەکی نەدەکرد و دەمی لە نان و ئاو نەدەدا. سەری دادەخست و دەچوو و دەگەڕاوە. بەپێی خەیاڵەکانی خێرا دەڕۆیشت و دەهاتەوە و لەسەر تەختەی بنی ژوورەکە زرمەی هەنگاوەکانی هەڵدەستا و دیسان هەنگاوی توندتر دەکرد... تۆفانی شێتی... ئەوەی بەسەری هاتبوو، خەریك بوو لەپێی بخا. چۆن، چۆن، چۆن؟... فەرماندەیەکی جەندەرمە دێ و دەرگای ئاوەدانییەك دەشکێنێ، چۆن شتی وا دەکا؟

دەروێش بەگ تەلەگراف دەکا بۆ ئەنکەرە، لە پێشدا بۆ سەرۆك وەزیر، دوایی بۆ وەزیری ناوخۆ و ئەوجار بۆ سەرۆکی حیزب لە ئەدەنە و بۆ هەموو هاوڕێ گەورە و بچووکە حیزبی و ناحیزبییەکانی لە ئەدەنە. نامەی بۆ نووسیون و باسی ئەو زوڵم و ناهەقییەی دەکات کە لێی کراوە. نەفیب هەر وا خەریکی شکاندن و لە ڕێسمەبردنی دەرگاکان بوو و نەیدەهێشت کەس لە ئاوەدانی بچێتە دەرێ.

بەڵام ئیزنی دابوو مزەفەر بۆ ناردنی تەلەگراف و نامەکان بچێتە شارۆچکە و بگەڕێتەوە. هەر ئەوەندە. ئاوەدانییەکە ببووە زیندان. جگە لە یوسف، ئەسلان ڕەشید، وەسمان دال بۆداقلی و زەینەلْ کین تۆتمازی کورشی تۆم یورك ئۆغلی و خالۆ سلێمان ئاغین قوشونیز"ـیش لە ئاوایی نەبوون. هەرکامەیان چوبوونە شوێنێك و هالۆ سلێمان مانگێك دەبوو مردبوو و کوێخا پیاوی دەروێش بەگ بوو. یوسفیشیان وەك خالۆ سلێمان بە مردوو لەقەڵەم دابوو. یوسفیش دوو مانگ لەمەوبەر مردبوو. بەڵام کوێخا پشتگوێی خستبوو و نەچوبوو لە دایرەی ناسنامە، هەویە و ناسنامەکەی بەتاڵ بکاتەوە. داوای لێبوردنی دەکرد و دەیگوت، هەر بەیانی دەچێ و لەوێ بە مردووی دەنووسێ.

کوێخا یوسفی بە مردوو لەقەڵەم دابوو و دوژمنەکەی، واتە فەرماندەی جەندەرمان دەرگاکانی شکاندبوو و هیچ سەرەداوێکی نەدۆزیبۆوە و بەو حاڵەشەوە دەروێش بەگ هەر نیگەران بوو و دەترسا.

کەس وەڵامی تەلەگراف و نامەکانی نەدابۆوە. مزەفەر هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارێ لە پۆستەخانە چاوەڕوێ بوو. ئەگەر هەواڵێکی پێ گەیشتبایە، هێور دەبۆوە.

فەرماندە تەلەفۆنی بۆ هەموو سەربازگەکان کردبوو و ئەمری کردبوو، ئەوانەی دیار نین، بیانگرن. تەلەگرافی بۆ شارۆچکەکانی دەوروبەریش ناردبوو. تەنانەت ئەدەنەشی ئاگادار

کردبۆوه. فەرماندە بڕوای بە قسەی کوێخا نەکردبوو و ناوی خاڵۆ سلێمان و یوسفیشی خستبووە ریزی ئەو کەسانەوە کە دەبوو بگیرێن.

کوێخا قاقا پێی پێدەکەنی. لەگەڵ دەروێش بەگ لە زۆر ئاوی ئاوایان دابوو. فەرماندە دەیتوانی خاڵۆ سلێمان لە گۆڕەکەی بێنێتە دەرێ و بیباتە پاسگا، بەڵام هەرگیز دەستی بە یوسف رانەدەگەیشت. ئەگەر فەرماندە داوای لێ کردبایە گۆڕی یوسفی نیشان بدا، دە گۆڕی یوسفی نیشان دەدا...

دەروێش بەگ چاوەڕێ بوو. ئەگەر زانیبای یوسف لە کوێیە، ئەگەر زانیبای چووەتە کوێ، ئەوەندە نیگەران و دڵ لە دوا نەدەبوو. دوای رۆیشتنەکەی یوسف پیاوی ناردبووە لای زۆنگاوەکە و رێگەکانی تۆرووس بەشکم بیدۆزنەوە. رایسپاردبوون دەسبەجێ هەواڵی یوسفی، مردوو یان زیندوو بۆ بێنن و هەتا سەر و سۆراغێکی نەکەن، نەگەڕێنەوە. کە بیری گیرانی یوسفی دەکەوتە مێکشییەوە، وای سەر لێ دەشێوا وەخت بوو شێت بێ. بێت و گیرابا، دۆست و دۆژمنی پێ خۆش دەبوون... جاری جاران، ئەو دەمەی قسەی دەڕۆیشت... هەر تەلەگرافێکی دەنارد، هەزار تەلەگرافیشی ناردبا، برادەرەکانی دەمودەست وەڵامیان دەداوە. ئێستا کەس متەقی لەبەر نەدەهات. ئەو دنیایە چیی لێ هاتبوو؟ ئەو دنیایە هەر لە رەگەوە رزیبوو.. ئەو هەمووە ساڵە، لە دەور و پشتت بوون و ئێستا کە تووشی کێشە و گێچەڵێك بووی، هەمووان خۆت لێ لا دەدەن. ئای، برادەری دوو روو، ئاخری رۆژێك چاومان بە چاوی یەکتری دەکەوێتەوە. هەی خەڵکی بۆگەن...

وای دەگوت و فرمێسکی هەڵدەوەراند. فرمێسکی گەرم و بەتین. دەروێش بەگیش بەو گریانە سەرخۆش دەبوو. جا لای دەروێش بەگ و لە نەریتی هەر سێ ئۆغوزدا قەت نەبووە پیاو بگرین و دەروێش بەگیش یەکەم جار بوو دەگریا. یەکەم جار بوو، چێژی گریانی تام دەکرد. چێژێکی سەرخۆشکەر. لە ژیانی دا ئەوە یەکەم جاری بوو ئاوا هەستی بە تەنیایی و داماوی دەکرد.

دەبوو کارێك بۆ یوسف بکا و فریای بکەوێ. ئەو گرێکوێرەیە دەبێ بکرێتەوە. دوای دۆزینەوەی یوسف و شاردنەوەی لە شوێنێکی باوەڕپێکراو، دەبێ بچمە ئەنکەرە و بەرۆکی سەرۆك وەزیر بگرم. باشە ئەوە ئێوە بوونە کۆمۆنیست، کە ئاوا سووکایەتی بە ئێمەمانان دەکەن و فەرماندەیەك رادەسپێرن و سەرلەبەر دەرگای ئاوایی دەیشکێنن؟ هەموو کەسێك لە جلوبەرگی خۆیدا پیاوێکە. دەبێ شتی وا بەو دەسەڵاتدارانە بڵێ ماست بێ و لە پێش سەگی دابنێی... ئەو فەرماندانە لە تەویلە بکا. شکاندنی دەرگای ئاوایییەکی گەورە گاڵتە نییە.

شێتی و کەرێتییە. ئێستا هەموو چوکووراوا و تورکیا ئەو دەرگا شکاندنەیان بیستووەتەوە. دەبێ ئەو فەرماندەیە تەمبێ بکرێ. خۆ لەرێی قانوونیشەوە نەتوانێ تەمبێی بکا، دەبێ بیکوژێ و روو بکاتە چیا. دەبێ لەسەر ئەو خەڵکە لێقەوماوە بێتە جواب. ئەو خەڵکە لە هەزار برا باشترن. دەبێ پشتیان بگری و هەتا دوا هەناسە لەبەرامبەر ئەو حکوومەتە رزیوەدا، لەسەر وەرگرتنەوەی مافەکانیان سوور بی.

رۆژێکی نوێ بۆ دەروێش بەگ دەستی پێ دەکرد. دەبوو کارێك بکا. دەبوو بیسەلمێنێ بۆ هەموو ئەوانەی چەندی چەند ساڵە بە دۆستی دانابوون، بۆیان روون بکاتەوە کە پووتێك چەند کیلۆیە.

کە تووشی گرفتێك دەبوو، هەموو پتشیان تێ دەکرد.

باشە یانی تاقە دۆستێکیشی نەبووە؟ ئەوانە بازرگانن. ئەوانە، هەر نازانن دۆستایەتی و خودا و ئیمان چییە. ئەوان جگە لە پارە و زەوی و زار دڵیان بە هیچ شتێکەوە نییە.

خۆ زەوی و زارەکەشیان خۆش ناوێ، بەڵکو لەبەر ئەوە حەزیان لێیەتی چونکە پارەی لێ دەکەوێتەوە. بۆنی خاك و گەرمای دەستی بنیادەمەکان شێتیان ناکا. ئەوانە هەر بە بۆنی پارە شێت دەبن. ئەوانە دەبێ دەرسێك دادرێن. دەرسی مرۆڤایەتی. بەڵام چۆن؟ ئەوانە چما دەزانن مرۆڤایەتی چییە؟ هەر نینۆکێکی یۆسف هەزاری وەك ئەوانەی بەقوربان بێ. ئەوانە شیاوی ئەوە نین بەر لەعنەتی خوداش بکەون. ئەوە چ سیستەم و قانوونێکە؟ وادال ئۆغڵی چیی گوتووە؟ گوتوویەتی:"خراپەکارێك هەزار پیاوچاك خراپ دەکا، ژیان ئیتر تاڵ و دژوار بووە..."

باشە ئەوە ئەو خەڵکە، ئەو خەڵکەی ئەوەندە بەشەرەف و بەهێزە، وا بوو بە کۆیلەی ئەو بنیادەمە سووك و چرووکانە؟ ئەو سیستەمە کەموکورتییەکی هەیە، شتێك لەجێی خۆیدا نییە...

لە نەکاو عەلیی عەریزەنووسی وەبیر هاتەوە. بیرێکی لێ کردەوە و گوتی، ئەو دەتوانێ دەستی بگرێ. دەتوانێ هەندێ شت بڵێ. ئەوجار بیری کردەوە، کە دەبێ لەکۆڵ ئەو کوڕە ببنەوە. نەمانتوانی هیچ یارمەتییەکی بدەین و ئەو لێقەوماوە لە زینداندا مایەوە... هەمووشی هەر ترس، ترسێکی نامۆ و نادیار... یانی ئەو بازرگانانە ئەوەندە بەهێزن؟ یەك بە یەك هێنانییە بەرچاوی و سەیری دەموفلچ و نێوچاوانی دەکردن و پێکەنینی دەهات. ئەوانە هەر هیچ نین، تەنانەت پووش و پەڵاشێکیش... ئەی باشە بۆچی ئەو دەمەی عەلی لە زیندان بوو، لە ترسی ئەوان نەیوێرا یارمەتییەکی بدا؟

چار چییە؟ دوای دۆزینەوەی یوسف دەبێ بچێتە ئەنکەرە و چاوی بە سەرۆك وەزیر بکەوێ و پەتەی ئەو بازرگانانە بخاتە سەر ئاوێ. دەبێ پێی بگوترێ پشتی خەڵك بگرێ و لەگەڵیان یەك بێ.... بەڵام سەرۆك وەزیریش هەر سەگێکە وەك ئەوان. هەموو دەڵێی لە زاری یەك تفیون. نابێ لەخۆڕاوە خۆی بشکێنێ. سواربوون عەیبێکە و دابەزین عەیبێکی دی. چما ئەگەر سەرۆك وەزیری فەرقێکی لەگەڵ ماهیر هەبوایە، دەیتوانی لەو کۆمەڵگایەدا کە بازرگانەکان قوڵی خەڵك دەبڕن و خوێنیان دەمژن، ئەو ببێتە سەرۆك وەزیر؟

چوونی ئەنکەرەش بەخۆڕاییە و هیچی لێ شین نابێتەوە.

## ١١٩

بۆنی زۆنگاوەکە، یوسفی خەوالّوو و گێژ و وێژ و کاس و بێهێز دەکرد. دەتگوت لە نێوان خەو و بەخەبەری دایە. لەخەودابوو یان بەخەبەر؟ نەیدەزانی. نەشیدەتوانی بزانیّ. باشە ئەوە خەیالّ بوو هەلّیگرتبوو یان خەونی دەدی؟ رۆژ بوو یان شەو؟ ئەی کوا هەتاو؟ مانگ لەکوێوە ئاوا دەبیّ؟ رۆژ دەبێتەوە، یان بەیان ئەنگوتووە؟ ئەو داوە تیشکەی دیّ... ئەوە چییە وا نالّ و کلکی ئەسپان دەبریسکێنێتەوە؟

دەلّێن ئەسپی عارەبی لە براش باشترە. دەلّێن ئەسپێکی عارەبیی باش، لە بنیادەمیش زیرەکترە. دەلّێن وەك برا وایە، دەلّێن جوانە.

لە دەشتێکی دوورەدەستدا ئەسپێك بەتەنیّ دەسوورێتەوە. ئەسپێکی شیّ بە زین و هەوسارەوە. ئەسپێکی وا جاریّ سەری بەردەداتەوە و بێجوولّە رادەوەستیّ و جاریّ هەلّدەستێتە سەر پاشووان و یالّ و کلکی پەرێشان دەکا و بە دەشتەکەدا غار دەدا. یالّ و کلکی وەك زیو دەدرەوشێنەوە. ئەسپی شیّ، چەند رۆژێکە دیسان وەك هەلّۆیەکی گەورە لە رەوەزە سوورباوەکاندا راوەستاوە... یالّ و بژی بریسکەدار و چاوەکانی وەك هەتاوی بەرەبەیان و ئاوی رووبار و نیگای خەمباری ئاسکەکان زولاّلّن.

قەلاّیەك بەسەر رەوەزەکانەوە و بەندییەك لە قەلاّکەدا. ناوی بەیبۆرکە. گەنجێکی تازە پێگەیشتوو. حەوت سالّە بەند کراوە. ئەسپەکەشی حەوت سالّی رەبەقە چاوەڕێی سوارەکەیەتی. بە هەوسار و لغاو و زینەوە...

بەیبۆرك خەفەت دەخوا و لەدلّی خۆیدا دەلّیّ:"ئای بێکەس خۆم لەم دنیایە. لەو دنیایە کەس نازانیّ بەدەردی من. هاوڕێیانم، برا گیانی گیانییەکان یەك لە دوای یەك پشتیان تیّ کردم. کەس لەسەر و سۆراغم ناپرسیّ. باشە یان ئەسپە شیّش بیرمان ناکا و لە سەر و سۆراغم ناپرسیّ؟ لەو ماوەیەدا تاقە جارێکیش نەهات کلك و یالّی پەخشان و پەرێشان بکا و بە لارولەنجەوە بە بەردەرکی

زیندانێدا رابرێ. قەول و قەرارمان ئاوا بوو، دۆستایەتییەکەمان ئاوابوو، گفت و وەفامان ئاوا بوو، ئەسپە شێ؟ وابوو؟ بەیبۆرك حەوت ساڵی رەبەق، لەبەر بێوەفاییەکەی ئەسپە شێ، لە زیندانێ زووخاوی چێشت و ژەهری ماری نۆشی و بە دەم ژەهرەوە نوست.

رۆژێك لە رۆژان کچی پادشا دڵی چووە سەر بەیبۆرك و کورتی ببڕینەوە، ئەو کچۆڵەیە، بەیبۆرکی لە زیندانێ بەردا. هەتا پشووت لەبەردا بێ، هیواشت هەر لەسەر دایە. ئەسپە شێ هەر وا سووك و سانا بەڵێنی خۆی ناشکێنێ. لەوانەیە تووشی کێشەیەك بووبێ. لەوانەیە بەڵایەکی بەسەر هاتبێ. بەیبۆرك لەبەر دەرکی بەندیخانە فیکەیەك لێ دەدا و تاوێك دواتر ئەسپە شێ وەك بریسکە خۆی دەگەیەنێتە دەرکی زیندان. بەیبۆرك دەست بەسەر سەروچاوی ئەسپەکەیدا دێنێ. چاوەکانی ماچ دەکا، بەڵام خەفەت و پەژارەیەك سێبەری خستووەتە سەر دڵ و چاوی. خۆ ئەسپە شێ زمانی نییە تا بۆی بگێڕێتەوە چیی بەسەر هاتووە و چیی لێ قەوماوە... هەر دوو دڵدارەکە سواری ئەسپەکە دەبن و ئەسپ وەك بای شەماڵ باڵ دەگرێ. شیو و دۆڵ و گرد و چیایان دەبڕێ و لە داوێنێ چیایەك رادەوەستێ. بەیبۆرك بۆ حەسانەوەی پشتی ئەسپە شێ، زینەکەی لێ دادەنێ و سەیر دەکا، چەرمی پشتی ئەسپەکە، بە زینەکەوە نووساوە و لەگەڵ زینەکە هەڵدەستێ. کاتێ حەوت ساڵی رەبەق زین بە پشتی ئەسپێکەوە بێ، هەر وای لێ دێ. ئەسپە شێ خۆی نەداوەتە دەست بنیادەمان. ئەگەر بەیبۆرك نەیتوانیبا لە زیندانێ بێتە دەرێ و تا دنیا دنیایە لە بەندیخانەدا بوایە، ئەسپە شێش هەر چاوەڕێ دەبوو. قەول و بەڵێنەکەیان وایە.

رەوەزە سووورباوەکانی ئاناوەرزا... حەزیای سەوز لە رەوەزی سووورباودا. حەزیا بەرەو ئاسمان هەڵدەکێشرێ. هەورێکی سەوز، ئاسمانەکە دادەپۆشێ.

لە رەوەزە سووورباوەکانی ئاناوەرزاوە، ئەسپێکی سووربەش، بە لینگدان روو دەکەنە دەشتەکە. ئەسپی سووربەش و کەسك. هەر ئەسپەی قەتارێك دوورِنای بەسەرەوە. ئەسپە کەسکەکان کلکیان تێك ئاڵاوە. هەزاران ئەسپ بە ناڵی بریسکەدارەوە بەسەر زۆنگاوەکەدا بەرەو دەشتەکەی چوکووراوا باڵیان گرتووە.

قەتاری دوورِنا بەژوور سەریانەوە... ئاسمان لەبەر دوورِنا دیار نییە و زەوی پڕ لە ئەسپی کەسك... دوورِنا و ئەسپ بەرەو چیاکانی تۆرووس بەرێوەن. دوورِنا، ئەسپەکان... ئاسمان و زەوی هەڵڵا و هەنگەمەو و قاووقیژ و شڵەژاو. ئاسمان وەك دوورِنا، زەوی وەك ئەسپ... دوورِنا،

ئەسپ... بریسکە و بریقەیەك بەسەر عەرزەوە. لەگەڵ تیریێژی خۆردا هەزاران ناڵ دەبریسکێنەوە. هەموو چوکووراوا، ڕەوەزەکانی تۆرووس نوقمی بریسکە و بریقەی ناڵی ئەسپ.

ئەوجار باڵ، باڵ، باڵ... ناڵ، ناڵ، ناڵ... لە ئاسمانەوە پەڕ و پۆ دادەبارێن. پەڕ هەموو سپی وەك لۆکە. دەشتەکە لەپڕێکا لەبەر پەڕ و پۆی سپی دیار نامێنێ. بایەك هەڵدەکا و پەڕەکان بڵاو دەکاتەوە و وەك گەواڵە هەورێك رایاندەدا... دوورِنا، ئەسپ...

ئەوجار ئەسپێك دێ و لەبەردەمی رادەوەستێ. ئەو ئەسپە جارێ لە دەریا دەپەڕێتەوە و جارێ کەژ و چیا دەبڕێ. لە پەڕینەوەی دەریادا یوسف لەسەر ملی دەخزێ و بەردەبێتەوە نێو گۆمی دەریا. ئەسپەکە لمبۆزی لە ئاوی دەریا رۆدەکا و یوسف بە ددان هەڵدەگرێ و دەیهێنێتەوە دەرێ و دەیخاتە سەر پشتی و تا ئەوپەڕی چیای دەبا.

یوسف بە ترسەوە چاو هەڵدێنێ. لەپڕ تیشکێك چاوی بەشەوارە دەها. یوسف دەسبەجێ چاوی دەقووچێنێ. دیسان چاو هەڵدێنێتەوە. چاوهەڵێنانەوە و داخستنەوەی وێکڕایە.

تا چاو هەتەر دەکا، وڵات دەسووڕێ. چوکووراوا دەسووڕێ. ڕەوەزە مۆر و سوورەکەی ئاناوەرزا دەسووڕێ. زۆنگاوەکەی ئاقچاساز دەسووڕێ. دەسووڕێ... بەهەزاران ئەسپ، سەدان هەزار ناڵی بریسکەدار دەسووڕێتەوە. قەتار قەتا دوورِنا دەسووڕێنەوە و ئەو قەتارە رێکوپێکانە تێك دەچرژێن.

بۆنی زۆنگاو، بۆنی قوڕە ڕەشە، بۆنی گۆڵاو، بۆگەنێك وەختە مێشك بەرێ.

هەزاران ژەنگەسوورەی هارووژاو. یوسف خۆی لە پەنا پۆلە قامیشێك رۆدەکا و خۆی گرمۆڵە دەکا. لە سێبەرە تارەکەدا چاو هەڵدێنێ. تیشکێکی تیژ لە دوورەوە وەك لافاو هەڵدەستێ و چاوی بە شەوارە دەها. دەسبەجێ چاوی دەقووچێنێتەوە. ئەژنۆی بە سینگییەوە نووساندووە و خۆی گرمۆڵە کردووە. ترس و لەرزێك هەموو گیانی داگرتووە. لە هەموو شتێك دەترسێ. لە گڤەی با، لە باڵندەی فڕیو، لە ژەنگەسوورەی هارووژاو، رووناکایی و لە تاریکی... لە خۆی و لە دەست و پێ و تووك و چاو وگوێ و لووتی خۆی و لە سێبەرەکان دەترسێ. نە دڵی زۆر توند لێ دەدا و نە کوڵی دڵی لرفە دەکا. وەك ئاوێکی مەند، قورس و لەسەرخۆ، ترسەکەی قورس، وەك قورقوشمێکی تواوە لە ناخیدا پۆنگی خواردووەتەوە. ئەوی بە تەڕایی و قوژبن و تاریکایی قامیشەکانەوە نووساندووە.

لە تەرکی بنی گۆمێکی زۆر قووڵدا. یوسف وەك کەوتبێتە بنی گۆمەکەوە، لە قووڵایی ئاوەکەوە بەرەو خوارتر بەرەو دەریای بێ بن رادەکێشرێ. خۆی بە بنی قامیشەکەوە نووساندووە بۆ

ئەوەی نەکێشرێ. ئاوەکە دەبیا. ئاوێکی وەك قورقوشم قورس. تاریك. ئەگەر چاو هەڵێنێ و سەیرێکی سەرەوە، سەر ئاوەکە بکا، تیشکێك، وەك لافاوی هەتاو چاوی بەشەوارە دەها. لە نێوەڕاست، لە ئاوەکە و روواکاییەکەیدا رووت و قووت دەمێنێتەوە. توند خۆی بە بنی قامیشەکەوە نووساندووە و ئاوەکە بەسەریدا تێدەپەڕێ. رووبارێکی هێندی دەریایەك بەسەریدا دەکشێ.

سێبەری خەست و قورسی دار هەنجیر... بۆن و بەرامەی هەنجیر. بۆنەکە لە پێنج سەد مەترییەوە بۆت دێ... یوسف خۆی گرمۆڵە دەکا و کرووشمە دەبێ.

دیسان ئەسپەکان بەژوور سەرییەوە. دەنگی زرمەی ناڵەکانیان دەشتی پڕ کردووە. دایکی چیرۆکێکی لە سەر ئەسپان بۆ دەگێڕاوە. یوسف خۆی کرووشمە دەکا. ئەگەر ئەسپێکی خۆشبەزی هەبوا، ئەگەر ئەسپێکی باڵداری هەبوا. لێی سوار دەبوو و دەچووە نێوەڕاستی سیواس. لەوێوە بەرەو دەریاچەی وان. خاڵوانی لە دەریاچەی وان... وای ئامێز لە قامیشەکە وەراندوە، قرچەی لێ دێنێ. دەستی دێشێن. دەڵێی کێردێك دەستی دەبڕێ. دڵی تێکەڵ دێ. لەو کاتەوە خوێنی خەنجەرەکەی لستووەتەوە، تووشی هەر ناخۆشی و تاڵییەك دێ، دڵی تێکەڵ دێ.

ئەگەر ئەسپێکی هەبوایە، لێی سوار دەبوو دەڕۆیشت. ئەسپێکی خۆشبەزی چاو درشت، ناڵ بریسکەدار و بێ لغاو و بێ زین و رووت... ئێرە ئۆرفە. هەسێڵێك لە ئۆرفە. ئەوانەی جوان وەبیر دێنەوە. دایکی بۆی دەگێڕاوە. ماسییەکان لە هەسێڵەکەدا. ماسییەکان لە ئاوی هەسێڵەکە پترن. قوڵتەی دێ. سەرئاوەکە پڕە لە ماسی. پشتیان بە پشتی یەکەوە ناوە و سواری یەك بوون. ماسییەکان تەنانەت جێیان نییە تێیدا بجوولێن و بگەڕێن. کەس ناتوانێ ماسیی ئەو هەسێڵە بگرێ. بیانگرێ و بیانخوا. هەر کەس ماسیی ئێرە بگرێ و بیخوا، بەڵای وای لێ دەبارێ نەبێتەوە. ئیفلیج دەبێ. دەبێتە تۆزی بانان و ماڵی وێران دەبێ و مانگێك نابا دەمرێ. ئەو ماسییانە متفەڕکن. ماسیی حەزرەتی برایمن. دایکی، ئەودەمەی گەرمێن و کوێستانیان دەکرد و هێشتا مندالٚ بووە، ئەو ماسییانەی دیبوو. چاوی ئەو ماسییانە سوور بوون وەك ئاگر. دەستی لە هەسێڵەکە رۆکردبوو، ماسی دەستیان لستبۆوە.

خاکەکە قرچەی دێ. لە رەوەزەکانی ئاناوەرزاوە لوورەیەکی سامناك دێ. زۆنگاوەکە هەڵدەقولێ. پڵتەی دێ. لە ئاسمانەوە ئاگربارانە. هەموو گیانی یوسف لە ئاگری تادا هەڵدەچۆقێ. بڵێسەیەك بەرەو لای دەکشێ. ناتوانێ چاو هەڵێنێ. لەپڕ لە قامیشەکە دەبێتەوە و هەڵدەستێ و دەردەپەڕێ. دنیایەکی وەك خەیاڵ لەبەر چاوی. دار و ئاو و رەوەز و ئەسپ و باڵندە... هەموو شتێك لە خەرمانەی خەیاڵێکدا دەخولێتەوە. لە قامیشەڵانەکە و گژ و

گیایەکە دێتە دەرێ و لە دەشتەکەدا، لە پاناوکەکەدا، لە نێو کێڵگەکاندا کاس و وڕ سەری لێ دەشێوێ. لە دوورەوە خانووی گوندەکە دیارن. بۆنی نانی گەرمەتەندووری بۆ دێ. دووکەڵێك لە کولانکەی ماڵێکەوە بەرەو ئاسمان کۆڵەکە دەکا.

یوسف خۆی بەعەرزی دادەدا و تاوێك لەوێ دەمێنێتەوە و چاوەڕوان دەبێ.

لە سەر شارە مێرووڵەیەك کەوتووە. مێرووڵە لە چاوترووکانێکدا دەستیان داپۆشیوە... مێرووڵەی دەستەمو و بێ هەڵپەی وەك خۆی. هەر کام دەنکە جۆیەك بە دەمەوە. جۆ هەر یەکەی دوو هێندەی خۆیان.

چیی دەبێ با ببێ چش. دەست لەسەر عەرزەکە دادەدا و هەڵدەستێتە سەر پێ. چیی دەبێ با ببێ. دەچێتە ئەو گوندە. لەوێ نانی گەرمی لێیە. دایکی کەرەی بۆ لە توێی نانێك دەنێ. کەرە، دەتوێتەوە و دەچۆڕێتەوە. بەڵام تینی ڕێگاڕۆیشتنی نییە. بەسپایی بەرەو گوندەکە هەنگاو دەنێ. دەڕوا و چاو لەگوندەکە هەڵناگرێ... چاوی لە چاوی گورگێکی برسی دەچن.

جەندەرمە لە گوندەکەن. هەر بگاتە ئەوێ دەیگرن و دەیبەنە زیندان و دواتریش لە سێدارەی دەدەن. بنیادەم کە بە پەتەوەی دەکەن، زمانی گەزێك دەردەکێشێ... مردوویەکی دێتە بەر چاوی زمانی دەرکێشاوە و روخساری زەرد زەرد هەڵگەڕاوە و وشك هەڵاتووە. بە پەتەکەوە و پەتیش بە دارێکەوە، بە دارێکی بێگەڵاو رووتەوە، ملی خوار بووەتەوە و سەری بەلایەکدا کەوتووە... ئەژنۆی سڕ بوون.

چیی نەمابوو بکەوێ. ددانی چیڕ کردنەوە و هەر لەوێ دانیشت.

جەندەرمە چووزانن یوسف کێیە؟ هەزار گەنجی وەك یوسف هەن. جەندەرمە، خۆ تا هەتایە لە ئاوایی کێشك ناکێشن... کێشکیش بکێشن، ئەوە کێشاویانە. چما بنیادەم ناتوانێ جۆرێك بچێتە ئاوایی نەهێڵێ کەس پێی بزانێ؟

دیسان هەستا و کەتە رێ. چاوی لە ئاوایی هەڵنەدەگرت. تەنانەت سەیری بەرپێشی نەدەکرد. چاوی لە پێش خۆیەوە بڕیبوو، لە گوندەکە. بێت و پێی لە چڵە گیایەك گیرابا، سەرەنگرێ دەبوو. ئاوا بەرەو پێشەوە دەڕۆیشت.

بەبێ ئەوەی گوێ بداتە برسێتییەکەی، رۆیشت هەتا گەیشتە دەم ئاوایی. گەیشتە بێستانەکەی وەلی جومبول. دەنگی ئەلیفە رەش لە گوندەوە دەهات. دیسان لە منداڵەکانی هەڵدەدا. وەك راوەستابوو، دەست و پێی دەلەرزین.

دەنگی فیکەیەك هات. فیکەیەکی دیکە... دەنگی فیکەیەکی وا بەرز لە گوندەوە نەدەهات. بێ و نەبێ جەندەرمە بوون فیکەیان لێ دەدا... تینی دەست و پێی نەما و ئەژنۆی نووشتانەوە و دانیشت. دەنگی فیکەفیکەکە پتر بوو و وەك لوورەیەکی لێ هات. یوسف سەری خۆی گرت. هەر بەراستی ئەوانە دەنگی فیکە بوون؟ وردە وردە لەو جێیەی لێی بوو بەرەو خەرەندەکە خزی. خزی و چووە نێو ئاوەکە و هەر چووە نێو ئاوەکە، دەنگی فیکە نەما. دەبوو تا شەوێ لێرە چاوەڕێ بکا.

لە لێواری جۆگەکە بۆق و کیسەڵ خۆیان لەبەر بەرۆچکەکە هەڵخستبوو. گوێی لە دەنگێك بوو، لەپڕ لە جۆگە ئاوەکە دەرپەڕی. چاوی زەق ببوونەوە. بە دەوری گوندەکەدا دەستی کرد بە غاردان. ئەگەر جەندەرمەیەك دیتبای، دەیگرت. جەندەرمە لە کادێنە بەتاڵەکەی دەروێش بەگدا نوستبوون. پاسەوانەکەش لەگەڵ گزیر، لە بن دار بییەکەوە سەیری ئەو کچۆڵانەیان دەکرد، کە دەچوونە کانی. پاسەوانێکی دی، لە دەرەوەی گوند لەسەر جێی خۆی بوو. هەر ئەو جەندەرمەیەی فەرماندە زۆری متمانە پێی هەبوو، هیچی لەچاو ون نەدەبوو. فەرماندەکەی پێی گوتبوو:"حوسێن، ئەو گوندەم بەتۆ سپارد. جیا لە تۆ متمانەم بەکەس نییە. نە بە عەریف و نە بە یوزباشی. چاوێکت بکە چوار چاو. پیاوکوژەکە لەو نزیکانەیە." بڵێی و نەڵێی، ئەو دەگەڕێتەوە ئاوایی بزانێ چ ئەمرێکی پێ دەکرێ. دەبێ بیگری. حوسێنیش نە شەوی هەیە و نە رۆژ. ئێستا کە فەرماندە ئەو گوندەی پێ سپاردووە، ئیتر شەیتانیش پێی ناوەستێ.

یوسف وەك گای گێرە، بە غاردان بەدەوری گوندەکەدا دەخولایەوە.

لە دوورەوە دەرگایەکی دی. دەرگاکە شکابوو. دەرگای ماڵی دۆنە کوێر بوو. دوای ئەو دەرگایەکی دیکەشی دی. ئەویش شکابوو و کەوتبوو. هەر دەرگایەکی دیتی، شکاندبوویان. هەموو دەرگای ئاوایی شکێنرابوون. بەبێ ئەوەی چاو لە دەرگا شکاوەکان هەڵگرێ، بە دەوری گوندەکەدا دەخولایەوە.

دەستێك قاز، بەسەر کادێنی بن دار تووەکەدا هەڵفڕین و شڵپ وەعەرزی کەوتن. یوسف راوەستا. سەری سووڕمابوو. ماڵەکانی ئاوایی هەر پێنج هەنگاوی لێوە دوور بوون... و سەری بنیادەمێك... لە سەری قالە دەچوو. قالە برادەری بوو. هاوتەمەن بوون. قالە یارمەتیی دەکرد. هەرای کرد:"قالە، قالەەە، وەرە ئێرەەە."

گوێی لێ نەبوو دەنگەکە لە قوڕگی دێتە نایەتە دەرێ و قالە گوێی لێی نابێ.

خۆر خەریك بوو ئاوا بێ. شتێك وەك سەرەنێزەی دیت. چیی تین و هێزی تێیدا بوو، کۆی کردەوە و بەرەو زۆنگاوەکە تێی قووچاند. لە پشتەوەی دەنگی پێ دەهات. لوورە، دەنگەدەنگ... لەوانەیە هەزار نەفەریشی بەشوێنەوە بووبن. نەیدەوێرا ئاوڕێکیش بداتەوە و سەیری دواوەی بکا. لە سەیرکردنێ دەترسا.

کە خۆر ئاوابوو و تاریکی وڵاتی تەنی، دیتی ئەوە لە نێو رەوەزەکانی ئاناوەرزایە. خۆی خزاندە پەنای رەوەزێکەوە و ئامێزی تێ وەراند. هانکەهانکی بوو. ئازای ئەندامی ئارەقەی لێ دەچۆڕایەوە. نێو چاوی دەکزانەوە. لاقەکانیشی شەلاڵی خوێن بوون. سەری بە رەوەزەکەوە نووساند و تاوێك ئاوا مایەوە. ئەوجار لەسەرخۆ ئاوڕی دایەوە. هێشتا لە دوور دوورەوە و لە لای زۆنگاوەوە ترپەی پێ و لوورەلوور دەهات. شەو هەر دەهات و خەستتر و قورستر دەبوو. چاو چاوی نەدەدی. دەستی یوسف کە گابەردەکەیان دەگوشی، شل و شەکەت بوون و بەربوونەوە و یوسف بەلاداهات.

ردێنێکی درێژ و تەنك هاتە پێش چاوی. گای کێوییش. ئەوجار بنیادەم، بنیادەم... بنیادەمی کێرد بە دەست، کێرد هەموو خوێنیان لێ دەچۆڕا... ئەوەندە خوێن لە کێردەکان دەچۆڕا... ئەوەندە، ئەوەندە کە... دەنگی تکە تك گوێچکەکانی سڕ دەکا.

بوغە کێو لە کوێیە؟ عەلی ریشە لەکوێیە؟ کولێرە چەورە لە ماڵەکەیدا...

یوغە کێو یەکێکە لەو چیایانە. هەر ئەو چیا سوورانەی بەرێکیان کەسك دەچێتەوە. هەر ئێستا. لە ئێستا زووتر نییە. دەبێ مل بنێتە چیا. تووشی هەر کەس بوو، سەر و سۆراغی عەلیە ریشە بگرێ، نیشانی دەدەن، وا نییە؟

گرمۆڵەبوو... وەك تۆپەڵە گۆشتێك... لەخۆی دەنووسێ، هەوڵ دەدا، بەڵام ناتوانێ هەستێتە پێ.

## ١٢٠

مزەفەر دەتگوت تواوەتەوە. خۆی زەرد هەڵگێڕابوو، بەڵام چاوی دەبریسکانەوە و بڵێسەی تۆڵەیان لیٚ دەبۆوە.

دەروێش بەگ گران و سەنگین و لە حالێکدا هەوڵی دەدا نەشڵەژیٚ، لەسەرخۆ و بە ئەمر و فەرمانەوە گوتی:"دەی بڵیٚ، بڵیٚ بزانم لە ئەنکەرەوە جوابیان لیٚ گێڕاینەوە؟"

مزەفەر بەهێمنی و بە دەنگێکی زایەڵەی شادیی لێوە دەهات، وەڵامی دایەوە:"نەخێر، زۆریش چاوەڕیٚ بووم، بەڵام هیچ هەواڵێك نەبوو. لەسەر یەك پتر لە پانزە تەلەگرافم نارد. هەر دەتگوت تەلەگرافێکیش بۆ ئەنکەرە نەنێردراوە."

"هەی ی ی ، یانی ئاواا؟"

"تەلەفۆنم لە حیزب کرد. رەشاد بەگ گوتی، ئێمە وەك حیزب ناتوانین دەست لە کاروباری وا وەربدەین. ئەوە مەسەلەی پیاوکوشتنە، ئێمە ناتوانین خۆ لە گێچەڵی ئاوا هەڵقورتێنین. فەرماندەش لە خوت و خۆڕایی دەرگای ماڵان ناشکێنیٚ. دیارە دەروێش بەگ ئەگەر حەزی لێیە، دەتوانیٚ سکاڵایەك لەسەر فەرماندە تۆمار بکا."

"هەی ی ی ی، یانی ئاواا؟"

"گوتی ئەگەر فەرماندە ناچار نەبوایە، دەرگاکانی نەدەشکاند."

مزەفەر لەسەر پیٚ بوو. پەیتا پەیتا زەبری خۆی لەو ساری ئۆغلێیە بۆگەن و بێزراو و بیٚ مێشکە دەدا و دوا زەبری گورچوبڕیشی بێبەزەییانە تیٚ دەسرەواند. جاریٚ لێی گەڕیٚ با چیی لە دەست دێت بیکا بۆ ئەوەی نەهێڵیٚ یوسف بگیریٚ.

"سیٚ جاریشم تەلەفۆن بۆ رەمەزان ئۆغلێی برادەرمان کرد. هەر سیٚ جارەکەش لەسەریان داخستمەوە. گوێم نەدایە و دیسانیش تەلەفۆنم کردەوە. گوتم لەوانەیە خراپ تێگەیشتبیٚ، چونکە بڵێی و نەڵێی ئەوان گەورەترین دۆست و برادەرمانن. خۆت وات فەرموو. چوارەمین جار

لێم روون بۆوە، نەخێر بابە، خراپ تێنەگەیشتوون. دەنگێکی گڕ و دوورەگە گوتی:"ئێمە ناتوانین قەسابخانە بۆ قەسابی بنیادەمان دامەزرێنین. گوتی سڵاوی بابت بگەیەنە و پێی بڵێ، چما هێشتا تێنەگەیوە ئەو رۆژگارە بەسەر چوو و رابرد و کەوڵەکەش ئاو بردی؟ ئەوە جاری جاران نییە. ئێستا بەگ سەهلە، تەنانەت سەرکۆماریش مێشێکی مێش ئاسایی بکوژێ، لێی دەپێچنەوە. خۆ شارە بەرەڵڵا نییە، مەملەکەت بێ سەرەوبەرە نییە..."

"هەی ی ی ، یانی ئاواا؟"

"کاکە ئەو سەردەم بەسەرچوو کە هەر لەبەر خاتری ساری ئۆغڵی پشتی خەڵکی پیاوکوژ و دوژمنی میللەت و دەوڵەت بگرین. ئەو خەیاڵی خاوە. هەر لەسەر گووکارییەکانی ئەوە، وەك پیاوکوژ سەیرمان دەکەن. چیی لە گیانی ئێمە دەوێ؟ ئەوەی گوت و تەلەفۆنەکەی داخستەوە."

"هەی ی ی، یانی ئاوا؟"

"چوومە لای ئاغا موستان. ئەو ئاغا موستانەی برای گیانی گیانیتە. نەیهێنا و نەیبرد، رووی تێ کردم و گوتی، هەتیوی پیاوکوژی خوێنمژ، کوڕی شێتی کوێر. سەری لە بەردی ئەلحەدێ دام و تەریقی کردمەوە. سەرم داخست و بەبێ ئەوەی بتوانم متەقم لێوە بێ، گەڕامەوە. شەویش بوو، بەڵام تەنانەت خوڵقێکیشی نەکردم و نەیگوت بەو ناوەختە نوێژی شێوانە بۆ کوێ دەچی... هەر حەیای بردم..."

"هەی ی ی ."

"هیچ دەزانی مەحموود قەرەداغی، هەر ئەوەی لە سایەی سەری تۆوە بووەتە پیاو و لەبەر خاتری ئەو چەند ساڵان هاتوچۆی زیندانت کرد و شەش مانگ لە ئەنکەرە مایەوە و لێبوردنت وەرگرت بۆ بیست ساڵ بەندیخانەکەی، کە بە تاوانی کوشتنی براکەی بۆیان بڕیبۆوە. دەستیت گرت و لە زیندانێ دەرت هێنا، دەزانی چیی پێ گوتم؟ گوتی: دەرگاشتان دەشکێنن و خۆشتان دوور دەخەنەوە و شاربەدەریشتان دەکەن ئەگەر بابت دەست لەو کەرێتییەی هەڵنەگرێ، زۆری پێناچێ خۆیشی لە سێدارە دەدەن. گوتی بۆ ئەو کەرێتییانەی ئەو دەیکا، کەس هچیی لەدەست نایە. ئیتر من قسەی دیکەم نەکرد. هەر ئەوەندەم گوت، باشە ئەوە گرفتێکی ئاوا بە مل تۆوە بووبا، بابیشم لەگەڵت ئاوا دەبوو. لە جوابدا گوتی، راست دەکەی، بابی تۆ جوامێرێکی تورکمانە، کە هێشتا لە سەدەی یەکەمدا دەژی و ئەقڵی پارسەنگی دەوێ."

دەروێش بەگ بۆ یەکەمین جار زەردەیەکی هاتێ و دیسان گوتی:"هەی ی ی، یانی ئاوا؟"

"مچە بەگیش وا دەهری بوو و ئاگری گرت هەر مەپرسە. گوتی، ئەو بابەت زۆر لەوە خراپتری بەسەر دێ. وای دانێین، میللەتی فریو دەدەن و دەنگ بۆ ئەم حیزبە، بۆ ئەم حیزبە بێ رەگ و ریشەیە کۆ دەکەنەوە، بەڵام هەرچۆنێك بێ، ئەو بابە پیاوکوژەت هەر نەجاتی نابێ و ملی بە پەتەوە دەکرێ. من هیچ کارێکم پێ ناکرێ. هیچم بۆ بابت پێ ناکرێ. ئەوەی لە گژ حوکمەت رابچێ، دەرگای ماڵ چییە، هەر ماڵەکەشی دەسووتێنن. بابت هەر ئەوەندەی لەدەست دێ، پیاوکوژەکە بێسەروشوێن بکا و گیانی شیرینی خۆی لە پەت و سێدارە رزگار بکا... هەموو ئەو کۆماری تورکیایە دوژمنی بابتە. کەس ناتوانێ بابت لەو کێشە قووڵە رزگار بکا کە خۆی دروستی کردووە. بۆ ئەوەی خۆی لە پەت و سێدارە رزگار بکا، دەبێ لە پێشدا سەری پیاوکوژەکە بەگۆمێدا بکا، دوایی سکاڵای دەرگا شکاندنەکەی تۆمار بکا. بابت ئەگەر خۆی بیەوێ، دەتوانێ لەو مەرگە مسۆگەرە دەرباز بێ. هەر کەسە قیبلەی ماڵی خۆی بۆخۆی دەزانێ."

"یانی ئاوا، ها؟"

"چوومە لای حاجی بەگیش. ئەویش دەیگوت..."

دەروێش بەگ نەڕاندی:"بیبڕەوە. بەسە. ئەوانەی لە نێوگەڵی قەحپاندا وەرکەوتوون، ئەو رزیوانە... ئەو..."

مزەفەر بە چاوی خۆی دەیدی باوکی، ئەو کابرای رەوەزئاسایە، تێك دەشکێ و بەچۆکدا دێ، بۆیە شایی لە دڵی دەگەڕا. کاتی ئەوە گەیبوو، زەبرە گورچوبڕەکەی بوەشێنێ. لەسەرخۆ و گورچووبڕ. تۆڵەی هەموو ئەو تاڵی و کوێرەوەرییانەی لە منداڵییەوە بەدەستییەوە چێشتبووی، هەر لەو دەرفەتەدا دەیتوانی ئەو تۆڵەیەی لێ بکاتەوە.

"ئیزنم بدە باسی شتێکی دیکەش بکەم، کە پێم وایە زۆرت بە لاوە گرنگە. دەمگۆیەك کەوتووەتە سەر زار و زمانان، موچڕکەت بەگیانیدا دێنێ."

نەیگوت و راوەستا و چاوەڕێی کرد. دەروێش بەگیش دانی بە جەرگیدا دەگرت. مزەفەر چاوەڕوان بوو بابی بتەقێ، ئاخۆ بڵێی دەمگۆی چ بێ؟ بەڵام دەروێش بەگ هەر دانی بە جەرگیدا دەگرت و نەیدەپرسی.

"زۆر قێزەون... هەر باشتر وایە نەیڵێم. بەڵام بووەتە بنێشتەخۆشکەی سەر زاران. لە حەوت ساڵانەوە بگرە هەتا حەفتا ساڵانە..."

دەروێش بەگ وەك پارچە سەهۆڵێك، بە ئاستەمیش نەدەجووڵا.

مزەفەر دیتی باوکی هەر ناپرسێ و ئەو چێشکەی ئەو خۆشییە ناکا.

دەی باشە، ئەگەر دەتوانێ با وەڕووی خۆی نەهێنێ. با بزانین. هەر ئێستا گوێی لێ بێ بەلادا دێ.

"ئاق یۆللی مستەفا ئاغا گوتوویەتی..."

ئەوەی گوت و تۆزێك راوەستا.

لە چرچ و لۆچەکانی روخساری دەروێش بەگدا جوولەیەك بەدی کرا. چاوەکانی بریسکانەوە، بەڵام بەسەر خۆیدا زاڵ بوو. نەدەبوو لەبەردەم ئەو سەگە گلاوە بەچۆکدا بێ و بلەرزێ.

"مستەفا ئاغا گوتوویەتی... من، گوتوویەتی، ئیتر وازم لە کوشتنی دەروێش بەگ هێناوە. ئەو ئیتر دوژمنی من نییە. گوتوویەتی، دوژمنی من دەبێ یەکێکی هاوشانی خۆم بێ. گوتوویەتی، ئەگەر هەر ئێستا دەروێش بەگ بێ و ورد و درشتی ئەندامانی بنەماڵەی ئاق یۆللی بکوژێ، هێشتا بە دوژمنی خۆمی دانانێم. گوتوویەتی، گەردنیم لە خوێنی براکەم و دایکیشم ئازاد کرد. گەردنی خۆش و ئازاد بێ. ئەو قسانە لە سەر زار و زمانی هەمووانن..."

دەروێش بەگ رەنگی بە روخسارەوە نەمابوو و لێوەکانی دەلەرینەوە. بەناڵینەوە گوتی:"ئای ی ی ، کە ئاوا؟"

مزەفەر ئاخرین زەبری گورچوبڕی خۆی لێ وەشاندبوو. ئەگەر ئەو زەبرە لە پێی نەخا، ئیتر بەهیچ هێزێك لێ ناکەوێ. وەك یەگی ترساو، کلکی لەگەڵۆزی نا و لە بابی دوور کەوتەوە. یەکەمین جاری بوو دەیدی بابی لەبەر چاوی ئەو هێندە بشڵەژێ و پەرێشان بێ. دەبوو چێژ لەو سەرکەوتنەی وەرگرێ.

"هەی ی ی، یانی ئاوااا؟"

دیسان هەروا قیت و قنج بوو. دیسان نەشکابۆوە. ئەو کابرایە لە بن پەتی سێدارەشدا نەدەشڵەژا. دەمرد و دەڕۆیشت، بەڵام بە سەری بەرزەوە. هەرگیز تێشکانی ئەو بەچاوی خۆی نابینێ.

"پیرە سەگ."

# ١٢١

"ماڵی عەلییە ریشە لەکوێیە؟ عەلی ریشە؟"

کابرایەکی ردێن ماش و برینجیی دەموچاو درێژ و زەردەڵە، بە سەرلەقاندنێکەوە گوتی، نایناسم. چاوە کاڵەکانی زەق ببوونەوە. چاوی لە یوسف بڕیبوو.

"بۆغە کێو لەکوێیە؟ بۆغە کێو؟"

کابرا گوتی:"نازانم. هەر ناویشیم نەبیستووە."

یوسف لەبەر خۆیەوە گوتی:"ناویشیم نەبیستووە." بەری پێی دەزووورانەوە. دەکەوت و هەڵدەستاوە. بە غاردان دوور کەوتەوە. شتێکی وەك تاریکی تێی ئالاَبوو. چیا بە لووتکە رەشەکانیانەوە دەهاتنە پێش. شنەبای فێنك لە دەموچاوی دەدا و تاو نە تاوێك تووشی هەوری تۆز و خۆڵ دەبوو. پێی وابوو چیی نەماوە باران دابکا. جارێ بە شوێنێکی گەرمدا تێدەپەڕی و جارێ دەکەوتە بەر لووزەوی بایەکی فێنك. ئەرێ دوێنێ نیوەشەو چ قەومابوو؟ نیوەشەوێ رەوەزەکان دەیانلووراند و دەلەرزین و دەنگ و زەنازەناکە تێکەڵاو دەبوون و هەڵدەستان. بە دەنگە تێکەڵاوەکان بەخەبەر هات. بەرد و خانووبەرەکان لە دەورووپشتییەوە خلۆر ببوونەوە و تاریکاییەکەیان دڕیبوو و بەرەو ئاقچاساز جاڵە دەبوونەوە. لە خوارەوە، مەکینەکان کاریان دەکرد. ملە درێژەکانیان هەڵدێنا و دایاندەنواندنەوە و وەك دێوەزمەکانی کێوی قاف خاکەکەیان هەڵدەلووشی و لە تەنیشت جۆگەکە دەڕشانەوە. لە حاڵێکدا بەردە خلۆربووەکان لە پشتەوە کردبوویانە قیامەتی رەش، لە رەوەزەکانەوە داگەڕا. دێوەزمەی دوازدە چاو لە بوومەلێڵی بەیانیدا، خووساو، لە نێو هاڵاو و تەمدا بەملاولادا دەسووڕایەوە و ملە درێژە نارنجییەکەی، دەمە بریقەدارە پێنج ددانەکەی پەیتاپەیتا و بە گرم و هۆڕ لە عەرزەکە دەچەقاند.

"عەلییە ریشەتان دی، دیتتان؟ ماڵەکەی لەکوێیە، لەکوێیە؟"

ئەو خەڵکەی سەرتاپایان چەور و رۆناوی بوو و لە دەوری مەکینەکان دەهاتن و دەچوون، گوتیان،:" نەماندیت."

لەو نێوەدا یەکێکیان گوتی:"تاوێك لەوە پێش لێرە بوو. عەلییە ریشە. ریش درێژ."

یوسف گوتی:"ردێنێکی تەنك و درێژی هەیە."

بنیادەمەکان پێدەکەنین. هەر بەراست، لە کوێ دەیزانی ردێنی تەنك و درێژە؟ یوسفیش پێکەنی. بنیادەمەکان بەسەرسوورِماوییەوە سەیریان کرد. سێبەری بنیادەمەکان بەرەو خۆرئاوا زۆر درێژ ببۆوە. یەکێکیان قومی لە کووپە چا گەرمەکە دەدا. مەکینەکان کردبوویانە گرم و هۆرِ. بۆگەنیشیان هەستاندبوو. بۆنی گازوایل، قورس و وەك دووکەڵ، هەتا ناخی مرۆڤ دەچووە خوارێ و سەری لەگێژەوە دێنا.

چاوەکانی دەسووتانەوە. سێ کامیۆنی شین، بەرەو خێوەتەکان دەچوون. ئەویش نەك بە رێیەکەدا، بگرە بە نێو کێڵگەکەدا و بە هێمنی و لەحاڵێکدا دووکەڵێکی خەستیان دەردەدا.

یەك بە یەك ژماردنی. دوازدە خێوەت بوون. چەند کەسێك لە بەردەرکی خێوەتەکان پیاسەیان دەکرد. یوسفیش نوقمی سەیرکردنی مەکینە نارنجییەکان ببوو. گەرماکە هەر دەهات و بەتینتر دەبوو. هەستی کرد بۆشاییەك لە ناخیدایە. برسیی بوو. دەبوو شتێك بخوا. بەڵام چما دەیتوانی چاو لەو مەکینە زەبەلاحانە هەڵگرێ؟ ئەو کامیۆن و مەکینانەی هەر دەرۆیشتن و دەهاتنەوە و ملە درێژەکان دەنووشتانەوە و خاکیان هەڵدەکەند و دەیانکێشا و لەولاوە رۆیان دەکردەوە... تاو هەڵیدەچۆقاند. سێبەری بنیادەمەکان و مەکینە و دار و رەوەزەکان کورتتر ببوونەوە. هەرچی دەنگە، دەنگی مەکینە، قامیشەلان و رەوەزەکان لە گەرمایەکەدا دەمرد و هاوکات دەتواوە. پشووی دەرنەدەهات. بەرەو لای کەناڵەکە دەچوو. لەگ لەگەکان یەك یەك لە کێڵگەکاندا دەگەڕان و بنیادەمە جامانە بەسەرەکان دەنووشتانەوە و قیت دەبوونەوە. دەنگی مەکینە و سەیارەکان لە مێشکیدا دەزرینگایەوە و گەرما پشووی لێ دەبرِی...

"عەلییە ریشە، عەلییە ریشە؟"

"عەلییە ریشە لەوێیە، زۆر زۆر لێرە دوور..."

لایەکی چیاکان وەنەوشەیی دەچنەوە و لایەکیشیان شینێکی کاڵ. بەردەوام کاڵ دەبنەوە و دەتوێنەوە و لە خەرمانەی تیشکێکدا دەبنە دووکەڵ و هەڵم.

زۆنگاوەکەش تواببووەوە، وشك ببۆوە، ببووە دووکەڵ. دار و باڵندە و هەور و ئاو و گڵەکەی لە دووکەڵێکی خۆڵەمیشی و تیشکێکی وەك هەڵم و تەمدا نوقم ببوو. دەموچاوی تاوبردوویان

و چرچ و لۆچی شل و چیڕ و ددانی سپی و بریقەداریان... چاوەکانیان گەش و مژۆڵ و برۆیان نوقمی تۆز و خۆڵ و سەرتاپا گیانیان خۆڵاوی. گوێچکەیان پڕ لەخۆڵ و کا، نێو تووك و قژی سەریان پڕ پڕ لە خۆڵ و هەمووی پێکەوەنووساو، شانیان لە ئارەقەیاندا خووساوە و شۆرەکاتی هەڵداوە.

وەرە سەیری ئەو گوندییە بێ شەرەف و گەمژانە... دیسان بە جەواڵ و گۆنی و سەللە و قەرتاڵە گڵ دەبەن بۆ ئاقچاساز. ئەوانە هار بوون و دەیانەوێ زەوی و زارێك بۆخۆیان دروست بکەن. شێت، شێت، شێت... ئاقچاساز وشك دەکەنەوە...

دەموچاویان تاوبردوو و پڕ لە چرچ و لۆچ، ملیان وا چرچ و درێژ بووەتەوە دەڵێی ئێستا نا تاوێکی دی دەپسێ... لێویان توێژی هەڵداوە و شەقار شەقار بووە... پێستە وشك هەڵاتووەکانیان شل بووەتەوە و بن نینۆکیان پڕە لە چڵك و چەپەڵ. لە بەر تاوێ دانیشتوون و نان دەخۆن. چەندەش بەپەلەپەل و زۆر دەخۆن. دەستیان وەك مەکینە کار دەکا. منداڵ دەگرین. هەرکەسە و لە منداڵی خۆی دەدا. منداڵێکی پێخاوس کە پانتۆڵەکەی داکەوتووە و لە لاقی دەئاڵێ، را دەکا. بەرەو زۆنگاکەوە رادەکا و چیی نەماوە بیگاتێ. ئەگەر منداڵێك خۆی بە قامیشەڵانەکەدا بکا، ئیتر نایدۆزنەوە. هەر ناتوانن بیدۆزنەوە. با هەر نەتوانن...

لەدەم کانییەکە دانیشت و لاقی لە ئاوەکە نا. ریخۆڵەکانی یەکتریان دەخوارد. لە گوندەکەی ئەوبەرەوە حەپەی سەگەل دەهات. لوورەیەکی دوور و لێڵ. دەبوو بچێتە ئەو گوندە و خواردنێك پەیدا بکا. بەڵام چۆن؟ دەبوو بچێتە دووکانی ئاوایی و شتێك بکڕێ. دەست لە گیرفانی نا. لوێچێ پارەی پێ بوو، بەڵام ئەی دراوەکانی دیکەی چییان لێ هاتبوو؟ چیی لەخۆی نووسا، هیچی وەبیر نەهاتەوە. تاریکی خەریك بوو باڵی بەسەردا دەکێشا، کە گەیشتە ئاوەدانی. لە یەکەمین ماڵ وەژوور کەوت. لە حەوشەکە، لە تاریك و روونی حەوشەکەدا، تۆزێك لە پێش ئەو مانگایانەوە کە خەوتبوون و کاوێژیان دەکردەوە و لە تەنیشت ئەو ئەسپانەوە کە خرمە خرم لە عارەبانەکە گیایان دەخوارد، راوەستا و بۆنی لەشی ئەسپەکانی هەڵمشت... خێزانەکە لە بن دارە تووەکە، لە دەوری سفرەیەك کە لەسەر حەسیرێك راخرابوو، دانیشتبوون و خەریکی شیوخواردنێ بوون. گوێی لە دەنگی تەقەی کەوچکەکانیان دەبوو. نوقمی زرینگەی بەریەککەوتنی کەوچەکەکان بوو و لەجێی خۆی نەدەبزووت. لە شوێنێکەوە دەنگی فشەفشێك دەهات. لە پشت پەرژینەکەوە چەند کەسێك قسەیان دەکرد. ئەسپێك لە دوور دوورەوە

دەیحیلاند. گرم و هۆڕ و هاڕەهاڕی ماشێنەکان تێکەڵاو دەبوون و لەگەڵ لوورەی قامیشەڵانەکە دەگەیشتنە ئێرە. چەند هەنگاوێك چووە پێشێ و گەیشتە بن دار تووەکە.

ئێستا ئەوان یان لەبەر ئەوەی زۆر نوقمی خواردنەکەیان بوون، یان بەهۆی ئەوەی بەسپایی لێیان چووبووە پێشێ، پێیان نەزانی. بۆنی ساوار و رۆنە قرچێنراوەکە هەموو گیانی دادەگرت و سەرخۆشی دەکرد. بەدەست خۆی نەبوو لە زاری دەرپەڕی:"ئەرێ ئێرە ماڵی عەلییە ریشەیە؟"

پیرەمێردێك، کە تیشکی کزی فانۆسەکە لایەکی روخساری رووناك کردبۆوە و چرچ و لۆچی دەموچاوی قووڵتر دەرخستبوو، ئاوڕی داوە و گوتی:"نا."

پیرە پیاوەکە لە حاڵێکدا پارووەکەی لە زاریدا دەسووڕاند و بارەوباری دەکرد و مژۆڵە خۆڵاوییەکانی دەترووکاند، لەسەری رۆیشت و گوتی:"ئەو گوندە کەسی وای تێدانییە ناوی عەلییە ریشە بێ."

جا بانگی کرد و لە تەنیشت خۆیەوە جێی بۆ کردەوە و گوتی:"فەرموو، وەرە لێرە دانیشە."

چووە پێشتر و لەتەنیشت پیرە پیاوەکەوە دانیشت.

پیرە رووی کردە ژووری و هەرای کرد:"کچینە، کەوچك و نان بێنن."

هەتا ئەو دانیشت، کچەکان دەرپەڕیبوون. کچێکی کەڵەگەت کەوچکێکی دارینی دایە دەستی. تاوێك دواتر یەکی دیکە دەستەوارێکی نان لە پێش دانا. قاپێکی پڕ لە ساوار لەسەر سفرە بوو و مەنجەڵێکیش باینجان و کەدوو... لە پێشدا پاروو پاروو ساوارەکەی دەخوارد و ئەوجار بە کەوچکان وەدەگەڕایە سەر باینجان و کەدووەکە... هێندەی برسی بوو نەیدەزانی چ دەکا.

بەبێ ئەوەی ئاگای لە دەوروپشتی خۆی بێ، هەر خواردی. هەمووان کشابوونەوە و دەست و دەمی ئەو هەر وا خێرا خێرا دەجووڵان. پیرە پیاوەش لەسەرخۆ دەیخوارد. تا پیرەپیاوە پارووەکی دەجوی ئەو دە پارووی قووت دەدا. پیرە بە ئانقەست خۆی دەخافڵاند نەکا میوانەکەی بەشەرمدا بکەوێ و بکشێتەوە... بەڵام میوان ئاگای لە هیچ نەبوو. خەواڵو و وڕ و کاس بوو. تەنانەت پیرەش کشاباوە و سفرەشی چیی لێ نەمابایە، ئەو هەر هەڵنەدەستا. چما ئاگای لەوە بوو کێ دانیشتووە و کێ دانەنیشتووە... نە هیچی دەدی و نە گوێی لەهیچ دەبوو. تەنانەت ئاگای لە هاتوچۆی شەویلکەشی نەبوو. تاقە جارێك زانیی خەریکە دۆ دەخواتەوەو تامی دۆیەکەی کرد. لەو جەنگەیەدا دیسان بۆنەکانی بەسەردا هاتنەوە. بەدوای ئەوەدا هاڕەهاڕی ماشێنەکان و قامیشەڵان و زرمەی ناڵی ئەسپی گوێ لێ بوو. پەرداخێکی دیکەی دۆ خواردەوە و لەو دەمەدا

بوو، که دەتگوت لەبەر تیشکی کزی چراکە، روون و تاریك دەموچاوەکانی دی. دەتگوت سەیری دەکەن. پیرەمێردەکە کە دیتی چاو دەگێڕێ، پاروەك ساواری هەڵگرت و لە زاری خست. چەندی خواردبوو؟ زۆر؟ کەوچەکەکەی دانا و هەستا:"خودا نەیبڕێ."

جا لە حاڵێکدا خەریك بوو دەکەوتەوە ڕێ، گوتی:"یانی ئەوە ماڵی عەلییە ریشە نەبوو؟"

تا ئەوانی دیکە وەخۆ کەوتن وەڵامی بدەنەوە، ئەو لە تاریکاییەکەدا بزر ببوو.

ئاقچاساز بانگی دەکرد. ماشێنەکان چاویان لەو بوو. دوازدە... ڕێگا نوورانییەکان لە دوازدە جێوە دڕیان بە تاریکایی دەشتەکە دابوو. ڕێیەکی ڕووناکی گرتبووە بەر. دیواری ئەستوور و پشووبڕی تاریکی بەدەورییەوە. ڕێگە ڕووناکەکە، بەرەو دوور دوور، بەرەو زۆنگاوەکەی دەبرد... شنەیەك بە ڕێگا نوورانییەکەدا هەڵیکرد.

دەرپەڕی. بە غاردان گەیشتە ئەو ماشێننەی شەوانە کاریان دەکرد. ماشێنەکان لە تاریکییەکەدا شتێکی دیکە بوون. گەورەتر و سامناکتر... ئێسك و پرووسکە خوێناوییەکانی ورد و خاش، ئەنجنراو... مەحموودە کوردە... تەرمەکەیان هێنابووە دەم ڕووبارەکە و لەسەر لمەکە فڕێیان دابوو. مێروولەی زەرد، چاویان کۆڵیبوو... سەگەل تەرمەکەیان ڕاکێشابوو... چەو و لم و وردکەبەردەکانی خوێناوی کردبوو... لە حاڵێکدا جار بە جار بازنەکانی گەورەتر دەکردەوە، بەسەر دەوەنە تووترکەکاندا دەکەوت و دەکەوتە نێو خەرەندەکەوە و جار بە جار دڵی توندتر لێی دەدا و هەر لەو کاتەدا کە چاوەڕێی هەندێ شت بوو و پارێزیشی دەکرد و دەسڵەمییەوە، ڕای دەکرد و خۆی لە تاریکاییەکان و بە ڕێگا ڕووناکەکاندا دەکرد و سەری لێ دەشێوا کە دەگەیشتە ئەو ڕێگایانە و هەوڵی دەدا لێیان دەرباز بێ. سەگەل و ریزی دوورودرێژی مێروولە زەردەکان بە شوێنییەوە، بە شوێن کۆڵینی چاوەکانییەوە وەك تەپۆ بە دەورییەوە...

کە لەخەوێ هەستا شەڵاڵی ئارەقە بوو. جلوبەرگە چرچ و لۆچاوییەکە، دەموچاوی و نێوچاوانی خۆڵاوی بوون. چاوی زەق و ترساوی بێوچان لە چاڵی چاویدا هەڵدەسووڕاند و سەیری دەوروپشتیان دەکرد. دڕدۆنگ و زراوچوو لەجێی خۆی وشك ببوو. وردە وردە کە بەخەبەر دەهات و هەندێ شتی وەبیر دەهاتەوە، دڵەخورپە و ترس جار بەجار پتر دڵی ڕێك دەگوشی و هەموو ڕەگ و دەمار و ماسوولکەکانی دەیانزیڕاند و وردە وردە زەینیشی ڕوون دەبۆوە و لە خۆشیی ئەو بیرکردنەوەیەی گیانی دادەگرتەوە، دەتوایەوە. بیرکردنەوەیەکی ڕووت بەبێ ئەوەی ئاگای لە دەوروبەری بێ. بیرکردنەوە و تێفکرینی هەر لەبیر نەماوە و سەری لەسەر ئەژنۆی داناوە و لەبەر قرچەی هەتاوە بەتینەکە بووەتە کۆڵوو و وا توقمی بیر و خەیاڵ ببوو، کە بەبێ

ئەوەی بتوانێ چاوە قووچاوەکانی هەڵبێنێ، بۆن بەو تۆزەوە دەکا کە لەبەر پێیانی هەڵدەستێ و بەدەم بۆنکردنەوەوە وەخەبەر دێ. دەموچاوی کابراکەی دوێنێ شەوێی لەبەر چاو، بە روویەکی گەشەوە لە حاڵێکدا لەسەرخۆ پارووییەك دەجوێ، زۆر لە پیاوێکی باش دەچێت. چاوەکانی میهرەبان و پڕ لە پرسیار. کە رووداوەکەی دوێ شەوێی بیر دەکەوێتەوە، شەرمەزاری وەك شەپۆلێك بە هەموو گیانیدا دەگەڕێ و خۆی کووڕ دەکاتەوە و ئارەقە لە هەموو گیانی دەچۆڕێ و بەلادا دێ. لە نێو گەردەلوولدا، زار و لووتی پڕ لە تۆز و خۆڵی تێکەڵ بە بۆنی گەڵای "بابادەم" کە کونە لووتی دەخورێنێ... هەزاران جڕ و جانەوەر لەو گەرمایەدا دەنگیان لێ هەڵبڕیبوو. چاوی هەڵێنا. هیچی نەدی. لەو چۆڵگە و شڵەژاوی و بێهیزیی و گەرما بەتینەدا... هەموو شتێك لێڵ، لە لێڵایی ئەو تیشکە بەتینەی هەتا ناخی رووناکاییەکە چووەتە خوارێ.... دەنگەکان و هەناسەکان و بۆنەکانی قووت داوە. شەپۆلی هێمن و نەرمی ئەو تیشکەی لەسەر هەموو شتێك نیشتووە، لافاوی بەخوڕی ئاو، سپیهەڵگەڕانی ئاسنێکی سوورەوەبوو، کە وردە وردە سپی هەڵدەگەڕێ، هەموو شتێك قووت دەدا و لە سپیاییدا نوقمی دەکا... هەستا. زاری وەك ژەهری مار تاڵ بوو. بە دەستەکوتە و خەواڵوو کەوتە رێ. بەرەو لای پاسێك رای کرد. نەیتوانی پاسەکە بدۆزێتەوە. پاسەکە لە تۆز و خۆڵدا بزر بوو. ئەویش چووە نێو تۆز و خۆڵەکە و هاتوە دەرێ. دوای ئەوە تەپوتۆزەکە نیشتەوە و شینێکی تۆزاوی جێی گرتەوە. کە پاسەکە راوەستا، گەرما و تیشکە بەتینەکە و تەپوتۆزەکە وەك شووشەیەکی شکاو بە خرم و هۆڕ هەڵوەرین و شین، شینێکی تۆزاوی دەرکەوت. نووسراوە سوورەکانی سەری نەدەخوێنراوە و توێژتوێژ بوون.

شاگرد شۆفێرەکە، کە کوڕێکی شپڕێوی سمێڵ باریك و روومەت دەرپەڕیو بوو، گوتی:"دەی سواربە دەی، چاوەڕێی چی؟ بیبڕەوە. بۆ کوێ؟" کە دەیویست سوار بێ، گوتی:"ماڵی عەلییە ریشە."

سمێڵ باریك گوتی:"لە پێشەوەیە. ماڵی عەلییە ریشە لە پێشمانەوەیە. سواربە دەی."

ماڵی عەلییە ریشە لە پێشمانەوەیە. ئەدی لە پێشمانەوەیە، پێشمانەوە. زۆر دەمێك بوو بەدوویدا دەگەڕام. زۆر لەمێژ بوو.. گاگەلی هەیە. لە بۆغە کێو، لە نێو کێوپارەدا. ئەو داڵدەت دەدا. رێگەی بەردەڵێن، لە سەر رێگەشت لە نێوقەدی دارسنۆبەرێکی قەوزەگرتووی پڕ لە ئاودا، پاپۆڕێك هەڵکۆڵراوە. پاپۆڕەکە لە نێو پنگە و گوڵەبەردینە و باداکی بەرماوی بەهاران و گوڵی فاڵگرتنەوەی بۆنخۆش. دەنگی کچۆڵە چاوبەڵەکەکانیش کە وێنەی روخساریان

کەوتووەتە نێو ئاوەکە، لە دوورەوە دێ. لم و چەو و دەم رووبار و سەگەل و لافاوی زەرد. جەندەرمەش تەرمە خوێناوییەکە بەسەر وردکەبەرد و چەوەکاندا رادەکێشن.

"ماڵی عەلییە ریشە لە شارۆچکەیە. جیرانمانە... لە حەوشەکەیدا کەپرێکی بۆ رەزەکانی هەڵبەستووە... عەلییە ریشە زۆری حەز لە گوڵە رەیحانە. دەوروبەری بیرەکەی پڕە لە گوڵە سوێسنەی مۆر... ئەو دەمەی ئاسمان ئاگربارانە، بن کەپرەکەی عەلییە ریشە و دەوری بیرەکەی وەك لووتکەی چیای دوڵدوڵ فێنکە... لووتکە نووك تیژە مسییەکە. وەك چۆن ئەو دەمەی مس لە کوورە دێننە دەرێ، دووکەڵاوی دیارە. کە لە چوکووراوا و لە دەشتە کاکی بە کاکییەکە و لە نێو گەرما و لەوبەری رووناکاییەوە سەیری ئەویش دەکەی، ئەوە دوڵدوڵ بە دەم شەپۆلەوە لەودیوی تارماییی و لە بەر تیشکی هەتاوەکە دەڵێی دووکەڵاوییە...

"دەچمە ماڵی عەلییە ریشە، لەوێ..."

"پیاوێکی باشە. پیاوی چاکە. دووسەد و پەنجا قرۆش..."

"دووسەد و پەنجا قرۆش؟ هانێ بیژمێرە..."

"دووسەد و پەنجا قرۆش. تەواوە."

نێو پاسەکە پڕ دەبێ لە تۆز و خۆڵ. پاسەکە چەندی پتر دەڕواتە پێشەوە، تۆز و خۆڵەکە هەروا هەڵدەستێ و دێتە ژوورەوە و خەستتر دەبێتەوە. وای لێ دێ چاو چاو نابینێ و پشوویانە دەرنایە. پیرەژنێك لە پێشەوە دەکڕووزێتەوە و منداڵێك دەزیقێنێ. پیاوێکی بەساڵاچووی بێ ددان کە هەر دەڵێی پیرەمێردەکەی دوێ شەوێیە ــ کە نەیدەتوانی بەجوانی پارووە گەورەکان بجوێ ــ خەریکە ردێنی توند گرتووەتە نێو قولی و چاوی وا قووچاندووە، قولینچکی چاوەکانی چرچ و لۆچ بوون. پیرەپیاوەکە ردێنە خۆڵاوییەکەی گرتووەتە نێو قولی دەستییەوە و هەروا دەیکێشێ. هەمووان شەلاڵی ئارەقەن. بۆنی ترشاوی لەش و بۆگەنی پێ، پاسەکەی پڕ کردووە و هەناسە ناکێشرێ. عەلییە ریشە ردێنی دەکێشێ. بنیادەمێکی درێژی رەقەڵە، سەری هێندەی مستێکی قووچاو، خڕ وەك گلۆڵەیەك. ملە باریك و چرچەکەی، قورتمەی گەرووی دەرپەڕیو و سەری بەرەو دواوە خوار کردووەتەوە. دوو چاوی گەورە و زەق، دووچاوی وەك گۆمی خوێن، تۆزاوی و مژۆڵ درێژ وەك مژۆڵی ئەسپ، لەو سەلکە گلۆڵەیەدا. لە قەڵافەتییەوە دیارە خەیاڵ رفاندوویەتی. لاقی زرت و زەلامی کابرای تەنیشتی هەر دەڵێی جووتە کیسەڵێکی پشت قەڵشیون، کە لەگەڵ هەر تەکانێکی پاسەکە، هەڵدەبەزنەوە و دیسان پان دەبنەوە. نینۆکەکانی خواروخێچ و کەمرە بەستوو، کە ئارەقە چڵك و خۆڵەکەی دەخووسێنێ.

مل به بێهێزییەوە درێژ بوونەتەوە و سەلکەسەرەکان لەگەڵ تەکانی پاسەکەدا دەلەقن. تەپوتۆزەکە بەردەوام لە کەلێنی دەرگای نیوەکراوە و درزەکانی تەخت و میچ و دیوارەکانی پاسەکەوە دێتە ژوورێ. خەڵکە چڵکن و جل شڕەکەش دەم و لێو وشك و قەڵشیو و توێژهەڵبوو، بەچاوی پڕ لە ترس و روومەتی قوپاو و ددانی رزیو و کەوتوو و خوراو و زەردەوە. دەموچاویان دەڵێی گریاون و سەریان بەملاولادا دەکەوێ. جارێ لە تۆز و خۆڵەکەدا بزر دەبن و جارێ وەنەوەز دەدەن و جارێ چاو هەڵدێنن و مل دەکێشن و دیسان خەونوچکە دەیانباتەوە. توند میلە ئاسنەکەی پێش خۆیانیان گرتووە. دەمار و ماسوولکە گرژبووەکانی وردە وردە شل دەبنەوە و بەلادا دێ و لە نێو خەو و بێداریدا، لەنێوان خەون و راستیدا، لە نێوان بەئاگایی و گێژیدا. ماسوولکەی پێیەکانی، دەست و نێوقەدی دەلەرزێ. هەموو گیانی لە بۆشاییدا، هەست و بێ هەستی... تەزووی پاژنە و بەلەك و نێوقەدی رەوییەوە، دەتگوت سڕ بووە. سڕ دەبێ، زگ و سەری سڕ دەبێ. لە جێی خۆی بەلادا دێ و هەست دەکا هەندێ شت لە بن پێی دەخزێن. بەسەر مۆبلەکەدا دەکەوێ و هەڵدەستێتەوە. هەندێ شتی دوور و لێڵ بەزەینیدا تێدەپەڕن... هەتاوی زەردەپەڕ کەوتووەتە پشت پاسەکەوە و لە نێو تەپوتۆزەکەدا جارێ سوور دەچێتەوە و جارێ سپی و جارێ لە تۆز و خۆڵەکەدا لە چاوان ون دەبێ... شارۆچکە لە داوێنی گردەکەدا تخێڵ بووە و هەموو شووشەکانی دەبریسکێنەوە. سەرتاپای قەدپاڵەکە وەك کۆشکی شای پەرییان دەدرەوشێتەوە. شووشەکان دەڵێی گڕیان گرتووە و بڵێسەیان لێ هەڵدەستێ و تیشك بەدەشتەکەدا دەپژێنن. هەزاران داوە تیشك بە تەپوتۆزەکەدا لە لاپاڵەکەوە بەرەو دەشتەکە دەکشێن. لەگەڵ گرموهۆڕەکەدا چاوی هەڵێنا. شارۆچکەکە بەرەوڕوویان دێ. لافاوی تیشك بەرەولایان دێ...

دەبێ لەر لەوەی بگەنە شارۆچکە و شارۆچکەکەیان بەسەردا بڕووخێ دابەزێ. هەندێ جێی لەشی دەزریکێنێ. دەموچاوی رێبوارەکان گەش بۆوە. پێکەنین دەنیشێتە سەر لێویان و ددانە خۆڵاوییەکانیان وەدەر دەکەون.

دەنگێك لە قوڕگییەوە هەڵدەستێ:"من لێرە... ئا لێرە دادەبەزم."

کوڕە سمێڵ باریکەکە هەر پێدەکەنی. سەگباب بەچی پێدەکەنی؟ بیبڕەوە دەی... بیبڕەوە. هەی دایکی خۆت و پێکەنینەکەت..."

"دەمەوێ دابەزم، لێرە دامبەزێنە. نامەوێ بچمە شارۆچکە."

"ماڵی عەلییە ریشە لێرە نییە."

"نییە؟ بۆ نییە، هەر لێرەیە... لە خوار پردەکەوە... دامبەزێنە."

شۆفێرەکە نەڕاندی:"بێدەنگ دەبی یان؟ بێدەنگ بە دەی. سەیارەکە راوەستیٚ، ئیتر ناکەوێتەوە ریٚ، بۆ نابینی؟"

هەموو رێبوارەکان وێکڕا گرماندیان:"بێدەنگ بە. ئەو پاسە بێت و راوەستیٚ، ئەگەر ئەو پاسە راوەستیٚ..."

"لە جێی خۆی نابزوێتەوە."

هەموو گیانی پاسەکە جیڕە و تەقەی دەهات. هەر دەتگوت ئێستا لەبەر یەك دەچیٚ و هەر پارەچەیەی بەلایەکدا دەکەویٚ و رێبوارەکانیش لەتوپەت دەبن.

"چما نابینی؟"

"کوێری؟"

"ئیفلیجی؟"

"کەڕی؟"

"ناتوانیٚ راوەستیٚ."

دەنگی شکان هات. شتێکی وەك شووشە شکا. بریسکانەوەی شووشەی شار کە چاویان ئازار دەدا، خرم و هۆڕ ورد و خاش بوون.... تاریکی باڵی بەسەر هەموو وڵاتدا کێشا. پشت ملی تەڕ بوو و برژایەوە. دەستی بۆ تەڕاییەکە برد. تاوێك دواتر قوڕە شلەتێنەکە وردە وردە لەسەر ملی داچۆڕایە خواریٚ.

کابرا چاو ریپۆقاوییە رەش ئەسمەرەکەی تەنیشتی گوتی:"ناتوانیٚ راوەستیٚ. ئەو پاسە لەهیچ ناتوانیٚ راوەستیٚ. جارێك راوەستا و هەموومانی بۆ بابمان ئاقڵ کرد. دەی دیارە ناتوانیٚ راوەستیٚ. تێگەیشتی؟ شتێکت هەیە؟"

"بەڵیٚ هەمە، هەمە. ئەگەر پاسەکە راوەستابا و من لەسەر پردەکە دابەزیبام..."

بێدەنگ بوون. هەموو وێکڕا خەونووچکە بردنییەوە. دەنگی خرم و هۆڕی شووشەی شارۆچکە بڕایەوە. شووشەکان جار نەجاریٚ بریقەیان دیٚ، تیشك دەدەنەوە و جار نەجارێکیش خرمەیان لیٚ هەڵدەستیٚ. تەپوتۆزەکە دەنیشتێتەوە و تاریکییەکە وڵات دادەگریٚ. شەق و هۆڕ...

کە لە پردەکە دەپەڕینەوە، چاوی قووچاند و ئاوەکەی نەدی. ژەنگەسوورە و کوێرەمارەکانی دیت، کە لەسەر وردکەبەرد و چەوەکان وەنەوزیان دەدا. باڵی ناسك و خەت خەت و پڕ لە دەماری شینیان، کە دەبریسکانەوە، لەسەرخۆ لێك دەکردنەوە و لێکیان دەنایەوە. هێڵی شین

شینی تۆخ لە دوورەوە دیار بوون... لەسەر وردە چەوی سپی وەك مردوو بەبێ جوولە... چەقە و گژ و گیا لە چنگیدا، چنگداگرتن لە گڵە خوێناوییەکە، گۆشتی پچڕاو و ئێسکە سپییە خوێناوییەکە... سەر لە عەرز کوتان و خۆگرمۆڵەکردنی لەبەر تریفەی مانگەشەو و خۆڵاویبوون و لکە مۆرتکەیەك بەدەستەوە...

کە گوێی لە جیڕەیەکی ناخۆش بوو، راوەستا. ئەو خەڵکە خۆڵاوییەی تەنیا چاو و ددانیان دەبریسکێتەوە، لە پاسەکە دادەبەزن.

"دابەزە برا... ماڵی عەلییە ریشە لە سەرەوەیە. بەو کۆڵانەدا بادەدەیەوە و راستەوڕێ سەر دەکەوی، سەر سەرێ... نێوەڕاستی باغێکی هەنار..."

ساڵی رابردوو، مارێکی رەشیان لە بیرەکەیدا دیتووە. پێنج مەتر درێژ. خوا بزانێ لەوانەیە درێژتریش... بەهێز... بیرەکەشی زۆر کۆنە، کە ئەو کلێسەیە دروست کراوە، ئەویش هەڵکەنراوە...

دابەزی. کابرایەکی خۆڵاوی. لەوێ لە نێوەڕاستی گۆڕەپانەکە، لە تەنیشت کۆگای پرتەقاڵەکان، پیاوە ریشدرێژەکان هاواریان دەکرد و دەنگیان لە گوێیدا دەزرینگایەوە، لەجێی خۆی چەقی. پاسەکە لەجێی خۆی نەدەبزووت. راوەستابوو و ئیتر نەیدەتوانی بجوولێت. هەر لەوێ پێی بە عەرزیەوە وشك بوو. تیریێژی خۆر وەك دەرزی لە لەشی رۆدەچوون. دەرزیی شووشەیی ورد و خاشکراو. هەمووان رۆیشتن. کەس هیچی بەو نەدەگوت. کەس ماڵی عەلییە ریشەی پێشان نەدەدا.

"ماڵی عەلییە ریشە لەوێ، لەسەر ئەو کێوانە، لە داوێن هۆو چیا وەنەوشەییە، لە بەر باران، لەوێ بارانێکی زۆر دەبارێ... لەوێیە."

لەوێ، لەو چیایە، ئەشکەوت و ماڵ و گوند... کەس ئەو ناناسێ. وەڕێ کەوت. بەترس و لەرزەوە و بە بن دیوار و لاشیپانی دەرگاکاندا بەسپایی و پێ دزە رۆیشت و رۆیشت و گەیشتەوە ماڵی دەروێش بەگ. لە بازاڕێ هەمووان سەیریان دەکرد. بۆ؟ لەبەرچی؟ با سەیری بکەن. بۆنی گوڵێکی کە دیار بوو رزیبوو، بەسەریدا هات. نێو بیرەکە، مارێکی رەش. لە بەر دەرگاکەوە گەڕایەوە بازاڕ. لەسەر کۆتەرەی بەردەم دووکانی ناڵبەندەکە دانیشت.

ناڵبەندەکە کابرایەکی چوارشانەی چاو گەورەی سمێڵ زلی بوو. خەنەی لە سمێڵی دابوو و سەری نووکی سمێڵی هەڵگێڕابوونەوە. نێوچاوان گرژ و زمان شڕ، ئەسپێکی شێی ناڵ دەکرد. ئەسپەکە جار نەجارێ خۆی رادەپسکاند و جووتەی داویشت.

"چ بووە؟ دەڵێی دەیەوێ بنیادەم بە چاو بخوا. شتێکت دەویست؟..."

"عەلیم دەویست. عەلییە ریشە."

ناڵبەندەکە هێور بۆوە و گوتی:"جا خۆ ئەو لێرە نییە. عەلییە ریشە پیاوێکی باشە. یازە سەر ئەسپیشی هەیە. بڕوانە برالە، جوان بڕوانە، هۆوێ، ئەو چیایەی مۆر دەچێتەوە... ئەو چیا پەڵەپەڵەیە دەڵێم. ماڵەکەی لە داوێنی ئەو چیایەیە.... ئەو هەر شەش مانگ جارێك سەرێك لێرە هەڵدێنێ. ئەویش بۆ ناڵکردنی ئەسپەکانی. من ئەسپەکانی ئەو ناڵ دەکەم. زینیش لە سەراج دەکڕێ. خۆ عەلییە ریشە نەبوایە، سەراج دەمێك بوو بەگوندا ریابوو. بەڵێ، ئەگەر ئەو نەدەبوو، ئێستا ئێسك و پرووسکیشی نەمابوو."

"لە عەلییە ریشە دەگەڕێم. ریشە.. ریشدرێژ... پانزە سەریشی ئەسپ هەیە. پانزە زین دەکڕێ. ئەسپەکانیشی دەڵێی ئەسپی شای پەرییانن. هەر هەمووشیان ئەسپی شێ. پەل ئەستوور و مل درێژ."

ماسیگرەی زەردباو، سپی و لۆق درێژ و دەندووك درێژ... بۆر و رەش. رەنگی یاسەمەنی ئاسمانی داگرتووە، لە جووڵەیەکی خۆڵاویدا...

دیسان گەڕایەوە کۆشك. لە ئەستوندەکەکە وەسەر کەوت و سەیری دیوەخانی کرد. چەقۆکان هەر وا لە تەختی ژوورەکان چەقیبوون. لە ئەستوونەکە هاتە خوارێ و لە دیواری باخچەکەوە خۆی فڕێ دایە دەرەوە و رای کردە بازاڕی ئاسنگەرەکان و بە هانکەهانك لە دووکانەکەی وەستا وەسمان وەژوور کەوت. دووکانەکە لە پێشدا بۆنی رەژوو و هەڵم و ئاسنی سوورەوەکراو و بۆنی گوڵی نیلوفەڕی لێوە دەهات. گوڵە نیلوفەڕ دیواری دیوەخانەکەی داپۆشیبوو. هەر شنەیەکی هەڵیدەکرد، عەترێکی سەرخۆشکەر لە دووکانەکە دەگەڕا...

"چەقۆیەکم دەویست. کێهە لە هەمووان باشترە. کێهە لە هەمووان باشترە مامە وەسمان... من... من... من..."

"ئەوەش چەقۆ. هەرە باشەکەیان."

دەنگێك وەك کوتکێکت لەسەریدا بێ، هات. هەموو گیانی لەرزی و پارەکەی دا و وەدەر کەوت. بەنێو شەپۆلی عەتری نیلوفەڕەکەدا تێپەڕی و هاتە دەرێ. نەیدەزانی روو لەکوێ بکا. بۆ کوێ بچێ و چ بکا؟ لەوانەیە بچێتە جێیەك چایەکی بخواتەوە. بەشکم لە شوێنێ، لە دووکانەکەی جاری جاران کەباب بخوا. بەشکم بچێتە سەرتاشخانەش. بەڵام ردێنەکەی هەر وەك خۆی وابوو. کە دەستی بە ردێنە زبرەکەیدا دەکێشا، چاوی بە چرای شارۆچکەکە کەوت.

پێیەکانی ڕاکێشیان کردە نێو باخچەی ماڵەکەی حاجی. دوو منداڵی دە دوازدە ساڵانە لەبەر دەرگای ماڵی حاجی جنێویان بەیەکتری دەدا و پێك هەڵدەپڕژان. هەتا تاریك داهات و ئیتر نەیدەتوانی بەجوانی بیانبینێ، ڕاوەستا و سەیری کردن.

هەردووکیان لە پەل و پۆ کەوتبوون. بای دایەوە پشت ماڵەکە و خۆی خزاندە بن هەنجیرەکە و خۆی کووڕ کردەوە و گوێی بە دیوارەکەوە نووساند، بەڵام گوێی لە هیچ نەبوو... بە ترسەترس سەری هەڵێنا و دەتگوت چاوی لە چاوی ژنە ئاڵقا... چاوە بۆشەکان ژنەکە، لە پێشدا بریسکەی شادییەکیان لێ هەستا و تاوێك دواتر بڵێسەی تووڕەییان لێ بۆوە و لە تاریکییەکەدا دامرکانەوە.

یوسف دیسان گوێی بە دیوارەکەوە نووساندەوە و پشووی لەخۆی بڕی. بەڵام دیسان هیچ دەنگێك لەو ماڵەوە نەدەهات. تەنانەت دەنگی پشوو هەڵکێشانێکیش.

# ١٢٢

ژنەکەی قەت نەیدیبوو وا بەکەیف و شاد بێ. دەهات و دەچوو و قسەی دەکرد و پێدەکەنی و سوعبەتی دەکرد. زۆریش دڵاوا ببوو. ئەگەر جار و بارەش مۆن نەبوایە و سێبەری ترس و دڵەڕاوکێ لە روخساری نەنیشتبا، لەوە باشتر هەر نەدەبوو. هەموو شتێك جوان بەرەو پێش دەچوو. خودا لەو دەروێش بەگە رازی بێ. بەخوای کابرایەکی باش و دڵاوا و لێوەشاوەیە. ئەو هەمووە زەوی و زارەی دانا. بەو زووانە ئاقچاسازیش وشك دەبێ، نیوەی، تەنانەت نیوەی پتریش... رەحمەت لە گۆڕی باوکی.

ماهیربەگ لەسەرخۆ و مات بەرچایی دەخوارد. شادی لە ناخیدا کڵپەی دەسەند و دادەمرکایەوە و خەفەتێکی نادیار جێی دەگرتەوە. ئەو خەمە چ بوو؟ لە کوێوە دەهات؟ لە حاڵێکدا شادییەکەی هەر دەبوو دانەمرکێتەوە و نەڕەوێتەوە. دە ئەوەندەی تۆڵە لێ کردبۆوە. حەیای پێوە نەهێشتبوو. داخی دڵی خۆی پێ رشتبوو و حەجمینی لێ هەڵگرتبوو و وەك سەیەکی داماوی لێ کردبوو. یوسفیش ئەمڕۆ نا سبەی هەر دەگیرێ. مەحاڵە لە داوی نەخەن. کە گیراش... دیسان داڵغەی لێ دایەوە... ئەو کات... ئەو کات... بێت و دەروێش سۆسەی بکا، ئەوکات... ئەوکات... تەزوویەك بە تیغەرەی پشتیدا هات. کە بیری لەوە کردەوە، بێت و دەروێش سۆسەی بکا، هەموو گیانی لەرزی و تینی لە گیانی بڕی.

لە خوارەوە گوتیان نەقیب هات. سەری سووڕ ما. نەقیب هەرگیز بەتەنێ نەهاتبووە ماڵەکەی. بێ و نەبێ شتێك قەوماوە، کە بەو کەڕەی بەیانییە هاتووەتە ماڵی. هەستا و بەرەو پلیکانەکان چوو. نەقیب شڵەژاو و ترساو دیار بوو. نیگای شڵەژاوی لە ماهیربەگ بڕیبوو و داوای شتێکی لێ دەکرد. لە حاڵێکدا هەوڵی دەدا بزەیەکی بێتێ و نەیدەتوانی، گوتی:"ماهیر بەگ، ماهیر بەگ..."

دەستی ماهیر بەگی گوشی و لەسەر ئەو مۆبلەی فەرمووی کردبوو، دانیشت. ماهیریش رووبەڕووی دانیشت.

نەقیب هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی:"ماهیر بەگ، لێم قەوما. لە دوێنێ شەوێوە پەیتاپەیتا لە ئەنکەرەوە تەلەگرافم بۆ دێ. لە وەزارەتی نێوخۆوە چوار تەلەگرافم بە ئیمزای وەزیری ناخۆ بەدەست گەیشتووە. زۆر بەو مەسەلەیەی دەروێش بەگ هەڵبەزیونەتەوە. دەیانەوێ دەسبەجێ یوسف قۆڵبەست بکرێ. دەسبەجێ. کەڕەی بەیانی قایمەقام تەلەفۆنی کرد و گوتی، بۆ گرتنی ئەو یاخیی پیاوکوژی خوێنمژە، چەندت هێز دەوێ بۆتی دەنێرم. هەر بەراستی نازانم چ بکەم. خۆ بێت و ئەو پیاوکوژەم پێ نەگیرێ، ئابڕوو و حەیام دەچێ. ئەنکەرە زۆر پێداگرە... ئەنکەرە... دەبێ بیگرم ماهیر بەگ. دەستوداوێنت بووم یارمەتیم بدە. ئەگەر ئەو پیاوە بگرین، چیم لەدەست بێ بۆتی دەکەم. تۆ ئەو چاکەیەم لەگەڵ بکە و منیش بەڵێن دەدەم بۆت قەرەبوو بکەمەوە."

بەبێ راوەستان ئەوەندە قسەیەی کرد. سەیری پێش خۆی دەکرد و بێدەنگ دەبوو و چاوە شینەکانی تەڕ دەبوون و دەینەڕاند:"باشە چ بکەین؟ دەبێ چ بکەین؟ کابرایەکی کەس نازانێ کێیە و چۆنە، لەکوێ بدۆزینەوە؟"

ماهیربەگ بە زەردەیەکەوە و وەك پیاوماقوولان گوتی:"دەدۆزرێتەوە. دەڵێن پیاوی بزربوو سووك و سانا نادۆزرێتەوە، بەڵام وا نییە، دەدۆزرێتەوە. دەدۆزرێتەوە."

"کوڕە نازانم ئەنکەرە بۆچی ئەوەندە لەسەر رووداوە سوورە و پێی هەڵبەزیوەتەوە؟"

"ئەنکەرە، ئەنکەرە... ئەو ئەندام پەرلەمانە دەناسیت، کە مەزراکەی ئەو خوارەوەی کڕیوە؟"

"دیتم، دەیناسم."

" دەزانی کێیە؟ ئەو پاڵەوانە. جا لەگەڵ عارەب و عەجەمدا دەستی تێکەڵە. هەم پیاوی عیسمەت پاشایە و هەم جەلال بایار و هەم فەوزی چاخماخ. دوژمنی قەستەسەری دەروێش بەگیشە. جەنابی نەقیب، هەقتە. هەندەی خودا حەزدەکا هەقتە ئاوا پەرێشان و شڵەژاو بی. بێت و ئەو هەتیوە نەگیرێ، ماڵوێران دەبی. نەك هەر کاروباری سەربازییەکەت، بگرە ژیانە تایبەتییەکەشت دەچێ. وا لەبەر چاوی حوکمەت دەکەوی، تا هەتایە جێی خۆت نەگریتەوە.

نەقیب بە لەبزێکی سەربازییانە گوتی:"دەزانم. هەر بۆیەشە بەو کەڕەی بەیانییە سەرودڵی تۆم گرتووە. خودا نەکا، ماهیر بەگ، خودا بەوێ رۆژێ نەکا."

"خودا نەکا."

ماهیربەگ دەموچاوی خستە نێوان هەردوو لەپی دەستییەوە و فکر و خەیاڵ هەڵیگرت. لەو دەمەیدا نوقمی بیرکردنەوە بوو، کچۆڵەیەك لە دوو کووپی زێڕنیشاندا قاوەی بۆ هێنان. هەر کام جگەرەیەکیان داگیرساند.

"چ بکەین؟"

ماهیر بەگ بە چاو و جووڵەی سەری وەك بڵێی ئاگاداری بکاتەوە: بێدەنگ بە، با فکرەکانم نەڕەوێنەوە. نەقیبیش بێدەنگ بوو و چاوی لە پێشەخۆیەوە بڕی. نەقیب وای هەست کرد ڕۆژێك بێدەنگ بوون. ماهیر بەگ ئاخرییەکەی سەری هەڵێنا و گوتی:"بەدڵ و بەگیان یارمەتیت دەدەم. جارێکی دیکەش دەبێ دووپاتەی بکەمەوە، نابێ دەروێش بەگ بەهیچ جۆرێ سۆسەی ئەوە بکا من یارمەتیدەرتم. بێت و بزانێ لە پێشدا من دەکوژێ و دواییش فیشەکێك لەنێو زاری خۆی دەکا."

نەقیب گرماندی:"نازانێ نا."

بۆخۆشی لەدەنگەکەی خۆی ڕاچەنی.

"ئەگەر نەزانێ قازانجێکی دیکەشی هەیە. ئەویش ئەوەیە، کە من دەتوانم بنج و بناوانی مەلەسەکە لە زمانی خۆی دەرکێشم. ئەو ناتوانێ پەیوەندییەکەی لەگەڵ یوسف بپسێنێ. بەڵام ئەگەر پێی وابێ یسوف دەگیرێ، بێ ئەملا و ئەولا سەری بەگۆمێدا دەکا. یان بە کوشتنی دەدا، یان دەسبەجێ خۆی دەیکوژێ. ئەگەر وابێ، ئیتر کەسێك بە ناوی یوسف، یوسفی کوڕی مەحموود نامێنێ. ئەو کاتەیە ئیتر ئێمە بەشوێنی یوسفێکی مردوودا دەگەڕێین. جا تۆ ورد گوێم لێ بگرە، با من نەخشەی خۆمت پێ بڵێم. ئەگەر جەنابت بەو توانا بەرزە سەربازییەی خۆت ئەم نەخشەیەی منت بەدڵ بێ، دەسبەجێ دەست بەکار دەبین."

"بەچاوان ماهیر بەگ، جارێ با ئەو کوڕە بگرین... ئەگینا..."

"کەوابوو تکا دەکەم ئاگادار بە جەنابی نەقیب. من دە هەزار لیرەی تورك بەو کەسە دەدەم یوسفم بە زیندووی بۆ بگرێ. بەڵێ گیانەکەم، بە مردوویی بەکاری ئێمە نایە، مردووەکەی پووشێك ناکا بۆ ئێمە. ئەنکەرە ئەوی بەزیندوویی لەئێمە دەوێ، بۆ ئەوەی ئەو دەرەبەگانەی پێوە تەمبێ بکا. هەر بۆیەش هەرکەس جا جەندەرمە بێ یان خەڵکی ئاسایی، دە هەزار لیرەی تورکیی خەڵات دەکەم ئەگەر یوسفم بە زیندوویی بۆ بگرێ. جا هەر باسی خەڵاتەکە دەکەی، ناوی من ناهێنی."

ترووسکەی هیوا لە چاوەکانی نەقیبدا درەوشایەوە و گەش بووەوە و گوتی:"زۆر باشە، لەوە باشتر نابیّ. دەهەزار لیرە نا، هەزار لیرەش، سەد لیرەش بەسەر بۆ ئەوەی هەموو گوندی قۆڵ هەڵماڵن بۆ گرتنی."

بە داخ و کەسەریشەوە سەری راوەشاند و سێبەری خەفەتێك کەوتە سەر چاوە شینەکانی و لەسەری رۆیشت:"مخابن، مخابن، زۆر بەداخەوە گوندییەکان گەلیّ هەژارن. هەموو دنیا ئەوە دەزانیّ و ئەو کۆمۆنیستی کافر و سەگبابی وەك عەلیی عەریزەنووسیش ئەوە زورنا لێدەدەن و بەهەموو دنیایدا بلاّو دەکەنەوە. وەك بلێی هیچ شتێکی دیکە نییە بە دنیای رابگەیەنن، جیا لە ژیانی نالەباری خەڵکی ئەو گوندەی ئێمە."

ماهیر قسەکەی لەزاری وەرگرتەوە:"نازانن. ئەو کۆمۆنیستە ترکەنانە هیچ نازانن، کە ژیانی گوندیی تورك قەت باش نابیّ. یان دەزانن و هەر دەیانەویّ نانێکی سیاسیی لیّ بخۆن بۆیە وا دەکەن. چونکە گوندیی تورك هەر لە بنیّ خۆی تەمبەڵ و تەوەزەلە کاکی من. خۆ دەبینی، تەمەڵ و دەستوپیّ سپی و خۆڕین. خودا تورکی دێهاتیی هەر بە تەمەڵی خولّقاندووە. کەس نالّیّ وا نییە. حاشای لیّ ناکریّ. گوندیی تورك واتە تەمەڵی و تەوەزەلی. رۆژ هەتا ئێواریّ کاریان نووستنە. دەی ئەوە گوتنی ناویّ، روون و دیارە. ئیشێکی دیکەیان ئەوەیە، هەر گوێیان لە ناوی دە هەزار لیرە بیّ، مل دەنێنە دەشت و چیا و لە کونەمشکیشدا بیّ یوسف دەدۆزنەوە. بەلاّم با لایەنەکانی دیکەی نەخشەکەمت بۆ باس بکەم. ئێمە "وەلی"یەکمان هەیە... وەلی دوژمنی قەستەسەری دەروێشە. دەروێش زۆری سووکایەتی پیّ کردووە. عەرزم بە حوزوورت جەنابی نەقیب، بنیادەم گوندییەکیش بیّ، نابیّ بیشکێنیتەوە. ئەو نەگبەتانە بەگیانی ناخێریان لەوەتەی دنیا دنیایە وەك سەگ ژیاون و وەك کرم بەسەریەکدا کەوتوون و بای خەیاڵیشیان نەبووە، بەلاّم هەر سووکایەتییەکیان پیّ دەکریّ و جوێنێکیان پیّ دەدریّ، دڵیان دێشیّ. زۆریش قین لەدڵن و هەر دەرفەت بێنن وەك مار پێتەوە دەدەن. دەروێشیش ئاوای لەو کلك هەڵتەکێنەیەی ئێمە کردووە."

جا گەڕاوە و نەڕاندی:"با وەلی بیّ."

تاوێك دواتر لە پلیکانەکانەوە دەنگی پیّ هات و وەلی کلاّوێك بەدەستەوە لە بەردەمیان راوەستا. دەموچاوی چرژا بوو و ئێسکی روومەتی دەرپەڕیبوو. وا تاوەسووت ببوو دەتگوت قولە زەنگییە. چاوی بەقووڵدا چوبوون. پانتۆڵە رەشە کاڵ ببووەوە و شیی ببۆوە و خۆڵاوی بوو. یەخەی کراسەکەشی پینە کردبوو. پینەی قوماشێکی خەنەیی.

ماهیر بەگ گوتی:"وەلی، زۆر دڵم بەتۆ خۆشە و متمانەی تەواوم پێتە. جەنابی نەقیب و من داوا لە تۆ کە خۆت کۆنە یاخییەکی بەناوبانگی، دەکەین، ئەو هەتیوە، هەر ئەو هەیتوەی بە فیتی دەروێش هەڵخەڵەتاوە و حاجیی کوشتووە، بگری. ئەگەر گرتت، ئەوە لە خزمەتی نەقیبدا بەڵێن بێ، هەر بە دەستی موبارەکی جەنابی نەقیب دە هەزا لیرەت خەڵات دەکەم. ئەوجار جەنابی نەقیب بە شایەت دەگرم، پێنج سەد دۆنم زەویشت لەو ئاقچاسازە بەناو دەکەم کە بەو زووانە وشك دەکرێ."

وەلی گەش بۆوە و بەخۆشییەوە گوتی:"ئەوە قسەیەکی بەجێیە. سێ رۆژ نابا دەیدۆزمەوە، بەڵام..."

بە شەرمەوە سەری داخست و دەستی لێك خشاندن و دووپاتەی کردەوە:"بەڵام..."

ماهیر بەگ گوتی:"بڵێ، دەی بڵێ دەی."

"هەزاریم بە نەقدی بدەیە."

"باشە، دەیدەم."

وای گوت و هەستا و لەسەری رۆیشت:"دەیدەم. بەڵام ئەگەر یوسف نەگری... من بە سەری زیندوویی دەمەوێ، بەمردوویی بەکارم نایە."

"دەزانم."

"ئەگەر نەیگری، هەزار لیرەکەت لەسەر دەنووسم."

"باشە، بینووسە."

ماهیر چووە ژوورەکەی تەنیشتی و بە چەپکە دراوێکەوە گەڕاوە و بە وەلیی گوت:"هانێ، یالڵلا دەی، خێرا دەست پێ بکە."

نەقیب:"سوپاس، سوپاس ماهیر بەگ. نازانم چۆن چاکەت بدەمەوە."

ماهیر بەگ بە لوتبەرزییەکەوە گوتی:"تکایە. شایانی نیە. ئێمە لە پێناوی نیشتمانەکەماندا ئامادە و گیان لەسەر دەستین جەنابی نەقیب. ئیزن مەدەن زیان بە دوایی دەوڵەتی تورك بگا. مەهێڵن کەس بچووکترین زیانی پێ بگەیەنێ. لەشکری ناوێ. ئێمە بە گیان و دڵ، خۆ ئاگات لێیە، بە گیان و دڵ لە خزمەتی دواین دەوڵەتی ئازیزی تورك داین... بەڵام سێهەم بەشی نەخشەکەم... عەرزت بکەم..."

"فەرموو، فەرموو ماهیر بەگ، گوێم لێتە."

"ئەو هێزەی قایمەقام ناردوویەتی کەی دەگاتێ؟"

"ئەمرۆ عەسر."

"ئەو هێزە بە فەرماندەیی حەسەن نایب عەریف دەنێریتە چیا، ئەو هێزە گوندیی چاوترسێن دەکا."

"هێزێك نییە، بەتالیۆنێکە ماهیر بەگ."

"باشتریش. عەرز بیٚ، ئەو بەتالیۆنە دەردێك دەدا بەگوندی و وا بە گۆڕی بابیاندا دەڕێنیٚ، هەر هەموویان لە دەروێش بەگ و پیاوەکەی بێزار دەبن. لەمەولا هەر ناوی دەروێش بەگ و یوسف دەبیستن... عەرزم بە حوزوورت، هەر گوێیان لە ناویان دەبیٚ..."

"دەزانم ماهیر بەگ، تێگەیشتم. راست دەکەی."

"ئەوجار لە بۆغە کێو، کابرایە هەیە بەناوی عەلییە ریشە، خۆ لێم تێدەگەی؟ عەلییە ریشە، خزمی دەروێش و دەستە راستییەتی. دەبیٚ بیانوویەکی لیٚ بدۆزینەوە و ئیسك و پرووسکی بهاڕین و پشتی لە زگی نەرمتر بکریٚ و بخرێتە تەویلە، با دەروێش بەگ شێت بیٚ  و سەری لیٚ بشێویٚ و بە دەستی خۆی یوسف بکوژیٚ، جا ئەو دەمە ئێمەش لەقاوی دەدەین..."

"یوسف دەکوژیٚ؟"

"بەڵیٚ، هەر هەست بە مەترسی بکا، دەیکوژیٚ."

"ئەی دادئەستێن و دادگا؟"

"ئەتۆ خەمی دادئەستێن و دادگات نەبیٚ جەنابی نەقیب. جێگری سەرۆکی گەورە بە تێبینی و پشتگیریی ئێمە ناردووەتە ئەنکەرە. لەمەودوا بەبیٚ رەزامەندی و ئیزنی ئێمە تەنانەت ناتوانن نامەبەرێکیش بنێرنە ئەو شارۆچکەیە. لەمەوپێش، ئاااخ، لەمەوپێش ئەو نیشتمانە ئازیزە، ئەو دوا حوکمەتی تورکە تێدا چوبوو. هەتا دەروێش بەگ قایل نەبوایە، تەنانەت نەیاندەتوانی پیاوێکی پیتاك وەرگریش بنێرنە ئێرە. چما کاری وا لە تورکیای مەزن دەوەشێتەوە؟ ئەو کات تورکیای مەزن راست و روون یەخسیری بەر دەستی چەند پاشماوەیەکی ئاغا و دەرەبەگایەتی بوو. ئێوە دادئەستێن و دادگا لێگەڕێن بۆ من و هیچ خەمی ئەوەتان نەبیٚ. لە مەزراکەی دەروێش بەگیش خافڵ مەبن.... بنکەیەك لە بەر ئاوایی دابنێن. هەر بۆ ئەوەی مێشکی تێك بدەن... لێی گەڕێن با شێت بیٚ..."

"ئەتۆ ئەو بەشەی بهێڵەوە بۆ من، کارت نەبیٚ."

هەستا و قیت و رەپ راوەستا. دەکرا بڵێی، هەر لە ئێستاوە بە مرازی دڵیان گەیشتوون. گیرانی یوسف بابەتی رۆژ بوو. ئەویش بیٚ ئەملاوئەولا زۆری نەدەبرد و دەگیرا. لەسەر لینگە درێژ

و باریکەکانی و بە جزمە بریقەدارەکانییەوە ئەم پێ و ئەو پێی کرد. دەتگوت گورگێکی زەردە. سەرکەوتنی زۆر گەورەیان لەبەردەم بوو.

"زۆر سوپاس. خواحافیز."

ماهیر بەگ هەتا بەر دەرگایەی بەڕێ کرد و لەوێ گوتی:"ئەگەر لە ئەنکەرەوە، لە ئەدەنەوە، فەرمانێك شتێك هات... ئەوە من لەماڵەوەم. هەر ئەمرێکی هەتبوو، لە خزمەتت دام. ئەرێ هەر بەراست مەسەلەی گوندییەکانی ئاقچاساز چیی لێ هاتەوە؟"

نەقیب گوتی:"لە سایەی سەرتانەوە، دامرکایەوە."

لەبەر دەرگای ماڵێ، توند پاژنەی لێك دان و دەستەونەزەر سڵاوی سەربازیی داو و وەك سەربازان لەسەر پاژنێ و پەنجەی پێی سووڕایەوە و بە گورگە لۆقە دوور کەوتەوە.

"کوڕە ئەو شارۆچکەیە بنیادەمی چەندە باش و برادەی و دۆست و خێرخواز و نیشتمانپەروەری تێدایە..."

نەقیب زۆر دڵخۆش و بە کەیف بوو.

شارۆچکە جموجۆڵێکی تێکەوتبوو. شڵەقابوو. گرتنی بنیادەمێك دەستی پێ کردبوو. گوندی، شارۆچکەییەکان، منداڵ و پیر و گەنج بە شوێن گەنجێکی کەڵەگەتی کاڵی هەژدە بیستساڵەوە بوون، کە چاوەکانی کەسك یان تۆزێك مەیلەوشین دەچوونەوە و شوخاڵی کۆنەبرینێك بە لاروومەتییەوە بوو و بەردەوام پێکەنینێکی لەسەر لێوی بوو و کە پێدەکەنی ددانی سپیی منداڵانەی دەتگوت شیرن دەردەکەوتن. برۆی پڕەکانی تێکەڵ ببوونەوە و سەری چەناگەی چاڵێکی تێکەوتبوو. بە چیا و دەشت و مێشەڵانەکە وەرببوون و سەریان بە هەموو کون و کاژێر و ئەشکەوت و شیو و دۆڵ و بن بەرد و کەلێنێکدا دەکرد. گاڵتەی پێ نەدەکرا، قسە لە دەهەزار لیرە و پارچە زەوییەکی ئاقچاساز بوو. دەهەزار لیرە لەو وڵاتەدا سامانێك بوو بە کەس پەیدا نەدەبوو و خەڵکی ئێرەش هەر بەخەونیش چییە ئەوەندەیان پارە نەدیتبوو. سەدان و لەوانەیە هەزاران کەس دەبوون کە بە کەفوکوڵ و جۆش و خرۆشەوە و نوقمی خەیاڵ پڵاوان، ملی خۆیان لە تیخ دەسوی و لە رەوەزان وەسەر دەکەوتن و خۆیان لە قامیشەڵان و دڕووەڵان و مێشەڵانێدا دەکرد و سەرتاپا قوڕاوی و بە جلوبەرگی ریشاڵ ریشاڵەوە بە شوێن کەسێکدا دەگەڕان. مەحاڵ بوو لە چنگی ئەو هەزاررە زیلەیەی بەشوێنییەوە بوون، دەرباز بێ.

ئاسنگەر و عارەبانەساز و پینەچی و قاوەچی و بەرگدروو و مسگەر و فافۆنچی و شۆفێر تەراکتۆر و ترۆمبێل و عارەبانە و مڵکدار و قومارچی و بەرەڵڵا و هەرچی و پەرچی و هەرچی

پیشەگەر و بێ پیشەیە دەستیان لە ئیش هەڵگرتبوو و هەموو باسی ئەو گەنجەیان دەکرد کە ناو نیشانی درابوو. شارۆچکە و هەموو گوندەکان و منداڵ و ژن و...

ماهیربەگیش سەری لەوە سوور ما. هەموو پیاو و دۆستەکانی ماهیربەگیش، نەقیبیش و... فکر و زیکری شارۆچکە ببووە یوسف و دەروێش بەگ.

"حاجییە شێتەی داماو. ئەو چارەڕەشە قەت ئاوێکی خۆشی لە گەرووی نەچووە خوارێ."

"کاری بەسەر کاری کەسەوە نەبوو."

"من دەمناسی..."

"منیش، منیش... کوڕی بێوەژنێك بوو. ماڵیان لە گەڕەکی ئێمە بوو. لە سایەی سەری ئەوەوە، گەڕەکەکەی ئێمە پازدە ساڵیش هێلکە و مریشکی لێ نەما. لە هەر جێیەك بۆنی مریشك و هێلکەی دەکرد، لە چاوتروکانێکدا دەیدزی."

"حاجی دزێك بوو... هێلکەی لەبەر قەل و رۆڵەی لەبەر دایك هەڵدەگرت. ئەو شارۆچکەیە پەنجا ساڵی دیکەش دزێکی ئاوا تەڕدەستی لێ هەڵناکەوێتەوە. لە حەوت ساڵانەوە دەستی پێ کرد و چیی دەست کەوت، دزیی، ئاخرییەکەی..."

"بیبڕنەوە، بیبڕنەوە. نابێ لە پاش مردووان ئاوا قسە بکەن."

"دوای ئەوە یەك جێ، باسەکەیان لە دزی و چەتەییەوە گۆڕی و وەك پیاوچاکێکی دەست و داوێنپاك باسی حاجییان کرد."

"پیاوچاکێکی دەست و داوێن پاك."

"بەڵام ئەجەل مۆڵەتی نەدا."

"دەروێش بەگیش کوشتی."

"حاجیی لێقەوماو."

"کابرایەکی بەستەزمان بوو. پیاوێکی خودای بوو."

"باشە ئەتۆ بەگیانی ناخێرت بەگێکی گەورەی. وەچەی ساری ئۆغڵیی بەناوبانگی. ئەو کەسەی وەك پیاوان لە عوسمانلی راپەڕی. باشە ئێستا بە چ بیانوویەك دەستی خۆتت بە خوێنی وەها داماوێك سوور کردووە؟"

"وادەزانن حاجی بێ کەسە؟ کێ بوو ئەوەی سلێمان ئەسڵان سۆوی پەنجە، ئەو هەڵۆ بەرزەفڕەی چیا بەرزەکانی کوشت؟"

"دەی خۆ دیارە."

"ئەو حاجی قۆرت بۆغایەی زەوی و ئاسمان لەبەری دەلەرزی؟ کێ کوشتی؟ کێ دەستی لە پشتی جارچییە چڵمن دا؟"

"دەی خۆ دیارە."

"بێت و وا بڕوات، چوکووراوا بنیادەمی تێدا نامێنێ."

"چوکووراوا وشك دەبێتەوە."

"ئێرە وەچەی بنیادەمی تێدا نامێنێ."

"پەلە مەکەن با ئەو گەنجە بدۆزرێتەوە."

"نەقیب سوێندی خواردووە و گوتوویەتی..."

"گوتوویەتی، من ئەو هەتیوە دەدۆزمەوە و وەقسەشی دێنم. ئەگەر هەر قسەشی نەکرد، بە مەرەدی بابی دەچێ."

"لە دەم رووبارەکە.."

"سەگەل تەرمەکەی لەتوپەت دەکەن."

"وردکە بەردە سپییەکان بەخوێنی سوور دەبن."

"نەقیب گوتوویەتی، دەیدۆزێتەوە."

"با بیدۆزێتەوە، دەیدۆزێتەوە، هەر دەبێ بیدۆزێتەوە."

"بێ ئەملا و ئەولا دەیدۆزێتەوە."

"خۆی لە بن باڵی باڵندەش شاردبێتەوە..."

"نەقیب هەر دەیدۆزێتەوە."

"دەشت و چیا لەبەر مرۆڤ جمەی دێ. بووبێتە مشك و چووبێتە نێو کونیشەوە و بووبێتە مەل و فڕیبێ، تەنانەت بووبێتە جنۆکە و بەچاویش نەبینرێ، دە هەزار لیرە، دە هەزار لیرە..."

"هەرچۆنێك بێ دەیدۆزنەوە."

"چووبێتە نێو کونەماریشەوە..."

"چووبێتە کەوڵی هەر ئاژەڵێکیشەوە."

"ئەگەر نەبەدییش بووبێ..."

"دوو رۆژی دیکە نابا، دەیدۆزینەوە و دەیهێننەوە..."

"جا نەقیب هەموو شتێکی لێ دەردێنێ."

"دەری دێنێ."

"ناتوانیٚ وەقسەی بیٚنیٚ."

"نەقیب کەلوپەلی وای لە ئەمریکاوە هیٚناوە، بەردیش دیٚنیٚتە زمان."

"هیچ نالیٚ. ئەوە کوڕی مەحموودە کوردەی پیٚ دەلیٚن. کوڕی باوکی خۆیەتی."

"چما دەرویٚش بەگ شیٚتە، پیاو بە یەکیٚك بکوژیٚ، قسەیەکی تیٚدا رانەوەستیٚ؟ دەم هەلٚناپچڕیٚ."

"بەردیش بیٚ، پۆلاش بیٚ، ئاسنیش بیٚ، نەقیب وەقسەی دیٚنیٚ."

"ئەمریکا وەقسەی دیٚنیٚ."

"بەویش دەلیٚن ئەمریکا."

"ئەمریکاش بیٚ، بابی ئەمریکاش بیٚ، ئەو متەقی لیٚوە نایە. ئەمریکا هەر شتیٚکیشی دروست کردبیٚ، ناتوانیٚ ئیمان و باوەڕی پۆلاییینی ئەو بشکیٚنیٚ."

"کوڕە باوەڕ، گالتەی پیٚ ناکریٚ."

"پیٚی ناکریٚ."

ناوە ناوە هەوالی گیرانی یوسف دەهات و شارۆچکەی دەهەژاند و بەندی جەرگ و دلی خەلکی گویٚ قولاغی شارۆچکەکەی دەپساند. زۆر شتی سەیر و سەمەرە سەبارەت بە یوسف دەکەوتە سەر زار و زمانان. باسی رەچەلەکی یوسف، خالوانی و باوکی و پەروەردەی بە دەستی دەرویٚش بەگ و ئەوەی کە ئاخۆ لەبەر ئەو کەلوپەلەی لە ئەمریکاوە بۆ ئەشکەنجە هاتووە خۆی رادەگریٚ؟.... شارۆچکەکە سەیر شلەقاوبوو و کەوتبووە جموجۆل. هەمووان لە مەسەلەی یوسف و دەرویٚش و حاجییان دەکۆلییەوە. لە هەموو شتیٚکەوە دیار بوو کە یوسف هەرچۆنیٚك بیٚ، دەگیریٚ.

لەو جەنگەیەدا، کۆمەلیٚك رووداوی چاوەڕواننەکراو و جیٚی داخیش روویان دا. وەرزیٚرەکانی ئاق تۆزلۆ، لە گوندی حاجیلار گەنجیٚکیان گرتبوو، وایان زانیبوو یوسفە و کە ویستبوویان بیبەن بۆ شارۆچکە، خەلکی حاجیلار پیٚی دەزانن و ریٚیان لیٚ دەگرن و دەلیٚن:

"ئەوە چ دەکەن؟ بەرۆکی ئەو مندالە بەردەن. لیٚتان تیٚك چووە. ئەوە هەو نییە. ئەمە کوڕی سمایلە تونگۆتای ئاواییەکەی ئیٚمەیە. لیٚتان تیٚك چووە..."

بەلام ئاق تۆزلۆییەکان ئەو قسانەیان بەگویٚدا ناچیٚ. وەك گویٚزیان بۆ بژمیٚرن. گوتبوویان:

"ئیٚوە دەتانەویٚ هەلمانخەلەتیٚنن و یوسفمان لە چنگی دەربیٚنن و خۆتان بچن و لە شارۆچکە دە هەزار لیرەکە وەرگرن. ئەنگۆ ناتوانن کلاو لەسەر ئیٚمە بنیٚن."

ئاخرییەکەی هەر دوو گوندەکە تێك بەردەبن و دەبێتە جەنگی مەغلۆوبە و دوو رۆژ لەسەر یەك، لە دەشتەکەی ئاناوەرزادا لێك دەکەن. ئەوان ئەگەرچی بۆشیان روون ببۆوە کە ئەوە یوسف نییە، بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو و شەڕەکە هەڵاییسابوو و سەروگوێی یەکتریان شکاندبوو. ئاق تۆزلۆییەکان، کە گوێیان لە قسەی حاجیلارییەکان دەبوو، دەیانگوت:"ئەی باشە ئەو لە دارستانە بییەکەی ئاقچاسازدا چیی دەکرد؟ دەی بڵێن دەی، ئەگەر ئەو یوسف نییە، ئەی لەوێ چیی دەکرد؟"

ئەوانیش نەیاندەزانی چۆن وەڵامی ئەو پرسیارە بدەنەوە و بیبڕێننەوە.

هەواڵی هەموو ئەو رووداوانە دەگەیشتەوە کۆشکی دەروێش بەگ. دەروێش بەگیش لەسەر هەست بوو و بە بیستنی هەر هەواڵێك دەگەشایەوە و زیندوو دەبۆوە. هەر لە یەکەم رۆژەوە، رەعیەتەکانی کۆ کردەوە و کوێخای گوندی ئۆکسۆزلۆ و ئەو کەسانەی خەڵکی ئۆکسۆزلوو بوون و متمانەی پێیان بوو، بانگ کردبوون و بەهەمووانی گوتبوو:"بڕۆن یوسفم بۆ بدۆزنەوە. لە هەر کون و کاژێرێکدا خۆی شاردبێتەوە بۆمی بێنن. بەڵام نەهێڵن کەس بزانێ. هەر کەس یوسفم بۆ بدۆزێتەوە و بۆمی بێنێ، ئەوەندەی خەڵات دەکەم تا مردن هەر بیخوا و نەبڕێ... حکوومەت دە هەزار لیرەی بۆ گرتنەکەی ئەو تەرخان کردووە، ئەمن دوو ئەوەندە دەدەم. هەرکەس یان خزم و کەسی هەر کەسێك یوسفم بۆ بێنێ، هەتا لەو دنیایەن، نەبوونی و هەژاری نابینن. یاڵڵا دەی، مەیگنخێنن و خۆ مەخافڵێنن و بەر لەوەی بکەوێتە دەستی حوکمەت، خۆتان دەست بەکار بن. ئەوان یوسف ناناسن، بەڵام ئێوە دەیناسن."

ئیتر گوندی و کوێخای ئۆکسۆزلوو و پیاوەکانی، دەمێك بوو چاویان بەسەر هەموو رێگاکانی دەوروبەرەوە بوو و سەریان بە هەموو ئەو کون و کەلێنانەدا دەکرد کە لەوانەبوو یوسف رووی تێ بکا. هەموو رۆژێ و سەعات بە سەعات، ئەو هەواڵانەی دەچوونە شارۆچکە، دەگەیشتنە کۆشکەکەی دەروێش بەگیش.

دەروێش بەگ خەوی لێ نەدەکەوت و شەو تا بەیانی ئەمسەرئەوسەری کۆشکەکەی دەکرد و دووپاتەی دەکردەوە:"لەکوێی یوسف؟ لەکوێی کوڕم؟ ئەی خۆزگە ئەقڵت دەیبڕی و سەرێکت بە کۆشکدا دەکردەوە. وەرە کوڕم، وەرەوە، ئەگەر بێییەوە..."

بە چزووی پەشیمانبوونەوە ـ لەوانەیە ئەوە یەکەم جاریشی بووبێت ئەو چزووە لە دڵی رۆچووبێت ـ خۆی لۆمە دەکرد. خۆی لۆمە دەکرد و ئەو مەتەڵەی بۆ هەڵنەدەهات. هەر جینگڵی دەدا.

هێشتا تاو نەکەوتبوو، بەڵام لێواری ئاسمان سپی دەچۆوە. سێ گوندی کە دوای گەڕان لە یوسف گەڕابوونەوە ئاوایی و هەواڵی یوسفیان بە بەگ دابوو، ئێستا دیسان دەچوونەوە بەشوێنیدا بگەڕێن. دەروێش بەگ گوێی لە دەنگی ترۆمبێلێك بوو و دەسبەجێ سۆسەی کرد لەوانەیە کێ بێ. لە پێشدا، دڵی بەوە خۆش بوو کە ماهیربەگی برادەری هاتووەتە سەردانی، بەڵام دوایی نیگەرانی چنگی لە دڵی داگرت. بێ و نەبێ شتێکی خراپ قەومابوو بۆیە ماهیر بەو کەڕەی بەیانییە هاتبووە گوند. رای کردە بەرهەیوانەکە و هەر چاوی بە روخساری گەشی ماهیر کەوت، کە لە ترۆمبێلەکەی دادەبەزی، ئەویش دڵی خۆش بوو. کەوابوو دەبێ برادەرەکەی هەواڵێکی خۆشی پێ بێ. ماهیر کە سەری هەڵێنا و دیتی دەروێش بەگ سەیری دەکا، رەنگی بە روخسارییەوە نەما و بەندی جەرگ و دڵی پسا. تەواو پەتەی خۆی خستبووە سەر ئاو. بەپەلە لە پلیکانەکان چووە سەرێ. هەوڵی دەدا چۆنی لە ترۆمبێلەکە دابەزیبوو خۆی ئاوا لێ بکاتەوە و روخساری گەش و خۆش بێ. نەشیدەتوانی. دەست و پێی دەلەرزین. بێت و بەگ ئەمجارە تێ نەگا، هەرگیز تێ ناگا.

دەروێش بەگ بەهەژاوییەوە بەپیرییەوە چوو:"دەنگوباس؟ چ بووە ماهیر؟ هەواڵێکی خۆشت پێیە؟"

ماهیر بە بێهێزی و زراوچوویی و بە بزەیەکی مەیلەوگریانەوە خۆی بەسەر مۆبلەکە دادا و گوتی:"زۆر خراپ، خراپە. بەڵام پێم وایە دەرەقەتی دێم."

"بۆ چ بووە؟"

"یوسفیان لەو سەرووە، لە بۆغە کێو، لەماڵی عەلییە ریشە گرتووە. گۆیا جەندەرمە عەلییە ریشەشیان گرتووە و لەگەڵ ئەو دەیهێننەوە شارۆچکە."

دەروێش بەگ لەزمانی دەرچوو:"هەی هاوار بەماڵم..."

دەسبەجێ زانیی چ هەڵەیەکی کردووە. زۆر پەشیمان بۆوە. وردە وردە زەرد هەڵگەڕا. ترسێکی سامناك گیانی تەنیبوو. بەڵام تاوێك دواتر، تووڕەییەك لەپڕ هەموو گیانی داگرت. سەرتاپای دەلەرزی و دەینەڕاند و جار بەجار خێراتر ئەمسەروسەری ژوورەکەی دەکرد و چیی بەسەر زاریدا دەهات بە نەڕەنەڕە دەیگوت.

ماهیربەگیش بەدوویدا غاری دەدا و پەیتاپەیتا دەیگوت:"لەسەرخۆ بە، بەگ. لەسەرخۆ بە. هێشتا سوور نییە. نەقیب ئەو هەواڵەی بە من دا... هیچ دوور نییە ویستبێتی تاقیمان بکاتەوە و شتێکمان لێ دەربچێ. لەسەرخۆ بە بەگ، هیوربەوە براڵە."

بەڵام بەگ هێور نەدەبۆوە. ماوەیەك هەروا نەڕاندی و هات و چوو و ئاخرییەکەی راوەستا و فکر و خەیاڵ رفاندی. نێوچاوانی ئارەقەی کردبوو و هەموو گیانی خووسابوو. بەرەو ماهیر چوو و گوتی:"ئەرێ تۆ باسی چیت دەکرد براڵە؟ داوای لێبوردن دەکەم، ماوەیەکە مێشکم تێك چووە. خەریك بوو بیرم لە شتی دیکە دەکردەوە. بڵێ بزانم باسی چیت دەکرد؟"

ماهیر بەگیش بەدڵیدا هات، کە بەڵێ بەڵێ بەسەرت. ئەوە دابەزییت و کەوتیتە ماستاوچێتی، گەواد؟ هەر گووت لە قوونی دەگیرێ، ماستاوچێتی... ئای وەچەی بنیادەم، ئای شێرەکوڕەکەم، ئای، ئێستا لە جاشکێکی گەڕی دەستەمۆ دەچی، ئەسپە رەسەنەکەی من. و ئیتر گوتی:"بەگی من."

دەروێش بەگ نەیدەزانی ئەو شادی و خۆشییە چییە لە دەنگی ماهیربەگدا شەپۆل دەدا.

"بەگی من، ئەمشەو، دوانی نیوەی شەوێ نەقیب هاتە بەر دەرگای ماڵەکەم و بەو هەواڵە ناخۆشەی پێ دام. هەر کە گوێم لێ بوو، دەتگوت کوتکێکی گەورەیان لەسەری راکێشام و دنیام لێ ئاخر بوو. ئیتر بەلادا هاتم و دەست و پێم سڕ بوون. رەنگێك لە روخسارم نیشتبوو..."

ماهیر بەدەم قسەکردنەوە، پێکەنین لە چاو و قولینچکی لێوەکانی دەباری. ئاخۆ ئەوکابرایە لە ترسان مێشکی تێك چووبوو؟ لە حاڵێکدا باسی شتە هەرە تاڵەکان دەکات، چۆن پێدەکەنێ؟ کاتێ خۆشترین و پێکەنینیترین شتی دەگێڕاوە، دەتگوت دەگری. جۆرێك نەترسی و بێ خەمی لە روخساری نیشتووە."

نەقیب گوتی:"ئەوە بۆ وات لێ هاتووە ماهیر بەگ؟"

منیش پێم گوت:"ئەگەر لەبەرخاتری من لە یوسف خۆش بێ، چیت لەماڵی دنیا بوێ دەتدەمێ."

"ئەی ئەو چیی کرد؟"

"وەك برێشکەی سەر سێڵ هەڵبەزییەوە و باسی نیشتمان و میللەت و ساکاریا و رەچەڵەك و نەریتی ئۆغوز و دوایین دەوڵەتی تورکی کرد و بە شان و باڵیاندا هات. ئەمنیش گوتم بێدەنگ بە، لەسەرخۆ بە جەنابی نەقیب. گوتم، ئەو هات و هەڵڵایە ناتوانی دوایین دەوڵەتی تورك رزگار

بکەی. ئەوەشم پێ گوت، کە بەو هات و هەرایە ناتوانی ببیتە ژەنەرالیش. ئەوە دامنا بوویە ژەنەرالیش، دەی چییە؟ گوتم ئەگەر واز لەو منداڵە بێنی، سێ هێندەی ئەو مووچەیەت دەدەمێ، کە ژەنەرالێك لە درێژایی خزمەتیدا وەری دەگرێ، جەنابی نەقیب. بێدەنگ بە جەنابی نەقیب..."

"ئەی ئەو چیی گوت؟"

"هیچ، بێدەنگ بوو. خۆ ئاگات لێیە. بێدەنگ بوو. دواییش گوتی، هەر شتێکیشم بدەنێ، تەنانەت ملیۆنێکیشم بدەنێ، دیسان واز لەو کابرایە ناهێنم. گوتی دەترسم. تەلەگرافەکانی پێشان دام. ئێستا وەزیری ناوخۆ و قایمەقام خۆیان بە شوێن مەسەلەکەی یوسفەوەن. گوتی، دەی باشە، تۆ بڵێ، بەو هەمووە تەلەگرافەوە چۆن دەتوانم دەست لە یوسف هەڵگرم؟ تەلەگرافەکان زۆر توند بوون. بەتایبەتی تەلەگرافەکەی وەزیری ناوخۆ. زۆر سەیرە. هەتا ئێستا پێنج جاران لەسەر ئەو مەسەلەیەی یوسف تەلەگرافی کردووە، وەك بڵێی لەو تورکیایەدا هیچ شتێك لەو مەسەلەیەی یوسف گرنگتر نییە. پێم گوت، هیچ روونیش نییە ئاخۆ ئەو حاجیی کوشتووە یان کەسێکی دیکە. گوتم ئەی ئەگەر روون بۆوە ئەو کوڕە حاجیی نەکوشتووە، بەڵکو یەکێکی دیکە کوشتوویەتی، چ دەکەی جەنابی نەقیب؟ ئەو هەتیوە گەنجە هێشتا رانەهاتووە بەرتیل وەرگرێ. دیارە حەزیشی لێیە. گاڵتە نییە پشت بکەیتە ئەو هەمووە پارەیە، بەڵام لە وەزیری ناوخۆ دەترسێ. من لەگەڵ ئەوەم دی، خۆم لە ترۆمبێلەکە خست و یەکڕاست هاتمە ئێرە.

ئەمڕۆ ناهێڵن بگاتە نیوەڕۆ یوسف دێننە شارۆچکە. دەبێ لە رێگایە لە چنگیانی دەربێنین، ئەگینا بێت و بیگەیەننە شارۆچکە، دەبێتە گرێپووچکە. لەوانەیە هەر وەکی گوتیشم، شتەکە هەر لە بنێ درۆ بێ و نەقیبیش بە هەڵبەستنی ئەو درۆیە ویستبێتی لە زمانی دەربکێشێ کە ئەو منداڵۆچکەیە ئەوە لە بۆغە کێو لای عەلییە ریشەیە، یان نەخێر... خۆ ئاگات لێیە قوربان؟ ئێستا دەفەرمووی چ بکەین؟"

"کارێکی باشت کردووە برالە، سوپاست دەکەم. ئێستا دوای نانی بەیانی دەچیتە شارۆچکە و چیت پێ باش بوو وا دەکەی. من قەرزباری تۆم و ئەو چاکەیەتم قەت لەبیر ناچێتەوە و هیوادارم بتوانم چاکەت بدەمەوە."

ماهیر بەگ بە پێکەنینەوە گوتی:"تکایە، تکا دەکەم. شەرمەزارم مەکە. ئەمن ئەرکی خۆمە و بەجێی دەگەیەنم."

لەسەر سینییەکی مسی و لە قاپی مسیی نەخشیندا، نان و ترخێنەیان هێنا. ترخێنەکە بیبەری سووریان بەسەرەوە و رۆنیان بەسەردا کردبوو. ئەوجار گۆشتی سوورکراوەی سوێسکە و پەنیر و مرەبا و کەرە و چاو و شیریان هێنا. ئەو دوو هاورێییەش بەبێ ئەوەی تاقە قسەیەك بکەن، ملّچەی خواردنیان دەهات و لە بێدەنگیدا نانەکەیان خوارد. لەگەڵ لەخواردنێ بوونەوە، ماهیر هەستا و بە دەنگێکی تژی لە شادی و خۆشییەوە گوتی:"ئەمن دەبێ بچمە شارۆچکە."

ئیتر بەرەو پلیکانەکان رای کرد. دەروێش بەگ هەر ئەوەندەی پێ کرا بڵێ:"خوات لەگەڵ بێ." و لەو کاتەدا گوێی لە داگیرسانی مەکینەی ترۆمبێلەکە بوو و بەدوایدا دەنگی هۆڕنەکەی.

شارۆچکەش بەر لە نیوەڕۆی ئەو رۆژە، بەبێ ئۆقرەییەوە چاوەڕوانی یوسف و عەلییە ریشە بوو.

## ١٢٣

که له خەو هەستا، تاو هەڵاتبوو. زاری دەتگوت قوزەڵقورتە*. لەگەڵ هەڵچوونی تەوژم و تینی گەرماکەدا دڵخورپەکەشی زیادی دەکرد. مێشکی دەزرینگایەوە. دەتگوت مێشکیان کردووەتە پوورەی هەنگ و پڕیان کردووە لە مێشەنگوین. چەندی لەخۆی نووسا، لێی روون نەبۆوە لەکوێ نوستووە. بە چاوی ترساو و لە ژێڵڵا هاتووەوە سەیری دەوروپشتی خۆی دەکرد. لە پێشدا دەروێش بەگ و دوای ئەو حاجییە شێتە و ژنەکەی حاجی و سمت و بەلەکی و چاوە خومارەکانی و پێکەنینەکەی کە چاڵێکی دەخستە سەر کوڵمە سوورەکانی، هاتەوە بیر. لە پڕ بە دیتنی شمشێرەکە زانیی لە کوێیە. لە تەنیشت شمشێرەکە، قورئان و تەپڵ و شتەکانی دیکەی نێو ژوورەکەی دی. لە سەر مۆبڵێك کەوتبوو. دەستی راستی و پێی راستەی سڕ ببوون. خۆی راوەشاند و هەستا و سەری وەبەر شێر"بەلووعە"ی ئاوەکە گرت. کە سەری لەبن ئاوەکە دەرهێنا، بەرچاوی روون ببۆوە و جوانتر بیری دەکردەوە. دیسان گەڕاوە ئەو ژوورەی شمشێرەکەی لێ بوو. دەتگوت شتێکی لێ بزر بووە. سەری لێ شێوابوو. ئاخری نیگای لەسەر شمشێرەکە گیرسایەوە. لە نەکاو سەری لەگێژەوە هات و دەنگێك لە سەریدا زرینگایەوە و هەموو دەماری گیانی لەبەر یەك کێشایەوە. هەندێ شت لەبن پێی دەخزین. بەرەو ئاوێنە باڵانوێنە زێڕکفتەکە رای کرد. مژۆڵی درێژ بوون و هەڵگەڕابوونەوە. دوای ئەوەی تۆزێك لە مژۆڵی ورد بۆوە، خێرا گەڕاوە و شمشێرەکەی لە دیوارەکە لێ کردەوە و لە کالانی دەرکێشا. شمشێرەکەی بەعەرزی دادا و کالانەکەی لەسەر ئەژنۆی دانا و لەنێوەڕاستەوە شکاندی. دوایی وەك شێتان لە نێو ماڵەکەدا ئەمسەر و ئەوسەر غاری دا و بە کالانە شکاوەکە لە شتەکان بەربوو. تاوێك دواتر کالانە چێوییەکەی بە دەستییەوە نەما و لەتوپەتەکانی بەسەر عەرزیدا بڵاو بوونەوە. چوو و

---

* زۆرجاران کە دایکم چێشکەی شتێکی تاڵی دەکرد، تفی دەکردەوە و دەیگوت دەڵێی کلکە مارە. یان دەڵێی قوزەڵقورتە.

شمشێرەکەی لەسەر عەرزەکە هەڵگرت. بە شمشێرەوە بەرەو خوارەوە رای کرد و بە  هەموو هێزی خۆیەوە لە تاشەبەردەکەی حەوشەی راکێشا. لێی راکێشا و رای کێشا. شمشێرەکە دادەهاتەوە، تەلەزمی لێ دەبووەوە، بەڵام نەدەشکا. هەر زەبرێکی بە شمشێر لە بەردەکەی دەدا، بڵێسەی لێ دەبۆوە. هەموو گیانی ئارەقەی لێ دەچۆڕایەوە.

وەك شێتان و بە خێراییەکی سەرسوورهێنەر شمشێرەکەی لە بەردەکە رادەکێشا و لەگەڵ هەر تەڵەزم و بڵێسەیەکی لەبەردەکە دەبۆوە، دڵی رادەچڵەکی. لەو نێوەدا چاوی بەو کولَنگە کەوت، کە بە دەرگاکەوە نرابوو. بە غاردان چوو و کولَنگەکەی هێنا. شمشێرەکەی لەسەر تاشەبەردەکە دانا و بە هەژاوییەوە بە کولَنگەکە لێی راکێشا. کە شان و پیلی لە جووڵە کەوتن، شمشێرەکە ئیتر لەتوپەت ببوو. نە نەخش و نیگاری پێوە مابوو و نە نووسراوە پڕشنگدارەکانی. شمشێرەکە ببوو بە پارچە ئاسنێکی خواروخێچ. بەهەموو تینی خۆی کولَنگەکەشی فڕێ دایە لایەك و بە غاردان خۆی گەیاندە دیواری حەوشەکە و لێی وەسەر کەوت و خۆی فڕێ دایە دەرەوە. بەدەم رێگاوە، وەخۆی دەهاتەوە. لە پێشدا وزەوزی مێشەنگوینێك لە گوێچکەیدا زرنگایەوە و دوای ئەوە هەنگێکی گەورەی لەسەر عەرزەکە دی. هەنگێکی بوو، خاڵە نارنجی و مۆر و کەسکەکانی لەبەر تاوەکە دەدرەوشانەوە. تۆزێك لەولاترەوە پەپوولەیەکی گەورە لەسەر شانە هەنوینێك نیشتبۆوە. پەپوولە باڵە پان و زەردباوەکانی خۆی بە خاڵی وەنەوشەییەوە لێك دەدا و وێکی دێنانەوە. لاقی پەپوولەکە و رەگەی نێو باڵەکانی و هەموو شتێکی دی. کە گەیشتە بازاڕ، هێشتا پەپوولەکەی دەدی. هاتە بن چنارەکە. لە قاوەخانەی بن چنارەکە، دەرزیت هەڵاویشتبایە وەعەرزی نەدەکەوت. بەڵام هەموو پێیان بە عەرزییەوە وشك ببوو. نە جووڵەیان دەکرد و نە قسەیەك. لە گۆشەیەکەوە جێیەکی بەتاڵی دۆزییەوە و چوو لەوێ دانیشت. هەر دانیشت، چاوەچییەکە کووپێك چای لە پێش دانا. چایەکەی هەر بە گەرمی هەڵلووشی و برسێتییەکی تاقەتبڕ هێرشی بۆ هێنا. دڵی بەلادا هات. ئەوجار قاوەخانەکە لە پڕ بوو بە دەنگ هەڵلا. بێ پسانەوە قسەیان دەکرد و سەیری ئەو کەسانەی کرد کە ناوی عەلییە ریشەیان دێنا. هەزاران مەل لەسەر لك و پۆی چنارەکە دەیانجیکاند. لك و پۆپەکان لە بن بارستایی باڵندەکاندا داهاتبوونەوە و وەك هێشوو شۆڕ ببوونەوە. ئەوانەی توانیبوویان، لەسەر لکەکە جێی خۆیان بکەنەوە، هەر پاڵەپەستۆیان بوو و دەیانجریواند. جاروبارە پێیان لە لکەدارەکە بەردەبوو و وێکڕا بەدەوری دارەکەدا دەفڕین و ئەوەندە لەعەرزی نیزیك دەبوونەوە دەتگوت سینگیان لە عەرزەکە دەخشێ، بەڵام بەر لەوەی بگەنە عەرزەکە، هەڵدەکشانەوە. ئەوانەی قسەیان دەکرد، بەردەوام

ناوی عەلییە ریشەیان دووپاتە دەکردەوە و بە سێرەی چاویش لەبنەوە سەیری ئەویان دەکرد. هەستی کرد وردە وردە پتر سەیری دەکەن. هەستا و بەرەو بازاڕەکە ڕۆیشت. هەستی کرد لە پشتەوە سەدان نیگا وەك دەرزی لە پشت ملی ڕۆدەچن و دڵی تێکەڵ دەهات. بازاڕەکە قەرەباڵغ، سەگ خاوەنی خۆی نەدەناسییەوە... دووکاندار لەبەر دەرگای دووکانەکانیان راوەستابوون و بێدەنگ و بەچاوە زەقەکانیان لێیان دەڕوانی. بەحاڵی سەگ خۆی گەیاندە کەبابخانەکە و گوتی:"خێرا... خێرا کە برالە..."

بریسکەی بزۆزییەك لە چاوەکانییەوە هەستا و گوتی:"لە دوورەوە هاتووم... زۆرم برسییە، زۆر..."

کەبابچییەکە پێکەنی و هەرای کرد:"بای لیٚ یٚ یٚ بدە. نەفەر و نیوێك کەبابی ئەدەنە... بای لیٚ یٚ یٚ دە..."

"یوسف گوتی:"با دوو نەفەر بیٚ."

"بای لیٚ یٚ یٚ دە، بوو بە دوو."

بۆنی سماق هات. دووکەڵێکی چەور تاوێك دووکانەکەی پڕ کرد. کە بۆنی دووکەڵەکەی هەڵدەمژی، پتر وەخۆ دەهاتەوە. تەندووری زگی هەر نیڵەی دەهات و بیٚ ئۆقرەیی بڕستی لیٚ دەبڕی. لاقەکانی لە بن مێزەکەوە پەیتا پەیتا دەجووڵان و دەستەکانیشی حەجمینیان نەبوو و هەر لەخۆوە دەهاتن و دەچوون. کەبابچییەکە قاپێکی توور و مەعدەنووس و شبیت و پیاڵەیەکی سماق و چەند نانێکی بۆ هێنا. یوسف بە پەلەپەل و لە چاوترووکانێکدا نان و سەوزەکەی راماڵی. کەبابچییە دەم بەپێکەنینەکە گوتی:"زۆرت برسییە برا. دەڵێی ساڵێکە دەمت لە خواردن نەداوە. بای ی ی ی لێدە، دەی ی ی خێرا کە..."

یوسف پشکۆی ئاگرەکەی، کەبابەکانی کە لەسەر ئاگرەکە چزەچزیان بوو و فرمێسکی دەڕشت و ئاگرەکەی خۆش دەکرد، دەدی و تفی زاری قووت دەداوە و دەیگوت:"وەستا، وەستا بەسە، برژا، بیهێنە دەی، بەسیەتی."

کەبابچییەکە، خەڵکی وا بیٚ ئۆقرەی زۆر دیتبوو. سیخی کەبابەکەی لەسەر ئاگرەکە هەڵگرت و لە نێو نانەکەی کێشا و هێنا و لەسەر مێزەکەی دانا. دیسان قاپێك پیاز و تەماتە و بیبەر و توور و شیبیت و مەعدەنووس بۆ هێنا. یوسف داهاتەوە و ئامبازی کەبابەکە بوو. هەم خێراخێرا دەیخوارد و هەمیش وەخۆ دەهاتەوە و ئاوی شێلمەکەی دەخواردەوە. هەر نەشیزانی کەی کەبابەکەی تەواو کرد و پارەی دا و هاتەدەریٚ. کە دیتی ئەوە لە نێوەندی بازاڕ

و لە بن بارستایی سەدان نیگا و چاودا. هەمووان چاویان تێ بڕیبوو. هەر لەوێ لە نێوەندی بازاڕەکە راوەستا. رووت و قووت بوو... لە پڕ دیتی رووت رووتە. لەوێ، لە نێوەڕاستی بازاڕ، پێی بە عەرزییەوە وشك ببوو و نەیدەزانی دەستی لەسەر کوێی دابنێ. دەستی بەسەر ئەندامەکانی لەشیدا دەخزی و ئۆقرەیان نەبوو.

پێیەکانی بەرەو لایەکی دیکە راکێشیان کرد. سێبەری تەنك و قەڵت قەڵتی داری ئەقاقیا مەیدانەکەیان خاڵ و بەڵەك کردبوو. عەلی عەریزەنووس لە پشت مێزە بچووکەکەی دانیشتبوو. کتێبەکەی بە مەکینەی تایپەکەیەوە نابوو و نوقمی خوێندنەوەی بوو. لە بەردەم راوەستا و دەیویست لەوێ رابکا. بەڵام وەك سیحریان لێ کردبێ، نەیدەتوانی هەنگاو بنێ. ئێستا سەری هەڵدێنێ. ئەها، ئەها، ئێستا،ـ هەر ئێستا. با را بکەم. ئێستا سەری هەڵدێنێ و دەمبینێ. سەری داخستبوو و هەر نەدەجوولا. چەقۆ تیژ و پتەوەکەی، دوێنێ لەوەستا وەسمانی کڕیبوو و پۆڵای دەبڕی، هەر لە گیرفانی دا بوو. چەقۆکەی جوان بوو. دەتگوت مووسی دەلاکە و دەمەکەی وەك تیریژی خۆر... لەحاڵێکدا پێی بەسەر عەرزەکەدا راکێش دەکرد، هەنگاوێکی دیکەشی نا... هەموو چاویان لەسەر ئەو بوو. رووت رووت بوو. رووت و قووت. تاوێك لەبن بارستایی ئەو نیگایانەدا هەستی کرد شەکەتە... دەنگێك لە مێشکیدا زرینگایەوە.

عەلی عەریزەنووس رەنگی بە روویەوە نەما و شەپۆلی تەزوویەك هەموو گیانی داگرت و لەجێی خۆی وشك بوو. وردە وردە لە ترسان چاوی زەقتر دەبوونەوە و دەترووکان و مووی لێ دەبوونە نەشتەر... لە نەکاو بەبێ ئەوەی بەدەست خی بێ، هەستایە پێ و خێرا ئەوێی بەجێ هێشت. تاوێك دواتر جگە لە ئەو باڵندانەی بەسەر دار چنارەکەوە قاوقیژیان بوو، هیچی وەبیر نەدەهاتەوە. لە شارۆچکە وەدەر کەوت. بە غاردان لە ئاوەکە پەڕییەوە. گەیشتە سێ گوند و بەبێ ئەوەی بچێتە ناویان، لێی لادان. جیکەجیك و قاوقیژی باڵندە هەر لەگوێیدا دەزرینگانەوە. وردە وردە چاوەکانی خۆش دەبوون و بەریان روون دەبۆوە و دەنگی عەلییە ریشە، عەلییە ریشە وردە وردە دوور دەکەوتە و بەئاستەم دەبیسرا.

رێبوار تەپوتۆزیان دەکرد. دار و ئاو و گیا تەپوتۆزیان دەکرد. گەیشتە رەوەزێکی رژد و هەڵدێر. لە بەردەم رەوەزەکەدا کە وەك دیوارێك سەری لە ئاسمانێ دەسوی، راوەستا.

سەر رەوەزەکانی گیایان لێ روابوو. رەوەزی سپی، خاڵ و بەڵەك و جێ جێ رەگەی سوورهەڵگەڕاوی قەوزەی بەسەرەوە تا چاو بڕی دەکرد، گەورە و شکۆدار دیار بوون. مێشەنگوینی رەش کە دەتگوت مەڕمەڕی رەشن و بریسکە بریسکێکی کەسکیان هەبوو، بە

وزەوز و ئەوەندە خێرا سەرت لێیان سوورِ دەما، دەفرِین و وزەوزەکەیان لە رەوەزەکاندا دەنگی دەدایەوە. یوسف لە نساری رەوەزەکەدا دانیشت. ئەژنۆی دەلەرزین. ئارەقەی وشك دەبۆوە. فێنکاییەك بە تیغەرەی پشتیدا هات.

دەتگوت هەتاوی دیتووە، کە لە گلۆڵەیەکی ئاگرین دەچوو. پاڵی دا بەو بەوەزەوە، کە خۆرەکە گەرمی کردبوو. پشتی سەریشی پێوە نا. تا، گوێی لەو زەنازەنا و هات و هەرایە نەبوو کە لەخوارەوە دەهات، هەروا لەنێوان خەو و بێداریدا لەوێ کەوت. کە رەوەزەکان پرِ بوون لە سرت و خرت، دەرپەرِی و بە ترس و درِدۆنگییەوە بە بزنەرِێیەکدا بەرەو ئاسۆی زەردەپەرِ تێی تەقاند. چاوی، بزۆزانە دەبریسکانەوە. ئەوجار دەیزانی بەرەو کوێ رادەکا. راکردنەکەی و لاقەکانی و ژان و ئازار و بریسکاندنی گیانی و بێهیوابوون و ورەگرتنەوەی... بێزاربوون و بەزین و دەست شوشتن لەهەموو شتێك و لەخۆی، خەوهاتن و نەبوونی دەرفەتێك بۆ نوستن، دەست سرِبوون، ترسان و راچڵەکین، خۆخاوکێش کردن، وەخۆهاتنەوەی لەنەکاو، شاگەشکەبوون لە وەخۆهاتنەوە، گەشبوونەوەی لەخۆشیان، بووژانەوە، گورجوگۆڵ بوونەوە، دیسان بێزاربوونەوە و بەزینەوە، دەست شوشتن و بێهیوایی، خۆبەدەستەوەدان، ئەوجار وەخۆهاتنەوەی لەنەکاو... دارەکان پەیتاپەیتا بە پێش چاویدا تێدەپەرِین. دار و دەرختی جۆراوجۆر، ناوەکانی بەمێشکیدا دەهاتن و دەزرینگانەوە و تێکەڵ دەبوون و دیمەن و جووڵەی دیکە جێیان پرِ دەکردنەوە.

کەروێشکێك لە پێشییەوە قەڵەمبازی دا و بازرە بوو و خۆی بە نێو دەوەنەکاندا کرد. رێوییەك کلکە خۆڵەمێشییە مەیلەوسوورەکەی رێك لەبەر لووتی راوەشاند. پۆلێك کەودەری بەلاقی سوور و دەندووکی کورت و باڵی رەنگاورەنگیانەوە، چەند جارێك نیشتنەوە و هەڵفرِینەوە.

کەوەکان بە لەنجەولار رۆیشتن و بڵاو بوونەوە و لە شەقەی باڵیان دا و ئاسمانیان خەتخەت کرد. کۆمەڵە خەت و هێڵێك کە لەسەر لاپەرِە بۆرەکەی ئاسمان تێکەڵ و پێکەڵ بوون... گیسکێك لەسەر تاشەبەردێکی وەنەوشەیی دەیکارِاند. کارِەکارِەکەی لە رەوەزەکان دەگەرِا و دەنگی دەدایەوە. دەنگدانەوەکان تێکەڵ دەبوون و دەبوونە لوورە. لوورەکەش پتر دەبوو و گەورەتر دەبۆوە و دەبووە لوورەیەکی دیکە. لە نێوەرِاستی گابەردە پان و بەرزەکاندا کە سەریان لە ئاسمانێ دەسوی، لە حاڵێکدا لە رەوەزێك وەك دیوارەوە خۆی فرِێ دەدایە سەر رەوەزێکی دیکە، لە لوورەلوورەکەدا نوقم ببوو و جار نەجارێك بە بیستنی دەنگی خۆی دەسڵەمییەوە و رادەچەنی و بە هانکەهانك و دەست و پێی خوێناوییەوە، سەری لە دووی ئەو گیسکە نابوو، کە

وەك جنۆكان لە ڕەوەزێکەوە بازی دەدایە سەر یەکی دی و لە نێوان تاریك و ڕوون و بوولێڵەکەدا بزر دەبوو و دەردەکەوتەوە. دەنگەدەنگ و هەتاوە بەتینەکە... لەوە پتری وەبیر نەدەهاتەوە. لە حاڵێکدا خۆی بە دیوارەکانی تاریکیدا دەکێشا، ئەستێرەکان دی. سێ ئەستێرە لە سەرچڵووکی بەرزترین لکی دارێك، کە لەگەڵ لەرینەوە و جووڵەی لکەدارەکە، جارێ دەردەکەوتن و جارێ بزر دەبوون. لەوانەشە لەخەویدا...

تاو هەڵاتبوو و ئاگربارانی بوو. دەستی چەپەی گیسکەکەی گرتبوو و هەوڵی دەدا بیلەوەڕێنێ. گیسکەکە لینگەفرتێی بوو و دەیویست خۆی دەباز بکا. بەردەبێ، ڕادەکا و ڕاکردن و ڕاوەدوونان دەست پێ دەکاتەوە. دیسان دەیگرێتەوە. لەسەر ڕەوەزێکەوە بەردەبێتەوە سەر شینکاییەکی نەرم. لاقی ڕاستەی... گیسکەکە هەوڵ دەدا و بە لاسارییەوە گیا و گەڵا سەوزەکان ناخوات. دیسان تاو هەڵات. داری بەرز، دەوری ڕەوەزەکەیان داوە. ئاوێك لە نێو ڕەوەزەکانەوە هەڵدەقوڵێ و کەفچڕێنە. لەبەر تاوەکە، چاوی لە میلەی بریقەداری ئاسنی، کەوت کە لە چەقۆ دەچوون. بەدوایدا لەپشت گابەردەکەوە سەری بنیادەم دەرکەوتن. نیشان و هێمای سەرکڵاوەکانیان دەدرەوشانەوە و دەنگی پێیان هات. گوتی:"عەلییە ریشە، عەلییە ریشە..." و دەنگەکەی، دەنگی دەدایەوە. پێی وابوو. لەوانەیە هیچیشی نەگوتبێ. گوێی لە دەنگەدەنگێك بوو. دەنگی چەند تەقەیەك هات و لە ڕەوەزەکاندا دەنگی دایەوە و بوو بە هەزاران دەنگ. گیسکەکەی هەر بەدەستەوە بوو. خۆی خزاندە پشت ئەو گابەردەی ئاوەکەی لێوە هەڵدەقوڵی. کونێك، کە لەبەرتاریکی چاو کاری تێ نەدەکرد، سەرنجی ڕاکێشا. گابەردێك و دەوەنی تێك ئاڵاو زارکی کونەکەیان داگرتبوو. خۆی خزاندە ژوورەوە... لەولاوە لاقی جەندەرمەکانی دەدی. کە تۆزێك سەری هەڵێنا، دەموچاویشیانی دیت. دەموچاوە گۆشتن و گووپنەکەی یەکێکیان ئەوەندە گەش و سوورکەڵە بوو، دەتگوت، پڵتۆکێکی لێ بدەی، خوێنی لێ دێ. ئەوی دیکە ریوەڵە و زەرد بوو. دەستەکانی دەلەرزی و وەك ژانەسکی هەبێ، خۆی نوشتاندبۆوە. ئەویتر یەکی تاوەسووتی کورتەباڵا بوو، چەناگەقووڵ و مژۆڵ درێژ. روخساری ئەوانی دیکە هەروەك روخساری خەڵکی تر بوون. ڕواڵەت و قەڵافەتی هیچ کامیان شتێکی سەرنجڕاکێشی تێدا نەبێت. ڕەوەز و بن گابەردیان پشکنی، ڕاوەستان، قسەیان کرد و گەڕان. سێبەرەکان لەبەر یەك کشانەوە و لینگ و روخساریان درێژ بوونەوە. خاکی نەرمی تەختی دووکانەکان و دیوارەکانیان بۆنی شێ و کەڕوو و بۆنی گیسکی لێ دەهات. بۆنێك کە کاری لە

جەرگ و دڵ دەکرد. حەزی لێبوو یەك بەخۆی بنەڕێنێ و لەبەر ئەو حەزەش خۆی پێ نەدەگیرا. لەحاڵێکدا کە ئەوان لەوێ پیاسەیان دەکرد، ئەو دەیویست وا بنەڕێنێ، بەرد بێنێتە گریان...

بە دەم سووتانەوەی دەست و سینگ و قوڕگ و لووت و زاری، کۆکە و هاوارەکەی لە سینەیدا قەتیس دەکرد. جەندەرمەیەك کە دڵۆپەی ئارەقە لە نێوچاوان و لارووماتی دەچۆڕایەوە سەر بەردەکان، هاتە بەردەم کونەکە و ملێکی کێشا و چەند جاران سەیری ناوەوەی کرد. چاوی لە چاوی یوسف ئاڵقا. یوسف دەیەویست بنەڕێنێ، بەڵام جەندەرمەکە سەری کێشایە دواوە. خۆی بە گیسکەکەوە نووساندبوو. گەرم بوو و بۆنی شیری خاوی لێ دەهات. جەندەرمە سەرقاڵی پشکنین و گەڕان بوون. جارێ لە تەنیشت گابەردەکە کۆ دەبوونەوە و قسەیان دەکرد. دەنگیان لە ڕەوەزەکاندا دەنگی دەدایەوە، بەڵام قسەکانیان لێڵ بوون. بەدەم قسەکردنەوە، جار نەجارێ گوێیان هەڵدەخست و چاوێکیان دەکردە چوار چاو و سەیری دەوروبەریان دەکرد. گومانیان بۆ هەندێ شت دەچوو و بڵاو دەبوونەوە و دەکەوتنەوە گەڕان. یوسف کرووشمەی کرد و بە گاگۆڵکێ خزییە بنەبانی ئەشکەوتەکە. جەندەرمە ئاگریان کردەوە. ئاگرەکە جار بە جار بڵێسەی بەرز بۆوە. بڵێسە و پزیسکی ئاگر لەبەر تاوەکە سپی دەچۆوە. دووکەڵەکەش خەرمانەیەکی سپیی بەسەر دەوروپشتیاندا کێشا...

جەندەرمەیەك هەرای کرد: "گیسکێك."

یوسف لەنێوان خەو و بێداریدا گوێی لەو دەنگە بوو. دەنگەکە لەخەون دەچوو و بە ئاستەم شادییەکی تێدا بوو. یوسف وڕ و کاس و بێزار، ڕاچڵەکی و وەخۆی هاتەوە و قیت بۆوە. ماسولکە تەزیوەکانی خۆبەخۆ بووژانەوە و هەلینگێکی لەخۆی دا. بۆشاییەکە لەبەر یەك ڕەوییەوە و هەستی کرد لە بۆشاییەکەدا نوقم بووە.

"گیسك."

بە سینگەخشکە هەتا بەردەرکی ئەشکەوتەکە هات. هەتاو لەنێوچاوانی دا. چاوەکانی بەشەوارە کەوتن و تاوێك هەموو وڵات تاریك داهات و نەیتوانی هیچ شتێك، هیچ جووڵە و تیشك و تاریکییەك ببینێ. بەڵام زۆری نەبرد. پەردە ڕەشەکە لەپڕ لاچوو و ڕەوەزە تیژ و سپی و زەرد و قەوزەگرتوو و خاڵ خاڵ و جێ جێ سوورباوەکان، دارە چڕە پڕ لك و پۆپەکان بە نێوقەدی ئەستوور و خوراوخێچەوە، چیمەنی سیس و ژاکاو و چقڵ و دڕك و گوڵی وشکەڵاتوو و ژاکاو و باڵندەی فڕیو بە ئاسمانەوە دەرکەوت. جەندەرمە سوورهوولەکە، گیسکەکەی گرتبوو.

"نەمگوت، گیسکێك، گیسکێك... با بیکوژینەوە."

یوسف مووچڕکەی پێدا هات، لەرزی لێ نیشت. ئانیشکی تۆزێکی دیکەش خزییە دەرەوە. چاوی زەق بوونەوە. گیسکەکە دەیکاڕاند. جەندەرمە سوورهوولەکە بە کێردێکی گەورە، کە دەمەکەی بریسکەی دا، دەمودەست سەری گیسکەکەی بڕی. کە جەندەرمە هەستایەوە، سەری گیسکەکەی بەدەستەوە بوو. لاشەی گیسکەکە ئەوەندەی چاوترووکاندنێك لەخوێندا سوور هەڵگەڕا. جەندەرمە سەلکی گیسکەکەی، کە تازە جێی شاخەکانی خوێنیان لێ دەهات، تووڕ دایە لایەك و لاشە خوێناوییەکەی هەڵگرت و بردییە سەر کانییەکە. یوسف هەر لەوێ، رووت و قووت و بێ جووڵە و هەست و خوست بەجێ ما. دەتگوت مێشکی لەکار کەوتووە و بڕستی لێ بڕاوە. ئانیشکەکانی خۆیان لەبەر بارستایی لەشیدا رانەگرت و کەوت. تاوێك دواتر بۆنی گۆشتی برژاوی بەسەردا هات. بۆنی گۆشتە برژاوەکەی هەڵمژی. دڵی لەخێڵەوە هات و زاری ئاوی کرد. دەنگی مڵچەملّچ دەهات. یوسف وەبیری دەهاتەوە کە چۆن شەوێ تا بەیانی رای کردووە و بەغاردان گەیشتووەتە بەردیوارێك و تووشی تاریکستانێکی ئەنگوستەچاو و پڕ لەدڵەخورپە بووە و دوایی گەیشتووەتە سەر لێواری هەڵدێری نەمان. هەر هەنگاوێی نابایە، هەموو شتێك تەواو دەبوو. بەڵام ئەو بەر لەوەی ئەو هەنگاوە بنێ، لەوێ کۆتایی کار و شێتی و ژان و تێداچوونی لێ روون ببۆوە. وەك ئەوەی پێی لە سەر پۆلوو دانابێ، دەمودەست گەڕابۆوە دواوە. وەبیری دەهاتەوە کە تاو هەڵاتبوو، کەوڵی خوێناویی گیسکەکەی بەدەستەوە و تەڕایی کەوڵە خوێناوییەکە کاری لە مێشکی ئێسقانی کردبوو و بۆنی ناخۆشی خوێنەکەی بەسەرداهاتبوو و ئەوەی بەدەستییەوە بووە، فڕێی دابووە شوێنێك ئیتر دەست پێ رانەگا و ئیتر را دەکا و لە کانییەکە دەستی دەشواتەوە و خۆی لە ئاوەکە هەڵدەکێشێتەوە و جلوبەرگەکانی لەبەر دەکاتەوە. برسیی دەبێ و لە جادەیەکی بێبڕانەوەدا رووت و قووت هەموو گیانی تەزووی پێدا دێ و بنی پێی هەمووە بووەتە برین، و بە ئەژنۆی بێ تینەوە بەرەو تاریکی رادەکات.

"بۆ کوێ، ئەوە بۆ کوێ رادەکەی رێبوار؟"

"دەچمە ماڵی عەلییە ریشە، عەلییە ریشە."

عەلییە ریشە یەکی سمێڵ بابڕە. چاوی درشت و قامکی گەورەن. ئەسپی هەیە، هەموو زین و رەشمە زیوکفت. زنجیری سەعاتەکەی زێڕ و کۆشکەکەی سێ نهۆمە... عەلییە ریشە باخچەیەکی هەیە پڕ لە دار و درەخت. داری زەیتوون و سپی چنار و پرتەقاڵ و گوڵ. شەش کوڕ و سێ کچی هەیە. ئەسپی شاباز، کەڵەکێوی، ئاسکی مووسووری هەیە. دوای ئەوەی دارستانە سنۆبەرەکە و چل کانی و سوێسنە و کانیی بەگ و چناری حەوت وەلی و چیای بەربەرۆچکەت

بڕی، عەسرێ دەگەیە کانیی چیمەن و شەوێ لە بن بەردێکی بەقەوزە داپۆشراو ڕۆژ دەکەیەوە. گوێزی حەوت برایان دەبینی...

"بۆکوێ، بۆکوێ؟"

"عەلییە ریشەیەك هەبوو، لەوێ..."

عەلییە ریشە کێڵگەی وای هەیە پڵینگیان لێ دەرناچێ و خەلەوخەرمانی پڕ بەرەکەتن.

"بۆ ماڵی عەلییە ریشە، عەلی..."

دوێنێ عەلییە ریشە ملی خوار ببۆوە. کەلەپچەیان لە دەستی و چەڵمەیان لەملی کردبوو. لە پێش دەستەیەك جەندەرمەوە، سەری داخستبوو و لە قزل گدیکەوە تێدەپەڕی. سووتمان و هاوار و هەڵڵایەکی لەدوای خۆی بەجێ هێشتبوو.

"ماڵی عەلییە ریشە، ماڵی..."

عەلییە ریشە بە روخسارێکی بزرکاو و چاوی تەڕ و دەمی قووچاو و دەموچاوێکی تێك شکاو، لە بەیانییەوە تا شەوێ لە سەر ئەو ڕەوەزە دانیشتووە و چاوەڕێ بووە. چاوە درشت و قاوەییە مەیلەوزەردەکانی بڕیوەتە ئەو ڕێگا بێبڕانەوانە و بەبێ جووڵە...

"عەلییە ریشە، عەلییە ریشەم..."

باوکی عەلییە ریشە، سەر رووت و پێخاوس، لە گۆڕەپانی بازاڕەکەی ماراش بە دارێکەوە هەڵواسرابوو و جۆلانێی دەکرد...

"لای عەلییە ریشە."

سوارەکان بە لینگدان هاتن و بابی عەلییە ریشەیان ـ کە بەپەتێك هەڵواسرابوو ـ لێ کردەوە و بردیانە ئاخوڕداغی، لە بەفر و بۆرانی ئاخوڕداغی و دەشتی گوندشلی ڕۆچوون. ڕەشماڵە عەرەبییەکان بە شین و شەپۆڕ...

"لای عەلییە ریشە..."

عەلییە ریشە شەلاڵی خوێن، روخسارێکی گرژ و خەمبار. مژۆڵەکانی خۆڵاوی و لێوەکانی ڕەش و مۆر. قامکی ئەسپێ کوژەی بەرەو عەرزی خوار کردبۆوە. خوێنی لێ دەچۆڕایەوە و دەکەوتە سەر لمەکە... بە نێو سەد و بیست و یەك شمشێری راکێشراودا بە ڕەوەزە ڕژدەکە هەڵدەگەڕا.

لاقەکانی قەڵیش قەڵیش و بریندار. جێی پێیەکانی دەبوونە گۆمیلکەی خوێن. روخساری وەك لیمۆ زەرد هەڵگەڕابوو و دەموچاوی باریك ببۆوە و ردێنی رەش و سمێڵە ئەستوور و شۆڕەکەی خۆڵاوی بوو.

"عەلییە ریشە، عەلییە ریشە..."

دوێنێ شەوێ هەڵیانکوتایە سەر ماڵەکەی عەلییە ریشە و ئەسپەکانیان لە گەورەکەی رفاند و کەلەپچەیان لەدەستی دا و بە پەتێك لە زینی ئەسپێکیان بەست و لێیان خوڕی و بەو قەدپاڵەدا سەرەوخوار بردیان. جار جارە دەکەوت و ئەسپەکە بەسەر عەرز و وردکەبەردەکاندا رایدەکێشا.

یوسف راوەستا. خۆر تیرێژی داویشت. عارەبانەیەك لە پێشەوە بوو. کەوتە پێش عارەبانەکە. تووشی ترۆمبێلێك بوو. ترۆمبێلەکە تەپوتۆزێکی هەستاندبوو چاو چاوی نەدەدی. گوتیان ئەوە، ئەوە عەلییە ریشەیە. سوێسنە لە بوولێڵی ئاسۆی شێدار، رەش و تەماوی بوو. لای دایە نێو کێڵگەکان. سوێسنە پیاوی تێدا ون دەبوو. گوڵاڵە و شلێرە و سێسوو و دەوەنی پڕ گوڵووکی تووترك و حوشترالوو بە گوڵی مۆرەوە، هێندەی سوێسنەکان هەستابوون. یوسف بەملاولادا رای دەکرد و ترۆمبێلەکە بەشوێنییەوە بوو. جانەوەرێکی دڕندە کە بۆنی بەنزینی لێ دەهات، بە هاڕەهاڕ سەری لەدوو نابوو. ئەو، ئەوە ئەو بنیادەمە عەلییە ریشەیە. لەو سەرەوە خۆی هەڵداشتە نێو شیوەکەوە و کەوتە سەر لمەکە. ترۆمبێلەکە بەدوویدا خلۆر بۆوە بۆ نێو شیوەکە. بوو بە تەپوتۆزێك چاو چاوی نەدەدی. عارەبانەکە وەرگەڕابوو و تۆپەکانی لە هەوا دەسووڕانەوە...

"بۆلای عەلی، لای عەلییە ریشە..."

ترۆمبێلەکە لەبەر هەتاو دەسووتا و تۆپەکانی دەخولانەوە. عەلییە ریشە بە ئەسپە سپیەکەیەوە هات.

"بۆکوێ؟ بۆ کوێ؟"

"بۆ لای عەلییە ریشە."

شۆفێرەکە گوتی:"سوار بە، سوار بە. ریشە لەوێ، لە وێستگەکە چاوەڕێمانە. ئەگەر تۆ لە عەلییە ریشە دەگەڕێی، لە شاری، لە ئەدەنە عەلییە ریشەیەك هەیە. یەك دانە، یەك... لە ئەدەنە چەند عەلییە ریشەیەك هەیە. عەلییە ریشە ردێن رەش، چاو مەیلەوزەرد و گەش، زنجیری سەعاتەکەی زێڕ، زین و کورتانی زیوکفت و کۆبەگیراو، نۆزدە داری گوێز، بیست و سێ تەراکتۆر،

حەوت مەکینەی دروێنە، سێ خەرمانکوت، سی و شەش کامیۆن و دوو کارخانە، یەك دوو عارەبانەی کەڵ کێش، کاروانسەرا، حەمام، کۆشك و چوار مەزرای هەیە. بچۆ بۆلای عەلییە ریشە، چاری دەردی تۆ لای ئەوە. لە مەزرا و کێڵگە و دەشتی ئەو، لە گوند و کوێستانەکانیدا سێسەد کرێکار کار دەکەن. لەوێ، وێستگەی شەمەندەفەری ئەدەنە، بازاڕی کرێکاری قەلای قاپۆسی، لەوبەریەوە و لەسەر پردێ چاوەڕێمانە. وەرە با بچینە لای عەلییە ریشە..."

داری ئۆکالیپتۆس بەرز و ئەستوور بوون. ئاپۆرای خەڵك لە گۆڕەپانەکەی رووبەڕووی وێستگە زەنازەنا و دەنگەدەنگیان بوو. دەتگوت بازاڕی شامە. شەمەندەفەرە دوورودرێژەکان بە هۆڕنلێدان دەهاتن و رادەوەستان. لەو سەرەوە، خەڵکی خۆلاوی و ماندوو و رەنگ بزرکاو و زەردهەڵگەڕاو وەك چۆن میروولەی لە شارەکەیان دێنە دەرێ، ئاوا، رەوەك و ترساو و رووگرژ و جاروبارە بە بریسکەی شادییەك لە روخساردا لە هێلانەکانیان دەهاتنە دەرێ. بینادەمەکان لەو کامیۆنانەوە کە هاتبوون و رادەوەستان، بەرەو گۆڕەپانی بن کالیپتۆسەکان دەڕۆیشتن... منداڵ، ژن، کچ، ئاوبردوو، لێو قەڵشیو... کەڵەگەتەکان، مل باریکەکان، لەڕ ولاواز و گۆشتن و خەواڵوو... گۆڕەپانە گەورەکە بۆنی ترشاوی ئارەقە و پێ و تەپوتۆزی لێ دەهات... لە نێوان تەلارە زەبەلاحەکان و کۆشەکەکانی شای پەرییاندا هەتا بەیانی هەر نوستبوو و بەخەبەر هاتبۆوە و جنیگڵی دابوو و بەسەرسووڕمانەوە چاوەڕێی تاوهەڵاتن و خۆراوابوون ببوو. لەحاڵێکدا تەپوتۆز و بۆنی بەنزین هەتا ناخیان هەڵدەمژن... لەگەڵ ئەستێرەی خەواڵوو و هەڵامەتگرتوو، بەدەم تاو لەرزەوە. دەستە دەستە کامیۆن بەسەرو سەرهەڵدەکشان و هەندێکیان دەهاتنە دەرەوە و جنێویان بەیەکتری دەدا و هاواریان دەکرد.... نوێن و بانی رەنگاورەنگ و کوڵ و کوڵبازی گەورە و بچووك لەسەر کوڵ و شان... هەڵڵا و هەنگەمەی شاری گەورە، هۆڕنی شەمەندەفەر و ترۆمبێل و تەراکتۆر لە گوێ دا. قوڵتەقوڵتی قابڵەمە رەش و دووکەڵ گرتووەکان لە تەنیشت یەك... بۆنی رۆنی قرچکراو. سێبەری لەتوپەتی گەلای کالیپتۆسەکان لەسەر عەرزی و شۆڕبوونەوەی هەتاو لەداوێنی ئاسمانەوە. سەیرکردنی کچۆڵەی شۆخ و شەنگ و کوڕی پاك و خاوێن، کلاوی حەسیریی گەڕگەڕی لەسەر و ورگ زل و کورتەبالا، ژنانی قەڵەو و قورسی چوارگۆشەیی و... سەدان هەزار چاوی زیت و گەڕۆك... سەیر دەکەن، هەر بۆ ئەوەی سەیری شتێکیان کردبێ. سەیرکردن بۆ سەیرکردن.

لەنێو ئاپۆراکەدا ون ببوو. شانی لە شانان دەدا و لێی دەدرایەوە. دەکەوت و هەڵدەستاوە. بەرەوپێش دەچوو و پاڵی پێوە دەنرایەوە. بە جینگڵ و بێ ئۆقرە لە نێو هەڵڵا و هەنگەمە و زەنازەنای سەرسوورهێنەری تەلارە زەبەلاحەکاندا رووت و قووت و تاك وتەنیا کەوتبۆوە.

تووڕەیی وەك ئاوێکی نیشتبێتەوە و وەك شتێکی رەق و قورس لەسەر ئەژنۆی و بەلەك و گوێزینگ و پاژنەی پێی...

هەموو شتەکان دوای هاتنی دەنگی شەمەندەفەرەکە قەوما. ئەو ئاپۆرایەی لە تاریکی دەچوو، تێك ئالا، نەراندی، دەنگەکان تێکەڵ بوون، ئاژیری خەتەر، دەنگی شەمەندەفەر، ترۆمبێل، هۆڕن، هەڵڵا و زەنازەنای بنیادەمەکان و دەنگی دوور و نزیکی بانگ... لە قرچەی گەرما بەتینەکەدا... لە حاڵێکدا کامیۆنەکان پڕ دەکران و بەتاڵ دەکرانەوە...

"عەلییە ریشەیان کوشت."

لەسەر گازەربای پشت کەوتبوو. خوێنی لە لووتی هاتبوو. هەموو گیانی خووسابوو...

لەژوور سەری راوەستا و سەیری کرد. دەستی لە دەستی دا، سارد بوو. دڕی بە حەشیمەتەکە دا و رای کرد. خۆی نەیزانی لە شار چووەتە دەرێ. نەیدەتوانی بیر لە زانین و تێگەیشتن بکاتەوە. پەیوەندیی دەست و پێ و چاوەکانی لەخۆوە لەگەڵ مێشکیدا هەڵبڕابوو. هەر گوێچکەکانی دەنگی زەنازەنای سەرسوورهێنەری شاریان تێدا دەزرینگایەوە و چاوەکانیشی ئەو چرایانەیان دەبینی کە لەپڕ هەڵدەبوون و ئەو حەشیمەتە بێ ژمارە ی شەپۆلی دەدا و لە نەکاو دەچووە قوڕگی روناکاییەکەوە و نوقم دەبوو، بە ترسێکەوە، سەرچاوەکەی لە هەستی رزگاربووندا بوو، رزگاربوون لەخەتەرێکی سامناك، رزگاربوون لە خەتەری کەوتنە نێو گەرووی مەرگەوە...

لەو کاتەدا هەستی دەکرد، ئەژنۆی خەریکن تینیان لێ دەبڕێ و ئەو هەستە، ترسێکی سڕکەری لە گیانی دەگەڕاند. ترسێك کە هەتا مێشکی ئێسقانەکانی رۆدەچوون و لەو ترسانە ئۆقرەی نەبوو و غاری دەدا.

# ١٢٤

ڕێگاکان تەپوتۆزیان لێ هەڵدەستا. هێشتا هەوا گەرم دانەهاتبوو و سێبەری هەورە فێنکەکان وەك با بەسەر کێڵگەکاندا دەخوشین. دەروێش بەگ لە زیندەخەوێدا چاوەڕوان بوو. زۆر لەمێژ بوو هیچ خەبەری لە یوسف نەبوو. سەر و سۆراغێکی نەبوو. وەك بەردی بن گۆمی لێ هاتبوو. ئەو گوندییانەی بست بە بست شارەزای ئەم دەر و دەشت و زۆنگاوە بوون و هەموو کون و کەلێنەکانی حەمیتە و شاناوەرزایان دەزانی، هیچ سۆراغێکیان لێ نەدیتبۆوە. هیچی نەدەویست. هەر ئەوەندەی هەواڵی زیندووبوونی یوسفی هەبێ، جا ئەوجار چیی بەسەردێت با بێ. مردن یان کوژرانی یوسف، ئەویش لە سەر ئەو، وەگیانی دەێنا*.

مزەفەر گوتی:"دەڵێن بابت لەوە زیاتر چاری نییە. دەڵێن ئەگەر یوسف یوسف بگیرێ و بڵێ دەروێش دەنەی داوم، ئەوکات تۆ لە دار دەدەن.

کام پارێزەری دادگا لەهەمووان زاناتر و شارەزاترە، هەر ئەوە دەڵێ. دوژمنەکانمان لە شارۆچکەش کە بەوەیان زاینوەتەوە، پارەیەکی زۆر، کەس نازانێ چەندەیە، کۆیان کردووەتەوە و ناویانەتە بەردەستی نەقیبی جەندەرمەکان و ئەویش... دەبێ بیدۆزینەوە بابە، دەبێ یوسف بدۆزینەوە، بیکوژین. ئەگینا هەتا ئەو زیندووە، ملی تۆ لە ئالقەی پەتی سێدارە دایە. دەڵێی چی بابە؟"

ئەوە ساڵی ساڵان بوایە، دیارە ساڵانی زۆر زۆر لەوەپێشیش نا، بگرە هەر حەوتووەك لەوەپێش بوایە و دەروێش بەگ قسەیەکی ئاوای لە یەکێك بیستبا، زمانی لە پشتەسەرییەوە دەردەکێشا و دنیای خرا دەکرد. بەڵام ئێستا لەسەر خۆ گوتی:"ئاااخ، کوڕم، ئاااخ، جارێ با یوسف بدۆزینەوە، ئەوکات مشوورێکی لێ دەخۆین."

---

*وەگیانهاتن: وەڕەز بوون. لەگیان بێزاربوون. وەگیانت هێنام. واتە وەڕەزت کردم. بێزارت کردم.

"ئەمنیش، ئەمنیش، بابە...دەترسم ئەوان بەر لە ئێمە بیدۆزنەوە..."

"ئەو هەیتوە، دەبێ چووبێتە کوێ؟ ئێستا لەکوێیە و چ دەکا؟ باشە خۆ ئەو هیچ کوێ نازانێ، هیچی لەدەست نایە، ئەی ئێستا بلێی چ بکا؟ زۆرم بەزەیی پێیدا دێ. خەریکە ئاگرم بۆی تێبەربێ. ئەوەم لێ بووەتە مەرگ و بگرە لە مەرگیش خراپتر. ئای خۆزگە مردبام و یوسف تووشی ئەو گێچەڵە نەبوایە."

"دادئەستێن چیی گوت بابە؟"

دەروێش بەگ چاوی پڕبوون لەئاو. گریانێك لە ئەوکیدا قەتیس ما و وەڵامی پرسیارەکەی مزەفەری نەداوە. دادئەستێنی ناوچەکەیان بەبێ چاکوخۆشی و خولّقکردن، زۆر بەساردوسڕی داوای لێ کردبوو، وەڵامی پرسیارەکانی بداتەوە. دەروێش بەگیش بەبێ ئەوەی ئیزنی لێ وەرگرێ، لەسەر کورسییەکەی بەرامبەری دانیشتبوو. دادئەستێن، بە رواڵەت و لەبزێکی توندەوە، وەك ئەوەی قسە لەگەڵ تاوانبارێك بکا کە دوو رۆژ دواتر لەسەری سوور دەبێتەوە پیاوی کوشتووە و دەکەوێتە بەردەستی، قسەی لەگەڵ کردبوو. ئەویش هیچی پێ نەکرابوو. دادئەستێن گوتبووی:"قۆڵبەست دەکرێ. ئەوکات سەرکردەی یەکێك لە باندە هەرە کەتنکەرەکانی مێژووش دەناسرێت و ئەوەی خوێنی خەڵکێکی بێتاوانی لە ئەستۆدایە، لە سێدارە دەدرێت."

ئەویش هەر ئەوەندەی پێ کرابوو، ددانی چیڕ بکاتەوە و چاوی توند لە چاوی ببڕێ. هەر ئەوەندە.

نەیدەتوانی یوسف بکوژێ. ئەوە بەو نەدەکرا. ئەوە جوامێری نییە و شتی وا لە پیاو ناوەشێتەوە. ئەگەر ناچار بێ یوسف بکوژێ، خۆشی لەگەڵی دەمرێ. هەر ئەوە لە پیاوەتی و جوامێریی ئەو دەوەشێتەوە. هەر یوسف بدۆزێتەوە، هەڵیدەگرێ و بە فیلینتای ئەلمانییەوە لێی سواری ئەسپی عارەبی دەبن و بەگژ ئەو پیاوە بوودەڵە و ناپیاوانەدا دەچنەوە و بە چیاکانی بەرامبەردا دەپەڕنەوە بۆ سووریا. برادەری لە سووریا زۆر هەن. شێخە رەشماڵنشینەکان برادەری بوون و زۆری چاکە لەگەڵ کردبوون. خۆ دنیاش خراپ بێ رادەستی نادەنەوە. بیری لە سووریا دەکردەوە و بەردەوام لە خەیاڵی ئەوێدا بوو. یوسف دەنێتە بەر خوێندن و دەینێرێتە پاریس. ژنی بۆ دێنێ و دەیکاتە کوڕی خۆی و دار و نەداری خۆی هەموو بەناوی دەکا. پارەیەکی زۆریش دەداتە ئەو کەسەی یوسف دەدۆزێتەوە. گوندییەکان کۆ دەکاتەوە و بۆیان باس دەکات.

لە چیا و کێوپارەوە هەواڵی ناخۆش دەهاتن. جەندەرمە لەوێ وەك تۆفانی دڵڕەقی و خراپەکاری دەگەڕان. کەس نەبوو جەندەرمە زیانێکی لێ نەدابێ و نقورچکێکی نەگەیاندبێتێ. ژن و پیر و منداڵ و نەخۆش کەس نەمابوو شەق و مستەکۆڵە و قۆنداغەتفەنگێکی جەندەرمەی نەخواردبێ. جا لەوەش هەر مەپرسە چ بەسەر عەلییە ریشە و ئیمامە کوردە هاتبوو.

جەندەرمە ئەوەندەیان لە رەجەب دۆغان هەڵدابوو، ناچار خۆی پێ رانەگیرابوو و گوتبووی راوەستن با پێتان بڵێم و ئیتر هەستابوو و لەحاڵێکدا لاکەس سەری هاتبوو و بەحاڵ خۆی بەسەرپێوە راگرتبوو، وەك سەرخۆشان پەیتاپەیتا گوتبووی، بەرم دەن، وازم لێ بێنن بەرم دەن با بچم یوسفتان بۆ بێنم. ئیتر دەکەوێتە پێش جەندەرمان و دەیانباتە ئەشکەوت و حەشارگەکەی کوڕەکەی خۆی و گوتبووی، یوسف لێرەیە. جەندەرمەش بەبێ هیچ دەنگ و پرسێك، ئەشکەوتەکە دەدەنە بەر فیشەك. خوێن وا بەرچاوی جەندەرمەی گرتبوو کە... جلوبەرگی گوندی هەموو خوێناوی ببوو. جەندەرمە چاویان عەرزی نەدەیتبوو و گوێیان هیچی نەبیستبوو. ئاخرییەکەی جەندەرمە توانیبوویان کوڕەکەی رەجەب دۆغان بە زیندوویی بگرن و بە دڵێکی خۆشەوە کە بەڵێ یوسفمان گرتووە، دەینێرنە شارۆچکە. گوندیی وەزاڵەهاتوو، ناوی هەرچی گەنجی نۆزدە ساڵەیان زانیوە، تەنانەت ئەگەر کوڕی خۆشیان بووە، گرتووە. زۆری نەبرد و ئەو نهێنییە پەردەی لەسەر لاچوو. دوای ئەوە، قوڕ بەسەر ئەو کەسانەی بۆ راکردن و خۆپەڕاندنەوە لە ئەشکەنجە، فێڵی ئاوایان دەکرد.

مزەفەر هەستا و چووە هەیوانەکە و چاوێکی بە دەوروبەردا گێڕا و سەیرێکی رێگای کرد و گەڕاوە و لەسەر جێیەکەی خۆی دانیشتەوە و گوتی:"ئەگەر وەچنگمان بکەوێتەوە... ئاااخ، ئەگەر بیدۆزینەوە... ئەمن بۆ ئەو دادئەستێنە، بۆ ئەو فەرماندەی جەندەرمانەی سوور دەکەمەوە، بۆیان دەسەلمێنم بابە..."

کە "بابە"ی بەسەرزاردا هات، شادییەك دڵی تەنییەوە و لەخۆوە قسەکەی بەلایەکی دیکەدا برد:"خەریکین کارخانەیەك دادەمەزرێنین بابە. کۆمپانیایەکمان دامەزراندووە. سەرمایەکەی سی و شەش ملیۆنە. کارخانەی چنین. وامان بۆ وەرگرت... هەموو بەڵگە و سەنەدەکانیش ئیمزا کراون. هێشتا کارخانەکە دانەمەزراوە، یەك و سێ سەد قازانج هەڵدەگرینەوە. سێ کەسیش لە شارۆچکەوە لە کۆمپانیاکەماندا هاوبەشن. یەکێکیان ئالاتەمیرە کە پارەیەکی زۆری ناوەتە بەردەستمان. هەر نازانی ئەو ئالاتەمیرە چەندە پیاوە بابە. زۆریش زیرەك و بە مشوورە. هەموو شتێك لە ئێمە باشتر دەزانێ. ئێستا دەتوانین دوو

هێندەی ئەو سەرمایەیەی داماننناوە، بە یەك سەودا و مامەڵە بەدەست بێنین. یانی ئەو دۆلارەی لە پای سی و شەش ملیۆن لیەر ئێمەدا دەیخەنە بەردەستمان، لە سەد ملیۆن لیرەش بەنرختره، واتە سێ هێندەی سی و شەش لیرەکە. تێگەیشتی بابە؟ یانی ئەو پارەیەی داماننناوە، هەر خۆی و بەبێ ئەوەی ئێمە خۆمان ماندوو کردبێ، سێ هێندە دەخاتەوە."

دەروێش بەگ، نەك بلێی بڕوای نەکردبێ، بڕوای هەر دەکرد، بەڵام ئەقڵی نەیدەبڕی کە چۆن ئەوەندە قازانجە دەکات؟ هەر بۆیە زەق زەق چاوی لە کوڕەکەی دەکرد.

"دوای ئەوە... لە ماوەی سێ مانگدا ئەو مەکینە و ئامرازانەی رامانسپاردووە لەدەرەوەڕا بۆمان بێن، دەگەنە دەستمان و کاروباری بینای کارخانەکەش لەو ماوەیەدا تەواو دەبێ... جا دوای ئەوە نۆرەی ئەو دادئەستێن و نەقیبە دەگات. جا بەچاوی خۆت دەبینی چۆن بەپێی خۆیان دێنە ئەو کۆشکە و خۆیان بەسەر پێڵاوتدا دەکێشن. تکا دەکەم بابە..."

"چما پێم نەگوتووی چیت حەز لێیە، دەتوانی بیکەی؟ حەز دەکەی بەشی خۆت بخە رەهنەوە. خۆ من بۆم جوێ کردوویەتەوە و خستوومەتە بەر دەستت. ئەگەر هات و پارەش بەشی نەکردی، دەتوانی چەندی کەیفت دێنێ، زەوی و زاری خۆت بفرۆشی. تۆ راست دەکەی کوڕم، باشە قایلم بەوەی..."

"بابە وەزگم پێ مەدە. ئەگەر ئەو هەتیوە بدۆزرێتەوە و سەری بەگۆمێدا بکرێ، ئیتر کێشەمان نابێ."

دەروێش بەگ بە تیزەبزەیەکەوە دووپاتەی کردەوە:"نامانبێ."

زۆر زوو لەکەفوکوڵ کەوتبوو و نەرم ببۆوە. بەڵام خۆی دەیزانی چ بکا. جارێ با یوسف بدۆزرێتەوە.... دەنگی هۆڕنێك لە دەرەوە رایچڵەکاند. مزەفەر گوتی:"مامە تەمیر بەگ هات."

ئالاتەمیر بە گرمەگرم و هانکەهانك لە پلیکانان وەسەر کەوت. دەروێش بەگ دەمێك بوو ئالاتەمیری نەدیتبوو. کە دیتی سەری سووڕ ما و بزەیەك لە روخساری گەڕا. لەو کاتەدا لەپڕ یادی جگەرگۆشەکەی واتە برایم، وەك ژانێك بریسکەی بەدڵیدا هێنا و زەردەی لێوی رەواندەوە. ئەگەر ئێستا برایم ئاوای دیتبایە، خودا دەزانێ یەك بەخۆی پێدەکەنی. لەبنەوە سەیرێکی مزەفەری کرد. ئەو هەر بای خەیاڵیشی نەبوو. دیاربوو ئەو قەڵافەت و رواڵەتە بەلای ئەوەوە ئاسایی بوو. وەك پەپوولە بەدەوری ئالاتەمیردا هەڵدەخولا و یەك پشوو خولقی دەکرد و دوایی

چوو و بن پیلی کوڕەکەی ئالاتەمیری، کە ڕێك چووبووەوە سەر بابی، گرت و هێنای و داینیشاند.

"بەخێرهاتن، خێر و بەرەکەتتان هێنا..."

دەروێش بەگ لەسەر جێیەکەی خۆی دانیشتبوو. ئاخرییەکەی هەستا و چووە پێشێ و دەستی ئالاتەمیری، کە لەسەر مۆبلەکە دانیشتبوو، گرت. زۆر قەڵەو ببوو و ملی ئەستوورتر دیار بوو. چاوە رود و سوورهەڵگەڕاوەکانی، لەبەر چرچ و لۆچ دیار نەبوون. کڵاوێکی گەڕگەڕیی رەشی گرانبایی لەسەر نابوو. کوڕەکانی زۆریان بە بابیان گوتبوو، کڵاو لەسەرکردن دەبێ چۆن بێ و ڕێوشوێنەکەی چۆنە، بەڵام هەرگیز نەیانتوانیبوو قایلی بکەن بەوەی لە ژوورەوەدا کڵاو لەسەر نەنێ. کەواوپانتۆڵەکەشی لە قوماشێکی زۆر گرانبایی بوو و دیاربوو بەرگدروویەکی شارەزا و دەستڕەنگین دووریبووی. ئەو جلوبەرگانە بۆ هەموو جێیەك و لەهەموو کاتێکدا لەبەر نەدەکرد. تەنیا ئەو دەمەی چووبایەتە سەردانی یەکێکی زۆر ماقووڵ و گرنگ، جار بە وردی و لەسەر خۆ لە سندووقەکە دەیهێنانە دەرێ و لەبەری دەکردن. قۆندەرەکانیشی بریقەیان دەهات. گۆرەوییە سوورەکانی لە دوورەوە سەرنجیان دەڕفاند. کوڕەکانی ئەو گۆرەویانەشیان لێ کردبووە مەسەلە. بەڵام کێ دەیوێرا قسە لە قسەی ئالاتەمیردا بکاتەوە؟ لە وەڵامیاندا گوتبووی، دەی رەنگ چییە؟ لەوە پتری نەگوتبوو. جگە لەوەی نەیانتوانیبوو بۆینباخیشی پێ ببەستن. زۆری کەیف بە کراسیش نەدەهات. حەزی لە شۆرتی ئەسلیپیش نەبوو. کراسەکەی هەر وەك جاری جاران لەقوماشە خەت خەتییەکەی ماراش بوو. بەڵام بە راسپاردە بۆیان دووریبوو. تاڵی ئەستووری سمێڵە ماش و برنجییەکەی دەتگوت دڕکن لەسەر لێوی و بن لیچی رواون. هەموو رۆژێ بووکەکەی، برۆ پڕ و کوڵکنەکانی بۆ شانە دەکرد. بووکێ، هەرجارەی برۆی بۆ شانەدەکرد، دەیگوت بابە، تۆ لەو دەچی. ئەویش وەك تۆ کابرایەکی گوندی بووە و پاساری و قەلەباسکەی لە مەزرا و کێڵگەکانی باقلەدا دەرکردووە. تا ئەوەی رۆژێك لە رۆژان تاقەتی ئەو کارەی نامێنێ و خەیاڵێکی دیکەی دێتە کەللەی. بنیادەمە ئیتر. دەبینی رۆژێك وەڕەز دەبێ و حەزی دەچێتە ژیانێکی نوێ. ئەویش واز لە هەڵفڕاندن و دەرکردنی قەلەباسکە و پاساری دێنێ و دێ نیشتمانە ئازیزەکەمان رزگار دەکا.

ئەوانەی برۆیان ئاوایە، لەهەر جێیەك بن، ئاخریەکەی ئەرکی رزگارکردنی نیشتمان دەگرنە ئەستۆ. جا ئالاتەمیر وەك رۆنی سەی لەقەلبی بدەن، کەیفی بەو قسانە ساز دەبوو و گوێی رادەگرت و لەحاڵێکدا دەستی بە برۆیدا دێنا، جار جارێ سەیری ئاوێنە و جارێ سەیری

وێنەکەی دەکرد کە بەدیوارەکەوە بوو. بەڵام هیچ خاڵێکی هاوبەشی لە نێوان خۆی و ئەودا نەدەدی. بەڵام چونکە هەرچۆنێك بێ بووکەکەی کەسێکی چاوکراوە و تێگەیشتووە، وەك کەسێکی بەختەوەر و گران و سەنگین و دڵنیا و متمانەبەخۆ، بەسەرخۆی نەدێنا و بەدڵی نەدەگرت. کەچی ئەو جلوبەرگەی بەرگدروویەکی شارەزا لە قوماشێکی تایبەت بۆی دووریوە، ئەوی زرت و زەبەلاحتر و نارێکتر و چوارشانەتر نیشان دەدا. جلوبەرگەکانی لەبەریدا لە هەزار و یەك شوێنەوە چرچ و لۆچ دەبوون و گنجیان تێ دەکەوت و بەو جلانەوە لە بووکەڵەیەکی زەبەلاح دەچوو.

ئالاتەمیر لەگەڵ لەسەر مۆبلەکە دانیشتبوو، بەپێی عادەتی پێشووی، لاقی خستبووە سەر لاقی. ئاااخ،÷ ئاااخ، ئاااخ. ئەی هاوار لە دەست ئەو کوڕانە. زۆری لەبەر گران بوو. زۆری لەبەر گران بوو لاقێکی بخاتە سەر ئەوی دیکەی و ماوەیەك ئاوا رایگرێ قەڵەوتر و قورستر ببوو. زۆری لەبەر گران بوو، بەتایبەتی لە بەردەم کەسێکی وە ساری ئۆغڵیدا. ئاخۆ بەگ لێی بەدڵ نەدەگرت و نەیدەگوت: ئەی ئەی، کوڕە ئەوە کێیە لە هەنتەشی مندا ئاوا لاقی لەسەر لاق داناوە؟ ئەوەی کەس نازانێ کوڕی کێیە؟ زۆری لەبەر گران بوو، زۆر ناخۆش... ئاخرییەکەشی، هەر جارێکیش، لەبیری دەکرد و وەك خۆی و وەك جاری جاران دادەنیشتەوە و ئابڕووی خۆی و کوڕەکانی دەبرد. ئەو جۆرە دانیشتنە گوندییانەی خۆی ئاسوودەتر بوو، ئاسوو و و ودە.

"بەخێر هاتی تەمیر بەگ."

کزەی لە جەرگی هات. ئاخۆ بەگ گاڵتەی پێ کردبوو؟ بەڵام کە سەیری کرد، نەخێر، بەگ هەر تاقەتی ئەوەی نەبوو گاڵتە بەکەس بکا.

"ویسکی، ساردی، ئاوی میوە یان قاوە؟ ئەی تۆ حەزت لە چییە گەنجۆ..."

ئالاتەمیر بە هەڕوکیڤەوە، چاوی لە شوێنێك بڕیبوو، گوتی:"قاوە."

کوڕەکەشی زۆر ئاسایی گوتی:"ویسکی."

دەروێش بەگ بە لەبزێکی وەك بووکەڵەیەك بدوێنێ، گوتی:"بەڵێ."

ئەو کە دوای ماوەیەك زۆر، هەستی کردبوو لەتوکوتی هیوایەك لە ناخیدا دەجووڵێ، لەسەر قسەکەی رۆیشت:"ئەوە لەکوێی برالە، زۆرم غەریبی کردبووی. هەر بەسەرمان ناکەیەوە..."

ئیتر لە خۆشیان و بلێی و نەڵێی تۆزێك بۆ بەکەمگرتن، دەستێکی لەسەر شانی ئالاتەمیر دا.

مزەفەر بەو هەڵسوکەوت و شێوە قسەکردنەی بابی زۆر تێك چوو. ئەو بە چ هەقێك ئاوا لەگەڵ ئەو کەڵە سەرمایەدارەی چوکووراوا دەجووڵێتەوە و سووکی سەیر دەکا؟ چما ئەو خۆی کێ بوو؟ چ بوو؟ چ کارە بوو؟ پاشماوەیەکی دەرەبەگایەتیی بەرەو نەمان و تێداچوون. خۆ ئەگەر لە گوێن دەرەبەگی رۆژئاواش بوایە، دیسان شتێك. بوونەوەرێکی چاخی دەقیانووس... هەربۆیە خۆی پێ نەگیرا و گوتی:"بابە..."

تۆزێك راوەستا و نەڕاندی:"بابە... ئەو کارخانەیەی باسیم کرد، تەمیر باغا بە سەردانێکی ئەنکەرە جێبەجێی کرد. ئێمەشی کردە شەریکی خۆی... خوا راوەستاوی بکا."

ئالاتەمیر لاقی راستەی خستە سەر چەپەی و لە حاڵێکدا چاوی بڕیبووە قەپۆزی پێڵاوە بۆیاغکراوەکەی، و لووتی لێ بەرز ببوو، گوتی:"بەڵێ، کە دیتم زانیاری و توانای ئەو گەنجە زیرەکانە بەفیڕۆ دەچێ، قۆڵم لێ هەڵماڵی. ئەوانە زۆر شت دەزانن دەروێش بەگی بەڕێز... دیتم ئەو وڵاتە بە دەستی ئەو گەنجانە رزگار دەبێ... لێی سواری شەمەندەفەر بووم و چوومە خزمەتی جەلال بەگ (جەلال بایار)... جەلال بەگیش لە قۆناغی گەنجێتیی دا یەکێك بووە لەو گەنجە پڕ جۆش و خرۆش و تێگەیشتووانە. جەلال بەگ قەدری پارە و دراویشی زانیوە. خودا ئەومان لێ نەستێنێ و سێبەری لەسەرمان هەڵنەگرێ چەندی بڵێی تێگەیشتووە و دەست و دڵ ئاوایە. هەر چەند قسەیەکم کرد، لەوسەری هاتەوە. دواییش گوتی، ئەگەر تۆ ئەو کارەت لەدەست بێ، ئەمن پارەی پێنج کارخانەی دیکەشت بۆ دابین دەکەم. زۆر لەوە پێش، ئەو دەمەی هێشتا جەلال بەگ ئاوا سواری ئەسپی مرادی خۆی نەببوو، رۆژێکیان پێی گوتم، ئێمە پێویستیمان بە پیاوی وەك تۆ هەیە تەمیر بەگ ئاغا. پیاوی وەك تۆ ئەو چوکووراوایە پڕ دەکەن لە کارخانە. ئەمجارەیان هەر چاوی پێم کەوتەوە، دەستی لە ئەستۆی کردم و زۆر چاکەی لەگەڵ کردم و قەڵەمەکەی هەڵگرت و نووسی. ئەمنیش هاتمەوە و بەو گەنجانەم گوت، کوڕینە دەی قۆڵی لێ هەڵماڵن لەمنتان کەوێ. ئەتۆش تا کەی دەتەوێ ئاوا هەر بگەڕێی و دەست لە رەش و سپی نەدەی دەروێش بەگ؟ راستە، سەردەمی ئێمە بەسەرچووە، بەڵام دەی، خۆ دەتوانی دەستێك بە بن باڵی ئەو گەنجانەوە بگری. ئەوانە پێویستیان بە ئێمەی دنیادیدەیە..."

قاوەیان هێنا. ئالاتەمیر کووپەکەی بە دووپەنجە هەڵگرت و لەسەر قسەکانی رۆیشت:"بەڵێ کاکی خۆم، دەبێ دەستیان بگرین... جەلال بەگ بەمنی گوت، ئەو نیشتمانە، هەر شتێکی لەدەست بێ بۆ ئەو هەوڵانەی ئێوە دەیکا بۆ ئەوەی پێش بکەوێز.."

دەروێش بەگ ئیتر گوێی نەدەدایە. بیر و خەیاڵی چوبووەوە لای یوسف... پێکەوە و بە قوونەشەڕ... ئەی لەو سەگی سەگبابە چەندەی لێ دەڕێسێ... با زەوییەکە بکڕێ و پارەکەی بدات و بڕوا ملی بشکێنێ و جەحەندەم پڕ بکا...

"بەڵێ، بەڵێ تەمیر ئاغا..."

ئاگای لێ بوو بەم دواییانە چۆن هەڵسوکەوت دەکا. تووشی هەرکەس دەبوو و لەگەڵ هەرکەس قسەی دەکرد، حاڵەتێکی پاڕانەوە و پڕ لەچاوەڕوانی و ریاییکەرانەی هەبوو. ئاخۆ ئێستاش هەر وابوو؟ لەوانەشە ئەو ئالاتەمیری وا چاوقایم کردبێ، ها؟ نەکا ئەویش هەڵسوکەوتی گۆڕدرابێ؟

هەوڵی دەدا ئاگای لە هەڵسوکەوت و رەفتاری خۆی بێ. لە چۆنێتیی هەڵسوکەوتی بەرامبەرەکەیەوە، دەیزانی خۆی چۆن رەفتاری کردووە.

"هەر بۆیە ویستم بێیە ئێرە، پێم وایە پێویستیت بە زەوی و زار هەبێ تەمیر ئاغا. ئەتۆ لە کۆن کۆنەوە ئەو دۆستایەتییەت پاراستووە و ئەمنیش بڕیارم داوە هەرکات ویستم زەوییەك بفرۆشم، پێش هەموو کەس بەتۆ بڵێم. یانی ئەتۆم خستووەتە پێش هەموو کەسەوە."

لەونێوەدا زەکەریا وەژوور کەوت و لەحاڵێکدا بە پەنجە ئاماژەی بۆ ئالاتەمیر دەکرد گوتی:"ئەو ملکەکەی ساکچاگوێزی دەوێ، بەڵام ئەمن ئەو ملکە بە پیاوی ئاوا نادەم."

بەگ وەجواب هات:"تکا دەکەم زەکەریا، دوایی وەرەوە، تاوێکی تر وەرەوە."

"دەی باشە من دەڕۆم. بەڵام بێت و خاکی ساکچاگوێزی پێ بفرۆشی، ئەمن ئیتر ناتوانم لەو ماڵەدا بمێنمەوە. ئیتر گەیوەتە ئێسقانم... هەر بفرۆشە و بفرۆشە. هەر بفرۆشە، ئەی ئاخرییەکەی چیی لێ دێتەوە؟

لە حاڵێکدا تووڕەییەکەی خۆی بەسەر هەموو دەوروپشتیدا هەڵدەڕشت، گەڕاوە و بەچاوێکی سووکەوە، سەیرێکی ئالاتەمیری کرد و لەسەر پلیکانەکان راوەستا و بە گاڵتەپێکردنەوە گوتی:"بەگ، بەگ، هەی بەگی غافڵ. ئەو گوندییە قوون بەگووە بە زەوی و زاری تۆ بوو لە لۆرد و ئیتر وای لێ هاتووە بەگ و پاشاکانی ئەنکەرە دێنە خزمەتی. ئەتۆش رۆژ بە رۆژ گوو لە کارەکە دەکەی... گووی... مەیدە، مەیدە، ساکچاگوێزی مەدەیە... ئەوەی بدەیەی، تێداچووی، تەواو..."

خێرا لە پلیکانەکان چووە خوارێ. لە حەوشەوە و دواییش لەنێو دێوە دەنگی دەهات. کەس لێی تێنەدەگەیشت.

ئالاتەمیر بە زویرییەوە گوتی:"ئەو کابرایە وەدەر بنێ بەگ. ئەو کابرایە بەرەڵڵا بکە با بڕوا و جەحەندەمی لێ پڕ بێ، مزەفەر. ئەو کابرایە لە ماڵی ئێوەدا سووکایەتیی بەمن کردووە و بێت و دەری نەکەن، هەر ئێستا دەڕۆم و تا هەم سڵاویشتان لێ ناکەم..."

دەروێش بەگ و کوڕەکەی تەمیر ئاغا و مزەفەر هەوڵیان دا لە کەری شەیتان بیهێننە خوارێ. دەروێش بەگ یەك پشوو دەیگوت:"نارەحەت مەبە و بەدڵی مەگرە تەمیر ئاغا. ئەو ئاگای لەدەمی خۆی نییە. بەدڵی مەگرە بابەگیان. ئەوە بەچاوی خۆت دیتت چیی بەمنیش گوت؟"

بەڵام ئالاتەمیر هەردوو پێی نابووە کەوشێکەوە و یەك پشوو دەیگوت:"دەبێ جوابی بکەن. قسەی دیکەم ناچێتە گوێ. ئەو کابرایە دەبێ وەك سەگ بەرەڵڵا بکرێ."

دەروێش بەگ ئاخرییەکەی بە پێکەنینەوە و بە لەبزێکی دڵدانەوە گوتی:"زۆر باشە بابە، زۆر باشە. زەکەریا جواب دەکەین. ئەو سەگبابە جواب دەکەین. باشە؟ دەی ئێستا بڵێ بزانم مڵکەکەی کۆکتاشی دەکڕی؟ ئەگەر دەیکڕی، دەبی بیست و پێنج هەزار لیرەم بدەیتێ. دەزانی رووبەرێکی زۆری بە ئاقچاسازەوەیە؟"

"نا، کۆکتاشم ناوێ. بەڵام ساکچاگوێز دەکڕم و سی هەزار لیرەشی پێ دەدەم."

"نایدەم."

مزەفەر هات نێوانیان:"تکایە بابە. نابێ دڵی تەمیر بەگ بشکێنی. تکا دەکەم بابە. ئەو کارخانەکە بە ئێمە و هەموو چوکووراوا دەدات."

"ناتوان بیدەمێ."

"بابە."

"ساکچاگوێز بە سی و پێنج هەزار."

"ناتوانم تەمیر. نایدەم."

"بابە."

تەمیر ئاغا:"چل هەزار."

هەستا و دووپاتەی کردەوە:"چل هەزار."

ئیتر وەڕێ کەوت. کورەکەشی بەدوایدا. دەیبۆڵاند و لەبن لێوانەوە زۆر قسەی ناخۆشی بە دەروێش بەگ دەگوت، بەڵام دیار نەبوو دەڵێ چی.

"چل هەزار."

مزەفەر خۆی گەیاندێ و لەسەر پلیکانەکان پێشی پێ گرت و کەوتە پاڕانەوە:"تکا دەکەم، تکا دەکەم زویر مەبە مامە تەمیر بەگ. خراپ لێك تێگەیشتوون. ئەتۆ فەرموو دانیشە با چارەسەری بکەین."

پیلی گرتبوو و دەیکێشاوە دوایە و دەیگوت:"ببوورە مامە تەمیر بەگ..."

ئالاتەمیریش کە چاوە لە ژێلڵاهاتوو و پڕ لەتووڕەییەکانی لە دەروێش بەگ بڕیبوو، پێداگرانە دەیگوت:"ساکچاگوێز بە چلهەزار، ساکچاگوێز، ساکچاگوێز بە چل هەزار... ساکچاگوێز بەگ، ساکچاگوێز..."

دەروێش بەگ لەپڕ تێگەیشت کە ئەوە دیسان بە داماوییەوە و بەچاوی پڕ لە پاڕانەوە سەیری ئالاتەمیر دەکا و لەنەکاو تووڕەبوو و سەری لەگێژەوە هات و بە نێوچاوانێکی گرژەوە بەرەو ئالاتەمیر گەڕایەوە. دەیویست وەك سەگێك لە ماڵەکەی دەری بکا، بەڵام لەجێی خۆی چەقی. یوسفی هاتبۆوە پێش چاوی. لەپڕ ئاگرەکەی دامرکایەوە و نەرم بۆوە. زەردەیەکی ریاییکارانەی کرد و داهاتەوە و دەستی لەسەر ئەژنۆی تەمیر دانا و گوتی:"بە قوربانی چاوت بێ براله."

جا هات و لە تەنیشتی دانیشت. بەچۆکدا هاتبوو، بەڵام هەر بزەی دەهاتێ و نیگای بەرەو دوور دەکشان، دەیگوت:"ئەوجار قایل بووی کاکە تەمیر؟"

پێویستیی بەپارە هەبوو و لەو دەشتەدا جگە لەو کەسی دیکە نەبوو ئەو هەمووە پارەیەی لەسەر یەك بخاتە بەر دەستی.

"دەسبەجێ کاروباری گرێبەست و بەناوکردنەکەی جێبەجێ بکەن مزەفەر."

"بەسەرچاو بابە."

مزەفەر ئەوەی گوت و ئاوڕی لە ئالاتەمیر دایەوە و رومانلووسانە گوتی:"سوپاس مامە تەمیر بەگ. بۆ هەموو شتێکت."

ئالاتەمیر بەبێ ئەوەی سەر هەڵبڕێ و گنجی نێوچاوانی بڕەوێنێتەوە، لە بن لێوانەوە قسەی دەکرد.

دەروێش بەگ هەستی دەکرد، لە گێژەنی سووکایەتیدا دەخنکێ. کە ئالاتەمیر سەری هەڵێنا و چاوێکی سووك و ساردی لێ کرد، لە پێشدا دڵی خۆش بوو، بەڵام کە لە واتای نیگاکەی تێگەیشت، وای زانی ئەوە دنیای بەسەردا وێران بووە. لەپڕێکدا وای بەدڵیدا هات، وەك سەگێك لە ماڵەکەی دەری بکاتە دەرەوە. دوایی بیری لەوە کردەوە کەسی دیکەی پێ شك

نایه زەوییەکەی لێ بکڕێ. کە لە دڵی خۆیدا دەیگوت با پێی بڵێم هەستە و ملت بشکێنە و بڕۆ، با دەرسێکی دابدەم... بڕۆ با جەحەندەمت لێ پڕ بێ... گوێی لە دەنگی ئەو بوو و ڕاچڵەکی:"

"دەروێش بەگ."

دەروێش بەگ بەبێ ئەوەی بەدەست خۆی بێ، خۆی خڕ کردەوە:"فەرموو ئاغا."

ئالاتەمیر کە بەو قەڵافەتە زل و نالەبارەیەوە لە کۆتەرەیەك دەچوو، لە جێی خۆی هەستا و دەستی درێژ کرد، بە نێوچاوانێکی گرژەوە گوتی:"خوا حافیز. دەمویست ئامۆژگارییەکت بکەم. گوێت لەمن بێ. شارۆچکەکە یەکسەر دژی تۆیە. لە کەوچکە ئاوێکدا دەتخنکێنن. هەرچۆنێك بووە ئەو یوسفە بدۆزەوە و شتێکی لێ بکە. ئەویدیکەی ئاسانە. ئەگەر یەو یوسفە بەلایەکدا نەخەی و یەکلایی نەکەیەوە، بە مزەفەر بەگم دەگوت، تەنانەت بچمە ئەنکەرەش هیچ شتێکم لەدەست نایە و چم پێ ناکرێ بۆت. دیارە نەك هیچ کارێکم بۆ نەکرێ، دەیکەم، بەڵام زۆری تێدەچێ. ماڵ ئاوا. قسەکانم پشت گوێ مەخە."

لە پەیکەرە بتێکی دانەتاشرا و شوێن تێنەکراوی هیتیت دەچوو. لە حاڵێکدا تەختی ژوورەکە لە بن پێیانیدا جیڕەیان دەهات، گەیشتە سەر پلیکانەکان و چووە خوارەوە.

دەروێش بەگ وەك سیحرلێکراوان، نە توانیبووی قسەیەك بکا و نە لەجێی خۆی ببزوێ. ئالاتەمیر هەموو هەڵسوکەوتەکانی پڕ لە سووکایەتی بوون و پێشتر بیری لێ کردبوونەوە. بەڵام با وابێ، چار نەبوو. پیاو کە ناچار بوو بە کەڵەگای دایکی دەڵێ خاڵە. خوێنی دڵی دەخواردەوە، بەڵام چیی پێ دەکرا؟ دەست و پێی بەسترابوو...

دەروێش بەگ لەسەر مۆبلێکی کە تاوێك پێشتر ئالاتەمیر لەسەری دانیشتبوو و هێشتا گەرمای ئارەقاویی ئەوی هەر پێوە بوو، پان ببۆوە و گوێی دەزرینگانەوە. گوێی لە دەنگی ترۆمبێلێك بوو، کە دوور دەکەوتەوە. مزەفەر بە غاردان و شاگەشکە و هەژاو لە پلیکانەکانەوە هاتە سەرێ و لە حاڵێکدا هانکەهانکی بوو، گوتی:"بابە، بابە، چیی نەمابوو تێکی بدەی... خودا ئاگای لێی بێ... مامە تەمیر بەگ پیاوێکی باشە... زۆر باشە..."

مزەفەر پەیتاپەیتا قسەی دەکرد و باسی کارخانە و گەڵاڵە و نەخشەکانیانی دەکرد و لێی نەدەبڕییەوە. دەروێش بەگ بیستبوویەوە کە حەمە عەلییش شەریکە لەو کارخانەیەدا. گەورەترین بەش دوای ئالاتەمیر هیی ئەو بوو. مستەفا بەگیشی هەربۆیە رووت کردبوو و لەسەر ساجی عەلیی دانابوو و بەتاقی تەنێ لە کۆشکەکەیدا بەجێی هێشتبوو. بۆ ئەوەی بزانێ

ئەوەی بیستوویەتی وایە یان نا، نە دەیتوانی لە کوڕەکەی بپرسێ و نە توانیبووی شتێك لە ئالاتەمیر بپرسێ.

مزەفەر بەگ یەك پشوو قسەی دەکرد، بەڵام دەروێش بەگ کە بەکۆستی خۆیدا کەوتبوو و بەردەوام خۆی لۆمە و سەرکۆنە دەکرد و بێزی لەخۆی هەڵدەستا، هەر نەشیدەزانی دەڵێ چی. لە گێژاوی شەرم و بەخۆداشکانەوەدا پەلەقاژەی بوو و نەیدەزانی چ بکا.

وەك بلێی وەزاڵە هاتبێ، لە بن لێوەوە و بە نیوەنووزەیەکەوە گوتی:"بڕۆ مزەفەر، بڕۆ وازم لێ بێنە."

تازە تاو هەڵاتبوو کە زەکەریا رۆستەم ئۆغلێی هێنا. لە کۆنە جیپێکی تۆزاوی و خۆڵاوی دابەزین. دەروێش بەگ وەك کۆنە برادەرێکی خۆی پێشوازیی لێ کرد. دەبوو زەوی زو زارێکی زۆر پتر لەوەش بفرۆشێ. رۆستەم بەگ هەر وەك جاری جاران، سەرو سەکتێکی گاڵتەجاڕانەی هەبوو. پانتۆلێکی فش و فۆڵی لەپێ کردبوو نێوفەکی لە عەرزی دەخشکا. سەعاتە زلە شەمەندەفەرییەکەی لە گیرفانی پەستەکە شینە پڕ لە پەڵەکەی ئاخنیبوو و ریزێك زنجیری زێڕیشی بەسەر ورگیدا شۆڕ کردبۆوە. پێڵاوی لاستیکیی لەپێدا بوو. چاکتە خەت خەتەکەی گنج گنج ببوو و لێواری کڵاوە گەڕگەڕییەکەی کەوتبووە سەر ملە کورتەکەی و تەواوی نێوچاوانی و بەشێك لە دەموچاویشی داپۆشیبوو. زۆر زۆ خۆمانە باوەشی بۆ دەروێش بەگ کردەوە و لەئامێزی گرت و ماوەیەك هەروا دەستی بە پشتیدا هێنا. ئاخرییەکەشی گوتی:"بەگ، ئەگەر ئیزن بفەرمووی، بەر لەوەی بچینە نێو قسانەوە، با نوێژەکەم نەچێ. ئەوەی قسەی تێدا نییە، هەرچی هەمانە لە سایەی سەری دینەکەمانەوەیە. هەموو شتێکمان لە گەورەیی و بەخشندەیی خوداوەیە. با فەرزەکەمان بەجێ بگەیەنین، بەشکم ئەویش لە بەزەیی و گەورەیی خۆی بێبەریمان نەکا."

مزەفەر بانگی کرد بەرماڵ بێنن. کچۆڵەیەك دووگردێکی بچووکی هێنا و رۆستەم ئۆغلی لە دیوەخانەکەدا شوێنێکی باشی دۆزیبۆوە و نوێژی دابەست... نوێژەکەی زۆری نەخایاند.

"بەڵێ بەگم، چ فەرمایشێکت هەبوو؟"

لەو کاتەدا قاوەیان هێنا و ئەو بەدەم هەڵقوڕاندنی قاوەکەیەوە، لەسەر قسەکەی رۆیشت:"ئەمڕۆ بەیانی هەر لەبەر دەرگای ماڵمان چاوم بە مزەفەر کەوت، زراوم چوو و گوتم نەکا، بەگمان بەڵایەکی بەسەر هاتبێ. دەسبەجێ غارم دا و هاوارم کرد، گیرا؟ هاوارم کرد ئاخۆ قۆڵبەست کرا و بەگیشیان برد؟ باش بوو دەرکەوت مەسەلەی زەوی و زار بووە. ئەگەرچی ئێمە هیچ پێویستییەکمان بە زەوی و زار نییە و خەڵك ئەوە پەیتاپەیتا کارخانە دادەمەزرێنن، بەڵام

هەرچۆنێك بێ، بەگ زەوی و زار دەفرۆشێ. خۆ زەوی و زاری زیادی، بەرد نییە سەرت بشکێنێ... ئیتر زەوی و زار خەرجی خۆی دەرناهێنێتەوە. کە ئیزنی دامەزراندنی کارخانەیەکت وەگرت، ئیتر پارووت لە رۆنی دەکەوێ. کە دوو ملوێنت دانا و ئەویش هەر بە سەری زمانێ داتنا، لە ماوەی شەش مانگدا نەك بە زمان، بەڵکە نەغد و پوخت شەش ملوێن قازانج دەکەی. سەرۆکی حیزبی یەکبوون و پێشکەوتن، جەنابی مەحموود جەلال بەگ لە ئەزمیر... سیاسەتە نوێیەکەی ئەوەیە ئاغای من. لە زەوی و زارەوە بۆ پیشەسازی... ئەو راست دەکا. چما باب و باپیرانی ئێمە لە ماوەی دەهەزار ساڵدا کە لەسەر ئەو زەوی و زارە کاریان کردووە، چییان پێ براوە، ئێمە چارمان نییە جگە لەوەی واز لە کشتوکاڵ بێنین و روو بکەینە پیشەسازی. هەربۆیە حکوومەت دەستی بە ماڵی خۆیەوە ناوە. بۆ هەرکەس، هەر کەسێکی.. زۆر گرنگ نییە کاکی من، جەلال بەگ نەك هەر بە خزم و کەسی خۆی، بەڵکە بە خەڵکی بەتواناش بە هەر کەسێکی مایە و هەوێنێکی سەرمایەدارانەی تێدا شك بەرێ، پارەیان دەخاتە بەردەست. زەوی و زار باوی نەما کاکی خۆم."

دەروێش بەگ دیسان ملی بەلارەوە نا و گوتی:"زۆر باشە رۆستەم ئۆغڵی براکەم، خراپ نییە."

ئیتر ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا و لەسەری رۆیشت:"یانی کار گەیوەتە ئەوە، ها؟ زۆری گوێ مەدەیە... دەسەڵات چییە. ئەگەر راستیت دەوێ، تۆ ئەوەندەی پێویستیت پێیەتی، زەوی و زارت هەیە."

رۆستەم ئۆغڵی بەهەژاوی گوتی:"نەخێر، نەخێر، نەخێر دەروێش بەگی بەڕێز. من ئەگەر هەزار کارخانەشم هەبێ، دیسان هەر پشتم بە زەوی و زار گەرمە." جا زەردەیەکی هاتێ و چاوەکانی بریسکانەوە و لێ ی زیاد کرد:"کوڕەکانی ئێوەش کارخانە دروست دەکەن. مزەفەر بەگ، ئالاتەمیر، حەمەعەلی بەگی ئاق یوللی.... گەورە..."

دەروێش بەگ بە دەنگێکی بەرز قسەکەی پێ بڕی:"دەزانم."

بەڵێ، بەڵێ بەگم، ئاغای من ئەگەرچی زەوی و زارێکی وای بەدەستەوە نەماوە، ئەمن بەپێی عادەتی کۆنی خۆم و بە چاولێکەری لە رێوشوێنی باب و باپیرانمان، هەر حەزم لە زەوی کڕینە. ئەوجار حەزیشم لێیە لەو سەردەمی تەنگانە و نەهاتییەی جەنابتدا بتوانم یارمەتییەکت بکەم. رۆژگارە ئیتر، جارێ بەرزت دەکاتەوە و جارێ لەعەرزت دەدا. هەر خودایە کاروبارەکانی نزم و نەویبوونیان تێدا نییە. پێشینیان گوتوویانە، دەست دەست دەشوات و ئەوجار دەست

هەڵدەگەڕێتەوە و دەموچاو دەشواتەوە. ئەمن هەر لەبەر ئەوە، بەبێ ئەوەی هیچ چاوم لە زەوی بێ و پێویستیم بە زەوی و زار بێ، لەسەر داوای مزەفەربەگ و زەکەریا بەگ..."

لەو کاتەدا خێسەیەکی پڕ لە سووکایەتیی لە زەکەریا کرد، کە دڵ شکا و بەنگ پەڕیو لەجێی خۆی وشك ببوو. زەکەریا بە شەرمەوە چاوی لە عەرزی بڕی. دەروێش بەگ ئاگای لەوەش بوو. بەگ لەسەر جێی خۆی بەبێ جووڵە راوەستابوو و زاری ببوو بە تەڵەی تەقیو و بە سەرسووڕمانەوە سەیری رۆستەم ئۆغلیی دەکرد و ئەو هەر قسەی دەکرد، و ئەمیش هەر رەنگی دێنا و دەبرد و گنجی روخسارە زەردهەڵگەڕاوەکەی درێژتر دەبوونەوە.

"ئەوە هاتم. من زەوی و زارێکی زۆرم هەیە، بەڵام ئەتۆ بەگی ئێمەی. با مەسەلەی ئەو هەتیوە راکردووە ببڕێتەوە... هەرچۆنێك بێ سەری بەگۆمێدا دەکەی و لایەکی بەلایەکدا دەخەی."

دەروێش بەگ رەنگێکی هێنا و برد. تەزوویەکی پێدا هات و نەفرەت لە دڵیدا بڵێسەی دا. ویستی شتێك بڵێ بەڵام زمانی نەگەڕا و کپ و بێدەنگ چاوی لە چاوی رۆستەم ئۆغلی بڕی. رۆستەم ئۆغلییش بەوەی زانی. ئاخۆ پێی لە بەڕەی خۆی پتر راکێشابوو؟

"تکایەکم هەیە. تۆ چاکەت زۆر بۆ من بووە. پێت ناخۆش نەبێ، خەفەتی لێ مەخۆ، تووڕە مەبە و خۆت مەخۆوە. کاروباری جوامێران وەك موو باریك دەبێتەوە بەڵام ناپسێ. ئێمە تۆ دەناسین. کێ هەیە تۆ نەناسێ؟ منیش دەزانم هەموو ئەو ئاگرانە لە گۆڕی ئەو ماهیر قاباقچی ئۆغڵییە گەندوو گووەوە هەڵدایسێ. هەموو چوکووراوا ئەوە دەزانن و هەر تۆی نایزانی."

رۆستەم ئۆغلی کە ئەو قسانەی دەکرد، دەست و پێی دەلەرزین و جگەرەکەی پێ رانەدەگیرا. جگەرەکەی سێ جاران لێ بەربۆوە سەر مافوورەکە.

"شتێکی دیکەشت پێ بڵێم؟ لەسەرخۆ بە، زۆر گوێ مەدە بەو شتانەی بەسەرت دێن. ئەوەی چاڵ بۆ یەکی دی هەڵدەکەنێ، لە پێشدا خۆی تێی دەکەوێ. ئەوەی خراپە دەکا، ئاخر هەڵیدەگرێتەوە. ئەم دنیایە چیی لێ بچێنی ئەوە دەدروویەوە. دەبێ ئیمانت بەو حوکمەی خودای هەبێ. دەبێ دان بەخۆتا بگری هەتا ماهیر پەتەی خۆی دەخاتە سەر ئاوێ. ماهیر ئاخرییەکەی خۆی پێوە دەکا."

قیت بۆوە و تاوێك چاوی لە چاوی بەگ بڕی و لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:"دەبێ بەڵێنم بدەیتێ ماهیر ناکوژی بەگ. دەبێ گفتم بدەیتێ دەستت بەخوێنی ئەو سەیەی گلاو ناکەی. بەڵێن دەدەی؟"

بەگ هەر زەردەیەکی کرد و ڕۆستەم ئۆغڵی دیسان درێژەی بە قسەکانی خۆی دا:"دەبێ دان بەخۆتا بگری بەگ. دەبێ ئاگری بن کا بی و لەوسەری بێیەوە. چار نییە. بۆ ئەوەی بنج و بناوانی ئەو کارە دەربێنی، دەبێ وا بکەی. گوێ مەدەرە ئەوەی بەسەر هاتووە و خەفەتی لێ مەخۆ. باشە؟ من برای تۆم. ئەگەرچی هیچ حەوجێم بە زەوی و زار نییە، بەڵام چیی زەویت هەیە بۆ فرۆشتنێ، هەر بۆ ئەوەی لەو تەنگانەیە رزگارت بکەم، هەمووت لێ دەکڕم. لە مستەفا بەگیش هەر مەپرسە، ئەو لەپێ کەوتووە. هەر دۆنمێکیش چییە زەویی بەدەستەوە نەماوە. حەمە عەلی تەنانەت گۆڕستانی باب و باپیرانیشی فرۆشتووە. چیی نەماوە ئەو دۆشەگە شڕەی مستەفا بەگیش لەسەری دەنوێ، بفرۆشێ."

کە تێگەیشت دەروێش بەگ لەنەکاو گۆڕدرا، بۆ ئەوەی قسەکەی گۆڕیبێ، دەنگی لێ هەڵێنا و گوتی:"زۆری گوێ مەدەرێ بەگ."

دەنگە پتەو و جێ متمانەکەی، لە جێی گەرمەوە دەهات.

"بڕوات بێ، هەموو گیایەك لەسەر پنجی خۆی دەڕوێتەوە. فیل بەمردوویی و بەزیندوویی یەك نرخی هەیە. تۆ لە هەر وەزع و حاڵێکدا بی، دیسان هەر ساری ئۆغڵیی. شێر هەر شێرە، ئەگەر پیریش بووبێ. با شتێکی دیکەشت پێ بڵێم، لەم دنیایەدا ئەوەی پیاوە و پیاوەتی لەدەست دێ، ئەوەی دڵاوا و جوامێرە، سەری بێ گۆڵمەز و گێچەڵ نییە. با شتێکت عەرز بکەم، جوان و زەریف گوێ بدەیە، چۆن بیلێم..."

هەر قسەیەکی دەیکرد، تۆزێك لەسەری رادەوەستا و جا لەسەری دەڕۆیشت:"ئەوەی هەنگوینی بە دەمەوە بێ، چزووی بە قوونەوە دەبێ[1]. ئەوە قسەی پێشینیانمانە و بۆ کەسی وەك تۆیان گوتووە."

دەروێش بەگ بۆ ئەوەی بەری بە چەنەوەڕەییەکەی گرتبێ، گوتی:"زەوییەکەی کۆك تاش دەدەمە تۆ."

[1] ... هاوتای ئەو ئیدیۆمەم نەدۆزییەوە لە کوردیدا زۆریشم پرسیار کرد. هیوادارم ئەوانەی دەیزانن پێمی بڵێن. نزیکیشە لەوی دەڵێ:"هەرکەس ماسی بگرێ قوونی (قولەپێ)یشی تەڕ دەبێ.

رۆستەم ئۆغڵی دڵی خۆش بوو و گوتی:"باشە، باشە، باشە. دیارە تەمیرە کەرە ئەوێی نەکرپیوە، بەڵام باشە. زۆر باشە."

دەروێش لە بن بارستایی ئەو سووکایەتی و تێشکانەدا دەتوایەوە و متەقی نەدەکرد. لەپڕ هەستی کرد هاتووەتەوە حاڵی جاران و بەزمانیدا هات:" بە درێژاییش بەری بە ئاقچاسازەوەیە."

کەیفی بەدەنگەکەی خۆی هات. گڕ و بە بڕشت بوو.

رۆستەم ئۆغڵی کە تاوێك لەوە پێش وەك ماقووڵان قسەی دەکرد، لەپڕ وەك ریاییکەران و بەدەم لێك خشاندنی دەستەکانییەوە گوتی:"بەگی خۆم، ئاقچاساز وشك دەبێ و تێدا دەچێ. کاری زنەکێش و کاناڵ لێدانەکەشی تا دە پانزە رۆژی دیکە تەواو دەبێ. ماهیر بەگ قاباقچی ئۆغڵی هەوڵی ئەوەیەتی هەموو ئاقچاسازت لێ داگیر بکا. هەم سێبەرت بە تیر دەنگێوێ و هەمیش ئەو هەمووە بەڵایەت بەسەر دێنێ. خۆی حاجییە شێتە بە کوشتن دەدا و بەسەرتۆیدا دێنێ و هەم ئەوەی... بەگ، پێشی بگرە... ئاقچاسازی مەدەیە. ئەگەر ئاقچاساز بەو ببڕدرێ، ئەتۆش و هەموو ئێمەش لەو کەوشەنە وەدەر دەنێ.

وەدەرمان دەنێ ها. پێت ناخۆش نەبێ بەگ. ئەتۆ ساری ئۆغڵیی و فرت و فێڵان نازانی. ئەویش فێر دەبی. خەفەت لەو رووداوانە مەخۆ. ئەتۆ پیاوی و گوتیشم ئەوی ماسی بگرێ..."

بەگ قاقایەکی کێشا. وا لە ناخی دڵەوە پێدەکەنی دەتگوت شتێکی زۆر گرنگی لێ روون بۆتەوە و تێی گەیوە. پەیتاپەیتاش لە بن لێوانەوە دووپاتەی دەکردەوە:"یانی ئاوا... ئاوا..."

"ئەوەی هەنگوینی بەدەمەوە بێ، چزووی بە قوونییەوە دەبێ."

"کۆك تاش ت..."

بوو بە مشتومڕێکی دوورودرێژ. زەکەریا و مزەفەریش هاتنە نێو مشتومڕەکەوە. کە رۆشتەم ئۆغڵی پاشەکشەی نەدەکرد، زەکەریا هەڕەشەی دەکرد و چاوی ێ سوور دەکردەوە و دەیگوت، رۆژێك دەیکوژێ و خوێنە ئاڵەکەی بەو خاکەدا دەکا، کە بە پارەی خۆی کڕیوێتی. مزەفەریش ئەهوەنی دەکردنەوە. رۆستەم ئۆغڵی هەر جارێکی دەکەوتە تەنگانەوە:"ئەوەی هەنگوینی بەدەمەوە بێ..."ی دەگوتەوە و دڵی بەگی وەك مێو و ڕۆن نەرم دەکردەوە و دیسان دەکەوتەوە چەنە لێدان. ئاخرییەکەی چەنەلێدان و بگرە و بستێنەکە بڕایەوە. دەروێش بەگ ئیتر لێ کەوتبوو. بەخۆداشکانەوە و شەرمەزاری هاڕیبووی. لەو دواییانەدا لە هەموو شتێك تەریق دەبۆوە. بە رێگا رۆیشتن و قسەکردن و گوێ راگرتن. باشە بۆ وای لێ هاتبوو؟ رووبەڕووی ئەو

سەیە دانیشتبوو و گوێی دابووە ئامۆژگارییەکانی و چەند سەعاتان چەنەی لەگەڵ لێ دابوو و بۆنی زاری بەسەردا هاتبوو.

"مزەفەر، بەیانی زوو بچۆ شارۆچکە. کاروباری بەناوکردنی ئەو قەباڵانە تەواو بکە و پارەکەی وەرگرە."

ڕۆستەم ئۆغڵی هاتە قسە:"پارەکەیم هێناوە بەگ، فەرموو..."

لە باخەڵییەوە توورەکەیەکی دەرهێنا کە بە ملیدا کردبوو. لە توورەکەکەدا دەستە دراوێکی زلی دەرهێنا، کە بە دەزووی قەند بەستبووی. بۆ دەروێش بەگی راداشت. بەگ پارەکەی لێ وەرگرت و بە ساردی و سووکیەوە فڕێی دایە سەر مۆبلەکەی تەنیشتییەوە. دوای ئەوە، هەستا ئەمسەرەوسەری دیوەخانەکەی کرد. نە بیری لە هیچ شتێك دەکردەوە و نە هەستی بەهیچ شتێك دەکرد. وڕ و کاس ببوو. هەر جار نە جارێك بەئاگا دەهاتەوە و دەیزانی ئەوە لە بۆشاییەکدا، لە دامای و بێکەس و تەنیاییدا نوقم بووە و گیری خواردووە. وای ئەوە هەموو شتێکی لە تاریکی و بۆشاییەکەدا لەبیر دەکرد. بیری ماهیر و قسەکانی ڕۆستەم ئۆغڵی جار بە جارێ وەك بریسکەیەك بە مێشکیدا تێدەپەڕی و دەکوژایەوە و لەبیری دەچووەوە. ئاقچاساز، یوسف، ئالاتەمیر، هەڵسوکەوتەکانی ئەوانیش هەروا. مزەفەر، کچەکەی، خوشکەکەی، مەرگی قۆرت بۆغا، جاڕچی... هەمووی یەك جێ... وەك ئەوەی بیری نەکردبێتەوە...

بۆ نهۆمی خوارەوە هەرای کرد:"ئەسپەکەم زین کەن."

بەخێرایی لە پلیکانەکان چووە خوارێ. هێشتا پێ ڕانەگەیشتبوون ئەسپەکە لە گەوڕ بێننە دەرێ. خۆی غاری دا گەوڕ. هەوساری لە دەست نۆکەرەکەی ـ کە خەریك بوو ئەسپەکەی دەکردەوە ـ ڕاپسکاند و بەپەلە ئەسپەکەی ڕاکێشا دەرەوە و خۆی هاویشتە سەر پشتی و تاوی دا. بۆ کوێ بەرەو کام لا دەڕۆیشت؟ خۆیشی نەیدەزانی. جڵەوی بۆ شل کردبوو و دابوویە بەر قەمچی. ئاگای لەخۆی نەبوو. بە نێو بۆشاییەکی تاریکدا دەفڕی و بایەکی توند لێی دەدا. وەبیری دەهاتەوە، کە چۆتە نێو بایەکی سوورەوە و دەم و لووتی پڕ بووە لە خۆڵ و دوای ئەوەی لە تاریکاییەکی تیژ تێپەڕدا نوقم بووە، کەوتووەتەوە نێو ڕووناکییەکەوە و کە لە مەودایەکی زۆر کەمدا سێ جاران هەتاوی کز و سڕی لە عەوێقی ئاسمانێکی سوور سووردا بینیوە. بە تاریکییەکەدا ڕۆچووە و هاتووەتەوە دەرێ. بە ڕێگا گەرم و سوورەوەبووەکاندا ئەسپی تاو داوە و گوڵێکی شلێرەی دیتووە و بەسەر دەوەنەکاندا بە ئەسپ بازی داوە و پەیتاپەیتا بە تەنیشت ئەو کامیۆن و مەکینە زەبەلاحە نارنجییانەدا تێپەڕیوە،

که له وشتری ئەفسانەیی دەچوون و عەرزەکەیان هەڵدەکەند و جۆگەیان لێ دەدا. ئێستاش له رێگایەکدا، له دەوری چنار و دیواری حەوشەیەك دەخولایەوە. لمبۆزی ئەسپەکەی کەفی دەردابوو و بۆنی ئارەقەی لێ دەهات. بەرەبەری تاوهەڵاتنێ که سەری هەڵێنا ئەوە له بن چنارێکه و چاوی بڕیوەته پەنجەرەیەك، که تیشکی کزی لالەیەکی لێوە دێ. لەو کاتەدا وەخۆ هاتەوە. دیسان ئەسپەکەی لینگ دا و بەدەوری کۆشکەکەدا خولایەوە. ئاوا باشتر بیری دەکردەوە. روونتر و ئاشکراتر. پێ به پێی بیرکردنەوەکەی، ترسێکی بێ دەرمان ناخی دەئاخنی. حەجمینی لێ هەڵگیرابوو بۆ ئەوەی بزانێ چ باسە. له پڕ بەسەر دەرگایەکی شکاوی بەلاداکەوتوودا ئەسپەکەی تاودایە ژوورەوە و لەبەر دەرگای کۆشکەکە دابەزی و هەوسارەکەی به میلەکەوە بەستەوە و وەژوور کەوت. قرچەقرچێك له ناخی هەڵدەستا و هێزی ئەژنۆی نەبوو. هەستی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ نەهامەتییەك له ناخیدا چەکەرەی دەکرد. وەزع و رواڵەتی کۆشکەکەش ئەو هەستەی بەتینتر دەکرد. له نێوەڕاستی پلیکانەکه راوەستا. ئیتر نەیدەتوانی وەسەر بکەوێ. پێیەکانی نەدەجووڵان. تەختە رزیو و قەڵشیوەکان تاك و تەرا کەوتبوون. دیوارەکانی کۆشك زگیان دابوو و سواخەکەی جێ جێ وەریبوو. لای چەپی بیناکه داتەپیبوو و گوێسوانەکان خواروخێچ ببوون. هەموو وڵات تۆزاوی و خۆڵاوی و پڕ له خۆڵ و کا و کۆت بوو. گوڵی نێو گوڵدانەکان وشك ببوون و چەند گوڵدانێکیش شکابوون و به گوڵی وشکەڵاتووەکان و گڵەکەی ناویانەوە بەسەر تەختی دیوەخانەکە وەرببوون.

کورسی، مێز، گاسن، کوتك، تەختی خەو، لێفە، باڵنج، دۆشەگ، بوتڵی بەتاڵ، تەنەکە، قاپی مسی، قاپی کۆن و شکاو و قایش و قرووشێکی زۆر له دیوەخان و حەوشە و بن دیوارەکان کەوتبوون و پەرش و بڵاو ببوون. کۆشك ئاداری بەسەر پاداریییەوە نەمابوو. دەروێش بەگ زۆریی لەخۆی کرد و بەخۆی گوت:"دەبێ هەر بیبینم. به هەر نرخێك بێ... دەبێ ئاوا به شپرزی و داماوی بیبینم." یەك دوو پلیکانی دیکەش چووە سەریز لەوانەیە ئەویش لەگەڵ کوڕەکەی چووبێتە ئەدەنە. لەوانەشە... لەوانەیە مردبێ. چاوی به چەند پیاوێکی جلوبەرگ شڕ کەوت که له گۆشەیەکەوە خەریکی رووخاندنی کۆشکەکه بوون. ئەوان هەر چاویان پێی کەوت، خۆیان ون کرد. لەوانەشە مستەفا بەگ لەو کاتەدا له جێوبانەکەیدا مردبێ. تەرمەکەی بای کردبێ و روخساری شین و مۆر هەڵگەڕابێ و دەستی لەسەر دەسکی لۆغانەکەی و پەنجەی لەسەر پەلەپیتکه ئاوسابێ. بۆ ئەوەی پەنجەی بێنییە دەرێ، دەبێ بیبڕیتەوە. لەوانەشە ئێستا کرمەڕێز بووبێت... بیری کردەوە، ئەگەر مردبێ، ئەگەر ئاوسابێ

و کرم تێی دابێ، ئەمن تەرمەکەی، تەرمی دوژمنە جوامێر و لێوەشاوەکەم هەڵدەگرم و بە جوانترین و شیاوترین ڕێورەسم... دەکرێ بڵێی، بە مەرگی ئەو نیوەی منیش دەمرێ.

بەخوای دنیایەکی سەیرە. دنیایەکی غەوارە و شێت. مستەفا، مستەفا، مستەفا ئاق یۆللی، ئەوی هەنگوینی بەدەمەوە بێ، چزووی بە قوونیەوە دەبێ... ئەتۆ پیاوێکی ئاوای، پیاوێکی شیلە و چزووت پێوەیە. دیارە نییە چارەنووسی من چۆن دەبێ. نازانم لەکوێ و کەی و چۆن دەمرم. مەرگی منیش فەرقێکی لەگەڵ مەرگی تۆ نابێ.

تەختەکان لەبن پێی دا وا دەلەرزین و دەنگیان دەهات، دەتگوت هەر ئێستا دەڕووخێ. ڕۆژانێك... ئەوەی دەیدی، چەقینی پێی لە خاك و خۆڵ و پیساییدا، کاولاش و وێرانی، بیر و زەینی دەروێش بەگیان نوقمی تاریکاییەك دەکرد. لە پشت دەرگایەکەوە کە باش دەیناسی، ڕاوەستا و گوێی هەڵخست. لە ناوەوە سریوەیەکیش چییە نەدەهات. زەمان بەستبووی و لە جووڵە کەوتبوو. چەند سەعات دەبوو لەوێ بوو؟ ئاگای لێ نەبوو. بەسپایی پاڵی بە دەرگاکەوە نا. دەرگاکە بە جیڕەجیڕ کرایەوە. بۆنی شێ و هەڕنەهووتی بەسەردا هات و سەری لەگێژەوە هات. کە وەژوور کەوت، دیتی. دەمانچەکەی بەدەستەوە بوو و پەنجەی لەسەر پەلەپیتکە. مستەفا بەگ چاوی هەڵێنا و ماوەیە بە سەرسووڕمانەوە سەیری کرد. بڕوای بە چاوی نەدەکرد. ڕوخساری وەك لیمۆ زەرد هەڵگەڕابوو. ردێنە ماش و برنجییەکەی، چڕ، ئاڵۆز و چڵکن کەوتبووە سەر سینگی و مژۆڵی نەدەجووڵانەوە. لێوی باریك ببوونەوە و وشك و توێژ توێژ و لیکاو بەولای لایدا هاتبووە خوارێ و پێوەی وشك ببۆوە و سپی هەڵگەڕابوو. لووتیشی درێژ ببۆوە و ئێسکی شەویلگە و ڕوومەتەکانی دەرپەڕیبوون. چەند مێشێك لە دەوری زار و لووتی دەخولانەوە. قورتمەی وەك مستەکۆڵەیەك لە نێوەندی گەرووی قەتیس مابوو. چاوەکانی بەقووڵدا چووبوون و دەرپەڕیبوون. چاوی وەك چاوی مردووان، وەك چاوی مەڕێکی سەربڕاو، زەق زەق بەمۆڵەق وەستابوون و ڕەشکێنەکەیان چرچی تێکەوتبوو.

دەمانچە بریقەدارەکەی پەڵە پەڵەی ڕەنگەکەی کاڵ ببۆوە و ئاسنەکەی دەرکەوتبوو و کۆگایەك فیشەکی بریقەدار لەبەر دەستی و لە تەنیشت دەسکی دەمانچەکەوە دیار بوون. دەستە وشکەڵاتووەکانی کەوتبووە سەر ئەو لێفە کۆن و چڵکنەی لۆکەکانی لە درز و شوێنە دڕاوەکانییەوە هاتبووە دەرێ. کەر لە ژوورەکەدا کەوتبا ددانی دەشکا. تاقە کورسییەکی شەق و شڕ لە تەنیشت تەختەکەیەوە بوو. هەر ئەوەندە. شوێنی وێنەکان و شمشێرەکان و شتەکانی دیکە بەسەر دیوارەکەوە مابووەوە. دەروێش بەگ لەو حاڵەدا نەیدەتوانی بەجوانی

بیهێنێتەوە بەرچاوی کە جاری جاران ئەو ژوورە چۆن بووە. بە ژوور سەرییەوە و لەسەر کورسییەکە پەرداخێکی نیوەپڕی درزبردوو و پیس و پڕ لە گووی مێش دانرابوو. پەلاسێکی زۆر کۆنە و کاڵەوەبوو راخرابوو... چاوی مستەفا بەگ و روخساری وردە وردە و بە خێراییەکی سەرسوورڕهێنەر، سات بە سات لە سەرسوورڕمانەوە بەرەو بڕوانەکردن و لە بڕوانەکردنەوە بەرەو ترس، لە ترسەوە بەرەو تووڕەیی، بەرەو پەلامار، شەرمەزاری، تۆقین و لە تۆقینەوە دیسان بەرەو ترس، لە ترسەوە لەپڕ بەرەو خۆشەویستن دەگۆڕدرا. ئەو چاوانە ئاخرییەکەی وایان لێ هات هیچیان تێدا نەدەخوێنرایەوە و لە دەروێش بەگی بڕین. روخساری تەڕایی تێدا نەمابوو. دەتگوت دەموچاوی مردووانە. پێستی وشك و بزرکاو، وەك پەڕە کاغەزێکی هەر دەستی لێ بدەی هەڵوەرێ... لەسەرخۆ خوێن لە روخساری گەڕایەوە. چاو و روخساری تۆزێك وەخۆ هاتنەوە و ئەوجار چاوەکانی بە نەرمە بزەیەك بووژانەوە و روون بوونەوە. نەرمەبزەیەك، کە گاڵتەی بە هەموو شتێك دەکرد، بە دنیا، بە دەروێش بەگ و بەخۆی. تاڵترین تیزەبزەی لێکەوتوویی و بێ دەسەڵاتی، کە بەرەو رزگاربوون دەکشا... بزەیەك لە چاوەکانەوە بەرەو سمێڵ و ئەوجار بەرەو لێوەکانی کشا. چەندی زەردەی لێوی روونتر دەبۆوە، گاڵتەجاڕانەتر و بەبڕشتر و بێ بەزەییانەتر دەبوو. روخساریشی وێڕای پێکەنینەکەی، بە گاڵتەجاڕییەوە و لە ململانێدا لەگەڵ دنیا و تووڕهەڵدانی دنیادا تیژتر و بەبڕشتر دەبوو. دوای ئەوە لەسەرخۆ چاوی لێك نا و ئەو بزە گاڵتەجاڕانەیەی بەسەر لێوییەوە بوو، بەوێوە وشك هەڵگەڕا. دەروێش بەگ نەیتوانی لە جێی خۆی ببزوێ. سەری لێ شێوابوو. نە دەیتوانی بگەڕێتەوە و نە توانای ئەوەی بوو بچێتە پێشەوەش. دەمانچە بەدەستەوە، لە جێی خۆی وشك هەڵاتبوو. لەو حاڵەدا دەیتوانی چ بکا؟ ... دەروێش بەگ هەروا دڕدۆنگ بوو هەتا پیرەژنێك هات. پیرەژنەکە لە مستەفا بەگ داماوتر بوو. دەتگوت لە گۆڕ هاتۆتەوە دەرێ. جلوبەرگەکانی لەبەریدا فشوفۆڵ ببوونەوە. روخساری تاوەسووت و پڕ لە چرچ و لۆچ بوو. شین و مۆر وەك مردووان. ژنە کە خۆی خزاندە ژوورەوە و چاوی بەو کەوت، گەش بۆوە و خێرا خێرا و بە دەنگێکی کز و تکاکارانە گوتی:"بەخێر هاتی، زۆر بەخێر بێ ئاغا... خۆ بە چاوی خۆت دەبینی، ئاغایان، ئێمەیان تووشی چ رۆژە رەشییەك کردووە؟ بەجێیان هێشتین و لێیان دا و رۆیشتن. ماڵ و مڵکەکەیان فرۆشت. خاتوونیش پشتی کوڕەکەی گرت و بەگ تووشی ئەو رۆژە بوو. دەڵێن خاتوون دەگەڕێتەوە لای بەگ و هەموو شتێك وەك خۆی لێ دێتەوە...

بە دەمە بێ ددانەکەی زەردەیەکی هاتێ و لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:"ئێمەش لەگەڵ بەگ، تێر زگی خۆمان ترخێنەیەك دەخۆین. بەگ دەڵێ، ئەگەر ترخێنەیەکم خواردبا..."

مستەفا بەگ لەو کاتەدا لە جێوبانەکەیدا جووڵەیەکی کرد و زۆر بە ناخۆشییەوە نالاندی. پیرەژنە لەسەری ڕۆیشت:"بەگ دەڵێ، ئەگەر جارێکی دیکە تێر زگی خۆم ترخێنەیەکی پڕ لە سیر و بیبەری سوور بخۆم، دەبووژێمەوە."

مستەفا بەگ ئەمجارە لە جێیەکەی خۆیدا وەك بڵێی تەکانێکی لەخۆی دابێ، وا نالاندی، دەتگوت هاوار دەکا. بەڵام پیرەژنە لێی نەبڕییەوە:"دەبووژایەوە، دەبووژایەوە..."

دەروێش بەگ لەنەکاو گەڕاوە و بە هەڵەداوان لە ژوورەکە چووە دەرێ و لە پلیکانان چووە خوارێ و خۆی هاویشتە سەر ئەسپەکەی.

دەروێش لە زیندەخەوێدا بوو، کە بە دەنگی ترۆمبێلێك وەخۆ هاتەوە. رای کردە بەر بێلا و ماهیر قاباقچی ئۆغلیی دیت. لە تەنیشت ترۆمبێلێکی ڕەشی درێژ و نوێ راوەستابوو. بە دەوری ترۆمبێلەکەدا دەهات و بەسەرسووڕمانەوە سەیری دەکرد. ترۆمبێلەکە تۆز و خۆڵێکی زۆری لێ نیشتبوو. شتێکی دیکەش هەبوو، ئەویش سەر و گوێلاك و قەلافەتی ماهیر بوو. کلاوێکی لەسەر کردبوو، کە لێوە پانەکەی سەر شانەکانیشی دادەپۆشی و لەبەر تاوەکە دەبریسکایەوە. کراس، پانتۆڵ و پێلاوی سپیی لەپێ کردبوو. دەتگوت هەر لەخۆوە پێدەکەنێ. پێکەنینە پڕ لە شادییەکەی لە دوورەوە دیار بوو. خەڵکی شاد و خەمبار و ترساو و خەفەتبار و دڕدۆنگ کە تەنیا دەکەونەوە، لە دوورەوە دیارن. بنیادەمەکان دەتوانن هەموو شتێك لە خەڵکی بشارنەوە، بەڵام زۆر کەم دەتوانن خۆ لە خۆیان بشارنەوە. بنیادەم ئەگەر شتێکی پێ ناشیرین و نادادپەروەرانە و بەژان و ترسێنەر بێ، تەنانەت ناتوانێ لە خۆیشی بشارێتەوە. پاساوێکیش هەر دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی نەیتوانیوە بیشارێتەوە.

ماهیر بەگ دوای ئەوەی چەند جارێك بەدەوری ترۆمبێلەکەدا هات، بەرەو پلیکانەکان وەڕێ کەوت. دەروێش بەگ بەپێچەوانەی خوو و خدەی خۆی، لەسەر پلیکانەکان چاوەڕێی بوو. ماهیری زۆر بە کەفوکوڵەوە لە باوەش گرت و بەدەنگێکی گەرم و خۆمانە گوتی:"بەخێر بێ برالە. برای شیرینم. مەگەر خوا بزانێ چۆن دەتوانم ئەو چاکەیەت بدەمەوە، کە لەگەڵم دەیکەی و وەك برایەك لە پشتمی."

ماهیر لە پێشدا دڵی بەو پێشوازییە خۆش بوو و دوایی لەپڕ وەك ئەوەی هەستی بە تووڕەییە شاراوەکەی نێو دەنگی دەروێشی کردبێ، ترس هەڵیگرت. کارەکە خەریك بوو تێك

دەچوو. هەزاران بیر و خەیاڵی بە مێشکیدا هات. دەروێش بەگ بەدەم فیکەی سمێڵانەوە، چاوی لە دەموچاو و دەستی ئەو هەڵنەدەگرت.

ماهیر کە لەسەر مۆبلەکە دادەنیشت، گوتی:"زۆر گەرمە."

ئیتر بە دەسرۆکەکەی دەموچاوی باوەشێن کرد:"ئای بۆ ویسکییەکی سارد."

دەروێش بەگ بانگی کرد:"ویسکی."

ڕێك لەو کاتەدا، وەك بڵێی لە پێشدا ئامادە کرابێ، لەسەر سینییەکی زیوین، ویسکی و سەهۆڵ و ئاو و پەرداخیان هێنا. شووشەکان هەڵمیان لێ نیشتبوو.

سەرودەموچاوی ماهیر بەگ تۆزاوی بوو. مژۆڵ و برۆ و سەر و قژی لەبەر تۆز و خۆڵ سپی دەچوونەوە. ئارەقە بە چەند شوێنێکی دەموچاوە خۆڵاوییەکەیدا هاتبووە خوارێ و شوێنی تێ خستبوو.

دەروێش بەگ بەدەستی خۆی ویسکیی تێ کرد، سەهۆڵ، ئاو... بۆ خۆشیی تێ کرد. لە حاڵێکدا زۆر بەدەگمەن دەیخواردەوە.

"بەخۆشیت."

پیاڵەیان لێك دا. لە روخساری ماهیردا ترس وردە وردە شادییەکەی دادەپۆشی. دەستەکانی ئۆقرەیان نەبوو. لەوکاتەدا کە سەرلێشێواوی گیانی دەتەنی، هەوڵی دەدا، شادی و سەرکەوتنەکەی خۆی بشارێتەوە. جارنەجارێکیش، بەبێ ئەوەی بەدەست خۆی بێ، هەندێ دەنگی لە قورگییەوە دەهات وەك بڵێی بیەوێ بڵێ، ئەوەی لەگەڵ تۆم کردووە و بەسەر تۆم هێناوە، هەقی خۆت بووە. بەگ یەك پشوو چاوی تێ بڕیبوو و ورد ورد لە هەڵسوکەوت و جووڵەکانی ورد دەبۆوە. ماهیر بەگ لە لایەکەوە پەیتاپەیتا پێکی هەڵ دەدا و لە لایەکی دیکەشەوە بەردەوام ئارەقەی نێوچاوانی دەسڕییەوە و نەیدەزانی دەستەکانی لەکوێ بشارێتەوە، ئەو پەڕی هەوڵی خۆی دەدا نەهێڵێ چاو و روخساری شتێك بنوێنن و شادییەکەی دەشاردەوە و حاڵەتێکی خەفەتبار و گریاناویی بەخۆوە دەگرت و هەر جارەی حاڵەت و هەستێکی هەبوو. دەروێش بەگیش لەسەر یەك هەر بەوجۆرە بوو. لە دڕدۆنگیدا جینگڵی دەدا، تووڕە دەبوو، دڵنیا دەبوو، سەری سووڕ دەما و دەکەوتە نێو تارىکییەوە و لە پڕێکدا هەموو بیر و بۆچوونەکانی وەڕاست گەڕان و دوایی لە سەرلێشێواوییەکدا پەلەقاژەی دەکردەوە و دەترسا و ئازا دەبوو ولە روخساری ماهیر ورد دەبۆوە و هەوڵی دەدا مێشك و ناخی بخوێنێتەوە و لە چاوترووکانێکدا سەرەداوێك بدۆزێتەوە لەو گۆڕانانەی لە روخساری

ماهیربەگدا دەهاتنە گۆڕێ. جارێ سەیری دەکرد ماهیری نەرم و نیان و برادەرەکەی تاوێك لەوە پێش لەپڕ بووەتە دوژمنێك و لەو حاڵەدا ترساو و هەڵکورماو و پەنجەکانی لە بەدفەڕییان گرژ دەبوونەوە و...

ماهیر نەیدەزانی چۆن خۆی قوتار بکا. بەگ هەموو هۆش و گۆشی خۆی دابووە چاوەکانی ماهیر و وێڕای ئەو بیری دەکردەوە و وێڕای ئەو دەترسا و وێڕای ئەو پەردەی بەسەر ناخی خۆیدا دەکێشا و گزەی دەکرد. دوو بنیادەمەکە دەتگوت بوونەتە یەك کەس. ئەویش لەگەڵ دەروێش بەگدا ببووە یەك.

ماهیر ئاخرییەکەی بۆ شاردنەوەی هەست و کەفوکوڵە بەجۆشەکانی، ناچار بوو بێتە قسە. بۆچی هاتبووە کۆشکی ساری ئۆغلی؟ دیارە بۆ هاتبوو هەواڵێکیان بداتێ، وانییە؟ لە شارۆچکە کێ لەو باشتر ئاگای لە رووداوە نوێیەکان بوو؟... گوتی:"بەڵێ بەگ."

جا لە حاڵێکدا هەوڵی دەدا دەستەکانی لە پشت جامی ویسکییەکان بشارێتەوە، لەسەری رۆیشت:"بەڵێ برا شیرین و نەجیمزادەکەم، بەڵێ دەروێش بەگی ساری ئۆغڵیی ماقووڵ زادە."

دەروێش بەگیش بە گاڵتەوە گوتی:"کوڕە ئەتۆ واز لەو بێنە، لە ساری ئۆغڵیی دەڵێم."

ماهیر پتر شڵەژا و لەسەر قسەیەکەی بەردەوام بوو:"بەڵێ ئاغای من، ئاخرییەکەی توانیم روونی بکەمەوە کێ پارەی بۆ سەری یوسف داناوە."

دەروێش بەگ خۆی پێ نەگیرا و نەیتوانی کەفوکوڵی ناخی بشارێتەوە، پرسیی:"کێ؟"

"ئەحمەد قایا سارپ، نوێنەری پەرلەمان."

دەروێش بەگ بەبێ ئەوەی بەدەست خۆی بێ، جنێوێکی دا و دەسبەجێ بەسەر خۆیدا زاڵ بۆوە و گوتی:"هەی دایکەخۆگێ. باشە چ خراپەیەکم بۆ وی بووە؟"

"جا چیت عەرز بکەم... لەگەڵ من دانووی ناکوڵێ. پێی وایە ئەمن دەچمە پەرلەمان و جێی وی دەگرمەوە و تەنانەت دەبمە وەزیریش. بەڵام نازانێ ئەگەر ئێمە حەزمان لە شتی وا بوایە، دوای ئەوەی لە ڤیەننا گەڕاینەوە، زۆر لەمێژ بوو دەبووینە بەڕێوەبەری گشتی و وەزیر. بەڵام ئێمە شارۆچکەکەی خۆمان و کۆشکەکەی ساری ئۆغڵیمان بە هیچ شتێکی دیکە نەگۆڕییەوە. من پێم وایە بۆیەش دوژمنایەتیی تۆ دەکا، چونکە تۆ پشتی من دەگری."

دەروێش بەگ هەستی بەو گزە و فرت و فێڵە کرد، کە لە چاوەکانی ئەودا بڵێسەی دەکێشا. لەسەرخۆ گوتی:"تکایە... بەڵام کەسێك بە ناوی یوسف لەگۆڕێ نییە.

بنیادەمێکیان بە ناوی یوسف لە خەیاڵی خۆیاندا دروست کردووە و کردووشیانەتە پیاوی من و جا هاتوون سی هەزار لیرەشیان خەڵات بۆ سەری داناوە و بۆ دۆزینەوەی ئەو بنیادەمە خەیاڵییە وەکێو و دەشتان کەوتوون. بنیادەم لەو کەرێتییەی ئەوانە شاخی لێ دەڕوێ. ئەوجار دەچن خەڵکی گوندەکانی بنیاری چیا دەدەنە بەر شەق و تێهەڵدان. ئەویش بە ئەمر و فەرمانی ئەو ئەنکەرە گەوجە. پەلە مەکە، هەموو شتێکی ئەنکەرە چارە دەکەم. لە سەرچاوەکەوە ئاوەکە دەگرمەوە. ئەو دادئەستێن و ئەو نەقیبە و ئەو کەسەش کە پارەی بۆ سەری یوسفە خەیاڵییەکە داناوە، تەمبێ دەکەم. ئاخرییەکەی هەر دەیدۆزمەوە. جا ئەحمەد قایا بێ یان کەسێکی دیکە. ئەمن بەشی خۆم ژیاوم و دوای ئەوە هەتا دەمرم، هەموو تەمەنم بۆ ئەو کارانە تەرخان دەکەم. تەمبێیان دەکەم... ئەوان دەیبینن چۆن مشووریان دەخۆم، ژن و منداڵەکانیان تووشی چ ڕۆژەڕەشییەك دەکەم و چییان بەسەر دێنم و شارۆچکە لە چ ئاگرێکدا دەسووتێنم..."

ئیتر هەستا و بە پێکەنینەوە نەڕاندی:"بە خۆشیت. هەڵدە ماهیر. ئەگەر من دەروێشم، تۆ خەمی هیچت نەبێ و لەهیچ شتێ مەترسە. مشووری هەمووان دەخۆم. مشووری ئەو کابرایەش هەروا، ئاخرییەکەی دەیدۆزمەوە."

ئیتر چاوی لە چاوی ماهیر بڕی. ماهیر پێی نەکرا چاوی لە چاوەکانی ئەو بدزێتەوە و ناچار بوو خۆی بەدەستەوە بدا و دەروێشیش دوای تۆزە ڕاوەستانێك گوتی:"تەنانەت دۆزیشمەوە."

جا لەسەرخۆ و بە داڵغەوە لەسەر جێیەکەی دانیشتەوە و لێبڕاوانە لەسەری ڕۆیشت:"تەنانەت دۆزیشمەوە. تۆ پەلەم لێ مەکە. هەمووان دەکەمە تۆزی بانان."

ماهیر بە تەتەڵەوە گوتی:"بەگ، ئەگەر ئەو یوسفە لەنێو نەبردرێ، لێمان دەقەومێ."

بەگ نەڕاندی:"کەسێك نییە ناوی یوسف بێ. هەرگیز نەبووە. زۆری پێ ناچێ دادئەستێنیش و تۆش و خۆشم نامێنین."

ماهیر بە بیستنی"تۆش، ئەمنیش" بە لەسەرخۆییەکی وەك لەسەرخۆبوونی دەمی مەرگ گوتی:"زۆر باشە. چاکە شوکوور لەنێو چووە. جا ئەوجار بە ئاسوودەیی... دەتوانین بەگژ دوژمنەکانماندا بچینەوە."

لەپڕ ڕوخساری گەش بۆوە و بە لەبزێکی دیکەوە گوتی:" بەگ چیی وای نەمابوو لەبیری بکەم. کوڕە دەرد و بەڵا ئەوەندە زۆرن کە... ئاقچاساز بەم زووانە وشك دەبێ. دوێنێ

چووبوومە ئەویّ. زنەکێشی و کاناڵ لیّدانەکە وا تەواو دەبیّ. چاکە شوکوور، مەسەلەی ئەو یوسفە ئارامی پیّ نەهێشتبووم. نازانم ئەو ئەنکەرەیە بۆچی ئاوا لەتۆ هەڵگەڕاوەتەوە؟ جا ئێستا شتی دیکەشیان هەڵبەستووە. دەڵێن ئەتۆ قۆرت بۆغات بە دەستی جارچی بەکوشتن داوە. دەڵێن وەلی شەماڵ پیاوی تۆ بووە و ئەتۆ دەستت لە پشتی مەستان داوە و دنەت داوە سلێمان ئەسلان سۆوی پەنجە بکوژیّ. لەو تەلەگرافانەدا کە لە ئەنکەرەوە دێن، باسی هەوو ئەو شتانە دەکریّ. گۆیا تۆش گوندییەکانت هان داوە راپەڕن. بۆ لێکۆڵینەوە لەو مەسەلانە، ژەنەراڵ بەهجەت پاشا لە ئەنکەرەوە هاتە شارۆچکە. من پێم گوت پاشای من، هەموو ئەو دەنگۆیانە بیّ بنەما و پووچن. چما شتی وا دەبیّ؟ دەروێش بەگ لەکویّ و راپەڕینی گوندی لەکویّ؟ بەڵام چیی کردم وکراندم بەگوێیدا نەچوو. ئەتۆش لەگەڵ ئەو عەریزەنوسە..."

دەروێش بەگ بە دڵخۆشییەوە و بەدەم چەپڵەلێدانەوە، یەك پشوو پێدەکەنی و دەیگوت:"بەهجەت، بەهجەت! من ئەو، من ئەو... لە مێژە دەیناسم. ئەو، ئەو؟ گویّ مەدەیە ماهیر. بای خەیاڵێشت نەبیّ. بەم زووانە مشووری هەمووان دەخۆم."

ماهیر لەو دەمەدا ئاسەواری دڕدۆنگی و گومان و شێوانی لە هەڵسوکەوت و دەنگی دەروێش بەگدا بەدی کرد و گوتی:"بەگ، گەورەترین کێشەی تۆ ئەوەیە، متمانەت بەهیچ کەس، تەنانەت بە چاوی خۆت و بە منیش نییە. تۆ کە دەڵێی، یوسفێك لەگۆڕیّ نییە، دیارە هێشتا متمانەت بەمن نییە. ئەگەر یوسفێك لەگۆڕیّ نییە، ئەی ئەو گەنجەی من نەقیبم بۆ خەڵەتاند و دەربازم کرد، کیّ بوو؟ یان ئەوەی لە ماڵەکەی عەلییە ریشە گرتبوویان و دوایی خۆی لە دەستیان قوتار کردبوو و جەندەرمە گیسکەکەیان خواردبوو، کیّ بوو؟ ئەگەر یوسفێك لەگۆڕیّ نییە، ئەی عەلییە ریشە بۆ لەبەندیخانە کراوە؟ ئەتۆ تەنانەت باوەڕت بە چاوەکانی خۆشت نییە. تۆ تەنانەت متمانە بە مزەفەر، بە کوڕەکەی خۆشت ناکەی."

دەروێش بەگ وەك بەلادا کەوتبیّ، بەدەنگێکی کز گوتی:"یوسفێك لەگۆڕیّ نییە. ئەمن نە کەسێکی وام دیتووە و نە دەیناسم. ئەوجار بەمن چی مەستان و وەلی شەماڵ، سلێمانیان کوشتووە؟ هەموو دنیاش دەزانن جارچی لەسەر چی قۆرت بۆغای کوشت."

"دەزانن. بەڵام یوسف هەیە و تۆش وەك نەقیب بەشوێنییەوەی. کەس نییە ئاگای لەوەش نەبیّ."

دەروێش بەدەنگێکی وەك بناڵێنیّ، گوتی:"یوسفێك لەگۆڕیّ نییە."

ماهیر بەگ بە تووڕەییەوە گوتی:"یوسف هەیە."

ئیتر هەستا و باقی ویسکییەکەی بەپێوە هەڵ دا. ئاخری لە دەروێشی ئاشکرا کردبوو. دەبوو بچێتەوە شارۆچکە و کاروبارەکان گورجوگۆڵتر بکا. بە لەبزێکی متمانەبەخۆوە و لەحالێکدا لەسەر یەك بە یەکی قسەکانی هەڵوەستەیەکی دەکرد، گوتی:"یوسف هەیە دەروێش بەگی ئازیز. ئەگەر یوسف نەبوایە، ئەتۆ ئەوەندە نەدەشڵەژای. تۆ راهاتووی هیچ شتێ بەکەس نەڵێی. دەی باشە، چۆنی پێت باشە با وابێ. تەنانەت بەمنیش مەڵێ، بەڵام چاوەڕوانییشت نەبێ لەمەودوا خۆم لە کارەکانت هەڵقورتێنم... ئێستا تۆ وات لێ بەسەرهاتووە لەهیچ شتێ تێناگەی. دۆست و دوژمنت لێك ناکەیەوە. دەبێ راست و بێ پێچ و پەنا پێت بڵێم تۆ نوقمی خەون و خەیاڵی دەروێش بەگی ئازیز..."

ئیتر بێدەنگ بوو، بۆ ئەوەی بزانێ قسەکانی چ کاریگەرییەکیان لەسەری هەیە. کە دیتی دەروێش بەگ بێدەنگە و خەریکە پاشەکشێ دەکا، بە تۆزێك تووڕەییەوە لەسەر قسەکانی رۆیشتەوە:"بەگ، دەروێش بەگ... تۆ هیچ شتێك لەو دنیا نوێیە، لەو دنیا مۆدێرنە نازانی و بەداخەوە خۆشت نازانی کە نازانی."

ئەوەندەش چووە پێش، کە دەستی کرد بە نەڕاندن. لەحالێکدا چێژی وەردەگرت لەوەی بەسەر دەروێش بەگدا بنەڕێنێ و بێ رێزیی پێ بکا.

"نازانی. ئەنکەرە مانگێکە دەستی لە هەموو کاروبارێکی خۆی هەڵگرتووە و خەریکی کاری تۆیە و مانگێکی رەبەقە ە شارۆچکە و هەموو ئەم مەملەکەتەدا کۆڕ و کۆبوونەوە لەسەر تۆ دەگیردرێ و بوویەتە بنێشتە خۆشکەی سەر زار و زمانان و پەتی سێدارەکەت لەپەنا گوێچکەتە و ئەتۆش هەر خۆت دەخەڵەتێنی و دەڵێی، یوسفێك لە گۆڕێ نییە. یوسفێك لەگۆڕێ نییە. هەر بە راستی لەوانەیە خۆشت بڕوات کردبێ بە نەبوونی یوسف..."

وردەوردە چاوقایمتر دەبوو و پتر هەڵدەچوو. دەموچاوە سوورهوولەکەی سوورتر دەبۆوە و دەنگیشی پتر لێ هەڵدێنا. دەروێش بەگیش بەسەرسوورمانەوە سەیری دەکرد. باشە ئەوە بۆ وای لێ هاتبوو و بەچی وا دەرهەڵبوو؟ یانی ماهیریش دەیتوانی ئاوا دەنگ هەڵێنێ و بنەڕێنێ؟ سەیرە، سەیرە. وەڵا پیاو خەریکە وەکێوان بکەوێ. لە نێوەندی هۆڵەکەدا، دەستە بێ تینەکانی بەردابوونەوە. نەیدەزانی چ بڵێ و چ بکا. چاوەکانی وەك چاوی ئاژەڵێکی لە داوکەوتوو، داماوانە لە گلێنەیدا دەخولانەوە."

"یوسف نییە. یوسف هەر نییە و نەشبووە. بەهەرچی بڕوات هەیە. چما دەکرێ یوسف نەبێ؟ ئەتۆ دەتەوێ کێ کەر بکەی؟ یانی لەگەڵ خۆشمان؟ دەی باشە. هەرچی هەیە لەچاوی

خۆتی دەبینی. ئیتر گەیوەتە ئێسقانم. ئیتر بێزار بوومە لەو خۆپارێزییەت و لەوەی ئاوا خوایانە سەیری کەسانی دیکە دەکەی، بێزار... کوڕە جا لێی گەڕێ خودای دەکرد هەر ملی دەشکا، جا بەمن چی..."

کە قسەی گەیشتە ئێرە، وەڕێ کەوت و دوای ئەوەی چەند پلیکانێکیش چووە خوارێ، راوەستا و خێرا گەڕاوە. دەروێش کە هەنگاوێکی وەدوا کەوتبوو، لەگەڵ گەڕانەوەی ئەو، دەسبەجێ وەخۆی هاتەوە و راوەستا. بە تکاوە و بۆ چارەسەر سەیری دەکرد. ماهیر ئەو نیگایەی خوێندەوە و گوتی:" من دەڕۆم و ... و ئیتر..."

بەپەلە لە پلیکانەکان چووە خوارێ. رێك لەوەدەمەدا و بەشوێنیدا دەنگی نیوەنووزەی دەروێش بەگ هات:"ماهیر... ماهیربەگی ئازیز... برالە..."

ماهیر کە گوێی لەو دەنگە بوو، شاگەشکە بوو و وەك ئەوەی باڵی لێ روابێ، خێرا رۆیشت و کە گەیشتەوە لای ترۆمبێلەکەی، ئاوڕێکی لە کۆشکەکە داوە و لە حاڵێکدا ددانە سپییەکانی وەدەردەخست، بە گاڵتەپێکردنێکەوە گوتی:"یوسفێك لە گۆڕێ نییە. ساری ئۆغڵی دەروێش بەگی ژیری ژیران، منداڵ دەخەڵەتێنێ."

لەو دەمەدا کە دەنگی کزی "یوسفێك لەگۆڕێ نییە" لە بەربێڵای کۆشکەوە دەهات، لەبەردەرگا تووشی مزەفەر بوو. مزەفەر بە نێوچاوانێکی تاڵەوە و لەحاڵێکدا بەزۆری زەردەیەکی خستبووە سەر لێوی، لێی نزیك بووەوە بن پیلی گرت و گوتی:"خۆت سەخڵەت مەکە، خۆت تووڕە مەکە. بابم ماوەیەك خولّق و خووی تێك چووە. ئەو رووداوانەی ئەو ماوەیە تەواو مێشکیان تێك داوە."

قۆڵ لە نێو قۆڵدا دیسان لە پلیکانەکان چوونەوە سەرێ. دەروێش بەگ لە سەر پلیکانەکان بەپیرییەوە چوو و ئەوجار رۆیشت و لەسەر مۆبلەکە دانیشتەوە. ئەو بنیادەمە چوارشانەیە لە پڕێکدا تێك چرژاو و بچووك ببۆوە و وەك گلۆڵەیەکی لێ هاتبۆوە.

بە دەنگێکی پڕ لە جۆش و خرۆش گوتی:"بەگ، بەگ، بڕوانە، ئاقچاساز بەو زووانە وشك دەکرێ. ئێمەش دەستمان داوەتە دەستی یەك بۆ ئەوەی کۆمپانیای پیشەسازیی چوکووراوا دامەزرێنین. هەر لە ئێستاوە بنەمای پێنج کارخانە وێکڕا دادەنرێت. ئێمە لەو کاتەوە بیرمان لەوە کردووەتەوە، سی، چل ملیۆن تمەنمان قازانج لێ کردووە. بەڵام تۆ، زۆر داوای لێ بووردن بەگ، ئەتۆش بە منداڵۆچکەیەکەوە، بەو گەمەیەوە کە یوسف هەیە یان نییە، خۆت خافڵاندووە. ئێمە هەوڵ دەدین ملت لە پەتی سێدارە رزگار بکەین، بەڵام تۆ بێحورمەتیمان

پێ دەکەی. باشە بەگ، شتی وا دەبێ؟ میش بنیادەمم. چەندە خۆڕاگرم. تۆ بفەرموو مزەفەر بەگ. وانییە؟ هەقمە یان نا؟"

"هێندەی زەوی و ئاسمان ئاغای من..."

هەستا و لە بەگ چووە پێشێ و لە تەنیشتی دانیشت. بەگ لێ کەوتبوو. چاوی وەك چاوی مەڕێکی سەربڕدراو بەمۆڵەق وەستابوون. ملی بۆ هەموو شتێك راکێشابوو. دەستی لەسەر ئەژنۆی بەگ دانا.

"ئامۆژگارییەکی برایانەت دەکەم. ئەگەر بەقسەی من دەکەی، با بەبێ پێچ و پەنا پێت بڵێم، تا زووە ئەو یوسفە بدۆزەوە و سەری بەگۆمێدا بکە. ئەگەر پێت وایە بەهەر هۆیەك خۆت ئەوەت پێ ناکرێ و دەستت بۆی ناچێ، بە من و مزەفەری بسپێرە. ئێمە باش دەزانین چیی لێ بکەین. ئاوا بە یوسفێك لەگۆڕێ نییە و ئەو قسانە، هیچ دەردێك دەرمان ناکرێ. چونکە یوسف هەیە. بنیادەم نابێ وەك سوێسکە سەری لە بەفر بنێ و..."

بەگ وەك ئەوەی لە خەوێ راپەڕیبێ، سەری هەڵێنا و گوتی:"یوسف هەر نییە."

بەگ چاوی لە چاوی ماهیر بڕیبوو و خەریك بوو وەخۆ دەهاتەوە. روخساری ماهیربەگ نوقمی فرت و فێڵ و گزە و درۆ بوو. لەو ساتەدا چیی پێ دەکرا؟ ماهیر سۆسەی هەندی شتی کردبوو. هەستا:"لە شارۆچکە کارم هەیە. دەبێ بڕۆم. بەدرەنگی کەوتم." بە هەشتاو لە پلیکانەکان چووە خوارێ. دەرویش بەگ کە گوێی لە دەنگی ترۆمبێلەکە بوو، وەخۆ هاتەوە و رای کردە بەربێڵایە. ترۆمبێلەکە دوور کەوتبۆوە و هەورێکی تۆز و خۆڵی لە پاش خۆی بەجێ هێشتبوو.

لەولاترەوە، بەسەر دەریای سپیی ناوەڕاستەوە، هەورە سپییەکان گەواڵ گەواڵ هەڵدەستان. بای شەماڵ چەند جارێك نەرم نەرم هەڵیکرد و دامرکایەوە و ئیتر لەنەکاو هەڵیکرد.

گەردەلوول لە دەشتەکەدا کۆڵەکەیان دەکرد و بەملاولادا دەسووڕانەوە و دەڕۆیشتن.

## ١٢٥

وەرزێر بەوپەڕی پارێز و کونجکۆڵییەوە دەهاتنە سەر ئەو کەناڵەی خەریك بوو تەواو دەبوون و سەیری ئەو مەکینە و شۆفلڵ و ئامرازانەیان دەکرد، کە ملیان درێژ کردبۆوە و ئەو گلە زۆرەی هەڵیانکەندبوو، لەسەر لێواری کەناڵەکە رۆیان دەکردەوە. چاوێکیان کردبووە چوار چاو و بە سرت و خرتەوە قسەیان دەکرد. ئەو کەناڵە زۆری نەدەبرد کە زۆنگاوەکەی هەڵدەچۆڕاند و جێی لیتە و ئاوەکە دەبووە زەوییەکی قەڵش قەڵشت و توێژتوێژ و پان و بەرین. بە ئەزموون تێگەیشتبوون کە ئەو خاکە، رۆحی بنیادەمیشی لێ بچێنی، شینی دەکاتەوە. شارۆچکە ئەو خاکەی لەتوپەت و پارچەپارچە دەکرد و لەپێش چاویان مەکینە و شۆفلە نارنجییەکان دیسان دەکەوتنەوە کار. نە خاکەکەیان لەبیر مابوو و نە ئەو زەوی و زارەش کە لێی دەکەوتەوە و تەواو سەریان بە کاروباری مەکینەکانەوە خافڵابوو. شەوانەش خەونیان بەو ئامرازە زەبەلاخانەوە دەدی. هەندێکیان کەڕەی بەیانی لەخەوێ هەڵدەستان و بەسەرسووڕماویەوە چەند سەعات سەیری ئەو مەکینە و ئامرازانەیان دەکرد، کە هەروا خەریکی هەڵکەندن بوون و دەچوونە پێش. مەکینەکان بوونە بەشێك لە دەشتەکە و زۆنگاوەکە و لەخۆیان. جار نە جارێکیش خەڵکێکی شارۆچکە بە ترۆمبێلە جوانەکەیەوە دەهاتە لای مەکینەکان و لە حاڵێکدا دەست و باڵی رادەوەشاند و پێدەکەنی، لەگەڵ شۆفێرەکان قسەی دەکرد. دواییش سواری ترۆمبێلەکەی دەبۆوە و دەڕۆیشت.

بەر لەوەی ئەو مەکینە و شۆفڵ و ئامرازانە بێن، هەمووانیان خڕ کردبوونەوە و برسی و تینوو و سەرلێشێواو لە دۆڵێکیان پەستاوتبوون... لەوانەشە لەگەڵ تەواوبوونی کەناڵەکە... لەوانەشە هەر لەگەڵ وشکبوونەوەی زۆنگاوەکە... باشە ئەو زۆنگاوە ئەگەر وشك بێ، چیی لێ دێتە دەرێ؟

ئەی ماسی و باڵندە و مێشەنگوینەکان چییان لێ دێ؟ ئەی جڕ و جانەوەرەکەی دیکە، حەزیاکانی زۆنگاوەکە هەموو رۆژێ بەرەبەری بەیانی لەگەڵ هەورێکی چڕدا بەسەر قامیشەڵانەکەدا دەبارین...

دوای ماوەیەك، وەرزێرەکان، ترسەکەیان و مەکینە و شۆفلە زەبەلاحەکان و ئەو قامیشەڵانەی وشك دەبۆوە و حەزیا و ئەو خاکەی وەك گۆشتی قوربانی لەتوپەتیان دەکرد، لەبیر چۆوە و سەریان بەکاروباری خۆیانەوە خافلا.

حەمەعەلی بەگ سێ جار هاتە دەم زۆنگاوەکە و چەند دەقەیەك لای سەیارە و شۆفڵ و مەکینەکان مایەوە و لەگەڵ پیاوەکان قسەی کرد و دوایی رۆیشت. کەسیش نەیزانی بۆچی هات و چیی گوت و چیی بیست.

ئیمامە کوردە دیسان قۆڵی هەڵماڵیبوو و شان و باهۆ ئەستوور و درێژ و خاڵکوتراوە مووزەردەکەی رووت کردبوو... لەسەر دوو تاتەبەردی رۆمی کەلوپەلەکانی خۆی دانابوو و هەرای دەکرد، ئای وەرە ساردیی میوەیی. ئەو بەردە رەشانە کە نەخش و نیگاری چەند سەلکە مەڕ و چەند هێشووە ترێیەکیان پێوە بوو، کێ لێرەی دانابوون؟ ئەوانە لەکوێوە هاتبوون؟ لەوانەشە بەر لەوەی بەردی بناغەی ئەو شارۆچکەیە دامەزرێ، لە تەنیشت یەکەوە و لە بن گڵ دا شاردرابێنەوە. ئیمامە کوردە چل ساڵ لەوەپێش بەبێ ئەوەی کەس بزانێ لەکوێوە هاتووە، ئەو بەردانەی هەر لێرە دۆزیبۆوە و تەختەکۆنەکەی خۆی، کە بەلای پانیدا دەکرایەوە، لەسەریان دانابوو و دەستی کردبوو بە فرۆشتنی ساردی. لەوێ رۆژێ بەدواوە ئەو بەردانە ببوونە بەردی ئەو. سەرۆکی مۆزەخانە یەك دوو جاران ویستبووی ئەو بەردانە بەرێتە مۆزەخانە، بەڵام ئیمامە کوردە کردبوویە قەرەچی ئۆین و هەڵڵایەك، ئیتر سەرۆك ناچار وازی لێ هێنابوو.

ئیمامە کوردە دەیگوت:"بە تەواوی ئەو شارە و حوکمەتێکەوە، وەشوێن منداڵۆچکەیەك کەوتوون." هەر کەس بە بەردەمیدا تێدەپەڕی، هەرکەس داوای لیمۆناد و ساردیی لێ دەکرد، چاوە زەردە درشتەکانی زەق دەکردەوە و هاواری دەکرد:"یوسف نەبووە و نییە. یوسفێك لەگۆڕێ نییە. لەخۆیانەوە هەڵیان بەستووە.. لە بێکارییە..."

ئاغا و بەگ و پیاوەکانی دەوڵەت کە بە لایدا تێدەپەڕین، نقورچکێکی لێ دەگرتن و تەشەرێکی لێ دەدان.

سەر و سەکتی نانەوا، لە حاڵێکدا وەك کوێران بە پێ کوتە دەهات، پەیدا بوو. نێوچاوانی نانکەر پڕ بوو لە گنج و چاوە قیچەکانی بە ئاستەم هەڵدێنا و سەری وا رادەگرت دەتگوت

بۆن دەکا. لە بەردەم ئیمامەکوردەوە رادەوەستا و لەحالێکدا لەسەر هەر قسەیەکی هەڵوەستەیەکی دەکرد، بەدەنگێکی پڕ زایەڵەوە دەیپرسی:"ئەگەر یوسفێك لەگۆڕێ نییە، ئەی کێ حاجیی کوشتووە؟ تۆ؟"

ئیمامەکوردەش لەحاڵێکدا وەخت بوو لە داخانی بدڕێ و دەماری ملی هەڵدەستا، دەینەڕاند:

"من کوشتم، حاجییە شێتە من کوشتم."

ئیتر پیاڵە مسییەکانی شەربەت خواردنەوەی لێك دەدا و لەسەری دەڕۆیشت:"بەڵێ، من ئەو سەگی بنی سەگەم کوشت. جا چۆنیشم کوشت. قسەت ما؟ هەر لە خۆیانەوە یوسفێکیان دروست کردووە و کەوتوونەتە شوێنی. کوڕە دەردی ئێوە دۆزینەوەی یوسف نییە، ئێوە هەر لەبیانوون لە گوندی هەڵدەن... دەی بڵێ دەی، بڵێ سەی کوێر... عەلییە ریشە چ تاوانێکی هەیە؟ ئەو یوسفی لەکوێ دیتووە، لەکوێی شاردووەتەوە، بۆ کوێی دەرباز کردووە؟ دەی بڵێ دەی، بڵێ دەی سەگە کوێرە. ریشەیان بۆ لەزیندانێ کرد؟ هەر لەبەر ئەوەی چاویان پێی هەڵنەدەهات، وانییە؟ لە لایەکەوە لە گوندی هەڵدەدەن و لە لایەکی دیکەشەوە دەڵێن هەر کەس بیدۆزێتەوە کووپەیەك زێڕی دەدەینێ. گوندی لەکوێ کابرایەك بدۆزنەوە، کە هەر لە بنێ ڕا نەبووە؟ یوسفێك لەگۆڕێ نییە."

نانکەریش دەیگوت:"هەیە."

دوای ئەوەی ئەوی لەبازاڕێ بوو، هاتە نێو کێشەکەیانەوە. بوو بە مشتومڕ و مقۆمقۆ و هەرا و هاوار و تێکەولێکەیەك دەنگیان دەگەیشتە ئاسمان و هەتا شەوێ و تا ئەو دەمەی دەڕابەکان دادرانەوە، هەر درێژەی دەبوو. ئیمامە کوردە سوور سوور هەڵگەڕابوو و ئارەقەی شین و رەشی دەرکردبوو و وەك سەربازێکی سەرکەوتوو، ماندوو و شەکەت و لەحاڵێکدا جنێوی بەهەموو خەڵکی شار و بە ناهەقی و بێدینەکان دەدا، کەلوپەلەکانی کۆ دەکردەوە و دەیبردە دووکانە نیوەچۆڵەکەی برایم. جا دوای لەوە لە سەر تاتە بەردەکان دادەنیشت و ئەو دراوەی پەیدای کردبوو، دەیکردە نێو کۆشی و دەیژمارد و لەگیرفانی دەنا. پارەی دەژمار و بەدەم ژماردنیشەوە، هەر کەس بەلایدا تێپەڕیبایە، سەرێکی هەڵدێنا و پێی دەگوت:"کەسێك بە ناوی یوسف لەگۆڕێ نییە. هەر بۆ ئەوەی چاوی حوکمەت بنووسێنن و لەگوندی هەڵدەن و خەڵك سەرقاڵ بکەن و خۆشیان رابوێرن، یوسفێکی خەیاڵییان دروست کردووە.

ناکەریش کە هەر لە نزیك ئەوێوە خۆی لێ مات دابوو، هەڵی دەدایە:"هەیە. بەکوێرایی چاوت هەیە. جا بەم زووانەش دەیگرن. کە گرتیشیان، گوێی دەگرم و دەیهێنمە بەردەمت و دەڵێم ئەوە یوسفە. جا ئەودەم دەبێ بنی پێیانم ماچ بکەی. گێلە، پیری خەلەفاو..."

جا ئیمامەکوردەش بێدەنگەی لێ دەکرد و پارەکەی دەژمارد. کە گلۆپی بازاڕ پێ دەبوون، یەك پێ هەڵدەستا و بەرەو ماڵەکەی دەکەوتە رێ و پیرەژنە وردیلە و بێ زمانەکەی دەدی، کە لەچکێکی سپیی لەسەر دەکرد، لەبەر دەرگا چاوەڕوانیەتی. ئەو هیچ باسی یوسف و ئەو شتانەی بۆ ژنەکەی نەدەکرد کە لە بازاڕێ روویان دەدا. دەست و دەموچاوی دەشوشت و جلوبەرگە تازەشۆردراوەکانی لەبەر دەکرد و لەسەر ئەو سفرەی ئارەقەی ژنەکەی بۆی رازاندبۆوە و لەوانەبوو لە بەیانییەوە خەریکی بووبێت، دادەنیشت و بە پیاڵەیەکی زبر و کاڵەوەبوو، کە چل ساڵ لەوەپێش لە وڵاتی خۆیانەوە هێنابووی، پێك پێك دەیخواردەوە و لەحاڵێکدا مەزەی بەدوودا دەکرد، دەچۆوە سەر باسی مەڵبەندەکەی خۆیان و باسی ئەسپ و هەڵۆ و هۆبە و هەوار و عەشیرەت و گەنجێتی و سەربازییەکەی دەکرد. چل ساڵی رەبەق بوو، ئاوا باسی رابردووی و سەربردەی خۆی دەکرد و ژنەکەی وەك چۆن یەکەم رۆژ بە تامەزرۆییەوە گوێی دابوویێ، دیسان هەروا زاری دادەپچڕی و وەك لەبەردەم هەقایەتخوانێکی بەگفت و لفت و گۆرانیبێژ دانیشتبێ، ئاوا گوێی دەدایە قسەکانی. لە ماوەی چل ساڵاندا قەت رۆژێك لە رۆژان وا رێك نەکەوتبوو، رووداوێك دووجار بۆ ژنەکەی بگێڕێتەوە. لەوانەیە رووداوێکی سەد جاریش گێڕابێتەوە، بەڵام هەر جارەی بەجۆرێکی دیکەی گێڕابۆوە. ژنەکەی بەگیان و دڵ گوێی دەدایە ئەو قسانەی دەیکردن جا باسی هەر شتێك بوایەن. کە ئیمامە کوردە لەسەر سفرەی ئارەق دادەنیشت و دەستی بەقسە دەکرد، کەس بۆی نەبوو بێتە لای. ئەوە بە ئەزموون روون ببۆوە کە هەرکەسێك، جا لەهەر پلە و پایەیەك تەنانەت بایشی لە قەبران زیندوو بووبایەتەوە، ئیمامە کوردە بەلایەکی بەسەر دەهێنا، عەرەب بەسەر گامێشی نەهێنابێ. ئەو رۆژانەش کە دڵی توند دەبوو، بەدەنگێکی بەرز کۆنەگۆرانییەکی دووروودرێژی دەگوتەوە، کە هەرکەس گوێی لێ دەبوو، وایدەزانی ئەوە لە دەشت و چیا ئەو گۆرانییە دەچڕێ. ژنەکەی هەمیشە خوداخودای بوو جارێك گۆرانییەك بڵێ، بەڵام دەرفەتی ئاوا بەدەگمەن هەڵدەکەوت.

یوسف چەند جاران کە شەربەتی لێ دەکڕی، ئەو مقۆمقۆ و مشتومڕانەی بەچاوی خۆی دیتبوو. لە پێشدا هەر نەیزانیبوو چ باسە و مەسەلە چییە. بەڵام هەندێ شتی لە گوێ و

مێشکیدا مابۆوە. جارێکیان دڕی بە حەشیمەتەکە دا و چووە پێشێ و داوای شەربەتی کرد. ئیمام بەدەم پڕکردنی پەرداخەکەوە، هەرای کرد:"یوسف هەر نییە و نەشبووە." یوسف راچڵەکی و نەشیتوانی لەوێ بڕوا. هەر تاو نا تاوێك دڕی لە ئاپۆرای خەڵکەکە دەدا و داوای شەربەتی دەکردەوە و یەك بین بە سەرییەوە دەنا و لە گۆشەیەکەوە رادەوەستا و گوێی هەڵدەخست. ئاخرییەکەی تێگەیشت کە باسەکە، باسی ئەوە. لەمەوپاش هەرجارێکی ئاپۆرایەکی دەدی، ترس و لەرز و هەستێکی نامۆ دایدەگرت و بەرەو ئاپۆراکە راکێش دەبوو و لەوێ وای گوێ لە قسەوباسەکان هەڵدەخست، تەنانەت شەربەتخواردنەوەشی لەبیر دەچۆوە. کاتێ نانکەر دەیگوت:"دەیگرن و لە سێدارەی دەدەن و دەروێشیش بە پەتەوە دەکەن، هەموو ئەندامی لەشی دەلەرزی. لە ناخیدا ئەوەندە لە نانکەر و ئیمامەکوردە تووڕە بوو، حەزی لێ بوو هەردووکیان بکوژێ، بەڵام تۆزێك دواتر بە بیستنی قسەیەك، خۆشی دەویستنەوە. گوێ هەڵخستن لەو مقۆمقۆیانە، ببووە خووی هەموو رۆژەی و بەردەوام لە دەوروبەری شەربەتفرۆشییەکە دەهات و دەچوو.

خەڵکی شارۆچکە لەمێژ بوو هەر باسی یوسف و حەمە عەلی و وەزعی مستەفا بەگ و ئەوەی بەسەری هاتبوو و پەیوەندیی نێوان مزەفەر و حەمەعەلی‌یان دەکرد. هەموو دەستیان لە کاروباری خۆیان بەردابوو و لەو رووداوە سەیر و سەمەرە و دەگمەنانەدا نوقم ببوون کە لەوانەبوو دووبارە نەبنەوە. جارێ باسی ئەو ماشێن و شۆفلێ و ئامرازانەیان دەکرد کە هێنابوویانە ئاقچاساز و جارێ باسی برادەرەکەی ماهیربەگیان دەکرد لە ئەنکەرە. بەڵام هەموو ئەوشتانە لایەك و قسەوباس و مشتومڕ لەسەر هەبوون و نەبوونی یوسف و پەیوەندییەکانی مزەفەر و حەمەعەلی لەلایەکی دیکە...

وایان دانابوو لە هۆڵی هوتێلە تازەکەدا کۆ ببنەوە. هۆڵەکە حەمەعەلی پێشتر گرتبوویەوە. حەمە عەلی لەگەڵ زەکی بەگ جار نە جارێ سەرێکی لە هوتێلەکە دەدا و سەراسوێییەکی رازاندنەوەی مێزەکانی دەکرد. لە نێوەڕاستی مێزەکە گوڵدانێکی پڕ لە گوڵ دانرابوو. ئەو گوڵدانە لەسەر پێشنیار و پێداگریی حەمەعەلی دانرابوو. چونکە زۆری حەز لە گوڵ بوو.

شەریك و هاوبەشەکان، سەروبەندی سەعاتی چوار یەك یەك و دوو دوو هاتن. خەلیل ئاق سۆوی ئۆغڵی و لەگەڵ وەسمان ئۆزباش، حەمەعەلی لەگەڵ مامۆستا رۆستەم بەگ، مزەفەریش لەگەڵ ئالاتەمیر هات. حەمەعەلی و مزەفەر یەکەم جاریان بوو یەکتریان دەدی. هەمووان حەپەسابوون و لەسەر هەست بوون بزانن ئەو دوان چۆن یەکتر هەڵسوکەوت دەکەن.

کە ئەوان هاتنە ژوورەوە، حەمە عەلی وەك زیارەتی دۆستێكی زۆر لەمێژینەی خۆی بۆ هەڵكەوتبێ، رووگەش و بەپێكەنینەوە بە پیرە مزەفەرەوە چوو. تۆزێك هەژاوی و شەرم و بڵێی و نەڵێی شڵەژاوییشی پێوە دیار بوو، چووە پێشێ و باوشی بە تەمیر ئاغادا كرد. تەمیر ئاغاش ئاوا هاورێیەكەی خۆی ناساند:"یەكتر بناسن، مزەفەر بەگ، مزەفەر بەگی ساری ئۆغڵی."

ئەوانیش بە روویەكی گەشەوە و لە حاڵێكدا لە سەرتاپای یەكتری ورد دەبوونەوە، زۆر دۆستانە دەستی یەكتریان گوشی. ئەوانی دیكەش لە جێی خۆیان هەستابوون و ورد ورد لەو دیمەنی پێشوازی و یەكترناسینەیان دەڕوانی. ئالاتەمیر سەری بردە بن گوێی حەمە عەلی و بەسرتەیەك گوتی:"باوەشی پێدا بكە."

حەمەعەلی تاوێك دڕدۆنگ بوو. نێوچاوانی تێك نا، رەنگێكی هێنا و برد و سوور هەڵگەڕا و ئاخرییەكەی دەستی مزەفەری بەردا و لە ئامێزی گرت. مزەفەریش ئامێزی لێ دا. ئەوجار قۆڵیان لە قۆڵی یەكتر كرد و لەسەر مێزەكە و لە تەنیشت یەكترەوە دانیشتن. وەك نە بایان بەسەردا هاتبێ و نەبۆران و هیچ لەنێوانیاندا نەبووبێ، كەوتنە دانوستان و قسەكردن لەسەر كاروبارەكان. لە پێشدا زەكی بەگ هاتە قسە و باسی پێشەكی و دەسپێكی كارو هەلومەرج و چەند و چۆنیی وام و قەرزەكانی دەوڵەتی كرد. حەمە عەلی كە رۆژێك پێشتر لە ئەنكەرە گەڕابۆوە، بە تێر و تەسەلی باسی سەفەرەكەی خۆی و دانوستانەكەی خۆی كرد. كە حەمە عەلی لە قسە بۆوە، تەمیر ئاغا لە دەمی وەرگرتەوە. قسە و وتووێژەكان دەوروبەری سەعات حەوت تەواو بوو. ئەو بەڵگەی پێویست بوو، ئیمزا كران. بەرپرسی نووسینگە چاوەڕێ بوو. شایەتیی دا. مەكینەی تایپكردن كەوتنە چرتەچرت و خرەخڕ. نووسینگە دیسانیش شایەتیی دایەوە... بە بۆنەی ئەو رۆژە پیرزەوە جێژنێك لە یانەی شاردا رێك خرابوو. دوای تەواوبوونی كارەكە، هەموان بە پێكەنین و دڵێكی خۆشەوە چوونە ئەوێ. حەمەعەلی و تەمیر ئاغا مەشرووبیان نەخواردەوە.

نیوەی شەوێ، جێژنەكە كۆتایی هات. حەمەعەلی و مزەفەر لەو ماوەیەدا لەتەنیشت یەكترەوە دانیشتبوون و یەك پشوو قسەیان دەكرد. قۆڵ لەنێو قۆڵدا لە یانەی شاری هاتنە دەرێ. كاتی ماڵاوایی، حەمەعەلی گوتی:"تكایەكم لێت هەیە مەزفەر گیان. حەزم لێیە شەوێ بچینەوە ماڵی ئێمە. واز لەوانە بێنە، من و تۆ براین، ئێمە دەمێكە یەكتر دەناسین."

مزەفەریش وەڵامی داوە:"تكایە، جا نەیەمە ماڵی تۆ، بچمە كوێ..."

باسی دۆستایەتی مزەفەر و حەمەعەلی هەر لەو ڕۆژەوە ئەوەندەی دیکەی پێوە نرا و کەوتە سەر زار و زمانان.

ماهیر قاباقچی ئۆغلّی دەیگوت:"ئێمە، دوای ئەوەی ئاوا بووینە پشتیوانی یەکتر، ئیتر پشتمان وەعەرزی ناکەوێ. ئەم سەردەمە، سەردەمێکە، دوژمنی هەزار سالّە و قەستەسەر وەك مێو و ڕۆن نەرم دەکا. سەردەمی شارستانییەت، شارستانییەتی دێنێ."

هەرچەندە نەیدەتوانی بەسەر ئەو ڕق و قینەیدا زالّ بێ کە لەدەروێش بەگی هەبوو، هەر لەسەر ئەوەی سووکایەتیی پێ کردبوو و شکاندبوویەوە، بەوحالّەشەوە بەزەیی پێی دا دەهاتەوە. خۆ مستەفا بەگ ئاق یوللی وەزعی زۆر لەویش شڕتر بوو. کافر بەزەیی پێیدا دەهات. جا هەر بە لاساری و پێداگریشەوە دەیگوت و دەیگوتەوە، کە مەحالّە ئەو کاولاشە کۆشکە بەجێ بێلّم. هەر لێرە دەمرم. ماهیر بەگ لەگەلّ ئەوەدا پیاوێکی جوامێر و زیرەکیش بوو، بەلّام نە سەرەدەری ئەو جۆرە کەسانە دەردەکرد و نە لە قین و ڕقەکەی خۆی بەرامبەر دەروێش بەگ. چما دەروێش بەگ کێیە؟ چما بوون و نەبوونی بەلای ماهیرەوە وەك یەك نەبوو؟ ئەو ئیتر وەك نەبێ وابوو. مردوویەکی بەروالّەت زیندوو... وانییە؟

گەرما هەلّی کردبوو. تەنانەت بالّندەش لە فڕینێ کەوتبوون. دەولّەمەندەکان، یان ئەوانەی کاریان کەم بوو، چووبوونە کوێستانی تۆرووس. ماهیر بەگ ژن و مندالّەکەی ناردبووە کوێستان، بەلّام خۆش کار و باری زۆر بوو. لایەکی کارەکەی دەروێش بەگ و کارخانە و مەسەلەی یوسف و نەقیب کە لەبەر ئەوەی نەیتوانیبوو یوسف بگرێ، حەجمینی لێ بڕابوو. لایەکی دیکەش کەنالّەکە خەریك بوو تەواو دەبوو و مشتومڕ و مقۆمقۆ لەسەر دابەشینی ئاقچاساز. خەلّکێکی ئێجگار زۆر، کە هەر هەمووشیان لە هەولّی ئەوەدابوون لایەکی ئاقچاساز بڕ بدەن، پیاوی حوکمەت و ئاغا و گوندی و ئەو دێهاتییانەی بەو هەمووە تێهەلّدرانە هێشتا چاویان نەترسابوو و لەملاولاوە دەخزینە نێو قامیشەلّانەکەوە و هەموانیش لەوە ئاگادار بوون و تەنانەت لە ئەنکەرەشەوە خەلّکێك دەهاتن و داوای پارچە زەوییەکی ئاقچاسازیان دەکرد بۆ ئەوەی بیکەنە باغ... لە لایەکی دیکەشەوە کاروباری مەرەزەجاڕ و لۆکە و مەزراکەی خۆی و... لەسەر یەك زۆریان سەرقالّ کردبوو. تێکە و لێکەیەك بوو باب ئاگای لە کوڕی نەمابوو. شارۆچکە کپ و مات ببوو. دیسان باس باسی دەروێش بەگ و مستەفا ئاق یۆللی و یوسف و پەیوەندیی مزەفەر و حەمەعەلی بوو، بەلّام کەفوکولّەکەی جاران دامرکابۆوە. هەتا ئەوەی سەباحەت خاتوونی خوشکی دەروێش بەگ هاتە شارۆچکە.

سەعاتێك دەبوو ڕۆژ ببۆوە، سەباحەت خان بە تەنوورەیەکی کورت لەپێ و لووزێکی شین لەبەر و بە گۆرەوی تەنك لەپێدا و قژە درێژەکەی بەسەر شانیدا پەخش و پەرێشان کردبوو و بەو چاوە درشت و مەست و پڕ نازانەیەوە، بەنێوەڕاستی بازاڕێدا تێپەڕی. لە پێشدا خەڵکی بازاڕ نەیانناسی، بەڵام لە پڕ یەکێك ناسییەوە و گوتی ئەوە سەباحەت خانە. ئەوەندەی چاوترووکانێك هەواڵەکە لە شاڕ گەڕا و جموجۆڵێکی خستە شارەوە. سەباحەت خان دلڕفێن و شۆخ و شەنگ، قیت قیت دەڕۆیشت، بەبێ ئەوەی سەیری کەسێك یان شوێنێك بکا، سێ جاران ئەمسەر و سەوسەری بازاڕی کرد. دوایی بەرەو سەر، بەرەو لای باخچە تێکدراوەکە چوو. بریسکەی بازنە زێڕەکانی سۆمای چاویان دەبرد.

دار هەنار گوڵیان کردبوو و گوڵە گەشەکان لە بن تۆز و خۆڵەکەشدا هەر وەك بڵێسەی سوور دەدرەوشانەوە... کاولاشی بەجێماوی هەرمەنییەکان کەوتبووە بن پەردەی جوانی گوڵە هەنارەکانەوە. شارۆچکەی تۆزلێنشیتوو لە گەرماکەدا تاك وتەنیا مابۆوە. وزەوزی مێشەنگوینە هەژاوەکان لەنێو داری هەناراندا هەر دەهات و زیاتر دەبوو. ماری ڕەش، وا هەژابوون و ئۆقرەیان لێ بڕابوو، سوور دەچوونەوە و لە گۆشە و قوژبنی کاولاشەکەدا تێك ئالأبوون و عەشقبازییان دەکرد. کەس لێی تێك نەدەدان. بەهاری مەند و بێجووڵە لەو شارۆچکەداهێزراوەدا، بۆ هەندێ جرِوجانەوەر و بنیادەم، وەرزی جووتبوونێ پڕ لەکەفوکوڵ بوو.

سەباحەت خاتوون سێ ڕۆژان لە نێو پنگە بۆنخۆشەکانی باخچە تێکدراوەکەدا، لە نێوان دار هەنارە پڕگوڵەکان و لە بن دارهەنجیرێکی بۆنخۆشدا جێی خۆی خۆش کرد. گەنجی بێبەش و چاوبرسی لەوانەیە بۆ یەکەم جار... هیچ هەڵلا و فیتنەیەکی لێ نەدەکەوتەوە. ئەو وای ڕاهاتبوو، لاوەکان وەك کۆیلەیەکی دەستەمو وەدووی خۆی بدا و هەرکەس هاتبایەتە لای، شێت و شەیدای خۆی دەکرد.

سەباحەت خان، لە باخچە تێکدراوەکەوە چووە نێو گوڵە پێنج پەڕەکان. لەوێیش گەنجی لادێیی... دوای ئەوێ ڕووی کردە گردەکە و ئیتر پاش ئەوەی شەوێکیش لە دەم کانییە پڕ پنگەکە ڕۆژی کردەوە، ون بوو. گەنجی دەم شیرینبوو، باخچە تێکدراوەکە و دارستانی سنۆبەر و دەم رووبار و نێو پێنج پەڕەکان و هەموو وڵاتی لێ گەڕان و سەنگ و سوژنیان دا، بەڵام نەیاندۆزییەوە. کە ڕۆیشت، ئیتر بوو بە بنێشتەخۆشکەی سەر زاران. وەك بڵێی هەرگیز جوانێکی ئاوا دلڕفێن ڕێی نەکەوتبێتە ئەم شارۆچکەیە.

ئیمامەکوردە لەپڕ دەهری بوو. لەدەم کەلوپەلی شەربەتفرۆشییەکەی  کردبوویە هات و هەوار و قەرەچی ئۆین. نانکەرەکە و خەڵکی دیکەش کە نەیاندەزانی بۆ وا گڕی گرتووە، نەیاندەوێرا لێی بچنە پێشێ. ئیمامە کوردە وا ئاگری گرتبوو، هیچ کەس نەیدەوێرا لێی نزیك بێتەوە و شەربەتێکی لێ بکڕێ.

"دۆزیتانەوە.... بێ ئابڕووی بێ شەرمینە، قەحپەیینە، هەر بۆ ئەوەی داخی دڵتان بە ریشە هەڵڕێژن چوون یوسفێکتان دروست کرد. دەی پێم بڵێن بزانم ریشە چ خراپەیەکی بۆ ئێوە بووە؟ دەچمە ئەنکەرە، دەچمە لای شەخسی سەرۆك وەزیر. وەك بڵێی ئێمە لە ئەنکەرە کەسمان نەبێ. هەموو شتێکی پێ دەڵێم. هەموو شتێك. پەتەی هەمووتان دەخەمە سەر ئاوێ. پێی دەڵێم، سەرۆکی گەورەتان چۆن کوشت، پیاوێکی وا دادپەروەر، کە هەقی بە هەقدار دەدا... جا سەرۆکوەزیریش ئەگەر پیاو بێ، ئەو شارۆچکەیە تۆپباران دەکا. دیسان وەك سەردەمی یاخییەکان "نەزمی بەگ"ـتان لەسەر دەکا. ئەویش چیی ئاغایە لێرەیان دەردەکا، جا ئەمجارەیان ناشیانتێرێتە دیاربەکر، بەڵکو راویان دەنێ بۆ فیزان. گوێتان لێ بوو؟ هەی نەگبەتینە. با ئەو نەقیبەش گوێی لێ بێ و هەموو ئەوانەش کە دەستیان لەگەڵی لەقاپێکدایە.... یوسف تەنانەت ئەگەر هەشبێ، ئیتر نەماوە. ئێمە لێرە سەری خۆمان بەرداوەتەوە و کارمان بەکاری کەسەوە نییە، سەگی سەگبابانە، پێیان وایە ئێمە پنگەین، یان نەخێر دەهۆڵی دۆمین. بەڵام خراپتان خەو لێ کەوتووە. مەگەر ئەوانەی لە شەڕگەی ئافیۆن و گالی چای و چاناق قەڵادا شان بە شانیان لەسەنگەردا بووین و شەڕمان کردووە، ئێستا لە دەسەڵاتدا نین؟"

باسکە رووت و خاڵکوتکراوەکانی رادەوەشاند و وەك شێرێکی لە قەفەز کرابێ، بە دەوری چنارەکەدا دەخولاوە. هەموو گیانی شەلاڵی ئارەقە بوو و دەماری ملی وەك کاریتەیان لێ هاتبوو.

هەر جار نە جارێك، پانتۆڵەکەی دادەکێشا و شوێنی برینەکەی سەر رانیی نیشان دەدا و دەیگوت:"ئەو برینەم دەبینن، خۆ لەسەر گانی دایکتان بریندار نەکراوم، لە شەڕێدا و لە بەرەنگاریی دوژمندا بریندار بووم."

ئیمامە کوردە زۆر خراپ هەڵچوبوو. ئەوانەی لەو کات و ساتانەدا پێیان وابوو خۆیان لادەن، باشترە، دەمیان هەڵدووریبوو و متەقیان لێوە نەدەهات. ئیمامە کوردە کەفی هەڵدەخراند و یەك پشوو دەینەڕاند:"حوکمەت ئاقچاساز وشك دەکات، بەڵام ئێوەی هیچ و

پووچی چاوبرسیی تێرنەخۆرە بستۆکەیەکی ئەو خاکە نادەنە هەژاران. هەر لە ئێستاوە وەك گۆشتی قوربانی لە نێوان خۆتاندا دابەشتان کردووە. وا نییە؟ ئەگەر سەرۆکی مەزن ئێستا زیندوو بوایە، دەتانتوانی ئاوا بکەن؟ گەوادینە، بۆ حەپەلووشکردنی ماڵی دنیا دوژمنی هەزاران ساڵە ئاشت دەکەنەوە و پێیان وایە خەڵك نازانێ چییان لەبن سەری دایە. هەر لە خۆوە منداڵێکیان دروست کردووە و بەو بیانوەوە چی خراپە بەسەر گوندییەکانی دێنن، بۆ ئەوەی لەکاتی حەپەلووشکردنی ئاقچاسازدا کەس نووزەی لێوە نەیە. ئاخر کافرینە، بێ ئابڕووینە، سەر هەڵێنن و خودا ببینن، چ خودا بەردارە؟"

دەنگی نزم دەکردەوە و دیسان هەڵی دێناوە...

ئەگەر جڵەویان بۆ ئیمامە کوردە شل کردبایە، رۆژ بە رۆژ پتر شووی لێ هەڵدەکێشا و دەبوو بە کێشەیەکی قووڵ.

سەرلەبەیانیی رۆژێك، ئەو دەمەی دیسان ئەو چاوی قووچاندبوو و زاری داپچڕیبوو، ماهیر بەگ گەیشتێ و گوتی:"بیبڕەوە، بیبڕەوە ئیمام. ئاواش نییە کە تۆ دەیڵێی. وەرە لەگەڵ من."

ئیمام وەك کۆیلە بەدوویدا رۆیشت. ماهیر کە دیتی کەسی بەدەورەوە نییە، بۆی گەڕاوە و گوتی:"ئەتۆ دەزانی خەریکی چ گووکارییەکی؟ کوڕە ئەوانە زمانی بنیادەم لە پشتەسەرییەوە دەردەکێشن ها. چما لە گیانی خۆت بێزاری؟ کێ سەرۆکی مەزنی کوشتووە؟ یانی لە کاتی گرتنی "دوڵدوڵیجە"دا لە پەیژەوە بەرنەبووەوە و عومری درێژی بۆتۆ بەجێ نەهێشت؟ یوسفیش نەمردووە و زیندووە. هەمووان ئەوە دەزانن. سەیرکە ئیمام، ئەوە پێت دەڵێم، نەقیب زۆرت لێ پڕە. دەیویست بێ و بتخاتە تەویلەوە، من نەمهێشت... ئەگەر دەتەوێ بە مردنی خۆت بمری، خۆت لەو شتانە هەڵمەقورتێنە. شتەکەش وا نییە کە تۆ دەیڵێی. هەر ئەوەندەت پێ دەڵێم ئەو ماستە بێ موو نییە. ئەگەر ژیر و ئاقڵ بی، بەوەندەم لێ تێ دەگەی. هەر ئەوەندە و هیچی دی. ئەسپی رەسەن قەمچییەکی بەسە. ئەوە من پێم گوتی."

خودا بتانحەسێنێتەوە، ئیتر لەمەودوا ئیمامە کوردە بێدەنگ بوو و چەند رۆژان زاری لێك نا. شارۆچکە دەتگوت مردووە. ئیمام لەو چەند رۆژەدا شتێکی لێ روون بۆوە. گەنجێکی باڵابەرزی سەروگوێلاك خۆڵاوی بەرەوڕووی رادەوەستا و چاوە درشتەکانی تێ دەبڕی. کاتێ ئیمامیش سەیری دەکرد، ئاوڕی دەدایەوە، بەپەلە لەوێ دوور دەکەوتەوە.

کەس نەیزانی چ رووی دا، یان کێ وای لە ئیمامە کوردە کرد، دیسان دەهری بێتەوە. ئەو دیسان دەستی کردەوە بە هات و هەرا و گوتی یوسفێك لەگۆڕێ نییە. ئێوە سەرۆکی مەزنتان

کوشتووە، نەزمی بەگ دێ و دوورخستنەوە و ئاقچاساز و... عەسری ئەو ڕۆژەی وا دەستی کردبۆوە بە زماندرێژی، ئەفسەرێك بە چوار جەندەرمەوە هاتن و لەگەڵ خۆیان بردیان بۆ پۆلیسخانە. نەقیب هەر چاوی پێی کەوت وەك بزووت لەجێی خۆی دەرپەڕی و پەلاماری دا و دایە بەر شەق و مستان. بەڵام ئەوانەی لەوێ بوون، مامۆستا ڕۆستەم بەگ و ماهیر و جافر ئۆز پۆلاد و ئالاتەمیر دەستیان گرت. بەڵام ئاگری تووڕەیی نەقیب دانەدەمرکایەوە. ئەو دەرهەڵبببوو و هەرچی بەسەر زاریدا دەهات، پێی دەگوت. ئیتر تۆمەتێك نەما نەیداتە پاڵی. هاندان گوندییەکان و هەوڵدان دژی ئاسایشی وڵات و پیلانگێڕان بۆ ڕووخاندنی دوایین دەوڵەتی تورك و... کۆمەڵە تۆمەتێك، لە وشترت نابایەن هەڵینەدەگرت...

نەقیب کەفی هەڵدەخراند و دەینەڕاند:

"لە دارت دەدەن. ئەگەر زۆرت چاکە لەگەڵ بکەن و لە سێدارەت نەدەن، هەتا دەمری، لە زیندانێدا دەڕزێی. کێ سەرۆکی مەزنی کوشت؟ یوسفێك لەگۆڕێ نییە؟ ئەگەر یوسف لەگۆڕێ نییە، ئەی ئەو هەمووە هێزەی جێی شانازیی دەوڵەتە شکۆمەندەکەمانن، بە شوێن کێدا دەشت و چیاکان کێوماڵ دەکەن؟"

پێی لە عەرزی دەکوتا، لێی دەچووە پێشێ و بە مۆڕەیەکەوە سەیری سەرتاپای دەکرد و دەگەڕاوە و دەیبۆڵاند و تووڕەییەکەی بەسەردا هەڵدەڕشت و بەسەریدا دەنەڕاند:"

"بڵێ، دەی بڵێ."

ئاخرییەکەشی بەوپەڕی تووڕەییەوە، فەرمانی بە جەندەرمەکان کرد:

"ئەو دوژمنە خەتەرناکەی دوایین دەوڵەتی تورك لە کۆت و بەند بکەن. زنجیری لە دەست و ئەستۆی بکەن و بیکەنە ژوورێ، دەی زوو بکەن..."

ئیمامە کوردە ئەوێ شەوێ لە بەندیخانەیەکی شێدار و پیس و بۆکەندا مایەوە و هەتا بەیانی ئەوی خەو بێ، بەچاویدا نەهات. هەر بەو شەوە نیوەگیان ببوو. خۆی بەسەر پێوە ڕانەدەگرت و روخساری وا زەرد هەڵگەڕابوو، کەسك دەچۆوە.

سەعات دەی بەیانی هێنایانە دەرێ و بردیانە لای نەقیب. ئاغا و دادوەر و مودیر ناحییەش لەوێ بوون. نەقیب هاتە قسە:"بڕۆ خودا بەقوربانی ئەو بەگانەت بکا، ئەگینا لەو تەمەنەتدا دەمخستییە تەویلەوە و بەرم نەدەدا هەتا گیانت بە قوونتدا دەرنەچووبا. ئەو ئاغایانە گوتیان، ئەتۆ پیاوێکی زەڕت بۆ کەس نییە و کارت بەسەر کەسەوە و بەسەر هیچ شتێکەوە

نییە. ئەمن ئەوە جارێ بەو مەرجەی بەڵێن بدەی لەمەودوا زماندرێژی نەکەیتەوە و قسەی لە زارت زلتر نەکەی، لێت خۆش دەبم. بەڵێن دەدەی؟"

ئیمام لەحاڵێکدا چرچ و لۆچەکانی دەموچاوی دەلەرزینەوە و سەر روومەتەکانی چلّیان دەدا، چاوی لەپێش خۆیەوە بڕیبوو و هیچی نەدەگوت. نەقیب نەڕاندی:"بەڵێن بدە، دەی بڵێ."

بەڵام ئیمامە کوردە متەقی لێ نەدەهات و هیچ گۆڕانێکیش لە قەڵافەتی و رواڵەتیدا بەدی نەدەکرا. نەقیب یەك پشوو دەینەڕاند:"بڵێ، دەی بڵێ."

ئەویش هەروا متەقی نەدەکرد. نەقیب نەڕاندی، بەسەریدا شریخاند و پێی لە عەرزی کوتا، بەڵام ئیمامە کوردە لە حاڵێکدا پشتی لەبن کۆت و زنجیردا چەمیبۆوە، وەك بووبێتە سەهۆڵ، هەروا راوەستا و متەقی نەکرد.

نەقیب تاقەتی نەما و نەڕاندی:"ئەو نیشتمانفرۆشە ناپاکە بەرنەوە ئەو شوێنەی لێی بوو. هەتا ئەو رۆژەی دادگایی دەکرێ، دەبێ لەوێدا بمێنێتەوە. دەی کۆنووسێکیش ئیمزا بکەن لەسەر دنەدانی خەڵکی. دۆزینەوی شایەتیشتان لەبیر نەچێ. بیبەن."

ئیتر دانیشتەوە. بەڵام ئۆقرەی نەگرت. ماهیر قاباقچی ئۆغڵی وەقسە هات:"لەبری ئەو من بەڵێن دەدەم جەنابی نەقیب."

مامۆستا رۆستەم بەگیش بەدووی ئەودا گوتی:"ئەمنیش."

ئالاتەمیریش هاتە قسە:"ئەگەر ئیمام بەڵێن بدا ئیتر قسەی وا نەکاتەوە، ئەمنیش... ئەمنیش... ئیمام پیاوێکی باشە."

نەقیب گوتی:"زۆر باشە. جا مادام وایە، بەری بدەن، با بڕوا بەشوێن کاری خۆیدا. بەڵام بێت و تاقە جارێکی دیکە، قسەی وا بکاتەوە، ئەوکات من و دەزانم و ئەو."

ئەوجار دەمانچەکەی هەڵکێشا و دووپاتەی کردەوە:"بێت و جارێکی دیکە قسەی وا بکاتەوە، جا من دەزانم و ئەو."

رووی دەمانچەکەی لە ئیمام کرد و نەڕاندی:"زاری پڕ دەکەم لە فیشەك."

ئیمام لە حاڵێکدا جینگڵی دەدا، بێدەنگ و تێك شکاو، پشتی کۆمابۆوە و بە هێواشی لە پلیکانەکان دەچووە خوارێ، بەرەو ماڵەکەی کەوتە رێ. ژنەکەی وەك هەمیشە و لە حاڵێکدا لەچکێکی وەك بەفر سپیی لەسەر کردبوو، لەبەر دەرگا چاوەڕێی بوو. سفرەی ئارەقەکەی لە دوێنێ عەسرێوە هەروا بۆ راخستبوو.

ئیمام نەیتوانی سەری هەڵێنێ و سەیرێکی ژنەکەی بکا و وەك جاری جاران زەردەیەکی بۆ بکا. راستە و ڕێ چووە سەر نوێن و بانەکەی کەوت و هەتا ئێوارە لێی نووست. کە لەخەوێ هەستا، روخسارە گرژەکەی، حەپەسابوو. ژنەکەی بە مەسینە ئاوی بەدەستیدا کرد و ئەو دەموچاوی بە سابوون شوشت و لەسەر سفرەکەی دانیشت. مەزەی سفرەکەی بۆ گۆڕیبوو. دوای ئەوە چاوی لە ژنەکەی بڕی و نیگایەکی خەفەتباری لێ کرد و بەئاستەم لێوەکانی بزواند. تفی زاری قوت دایەوە و ماوەیەك هەر قسەی پێ نەکرا. چەند جارێك تفی زاری قوت دایەوە و دیسان قسەی هەر پێ نەکرا. گریان لە ئەوکیدا گیری خواردبوو و وەخت بوو بیخنکێنێ.

بایەکی فێنك هەڵی کرد و گەڵای رەز و سپی چنارەکانی حەوشە خشەخشیان هات. دوای ئەوە بوو، کە ئیمام توانیی قسە بکا و گوتی:"ئەو شارۆچکەیە ئیتر خێر و خۆشیی بۆ ئێمە تێدا نییە. شڕ و سپاڵەکەمان کۆ بکەوە، با بار بکەین و بڕۆین بۆ شوێنێکی دی. جارێ نازانم بۆ کوێ، بەڵام هەرچۆنێك بێ ئێرە بۆ ئێمە نابێ. دەبێ بڕۆین..."

## ١٢٦

ئەو مرۆڤە باشانە، لێی سوار ئەسپە جوانەکانیان بوون و..."

نەرمە بارانێکی زەرد ورد ورد دایکردبوو. هەر دەتگوت ناشبارێ. دەوروبەر، جارێ نوقمی رووناکاییەکی زەرد و شێدار و جارێکیش نوقمی تاریکییەکی زەرد و شێدار دەبۆوە. لەودیوی کونێکی رووناکی درێژ و بەرینەوە، ئاقچاساز و دارەکانی ئاناوەزرا تار و رەنگبزرکاو جارێ دەردەکەوتن و جارێ نەدیو دەبوونەوە. هەتاوەکە هەر دەتگوت هەڵنەهاتووە. لەبیرکرابوو و ئاواببوو و لەوانەش بوو هەر هەڵیشنەهاتبێ.... لەوانەشە ورد و خاش بووبێت و بەئاسمانێ وەربووبێ. جێ جێ، لەو بارانەدا کە هەر دەتگوت نابارێ، رووناکایی و بریسکەبریسك و هەورەتریشقە... خاکە نارنجییە باران لێدراوەکە، هەستابوو و گەیبۆوە ئاسمان و هێڵی نێوان زەوی و ئاسمان نەمابوو. ئاسمان تاوێك تاریك دەبێ و تاوێك ساو و سامالْ دەبێتەوە. جارێ پەڵەی لە زەرد زەردتر و روونتر و جارێ لە نارنجییەکی تۆخ، تۆختر دەردەکەوێ و ون دەبێتەوە. بێدەنگییەکی قوولْ بالْ بەسەر دەوروبەردا دەکێشێ. تاریکاییەکی خەست و لیچق جارێ دادەکشێتە خوارەوە و جارێ هەڵدەستێتەوە و لەوبەری توێژێکی تاردا ون دەبێ و لەپڕ روون روون دەردەکەوێتەوە. هەموو شتێك، جارێ نەدیو دەبێ و جارێ دێتەوە بەرچاو. ئەسپی رەش و کوێت و سپی و شێ، سوار لەسەر پشت و زین و کورتان زیوکفت. خۆر وەك بڵێی هەڵبێ، جارێ رووناك و جارێك خامۆش... ئەسپەکان لەسەرخۆ هەتا رەفیچکان هەتا بن زگ لە قوڕ هەڵدەچەقن و بە زرم و کوت هەوڵ دەدەن و نوقمی ئارەقە شان بە شان بە قوڕ و لیتە نارنجییەکە و بارانە زەردەکەدا تێدەپەڕن. گەرمای مەند و خنکێنەر، بە تیشك و درەوشانەوەی بەردەوام، لە هەوا مات و ئامالْ زەردەکەدا لە دووکەڵ دەچێ.

سوار، شان بەشانی یەك بەنێو قوڕ و لیتەدا رێیان دەبڕی و بە نەرمەغار دەڕۆیشتن. بارانە زەردەکە، جارێ لە شەوی دەدا و جارێ لە تاریکاییەکی زەرد و جارێ لە رووناکاییەکی زەرد و

پڕ لە درەوشانەوە و بریسکەبریسك، دیمەنی سوارەکانی دەگۆڕی. چەند تەراکتۆرێکی نارنجی بە ریز لە پشتەوەیان لە قوڕ چەقیون و لەجێی خۆیان نابزوون. کلکی ئەسپەکانیان بەستووە.

باڵندەیەکی گەورە هات و کەوتە سەر دیواری کۆشکەکە. باڵندەکە وەك باڵندان لەسەر دیوارەکە نەنیشت، بەڵکو وەك بەردێك شلّپ کەوتە سەر دیوارەکە. ماوەیەك بە باڵی لێك کراوەوە هەر هەوڵی دەدا و ئاخرییەکەی توانیی خۆی بگرێتەوە و لەسەر دیوارەکە راوەستا. پەڕ و پۆی باڵندەکە تەڕ ببوون و پێکەوە نووسابوون. ملی وێك هێنا و بە چنجڕووك توند دیوارەکەی گرت و کرووشمەی کرد و گرمۆڵە بوو و وەك پارچەیەك لە یوارەکە لەجێی خۆی چەقی. تاوێك دواتر باڵندەیەکی دیکەش وەك ئەو کەوتە سەر دیوارەکە. ئەوجار سێهەم، چوارەم، پێنجەم... باڵندەی خووساو بە لەرزەلەرز لەسەرمان و سەرو ملی وێکهاتوو لەسەر دیوارەکە ریز بوون.

هاڕەی تەراکتۆر بەرز بوونەوە و دەشتەکەیان خستە لەرزین و بە باقە دووکەڵیان دەردا. رەنگی خاکەکە، نارنجییەکی تۆخ داگەڕا. ئەسپەکان لە قوڕ چەقین و سوارەکانیشیان لە قوڕ و لیتەکەدا رەنگی نارنجییان پێوە نووسا. باڵندە تەڕەکانیش رەنگە نارنجییەکەی قوڕ و لیتەکەیان پێوە نووسا و پەڕ و باڵیان قورس بوو. لەوانەش بوو ئیتر لەبەر ئەو قورساییەی قوڕ و لیتەکە ئیتر نەتوانن باڵ لێك بدەن و هەڵفڕن...

ئەسپەکان لە قوڕ و لیتەدا تەکانیان لەخۆ دەدا. پشت و کەفەڵ و سمتیان هەڵمی لێ هەڵدەستا. سوارەکان لەو هەڵمەدا مانەوە. لەنەکاو سوارەکەی پێشەوە هەلینگی دا و ئەسپەکەی وا تاو دا، هەر دەتگوت ئەسپەکە پێی عەرز ناگرێ و دەفڕێ. لەگەڵ غاردانی ئەو، قیژەیەك هەستا، کە وەك شیر دڕی بەبێدەنگیی دەشتەکە دەدا. سوارەکە شان بە شانی قیژەکە هات و لەبەردەم کۆشکەکە راوەستا. قیژەکە توندتر ببوو و خۆی لە دەرگای کۆشك دەکوتا. سوارە وای دەنالاند و دەکڕووزاوە، بەردی دەتاواندەوە. سوارە، لەگەڵ قیژە و نالێنەکە و بە خێراییەکی سەرسووڕهێنەر، بەدەوری کۆشکەکەدا سووڕایەوە. سوارەکانی دیکەش لە قوڕ و لیتەکە رزگار بوون و لەگەڵ قاوقیژەکان بەرەو کۆشکەکە باڵیان گرتبوو و دەهاتن. تاوێك لەبەر دەرگای کۆشکەکە رادەوەستان و ئەوجار دەکەوتنە شوێن سوارەکەی پێشوو. سوارەکان لەگەڵ قاوقیژ و زریکە دڵتەزێنەکاندا بەدەوری کۆشکدا دەخولانەوە و باڵندەکان باڵە قورس و قوڕاوییەکانیان بە زۆری و بە دەم قاوقیژی دڵتەزینەوە لێك دەدا.

یەکێ لە باڵندەکان تلّپ بەربۆوە نێوەڕاستی حەوشەکە. دەتگوت عەرز لەرزی. لەوێ لەسەر عەرزەکە پان بۆوەز باڵی لە قوڕەکەی چەقین. سوارەکەی پێشەوەش بەدوای ئەودا لە نێوەندی حەوشەکە کەوت و لاقی ئەسپەکەی هەتا رەفیچکانی لە قوڕ چەقین. ئیتر لە جێی خۆی نەبزووت. دەروێش بەگ لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەی لاچوو و هاتە دیوەخان و پاڵی بە ئەستوونەکەوە دا. رەنگی زەرد هەڵگەڕابوو و هەموو گیانی وەك بینی ئاو دەلەرزی. سوارە لە حەوشە لە قوڕێکی خوێناوی رۆچوبوو و هاتبۆوە دەرێ. ئەو خوێنەی لە رکێفی دەچۆڕایەوە، دلۆپ دلۆپ عەرزی حەوشەکەی کون کون دەکرد... هەتاوێکی بەتین، ئاگری لە دەوروپشتی بەردابوو و عەرزەکەی سوور دەکردەوە. بارانە ئاماڵ زەردەکە خۆشی نەدەکردەوە. خوێنەکە لەسەر عەرزی گۆمیلکەی دەکرد. زریکە و قاوقیژ، دڕی بە باران و گەرماکە دەدا، توندتر دەبوو و هەتا مێشکی ئێسقان رۆدەچوو...

ئەوە پیاوەی لە نێوەڕاستی حەوشەکە خوێنی لەبەر دەڕۆیشت، بە چاوی لەژێڵلاهاتوو و بە روخسارێکی ئەسمەرەوە کە لەبەر ژان و ئازار گرژ ببوو، خۆی چەماندبۆوە و چاوی بڕیبووە خوێنەکەی خۆی، کە لەسەرخاکەکە کەفی دەکرد و کۆ دەبێتەوە... دەروێش بێ تاقەت و تین لەبەردانەماو و شەکەت، بەبێ ئەوەی بتوانێ لەجێی خۆی ببزوێ، دەنەڕێنێ، بەڵام نەڕە و گوڕەکەی لە نێو دەنگدانەوەی گابەرد و رەوەزەکان و حیلە و کوڕژنی ئەسپ و قاوقیژی باڵندان و دەنگی بەریەك کەوتنی باڵی قورسی باڵندەکاندا بزر دەبێ. زاری داپچڕیوە و ئەوەندەی هاوار کردووە دەنگی نووساوە. لە بارانە ئاماڵ زەردەکەدا شەکەت و داماو ماوەتەوە. هەرچی هەیە لە جووڵە کەوتووە. سوارەکان بە زریکە و قیژەقیژ لە نێوەڕاستی حەوشەکە کۆ بوونەوە. ئەسپەکانیان هەتا بەر زگ لە قوڕ چەقین. لەو کاتەدا دڵی دەروێش بەگ دەتگوت لەلێدان کەوت. راچڵەکی. سەرمای بوو. مێشکی ئێسقانی، دەنگی و عەرز، پوا و بۆگەن بوو. بنیادەمەکان پەیتاپەیتا لە ئەسپەکانیان خۆیان فڕێ دا و هەتا بەرپشتوێنیان لە قوڕ چەقین. دەروێش بەگ ئارەقەی دەکرد. هەموو گیانی، تەنانەت سەری مووەکانیشی ئارەقەی دەکرد. ئارەقەیەکی ترشاوی سووتێنەر و بەتین. ماوەیەك لەبەر زریکە و قیژە هیچ کوێی نەدی. هەرچی هەبوو رەش ببۆوە. باران دایدایە گۆپاڵباران. دەروێش بەگ ئەوەندە شەکەت بوو، لەپێ کەوتبوو. دەتگوت هەر نییە. سەری داخستبوو و پێڵووەکانی بەسەرچاویدا کەوتبوون. چاوەکانی "کابرا"یش شەکەت بوون. کابرا شەکەت و بێزار بە ئاستەم هەوسارە تورکمانییەکەی کە بەدەستییەوە بوو، بەسەر قەرپۆزی زینە تورکانییەکەوە بەست و دیسان بەلادا هات و شل

بۆوە. باسکی وەك باڵی باڵندەیەك لێك کرانەوە و کەوتە سەر عەرزی. نۆغانەکەی لە دەستیدا و لەبەر بارانە ئاماڵ زەردەکە دەبریسکایەوە. هەتا ئەژنۆی لە قوڕ چەقیبوو و خوێنی لەبەر دەڕۆیشت. لە حاڵێکدا وەك گاسنێك گڵەکەی هەڵدەدڕی و هەتا بەر پشتوێنان لە قوڕەکەی چەقیبوو، گەیشتە بەر دەرگای کۆشك. مزەفەر لەبەر دەرگا بوو. قۆڵی کابرا(ئادەم)ی گرت و بردی و لە پشت دیواری حەوشەکەی دانا. باڵندەکان نەبزووتن. پیاوە لە قوڕ چەقیوەکان ناڵاندیان. ئەسپەکانیان حیلاندیان. باڵندەکان بەبێ ئەوەی لەجێی خۆیان ببزوون، بە قاوقیژ باڵیان لێك دا. مزەفەر دەرگای حەوشەی گاڵە دا و وەك ئەوەی هیچ نەقەومابێ، بە باڵ راوەشاندن و سەبیلەیەك بە لالێوەوە، سینگی دەرپەڕاندبوو و هاتە بەر دەرگای کۆشك. لەوێ کاتێ ئاوڕی دایەوە، ئادەمی دیت کە بە نێو قوڕەکەدا ڕێی خۆی کردووەتەوە و هاتووە و خەریکە گیانی دەردەچێ. دەروێش بەگ بێ هێز و بێ تین، لەبەر شەکەتییان دەف دەدا، هاوار دەکا و وەك شێتان دێ و دەیەوێ ئەو بنیادەمەی خوێنی لەبەردا نەماوە، بەرێتە سەرێ، بەڵام ناتوانێ. مزەفەر چاوێکی لەسەرتاپای کابرا کرد و بن پیلی گرت و بە راکێش راکێش بردی و دیسان لەبەر دەرگای حەوشە فڕێی دایەوە. ئەو بنیادەمەی خوێنی لەبەردا نەمابوو، بەر لەوەی مزەفەر بگاتەوە بەردەرگای کۆشك، گەیشتە ئەوێ. مزەفەر هەڵچوو و کاتێ کابرای برینداری هەڵدەگرتەوە، لێیان بوو بە شەڕ. ئاخری ئەو کابرایەی خوێنی لەبەردا نەمابوو، دیتی گەیشتوەتە بەر پێیانی دەروێش بەگ. هیدایەت و خاتوون هاتن. دەروێش بەگ گوتی:"خێرا بن، کابرا خەریکە دەمرێ. دەی بەلایەکیدا بخەن."

گوێیان لە دەنگی بوو. کابرایان هەڵگرت. هەموو گیانی شەڵاڵی خوێن بوو. بردیان جوان و زەریف شوشتیان. چاوە رەشەکانی وردەوردە بەسەرسووڕمانەوە زەق دەبوونەوە ردێنە رەش و لوولەکەی دەشەکایەوە.

نەرمە بارانێك دای کرد... ئەوانەی لە حەوشە بوو،، سواری ئەسپەکانیان بوون و یەك دەنگ هەرایان کرد:"سوڵتان ئاغا، سوڵتان ئاغا، ئەمیر سوڵتان، ئەمیر سوڵتان، وەرە، وەرە. ناتوانی لەدەست چارەنووس را بکەی. ساری ئۆغڵی دەروێش سەهلە، تەنانەت پەنا بەریتە بەر سوڵتان سلێمانیش، دیسان ناتوانی لە چنگی چارەنووس را بکەی."

بێدەنگ بوون و چاوەڕێیان کرد. هەورە تریشقەیەك ئاسمانی تەقاندەوە و لەتوپەتی کرد و بەسەریدا هەڵڕشتن.

"دەروێش بەگ، دەروێش بەگ، بیدە دەستمان. ئەگەر نەیدەیە دەستمان، بەزۆری لێتی دەستێنین و کۆشکەکەت بەسەردا کاول دەکەین و یوسفیش رادەستی نەقیب دەکەین."

دەروێش بەگ گوتی:"بیگرن. بیگرن. ئەوە مزەفەر لەوێیە. کوڕی گەورەمە. بیگرن، گەردنتان ئازاد بێ. چیتان پێ خۆشە وای لێ بکەن. ئەمیر سولتان پەنای هێناوەتە بەر من. لەبەر من لەو خۆش بن، یوسف بدنەوە بە من."

پیاوەکان پێکەنین و مزەفەریان وەك تۆپێك بۆ یەکتر هاویشت و گوتیان:"ئەوە، ئەوە دەدەیە ئێمە؟ جا ئەوە بۆ چ دەبێ؟ هانێ، پێشکەش بەخۆت. مالی قەلب سەر بە خاوەنێتی."

حەمە عەلی مزەفەری نەجات دا. ترۆمبێلەکەی لەبەر دەرگا راوەستابوو. تازە خەتی لێ دابوو. کلاوێکی گەڕگەڕیی حەسیر و کراسێکی سپی و پێلاو و پانتۆلی سپی... گەیشتێ و مزەفەری لە چنگ دەرهێنان. چووە بن پیلی و چاوێکی گالتەجاڕانەی لە کۆشك کرد و هەر بەو روانینەشەوە سەیرێکی دەروێش بەگی کرد. دەستی دەروێش بەگ خزییە سەر دەمانچەکەی، بەلام نەیتوانی رایکێشێ. ئەوان بە پێکەنین و سەماکردنەوە سواری ترۆمبێلەکە بوون و رۆیشتن. تاوێك دوای رۆیشتنەکەیان، سەری شۆفلەکان کرانەوە. شۆفلی نارنجیی تۆخ کۆشکەکەیان گەمارۆ دا. سوار لە ئەسپ دابەزین و سواری شۆفل بوون و لە حالێکدا بوولەرزەیان خستبووە کۆشکەوە، بەدەوریدا خولانەوە. جارێ شۆفلەکان رادەوەستان و ئەوان سواری ئەسپەکان دەبوون و بەدەوری کۆشکەکەدا دەخولانەوە و جارێ لە ئەسپ دادەبەزینەوە و سواری شۆفلەکان دەبوونەوە و دەخولانەوە. بەرەبەری ئێوارێ بارانە ئامالێ زەردەکە لێی کردەوە و بالندە خووساوەکان هەلفڕین و بەسەر کۆشکەکەدا لە شەقەی بالیان دا.

پیاوە فیلینتا بەدەستەکان لە نێوەڕاستی حەوشەکە ریز بوون. بەبێ ئەوەی جوولە بکەن، چاویان قووچاندبوو و چاوەڕێ بوون. لەپڕ زاریان کردەوە و یەك دەنگ هەرایان کرد:"ئەمیر سولتان، ئەمیر سولتان، تۆ گوێ مەدە قسەی ئەو شێتە. ئەو کابرایە شێت بووە. ئەتۆ خۆت راکە و وەرە. خۆت لە چنگی ئەو شێتە رزگار بکە و وەرە."

ئەمیر سولتانی گوێی لە دەنگەکە بوو و چاوی هەلێنا. لە تەندووری "تا"دا هەلدەچۆقا. هەستایە سەر پێ و دەرپەڕییە دەرەوە و هەرای کرد:"بمگرن، من بگرن. ئیتر گەیشتە ئێسقانم، گەیشتە ئێسقانم. بمگرن و بم ئەنجنن. ئیتر بەسمە."

هیدایەت گەیشتێ و باوەشی بە ئەمیر سولتاندا کرد. ئەمیر سولتان وەك منداڵێکی بەرمەمکان سووك بوو. لە پلیکانەکان بردییە سەرێ و لەجێوبانەکەیدا درێژی کرد. نەشتەگەرە

کوردەکە گوتی:"ئەو کابرایە هەتا مانگێك ناتوانێ لە جێ بێتە دەرێ. هەر بێتە دەرێ، دەمرێ."

"ئەو کابرایە بدەیەوە بە ئێمە، بماندەیە. یوسف بەدەست ئێمەوەیە. ئەگەر ئەومان نەدەیەی، ناگاتە ئێوارە یوسف رادەستی نەقیب دەکەین."

کابرایەك لە خوارەوە و بەنێو ئاسکەکاندا دەهات. گەردەلوولەکان لەحاڵێکدا بەهەزاران چزیسك و بریسکەیان لێ دەبۆوە، لەگەڵ مامزەکان دەهاتن. یوسف لە نێو ئاسکەکاندا جارێ دەردەکەوت و جارێ نەدیو دەبوو. ئاسکەکان، گەردەلوولەکان، یوسف و ئەو باڵندانەی تێکەڵی یەك بوون و بەتێکەڵاوی بەرەو ئاقچاساز وەڕێ کەوتن. کابراو گۆڕە سەری داخستبوو و هەر بەدەوری خۆیدا دەخولایەوە وبازنەی گەورەتری دروست دەکرد.

ئەو پیاوانەی لە شۆفلەکان دابەزیبوون و سواری ئەسپەکان ببوون، لە حاڵێکدا سەق و کوت هەوسار و رکێفی ئەسپەکانیان رادەوەشاند، لەبەر دەرگای کۆشکەکە ریز بوون و هەرایان کرد:

"بەچاوی خۆت دیتت، یتت، دیتت... ئەمیر سوڵتان بدە دەست ئێمە. چارت نییە هەردەبێ وا بکەی."

نەقیب فەرمانی پێ دان. لەسەر جێی خۆیان چەقین. ئەسپەکان لە پشتەوەیان حەجمینیان لێ بڕابوو. شۆفلەکان لە پشت ئەسپەکانەوە، لەحاڵێکدا بۆنی رۆنە رەشەیان لێ دەهات، ئیشیان دەکرد. نەقیب سواری شۆفلێك بوو، رۆیشت و دوای ئەوەی بەسووکەوە سەیرێکی دەروێش بەگی کرد، گوتی:"خۆت دیتت، بەچاوی خۆت دیتت، دیتت کە.."

دەوروبەر لە تۆزێکی تاریك رۆچوو و دەرکەوتەوە. ئەمیر سوڵتان بە ملی شۆڕەوە هات و لەبەر دەمی راوەستا و گوتی:"گەردنم ئازاد بکە بەگ. من عومرم تەواو بووە. چ پێویست دەکا لەوە پتر درێژەی بدەین؟ خۆ دیارە ئاخرییەکەی چیم بەسەر دێ. من دەڕۆم. منیان بدەیە و یوسف وەرگرە."

دەروێش بەگ زمانی نەدەگەڕا و دەنگی دەرنەدەهات.

ئەمیر سوڵتان دەستی لە باخەڵی نا و متفەرکێکی زێڕکفتی دەرهێنا و گوتی:"با ئەوە لەلات بمێنێتەوە. لە بەڵای لابەلا و شەڕی دوژمن و لە هەموو چەپەڵی و زوڵم و سووکایەتییەك دەتپارێزێ."

دەروێش متفەڕکەکەی بەدەستەوە گرت و سەیرێکی کرد. دوای ماوەیەکی زۆر، روخساری گەش بۆوە و بەسەر زاریدا هات:" بەکاری چ دێ. لەمەوپاش بەکاری چ دێ. ئای ی ی ئەمیر سوڵتان، دوای رۆیشتنی تۆ..."

متفەڕکەکەی دایە. ئەویش وەریگرت و بەبێ ئەوەی یەك قسەش بکا، خستییە باخەڵییەوە... لە پلیکانەکان چووە خوارێ و گەیشتە حەوشە و لەوێ، لەبەر تاوە بەتینەکە راوەستا و سێبەرە تارەکە لەبن پێیدا هەستا. خوێنی لەبەر دەڕۆیشت.

نەشتەرگەرە کوردەکە وەقسەهات:"نابێ، نابێ نابێ بەگ. ئینسانێك نابێ بەو حاڵەوە وەدەر بکەوێ. یانی چوکووراوا پیاوەتی و ئینسانەتیی تێدا نەماوە؟"

دەروێش بەگیش لە وەڵامیدا گوتی:"تەواو بووە نەشتەرگەر، چوکووراوا تێداچوو."

نەشتەرگەر شێلگیرتر بوو:"نابێ، نابێ، سەرەڕای هەموو ئەوشتانەش، دیسان نابێ تێدابچێ."

شۆفلێ سوار و ئەسپ سوارەکان بەتەپوتۆز و هەرا و قریوە خۆیان بە حەوشەکە داکرد. زاریان گەزێك داپچڕیبوو. باڵندە خووساوە شەکەتەکان بە پەڕ و باڵی پێکەوە نووساوەوە، دیسان هاتنەوە و لەسەر دیوارەکە هەڵنیشتنەوە.

بنیادەمەکان بە دیتنی ئەو باڵندانە، بە جۆش و خرۆشێکی زۆرەوە بەرەو باڵندەکان غاریان دا و هەرکامە لەسەر دیوارەکە، باڵندەیەکی خووساو و قورس و بێ جووڵەیان گرت. هەرکەس باڵندەیەکی دەگرت، هەرلەوێ سەری هەڵدەپڕووسکاند. حەوشەکە لە چاوترووکانێکدا پڕ بوو لە لاشی باڵندە. جار بە جار باڵندەی دیکە دەگەیشتنێ و جێی باڵندە سەر هەڵکەنراوەکانیان پڕ دەکردەوە و لەسەر دیوارەکە هەڵدەنیشتنەوە. هەر لەگەڵ هەڵنیشتنەوەیان، پیاوەکان پڕیان دەدانێ و سەریان هەڵدەکەندن و سەرەکانیان بۆ لایەك و لاشەیان بۆ لایەکی دیکە تووڕ دەدان. حەوشەکە کۆگا کۆگا لاشەی باڵندەی لێ کەڵەکە بوو. پڕ بوو لە خوێن و پەڕوپۆی خووساو و چاوی پرووش.

"خۆ بەچاوی خۆت دیتت ئەمیر سوڵتان. دیتت، دیتت، دیتت کە، دیتت..."

ئەمیر سوڵتان لەبن کۆڵەکەکە کرووشمەی کردبۆو و گرمۆڵە ببوو. وا سەری سووڕمابوو، چاوە درشت و گەش و بریسکەدارەکەی زوو زوو دەترووکاند و ردێنە لوولەکەی دەلەرزی.

"مەمدەرە دەستی ئەوان بەگ. مەمدە. تۆ ساری ئۆغلیی. من هانام بۆ تۆ هێنا. چۆن دەتوانی بمدەیتە دەستی ئەوان؟"

پیاوێکی کەڵەگەت و رووگەش، کە کاکۆڵی بەلایەدا خستبوو، جلوبەرگێکی نیلیی جوانی لەبەر کردبوو و دەسرۆکەیەکی شینی لەبەر پشتوێنی نابوو و کڵاوێکی گوڵدار لەسەر و پێڵاوی بریقەداری لەپێدا بوو و بە پارێزەوە و بەئاستەم و دووبەڵا پێی لەسەر عەرزی دادەنا. بە هێواشی لە پلیکانەکان وەسەر کەوت و لەنێوەڕاستی دیوەخانەکە راوەستا و سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد. کابرا لەسەرخۆ سەری هەڵێنا، کۆمەڵێك کاغەزی سپیی لەگیرفانی دەرهێنا و خوێندییەوە و ئەوجار هاتە لای ئەمیر سوڵتان کە لە بن کۆڵەکە کرووشمەی کردبوو. بەژوور سەرییەوە راوەستا و نامەیەکی پەمیی دیکەی پێشان دا. ئەمیر سوڵتان دەمانچەکەی دەستی دایێ و هەستایە پێ. سەری بە سینگیدا شۆڕ ببۆوە. هەر ئاوا تا سەر پلیکانەکان چوو. ساتێك لەوێ راوەستا و سەیرێکی دەروێش بەگی کرد. چاویان تێك ئاڵقا. دەروێش بەگ سەری داخست. کە سەری هەڵێنایەوە، ئەمیر سوڵتان نەمابوو. گوێی لەو قریوەی شادییە بوو کە لە حەوشەوە دەهات. گەیشتە بەر بێڵا. ئەمیر سوڵتان لەوێ، لە نێوەندی حەوشە راوەستابوو و سەری بەسەر شانی راستەیدا کەوتبوو. زەنازەنا و هەراکە تاوێك نیشتەوە و کابرای کاکۆڵ گوتی:"بیگرن."

بە پەنجە، ئەمیر سوڵتانی پێشان دان و گوتی:"چما ئەوەتا نەدەویست؟ دەی بیگرن."

لەپڕ هرووژمیان بردە سەر ئەمیر سوڵتان. دەروێش بەگ دیسان بۆ ساتێك چاوی لە چاوی ئەمیر سوڵتان ئاڵقا و دوای ئەوە هەرچی هەبوو نوقمی تەپوتۆز بوو. هەراهەرا و هات و هاوار و پێکەنین و بۆڵ بۆڵەکان... کە تۆزەکە نیشتەوە، تەرمی ئەنجنراوی ئەمیر سوڵتان لەسەر لاشەی باڵندەکان کەوتبوو. باسکێکی لە بنەوە هەڵکەنرابوو.

لەگەڵ بەسەرداهاتنی شەو، بارانێکی ئاماڵ زەرد، ورد، درەوشاوە و تێکەڵ بەقوڕ و لیتە و کا و کۆت و پووش و پەڵاش و تەپوتۆز نەرم نەرم دەباری...

دەروێش بەگ بەرەو لای ئاقچاساز و کاولاشەکانی ئاناوەرزای کۆن، رووی وەرسووڕاند.

"ئەو مرۆڤە باشانە... بەو ئەسپە جوانانە..."

## ١٢٧

شەوە خەست و شێدار و خنکێنەرەکە، دەبزووت. دەتگوت دەمانچەکەی بەشێکە لە جەستەی. بە لەپی دەستی هەستی بەوە کرد، فیشەکەکان ئەوەندە لێك سواون، لێك و لووس بوون. دەنگەکان وەك دیوارێك، وەك ئاو، لە پشت و تەنیشتەوە بەرەولای دەکشان. ماندووبوو. ئەوەندەی هێز نەبوو، لاقی بجوولێنێ. جەستەی کە هەر ئێسك و پرووسکێکی لێ مابۆوە، تەزووی پێدا دەهات. لە نێو ئەو زەنازەنا و هات و هەرایەوە، دەنگێك دەبیسترا، بەڵام هەرچی دەیکرد، بۆی جوێ نەدەکرایەوە. لەوبەری دەنگەکەوە چەند کافرێکی دی. کافرە لە ڕووناکاییەکەدا جارێ دەردەکەوت و جارێ بزر دەبۆوە. پێی لە دڕکەزییەك هەڵەنگووت و دڕکەکانی پێ و بەلەکیان بریندار کرد. خوێنە مەیلەوگەرمەکەی دەهاتە دەرێ. لەسەرخۆ گوتی:"هەڵمەیە کافر، مەترسە."

کافر گوێی نەدەدایێ. ئەژنۆی دەنووشتانەوە. لە حاڵێکدا دەستی لەسەر پەلەپیتکەی دەمانچەکە بوو، بەدەم ئاقاچاسازدا سەری لەدووی کافر نابوو. کافر قەڵەمبازێکی دا و خۆی هاویشە نێو زۆنگاوەکەوە. ئاوەکە هەڵی لووشی و چەند بڵقەیەك کەوتە سەر ئاوەکە. لەوێ، هەر لەو شوێنەی ئاوەکە کافرەی قووت دا، هەتا بەیان ئەنگوت بەدەم لەرزینەوە خۆی کرووشمە کرد و بەدەمانچەوە چاوەڕێی کرد. کە تاو هەڵات، ئاوەکە کوڵی، شوێنێك، هێندەی سەلکی بنیادەمێك کەی کرد و هەستا. دوایی سەروکاکۆڵ و قژێکی وەك قژی ئافرەت کەوتە سەر ئاوەکە و بەدوایدا نێوچاوانی و چاوەکانی و لووتی و ئەوجار هەموو سەری هاتە سەر ئاوەکە. لەپێکەنینان وەخت بوو ببوورێتەوە. خۆ ئەوە سەلکی حەمەعەلی بوو. دەستی بە پەلەپیتکەکەدا هێنا و هەر پەنجەی گەیشتە پەلەپیتکە، سەلکەکە بوو بە سەلکی کافرەکە. خەفەتبار و خەمبار بوو. پەلەپیتکەی ڕاکێشا. سەلکەسەرەکە سێ جاران لە ئاوەکەدا نوقم بوو و هاتەوە سەرێ. ئاوەکە بەتۆقلەکردنەوە کەفی کرد. زۆنگاوەکە هەناسەیەکی وای کێشا، عەرزی

لەرزاند. سەلکەکە دیسان بۆوە بە سەلکی حەمەعەلی. ئەو ماستە بێ موو نەبوو. نهێنییەکی تێدا بوو. هەرجارێکی ئەو تەقەی لێ دەکرد، سەلکەکە، جارێ دەبووە سەلکی حەمەعەلی و جارێ سەلکی کافرەکە. ئەو گەمەیە بەردەوام بوو تا هەوا گەرمی کرد. پاساری لەسەر لك و پۆی داران وەك شێتان کردیانە جیك و فیك. لۆکەی لە گوێچکەی نا و دیسان دەنگی قاوقیژ و جیکەجیك هەر وەڕەزیان کرد. سێ فیشەکی بە لك و پۆی دارەکەی بەرامبەرییەوە نا. لك و پۆ شکانەوە و بەربوونەوە. پاساری هەڵنەفڕین و لە جیکەجیکیش نەکەوتن. تەمێك، هەورێکی رەش بەسەر دارەکە کشا. پاساری پتر جیکاندیان. جار بە جار دەینەڕاند و دەیگوت:"لێرە بڕۆن. لەکۆڵم بنەوە. من لێرە زیاتر ناتوانم بچمە هیچ کوێی دی. هەمووتان، هەر هەمووتان فێڵتان لێ کردم."

دەنگی لەگەڵ جیکەجیکی پاسارییەکان تێکەڵ بوو و لە دەوروپشتدا دەنگی دایەوە. ئاسمان قەڵشی و تاریکی لەودیوییەوە دەرکەوت و بەسەر عەرزیدا کشا. زۆنگاوەکە تەقییەوە و کافرەی فڕێ دایە دەرەوە و بەسەر قامیشەکانیدا دا. کافر بەئاستەم پشووی دەردەهات. بەرەو کافر غاری دا و هەر لێی نزیك بۆوە، کافرە دەرپەڕی و دیسان خۆی خستەوە نێو زۆنگاوەکە. ئاوە قوڕاوەکە تاوێك بەسەر خۆیەوە رایگرت و دوایی وردە وردە قووتی دا. بەهات و هاوارەوە گوتی:"نابێ، نابێ. مەڕۆ کافر. ئاوا نابێ نا."

ئەوەندەی هاوار کرد هەتا دەنگی نووسا. زایەڵەی دەنگی لە سەد لاوە، لە رەوەزەکانەوە و لە زۆنگاوەکەوە هات.

"نابێ... نابێ..."

چاوی بڕییە ئەو شوێنەی کافر لێی نوقم ببوو. زۆنگاوەکە وشك بۆوە، خاکەکەی شەقارشەقار بوو و وەك بەردی لێ هات. کافر وەك پەیکەرەیەکی قوڕ لەوێ لەسەر گڵە قەڵش قەڵشەکە کەوتبوو. لە نێو جیکەجیکی چۆلەکەکانەوە گوێی لە ناڵینێك بوو. بەرەو ناڵینەکەی غاری دا. کافرە قوڕاوییەکەی بەکۆڵی دادا و بەرەو ئاوەکە، کە وەك زیوی تواوە دەدرەوشایەوە، رای کرد. کافری، کە بەکۆڵییەوە دەیناڵاند، خستە نێو ئاوەکەوە. قوڕی کافرە تلیساوە و رووت و قووت و لەحاڵێکدا دەستی لەسەر گەڵ و گونی دانابوو، بەرامبەری راوەستا. خەفەتبار بوو. چاوی لێك نابوون و ئەژنۆی دەلەرزین و مووی درێژی پێ و بەلەکی وەك نەشتەر راوەستابوون. مووی سنگ و باسك و بەرگەدەشی گرژ ببوونەوە. قژی سەریشی وەك دڕکی ژیژك رەق راوەستابوو. دەموچاوی هەردەهات و باریك و درێژ دەبۆوە و دەبزڕکا. کافر دەکرووزایەوە،

کرووزانەوەیەك وەك شین گێڕان. رووی دەمانچەکەی تێ کرد و لەو کاتەدا دەموچاوی کافر گۆڕا و دەموچاوی حەمەعەلی جێی گرتەوە.

دەموچاوی حەمەعەلی پێکەنینێکی لاسارانە و گاڵتەجاڕانە و پڕ لە سووکایەتیی تێدا بوو. چەند سەرێکی دیکە لە دەوری سەری حەمەعەلی دەرکەوتن. هەمووشیان دەم بە پێکەنین. هەموو ئەوسەرانەی لەبەرچاو ئاشنا بوون، بەڵام نەیدەناسینەوە. دەستی بۆ توورەکەی فیشەکەکانی گێڕا و دۆزییەوە. فیشەکەی خستە تۆپەی دەمانچەکەیەوە و دیسان بەتاڵی کردنەوە و دیسان سەرلەنوێ... چاوی هەڵێنان و لێکی نانەوە. کافرەی دیت، چەکمەی زەردی لە پێدابوو و لێوەکانی وشك و توێ توێ بوون و سەروقژی شێواو و پەرێشان ببوو و نیوەی وەریبوو و پشتی کۆم ببۆوە. مارێکی رەش هات و لە ملی کافر ئالا. مارێکی درێژ، ئەستوور بەقەوەت. مارەکە خەریك بوو بیخنکێنێ و کافر هەوڵی دەدا بە هەردوو دەستی خۆی، مارەکە لەملی بکاتەوە. دەماری نێوچاوانی و شەویلکە و لاملی وەك کاریتەیان لێ هاتبوو و چاوی وەك چاوی بۆق زەقێکی لەزاری ماردا گیری خواردبێ، زەق دەرپەڕیبوون. کافرە چەندی هەوڵی دا نەیتوانی ملی خۆی لە قەفی مارەکە رزگار بکا. وردە وردە رەنگی زەرد هەڵگەڕا و وەك ئەوەی تۆفانێکی بەسەردا هاتبێ، بەلای چەپ و راستیدا دەچەمییەوە و دەنگێکی وەك لەگەروویەکی هەڵبڕاوەوە بێتە دەرێ، لێوە هات و بە لارەلار و سەرەنگرێ بوون بەدەوری خۆیدا هەر خولاوە و خولاوە و لە حاڵێکدا ئەژنۆی دەنووشتانەوە، بەرەو زۆنگاوەکە چوو و گەیشتە سەر لێواری زۆنگاوەکە و هەتا بەرپشتوێنی لەقوڕ هەڵچەقی. تاریکییەکە باڵی بەسەردا کێشا و ئەو لەوێ، لە دەم ئاقچاساز جگە لە جووڵەیەك هیچی نەدی. ناڵبەند ئەسپەکەی ناڵ دەکرد و تەق و کوتی چەکوچەکەی لەسەر ناڵەکە هەڵدەستا. جاڕچی بە روخسارێکی منداڵانە و خەفەتبارەوە و لەهەمان کاتیشدا لاسار، لە تەنیشتی راوەستابوو. رای کرد و هەڵیکێشایە خەنجەر و سەری مارەکەی گرت و بە زەبرێك پەڕاندی. تاریکییەکە رەوییەوە و حەمە عەلی بە پێکنینەوە دەرکەوتەوە. مارە سەرپەڕیوەکە درێژ و ئەستوور بۆوە. چاوە مەرجانییەکانی دەروشانەوە و نووکی درویشە و ددانە درێژەکانی تیژتر بوونەوە و لە هەموو گیانی حەمە عەلی ئالا، و ملی گوشی. ئەوەندەی گوشی چاوی دەرپەڕی. حەمە عەلی دیسانیش هەر پێدەکەنی. روخساری چرژا و گرژ بوو. تەراکتۆرێکی شین لە حاڵێکدا عەرزی دەدرێ و بۆگەنی هەڵدەستاند، هات و دیواری ماڵەکەی لەرزاند. تەراکتۆرێکی نارنجییش هات. بەدوایدای تەراکتۆری کەسك، زەرد و سووریش هاتن و حەوشەکەیان پڕ کرد. کافر ملی حەمەعەلیی

گرتبوو و دەیکێشایە بن تایەی تەراکتۆرەکان و ئەو هاواری دەکرد:"ئەی هاوار فریام کەون، لە چنگ ئەو کافرە نەجاتم بدەن..."

هاواری کرد و هەر هاواری کرد و ئاخرییەکەی دەنگی کپ بوو. تەراکتۆرێك خێرا هات و رابرد. سەری حەمەعەلی لەسەر پیادەڕۆ* پان پان ببۆوە و بە چیمەنتۆکەوە نووسابوو. چاوێکی ئاوساوی کە بە چەند داوێکی سپییەوە نووسابوو و لەولاوە کەوتبوو، پێدەکەنی. تەراکتۆرێك وەسەرچاوەکە پەڕی. چاوەکە هەروا پێدەکەنی. تەراکتۆرەکان پەیتاپەیتا بەسەر چاوەکەدا دەڕۆیشتن. چاوەکە دیسان هەر ئاوساو و روون و وەك شەیتانۆکەیەکی گەورە لەوێ کەوتبوو. کافر کات و تەرمی ئەنجنراو و لەتوپەتی حەمەعەلیی لە جەواڵێك ئاخنی و گوتی:"ها، ئەوە بۆ تۆیە. چیی لێ دەکەی بکە."

خولخولەی ددانەداری گەورە لەسەرخۆ و بە هاڕەهاڕ و گژەگژ دەسووڕانەوە و تۆپ تۆپ قوماشیان دەچنی و فڕێیان دەدایە دەرەوە. کافر جەواڵەکەی ورد ورد دایە دەم خولخولە ددانەدارەکانەوە. حەمە عەلی سێ جاران بە ژانەوە زریکاندی. کافر لە ئەسپەکەی دابەزی. دەنگی پێ لە سەر پلیکانەکان. پلیکان لەرزی. دیوەخانەکەش لەرزی. دەنگی پێیەکان زۆر بوون. یەك بە یەك وەك ماڵی خۆیان، سەر بەهەمووە ژوورەکاندا دەکا. دڵی تێکەڵ هات و هێڵنجی دا. رووت رووت بۆوە. دەستەکانی لەسەر گەڵ و گونی. لەپڕ دەستی کێشا و بریسکەیەك بە هێلکەی گونیدا هات. ژانێکی تاقەتبڕ لە گیانی گەڕا. دەمانچەکەی لە چاوتروکانێکدا پڕ کرد و رویی کردە لای دەرگاکە. گوێی لەدەنگی حەمەعەلی بوو. دەنگەکە ئەمر و فەرمانی دەردەکرد. تۆپەی دەمانچەکە لەخۆوە بەتاڵ بۆوە. جیکەجیکی چۆلەکە هەموو وڵاتی داگرت و بەهەزاران چۆلەکە لەسەر لك وپۆی دارەکە نیشتنەوە. کافر خۆی خستە زۆنگاوەکەوە و بەهاوارێکەوە گوتی:"نەجاتم مەدە، نەجاتم مەدە."

سوار وەسەری پەڕین. کافر لە بن سمی ئەسپاندا لە قوڕ و لیتەدا لینگەفرتەی بوو. ئەسپە کێوی بە تاو دەهاتن و ناڵە بریقەدارەکانی خۆیان لەسەری کافر دەکوتا و سەریان پان دەکردەوە. کافر لە بن پێی ئەسپێکەوە خۆی دەخستە بن پێی ئەسپێکی دیکە... سوار تێپەڕین و رۆیشتن.

---

* پیادەڕۆ: شۆستە. ئەو رێچکەیەی دەم شەقامەکان کە بۆ رێبواران دەکرێ. لەوانەیە پیادەڕۆ هەر لەبنەڕەتدا کوردی بێت نەك فارسی. واتە (پێ + دەڕۆ) شوێنێك کە بەپێ پێیدا دەڕۆی.

کافر کەوتبوو و تەپوتۆزەکە وردە وردە دەنیشتەوە. رووت و قووت و خوێناوی بوو. دەستی لەسەر گەڵ و گونی، خۆی وێك دێنا و دەینەڕاند.

"لێم بدە، لێم بدە، لێم دە و بیبڕەوە. لەوەتەی هەین، ئاواین. ئەگەر تۆ داوات لە من کردبایە، چما لێم نەدەدای؟ لێم دە."

حەمەعەلی لەبەردەمی راوەستابوو و دڵخۆش و لەخۆبایی پێ دەکەنی. پانتۆڵی سپی لەپێدا و کڵاوی گەڕگەڕیی سپی لەسەر و دەستەوانەی سپی لە دەستدا بوو و چاویلکەیەکی خۆریی لەچاو کردبوو و لە تەنیشت ترۆمبێلە مۆدێل نوێیەکەی راوەستابوو.

"بمکوژە، بمکوژە، ئیتر ریسوا بووین و حەیامان نەما. لەبەر نەقامی و لاساری و کەللەرەقیمان، ئابڕوومان تکا. بمکوژە و رزگارم بکە. تۆ دەمکوژی. دەبێ بمکوژی. چما هەر بۆ ئەوەی نابم بمکوژی؟"

لەوێ، لەبەر تاوە بەتینەکە و لەحاڵێکدا خوێنی، خوێنە کەف کردووەکەی دڵۆپ دڵۆپ دەتکایە سەر عەرزەکە و دەستی لەسەر گەڵ و گونی دانابوو، گرمۆڵە ببوو و بە پاڕانەوە و تکاوە چاوەڕوانیی دەکێشا.

"دەتکوژم کافر. ئەوە هەم هەقی منە و هەمیش هیی تۆ... راست دەکەی، دەبێ بتکوژم، لێگەڕێ با ئەوەیش ئاوا ببڕێتەوە."

بە ئەستۆیەکی کەچ و چاوی وەك چاوی مەڕێکی مردارەوە بوو، دەپاڕایەوە. دەستی هەر بەدەمانچەکەیەوە بوو و نەدەیتوانی رایکێشێ. هێزی تەقەکردنی نەبوو و دەستی دەلەرزین.

"هەڵ مەیێ، تۆزێك راوەستە. لێگەڕێ با پشوویەکم بێتەوە بەر. دەتکوژم. بەڵێن دەدەم. رزگارت دەکەم. ئەتۆ تاوێك راوەستە."

جەندەرمە تفەنگەکانیان بەحاڵەتی ئەستوونی و لەبەردەمیانەوە "نێزەفەنگ" راگرتووە و دێنە پێشێ. نێزەی تەفەنگیان لەبەر تاوەکە بریقەی دێ. کافر گەمارۆ دەدەن. پاڵ بە کافرەوە دەنێن... کەلەپچەی لەدەستی دەدەن و کۆتی لەملی دەکەن. پەتێکی لە ملی دەخەن و سەری پەتەکە دەدەنە دەست نەقیب. نەقیب سواری ئەسپێك بووە. نەقیب لەسەر ئەسپەکەی لە گورگێکی ئامالْ زەرد دەچێ. لەخۆبایی، سەری قیت راگرتووە و سینگی دەرپەڕاندووە. ئەسپەکەی تاو دەدا و کافر، کە هەر دەکەوێ و هەڵدەستێتەوە، بەشوێن خۆیدا دەکێشێ.

تەپوتۆز هەموو دەوروپشتی داگرت. دەنگی پەیتاپەیتای هۆڕن دڕی بە گەرما و تەپوتۆز و رووناکاییەکەدا و دەنگی حەمەعەلی هات:"راوەستە نەقیب... ئامادە."

نەقیب راوەستا:"بفەرموو بەگ. حەمەعەلی بەگ."

حەمەعەلی چووە پێشتر:"بێ بەلاّ بی مامە گیان. بێ بەلاّ بی. زۆر داوای لێبوردن، نەیانناسیوە."

زەردەیەکی لەسەر لێ بوو بەواتای رەزامەندی، گوتی:"ئەو کابرایە بەردەن. لێتان تێك چووە. ئەو زنجیر و کەلەپچەیەی بۆ چییە؟ کێ دەبەن؟"

کافریان بەردا. حەمەعەلی پێی گوت سواری ترۆمبێلەکەی بێ. هەر خۆشی دەرگای ترۆمبێلەکەی بۆ کردەوە. کافر هاتە پێشتر و تفێکی لە رووی حەمەعەلی کرد. حەمەعەلی لەخۆباییانە پێکەنی و سواری ترۆمبێلەکەی بۆوە و کافر رووت و قووت لە تەپوتۆزەکەدا مایەوە و بە راکردن هاتە حەوشە و لەسەر خۆڵ و خاکەکە راکشا. چووە پێشتر و دەستی گرت و گوتی:"کارێکی باشت کرد، زۆر باشت کرد، بەدڵم بووی. مەترسە. دەتکوژم."

کافر ناڵاندی:"ناتوانی بمکوژی. تۆ ناتوانی بمکوژی. تۆ ناتوانی ئەو چاکەیەم لەگەڵ بکەی. گیانمی. خوێنمی. زۆر جوان وەلاّمیت داوە. باشت کرد، ئای دەست خۆش..."

کافر بۆ یەکەم جار پێکەنی. دەستی برد و گەرم و خۆمانە دەستی رێك گوشی. تەزووی خۆشی و خۆشەویستییان لەلەش گەڕا.

پشت لە پەنجەرە دانیشتبوو و چاوەڕێی دەکرد. کامیۆن و ترۆمبێل و تەراکتۆر و خەرمانکوتەکان لە حاڵێکدا لە تەپوتۆزەکەدا نوپم دەبوون و هاڕەهاڕەکەیان لە رەوەزەکانی ئاناوەرزادا دەنگی دەداوە و دوو ئەوەندە زۆرتر دەبوو، بە رێیەکەی خوارەوەدا دەڕۆیشتن. لەسەر لکێك، دوو چۆلەکە یارییان دەکرد و دەیانجیکاند. سێرەی لێ گرت و پەلەپیتکەی ترازاند. باڵ و پەڕی چۆلەکەیەکیان بەهەوادا بڵاو بۆوە و خۆی ورد و پرد بەربۆوە. چۆلەکەکەی تر، تاوێك ون بوو و دوایی بەجیکەجیکگ هاتەوە و بە دەوری هاوڕێ لەتوپەتکراوەکەیدا دەستی کرد بە خولانەوە. زۆر دڵتەزێن بوو. دیسان سێرەی لەو چۆلەکەیەکی دیکەش گرتەوە وا بەسەر پەڕوپۆیەکاندا دەخولایەوە. تەقەی لێ کرد و پەڕوپۆ وەك هەورێك بڵاو بوونەوە. چاوی بە دوای لاشەی دووەمین چۆلەکەدا گەڕان، بەلاّم نەیدۆزییەوە.

زۆر لەمێژ بوو چاوەڕێ بوو و ئاوا پەڕوپۆی چۆلەکەی بەولاّت وەردەکرد. پشیلەکان لە بن پەنجەرەکەی لای دارتووەکە خۆیان مەلاّس دابوو و یەکێکیان لەگەڵ بڵاوبوونەوەی پەڕ و پۆی چۆلەکەکە، گورج قەڵەمبازێکی دا و چی لەچۆلەکەکە مابووە، دەیڕفاند و لە حاڵێکدا ئەوانی دیکە شوێنی کەوتبوون، خێرا لەوێ دوور دەکەوتەوە.

پیرەژنە بەیانی و نیوەڕۆ و شەوێ دەهات و لەسەر سینییەکی مسی ئەو خواردنانەی لێی نابوون، دەیهێنان ولەسەر مێزە تۆزاوی شڕ و شەوێقەکەی دادەنان و دەیگوت:"ئەمڕۆش تا چاو هەتەر دەکا کەس دیار نییە. سوار و پیادەیەك بەولایەدا تێنەپەڕیوە لەو بچێ."

ئەویش دەیگوت:"دێ. بێ ئەملاو ئەولا دێ. ئەمڕۆش نەیە، سبەی دێ."

ڕۆژ بە دوای ڕۆژدا هاتن. جارێکیان گورگەزێیەك هات و رابرد. ئیتر چۆلەکە روو لە دارتووەکەی بەر پەنجەرەکە ناکەنەوە و جیکەجیك ناکەن. باڵندەیەکیش لەسەر دارەکانی بەرامبەر نانیشێتەوە. دەنگی نرکەی ئاقچاساز هەموو شەوێ تێکەڵی هاڕەهاڕی ماتۆڕ و دەنگدانەوەی ئەوەزەکانی ئاناوەرزا دەبێ. بنیادەمەکان بە روخساری ئاشنا و دۆستانە و دڵسۆزانەوە دێن و هەواڵ دێنن و ناهێڵن لەدنیا دابڕێ... قسە دەکەن، قسە دەکەن و دەڕۆن.

دەنگیان خەشی تێدەکەوێ و کۆخین، دەیانخنکێنێ. هەندێ شاد و بەکەیف دێن و بە جۆش و خرۆشەوە دەیگێڕنەوە و بە کەیفخۆشی دەڕۆن. تووڕەیی و هەڵچوون چنگی لەدڵی دادەگرێ. حەزی لێیە بزانێ چ بووە، پێی خۆشە بپرسێ. هەواڵی بۆ بێ. بزانێ چ قەوماوە و چ رووی داوە. بەڵام جەستەی شەکەوت و ماندوو و مێشکە وڕ و کاسەکەی یارمەتیی نادەن و هەر لەنێو خولیا و خەونی سەیر و سەمەرەدا دەتلێتەوە. حەزی لێیە بجووڵێ و بەسەر خۆیدا زاڵ بێ. بچێتە دەرێ و لە زۆنگاوەکە و ئاناوەرزا کە لەوێوە وەنەوشەیی دەچێتەوە، کێوپارەی بەفرگرتوو و چیای دوڵدوڵی رووت و قووت لە سوورایی مس ئاساکەیدا وەنەوشەیی دەنوێنێ، لە دەشتە کاکی و دووکەڵاوی و سووتاوەکە بڕوانێ، بەڵام ناتوانێ. هەموو ئەو شتانە پەیتاپەیتا لەگەڵ خولیا و وڕێنە و تارماییە خەیاڵییەکاندا تێکەڵ دەکا... جارنەجارێ کۆمەڵێك پیاوی رەشپۆشی سەروگوێلاك و جلوبەرگ خۆڵاوی دێن و هەندێ شتی لەسەر کاغەزی سپی پێ دەنووسن و دەیخوێننەوە و ئیمزای دەکەن و دەڕۆن. زۆر شتی قێزەون لە ناخی ئەو بنیادەمانەدا هەست پێ دەکا، تێ دەگا بەڵام گوێی ناداتێ. هەندێ شتی پێ دەڵێ، هەندێ شتی بۆ روون دەکاتەوە، دەستی دەگرێ، دەست بەسەر نێوچاوان و سەروقژیدا دێنێ، دوای ئەوە باوەشی پێدا دەکا و توند دەستی دەگوشێ. دوایی وەك هاتووە، ئاوا دەڕوا... جاری جاران هەموو هەفتانە، یان بە پانزە ڕۆژان جاێك، شەو بایە یان ڕۆژ بەرەبەری بەیانی یان لای ئێوارە بوایە دەهات و لەسەر ئەو کورسییە شڕ و شەوێقە دادەنیشت و کورسییەکە جیڕەجیڕی لێ هەڵدەستا و ئەو هەوڵی دەدا چاوی هەڵێنێ، بەڵام نەیدەتوانی. سەیری دەکرد، لەوانەشە دوژمنانە یان دۆستانە، یان لەوانەیە لەڕووی بەزەیی یان خۆشەویستییەکی بێ سنوور و بێدەرمان، سەیری دەکرد و نوقمی

ترس و دڕدۆنگی بەبێ ئەوەی پشتی تێ بکا، لەسەر هەست و دەمانچە بەدەستەوە و پاشەوپاش دەکشاوە و بەبێ ئەوەی پشتی تێ بکا دەرگاکەی دەکردەوە و دوای پێوەدانی دەرگاکە، گوێی لە کوتە و ترپەی پێی دەبوو کە دوور دەکەوێتەوە.

کە ئەو دەڕۆیشت، بەو کونجکۆڵییەی پڕ لە ترس و دڕدۆنگی بوو، سەرخۆش و کەیفخۆش دەبوو و چەند رۆژان دوای رۆیشتنەکەشی، هاتنەکەی ئەوی وەبیر خۆی دێنایەوە. کە یەکەم جار هاتبوو، بەبێ ئۆقرەیی و پەنجە لەسەر پەلەپیتکە و لەسەرهەست و بەدڵەخورپەوە، چاوەڕێی کردبوو گوێی لەدەنگی تەقە بێ... دوایی تێگەیشتبوو و ترس و دڕدۆنگییەکەی لەدڵی رەواندبۆوە و خۆی دابووە دەست چێژی شادی و خۆشەویستی و هۆگری.

هەموو جارێش هەر دەیگوت:"دێتەوە، بەدڵنیاییەوە دێ."

لەپێشدا بلە ئیبۆ هات و بەدوای ئەودا ئەوانی دی. سەروقەلافەتی زۆریانی لەبیر چوبۆوە. سەروگوێلاکیان لە تاریکایی زیندەخەوێدا، جارێ روون روون دەردەکەوت و جارێ لەچاو ون دەبووەوە. لەبەر دەرگا، ئەسپەکان شەلاڵی ئارەقە و کەفکردوو، سمیان لەعەرزی دەکوتا و هەڵدەستانە سەر پاشووان و کەفەڵیان چرچ و گنجی تێدەکەوت و کونە تفنیان لێك رەویبوونەوە و دەیانحیلاند...

"بیکەیسی، فیشەك و فیشەکدانەکان لە کادێنێ بێننە دەرێ."

ئەوەندەی ەك و دوو خۆیان خستە سەر پشتی ئەسپ و لینگیان دان. پەیتاپەیتا هەرای دەکرد و فەرمانی دەدا:"خێراتر، خێراتر. دەبێ بەر لەوەی رۆژ بێتەوە لەوێ بین. دەبێ نەجاتی بدەین."

سێدارەکەیان لە نێوەڕاستی شاری هەڵ دابوو. قەول بوو بەیانی لە سێدارەی بدەن. ئەسپیان دایە بە قەمچی و تاویان دان. لە ئاوەکەیان دا، ئاوەکە قووڵ بوو، ئەسپ کەوتنە مەلە. ئەوا رای دان و هەتا لای خوارووی بردن. حیلەی ئەسپە خووساوەکان شەوەکەی ئاخنی. بەر لەوەی رۆژ بێتەوە، دەوری گۆڕەپانەکەیان دابوو. کراسێکی سپییان کردبووە بەر کافرەکە. کاغەزێکیان بەملیدا کردبوو. پیاوێکی مێزەر بەسەر لە بن لێوانەوە قسەی دەکرد. ئەسپ سمکۆڵیان دەکرد و دەیانحیلاند. جەندەرمە سەرنێزەیان بەسەر تفەنگانەوە کردبوو. سەری کافرەکە، لە بوومەلێڵی بەیانیدا بەسەر سینگیدا شۆڕ ببۆوە. بردیانە بن سێدارەکە. لەوێ راوەستا. لێوەکانی جوولان. بەڵام کەس دەنگی نەبیست. رێك لەو دەموساتەدا چاویان تێك ئاڵقا. کافرە گەش گەش بۆوە، بووژایەوە. ئاڵقەی پەتەکەیان بەملیدا کرد. کە ویستیان چوارپێچکەکەی بن پێیانی بترازێنن،

تەقە و خرمەی تیربار و بیکەسی هەستا. هەموو شتێك شێوا. خۆی گەیاندە کافر و پەتی سێدارەکەی هەڵبڕی و خستییە تەرکی زینەکەی و دڕی بە حەشیمەتەکە دا و بەرەو کێوپارەکان تێی تەقاند. شارۆچکەیان بە شڵەژاوی بەجێ هێشت. بەرەبەری نیوەڕۆیە گەیشتبوونە ڕەوەزە بەرزەکان. هەتا ئەوێ یەك قسەشیان نەکردبوو. کافریان لە ئەسپ دابەزاند و لەسەر عەرزەکە درێژیان کرد. کافر ناڵاندی:"ئاو، ئاو، چۆڕێك ئاو، تینوومە."

لە کانییەك کە لەوێوە نزیك بوو، بە لالوێچان ئاوی هێنا و بەدەمییەوە کرد. ڕوخسارە زەرد هەڵگەڕاوەکەی کافر وردە وردە گەش دەبۆوە و وەخۆ دەهاتەوە. کە چاوی هەڵێنا، لە پێشدا بڕوای نەکرد. لەخۆی نووسا و چەند جاران بەسەرسووڕمانەوە چاوی ترووکاند. پێی وابوو خەونی دیوە یان خەیاڵ هەڵیگرتووە. یەك بەخۆی هاواری کرد:"منم من. بەهەڵە نەچووی، خۆمم، منم."

کافر زەردەیەکی هاتێ. بە بێهێزییەوە دەستی درێژ کرد و دەستی توند گوشی. دەستی گەرم بوو. بەجارێك لەوێ، لە نێو ڕەوەزەکانەوە کۆمەڵێك پیاوی جلوبەرگ سپی دەرکەوتن. هەموو کڵاوی شاپۆیان لەسەر بوو. لە سێ ترۆمبێل دابەزین و هاتن. حەمەعەلی و ئالاتەمیریش وەپێشیان کەوتبوون. گوتیان:"ئەوە بدە بە ئێمە."

خەنجەری درێژ و زنجیری ئەستوور بە دەستەوە.

"کەس ناتوانێ ئەوەمان لێ بستێنێ. کوشتی، کوشتی، کوشتی."

زنجیرەکانیان ڕاوەشاند. ڕەوەزە شەقاربووەکە داوەری و پۆلە کەودەرییەك فڕین. ئاسمان ڕەش داگەڕا. تیشکەکان لە وردەشووشەی ورد و خاش و نووك تیژ دەچوون و بە خرم و هۆڕ بەسەر ڕەوەزەکاندا هاتنە خوارێ. کافرەیان لە زنجیر کرد و مل و دەست و پێیان بەست و وەك کڵافە بەنێك هەڵیانگرت و لە ترۆمبێلەکەیان هاویشت. بوو بە قریوە:"نابێ، نابێ. کوڕینە، برادەرینە لەکوێن؟"

حەمەعەلی گوتی:"هاوڕێیانت، ئامادەی بەڕێوەبردنی فەرمانتن."

لەوێ، لای ترۆمبێلەکەوە ماهیر قاباقچی ئۆغڵی بەو قەڵافەتە پیس و مردار و فێڵبازەیەوە زاری گەزێك داپیچڕیبوو و پێدەکەنی. ددانەکانی لەسەر یەك داگرت و بەرەو لای ماهیر غاری دا و بەرۆکی گرت و نەڕاندی:"سەگ، سەگی گڵاو، هەی پەڵەی شەرمی سەرشانی مرۆڤایەتی، مایەی سەرشۆڕیی پیاوان، ئەو ئاگرە لە بن سەری تۆ دایە." و چەند تفی لە ڕووی کرد. ئەو هیچ گوێی نەدایێ و گوتی:"دەی یانی چی؟ چەندی کەیفت دێنێ تقم لێ بکە."

دەسرۆکەکەی دەرهێنا و دەموچاوی سڕییەوە. لەخۆ چوو. لەوە پتری وەبیر نەدەهاتەوە. لە تاریکییەکەدا توند قوڕقوڕۆچکەی ماهیری گرت. دەیگوشی. ماهیر پەلەقاژەیەتی و جار جارێ نووزەیەکی دێ و ناتوانێ خۆی لەچنگی راپسکێنێ. کە وەخۆ هاتەوە، جگە لە تۆپە(تایە)ی چیی وەبیر نەدەهاتەوە. کە تاو هەڵات، لەبەر دەرگای پۆلیسخانە بوو. گوتی:" بیدەن بە من، ئەگینا خۆتان دەزانن. تەنەکە دەبە بەنزینەکە ئەوەتا لێرەیە."

نەقیب گوتی:"کافر لەوێ، لەو بیناگەورەیە دایە کە لەهەرمەنییەکان بەجێ ماوە. بڕۆ دەرگاکەی بشکێنە و بیبە."

گوتی:"ئاگری دەدەم، کاولی دەکەم. دەچمە و ئەو کافرە لەوێ دێنمە دەرێ و ناهێڵم لە چنگی ئێوەدا بمێنێتەوە. سوارەکان، برادەرینە، ئێرە وا گەمارۆ بدەن، تەنانەت باڵداریش نەتوانێ بفڕێتە دەرێ."

یەك دەنگ هەرایان کرد:"ناتوانێ بفڕێ."

"لە پێشدا بەنزین بە دادگاکەدا بکن با فایلەکانی کافرە بسووتێ. دوایی بە بنکەی پۆلیسدا و ئەوجار بە دەرگای بەندیخانەدا..."

گوتیان:"بەسەرچاو."

کافر لە پشت میلە ئاسنینەکانەوە سەیری دەکرد. چاویان تێك ئاڵقا. چاوەکانی چزیسکەی خۆشەویستییان لێ بۆوە.

بلێسەی ئاگر هێندەی منارەیەك هەستان. پشتیان لە بلێسەکان کرد و رووی رەشاشەکانیان کردە شارۆچکە. جەندەرمە و بەندی لە نێو بلێسەکانەوە دەردەپەڕینە دەرەوە، بەڵام کافرە هەر دیار نەبوو. کە سەیری کرد، دیتی ئەوە کافر لە نێو بلێسەکاندا و بە میلەئاسنەکانی زیندانەوە بەستراوەتەوە. رەشاشەکان تەقەیان لێ هەستا. جەندەرمە لە شوێنی دیکەوە گەیشتبوون. نەڕاندی:"چاوەڕێ بکە کافر."

خۆی گەیاندە پشت رەشاشەکە و دەستی لەسەر پەلەپیتکە دانا. کافر، لە نێو بلێسەکاندا جارێ دەردەکەوت و جارێ بزر دەبۆوە. رەشاشەکەی دانا و گوتی:"ئێوە لێرە بن برادەرینە، من دەگەڕێمەوە."

خۆی بەنێو بەندیخانەکەدا و بەنێو زمانەی بلێسەکاندا کرد. لەبەر دووکەڵ و ئاگر هیچ کوێی نەدەدی. لە نێو ئەو ئاگرانەدا کە بەسەریدا دەڕژان، هەر لەخۆوە، خۆی بەملاولادا دەکرد.

"کافر، کافر، لەکوێی؟ قسە بکە، وا هاتم."

کافر هیچ دەنگی نەبوو. دەستی بە زنجیر شەتەك درابوون. هەڵیانواسیبوو و بە بزمارێکیاندا کردبوو و خەریك بوو دەبووە کوڵوو. بزمارەکەی هەڵکێشا و لاقەکانی کافری گرت و کێشایە دەرەوە.

"سواربن."

خۆیان هاویشتە سەر پشتی ئەسپان و بەرەو چیا وەنەوشەییەکان تاویان دا. دەمەدەمی تاوهەڵاتیێ گەیشتنە رەوەزە بەرزەکان. دەنگی تەقەی رەشاشەکە لە رەوەزەکاندا دەنگی دەدایەوە. کافرەیان لەسەر عەرزی درێژ کرد و چۆوە پشت رەشاشەکەی. ئاگرباران دەستی پێ کردەوە. زۆری نەبرد، فیشەکیان بڕا. جەندەرمە لە پێنج کامیۆنەوە خۆیان فڕێ دایە خوارێ و دەست و پێی هەمووانیان شەتەك دا و سواری کامیۆنیان کردن. کافر لە کامیۆنەکەدا چاوی هەڵێنا و ئەوی بەژوور سەری خۆیەوە دی. چاوەکانی پڕ بوون لە خۆشەویستی. دەستی بۆلای درێژ کرد و تۆقەیان کرد. سەریان هەڵێنا. حەمەعەلی لەولاترەوە راوەستابوو و ماهیریش لە تەنیشتییەوە. هەردووکیان قاقا پێدەکەنین. ئەو جووتە، ئەو و کافر دەستیان لە دەستی یەکتریدا بوو. حەمەعەلی و ماهیر هاتن و بە تووڕەییەوە دەستیان لێك جیا کردنەوە. کامیۆنەکان لە لە هەوری تۆز و خۆڵدا ون بوون.

پیرەژنە تەقەیەکی لە دەرگا هێنا و دەرگای کردەوە و بە هانکەهانکەوە گوتی:

"لە دوێنێ شەوێوە، لە دوێنێ شەوێوە... لە دوێنێ شەوێوە، لە دوێ شەوێوە کابرایەك بەسواری ئەسپێکی کوێت، بە دەوری کۆشکەکەدا دەسووڕێتەوە. ئەسپەکەی تەڕ تەڕ بووە."

لەخۆشییان بەرەو پەنجەرە رای کرد. ئەژنۆی ئەوەندەیان یارمەتی نەدا بگاتە بەر پەنجەرەکە. سێ جاران ئەژنۆی نووشتانەوە. ئەو سوارەی دیت، کە شەکەت و ماندوو لەسەر ئەسپەکەی کۆم ببۆوە و ئەسپەکەشی خەریك بوو بەچۆکدا دەهات. هەوسار و قەمچی بە دەستێکەوە و دەمانچەکەی بە دەستەکەی دیکەیەوە. ئەسپەکەی لێ دەخوڕی و جار نە جارێکیش سەری هەڵدێنا و سەیری کۆشکەکەی دەکرد. بۆ ئەوەی نەیبینن، لە بەر پەنجەرەکە واوەهات و لە حاڵێکدا دەستی بە دیوارەکەوە نابوو، گەڕاوە سەر جێ و بانەکەی و چاوی لەسەر یەك دانان و گوێی دایە دەنگی ناڵی ئەسپەکە. تاوێك دواتر دەنگی ناڵی ئەسپەکە بڕایەوە. کە دەنگەکە نەما، دڵەخورپە دایگرت. گوێی لە لای پلیکانەکان خەڵخست. دەستەکانیشی لە جووڵە کەوتبوون و فیشەکەکانیان بەتاڵ و پڕ نەدەکردەوە. بەخۆی دەگوت:"بەخێر هاتی بەسواری کوێتە. بەخێرهاتی و خێر و خۆشیت هێنا."

یەکەم هەنگاوی کە لەسەر پلیکانەکان گوێ لێ بوو، دڵی لە سینگیدا وا کەوتە لێدان، چیی نەمابوو لە سینەی بێتە دەرێ. ئەوەی دەهات، پیاوێك بوو بە ئەسپێکی کوێت. زۆر لەمێژبوو چاوەڕێی بوو. هەتا دەرگاکە کرایەوە، دەتگوت سەدەیەکی بەسەردا هات. کە دەرگاکەی کردەوە و وەژوور کەوت، چاوی لێك نا. دەموچاوە درێژەکەی، سەر و ردێنە سپییەکەی، چرچ و لۆچەکانی دەموچاوی پتر شێوابوون. چاوەکانی سۆمایان لێ بڕابوو و بەقووڵدا چوبوون. کووڕ ببۆوە. تۆزاوی و خۆڵاوی و کووڕ. جلوبەرگەکانی لەبەریدا فشوفۆڵ ببوونەوە. بەسپایی هات و لەسەر کورسییە تۆزاوی و شڕ و شەوێقەکە دانیشت. ئەو سینییەی لەسەر تەختە رووت و پێچکەشکاوەکە دانرابوو، پڕ بوو لە خواردنی کەڕووگرتووی ترشاو و وردکەنان. ئەوەندەی مێش لێ نیشتبوو، رەش دەچۆوە و مێرووولە لە خواردنە ترشاوەکە و وردکەنانەکە ئاڵابوون. ژوورەکە لە تۆز و خۆڵدا نوقم ببوو. دیوارەکان زگیان دابوو و سواخەکەیان هەموو بەریدابوو و هەڵوەریبوو. کە بای دەهات، چیی خۆڵ و خاك بوو لە پەنجەرەکانەوە لە ژوورێی دەکرد...

لاقی زەرد زەرد، وەك لاقی مردووان لە بن لێفە چڵکنە شڕەکەوە، کە جێ جێ لۆکەی لێ هاتبووە دەرێ، دەرکەوتبوو. دەموچاوی چرژاو و پڕ چرچ و لۆچ و ردێنی وەك ردێنی مردووان پیس و ئاڵۆز بوو. چاوی لە بن پێڵوە داخراوەکانییەوە دەجووڵان، تاقە شوێنێکی (چاوەکانی)، کە لەوێوە دەتزانی زیندووە.

سوارەی ئەسپە کوێت، چاوی تێ بڕیبوو. بە دڵسۆزی و میهرەبانی و پەشیمانی و لەوانەشە لە رووی خۆشەویستییەوە سەیری دەکرد. کابرا، کە چاوی قووچاندبوون و وەك مردووان کەوتبوو، بەوەی دەزانی و هەستی پێ دەکرد و بەدڵیدا دەهات، هەستێ و دەست بکاتە ئەستۆی میوانەکەی. یەکێکیان بیری لە هەر شتێك کردبایەوە، بە زەینی ئەوی دیکەشدا دەهات. بیر و خەیاڵیان تێك ئاڵابوو و ببووە یەك و هەردووکیان پێکەوە بیریان دەکردەوە و یەك هەستیان هەبوو.

ئاخرییەکەی میوانەکە، دەستی برد و دەستی بە قژ و نێوچاوانیدا هێنا. دەستی هات و لەلای دەستە بێتینەکانی راوەستا و ساتێك دواتر دەستی یەکتریان گرت و توند دەستی یەکتریان گوشی. کابرا خەوتووەکە بۆ یەکەم جار چاوی هەڵێنا. بەو پەڕی ئەوین و خۆشەویستییەوە و زۆر ئەمەگدارانە نیگایان تێك ئاڵقا و گەش بوونەوە و نەرمە بزەیەکیان بۆ یەکتر کرد. کابرای ئەسپە کوێت، هەستایە سەر پێ و بە هەنگاوی خێرا بەرەو دەرگا رۆیشت.

لەبەردەرگاکە راوەستا و گەڕاوە و بزەیەکی دۆستانە و پڕ لە خۆشەویستیی بۆ کرد. ئەوەی لەجێوبانێدا کەوتبوو، لەبن لێوانەوە هەندێ شتی گوتن. دەیەویست چەند قسەیەك بکا، بەڵام ئەوی دی نەیبیست و دەرگاکەی پێوەدا و بەرەو پلیکانەکان وەڕێ کەوت. کابرای بەجێوبان، هەموو تین و توانای خۆی لە گوێچکەکانیدا کۆ کردەوە و گوێی لە ترپەی پێی ئەو هەڵخست. ئاخرییەکەی دەنگی پێیان بڕایەوە و سمکۆڵی ئەسپەکەی بیسترا و ئەسپەکە وردە وردە دوور کەوتەوە. کابرای لەجێوبان کەوتوو، دەمانچەکەی هەڵگرت و بەخێراییەکی سەرسووڕهێنەر دەستی کردەوە بە پڕکردنەوە و بەتاڵکردنەوەی.

# ١٢٨

کێوپارە وەك پەردەی وەنەوشەیی و بزرکاو، نزیك و ناسك دیار بوون. چیای دوڵدوڵێش رووت و قووت و بە لووتکە تیژ و بنەوشەییەکەیەوە ئەوەندە هاتبووە پێشێ، پێت وابوو دەستی بۆ بەری، دەستت وێی دەکەوێ. بەهەموو شتێکییەوە، بە رەوەز و رووەك و ئەشکەوتە زارك تاریك و رەشەکانییەوە، جوان دیار بوو و لە رووناکاییە وەنەوشەییە روونەکەیدا، لە رووناکاییەکەیدا لەگەڵ گێژەڵووکە سپییەکانی چوکووراوا ببووە یەك.

لە دەوروبەری ئاقچاساز، رەوەزەکانی ئاناوەرزا و ئەشکەوتەکانی چیای حەمیتە و کاژێر و دڕووەڵان و کۆخی قامیش و تەنانەت بن هیچ دەوەنێکیش نەمابوو، دەروێش بەگ هەموو رۆژێ سەرێکی پێدا نەکردبێ. جارێ هیوای لەدڵی دەگەڕا و بەکەیف دەبوو و جارێ هیوای دەبڕا و نوقمی تاریکی دەبوو. پووش و پەڵاشی زەرد و وشکەڵاتووی چیای حەمیتە توندتر بۆنیان دەهات. لەگەڵ هەر بۆنێکدا، تۆز و گەردی رەوەزێکی پواو نێو لووتی دەبرژاندەوە.

لە نێوەندی دەشتەکە، لەبەر گەرما زەردەکە، جاری وابوو، دەکرێ بڵێی لە بەیانییەوە تا ئێوارێ رادەوەستا و بیری لەوە دەکردەوە، ئاخۆ ئەو هەتیوە دەبێ چووبێتە کوێ؟ ئەسپەکەی تاو دەدا بەرەو ئەولایەی پێی وابوو چووەتە ئەوێ و لەوانەیە لەوێی بدۆزێتەوە. کە نەیدەدۆزییەوە، ئاگای لەخۆی نەدەما، ئاگری تێبەردەبوو و لە نووکی کەڵەموستی پێیەوە هەتا تۆقی سەری دەیزریکاند و بەزەیی بەخۆی و یوسفدا دەهاتەوە و دەست لە گونان درێژتر لەوێ دوور دەکەوتەوە و ئەسپەکەی بەرەو لایەکی دیکە لینگ دەدا.

هەتاوەکە هەڵیدەچۆقاند. سێبەرە تارەکەی کەوتبووە بەر پێیانی. ئەو ترۆمبێلەی دەهات، هەتا نەگەیشتە بەردەمی، نەیدی. کە ترۆمبێلەکە راوەستا و ماهیر و مزەر لێی دابەزین، ئینجا دەیتی. هیچ چاوەڕێی هاتنیان نەبوو و کە دیتنی لە ترسی ئەوەی نەکا هەواڵێکی ناخۆشیان پێ بێ، مووی لێ بوو بە نەشتەر و تەزوویەکی سارد بە تیغەرەی پشتیدا هات.

بەدڵیدا هات، کە لەوانەیە ئیتر هەموو شتێك بڕابێتەوە. چ بکا؟ ئاخۆ سواری ئەسپەکەی بێ و روو بکاتە دەشتێ؟

روخساری هەڵبزڕکاو و نێوچاوانی گرژ و تاڵی ماهیر و مزەفەر، بەندی جەرگ و دڵی دەروێش بەگی پساند و ئاگری نیگەرانی لە ناخیدا کلّپەی دەسەند. بەبێ ئەوەی بەدەست خۆی بێ، چەند هەنگاوێك بەپیریانەوە چوو و چاوی لە چاویان بڕی و دوای تاوێك راوەستان، بە دەنگێکی لەرزۆك پرسیی:"شتێك قەوماوە؟"

ماهیر شاگەشکە بوو. چیی نەمابوو بپرسێ، ئاخۆ گرتیان؟ بەڵام لە نووکی زمانی گێڕایەوە.

مزەفەر گوتی:"شتێکی وا نییە بابە. ئیتر ئەو شارە بۆ ژیان نابێ."

ماهیر بەگیش بە هەندێ چاوقایمییەوە دووپاتەی کردەوە:"شتێکی وا نییە بەگ..."

دەروێش بەگ بەبێ ئەوەی تۆقەیان لەگەڵ بکا، چاوەڕێی قسەکردنیان بوو. تۆزێك دڵی فێنك بۆوە و ئۆخژنێکی هاتێ. وەکی دەڵێن هیچ نییە، دیارە یوسفیان نەگرتووە. مزەفەر بە دەنگێکی لەرزۆکەوە، کە پڕ بوو لە داماوی، گوتی:"ئیتر گەیشتووەتە ئێسقانم بابە. خۆ ناتوانم بە ئاسوودەیی بچمە کووچە و بازاڕێ. منداڵۆچکە و دووکاندار لە دواوە لێم دەقریوێنن و هەرام دەکەن، کوڕی پیاوکوژەکە..."

ماهیر خۆی خستە پێشێ و دەستی گرت و گوتی:"فریامان بکەوە بەگ، دەستمان بەداوێنت..."

دەروێش بەگ وەك ئەوەی دەستی لە ئاگر، یان لە پیساییەك رۆچووبێ، خێرا کشاندەوە و چاوی زەق بوونەوە.

"دەستمان بە داوێنت بەگ..."

ماهیر هەستی کرد بەگ لە بنەوە گۆڕانێکی بەسەردا هاتووە. دەستی کردە زمانلووسی و پێی وابوو خۆی یوسفی دۆزیوەتەوە و شاردوویەتییەوە.

"نەکا بێیە بازاڕێ بەگ. هاتووین هەر ئەوەت پێ بڵێین."

دەستبەجێ هەوڵی دا بیر و خەیاڵی بخاتەوە سەر یوسف. بەندی جەرگ و دڵی دەپسا و هەموو گیانی وەلەرزین دەکەوت. باسکی بەملاولایدا شۆڕ ببوونەوە و ئەوەندە بێهێز و بێجوولە راوەستابوو، دەتگوت لەوێ چەقێنراوە. پەیتاپەیتاش بەدڵیدا دەهات، کە تۆ ئیتر مردی. ئەتۆ تێداچووی و بەگومدا ریای. بەڵام تۆزێك دان بەخۆتا بگرە با بزانی چیت بەسەر دێ. جا

دەیگوت:"نەکا لەو ڕۆژانەدا بێیە شارۆچکە بەگ. نەکەی خۆ لەو ئاگرە نەدەی. لە حەوت تا حەفتا ساڵان هەر هەمووی ددانیان لێ تیژ کردووینەوە هەڵماندڕن. ئیتر من ناتوانم بێمە بازاڕێ و دەرکەوم. لێم دەقریوێنن و هەرام لێ دەکەن، هۆی پیاوکوژە خوێنمژەکان، پیاوکوژە خوێنمژەکان."

جا بە چێژێکی زیاترەوە لەسەر "پیاوکوژە خوێنمژەکان" هەڵوێستەی دەکرد:"برادەری پیاوکوژە خوێنمژەکە، برادەری پیاوکوژە خوێنمژەکە.."

مزەفەر لە حاڵێکدا ڕەنگی بە ڕوویەوە نەمابوو و چاوەکانی زوو زوو دەترووکاند، بە دەنگێکی لەرزۆکەوە دەستی پێ کرد:"نەکا بێیە شارۆچکە بابە. پێم وایە چیی وای نەماوە هەمووان بێنە بازاڕێ و لەتوپەتم بکەن."

ماهیریش ساز و بەکەیف پاڕایەوە:"نەیەی بەگ. نەیەی. دوژمنەکانمان پیلانی زۆر مەترسیدار و زۆریش وردیان بۆ داڕشتووین. خوا بزانێ چەندەیان پارە لەسەر یوسف خەرج کردووە، تا شتەکەیان گەیاندووەتە ئێرە. هەموو خەڵکی شارۆچکە هەر لە حەوت ساڵانەوە تا حەفتا ساڵان دەڵێی هار بوون. بێت و بکەوینە چنگیان، ونجڕونجڕمان دەکەن."

"ئەی خۆزگە دیتبات، بابە."

"خەمی یوسفیشت هەر نەبێ بەگ. من لەگەڵ قاچاخچییەکانی "ئەنتەب" کە برادەری خۆمانن، قسەم کردووە، ڕێك کەوتووین یوسف بەرنە سووریا."

مزەفەر:"ماهیر بەگ خۆی بە ئاو و ئاگرێدا کرد و ئاخرییەکەی ڕێگەچارەیەکی زۆر باشی بۆ چارەسەری ئەو کێشەیەمان دۆزییەوە. یاخوا هەر ڕاوەستاو بێ و خودا لێمانی نەستێنێ. جارێ تۆ جێ و مەکانی یوسفم پێ بڵێ، با بیدەینە دەست قاچاخچییەکان. هەر یوسف بڕوا، ئیتر هەموو ئەو نەخش و ڕێوشوێنانەی دوژمنەکانمان بۆیان کێشاوین، دەبنەوە بڵقی سەر ئاو."

ماهیر بەگ بە پۆزێکەوە، دەستی لە کەلەکەی نا و قسەکەی لێ وەرگرتەوە:"کە دیتم تۆ مەسەلەی ئەو یوسفە نابڕێنیتەوە و ئەو گێچەڵەمان لەکۆڵ ناکەیتەوە، ئەو ڕێگەچارەیەم دۆزییەوە. دیارە لێت تێدەگەم. پیاو چۆن دەتوانێ خوێنی منداڵێك بڕێژێ، کە وەك عەولادی خۆی گەورەی کردووە؟ بنیادەم تەنانەت دڵی نایە پشیلەیەکیش کە لە ماڵەکەی خۆی گەورە بووە، یان باڵندەیەکی نێو قەفەز یان مێروولەیەکی لە باخچەکەیدا لانەی کردووە، بکوژێ."

لەوکاتەدا سەیری مزەفەری کرد و لەسەری ڕۆیشت:"لە کوێ ئەوە ماوە، کابرا هەتیوێك بکوژێت، کە لە منداڵەکانی خۆی پتر خۆشی دەوێ. زانیمان ئەوە بەتۆ ناکرێ، ئێمەش

ڕێگەچارەیەکمان دۆزییەوە و چووین بۆ دۆزینەوەی قاچاخچییەکان. ئەوان خەڵکێکی جێ متمانەن. نە خۆیان دەگیرێن و نە موویەکیش لەسەر یوسف کەم دەبێتەوە. ئەوەشت با پێ بڵێم..."

دەروێش بەگ جار بە جار روخساری گەشتر دەبۆوە و زەردەیەك، شادییەکی شاکرا لە روخساریدا کاڵ دەبۆوە. ئەو حاڵەتەی ئەو غیرەتی نابووە بەر ماهیر، کە دیسان خۆی خستەوە سەر دەستی. بەڵام دەروێش بەگ دیسان تەزووەکەی پێدا هاتەوە و دەستی کشاندەوە. ماهیر نەڕاندی:"ئەو هەتیوە نابێ لێرە بمێنێتەوە. نابێ بمێنێتەوە بەگ. نابێ لێرە بمێنێتەوە. مانەوەی ئەو هەتیوە لێرە وەك شمشێرەکەی داموکلێس وایە بەژوور سەرمانەوە... هەتا هەین... مەحاڵە بەگ. لەوانەیە تۆ خۆ رابگری، ئەتۆ دەروێش بەگ، نەجیمزادە و رەسەنی..."

دەروێش سۆسەی ئەوەی کرد، کە گاڵتەپێکردن و نەفرەتێکی قوڵ لە قسەکردن و لەبزی ئەودا هەیە.

"ئەتۆ خووت بەو ژیانەوە گرتووە، بەڵام من ناتوانم. ئەوەم پێ ناکرێ. لەو کاتەوە مەسەلەی ئەو هەتیوە هاتووەتە پێشێ، لە ترسان خەو نەچووەتە چاومەوە. یەکسەر بیر لەتۆ دەکەمەوە، کە نەکا یوسف گرن. نەکا وا لە یوسف بکەن، دانی پێجا بنێ. نەکا بەگەکەمان لە سێدارە بدەن... کورتی ببڕینەوە، ئەو هەیتوە نابێ لێرە بمێنێتەوە... مەسەلەکە زۆر قووڵ بووەتەوە. هەموو ئەنکەرە و حوکمەت هەر بیر لەو مەسەلەیە دەکەنەوە."

مزەفەریش بەبێ ئەوەی بەدەست خۆی بێ نەڕاندی:"کردوویانەتە مەسەلەیەکی نیشتمانی."

چیی نەمابوو دەست بکا بە گریان. ماهیر گوتی:"خۆ ناشکرێ بیکوژی. شتی وا ناکرێ. تەرمەکەی دەدۆزنەوە. جا ئەو کات شتەکە ئاڵۆزتر و خراپتریش دەبێ. وەزارەتی ناوخۆ لە ئەنکەرەوە پانزە پۆلیسی نهێنیی ناردووە. ئەو پۆلیسانە لە ئەڵمانێ راهێنراون و بەوەجترین و ئازاترین پۆلیسی نهێنیی دنیان. خۆشیان گۆیا گوتوویانە، دڵنیا بن، مردوو یان زیندووەکەی دەدۆزینەوە."

"تا کار لە کارێ نەترازاوە، ئەو کوڕە، یوسف رادەستی ئێمە بکە. ئێستا کە ئەم هەلە هەڵکەوتووە... لەناومان مەبە..."

ماهیر هەر دوو دەستی لەبەر پشتوێنی نا. چاوی دەروێش بەگ لە گلێنەیدا زوو زوو دەترووکان و رەنگی بە رووەوە نەدەما.

"ئاقچاساز له ماوەی چەند حەفتەیەكدا هەڵدەچۆڕێنن. لێدانی زنه و كاناڵی بەتاڵكردنەوەكەی خەریكه تەواو دەبێ و هەر لەم حەفتەیەدا ئاوی پێدا دەڕوات. كارەكان بەجوانی رادەپەڕن."

مزفەریش لێی زیاد كرد:"كارەكان به جوانی رادەپەڕن. ئەگەر ئەم كارەش یەكلایی بكەینەوە... ئیتر نه له ئەدەنه و نه له شارۆچكه ناتوانم دەركەوم و خۆم پێشانی خەڵك بدەم. ئەمشەو یوسف بدە دەست ئێمه با بەڕێی بكەین بڕوا. بەو جۆره لەكۆڵیشمان دەبێتەوە و ئەویش نەجاتی دەبێ."

دەروێش بەگ هەر رەنگی دێنا و دەبرد، جاری پێدەكەنی و جاری له تووڕەییان خۆی وێك دێنا و دەمێكیش سڵۆك دەبوو. له هەموو حاڵەتێكیشدا هەر بێدەنگ بوو.

ماهیربەگ نەڕاندی:"با رزگار بین. پێمان بڵێ له كوێیه بەگ، هەتا ئەوان، ئەوانەی له ئەنكەرەوە نێردراون، ئەوانەی له ڤیەننا راهێنراون و من دەزانم چۆن وەك سەگ بۆن هەڵدەگرن و بۆنی پیاوكوژ له زۆر دوورەوە هەڵدێنن، نەهاتوون... دەخیله بەگ..."

دەروێش بەگ هەنگاوێك لێیان چووه پێشێ. دەمی سەیری دەستی ماهیر بەگی دەكرد و دەمێك چاوی. وەك مێش لەخۆی دەربكا، دەستی راوەشاند و گوتی:"یوسفێك له گۆڕێ نییه. ئەو كەسه هەر قەت نەبووه. ئێوه خەمی منتان نەبێ. لەبەر پیاوكوژێكی كه هەر نییه، ناتوانن من له سێداره بدەن. ئێوه خەریكی كاروباری خۆتان بن و كارتان بەسەر كاری منەوە نەبێ. زۆر سوپاستان دەكەم ئاوا مشووری من دەخۆن و له خەمم دان."

گەڕاوه و پشتی تێكردن و بەرەو ئەسپەكەی چوو و لێی سواربوو و رۆیشت. ئەوانیش سەرگەردان لەوێ مانەوە. ماهیر كه رەنگی وەك پەڕی كاغەز سپی هەڵگەڕابوو، دەسته لەرزۆكەكانی لەسەر شانی مزەفەر دانا و گوتی:"باشه كاك مزەفەر، دەكرێ ئەو بنیادەمه هەر نەبووبێ؟ خۆ زۆر باشتره كەسی وا لەگۆڕێ نەبێ..."

"چۆن دەبێ نەبێ؟ ئەگەر من بوونم نەبێ، ئەویش نییه. ئێمه هەر له منداڵییەوە پێكەوە گەوره بووین. یانی من و جەیحوون و نوورخان، ئەو هەمووه ئێرەییمان به یوسف دەبرد، چونكه پێمان وابوو بابمان ئەوی لەئێمه خۆشتر دەوێ."

"لێت تێناگەم، یانی چۆن دەبێ..."

"كاكه گیان، ئەو متمانەی به ئێمه نییه. پێی وایه فێڵ و كەڵەكێكمان لەبن سەری دایه و داوێكمان بۆ ناوەتەوە."

ماهیر لە داخان ددانی چیڕ کردنەوە و بەتوورەییەوە گوتی:"گووی خۆیەتی با بیشێلێ."

ئیتر پێی لەعەرزی کوتا. لاقی لە خۆڵە نەرمەکە رۆچوو و لەسەر قسەکەی رۆیی:"کابرایەکی سەیرە. تەنانەت متمانە بە کوڕەکەی خۆی و بە نزیکترین هاوڕێی خۆشی ناکا. ئەو کابرایە هەموو گیانی بووەتە گومان... تەنانەت بەمنیش، بە من، من کە ئەو هەمووە چاکەیەم بۆی هەبووە... ئەی لەو کابرایە، بەخوای بنیادەم سەیرن..."

سواری ترۆمبێلەکە بوونەوە و ترۆمبێل کەوتە رێ. بای شەماڵ هەڵی کرد و تەپوتۆزی هەستاند.

دەروێش بەگ ئەمرۆش بەدەستی بەتاڵ گەڕایەوە. کە ئەوانی بەجێ هێشت، بە شوێن یوسفدا سەری بە شەش جێی دیکەشدا کرد. هەرجێییەکی دەچوو، ئەوەندە هیوادار بوو، وەك خۆی یوسفی لەوێ دانابێ، بەڵام کە نەیدەدۆزییەوە، بە خەفەت و پەژارە و بێهیواییەوە دەگەڕایەوە و دوایی بە دڵێکی پڕ لەهیوای تازەوە، رووی دەکردە شوێنێکی دیکە.

شەکەت و ماندوو، بەوهیوایەی لە ماڵەوە دەیدۆزێتەوە، گەڕاوە کۆشك و هەر لە ئەسپەکەی دابەزی، هەستی کرد کەس نەهاتووەتەوە ماڵێ. بە بێ وازی و بەلارەلار لە پلیکانەکان وەسەر کەوت. نە ژنەکەی دیت کە بەپیرییەوە هاتبوو نە پیاوەکان. چۆوە ژوورەکەی و کەوت. پەرێشان و دڵشکاو و وڕ و کاس ببوو و سەری لێ شێوابوو. هەتا سۆللۆپیرە لە دەرگای نەدا، هەر ئاوا بوو. سۆللۆپیرە مۆن و گرژ بوو. حاڵەتی روخساری ئەو کابرا دنیادیتەیە بەگی ترساند. بە هەژاوییەوە پرسیی:"چ بووە، چ قەوماوە؟"

"بەڵێ، یوسفم دیت."

"لەکوێ؟"

"لە نێوەڕاستی شارۆچکە. لە بن چنارەکە دانیشتبوو و نێرگەلەی دەکێشا. کە منی دی، راچڵەکی و بە گومانەوە سەیری دەوروبەری خۆی کرد. وەك ئاژەڵێکی زامار سەیری منی دەکرد. بانگم کرد. حەپەسا و دوای ئەوەی چەند هەنگاوێك بەرەو لام هات، لەپڕ گەڕایەوە و دەرپەڕی. منیش کەوتمە شوێنی. بەڵام نەمتوانی تۆزی بشکێنم. وەك ئەسپ غاری دەدا. خۆی بە کووچە و کۆڵاناندا کرد و لێم ون بوو. ئەوە سێ رۆژە، هیچ کون و کاژێرێکی ئەو شارە نەماوە سەری پێدا نەکەم. بەڵام هیچ ئاسەوارێکم لێی نەدیتەوە. دەتگوت بووەتە دڵۆپە ئاوێك و بەعەرزیدا رۆچووە یان بووەتە دووکەڵ و چووەتە ئاسمان. کورتی ببڕینەوە، وەك جنۆکە غەیب بووە."

بەگ دەستی گرت و گوتی:"دانیشە. دانیشە بزانم سۆللو. ئەگەر راستیت دەوێ، دەترسم ئەو هەتیوە لە داو بکەوێ و تووشی گێچەڵمان بکا."

لە تەنیشت یەکتری لە دیوەخانێ دانیشتن و رێ و شوێنیان کێشا بۆ ئەوەی چۆن یوسف بدۆزنەوە. سۆللو گوتی:"ئەو لە شارۆچکەیە. لە شارۆچەکەیە. بەڵام دیار نییە لە کوێیە. من دەڵێم با چەند کەسێکی گورج و گۆڵ کە بتوانن بیگرن، بنێرینە شارۆچکە."

"یانی لە شارۆچکەیە. بەڵام لەکوێ خۆی دەشارێتەوە؟ لە کام کون و کاژێر؟ لە ماڵی کێ؟"

سۆللو:"لە شارۆچکەیە. خوێن گرتوویەتی. بشیکوژی، لەوێ دوور ناکەوێتەوە. ئەوانەی خوێن دەیانگرێ، دەڕۆن، دەگەڕێن، دەگەڕێن و ئاخرییەکەی هەر دێنەوە ئەو شوێنەی قەتڵەکەیان لێ کردووە. تەزووی پیاوکوشتنەکە وەسوەسەیان دەکات و دەچنەوە ئەو شوێنەی پیاویان لێ کوشتووە و لەوێ دەگەڕێن و دەسووڕێنەوە..."

"کەوابوو تا زوو دەبێ دەست بەکار بین سۆللوو. نابێ هەل و دەرفەتەکە لەکیس خۆمان بدەین."

"بەڵێ. تا زووە دەبێ دەست بەکار بین. ئەگەرچی خۆیان لێیان سوورە لەوێ دەگیرێن و دەکوژرێنەوە، دیسان هەر لەوێ دوور ناکەونەوە. جارێکیان، لەوانەشە لەبیرت مابێ بەگ، ئەو کات تۆ گەنج بووی. باسی ئەو سەردەمانە دەکەم کە من کوڕەکەی قۆش ئۆغلێم کوشتبوو. لە بن دارچنارێك کوڕەم دابووە بەر فیشەك. چنارەکە لەسەر چوارڕێیانێك بوو. شوێنێك، کە هەموو جادەکان لەوێ یەکیان دەگرتەوە. رام دەکرد، دەڕۆیشتم، دەنوستم، هەڵدەستام، لە پڕ دەمدی، ئەوە هاتوومەتەوە ژوور سەری مردووەکە لە نێو دەوەنەکاندا. وەك دوێنێ بێ، هەموویم لەبیرە. لەبەرچاومە. تەرمەکەی بای کرد، کرم تێی دا، مێرووله و باڵندە خواردیان و بەو حاڵەشەوە نەمتوانی لێی دوور بکەومەوە. رام دەکرد و دەڕۆیشتم و خۆم دەکوشت تا لەوێ دوور دەکەوتمەوە و دیسان هەر دەگەڕامەوە لای. رۆژێکیان کە هەستام، دیتم ئەوە مەستان بەسەرمدا نوشتاوەتەوە. هەر چاوم هەڵێنا، گوتی، سۆللو ئەوە چییە؟ تەرمە ئاوساوەکەی نیشان دام. منیش سەیریم کرد. گوتی، چما شێت بووی؟ من سەرم سووڕ ما. پرسیی، ئەوە چەند رۆژە؟ گوتم، چووزانم. شەقەی لەبن گوێم هەستاند. زللەیەکی دیکە و یەکی تریش. چەندی بۆی راوەستام لێی دام. ئاخرییەکەی وەخۆ هاتمەوە، دەنا وەك یوسفم لێ دەهات. دواتر

زانیم کە یەك حەفتە ڕێك لە دەوروبەری تەرمەکە هاتووم و چووم. حەفتەیەکی تەواو ئەقڵم نەیبڕیبوو کە شتێك بخۆم. وەبیرم نایەتەوە تەنانەت ئاویشم خواردبێتەوە."

تاو ئاوادەبوو و تاریکی باڵی بەسەر وڵاتدا دەکێشا. لەوکاتەدا سەروسەکتی جەمشیدە زەلەی پارێزەر لەسەر پلیکانەکان دەرکەوت. هانکەهانکی بوو و دەماری لاملی وەك کاریتەیان لێ هاتبوو. دەروێش و سوللو خەریکی نانخواردنێ بوون. خولقیان کرد. جەمشید پارێزەر، دەستێکی بەسمێڵە درێژەکەیدا هێنا و دەستی بەقسەکرد:"دیتم، دیتم، بەڵام لە چنگم رای کرد. ئەوەندە بەدوایدا رام کرد، لە پەل و پێ کەوتم. گەرما کوشتمی و بۆ ئەوەی تۆزێ فێنکم بێتەوە، لە "نارلی بووت" خۆم رووت کردەوە و خۆم بە ئاوێدا دا. تۆزێك لەولاترەوە گوێم لە شڵپەشڵپێك بوو. کە سەیرم کرد، دیتم یوسفە. هەتا بەرپشتوێنی چووبووە نێو ئاوەکە. دەتگوت وەنەوز دەدا. ئەگەر کارمان پێی نەبێ، سەد ساڵی دیکەش هەر بەوجۆرە دەمێنێتەوە. کە جوان سەیرم کرد، دیتم، هەموو گیانی بریندارە. دوایی دەستی کرد بە مەلەکردن. خۆی هەڵداویشت و خۆی بە ئاوەکەدا دەداوە. بانگم کرد. ئاوڕی داوە و منی دیت. دەستی بە پێش خۆیەوە گرت و هاتە لام. وڕ و کاس بوو و هیچی نەدەگوت. پێم گوت، رۆڵە، یوسف گیان، ئەوە بۆ وات لێ هاتووە. دەتگوت هەر گوێشی لێ نییە. لە ئاوەکە هاتە دەرێ و ئەوەندەی چاوترووکانێك، جلوبەرگەکانی لەبەر کرد. سەیرم کرد ئەوە زەق زەق چاوم لێ دەکا. دەتگوت دەیەوێ پرسیارێکم لێ بکا. گوتم، بلێ کوڕم، بلێ بزانم چیت دەوێ یوسفەکەم. چاوە گەورەکانی تێ بڕیم. چاوی هەر دەهات و زەقتر دەبوو. وای لێ هات کە من بۆ ساتێك هەر چاویم دی. ئەوەندەم زانی دەرپەڕی و لە نێو دەوەنەکاندا بزر بوو. لە ئاوەکە هاتمە دەرێ و جلوبەرگم لەبەر کردەوە و ئەوە سێ رۆژە بە شوێنییەوەم. بووەتە جن و خێو و زەوی زاری داپچڕیوە و هەڵیلووشیوە. کە هیوام بە دۆزینەوەی نەما، هاتمە ئێرە. من چووزانم رادەکا. تا وەخۆم هاتمەوە، کالەم دڕا و چیم پێ نەبڕا."

هەم هاتەران پاتەران قسەی دەکرد و هەم بە وردییش باسی یوسفی دەگێڕاوە.

شەوگار شەق ببوو کە هیدایەت هاتەوە و بەهەژاوی دەستی پێ کرد:"دیتم. دوێنێ پێنج جاری ڕێك لە دەمۆز تەپە و مێشەلانەکە دیتم. لە کەڕەی بەیانییەوە تا تەنگەی نوێژی شێوانێ بەشوێنیدا رام کرد. یازدە جار تفەنگم پێوە نا. بەڵام نەمدەویست لێی دەم. ئەگەر ترسی ئەوەم نەبوایە کە نەکا وێی بکەوێ، دەمگرت. جلوبەرگەکەی شڕ شڕ بووە.

دیتم، بەڵام خۆزگە مردبام و نەمدیتبا. ئاخرین جار تەنگەی نوێژی شێوان بوو دیتم. لەسەر سینگ راکشابوو و لە کانییەکە ئاوی دەخواردەوە. گوتم، با بەسپایی لێی نزیك ببمەوە. بەسەری پەنجە لێی چوومە پێشێ. لە نەکاو هەستا. هەر یەك دوو گۆچان لێمەوە دوور بوو. لەپڕ هەستا و دوای ئەوەی بە ترسەوە سەیری دەورووپشتی کرد و منی دیت، لە هەڵدێرەکەوە خۆی هەڵداشت و بەرەو شارۆچکە تێی تەقاند. هەرام کرد. گوتم راوەستە، راوەستە یوسف. بەڵام سەت هاوار بە پووشێك. هەم هەرام دەکرد و هەمیش تفەنگم پێوە دەنا. ئەو لە پێشەوە و من بەدوایدا بە غاردان گەیشتینەوە شار و لێم ون بوو."

بەگ بێدەنگ و کپ، بیری دەکردەوە.

ئەوجار ئاپتۆ هات. ئەویش دیتبووی. دۆرانەپیرەش دیتبووی. لەسەر دار زەیتوونێکی قەراغ شار. عەلییش لە بەیانییەوە تا ئێوارێ، هەموو کووچە و کۆڵانی شارۆچکەکەی پێ کردبوو و بۆی نەگیرابوو.

ئاپتۆ دەیگوت:"کوڕە هەزار هێندەی وەلی شەماڵ خێراترە. ئەسپی عەرەبیی چی، جیپیش نایگاتێ. وەك بای شەماڵ دەفڕێ. دەبێتە جنۆکە و غەیب دەبێ.

"کەس بنیادەمی رەوەك و سرکی پێ ناگیرێ."

"لە باڵندەش دەسڵەمێتەوە."

"جەندەرمەش ناتوانن بیگرن."

"هیچ لە یوسف ناچێ..."

"بووەتە بنیادەمێکی دی."

"دەڵێی حەیوانێکی کێوییە و بریندار و گڕوێ بووە و تووکی پێوە نەماوە." دەروێش بەگ بەتووڕەییەوە نەڕاندی:"بێدەنگ بن. بیبڕنەوە. مندالۆچکەیەکیان پێ نەگیراوە خەریکن..."

هەموو قڕوقپ بوون. خۆیان خڕ کردەوە و دەستیان بە نیشانەی رێز و حورمەت لەسەر ئەژنۆیان دانا و چاویان لە پێش خۆیانەوە بڕی. دەروێش بەگ لەجێی خۆی هەستا، بە دیوەخانەکەدا کەوتە پیاسەکردن. خەریك بوو تاو هەڵدەهات، کە هات و لەبەرامبەریان راوەستا:"ئامادە بن. دەبێ بچینە شارۆچکە. هەر هەموومان. دیارە، پێکەوە نا. یەك، یەك. دەبێ ئەمڕۆ بیگرین. ئەگەر کەس نەتوانێ لە دەرەوەی شارۆچکە بیگرێ..."

تاویێ راوەستا، لە بیر رۆچوو. چاوی سووراند و نەیتوانی بڵێ، بیئەنگێون. گوتی:"دەگیرێ. ئێستا ئەوەندەی غار داوە، لە پەل و پۆ کەوتووە و تینی تێدا نەماوە. گەنجەکانیش راسپێرن، ژنەکانیش... لەوانەشە بێتەوە ئاوایی.."

دەستی لەگیرفانی نا و چەپکە دراوێکی دەرهێنا و بەسەریاندا دابەشی کرد. پیاوەکان هەستان و ماندوو و شەکەت و خەواڵوو لە پلیکانەکان چوونە خوارێ.

دەروێش بەگ دوای هەموویان لە ژوورەکەی هاتە دەرێ و سواری ئەسپەکەی بوو. ئەسپەکەی بەپێی عادەتی خۆی دەرپەڕی و کەوتە غار. خۆر بەرز ببۆوە و هەوا گەرمی کردبوو، کە گەیشتە سەر پردەکەی شارۆچکە. لەوێ لە قەراغ پردەکە راوەستا. مێش و مەگەز ئۆقرەیان لە ئەسپەکەی هەڵگرتبوو. دەروێش بەگ نەیدەتوانی ساغ بێتەوە و لە پردەکە بپەڕێتەوە. گەڕاوە. کە گەیشتە بن سپی چنارەکان، وەخۆ هاتەوە. دیسان گەڕاوە و گەیشتەوە کن پردەکە. ئاخرییەکەی و لەوانەشە کونجکۆڵیەکەی، لەوانەشە هیوایەك لەدڵی گەڕابێ یان لەوانەیە ئازایەتییەکەی زاڵ بووبێ، لە پردەکە پەڕییەوە و لە لای باشوورەوە چووە نێو شارۆچکە. هەرکاتێکی بەوێدا تێدەپەڕی، ئاسنگەر لە دووکانەکانیان دەهاتنە دەرێ و سڵاویان لێ دەکرد. هات. کە گەیشتە بەردەم بازاڕی ئاسنگەرەکان، جڵەوی ئەسپەکەی کێشا و شلی کردەوە. هەندێ لە ئاسنگەرە ناسیارەکان لە دووکانەکانیان هاتبوونە دەرێ و وایان دەڕوانی، وەك هەر نەیبینن. چاویان هیچی تێدا نەدەخوێنرایەوە. وەستا وەسمان، ئەو دۆستە لەمێژینەیەشی لە نێویاندا بوو. ئەو بنیادەمەی کە زۆریشی خۆش دەویست... سەری ئەسپەکەی بەرەو ئاسنگەرەکان وەرسووڕاندەوە و هات و هەر دەهەنگاوێك لە نزیکیانەوە راوەستا. ئەوان دیسانیش وەك نەیبینن، هەر دەتگوت سەیریشی ناکەن، وەك ئەوەی سوارێکی نەناسراو بێ، ساردوسڕ سەیریان دەکرد. دەروێش بەگ، وای سەیر دەکردن، کە دەتگوت داوای یارمەتییان لێ دەکا و دەروێش خۆی وای هەست دەکرد، ئەو جۆرە روانینە، ریاییکەرانەیە. لەپڕ دەتگوت لەگەڵ وەستا وەسمان چاویان تێك ئاڵقا. وەستا خێرا رووی وەرگێڕا، پشتی تێ کرد و چۆوە نێو دووکانەکەی کە بە گوڵی نیلۆفەر رازاندبوویەوە. ئاسنگەرەکانی دیکەش روویان لێ وەرگێڕا و پتشیان تێ کرد و بەپەلە گەڕانەوە دووکانەکانیان. دەروێش بەگ تاوێك لەوێ و بەسەر ئەسپەکەیەوە حەپەسا. چاوی لە گلێنەیدا ئۆقرەیان نەبوو و لە نێو گوڵەکێوییەکاندا و لەسەر کۆگا خۆڵەمێش و زبڵ و زاڵەکە و لە نێو باڵ و هەڵفڕینی

مێشەنگوین و پەپوولەکاندا کە بەسەر گژوگیاکاندا دەفڕین، لە نێو کۆگای ئاسنەواڵەکاندا، بەشوێن شتێکدا گەڕان.

لەپڕ لە بازاڕی ئاسنگەرەکاندا بوو بەقیامەتێك هەر مەپرسە. دەنگی گرمە و تەقوکوتی چەکوچ و کوتك لەسەر سندان دەستی پێ کردەوە و هەموو شارۆچکەکەی داگرت. لە هەموو دووکانەکانەوە گرمە و تەقوکوتی چەکوچ و کوتکەکان بە تووڕەییەوە هەڵدەستا. دەنگی کوتك هەر دەهات و بەرزتر دەبۆوە و پتر دەنگی دەدایەوە. دەروێش بەگ تاوێك لەنێو دەنگی سەرسووڕهێنەر و گوێ کەڕکەری کوتکەکاندا کە لە هەر چوار لاوە دەوریان دابوو، نەیدەزانی چ بکا و وەك ئەوەی چاوی بەمۆڵەق وەستابن، سەیرێکی ئەملاولای خۆی کرد. ئەسپەکەی وەك بڵێی لەو دەنگەدەنگە سڵەمیبێتەوە، دەرپەڕی و بەپێی عادەتی خۆی رووی کردە بازاڕ. دەروێش سەرلێشێواو و شڵەژاو سەیری دووکانەکانی دەکرد و چاوەڕێ بوو دووکاندارەکان لە دووکانان بێنە دەرێ و سڵاوی لێ بکەن. لانیکەم دیوناسەکانی، دۆست و برادەرەکانی... دووکاندارەکانی دەدی کە لەگەڵ چاویان پێی دەکەوت، سەریان دادەخست و پشتیان تێ دەکرد. لەبەر دووکانەکەی سەراج جڵەوی ئەسپەکەی کێشا و بە زەردەیەکی گاڵتەجاڕانەوە سەیرێکی سەراجی کرد، کە ئاگای لە دەوروپشتی بڕابوو. بەڵام سەراج هەر جارێکیش چییە، سەری هەڵنەهێنا و سەیرێکیشی نەکرد. ناچار جڵەوی بۆ ئەسپەکەی شل کرد و ئەسپەکە بزووت و دەنگی خرمەی ناڵەکانی لەسەر سەنگفەرشی شەقامەکە بەرز بۆوە، بەڵام سەراج دیسانیش هەر سەری هەڵنەهێنا. ویستی بانگی بکا، بەڵام دەنگی لە قوڕگیدا بوو بە گرێ و قەتیس ما. بیری کردەوە، ئەگەر بانگی بکا، تەنانەت بیکاتە رۆژی حەشریش، سەراج دیسان هەر سەر هەڵناهێنێ سەیرێکی بکا. بەرەو دووکانی ناڵبەندەکە لێی خوڕی. ناڵبەند بەسەر سمی ئەو ئەسپەدا کە ناڵی دەکرد، نوشتایەوە و دایە بەر چەکوچ. دەروێش چاوەڕێی کرد هەتا ناڵکردنەکە تەواو بێ، بەڵام دیاربوو تەواوی نەدەکرد. هەروا داهاتبۆوە و لەو ناڵەی دەدا، کە تەواو جێی گرتبوو. کاتێ دەیویست سەرێك لە دووکانەکەی رەشید ئاغا هەڵێنێ، رەشید ئاغای دی، کە دەسبەجێ بەرماڵی راخست و نوێژی دابەست و سوژدەی برد. نە کاتی نوێژی نیوەڕۆیە بوو و نە نوێژی عەسرێ و نە کاتی نوێژی شێوان و نە خەوتنانیش. لەبەر دووکانەکەی ئەویش بەبێ ئەوەی بەدەست خۆی بێ، جڵەوی ئەسپی کێشا و راوەستا. بەڵام رەشید ئاغا سەری لە سوژدەی هەڵنەدەگرت. ئەسپەکەی لەخۆوە کەوتە رێ و رۆیشت و لەبەر دەرگای خانووەکەی خۆی راوەستا. دەروێش بەگ ئارەقەی کردبوو. پەیتاپەیتاش ئارەقەی دەکرد. لەبەر دەرگای

حەوشە لەسەر ئەسپەکەی دانیشتبوو و هەزاران بیر و خەیالْ هرووژمیان بۆ مێشکی دێنا و ئەو نەیدەوێرا مێگەلی پەرش و بڵاوی خەیاڵی خڕ بکاتەوە. تاوێك دواتر سەیری کرد چووەتەوە نێو بازاڕ. بازاڕ تێك چڕژابوو. خەڵکێك گەش و لێو بە پێکەنین و هەندێك نێوچاوان تاڵ و رووگرژ. هەندێ ددانیان سپی و ژمارەیەکیش ددانیان زەرد و چڵکن و رەشهەڵگەڕاو، سمێڵ شۆڕ و... هاتەران پاتەران... ئەسپەکەی دیسان لەبەر دووکانەکەی سەراج پێی لە عەرزی وەژاند و کوڕژنی کرد. سەراج دیسان سەری هەڵنەهێنا. ناڵبەندیش هەروا لەخۆڕا لە ناڵەکەی دەدا و نێوچاوانی رەشید ئاغاش وەك مردبێ، هەر لەسەر بەرماڵ و لەسوژدە بوو. بازاڕی ئاسنگەران دیسان بە دەنگی کوتانی هەزاران کوتك و چەکوچ لە سندانەکە، پێشوازییان لێ کردەوە. بە بازاڕەکەدا گەڕا. راوەستا. چاوەڕێی کرد، ئەسپەکەی ئاژووت. زەردەی هاتێ و بە رواڵەتێکی تکاکارانەوە سەیری دۆست و برادەرانی کرد و کەسیش نیونیگایەکی لێ نەکرد. هەر دەتگوت ناشیناسن. دەتگوت هەر ناشیبینن. دەتگوت هەر نییە.

هەتا تین و توانای لەبەردابوو، هەر لە دەرگای حەوشەکەوە چۆوە نێو بازاڕ و لەوێوە گەڕاوە حەوشەکەی. شارۆچکە لەپڕ لەودیوی تاریکیی دۆڵپایەکەوە لووراندی. لوورەیەکی درێژ کە هەر دەهات و بەرزتر دەبۆوە. دەڕابە بە خرمەخرم دادرانەوە. تەقوکوتی چەکوچ دەنگی دایەوە و مەکینە کەوتنە کار. هاڕەهاڕێك، کە جاربەجار توندتر دەبوو، دەتگوت پەلاماری شارۆچکە دەدا. کە وەخۆ هاتەوە لەسەر پردەکە بوو. بەرەو دەشتێ ئەسپەکەی تاو دا و شارۆچکە بە دەنگی تەقوکوتی چەکوچ و لوورەلوور و هاڕەهاڕەوە لە دواوەی بەجێ ما. ئەسپەکەی هات و لە بن چنارەکەی بەرامبەر کۆشکی ئاق یۆللی، هەر لە جێیەکەی جارانی راوەستا. دەروێش بەگ، وەك بەدەست خۆی نەبێ، دابەزی و دەمانچەکەی بەدەستەوە لە پلیکانە شڕوشەوێقەکان کە لەبن پێیدا جیڕجیڕیان دەهات، وەسەر کەوت. تاوێك لە دیوەخانەکە راوەستا. سەری سووڕما و لەپڕ تەریق بۆوە و دەمانچەکەی خستەوە بەر پشتوێنی. دیوارەکەی بەرامبەری درزی بەربوو و رەنگە شینەکەی هەڵوەریبوو.

کە گەیشتە پشت دەرگای مستەفا بەگ، راوەستا. دەستی نەدەچوو بۆ ئەوەی دەرگاکە بکاتەوە و لاقەکانیشی حەزیان لە گەڕانەوە بوو، بەڵام نەیاندەتوانی. هەروا لەجێی خۆی چەقیبوو. گەڵای دار تووەکەی رووبەڕوویان لەبن تۆز و خۆڵدا سپی دەچۆوە. دەروێش بەگ نەیدەتوانی چاوی لێ هەڵگرێ. گەڕاوە و هێدی هێدی لە پلیکانەکان چووە خوارێ. ئەسپەکەی

لەبن قرچەی گەرماکەدا گوێی شۆڕ کردبوونەوە و بە کلك مێشی لە خۆی دەردەکرد. سێبەرەکەشی بەرەو لای رۆژهەڵات کشابوو.

دەروێش بەگ لە خوار پلیکانەکان راوەستا و هەوڵی دا فکر و زەینی خۆی خڕ بکاتەوە. هێدی هێدی هاتەوە سەرخۆی. دەتگوت هەر نەشچووەتە شارۆچکە و لەوانەشە ئەو شتانەی هەر بەسەریش نەهاتبێ، نە حاجییەك کوژرابێ و نە یوسفێکیش رای کردبێ. چووبووە بەر تاڤگەیەك و خۆی شوشتبوو و لەپڕ لەهەموو چەپەڵییەك پاك ببۆوە. بەخۆی دەگوت:"نامەوێ بمرم. نامەوێ خۆ بەدەستەوە بدەم. یوسفیش دەدۆزمەوە. دەبێ بیدۆزمەوە. هەرچۆنێك بێ... چما چ بووە؟ ئەوان ناتوانن من بەچۆکدا بێنن، ناتوانن... سەری دەروێشیان بۆ شۆڕ ناکەم. یوسفێك، منداڵۆچکەیەکیان کردووەتە بیانوو... ئەویش بەو زووانە دەدۆزرێتەوە... بەڵێ..." دەیگوت و دژی هەموو مەحاڵەکان شەڕی رادەگەیاند.

سەری هەڵێنا و چاوی بڕییە کۆشکە کۆن و داتەپیو و تۆز و خۆڵاوییەکەی ئاق یۆللی. پەژارەیەکی چنگی لەدڵی گیر کرد و بەخۆی گوت:"بۆچی دەچمە سەیری مردوویەك؟ چ پێویستە؟ ئیتر ئەو رۆیشت... چیم لێی دەوێ؟ باشە بۆ دەبێ ئەو لە هەموو کات و ساتە خۆش و ناخۆشەکانی ژیانمدا لە قوژبنێکی دڵ و مێشکمدا بێ؟ ئەو چیی لە گیانی من دەوێ؟"

چووە پێشێ و هەوساری لە قەرپۆزی زینێ کردەوە. کە دەیوسیت پێ لە رکێفان بنێ، پەژیوان بۆوە و بە غاردان گەڕایەوە بۆ کۆشکەکە. وەزگی دەدا، بێت و ئەمڕۆ مستەفا بەگی نەدیتبا. بەردەوام لەخۆی دەپرسی، باشە بۆ؟ بۆ؟ هەر دەیویست بیبینێ؟ باشە ئەو حەزە ئۆقرەنەگرتووە لە کونجکۆڵێ، لە هاودەردی، لە خۆشەویستی، لە هاوڕێیەتی لە دوژمنایەتی، یان لە چ شتێکەوە سەرچاوەی دەگرت؟ ئاخۆ بەزەیی بە کابرایەکی مایەپووچی تێشکاوی بەزیودا دەهات؟

کە گەیشتە بەر دەرگاکەی مستەفا بەگ، دیسان پێی بەعەرزییەوە وشك بوو. دەستی بۆ دەرگاکە نەچوو بیکاتەوە. لە پشت دەرگاکە بە دوودڵییەوە راوەستا و دانی بە جەرگیدا گرت. دەستی شۆڕ ببوونەوە و تینیان تێدا نەبوو ببزوێن. لەپڕ گەڕاوە و وەك شێتان رای کرد و بە هەڵپە بەرەو پلیکانەکان غاری دا. خۆی خستە سەر ئەسپەکەی و بەرەو دەشتەکە لینگی دا. دەشتەکە وەك رزگاریدەرێکی میهرەبان باوەشی بۆ کردبۆوە.

## ١٢٩

تریفەی مانگ دەتگوت زیوە. سێبەری ڕەوەز و دار و دەوەنەکان گەورەتر لەخۆیان دیار بوون. ئاوەکە لە خوارەوە هەستابوو و بەرەو گردەکە دەڕۆیشت. باڵندەیەك لە نێو دەوەنەکاندا و لەبەر پێی یوسف هەڵفڕی. ڕاچڵەکی، گەڕاوە و دەرپەڕی.لاقی لە گیاچەقە و دەوەن و کەنگرەکان دەئاڵقا. بۆنی بیزا و شێی شەوێ، وردە وردە بەسەریدا دەهات. لە سەر تەختایی گردەکە کەوتە پیاسەکردن. ئەو شوێنەی پیاسەی لێ دەکرد، وردە وردە بچووکتر و بازنەکەی تەسکتر دەبۆوە. دیسان باڵندەیەك دەرپەڕی و ئەو دەسبەجێ گەڕاوە. دوایی گوێی لە خشپەیەك بوو و ڕێڕەوی گۆڕی. بچووکترین دەنگ هاتبا، دەسڵەمییەوە. ماندوو بوو و باڵی بە دارێکەوە دا و گوێی هەڵخست. هیچ دەنگێکی نەدەبوارد. کرمێك دارێکی جوویتبا و باڵندەیەك لە هێلانەکەیدا فڕەی لێکدانی باڵی هاتبا و وزەوزی مێشەنگوینێکی نوستوو، تێکەڵی هانکەهانك و ترپەی دڵی دەبوو. لەسەر هەست بوو و حەپەساو و زراوچوو چاوەڕوانی دەکرد. لەپڕ دەرپەڕی و دەستی کرد بە ڕاکردن. خۆی خزاندە نێو گومبەزە گۆڕێکی ڕۆمییەوە و لەوێدا کرووشمەی کرد. لەو ساتەدا تەنیا بیری لەوە دەکردەوە کە ڕزگاری بووە. کە لە گۆڕەکەدا دانیشتبوو، دەنگەدەنگێکی وەك دەنگی مشار لەسەرەوە هات. دەنگەکە جار بە جار نزیکتر دەبۆوە و خێراتر دەبوو. لە تەختی گۆڕەکەدا خۆی وا گرمۆڵە کردبوو، گیانی دەیزریکاند. ساتێك ئاگای لەخۆی بڕا و دەسبەجێ وەخۆ هاتەوە و بە ترسەوە لەگۆڕەکە خۆی فڕێدایە دەرێ و سەیری دەوروپشتی کرد. بە شوێن هەندێ شتەوە بوو. بە دڕدۆنگی و وردورد نێو خۆڵەکە گەڕا، بەڵام هیچی نەدۆزییەوە. لەولاترەوە، سێ کەسی دی، کە دەستیان وەك باڵی باڵندە لێك کردبۆوە. بە گوڕە و نەڕاندن بەرەولایان ڕای کرد، بەڵام هەر گەیشتە لایان، ون بوون. لەخۆشیان شاگەشکە ببوو. بە هەوێزێکدا (شوێنی گیرسانەوەی مێگەل) تێپەڕی. بۆنی خوریی مەڕ نێو لووتی زووراندەوە. ئیتر چاوی هیچ کوێی نەدەدی، هەر بۆنی دەکرد. بۆنی سەگێکی زرتەزلی

شوانی بۆ هات. سەگەکە لە دوورەوە دەیمڕاند. کە بەرەو لای سەگەکە گەڕاوە، تووشی بێستانێکی شووتی بوو. شنەبایەك بۆنی شووتیی ترشاوی هێنا. کەپری بێستانەوانەکە لەولایەوە بوو کە بۆنی شووتییەکە دەهات و رەش دەچۆوە. کەپرەکە لە دوورەوە خوار و خێچ دیار بوو و دەتگوت ئێستا نا تاوێکی دی بەلادا دێ و دەڕووخێ. شووتییەکان وەك کوچکە بەردی گەورە و درشت لە بێستانەکەدا بلاو ببوونەوە. کە گەیشتە کەپرەکە، توند رایتلەکاند. کابرایەك دەپەڕییە دەرێ و بە تووڕەییەوە لێی پرسی:"چییە؟ چ قەوماوە؟"

هاتەپێش و ئەمجارە لەسەرخۆتر پرسی:"چیت دەوێ؟"

بەلام یوسف وەلامی نەداوە. کابرا دەیپرسی و قسەی دەکرد و یوسف متەقی لێوە نەدەهات. زمانی شکابوو و زاری ببووە تەلەی تەقیو. بێستانەوان بەرۆکی گرت و بەسەریدا شیڕاندی:"تۆ کێی؟ چیت دەوێ؟ بلێ دەی، برسیتە؟ شووتیت دەوێ؟ بنیادەمی، جنۆکەی، خێوی، شێتی چیی؟"

غەلبەغەلبێك لە گەرووی یوسفەوە هەستا. کابرا دیسان پرسی:

"نەخۆشی؟ دانیشە با شووتییەکت بۆ بشکێنم. (دوراغ)ـیش دەخۆی؟"

سفرەکەی بۆ راخست و بۆنی (دوراغ) هەستا. شووتییەکی گەورەی بە مستێك شکاند و لە پێشی دانا. بەلام ئەو نەیدەتوانی دەستی بجوولێنێ. بێستانچییەکە گوتی:"بخۆ، بخۆ براله. شووتییەکە دەتحەسێنێتەوە."

تاوێك راوەستا و گوتی:"راوەستە با ئاویشت بۆ بێنم."

پڕی دایە دەفرە دارینەکە و بەغاردان بەرەو لای رووبارەکە رۆیشت و لە ئاوە فێنك و زولالەکە پڕی کرد و هێنای و گوتی:"هانێ، بخۆوە. تۆ ماندوو و شەکەتی براله. بخۆوە با فێنك بییەوە و ئۆخژنێکت بەگیانیدا بێ."

دەفرەکەی دایە دەستی. ئەویش بەدەستە لەرزۆکەکەی ئاوەکەی فڕکرد و قلپ قلپ خواردییەوە دەفرەکەی هەلچۆڕاند و بە ئاماژەی دەست دیسان داوای ئاوی کردەوە. بێستانەوان دیسان رای کرد و دەسبەجێ گەڕاوە. یوسف ئەمجارە بەسەرییەوە نا و هەلیچۆڕاند. بێستانەوانەکە گوتی:"بخۆوە، بخۆوە با بێیەوە سەرخۆ."

بە شەرمەوە دەستە لەرزۆکەکانی بۆ سفرەکە برد. لەتێ نانی هەلگرت و لە زاری ئاخنی و لەسەرخۆ جووی. پاروەکە لە دەمیدا نەرم بوو و خووسا. ئەو دیسان هەر جووی. بێستانەوانەکە لێی تێگەیشتبوو. گوتی:"تۆ لەمێژە برسیتە براله. بنیادەمی برسی ئاوان."

پارووەکی بۆ پێچاوە و دایە دەستی:"بخۆ، بخۆ براله. پەله مەکە. لەسەرخۆ بیخۆ. راوەستە با ئاویشت بۆ بێنم. فێنکە وانییە؟"

یوسف چاوی لە بێستانەوان بڕیبوو و لە هەموو جووڵە و ڕەفتارێکی ورد دەبۆوە. وا بێهێز ببوو، نە هەستی بە برسێتییەکەی دەکرد و نە ترس و نە هیچ شتێکی دی. هەوڵی دەدا لەو بێهێزییە بێتە دەرێ، بەڵام نەیدەتوانی. کۆمەڵێك مێشەکەرانەی دیت کە لەسەر توێکڵە شووتییەکان خەویان لێ کەوتبوو. لە جێی خۆیان نەدەبزووتن. دەستی برد و دەستی لەسەردانان و لەپڕ وەك بڵێی پۆلوویەك بەدەستییەوە نووسابێ، دەستی کشاندەوە. کە بێستانەوان ئاوەکەی بۆ هێنا پرسی:"چ بوو براله؟"

دیتی زەردەواڵەکان هارووژاون و بەدەوری سەریدا دەسووڕێنەوە.

"نەکا دەستت لەسەر زەردەواڵەکان دانابێ و پێوەیان دابێی؟"

یوسف خێراخێرا دەستی رادەوەشاند و لەبەر ژان و ئێشەکە خۆی وێك دێنا. بێستانەوان دۆدانەکەی لە بنمیچی کەپرەکە کردەوە و زارکەکەی بۆ کردەوە و لەپێشی دانا و گوتی:"ئەگەر دەستتی تێخەی، ژەهرەکەی دەبا."

کە زانیی یوسف ئاگای لەخۆی نییە، دەستیی گرت و لە دۆدانەکەی رۆکرد و تاوێك رایگرت و گوتی:"ها، بخۆرەوە."

یوسف لەپڕ پەلاماری نان و شووتی و "دۆراغ"ـەکەی دا و جا وەرە و بخۆ. دەستی وەك خولخوله دەهاتن و دەچوون. بێستانەوان دەستی گرت و گوتی:"لەسەرخۆ بە براله. پەلەی مەکە. دەترسم ئاوا بخۆی، شتێکت لێ بێ..."

یوسف هەرجارێکی دەکەوتەوە پەله، بێستانەوان دەستی دەگرت. ئاخری سفرەکەی راماڵی و دیسان داوای ئاوی کرد. بەرامبەری یەکتری دانیشتن. بێستانەوان گوتی:"من ناوم عەلییە. ئەی ناوی تۆ؟"

یوسف گوتی:"عەلی، عەلی."

یەکەم جاری بوو قسەیەکی بەسەر زاریدا دەهات. بێستانەوان کە شادییەك لەدەنگیدا دیار بوو، پرسیی:"تۆش ناوت عەلییە، ها؟"

یوسف دووبارەی کردەوە:"عەلی."

ئیتر پاڵ کەوت. عەلی باقە گیایەکی لەبن سەری دانا و گوتی:"بنوو کاکە عەلی گیان. بەیانی خواردنی زیاترت دەدەمێ. دەبێ کەلانەیەکت بۆ دروست بکەم سەری قامکەکانتی پێوە بخۆی."

عەلیی بێستانچی کەرەی بەیانی لەخەوێ هەستا. یوسف کەوتبووە سەر تەنیشتی راستەی. ئەژنۆی کۆ کردبوونەوە بەر زگی و وەك منداڵێك خەوتبوو. لێوی شل دەکرد و بە پفەپفێکەوە پشووی دەردەدایە دەرەوە. عەلی لێی گەڕا بنوێ. تاو کەوت و تەوژمی گەرمایەکی زەرد و خنێکێنەر نیشتەوە. یوسف هەروا لەخەوێدا بوو. پۆل پۆل مێشی لێ دەنیشتن و دەفڕینەوە و ئەو هەر بای خەیاڵیشی نەبوو. یەك پشوو ئارەقەشی دەکرد. عەلیی بێستانچی کێچی کەوتبووە کەوڵی، بەڵام نەیدەزانی ئەو بنیادەمە برسی و تینوو و بێ خەوە کێیە وا لەنیوەی شەوێدا پەیدا بووە و ئێستاش ئاوا خەوی لێ کەوتووە و نازانێ دەوری چ پادشایەکە. لە یاخی و قاچاخچی و شتی وا ناچێ. بەڵام لە کەسێکی ئاساییش نەدەچوو. ئەو گەنجە بێ و نەبێ شتێکی بەدەمەوە بوو. بەڵام چ شتێك؟ کراسەکەی چڵکن بوو. پێڵاوەکانی دڕابوون و دەستی هەموو بریندار و کەمرەگرتوو و بن نینۆکەدرێژەکانیشی رەش رەش ببوون. سەروقژی خۆڵاوی و تۆزاوی و ئاڵۆز، لەبەر پیسی، پێکەوە نووسابوون.... دەموچاوی درێژووکە و خۆڵاوی بوو. مژۆڵە درێژ و تۆزاوییەکانی لە مژۆڵی ئەسپ دەچوون. بە کورتی گەنجە نووستووەکە، دەتگوت بووکە قوڕینەیە. تۆزی مردووی لێ نیشتبوو... ئەگەر هەناسە نەکێشێ، وادەزانی مردووە. ئەو هەمووە مێش و مەگەز و تەپۆ و مێشوولەیەی لێ دەنیشێ و هەڵدەفڕنەوە و ئەو هەمووە زەردەواڵەیەی بە وزەوز بەسەریدا دەخولێنەوە، هەر بای خەیاڵیشی نییە. لە حاڵێکدا هەتاوەکە ئەوەندە بەتینە، بەرد دەکولێنێ و بنیادەم ناتوانێ پێ لەسەر عەرزی دابنێ و هەرچی لەبەر تاو بووبێ، پیاو ناوێرێ دەستی بۆ بەرێ، ئەو لە خەوێکی قووڵ دایە و ئارەقە دەکا و هەر نابزوێ.

بێستانەوان پیلی گرت و لەسەرخۆ رایکێشایە بن سێبەری کەپرەکە. نیوەڕۆ داهات، بوو بە عەسر، تاریکدا هات و یوسف چۆن لەسەر تەنیشتی راستەی نووستبوو و ئەژنۆی کۆکردبوونەوە بن زگی، هەر وەخەبەر نەهات.

دووەم رۆژ کە رۆژ بۆوە، لەخەو هەستا. عەلیی بێستانچی کە مەزەندەی کردبوو لەو کاتەدا لەخەوێ هەڵدەستێ، هەموو شتێکی بۆ ئامادە کردبوو. یوسف کە هەستا، وەك لە ماڵی خۆی بێ، وردەوردە چووە سەر ئاوەکە و دەست و دەموچاوی شووش و بەسەر قۆڵەکانی دەموچاوی ویشك کردەوە و گەڕایەوە کەپرەکە. لە کەپرەکەدا سەیری کرد سفرە راخراوە و نان و قاپێکی

مسیی پڕ لە ساواریشی لەسەرە. لە نێو قابڵەمەیەکی دووکەڵاوییەوە هاڵاوی کەلانەش هەڵدەستا. یوسف بەبێ ئەوەی سەیری ڕاست و چەپی خۆی بکا، ڕاستەوڕێ چووە سەر سفرەکە دانیشت و وەك نەدی و بدی دەسی کرد بە خواردن. هەتا بێستانچی لەسەر ئاوێ گەڕاوە، ساوار و کەلانەی نیوەکردبوو و دەست و شەویلکەی یوسف وا دەجووڵان پیاو سەری سووڕ دەما. بێستانچی حەپەسا. ئەویش بەوپەڕی ئاسوودەییەوە بنی قابڵەمەکەی لێس دا و دوای خاوێنکردنەوەی دەم و زاری، سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد. دەتگوت لە شتێك دەگەڕێ. دوای ئەوە نیگای لەسەر عەلی گیرسایەوە. ڕوخساری لە کابرایەك دەچوو، بیەوێ هەندێ شتی وەبیر بێتەوە و چەندی هەوڵیش دەدا بۆی جێبەجێ نابێ. بێستانچییەکە چاوی لە چاوە سرك و پڕ لە پرسیارەکانی یوسف دزییەوە. یوسفیش لاسارانە چاوی لەو هەڵنەدەگرت. بێستانچی بەسەرسووڕمانەوە هەر سەری هەڵێنا، چاوی لە چاوە ترساو و زەقەکانی ئەو ئاڵقا. دەتگوت ئەو چاوانە لە هەموو شتێ تێگەیون. تا بێستانچییەکە وەخۆ هاتەوە، سەیری کرد ئەو قەڵەمبازێکی دا و لەچاوترووکانێکدا لە رووبارەکە پەڕییەوە و لەودیو دەوەنەتوودڕکەکانەوە لەچاوان ون بوو.

یوسف خۆی بەئاوەکەدا دا و هاتەوە دەرێ و ملی ڕێگەکەی گرت. چەندجاران لاقی لە توودڕکان ئاڵقا و یەك دوو جاریش سەرەنگرێ بوو و کەوت. کە لە مێشەڵانەکە هاتە دەرێ، جلەکانی وشك ببوونەوە. بە دەم رووبارەکەدا ڕای دەکرد. وەك باڵندەیەکی سرك لە هەموو تارمایی و دەنگێك دەسڵەمییەوە و لەپڕ دەگەڕاوە و لای دەدا و خێراتر ڕای دەکرد. هەتا دەمی زەردەپەڕ هەروا ڕۆیشت و ڕۆیشت و کاتێ لە دوورەوە دەنگی زەنازەنای شارۆچکەی گوێ لێ بوو، سەری هەڵێنا و سەیرێکی شارۆچکەی کرد کە وەك شاری پەرییان لە تیشك و ڕووناکیدا دەدرەوشاوە.

تاوێك لەجێی خۆی چەقی و ترس و هیوا و نیگەرانیی لەبیر کرد و نوقمی سەیرکردنی شارە چراخانەکە بۆوە. دوای ئەوە پێی نایە شارە تیشکاوێژەکەوە... شار چۆلەکەکوژی تێدا دیار نەبوو. زەردەواڵە و پەپوولە و مێشوولە و باڵندەش نەدەفڕین. وەك خۆ بەئاوێدا بدا، خۆی بەلافاوی ڕووناکییەکەدا کرد و گەیشتە بازاڕ. لەسەر ئەستوندەکەکەی ڕۆمی کرن، کە ئیمامەکوردە بەجێی هێشتبوو، دانیشت. لە ئاسمانەوە یەك پشوو تیشك و ڕووناکی بەسەردا دەباری. یوسف لەبەر تیشکەکە نەیدەتوانی چاو هەڵێنێ و جێیەك ببینێ. دوای ئەوە لە جەرگەی ڕووناکییەکەوە هەندێ شت، کۆمەڵێك تارمایی دیت. گوێی لە دەنگەدەنگێك بوو. یەکێك لە نزیکییەوە ئەسپی ناڵ دەکرد. لە دەنگی چەکوچەکەوە بەوەی زانی. تەراکتۆرێك

تۆزێك دوورتر تێپەڕی و عەرزی لەرزاندەوەز قاوەچییەك بەدەنگی بەرز هەرای کرد، چااااایەك. سات بە سات دەنگەدەنگەکە پتر دەبوو و لە سەرووی رووناکییەکەوە دەیبیستن. خەریك بوو هەندێ شت دەقەوما. ئەو سەری لێ دەرنەدەکرد. تارمایی سەگێك، کە تارماییەکی زۆر زل بوو، لێی نزیك بۆوە. بۆنی بەلاقییەوە کرد. دوای ئەوە لستییەوە. لە پێشدا بۆنی پێوە دەکرد و دوایی دەیلستەوە. رێك دوای رۆیشتنی سەگەکە، بنیادەمەکان لەحالێکدا دڕیان بە رووناکییەکە دا و سێبەرەکانیان جاربەجار گەورەتر بوونەوە و هاتنە پێشێ و بەسەریدا نوشتانەوە و وردورد سەیریان کرد. دواییش کشانەوە و لەولاترەوە راوەستان. ئاپۆرای خەڵکەکە چڕتر بۆوە و بازاڕەکە دەرزیت لێ هەڵاویشتبا نەدەکەوتە عەرزی. لە رووناکایی و لە سەرووییەوە وەك تارمایی تێك چڕژان و بوو بە زەنازەنا و قریوە. یوسف بە نێوان لاقی حەشیمەتەکەدا خزییە دەرەوە و هاتە بازاڕی ئاسنگەرەکان. لە کوورەی ئاسنگەرەپیرەکەدا پۆلووی ئاگر، چزیسك و بڵێسەیان لێ دەبۆوە و دەیانپڕیشکاند. بەرەو ئەو تارماییە سپییەی لە دووکانەکەدا راوەستابوو، چوو. چزیسك و ئاورینگ بە دەوری سەری کابرا سمێڵ بابڕەکەدا دەپڕیشکان. کابرا بزەی دەهاتێ. چەند، چەند دانە، چەندت هەیە. ئاسنگەرەکە چەقۆیەکی دەم تەنکی، کە دەمەکەی رەش دەچۆوە، هێنا دەرێ و گوتی:"ها، ئەوە وەرگرە و لێرە بڕۆ. لێرە مەویستە دەنا دەتبینن. ئەو چەقۆیانە هەڵگرە. چما نابینی ئەو هەمووە خەڵکە هاتوون تۆ ببینن؟ لە دەرگاکەوە ناکرێ، ناکرێ. لەو پەنجەرەیەی پشتەوەڕا خۆت فڕێ بدە. لێرە رامەوەستە. خۆت فڕێ بدە دەی. دەمی چەقۆکان، کوورەی ئاسنگەرەکان و شووشەی ماڵەکەی بەرامبەر چزیسك و ئاورینگیان لێ دەبۆوە و ئەو ئاورینگانە بەسەر شارۆچکەدا دەتەقینەوە و پەرش و بڵاو دەبوونەوە. ماڵی حاجییە شێتە قەرەباڵغ بوو. لە پێشدا سڵەمییەوە. چوار جار بە دەوری ماڵەکەدا سووڕاوە و بەرەو کەناری رووبارەکە رای کرد و دیسان گەڕاوە. باخچەکانی پێش و پشتەوەی ماڵەکە پڕ بوو لە کچ و کوڕی بچووك و ژن و پیاوی پیر و گەنج و هەر هەموو قسەیان دەکرد و دەیانگوڕاند و لەپڕ بێدەنگ دەبوون. خۆی خزاندە نێو گژ و گیاکان و لەسەر عەرزەکە راکشا. جارجارێ دەنگی سەیر و سەمەرەی دەبیست و دەبڕایەوە. هەمیشە، ئەو کاتانەی ئاوا لەسەر زگ رادەشکا، دەیزانی چراکە هەڵدەبێ. سەری هەڵێنا و سەیرێکی ناوەوەی کرد. ژنە لە ژوورەکەیدا تەنیا بوو. لە رووناکاییەکی چڕدا وەك تارمایی و توند خۆی رادەژاند... کاڵ دەبۆوە و تۆخ دەبۆوە و دەبووەوە جەستە... پەنجەرەکەی کردەوە و بەهەژاوی قۆڵی گرت و کێشایە ژوورەوە... ئاگری تێبەربوو... گوێی لە دەنگی بوو.

"بڕۆ، دەی بڕۆ دەی..."

بەڵام توانای نەبوو بجووڵێ و لەو چێژ و خۆشییە دابڕێ....

"بڕۆ، دەی بڕۆ دەی... ملت بشکێنە. لێرە هەمووان دەتناسن. دەتگرن و دەتکوژن...."

دەری کردە دەرێ و دەرگاکەی لەسەر داخست....

لاقەکانی بەرەو باخچەی عومەر پەلکێشیان کرد. قومارچییەکان خەریکی قومار بوون. خۆی خزاندە نێو دەوەنەکانەوە و نووقمی یاریکردنەکەیان بوو. کە شەوگار شەق بوو، قومارچی داگژانە یەکتری و تێك بەربوون. ئەویش خۆی تێوەردا. لەو جەنگەیەدا دارێکی وەسەری کەوت و بەعەرزیدا کەوت. لاقیان گرت و بە راکێش راکێش بردیانە دەم ئاوەکە و چەند جاران لە ئاوەکەیان هەڵکێشا. لەو دەمەدا هیچی پێ نەدەکرا. چونکە بە هەردوودەستی ئەو چەقۆیانەی توند گرتبوو کە لە ئاسنگەرەکەی کڕیبوون. ئەو کابرایەی لە پێشییەوە بوو، پەیتاپەیتا دەگەڕاوە و جنێوی دەدایێ و بەردی هەڵدەگرت و تێی دەگرت. بەردەکەش هەموو جارێ وەچەناگەی دەکەوت. بۆنی شێداری بیزا و مەندی لە گردەوە هەڵدەستا. چەقۆکانی دانا و یەکێکیانی جوێ کردەوە و بەغاردان پەلاماری ئەو کابرایەی دا کە لە سێبەری دار بادامەکە راوەستابوو. چەقۆکەی هەتا بن دەسکان لە سینگی رۆکرد. کابرا کەوت و جووڵەی لێ بڕا. چەقۆکانی هەڵگرتەوە و خستنییە بن باغەڵی. بەدەستی راستەشی لاقی مردووەکەی گرت و بەرەو خواروو، بەرەو لای شارۆچکە رایکێشا. تەرمەکەی هێنا و لە بن چنارەکە فڕێی دا. کابرای مردوو، کە ئەژنۆی کۆببوونەوە بەر زگی، هەروا لەسەر پیادەڕۆیەکە کەوت. حەشیمەتەکە هات و دەوری مردووەکەیان دا. لەپڕ ئەو خوێنەی لە برینەکەیەوە فیچقەی دەکرد، راوەستا. هەمووان یەکدەنگ هەرایان کرد:"بیگرن، بیگرن، ئەوە خۆیەتی، خۆیەتی..."

رای کرد و خۆی بەسەر دیوارەکەدا بازی دا و خۆی بە گەسگەسکەجاڕەکەدا کرد. کۆمەڵێك لەبەر دەمی قیت بوونەوە. گەڕاوە و خۆی فڕێدایە سەر عارەبانەیەك. عارەبانەیەکی سەوز بوو، نەخش و نیگاری سووری پێوە بوو. چیی وای نەمابوو عارەبانەچییەکە بیگرێ. خۆی فڕێ دا و ئەسپەکان بە زەنگوڵەوە بەسەری پەڕین. عارەبانەکە گەڕاوە و ئەسپە تووڕەکان کە بڵێسە لە کونە تفنیانەوە دەردەپەڕی، دیسان بەسەریدا رۆیشتن. لە عارەبانەکە نەجاتی بوو و دیسان لە بن دار بووز(نارەوەن)ـەکان پێشیان پێ گرت. ئەگەر زوو فریای خۆی نەکەوتبایە و نەگەڕابایەتەوە، دەیانگرت.

کۆمەڵێك لە پشت گابەردێك خۆیان لیٚ مات دابوو. کە لە رەوەزەکە نزیك بۆوە، بەر لەوەی بگاتیٚ، گەڕاوە. چەقۆکان هەر لە بن پیلیدا بوون و هەتا بەیانی هەر رای کرد. کە سەری هەڵێنا، ماندوو و شەکەت ئەوە لە نێو بازاڕێکی چۆڵ دایە کە بۆنی میوەی رزیوی لیٚ دەهات. جەندەرمەیەك هەرای کرد، تۆ کێی؟ ئەویش متەقی لێوە نەدەهات. زمانی بە مەڵاشوویەوە نووسابوو و دەنگی دەرنەدەهات. شارۆچکە لە چاوتروکانێکدا شێوا. دەرابەکان بە خرم و هۆڕ دادەردانەوە. دەنگی کرێکاران، مەکینەی کامیۆنەکان، ترۆمبێل، تەراکتۆر و بۆنی بەنزین هەموو وڵاتی دادەگرت. چەندەرمەکە هەرای کرد:"دۆزیمەوە. گرتم، ئاوا دەتگرم. ئەوە تۆی، خۆتی، تۆم ناسییەوە..."

کەلەپچەی لەدەستی و زنجیری لە ئەستۆی کرد.

"ئەتۆ کێی؟"

دەنگی دەرنەهات. زمانی لە مەڵاشووی نەدەبۆوە. چەقۆکانی توندتوند گرتبوو. حەشیمەتەکە هەر دەهات و چڕتر بۆوە و بازاڕەکەی پڕتر کرد. ئاسنگەرەکە هات و گوتی:"خۆیەتی، راست خۆیەتی."

عەلیی عەریزەنووس هات و گوتی:"خۆیەتی."

ژنەکەی حاجییە شێتە هات. ئاپۆراکە هەناسەی لەخۆ بڕیبوو و چاویان لە زاری ئەو بڕی. ئەویش گوتی:"خۆیەتی. خۆیەتی."

حەشیمەت هەر ئەوەندەی ئەوەی بیست، خرۆشا و نەڕاندی و پەلاماریان دا. بەسەر عەرزەکەدا رایانکێشا و ونجڕونجڕیان کرد، لەتوپەت... عارەبانە سەوزەکە بۆنی رەنگ و رۆنی لیٚ دەهات.

شیناوەرد، گوڵ و دەوەنی سوور بە شیناوەردەکەوە. ئەسپەکان رەش و کوێتە بوون و زەنگوڵەی ملیان زرینگەی دەهات. تۆپەی عارەبانە جیڕەیان بوو. عارەبانە بۆنی قوڕ و پووش و کای لیٚ دەهات. عارەبانەچی دەیگوت:"سەرت دانوێنە، هەڵیمەهێنە. هیچ کون و کاژێرێك نەماوە بۆ دۆزینەوەت سەنگ و سوژنیان نەدابیٚ. کەچی تۆ هەر لێرە و لەبەر دەستیانی. خۆ ئەگەر ئێستا یەکێکی دیکە لەجێی من بوایە، هیچ دەزانی چیی لیٚ دەکردی؟ دەلیایەکیان پارە بۆ سەرت تەرخان کردووە. خۆ لەبەر خاتری بابت نەبوایە، لەبەر مەحموودە کوردە نەبوایە، زۆر لەمێژ بوو دەمدایتە دەست جەندەرمەکان..."

عارەبانەچی ئەسپەکانی دایە بەر قەمچی. ئەسپ کەوتنە چوارناڵە. عارەبانە راتڵەکی. تەپوتۆز و گرمە و دەنگی زەنگوڵە هەستا.... یوسف هەرای کرد:"رایگرە، رایگرە، لەبەر ئەم دەرگایە رایگرە."

عارەبانچی جڵەوی کێشا.

"لێرە راوەستە زوو دەگەڕێمەوە."

چووە ژووریٚ. ئەو چەقۆیانەی پێی بوون، هەمووی لە تەنیشت چەقۆکانی دیکەوە کە پێشتر لە تەختی عەرزی دیوەخانەکە دایکوتابوون، داکوتا. کە لیٚ بۆوە، سیٚ جاران بەسەر نووکی کەڵەموستی پێی بەنێو چەقۆ چەقێنراوەکاندا رۆیشت. عارەبانەچییەکە لە خوارەوە بانگی دەکرد. بەپەلە هاتە خواریٚ و سەیری کرد. جەندەرمەکانی دی، کە عارەبانەکەیان گەمارۆ داوە. دڕی بە جەندەرمەکان دا و خۆی هاویشتە سەر عارەبانەکە. عارەبانەچی ئەسپەکانی دایەوە بەر قەمچی. عارەبانە کەوتە ریٚ و لەهەورێکی تۆز و خۆڵدا ون بوو... جڵەوی کێشا. هەوری تۆز و خۆڵەکە وردەوردە نیشتەوە. لە تەنیشت قاوەخانی بن چنارەکەی بازاڕ بوو. ئەسپ سمیان لە عەرزی دەکوتا. عارەبانەچی بەسەریدا نەڕاند:"دابەزە. ئەمن کەسی وەك تۆ نابەمە هیچ کوێیەك. من گیانی خۆمم لە کۆڵانان نەدۆزیوەتەوە. خۆت فڕێدە خواریٚ."

خۆی لە عارەبانەکە فڕیٚ دایە خواریٚ و بەرەو نێوەڕاستی بازاڕەکە رۆیشت. ماندوو و شەکەت بوو. تینی لەبەردا نەبوو. لەویٚ، لەبەر دووکانی دەلاك(ئارایشگا)کە دانیشت. ئەوەندە ماندوو بوو پشووی دەرنەدەهات. بۆنی کەبابی بەسەردا هات. ویستی هەستیٚ و بچێتە کەبابخانەکە و نەیتوانی. لەو کاتەدا یەکێك بن پیلی گرت. یوسف راچڵەکی.

"کوڕە ئەوە بۆ وای یوسف؟ شێت بووی؟"

کابرا نێوچاوانی تێك نابوو و ردێنی دەلەرزی. لەترسان خەریك بوو دڵی بتۆقیٚ.

"هەستە، هەستە. هەستە بەر لەوەی بتگرن با بچینەوە گوندەکەی خۆمان. هەمووان بەشوێنتەوەن و بەگیش خەریکە شێت دەبیٚ. دەی هەستە. هەتا نەگیراوی هەستە با لێرە بڕۆین."

یوسف هەستا و هاواری کرد. بەڵام دەنگی نەهاتە دەریٚ. تاوێك دواتر هێور بۆوە. چاوی لە چاوی ئەو کابرایەی پیلی گرتبوو، بڕی:"تۆ عەلییە ریشەی؟"

کابرای بەرەو لای کەبابخانەکە راکێشا:"لە برسان وەختە بمرم. تا تێر نەخۆم، بۆ هیچ کویٚ ناڕۆم."

"جەندەرمە؟"

یوسف:"خۆ لە شوێنانە نادەم کە ئەوانی لێن."

چوونە کەبابخانەکەوە. دووکەڵەکە ئەوەندە خەست بوو، چاو چاوی نەدەدی. دووکەڵەکە بۆنی رۆنی سووتاوی لێ دەهات. لە پشت مێزێك رووبەڕووی یەکتری دانیشتن. یوسف بەدیتنی عەلییە ریشە شاگەشکە ببوو. کەسی دیکەی لێ نەبوو. بەر لەوەی کەباب بێنن، قاپێکی پڕ لە توور و بیبەر و مەعدەنووس و تەڕەتیزەیان هێنا. دوایی کەبابیان هێنا. کەباب چەوریی لێ دەچۆڕایەوە. شەربەیەکیشیان دۆ هێنا. بەبێ ئەوەی قسەیەك بکەن و سەیرێکی یەکتری بکەن، کەبابەکانیان خوارد. کە یسوف لە پێشەوە و کابرا بەشوێنیدا لە دووکانەکان دەهاتنە دەرێ، تاو خەریك بوو ئاوا دەبوو. یوسف حەپەسابوو و لەداو کەوتبوو. چاوی وەك چاوی ئاژەڵەکێوییەکی ترساو دەترووکان. عارەبانەیەکی زەردی دیت، کە لە نێوەندی مەیدانەکە رایگرتبوو. لەسەر کەسکاییەکەی، هەڵاڵەی گەورەیان لێ نەخش کردبوو. هەڵاڵەیەکی درشتی نارنجییشی پێوە بوو. ئەسپە کوێتە رەسەنەکان، کە زین و جلیان نوێ بوون، لەسەرجێی خۆیان سمیان لە عەرزی دەکوتا. یوسف چاوی لە چاوی کابرا هەڵەنگوت. بە سەرسووڕمانەوە و جارێ سەیری کابرا و جارێ سەیری عارەبانەکەی کرد و بەرەو عارەبانەکە رای کرد. کابراش بەشوێنیدا... گەیشتە عارەبانەکە. کابراش بەشوێنیدا. هەوڵی دا کابرا لە عارەبانەکە فڕێ بداتە خوارێ. بەڵام قەوەی پێی نەشکا. چەقۆکەی دەرهێنا و لەسەر کەلەکەی عارەبانەچییەکەی راگرت و گوتی:"لێخوڕە."

عارەبانەچی هەوسارەکانی کێشا و ئەسپی بە قەمچییان غار دا و لە پردەکە پەڕینەوە. کە عارەبانەکە لە پردێ دەپەڕییەوە، یوسف کابرای فڕێدایە نێو ئاوەکەوە.

## ١٣٠

زیکزیکە هەر لە بەیانییەوە کەوتبوونە زیکەزیك. چیی هەوا گەرمتری دەکرد، ئەوان دەنگیان پتر هەڵدێنا. چنار و دەوەن و گژ و گیا و دار هەنارەکان هەر دەتگوت پڕ بوون لە زیکزیك کەرە. دەنگیان لە زەوییەوە دەچووە ئاسمان و لە هەر چوار تەنیشتەووە دەبیسرا. گەرماکەی دەتگوت شووشەیە و ورد و خاش بووە و هەڵدەڕژێتە خوارێ. شنەبایەك، کە جار نە جارێ هەڵی دەکرد، هەورێکی لە تۆز و خۆڵ هەڵدەستاند و دەیهێنا و بەسەر ئاو و دار تووە چڕەکە و چنار و هەنارەکانیدا دەکرد. پووش و پەڵاشی تاوبردوو لە بن تۆز و خۆڵ و گەرما بەتینەکەدا قرچەقرچیان بوو.

دار هەنارە تۆزاوییەکان لە گوڵدا ون ببوون. وشترالووییەکی بەرز کە گوڵێکی مۆری هەبوو، لە دوورەوە دەشنایەوە. سێبەرەکان لەگەرمان وشك هەڵاتبوون و مات ببوون و بە عەرزییەوە نووسابوون. باڵندەیەك باڵی نەدەبزاوت و وزەی مێشەنگوینێك نەدەهات. مێشەنگوینەکان لە نێو گوڵ و گەڵای هەناردا بێدەنگ و کپ جێی خۆیان خۆش کردبوو. کۆشکەکەی ئاق یۆللیش کەوتبووە بن توێژکاڵێکی تۆز و خۆڵ. سوفالی سەربانی و دیوار و تەختەکانی کۆشك لەتۆز وخۆڵدا هەر سپی دەچوونەوە. لە یەکێك لە گوڵدانە تەنەکە ژەنگاوییەکاندا کە گڵەکەی هەڵڕژابووە سەر ئەو شوێنەی چەند ساڵان بوو قیرقیزخاتوون لەوێ و لەپشت پەرژینەکەوە دادەنیشت، لقە گوڵێکی مەخمەریی سیس و ژاکاو گوڵێکی زەردی مەیلەوسووری لێ پشکووتبوو، کە لەو کاولاشەدا نیشانەیەك بوو لە ژیان.

پیرەژنە شاگەشکە و دڵخۆش و بە زەیقاندن خۆی بە ژوورەکەی مستەفابەگدا کرد و گوتی:" هاتن. سێ ترۆمبێل پێکەوە... بەخوای خۆیانن، وا دێن."

مستەفا بەگ چاوی هەڵێنان و لێکی نانەوە و هیچ گۆڕانێك لە روخساریدا بەدی نەکرا. دەستی خزییە سەر دەمانچەکەی و دەستی کردەوە بە پڕ و بەتاڵکردنەوەی. چۆلەکەکانی سەر

دارتووەکەی بەر پەنجەرە، وەخەبەر هاتبوون. پۆلەمێشێك وەك هەور، لە ژوورەکەدا جارێ لە مستەفا بەگ دەنیشتن و جارێ هەڵدەستانەوە و دەچوون لەسەر ئەو مێزە دەنیشتنەوە کە وردکەنان و قاپ و قاچاغە پیسەکانی لەسەر بوو. مستەفا بەگ ئیتر چەند شەوێك بوو خەوی لێ نەدەکەوت و لە زیندەخەوێدا بوو. یەك پشوو نوقمی خەون و خەیاڵەکانی بوو. هەم لە خەو و هەم لە بەخەبەریدا... خەون و بەخەبەری بۆ ئەو وەك یەك وابوو. خەوەکەی، هەر ئەو تەپۆیانە لێیان تێك دەدا کە شەوانە بە وزەوز دەهاتنە دەرێ. مستەفا بەگ لەپێشدا پەلەقاژەی دەکرد و هەوڵی دەدا دەریان بکا، بەڵام ئاخرییەکەی ماندوو و شەکەت دەبوو و وەك مردووان خۆی دەدایە دەست تەپۆ و مێشەکوێرەکان. خولیاکانی هەر دەهاتن و پتر و دەوڵەمەندتر دەبوون و دەگۆڕان و پێدەگەیشتن و رەنگینتر دەبوون. هیچ گوێی نەدایە ئەو هەواڵەی لەدەرەوەڕا بۆیان هێنابوو. ئەو پیرەژنە کێ بوو؟ ئەویش جار و بارە دەهاتە نێو خولیاکانییەوە. ناوەکەی لەبیر چووبۆوە. باشە بۆچی بەتەنیا لەو کۆشکەدا مابۆوە و وەك ئەوانی دیکە بەجێی نەهێشتبوو؟ ژنێکی چاو درشت بوو. چەناگەیەکی تیژی تورکمانی و نێوچاوانێکی پان، کە تەنانەت ئێستاش تۆزێکی جوانی هەر تێدا مابوو. بە دەگمەن قسەی دەکرد و بە چاوی پڕ لە ئارەزوو و سەرسووڕماوی هەر دەیڕوانی. باشە ئەو ژنە نەبوایە چیی بەسەر دەهات؟ لەو رۆژانەی دواییدا وڕ و کاس ببوو و جۆرە هێوربوونەوەیەکی دەمی مەرگی بەسەردا هاتبوو. هێورییەکی مەرگ لە خولیا و ئارەزووەکانیدا بوو. ئەگەر ئەویش نەبوایە و لێرە نەخەوتبا و بە کەفوکوڵ و حەزەوە چاوی لەسەر خولیاکانییەوە نەبوایە، هەر دەیتوانی خۆی تەواو بە هێورییەکەی مەرگ بسپێرێ. دەستێك لە خولیاکانی وەردەدرا و بەردەوام ئاڵۆزی دەکردن و هەر دەڕۆیشت، هەموو شتێکی جوانتر دەکرد. دەستەکە دەهاتەوە و نێوچاوانی نەوازش دەکرد و لەو حاڵەتەدا خۆشەویستی نەرم نەرم لە نێوچاوانییەوە دەتکایە نێو دڵییەوە و بە دەرزیی هەژان وخۆشەویستی و بە شتێکی نەمر و بە شیرینییەکی بەردەوام و هەرمان دڵیی دەرزیئاژن و تەژیی دەکرد. دەستی بەسەر مووی دەستی، دەستە وشکەڵاتووەکانی، دەموچاو و نێوشانیدا دێنا و بە ئەشق و خۆشەویستی مردوویەکی زیندوو دەکردەوە. دوای رۆیشتنەکەشی، خۆی لە بەهەشتی خولیا و ئەشق و برادەرایەتی و کەفوکوڵێکی تازەدا دەدیتەوە. چێشکەی شیرینیایەتیی زیندووبوونەوەیەك، پیاوەتی و دنیایەکی نوێی... هەستی دەکرد تازە لەدایك بووە. قەلب سووك و کەیفخۆش.

پیرەژنە دیسان هەر بەو کەفوکوڵەی پێشووەوە هاتەوە ژووریٚ:"نەمگوت؟ نەمگوت بەگ؟ ئەوان دەستمان لیٚ بەرنادەن. ئاخرییەکەی هاتن."

چاوی هەڵنەهێنا. بەڵام گوێی هەڵخست و گوێی لیٚ بوو سیٚ ترۆمبێل پەیتاپەیتا لە حەوشەکەیدا راوەستان. دوایی دەنگی پیٚ لە پلیکانەکانەوە هات. مستەفا بەگ نەیزانی چ بکا، بۆیە تەریق بۆوە. بلێی و نەڵێی بیری لە حەمەعەلی و ژنەکەی و منداڵەکانی و خزم و کەس و پیاوەکانی کردەوە. ئاخۆ بلەئیبۆ، حەمدی و مەستانیش دێن؟ هەر بە راست، مەستان چیی بەسەرهاتبوو؟ دەتگوت شتێکی بەسەرهاتووە، بەڵام چیی بەسەرهاتبیٚ؟ لەوانەیە لە پەیوەندی لەگەڵ وەلی شەماڵ... تۆ بلێی وەلی شەماڵیان کوشتبیٚ؟ لە حاڵێکدا وەلی شەماڵی وەبیر هاتبۆوە، دەرگاکە کرایەوە و دەنگێك لە گوێیدا زرینگایەوە."بابە."

دەنگی حەمەعەلی بوو. ژنەکەشی گوتی:"بەگ."

ئیتر هات و دەستەکانی گرتە نێو دەستی. دوایی گوێی لە دەنگی منداڵەکانی دیکە و ئەوجار لە دەنگی سیٚ کەسی نەناسراو بوو.خزم و کەس و بلەئیبۆ و حەمدی و رەمزی و عەلی نێرگز یەك بە یەك هاتن و ئەحواڵیان پرسی. بەڵام ئەو چاوی هەڵنەدەهێنا. دەنگی زیکزیکەرەی دەبیست، کە جار بەجار لە دەروە پتر دەبوو. گوێی دابووە دەنگی زیکزیکەرەکان. خولیاکانی پڕ بوون لە زیکزیکەرە و چۆلەکە و مێشەنگوین و گوڵەهەناری زۆر و تەراکتۆری رەنگاوڕەنگ.

ئەوەی لە تەنیشت جێوبانەکەی دانیشتبوو و دەستی خستبووە نێو دەستەکانی و بەسەر سینگی دانابوو، حەمەعەلی بوو. دەنگی پڕ بوو لە خۆشی و متمانەبەخۆیی. دەستی خاتوون بلێی و نەڵێی دەلەرزین... حەمەعەلی یەك پشوو قسەی دەکرد، بەڵام مستەفا بەگ، دەنگیی نەدەبیست. دیارە هەوڵی دەدا، گویچی لە قسەی حەمە عەلی بیٚ و بزانیٚ دەڵیٚ چی، بەڵام نەیدەتوانی. لە خولیاکانیدا دەتلاوە. هەندیٚ شت، کۆمەڵێك تارمایی و وشە تێکەڵی خەونەکەی دەبوون.

حەمەعەلی دەتگوت لە نەبیستن و تێنەگەیشتنەکەی تێگەیوە، یان قسەی پیٚ نەمابوو، بۆیە بێدەنگ بوو. بێدەنگییەکی قووڵ و درێژخایەن باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا. زریکەی زیکزیکەرە ژوورەکەی پڕ کرد. کەس متەقی لیٚ دەرنایە. جگە لە دەنگی هەناسەکێشان و زریکەی زیکزیکەرە، دەنگی دی نەدەهات. حەمەعەلی نەیدەزانی چ بکا. باوکی نە چاوی هەڵدێنا و نە دەشجووڵا. کەوتە هاوارکردن. دەستی باوکیی بە سینگییەوە دەگوشی و هاواری دەکرد. لەو کاتەدا مستەفا بەگ پێڵووی هەڵێنان و چاوە پڕ لەپرسیار و حەپەساوەکانی پێدا

گێڕان. چەندی چاوی دەگێڕا، نیگاکانی مانادارتر دەبوون و روون دەبۆوە کە دەبینێ و تێدەگا. حەمەعەلی گوتی:"بابە هاتووم لێرە بتبەم. دەتبەم. تێگەیشتی؟ لە ئەدەنە خانوویەکی گەورەم بۆ گرتووی، چواردەوری باخچەیە... ژوورێکی گەورەم بۆ تۆ تەرخان کردووە... یەکی وەك..."

مستەفا بەگ لەو پەنجەرەیەوە کە ئەو نیشانی دەدا، سەیرێکی دەرەوەی کرد و حەمەعەلی لەسەر قسەی خۆی رۆیشت:"دار تووەکی ئاواش لەبەر پەنجەرەکەیەتی. پیرە دارتوویەکی گەورە.... هەزاران چۆلەکەش لە سەر لك و پۆی هەڵدەنیشن. خانووەکە، رێك وەك ئەو کۆشکەی خۆمان لەسەر گردێك دروست کراوە.  دوای ئەوەی بە برادەرێکمم گوت تۆ حەزت لە ماڵێکی لەو جۆرەیە، برادەرێکم ئەو ماڵەی داینێ."

خاتوون قسەکانی لێ وەرگرتەوە:"بەگ، سەیرکە. ناتوانی لێرە بمێنییەوە. ئەتۆ بۆ دەبێ بەتاقی تەنێ لەو کاولە کۆشکەدا بمێنیتەوە؟ سەیر کە..."

خاتوون پرێسکەیەکی کردەوە و لەسەری رۆیشت:"سەیر کە کوڕم، جلوبەرگی چۆنم بۆ ئامادە کردووی؟ ئەوانە باشترین بەرگدرووی ئەدەنە دووریونی. هەستە دەی، هەستە جلوبەرگەکانت لەبەر بکە با بڕۆین."

حەمەعەلییش لێی وەرگرتەوە:"هەستە جلوبەرگەکانت لەبەر بکە بابە... هەستە دەی..."

مستەفا بەگ دیسان پێڵووی لێك نانەوە. هەر حەمەعەلی قسەی کرد و خاتوون بۆی ئەستاندەوە. ئەوانی دیکە بێدەنگ لەجێی خۆیان دانیشتبوون و سەیریان دەکرد. حەمە عەلی ئاخرییەکەی هەڵچوو و بەتووڕەییەوە گوتی:"تۆ لە سبەینێوە ناتوانی لەو کاولاشەدا بی."

مستەفا بەگ بەسپایی پێڵووی هەڵێنا و چاوی پڕ لە پرسیاری لە حەمەعەلی بڕی.

حەمەعەلی درێژەی دا:"چونکە ئەو کۆشکە، یەکسەر فرۆشرا."

مستەفا بەگ رەنگی بە رووەوە نەما و ئاخێزێکی کرد. دەستی جوان دیار بوو دەلەرزین و لێوی دەپەڕین. تفی زاری قووت دەداوە و بە دەنگێکی کە لە تووڕەیی و هەژاوی دەلەرزی، پرسیی:"کێ ماڵی منی فرۆشتووە؟"

"کۆشکەکە هیی تۆ نەبوو، هیی دایکم بوو و دایکیشم فرۆشتوویەتی."

"یانی ئاوا؟.... یانی ئاوا؟"

ئینجا بە بێهێزییەوە سەری لەسەر بالیفەکە دانا. خاتوونیش گوتی:"بەڵێ فرۆشتوومە."

حەمەعەلییش لەخۆشیان و بە لەبزێکی پڕ لە متمانە و سەرکەوتنەوە، قسەکەی قۆستەوە و گوتی:"فرۆشتمان. باشە نەمانفرۆشتبا، چیمان کردبا؟ کاولەکۆشکێك بەکاری چی دێ؟"

مستەفا بەگ نالاندی:"ئەوە کۆشکی منە. ئێرە هەوارگەی باب و باپیرانی منە. گۆڕ و مەزاری ئەوان لێرەیە. چۆن دەتوانن بیفرۆشن؟ من چۆن دەتوانم ئێرە بەجێ بێڵم و بچمە جێیەکی دی؟"

خاتوون گوتی:"با بڕۆین بەگ. چارەنووسە رەشەکەی ئێمە هەر ئەوە بووە. چارەنووس بەئێمە ناگۆڕدرێ. چار نییە و دەبێ پێی قایل بین."

حەمەعەلی ناڕەزایەتیی دەربڕی:"چارەنووسی رەش چییە دایە؟ خۆ ئەو دۆزەخە شوێنی ژیان نییە. جوان سەیری ئەو کاولاشە بکە، هەر دەڵێی کۆشکیش نەبووە. تڕحێووو لەو کۆشکەی سەگ تێیدا ناژی."

مستەفا بەگ دڕدۆنگ بوو. ئاخۆ بڕوات یان بمێنێتەوە؟ چۆن دەیتوانی دڵ لە کۆشکی باب و باپیرانی بکاتەوە؟ بە هەزاران وردەداوی بەهێز گیانی بەو کۆشکە کاولەوە بەسترابۆوە. ئەوان قسەیان دەکرد و مستەفا بەگ لەنێوخۆیدا جینگڵی دەدا. ئاسوودە خۆی خزاندەوە جێوبانەکەی و بەدەنگێکی کز گوتی:"لەکۆڵم بنەوە. ئێوە رۆیشتنوون، بڕۆن، بڕۆن، بڕۆن..."

بە ئاستەم پشووی دەهاتە دەر. وەك مێش لەخۆی دەربکا، دەستی راوەشاند:"بڕۆن."

حەمەعەلی:"باشە دەڕۆین. بەڵام جوان بزانە، سبەینێ ئەو خانووە تێك دەدرێ. هەر بۆیەش ئەمڕۆ هاتین لێرە بتبەین. ئەگینا چەندی مابایەوە، کەس لێی نەدەپرسیی. ئەوانەی ئەو کۆشك و زەوییانەیان کڕیوە، دەیانەوێ تێك بدەن و بینایەکی گەورەی بۆ مەزرایەکی مۆدێرن لێ دروست بکەن."

مستەفا بەگ بەتووڕەییەوە قیت بۆوە. بەهانکەهانك و لەحاڵێکدا سینگی دەفی دەدا، پرسیی:"بەیانی، بەیانی، بەیانی تێکی دەدەن؟"

حەمەعەلی لەسەرخۆی وەڵامی داوە:"ئەگەر تا بەیانی لێی نەچییە دەرێ، بەسەرتدا کاولی دەکەن."

مستەفا بەگ هەر گوێی لەو وەڵامە بوو، هەستا و ئەوەندەی چاوترووکانێك دەمانچەکەی پڕ کرد لەو فیشەکانەی لە مستیدا بوون و رووی لە حەمەعەلی کرد. خۆ ئەگەر بلەئیبۆ دەستی نەگرتبایە، هەموو فیشەکەکانی لە نێوچاوانی حەمەعەلی دابوو. بلەئیبۆ مەچەکی دەستی گرتبوو و هەوڵی دەدا نەهێڵێ تەقەیەکی دیکە بکا.

ئەوەندەی چاوترووکانێك ژوورەکە چۆڵ بوو. هەمووان بە هەڵەداوان و بەپاڵەپەستۆ لە پلیکانەکان چوونە خوارێ و سواری ترۆمبێلەکانیان بوون.

حەمەعەلی بەدەنگێکی ترساوەوە دەیبۆلاند:"وەحشی، وەحشی، جانەوەری وەحشی. چیی نەمابوو مێشکم هەڵتەکێنێ. باشە، با لێرە بێ، لێرە بێ، با ئەوەندە لێرە بێ تا دەڕزێ. پیاوکوژی وەحشی...

مستەفا بەگ تۆزێك دواتر تینی تێدا نەما و کەوت و نالاندی:"لەکۆڵم بەوە کوڕم، لەکۆڵم بەوە بلەئیبۆ."

ئیتر کەوت. هانکەهانکی بوو و هەموو گیانی وەسەر ئارەقە کەوتبوو. هەستی بە داگیرسانی مەکینەی ترۆمبێل و دوورکەوتنەوەیان و هەڵکەندرانی هەندێ شت لە ناخیدا بوو. لەپڕ رووناکاییەك لە ناخی گەڕا. یانی ئەو ئەمرۆ دێ؟ یان بەڵایەکی بەسەر هاتووە... یان بەڵایەکی...

دنیا خەریك بوو رووناکی دەکردەوە، کە کۆشکەکە بە گرمەگرمێکی سامناك لەرزی. پەنجەرە و میچ و دەرگا و دیوارەکان وەك بێشکە قرچ و هۆڕیان بوو. مستەفا بەگ لەپێشدا وای زانی بوولەرزە هاتووە و ویستی هەستێ و را بکاتە دەرێ. بەڵام دەسبەجێ پاشگەز بۆوە. کۆشکەکە وا دەلەرزی، دەتگوت ئێستا نا ئێستا دادەتەپێ. گرمەیەکی بەسام، مستەفا بەگی وەخۆ هێناوە. لەو کاتەدا پیرەژنە، خۆی بە ژووریدا کرد و بە ترسەوە نالاندی:"کاولی دەکەن. کۆشکەکەمان بەسەردا کاول دەکەن. وەجاغمان کوێر دەکەنەوە."

بەگ چاوەی هەڵێنان و لێکی نانەوە.

هەتا زەردەپەڕ هەموو وڵات لەرزی و راتڵەکی و هەندێ شت بەگرمەگرم داتەپی و رووخا و دەمەدەمی ئێوارێ، دووکەسی سەروگوێلاك تۆزاوی، شەرمەزار وەژوور کەوتن. ئەو دووانە، کە جلوبەرگێکی شینی رەنگ بزڕکاویان لەبەردا بوو، دەستەونەزەر راوەستابوون و لەبەر خۆڵ و تۆز تەنیا ددان و چاویان دیار بوو. "کۆشکەکەمان لەلایەکەوە تێك دا و گەیشتینە ئێرە بەگ. لەسەر ئیزنت ئەوجار نۆرەی ئێرەیە. لێرە بڕۆ دەرێ. کاتمان کەمە و کارمان زۆر."

مستەفا بەگ بەدەنگێکی هێمن و تێکەڵ بە پێکەنینەوە گوتی:"بڕۆنە دەرێ با جلەکانم لەبەر بکەم."

پیاوە جل شینەکان وەدەرکەوتن و لە تەنیشت شۆفلەکانیان چاوەڕێیان کرد. مستەفا بەگ جلوبەرگی لەبەرکرد و سەرو رواڵەتی رێك خست و لە کۆشکەکە هاتەخوارێ و بە کرێکارەکانی گوت:"بیرۆووخێنن."

پیرەژنەش کە پرێسکەیەکی لەبن هەنگڵیدا بوو، هات و گوتی:"من دەڕۆم بەگ. ئەو هەمووە ساڵە نان و نمەکم کردووی، گەردنم ئازاد بکە."

مستەفا بەگ دەستی لە گیرفانی نا و جزدانی دراوەکەی دەرهێنا و چیی پارەی هەیبوو، دایە پیرەژنەکە و گوتی:"گەردنت خۆش و ئازاد بێ. گەردنت ئازا بێ."

پیرەژنە سەرشانی بەگی ماچ کرد و ملی رێگای گرت.

شۆفڵەکان وێکڕا پەلاماری کۆشکیان دا. مستەفا بەگ هەتا رووخانی دوایین دیوار، هەر لەوێ راوەستا و چاوی لە کاولکرانی کۆشکەکەی کرد. دوای ئەوەی شۆفڵ لە رووخاندنی کۆشکەکەی ئاق یۆللی بوونەوە، لەگەڵ ئەو خۆرەی خەریك بوو لە قوڕگی ئێوارەدا نوقم دەبوو، لەوێ دوور کەوتنەوە. مستەفا بەگ لەسەر بەردێك دانیشت و سەری لە نێوان هەردوولەپی دەستی گرت و خەیاڵ رفاندی. دوایین گزینگ و تیرێژەکانی خۆر لە چڵووکی دار هەنارەکانی بەرامبەرەوە دەپسانەوە. پیرە دارهەنارە چڕەکان لەبەر گوڵی سوور دیار نەبوون. لەو جێیەی لێی دانیشتبوو، هەستا و هاتە بن دار هەنارەکان. لە دوایین ساتەکانی رۆژدا زیکزیکەرەکان هەژابوون و مێشەنگوین کەوتبوونەوە وزەوز. ئاوەکە رەنگی سووری هەنار و زەردەپەڕی گرتبوو و هەتا چاو هەتەری دەکرد، بەرەو خواروو دەکشا.

مستەفا بەگ، چاوێکی دیکەی لە ئاوەکە و هەنارەکان مێشەنگوین و کۆشکە کاولکراوەکە و ئەو کوندەبووە کرد، کە لەسەر دیواری حەوشەکە نیشتبوو. ئیتر گەڕاوە و بەرەو لای خوراوو کەوتە رێ. چیی پتر دەڕۆیشت، هەنگاوی خۆشتر دەکردن و چەندی خێراتریش دەڕۆیشت، هەموو شتێك لە مێشکیدا تێکەڵ و پێکەڵتر دەبوو.

گەیشتە دەم ئاقچاساز. دیسان گوێی لە دەنگی شۆفڵەکان بوو و بە دەم ئاقچاسازدا لە لاقانی وەراند و غاری دا. ئێوارە سات بە سات کاڵتر دەبۆوە و ئاسمان تاریکدا دەهات و شەو زاڵ دەبوو. لاقی لە دەوەن و تووذڕکەکان هەڵدەنگوت و سەرەنگرێ دەبوو و دەکەوت و هەڵدەستاوەو دیسان رای دەکرد. هەتا تینی لە ئەژنۆیدا مابوو، تا سۆمای لەچاو و هەستی لە مێشکیدا هەبوو، هەر رای کرد. دەمانچەکەی بەدەستەوە بوو. تاوێك راوەستا و ئەوجار بەهەموو هێزی خۆی، دەمانچە و فیشەکەکانی نێو دەستی تووڕ هەڵدایە نێو زۆنگاوەکە. لەو دەمەدا هەستی کرد تان و پۆیەك لە هەناویدا پسا و بەدەوری خۆیدا گێژی خوارد و خولایەوە.

"بۆکوێ، بۆ کوێ، بۆ کوێ براله؟"

بەدەوری خۆیدا دەخولایەوە و ئەو گۆرانییەی، کە هیچ کەس نەیدەزانی لە کەیەوە هەیە، لە تاکە قوژبنێکی مێشکیدا کە هێشتا کاس نەببوو، دەنگی دەدایەوە:"بۆ کویێ، بۆ کویێ، بۆ کویێ براله؟ بۆ کویێ، بۆ کویێ، بۆ کویێ..."

هەتا دوا تیریێژی زەردەپەڕ هەروا خولایەوە و هێدی و لەسەرخۆ و بێهەست و جوولە خلیسکایە نێو زۆنگاوەکەوە و دواییش...

## ١٣١

دەروێش بەگ لای خۆی بیری دەکردەوە، ئەگەر پێش ئەوەی یوسف بکەوێتە دەست ئەوان، خۆمان بیگرین، ئەویدیکەی ئاسانە... ئیتر ئەوە کۆتایی گۆوەندەکەیە. کۆتایی گۆوەندەکەیە.

خاتوون دەیگوت:"بێت و ئەو هەتیوەت وەچنگ بکەوێ، ناتوانی هەروا سووك و سانا دەستی لێ بەردەی."

دەروێش بەگیش دەیپرسی:"ناتوانم دەستی لێ بەردەم، بەڵام تۆ دەڵێی چیی لێ بکەم خاتوون؟ ئاخرییەکەی هەر دەیگرن. ئەمڕۆش نەبێ سبەی. جا ئەو کات دەیکەنە چەکێك بۆ لەناوبردنی ئێمە. تۆ هەتا ئێستا دیتووتە لە چوکووراوادا بەوجۆرە راوەدووی پیاوکوژێك بنێن. لە ئەنکەرەوە هەتا ئێرە، هەرچی هێزی حکوومەتە بەشوێنییەوەن. راوی رێوییەکەش بۆ کەوڵە. دەیانەوێ بیگرن و وای لێ بکەن من پێوە بکا. ناتوانم دەست لە یوسف هەڵگرم. بەڵام لە کوێ بیشارمەوە؟ ئیتر لەم ئاواییەدا متمانەم بەکەس نەماوە."

خاتوون متەقی نەدەکرد و چاوی لە چاوی ئەو بڕیبوو. شتێکی لەسەر زمانی بوو، بەڵام نەیدەوێرا بیڵێ. دەروێش بەگ دەیزانی ئەو چیی لەدڵێدایە، بەڵام ئەو خۆشی نەیدەوێرا بیدرکێنێ.

دەروێش بەگ ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا و نەرم و لەسەخۆ گوتی:"دەبێ بژیم. نابێ دوای ئەو هەمووە چەرمەسەرییە بکەومە بەندیخانەوە. دەبێ ئەو دوژمنانەی تووشی ئەو رۆژە ڕەشییەیان کردووم، بدۆزمەوە و تۆڵەی خۆم و یوسفیان لێ بکەمەوە."

خاتوون وەقسە هات:"هەر لەبەر ئەوەش بووبێ، دەبێ بەزیندوویی بمێنییەوە بەگ. چار نییە هەر دەبێ بژییی بەگ..."

"چار نییە، چار نییە. بەڵام چۆن دەستمان بە یوسف رابگا بەر لەوەی ئەوان بیگرن؟ زۆر لەمێژە ئاگامان لێی نییە. دەڵێی زەوی زاری داپچڕیوە و قووتی داوە..."

درکاندی. جا یان له هەڵسوکەوتی بەگ یان لە سەیرکردنەکەی یان لە نەرم و قسەکردنە نەرم ونیانەکەیەوە بوو، وای لێ کرد، ئەوەی لەسەر نووکی زمانی بوو، بە تەتەڵە دەریبڕێ:"هەر یوسفت بکەوێتە بەردەستی، دەبێ سەری بەگۆمێدا بکەی بەگ. هیچ چاری دیکەمان نییە."

بەگ ناڵاندی:"نا."

لرخەلرخێکی لە سینگییەوە دەهات:"نا، چما کوشتنی یوسف وەك ئەوە وانییە خۆمم کۆشتبێ؟ بە واتای کوشتنی ساری ئۆغلێی هەزار ساڵە و تورکمانی دەهەزار ساڵە نییە؟"

خاتوون چاوقایم ببوو و لە تەنگانە هاتبووە دەرێ. بە هەڵەداوان و بەدەنگێکی وەك هاوارکردنەوە گوتی:"نا، وانییە. نەفەرێك چییە. یەك نەفەر خۆ هەزار نەفەر نییە. چما هەتا ئێستا کەس تێدا نەچووە؟"

بەگ تیزەبزەیەکی هاتێ و گوتی:"تێداچووە. جارێ راوەستە با بەرلەوەی بکوژرێ، بکەوێتە دەستم. ئەگەر بەر لەوەی بکەوێتە دەست خۆمان، ئەوان بیگرن، ئیتر رێگەی نەجاتیمان نامێنێ. لە دارم دەدەن. ئەوە لە هەموو شتێکەوە عەیانە. لە بیانووەك دەگەڕێن بۆ لەداردانی من."

خاتوونیش لێبڕاوانە لەدووی دا:"لە بیانوو دەگەڕێن."

دەروێش بەگ هەستا. لە خاتوون چووە پێشێ و چاوی لەنێوچاوی بڕی و ئەوجار دەستی راستەی درێژکرد و لەسەر شانی دانا و گوتی:"گوێت لەمن بێ خاتوون. ئەگەر یوسف بەر لەوەی بکەوێتەوە دەست خۆمان، بکەوێتە چنگی ئەوان، خۆم بەدەستەوە نادەم. مڵك و ماڵ و کەلوپەل و کچەکەم بەتۆ دەسپێرم. هەرگیز ئاواییەکە ناهێنیتە سەر سەودای فرۆشتنێ. ئەو رەوت و رێکی و ئینسانەتییەی لەو ئاواییەدا هەیە، نایفەوتێنی، تێگەیشتی؟"

خاتوون لەحاڵێکدا چاوی پڕببوون لە ئاو و گریان ئەوکی دەگرت، گوتی:"تێگەیشتم. بەڵام دڵم ختوورەی دەکا، کە یوسف دەگرین."

"ئەگەر ئێمە گرتمان، ئەویدیکەی ئاسانە."

"دەیکوژین."

"ئەویدیکەی ئاسانە."

"ئەگەر ئەو نەمرێ، وەچەی ساری ئۆغلێ دەبڕێتەوە. تورکمانی گەورە دەمرێ."

دەروێش بەگ لەو پێ چەقاندنەی خاتوون سەری سوورِ ما و جوابەجەنگێی کرد*.

---

*جوابەجەنگێ: وەڵامدانەوەی بەپێچەوانە. بەقسەنەکردن. نا گوتن.

"دەی دەمرێ با بمرێ."

هەورێکی ڕەش لەسەر ئاناوەرزاوە هەستا. هەورێکی لەگوێن ئەویش لە تۆرووسەوە تیژ بەرەو خوار دەخوشی. هەورەکان لە چەپ و ڕاستەوە دەهاتنە سەر سینگی دەشتەکە و گەواڵە دەبوون و ئاسمان دەیگرماند. "با" جارێ سارد و جارێ گەرم هەڵی کرد و تۆز و خۆڵی هەستاند. بەدوایدا دڵۆپی گەرم و قورسی باران خۆڵە نەرمەکەیان کون کون کرد. تاوێك دواتر دایدایە گۆپاڵ باران. دەروێش بەگ لە دیوەخانی کۆشکەکەیدا دەهات و دەچوو. بیری دەکردەوە، ڕادەوەستا و سەیری بارانی دەکرد و دیسان دەکەوتەوە هات و چۆ و خەیاڵ دەیبرد.

ڕێك لەو کاتەدا یوسف کە لە عارەبانە سەوزەکەوە خۆی فڕێدابوو و لەو دوێنێوە لە قامیشەڵانەکەدا خۆی شاردبۆوە، دەهاتەوە نێو ئاوایی. یوسف دوێنێ، ئەو کاتەی لە قامیشەڵانەکەدا خۆی مات دەکرد، وڕ و کاس بوو. توانای بیرکردنەوەی نەمابوو و تەنانەت هەستی بە برسێتییش نەدەکرد. هەر ئەوەندەی دەزانی دەبێ خۆی بشارێتەوە و نەگیرێ. کە بارانەکە دایکرد، لە قامیشەڵانەکە دەرپەڕییە دەرێ و ڕاستەوڕێ ڕووی لە ئاوەدانی کرد. جلوبەرگە قوڕاوی و گنجاوییەکانی بە پشتییەوە نووسابوون و جەستەی وەك وشکەڵەدارێکی لێ هاتبوو. بە لۆژەلۆژ و لە حاڵێکدا لاقی تێك دەئاڵقان، وەك چۆن سەگێك وارسکەی بەرەو ماڵەوە پەلکێشی دەکات، بەرەو ماڵەوە چوو. دەرگای ماڵێیان داخرابوو. پشتی بەدەرگاکەوە دا و لەوێ ڕاوەستا. باران وەك گۆزەی سەروبن دەهاتە خوار. سەگێکی ئاشنا هات و لاقی لستەوە. مانگایەك بە چاوە گەورەکانی سەیری کرد. منداڵێکی سەرسووڕماو لە دوورەوە لێی ڕوانی. یوسف دەیزانی چ شتێك چاوەڕوانێتی و ناخی ڕووناك دەکاتەوە. بەڵام چاوەڕێی چ بوو؟ هەوڵی دەدا وەبیر خۆی بێنێتەوە، بەڵام نەیدەتوانی. تاوێك دواتر چاوەڕوانییشی لەبیر چۆوە و هەستا و خۆی بە بارانەکەدا کرد. بەبێ ئەوەی هەنگاو شل بکاتەوە، بە بەردەرگای ماڵی گوڵعوزاردا تێپەڕی. دەهاتە بەر دەرگای ماڵان، هەنگاوی شل دەکردن و ڕادەوەستا و دیسان بە بەر بارانەکەدا دەکەوتەوە ڕێ. ئاخرییەکەی چووە حەوشەی کۆشکەکە و لەبەر تاوی بارانەکە، لە نێوەندی حەوشە، ڕێك لەو شوێنەی ئەمیر سوڵتان کەوتبوو، ڕاوەستا. لەوێ، لەبەر بارانەکە، چەندی چاوەڕێی کرد، کەس ئاگای لێی نەبوو. خاتوون پێش هەمووان دیتی. ئەویش لەپێشدا نەیناسییەوە. لە پلیکانەکان چووە خوارێ بزانێ کێیە؟ چەند جارێك لەبەر بارانەکە بەدەوریدا خولایەوە و لێی ورد بۆوە. لە ئاشنا دەچوو. بەڵام تۆ بڵێی کێ بێ؟ تۆزێك دواتر زریکاندی و

بەگ بە بیستنی زریکەی خاتوون هاتە بەر بێڵایە و دەمودەست بە راکردن لە پلیکانان هاتە خوارێ. خاتوون ئاگای لەخۆی نەمابوو و هەر دەیگوت:"یوسف، ئەوەش یوسف..."

جا دەستی بەرەو ئاسمان هەڵبڕی و گوتی:"خوایە گیان هەزار و هەزار جار شوکر، شوکرانەبژێرم. رزگارمان بوو بەگ، ئەوەش یوسف، یوسف..."

بەگ بن پیلی یوسفی گرت و لە پلیکانەکان بردییە سەرێ. بانگی کلفەت و قەرەواشی کرد و گوتی:"ئەوە بەرن و جوان بیشۆن."

ئەو یوسفە هیچ لە یوسفەکەی جاران نەدەچوو. بەڵام هەرچۆنێك بوو، یوسف بوو. خۆی بوو. خاتوون بە هەژاوی لە بەگ نزیك بۆوە و بەدڕدۆنگییەوە پرسیی:"خۆیەتی؟"

بەگیش بەدەنگێکی خەمبار و لەرزۆك گوتی:"بەڵێ راست خۆیەتی. هەوە، خاتوون."

یوسف هەر پێست و ئێسقانی لێ مابۆوە. روومەتی تێك قوپابوون و لێوی وەك پەڕی کاغەز سپی هەڵگەڕابوو و توێژ توێژ بوو و پەڕەی لووتی دەپەڕین. ملی وەك داوە دەزووی لێ هاتبوو و هەر قورتمەی مابۆوە. دەست و لاقی هەموو بریندار و رووشا بوو. گوێچکەشی کێم و چڵکێکی زەردی لێ دەهاتە دەرێ.

"بڵێی جلوبەرگی مزەفەری بۆ بەری بن؟"

"بەڵێ. پڕ بە بەرێتی بەگ."

"ئەی پێڵاوەکانی؟"

"هەموو جارێ کە پێڵاوی مزەفەر کۆن دەبوون دەمدانە وی."

"دەستێك جلی هەرە باشی مزەفەر بێنن. کراس و بن کراسیش... جووتێکیش پێڵاو."

"هەر ئێستا."

خاتوون ئەوەی گوت و بەغاردان رۆیشت.

بەگ چاوی لە خاڵێك بڕیبوو و بیری دەکردەوە. روخساری جارێ لە خۆشیان گەش دەبۆوە و جارێ سێبەری ژان و پەژارەیەك رەشی هەڵدەگێڕا.

"هیدایەت لێرەیە؟"

دەنگێك هات:"لەخوارەوەیە."

"با بێتە سەرێ."

هیدایەت لەسەر هەست بوو. ئامادە بوو و گوتی:"فەرموو بەگ."

"ئەوە خەریکن دەیشۆن. دواییش تۆ سەروقژی بۆ چاك دەكەی. خاتوونیش جلوبەرگی لەبەر دەكا. ئەو كات رادەسپێری میرۆ بێ و كوڕەكەی ببینێ. دواییش هەڵیدەكری و دەیبەیە ئاقچاساز بن دار بییەكان."

ئەوەندەی یەك و دوو، هەموو كارەكان راپەڕین. بەگ و یوسف بەرامبەر یەكتری دانیشتبوون و نانیان دەخوارد. لەو كاتەدا میرۆ هات و بە روخسارێكی ترساو و شێواو دەستی كوڕەكەی گرت. سەیری كرد و بەبێ ئەوەی خۆی تێك بدا، هەستا و چوو لەسەر مۆبلەكەی بەرامبەریان دانیشت و چاوی بڕییە نانخواردنی كوڕەكەی. لە روخسارییەوە هیچ دیار نەبوو شاد یان خەفەتبار. دوای نانخواردنەكە، دەروێش بەگ بە روویەكی شاد و گەش و لەبزێكی دڵنیا گوتی:"میرۆ، شوكری خودا، وا یوسف هاتەوە. هاتەوە. بەڵام ئێستا گیانی لە مەترسی دایە. دەمەوێ بینێرمە وان، بۆ لای خاڵوانی. ماڵاوایی لێ بكە. نەكا دیدار ئاخر بی و نەیبینییەوە، بەشكم بشیبینییەوە..."

میرۆ سەبرێ لەجێی خۆی هەستا و هاتە بەرامبەر كوڕەكەی. چاوێكی لە سەرتاپای كرد، ئەوجار داهاتەوە و سێ جاران ماچی كرد و گوتی:"هەر هەقێكم هەیە، هەقی دایكایەتی، شیرم حەڵاڵت بێ. ئەگەر جارێكی دیكەش بتبینمەوە... بڕۆ، خێرت وەرێ بێ..."

یوسفیش دەستی دایكی گرت و ماچی كرد.

خاتوون بەخۆشییەوە سەری بردە بن گوێی بەگ و بەسرتەیەك گوتی:"كارێكی باشت كرد بەگ. كارێكی باشت كرد، ئەو گەردن ئازاییەت رێك خست. یاخوا دەستت خۆش بێ بەگ..."

بەگیش نوقمی غروور و خۆشی، بزەی دەهاتێ.

لە دەرەوە باران خۆشی كردبۆوە و كۆلكەزێڕینەیەكی زۆر گەورە بەسەر چوكووراوا و چیای دوڵدوڵدا هەتا ئالاداغ كشابوو. تاو هەڵاتبوو.

هیدایەت بە دەنگێكی بەتوێكڵەوە لەبن گوێی بەگ گوتی:"ئێمە دەڕۆین بەگ. بن دار بییەكان لەهەموو جێیەك باشترە."

بەگیش گوتی:"بڕۆن. دوایی خۆشم دێم. یوسف وەزعی زۆر باش نییە و چاوی رەشكەوپێشكە دەكەن، ئاگات لێی بێ."

"دەزانم بەگ، ئاگام لێیەتی."

یوسف لەجلوبەرگە جوانەكانی مزەفەردا بچووكتر دیار بوو. هیدایەت بن پیلی گرت و لە پلیكانەكان چوونە خوار. نۆكەرێك وەك منداڵێك هەڵگرێ، ئاوا یوسفی هەڵگرت و لە تەركی

هیدایەت سواری کرد. هیدایەت ئەسپەکەی بەرەو مێشەڵانەکە تاو دا. بەگ دەمەدەمی ئێوارە هات. هیوایەت و یوسفی دیت کە لەسەر لێواری هەڵدێری زۆنگاوەکە و لەبن دار بییەکی گەورە بەرامبەر یەکتری دانیشتبوون. دیار بوو هیچ قسەیەکیان پێکەوە نەکردووە. هیدایەت بە دیتنی بەگ، هەستا و بەرەو لای هات. بەگ بەسپایی گوتی:"بەجێمان بێڵە."

هیدایەت سوار بوو و بەلینگدان لەوێ دوور کەوتەوە. کە ئەو دوور کەوتەوە، بەگ هەڵیکێشایە دەمانچەکەی. یوسف هەروا لەسەر ئەژنۆی دانیشتبوو. رووی دەمانچەکەی لە یوسف کرد. یوسف هەر چاوی بەدەمانچەکە کەوت، هەستا و لەوێ، لەبەر لوولەی ئەو دەمانچەیەی رووی لەوکرابوو، هەموو تین و هێزی خۆی هێنا نێو چاوی و بە تکا و پاڕانەوەوە سەیری کرد.

دەروێش بەگ پێی وانەبوو ئەو بنیادەمە لەپێ کەوتووە بێهێزە، ئاوا حەزێکی بێسنووری بۆ ژیان هەبێت و وا بە تکاوە سەیری بکا. لوولەی دەمانچەکە، لەخۆوە وردە وردە شۆڕ بۆوە. رووداوێکی چاوەڕواننەکراو رووی دا. یوسف لەپڕ گەش بۆوە و بریسکەی شادی و خۆشی لە چاو و روخسار و هەموو گیانییەوە هەستا. لوولەی دەمانچەکەی دەروێش دیسان وردە وردە هەستایەوە و رێك بەرەو نێوچاوانی راوەستا. روخساری یوسف لە چاوترووکانێکدا رەنگی پێوە نەما و چاوی بەترسێکی قووڵ و پڕ لە پاڕانەوەیەك کە لەقووڵایی دڵیەوە هەڵدەستا، زەق بوونەوە. دەستی دەروێش بەگ لەرزین. تەنانەت تەقەشی کردبا، ئەستەم بوو بیئەنگێوێ. دیسان لوولەکە شۆڕ بۆوە. باسکی دەروێش بەگ شۆڕ بوونەوە. چ بوو؟ چ دەبوو؟ لەنەکاو هرووژمی شەپۆلی شادییەك پڕ لە خۆشی لە روخساری یوسفدا دی و لەسەخۆ لوولەی دەمانچەکە بەرز بۆوە. هەر لوولەکەی بەرز بۆوە، یوسف زراوی چوو و پاڕانەوەی لێ دەباری.

تا خۆر ئاوابوو، هەر وا بوو. کە هەتاو نەما و دەروێش بەگ ئیتر نەیتوانی بەجوانی روخسار و نێو چاوەکانی یوسف ببینێ، پەنجەی لە پەلەپیتکە ترازاند و هاوارێکی کپ بەسەر زۆنگاوەکەدا کشا و دامرکایەوە.

یوسف خۆی وێك هێنا و سووڕا. بە خولەخول لە لێوی هەڵدێرەکە نزیك بۆوە. دەروێش بەگ جارێکی دیکەش پەلەپیتکەی ترازاند. یوسف دیسان هەر نەکەوت. هەروا بەدەوری خۆیدا دەخولایەوە. فیشەکێکی دیکە... یوسف بە سووڕەسووڕ گەیشتە سەر لێوارەکە و بەربۆوە نێو زۆنگاوەکە. تاوێك بەسەر زۆنگەکەوە مایەوە و دوایی ئاوە رەشەکە وردە وردە قووتی دا.

ڕێك لەو کاتەدا، لە مەودای سێ کیلۆمەتر لەولاترەوە، ماشێنێکی گەورەی عەرز کۆڵێن، بێڵە گەورەکەی لە بەریانی نێوان جۆگە و زۆنگاوەکە ڕۆکرد و گڵەکەی هەڵگرت و لە سەر لێوارەکە ڕۆی کرد و ئاوە بۆگەن و ڕەشەکە، وەك لافاو و بە خوڕەخوڕ ڕژایە نێو جۆگە تازە لێدراوەکەوە و وەڕێ کەوت.

"ئەو مرۆڤە باشانە، بە سواری ئەسپە جوانەکانیان..."

بارانێکی ئاماڵ زەرد، لێڵ، ورد دەباری و دەبریسکایەوە. گژەبا بارانەکەی دەشێواند و لەملاوە بەولایدا دەپژاند. ئەمیر سوڵتان لەسەر پشتی ئەسپەکەی، لەنێو حەوشەکەدا، شڕ و شپڕێو... لە ڕکێفییەوە خوێنەکەی دەچۆڕایەوە و عەرزەکەی کون کون دەکرد.

"ئەمیر سوڵتان، ئەمیر سوڵتان... دەروێش بەگ، دەروێش بەگ، رادەستی ئێمەی بکەوە..."

ردێنە ڕەشەکەی، چاوە ڕەشە ئاگرینەکانی... لەتوپەت... لەسەر لاشەی هەڵۆکان... لەسەر گازەرای پشت کەوتوو.

سواری ئەسپەکەی بوو و ڕووی لە کۆشکەکەی ئاق یۆللی کرد. شتێك لەناخیدا دەکوڵی. بارانەکە جار نەجارێ وەك شەپۆلێ دەهات و تێدەپەڕی و دوای تێپەڕینی تاوە بارانەکە، دیسان دەوروبەر وشك دەبۆوە.

کە لە دوورەوە کۆشکەکەی ئاق یۆللیی بەسەر گردەکەوە نەدی، بەندی جەرگ و دڵی پسا. جڵەوی ئەسپەکەی کێشا و شلی کردەوە و بەپێی عادەتی جارانی، چوو و لەبن دار چنارەکە ڕاوەستا.

سوورایی گوڵی پشکووتووی هەنارەکە، لەگەڵ ئاوەکە دەڕۆیی. ماسیی بچووك و بریقەدار لە نێو سوورایی ئاوەکەدا ڕاکەراکیان بوو. چاوی بەشوێنیاندا ڕۆیشت. کوللەیەکی کەسکی گەورە، کە چاوی دەبریسکانەوە، بە پووشێکەوە نووسابوو و لەحاڵێکدا سێبەرەکەی بەسەر لمی تەختی ئاوەکەدا دەکشا، بە سووڕەسووڕ بەرەو خوار ڕۆیشت. باڵێکی نوقم ببوو.

نیگای دەروێش بەگ، لە کوللە سەوزەکەوە بەرو خوار، بەرەو دەشتەکە باڵی گرت. شۆفڵ و بۆلدزێرەکان وەك دێوەزمە لە لای ڕەوەزەکانی ئاناوەرزاوە بەرەو باشوور، بەرەو ڕووبارەکەی جەیهان و بەرەو ئەولاتر، بەرەو چوکووراوا دەڕۆیشتن. لە دەشتە کاکی بە کاکییەکەدا، لە مۆراییە مەیلەوڕەشەکەدا، بەدووی یەکتریدا ڕیز ببوون و لە دوورەوە هەر دەتگوت ناجوولێن. نیگای لەسەر ئەو دێوەزمە زەبەلاحانەوە بەرەو ڕۆژهەڵات گەڕاوە. کێوپارە ڕوون ببوونەوە و لە

شینایییەکی بزرکاودا وەك پەردە بەرز و نزم دەبوونەوە. چیای دولْدولْیش بە رەنگە مسییە دووکەڵ ئاساکەی و بە ترۆپکە تیژەکەیەوە، هاتبووە پێشتر و لە پێش کێوپارەکەوە و لەدەم دەشتەکە راوەستابوو. هەتاو لە داوێنی شەپۆلی دەدا. گەردەلوولەکان لە لای کوێستان قەڵاوە جار جارێ بریسکەیەکیان دەدا و کپ دەبوونەوە. چیای دولْدولْ لەحالێکدا دووکەڵێکی تەنکی لێ هەڵدەستا، وردە وردە بە سوورایییە تۆخە مسییەکەیەوە نزیکتر دەبۆوە.

لەپڕ سەری ئەسپەکەی بەرەو ئاقچاساز وەرسووڕاند و دایە بەر قەمچی. ئەسپەکە وەکی بای شەماڵ بەرەو دەشتەکە لوور بوو. دەشتەکە لەپڕ نوقمی تەم و مژ بوو. تەمێکی تەنك هەموو شتێك، ئاقچاساز و قەڵای ئاناوەرزا و چیای دولْدولْی داگرت. دوایی بارانێکی ئاماڵ زەرد، مۆر وەك پۆڵا، کە سەری هەر تنۆکێکی هەزار بریسکەی لێ دەبۆوە، بەسەر تەمەکەدا باری و تەمە پەمەیییەکەی توێژ توێژ کرد. شەوێکی قورس وەك بەرد، زەردباو، ناخۆش و خنکێنەر، باڵی بەسەر دەوروبەریدا کێشا.

باران وەك گۆزەی سەروبن دەباری و ئاوەکە بە تەنیشتیدا بەخوڕەخوڕ بە جۆگە"کاناڵ"ـەکەدا بەرەو لاوباری جەیهان دەخوشی. جۆگە تازە لێدراوەکە ئاوی بۆگەنیو و رەش و قوڕاو و خەستی ئاقچاسازی بەتاڵ دەکردەوە. ئاوە بەربووەکە دەتگوت هەموو قورسایی زۆنگاوەکەی لەسەر پشتە، پاڵەپەستۆی خاکەکەی دەدا و دەیلەزراند و دەخرۆشا.

دەروێش لەمێژ بوو لەسەر لێواری جۆگەکە راوەستابوو و چاوی لە ئاوەکە بڕیبوو. وڕ و کاس بوو. ئەسپەکەی لەخۆوە کەوتە رێ و شان بە شانی رەوگەی ئاوە تار و قوڕاوییەکە و پێ بە پێی خێرایییەکەی ئەو رۆیشت. کە گەیشتە رووباری جەیهان، راوەستا. ئەو ئاوە تار و لیڵەی لە ئاقچاسازەوە دەهات، لەو شوێنەوە کە دەرژایە نێو رووبارەکەوە، دڕی بە ئاوەکەی دەدا و کەفی لێ هەڵدەستاند.

لەبەر بارانە ئاماڵ زەردە و قوڕاو و روون، کە بەغوڕەم دەباری و وەك نووکی دەرزیی ئەرخەوانی دەبریسکایەوە...

"ئەو ئەسپە جوانانە، ئەو هەمووە بنیاددەمە باشەیان برد و رۆیشتن."

کۆتایی

٢٠١٢/١٠/٤

# رەسووڵ بایز مەحموود "سوڵتانی" ( شاعیر و وەرگێڕ )

ساڵی ١٩٧٦ لە گوندێکی نزیك شاری بۆکانی رۆژهەڵاتی کوردستان لە دایك بووەز بەکالۆریۆسی هەیە لە زمان و ئەدەبیاتی فارسیدا.

ئەو بەرهەمانەشی پێشکەی بە کتێبخانەی کوردی و خوێنەری کورد کردووە:

١. رۆمانی ژان (نووسینی مارگریت دۆراس)

٢. پێشەوای رابوون (کتێبێکە لەسەر کۆماری کوردستان)

٣. ژن لە فەلسەفەی سیاسیی رۆژئاوادا

٤. کۆیلەکردنی ژنان (نووسینی جۆن ستیوارت میل)

٥. ئێمیلی ژان ژاك رۆسۆ

٦. تاعوونی ئەلبێر کامۆ

٧. (ئەو دیوی کوێستان).(رۆمان /یەشار کەمال)

٨. سەفەر و ئاسکۆڵەکەی بەختم گوزەل (رۆمانێکی مەحموود دەوڵەت ئابادی)

٩. سێبەری هەڵۆ (رۆمانێکە ئاوڕی لە نهێنییەکانی ژیانی ناپلیۆن بوناپارت داوەتەوە)

١٠. لە لینینەوە بۆ پووتین ( مێژووی سیاسیی رووسیا )

١١. ئیمپراتۆریی بیزەنتی

١٢. کۆتایی سەدەکانی ناوەراست

١٣. ئاغاکانی ئاقچاساز/ یەشارکەمال

١٤. ئاسییە رۆمان/ تۆرگینێف)

١٥. یەکەم ئەشق (رۆمان/ تۆرگینێف)

١٦. کچانی کابول (رۆمان)

١٧. رووخان (رۆمان/ ئەلبێر کامۆ)

١٨. یاخی (رۆمان/ یەشار کەمال)